# دەوڵەتی عوسمانی

## هۆیەکانی گەشەسەندن و ڕووخان

نووسینی

دکتور علی محمد الصلابی

وەرگێڕان

ئەحمد عبدالرحمن ئەحمد
ئەمجد جلال الحبیب اللە





دار المعرفة
بەیرووت

بسمِ اللهِ الرّحمن الرّحيم

## ئێمەی وەرگێڕیش قسەیەکمان هەیە

سوپاس بۆ خوای گەورە کە دوای ڕووخانی هەندێ قەوارە ئەفەرموێت: **(فاعتبروا یا أولي الابصار)** خەڵکە چاو ساغەکە! پەند وەربگرن.

سەڵات و سەلامیش بۆ سەر گیانی پێغەمبەر (ﷺ) کە ئەفەرموێت: **(کانت بنوا إسرائیل تسوسهم الانبیاء کلما هلك نبي خلفه نبي وانه لا نبي بعدي، وسیکون خلفاء فیکثرون، قالوا: فما تأمرنا؟ قال: فوا ببیعة الاول فالاول، اعطوهم حقهم، فأن الله سائلهم عما استرعاهم)**[1].

واتا: نەوەکانی ئیسرائیل پێغەمبەران سەرپەرشتی کاروباری سیاسەتیان ئەکرد لە ناویاندا، کە پێغەمبەرێك ئەمرد پێغەمبەرێکی تر ئەهاتە جێگەکەی، بە دڵنیاییەوە دوای من پێغەمبەری تر نایەت و لەمەودوا خەلیفەکان ئەو کارە دەکەن و زۆریش ئەبن، وتیان: جا فەرمانت چیە بۆمان؟ فەرمووی: ئەمەکدار بن بۆ پەیمانی یەکەمجارتان پاشان یەکەمەکەی تر، ئێوە مافی ئەوان مەخۆن و بیپارێزن، بێگومان خوای گەورەش لە هەموو ئەو شتانە ئەپرسێتەوە کە خستبوویە ژێر دەستی ئەوان..

ئەم پەرتوکەی ئێستا لەبەر دەستی ئێوەی خوێنەری بەڕێزدایە وەرگێڕراوی کتێبی "**الدولة العثمانیة، عوامل النهوض والسقوط**"ە لە نووسینی نووسەری گەورەی لیبی دکتۆر "**علی محمد محمد الصلابی**"یە. دکتۆر صەلابی نوسەرێکی بەتوانا و خاوەنی خامەیەکی زۆر بە بڕشتە و تا ئێستا زیاد لە دە بەرگ کتێبی مێژوویی نووسیوە و تێیدا هەموو ئەو گزیبازی و بوختانانەی هەڵوەشاندووەتەوە کە خامە گوماناویەکان لە کۆن و نوێدا خزاندوویانەتە ناو مێژووی ئیسلامەوە...

---

[1] **البخاري، کتاب الانبیاء، باب: ما ذکر عن بني اسرائیل**

پێنج بەرگی گەورە کتێبی دەربارەی «**خەلیفەکانی ڕاشیدین**» **نووسیوە دوو بەرگ لە ژیانی پێغەمبەر** (ﷺ) و دوو بەرگ لە مێژووی ئیسلامی و دوو بەرگ لە مێژووی (ئەمەوی) و (عەباسی) و کتێبی تایبەتیش دەربارەی بزوتنەوەی (سەنوسیەکان) و (دەوڵەتی یەکتاپەرستەکان) و (سەلجوقیەکان) و (زەنکیەکان) و (ئەیوبیەکان) و.....هتد...

نووسینەکانی دکتۆر صەلابی دوو تایبەتمەندی زۆر دیاری هەیە:

یەکەمیان: بەردەوام لە سەرچاوەوە قسە ئەکات و زۆر کەم قسەی خۆی ئەکات.

دووەم: بە بەڵگە و موناقەشەی لۆژیکانە هەموو زانیاریەکی ناڕاست کە خراونەتە ناو مێژووەوە ڕەت ئەکاتەوە و باز نادات بە سەریاندا وەك هەندێ نووسەری تر ئەیکات و لەوەش خراپتر جاری وا هەیە کە بەرگریشی لێ دەکەن.

ئیمەش کتێبی " **دەوڵەتی عوسمانی** هۆکارەکانی گەشەسەندن و ڕووخانی "مان لەو کتێبانە هەڵبژاردووە لەبەر چەند هۆیەك:

یەکەم: خزمەتکردنی قوتابیانی زانکۆ بە تایبەت و خوێنەری کورد بەگشتی چونکە ئەوەی دیارە قوتابیان سەرچاوەی کوردی و باوەڕپێکراویان لە بەردەستدا نیە یاخود ئەوەندە کەمە لە ڕیزی نەبووندایە.

دووهەم: ڕاستکردنەوەی هەموو ئەو زانیاریە هەڵانەی دراوەتە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی لەبەر هۆیەك یان زیاتر.

سێ یەم: ماددەیەکی زانستی بدەینە دەست ڕۆشنبیران بۆ ئەوەی ببنە خاوەن (ڕا) و (ڕای بەرامبەر) و تەنها بە ڕایەکی تایبەتەوە دەق نەگن.

ئێمە ئەزانین کە ئەم کتێبە هەندێ کەس و نووسەر زویر و توڕە ئەکات چونکە ئەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە ئابڕووی ڕۆشنبیری و ڕابردووی نووسینەکانی چونکە ئەو دەوڵەتی عوسمانی وا نەناساندووە لە ناو کورددا و بەڵکو هەر ئەوەی تفیوەتەوە کە دوژمنەکانی دەوڵەتی عوسمانی ناویانەتە دەمی.

لێرەدا ڕاستیەك هەیە کە تۆمارکردنی بە شتێکی بەسوود ئەزانین... هەندێ نووسەر هەیە زانیاریەکانی دەربارەی دەوڵەتی عوسمانی لە چوارچێوەی سەرچاوەکانی ڕەقیبانی دەوڵەتی

عوسمانی دەسوڕێتەوە کە ئەویش کارێکی نادروست و نازانستی یە... چونکە عـەقڵ نایبرێـت کە دوژمن بەو ویژدانەوە قسە دەربارەی دوژمنەکەی بکات... ئەمە وای کرد لە نووسـەرێکی گەورەی وەك مارف خەزنەدار کە نووسینەکانی دکتۆر کەمال ئەزهـەر بخاتـە ژێـر پرسـیار و بازنەی گومانەوە و بلێت کتێبەکانی کـەمال ئەزهـەر دەربـارەی دەوڵـەتی عوسمـانی نرخـی زانستیانەیان نی یـە چـونکە سەرچـاوەی نووسـینەکانەی بریتیـە لـە ئەرشـیفی ڕووسـی و ڕووسیاش دوژمنێکی سەرسەختی عوسمانیەکان بووە و هەمیشە لـە هـەوڵی ناشـیرنکردن و ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە... ئەوە ڕاستیەکە زۆر کەس لە ئاستیدا چاو دائەخەن گـزی لە خۆیان و خوێنەری کوردیش ئەکەن و ڕەچاوی ناکەن لەکاتی نووسیندا.

ئەکرێ مێژووی کورد و بزوتنەوەکانی ڕزگاریخوازی کوردستان لە ئەرشیفی بەعسەوە-بـۆ نموونە- وەربگیرێت؟ یان مێژووی وڵاتی جەزائیر و بزوتنـەوە ڕزگاریخوازەکـانی لـە ئەرشـیفی فەڕەنساوە وەربگیرێت؟ و...وە هەروەها.

ئەو بەڕێزانەی کە تا ئێستا ناهەقی بە دەوڵەتی عوسمانی ئەکەن و بە هـەموو هۆکارێـك هەوڵی ناشیرنکردنی ئەدەن، با لە ئێمە زویر نەبن و لـە بـری خـۆ تـووڕەکردن بـە خۆیـان و نووسینەوەکانیاندا بڕۆنەوە و مێژوو لە سەرچاوەی ڕەسـەن و دوور لـە گومانـەوە وەربگـرن و بێلایەن بن لە نووسیندا چونکە بێلایەنی سەرەکیترین مەرجی مێژوو نووسـە و پینـەکردن و گزیبازیش بۆ کەس ناچێتە سەر بە بەردەوامی، عەرەب جوان ئـەڵێت: (**تستطيع ان تخدع بعض الناس بعض الوقت ولكن لا تستطيع ان تخدع كل الناس كل الوقت**) **ئەتوانی هەندێ کەس بۆ ماوەیەك فریو بدەی بەڵام ناتوانی هەموو خەڵکی بۆ هەموو کاتێك فریو بدەی...**

**لە وەرگێڕانی ئەم پەرتووکەدا هەندێ گرفتمان هاتە ڕێگە لەوانە:**

**گـەورەیی کتێبەکـە و بـوونی هـەندێ ڕای نووسـەر کـە لەگـەڵ ڕای ئێمـەدا یـەکی نەدەگرتـەوە و کـەمی کـات و چـۆنیەتی بەچـاپ گەیانـدنی و وەرگرتنـی شەرعیەتی ئایینی و یاسایی بۆ وەرگێڕان و چاپکردن و بڵاوکردنەوە...بەڵام خوا**

لێـی بـەزیاد بێـت گرفتـەکانی ئاسـان کـرد و ئـەم کتێبـەش کەوتـە بـەر دەسـتی خوێنەرانی کورد.

هەندێ تێبینی هەیە لەسـەر وەرگێڕانەکە و کتێبەکە بە پێویستی ئـەزانین کـە خوێنەرانی لێ ئاگادار بکەین....

- لە هەندێ شوێندا پێویست بووە کە وشەیەك یان پێناسەیەك زیاد بکـەین، ئەوە ئاماژەمان پێداوە لە پەراوێزدا یان خستوومانەتە ناو دوو کەوانەوە.
- لەوانەیە هەندێ بیروڕای نووسەر هـەبێت، ئێمـەی وەرگێڕ ڕامـان وا نـەبێت بەڵام بە پێویستمان نەزانیووە ئاماژەیان پێ بدەین.
- ئەگـەر خـوا یاوەریمـان بکـات بـە نیـازین ئـەو بەرهەمـە مێژووییانـە کـە هەندێکیان لە ڕوویەکەوە یان زیاتر پەیوەندی بە ئێمەی کوردیشەوە هەیە بـە زمـانی شـیرنی کـوردی بخەینـە بـەر دەسـتی خوێنـەرانی بـە ڕێـز و ئومێـدیش ئەکـەین کـارێکی باشمـان کردبێـت و خوێنـەرانی بـەڕێز و قوتابیانی خۆشەویست ئەم نۆبەرەیەمان لێ وەربگرن و هەر هەڵەیەکیشیان بینـی بە دیاری بۆمـانی بنێـرن با ئـەوانیش بەشـداری خێـری چاککردنی چاپەکانی داهاتوو بن.

دیارە وەك"عماد الاصفهانی"یش ئەڵێ:

(شك نابەم کەسێك هەبێت شتێکی نووسیبێت و بۆ ڕۆژی دواتر نـەیوتبێت ئەگـەر ئەوەم گۆڕیبا چاکتر ئـەبوو ئەگـەر ئەوەم بۆ زیـاد بکردایـە خۆشتر ئـەبوو، ئەگـەر ئـەوەیانم لـە پـێش ئەوەیانـەوە بنووسیبا جـوانتر ئـەبوو... ئەمـەش گـەورەترین پەنــدە و بەڵگەیــە لەســەر ئــەوەی کــە کــەم و کــوڕی زاڵــە بەســەر هــەموو مرۆڤەکاندا...(القران منهل العلوم،ص٢٢٧).

وصلی الله علی محمد وعلی آله وصحبه أجمعین

أحمد عبدالرحمن أحمد

نهاد جلال حبیب الله

یادی نۆزدە ساڵەی کیمیابارانی هەڵەبجە ٢٠٠٧

## پێشکەش

بەزانایانی ئیشکەرو بانگخوازانی دڵسۆز و زانستخوازانی تێکۆشەر ونەوەدلێرەکانی ئەم ئوممەتە .

ئەم کتێبە پێشکەش دەکەم و بەناوە چاك و سیفەتە بەرزەکان خوا لێی دەپارێمەوە کە لەپێناو خۆیدا بێت .

خوا دەفەرموێت : ( فمن كان يرجو لقاء ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعبادة ربه أحدا ) الكهف :١١٠ ، واتە : هەرکەسێك بەتەمای گەشتنە بەپەروەردگاری خۆی با کردەوەی چاك بکات و هاوەڵ بۆ پەروەردگاری بڕیار نەدات .

## پێشەکی :

أن الحمد لله ، نحمده ونستعينه ونستهديه ، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا وسيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له ، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله .

( يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله حق تقاته ولاتموتن إلا وأنتم مسلمون ) آل عمران : ١٠٢

( ياأيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولا سديدا *يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزا عظيما ) الأحزاب ٧٠-٧١

يارب لك الحمد كما ينبغي لجلال وجهك وعظيم سلطانك ، لك الحمد حتى ترضى ، ولك الحمد إذا رضيت .

ئەمە کتێبی شەشەمە ( چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی ئیسلامی ) لەبارەی دەوڵەتی عوسمانی ( فاکتەرەکانی ڕاپەڕین وهۆکارەکانی کەوتنی ) ەوە دەدوێین ، کە وێنەیەکی ڕوون دەبەخشێت لەمەڕ ڕەچەڵەك و ڕەگ و ڕیشەی تورکەکان و کاتی هاتنیان بۆ نێو ئیسلام لەگەڵ کرداره چاکسازییەکانیان بە درێژایی مێژوو کە چەند پێناسەو تەعریفێك لەنێوەندی سەرچاوەو مەرجەعەکانەوە دەردەهێنین بۆ ئەو کەسایەتییە تورکانەی کە لە قورئانی پیرۆز نزیك بوونەتەوەو بەشدارییان کردووە لە بنیاد نانی شارستانییەتی ئیسلامیدا و ڕێڕەوی ئەهلی سوننەو جەماعەتیان سەرخستووە ، بە وێنەی( سوڵتان سەلجوق ، ئەلب ئەرسەلان ، نیزامولمولك ، مەلیکشاه )

هەروەها ئەم کتێبە لەمەڕ جیهادو بانگەوازو خوشەویستی ئەوانەوە دەدوێت بۆ زانست و دادپەروەری و ڕوونی دەکاتەوە کە : ئەو تورکانەی هەستان بە بنیاد نانی دەوڵەتی عوسمانی ، درێژە پێدەرانی سەلجوقیەکانن . بە ویژدانەوە لەبارەی سەرکردەکانی دەوڵەتی عوسمانی دەدوێت ، وەك : عوسمانی یەکەم و ئورخان و مورادی یەکەم و محمد چەلەبی و مورادی دووەم و موحەممەدی فاتیح و سیفەتەکانیان بە دیار دەخات لەگەڵ ئەو مەنهەجەدا کە لەسەری ڕۆشتوون .

هەروەها لە بونیادنانی دەوڵەتدا چۆن هەڵسوکەوتیان کردووە لەگەڵ سوونەتە خواییەکانی وەك: سوننەتی پلە بەپلە ( التدرج) و بەکارخستنی هۆکارەکان و سوننەتی گۆڕینی دەرونەکان و سوننەتی ( تدافع ) و دوچار بوون ( إبتلاء) ، وەچۆن سەرکردە یەکەمینەکان مەرجەکانی دەسەڵات( تمکین) یان بەدی هێناوە و هۆکارە ماددی و مەعنەوی یەکانیان خستوەتە کار؟

ئەم کتێبە باس لە هەمووئەو قۆناغانەش دەکات کە دەوڵەتی عوسمانی پێیدا تێپەڕی کردووەوچۆن(قوستەنتینیە)ڕزگار کراوە لە ئەنجامی چەند هەوڵێکی زۆری کەڵەکە بووی زانایان وشەغرانەکان وسەربازوو سەرکردەکان بووە بە درێژایی هەموو ئەو سەردەم و ماوەو ڕۆژکارانەی پێشتر هاتوون .ڕۆشتون بەشدارییان تێیدا کردووە . بۆ خوێنەری بەڕێزیش دەردەکەوێت کە ڕاپەڕینی عوسمانیەکان گشتگیر بووە لەهەموو بوارە زانستی و سیاسی و ئابووری و ڕاگەیاندن و جەنگییەکاندا . دەسەڵاتداریش چەند سیفەتێکی هەیە کە پێویستە لەسەر کردەو ئوممەتیشدا هاتبنە دی کە بەلە دەستدانی ئەوانە دەسەلاتیش لەدەست دەچێت .

هەروەها ڕاستی دەوڵەتی عوسمانی و ئەو بنەمایانەش کە لەسەری ڕاوەستاوە ، لەگەڵ ئەو کارە بەرز و بڵندانەدا ڕوون دەکاتەوەکە ئەم دەوڵەتە پێشکەشی کردووە بە ئوممەت وەك : پارێزگاری کردن لە شوێنە پیرۆزە ئیسلامییەکان لەدەست پیلانەکانی پورتوگالی خاچ پەرست ، وەسەرخستنی خەڵکانی باکوری ئەفریقی ( موسوڵمانەکانی ئەوێ ) دژ بە هێرشی ئیسپانیەکان و دوور خستنەوەی پەلامارەکانیان لە هەرێمەکانی شام و میسر و خاکە ئیسلامیەکانی تر .

ئەم دەوڵەتە ڕێگەی لەبلاو بوونەوەی مەزهەبی شیعەی ڕافیزی دوازدە ئیمامی گرت لە هەرێمە ئیسلامیەکانی سەر بە دەوڵەتی عوسمانی داهەروەها ڕێگەی نەداجوولەکە نیشتە جێ بن لە ٠٠فەڵەستین٩٩داوبیکەنە نیشتمانی خۆیان،

هەروەها ڕۆڵی دەوڵەتی عوسمانی لە بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە ئەورووپادا ڕوون دەکاتەوە .

ئەم لێکۆڵینەوەیە لەبارەی نالەباریەکانی ( سلبیات ) خەلافەتی عوسمانی و ئەو هۆکارانە دەدوێت کە کاریان کردە سەر لاواز کردنی فەرمانڕەواییەکەی ، وەك : پشتگوێ خستنی زمانی عەرەبی لە کۆتا ساتەکانی دا کە زمانی عەرەبی زمانی قورئانی پیرۆزو فەرمووده بەرزەکانە ، هەروەها نەبوونی هۆشیارییە کی ڕاستە قینەیئیسلام ولادان لە شەریعەتی ئیسلام وکەوتنە ژێر کاریگەری بانگەشەی یەرۆژئاوایی بوون ، لەبارەی ڕاستی ململانێی نێوان بزوتنەوەی وەهابی و دەوڵەتی عوسمانی و ئەو ڕۆڵە گوماناوییە دەدوێت کە عەلی محمد پێی هەستا لە بەرژەوەندی بەریتانیاو فەرەنسادا بەلێدانی ڕەوتی ئیسلامی لە میسر و حیجاز و شام و ڕونکردنەوەی بزوتنەوە بەرۆژئاواییکەرەکەی ئەو. هەروەها لە مەڕ پاڵپشتی ماسۆنیی دەدوێت کەلەپشت سیاسەتە کاولکاری یەکانی محمد علی دابوو لە دژی ئوممەتی ئیسلامی .

ئەم کتێبە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە محمد علی چنگول و خەنجەرێکی ژەهراوی بووە کە دوژمنان لە جێبەجێ کردنی پیلانەکانیاندا بەکاریان هێناوە ، بۆیە لە ڕاپەڕینە زانستی و ئابوری و سەربازی یەکانیدا لەگەڵیدا ڕاوەستان ، پاش ئەوەی دڵنیا بوون لە کزی ، و بیرو باوەڕو ئیسلامییەتیەکەی محمد علی و هۆکارو سەربازەکانی ،ئەم لێکۆڵینەوە باس لەوە دەکات کە چۆن ئەم ڕۆڵەی محمد علی بینی لە هەموو ناوچەکە دا بویە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتە ئەورووپی یەکان هەموو ئاگادار بن لە ئاستی ئەو لاوازییەی دەوڵەتی عوسمانی تێی کەوتووەودواتر خۆسازدانیشیان بۆ دابەشکردنی زەوییەکانی عوسمانی لە هەرکاتێکدا کە بارودۆخی سیاسی لەبار بێت .

هەروەها لەبارەی سوڵتان مەحمودی دووەمەوە دەدوێت کە هەنگاو بە هەنگاوبە شوێن شارستانیی ڕۆژئاوادا ئەڕۆشت لەبزوتنەوە چاکسازی یەکەی

دا ، لەگەڵ باسی عبدالمجیدی کوڕی کە لە دوای خۆی دەسەڵاتی گرتە دەست ، کە لەژێر کاریگەری ڕەشید پاشای وەزیردا بوو کە بە هابالأکان و فەلسەفەی خۆیی لە ماسۆنیەتدا ئەبینیەوە ، وەچۆن ئەو وەزیرە لەگەڵ پشتیوانەکانیدا بەشکاری کرد لە خێراتر کردنی ڕەوڕەوەی بەڕۆژئاوایی بوون٩دا کە بە دەوری سێ خاڵی گرنگ دا ئەسوڕایەوە :

فێربوون و وەرگرتنی ئەوەی پەیوەندی هەیە بەڕێکخستنی سوپاوە لە ڕۆژئاوا ، و ئاراستە کردنی کۆمەڵگە بەرەو پێکهاتەیەکی عەلمانی ، و چوون بەرەو مەرکەزی بوونی دەسەڵاتی لەئەستانبوڵ و لەویلایەتەکاندا . پاشان ئەو هەنگاوە دلێرانەی کە تورکە ماسۆنی یەکان گرتیانە بەر بەرەو بە عەلمانی کردنی دەوڵەت چۆن بوو لەگەڵ نیشاندانی دووهێڵی گوڵخانە و هومایۆن و گەشتن بە دەستوری مەدحەت پاشا لەساڵی ١٨٧٦ ز دا .ئەم ڕووداوە لە مێژووی ئیسلام ودەوڵەتەکانی دا یەکەم جار بوو کە بە دەستورێکی وەرگیراو لە دەستوری فەرەنسی و بەلجیکی و سویسری کاروباری ببرێت بەڕێوە،کە ئەوانە چەند دەستورێکی دانراوی عەلمانی بوون . بۆ خوێنەریش ڕوون دەبێتەوە کە چۆن بزوتنەوەی ڕێکخستنەکان دەوڵەتی عوسمانی بەڕەسمی خستنە سەر ڕێگای کۆتا پێهاتنی وەك دەوڵەتێکی ئیسلامی و یاساکان کران بە عەلمانی و چەند دامەزراوەیەك دانران کە بەیاساگەلی وەزعی کاریان دەکردو دەوڵەت لەبوارەکانی بازرگانی و سیاسی و ئابووری لەیاساکانی ئیسلامی دوورکەوتەوە، بەمەش ڕەوابوونی ( شەرعیەت) ی دەوڵەتی عوسمانی لە دیدی موسوڵمانەکانەوە پاشەکشەی کرد و نەما .

بۆ خوێنەری بەڕێز ڕوون دەبێتەوە کە چۆن پیاوانی بەڕۆژئاواییکەر لەسەردەمی سوڵتان عبدالعزیز دا بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا زاڵ بوون ، کاتێکیش بەرەنگاری زۆرێك لە پیلانە کانیان بویەوە لایانبرد و دواتریش کوشتیان .

ئەم لێکۆڵینەوەیە باس لە هەموو ئەو هەوڵە گەورانەش دەکات کە سوڵتان عبد الحمیـد وەك خزمـەتێك بـە ئیـسلام و بـەرگری لـە دەوڵەتەکـەی و یەکخـستنی هەوڵـەکانی ئوممـەت لـە ژێـر ئـاڵای خۆیـدا پێـی هەسـتاو ، وەچـۆن بیرۆکـەی ،،کۆمەڵگەی ئیسلامی،، لەنێوەنـدی سیاسـەتی دەوڵـەتی دا لەسـەردەمی سـوڵتان عبـدال حمیـد دا بەدەرکـەوت ، درێـژەش دەدات بـە باسـی ئـەو هۆکارانـەی کـە سوڵتان عبدالحمیـد لـە جێبـەجێ کردنـی نەخشەکەیدا گرتیـە بـەر بۆ گەشـتن بـە کۆمەڵگەی ئیسلامی وەك پەیوەنـدی کـردن بـە بانگخوازان و ڕێکخـستنی ڕێبـازە سـۆفیزمەکان و کـارکردن لەسـەر بـە عـەرەبی کردنـی دەوڵـەت و بنیـاد نـانی خوێندنگـەی هۆزەکـان و دانـانی هێڵـی سکـەی ئاسـنی حیجـازو پوچەڵکردنەوەی پیلانەکانی دوژمن .
ئەم کتێبە جەخت دەکاتەوە لەسەر هەوڵە کانی زایـونیزمی جیهـانی لـە پاڵپشتی دوژمنانی سوڵتان عبدالحمید ، وەك یاخیبوەکانی ئەرمەن و نەتەوە پەرستـەکانی بەلقان و بزوتنـەوەی حیزبـی ئیتیحـاد و تـەرەقی و ڕاوەسـتانیان لەگـەڵ بزۆتنـەوە جیاخوازیـەکانی نێـو دەوڵـەتی عوسمـانی ، وەچـۆن دوژمنـانی ئیـسلام توانییـان سـوڵتان عبدالحمیـد لا بـدەن و پاڵـەوانی قـەڵب• البطـل المزیـف٩ موسـتەفا کـەمال دورست کرا ؟ ئەوکەسەی کە کاری دەکرد لەسەر داماڵینی تورکیا لە بیرو باوەڕو ئیسلامەکەی دەستی دا بەشەڕکردن لەگەڵ دینداریداوڕێگەی تـەنگ دەکـردەوە لـە بانگخوازان و بانگەشەی بۆ بێحیجابی و تێکەڵی ژن وپیاو دەکرد .
ئـەم کتێبـە باسـی مـژدەی هاتنـەوەی ئیـسلام بۆنـاو تورکیاشـی فـەرامۆش نەکردووەوئاماژە دەکات بەوهەوڵە گەورانەی کە بزوتنەوەی ئیسلامی لەتورکیا بە کۆمەڵـە جۆربـە جۆرەکانیـەوە پێـی هەسـتاوە . خوێنـەری موسـوڵمانیش بـەجێ دەهێڵێت تـا بـە ڕوونـاکی ئیمـان بڕوانێتـە داهـاتووی ئیـسلام لـە تورکیـاو جیهـان بەگشتی .

له كۆتایی كتێبەكەدا توێژەر گرنگی دەدات بە نیشاندانی هۆكارەكانی كەوتن و دارمان لە دیدێكی قورئانییەوە ، تا بۆ خوێنەر ڕوون ببێتەوە كە هۆكارەكانی كەوتن و دارمان زۆرن لەوانە : لاڕێبوونی ( إنحراف) ئوممەت لە چەمكەكانی ئایینەكەی ، وەك بیروباوەڕی ( ولاء و براء )، هۆگری و دورەپەرێزی ، و چەمكی پەرستش و بڵاو بوونەوەی دیاردەكانی ،،شیرك،، و داهێنانە ناڕەوا( بدعە) ولا ڕێبوونەكان و دەركەوتنی سۆفیەتی لا ڕێبو وەك هێزێكی ڕێكخراوی نێوكۆمەڵگای ئیسلامی كە چەند بیرو باوەڕو بیرۆكە و پەرستشێكی دوور لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەری (درودی خوای لەسەر بێت ) لە خۆگرتبوو ،خوێنەری موسوڵمانیش ئاگادار دەكاتەوە لەو دەستەو تاقمە گومڕایانەی كە ڕۆڵیان لە لاوازكردنی ئوممەتی ئیسلامیدا بینی وەك:،،تاقمی شیعەی ڕافیزی دوازدە ئیمامی،، و ،،دورزیەكان،، و ،،نوصەبیریەكان،، و ،،ئیسماعیلیەكان،، و ،،بەهائیەكان،، و جگە لەوانیش ئەو تاقم ودەستانەی كە لەسەرووئیسلام ئەژمێررێن ، هەروەها دەدوێت لەمەڕ نەبوونی سەركردە ڕەبانییەكان وەك هۆكارێك بۆ فەوتانی ئوممەت ، بەتایبەت كاتێك زاناكانیان بوونە ئامێری یاریكردن بەدەست فەرمانڕەوا زۆردارەكانەوەو هەریەك پێشبڕكێیان دەكرد بۆ پلەو پایەكان و ڕۆڵی خوازراوو جێ ئومێدیان نادیار بوو ، ئینجا چۆن زانستە ئایینییەكان لەكۆتایی دەوڵەتی عوسمانی دا تووشی دۆگایی‌وگەشە نەكردن هاتن .

هەروەها چۆن زانایان گرنگییان دا بەكورت كردنەوەو شەرح و پەراوێز و ڕاپۆرتەكان و دوور كەوتنەوە لە گیانی ڕاستەقینەی ئیسلام كە لە قورئان وسوننەتی پێغەمبەرە٠ص٩وەرگیراوە و ڕەفز كردنی دەرگای ئیجتیهاد لەلایەن زۆرێك لە زانایانەوە تاگەیشتنە ئەوەی بانگەوازكردن بۆ كردنەوەی ئەو باسە بوو بە تۆمەتێكی گەورە كە دەگەشتە ئەوەی بەتاوانە گەورەكان ئاماژەی پێ بكرێت و

لەلای هەندێ لە خەڵکەچاولێکەرەوودۆگماکان دەگەشتە ئاستی بێ باوەڕی و کوفر ؟!

ئەم کتێبە باسی ئەو ستەم کاریانەش دەکات کە لە دەوڵەتی عوسمانی دابلاّو بوبوویەوەوە باسی ئەوخۆشخۆری وۆچوون لە ئارەزووبازی وئەو ناکۆکیيە توند ودەستە دەستەوەستانە وەئەکات کە سەرەتای هەڵچنی بۆ دوورکەوتنەوە لە شەریعەتی خوا کە شوێنەواری ترسناکی گەورەیان دروست کردوەك: لاوازی سیاسی و جەنگی و ئابوری و زانستی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی . هەروەهاباسی ئەوە ئەکات چۆن ئوممەت توانای خۆی لەدەست دا بەرگریکردن و زاڵبوون بەسەر دوژمنانیدا و چۆن داگیر کرابیرو بیرکردنەوەی خرایە ژێر پەلاماریان،ئەویش و لەئەنجامی لە دەستدانی مەرجەکانی تەمکین و دورکەوتنەوەی لە هۆکارەمادی و مەعنەویەکان و نەزانی بەرامبەر سوننەتەکانی خوا لە ڕاپەڕین و کەوتنی ئوممەتەکاندا ، خوا دەفەرموێت : ( ولو أن أهل القرى أمنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء والأرض ولكن كذبوا فأخذناهم بما كانوا يكسبون ) الأعراف : ٦٩ .

واتە : ئەگەر خەڵکی شارەکان باوەڕیان بهێنایاو لەخوا بترسانایە ئێمە بەرەکەتەکانی ئاسمان و زەویمان بۆ گوشاد دەکردن ، بەڵام ئەوان دەستیان دایەدرۆ کردن و ئێمەش بەسزای خۆمان گرتمانن بەهۆی ئەو کارانەوە کەدەیانکردن .

ئەم هەوڵە ملکەچانە ، ڕەخنەو استکردنەوە هەڵدەگرێ، لەڕاستیشدا هەوڵێکی ڕاستەقینەی بۆ کۆکردنەوەو ڕێکخستن و واژەکردن ( تفسیر)و لێکۆڵینەوەی ئەو ڕووداوە مێژوویی یانەی کە لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا ڕوویان داوە کەئەو ڕووداوانە بەهۆی جووڵەی میللەکان وململانێی توندی‌نێوانیانەوەدروست بووکە لە ئەنجامی جیاوازی بیرو باوەڕومتیۆدو ئامانج وبەهاو شتە پیرۆزەکانیانی هوریەکەیانەوە سەرچاوەی ئەگرت. جا ئەگەر چاك بوو تەنیا لە خواوەیە، ئەگەر

ڕێگاکەشم هەڵە کردبێت ئەوە لێ یدەگەڕێمەوە کاتێك ، ئەو هەڵەیەم بۆ ڕوون بوویەوە . دەرفەتیش کراوەیە بۆ ڕەخنەو وەڵامدانەوەو ڕاستکردنەوە .

ئامانجم لەم کتێبە :

١. تیشك خستنە سەر سەرکردەکانی دەوڵەتی عوسمانی یە ، وەك : عوسمانی یەکەم و ئورخان و محمدی فاتح و ئەوانی تر .

٢. ڕۆشنکردنەوەی ئەو میتۆدەیکە دەوڵەتی عوسمانی لە کاروانە دوورو درێژەکەیدا لەسەری دەڕۆشت .

٣. جەخت خستنەسەر ئەو فاکتەرانەی کە بەشدار بوون لە بنیادنانی دەوڵەتی عوسمانی و ئەو هۆکارانەش کە پوکاندیەوە و بەشدار بوون لە لاواز کردنی و پاشان کەوتن و ئاوابوونیدا .

٤. ئاسانکردنی بنەمای پەند وەرگرتن و ئامۆژگاری کردن بە ئاگاداربوون لە باری دەوڵەتان و ووردبوونەوە لەسوننەتەکانی خوا لە ئاسۆو دەروونەکان و کۆمەڵگاکاندا .

٥. ڕوونکردنەوەی ئەو فێڵە گەورەیەی کە دەوڵەتی عوسمانی لەلایەن مەسیحی و یەهودی و تورکە عەلمانییەکان وکەسانی ترەوە بەرەو ڕووی بوویەوە .

٦. دەرخستنی ئەو درۆو بوختانەی کە دەوڵەتی عوسمانی لە پێنووسە ژەهراویەکانەوە بەرەو ڕووی بوویەوە وڕۆشنکردنەوەی نادروستی ئەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی بە داگیر کەر ناو دەبات ویەکسانی ئەکات ڕۆژئاوای داگیر کەر بە داگیرکەری ڕۆژئاوایی وەك ئیمپریالیزمی فەرەنسی و ئینگلیزی .

٧. پشتگیری کردن لە برایانی ئاییمان ( عوسمانیەکان) کە بەرەوڕووی ستەم بوونەوەو چەندین ناڕاستی و درۆ لەلایەن جولەکەو مەسیحی و عەرەب و تورکە عەلمانیەکانەوە دراوەتە پاڵ مێژوەکەیان ومەبەستی ئەوەش هەیە بەرچاوی نەوەی داهاتووش ڕۆشن بکەمەوە تا ڕاستی ودروستی وعوسمانیەکان بزانێت.

٨. دەرخستنی لاپەڕەکانی ئەو جیهادە گەورەیەی کە عوسمانیەکان پێی هەستان لەگەڵ ئەو هەمووبەشداریەیان لە بانگەوازکردن بۆلای خوادا .کە دوژمنانی ئەم ئوممەتە بەردەوام هەوڵی سڕینەوەوگومان دروست کردن ئەدەن دەربارەی وتانە ئەخەنە سەر ڕاستی ودروستی یەکەی.

٩. دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی مێژوویی ئیسلامی بە لێکۆڵینەوە لە بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست و ڕوانینێکی ساغی دوور لەژەهری ڕۆژهەڵاتناسان و بیرۆکەکانی ئەو عەلمانیانەی کە هەوڵی هەڵگێڕانەوەی ڕاستییە مێژووییەکان دەدەن لەپێناو خزمەت کردنی ئامانجەکانیاندا .

١٠. دەرخستنی ئەوەی کەئەو بزوتنەوە چاکسازی یانەی کە شیاوی ڕێز لێنانن ، لەناو ئەم ئوممەتەدا بریتین لەوانەی کە لەسەر مەنهەجی قورئانی پیرۆز و سوننەتی گەورەی نێرراومان محمد (درودی خوای لەسەر بێت ) لەبیروباوەڕو پەرستش و ڕەوشت و کڕین و فرۆشتن و هەموو بوارەکانی ژیانی محمد (درودی خوای لەسەر بێت ) ڕۆشتووەو دەڕوات .

١١. ناساندنی هەندێ لەو زانا ئیشکەر و شەرعزانەڕیشەدارانەی کە بەشداریان کردووە لە بنیاد نانی دەوڵەتی عوسمانی و پەروەردەی ئوممەتدا وەك شێخ ئەحمەدی گۆران و شمس الدین آق( محمد کوڕی حەمزە ) و کەسانی تر .

ئەمەوهەستاوم بە دابەش کردنی ئەم کتێبە بۆ: دەروازەیەك ، و حەوت بەش و ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە :

دەروازە : میتۆدە هاوچەرخەکان لە نووسینی مێژووی دەوڵەتی عوسمانیدا .

بەشی یەکەم : ڕەگ و ڕیشە و ڕەچەڵەکی تورکەکان کە سێ باس لە خۆ دەگرێت:

باسی یەکەم : ڕەچەڵەك و نشنیگەی تورکەکان .

باسی دووەم : دروستکردنی دەوڵەتی سەلجوقی .

باسی سێیەم :کۆتایی هاتنی دەوڵەتی سەلجوقی .

بەشی دووەم : دروست بوونی دەوڵەتی عوسمانی و فتوحاتەکانی کە شەش باس لە خۆ دەگرێت :

باسی یەکەم : عوسمان دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی .

باسی دووەم : سوڵتان ئورخانی کوڕی عوسمان .

باسی سێیەم : سوڵتان مورادی یەکەم .

باسی چوارەم : سوڵتان بایەزیدی یەکەم .

باسی پێنجەم : سوڵتان محمدی یەکەم .

باسی شەشەم : سوڵتان مورادی دووەم .

بەشی سێیەم : محمد فاتح و ڕزگار کردنی قوستەنتینیە ، کە حەوت باس لە خۆ دەگرێت :

باسی یەکەم : سوڵتان محمدی فاتح .

باسی دووەم : ڕزگارکەری مەعنەوی قوستەنتینیە ( شیخ ئاق شمس الدین) .

باسی سێیەم : کاریگەری ڕزگار کردنی قوستەنتینیە لەسەر جیهانی ئەورووپی وئیسلامی .

باسی چوارەم : هۆکارەکانی ڕزگار کردنی قوستەنتینیە .

باسی پێنجەم : گرنگترین سیفەتەکانی محمدی فاتح .

باسی شەشەم : شتێك لەکارە شارستانییەکانی .

باسی حەوتەم : وەسیەتی سوڵتان محمدی فاتح بۆ کوڕەکەی .

بەشی چوارەم : سوڵتانە بەهێزەکانی دوای محمدی فاتح کە نۆ باس لەخۆ دەگرێت :

باسی یەکەم: سوڵتان بایەزیدی دووەم .

باسی دووەم : سوڵتان سەلیمی یەکەم .

باسی سێیەم : سوڵتان سولەیمانی قانونی .

باسی چوارەم : دەوڵەتی عوسمانی و باکوری ئەفریقی .

باسی پێنجەم : موجاهیدی گەورە حسن ئاغای طوشی .
باسی شەشەم : موجاهید حسن خیر الدین بربروسە .
باسی حەوتەم : سیاسەتی صالح رایس .
باسی هەشتەم : سیاسەتی حەسەنی کوڕی خیرالدین لە فشار خستنە سەر ئیسپانیادا .
باسی نۆیەم :،، متوکل علی الله ،،ی کوڕی عبدالله غالبی سەعدی .
بەشی پێنجەم : سەرەتای شلۆقی و پەشێو بوونی دەوڵەتی عوسمانی ، کەیازدەە باس لەخۆ دەگرێت :
باسی یەکەم : سوڵتان سەلیمی دووەم .
باسی دووەم : سوڵتان موڕادی سێ یەم .
باسی سێیەم : سوڵتان محمد خانی سێیەم .
باسی چوارەم : سوڵتان ئەحمەدی یەکەم .
باسی پێنجەم : هەندێ سوڵتانی لاواز .
باسی شەشەم : سوڵتان سەلیمی سێیەم .
باسی حەوتەم : ڕەگ وڕیشەی هێرشی خاچ پەرستانەی فەرەنسی .
باسی هەشتەم : سوڵتان محمودی دووەم .
باسی نۆیەم : سوڵتان عبدالمجیدی یەکەم .
باسی دەیەم: سوڵتان عبدالعزیز .
باسی یانزەهەم: سوڵتان موڕادی پێنجەم .
بەشی شەشەم : سەردەمی سوڵتان عبد الحمید کە هەشت باس لەخۆ دەگرێت:
باسی یەکەم : سوڵتان عبدالحمید .
باسی دووەم :کۆمەڵگەی ئیسلامی .
باسی سێیەم : سوڵتان عبدالحمید وجولەکە .
باسی چوارەم : سوڵتان عبدالحمید و دەستەی ئیتیحاد و تەرەقی .

باسی پێنجەم : دارماندنی دەسەڵاتی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم .

باسی شەشەم : فەرمانڕەوایی ئیتیحادیەکان و کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی .

باسی حەوتەم : مژدەی هاتنەوەی ئیسلام بۆ ناو تورکیای عەلمانیباسی هەشتەم : هۆکارەکانی کەوتن .

لەکۆتاییدا : دەپاڕێمەوە لەخوای گەورە کە ئەم کارە کارێکی دڵسۆزانە بێت لە پێناو خۆیدا وپاداشتم بداتەوە لەسەر هەر پیتێك کە نوسیبێتم و بیخاتە نێو تەرازووی چاکەکانمەوە ، پاداشتی ئەو برایانەشم بداتەوە کە یارمەتی یان دام لەپێناو تەواو کردنی ئەم کتێبە دا بە هەموو ئەو توانستەی کەهەیانبوو .

( سبحانك اللهم وبحمدك ، أشهد أن لاإله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك )

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين .

هەژار بە لێبوردن و چاوپۆشی پەروەردگار :

علی محمد محمد الصلابی

## ( دەروازە)

**متیۆدە هاوچەرخەکان لە نوسینەوەی مێژووی دەوڵەتی عوسمانیدا :**

مێژوو نوسە ئەوروپی و جولەکەو مەسیحی و عەلمانییە کینە لە دڵەکان خۆیان بەدوورناگرن لەهێرش کردنەسەر مێژووی دەوڵەتی عوسمانی داو هەموو ، شێوازەکانی تانەو توانج و ناشیرین کردن و گومان خستنەسەر ئەو کارانەی کە عوسمانییەکان لەپێناو خزمەتکردنی بیرو باوەڕو ئیسلامدا پێی هەستان ئەخەنە کار . زۆرێك لە مێژوو نووسە عەرەبەکانیش بە ئینتیماو ئاراستە نەتەوەیی و عەلمانی یەکانەوە ، لەگەڵ ئەو مێژوو نووسە تورکانەش کە کاریگەربوون بە ئاراستەی عەلمانی کە مستەفا کەمال سەرکردایەتی دەکرد ، بەورپێبازە چەوتەدا ڕۆشتن . ئیدی شتێکی سروشتی بوو کە هەستن بە سەرزەنشتکردنی ماوەی خەلافەتی عوسمانی مێژوو نوسە تورکەکان کەوتن بەسەر سامانێکی گەورەدا کە بە دەستی گاوورو جولەکەکان نووسرابویەوە بوویە پاڵپشت لە ڕێگۆڕی نەتەوەیی عەلمانی یان لەتورکیادا پاش لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم .

لەئاست مێژوو نوسانی ئەوروپیدا ، هەڵوێست لەمەڕمێژووی عوسمانی بەهۆی کاریگەر بوونیان بەو فتوحاتە گەورانەی کە عوسمانییەکان بەدییان هێنابوو بەتایبەت لە دوای ئەوەی کە قوستەنتینیەی پایتەختی دەوڵەتی بیزەنتی کەوت و داڕماو عوسمانییەکان گۆڕیان بە ( دار الإسلام) و ناویان نا إسلام بول ،ئیدی دەرونی ئەوروپییەکان ئەمە کاری زۆری تێکردوو پڕی کرد لە کینەو تاڵ چێژی و ڕق لە دژی ئیسلام ، ئەو ڕق و کینە یانەش لە قسەو کردارو نوسینەکانیاندا دیواودیوبوویەوە ، عوسمانیەکانیش هەولی بەردەوامی ڕۆشتنیان دەدا تاکوو لەگەڵ بەردەوامی جیهاد کردنەکەیاندا ڕۆما بخەنە سەر دەوڵەتی ئیسلامی تا باز بدەنە نێوەندی ئەورووپاو بگەنە ئەندەلوس بۆ ڕزگار کردنی موسوڵمانەکانی ئەوێ.

ئەوروپاش لەترس و سام و بیمدا دژیان و دڵەکانیان بەمردنی سوڵتان محمدی فاتح نەبێت ئارام نەبوویەوە . سەرکردە ئایینی یەکانی مەسیحیش بە قەشەوڕوهبان وپاشاکانیانەوە شەقامی ئەوروپی یان بەڕق و کینەی دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان پڕدەکرد . پیاوانی ئاینی کاریان دەکرد لەسەر کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و خۆبەخت کەران بۆ بەرەنگار بوونەوەی موسوڵمانە بەربەریەکان -بێ باوەڕەکان بە قسەی ئەوان -. هەرکات عوسمانی یەکان بەسەر ئەو خۆسازدان و ئامادە سازییانەدا سەردەکەوتن ،شەپۆلی بێزاری و کینە و ڕق دژ بە ئیسلام و کەسەکانی زیادی دەکرد .

ئیدی سەرکردە مەسیحیەکان عوسمانیەکانیان بە جەردە و دڕندە و دەشتەکی تۆمەتبار دەکرد ، ئەو تۆمەتانەش لەیادەوەری ئەورووپیەکاندا هەڵواسرا .

بەڕاستی هێرشە چڕەکانی ڕاگەیاندن لەلایەن سەرکردە مەسیحیەکانەوە بۆ پارێزگاری کردن بوو لە دەستکەوتە سیاسی و ماددی یەکان و بێزاری دەربڕین بوو لەئیسلام و ئەهلی ئیسلام . هەندێك لەفەرمانڕەوابە کرێ گیراوەکانی ئەوروپاش توانیان بۆ ماوەیەکی کاتی درێژخایەن لەدەسەلاتدا دەستبگرن بەسەر دەروونی کۆمەڵگا ئەوروپییەکاندا و چەندین دەستکەوتی گەورە بەدەست بخەن و خۆشییەکی گەورە بخەنە دەروونیانەوە کە لەهەموو ئەمانەدا پشتیان بە چەواشەکاری بەستبوو.

لەگەڵ ئەوەی کە دەوڵەتە ئەوروپییەکان پاش ئەوەی کە چەواشەکاری ئەو دەستەو تاقمانەیان لەگەڵ سەرەتای سەردەمی ڕێنسانس دا بۆ بەدەرکەوت ، بەڕووی ئەو دەستەو تاقمانەدا چوون و سەرەتای قۆناغێکی نوێ لە مێژووی ئەوروپا دا هاتەدی . کەچی ویژدانی کۆمەڵگای ئەوروپی هەر نەیتوانی ڕزگاری بێت لەو خڵتەو شتانەی لە ئەو دەستەوتاقمانەوە بۆیان مابوویەوە دەربارەیجیهانی ئیسلامی بەشێوەیەکی گشتی و دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەکی تایبەتی . بۆیە هێزی (سەربازیەکان بە پاڵپشتی شارستانییەتە

ماددی یەکان سازدا بۆ تۆڵە سەندنەوە لەئیسلام و موسوڵمانانو فەرهود کردنی خێروو بێری وولأتەکانیان بەفاکتەرە ئایینی وئابووری وسیاسی وکەلتوریەکان .
نووسەران ومێژوو نووسەکانیشیان بە تانەو تەشەرو ناشیرین کردن و گومان دروست کردن لەمەڕ ئیسلام و بیرو باوەڕو مێژووەکەی پشتیوانیان ئەکردن و، دەوڵەتی عوسمانی لە م هێرشە دڕندانە داپشکی زۆر گەورەی بەرکەوت.
جولەکە ئەوروپییەکانیش بە پێنووسە ژەهراوی و بۆچوونە نە خۆشەکانیان بەشدارییان ئەکرد کرد لەو هێرشە بەردەوامانەدا کە دژ بە دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی و ئیسلام بەگشتی . دوای ئەوەی پیلانەکانیان بە درێژایی چوار سەدە٠کە تەمەنی سونی عوسمانی یە٩ لەدەست بەسەرداگرتنی هەر بستێك لە زەوییەکانی ئەو دەوڵەتە شکستی خوارد بۆ بنیاد نانی قەوارەیەکی سیاسی بۆخۆیان. ئیدی دوژمنایەتی جوولەکە بۆ دەوڵەتی عوسمانی ڕووی لەزیاد بوون کرد .
جولەکە بەیارمەتی دەوڵەتە خاچ پەرستەکان و دەوڵەتە داگیرکەرە ڕۆژئاواییەکان و لە ڕێگەی کۆڕەکانی ماسۆنییەتەوە توانیان ئامانجەکانیان لەسەر حسابی ئەو ڕژێمە نەتەوەییانە بەدی بهێنن کە لەجیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا هەبوون . ئەو ڕژێمانەی کە خۆیان بە پێشکەوتوو و مەدەنییەت وەسف دەکرد و خەلافەتی عوسمانیشیان بە درێژایی مێژوو بە لادان و دواکەوتوویی و دۆگماودا ڕووخا وشتی تر تۆمەتبار دەکرد . کۆڕە ماسۆنییەکان و و ڕێکخراوە نهێنییەکان سەر بە جولەکە و هێزە جیهانی یەکانی دژ بە ئیسلام و موسوڵمانان ، وایان دەردەبڕی کە ناشیرینکردنی سەردەمەکانی مێژوویی دەوڵەتی شکۆداری عوسمانی لەگرنگترین ئامانجەکانیانە .
مێژوو نووسە عەرەبەکانیش لە جیهانی ئیسلامیدا ، لەگەڵ ئاڕاستەی ئەو کاروانی نەدابوون کە هێرشیان دەکردەسەر سەردەمی خەلافەتی عوسمانی ، پاڵنەریشیان بۆ ئەوە چەند هۆکارێك بوو کە پێش هەموویانەوە ئەودەست پێش

خەرییـــەی  تورکیـــەکان بـــوو بەســـەرکردایەتی موســـتەفا ئـــەتاتورك بـــۆ هەڵوەشـاندنەوەی خەلافـەتی عوسمـانی لـە سـاڵی ١٩٢٤ ز دا ، پاشـان دەسـت پێشخەری حکومەتی عوسمانی تورکی دێت لە وەرچەخانی تەواوی بۆ مەنهەجی عەلمانی لە لایەنە کۆمەڵایـەتی و ئابوری و سیاسییەکان دا وە دەستیان بەردالە شەریعەتی ئیسلامی کە بە درێـژایی تەمـەنی دەوڵـەتی عوسمـانی دەسـتی بەسـەر ئـەو کۆمەڵگەیـەدا کێشابوو.ئـەم حکوومەتـە ٠ناسیولـستە٩دەسـتی تێکـەڵ کـرد لەگـەڵ سیاسـەتە ئـەو رووپاییەکانـدا کـە دژ بـە دەوڵەتـە ئیسلامی وعەرەبییـەکان بـوون وبەشــداری زنجیرەیـەك هاوپـەیمانی سـەربازی ئـەورووپی‌یان کـرد دوای جەنگی جیهانی دوهەم.
ئەوجەنگـەی کـە گەلـە عـەرەبی و ئیسلامیەکان و هەنـدێ لـە حکومەتـەکان ڕەتیـان کردەوە . تورکیا لەو دەوڵەتە یەکەمانە بوو کە دانی نا بە بەرپابوونی قەوارەیەکی سیاسی ئیسرائیلی لـە فەلەستین لەساڵی ١٩٤٨دا ، کـە وای لـە گەلـە عـەرەبی یـە ئیسلامیەکان کرد بو کوێرانە بچن بـە دوای حکومەتـە نەتەوەییەکەیانـدا لـە دوای نەمانی ئەودەوڵەتە عوسمانییەی کە بە گژ هەموو کەسێکدا ئەچوو ئەگـەر نیازی ئەوەی بکردایـە بستێك لـە خاکی موسـوڵمانان داگیر بکات . لاسایی کردنـەوەی لێکۆڵینـەوەکانی قوتابخانـەی مێـژووی عـەرەبی بـۆ متیـۆدی ڕۆژئـاوایی یـەکان پاڵنەرێکی گرنگە بۆ ئەو ئاڕاستەیەی هێرش بکرێتە سەرخیلافەتی عوسمـانی،بە تایبەت دوای ئەوەی کە گۆشەنگیای مێژوو نوسە ئەورووپیـەکان ومێـژوو نووسـە عەرەبـەکان لـە یـەك خاڵدایـەکیان گـرت ئـەویش شـێواندنی خیلافـەتی ئیـسلامی عوسمانی یە"
بـە ڕاسـتی زۆرێـك لـە مێـژوو نووسـە عەرەبییـەکان کەوتنـە ژێـر کاریگـەری شارسـتانیەتی مـاددی ئـەوروپی بۆیـە هـەموو شـتێکی پرشـنگداریان لـە مێژووی وولاتەکەیانـدا دەدایـە پـاڵ سـەرەتای کاریگـەربوونیان بـەو شارسـتانییەتەی کـە تـەواو دوور بـوو لەمەنهـەجی خـوایی. سـەرەتای مێژووەتازەکەشـیان بە گەشتنی

هێرشی فەرەنسی بۆ میسرو شام و دارماندنی دیواری جیاکاری نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا دیاری دەکەن کە بە دوایئەمەدا دەوڵەتی نەتەوەیی لەسەردەمی محمد علی لەمیسردا ، دروست بوو هاوڕێ لەگەڵ ئەمەشدا دەستیان دایە مەحکووم کردنی دەوڵەتە عوسمانی ئەو دەوڵەتەی کە بەرگری ئەکرد لەبیرو باوەڕی گەلە ئیسلامیەکان و ئایین و ئیسلامەکەیان لەو هێرشە دڕندانەی کە ئەوروپای مەسیحی پێی هەڵئەستا .

هێزی ئەوروپی ئاڕاستەی ڕاپەڕینەکانی دژ بە خیلافەتی ئیسلامی گرتە خۆ و هەستا بە پاڵپشتی کردنی مێژوو نووس و بیریارەکانی میسر وشام تاڕەگ وڕیشە بدەنە چوارچێوەی ناسیو نالیزمی وئەو ئاڕاستەیە قوڵ بکەنەوە وەك ( بوستانی و یازەجی و جۆرج زەیدان و ئەدیب ئیسحاق و سەلیم نەقاش و فەرەج ئەنتوان و شبلی شەیمل و سەلامە موسی وهنری کوربیل و مەلیل شفارتز و ......هی تریش ) ئەوەی تێبینی دەکرێت کە زۆربەی ئەوانە مەسیحی و جولەکەن . هەروەك تێبینی ئەوە ئەکرێت کە ئەگەر هەموویان نەبێت ، ئەوازۆرینەیان ئەوانەن کە سەر بە ئەو بزوتنەوە ماسۆنیەتەن کە لە سەردەمی محمد علی یەوە لە ڕۆژهەڵاتدا پەرەی سەندبوو و لە گەڵ پێشڕەوی ناپلیۆن لە هێرشە فەرەنسی یەکەیدا تۆوی یەکەمی ئەم بزووتنەوەیە داکرا .

لەڕاستی دا دوژمنانی ئوممەتی ئیسلامی دیتیان پاڵپشتی ئاراستەی نەتەوەیی و ڕاوەستان لەگەڵ بانگخوازانی ئەو ئاراستەیەدا بەسە بۆ لاواز کردنی ئوممەتی ئیسلامی و زاڵبوون بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا .

کۆڕە ماسۆنییەکانیش توانییان کە دەست بگرن بەسەر هۆش و عەقڵی سەرکردە کانی ئاراستەی نەتەوەیی نێو گەلە ئیسلامیەکان دا . ئەو سەرکردانەش ئەوەندەی ملکەچی ئاراستەی کۆڕە ماسۆنیەکان بوون ئەوەندە خواستی گەلەکانیان نەبوون ، بەتایبەت هەڵوێستیان لەڕووی ئاینی ئیسلامدا ، کە وێنەی چوارچێوەیەکی ڕاست و دروستی شارستانی و ڕۆشنبیری و زانست و زانیاری

موسـولْمانانی دەنواند ، بەشـێوەیەکی گـشتیش ئـەو مەنهەجـە لاڕێبـووە لـە لای مێژوو نووسە عەرەبەکانیش لەدوای سەرهەڵدان و کودە تای سەربازی میسری لە سـاڵی ١٩٥٢ ز دا ، بـەبیٚ گۆڕانگـاری مایـەوەو چەسـپا ، حکومـەتی سـەربازی لـە میسرداو لەسەرەتای دەست بەکاربوونیەوەو، زۆربـەی حکومەتـە سـەربازییەکانی تـریش دایانـە پاڵیبۆ پشتیوانی کردنـی ڕەوتـی ناسیو نـالیزمی ، هـەروەك چۆن زۆربــەی ئــەو حکومەتانــە جــەختیان کــردە ســەر چــەند بنەمایــەك ، لەهــەموو بوارەکاندا کە زیاتر بنەماگـەلێکی عـەلمانی بـوون ، لەوانـەش بـواری ڕۆشـنبیری و فیکری ، جا خیلافەتی عوسمانی و حوکمی عوسمانییـەکان بۆ گـەلانی ئیسلامی و عــەرەبی وەك:شــەڕ فرۆشــی و داگیرکــەری ســەیر دەکــرد ، بەمــەش هــەموو هۆکارەکـانی دواکـەوتوویی و لاوازی ودۆگمـایی و ئـەو شـڵەژانەیان دایـە پاڵ کـە جیهانی عەرەبی و ئیسلامی پێوەی دووچاربووبوون. بزوتنـەوە جودا خوازەکـان ویـاخی بووەکانیـان کـە لـە سـەردەمی عوسمانیـدا سـەریان هەڵـدا کەزۆربـەیان ، تـەماعی شەخـسی یـان بەپاڵپـشتی هێـزە دەرەکیـە کـان کـە دوژمـنی خیلافـەتی عوسمــانی بــوون ئــەجولێنران ئەمانــەیان نــاو ئەنابزاڤــەکانی ســەربەخۆیی کــە سرووشتێکی ناسیوناليزميان هـەبوو ، وەك : بزوتنـەوەی عـەلی بـەگی گـەورە لـە میسر و قەرمانلی یەکان لە لیبیا و زاهر العمر لە فەلەستین و حوسەینی یەکان لە تونس و موعنییەکان و شەهابی یـەکان لـە لوبنـان و ......هتـد . ئەمـەش بۆ ئـەوە بـوو ڕەگ وڕیشە بدەنـە ئـەو ئاڕاسـتە ناسـیو ناليزمـەی کە کە خستبوویانە نـاو خـەڵکی نـەك هـەر ئەمـە، بـەڵکو بانگەشـەی ئەوەشـیان دەکـرد کـە محمـد علـی سەرکردەیەکی ناسیو نالستە هـەوڵی یەکخستنی جیهانی عـەرەبی داوە بۆ بـەش شکستی خواردووە چونکە خۆی عەرەب نەبووە".

ئەمانە ئەوەیان لەبیر نی یە کە محمد علی خاوەن تـەماعی شەخصی بووەو هـەر ئەمـەش وایلێکـرد پەیوەسـت ببێت بـەو سیاسـەتە داگیر کەرانـەی کـە پاڵپـشتی بوونی ئەوەیان دەکرد و ئەوانیش ئامانجە شەڕەنگێزییەکانی خۆیانیان پـیٚ جیٚ

بەجێ ئەکرد وەك:لێدانی دەوڵەتی سەلەفی سعودیەو لاواز کردنی خیلافەتی عوسمانی و پشتیوانی کردن لە کۆڕەماسۆنیەکان بۆلێدانی هێزە ئیسلامیەکانی ناوچەکەوئامادەکردنی بۆ داگیرکەری مەسیحی ڕۆژئاوایی کینە لە دڵ .

بەڕاستی کۆڕەکانی جولەکەی ماسۆنی هاوپەیمانی یان بەست لەگەڵ هێزە داگیرکەرە ڕۆژئاوایی و ئەو هێزە ناوچەیی یە ئیشکەرانەدا کە لە پێناو تەماعەکانیاندا خۆیان بەخت دەکرد ، بەمە هەموو لەپێناو کاولکردنی هێزی ئیسلامی و دەستبەسەردا گرتنی سەربەستیەکانی گەلانی ئیسلامی و تالآنکردنی خێرو بەروبوومەکەیان و دانانی فەرمانڕەواییەکی دیکتاتۆرانەی پاڵپشت کراو بە چەکی نوێی ڕۆژئاواییدا بوونەیەك هەروەك چۆن محمد علی نیشانی دا .

هەندێ لە مێژوو نووسە سەلەفییەکانی ڕۆژهەلآتی عەرەبیش لەو هێرشەدا بەشدارن کە ئەکرێتە سەر ماوەی حوکمڕانی عوسمانییەکان وئەوەش پاڵی پێوە نان بۆ ئەم کارە ئەو کۆمەڵەهەڵوێستە.دوژمنکارانەی خیلافەتی عوسمانیدا کە بەرانبەر بانگەوازی سەلەفییەت هەیبووە لە زۆربەی قۆناغەکانی دەسەلآتیدا ،کە ئەویش دەرئەنجامی پیلانێکی پیلانێکی دەوڵەتە ئیمپریالیزمە ڕۆژئاوایی یەکان بووپاڵی ئەنا بە سوڵتانە عوسمانییە کانەوە بۆ ئەوەی هەڵبگرژێن بەو هێزە ئیسلامییەی لە نجد دا درووست بوو کە بە دڵی سەلەفییەت دا ئەنرا،ئەم پیلانە بۆ ئەوەش بووکە خیلافەتی عوسمانی بەرەو ئاڕاستەی سۆنیگەری ببات سەلەفییەکان ئەوەش ئەکەنە بیانووکە هەندێ دیاردە کە کەلەبەر زۆر لایەنی شەریعەتی ئیسلامی دا دروست دەکات لەناو خیلافەتی عوسمانی دا هەبووە ،زیاد لەمەش دەوڵەتی خیلافەت لە کمۆتا ساڵەکانی دەسەلآت داری دا بانگخوازانی نەتەوە پەرستەکانی تورك دەستیان گرت بەسەر دەوڵەتەکەداو بەتەواوەتی لە میتۆدی ئیسلامی دووریان خستەوە کە لەوەو پێش دەوڵەتی

عوسمانی بەو میتیۆدەوە گەردنگیر بووەو موسڵمانانی بۆ ئەو مەبەستە هانداوەو پشتیوانی لێکردووەو لە گەڵیدا وەستاوە...

مێژوو نووسە مارکسی یەکانیش شەڕێکیان بەرپا کرد کە هیچ سۆز و نەرمی و نەوازشێکی لە ڕووی دەوڵەتی عوسمانیدا نەبوو بەوەی ماوەی فەرمانڕەوایی یەکەیان بە بناغەی سەرکردایەتی گرتنە دەستی ئەو ڕێبازە دەرەبەگایەتییە ناوزەد دەکرد کە بەسەر مێژووی سەردەمە ناوەڕاستەکانی پێشوودا زاڵ بووبوو . عوسمانیەکان هیچ گەشەسەندنێکیان لەئامێر یان هێزەکانی بەرهەمهێناندا نەهێنایە دی ، مێژووی نوێش بە دەرکەوتنی چینی بۆرجوازی دەست پێدەکات . پاشان سەرمایەداری دێت کە بەشدار بوو لە هێنانەدی گۆڕانکاری لە بوارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی سەرەتای سەدەی ١٩ دا . بۆ ئەمەش لەگەڵ مێژوو نووسە خاوەن ئاراستە لیبرالی و تێڕوانینە نەتەوەییەکاندا یەك دەگرن .

هەندێك لەمێژوو نووس و بیریارە مەسیحی و جولەکەکان ، هەستان بە ڕەواج دان بە هەردوو دوو ئاراستەیی ڕۆژئاوایی و مارکسی ، ئەمەش بە هۆی نوسینی کتێب و وەرگێڕانی نوسینەکانیان ، کۆڕە ماسۆنیەکانیش پشتگیری ئەمەیان دەکرد و هەوڵیان ئەدا لەهەموو ئەو بازنە ئیسلامیانەی بۆ یەکێتی ئیسلامی پێشنیار ئەکرێت خۆیان بەدوور بگرن وباری ڕەوتە ناسیونالیزمەکان بە هەردوو چەمکە ناوچەیی یان عەرەبی یەکەی بدەن بەسەر ئەو ڕێگە ئیسلامیەدا وەك پرۆژەی هیلال خەصیب لە شام یان پرۆژەی یەکبوونی دۆڵی نیل لە نێوان میسرو ئەمە جگە لەوەی ڕەواجێکی زۆریان دا بە ڕەوتی ناسیو نالیزمی بەر تەسکی وەك بانگەوازکردن بۆ فرعەونیەت لەمیسرو بۆئاشوریەت لە عیراق وبۆفینیقیەت لەشام و.......هتد .

لەمەڕ ئەو مێژوونووسە تورکانەش کە لەماوەی بانگەوازی نەتەوەیی تورکیدا دەرکەوتن هێرشێکی زۆر ئەکەنە سەر ماوەی خیلافەتی عوسمانی ئیتر ئایا لە بەر ڕێکردەیی ئەو ئاراستە سیاسی و فیکرییە بێت ، کە پێشەنگی وڵاتەکەیانی

دەکرد لەگەڵ ئەو ماوە پێشینەی کە هەموولایەنەکانی لاوازی و داڕمانی لە خۆ گرتبوو یاخود ، لە بەرکاریگەر بوونی تورکەکان بێت بەو هەڵوێستە نەنگانەی کە دەسەڵاتی خیلافەت لە دوای ئابڵوقەدانی سوڵتان عبدالحمید لەساڵی ۱۹۰۹دا دەستی پێ کرد و بوو بەشێوەی ، پاش ئەوەی لەچەند شەڕێکی جۆراوجۆردا لە دوای چوونەنێو جەنگی جیهانی یەکەمەوە شکستی خوارد و بەدوای یەکدا زۆرێك لەزەویەکانی لە دەست دا ، لەگەڵ خۆ بەدەستەوەدانی لە دانانی پەیماننامەی سیڤەری ساڵی ۱۹۱۸ دا کە لە ڕاستی دا شکستێ بوو بۆ پیاوانی ئیتیحادو تەرەقی و ئەنجامێك بوو بۆ سیاسەتی ئەوان.

لە کاتێکدا بزوتنەوەی نەتەوایەتی بەسەرکردایەتی مستەفا کەمال توانی تورکیا لەو سەرشۆڕیە ڕزگار بکات ، و زۆرێك لە زەویەکانی تورکیا بگێڕێتەوە ، یۆنان و ئەو هێزەش کە یونان داڵدەی دەدات ناچار بکات بۆ هاتنەناو بوارو لایەنی کاریگەربوونی بیریارە تورکەکان بەهەڵوێستی هەندێ لەو عەرەبانەی کە لەماوەی جەنگی جیهانی یەکەمدا داڵدەی هاوپەیمانە ڕۆژئاواییەکانیان دەدا ، دژ بە دەوڵەتی خیلافەت لەگەڵ ڕاگەیاندنی شۆڕش کردن بەسەر ئەو دەوڵەتەدا لەساڵی ۱۹۱٦ ز دا ، بەهۆی جیاوازی هۆکارەکانەوە زۆرێك لە مێژوو نووسەکان دووچاری سەرلێ شێوان و تەزویر کردنی مێژووی خیلافەتی ئیسلامی عوسمانی بوون ، ئەو مێژوو نووسانەی کە کاریان دەکرد لەسەر شێواندنی دەوڵەتی عوسمانی پشتیان دەبەست بە تەزویر کردنی ڕاستیەکان و درۆو قسە هەڵواسین و گومانسازی و داوو تەڵەنانەوە کە تێیدا مۆرکی ڕاستی کوێر بوویەوەو پاڵنەرە لاڕێبوەکان بەدوور لە بابەتی ( وضوعی ) بوونی ئەو باسە زاڵ بوون بەسەر ئەو کتێب وخوێندنانەدا . ئەمەش بوو بەهۆی دەرکەوتنی کاردانەوەیەکی ئیسلامی بۆ بەرپەرچ دانەوەیی ئەو تۆمەت و گومانانەی کە ئاراستەی دەوڵەتی عوسمانی کرانەوە . لەگرنگترین و دیارترینیشیان ئەو نوسینە پەرش و بڵاوانە بوون کە دکتور عبد العزیز لە سێ بەگی گەورەدا پێی

هەستا لەژێر ناونیشانی ( الدولة العثمانية دولة مفترى عليها لەگەڵ ئەو هەوڵەی کە داویەتی وبە پاڵنەرێکی ئیسلامیانەش وپاپەند بوون بە باتەنیانەش لە زۆربەی نووسینەکەیداکەچی دکتۆر نەیتوانی وە باسی هەموو لایەنەکانی دەوڵەتی عوسمانی چارەسەر بکات وچەند تێبینی لەسەر نووسینەکەی هەیە وەك قسەکردن لەسەر ڕاستی ودروستی –ئینکشاریەکان–کە بەڕاستی لەبەردەم لێکۆڵینەوەی پاکی زانستی دا خۆی ناگرێت.

یەکێکی ترلەو هەوڵانەی شایانی سوپاسکردنە لەم مەیدانەدا ئەو هەوڵەیە کە لێکۆڵەری گەورەو مامۆستای ناسراوی تایبەتمەند لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی دا ، "محمد حەرب"" پێی هەستاوەچەند کتێبێکی بەنرخی بۆ ئوممەتی ئیسلام نووسیوە، وەك : (العثمانيون في التأريخ والحضارة ) و ( السلطان محمد الفاتح ، فاتح القسطنطينية وقاهر الروم ) و (السلطان عبدالحميد آخر السلاطين العثمانيين الكبار )[1]

لەکارە بەنرخەکانی ترکە دەربارەی مێژووی دەوڵەتی عوسمانی نوسراوە ئەوەیە کە" موفق الدين المدحة" لە نامەیەکی زانستیدا پێی هەستاوە بۆبەدەست هێنانی‌نمرەی ماستەر لە ژێرناونیشانی (صحوة الرجل المريض أو السلطان عبدالحميد أو الخلافة الإسلامية ) ئەم کتێبە توانی زۆرێك لە ڕاستییە پشت بەستوەکانی بەبەڵگەنامەو بەڵگە مۆرکراوەکان ڕوون بکاتەوە جگە لەوەش چەند نوسەرێکی تری هاوچەرخ هەبوون ، بەلاّم لێرەدا چەند لایەنێکی مێژووی خیلافەتی عوسمانی و ئیسلامی سەردەمی نوێمان هەیە کە پێویستی بە پێدا چوونەوە هەیە لە دیدێکی ئیسلامیەوە بەبەشداری کردن لە دەرخستنی ڕاستیەکان و ساڕێژکردنی ئەو درزو شکاویانەی کە لە ئەنجامی ڕێکخستنەوەی مێژوومان‌دا

[1] ئەم کتێبە وەرگێڕراوەتە سەر کوردی و نوسینگەی تەفسیر لە ژمارە (٢) ی زنجیرەی پیاوە ناودارەکانی ئیسلامدا بلاّوی کردوەتەوە . وەرگێڕ: ن .

دەرکەوت لە تێڕوانینێکی نەتەوەیی عەلمانیەوە کە بەپلەی یەکەم خزمەتی دوژمنانی کرد وەك هۆکارێك لە هۆکارەکان لە توانەوەو نەمانی گەلە ئیسلامیەکاندا بەکاریان هێنا .

پێویستە لەسەرمان کاتێ مێژووی نوێ دەنوسینەوە ڕۆڵی کۆڕەکانی ماسۆنیەت و نەخشەو پلانە ڕۆژئاواییەکان لە داڕشتن و ڕێکخستنەوەی پیسی مێژوودا ڕوون بکەینەوە و بەدەربخەین .

ئەو داڕشتنەوەی کە هەندێ بەکرێگیراوی جولەکەو نەصاراکان پێی هەستاوون ولافی متیۆدی لیبڕاڵی وعەلمانیش لێی دەدەن.لە کاتێکدا کارەکەیان ئەوەیە ڕۆڵی بەر چاو بدەنە ئەو کەسە ماسۆنیاتنەی کە لە مەیدانی مێژوودا هەبوون ووایان بناسێنی کە ڕۆڵی گرنگیان هەبوو لەناو ماسۆنیەت داو پشتیوانیان لەڕاپەڕینە ئازادیخوازەکان کردووە.

لە ڕاستی دا مێژووی ئیسلامی کۆن و نوێ زانستێکە هەموو هێزە دوژمنەکان بە ئیسلام قەرەوڵیان لێ گرتووە چونکە بە کەشکۆڵی • عەقیدەو • بیروباوەڕو • میتۆدی پەروەردەی ئەزانن بۆدروستکردنەوەو داڕشتنەوەی ناسنامەی ئیسلامی هەموو گەلان.

ئەمەش هەوڵێکی ملکە چانەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی عوسمانی بەشێوەیەکی گشتی ، گرنگیش دەدات بە ڕۆڵی خیلافەتی عوسمانی لەباکوری ئەفریقی دا ، ئەم لێکۆڵینەوەیە خۆی دەکێشێت بۆ ئەو ڕەگ و ڕیشە کۆنانەی کە دەوڵەتی عوسمانی لەسەری هەستاوەو دامەزراوە ، تائەو کاتەی کە خیلافەت لەسەر دەستی بەکرێ گیراوی ئینگلیزی و کینە لەدڵی گەورە مستەفا کەمال کەوت و شکستی خوارد ، لەلایەنەکانی ئەم لێکۆڵینەوە دا لێکۆڵەر ڕووبەڕووی هۆکارەکانی هێزو تواناو لاواز بوونی عوسمانیەکان و سیفەتی کەس و سوڵتانە بەهێزەکان و گرنگی دانیان بە زانایان و جێ بەجێ کردنی شەرعی خواو جیهادی

گەورەیان بۆ بلاو کردنەوەی ئیسلام و بەرگری دژ بە هێرشی خاچ پەرستەکان کە هێشتا کۆتایی پیێ نەهاتووە دەبێتەوە .
نووسەر لەکاتی خستنەڕووی ڕووداوەکاندا پابەندە بە مەنهەجی ئەهلی سوننەوە وهەوڵ ئەدات گەردنگیر بێت بە دادپەروەری وئینسافەوە لەکاتی بڕیاردان لەسەر ڕووداوەکان ، بەهیوای ئەوەی بەشداربێت لە ڕاست کردنەوەی زۆرێك لەو بڕیارو چەمکە هەلاّنەی کە توشی دەولەتی ئیسلامی عوسمانی بووبوون .
خواش لەپشت ئامانجەوەیە، هەرئەویش ڕیێ نیشاندەرە بۆ ڕێگای ڕاست .

## بەشی یەکەم

## ڕەگ و ڕیشەو ڕەچەڵەکی تورکەکان

### باسی یەکەم : (ڕەچەڵەك و نشینگەی تورکەکان )

لە ناوچەی ئەودیو ڕووبار ، ئەوەی کە ئەمڕۆ بە تورکستان ناوی دەبەین و لەبانی مەنغۆلیاو باکوری چین لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ دەریای خەزەر ( دەریای قەزوین ) لە ڕۆژئاواوە و لەدەشتایی سیبریا لە باکورەوە بۆ نیمچە دورگەی هیندی و فارس لە باشوورەوە ، خێڵەکانی غەز[1] و تیرە گەورەکانی لە وناچەیەدا نیشتەجێ بوون کە بە تورك یان تورکەکان ناسراون[2] .

پاشان ئەو هۆزانەی لەنیوەی دووەمی سەدەی شەشەمی زایینییەوە لەچەند کۆچێکی گەورەدا کەوتنە خۆگواستنەوە لەنشینگەی سەرەکیانەوە بەرەو ئاسیای بچوك . مێژوونوسان بڕێك لەو هۆکارانەیان باس کردووە کە بەشدار بوون لە هۆی کۆچکردنیاندا . هەندێك وادەبینن کە ئەو کۆچە بەهۆی هۆکارە ئابورییەکانەوەبووبێت ، جا وشکی و بێ پیتی توند و بەهێز وزۆر بوونی وەچەو نەوە وایکرد کە ئەو هۆزانە لەناوچەکەی خۆیاندا شوێنیان تەسك بێت ، بۆیە کەوتنە کۆچ کردن بۆ گەڕان بەدوای لەوەڕگاو پاوەن و ژیانی خۆشگوزەرانیدا[3] . هەندێکیش ئەو کۆچانە دەگێڕنەوە بۆ هۆکارە سیاسیەکان ، کاتێك ئەو هۆزانە کەوتنە بەر چەندین فشاری گەورەی هۆزەکانی تر کەژمارەو توانایان لەوان زیاتر بوو ، کە مەغۆلیەکان بوون ، بەمە ناچاریان کردن بە کۆچکردن تاکوو بگەڕێن بە

---

[1] تأريخ الترك في آسيا الوسطى –بارتولد / ١٠٦

[2] أخبار الأمراء والملوك السلجوقية / ٢٠٤ .

[3] قيام الدولة العثمانية / ٨ .

دوای نـشینگەیەکی تـردا و زەویـەکانیان بـەجیٚ بهـیٚڵن [1] بـۆ گـەڕان بـەدوای بەخششی ئارامش و سەقامگیری .
دکتور عبداللطیف عبدالله ی کوڕی دهیش[2] بۆ ئەم رایە دەچیٚت .
ئەو هۆزە کۆچەریانە ناچار بوون کە بەرەو ڕۆژئاوا ئاڕاستە وەربگرن و لەنزیك کەنارەکانی ڕووباری جەیحوندا دابەزن . پاشـان هەنـدیٚ کـات لـە تەبەرسـتان و جورجان سەقامگیر دەبوون [3] .
بۆیـە نزیکـی ئـەو زەوی یـە ئیـسلامیانە بوونەوەکـە موسـوڵمانان لـە دوای شـەڕی نەهاوەند و کەوتنی دەوڵەتی ساسانی لە وولاتـی فارس لـە سـاڵی ٢١ ك ، ٦٤١ ز دا فەتحیان کرد . [4]
پەیوەنـدیان بـەجیهانی ئیـسلامیەوە :لەسـاڵی ٢٢ ك ، ٦٤٢ ز . دا سـوپا ئیسلامیەکان بەرەو وولاتی پاپ کەوتنـەڕیٚ بۆ ڕزگار کردنـی ئـەو ناوچـەیە . ئـەو زەویانەش تورکەکانی تیٚدا نیشتەجیٚ بوون .
لیٚرەدا سەرکردەی سوپای ئیسلامی عبدالرحمان کوڕی ڕەبیعە گەشت بە شـەهر برازی پاشای تورك ، جاداوای ڕیٚککەوتنی لە عبدالرحمان کرد و ئامادەیی خـۆی دەربڕی بۆ بەشداری کردن لەسوپای ئیسلامیدا بۆ جەنگان دژ بە ئەرمەن .
عبـدالرحمانیش نـاردی بـۆ لای سـەرکردە سـوراقەی کـوڕی عـەمر ، شـەهر بـراز هەستا بە دانیشتن لەگەڵ سوراقە دا وبەشـدارییەکەی لیٚ قـەبووڵ کردونامەیـەکیان نووسـی بۆ خـەلیفە عومەری کوڕی خـەتاب ° ر.ض٩لـەم ڕیٚکەوتنـە ئاگاداریـان کـردو ئـەویش ڕەزامەنـدی لەسـەر ئـەم کـارە داوپـاش ئـەم ڕەزامەندییـە ئاشـتینامەکە

---

[1] كتاب السلوك –أحمد المقريزي : ١ /٣ .
[2] قيام الدولة العثمانية / ٨ .
[3] الكامل في التأريخ : ٨/ ٢٢.
[4] شوقي أبو خليل : نهاوند / ٥٥–٧٠ .

بەستراو، بەمە هیچ جەنگێك لە نێوان تورك و موسوڵمانەكاندا ڕووی نەدا . بەڵكو هەموو چوون بۆ ڕزگار كردنی ووڵاتی ئەرمەن و بڵاو كردنەوەی ئیسلام تێیدا [١].
سوپا ئیسلامیەكان پێشڕەوییان كرد بۆ ڕزگار كردنی ووڵاتەكانی باكوری ڕۆژهەڵاتی ووڵاتی فارس تاكوو بانگەوازی خوای تێدا بڵاو ببێتەوە لەدوای ڕووخانی ئەو دەوڵەتە فارسەی كە لەبەردەم سوپا ئیسلامیەكانی ئەو ووڵاتەدا وەك بەربەستێكی گەورە ڕادەوەستان . بەنەمانی ئەو ڕێگریانەو لەئەنجامی ڕزگاری خوازیە ئیسلامیەكاندا دەرگای پاپ لەبەردەم جموجوڵەكانی گەلەكانی ئەو ووڵات و هەرێمانەدا كراوەبوو ، لەوانەش توركەكان .
ئیدی پەیوەندی كردن بە گەلە ئیسلامیەكانەوە هاتە دی و توركەكان ئیسلامیان گرتەخۆ و هاتنە ڕیزی موجاهیدەكانەوە بۆ بڵاو كردنەوەی ئیسلام و سەرخستنی ووشەی الله [٢].
لەسەردەمی خەلیفەی ڕاشید ، عوسمانی كوڕی عەففاندا ، ووڵاتی تەبەرستانیش ڕزگار كرا ، پاشان موسوڵمانان لەساڵی ٣١ ك .دا بەڕووباری جەیحوندا تێپەڕبوون و دابەزینە نێو ووڵاتی ئەو دیو ڕووبار .ئیتر زۆرێك لە توركەكان هاتنە ناو ئیسلام و بوونە پشتیوانی و بەشدار بوون لە جیهاد كردن بۆ بڵاو كردنەوەی بانگەوازی خوا لەنێو جیهانیاندا [٣].
بەردەوام سوپاكانی ئیسلام لەوهەرێمانەدا بەرەو پێشەوە دەچوون تالەسەردەمی موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیاندا ، ووڵاتی بوخارا ڕزگار كرا . ئەو سوپاسەركەوتووانەهێندە ڕۆچوون تاكوو گەشتنە سەمەرقەند .

---

[1] تأريخ الأمم والملوك –محمد بن جرير الطبري : ٣/ ٢٥٦-٢٥٧ .

[2] الدولة العثمانية والشرق العربي : محمد انيس / ١٢-١٣ .

[3] فتوح البلدان –البلاذري / ٤٠٥-٤٠٩ .

سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامی هێندە دەرکەوت تاووڵاتی ئەودیو ڕووبار هەمووی کەوتە ژێر دادپەروەری دەسەڵاتی ئیسلامییەوە . ئەو گەلانەش لەشارستانیەتێکی قوڵی ئیسلامیدا ژیان [١].

ژمارەی تورکەکان لە کوشکی خیلافەت و سەرکردە عەباسییەکاندا زیادی کرد . دەستیان کرد بە گرتنەدەستی پایە سەرکردەیی و بەڕێوەبەریەکانی دەوڵەت . ئەمانە سەربازو سەرکردەو نوسەریان تێدابووەو خۆیان بە ئارامی و لەسەرخۆیی و گوێڕایەڵی یەوە پابەند کرد تاکوو گەشتنە بەرزترین پلەکان .

کاتێك موعتەسیمی عەباسی خەلیفایەتی گرتە دەست ، دەرگاکان لەبەردەم گوزەری تورکیدا کرانەوەو پلە سەرکردەییەکانی دەوڵەتیان درایە پاڵ ، بەوەش بەشداری یان دەکرد لە گۆڕینی کاروباری دەوڵەتدا . سیاسەتی موعتەسیم ئامانجی بنبڕکردنی گوزەری فارسی بوو کە دەستی ڕەهای هەبوو لەبەڕێوەبردنی دەوڵەتی عەباسی لەسەردەمی خەلیفە مەئموندا [٢].

گرنگیدانی موعتەسیم بە ڕەگەزی تورکی بووە هۆی بارێکی ڕق و تورەیی توند لە نێو خەڵك و سەربازاندا ، بەمە موعتەسیم ترسا لەتۆڵەی خەڵك لە دژی ،بۆیە شارێکی نوێی بونیاد نا کە سامەڕا بوو نزیکەی ١٢٥ کم لەبەغداوە دوورە ، خۆی و سەربازو پشتیوانەکانی تیایدا نیشتەجێ بوون .

بەم جۆرە تورکەکان هەر لەمێژەوە دەستیان کرد بە دەرکەوتن لە سەر شانۆی مێژووی ئیسلامی لە بوارە گرنگەکاندا ، تاکوو دەوڵەتێکی ئیسلامی گەورەیان دامەزراند بەهۆی پەیوەستی بەهێزیان بەخەلیفەکانی دەوڵەتی عەباسییەوە کە بەدەوڵەتی سەلجوقی ناسرابوو[٣] . *[١]

---

[1] خراسان –محمود شاکر / ٢٠-٣٥ .

[2] قيام الدولة العثمانية / ١٢ .

[3] هەمان سەرچاوە / ١٢ .

## باسی دووەم
## هەستانی دەوڵەتی سەلجوقی

دەرکـەوتنی سـەلجوقیەکان لەسـەر شـانۆی ڕووداوەکـان لـە ڕۆژهـەڵاتی عـەرەبی ئیسلامیدا ، کاریگەری یەکی گەورەی هەبوو لە گۆڕینی بارودوخە سیاسیەکانی ئەو ناوچـەیە کـە خیلافـەتی عەبباسـی سوننی لا لایەکـەوەو خیلافـەتی شـیعەی فاتیمی لە لایەنی دووەمەوە ناکۆکیان هەبوولە سەری . .

سەلجوقیەکان دەوڵەتێکی تورکیی گەورەیان بنیاد نا کە لەسەدەی ٥ ی کۆچی لە ١١ی زاینیدا دەرکەوت و تاکوو خوراسـان و ئەو دیـو ڕووبارو ئێـران و عێـراق و وولاتـی شـام و ئاسـیای بـچوك لـە خـۆ بگرێـت . سەرکردایەتیشیان لـە ئێـران و پاشان لە عێراق لە بەغداد پێگەی دەسـەڵاتی سـەلجوقیەکان بـوو ، هاوکات چەند دەوڵەتۆکەیەکی سەلجوقی لە خوراسان و ئەودیو ڕووبارلە کرمـان و وولاتـی شـام —سەلجوقیەکانی شام —و ئاسیای بچوك —سەلجوقیەکانی ڕۆم —دا پەیدابوون کـە پاشکۆو شوێنکەوتەی سوڵتانی سەلجوقی بوون لەئێران و عێراق دا .

سەلجوقیەکان پاش ئەوەی نزیکی دارمان بوونەوە لەنێوەندی دەسـەڵاتی بوەیهی شیعە لە عێراق و ئێران و دەڵاتی عەبیدی فاتیمی لەمیسر و شـامدا ، دایانـە پاڵ خیلافـەتی عەبباسـی لـە بەغـدادو مەزهـەبی سـوننی خۆیـان سەرخـست . سەلجوقیەکان بە تەواوی زاڵ بوون بەسەر دەسەڵاتی بوەیهیدا و ڕێگایان گرت لـە خیلافەتی عەبیدی فاتیمی [٢] .

---

[*1] ئێستا سـەرقاڵی وەرگێڕانـی کتـێبی ( تـأريخ دولـة آل سلجوق ) ین کـە عمـاد الـدینی ئەسـفەهانی کـە لـە ٥٩٢ ك دا کۆچـی دوایـی کـردوە ، نوسـیویەتی و سەرچاوەیەکی ڕەسـەنە بەنزیکـەی ٧٠سـاڵ دوای سـەلجوقیەکان نوسـیویەتی . وەرگێڕ:ن.

[2] السلاطين في المشرق العربي / ١٧١ .

توغرول بەگ سەركردەی سەلجوقیەكان توانی كە دەوڵەتی بوەیهی لە ساڵی ٤٤٧ ك لـە بەغـداد دا شكـست پـیٚ بهێنێـت و بیخـات . هـەوەها زالٚ بێـت بەسـەر ئاژاوەگێڕی و گێرەشێوێنی دا . ئەو جنێـو دان بـە٠صـحابە٩شـكە بـە دەرگـای مزگەوتەكانـدا داكوترابـوو ، هـەمووی لابـردن ونـەیهێڵاْن و ئـەبو عبـدالله ی جەللابیشی كوشت كە شێخی ڕافیزەكان بوو لەبەر ئەوەی زۆر ڕۆچووبوو لە ڕەفز كردندا [1].

بەڕاسـتی دەسـەلاْتی بـوەیهی شـیعی پێـشتر زاڵبـوو بەسـەر بەغـداد و خەلیفـەی عەبباسیدا . دوای ئەوەی سەلجوقیەكان دەوڵەتی بـوەیهی یـان لـە بەغداد لابرد و تـوغرول بـەگی سـوڵتانیان چـووە نێـو پایتـەختی خیلافـەتی عەبباسـی یـەوە . خەلیفەی عەبباسی ( القائم بأمر الله ) پێشوازییەكی گەورەی لێكرد و بەرگێكی پایەداری بەبەرداكردو لەكەژاوەی خۆیدا داینیشاند و هەندیٚ نازناوی گەورەی بەسەردا بڕی، لە وانە نازناوی سوڵتان روكنەدین توغرول بـەگی لێنا . هـەوەك خەلیفەی عەبباسی فەرمانی دەكرد كە ناوی سوڵتان توغرول بـەگ لـە سەر دراو هـەڵبكۆڵرێت و ناوی لـەوتاری لەمزگەوتـەكانی بەغـداد دا بهێنرێـت و.... هتـد ، ئەمەش لەپایەی سەلجوقیەكانی زیاد كرد . لەوكاتەوە ئیتر سەلجوقیەكان شوێنی بوەیهیـەكانیان گرتـە دەسـت لـە زاڵبـوون بەسـەر كاروبـاری عـیراق و بـەكارهێنانی خەلیفەی عەبباسیش بەپێی خواستی خۆیان [2].

توغرول بەگ خاوەن كەسایەتی بەهێز بووبیرێكی تیژ وئازایـەتی یـەكی زۆر بـوو . هەروەها كەسێكی دیندار و خاوەن نـەوازش٠ وەرع٩ و دادپـەروەری بـوو . لـە بـەر ئەمـەش بـوو كـە پـشتگیری و پـشتیوانییەكی گـەورەی لـە لایـەن گەلەكەیـەوە

---

[1] أيعيد التأريخ نفسه —محمد عبده / ٦٧ .

[2] قيام الدولة العثمانية / ١٩ .

بەدەست هێنا و سوپایەکی بەهێزی ئامادە کرد و هەوڵی یەکخستنی سەلجوقی یە تورکەکانی دا لەنێو دەوڵەتێکی بەهێزدا [1].

بەهۆی بەهێزی پەیوەندییەکانی نێوان خەلیفەی عەبباسی قائم بأمر الله و توغرول بەگی سەرکردەی دەوڵەتی سەلجوقییەوە ، خەلیفە کچێکی جفری بەگی براگەورەی توغرول بەگی خواست . ئەمەش لە ساڵی ٤٤٨ك ، ١٠٥٩ز دا بوو . پاشان لە شەعبانی ساڵی ٤٥٤ك ، ١٠٦٣ز دا ، توغرول بەگ کچێکی خەلیفەی عەبباسی قائم بأمر الله ی خواست . بەڵام توغرول بەگ لەدوای ئەمەوە زۆر نەژیا و لەشەوی هەینی ٨ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٤٥٤ك ، ١٠٦٢ز دا کۆچی دوایی کرد کە لەوکاتەدا تەمەنی ٧٠ساڵ بوو . دوای ئەوەی لەسەر دەستی ئەودا سەلجوقیەکان لەناوچەکانی خۆراسان و ئێران و باکوری ڕۆژهەڵاتی عێراق دا زاڵ بوون [2].

یەکەم : سوڵتان محمدی ناسراو بە ( ئەلب ئەرسەلان ) واتە: (شێری دلێر ) :

ئەلب ئەرسەلان لە دوای مردنی توغرول بەگ ،جڵەوی دەسەڵاتی لە وڵاتدا گرتە دەست ، چەند ناکۆکی یەك لە وڵاتدا لەسەر گرتنە دەستی دەسەڵات ڕوویدا ، بەڵام ئەلب ئەرسەلان توانی کە زاڵ بێت بەسەریاندا . ئەلب ئەرسەلان وەك توغرول بەگی مامی سەرکردەیەکی لێهاتووی هەڵمەت بەر بوو ، سیاسەتێکی تایبەتی گرتەبەر کە پشتی دەبەست بە جێگیر کردنی پایەکانی حوکمەکەی لە وڵاتا نەدا کە ملکەچ بوون بۆ دەسەڵاتی سەلجوقیەکان پێش ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە هەرێمی تازەتر بخاتە >ێر دەسەڵاتی خۆیەوەو بیداتە پاڵ دەوڵەتەکەی . هەروەك شەیدای جیهادی ڕێگەی خواو بڵاو کردنەوەی بانگەوازی ئیسلام بوو ، لەناوئەو دەوڵەتی مەسیحی دراوسێیدا ، وەك وڵاتی ئەرمەن و ڕۆم . ڕۆحی

---

[1] هەمان سەرچاوەی پێشوو / ١٧ .

[2] تأريخ الدولة العلية العثمانية / ٢٥ .

جیهادی ئیسلامی بزوێنەری ئەو بزوتنەوە ڕزگاریخوازانە بوو کە ئەلب ئەرسەلان پێـی هەسـتاو مـۆرکێکی ئـایینی بەدەسـت خـست کـە بـووە سـەرکردەی سەلجوقیەکان وەك سەرکردەیەکی جیهادی . سوریش بوو لەسەر سەرخستنی ئیسلام و بەرزکردنـەوەی لـە و وولاتانـەدا و بـلاو کردنـەوەی ئـالای ئیسلام و شـەکاندنەوەی بەسـەر ناوچـەیەکی زۆری زەوییـەکانی دەوڵـەتی بیزەنتـی دا [١].

ماوەی ٧ساڵ مایەوەو بەشەکانی دەوڵەتە پەرش و بلاوەکەی بەسەر ناوچەکاندا بەسەرئەکردەوە و پێش ئەوەی هیچ جۆرە فراوانخوازییەکی دەرەکی تر بکات .

کـاتێکیش دڵنیـا بـوو لەسـەقامگیری و ئاسـایش و خۆسـازدانی حـوکمی سەلجوقیەکان لەهەموو هەرێم و وولاتە ژێر دەستەکانیدا ، نەخشەیەکی دانا بۆ هێنانەدی ئامانجە دوورەکانی کە بریتی بوو لە ئازاد کردنی وولاتە مەسیحی یە کانی دراوسێی دەوڵەتەکەی و خستنی دەوڵـەتی فاتیمی ( عەبیدی ) لەمیسر ویەکخـستنی جیهـانی ئیـسلامی لـەژێر ئـالای خیلافـەتی عەبباسـی سـوننی و دەسەلاتی سەلجوقیەکاندا . بەمە سوپایەکی گەورەی ئامادە کردو بەرەو وولاتی ئەرمەن و جۆرجیا کەوتە ڕێ و ڕزگاری کردن و بەستنیەوە بە مەملەکەتەکەیەوە . هەوەك کاری ئە کرد بۆ بلاو کردنەوەی ئیسلام لەوناوچانەدا [٢].

ئەلب ئەرسەلان پەلاماری باکوری شام داو دەوڵـەتی ( مرداسیە ) ی لەحەلـەب دا خستە >ێر ئابلۆقەوەو ئەو دەوڵەمەنەی کە کە صالحی کوڕی مرداسـی بە پێـی مەزهـەبی شـیعە لەسـاڵی {٤١٤ك- ١٠٢٣ز} دا دایمەزرانـد ، پاشـان ئەمیرەکـەی ئەوێی کە محمودی کوڕی صاڵحی مرداسی بوو ناچار کرد بانگەشە بۆ خەلیفەی

[1] قیام الدولة العثمانیة / ٢٠ .

[2] قیام الدولة العثمانیة / ٢٠ .

عەبباسـی بکاتلـە جێگـەی خەلیفـەی فـاتیمی (عەبیـدی) لەسـاڵی {٤٦٢ك – ١٠٧٠ز} دا [1].

پاشـان ئەتنسنر کوڕی ئوقی سـەرکردەی تـورکی خـوارزمی نـارد بـە هێزێکـەوە بۆپەلامارداني باشوری شام و ڕەملە و بەیتولمەقدیسی لەدەستی فاتیمیەکان ( عەبیدیەکان) سەندەوە ، بەڵام نـەیتوانی دەست بگرێت بەسـەر عەسـەقەلان دا کـە بـەدەرگای چـوونەناو میسر دادەنـرا . بەمـەش سـەلجوقیەکان نزیـك بوونـەوە لـە سـەربازگەی خەلیفـەی عەبباسـی . سـوڵتانی سـەلجوقیش لـەناوخۆی بەیتولمەقدیسدا [2]. لەساڵی ٤٦٢ك دا نێردراوی گـەورەی مەککـە محمـدی کـوڕی ئەبو هاشم هاتـە لای سـوڵتان و هـەواڵی وتـاردان بـۆ خەلیفـە سـەردەم و سـوڵتانی پێدا لەگەڵ لابردنی وتاردان بۆ گەورەی میسر ( عەبیدی ) و لابردنـی ( حيّ علـى خير العمل ) لە بانگدا . سـوڵتانیش {٣٠}سـی هـەزار دیناری پێـداو و پێـی ووت ئەگـەر ئـەمیری "مەدینـە"ش وەك ئـەو بکـات ئـەوە{٢٠}بیـست هـەزاردیناری پـێ دەبەخشین [3].

لە ڕاستی دا جەنگە ئازادیخوازەکانی* ئەلب ئەرسەلان ، "دومانۆس دیوجنسی" ئیمبراتۆری ڕۆمی تووڕەکرد ، بۆیە کەوتـە هـەوڵی بونیـاد نـانی بزوتنەوەیـەکی دژ بـۆ پارێزگـاری کـردن لەئیمبراتۆریەتەکـەی ،چـەند جارێـك کەوتنـە نـاو شەڕوپێکدادان لەگەڵ هێزەکانی سەلجوقیەکاندا . گرنگترینیان شەڕی ( ملازگرد) بوو لەساڵی ٤٦٣ك هاوکاتی ئوغسطسي ساڵی ١٠٧٠ز *٢.

"إبن کثير" دەڵێت : ( لەوسـاڵەدا ئەرمانوسـی پاشـای ڕۆم بـە خـۆی وهێزێکـی بێـشومارەوە کـەوەك شـاخ ئەیانوانـد لـە وێنـەیی میللـەتانی ڕۆم و ڕەخ و فـەرەنج

---

1 السلاطين في المشرق العربي / ٢٥ .

2 مرآة الزمان —ابن الجوزي / ١٦١ .

3 ايعيد التأريخ نفسه —محمد عبده / ٦٨ .

پێکهاتبوون و ژمارەیەکی گەورە و چەندین کەرەسەی جەنگی لە گەڵدا بوو {٣٥}هەزار "باتریاك"ی لەگەڵدا بوو. هەر باتریاییێکیش {٢٠٠}دووسەدهەزار فەرەنجی لەگەڵدابوو ، لەو جەنگاوەرانەش کە لەقوستەنتینیە نیشتەجێ بوون {١٥}پانزەهەزار سواری هێنابوو. هەروەها {١٠٠}ڕۆژ جاریێ و {٤٠٠}عەرەبانەی پێبوو کە پێلاوو بزماریان هەڵگرتبوو . هەزار عەرەبانەی کە چەك و زین و عەرادەو مەنجەنیقیان پێبوو . یەکێك لەمەنجەنیقەکان {١٢٠٠}هەزاروودووسەد پیاوی پێ تایبەت کرابوو . نیازی تەواوی ئەم کابرایە{خواڕووی ڕەش بکات} ئەوەبوو کە ئیسلام و شوێنکەوتوانی هەموو لەناو بەرێت وهەموو وولاتی بەخشی بوویە بەتریاکەکانی تائەگەیشتە بەغداد . وەسیەتیشی کردبوو بۆ جێگرەکەی کە لەگەڵ خەلیفەدا باش بێت و پێی ووت : لەگەڵ ئەو پیاوەدا نەرم ونیان بە ، چونکە ئەو هاوڕێمانە ، جا ئەگەر پاشاکانی عیراق و خوراسانی کردە جێگەی متمانەی خۆی ، ئەوا یەك هەڵمەتیش ئەبەن بۆ شام وخەڵکی شام لەدەستی موسوڵمانان دەسەننەوە .

خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ لعمرك إنهم لفي سكرتهم يعمهون ﴾الحجر : ٧٢.

واتە :"بەگیانی تۆ ئەی پێغەمبەر بەدڵنیاییەوە بەردەوام سەرگەردان ئەبوون لەمەستییەکەیاندا"

سوڵتان ئەلب ئەرسەلان بە سوپاکەیەوە لە شوێنێکدا کە پێی دەوترێت زەهوە لە ڕۆژی چوار شەممە لە ٢٥ی زی القعدە دا بەرەنگاری بوویەوە . سوڵتان لەزۆری سەربازانی ڕۆم ترسی لێ نیشت . بەڵام شەرع زان "ابونصر محمدی کوڕی عبدالملیکی بوخاری" ئاماژەی پێ دا کە با ڕۆژی هەینی ودوای نیوەڕۆکەی دیاری بکرێت بۆ شەڕەکەئەو کاتەی خۆر لائەدات وتار خوێنەکان دووعا ئەکەن بۆموجاهیدەکان . کاتێك دوای نیوەڕۆی هەینی هات ، هەردوو دەستە ڕووبەڕووی یەکدی وەستانەوەو بەرانبەر یەك وەستان ، سوڵتان لەسەر ئەسپەکەی دابەزی و کڕنوشی برد بۆ خوا و دەموچاوی لەنێو خۆڵدا گەوزاند و

کەوتە پاڕانەوە لەخواو داوای سەرکەوتنی لێکرد ، خواش سەرکەوتنی خۆی داباراند بەسەر موسوڵمانانندا ملی کافرانی خستە بەر دەستیان وئەوانیش زۆرێکیان لێ کوشتن و "دومانوسی" پاشایان بەدەستی کۆیلەیەکی ڕۆمی بەدیلی گیرا ، جا کەلەبەردەمی ئەلب ئەرسەلاندا وەستانیان ، بەدەستی خۆی سێ قامچی لێدا و پێی ووت : ئەگەر من لەبەردەستی تۆدا دیل بوومایە تۆچیت دەکرد ؟ ووتی : هەموو ناپەسەندی یەك . ووتی : ئەی تێڕوانین و گومانت لەمەڕمن چی یە ؟ ووتی : یان بمکوژی و بمگەڕێنیت بە ووڵاتەکەتدا ، یان لێبوردنت هەبێت و"فیدیەم"لێ وەربگری و بمگێڕیتەوە . ئەویش ووتی : جگە لە لێبوردن و"فیدیە" *هیچ نیازێکی ترم نییە . بۆیە بە ١,٥ ملیونو نیوێك دینار ڕزگاری کرد . دومانوس لەبەردەستی ئەلب ئەرسەلانی پاشادا هەستایەوە ، ئەویش بڕێك ئاوی دەرخوارد دا . "دومانوسیش" زەویبەر پێیپاشای ماچ کردئەو زەوویەیشی ماچ کرد کە ڕووی لە خەلیفە بوو ، وەك ڕێزوو شکۆدارییەك شکۆداری بۆ پاشا ، پاشاش ١٠ هەزار دیناری بۆ تەرخان کرد بۆ ئەوەی خۆی پێ بخاتە ڕێ . دەستەیەکیش بەتریاکی لەگەڵدا بەرداوفەرسەخێکیش لەگەڵیاندا بۆ خواحافیزی، لەشار دوور کەوتەوەو سوپایەکیشی لەگەڵدا ناردبۆ ئەوەی تاکوو بیپارێزن تادەگاتە ووڵاتی خۆی . ئاڵایەکیشیان پێ بوو کەلەسەری نوسرلبوو ( لاإله إلا الله محمد رسول الله )[1].

بەڕاستی سەرکەوتنی ئەلب ئەرسەلان بەو سوپایەکی کە لە ١٥ هەزار جەنگاوەر تێنەدەپەڕی بەسەر سوپای ئیمبراتۆر دومانوس دا کە ٢٠٠هەزار دەبوون ، ڕووداوێکی گەورەو خاڵی وەرچەرخانی نێو مێژووی ئیسلامی بوو ، چونکە ڕێگەی خۆشکردبۆدەسەڵاتی لاوازکردنی گوزەری ڕۆمی لە زۆربەی هەرێمەکانی ئاسیای بچوکدا ، ئەوناوچانەی کە زۆر گرنگ بوون و پایەی ئیمپڕاریەتی

---

[1] البداية والنهاية –ابن كثير : ١٢/ ١٠٨ .

بیزەنتی بوون ، ئەمەش یارمەتی عوسمانیەکانی دا زاڵ ببن بەسەر دەوڵەتی بیزەنتی دا.

بەڕاستی ئەلب ئەرسەلان کەسێکی پیاوێکی چاك بوو، هۆکارە مەعنەوی و ماددیەکانی سەرکەوتنی بەکار دەخست و زانایانی لەخۆی نزیك دەکردەوەو ئامۆژگاریەکانیانی وەردەگرت . ئەو ئامۆژگاریەی زانای خواویست ئەبو نصر محمدی کوڕی عبدالملیکی بوخاری حەنەفی چەند جوان وشیرینە کە لەشەڕی مرازگرد دا بەسوڵتان ئەلب ئەرسەلانی ووت : ( تۆ لەسەر ئاینێك شەڕ دەکەیت کە خوا پەیمانی سەرکەوتنی داوە زاڵی ئەکات بەسەر هەموو ئاینەکاندا. خوازیارم کە خوای گەورە ئەم ڕزگارکردنەی بەناوی تۆوە نوسیبێت . جا ڕۆژی هەینی لەوکاتەی کە ووتاربێژەکان لەسەر مینبەرن دووعا بۆ موجاهیدەکان دەکەن ڕووبەڕوویان ببەرەوە) .

جا کەهەینی هات لە وکاتەدا نوێژی بۆ کردن و سوڵتان گریا و خەڵکیش بە گریانەکەی ئەوگریان و پاڕایەوە و خەڵکەکەش ئامینیان بۆ کرد . جا پێی ووتن : ئەوەی دەیەوێتلێرە بڕوات بابڕوات . لێرەدا سوڵتانێك نییە فرمان و ڕێگرییەك بکات . ئنجا شمشێرو تیروکەوانەکەی فڕێداو شمشێرەکەی هەڵگرت وکلکە ئەسپەکەی بەدەستی خۆی گرێدا . سوپاکەیشی وەك ئەویان کردو جلی سپی لەبەرکرد وبۆنی خۆشی دا لە خۆی و ووتی : ئەگەر کوژرام ئەمە کفنمە[1] .الله اکبر بەسەر ئەوجۆرەکەسانە دا سەرکەوتنی خوا دادەبارێت .

ئەو سوڵتانە لەسەر دەستی یەکێك لە یاخی بووەکان کوژرا کەناوی یوسفی خوارزمی بوو ، ئەمەش لەڕۆژی ١٠ی ڕەبیع الاولی ساڵی ٤٦٥ك ، ١٠٧٢ ز .

---

[1] تأريخ الإسلام –الذهبي –حوادث ووفيات / ٤٦٠-٤٧٠

*فیدیە وەرگرتن شتێکە لە بەرانبەر ئازادکردنی دیلێکدا وەك {دیل بە دیل} یان پارە یان هەر بەرانبەرێکە تر.وەرگێر

دابوو . لەشاری ( مرو) لەپاڵ گۆڕی باوکی دا نێژرا . ئنجا مەلیکشاهی کوڕی هاتە جێگەکەی [1].

شتێك لە ڕەوشتی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان :

ئەلب ئەرسەلان کەسێکی دڵ نەرم و نەرمونیان بوو لەگەڵ هەژاراندا . زۆر لە خوا دەپاڕایەوە بۆ بەردەوامی ئەو بەخششەی کە بەسەریدا ڕشتبووی . ڕۆژێکیان لە {مرو} داتیێ پەڕیو چاوی بە هەندێ هەژاری کەپوو لاڵ کەوت دەستی کرد بەگریان وداوای لەخوای گەورە کرد کە بەفەزڵی خۆی دەوڵەمەندی بکات .شتی زۆری دەبەخشی ، لەڕەمەزاندا ١٥ هەزار دیناری دەبەخشی ، لەدیوانەکەیدا ناوی خەڵکێکی زۆری هەژارانی هەموو هەرێمەکانی وولاتەکەی هەبوون ، بەردەوام خێرووبێری ئەڕشت بەسەریاندا . لەهەموو وولاتەکەیدا تاوان یان ماڵ داگیر کردن نەبوو ، قەناعەتی کردبوو کە خەڵکی ، سالانە دووجار باجی سەرەکی خۆیان بدەن بەدووجار بۆئەوەی سووك بێت لەسەریان وناڕەحەت نەبن [2].

هەندێ کەسی فیتنە شتێکیان دەربارەی{نظام الملك} یوەزیری بۆنوسی وتێیدا باسی موڵك وسامانەکانی ئەویان کردبووە لەکاتی دەسەلاتداریەکەیدا، ئەویش بانگی کرد و ووتی، کە ئەمەی ووتراوە ڕاستە دەی ڕەوشتت پوخت بکەرەوەو حاڵی خۆت چاك بکە ، ئەگەریش ئەمە درۆیە لەگوناهی ئەو کەسە خۆش بە .

سور بوون لەسەر پارێزگارکردنی ماڵ و سامانی هاوولاتیەکانی :

هەواڵی پێدرا کە یەکێك لە کۆیلەکانی وەرپێی لە هاوڕێکەی دزیوە ،ئەویش ئەو کۆیلەیەی لە خاچ دا ، بەمە هەموو کۆیلەکانی تر لەترسی توندی تۆڵەی ئەلب ئەرسەلان سلەمینەوە [3].

---

[1] قيام الدولة العثمانية / ٢١ .

[2] الكامل في التأريخ –ابن الأثير : ٢٥٢/٦ .

[3] البداية والنهاية –ابن كثير : ١٢/ ١١٤ .

زۆر جارمێژوو وئاکاری پاشاکان و یاساکانی شەریعەتی بۆ ئەخوێنرایەوە،کە لە ناو پاشاکانی سەردەمی خۆیدابە ژیان پاکی و چاکی ناوی دەرکردو زانیان پارێزگاری لە خۆی دەکات هەموو ملیان بۆ کەچ کردوودەستیان دایە گوێڕایەڵی کردنی ودوای ئەوەی کە مازەیەك نکوڵیان لیٚ دەکرد،وای لیٚ هات لە ئەو پەڕی {پشتڕووبارەوە}وتا ئەمپەڕی شام هەموولای ئامادە ئەبوون [1].

دووەم : "مەلیکشاه" و شکستیی لەیەکخستنی خیلافەت و دەسەڵات دا :

لەدوای ئەلب ئەرسەلان دەسەڵات کەوتە دەست ( مەلیکشاه ) ی کوڕی ئەلب ئەرسەلان . بەڵام قاوەردی کوڕی جغری مامی کە حوکمڕانی سەلجوقیەکانی کرمان بوو . بوویە نەیارو ڕێگری و خوازیاری دەسەڵات بوو . لەنزیك هەمەدان پێکدادان لەنێوانیاندا ڕوویدا کە تێیدا قاورد شکستی خوارد و کوژرا . بەمەش مەلیکشاه زاڵ بوو بەسەر دەوڵەتی سەلجوقی یەکانی کرماندا . وەلەساڵی ٤٦٥ك،١٠٧٣ز دا سوڵتان شاهی کوڕی ئەلب ئەرسەلانی بەفەرمانڕەوای ئەویٚ دەست نیشان کرد.

دەوڵەتی سەلجوقی لەسەردەمی سوڵتان مەلیکشاهدا فراوان بوو ، تاکوو گەشتنە ئەوپەڕی کشانی لە ئەفغانستان لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ئاسیای بچوك لە ڕۆژئاواوە ، وە وڵاتی شام لە باشوورەوە . ئەمەش لە دوای ئەوەی کە لەساڵی ٤٦٨ك ، ١٠٧٥ز دا دیمەشق لەسەردەستی سەرکردە توتسز شکستی هێناو بانگەواز بۆ خیلافەتی عەبباسی بەر قەرار بوو .

لەساڵی ٤٧٠ك ، ١٠٧٧ز دا ، مەلیکشاه ئەو ناوچانەی دایە پاڵ"تاج الدولە تتمشی" برای خۆی کە لەوڵاتی شامدا بەسەریاندا زاڵ بووبوو . ئەمەش لەپێناو درێژەدان بەو جەنگە ئازادیخوازانەی کە دواتر دەوڵەتی سەلجوقی یەکانی شامی دامەزراند . مەلیکشاه یەکێك لە نزیکەکانی خۆی وەك والی

---

[1] الكامل في التأريخ –ابن الأثير : ٦/ ٢٥٣ .

دەستنیشان کرد بەسەر ئاسیای بچوکەوە کەپێی ئەووترا سولەیمانی کوڕی قتلمشی کوڕی ئیسرائیل دەناسرا . هەروەها بۆ درێژەدان بە جەنگە ئازادیخوازانە لە ساڵی ٤٧٠ك ، ١٠٧٧ز دا ڕێگەی ڕۆمی گرتەبەر .
بەمەش دەوڵەتی سەلجوقیەکانی ڕۆمی دامەزراند [١] .
ئەم دەوڵەتە ٢٢٤ساڵ بەردەوام بوو ، تائەوەی ١٤کەس لە بنەماڵەی ئەبولفەوارس قتلمشی کوڕی ئیسرائیل بە دووی یەکدا هاتن ، کەیەکەمیان سولەیمانی کوڕی قتلمش بوو کە بە دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتە دادەنرێ [٢].کە لەساڵی ٤٧٧ك ، ١٠٨٤ز دا ئەنتاکیەی ئازاد کرد . هەروەك داودی کوڕی دەستی گرت بەسەر قونیەدا ، لەساڵی ٤٨٠ك ، ١٠٨٧ز ، تاکوو بیکاتە پایتەخت بۆ خۆی .
قونیە لەدەوڵەمەندترین و جوانترین شارە بیزەنتیەکان بوو لە ئاسیای بچوکدا . سەلجوقی یەکان لە شارێکی مەسیحی بیزەنتیەوە گواستیانەوە بۆ شارێکی سەلجوقی ئیسلامی . ئەو دەوڵەتەش لە ساڵی ٧٠٠ك، ١٣٠٠ز دا لەسەر دەستی مەغۆلەکان کەوت و لەناو چوو [٣] .
سەلجوقیەکانی ڕۆم سووربوون لەسەر بەتورك کرنی ئاسیای بچوك و بڵاوکردنەوەی ئیسلام تیایدا لەسەر مەزهەبی سوننی . هۆکارێکی گواستنەوەی ژیاری ئیسلامیش بوون بۆ ئەو هەرێمانە . هەروەها ئەو هێڵە بەرگریەیان شکاند کە بۆ پاراستنی مەسیحیەکانی ئەوروپا دژ بە ئیسلام لە ڕۆژهەڵاتدا دروست کرابوو [٤].

---

[1] السلاطين في المشرق العربي / ٢٨ .

[2] السلاطين في المشرق العربي / ٢٩ .

[3] السلاطين في المشرق العربي / ٢٩.

[4] السلاطين في المشرق العربي / ٢٩ .

لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە بەهێزەی سەردەمی مەلیکشاه یشدا ، بەڵام سەرکردە ئوتسز سەرکەوتوو نەبوو لە یەکخستنی وڵاتی میسرو شام ، لەدوای ئەوەی سەلجوقیەکان شێوەیەکی هەڕەشە ئامێزی کرداری‌یان لەڕووی دەوڵەتی عەبیدی فاتیمی‌دا نواند لەناوخۆی میسردا .

کاتێك ئوتسز ویستی لەگەڵ میسر جەنگ بکات ، لەسەردەستی هێزێکی عەرەبدا لە ڕەجەبی ٤٦٩ك ، ١٠٧٦ز لەپێش ئەوەی بەرەنگاری ئەو سوپا گەورەیە ببێتەوە کە وەزیر بدر الجمال ئامادەی کردبوو ،شکستی هێنا .

شکستی ئوتسز بووە هۆی زیاتر بوونی پشێوی و  ڕیزاڵ بوونی سیاسی و ململانێی خوێناوی تاکارەکە سەری کێشا بۆ کوشتنی ئوتسز لەساڵی ٥٧١ك ، ١٠٧٨ز دا .[1]

هەروەها مەلیکشاه نەیتوانی خیلافەتی عەبباسی بگۆڕێت بۆ خێزانی سەلجوقی لەکاتێکدا کە لەساڵی ٤٨٠ك ، ١٠٨٧ز دا کچەکەی شوی کرد بە خەلیفەی عەبباسی مقتدی بأمر الله و دواتر منداڵێکی بوو ، هەروەها کچەکەی تری شوی کرد بە مستظهر بالله ی عەبباسی . کەچی نەیتوانی خیلافەت و دەسەڵات لەنێونەوەکانی‌دا قۆرخ بکات[2] .

مردنی :

سوڵتان مەلیکشاه مردو ڕۆڵی تواناو شکۆداری لەساڵی ٤٤٧ –٤٨٥ ك ، ١٠٥٥–١٠٩٢ز دا کۆتایی پێ‌هات .

دەوڵەتی سەلجوقی بەسەردەمی سێ سوڵتانەکە دەناسرا ( توغرل بەگ ، ئەلب ئەرسەلان ، مەلیکشاه ) پاشان قۆناغی لاوازی و ململانێ دەستی پێ‌کرد .

---

1 مرآة الزمان –سبط ابن الجوزي / ١٢٨ .

2 السلاطين في المشرق العربي / ٣٠ .

لەسەردەمی ئەلب ئەرسەلان و مەلیکشاه دا نیزامولمولکی وەزیر ناوی دەرکەوت
کە گرنگە شارەزای ژیان ورۆڵی ببین لە بەهێزکردن دەوڵەتی سەلجوقیدا .

سێیەم : نیزامولمولك :

زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێت : ( وەزیری گەورە نیزامولمولك قوام الدين ، باوکی عەلی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاقی طوسي ،پیاوێکی ژیرو سیاسەتمەدارو پسپۆڕ و پایە بڵند و وابەستە بەدین وخاکی و بێ فیزبوو کۆڕەکانی بە قورئان خوێن و زانایان گەرم دەکرد.

نیزامولمولك خوێندنگەیەکی گەورەی لە بەغداد و یەکێکی تریشی لە نەیسابوور و یەکێکی تری لە "طوس" دروست کرد . ئارەزوومەندی زانست بوو و بەردەوام یارمەتی وهاوکاری ئەڕشت بەسەر زانتست خوازاندا فەرموودەی ئەنووسی یەوەو دەنگ وباسی دونیای گرتەوە [1].

قۆناغ بە قۆناغ گەورەتر دەبوو تاکوو بوو بە وەزیری سوڵتان ئەلب ئەرسەلان و پاشان مەلیکشاهی کوڕی . ئەوکات لەسەر چاکترین شێوەی شیاو ناوچەکانی ڕکخست و ستەمی کەم و سوك کردەوە و بەزەیی بە ژێردەستەکانی دا دەهاتەوەو وەقفێکی* زۆری دامەزراند وچەند پیاوی گەورەوناودار کۆچیان کرد بۆ لای [2].

نیزامولمولك پێشنیاری کرد بۆ مەلیکشاه دەدا ، بە دامەزراندنی ئەو سەرکردە و بەرپرسانەی کە ڕەوشت و دین و نەبەردیان تێدایە . شوێنەواری ئەو سیاسەتەش لە دواتر دەرکەوت . لەو سەرکردانەی کە هەڵی بژاردن ( ئاق سنقز )

---

[1] سير أعلام النبلاء –الذهبي : ١٩/ ٩٤ .

*"وەقف"و"ئەوقاف"بریتین لەو موڵك وسەروەتانەی کەبڕیار ئەدرێت خێرەکەی بۆ هەژاران یا زانستخوازان یا خەڵکی نەخۆش...هتد دابنرێتوتایبەت بکرێت {وەرگێڕ}

[2] سير أعلام النبلاء –الذهبي : ١٩/ ٩٥ .

باپیری "نورالدین محمود" بوو کەکردیە والی حەلەب و دیاربەکر و جزیرە . إبن کثیر لە بارەیەوە دەڵێت :( باشترین وچاکترینی پاشاکانە لەڕووی خووڕەوشت و دڵسۆزی و نیازپاکی یەوەبووە .[1] )

عمادالدین زەنگی کوڕی هەستا بە بەرپاکردنی جیهاد لە دژی خاچ پەرستان ، پاشان دوای ئەو نورەددین محمود پێی هەڵدەسا ، ئەو خێزانە بوو بناغەیان بۆ سەرکەوتنەکانی صلاح الدین و ظاهر بیبرس و قلاوون لە دژی خاچ پەرستەکان دانا . ئیدی سەردەمی یەکخستن ویەکبوون لە جیهانی ئیسلامیدا دەستی پێکرد[2] .

"ئاق سنقری برسقی"یەکێك بوو لەسەرکردەکانی سوڵتان مەحمودی سەلجوقی کە ئەمیری موسڵ بوو و سەرقاڵی جیهاد کردن بوو دژ بە خاچ پەرستەکان کە لەساڵی ٥١٠ ك دا (باتینی[3])یەکان کوشتیان لەکاتێکدا کە لە مزگەوتی گەورەی موسڵ دا نوێژی دەکرد .

"إبن الأثیر" لە بارەیەوە دەڵێت : مەملوکێکی تورکی زۆر چالاك بوو ، ئەهلی زانست و پیاوچاکانی خۆش دەویست ، دادپەروەری بەدی دەکردو جێبەجێی دەکرد چاکترین کاربەدەست بووەنوێژەکانی لەکاتی خۆیان دائەکردلە شەویشدا شەو نوێژێکی زۆریدەکرد[4] ).

---

[1] البدایة والنهایة –إبن کثیر : ١٢/ ١٥٧.

[2] أیعید التأریخ نفسه / ٦٨ .

[3] باتینی یەکان : دەستەیەکی شیعە مەزهەب بوون لەمێژوودا هەوڵی کوشتنی کەسانی هەڵکەوتووی سوننەیان دەدا . وەرگێڕ"ن"لە ، کە لە {أیعید التأریخ نفسه} ی وەرگیراوە.

[4] الکامل في التأریخ : ١٠ / ٦٣٣ .

أبو شامەی مێژوو نووس لەبارەی شوێنەواری سەلجوقیەکانەوە بۆمان دەدوێت بەتایبەت لەسەردەمی نیزامولمولك دا دەڵێت : ( کاتێك سەلجوقیەکان بوونە دەسەلاتدار ، ئەوسام و شکۆیەی خیلافەتیان نویٚ کردەوە کە نەمابوو . بەتایبەت لەوەزارەتی نیزامولمولك دا ، چونکە ئەو ناموس و سام و شکۆی بۆ چاکترین بارودۆخەکانی خۆی گێڕایەوە [١] ) .

<u>ڕێکخستنی بۆ کاروبارەکانی دەوڵەت</u> : کاتێك مەلیکشاه کاروباری دەوڵەتی گرتە دەست ،کاروباری سەربازی بەرەڵلابوو ، سەربازان دەستیان خستە ناو ماڵ و سامانی خەڵکەوە و ووتیان: جگە لە نیزامولمولك هیچ کەس ڕێگری سوڵتان نی یە کە ماڵ و داراییمان پیٚ ببەخشێت ، خەڵکی بەرەو ڕووی ئازارێکی توند بوونەوە ، نیزامولمولکیش ئەوەی بۆ سوڵتان باس کردوئەوەی بۆڕوون کردنەوە کە ئەم کاترەیان لاوازی و نەمانی سام و شکۆو ترس وکاول بوونی شارەکان و نەمانی سیاسەتی بە دوادادێت . ئەویش پێی ووت :چی بەبەرژەوەندی دەزانیت لەوکارەدا بیکە .

نیزامولمولك پێی ووت : ناتوانم هیچ بکەم بەفەرمانی تۆ نەبێت . سوڵتان ووتی : هەموو کاروبارەکانم بەگەورەو بچوکەوە گێڕاوەتەوەبۆ تۆ ، جا تۆلە جێی باوکیت وسوێندیشی بۆ خوارد و زیاتر لەو بەشەی کە هەیبوو بۆی بڕیەوە پلەو پایەی‌زیاتری دایەوچەند نازناوێکیشی پیٚدا . لەڕیزی ئەوانەدا : "ئەتابەگ" بە واتای "باوکە ئەمیر"دێت ، ئەوەندە ڕێکی وپێکی ونەبەردی و ژیان چاکی بەدەرکەوت دڵی خەڵکانی زۆرخۆش کرد . بۆ نمونە: ژنێکی لاواز و بیٚهێز داوای فریاکەوتنی لیٚ کرد ، ئەویش لەگەڵیدا ڕاوەستا و پێکەوە قسەیان کرد . دەرگاوانەکەی ئافرەتەکەی دەرکرد ، ئەویش لۆمەو سەرزەنشتی کرد و ووتی :

---

[1] الروضتان في أخبار الدولتين : ١/ ٣١ ، کەلە کتێبی أيعيد التأريخ نفسه وەریگرتووە .

مـن تـۆم بۆخزمـەت كردنـی ئـەم جـۆرە كەسـانە دانـاوە، چـونكە كاربەدەسـت و بەرپرسان پێویستیان بە تۆنی یە . پاشـان دەرگاوانەكـەی لەسـەر ئەو كارە لابـرد [١].

<u>خۆشەویستنی نیزامولمولك بۆ زانست و ڕێزگرتنی لە زانایان و بێفیزی خۆی :</u>

نیزامولمولــك زانــستەكانی خــۆش دەویــست بەتایبــەت فــەرموودەكانی پێغەمبەر{صلى الله عليه وسلم} كە زۆر هۆگرو شەیدای بوو . دەیووت : من دەزانم كە ئەهلی گێڕانەوەی فەرموودە نیم ، بەڵام حـەز دەكـەم لـە شـەمەندەفەریكاروانی هـەڵگرانی فـەرموودەی پێغـەمبـەر (صـلى الله علیـه وسـلم )بم* . جـا لـە"قشیری"كـە {ئەبوموسـلیمی كـوڕی مهریزیـد}ەولـە ئـەبو حامیـدی ئەزهەبیـەوە فـەرموودەی وەردگرت و دەیبیست [٢].

هەروەهالەسەر ئەوە سوور بوو كە ئەو خوێندنگایانـەی بنیـادی نـابوون پێویستە پـەیامی خۆیـان ، بـەدی بهێـنین . جـا كاتێـك ئـەبو حەسـەن محمـدی كـوڕی عـەلی واستی شارەزا لە فیقهی شـافیعی داچـەند دێـڕە شـیعرێكی بـۆ ناردو هـانی دا بـۆ ئـەوەی بەپـەلـە ئەوفیتنـەو ئاژاوانـەی كـە لـەنێوان حەنبـەلی و ئەشـعەرییەكاندا ڕووی داوە چارەسەر بكات ، نیزامولمولك هەستاو ئەو ئاژاوەیەی نەهێڵا . ئەوەی كە ئەبو حەسەنی واستی لەشیعرەكەیدا پێی ووتبوو بریتی بوو لە :

| | |
|---|---|
| یانظام الملك قد حلّ | ببغداد النظام |
| وابنك القاطن فیها | مستهان مستضام |
| وبها أودى له قتلى | غلام وغلام |
| والذي منهم تبقى | سالما فیه السهام |

---

[1] بڕوانە:الكامل لابن الاثیر{٢/٢٥٦}

*بڕوانە الكامل فی التأریخ{٦/٢٧٦}.*

[2] بڕوانە {سیر اعلام النبلاء}ی الذهبي{١٩/٩٥}

| | |
|---|---|
| ياقوام الخطب وللحر | ب اتصال ودوام |
| فمتى لم تحسم الدّا | أياديك الحسام |
| ويكفّ القوم في | بغداد قتل وانتقام |
| فعلى مدرسة فيها | ومن فيها السلام |
| واعتصام بحريم | لك من بعد حرام |

**كۆڕەکانی ئەم پیاوە هەمیشە ئاوەدان بوو بە شەرعزان وزاناکان زۆربەی کاتەکانی ڕۆژی لەگەڵدا بەسەر دەبردن ، پێی ووترا : ئەوانە تۆیان لەزۆربەی بەرژەوەندیەکان سەرقاڵ کردووە . ئەویش ووتی : ئەوانە جوانی دونیاو دواڕۆژن . ئەگەر لەسەر سەریشم دایان بنێم وانازانم شتێکی زیادم کردبێت.**

**کاتێك ئەبوقاسمی قشیری و ئەبولمەعالی جوەینی بچوونایەتە لای ، لەبەریان هەڵدەستاو لەشوێنەکەی خۆیدا ولەگەڵ خۆیدا دایئەنیشاندن،خۆ ئەگەر{ئەبوعەلی فارەندی} بهاتایە ژوورەوەوئەو لەبەریهەڵدەستاولە جێگەکەی خۆی دایئەناو خۆی لەبەر دەمیدا دائەنیشت . جالەسەر ئەوە سەرزەنشت کرا . ئەویش ووتی :ئەو دوانە کاتێك دێنەلام دەڵێن : تۆئەمەو و تۆ ئەوەی وبەسەرمدا هەڵ دەدەن و بەگەورەم دەگرن و شتانێکم دەربارەی دەڵێن کە تیامدا نی یە ، بۆیە بەهۆی ئەوانەوە ئەوەی لە دەرونی مرۆڤێکدا هەیە لەلام زیاد دەکات . بەڵام کاتێك "ئەبوعەلی فارندی" دێتە لام هەڵەو ستەمەکانم باس دەکات ، بۆیە دەشکێم و لە زۆرێك لەو کارانەی کە تیایدام پەشیمان دەبمەوەوتۆبە دەکەم )[1] .**

**ابن الأثیر لەبارەیەوە دەڵێت : (بەڵام دەنگ وباسەکانی ئەوەیە کە پیاوێکی زاناو دینداروبەخشندە و دادپەروەر و لەسەرخۆ بووەو . زۆر لێبووردەبووە بەرامبەر**

---

[1] **البداية والنهاية –ابن كثير : ١٢/ ١٥٠ .**

بەتاوانباران . زۆرترین کات بێدەنگ بووە . کوڕەکانی بەقورئان خوێن وفیقه زان و ئیمامانی موسوڵمانان و ئەهلی چاکەو چاکە خوازی ئاوەدان بوو ) [1] .

پیاوێك بوو هەمووقورئانی لەبەر بوو لەتەمەنی یازدە ساڵی دا هەموو قورئانی خەتم کرد ، سەرقاڵبوو بەمەزهەبی شافیعی یەوە،هەرگیز بەبێ دەستنوێژ دانەدەنیشت ، ئەگەر دەستنوێژی بگرتایە ،ئەوادەبوو نوێژی سوننەتی بکردبا [2] .

وەئەگەر گوێی لەبانگدەر بوایە دەستی لەهەموو سەرقاڵی‌یەك هەڵدەگرت و لێی دوور دەکەوتەوە ، کە لە بانگیش دەبوویەوە ، هیچی نەدەکرد لەپێش نوێژدا .ئەگەر بانگدەر بێئاگابوایە و کاتی بانگ بهاتبایە ، ئەوا فەرمانی پێدەکرد بانگ بدات ، ئەوەش لووتکەی‌حاڵی ئەو کەسانەیە کە خۆیان یەك لا دەکەنەوە بۆ عیبادەت کردن وە کاتەکانیان ئەپارێزن وپاپەند ئەبن بەنوێژەکانەوە [3] وە ئەم پیاوەپەیوەندی‌یەکی بەهێزی لەگەڵ خوادا هەبوو .جارێکیان ووتی : شەوێك لەخەومدا شەیتانم دیت و پێم ووت : قوڕبەسەر ، خوادروستی کردیت وبە دەمی {بە شەفەهی} فەرمانی پێکردیت کڕنووش بەریت ، بەڵام تۆ نەتبرد ، من بە دەمیش فەرمانی پێ نەکردم بەکڕنووش بردن بۆی و کەچی لە ڕۆژێکدا چەندین جار کڕنوشی بۆ دەبەم . ئەم شیعرەشی بەم جۆرە هۆنیەوە :

من لم يكن للوصال أهلا فكل إحسانه ذنوب [4]

ئەوەی شایەنی دیدار نەبێت هەموو چاکەکانی تاوانن

خوازیاربوو مزگەوتێکی هەبێت کە تیایدا پەرستش بکات ، و ڕۆزی دابین کرابێت . لەم بارەیەوە دەیووت : من خوازیارم کە گوندێکی تایبەت بە خۆم هەبێت لەگەڵ

---

[1] الكامل في التأريخ –ابن الأثير : ٦/ ٣٣٧ .

[2] سير أعلام النبلاء –الذهبي : ١٩/ ٩٦ .

[3] الكامل في التأريخ –إبن الأثير : ٦/ ٣٣٧ .

[4] البداية والنهاية –إبن كثير : ١٢/ ١٥٠ .

مزگەوتێك كە تیایدا كەنار بگرم بۆ پەرستشی پەروەردگارم ، پاش ماوەیەك خوازیار بووم كە هەموو ڕۆژێك كولێرەیەكم هەبێت ، لەگەڵ مزگەوتێكدا پەرستشی خودای تێدا بكەم [1] .

یەكێك لە • بێنەفی یەكانی : ئەوەبووشەوێك نانی دەخوارد و لەپاڵیدا ئەبولقاسمی برای دانیشتبوو ، لەولاشەوە ڕاگری خوراسان ولەلای ڕاگریسشەوە مرۆڤێكی هەژاری دەست بڕاو هەبوو . نیزامولمولك سەیری كردو بینی كە ڕاگری خۆراسان لە كاتی‌نان خواردن دا خۆی بەدوور ئەگرێت لە كابرای دەست بڕاو نیزامولمولك فەرمانی پێ ئەكات بچێتە لایەكی تروكابرای دەست بڕاو لە خۆی نزیك بكاتەوەو نان لەگەڵ ئەودا ئەخوات خوو و نەریتی وابوو كە هەژاران ئامادەی خواردنی بكرێن و لەخۆی نزیكیان بكاتەوە و ئەیبردنە تەنیشتی خۆی [2] .

هەندێك لەشیعرەكانی بریتین لە :

| | |
|---|---|
| بعد الثمانين ليس قوة | قد ذهبت شهوة الصبوة |
| كأنني والعصا بكفّي | موسى ولكن بلا نبوة [3] |

( باس لەوەدەكات تەمەنی گەیشتووەتە هەشتا ساڵی وهێزی لاوییەتی نەماوەو وەك موسی گاچۆنێكی گرتووەبەدەستیەوە بەڵام بەبێ پێغەمبەرایەتی ) .

هەروەها ئەم شیعرەی دەدرێتە پاڵ :

| | |
|---|---|
| تقوّس بعد طول العمر ظهري | وداستني الليالي أي دوس |
| فأمسي والعصا تمشي أمامي | كأن قوامها وتر بقوس |

---

[1] الكامل في التأريخ –إبن الأثير : ٦/ ٣٣٨ .

[2] الكامل في التأريخ : ٦/ ٣٣٨ .

[3] تأريخ الإسلام حوادث ووفيات (٤٨١-٤٨٩) / ١٤٧ .

واته:پشتم وەك كەوان دوای تەمەنێكی زۆر چەماوەتەوەو شەویش خستومیەتە ژێـر پێـی خـۆی ووام لێهـاتووە گاچـۆن لەپێـشمەوە ئـەڕوات وەك ئەوەیـەتیرو كەوانەكـە یـەكیان ڕاگرتبـێ شـیعر زۆر كـاری تـێ دەكـرد ، كاتێـك ئـەبو عـەلی قومەسـانی لـە نەخۆشی‌یەكدا كـە توشـی بـوو سـەردانی كـرد ، ئـەم شـیعرەی بـۆ خوێندەوە :

| | |
|---|---|
| إذا مرضنا نوينا كل صالحة | فإن شفينا فمنا الزيغ والزلل |
| ترجو الإله إذا خفنا ونسخطه | أمنّا فما يزكو لنا عمل |

واتـە{كـە نـەخۆش ئەكـەوین نییـەتی هـەموو كـارێكی چـاك دێـنین وكـە چـاكیش بووینەوە چی خراپەو لادان هەیە لێمانەوە دەردەچێت،كە ترسێكیش ڕوومان تـێ دەكات ئومێد ئەدەینە خواو كە ئارام ئەبینەوە خودا عادز دەكەین

نیزامولمولكیش گریاو ووتی : وایە كە ووتت [1].

مردنی :لەساڵی ٤٨٥ك لە ڕۆژی پێنج شەممە ١٠ی مانگی ڕەمەزان و لـەكاتی بـەر بانگكردنـەوەدا ،نیزامولمولـك نوێـژی ئێـوارەی كـردو لەسـەرخوان دانیـشت و خـەڵكێكی زۆر لـە فیقهـزان و قورئـان خوێن و سۆفی و خـەڵكی هـەژاری لـە لابوو ، دەستی كردە باسكردنی بەنرخی ئەو شوێنەی كە لەزەویەكانی نەهاوەند دا لایان دا بۆی و هـەواڵی ئـەو شـەڕەی لـەنێوان فـارس و موسوڵمانەكاندا ئەگێڕایـەوە كە لەسەردەمی ئەمیری باوەڕداراندا• عومەری كوڕی خەتتاب٩ ( خـوالێی ڕازی بێـت ) ڕوویدابوو باسی ئەو كەسەناودارانەیدەكرد كە لەویٚ شـەهیدبوو بـوون ، پاشـان دەیـووت : خۆشـبەختی بـۆ ئـەو كەسـەی ئـەگات بـە خزمـەتی ئـەو كەسـانە .. لەبەربانگەكەی بوویەوە ، بەمەبەستی چوونەوە بۆناو خێزانەكەی هاتە دەروولەپڕ لاوێكی"دەیلەمی"ی هاتەڕێی . وەك ئەوەی پەنای بۆهێنابێت وداوای شتێكی لـێ بكات،لاوە دەیلەمییەكە هەڵزنی پێیداو دایە بەر{خەنجەر}وبرایـەوە بەرەو ماڵی

---

[1] طبقات الشافعية الكبرى –السبكي : ٤/ ٣٢٨ .

خۆی،ئەڵێن نیزامولمولوکیەکەمین کەسە کە بە دەستیئیسماعیلە باتینیەکان تیرۆر کرابێت . هەواڵەکە لەناو سوپادا بڵاو بوویەوە و دەنگەکان بەرزبوونەوە و سوڵتان مەلیك شاە کە هەواڵەکەی پێگەشت بە ڕوخسارێکی غەمبارانەوە هات وگریان وشینی لێ بەرز بوویەوەو کاتژمێرێك لای نیزامولمولك دانیشت و سەیر ئەکات گیان ئەدات ولای مایەو تا گیانی دەرچوو.

نیزامولمولك بەبەختەوەری ژیاو بەشەهیدی مردوهەموو کەس بیری دەکردەوەوسوپاسگوزاری بوو [1].

بکوژەکەی پێی هەڵکەوت لە پەتی خەیمەکەی وکاربەدەستەکانی نیزامولمولکیش پێی گەشتن و کوشتیان . هەندێك لە خزمەتگوزارەکانی دەڵێن کۆتاقسەی نیزامولمولك ئەوەبوو کەووتی بکوژەکەم مەکوژن ، چونکە من لێی خۆش بووم . پاشان شایەتومانی هێناو مرد [2]. کاتێك خەڵکی بەغداد هەواڵی کوژرانی نیزامولمولکیان پێگەشت ، بۆی دڵگران بوون و سێ ڕۆژ وەزیر و سەرکردەکان پرسەیان بۆ داناو شاعیرەکان بە قەسیدەکانیان شینیان بۆ گێڕا ، لەوانە موقاتیلی کوڕی عەتییە کە دەڵێت :

| | |
|---|---|
| كان الوزير نظام الملك لؤلؤة | يتيمة صاغها الرحمن من شرف |
| عزت فلم تعرف الأيام قيمتها | فردّها غيرة منه الى الصّدف [3] |

( باس لە سودبەخشی و بەنرخی نیزامولمولك و داڵدەیی خوا دەکات بۆی و بەزانینی نرخی لەلایەن کەسانێکەوە دەکات . )

ئیبن عەقیل دەڵێت:ژیانی نیزامولمولك لە ڕووی دەستگوشادی ودادپەروەریو بەخشەندەیی یەوە هەوڵدان بۆ زیندووکردنەوەی ڕێبازەکانی دینداری عەقڵەکان

---

[1] طبقات الشافعية الكبرى –السبكي : ٤/ ٣٢٢– ٣٢٣ .

[2] طبقات الشافعية الكبرى : ٣٢٣/٤ .

[3] البداية والنهاية –إبن كثير : ١٢/ ١٥١ .

سەرسام دەكات سەردەمی ئەو سەردەمی دەوڵەتی خەڵكی زانا بوو پاشان بە كوشتن ژیانی تەواو كرد لە كاتێك دا بۆ حەج دەڕۆشت لە مانگی ڕەمەزانیش دا بوو ئەم پیاوەش شاهاتنە لە دونیادا ژیاوشاهانەش لە ئاخیرەت دا ئەژی بەر ڕەحمەتی خوا بكەوێت [1] .

## باسی سێیەم

## كۆتایی دەوڵەتی سەلجوقی

سوڵتان مەلیكشاه لەكاتی مردنیدا چوار كوڕی هەبوون كە بریتی بوون لە : بركيارق ، محمد ، مسنجر ، محمود–كە دواتر بە ناصر الدين محمود ناسرا – ،ئەو كاتەمنداڵ بوو. بەڵام لەبەر ئەوەی توركان خاتونی دایكی لە ڕۆژانی مەلیكشا دا خاوەن پێگەیەكی گەورەو بەرز بوو بەیعەتی دەسەڵات دارێتیان پێ دا، فەرمانڕەوایییەكەی ماوەی دووساڵ بەردەوام بوو ، لە ٤٨٥ك ، ١٠٩٢ز ەوە بۆ ٤٨٧ك ، ١٠٩٤ز . كە لەوساڵەدا خۆی و دایكیشی مردن . پاشان لەدوای ئەو ڕوكنەدین ئەبوالموزەففەر بركيارقی كوڕی مەلیكشاه هات كە فەرمانڕەوايیەكەی تا ٤٩٨ك ، ١١٠٥ز خایاند . پاشان بەدوایدا مەلیكشاهی دووەم هات . لەهەمان ساڵدا غیاسەدین ئەبوشوجاع محمد دەسەڵاتی گرتەدەست و فەرمانڕەوایییەكەی تا ٥١١ك ، ١١٢٨ز بەردەوام بوو . ئەمە دوا فەرمانڕەوای دەوڵەتی گەورەی سەلجوقی بووكە دەسەڵاتیان لە وولاتانی لە ئەودیو ڕووبارەوە هەبوو،هەروەك بەسەر خوراسان و ئێران و عێراقیشدا دەستیان زاڵ بوو . دەوڵەتەكەشیان لە ساڵی ٥٢٢ك ، ١١٢٨ز دا لەسەر دەستیشاهانی خوارەزمی ڕوكایەوە.

بەكەوتنی دەوڵەتی گەورەی سەلجوقی لەودیو ڕووباردا ،شیرازەی سەلجوقیەكان تێكچوو و یەكبوونەكەیان توایەوەو هێزیان لاواز بوو بوونە چەند حیزب وتاقم و سەربازگەیەكی جیاواز، لەناو خۆیاندا لەسەر كورسی دەسەڵات ململانێیان

[1] سير أعلام النبلاء –الذهبي : ١٩/ ٩٦.

دەکرد . لە ژێر ڕۆشنایی ئەمەدا دەوڵەتی گەورەی سەلجوقی دابەش بوو بۆ چەند دەوڵەت و میر نشینی بچووك . ئەودەوڵەت و هەرێمانەش ملکەچی فەرمانڕەوایی تاکە سوڵتانێك نەبوون ، بەوجۆرەی کە لە سەردەمی هەریەك لەسوڵتان توغرول بەگی یەکەم و سوڵتان ئەلب ئەرسەلان و سوڵتان مەلیکشاه ە ئەوانی پێش ئەوانیشدا هەبوون . بەڵکو هەموو بەشێك لەبەشەکانی دەوڵەتی سەلجوقی لەژێر سەرکردایەتی یەکی جوداخوازدا سەربەخۆکاریان دەکرد ، کەهیچ هاوکارییەك شیاوی باسکردن بێت لەنێوانیاندا نەبوو[1] .

لە ئەنجامی ئەمەدا ، دەوڵەتی خوارزمی لە ئەودیو ڕووبارەوە سەری هەڵدا ئەو دەوڵەتەی ، کە ماوەیەکی باش لەبەرامبەر هێرشەکانی مەغۆل دا خۆی گرت ولەگەڵ ئەویشدا چەند هەرێم و میرنشینێکی سەلجوقی لەباکوری عێراق و شامدا پەیدا بوون کە بە"ئەتابەگی یەکان" ناسران . لەو ماوەیەدا دەسەڵاتی سەلجوقی یەکانی ڕۆم سەری هەڵدا کە لەڕووی هێرشە خاچ پەرستی‌یەکاندا ڕاوەستا و توانی لەقوڵی باکووری ڕۆژئاوای ئاسیای بچوکەوە گەمارۆی بدات . ئەم دەسەڵاتەی سەلجوقیەکانی ڕۆم شالاوە یەك لە دوای یەکەکانی مەغۆلی تێکی‌شکاندو لەناوی برد.

لەڕاستی دا چەند هۆکارێك بوونەهۆی کەوتنی دەسەڵاتی سەلجوقی کە ڕێگە یان خۆشکرد بۆ کەوتنی خیلافەتی عەبباسی .

لەوهۆکارانە :

١. ململانێی نێو بنەماڵەی سەلجوقی لەنێوان براو مام و کوڕ و کوڕەزاکانیدا .
٢. دەست تێوەردانی ئافرەتان لەکاروباری فەرمانڕەوایی دا .
٣. هەڵگیرساندنی ئاگری ئاژاوە و فیتنە لەنێوان کاربەدەست سەلجوقیەکاندا لەلایەن هەندێ لە میرو وەزیر و ئەتابەگەکانەوە .

[1] قیام الدولة العثمانیة / ٢٣.

٤. بێهێزی ئەو خەلیفە عەبباسی‌یانەی کە بەلاوازی لەبەرامبەر هێزە سەربازییە سەلجوقیەکاندا دەرکەوتبوون ، ئیدی سڵیان لەوە نەدەکردو دانیان ئەنا بەشەرعیەت و ڕەوا بوونی هەموو کەسێك کە لەسەر کورسی دەسەڵاتی سەلجوقی دابنیشێت وڕێگەیان ئەدا ووتار بۆ هەموو کەسێکی زاڵ وبەهێز بدرێ [1].

٥. دەسەو سانی دەوڵەتی سەلجوقی لەیەکخستنی ووڵاتەکانی شام و میسرو عێراق ، لەژێر ئاڵای خیلافەتی عەبباسی دا .

٦. ئەو دابەش بوونە ناوخۆی‌یەی نێوان سەلجوقی یەکان خۆشیان کەگەشتە ئاستی ڕوبەڕووبونەوەی سەربازی بەردەوام کە مەهێزی سەلجوقی یەکانی هەموو هەڵوەشاندکار گەیشتە ئەوەی دەسەڵاتەکەیان لەعێراق دا نشوستی هێنا .

٧. فێڵ و تەڵەکەی پیسی‌باتینی یەکان پیسەکان لەڕووی دەوڵەتی سەلجوقی دا ، ئەمەش لەهێرشی پاکتاو و هەوڵە بەردەوامەکانیان بۆ ( تیرۆر ) کردنی سوڵتان و سەرکردە و پێشەوا سەلجوقی‌یەکاندا خۆی دەبینێتەوە .

٨. هێرشی خاچ پەرستی لەودیو ڕووبارەکان وململانێی دەوڵەتی سەلجوقی لەگەڵ سوپا دڕندە شاڵاو بەرەکاندا کەلە ئەوروپاوەئەهاتن و چەند هۆکاری تریش . لەگەڵ ئەوەش دا سەلجوقی‌یەکان چەند کاری چاك و جوانیان هەبوو ، لەگرنگ ترینیان :

أ– نزیکەی دووسەدە ڕووخانی خیلافەتی عەباسی یان دواخست ، کەلەپێش هاتنی ئەماندا لەژێر سایەی بوەیهی‌یە شیعە ڕافیزیەکاندا ئەو دەوڵەتەخەریك بوو. بەرەو فەوتان وپوکانەوە دەچوو.

---

[1] السلاطين في المشرق العربي / ٥٠ .

ب- دەوڵەتی سەلجوقی ڕێگای لە دەوڵەتی عەبیدی لەمیسر گرت لە بەدیهێنانی ئەو ئامانجەدا کەمەبەستی بوو ڕۆژهەڵاتی عەرەبی ئیسلامی لەژێر ئالای عەبیدی باتینیڕافیزی داهەموو بکاتە یەك .

ج- ئەو هەولانەی کەدەوڵەتی سەلجوقی خستیە گەڕ ، ڕێخۆشکەر بوو بۆ یەکخستنی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی کە لەژێر دەستی صەلاحەددینی ئەیوبی و لەژێر ئالای خەلافەتی سوننی عەبباسیدا هاتە دی [1] .

د- سەلجوقیەکان ڕۆڵێکی دیاروبەرچاویان گێڕابوو لە زیندوو کردنەوەی ئەو ناوچانەی لەژێر دەسەلاتی خۆیان دا بوولەڕووی زانست وبەرێوە بردنەوە و ئاسایش و سەقامگیرییان تێدا بلاو کردەوە .

هـ-لەڕووی بزاوتنە خاچ پەرستییەکانی ئیمبراتۆرییەتی بیزەنتیدا ڕاوەستان و تائاستێکی زۆر بەربەستیان لەڕێگەی مەترسیەکانی مەغۆل دا دانا

و-شان و شکۆی مەزهەبی سوننی و زاناکانی ئەو مەزهەبەیان لەوناوچانەدا بەرز کردەوە [2] .

ئەمە پوختەیەکی کورتە لەمەڕ سەلجوقی یە سوننیەکانکان ، و ڕۆڵیان لەسەرخستنی ئیسلام دا . بەڕاستیش ئەوەستەم و درۆو بوختانە ئەگەر لەوکۆمەڵە دلێر و نەبەردانە ناوبنرێن خەڵکانی پەڕاکەندەوتاقمی بچووك بچووك، هەروەك مامۆستا نەجیب زەبیب لە کتێبی {الموسوعه العامه لتأريخ المغرب والاندلس} دا ئەم کارەی کردووە [3] .

## بەشی دووەم

## بەر قەرار بوونی دەوڵەتی عوسمانی و جەنگە ئازادیخوازەکان

---

[1] السلاطين في المشرق العربي / ٥١ .

[2] قيام الدولة العثمانية / ٢٤.

[3] الموسوعة العامة لتأريخ المغرب والأندلس : ٣/ ١٠ .

عوسمانی‌یەکان دەدرێنە پاڵ هۆزێکی تورك کە لەسەرەتای سەدەی ٧ی کۆچی بەرامبەر بە ١٣زاینی لە"کوردستان" دا دەژیان و پیشەی شوانی‌یان هەبوو .
لەئەنجامی شالاوی مەغۆل بەسەرکردایەتی جنگیزخان بۆ سەر عێراق و ناوچەکانی باکووری ئاسیای بچووك ،سلێمان کە باپیری عوسمان لەساڵی ٦١٧ك ، ١١٢٠ز لەکوردستانەوە لەگەڵ هۆزەکەی‌دا کۆچیدەکات بۆ وولاتی ئەنادۆڵ و لەشاری ( اخلاط) نیشتەجێ ئەبێت [1].
لەدوای مردنی خۆی لە ساڵی ٦٣٨ك ، ١٢٣٠ ز دا توغرولی کوڕە ناوەڕاستینەکەی شوێنی گرتەوە و درێژەی بە جموجوڵەکەی دا بەرەو باکوری ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ کە نزیکەی ١٠٠ خێزان و زیاتر لە {٤٠٠}چوار سەدسواری پێبوو [2]. کاتێك توغرولی باوکی عوسمان لەگەڵ ئەو خێڵەکەیدا کە لە ٢٠٠ خێزان تێنەدەپەڕی ، کە لە چەرمەسەری هێرشی مەغۆل ڕایکردبوولە دوورەوە دەنگی هەلاّو هەرایەکی دەبیست . وکە لێی نزیك بوویەوە سەیر دەکات شەڕێکی گەرمە لەنێوان موسوڵمانان ومەسیحیەکانداو.تای تەرازووی شەکەش بەلای بێزەنتی یەکان داقورسە ئەوو توغرولیش هیچی بۆ نەما ئەوە نەبێت بەهەموو حەماسەتێکودڵقاییمێکەوەکە هەیبوو هەڵمەتی‌برد بۆ فریاکەوتنی برا هاودین وهاوعەقیدەکانی وئەم بەشداری یەی ئەویش بۆیە هۆی سەرکەوتنی موسڵمانەکان بەسەر نەصاراکاندا [3].
دوای کۆتایی هاتنی شەڕ ، سەرکردەی سوپای ئیسلامی سەلجوقی ئەو هەڵوێستەی ئەو توغرولی بەرز نرخاندو لەسنوری ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ و لەسەر

---

[1] اخلاط شارێکی ڕۆژهەلاّتی تورکیای ئەمڕۆیە لەنزیك دەریاچەی وان لەئەرمینیا.

[2] قیام الدولة العثمانیة / ٢٦ .

[3] جوانب مضیئة في تأریخ العثمانیین / ٣٦،

سنوری ڕۆمەكان دا پارچەزەویەكی پیێ بەخشین [1] .بەمەش هەلی بەرفراوانیی‌یان لەسەر حسابی ڕۆمەكان بۆ ڕەخساو سەلجوقیەكانیش هاوپەیمانێكی بەهێزو هاوكاریان لە جیهادی دژ بەڕۆمەكاندادروست بوو.

لەنێوان ئەم دەوڵەتە تازە پێگەشتووەو سەلجوقیەكانی ڕۆمدا ، پەیوەندی‌یەكی گەرم و گوڕ پەیدا بوو لەئەنجامی بوونی دوژمنێكی هاوبەشی بە بیرو باوەڕو ئایینیان .

ئەو پەیوەندی‌یە بەدرێژایی ژیانی ئەو توغرول بەردەوام بوو ، تائەوەی لەساڵی ٦٩٩ ك ، ١٢٩٩ز [2] دا عوسمانی كوڕی لەدوای خۆی شوێنی فەرمانڕەوایی گرتەوە و لەفراوانخوازی نێو زەویەكانی ڕۆم دا لەسەر سیاسەتی پێشووی باوكی دەڕۆشت [3] .

باسی یەكەم : <u>عوسمانی دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی</u> :لەساڵی ٦٥٦ك ، ١٢٥٨ز دا ئورتوغرل عوسمانی كوڕی لەدایك دەبێت كەدەوڵەتی عوسمانی دەدرێتە پاڵ ئەم كوە [4] . ئەمەش ئەو ساڵە بوو كە تێیدا مەغۆل بەسەركردایەتی هۆلاكۆ شالاوی بردە سەر بەغدادی پایتەختی خیلافەتی عەبباسی و چەندان وورداوی دڵتەزێن ولێقەومانی گەورە وویان دا .

إبن كثير :دەڵێت : ( دایان بەسەر شارەكەدا و هەرچی پیاوو ئافرەت و منداڵ و پەككەوتەو هەرزەكاریان كەوتە بەردەست كوشتنیان و زۆرێك لەخەڵك چوونە ناو بیرو كایەن و جۆگە پیسەكانەوە ، بەوجۆرە چەندڕۆژێك خۆیان دائە شاردو

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٥٣ .

[2] تأريخ سلاطين آل عثمان / ١٠ .

[3] تأريخ الدولة العلية العثمانية / ١١٥ .

[4] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام عبد العزيز / ١٢.

دەرنەئەکەوتن ، کۆمەڵێك لەخەڵکانیش لەناو {خان}ەکاندا[1] کۆدەبوونەوەو دەرگاکانیان لەسەرخۆیان دادەخست ، تەتارەکانیشیان دەرگاکانیان دەشکاند یان ئاگریان تێ بەر ئەداو ئەیانکردنەوە ، پاشان دەچوونە ناوەوە ، هەیانبوو ڕایدەکردوو هەڵدەزنینە شوێنە بەرزەکان و ئەوانیش لەسەر بانەکان دا دەیانکوشتن وای لێ هات فاوی خوێن جۆگەلەی ئەبەست وبە کوچەکاندا دەڕۆشت ( إنا لله وإنا إليه راجعون ) بەو جۆرە لەمزگەوت وتەکیەو شوێنی کۆبونەوەکانیش دا خەڵکیان ئەکوشت و ، جگە لە ئەهلی زیممەی لەجوولەکەو نەصاراکان وئەوانەی کە پەنایان بۆ ئەوان بردبوو کەسی تر ڕزگار نەبوو لەدەستیان )[2] .

کارەساتەکان زیادیان کردو ڕووداوەکان تا ئەهات گەورە دەبوون و ئوممەتیش بەهۆی ئەو هەموو گوناه وتاوانەوەکە ئەکرا لاواز و ترسنوك بوو ، بۆیە مەغۆلەکان زاڵ بوون بەسەریانداو ناموسیان ئەتك کردن و خوێنیان ڕژاندن وماڵ و سامانیان تالاّن کردن وماڵەکانیان وێران کردن .

لەو هەل ومەرجە سەختەداو لەکاتی ئەو لاوازییەدا کە بە جەنگەکانی ئوممەتی ئیسلامیدابلاّو بووبویەوە، عوسمانی دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی لەدایك بوو لێرەدا مانایەکی جوان هەیە ئەویش ئەوەیە سەرەتای دەسەڵات وبەهێز بوونی ئوممەت لەوپەڕی خاڵی لاوازی و داڕماندا دەست پێ ئەکات ،کە ئەمەش سەرەتای سەرکەوتن بوو بەرەو عیززەت و دەسەڵات و سەرکەوتن . ئەوەش ویست دانایی و خواستی پەروەردگار بوو . خوا دەفەرموێت : ﴿إن فرعون علا في

---

[1] {خان}بەو شوێنانە ئەوترا کە غەریبەومیوان لە وێدا لایان ئەداوتێیدا ئەحەوانەوە،بەو شوێنانەش ئەوترێت کە {مەڕی}تێیدا ئەفرۆشرا.وەرگێڕ:ا سەیری {المنجد} ووشەی {خان}بکە.

[2] البداية والنهاية –إبن كثير الدمشقي :١٣/ ١٩٢-١٩٣ .

الأرض وجعل أهلها شيعا يستضعف طائفة منهم يذبح أبنائهم ويستحيي نسائهم إنة كان من المفسدين ﴾القصص : ٤ واته :فيرعەون لەسەر زەوی دا خۆی قیت کردەوەو دەستی دایە لەت وپەت کردنی خەڵکی سەر ئەم زەوی یە هەندێکی لێ لاواز ئەکردن وکوڕەکانی سەردەبڕین وژنەکانی دەهێڵانەوە،فیرعەون یەکێك بوو لە خەڵکە گەندەڵەکە.

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ ونريد أن نمنّ على الذين استضعفوا في الأرض ونجعلهم أئمة ونجعلهم الوارثين، ونمكن لهم في الأرض ﴾ القصص: ٥-٦ واتە :ئێمە ئەمانەوێت دەستی ڕێز بخەینە سەر ئەوانەی کە لاواز کراون لەسەر زەوی داوبیانکەینە پێشەواو سەردارو میراتی {ستەمکارانیان} پێ بدەین ودەسەلاتیان قایم بکەین لە زەوی دا.

گومانی تێدانی یە کە خوای گەورە دەتوانێت لە شەوو ڕۆژێکدا ، بەڵکوو لە چاوتروکاندنێکدا هێزو دەسەلات بداتە بەندەکانی وەك دەفەرموێت : ﴿ إنما قولنا لشيء إذا أردناه أن نقول له كن فيكون ﴾ النحل : ٤٠ واتە :قسەی ئێمە بەدڵنیاییەوە هەر ئەوەندەیە کە شتێکمان ویست پێی ئەڵێین :ببە،یەکسەر ئەبێت.

جا ئەهلی ڕاستی پەلە لە بەڵێنی دەستنیشانکراوی خواداناکەن کە ڕادەی سەرخستن وهێنانەدی دەسەلاتیان پێ ئەدات ، بۆیە دەبێت ڕەچاوی سوننەتە شەرعی و گەردوونی یەکان و خۆڕاگری لەسەر ئەم ئایینەی خوابکرێت﴿ ولو يشاء الله لانتصر منهم ولكن ليبلو بعضكم ببعض ﴾محمد : ٤ واتە :ئەگەر خوا بیەوێت تۆڵە لە کافران دەسەنێت.بەلام خوای گەورە ئەیەوێت هەندێکیان بەهەندێکی تریان تاقی بکاتەوە.

جائەگەر خوای گەورە شتێکی بوێت ، هۆکارەکانی بۆ ئامادە دەکات و هەنگاو بەهەنگاو دەیهێنێتە دی یان بەیەکجارئەیهێنێتە دی . چیرۆکی دەسەلاتی دەوڵەتی لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە عوسمانی سەرکردە بە دەردەکەوێت

که ساڵی ٦٠٦کۆچی له بەغداد خیلافەتی عەباسی نوشوستی ئەهێنێت ئەم لەو ساڵەدا له دایك ئەبێت.

یەکەم : گرنگترین سیفەته ڕابەرییەکانی له عوسمانی یەکەم دا :

کاتێك ڕادەمێنینه ژیانی عوسمانی یەکەم ، هەندێ سیفەتی بنەڕەتی عوسمانمان وەك سەرکردەیەکی سەربازی وپیاوێکی سیاسی لەکەسایەتیەکەیدا بۆ دەردەکەوێت که لەگرنگترینیان ئەمانەن :

١) ئازایەتی : کاتێك لەساڵی {٧٠٠ك- ١٣٠١ز}دا میرەکانی نه صارا بێزەنتینیەکان بورسه و مادانوس و ئەدرەنوس و کتەو کستله داوایپێکهێنانی هاوپەیمانیەکی خاچ پەرستی یان کرد بۆ دژایەتی کردنی عوسمانی کوڕی ئورتوغرلی دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی ، و هەموو نەصاراکان وەلامی ئەو بانگەوازەیان دایەوەو هاوپەیمانیەتیان بەست بۆ لەناوبردنی بەسەر ئەو دەوڵەته کۆرپەیه ، عوسمان به سەربازەکانیەوە پێشڕەوی کرد و خۆی جەنگەکانی گرته دەست وسوپا خاچ پەرستەکانی تێك شکاند و نەبەردی و بەجەرگی و لێ هاتوویی لێ بەدەر کەوت و لای عوسمانیەکان بوو پەندی سەرزمانیان [1].

٢) دانایی : پاش ئەوەی عوسمان ڕێبەرێتی هۆزەکەی گرتەدەست ، دانایی لەوەدا دەبینیەوە که دژ به مەسیحیەکان لەگەڵ سوڵتان عەلائەددین دا ڕاوەستێت و له ئازادکردنی دەستەیەك لەشاره سەختەکان و هەندێك لەقەلا پتەوەکان دا یارمەتی یەکی باشی دا . بۆ ئەمەش پلەی میرایەتی له لایەن سوڵتان عەلائەددینی سەرۆکی دەوڵەتی سەلجوقیەکانی ڕۆمەوه پێدراو

---

[1] جوانب مضيئة في تأريخ العثمانيين الأتراك / ١٩٧ .

ڕێگەشی دا ناوی خۆی لەسەر سکە هەڵبکۆڵێت ولە هەموو ئەو ناوچانەدا کە لەژێردەسەلاتی خۆی دایە لەرۆژانی هەینیش دا دوعای بۆ بکرێت[1].

**٣)** دلسۆزی ( الإخلاص ) : کاتێك دانیشتوانی زەوی‌یە نزیکەکانی میرنشینی عوسمان ، هەستیان کرد بە دڵسۆزی ودڵپاکی عوسمان بۆ ئیسلام ، کەوتنە یارمەتی‌دان و ڕاوەستان لەگەڵ عوسمان دا لەپێناو بەهێز کردنی پایەکانی دەوڵەتێکی ئیسلامی‌دا بۆ ئەوەی وەك بەربەستێکی گەورە لە بەردەم ئەو دەوڵەتە دا بوەستێت کەدژایەتی ئیسلام وموسڵمانان دەکات[2].

خۆڕاگری : ئەم ڕەوشتە لەو کاتەوە لەکەسایەتی عوسماندا دەرکەوت کە دەستی کرد بە ئازادکردنی قەلاو شارەکان . لەساڵی ٧٠٧ك دا قەلاکانی ( کتە و لفکە و ئاق حصار و قوج حصار ) و لەساڵی ٧١٢دا قەلاکانی ( کبوه و یکیجه طراوقلوا و تکرر بیکاری )و چەندێکی‌تری ئازاد کرد . جەنگە ئازادیخوازەکانی بەئازادکردنی شاری( بروسه )تاجیان خرایە سەر پاش ئەوەی بۆ چەند ساڵێك ، بەڵکو لەسەختترین کارێك کە عوسمان لەجەنگ ئازادیخوازەکانیدا بەرەو ڕووی بوویەوە ، ئەو ململانێ توندە بوو کە لەنێوان عوسمان و ئەقرینوسی پارێزەری شارەکەدا –شاری بروسه– ڕوی دا و چەن ساڵێکی خایاند تاخۆی دا بەدەستەوە و شارەکە ی دایە دەست عوسمان ، خوا دەفەرموێت: ﴿یاأیهاالذین آمنوا اصبروا وصابروا ورابطوا واتقوا الله لعلکم تفلحون﴾ آل عمران:٢٠٠

واتە ئەی ئیمانداران،ئارام بگرن وئارام بەیەکتری بدەن وپاسەوانی بکەن ولەخوا بترسن بەڵکوسەرکەوتن بەدەست بهێنن

**٤)** یەکانگیری ئیمانی : ئەم ڕەوشتەی عوسمان ئەوکاتە دەرکەوت کە ئەقرینوسی سەرکردەی بروسە دایە پاڵ عوسمان و موسوڵمان بوو ،

---

[1] قیام الدولة العثمانیة / ٢٥ .

[2] قیام الدولة العثمانیة / ٢٦.

سـولتانیش نازنـاوی بـەگی پـێدا و لـەدواتردا بووبەیـەکێك لەسـەرکردە دیارەکانی دەوڵەتی عوسمانی . زۆرێك لە سەرکردە بیزەنتی‌یەکان کاریگەر بوون بە کەسایەتی و ئەو ڕێبازەی عوسمانی لەسەر دەڕۆیشت . تاوای‌لی هات ڕیزەکانی سوپای عوسمانی پڕبوو لەو سەرکردانە [1] . بەڵکو زۆرێك لەکۆمەڵە ئیسلامیەکان هاتنە ژێر دروشمی دەوڵەتی عوسمانی‌یەوە . وەك کۆمەڵەی ( غزیاروم ) واتە "جەنگاوەرانی ڕۆم" کە کۆمەڵێکی ئیسلامی سەنگەرنشینی بەرامبەر بە ڕۆمەکان بوون و هەر لەسەردەمی عەبباسی‌یەوە ڕێگری هێرشەکانی ڕۆمیان دەکرد لەڕووی موسوڵمانان‌دا . ئەم سەنگەر نشینی‌یە چەندین ئەزمونی پێدابوون لە جیهاد کردنی دژ بە ڕۆم کە بەمە لایەنگری‌و پابەندی‌یان بۆ هەموو یاساکانی ئیسلام قووڵ بووبوویەوە تیایاندا.

هەروەها کۆمەڵەی ( ئیخیان ) واتە "برایان" ، کە کۆمەڵێکی چاکە خواز بوون و پاڵپشتی و میوانداری موسوڵمانانیان دەکردو لەگەڵ سوپاکانیاندا دەڕۆیشتن بۆ ئەوەی‌خزمەت بە جەنگاوەران بکەن .

زۆبەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە ، لەو گەورە بازرگانانەبوون کە ماڵ و سامانی خۆیان وەگەڕ خستبوو بۆ خزمەتگوزاری ئیسلامی‌یەکان وەك بنیاد نانی مزگەوت وخان و تەکیە و میوانخانە . ئەمانە پێگەی بەرزیان هەبوو لەنێو دەوڵەتدا . لەم ناو کۆمەڵەیەدا چەندین زانا هەڵکەوتن کە کاریان بۆ بڵاو کردنەوەی ڕۆشنبیری ئیسلامی دەکرد و خەڵکیان ڕادەکێشا بۆ پابەند بوونیان بەئایینەوە .

هەروەها کۆمەڵەی ( حاجیات الروم ) واتە حاجیەکانی خاکی ڕۆم ، کە کۆمەڵێکی شارەزا بە ئیسلام بوون و تێگەشتنێکی ووردیان هەبوو بۆ یاساو

---

[1] قیام الدولة العثمانیة / ٢٨ .

ڕێساكانی ، ئامانجیان یارمەتیدانی موسوڵمانان بوو بەگشتی و موجاهیدەكان بەتایبەتی . هەروەها چەند كۆمەڵەیەكی تریش جگە لەمانە [1] .

٥) دادپەروەری : زۆربەی ئەو سەرچاوە توركیانەی كەمێژووی عوسمانیان تۆمار كردووە دەگێڕنەوە كە : ئورتوغرول دەسەلاتی قەزاوەتكردنی لە شاری "قرجە" دا بەعوسمانی كوڕی كە دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانیە . لەپاش ئەوەی لەساڵی ٦٨٤ك ، ١٢٨٥ز دا لەبیزەنتیەكانی سەندەوە ، عوسمان بڕیارێكی دەركرد بۆ بیزەنتیەكی مەسیحی لە دژی موسوڵمانێكی توركی ، كارای بیزەنتی ئەمەی لەلا نامۆبوو ، و پرسیاری كرد لەعوسمان : ئەی چۆن لەبەرژەوەندی من بڕیار دەردەكەیت لە كاتێكدا من لەسەر ئاینی تۆ نیم ؟ عوسمانیش وەڵامی دایەوە : چۆن لەبەرژەوەندی تۆ بڕیار نەدەم لەكاتێكدا ئەو خوایەی كە دەیپەرستین ،پێمان دەفەرموێت : ﴿إن الله يأمركم أن تؤدوا الأمانات الى أهلها وإذا حكمتم بين الناس أن تحكموا بالعدل﴾ النساء: ٥٨ . واتە :بەبێ گومان خوا فەرمانتان پێ دەكات كە سپاردەكانیان بگەڕێننەوە بۆ خاوەنەكانیان وكاتێكیش داوەری نێوان خەڵك ئەكەن،ئەوە بەداد داوەریان بكەن..

ئەم كارە جوان و ڕێزدارانەیە بوویە هۆی هیدایەتی كابراو--- گەلەكەی بۆ ئیسلام [2] .

بەڕاستی عوسمانی یەكەم دادپەروەری لەگەڵ ژێر دەستەكانی و ئەو ناوچانەشدا پەیڕەو دەكرد كە ئازادی كردبوون ، ئەو هەڵوێستی زۆرداری و ستەم و خۆسەپاندن و سەركەشی و برسی كردنی لەگەڵ گەلە شكست خواردوەكاندا نەبوو . بەڵكو بەم دەستوورە خواییە ڕەفتاری دەكرد لە گەڵیاندا﴿ أما من ظلم

---

[1] التراجع الحضاري في العالم الإسلامي –د. علي عبدالحليم / ٣٣١-٣٣٢ .

[2] جوانب مضيئة / ٣٢ .

فسوف نعذبه ثم يرد الى ربه فيعذبه عذابا نكرا ، وأما من آمن وعمل صالحا فله جزاءالحسنى وسنقول له من أمرنا يسرا ﴾ الكهف : ٨٧-٨٨ واته :ئەوەی ستەمێکی کردبێت سزای ئەدەین پاشان ئەدرێتە دەست خوداوئەویش سزایەکی خراپی ئەدات،وئەوانەش کە بڕوایان هێناوەو کاری چاکە دەکەن ئەوە پاداشتێکی چاکیان ئەدرێتێ وئێمەش کارێکی چاك وئاسانی بەرانبەر دەکەین.

کارکردنیش بەم یاسا خواییە بەڵگەیە لەسەر ئیمان و لەخواترسان و هۆشیاری و زیرەکی و داد پەروەری و چاکە وڕەحمەت .

٦) وەفاداری : عوسمان وەفادار بوو بەرانبەر بەهەموو پەیمانێك ، کاتێك میری "قەڵای ئولوباد"ی خۆی دا بەدەست سوپای عوسمانیەوە ،ئەوەی بەمەرج دانا کە هیچ عوسمانیەکی موسوڵمان بەسەر پردەکەدا تێپەڕنەبێتە نێو قەڵاکەوە ، عوسمانیش و سوڵتانەکانی دوای ئەویش پابەند بوون بەو مەرجەوە[1] .خوا دەفەرموێت : ﴿وأوفوا بالعهد إن العهد كان مسئولا ﴾ إسراء: ٣٤. واتە : وەفاتان بەپەیمانەوە هەبێت ، چونکە پەیمان پرسیاری لەسەرەدەکرێت .

٧) خۆ یەکلاکردنەوە بۆ خواله ئازادکردنی ولاّتاندا :

کارو جەنگە ئازادیخوازەکانی عوسمان لە پێناو بەرژەوەندی ئابووری و سەربازی یان شتی تردا نەبوو ، بەڵکو هەلی گەیاندنی بانگەوازی خواو بلاّوکردنەوەی ئایینەکەی بوو . بۆیە ئەحمەد ڕەفیق لەئەنکسلوپیدیە کەیدا بەناوی ( التأريخ العام الكبير ) وەسفی عوسمان دەکات بەوەی کە : ( عوسمان ئایندارێکی خاوەن ئامانج بووە و دەیزانی کە بلاّوکردنەوەی ئیسلام و گشتگیرکردنی پێویستیەکی پیرۆزە . هەروەها خاوەنی بیرێکی ڕامیاری فراوانی بەهێز بوو ،

[1] التراجع الحضاري في العالم الإسلامي –د. علی عبدالحليم / ٣٣١-٣٣٢ .

عوسمان دەوڵەتەکەی لەبەرخۆشەویستی بۆ دەسەلاَت بنیات نەنا ، بەڵکو لەبەر خۆشەویستی بوو بۆ بلاَو کردنەوەی ئیسلام ) [1] .

مصرئوغلو دەڵێت : ( بەڕاستی عوسمانی کوڕی ئوتوغرول ئیمانێکی قووڵی هەبوو بەوەی کە تاکە ئەرکی لەژیان دا بریتی بوو لە جیهادلە پێناوی خوادا بۆ بەرزکردنەوەی ووشەی خوا لەسەر زەوی‌دا ، بۆیە بەهەموو گوڕو تینێکەوە دەستی پێ‌کرد ، بۆیە بەوپەڕی ووزەو تواناپەکییەوە کەهەیبوو لە پێناو بەدیهێنانی ئەوئامانجەدا تێدەکۆشا ) [2].

ئەمانە هەندێك لەو سیفەتانەی عوسمانی یەکەم بوو کە بەرهەمێکی سروشتی بوو بۆ ئەو بیرو باوەڕووئامادە سازی یەی کە بۆ رۆ<ی ڕەستا خێز وەری گرتبوو،خۆشەویستی بۆ ئەهلی ئیمان وڕق وبێزاری لە گوناه وئەهلی کوفرو خۆشویستنی بە دڵ بۆ جیهادی ڕێگەی خوداو خەڵك بانگ کردن بۆ لای ئەو ئەو عوسمانی کردە خاوەنی ئەو هەموو سیفەتە جوانە . بۆیە عوسمان لەجەنگە ئازادیخوازەکانیدا لەناوچەکانی ئاسیای بچوکدا . داوای لەسەرکردەکانی ڕۆم دەکرد کە یەکێك لەوسیٚ بوارە هەڵبژێرن کە ئەمانەن : چوونەناو ئیسلام یان پێدانی سەرانە یان شەڕ . بەمەش هەندێکیان موسوڵمان بوون و هەندێکی تر دایانە پاڵی و سەرانەیان قبووڵ کرد . ئەوانیش کە دوژمنایەتی‌یان دەکرد ، ئەم جیهادێکی بێبڕانەوەی لەدژیان بەرپاکرد و بەسەریان دا زاڵ بوو وبەمەش توانی هەندیٚ ناوچەی گەورەی تر بداتە دەم دەوڵەتەکەی .

بەڕاستی کەسایەتی عوسمان بەهۆی ئیمانە گەورەو بەهێزەکەی بەخوای گەورەو ڕۆژی دوایی‌یەوە سەنگین و دڵڕفێن بوو . بۆیە نەهێزی بەسەر دادپەروەری و دەسەلاَتی بەسەر میهرەبانی و نەدەوڵەمەندی بەسەر ملکەچیەکەیدا زاڵ نەبوون .

---

[1] جوانب مضيئة / ٣٣.

[2] جوانب مضيئة / ٣٣،

بۆیە بوویە شیاوی پشتگیری و پاڵپشتی خوایی . خوای گەورەش بەپێدانی دەسەڵات و سەرکەوتن ڕێزی لێنا . ئەمەش فەزڵێکی خوایییە بەسەر عوسمانی بەندەیدا . بەمەش تواناو لێهاتوویی هەڵسوکەوت کردنی لەئاسیای بچوکدا پێدا لەڕووی بیرلێکردنەوەو بیروڕاو زۆری سەربازو سام و شکۆو نەرم و نیانییەوە بەڕاستی سەرپەرشتیاری خوایی بۆ عوسمان زۆر بوو . هەربۆیە دەرگای تەوفیقی بۆکردەوەو ئەو ئامانج و مەبەستەبەرز و بڵندانەی بۆ بەدیهێنا کە بە دوایدا دەگەڕا . کاروکردەوەکانی عوسمانیش بەهۆی خۆشەویستی بۆ بانگەوازکردن بۆ خوا شکۆداربوون ، توانی ئازادکردنی ولآتان بە زۆری شمشێروو ئازادکردنی دلآن بەکاری چاکەو دینداری پێکەوە گرێبدات و . ئەگەر بەسەر گەلێکیشدا سەربکەوتایە ، ئەوا بانگی دەکردن بۆلای ڕاستی و ئیمان بەخوای گەورە . سوریش بوو لەسەر کاروکردارە چاکسازییەکانی لەهەموو ئەو هەرێم و شارانەدا کە ئازادی کردبوون . هەوڵی ئەدا ڕاستی ودادپەروەری باڵ بکێشێ بەسەر گشت لایەکداو خۆشەویست ولاگیری ئەهلی ئیمان بوو وەك چۆن دژو دوژمنی ئەهلی عصیان بوو .

دووەم : ئەو دەستورەی کە عوسمانییەکان لەسەری دەڕۆشتن :

سەر پاکی ژیانی میر عوسمان دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی بریتی بوو لە جیهاد کردن وخەڵك بانگکردن بوو بۆڕێگەی خوا . زانایانی ئایینیش چواردەوری میر عوسمانیان دەگرت و سەرپەرشتی نەخشەی کارگێڕی و جێبەجێکردنی شەرعی نێو میرنشینەکانیان دەکرد . بێگومان مێژوو وەسیەتەکەی عوسمانی بۆ ئورخانی کوڕی پاراستووە بۆ ئێمە.

ئەو وەسیەتە مانای ژیاری و بەرنامەیی شەرعی زۆری تێدایە کە دیارەدەوڵەتی عوسمانی لەودوا لەسەر ئەو مەنهەجە ڕۆشتووە ، عوسمان لەوەسیەتەکەیدا دەڵێت : کوڕی شیرینم : وریابە سەرقاڵ نەبیت بە شتێکەوە کە خوای

پەروەردگاری جیهانیان فرمانی پێ نەکردبێت ، ئەگەر لە حوکمڕانیشدا گرفتێکت بەرەوڕوو بوویەوە ، ئەوا ڕاوێژ کردن بە زانایانی ئایینی باقەلأی قایمت بێ.
کوڕی شیرینم ، ئەوەی گوێڕایەڵیت دەکات بەرز ڕاییبگرەوبا بەخششت هەمیشە بڕژێت بە سەر سەربازەکاندا ، وریابەشەیتانیش بەسەربازو ماڵ و سامانت فریوت نەدات . وریابە ئاگات لە خۆت بێت هەرگیز دوورنەکەویتەوە لە خزمەت کاری شەریعەت .
کوڕی شیرینم : تۆ دەزانیت کە تاکە مەبەستمان ڕازی کردنی خوای پەروەردگاری جیهانیانە ، بەڕاستیش بە جیهاد کردن ڕوناکی ئایینەکەمان هەموو لایەك دەگرێتەوە . جا بەدووی ڕەزامەندی خواشمان بۆ بەدەست دێ.
کوڕی شیرینم : ئێمە لەوانەنین کە بۆ ئارەزووی فەرمانڕەوایی و زاڵبوون بەسەر تاکەکاندا جەنگ دەنێنەوە ، ئێمە بەئیسلامەوە دەژین و بۆ ئیسلامیش دەمرین ، ئەمەش ئەو شتەیە کوڕم کە تۆ مەردی مەیدانی بۆی )[1].
لە کتێبی ( التأريخ السياسي للدولة العلية العثمانية ) دا گێڕانەوەیەکی تری ئەو وەسیەتە دەبینین :
کوڕی شیرینم :ئەوە بزانەکە بڵاو کردنەوەی ئیسلام و ڕێنمونی خەڵك بۆلای ، و پاراستنی ئابڕوو ومالی موسوڵمانان ، سپاردەیەکە لەگەردنت دا کە دواتر خوای گەورە لەبارەیەوە پرسیارت لێ دەکات )[2].
لە کتێبی ( مأساة عثمان) دا چەند دەستەواژەیەکی تری وەسیەتەکەی عوسمان بۆ ئورخانی کوڕی دەبینین کە دەڵێت : (ئەی کوڕی شیرینم : من وا دەگوازمەوە بۆلای خوا ، من شانازی بەتۆوەدەکەم کە لەمەودوا دادپەروەر دەبیت لەناو هاوڵاتیانداو موجاهیدێکی ڕێگەی خوادەبێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام ،

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة –د. محمد حرب / ١٦ .
[2] جوانب مضيئة / ٢١ .

ئەی کوڕی شیرینم : لەبارەی زانایانی ئوممەتەوە ئامۆژگاری ئەوەت دەکەم کە بەردەوام خاتریان بگرەو زۆر گەورە سەیریان بکەو کە ڕاوێژیان پێ دەکەی ئەوان چی یان ووت تۆ وا بکە ، چونکە ئەوانە جگە لەچاکە فەرمانی شتی ترتپێ ناکەن .

کوڕی شیرینم : وریابە کارێك نەکەیت کە خوا ناڕازی بێت پێی ،ئەگەر کارێکیشت لەسەر گران بوو ، ئەوا پرسیار بکە لەزانایانی شەریعەت ، چونکە ئەوان ڕێگەی چاکەت نیشان ئەدەن .

کوڕی شیرینم : بزانە کە تاکە ڕێگەی ئێمە لەم ژیانەدا بریتیە لەڕێگەی خوا ، تاکە مەبەستیشمان بریتیەیە لە بلاو کردنەوەی ئاییینی خوا ، ئێمە بەدوای پلەو پایەدونیادا ناگەڕێین ) [1] .

لە ( التأريخ العثماني المصور ) یشدا چەند دەستەواژەیەکی تر لە وەسیەتەکەی عوسمان هەیە کە دەڵێت : ( وەسیەتم بۆ ڕۆڵە و هاوڕێکانم ئەوەیە، درێژە بدەن بەبەرزو بڵندی ئاییینی پیرۆزی ئیسلام ئەویش بەوە دەبێت بەردەوام جیهاد بکەن لە ڕێگەی خوادائالأی پیرۆزی ئیسلام بە شاکاوەیی وبڵندی بەدەستەوە بگرن بە هۆی جیهادی ڕاستەقینەوە. هەمیشە خزمەتگوزاری ئیسلام بن ، چونکە خوای گەورە بەندەیەکی لاوازی وەك منی بەکار هێنا بۆ ئازادکردنی وولاتان ، بەوشەی یەکتاپەرستیوبانگی جیهادکردنەوە لەڕێی خوادا بچن بۆ ئەو پەڕی دونیا ، هەرکەسیش لە بنەماڵەکەم لایدا لە ڕاستی و دادپەروەری ، ئەوا لەڕۆژی قیامەت دا بێبەش دەبێت لەشەفاعەتی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) . کوڕی شیرینم : کەس نییە لەم دونیایەدا گەردنی بۆ مردن کەچ نەکات ، دڵنیاش بە فەرمانی

[1] جوانب مضيئة / ٣ .

خوامەرگم نزیك بوویەوە ، ئەم دەوڵەتەت دەدەمە دەست و بەخوات دەسپێرم ، لەهەموو كاروبارێكتا دادپەروەربە ........)[1].

بەڕاستی ئەو وەسیەت و ڕاسپاردەیە ، بەرنامەیەك بووكە عوسمانیەكان لەسەری دەڕۆشتن بۆیە ، گرنگی یان ئەدا بە زانست و دامەزراوە زانستیەكان و سوپاو دامەزراوە سەربازیەكان و زانایان وڕێز گرتنیان وەك چۆن گرنگیان ئەدا بە ئەو جیهادە كە ئازادكردنی گەیاندە ئەوپەڕی شوێن كەئالای سوپای موسوڵمانانی بەسەردا شەكایەوە،بە چاوی گرنگیەوە ئەیانڕوانی بۆحوكمڕانی وشارستانیەتی[2].

عوسمانی یەكەم دەوڵەتی عوسمانی بەجیّ هێشت كە ڕووبەرەكەی دەگەشتە ١٦٠٠ كم دوجا ، توانیشی كە ڕێڕ ەوێك( منفذ) بدۆزێتەوە بۆ دەوڵەتە تازە پێگەشتووەكەی لەسەر دەریای مەڕمەڕە ، هەروەها توانی بەسوپاكەیەوە هەڕەشە بخاتە سەرگرنگترین دووشاری بیزەنتی لەوسەردەمەدا ، كە ئەزنیق و بورصە بوون[3].

## باسی دووەم : سوڵتان ئورخانی كوڕی عوسمان ( ٧٢٦-٧٦١ك ، ١٣٢٧-١٣٦٠ز)

لە دوای مردنی عوسمان ، ئورخانی كوڕی فەرمانڕەوایی گرتەدەست ، لە فەرمانڕەوایی و جەنگە ئازادیخوازەكانی دادا لەسەر هەمان سیاسەتی باوكی دەڕۆشت ، لەساڵی {٧٢٧ك – ١٣٢٧ز} دا "نیقومیدیا"كەوتە دەستی ، كەدەكەوێتە باكوری ڕۆژئاوای ئاسیای بچوك نزیك بەشاری ئەستانبوڵ كە شاری ئەزمیتی ئەمڕۆیە . یەكەم زانكۆی عوسمانی تێدا دامەزراند و بەڕێوەبردنی

[1] السلاطين العثمانيون / ٣٣.

[2] ـبڕوانە:العثمانيون في التأريخ والحظارة،ص ٢٦.

[3] هەمان سەرچاوە ل ١٥.

زانكۆكەی دایە دەست داودی قەیسەری كە یەكێك بوو لەو زانا عوسمانیانەی كە لەمیسر خوێندبوویان .[1]

هەروەها گرنگی دا بەبنیادنانی سوپا لەسەر چەند بنەمایەكی سەردەمی و كردیە سوپایەكی نیزامی[2] .

سوڵتان ئورخان لە سەر ئەوە سوور بوو كە ئەو موژدەیەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) )دەربارەی ڕزگاركردنی قوستەنتینیە دا بۆی بهێنێتە بۆیە دی پلانێكی ستراتیژی داناكە ئامانجی ئابلۆقەدانی پایتەختی بیزەنتی بوو لەیەك كات دا لەڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتەوە ، بۆ بەدی هێنانی ئەوەش ، سولەیمانی وەلی عەهدی نارد تا لە تەنگاوی{دەردە نیل}ەوەبپەڕنەوەو دەست بگرن بەسەر ئەو ناوچانەدا كە دەكەونە قۆڵی ڕۆژئاواوە. .

لەساڵی ٧٥٨ك دا سولەیمان لەگەڵ ٤٠ پیاو لەسوارچاكانی ئیسلام دا بەشەو لە تەنگاوی دەردەنێلەوە دا تێپەڕبوون ، كاتێك گەشتنە كەناری ڕۆژئاوای ، دەستیان گرت بەسەر ئەو بەلەمە ڕۆمیانەدا گرت كە لەوێدا لەنگەریان گرتبوو وە بەو بەلەمانەوە گەڕانەوە بۆ كەناری ڕۆژئاوا چونكە ، لەوسەردەمەدا عوسمانیەكان هیچ كەشتیگەلێكیان نەبوو ، لەبەرئەوەی هێشتا دەوڵەتەكەیان لەسەرەتای دامەزراندنیدا بوو ، سولەیمان لەكەناری ڕۆژئاوادا فەرمانی كرد بەسەربازەكانی سواری بەلەمەكان ببن تا بیانگوێزێتەوە بۆ قۆڵە ئەوروپی یەكەی وئەوەبوو . كە بەندەری قەڵای {ترتب} و {غالیبول}یان ڕزگار كرد كە قەڵای "جناقلعە" و" ئەبسالا"و "رودستوی" تێدابوو ، و هەمووئەو ناوچانەش دەكەونە سەر تەنگاوی دەردەنێل لەباشوورەوە بۆ باكور ، بەمەش ئەم سوڵتانە

---

[1] قيام الدولة العثمانية / ٢٩ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٧.

هەنگاوێکی گەورەی بڕی کە کەسانی دوای خۆی لە فەتحکردنی قوستەنتینیەدا سودی زۆریان لیٚ ببینیی[١] .

یەکەم : دامەزراندنی سوپای نوێی ( ینی تتاری ) : لەگرنگترین ئەوکارانەی کە پەیوەنــدی هەیــە بــە ژیــانی ســوڵتان ئورخانــەوە ، دامەزرانــدنی ســوپایەکی ئیسلامی‌یە لەگەڵ سوربوونی لەسەر داهێنانی یاسایەکی تایبەتی بۆ سوپا، هات سوپاکەی دابەش کرد بۆ چەند یەکەیەك ، هەموو یەکێك لەو یەکانە لە ١٠ یان ١٠٠ یان ١٠٠٠ کەس پێك هاتبوو ، پێنج یەکی دەستکەوتەکانیشی تایبەت کرد بەبەخشش بەسەر سوپادا ، بەمە کردی بەسوپایەکی هەمیشەیی پاش ئەوەی کە پێشتر تەنها لەکاتی شەڕدا کۆدەبوویەوە . هەروەها چەند بنکەیەکی تایبەتیشی بۆ دارشت کە تیایدا مەشق دەکرا[٢] . هەروەك سوپایەکی تری بۆ زیاد کرد کە بە "ئینکیشاری‌یەکان"[٣] ئەناسرێن کە لەو تازە موسوڵمانانەی پێکهێنا کە ژمارەیان پاش فراوان بوونی خاکی دەوڵەت و سەرکەوتنە گەورەکانیان لەشەڕەکانی لەگەڵ دوژمنە ناموسوڵمانەکانیاندا ، زیادی کرد ، لەگەڵ هاتنە ناوی ژمارەیەکی زۆر لەنەوەکانی ئەو وولاتە ئازاد کراوانە بۆ ئیسلام و پاشان وابەستە بوونیان بە ڕیزەکانی موجاهیدانەوە ، لەپێناو بلاوکردنەوەی ئیسلامدا ، پاش ئەوەی کە موسڵمان ئەبوون وئیسلامیان وەرگرت و ئەخرانە ژێر پەروەردەیەکی ئیسلامی یەوەلەووی {فکر}ی و{سەربازییەوە} پەروەردە دەکران وئەو بەسەربازی لەبنکە جۆراوجۆرەکانی سوپادا دامەزران ، هەوەها زانا و فیقھ ناسەکان لەگەڵ ئورخانی سوڵتانیاندا دەستیان دایە چاندنی خۆشەویستی جیهاد و پارێزگاری لەئاین و

[1] الدولة العثمانية –د. جمال عبدالهادي / ٢٢ .

[2] قيام الدولة العثمانية / ٣٠٢ ،

[3] قيام الدولة العثمانية / ٣٠٢ .

تامەزرۆیی بۆسەرکەوتن یان شەهید بوون ، لەپێناوی دین دا ، تائەوەی لەکاتی چونیان بۆ مەیدانی شەڕ دروشمیان بووبوو بە ( جەنگاوەری یان شەهیدی ) [1].

زۆرێك لە مێژوو نووسە بێگانەکان لافی ئەوە لێدەدەن گوایە سوپای ئینکیشاری لەو منالە نەصریانە دروست ئەکران کە لە کەسو کاریان ئەسەنران وناچاریان ئەکردن موسلمان ببن بەپێی یاسایەك یان سیستمێك {بە قسەی ئەوان}گوایە ناوی سیستمی دەخشەری یە بووە ،بەقسەی ئەوان ئەم سیستمە لە بناغەدا باجێکی ئیسلامی یەو ناویان لێناوە باجی کۆیلەکان هەندێك جار ناوی ئەتێن باجی کوڕ کە باجێکە بە قسەی ئەوان بۆ موسلمانە عوسمانییەکان حەلاڵە لە هەموو شاروو گوندێکی نەصرانی دا پێنج یەکی منالەکانیان وەربگرن بەو حسابەی ئەوە پێنج یەکی غەنیمەیەو پشکی بیت المالی موسلمانانەلەو مێژوونووستنەی ئەو بوختانە ئەکەن وڕاستی ئەشێوێنن {کارل بروکلمان} و{جیبونس} و{جب}ن [2] .

ڕاستی وادەلێت : کە ئەو سیستمە هەلبەستراوە جگە لە درۆیەك زیارتر شتێکی تر نی یەو دراوەتە پالْ مێژووی ئورخانی کوڕی عوسمان و موڕادی کوڕی ئورخان ،لەوەو دوا ئەو بوختانە کێشی پێ هێنراو هەموو مێژووی عوسمانییەکانی تێپەڕ کرا.

ئەم سیستمەش جگە لە گرنگی دان بە منالانی بێسەرپەرستی نێو دەولەتی عوسمانی لەو مندالە مەسیحی یانەی کە جەنگەبەردەوامەکان بەهەتیوی یان بێ سەرپەرستی ئەهێلانەوە، هیچی تر نییە ، جا ئیسلام کە دەولەتی عوسمانی کردبوویە ڕێبازی خۆی، بێ دوودلی ئەو باجەی کە پێی باجی مندالان بە گشتی ڕەت دەکاتەوە کە مێژوو نووسە بیانی یەکینە لەدلەکان ئەیدەنە پالْ ئەو دەولەتە.

---

[1] قیام الدولة العثمانیة / ٣٠٢ .

[2] جوانب مضیئة / ١٢٢ .

ڕاستی یەکەی ئەوەیە ژمارەیەکی زۆر منداڵ بەهۆی شەڕو پێکدادانەکانەوە باوك ودایکــی خۆیــان لەدەســت ئــەدا موســڵمانە عوسمانیــەکانیش چــوون بــە هانایانەوەوباوەشیان بۆ کردنەوە چونکە ئەو منداڵانە سەرگەردان بوون ولەڕێگەو کوچەو کۆڵانەکانـدا ئەمانـەوە لـە وولاٌتـە ئازادکراوەکانـدا لەبـەر ئـەوەی بـاوك و دایکیان نەما بووە عوسمانییەکان سوربوون لە سەر ئەوەی داهاتوویەکی باش دابین بکەن بۆ ئەم منداڵانە باشە داهاتوو لەوە باشتر ئەبێت کە فێری ئیسلام بکـرێن ئـەرێ ئەگـەر موسـڵمان هـەوڵی ئـەوە بـدات منـداڵی بـێ سەرپەرشـت وسـەرگەردانی نـاو کۆمەڵگـە فێـری ئیسلامەتی بکـات ئـەبێ بوختـان چـی یـەکان ڕاسـت ببنـەوەو بڵـێن موسـڵمانەکان منـداڵانیان لـە باوەشـی دایـك وباوکیـان دەرهێناوەو بە زۆر کردونیانن بە ئیسلام؟.

ئەوەی جێی داخـە : ئـەم بوختاتنـە پڕکینەیە،ئـەم درۆ ئاشکرایە،ئـەم نەهانەتییە گەورەیـە کـە هەنـدێك لـە مێژوونوسـە موسڵمانەکان دەم بـەدەم وەریـان گرتـووەو لەخوێندنگـەو زانکۆکانیانـدا بـە وانـە و دەرس دەیڵێنـەوە ، وەك ئـەوەی شـتێکی بەڵگە نەویست بێت . واش بۆ زانست خوازان دەخرێتە ڕوو کە ئەمە ڕاستی یەکە لەڕاستی‌یەکانی مێژوو . کۆمـەڵێك لـە مێـژوو نووسـە موسـوڵمانەکان کاریگـەری کتێبــەکانی مێــژوو نووســە بیانی‌یــەکانیان لەســەرە،هەنــدێ لەوانــە شــایەتی ئەوەشــیان بــۆ دەدرێــت کــە بەرانبــەر ئیــسلام خــاوەنی غیرەتــن،کەچــی ، و لەکتێبەکانیانـدا ئـەو بوختانـەی بـەردەوام ئەڵێینـەوە ،وەك مێـژوو نـووس محمـد فرید بەگی پارێزەر کە لەکتێبی : ( الدولة العثمانية العلية ) و د. علـی حسون لـە کتێبەکی ( تأريخ الدولة العثمانية ) و مێژوو نووس {محمد کود عەلی} لە کتێبی ( خطط الشام ) و د. عمر عبدالعزيز لە کتێبەکەیدا ( محاضرات في تأريخ الشعوب الإسلامية ) و د. عبدالکريم غريبە لەکتێبی ( العرب والأتراك ) دا .

ڕاستیش دەڵێت : هـەموو ئەوانـەی باسـی بـاجی منداڵان ئەکـەن وئـەڵێن بـەزۆر لـە کـەس وکاریــان وەرگــیراون بــەپێی یاســای وەرگرتنــی پێــنج یــەکی منــداڵانی

شارولادێکان ، هیچ بەڵگەیەکیان نی یە کتێبەکانی ڕۆژهەڵاتناسانی وەك جب و مێژوونووسی مەسیحی سوموفیل یان بروکلمان نەبێت ، ئەوانەش لە نووسینەوەی مێژووی ئیسلامی و نیازیان بەرامبەر بە ئیسلام و مێژووی ئیسلامداجێگەی دڵنیایی ومتمانە نین، ئەوانەی پەروەردەیەکی تایبەتی کران لەسەر جیهاد کردن مەسیحی نەبوو ، بەڵکو منالی باوکی موسوڵمانەکانیان بوون و وازیان لە مەسیحی یەت هێنابووڕوویان کردبووە ، ئیسلام ، و بەپێی خواستی خۆیان و بە دڵ هاتووبون نەك بەزۆر ، ئەوان منالەکانیان پێشکەش بە سوڵتان دەکرد تاکوو بەپەروەردەیەکی تەواوی ئیسلامی پەروەردەیان بکات ، بەلاَم ئەومندالی تریش ، ئەوە بریتی بوو لەو منالە بیٚ باوك وسەرگەردانانەی کە دەرهاویشتەی ئەنجامی شەڕەکان بوون دەوڵەتی عوسمانیش باوەشی سۆزی بۆ کردنەوە.

ڕاستی ئەو سوپایەی کە ئورخانی کوڕی عوسمان دای مەزراند بریتی بوولە سوپایەکی نیزامی نزیك لە خۆی تاهەمیشە سازوو ئامادە بێت چ حاڵەتەکە ئاشتی بێت یان حاڵەتی شەڕبێت، سوپاکە لەسوارەکانی خێڵەکەی خۆی و لەو موجاهیدە تاودراونە ڕێکخرابوو کە پێشبڕکێیان دەکرد لەوەلاٚمدانەوەو بەدەمەوەچوونی بانگەوازکەری جیهاددا لەگەڵ ئەو سەربازە ڕۆمی یانەش کە ئیسلام و چووبووە نێو دڵەکانیانەوەوموسڵمانێکی چاکیان لێ دەرچوو بوو .

ئورخان هەرکە ڕێکخستنی ئەو سوپایەی تەواو کرد ، بەپەلە چوو بۆ لای زانای باوەڕداری لەخواترس ( حاجی بەگتاش ) و داوای لیٚ کرد کە نزای خێریان بۆ بکات ، ئەویش بەجوانی پێشوازی لیٚ کردن و دەستی خستە سەرسەری یەکێك لەسەربازەکان و نزای خێری بۆ کردن تاخوا ڕووسپی یان بکات و شمشێرەکانیان تیژو بڕندە بکات . و لەهەمووشەڕێکدا کە لەپێناو خوادا بیگرنەبەر خوا سەریان بخات ، پاشان ڕووی وەرچەرخاند بەلای ئورخان داو پرسیاری لێکرد : ئایا هیچ ناوێکت داناوە بۆ ئەم سوپایە ؟ ووتی : نەخێر ،

ووتی : دەی باناوی ( ینی جری) بێت کەبە ینی {تشری} دەردەبڕیێت ، واتە : سوپای نویٚ .
ئالاٚی سوپای نویٚ لەقوماشی سوور بوو ، لەناوەڕاستیدا مانگێك بوو لەژێر مانگەکەشدا وێنەیەکی شمشێر بوو کە ناوی ( ذوالفقار ) یان لیٚ نابوو ، وەك بەرەکەت وەرگرتنێك لە شمشێرەکەی ئیمامی عەلی خوای لیٚ ڕازی بێت [1] .
علاءالدینی کوڕی عوسمان برای ئورخان خاوەنی بیرۆکەکەبوو ، زانایەکیش بوو لە شەریعەت دا و بەدنیا نەویستی و تەسەوف ڕاستەقینە ناسرابوو [2] . پاش ئەوەی کە ئەرکەکانی جیهادو ڕووبونەوە لەگەڵ بیزەنتییەکانی زیادی کرد ئۆرخان دەستی دایە زیاد کردنی ژمارەی سوپا نوێیەکەی ، بۆیە ژمارەیەك لەگەنجە تورکەکان و ژمارەیەکیش لەو گەنجە بیزەنتییانەی هەڵبژارد کە موسوڵمان بووبوون و ئیسلامیان بەچاکی وەرگرتبوو . ئەمانیشی خستە سەر سوپاکەو گرنگییەکی زۆری دا بە پەروەردەکردنیان بە لەڕووی پەروەردەیەکی ئیسلامی جیهادی یەوە . سوپای نویٚ زۆری نەبرد ژمارەیان زۆر زیادی کردو هەزاران موجاهیدی ڕیٚی خوای لەخۆگرت .
ئورخان و عەلائەدین کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە ئامانجی سەرەکی ڕێکخستنی سوپای نویٚ بریتی بێت لە درێژە پێدانی جیهادی دژ بە بیزەنتیەکان و ئازاد کردنی زیاتری خاکەکانیان بەئامانجی بلاٚوکردنەوەی ئیسلام تێیاندا و سوود بینین لەوموسڵمانە بیزەنتیانەوەربگیرێت لەبلاٚوکردنەوەی ئیسلامدا چونکە ئەوان گەشتبوونە پەروەردەیەکی ئیسلامی جیهادی باش و ئامانجەکانی ئیسلام لە ئاکارو جیهاددا لەنێو دڵیاندا داچەسپی بوو .

---

[1] جوانب مضيئة / ١٤٧ .

[2] جوانب مضيئة / ١٤٤.

پوختەی قسە ئەوەیە کە : سوڵتان ئورخان تاکە منداڵێکی مەسیحیشی لەماڵی باوکی‌دا دەرنەهێناوە، هەروەها تاکە منداڵێکی مەسیحی بەزۆر موسڵمان نەکردووە . هەرچیش کە برۆکلمان و جب و جیبونز بانگەشەی بۆ دەکەن ، درۆو هەڵبەستەیەو پێویستە شوێنەواریان لەکتێبەکانی مێژووی ئیسلامیماندا بسرپینەوە[1] .

بەڕاستی ئەمانەتی زانستی و برایەتی ئیسلامی لەگەردنی هەموو موسوڵمانێکی دلێرداو ، بەتایبەت زانا و ڕۆشنبیرو بیریارو مێژوو نووس و مامۆستا و لێکۆڵەرو پیاوانی‌ڕاگەیاندندا ئەوە ئەخوازێت کە ئەو بوختانە بڕوخێنرێت و ئەو گومانە بەتاڵ بکرێتەوە کە دراوەتە پاڵ عوسمانی‌یەکان و وای لێ هاتووەهەر وەك ڕاستی یەك بێت ، کەدەڵێی موناقەشەو گفتوگۆو پێداچوونەوەی ناوێت .

دووەم: سیاسەتی ناوخۆیی و دەرەکی ئورخان: پەلامارەکانی ئورخان ڕووبەڕووی ڕۆمەکان کرابوویەوە ، میری {قرەسی} کە یەکێك لە میرەکانی میرنشینی دەوڵەتی سەلجوقیەکانی ڕۆم بوولە ساڵی {٧٣٦ك-١٣٣٦ز} دا مرد ، لەدوای خۆی دوو کوڕەکەی ناکۆکی یان تێکەوت ولەسەر میرێتی بوەناخۆشیان ، ئورخان سوودی لەو هەلە وەرگرت و دەستی وەر دایە نێو ناکۆکیەکەوەو زاڵ بوو بەسەر میرنشینەکەدا . ئەوەش کە دەوڵەتی ساوای عوسمانی کردبووی بەئامانجی ئەوەبوو کە ببێتە میراتگری دەوڵەتی سەلجوقی‌یەکانی ڕۆم لە ئاسیای بچوك و ناوچەکانی تری سەلجوقی‌دا . ململانێکە بەردەوام بوو لەنێوان ئەوو میرنشینەکانی تردا تا ڕۆژانی محمد فاتح هاتن ئەوە بوو هەموو ئاسیای بچوك ملیان بۆداو هاتنە ژێردەسەلاتەکەیەوە.

ئورخان گرنگی بەتوندکردنی پایەکانی دەوڵەتەکەی ئەدا، جادەستی دایە چاکسازی و ئاوەدانی دروست کردن و کاروبارەکانی بەڕێوەبردنی کۆنترۆڵ کرد

---

[1] جوانت مضيئة / ١٥٥.

و سوپای بەهێز کرد و دەستی دایەمزگەوت کردنەوەو دروستکردنی پەیمانگەی زانستی دامەزراند [1] و چاکترین زاناو مامۆستاکانیئەو کاتەی کرد بەسەرپەرشتیکەری ، ڕێزێکی زۆریان هەبوو لەلایەن دەوڵەتەوە. هەموو گوندێك خوێندنگای خۆی هەبوو ، هەموو شارێکیش کۆلێژێکی خۆی هەبوو کە وانەکانی نەحوو و تەرکیبی زمانەوانی ومەنتیق و میتافیزیك و فیقهی زمان و زانستی داهێنانی زمانەوانی و ڕەوانبێژی و ئەندازیاری و گەردوون ناسی تێدا ئەخوێنرا [2] بێگومان لەبەرکردنی قورئان و خوێندنی زانستەکانی قورئان و سوننەت و فیقه و بیرو باوەڕیش ئەخوێنرا.

ئورخان پاش زاڵبوونی بەسەر میرنشینی { قرەسی}دا بیست ٢٠ ساڵ بەبێ هیچ شەڕێك کوزەراند ، بەڵکوئەمبیست ساڵەی لە دەمە زەردکردنەوەی سیستمە مەدەنی و و سەربازییەکاندا بردە سەر کە دەوڵەت بەدیهێنابوون هەروەها خەریکی بەهێزکردنی ئاسایشی ناوخۆیی و بنیاد نانی مزگەوتەکان و دانانی ئەوقافی پێویست بۆیان و بنیادنانی دامەزراوەی گشتی فراوان بوو لەو ماوەیەدا کە ئەمانە شایەتی گەورەیی و لەخواترسی و و دانایی دووربینی ئەدەن بۆ ئورخان. ئەم پیاوە لەبەر تەماعی فراوانخوازی شەڕ لەدوای شەڕی ئەنجام نەدەدا . بەڵکو سوور بوو لەسەر ئەوەی هەموو خاکێکی نوێ بە مۆرکی دەوڵەتی شارستانی و سەربازی و پەروەردەیی وڕۆشنبیری مۆر بکات. بەمەش ئەو وڵاتانە دەبوو بە بەشێك لە ومولکەکانی دەوڵەت ولێی جیا دەبوونەوەو بەو شێوەیە موڵکەکان لە ئاسیای بچوکدا هەموو وەك یەکیان لێ هات وئارامی ڕووی تێکردن. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تێگەشتن و هەست پێکردنی ئورخان بەسوننەتی پلە بەپلە ( التدرج ) لە بنیاد نانی دەوڵەت و ژیارەکان و زیندوو کردنەوەی گەلاندا .

---

[1] محمد الفاتح –دسالم الرشيدين / ٢٥.

[2] في أصول التأريخ العثماني –محمد عبدالرحيم / ٤٠ .

ئورخان هێشتا بنیادی ناوخۆی تەواو نەکردبوو لە ناوخۆی دەوڵەتی بیزەنتی دا ململانێیەك لەسەر حوكم و دەسەلات ڕووی‌دا ، و ئیمبراتۆر كونتاكوزینوس داوای یارمەتی لە سوڵتان ئورخان كرد لە دژی ڕكەبەرەكەی ، سوڵتانیش چەند هێزێكی لە عوسمانی‌یەكان نارد بۆ بەهێز كردنی قەڵەمڕەوی عوسمانی لەئەورووپادا . تالەسالی ١٣٥٨دا بومەلەرزەیەك شاری تراقیای گرتەوە و بەشی پێشەوەی غالیبولی داڕمان و خەڵكەكە شارەكەیان بەجێیان هێشت . ئەمەش كاری چوونە ناو شارەكەی بۆ عوسمانی‌یەكان ئاسان كرد. ئیمبراتۆر ناڕەزایی لەمەدەربڕی ، وەڵامی ئورخانیش ئەوەبوو كە یارمەتی خوایی دەرگاكانی شارەكەی لەبەردەم هێزەكەی‌دا كردۆتەوە ، زۆری نەبرد غالیبولی بوو بەیەكەم بنكەی عوسمانی لەئەورووپادا . ئیدی لەوێوە هێرشە یەكەمەكانی دەست پێ‌كرد كەكۆتایی‌یەكەی بەوە هات دەستگیر كرا بەسەر هەموو نیمچە دورگەی بەلقاندا.

كاتێك حەنناى پێنجەمی بالیولوجنس تا كرەواتە فەرمانڕەوایی بیزەنتەی گرتە دەست ، دانی نا بەهەموو جەنگە ئازادیخوازەكانی ئورخان لە ئەورووپادا بەرامبەر بە بەڵێندانی سوڵتان بە ڕێخۆشكردنی گەشتنی خۆراك و دەستگرۆیی بۆ قوستەنتینیە . ئورخان ژمارەیەكی زۆرلە هۆزە موسوڵمانەكانی نارد لەبۆ ئەوەی بانگەواز بكەن بۆ ئیسلام و بەربەستێك دروست بكەن دواتر نەصاراكان نەتوانن عوسمانیەكان لەئەورووپادا دەربكەن [1].

<u>سێیەم : ئەو هۆكارانەی یارمەتی سوڵتان ئورخانی دا بۆ بەدیهێنانی ئامانجەكانی :</u>

١. ئەو قۆناغبەندی‌یەی كە ئورخان لەسەری دەڕۆشت لەگەڵ سود بینینی لەهەوڵەكانی عوسمانی باوكی و بوونی ئەو توانست و ئیمكانیەتە ماددی ومەعنەوی‌یانەی كە یارمەتی‌دان لەئازا كردنی خاكە بیزەنتی‌یەكان لەئەنادۆڵدا ،

---

[1] أصول التأريخ العثماني / ٤٧.

و قایمکردنی دەسەلاتیان لەو شوێنانەدا ، هەولەکانی ئورخان بەوە دەناسرێتەوە کە هەنگاوی لە سەرخۆوبیٚ دوودلی ئەنا بۆ فراوان کردنی دەولەتەکەی و کشانی سنورەکەانی ، جیهانی مەسیحیش بیریان بولایمەترسی دەولەتی عوسمانی دانەئەڕۆیشت ، ئەو کاتە نەبیٚ کەعوسمانییەکان لەدەریا وە پەڕینەوەو دەستیان گرت بەسەر غالیبولی دا [1].

٢. یەك ڕیزی ویەك ئامانجی ویەك مەزهەبی کە مەزهەبی سوننی بوو بە عوسمانیەکانەوە دیاربوو لەکاتی ئەو ڕووبەڕووبونەوەو شەڕانەدا کە لەنێوان ئەوان وگەلانی بەلقان داڕوویان ئەدا

٣. دەولەتی بیزەنتی گەیشتبووە لوتکەی شەکەت بوون و کۆمەڵگەی بیزەنتیش دووچاری هەلوەشانێکی سیاسی و توانەوەیەکی ئایینی و کۆمەلایەتی بوو بوو، بۆیە بۆ عوسمانی یەکان ئاسان بوو هەرێمەکانی ئەودەولەتە بدەنە پالٚ خۆیان .

٤. لاوازی بەرەی مەسیحی لەئەنجامی نەبوونی متمانەی نێوان فەرمانڕەوادەسەلاتدارەکانی دەولەتی بیزەنتی و بولغاریاو وولاتی صربەکان و مەجەڕدا ، بۆیە زۆربەی کات نەیانئەتوانی هەمامەنگی تەواو بکەن لە نەخشە سیاسی و سەربازییەکانیاندا لە یەك بەرەدا دژ بەعوسمانی یەکان [2].

٥. جیاوازی ئایینی نێوان ڕۆماو قوستەنتینیە ، واتە لەنێوان "کاسۆلیك" و "ئەرسەزوکس" دا کە هەموو هەلقەکانی ئەو جیاوازی یە دروست بووبوو. ئەمەش شوێنەوارێکی قولٚ و ڕیشەداری لەدەروونی ئەو دوو کۆمەلەدا بەجیٚ هێشتبوو .

---

[1] الدولة العثمانية فى التأريخ الإسلامي الحديث / ٢٢ .

[2] الدولة العثمانية فى التأريخ الإسلامي الحديث / ٢٢ .

٦. دەرکەوتنی سیستمی نوێی سەربازی کە لەسەر چەند بنەمایەکی عەقائیدی و بەرنامەی پەروەردەیی و ئامانجی خواویستی یانە دروست بووبوو چاکترین سەرکردەکانی عوسمانیش سەرپەرشتی یان دەکرد .

## باسی سێیەم

## سوڵتان موورادی یەکەم ( ٧٦١-٧٩١ک ، ١٣٦٠-١٣٨٩ز )

موورادی یەکەم کەسێکی دلێری موجاهیدی بەرێزی دینداربوو ، زۆر یاسای خۆشدەویست و پابەندیش بوو پێوەوی . دادپەروەربوو لەگەڵ ژێر دەستەو سەربازەکانیدا . عاشقی جەنگ و بنیادنانی مزگەوت و خوێندنگەو پەناگاکان بوو ، لەپاڵیشیدا کۆمەڵێك لەسەرکردەو پسپۆرو سەربازە هەرەچاکەکان هەبوون ، ئەنجومەنێکی لێ پێك هێنان بۆ ڕاوێژ پێکردنیان . لەیەك کاتیشدا فراوانخوازی لەئاسیای بچووك و ئەورووپادا دەست کرد .

لەئەورووپادا سوپای عوسمانی هێرشی کردە سەر مۆڵکەکانی دەوڵەتی بیزەنتی ، پاشان دەستی گرت بەسەر شاری ئەدرنە دا لەساڵی {٧٦٤ك – ١٣٦٠ ز} کە ئەو شارە گرنگییەکی ستراتیژی هەبوو لە بەلقانداو دووەم شاری ئیمبراتۆریەتی بیزەنتی بوو لەدوای قوستەنتینیە ، مووراد لەو شارەدا پایتەختێکی بۆ دەوڵەتی عوسمانی دانا لەساڵی {٧٦٨ك – ١٣٦٦ز} بەمەش پایتەخت گوازرایەوە بۆ ئەورووپا، و "ئەدرنە" بوو بە پایتەختێکی ئیسلامی ، ئامانجی مووراد لەم گواستنەوەیەدا بریتی بوو لە :

١. بەکارهێنانی شوێنە جەنگی یە قایمەکانی "ئەدرنە"ونزیکیەکەی لەشانۆی چالاکی یە جیهادییەکان .

٢. خواستی مووراد بۆ لەخۆگرتنی ئەو هەرێمە ئەورووپییانەی کە لەجیهاد داگرتبوویان پێی خۆیان تێدا قایم کردبوو .

٣. مووراد لەوپایتەختەدا هەموو کەرەسەکانی بەرقەرارکردنی دەوڵەت و بنەماکانی فەرمانڕەوایی کۆکردبویەوە ، لەو پایتەختەدا کۆمەڵێکی زۆر کارمەند

لەشکری سوپایی وکۆمەڵێك یاساناس و زانایانی ئایینی دروست کران ، هەروەهاچەند خانەی داد و خوێندنگەی شارستانی و پەیمانگەی سەربازی یەکان دامەزراند بۆ مەشق پێکردنی ئینکیشاریەکان .

ئەدرنە لەسەر ئەو بارە سیاسیو سەربازی و ئیداری و ڕۆشنبیری و ئایینی یە بەردەوام بوو تائەوکاتەی عوسمانی یەکان لەسالی {٨٥٧ك - ١٤٥٣ز} دا قوستەنتینیەیان فەتح کرد و بووبە پایتەختی دەوڵەتەکەیان [١] .

**یەکەم : هاوپەیمانیەتیەکی خاچ پەرستی دژ بەموراد :**

سوڵتان موراد لە بزوتنەوەی جیهادو بانگەوازو ئازادکردنی هەرێمەکان لە ئەوروپادا بەردەوام بوو ، وەسوپاکەی نارد و"مەکدۆنیا"یان ئازاد کرد،سەرکەوتنەکانی موراد.زۆریان دایەوەو، بەو هۆیەوە هاوپەیمانیەتیەکی ئەوروپی بەلقانی خاچ پەرستی پێکهات کە پاپا ئوربای پێنجەم پیرۆزبایی لێ کرد و صربەکان و و بولغاریەکان ومەجەریەکان و دانیشتوانی هەرێمی "والاشیا" شی گرتە خۆی ، دەوڵەتە ئەندامەکانی نێو هاوپەیمانێتیە خاچ پەرستییەکە توانیان سوپایەك کۆبکەنەوە کە ژمارەی دەگەشتە ٦٠ شەست هەزار سەرباز ، "لالاشاهین"کەسەرکردەیەکی عوسمانی یەکان بوو لالاشاهین بەهێزێك بەرەنگاریان بوویەوە کە ژمارەی هێزەکە کەمتربوو لە هێزی هاوپەیمانەکان .

لە نزیك" تشیرمن" ی سەر ڕووباری "مارتیزا" بەرەنگاریان بوویەوەو شەڕێکی تۆقێنەر ڕووی دا و سوپای هاوپەیمانی شکستی خوارد و هەردوو ئەمیرەکەی صربی هەڵهاتن ، بەڵام لە ڕووبای "مارتیزا"دا خنکان . پاشای مەجەڕیش بە شێوەیەکی زۆر سەیر ڕزگاری بوو ، سوڵتان مورادیش لەوکاتدا سەرقاڵی جەنگ بوو لەووڵاتی ئاسیای بچوکدا و چەند شارێکی ڕزگارکرد ، پاشان گەڕایەوە بۆ

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٣٨ .

پێگەی دەسەڵاتەکەی بۆ ڕێکخستنی ئەو هەرێم و شارانەی کە ڕزگاری کردبوون ، ئەوەش کاری هەموو سەرکردەیەکی دانایە [١].

سەرکەوتنی عوسمانییەکان لەسەر ڕووباری مارتیزا بەرهەمی گرنگی زۆر هەبوو ، لەوانە :

١. هەرێمی تراقیا و مەکدۆنیایان ئازاد کرد و گەشتنە باشوری بولغاریاو ڕۆژهەڵاتی صیربیا .

٢. شارو مەملەکەتەکانی دەوڵەتی بیزەنتی و بولغاریا و صربیا وەك گەڵای پاییز لەبەردەستیاندا دەکەوتن [٢].

<u>یەکەم پەیماننامەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتیمەسیحی</u> :

کاتێك بازووی دەوڵەتی عوسمانی ئەستوور بوو، دراوسێکانی بەتایبەت لاوازەکانیان ترسیان لێ نیشت ، کۆماری "ڕاجوزە" دەستی پێشخەری کردبوو چەند نوێنەرێکی نارد بۆ لای سوڵتان موراد پەیماننامەیەکی دۆستانەو بازرگانیانە ببەستن لەگەڵ سوڵتان مورادا ، پەیمانی ئەوەیان دا سەرانەیەکی ساڵانە بەبڕی ٥٠٠ دۆقیەی ئاڵتون بدەن، ئەمەش یەکەم پەیماننامە بوولە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی مەسیحی دا ببەسترێت [٣].

<u>"جەنگی قوصوە"</u> :سوڵتان موراد خۆی و لەڕێگای سەرکردەکانیەوە چوونە ناو قولایی بەلقان وئەمەش صربەکانی وروژاند چەندین جار هەوڵیان دا هەلی ئامادەنەبوونی سوڵتان لە ، ئەوروپادا بقۆزنەوەو هێرش بکەنە سەر سوپای عوسمانییەکان لە بەلقان و دەوروبەریدا ، بەڵام شکستیان هێنا لەبەدی هێنانی سەرکەوتنێك بەسەر عوسمانییەکان دا کە جێگەی باسکردن بێت .

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية العلية / ١٣١.

[2] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٣٧ .

[3] تأريخ الدولة العلية العثمانية –د . محمد فريد / ١٣٢ .

صربیاو بۆسنەییە بولغاریەکان هاوپەیمانی یەکیان بەست و سوپایەکی خاچ پەرستی ئەوروپی چڕو پڕیان ئامادە کرد بۆ شەڕکردن لەگەڵ ئەو سوڵتانەی کە بەسوپایەکی ئامادەوە ، پاش خۆسازدانێکی بەهێز هاتبوویە ناوچەی کۆسۆڤا لەبەلقاندا ، لەوڕێکەوتانەی باس دەکرێت ئەوەیە کە وەزیرەکەی سوڵتان موراد قورئانێکی بەستەوە ئەبێت هەر لەخۆوە ئەوقورئانە ئەکاتەوە بەبێ مەبەست وچاوی ئەکەوێتەسەر ئەم ئایەتە ﴿ یاأیها النبي حرّض المؤمنین علی القتال إن یکن منکم عشرون صابرون یغلبوا مئتینوان یکن منکم مئة یغلبوا ألفا من الذین کفروا بأنهم قوم لایفقهون ﴾ الأنفال : ٦٥. واتە :ئەی پێغەمبەر هانی موسڵمانان بدە بابجەنگن ئەگەر بیست کەسی بە ئارامتان تێدا بێت زاڵ ئەبن بەسەر دووسەد کەسداوئەگەر سەد کەستان ببێت زاڵ ئەبن بەسەر هەزار کەسی کافردا چونکە ئەوانە میللەتێکن نافامن.

بەمە خۆشی وموسوڵمانانیش ئومێدی سەرکەوتنیان بۆ دروست بوو زۆری نەبرد شەڕلەنێوان هەردوو لادا هەڵگیرسا و گەرم و توند بوو، شەڕەکە بەسەرکەوتنی موسوڵمانان کۆتایی هات سەرکەوتنێکی زۆر جوان و یەکلاکەرەوە [1].

دووەم : <u>شەهید بوونی سوڵتان موراد</u> :پاش سەرکەوتن لە"قوصر"ەدا ، سوڵتان موراد دەستی کردە گەڕان بەنێو مەیدانی جەنگەکە و ڕیزەکانی کوژراوانی موسوڵماناندا و دوعای خێری بۆدەکردن . هەروەك دەگەڕا بەسەر بریندارەکاندا ، لەوکاتەدا سەربازێکی صربی هەستایەوە کەخۆی وەك مردوو نیشان دابوو ، بەپەلە چوو بەرەو ڕووی سوڵتان . موسوڵمانەکان توانیان بیگرن ، بەڵام ئەو واخۆی نیشان دا کە هاتووە دەیەوێت گفتوگۆ بکات لەگەڵ سوڵتان و موسوڵمان بوونی خۆی لەسەر دەستی ئەو ڕابگەیەنێت . ئەو کات سوڵتان ئاماژەی بۆ

[1] الفتوح الإسلامیة عبر العصور / ٣٨٩. و : محمد الفاتح –د. سالم الرشیدي/٣٠

پاسەوان کرد کە بەری بدەن. ئەویش واخۆی نیشان دا کە دەیەوێت دەستی سوڵتان ماچ بکات ، کەچی هەستا بەجوڵەیەکی بەپەلە و خەنجەرێکی ژەهراوی دەرهێناو دای لەسوڵتان ، سوڵتانیش {بەڕەحمەت ببێت} بەمە لە ١٥ی شەعبانی {٧٩١ك} دا شەهید بوو [١] .

أ –کۆتا ووتەکانی سوڵتان موراد :( لەکاتی ماڵئاوایيمدا جگە لەوەی سوپاسی خوا بکەم هیچی ترناتوانم بڵێم ، چونکە هەر ئەو زانایە بە شتە نادیارەکان و نزای هەژار وەردەگرێت، شایەتی دەدەم هیچ پەرستراوێك نی‌یە جگە لە "الله" کەسیش جگەلە ئەو شیاوی سوپاس و پێزانین نی‌یە . ژیانم نزیك بەکۆتایی هاتن بوەتەوە و سەرکەوتنی سەربازانی ئیسلامم بینی ، گوێڕایەڵی یەزیدی کوڕم بن و دیلەکان سزا و ئازار مەدەن و تالآنیان مەکەن ، لەو کاتە وساتەدا ماڵئاواییتان لیَ دەکەم و ئێوەو سوپا گەورەو زاڵەکەمان ئەدەمە دەست خوا . چونکە هەر خوا دەوڵەتەکەمان لەهەموو خراپەیەك دەپارێزێت ) [٢]. ئەو سوڵتانە پاش ئەوەی ٦٥ساڵ ژیا بە شەهیدی سەری نایەوە.

ب–نزای سوڵتان موراد لەپێش بەجێهێشتنی شەڕی قوصرە :سوڵتان موراد دەیزانی کە ئەم لەپێناو خوادا شەڕدەکات ، و سەرکەوتنیش لەلای ئەوە، بۆیە زۆر نزای دەکردو لەخوا دەپاڕایەوە و هەژاری خۆی بۆ دەرئەبڕی و پشتی پیَدەبەست ، جا لەو نزاو خۆزەلیل نیشاندانانەی کە دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی سوڵتان موراد باش پەروەردگاری خۆیناسیوەو واتاکانی بەندایەتی لەخۆیدا بەدی هێناوەو ، سوڵتان موراد لەموناجاتی پەروەردگاری دا ئەڵێت : ( خودایە ! ئەی میهرەبان ! ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان ! ئەی ئەوەی نزا قەبوڵ دەکەیت ، سەرم شۆڕ مەکە ! ئەی میهرەبان و سۆزیار ، ئەم جارە نزای بەندەی هەژاری

---

[1] تأريخ سلاطين آل عثمان –القرماني / ١٦ .
[2] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٩١ .

خۆت وەڵام بدەرەوە ! بارانی ئاسمانمان بۆ داباریّنە ، پەردەکانی تارکیمان بۆ بڕەوێنەوە دوژمنمان ببینین ، ئێمە جگە لە بەندەگەلی تاوانباری تۆ هیچی تر نین ، تۆ بەخشندەیت و ئێمەش هەژاری بەر بارەگاتین ، من جگە لە بەندەیەکی هەژاری سکالاکاری بارەگای تۆ هیچی تر نیم ،هەر تۆش زانایت ئەی زانا بەنادیارەکان ونهێنی نێو دڵەکان{خوایە خۆت ئەزانی}من هیچ ئامانج وبەرژەوەندی یەکی خودی خۆمم نی یەوغەنیمەت ودەستکەوتیش پاڵە پێوەنانی، من جگە لە ڕەزامەندی تۆ هیچ خواستێکی ترم نی یە ، یاالله یاعلیم . ئەی ئامادەبووی لای هەموو بوویەك ، ڕۆحی خۆمت فیدادەکەم ، دەی تۆش پاڕانەوەکەم وەربگرە و بێئومێدم مەکە . موسوڵمانانیش وا لێنەکەی سەرشۆڕی بەردەم دوژمنان بن ! خودایە ، ئەی میهرەبانترینی میهرەبانان ،مەمکە بە هۆکارێك بۆ مردنی موسوڵمانان ، بەڵکو بیانگێڕە بەسەرکەوتوان ! ڕۆحم بەخت دەکەم بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم ! من خوازیار بووم و تائیستاش خوازیارم بگەم بە پلەی شەهیدی لەپێناو سەربازانی ئیسلامدا . دەی خوایە چەرمەسەری موسوڵمانانم پیشان مەدە ! ئەم جارە ڕێم بۆ والاکە تالەپێناو تۆو ڕەزامەندی تۆدا شەهید ببم ئەی پەروەردگارم ! )[1] .

لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە:ئە خوای خۆشەویست،بێ دوودڵی سوێند دەخۆم بە ::عیززەت وجەلالی تۆ،،کە مەبەستم بەم جیهاد کردنە دونیای خانی نی یە بەڵکو مەبەستم ڕازیکردنی خوایە،جگە لە ڕەزامەندی تۆش هیچ مەبەستێکی ترم نی یە ئەی پەروەردگارە خۆشەویستەکەم ،سوێند بە {عیززەت وجەلالی تۆ}ئەخۆم کە من ڕێگەی تۆم گرتووەتە بەر ڕێزوو حورمەتی زیاترم بدەرێ بە شەهید بوون لەپێناو ڕێبازەکەی تۆدا.

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٩٠ .

له گێڕانەوەیەکی تردا هاتووە : ( ئەی خوداو گەورەی من ! نزاو سکالاّم قبولْ بکەو بەڕەحمەتی خۆت بارانێکی ڕەحمەت داباریّنە سەرمان ، تاوەکو تۆزی گەردەلوولەکانی دەوروبەرمان دامرکێنێتەوە . وە ڕووناکیەکمان بۆ بنێرە تاریکی یەکانی دەوروبەرمان لابدات ، تاکوو بتوانین شوێنی دوژمنانمان ببینین . تا لەپێناو بەرزکردنەوەی ئایینە خۆشەویستەکەتدا جەنگیان لەگەڵدا بکەین ، ئەی خواو گەورەی من ! موڵك و هێزهەر هی تۆیە ، ئەیدەیتە هەریەك لە بەندەکانت کە بتەوێت ، منیش بەندەیەکی دەستەوسان و هەژاری تۆم ، نهێنی و ئاشکرام دەزانیت ، سوێند دەخۆم بە{{عیزەت وجەلالی}} بەشکۆمەندی و بەرزو بڵندی تۆ کە مەبەستم لەم جیهادەدا کۆکردنەوەی ئەم دونیالەناوچووە نیيە ، بەڵکوو مەبەستم ڕەزامەندی تۆیەو هیچ شتێکی ترم جگە لە ڕەزامەندی تۆ مەبەست نی یە [١].

ئەی خودای خۆشەویست گەورەی من ! بەبەرزو بڵندی خۆت لێت دەپاڕێمەوە کە بمکەیتە فیدا بۆ هەموو موسوڵمانێك و نەمکەیتە هۆکارێك بۆ لەناو بردنی هیچ موسوڵمانێك لە پێناو ڕێگەیەکی جگە لە ڕێگا ڕاستەکەی تۆدا ! ئەی خودای گەورەی من! ئەگەر لەشەهید بوونمدا ڕزگارییەك بۆ سەربازانی موسوڵمانان هەیە ئەوا بێبەشم مەکە لە شەهیدی لەپێناو تۆدا تا بەشداربم لەبەخششی پەنای تۆدا ، چاکترین پەناش پەنای تۆیە .

ئەی خوای گەورەی من ! شەرەفمەندت کردم بەوەی ڕێنمونیت کردم بۆ ڕێگای جیهاد لەپێناو تۆدا ، جا شەرفمەندییشم زیاد بکە بەمەرگ لەپێناو تۆدا [٢].

ئەم نزاکلۆلاّنە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سوڵتان مورادپیاوێکی زۆر خواناس بووە ، بەڵگەشە بۆ ئەوەی کە سوڵتان مەرجەکانی ( لا إلـه إلا الله ) ، ووشەی

---

[1] جوانب مضيئة / ١٩٠ .

[2] جوانب مضيئة / ٤٠-٤١ .

یەکتاپەرستی بەدی هێناوە ، مەرجەکانیشی لەئاکارو ژیانی خۆیدا کۆکردوەتەوە ئەولەسەر ئەمانە بووە :

- زانیاری هەبووە دەربارەی مانای {ئەریٚ} و {نەریٚ} ی {لا الە الا اللە} ەکەو بیٚ ئاگانە بووە لیٚی ، خوادەفەرمویٚت ﴿ فاعلم أنه لا إله إلا الله ﴾ محمد: ١٩ ، واتە : بزانە هیچ پەرستراویٚك نی یە جگە لە خوا . هەروەها دەفەرمویٚت ﴿ إلامـن شـهد بالحق وهم يعلمون ﴾ الزخرف : ٨٦ ، واتە :کەسانیٚك نەبیٚت کە شایەتی بە هەم ئەدەن ومانای شایەتیەکەشیان ئەزانن،زانایان ئەفەرموون:شـهد بالحق واتە شایەتی بە{ لا الە الا اللە} ئەدەن و{يعلمون} یانی بە دلٚیش ئەزانن مانای ئەو شایەتی یە چی یە کە بەزمان دەری ئەبڕن.
- دلٚنیابوون لە{لا الە الا اللە} کە گومان ناهیٚلٚیٚت . جا سولٚتان موراد زۆر دلٚنیابوو لەمەبەستەکانی ووشەی ( لاإله إلا الله ) . چونکە ئیمانیٚك بە کەلٚك دیٚت کە یەقین ودلٚنیایی تیٚدا بیٚت نەك گومان ودوودلٚی [1].خوا دەفەرمویٚت : ﴿ إنما المؤمنون الذين آمنوا بالله ورسوله ثم لم يرتابوا وجاهدوا بـأموالهم وأنفسهم في سـبيل الله ،أولئك هم الصادقون ﴾ الحجرات : ١٥ . واتە :بە دلٚنیاییەوە ئیمانداران ئەوانەن کە بڕوایان بە خواو پیٚغەمبەری خوا هەیەو پاش ئەوە دوو دلٚی ڕوویان تیٚ ناکات لاوتیٚئەکۆشن بە مالٚ ونەفسی خۆیان لە ڕیٚگەی خوادا،ئەوانەو تەنیا ئەوانە ڕاستگۆن.
- ئەم ووشەیە داوای هەرچی لیٚبکات قەبولٚی ئەکات بە دلٚ و بە زمانی و ملکەچ ئەکات بۆ هەموو {حەلاٚلٚ} و {حەرامیٚك} کە ئەو ووشەیە بۆی دیاری ئەکات ، خوا دەفەرمویٚت : ﴿ ومن يسلم وجهه الى الله وهو محسن فقد استمسك بالعروة الوثقى وإلى الله عاقبة الأمور ﴾ لقمان : ٢٢ . واتە: هەر کەس ڕووی تەسلیم بە خوا بکات ئەوە

---

[1] معارج القبول : ٢/٤١٩ .

چاکە کاروو دەستی گرتووەبە هەڵقەی قاییمی سەر خوازییەوەو دا هاتووی هەموو کارێکیش هەر بەرەو خوا ئەبێتەوە .

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ فلاوربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما ﴾ النساء : ٦٥ . واتە :سوێند بە خوای تۆ،نابنە ئیماندار تا لە هەموو کێشەیەکی ناو خۆیاندا تۆ نەکەنە داوەروپاشان لە دڵدا بێتاقەتی نەبینن،لەو بڕیارەی تۆ ئەیدەیت و بەتەواوەتی تەسلیمی ئەبن.

- لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا ڕاستگۆو نیازپاك بوو ، بەنیازپاکی‌یەك کە پەڵەکانی هاوەڵ دانانی لە دەروونی‌دا پاك کردبووەوە . خوا دەفەرموێت : ﴿ وماأمروا إلا ليعبدوا الله مخلصين له الدين ﴾ البينة : ٥ . واتە :ئێمە هیچ فەمانێکی ترمان پێ نەکردوون ئەوە نەبێ کە تەنیا خوا بپەرەستن بە دڵێکی پاکەوە دینداری بۆ خوا بکەن.
- نیازپاك بوو بەرامبەر دروستکەرەکەی .ئامادەی بەخت کردنی گیانی بوو لە پێناوی خوادا ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ ومن الناس من يتخذ من دون الله أندادا يحبونهم كحب الله والذين آمنوا أشد حبا لله ﴾ البقرة : ١٦٥ . واتە :هەندێ کەس هەیە کە جگە لە خوا،هاوبەشی تر بۆ خوا دائەنێ وەك خوا خۆشیان ئەوێت بەڵام ئیماندارەکان خۆیان زۆرتر خۆش ئەوێ.

هەروەها دەفەرموێت ﴿ ياأيها الذين آمنوا .... لومة لائم ﴾ المائدة : ٥٤. واتە :ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە هەکەس لە ئێوە پاشگەز ببێتەوە لە ئایینەکەی ئەوە خوا میللەتێکی تر ئەهێنێت کە خۆشی ئەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش ئەوێت.ملکەچی لە ڕووی ئیمانداراندا و بە عیزەتن لە ڕووی کافراندا جیهاد لە ڕێگەی خودا ئەکەن و لە لۆمەی لۆمەکەران ناترسن ئەمەش فەزڵی خوایەو ئەیدات بە هەر کەس بیەوێت خواش فراوان و زانایە.

لە فەرموودەی صەحیحیشدا هاتووە (ثلاث من كنّ فيه وجد بهنّ حلاوة الأيمان...الخ) البخاري.

واتە:سێ شت هەن هەركەسێك بەدەستی خستن چێژی ئیمانی چەشتووە ، خواو پێغەمبەری لەهەموو كەس خۆشتر بوێت ، هەركەسێكی خۆش ویست یان ڕقی لێی بوو لەبەرخوا بێت ، حەز نەكات بچێتەوە نێو كوفرو بێدینی یەوە وەك چۆن حەز ناكات بچێتە نێو ئاگرەوە .
بەڕاستی سوڵتان موراد لە ڕاستی ئیمان و ووشەی یەكتاپەرستی تێگەشتبووە ، شوێنەوارەكانیشی لە ژیانی‌دا ڕەنگی دابویەوە ، جالە دەروونی دا هەستی بە عیززەت و و سەربڵندی ئەكرد كە ئەوەش هەڵهاویشتەی ئیمانی بوو بەخوا ، دڵنیا بوو جگە لەخوا هیچ سوود بەخشێك نی‌یە ، ئەو ژیێنەرو مرێنەرە . ئەو خاوەنی حوكم و دەسەڵات و سەروەرییەی ،پاشان هەموو ترسێك لە دڵیدا جگە لەترسی خوا ، لە بەردەم هیچ دروستكراوێكی خوادا سەری شۆڕنەدەكرد و لێی نە دەپاڕایەوەو لەبەری نەدە لەرزی ، چونكە دڵنیا بوو لەوەی هەر خوا بەتواناو گەورەیە ، ئیمان بەخوا ، هێزێكی گەورەی وای پێدابوو مكوڕوو هەڵمەتبەروو بە ئارام ونەبەردوو پشت ئەستوور بوو بەخواو هەمیشە بۆ كاری گەورەو ڕەزامەندی خوا بەرز ئە بوویەوە . بۆیە لە هەموو جەنگەكانیدا وەك شاخی سەقامگیر و چەسپاوڕادەوەستاو دڵنیابوو لەوەی كە تاكە خاوەنی خۆی و ماڵی هەر خودایە . بۆیە گوێی لێ نەبوو كە بەهەموو شتێكی گران و هەرزان لەپێناو ڕەزامەندی پەروەردگاری‌دا قوربانی بدات .
سوڵتان موراد لەگەڵ ئیمانی ڕاستەقینەدا ژیا ، بۆیە ڕای دایە نێو مەیدانەكانی جیهاد و ئەوەی لەدەسەڵاتیدا بوو لەپێناو بانگەوازی ئیسلامدا بەختی كرد . سوڵتان موراد ٣٠ساڵ بە هەموو دانایی و لێهاتنێكیەوە كە هیچ سەرۆكێكی سەردەمی خۆی شانی نەیئەدا لە شانی توانی ڕابەرایەتی .
مێژوونووسی بیزەنتی ، مالكوندیلاس لە بارەی مورادی یەكەمەوە دەڵێت :( موراد چەند كارێكی زۆرو گرنگی كرد : ٣٧شەڕی لەئەنادۆڵ و بەلقاندا كرد ،

لەهەمووشیاندابەسەرکەوتوویی دەرچوو ، لەگەڵ هاولآتیانیدا* هەڵسوکەوتێکی پڕ بەزەیی نواندووە بەبێ گوێدانە جیاوازی لە ڕەگەزوئاییندا )[1].

مێژوونووسی فەرەنسی "کرینارد" لەبارەیەوە دەڵێت : ( موراد یەکێك بوو لە گەورەترین پیاوانی ئالی عوسمان ، ئەگەر پێوەرێکی شەخسی بۆ بکەین ، دەبینین ئاستی بەرزتر بووە لە ئاستی هەموو فەرمانڕەواکانی ئەوروپا لەسەردەمی خۆیدا )[2].

(موڕادی یەکەم لەباوکیەوە میرنشینێکی گەورەی بەمیرات وەرگرت کە دەگەشتە ٩٥٠٠٠ نەوەدو پێنج هەزارکم دوجا ، لەکاتی شەهید بوونی دا ئەو میرنشینە عوسمانی یەی دا یەدەست بایەزیدی کوڕی پاش ئەوەی گەشتە ٥٠٠٠٠٠پێنج سەد هەزار کم دوجا ، بەواتای ئەوەی لەماوەی ٢٩ ساڵداله چاو ئەوەی کە ئۆرخانی باوکی بە جێ هێشتبوو زیاتر لەپێنج ئەوەندەی زیادی کرد ،) [3].

<u>ئەو ئامانجانەی کە لە سەرکەوتنی موسوڵمانەکان لەشەڕی قوصرە دا هاتنە دی</u> :

١.بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەناوچەی بەلقان و وەرچەرخانی ژمارەیەکی زۆری خانەدانە کۆن و گەورەکان بۆ نێو ئیسلام بەپێی خواستی خۆیان .

٢.ژمارەیەکی زۆری دەوڵەتە ئەوروپیەکان ناچاربوون دڵی دەوڵەتی عوسمانی بەلای خۆیاندا ڕابکێشن ، جاهەندێکیان بە دابین کردنی سەرانە بۆ عوسمانی یەکن دەستپێشخەرییان کرد ، هەندێکیش هەستان بە ڕاگەیاندنی دۆستایەتی و پشتیوانیان بۆ عوسمانی یەکان لەترسی بە هێزیان بۆ ئەوەی خۆیان بپارێزن لە توورەیی یان.

---

*ووشەی{رعیة}کاتی خۆی بۆ {هاولآتیان }بەکار هاتووە

[1] العثمانیون في التأریخ والحضارة / ١٩ .

[2] العثمانیون في التأریخ والحضارة / ١٩ .

[3] العثمانیون في التأریخ والحضارة / ٢٠ .

٣.دەسەلاتی عوسمانیەکان گەیشتە سەر میرەکانی مەجەڕو ڕۆمانیاو ناوچە نزیکە کانی ئەدریاتیك تەنانەت دەسەلاتیان گەشتە ئەلبانیاش [1].

## باسی چوارەم

## سوڵتان بایەزیدی یەکەم ( ٧٩١-٨٠٥ك ، ١٣٨٩- ١٤٠٢ز )

دوای شەهید بوونی سوڵتان موراد ، بایەزیدی کوڕی فەرمانڕەوایی گرتە دەست کە کەسێکی دلێری مەردی بەخشندەی بە وورە بوو بۆ فتوحاتی ئیسلامی ، بۆیە گرنگی‌یەکی گەورەی دا بە کاروباری سەربازی ، بۆیە میرنشینەکە مەسیحیەکانی لە ئەنادۆڵ کردە ئامانج و لەماوەی سالێکدا توانی بیانکاتە پاشکۆی دەوڵەتی عوسمانی ، بایەزید لە جموجوڵەکانی نێوان هەردووبەرەی بەلقانی و ئەنادۆلی دا وەك بروسکە بوو هەر بۆیە نازناوی ( هەورە بروسکەیان ) لێ نا [2].

یەکەم : سیاسەت لەگەڵ صربیا :بایەزید دەستی کرد بە دروستکردنی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ صربەکاندا ، هەرچەندە ئەوان هۆکاری بەرپابوونی هاوپەیمانی‌یەکی بەلقانی بوون دژی بە دەوڵەتی عوسمانی ، مەبەستی بایەزید لەم پەیوەندی‌یە بەکارهێنانی دەوڵەتی صرب بوو وەك بەربەستێك لە نێوان خۆی و مەجەڕ ، هەستی بەوە کرد کە زۆر پێویستی بە هاو پەیمانێك هەیەلەو سیاسەتە سەربازییە چالاکەی کە ئامانجە میرنشینە سەلجوقی‌یە تورکی‌یە ئیسلامی‌یەکان بوو لە ئاسیای بچوك ، بۆیە بایەزید ڕێککەوت لەسەر ئەوەی هەردوو کوڕی پاشا ( لازار) بکات کە لەشەڕی قوصرەداکوژرا بوو فەرمانڕەوایی صرب بکەن و ، وەپێویستی کرد لەسەریان کە هەردووکیان ببنە فەرمانڕەوا لەسەر صربیاو ، بەپێی یاساو داب و خوو ونەریتەکانی ولاتی صرب

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور –د. عبدالعزيز العمري / ٣٨٨ .

[2] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٤٠ .

فەرمانڕەوایی بکەن ، هەروەها لایەنگری خۆیان بۆ پاشا بنوێنن و سەرانەی بدەنێ و ژمارەیەکی دیاری کراو لەسەربازان لە تیپێکی تایبەت بە خۆیاندا بەشداری شەڕەکان بکەن [1]. دوای ئەوە بایەزد کچەکەی پاشا "لازار"ی خواست.

دووەم : <u>سەردانەواندنی بولغاریا بۆ سەروەری عوسمانییەکان</u>: پاش ئەوەی لێکگەشتن لەگەڵ صرب تەواو بوو، بایەزید گورزێکی بەپەلەی دالە بولغاریا، لە ٧٩٧ك ، ١٣٩٣زدا و دەستی گرت بەسەری دا و دانیشتوانەکەی خستەژێر ڕکێفی خۆی ، بەمەش وولات سەربەخۆیی سیاسی خۆی لەدەست دا ، کەو بولغاریا کەوتە دەست دەوڵەتی عوسمانی دەنگێکی گەورەی دایەوە لە ئەوروپاداو، ترس وبیم بێقەراری هەموو لایەکی ئەوروپادا بڵاو بوویەوە ، هێزە مەسیحییە خاچ پەرستەکانیش کەوتنە هەوڵی لەناوبردنی دەسەڵاتی عوسمانی لەبەلقاندا [2].

<u>سێیەم : کوتلە گەرایی مەسیحی خاچ پەرستی لەدژی دەوڵەتی عوسمانی</u> :

"سیجسموند" پاشای مەجەڕ لەگەڵ پاپا بۆنیفاسی نۆیەم دەستیان دایە بانگەواز بۆ کردن بۆ دروستکردنی بەرەیەکی ئەورووپی خاچ پەرستی مەسیحی لەدژی دەوڵەتی عوسمانی . ئەم بەرەش لەگەورەترین ئەو کوتلە گەراییانە بووە کە دەوڵەتی عوسمانی لەسەدەی ١٤دا بەرەنگاری بوویەوە ، لەڕووی ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی بەشدارییان تێدا کرد ، پاشان بەچەك و تفاق و ماڵ و هێز پشکداریان تێدا کرا و ژمارەی نزیکی ئەو هێرشە خاچ پەرستی یە ١٢٠٠٠٠سەدوبیست هەزار جەنگاوەر بوو لەهەمە چەشنەی ڕەگەزەکان (

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٤٠ .

[2] الدولةالعثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٤١ .

ئـەڵمانیا، فەرەنسا ، ئینگلترا ، سـكوتلەند ، سویـسرا ، ئوكـسمبۆرگ ، خاكـە نشێوەكانی باشوور و هەندێ میرنشینی ئیتاڵیاش ) [1].

هێزەكـە لـە سـاڵی {٨٠٠ك ، ١٣٩١ز} بـەرەو مەجـەڕ كەوتـە ڕێ بـەڵام سـەركردەو ڕێبـەرانی هەڵمەتەكـە پـێش دەسـت پێكردنـی شـەڕ لەگـەڵ سیجسموند ناكۆكیـان تێكـەوت ، سیجسموندوای بـەباش ئـەزانی چـاوەڕوان بێـت تـا عوسمـانی یـەكان دەسـت بەهێرش كـردن ئەكـەن ، بـەڵام سـەركردەكانی هێرشـەكە دەسـتیان كـردە هێرش بـردن وبەكـەناری ڕووبـاری دانـوب دا لێژ بوونـەوە تاگەشـتنە نیكوبـولیس لـەباكوری بـەلقان و گـەمارۆیان خـستە سـەری ، لەیەكـەمجاردا سـەركەوتن بەسـەر هێزی عوسمانیەكاندا ، بەڵام لەناكاو بایەزید بەخۆی و نزیكـەی ١٠٠٠٠٠سـەد هـەزار سـەربازەوەدەركەوت كـە بـەژمارە كـەمتر بـوون لـەژمارەی كوتلەگەرادیـیـە ئەوروپی یە خاچ پەرستیەكە ، بەڵامبە یاساو بەچەك لـەوان زاڵتر بوون ، بۆیە زۆربەی مەسیحی یەكان داڕوخان و پـەنایان بردەبـەر ڕاكـردن و هـەڵهاتن ، زۆرێك لەسەركردەكانیان كوژران و بە دیل گیران .

عوسمانیـیـەكان بەدەسـتكەوتێكی گـەورەو زۆرەوە لەجـەنگی نیكوپـولیس هاتنـە دەرەوەو دەستیان گرت بەسەر جبە خانەكانی دوژمن دا [2].

له ترۆیكه سەركەوتن و خۆشی داسوڵتان بایەزیـد وتـی:ئەمـەوێت ئیتاڵیا ئـازاد بكەم وله كوشتارگەكەی قەشە"بترس"دا لە "ڕۆما"تێر جۆ بدەم بە ئەسپەكەم. [3].

زۆرێك له خانەدانەكانی فەرەنسا لەوانە{كونت دی نیڤر} خـۆی بـەدیلی گیران ، سوڵتان بایەزیدیش پێدانی فیدیەدانی لێ قبوڵ كردن و دیلـەكانی لەگـەڵ {كونـت دی نیڤر} دائازاد كرد ، جا پابەندی كرد بە سوێند خواردن كەئیـدی نەگـەڕێتـەوە

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية –د. علي حسون / ٢٤-٢٥ .

[2] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٤٢ .

[3] محمد الفاتح –د. سالم الرشيدي / ٣٣.

بۆ جەنگ کردن لەگەڵیدا ولەگەڵ ئەوەیش دا پێی ووت : من مۆڵەتت دەدەم کە ئەو سوێندە بشکێنی ،تۆش بۆت هەیە بگەڕێیتەوە بۆ شەڕکردن لە دژی من ، چونکە هیچ شتێك لەلای من لەوەخۆشتر نی یە لە بەرانبەر هەموو مەسیحییەکانی ئەوروپابجەنگم و سەرکەوتن بەسەریان دابەدەست بهێنم[1].

بەلآم سیجسمۆندی پاشای مەجەڕ کە ئەوەندە بە هێزوو سوپاکەیدا ئەنازیوتووشی لوتبەرزی بووبوو،ئەیووت: : ئەگەرئەو ئاسمانە لەوبەرزییەوە دابڕمێت ئەوا بە نێرەکانمان ڕائەگیرنەوە کەچی لە شەڕەکە هەلآت وڕایەکرد، کە ڕودسی سەرکردەی سوارەکانیشی لەگەڵدابوو ، ئەوەندە دوور کەوتنەوە تاگەشتنە دەریای ڕەش ، کەشتی گەلێکی مەسیحیان لەوێدا بینی

قونینە ناو یەکێك لەو بەلەمانەو

، وەبەپەلە وبێ لاکردنەوە لەهیچ تێی قووچاند ، پێگەی مەجەڕ لەبەرچاوی کۆمەڵگەی ئەوروپی لەدوای جەنگی نیکوبولیس زۆر کزی کردو ئەو سام و ترسەی هەیانبووبووبە هەڵم و چوو بەهەوادا[2].ئەو سەرکەوتنە یەکلاکەرەوە کاریگەری لەسەر بایەزیدو کومەڵگای ئیسلامی زۆر دروست کرد ، بۆیە بایەزید دەستی دایە بە ناردنی نامەگەلێك بۆ گەورە کاربەدەستەکانی ڕۆژهەلآتی ئیسلامی و مۆژدەی سەرکەوتنی گەورەی بەسەر نەصاراکاندا پێدان، ئەم نوێنەرانە کە ئەچوونە کۆشکی پاشا موسوڵمانەکان هەریەکەیان کۆمەڵێك دیلی هەڵبژاردەی مەسیحی لەگەڵ بوو وەك دیاری دەستی کەسێکی سەرکەوتوو بۆ ئەوەش و بەڵگەیەکی ماددی بن لەسەرسەرکەوتنەکانی، بایەزید نازناوی "سوڵتانی ڕۆمی" وەرگرت وەك بەڵگەیەك لەسەر میراتگری دەوڵەتی سەلجوقییەکان و زاڵبوونی بەسەر نیمچە دورگەی ئەنادۆڵدا .

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية العلية –محمد فريد بك / ١٤٤.

[2] محمد الفاتح –د. سالم الرشيدي / ٣٣.

هەروەها نوێنەرینارد بۆ لای خەلیفەی عەبباسی کە لە قاهیرە دائەنیشت داوای لێکرد کە دان بەو نازناوەدا بنێت سیفەتی ڕەسمی شەرعی بداتە ئەو دەسەڵاتە ی کە ئەم باوباپیرانی مومارەسەیان کردووە ، بەو شێوەیەش سام وترسی لەجیهانی ئیسلامیدا زیاد ئە کات . شتێکی سرووشتی بوو کە {برۆق}ی مەملوکی خاوەن دەسەڵات کە پارێزەری خەلیفەی عەبباسی بوو ڕەزامەندی دا لەسەر ئەو داواکاری‌یە ،چونکە ئەم {برۆق}ە سەیر دەکات تاکە هاوپەیمانی لە دژی هێزەکانی تەیمووری لەنگ کە هەڕەشە لە دەوڵەتی مەملوکی ودەوڵەتی عوسمانی دەکات{بایەزید}ەو بەس دوای ئەمە ، هەزاران موسوڵمان کۆچیان کرد بۆ ئەنادۆڵ تا خزمەت بە دەوڵەتی عوسمانی بکەن، کۆچەکە پڕبوو لەوسەربازانەی بەشداری لەژیانی ئابووری و زانستی و دەوڵەتیان هەبوو لەئێران و عێراق و ئەودیو ڕووباردا . ئەمە جگە لەو کۆڕەوەی کە لە ترسی هێرشەکانی تەیموری لەنگ لەئاسیای ناوەڕاست ڕایان کردو هەڵاتن [١] .

چوارەم : ئابڵۆقە دانی قوستەنتینیە :بایەزید توانی لەپێش شەڕی نیکوبولیس فشاری لەسەر ئیمبارتۆری بیزەنتی توند بکات ، وەئەوە بەسەر ئیمبراتۆردا بسەپێنێت کە ئەبێت قازی‌یەك-دادوەرێك-لەقوستەنتینیە دادابمەزرێنێت تا بڕیار لە کاروباری موسوڵمانانندا . بدات وزۆی نەبرد پایتەختی بیزەنتی ئابڵۆقەدا ، ئیمبراتۆریش ئەوەی قەبوڵکرد کە دادگایەکی ئیسلامی دابمەزرێت و مزگەوتێك بکرێتەوەو حەوت سەد٧٠٠ماڵی ناوشاری تایبەت بکرێت بە ڕەوەندی ئیسلامییەوە هەروەها دەستی هەڵگرت لەنیوەی گەڕەکی غلطة (حي الغلطة ) کە سەربازگەیەکی عوسمانی تێدا بوو کە ژمارەیان ٦٠٠٠ شەش هەزارسەرباز ئەبوون ، هەروەها سەرانەی دانراوی لەسەر دەوڵەتی بیزەنتی زیاد کردو خەزێنەی عوسمانی باجی خستە سەر ڕەزەکان وکێڵگە سەوزەکانی

---

[1] في ا صول التأريخ العثماني –احمد عبد الحليم / ٥٤–٥٥.

دەرەوەی شار بلّندگۆی مزگەوتەکان دەستیان کردەگواستنەوەی بانگ بۆ ناو پایتەختی بیزەنتی [1].دوای ئەوسەرکەوتنە گەورەی عوسمانییەکان لەشەڕی نیکوبولیس بە دەستیان هێنا ، عوسمانییەکان پێیان لە بەلقان قایم کردوو ، ترس وبیم لەنێو گەلە بەلقانییەکاندا بڵاو بوویەوە و بۆ سنەو بولغاریا ملیان کەچکرد بۆ دەوڵەتی عوسمانی ، سەربازە عوسمانییەکانیش شوێن هێزە نەصرانیەبەزیوەکان کەوتبوون ، سوڵتان بایەزیدش فەرمانڕەواکانی نیمچە دورگەی مورەی سزادا لەبەر ئەوەی ، کە یارمەتی سەربازییان پێشکەش بە هاوپەیمانانی خاچ پەرستان کردبوو[2]، وەك تۆڵە سەندنەوەیەکیش لە ئیمبراتۆری بێزەنتی لەسەر ئەو هەڵوێستە ددوژمنکارانەی کە هەیبوو بایەزید داوای لێکرد قوستەنتینیە بدات بەدەستەوە ، بەهۆی ئەمەوە ئیمبراتۆر مانوێل داوای هاوکاری لەئەوروپا کرد بەبێ هیچ سوودێك ، ڕاست ئەوەیە : دەست گرتن بەسەر قوستەنتینیە دا ئامانجێکی سەرەکی بوو لەبەرنامەی جیهادی سوڵتان بایەزیدی یەکەم دا .

بۆ مەبەستە{بایەزد}بە خۆی وسوپایەکەوە بزاوت وگەمارۆیەکی توندی خستە سەر بێزەنتەی پایتەخت و پاڵەپەستۆیەکی وای خستە سەری کە دەرچوونی بۆ نەبوو ، گەمارۆیەش دەوامی کێشا تا خەریك بوو بکەوێت، لەکاتێکدا کە ئەوروپا چاوەڕێی ئەم پایتەختەدێرینەی ئەکردلە ئەمڕۆ بە یانی دا کەچی سوڵتان پاشەکشەی کرد لەفەتح کردنی قوستەنتینیە ، لەبەرئەوەی مەترسیەکی نوێ لەسەر دەوڵەتی عوسمانی لە قوڵێکی ترەوە سەری هەڵدابوو[3].

[1] في أصول التأريخ العثماني –احمد عبدالحليم / ٥٣،

[2] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٤٢ .

[3] الدولة العثمانية –د. إسماعيل أحمد / ٤٣.

پێنجەم پێکدادانی نێوان تەیموری لەنگ و بایەزید :تەیمور لەنگ سەر بە خێزانە خانەدانەکانی وولاتی ئەودیو ڕووبارە ، لەساڵی {١٣٩٩ ز}دا ، لەسەر تەختی خوراسان دانیشت کە سەمەرقەند بنکەکەی وولاتەکە بوو ،بەسوپا ترسێنەرەکانی یەوە توانی فراوان خوازی یەکی زۆر بکات ، دەست بگرێت بەسەر زۆربەی جیهانی ئیسلامیدا ، جاهێزە گەورەکانی بە ناوئاسیادا لەدلهی‌یەوە بۆ دیمەشق و لە دەریانی ئاراڵەوە بۆ کەنداوی عەرەبی بلاو کردەوە ، وفارس وئەرمینیا و بەرزاییەکانی فورات و دیجلەوئەو ناوچانەی دەکەونە نێوان دەریای قەزوینەوە تا دەریای ڕەش هەموو داگیر کرد ، هەروەها لە ڕوسیادا دەستی گرت بەسەر ناوچە درێژەوەبووەکانی نێوان ڕووبارەکانی فولجاو دۆن و دنیبرە ،
وەڕایگەیاند کە زۆر نابات دەست بەسەر هەموو ئەو شوێنانەدا ئەگرێت کە خەڵکی تێدایە دەیکاتە موڵکی تایبەتی خۆی ، هەمیشە ئەوەی دووبارە ئەکردەوە : (پێویستە لە یەك گەورە زیاتر لەسەرزەویدا نەبێت وەك چۆن جگە لەیەك خوا لەئاسمان دانی یە ) [1].
تەیمورلەنگ بەوە دەناسرێت کە پیاوێکی دلێروو خاوەن لێهاتوویەکی سەربازی وبەهرەیەکی سیاسی بووە ، پێش ئەوەی بڕیارێکی بدایە زانیاری تەواوی‌بۆ کۆدەکردەوە وسیخوەکانی بلاوەو پێ دەکردو ، پاشان لەدوای تێڕامان و تیاوەستانێکی زۆرو دوور لە پەلە، بڕیارەکانی دەردەکرد ئەوەندە سامی هەبوولای سەربازەکانی هەر فەرمانێکی دەربکردایە خێرا جێ بەجێیان دەکرد،ئەو فەرمانە هەرچی بوایە ، تەیمور بەو پێیەی موسوڵمان بوو خاتری زانایان و پیاوانی ئایینی زۆردەگرت بەتایبەت شوێنکەوتوانی ڕێبازی( تەریقەت )ی نەقشبەندی [2].

---

[1] في ا صول التأريخ العثماني / ٥٦.

[2] في اصول التأريخ العثماني / ٥٦ .

چەند هۆکارێك هەبوون کە بەشداریان کرد لە دروستبوونی ململانێی نێوان تەیموری لەنگ و بایەزیددا ، لەوانە :

١. ئەوسەرکردانەی عێراق دابوون و تەیمور دەستی گرت بەسەرووڵاتەکەدایاندا ، پەنایان بردە بەر بایەزید ، هەروەك هەندێك لەسەرکردەکانی ئاسیای بچوك پەنایان بردەبەر تەیموری لەنگ ، جا پەنابەررانی هەردوولا هانی خانە خوێکانیان ئەدا بۆ ئەوەی شە ڕدژ بەلایەنی بەرامبەر ڕابگەیەنێت.

٢. هاندانی مەسیحی‌یەکان بۆ تەیموری لەنگ و پاڵپێوەنانی بۆ لەناو بردنی بایەزید.

٣. نامە ئاگرینەکانی نێوان هەردوولا ، جا یەکێك لەونامانەی کە تەیمور ناردبووی بۆ بایەزید کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ سوکایەتی پیێ دەکات ، کاتێك بە ناڕوونی باسی شەجەرەی بنەماڵەکەی دەکات ، وەلێبوردنی بۆ خستۆتە ڕوو بە بیانووی ئەوەی کە ئالی عوسمان چەند خزمەتگوزاریەکی بەنرخیان پێشکەش بەئیسلام کردووە ، وەئەگەر چی نامەکەی بەسیفەتی سەرکردەیەکی تورك کۆتایی پیێ هێناوە ، بەبچوك کردنەوەی شان و شکۆی بایەزیدێك کە ئەو تەحەددایەی قبوڵ کردو بڕیاری دار کرد کە بەزوویی تەیموری لەنگ پاشەکشە پیێ دەکات بۆ تەبرێزو سوڵتان ذی‌یە [1].

هەریەك لەو دووسەرکردە ، تەیمور لەنگ و بایەزید هەوڵیان بۆ فراوان کردنی دەوڵەتەکەی خۆیان ئەدا.

شەشەم : <u>داڕمانی دەوڵەتی عوسمانی</u> :تەیموری لەنگ بەسوپاکانی‌یەوە پێشڕەوی کرد و سیواسی داگیر کرد و ئەو سەربازگەیەی لەناو برد کە ئەمیر ئورتوغرلی کوڕی یەزید سەرکردایەتی دەکرد ، هەردوو سوپا لەنزیك ئەنقەرە لەساڵی ٨٠٤ ك ، ١٤٠٢ز دا بەیەك گەشتن ، سوپای بایەزید دەگەشتە

---

[1] في أصول التأريخ العثماني / ٥٧.

١٢٠٠٠٠سەدو بیست هەزار موجاهید و کە ئامادە بوون بۆ ڕووبە ڕووبونەوە لە گەڵ د>ەکەیدا ، تەیمورلەنگیش بە ڕێبەرایەتی هێزێکی بێشومار ، لە ٢٠ ی یولیوی ١٤٠٢ز واتە ٨٠٤ك دا ، کشاو سەرئەنجام مەغۆل سەرکەوتنی بەدەست هێناو ، بایەزیدیش بەدیل گیرا ، لەناو کۆت و زنجیری دێلینیدا مایەوەو تا ساڵێك دوای ئەوە مەرگ بوویە میوانی و کۆچی دوایی کرد [١].ئەم نشوستی یە بە هۆی هەڵپەو پەلە پەلکردنی بایەزیدەوە ڕوویدا ، چونکە هەڵبـژاردنی ئەو شوێنە گونجاو نەبوو کە ئەم سوپاکەی تێدا مۆڵدا، کە لە ١٢٠سودوبیست هەزار جەنگاوەر زیاتری نەبوو ، لە کاتێکدا کە سوپای بەرامبەری لە ٨٠٠ هەزار کەمتر نەبوون ، زۆرێك لەسەربازەکانی بایەزید لەشوێنێکدا لەبەر نەبوونی ئاو لوە تینوێتیدا مردن ، کاتەکەش هاوینێکی زۆر گەرم بوو ، هەر کەدووسوپاکە لەئەنقەرەدا بەیەك گەشتن ،ئەو سەربازەی تەتاریانەی لەسوپای بایەزیدا بوون لەگەڵ ئەو سەربازانەی لە میرنشینە ئاسیاییەکانەوە کە زۆر نەبوو ئازاد کرابوون وهاتبوونە ناو سوپای بایەزد ڕایان کردیانە پاڵ تەیمووری لەنگ جا سوڵتانی عوسمانی دوای ئەوەی نە خۆی و نە سوپاکەی ئەو ئازایەتی وشە ڕی مان ونەمان لە جەنگەکەدا تێدا نەما [٢].

دەوڵەتە نەصرانیەکان لە ڕۆژئاوادا دڵخۆش بوون بەسەرکەوتنی تەیموری لەنگ ، و توشی گەشکە بوون بەفەوتانی بایەزید و ئەو لەیەك هەڵوەشان وپەرشو بڵاو بوونەوەی کە دەوڵەتەکەی دووچاری بوو . پاشاکانی ئینگلترا و فەرەنساو قشتالەیش و ئیمبراتۆری قوستەنتینیە نوێنەریان نارد بۆ لای تەیمورلەنگ تا پیرۆزبایی لیٚ بکەن لەسەر ئەو سەرکەوتنە گەورەو زاڵبونەگەورەی کە بەدەستی هێناوە ، ئەوروپا باوەڕی وابوو کە بۆ هەتایی ڕزگاری بوو لەمەترسی عوسمانی

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث.

[2] محمد الفاتح –د. سالم الرشيدي / ٣٥.

کە بەردەوام دەیترساندن و هەڕەشەی لێ دەکردن [1]. تەیموری لەنگ دوای ڕوخانی بایەزید دەستی گرت بەسەر ئەزنیق و بروسەو چەندین شارو قەڵای تردا ، پاشان قەڵاکانی ئەزمیری کوتا و لەژێر چنگی سوارەکانی ڕۆوس ( سوارەکانی قدیس یوحەننا) ڕزگاری کرد بۆ ئەوەی پاساو بنێتەوە لەبەرامبەر ڕای گشتی ئیسلامی دا کە تۆمەتباریان دەکرد بەوەی گورزێکی توندی ئاراستەی ئیسلام کردووە ،بە لەناو بردنی دەوڵەتی عوسمانی ، تەیمورلەنگ لە پەلاماردان وکوشتنی سوارەکانی قدیس یوحەننا مەبەستی ئەوە بوو مۆرکی جیهاد بدات لە جەنگەکانی خۆی لە ئەنادۆڵدا [2]. هەروەها تەیموری لەنگ میرەکانی ئاسیای بچوکی گێڕایەوە بۆسەر موڵکە پێشووەکانی خۆیان ، ئەو میرنشینانەش کە دابویانە پاڵ بایەزید سەربەخۆیی خۆیانی گێ ڕانەوەو هەروەها ، تەیمورلەنگ تۆوی دووبەرەکیشی چاند لەنێوان نەوە کانی بایەزیدا چاند کە لەسەر کورسی دەسەڵات ناکۆکیان تێ کەوتبوو [3].

حەوتەم : <u>جەنگە ناوخۆیەکان</u> : لەڕاستی دا دەوڵەتی عوسمانی ڕووبە ڕووی مەترسی‌یەکی ناوخۆیی بوویەوە کە لە شێوەی جەنگێکی ئەهلی دایە خۆی دەنواند ، لەنێوان کوڕەکانی بایەزید دا لەسەر کورسی دەسەڵات ، ئەوجەنگەش ١٠ساڵی خایاند، ( ٨٠٦-٨١٦ك ، ١٤٠٣-١٤١٣ز ) ، [4]بایەزید پێنج کوڕی هەبوو ، کەلەجەنگدا بەشداریان لەگەڵدائە کرد.

موستەفا یەکێکە لەکوڕەکان گومان دەبرێت کە لەشەرەکە دا کوژرابێت ، موسی لەگەڵ باوکیدا بەدیل گیرا ، سیانەکەی تر هەڵهاتن و ڕزگاریان بوو ، گەورەکەیان

---

[1] محمد الفاتح –د. سالم الرشيدي / ٣٦.

[2] في أصول التأريخ العثماني / ٥٩ .

[3] في أصول التأريخ العثماني / ٥٩ .

[4] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٤٣ .

سولەیمان بوو کە چوو بۆ ئەدرنە و خۆی بەسوڵتانی ئەویٚ ڕاگەیاند ، عیسی چوو بۆ بروسە و بەخەڵکی ڕاگەیاند کە ئەم خەلیفەی باوکیٚتی ، محمدیش کە بچوکترینیان بوو لەگەڵ هەندیٚ سەربازدا پاشەکشەی کرد بۆ ئەماسیا لە باکوری ڕۆژهەلاٌتی ئاسیای بچوك ، جەنگ لەنیٚوان ئەوسیٚ برایەدا هەڵگیرسا و هەریەکەیان لەلایەکەوە لەنیٚوان خۆیاندا گۆشەیەکی دەوڵەتە هەڵوەشاوەکەیان بۆ خۆی دەکیٚشا ، دوژمنانیش لەهەموو لایەکەوە خۆیان بۆ مەلاٌس دابوون . پاشان تەیموری لەنگ میر موسای بەردا بۆ ئەوەی ئاگری فیتنەی پیٚ خۆش بکاتوشەڕلەنیٚوانیاندا بڵیٚسە ی زیاتر بسیٚنیٚت ئاگرەکە خۆشتر بیٚت ودەستی کردە دنەدای ئەمیان دژ بەئەویان بە شەڕوو هەندیٚکیانی بەهەندیٚکی تریان فروو ئەدا [1]. پاش ساڵیٚك تەیموری لەنگ دوای ئەوەی تەڕوو ووشکی پیٚکەوە سوتاند ، بەسوپاکەیەوە کۆچی کردو وولاٌتی بەدوای خۆیدا بەجیٚهیٚشت لەسەر خراپترین باری دەمارگیری و ویٚرانەیی و پشیٚوی بە جیٚ هیٚشت [2].ئەم قۆناغە لەمیٚژووی دەوڵەتی عوسمانی دا قۆناغی تاقیکردنەوەو ی بەلاٌبوو ، کە سەرەتا بوو بۆ پەیدابوونی دەسەلاٌت کە خۆی لە ئازادکردنی قوستەنتینیەدا بینیەوە ، سوننەتی خواییش بەردەوام وابووە کە ئوممەت ناگاتە دەسەلاٌت تا تاکو بە قۆناغە جیاوازەکانی تاقی کردنەوەدا تیٚپەڕنەبیٚت یان تا کانزاکەی لەبۆتەی ڕووداوەکاندا نەتویٚتەوە ، ئەوکاتە خوای گەورەش پیس لەپاك جیا دەکاتەوە، ئەمەش سوننەتیٚکی بەردەوام بووە لەسەر ئوممەتی ئیسلامی و پیٚچەوانەکەی ڕوونادات، خوای گەورە ویستی باوەڕداران توشی بەلاٌ و تاقی بکات تا ئیمانیان بژار بکات ، پاشان لەدوای ئەمە لەسەر زەویدا دەسەلاٌت وتەمکینیان دەستکەویٚت .

---

[1] محمد الفاتح / ٣٦ .

[2] محمد الفاتح / ٣٦ .

**تاقیکردنەوەی باوەڕداران لە پێش تەمکین کارێکی حاشا هەڵنەگرەو بۆ بژار کردنیئیمانداراتە تابونیادیان قاییم بێت وڕیشك دابکوتن پێش تەمکین ، خوا دەفەرموێت :** ﴿أحسب الناس ان یترکوا ان یقولو امنا وهم لا یفتنون{٢}ولقد فتنا الذین من قبلهم فلیعلمن الله الذین صدقوا ولیعلمن الکاذبین﴾**العنکبوت : ٢-٣ .**
**واتە :خەڵکی وادائەنێن کە وازیان لێبهێنرێت کە وتیان ئێمە ئیمانمان هێناوەو ئیدی تاقی نەکرێنەوە*ئێمە خەڵکانی پێش ئێوەشمانت تاقی کردووەتەوەو تا خوا دەری بخات کێ ڕاستگۆیسەو کێ درۆزنە.**
**فیتنە بەواتای تاقی کردنەوە بە ئەرکی قورس وگران دێت ........ وەك بەجێ هێشتنی نیشتمان و جیهاد کردنی دوژمنان و هەموو گوێڕایەڵیە قورسەکان و وازهێنان لە ئارەزووەکان وتاقیکردنەوە بە هەژاری و هەموو جۆرەکانی لێقەومان چ لەکەس وکاردا بێت وچ لە کاروو باردابێت ،هەروەها کێبەرکێ کردن لەگەڵ کافراندا لە سەر ئازاروو فرت وفێڵیان [1]. وەخۆڕاگری لەڕووی بێباوەڕان لەسەر ئازارو فێڵیان .**
**ابن کثیر ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەڵێت : پرسیارکردن لەئایەتی** ﴿**أحسب الناس**﴾ **پێی ئەوترێ {ئیستفهامی ئینکاری واتە{پرسیارکردنی نکوتی کردن} ، واتاشی ئەوەیە کە خوای گەورە هەردەبێت بەندە باوەڕدارەکانی بەپێی ئەو ئیمانەی کە لەلایانە تاقی بکاتەوە ، هەروەهالە دەفەرموودەی صەحیحدا هاتووە : ( أشد الناس بلاءا الأنبیاء ثم الصالحون ثم الأمثل فالأمثل یبتلی الرجل علی حسب دینه فإن کان في دینه صلابة زید له في البلاء ) رواه الترمذي وقال حدیث حسن صحیح .**
**پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت ) ڕوونی کردۆتەوە تاقی کردنەوە سیفەتێکی پێویستە بۆ باوەڕدار کاتێك دەفەرموێت : ( مثل المؤمن کمثل الزرع لا**

---
[1] **تفسیر النسفي : ٣/ ٢٤٩ .**

تزال الرّيح تميله ، ولايزال المؤمن يصيبه البلاء ، ومثل المنافق كمثل شجرة الأرز لا تهتز حتى تستحصد ) رواه مسلم .

سوننەتی بە توشبوون بە بلاّوو تاقیکردنەوەلەنێو هەموو ئوممەت و دەوڵەت و گەل و کۆمەڵگەیەکدا هەبووە ، بۆیە سوننەتی خواییش توشی دەوڵەتی عوسمانیش بوو ، عوسمانیەکان ، لەگەڵ ئەوەشدا کە دیاننالاّند بەدەست ناکۆکی‌یە ناوخۆیی‌یەکانەوە کەچی خڕاگربوون لەبەردەم ئەو لێقەومانەدا کە اە ئەنقەرەدا توشیان هات، تاکو محمدی یەکەم لەساڵی ١٤١٣ز دا حوکمی گرتەدەست و توانی هەموو ئەو زەویانە کۆبکاتەوە و یەکبخات کە پێشتر هی دەوڵەت بوون و لەدەستی دابوون ، بەئاگاهاتنەوەی دەوڵەت لە کارەساتی ئەنقەرە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوبەرنامە خوایی یەی کە لەسەری دەڕۆشتن کە عوسمانیەکانی کردەئوممەتێکی بەئاگادا لەڕووی بیرو باوەڕی و ئاینی و ڕەوشتی وئاکاری جیهادیەوە ، بەفەزڵی خواش عوسمانی‌یەکان گەرم گوڕی‌دیندری و ڕەوشتە بەرز و بەڕێزەکانیان خۆیانیان پاراست[1]. پاشان بەهۆی لێهاتوویی و کەم وێنەیی ئورخان و عەلائەددینی برای کە دەوڵەتە نوێکەیان پێ ڕێکخستنەوە بەهۆی ئەو کارگێڕی‌یە ی جێگەی سەرسوڕمان بوو هەروەهابەهۆی ئەو فێرکردنە بەردەوامەی نەوەو گەنجە عوسمانی‌یەکانیان وەریان دەگرت وهۆکاری تری زۆریش هەموو وای کرد کە هێزێکی زیندووی تەواوی بۆ عوسمانی‌یەکان بگەڕێتەوە ، زۆری نەبرد ئەو دەوڵەتە لە دوای کارەساتی ئەنقەرە سەرلەنوێ لەنێو ئەو داڕمان و کەلاوانەدا سەر لەنوێ ژایەوەو گەشایەوەو ئاوی ژیان و ڕۆحی شەریعەت بەڕەگ و ڕیشەیدا دەستی بە هاتوو چۆکردن

[1] في اصول التأريخ العثماني / ٦١ .

کردەوزەو سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە ڕێگە بڕین وبەرەو پێشەوە چوون کە دوژمنان و دۆستانی سەرسام کرد [١].

## باسی پێنجەم

## سوڵتان محمدی یەکەم

سوڵتان محمدی یەکەم لەساڵی {٧٨١ك – ١٣٧٩ز } ، لەدایك بووە [٢] و کاروباری ئوممەتی لەدوای مردنی بایەزیدی باوکی گرتەدەست ، لەمێژوودا بە ( محمدچەلەبی) یش ناسراوە ، بالاّی مام ناوەند بووە ، دەم و چاوی خڕ و ئەبرۆکانی پێکەوە نووسا و پێستی سپی، ڕوومەتی سورو سینگی فراوان و خاوەنی جەستەیەکی بەهێز بووە ،ئەوپەڕی چالاکی و ئازایەتی دابووە مومارەسەی زۆرانبازی دەکرد ، بەهێزترین پەتی کەوانی ڕادەکێشا ، لەکاتی فەرمانڕەواییدا بەشداری ٢٤جەنگی کردووە ٤٠ جار برینداربووە [٣] سولتان چەلەبی توانی کە زاڵ بێت بەسەر شەڕی ناوخۆیی دا بەهۆی ئەو وریایی و دووربینییەی کە هەیبوو ، هەروەها یەك یەك بەسەر براکانیدا سەرکەوت تاکو هەموو کارەکە بۆ خۆی مایەوەو بوو بەسوڵتان . حوکمی هەشت ساڵ تەمەنی لە ناو دەسەلاّت دا بۆ سەر لەنوێ بنیادنانەوەی دەوڵەت و پتەوکردنی پایەکانی بردەسەر [٤].هەندێك لە مێژوو نووسان بەدامەزرێنەری دووەمی دەوڵەتی عوسمانی دادەنێن [٥]. ئەوەی لەو سوڵتانە بەجێماوە ئەوەیە کە : ورە و لەسەرخۆیی پێکەوە بەکار دەهێنا لەکاتی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دا کە دەستی

---

[1] محمد الفاتح / ٣٧ .

[2] اخطاء يجب أن تصحح ( الدولة العثمانية ) / ٣٣ .

[3] السلاطين العثمانيون / ٤١ .

[4] محمد الفاتح –د.سالم الرشيدي / ٣٧ .

[5] السلاطين العثمانيون / ٤١ .

ئەگرتەوە بە سەریاندا پاش ئەوەی داری گوێڕایەڵی دەوڵەتیان ئەشکاند ،بۆ نمونە کاتێك دەستی گرتەوە بەسەر میری وولاتی ( قەرمان) دا کە سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند بوو،ئەوە بوو گەردنی ئازا کردوو سوێنی بەقورئان پێ خوارد کە لەمەودوا ناپاکی لەدەوڵەت نەکات دوای ئەوەش کە سوێندەکەی شکاند بۆ جاری دووەمیش لێی خۆش بوو [1].ئامانجی سیاسەتەکەی بنیادنانەوەی دەوڵەت و بەهێز کردنی بوو لەناوخۆدا لەبەر ئەوەی ئاشتی لەگەڵ ئیمپراتۆری قوستەنتینیە ڕاگەیاندوو و هاوپەیمانی لەگەڵ بەست و هەندێ لەشارەکانی سەرکەناری دەریای ڕەش و شالیای بۆ گەڕاندەوە ، {بوندوقیە}شی ئاشت کردەوە لەدوای ڕوخانی کەشتیگەلەکەی لەبەرامبەر کیبتولی و ئاژاوەکان وشۆڕشەکانی ئاسیا و ئەوروپای دامرکاندەوەو ملی بە هەندێ لەو میرنشینە . هەندێ لەو ئیماراتە ئاسیاییانەش کەچ کرد کە تەیمورلەنگ زیندووی کردبوونەوە ،ملیان دانا بۆ گوێڕایەڵی و لایەنگری کردن [2]. لەسەردەمی سوڵتان محمد داکابرایەك بەناوی "بدرالدین" کە سیفاتی زاناکانی ئاینی ئیسلامی لە خۆی نابوو لەناو خەڵکدا ناوی دەرکرد کە پێشتر لەسوپای موسای برای سوڵتان محمد دابوو ، پلەی دادوەریی{قازی} وسەربازی گرتەدەست کە بەرزترین پلەکانی ئەوکاتەی دەوڵەتی عوسمانی بوو ، ئەو قازیەش لەلایەن موسای کوڕی بایەزیدەوە باوەشی بۆ کرایەوە . خاوەنی ( الشقایق النعمانیة ) دەڵێت : ( شیخ بدرالدین محمودی کوڕی ئیسرائیلی ناسراو بە" ابن قاضي سیماونە" ، لەقەڵای سیماونە لەولاتی ڕۆم لەدایك بووە کە یەکێکە لە لادێکانی ئەدرنە کە دەکەوێتە بەشە ئەوروپیەکەی تورکیا ، باوکی دادوەری ئەوێ بوو ، هەروەها میری سەربازگەی موسوڵمانان بوو لەوێ ، ئازادکردنی ئەو قەڵایە لەسەر دەستی ئەودا

---

[1] تأریخ الدولة العلیة العثمانیة / ٢٤٩ .

[2] محمد الفاتح –الرشیدي / ٣٧ .

بوو ، لەدایك بوونی شێخ بدرالدین لەکاتی سوڵتانی غەزاکەر ( خوداوەندکار) واتە:{مورادی یەکەم} دابوو کەیەکێك بوو لەسوڵتانەکانی ئالی عوسمان ، پاشان ئەم شێخە هەر لەمنداڵیەوە زانستی لەباوکیەوە وەرگرت و قورئانی لەبەرکرد .لەلای مامۆستایەك دەستی کرد بە خوێندن بە {شاهیدی}ناوبانگی دەر کردبوو "صەرف" و "نەحو"یش لەلای مەولانا یوسف فێر بوو ، پاشان کۆچی کرد بۆوولاتی میصر ناوچە میسریەکان ، لەوێ لەگەڵ بەڕێز شەریفیجورجانی دا لەلای {مەولانا موبارەك شاهی مەنتیقی}کە مامۆستابوو لە قاهیرەدا هەندێکی تری خوێند ، پاشان لەگەڵ "موبارەك شاه"دا حەجی کردو لەلای "شێخی زەیلەعی" لەمەککە خوێندی پاشان چوو بۆ قاهیرە ولەگەڵ جورجانیدا لای "شیخ أكمل الدینی بایبور"ی خوێندی وکە لەسەر دەستی ئەم{ شێخ بدر الدین}ە دا سوڵتان فەرەجی کوڕی سوڵتان بەرقوقی پاشای میسر ( سوڵتان بەرقوقی مەملوکی میسر ) پێگەییوە .
پاشان ئەم{ شیخ بدر الدین}ە فێری جەزبەی خودایی ئەبێت ، دواتر ئەچێتە لای شیخ سعیدی أخلاطي كة لەوکاتەدا لەمیسر نیشتەجێ بوو ، ئیتر ئەوە ڕووئەدات کە ڕووی دا ( واتە بووبە موریدی ) ، "شیخی اخلاطي" ناردی بۆ تەبریز بۆ {{ئیرشادکردنی}}سۆفیزم ، دەگێڕنەوە کاتێك تەیموری لەنگ هاتە تەبریز ، بدرالدین لە لایەن ئەمیری ناوبراوەوە –واتە تەیموری لەنگ– ماڵێکی زۆرو ئەو پەڕی گەورەی پێدرا، پاشان شێخی بدر الدین هەموان بە جێ دێلێ وئەچێت بۆ بەدلیس ، پاشان ئەچێت بۆ میسر ، ئینجا بۆ حەلەب دواتر بۆ قونیە ، پاشان بۆ {تبرە} لەولاتی ڕۆم ، پاشان سەرۆکی دورگەی ساقز–کە کابرایەکی مەسیحی بوو –بانگی دەکات و ئەویش لەسەر دەستی شێخ موسوڵمان ئەبێت... ، موسا کە یەکێك بووە لە لەکوڕەکانی {عوسمانی غەزاکەر}کە دەسەلاتی پەیدا کرد بەشێخ بدرالدینی کردە داوەری سەربازەکانی ، پاشا محمد موسای برای کوشت

و شـێخی لەگـەڵ خێزانەکەیـدا لەشـاری ئـەزنیق دەسـت بەسـەر کـرد [1] . شـێخ بدرالدین محمودی کوڕی ئیسرائیل لەئەزنیق کەشارێکە لەتورکیا ، دسـتی کـرد ەبانگەشە کردن بۆ ڕێبازە گەندەڵەکەی ، بانگەوازی یەکسانی ماڵ و کەل و پەل و ئایینـەکانی دەکرد و جیاوازی نێوان موسـوڵمان و ناموسـوڵمانی لـەبیرو باوەڕدا نەدەکردو ، دەیووت : خـەلك بـران هەرچەنده بیروباوەڕو ئایینیان جیاواز بێت ، ئەوەش ئەوەیە کە ماسۆنیەتی جولەکە بانگەوازی بۆ دەکات ، بۆیە زۆرێك لە گێل و نـەزان و خـاوەن مەبەسـتە نزمـەکان دایانـە پـاڵ بانگـەوازە پڕوپوچـەکەی ، بدرالـدین چـەند خوێنـدکارێکی هـەبوو کـە بانگـەوازیان بـۆ بەرنامـە و ڕێـڕەوە خراپەکەی دەکرد . لەناودارترین ئەو بانگخوازانە کەسێکی ناسراو بە ( بیر قلیجە مستەفا ) بوو هەروەها یەکێکی تریشی هەبوو بەناوی{طورە کمال}کە ئەڵێن لـە بنـەڕەت دا جوولەکـە مەزهـەب بـووە ،دیـارە جولەکـەش هەمیـشە لەپـشت پیلانەکاندایە ، هەرلەکاتی پێغەمبەرەوە (ص ) تائەم سەردەمەی خۆشمان ، ئەو ڕێبازە خراپـە بڵاو بوویـەوە و شوێنکەوتەی زۆر بوو ، سوڵتان محمدی چەلەبی بـەرەنگاری ئـەو ڕیبـازە پڕوپوچـە بوویـەوە ویـەك لەسـەرکردەکانی بەسوپایەکی گەورەوە نـارد بـۆ شـەڕی بدرالـدین ، بەداخـەوە سـەرکردە "سیستمان" کـە محمـد چـەلەبی نـاردبووی لەسـەر دەسـتی ( بـیر قلیجـە) ی ناپـاك کـوژراو سـوپاکەی نـشوستی هێنـا ، سـوڵتان محمـد چـەلەبی سـوپایەکی تـری ئامـادەکرد ، بەسـەرکردایەتی بایەزیـد پاشـای وەزیـری یەکـەمی ، ئـەویش جـەنگی لەگـەڵ "بیرقلیجە"دا کردو لەناوچەی ( قرەبورنو) بەسەریدا سەرکەوت ، و دواتـر سزای جـەنگی درا بەسـەر "بیرقلیجـە مـستەفا"دا وەك جێبـەجێ کردنـی ئـەم فەرمانـە خوایی یە [2] کە دەفەرموێت : ﴿انما جزاء الذين يحاربون ......عذاب عظيم ﴾ المائده

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٣٣-١٣٤ .

[2] اخطاء يجب أن تصحح ( الدولة العثمانية ) / ٣٥ .

: ٣٣ .واتـه :بـه بێ گومـان پاداشتی ئەوانـەی کـه شـەڕ لەگـەڵ خـواو پێغەمبـەردا ئەکەن وهەمیشه خەریکی ئەوەن کە گەندەڵی لە زەویدا بەر پابنێت ئەوەیە کە بە خراپترین شێوە بکوژرێن یان چوار مێخە بکرێن یان دەست و قاچیان بە پێچەوانە یەکترییەوە ببڕێت یان دووربخرێنەوە لە وولات لـە زەوی ،با ئـەوە سـەر شـۆڕییەك بێـت بۆیـان لـەدونیاداو سـزایەکی سـەر سەختیـشیان لـە ئـاخیرەت دا بـۆ ئامـادە کـراوە.شـێخ بدرالـدین بـەردەوام بـوو لـە گومڕاییەکەیـدا ، وایـدەزانی کـە چـەند وڵاتێکی بەدەست دەکەوێت بەهۆی ئەو پەرتەوازەو پشێویەی کە هـەموو لایـەکی وولاتـی گرتبوویـەوە ، بدرالـدین دەیـووت: ( مـن بۆیەشـۆڕش دەکـەم تـا هـەموو جیهـان بخەمـە ژێـر ڕکێفـی خۆمـەوە ، بـەپێی بیروباوەڕەکـانی مـن کـە پـڕن لـە ئاما>ەی نادیـار جیهـان دابـەش دەکـەم بەنێو موریدەکانمـدا ، بـەهێزی زانسـت و نهـێنی یـەکتا پەرسـتی . وەیاسـاکانی ئـەهلی چـاولێگەری و ڕێبازەکـەیان پـوچ دەکەمـەوە . بەبۆنـەی فراوانـی سەرچـاوەکانمەوە هەنـدی لەحەرامـەکان حـەڵاڵ دەکـەم )[1]. میری {ئـەخلاق} لـە ڕۆمانیـا پاڵپـشتی مـاددی و سـەربازی ئـەم جـودا خوازی بیدعه چی یـه زندیقەی* کـرد، سوڵتان محمد چەلەبی لەقەرەوڵدابوو بـۆ ئەو بانگەوازە خراپە و پەتی خنکانی لێ توند کردەوە ، تاکو بدرالدین ناچار بوو کـه بپەڕێتـەوە بـۆ ناوچـەی دلـی ئورمـان –کـە ئەکەوێتـە بولغاریـای ئێـستا[2]– ، محمد شرف الدین دەربارەی هەڵهاتنی شێخ بدرالدین بۆ دڵی "ئۆرمان" دەڵێت ( ئـەو ناوچـەیە و هـەموو ئـەو ناوچانـەی دەوروبـەر مۆڵگـەی باتینیـەکان بـوو ، ئـەو ناوچەیەکه جمـەی دەهـات لـە شـوێنکەوتوانی شـۆڕشـی بابـا ئیـسحاق کـە لـەدژی

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٤٠ .

*زندیق/بەکەسێك ئەوترێت کە بە ڕووکەش ئیمانداربێت ولـە ناخـەوە بێدین بێـت سەیری {المنجد} بکە."وەرگێڕ.ا}

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٤٠ .

دەوڵەتی عوسمانی لەنیوەی سەدەی حەوتەمی کۆچی دا بەرپابوو بوو ڕووکردنی شێخ بدرالدین بۆ ئەو ناوچەیە وا سەرکەوتنی لە کۆکردنەوەی هەزاران وابەستەو پشتیوان بۆ خۆی و بزوتنەوەکەی لەوناوچەیەدا بەڵگەی تەواوە کە لەبەر چی شێخ ئەو ناوچەیەی هەڵبژارد [1]. لە دلی" ئورمان" هاوکاری یە ئەوروپیەکان بۆشێخ دەستی پیٚ کرد ، سنووری ڕاپەڕین لەدژی سوڵتان محمدی یەکەم فراوان بوو ، دەستەی جودا خوازەکان کە دوژمنی ئیسلامی ڕاستەقینە بوون تا دەهات زیادی دەکردوو گەیشتە{٧}تا{٨}هەزارجەنگاوەر [2].

سوڵتان محمدی یەکەم بەوریایی و هۆشیاریەوە کاروبارەکانی جیٚ بەجیٚ دەکردو بیٚئاگا نەبوو لەوەی کە ئەو ڕاپەڕیوانە دەیانکرد ، سوڵتان خۆی هەستا بەشەڕکردن دژ بەٚ شیخ بدرالدین و ، ئەوەش بە ڕیٚبەری کردنی سوپایەکی گەورەبوو لە {دلی ئورمان} .

سولتان محمد مەڵبەندێکی بۆ سەرکردایەتی لەسیروز –یۆنانی ئەمڕۆ– دانا ، سوڵتان هێزەکانی نارد بۆ ڕاپەرینەکان و تێکی شکاندن و بدرالدینی سەرکردەی ڕاپە ڕیوەکان دوای شکاندنەکەی لەناوچەی {دلی ئورمان} خۆی شاردەوەو ڕای کرد تا نەکە وێتە لەدەست سوڵتان [3].هەواڵگیری سوڵتان محمدی یەکەم توانی ڕیزەکانی خەڵکە ڕاپەڕیوەکە لەیەك بترازێنێت و نەخشەیەکی ووردو بەهێزیان بۆ دابنیٚ ، کە ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە بدر الدینی بیدعە چی سەرکردەی ڕاپەڕیوەکان بە دیل گیرا [4]. کاتێك سوڵتان محمدی یەکەم بدرالدینی بینی پێی ووت : ئەوە چیٚیە دەبینم دەمو چاوت زەرد بووە ؟ بدرالدین وەڵامی دایەوە و

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٤٠ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٤٠ .

[3] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٤٠ .

[4] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٤٠ –١٤٢ .

ووتـی : گـەورەم خـۆر کاتێـك لـەئاوابوون نزیـك دەبێتـەوە زەرد هەڵدەگـەڕێ .
زانایانی دەوڵەت دەستیان کرد بە مونازەرەیەکی زانستی ئازاد لەگەڵ بدرالدین دا
، پاشـان دادگایـەکی شـەرعی دانـرا ، وەحـوکمی لەسـێدارە دانـی دەرکـرد پـشت
ئەسـتوور بەفـەتوای ئـەو زانایانـەی کـە بـەپێی ئـەم بـەر چاو ڕوونیـەی پێغەمبـەر
(صلى الله عليه وسلم )كە ئەفەرموێت { من اتاكم وامـركم جميعا على رجـل واحـد
يريد أن يـشق عـصاكم و يفـرق جماعتكم فـأقتلوه} واتـە:{ هـەر کەسێك هـات و لـە
کاتێکیشدا کەکاروبارەکان یەکپارچەو هەموو لەدەوری یەك کەس کۆبوونەتەوەو
ئەوئەیـەوێ داری دەسـەڵاتتان بـشکێنێ وکۆمەڵەکـەتان لـەت وپـەت بکـات ئـەوە
بیکوژن. رواه مسلم: ١٨٥٢
ئـەو ڕێـڕەوە خراپـەی کـە بدرالـدین بانگەشـەی بـۆ دەکـرد هەرهـەمان ڕێـڕەوی
ماسۆنی جولەکەی سەردەمی ئەمڕۆیە —سەدەی ١٥ی کۆچی ، ٢٠ ی زاینـی —کە
کـاری ئەوەیــە ســنوور لــەنێوان نێـوان هــەوادارانی بــیرو بـاوەڕە ئیـسلامیەیە
دروســتەکان و هــەوادارانی بــیرو بـاوەڕە خراپەکانــدا نــەهێڵێت چـونکە چـۆن
ڕێئەکەوێت برایەتی لەنێوان ئەونەی دژایەتی خواو پێغەمبەردەکەن وئەوانەی،
باوەڕداری یەکتاپەرستی دروست بێت ! [1]
سوڵتان محمدی یەکـەم حـەزی لـە شیعرو ئـەدەب و هونـەر بـوو ، دەوترێـت : ئـەو
یەکەم موسوڵمانی عوسمانیە کە دیاری ساڵانەی ناردووە بۆ ئەمیری مەککە بەو
دیاریە ئەوترا {کیسە زێڕ}کە بریتی بوو لـە بڕێکـی دیـاریکراو پـارە دەنێـردرا بـۆ
ئەمیر تا دابەشی بکات بەسەر هەژارەکانی مەککە ومەدینـەدا [2]. گـەلی عوسمانی
سوڵتان محمدی یەکەمیان خۆش دەویست و نازناوی{بەهلەوان}واتـە پاڵـەوانیان
بەسـەردا بڕیبـوو. ئەمـەش بـەهۆی ئازایـەتی و چالاکی زۆرەیـەوە بـوو. جا لەبـەر

---

[1] أخطاء يجب أن تصحح في التأريخ ( الدولة العثمانية ) / ٣٨ .
[2] تأريخ الدولة العلية العثمانية / ١٥٢ .

ئەوە کارە گەورانەی کە پێی هەڵئەساو لەبەر ئەو لێهاتوویە تایبەتی کە لەو ماوەیەدا سەرکردابەتی دەوڵەتی عوسمانی پێ کرد ودەوڵەتەکەی گەیاندە کەناوی ئارامی ولەبەر ڕەوشت وئاکاری جوان و ڕەوشت و ئاکارو دلێری و خۆشەویستی بۆ داد وڕاستی خۆشەویستی چوویە دڵی گەلەکەی دیسان نازناوی ( چلبی) بەسەردا بڕا کە ئەو نازناوێك بۆڕێزوو قەدر زانی بەکاردێت ، واتای دلێری و پیاوەتی تێدایە .

لەڕاستیدا : هەندێ لە کار بەدەستانی ئالی عوسمانی لە ئەم زیاتر ناودارن وباسیان زیاتر ئەکرێت،بەلآمدەکرێت محمدی یەکەم بەخانەدانترین کاربەدەستی عوسمانی دابنرێت ، جا مێژوو نووسە ڕۆژهەلآتی و یۆنانیەکان دانیان بە مرۆڤدۆستی ئەودا ناوە ، مێژوو نووسە عوسمانیەکانیش[1] بەوێنەی کەشتیەوانێکی لێهاتوو ئامارەی پێ دەکەن کە پارێزگاری لەسەرکردایەتی کەشتی دەوڵەتی عوسمانی کردبێت لەو کاتەدا کە، کاتێك لە لافاوی هێرشەکانی تەتەر و جەنگە ناوخۆیی یەکان وفیتنەی{باتنی یەکان}و هەڕەشەیان لەو دەوڵەتە دەکرد .

پاش ئەوەی کە سوڵتان محمدی یەکەم ئەو پەڕی هەوڵی خستە کار بۆ سڕینەوەی شوێنەوارەکانی ئەو فیتنەو ئاژاوانەی کە دەوڵەتی عوسمانی پێدا تێئەپەڕی ودەستی دایە ڕێکخستنی کارەکانی ناوخۆی دەوڵەت کە گرنتی ڕوونەدانی بشێوی ئەدات لە داهاتوودا ،لەو کاتەدا کە سوڵتان سەرقاڵی ئەم کارە گرنگانە بوو لە هەل و مەرجێکی ئارامدا هەستی بە نزیکبوونەوەی "ئەجەل "ی کردو ، هەستی کرد بە نزیك بوونەوەی مەرگی بۆیە پاشا بایەزیدی بانگ کردو پێی ووت من موورادی کوڕم بەجێگری خۆم دەستنیشان کردووە ، جا گوێڕایەڵی بکەو لەگەڵیدا ڕاستگۆبە ، وەك چۆن لەگەڵ منداڕاستگۆ بوویت ، ئێستا دەمەوێت

---

[1] في اصول التاريخ العثماني / ٦٢ .

موورادم بۆ بێنن چونكه من ناتوانم لەمەودوا له جێگەكەم دا هەستم ، جائەگەر لە پێش هاتنی ئەو فەرمانی خوا ڕوویداو من مردم وریابن مردنەكەم رامەگەیەنن تا ئەو دێت [1].

مەرگی لە ناكاو لەساڵی {٨٢٤ك - ١٤٢١ز} داهاتە سەری و ، لەشاری ئەدرنە ولەتەمەنی {٤٣} ساڵیدا رۆحی دایەوە دەست دروستكەرەكەی.

لەترسی ڕوودانی هەندێك شت كە بۆ داهاتوو باش نەئەبوو ئەگەر مردنی سوڵتان محمدیان ئاشكرا ببوایە بزانیبا ، هەردوو وەزیرەكەی ( ئیبراهیم و بایەزید ) ڕێككەوتن لەسەر شاردنەوەی هەواڵی مردنی سولاّتان لای سەربازە كان تا مورادی دووەمی كوڕی دێت بۆیە وایان بلاّو كردەوە كە سوڵتان نەخۆشە و هەواڵیان نارد بۆ كوڕەكەی ئەویش لەدوای ٤١ڕۆژ هات كلیلی حوكمڕانی گرتە دەست [2]. سوڵتان محمدی یەكەم حەزی لە ئاشتی بوو زانست و فیقهـ زانەكانی خۆش دەویست . هەربۆیە پایتەختی دەوڵەتی لە ئەدرنەوە (كە شاری جەنگاوەران)بوو گواستەوە بۆ بروسە ( كە شاری فیقهـ زانانەكان بوو ) [3] ،كابرایەكی ڕەوشت بەرزو بڕیار بەدەست و لەسەرخۆیی یەكی كەم وێنە و سیاسەتێكی بەهێزو ناوازە بوو لە هەڵسوكەوتیدا لەگەڵ دوژمنان ولەگەڵ دۆستانیدا .

## باسی شەشەم

## مورادی دووەم

سوڵتان مورادی دووەم كاروباری وولاّتی لەدوای مردنی محمد چەلەبی باوكیلە ساڵی {٨٢٤ك-١٤٢١ز} دا گرتەدەست ، كە تەمەنی لەو كاتەدا لە ١٨ ساڵ

---

[1] السلاطين العثمانيون / ٤١ .

[2] تأريخ الدولة العلية العثمانية / ١٥٢ .

[3] في أصول التأريخ العثماني / ٦٣ .

تێنەدەپەڕی ، زۆر حەزی لە جیهاد کردن لەڕێی خواو بانگەوازکردن بۆ ئیسلام بووە لەبەشەکانی ئەوروپادا [1] . لەناو هەموو ژێر دەستەکانی بەوە ناسراو بووە کە پیاوێکی لە خواترس ودادپەروەرو بەبە زەیی یە [2] . سوڵتان موراد توانی سەربکەوێت بەسەر بزوتنەوە ناوخۆییە یاخیبووەکان دا کە موستەفای مامی دروستی کردن و هەرلایەن دوژمنانی دەوڵەتی عوسمانیەوە پشتیوانی دەکران ، {مانوێلی دووەمی ئیمبراتۆری بیزەنتی} لەپشت هەموو ئەو ئاژاوەو پیلان و چەرمەسەریانەوەبوو کەسوڵتان توشی سوڵتان موراد بوونپشتیوانی ویارمەتیئەو بۆ مامی سوڵتان موڕادی کە ناوی موستەفابووای کرد ، شاری غالی بولی ئابلۆقەبدات لە پێناو سەندنەوەی لەسوڵتان و کردنی بە بنکەیەك بۆخۆی ، بەڵام سوڵتان موراد توانی مامی دەستگیر بکات وڕووبەڕووی سێدارەی بکاتەوە ، لەگەڵ ئەوەدا ئیمبراتۆر مانوێلی دووەم بەردەوام پیلانی لە سوڵتان دەکرد وباوەش بۆ برایەکی مورادی دووەم کردەوەو کردیە سەرۆکی هێزێك وپەلاماری {نیقیا}ی لە {ئەنادۆڵ}دا دەستی گرت بەسەر شارەکەداو ، مورادیش چوو بە ڕەو ڕووی و توانی هێزەکانی دالەناو بەرێت وناحەزەکەی ناچار کرد کەخۆ بەدەستەوە بدات ، پاشان کوژرا ، جا هەربۆیە سوڵتان موراد بڕیاریدا کە وانەیەکی کرداری بداتە ئیمبراتۆر ، بۆیە بەپەلە {سالونیك}ی داگیر کرد،و هێرشی کردەسە و بەشەو لە مارسی ١٤٣١ز ، ٨٣٣ك دا چوویەناوی شارەکەو بوویە بەشێکی جیانەکراوە لە دەوڵەتی عوسمانی .

سوڵتان موراد بەردەوام گورزی بەئێشی ئاراستەی بزوتنەوە یاخیبوەکانی نێو وولاتی بەلقانی دەکرد ، مکور بوو لەسەر پشتیوانیکردنی دەسەڵاتی عوسمانی لەو وولاتەدا ، سوپای عوسمانی ڕووی کردە باکور بۆ ملکەچ کردنی هەرێمی {

---

[1] اخطاء يجب أن تصحح ( الدولة العثمانية ) / ٣٨ .

[2] السلاطين العثمانيون / ٤٣ .

ولاشیا} ، وەسەرانەی سالأنەی بەسەردا سەپاند وپاشای نوێی صرب ( ستیف لازارمیتش ) ی ناچاری ملکەچ کردن کرد ، بۆ عوسمانی یەکان و چوویە ژێر دەسەلأتیان و لایەنگری خۆی بۆ سولّتان نویٚ کردەوە و پاشان سوپای عوسمانی ڕوی کردە باشور و هەستا بەپتەوکردنی پایەکانی حوکمی عوسمانی لە ولأتانی یۆنان دا ، زۆری نەبرد سولّتان لە ڕێگەی ئەم جیهادە بانگەواز ئامێزەیەوە توانی هەرچی پەرچی ڕێگەی هەیە ئەلبانیا و مەجەڕدا لە ناوی بەرێت ، عوسمانی یەکان توانیان ئەلبانیا لەسالّی ٨٣٤ك ، ١٤٣١ ز دا ئازاد بکەن و هێرشەکەیان چڕ بکەنەوە بۆسەر بەشی باشوری وولأتەکە لە باکوری ئەلبانیاش عوسمانیەکان جیهادێکی ئالیان بەرپاکرد و ئەلبانی یەکانی باکور توانیان لەشاخی ئەلبانیادا دوو سوپای عوسمانیەکان تێك بشکێنن ، هەروەك نشوستیان بە دوو هەلّمەتی تر عوسمانیەکان بهێنن کە خودی سولّتان موراد سەرکردایەتی دەکردن ، عوسمانیەکان زیانێکی قورسیان لیٚ کەوت لەکاتی پاشەکشەدا ، دەولّەتە نەصرانیەکانیش لەپشت ئەلبانەوە وەستابوون وپشتیوانیان ئەکردن دژ بە عوسمانیەکان ، بەتایبەت دەولّەتی {بوندوقیە} کە هەستی بەمەترسی جەنگە ئازادیخوازەکانی عوسمانی دەکرد بۆ ئەو هەرێمە گرنگە بەهەردوو ناردە دەریایی یەکەی وبەندەرەکانیەوە کە {بوندوقیە}ی دەبەستێتەوە بە حەوزی دەریای ناوەڕاست و جیهانی دەرەوە ، ئەوان دەیانتوانی کە کەشتیە بوندوقیەکان لەنێو دەریایەکی داخراودا گەمارۆ بدەن ، کەدەریای ئەدریاتیکە ، بەو جۆرە سولّتان موڕادی دووەم هیچ سەقامگیریەکی لەئەلبانیا بۆ حوکمی عوسمانی نەدیت [1]. ئەوەی پەیوەندی بەبەرەی مەجەڕەوە هەیە ، ئەوەیە عوسمانیەکان توانیان ، لەسالّی {٨٤٢ك-١٤٣٨ ز} دا شکست بەمەجەڕی یەکان بهێنن ، حەفتا ٧٠ هەزار سەربازیان لیٚ بەدیل بگرن و دەست

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٤٦.

بەسەر هەندێ پێگەدا بگرن ، پاشان پێشڕەویان کرد بۆ بەنگرادی پایتەختی صرب ، بەڵام لەهەوڵەکەیدا سەرکەوتوو نەبوون و بەپەلە هاوپەیمانیەتیەکی خاچ پەرستی گەورە پێك هێنرا کە پاپا پیرۆزبایی لێکرد ، ئەو هاوپەیمانێیە ئامانجی وەدەرنانی عوسمانێیەکان بوو لە هەموو ئەوروپادا ، هاوپەیمانێیەتی یەکە وڵاتی پاپاو مەجەڕو پۆڵەندەو صرب و وڵاتی{ئەخلاق} جنوە و بوندوقیەو ئیمبراتۆری بیزەنتی ودۆقیەی برجندیای گرتە خۆی هەروەها چەند لەشکرێکی ئەڵمانیای و چیکیش دایانەپاڵ هاوپەیمانیەتێیەکە ، سەرکردایەتی هێزەکانی هاوپەمانی خاچ پەرستی درایە سەرکردەیەکی مەجەڕی بەتوانا کە یوحەننا هنیادی بوو.

هنیادی هێزە ووشکانیە خاچ پەرستە سەرکردایەتی کردو بەرەو باشور کشا و لەدانوب پەڕیەوە ، دوشکستی قورسی دا لەعوسمانێیەکان لەساڵی {٨٤٦ك – ١٤٤٢ز} و عوسمانێیەکان ناچار داوای ڕێککەوتنیان کرد[1]. پەیماننامەی ڕێککەوتن لە {سیزهادن} بۆ ماوەی ١٠دەساڵ بەسترا، ئەمەش لەمانگی یۆلیۆی ساڵی ٨٤٨ك ، ١٤٤٤ز دابوو ، دەستی لەصرب کشاندەوەو دانی نا بەجورج برانکوفیتش وەك ئەمیری ئەوێ ، هەروەك سوڵتان موراد دەستی کشاندەوە لە{ئەفلاق} بۆ مەجەڕ و هاوسەری کچەکەی ( محمود شبلی ) بەبڕی ٦٠هەزار دۆقیەی ڕزگارکرد کە ڕێبەری گشتی سوپای عوسمانێیەکان بوو ، ئەو پەیماننامە یەبەهەردوو زمانی عوسمانی و مەجەڕی نوسرایەوە ، ودیسلاسی پاشای مەجەڕ بەئینجیل سوێنی خوارد ، هەروەك چۆن سوڵتان موراد بە قورئان سوێندی خوارد کە مەرجەکانی گرێبەستەکە بە وەفاداری و شەرەفەوە بپارێزن .
کاتێك موراد لەگەڵ دوژمنە ئەوروپیەانیدا لە بەستنی ئاشتینامەکە بوویەوە گەڕایەوە بۆ ئەنادۆڵ و هات بەسەر مەرگی میر عەلای کوڕی دا ، زۆر خەفەتی بۆ

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسرامي الحديث / ٤٦ .

خوارد و لە دونیاو موڵك دوور کەوتەوە و دەسەڵاتەکەی دابەزی ودایە محمدی کوڕی کە ئەو کاتە لەتەمەتی ١٤ساڵی دابوو ، لەبەر کەمی تەمەنی باوکی هەندێ لە پیاوانی دەوڵەتەکەی کە خاوەنیڕاو بۆچوون بوون لە چواردەوری کۆکردەوە ، پاشان چوو بۆ مغنیسیا لە ئاسیای بچوك ، تائەوەی ماوە لە ژیانیدا بەتەنیایی و ئارامش بیباتە سەر و لەو چۆڵەوانیەدا خۆی یەکلا بکاتەوە بۆ پەرستنی خواو تێڕامان لە مەلەکوتی* خوا ، ئەمەش دوای ئەوەی کە دڵنیا بوو لە سەقامگیر بوونی ئاسایش و ئاشتی لە بەشەکانی دەوڵەتەکەیدا ، سوڵتان زۆر خۆشی لەو چۆڵەوانی و پەرشتشە نەبرد [1] ، چونکە کاردینال سیزارینی و هەندێ لە هاوکارانی دەستیان دایە بانگەواز کردن بۆ هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامەکان لەگەڵ عوسمانییەکاندا و دەرکردنیان لە ئەوروپا بەتایبەت کە کەسێکی بێ ئەزموون...کەسێك ترسی لێی نەبووکورسی دەسەڵاتی عوسمانی لە لایەن مورادەوە بۆ کوڕە گەنجەکەی بەجێ مابوو کە کەسێکی بێ ئەزموون...کەسێك ترسی لێی نەبوو ، پاپا ئۆجینی چوارەم بەم بیرۆکە شەیتانی یە قایل بوو [2] و داوای لە مەسیحییەکان کرد پەیمانەکە و هەڵبوەشێننەوەو هێرش بەرنە سەر موسوڵمانەکان و بۆ مەسیحیەکانی ڕوون کردەوە کە ئەو پەیماننامەی لەگەڵ موسوڵمانەکاندا بەستراوە نادروستە چونکە بەبێ مۆڵەتی پاپا بەستراوە ، کە وەکیلی مەسیحە لەزەویدا ،" کاردینال سیزارینی" زۆر چاك بوو بەردەوام دەجولا ، لە کار نەدەسواو بێزارنەدەبوو ، کوششی دەکرد و هەوڵی دەدا بۆ لەناو بردنی عوسمانییەکان ، بۆیە سەردانی پاشا نەصرانیەکان و ڕێبەرەکانی

---

*"مولك"و"مەلەکوت"دوو زاراوەی لاهونی یەو مەبەست بە"مەلەکوت"شوێنی قەشەکانە لە ئاسمانەکانداو ووشەیەکی سریانی یە

[1] محمد الفاتح –الرشيدي / ٤٢-٤٣ .

[2] محمد الفاتح –الرشيدي / ٤٢-٤٣ .

دەکردو هانی دەدان لە سەر پوچەڵ کردنەوەی پەیماننامەکە لەگەڵ موسوڵمانان دا ، وەهەموو کەسێکی قایل دەکرد کە ڕەخنەی لەشکانی گرێبەستەکەدا هەبوایە ، وەپێی دەووت : ئەو بەناوی پاپاوە گەردنیان ئازاد ئەکات ئەگەر پەیماننامەکە بشکێنن ،بەرەکەت ئەخاتە ناو سەربازەکان وچەکەکانیان وپێویستە شوێن ڕێگەکەی بکەوتنایە ، چونکە ئەوە ڕێگەی شکۆمەندی ورزگار بوونە ، هەرکەسێکیش دوای شکاندنی پەیماننامەکە ویژدانی ئازاری بدات وهەست بەگوناهباری بکات ئەوە ئەم لەجیاتی ئەودا گوناهەکە هەڵدەگرێت [1].

نەصرانیەکان پەیمانەکەیان شکاندو دەستیان کردە کۆکردنەوەی سوپا بۆ دژایەتی کردنی موسڵمانان و شاری ( فارنا) ی بولغاریان گەمارۆ داکە دەکەوێتە سەرکەناری دەریای ڕەش ئەم شارە لەسەر دەستی موسوڵمانان ئازاد کرابوو ، پەیمان شکاندن دیاردەیەکی ئاشکرایە لەدوژمنانی ئەم ئایینەدا ، بۆیە خوای گەورە لەسەر موسوڵمانانی پێویست کردووەوکە لەگەڵیاندا بجەنگن وەك دەفەرموێت : ﴿فقاتلوا أئمة الكفر إنهم لا أيمان لهم لعلهم ينتهون ﴾ التوبه : ١٠ . واته : بجەنگن لەگەڵ سەرانی سەرانی{بێدینی} دا،ئەوانە گوێ بە پەیمان نادەن تا كوو بەڵکو دەست لەوە هەڵبگرن .پارێزگاری لەپەیمان وسوێندی خۆیان ناکەن وەك سرووشتی هەمیشەییان خۆیان لە پەلاماری هیچئوممەتێك ناپارێزن بێهێزییان لە هەر کەسێکدا شك برد ئەیکوژن و سەری ئەبڕن ،خوای گەورە زۆر ڕاست وێنەیان دەگرێت و دەفەرموێت{لا یر قبون في مؤمن الا ولا ذمة وأولئك هم المعتدون} التوبة/١٠ واتە:بەرانبەر موسڵمانان نە خزمایەتی و نە پەیمان ناکەن وئائەوانەن سنوور بەزێن.

کاتێك مەسیحی یەکان دەستیان بە جوڵان وهەڵمەتبردن بۆ دەوڵەتی عوسمانی کردموسوڵمانان لەئەدرنە ئەو بزوتنەو کشانەی خاچ پەرستەکانیان بیست ،

---

[1] محمد الفاتح / ٤٤ .

ترس و بیم دایگرتن و پیاوانی دەوڵەت ناردیان بۆ لای سوڵتان موراد و داوایان لێکرد پەلە بکات لە هاتنی بۆ بەرەنگار بوونەوەی ئەو مەترسییە ، سوڵتانی موجاهیدیش لەخەڵوەتگەکەی دەرچوو بۆ ئەوەی سەرکردایەتی سوپا عوسمانییەکان بکات دژی مەترسی خاچ پەرستی ، موراد توانی لەگەڵ کەشتیگەلی {جەنەوی}دا ڕێك بکەوێت تاکوو ٤٠چل هەزار سەربازی لەسوپای عوسمانی لە ئاسیاوە بۆ ئەوروپا بۆ بگوێزێتەوە بە دیاری چاوو گوێی کەشتیگەلی خاچ پەرستانیشەوە و لەبەرامبەر دینارێك بۆ هەر سەربازێك . سوڵتان موراد زۆر پەلەی دەکرد لە ڕۆشتندا و لەهەمان ئەو ڕۆژەی خاچ پەرستەکان گەشتبوونە {ادرنە} ئەویش گەشتە ئەوێ ، لەڕۆژی داهاتوودا شەڕ لەنێوان هەردوو سوپای نەصرانی و ئیسلامیدا هەڵگیرسا کە شەڕێکی زۆر توند و گەرم بوو ، سوڵتان موراد ئەو گرێبەستەی کە دوژمنەکانی شکاندبوویان خستە سەر ڕمێك تا بیبینن وئاسمان و زەویش شایەتی بدەن لەسەر ناپاکی و سنور بەزاندنیان ، هەروەها بۆ ئەوەی وورەی سەربازەکانی خۆشی زیاد بکات .هەردوو تاقم دایان لەیەکترو شەڕێکی ترسناك لەنێوانیاندا ڕووی دا کە خەریك بوو سەرکەوتن بۆ مەسیحییەکان دروست ببێت ، لە ئەنجامی زیاتری گوڕو تینی ئایینییان ، بەڵام ئەو گەرمی و وورە زیادەیان ڕووبەڕووی ئەو گیانە جیهادی یە بوویەوە کە عوسمانییەکان هەیانبووپاشا لادیسلاسی پەیمان شکێن لەگەڵ سوڵتان مورادی بەوەفا بۆپەیماننامەکانی ڕووبەڕوو وەستانەوەوهەڵگژان بەیەکدا ، جەنگێکی ترسناك لەنێوانیاندا ڕووی دا وسوڵتان موڕادی موسوڵمان توانی پاشای نەصرانی مەجەڕی بکوژێت ، بەوەی بەپەلەڕمێکی بە هێزی تیێ بگرێت ولە ئەسپەکەی خستیە خوارەوەو هەندێ لەموجاهیدەکان بەپەلە سەریان لە

لاشـەی كـردەوەو بەتەهلیلـەو تـەكبیر كردنـەوە بـەڕمێك بـەرزیان كـردەوە و زۆر دڵخۆش بوون [1].

یەكێك لە موجاهیدەكان بەنێو دوژمنەكاندا هـاواری كـرد :ئـەی بێباوەڕان ! ئـەوە سەری پاشاكەتانە .

ئەو دیمەنە كاریگەری‌یەكی گەورەی هەبوو لەسەر هەموو نەصرانیەكان و ترس و ڕاڕایـی دایگـرتن و موسـوڵمانەكانیش هەڵمـەتێكی بـەهێزیان كردنەسـەر و ڕیزەكانیـانی تێكـشكاندو بـەخراپترین شـێوە شكـستیان پـێ هێنـان ، مەسیحی‌یەكانیش بەهەڵهاتنـەوە وەرچـەرخان و هەنـدێكیان پاڵیـان بەهەنـدێكی تریانەوەدەنا ، سوڵتان موراد شوێن پێی هەڵنەگرتن بەڵكو بەو هێندە سەركەوتنە وازی هێنـا ، بەڕاسـتیش ئـەوە سـەركەوتنێكی گـەورە بـوو [2]، ئـەو جەنگـە لـە كەنارەكانی قوصرەو لـە ١٧ی ئەكتۆبـەری ٨٥٢ك ، ١٤٤٨ز ڕوویدا، كە جەنگەكە سێ ڕۆژی خایاند و بەسـەركەوتنێكی پشتبشكێن بۆ عوسمانی‌یەكان كۆتـایی پێهـات [3]. ئـەو شـەڕە وڵاتـی مەجـەڕی بەلایـەنی كەمـەوە بۆ مـاوەی ١٠ سـاڵ لـە ڕیزی ئەو وڵاتانەدا دەر هێنا كە دەیتوانی هەستێت بە جەنگ و هێرشبردن دژی عوسمانی‌یەكان.

سـوڵتان مـوراد دەسـتبەرداری دونیـا نەویـستی وپاشـایەتی نـەبوو ، بـەڵكو جـارێكی‌تر لەسـەر كورسـی دەسـەڵات دابـەزی بـۆ محمـدی كـوڕی و چـویەوە بـۆ كەنارگیری‌یەكـەی خـۆی لـە مەغنیـسیا ، هـەروەك چـۆن شـێری سـەركەوتوو دەگەڕێتەوە بۆ نێو لانەكەی خۆی ، مێـژوو كۆمـەڵێك لـە پاشـاو فەرمانڕەواكانمان بـۆ بـاس دەكـات كە لەسـەر كورسـی دەسـەڵاتیان دابـەزیون و لەخـەڵك دا بڕاون و

---

[1] محمد الفاتح –عبدالسلام عبدالعزيز / ٢٢ .

[2] محمد الفاتح –عبدالسلام عبدالعزيز /٤٦.

[3] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٤٧ .

پاشان چوون بۆ کەنارگیری ، هەندێك لەوپاشایانەش گەڕاونەتەوە بۆ کورسی دەسەڵات ، بەڵام باسی ئەوە نەکراوە کە هیچ یەکێکیان دوو جار لە کورسی دەسەڵات دەبەزیبێت ، جگە لە سوڵتان موراد ، زۆر نەبوو چووبوو بۆ خەڵوەتگەی لە ئاسیای بچوکدا ، ئینکیشاریەکان لە ئەدرنە ڕاپەڕین ودەستیان دایە ئاژاوە نانەوە و یاخیبوون وگەندەڵی وپیاو کوشتن ، سوڵتان محمدیش گەنجێکی تازە پێگەشتووی کەم تەمەن بوو ، هەندێ لەپیاوانی دەوڵەت ترسان کە کارەکە ئاڵۆز بێت ، و مەترسی‌یەکە گەروەتربێت و خراپەکە تەشەنە بکات و ئەنجام خراپ بکەوێتەوە ، بۆیە ناردیان بە دوای سوڵتان مورادداو داوای هاتنیان لێ کرد تاخۆی کارەکە بگرێتە دەست [1].ئینکیشاری یەکانیش ملکەچ بوون بۆی ومحمدی کوڕیشی نارد تا ببێتە فەرمانڕەوا لە ئەنادۆڵ دا ، سوڵتان مورادی دووەمیش لەسەر کورسی دەسەڵاتی عوسمانی مایەوە ، تا کۆتا ڕۆژی ژیانی و هەموو تەمەنی لە ئازادکردنی وولاّتاندا بردە سەر [2].

<u>یەکەم : مورادی دووەم و خۆشەویستی</u> بۆ شاعیران و زانایان وکاری چاك :

{محمد حرب} دەڵێت : ( مورادی دووهەم ئەگەر هەزاریش بێت وئەو ڕێژە شیعرەشی کە لە وەستاندا یەکەم بێت و{زۆر نەبێت} هەر خاوەنی فەزڵە بەسەر ئەدەب وشیعرەوەو نکوڵی لەمە ناکرێ ، چونکە نیعمەتێك بوو بەسەر شاعیرانەوە،و لەهەفتەیەکدا دوو ڕۆژ بانگی دەکردن بۆ کۆڕەکانی خۆی تا ئەوەی لەلایانە بیڵێن و قسەو دەمە تەقێ لە نێوان ئەوان و سوڵتان دا بکەن ، ئەویش یان بەچاکی دادەنا یان بەخەوشدار یان هەڵی دەبژارد یان نەیدەویست ، زۆر جار دەستی دەستکورتانی دەگرت وجل وبەرگی بۆ دەکردن یان پیشەی بۆیان ئەدۆزییەوە تا بەو ڕێگەیە کە خۆیان دەست بخەن وئەمەش بۆ ئەوە بوو

---

1 محمد الفاتح / ٤٧ .

2 محمد الفاتح / ٢٣

لەخەمەكانی ژیان ڕزگاریان بێت وخۆیان تەرخان بكەن بۆ توانستی ووتنی شیعر ، سەردەمی ئەوشاعیرانێكی زۆری هەڵ خست)[1] .كۆشكی فەرمانڕەوا گۆڕابوو بۆ جۆرێك لە ئەكادیمیای زانستی تائاری گەشتە ئەوەی كە شاعیران لەكاتی جیهاد كردنیدا هاودەمی‌یان دەكرد[2] .یەكێ لە شیعرەكانی بریتی‌یە لە ( وەرن بایادی خوا بكەین چونكە ئێمە هەمیشە لە دونیادا نابین[3] .موڕادی دووهەم سوڵتانێكی زانای ژێری دادپەروەری دلێر بوو ، لەماڵی تایبەتی خۆی هەموو ساڵێك ۳۵۰۰ دیناری دەنارد بۆ خەڵكی مەككە و مەدینە و قودسی پیرۆز ، و گرنگی زۆری ئەدا بەكاروباری زانست و زاناو شێخ و پیاوچاكان ، میرنشینەكانی رێك خست و ڕێگەو بانەكانی ئاسایش و ئارام كردەوە وشەرع و ئاینی چەسپاندوبێباوەڕو مولحیدەكانی سەرشۆڕ كرد[4] ، "یوسف ئاساف" دەربارەی دەڵێت : كەسێكی پیاو چاك و لە خوا ترس بوو،پاڵەوان و بەڕێز بوو،حەزی لە خێر بوو خوازیاری بەزەیی و چاكە بوو[5] .

دووەم : <u>مردن و وەسیەتەكەی</u> :خاوەنی (النجوم الزاهرة )لە باسی ئەو كەسانەدا كە لە ساڵی ۸۵۵دا مردوون لەمەڕ مورادی دووەمەوە دەڵێت : ( باشترین پاشای سەردەمی خۆی بوو لەڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بە هۆی ئەو هەمووە عەقڵ و وورەو بێباكی وبەخشندەیی وئازایەتی و پلە بەرزی یەی كە هەیبوو، تەمەنی لە جیهادی ڕێی خوادا بەسەربرد ، چەندین شەڕی كرد ، و چەندین وولاتی ئازاد كردو چەندین قەڵای قایم وقولە بەرزو شاری لەچنگ دوژمنی سەرشۆڕ دەر هێنا،

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٢٤٦ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٢٤٦ .

[3] السلاطين العثمانيون / ٤٣ .

[4] تأريخ سلاطين آل عثمان / ٢٥ .

[5] تأريخ سلاطين آل عثمان / ٥٥ .

هەرچەندە ئەو زۆر خەریکی ئەو خۆشیانە ئەبوو کە دەروونەکان دەیانخواست ، پێدەچێت حاڵی وەك حاڵی هەندێك لە پیاو چاکان بوبێت کە پرسیار لە حاڵیدینی کرا ، ووتی : هەموو جارێ دێنم بە گوناه کردن ئە درێنم بەلاّم بە تۆبەکردنیش پینەی دەکەمەوە.سوڵتان مورادی دووهەم شیاوترین کەسە بەلێخۆش بوون و کەرەمی خوا ، چونکە ئەو چەندان هەڵوێستی بەناو بانگی هەبووە و لە پێشخستنی* ئیسلام و بەزاندنی دوژمندا دەستێکی بالاّی هەبووە ، ئەوەتا لەبارەیەوە دەووترێت ، ئەو پەرژینێك بووە بۆ ئیسلام و موسوڵمانان ، {خوا لێی خۆش بێت} ، و گەنجێتی لەبەهەشت دا بۆ بگێرِرێتەوە [1]، سوڵتان لەکۆشکی {ئەدرنە} لە نزیکەی ٤٧ساڵی تمەنی دا وەفاتی کرد ، لەسەر وەسیەتی خۆی -بەرەحمەت بێت - لە نزیك {مزگەوتی مورادیە} لە{بورسە} نێژرا ، وەسیەتی کرد کەهیچ لەسەر گۆرِەکەی بونیاد نەنێن و تەنیا چەند نشینگەیەك دروست بکەن لە چواردەوری گۆرِەکەیدا بۆئەوەی {حافز}و قورئان خوێنەکان تیایدا دابنیشن وقورئانی پیرۆزی لەسەر بخوێنن ووە لێتیشی دابوو لە رِۆژی هەینیشدا بنێژرێت ، ئەوەبوو وەسیەتەکەی جێبەجێ کرا[2] .

لەوەسیەتەکەیدا شیعرێکی بەجێ هێشت ،وزۆر دڵی لای ئەو ترسە بوو کە لەگۆرِێکی گەورەدا بنێژرێت چونکە ئەو دەیویست هیچ شتێك لەسەر گۆرِەکەی دروست نەکرێت و شیعرێکی لێ بنووسن کە بڵێت : رِۆژێك دێت خەڵك تیایدا خۆڵەکەم دەبینن [3].

---

[1] النجوم الزاهرة -جمال الدين تغري :١٦/٣ .

[2] السلاطين العثمانيون / ٤٣ .

*{باڵە خانە یان باڵەکۆن}مان بۆ {شرفة}ی عەرەبی داناوە"وەرگێر"

[3] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٢٤٦ .

سوڵتان موراد لەسەردەمی خۆی دا مزگەوت و خوێندنگە و کۆشك و پردی زۆری بنیات نا، لەوانە مزگەوتی ئەدرنە کە سێ باڵەخانەی *مەزنی هەبوو ، لەتەنیشت ئەو مزگەوتە شدا خوێندنگەیەك و تەکیەیەکی دروست کرد کە بەردەوام هەژارو کەمدەستەکان خۆراکیان پێدەدرا [1].

## بەشی سێیەم

## محمدی فاتح و فەتح کردنی قوستەنتینیە

### باسی یەکەم : سوڵتان محمدی فاتح

سوڵتان محمدی دووەم ( ٨٣٣-٨٨٦ك، ١٤٢٩-١٤٨١ز ) لە زنجیرەی ئالی عوسماندا بە حەوتەم سوڵتانی عوسمانی دادەنرێت و بە فاتح و باوکی چاکەکان ناوزەد دەکرێت . نزیکەی ٣٠ساڵ فەرمانڕەوایی کرد کە ئەو ماوەیە خێرو سەربەرزی بووبۆموسوڵمانان [2]. لە دوای مردنی باوکی لە ١٦ی موحەڕڕەمی ساڵی ٨٥٥ك بەرامبەر بە ١٨ی فبرایەری ساڵی ١٤٥١ز دا فەرمانڕەوایی دەوڵەتی عوسمانی گرتەدەست .

سوڵتان محمدی فاتح کە سایەتی یەکی تایبەتی وناوازەیهەیە هێزو دادپەروەری پێکەوە گرێدابوو . هەروەك هەر لەسەرەتای پێگەشتنیەوە ئیشی زۆرێك لە هاوەڵانی دا بوویەوە لە زۆرێك لەو زانستانەدا کە لەخوێندنگەی میرەکاندا دەخوێندرا وبە تایبەتیش زۆرێك لە زمانەکانی سەردەمی خۆی دەزانی وزۆر حەزی لە خوێندنەوەی کتێبەکانی مێژوو بوو ،هەر ئەمە یارمەتی دا لە دەرکەوتنی کەسایەتی یەکەیدا لە بواری کارگێڕی و مەیدانەکانی جەنگدا، تائەوەبوو لە کۆتایی‌دا لە مێژوودا بە نازناوی {محمدی فاتیح} ناسرا بەبۆنەی فەتح کردنی قوستەنتینیەوە .

---

[1] السلاطين العثمانيون / ٤٣ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٢٥٣ .

سوڵتان ئەو بەرنامەیەی گرتەبەر کە باوك و باپیرانی لە فەتح کردنەکانیاندا لە سەری دەڕۆیشتین. لە دوای ئەوەی دەسەڵاتی گرتە دەست لەدەوڵەتی عوسمانیدا بە وە ناوی دەرکرد کە هەستاوە بە دووبارە ڕێکخستنەوەی بەڕێوبەرایەتی یە بردنە جیاوازەکانی دەوڵەت. زۆریش گرنگی بە کاروبارەداراییەکان . بۆیە کەوتە کارکردن لەسەر دیاری کردنی سەرچاوەکانی دەوڵەت و ڕێگاکانی خەرج کردنی بەشێوەیەك کە ڕێگە بگرێت لە زیادە ڕۆیی و بەرزفڕی و ماڵ بە فیوڕدان ، هەروەها جەختی کردەوە لەسەر گەشە دان بە لەشکرەکانی سوپاو دووبارە ڕێکخستنەوەیان و دانانی لیستی تایبەت بە سەرباز و زیادکردنی مووچەکانیان و پشت قایم کردنیان چەکی دەستکەوتو لەو سەردەمە دا .

"محمد الفاتیح" لەسەر گەشەر پێدانی بەڕێوە بردنی هەرێمەکان دەکردو هەندێ لە کاربەدەستە پێشینەکانی لە هەرێمەکانی خۆیاندا هێشتەوە و ئەوانەی لابرد کە کەموکورتی یان کەمتەرخەمی یان لێ بەدیار کەوتبوو .

پاشان دەستی کردە گەشەدان بە کۆشکە سوڵتانییەکان و پڕچەککردنیان بەئەزمونە ئیداری و و سەربازییە باشەکان کە ئەمانە لە سەقامگیربوون و بەرەو پێشەوە چوونی دەوڵەتدا ڕۆڵی گرنگیان گێڕا.

پاش ئەوەی چەند قۆناغێکی بەرهەمداری لە چاکسازی ناوخۆییدا بڕی ، ئینجا خولیای فەتح کردنی ناوچە مەسیحییەکانی نێو ئەوروپا و بڵاو کردنەوەی ئیسلام تێیاندا .کەوتە سەری چەند هۆکارێك یارمەتی سوڵتان محمدی فاتیحیان دا لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا ، لە وانە : ئەو لاوازی یەی کە ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی تووشی هاتبوو بەهۆی ئەو هەمووە کێشمە کێشەی لەگەڵ دەوڵەتە ئەورووپی یە کانی تردا ئەیکرد،هەروەها بە هۆی ئەو ناکۆکیە ناوخۆیی یەی کە هەمو ناوچەکان وشارەکانی بێزەنتەی گرتبوویەوە .

سوڵتان محمد بەمەوە نەوەستا ، بەڵکوو بە"جیدی" کاری لە پێناو ئەوەدا ئەکرد کە فەتحی قوستەنتینیەی پایتەختی ئیمبراتۆریەتی بیزەنتی بکاتە تاجی سەر

سەری جەنگە ئازادیخوازەکانی ئەو پایتەختەی کە قەڵای گرنگو ستراتیژ بوو بۆ جموجووڵە خاچ پەرستییەکانی دژ بە جیهانی ئیسلامی بۆ ماوەیەکی زۆر کە ئیمبراتۆرییەتی بیزەنتی بە شێوەیەکی تایبەتی و مەسیحی یەت بەگشتی شانازی بەو پایتەختەوە دەکرد محمد فاتیح هات کردیە پایتەخت بۆ دەوڵەتی عوسمانی و ئەوەی بەدیهێنا سەرکردە پێشینەکانی سوپا ئیسلامییەکان لەوەو پێش نەیانتوانی بەدی بهێنن [١].

<u>یەکەم :فەتح کردنی قوستەنتینیە :</u>

قوستەنتینیە لە گرنگترین شارە جیهانییەکان ئەژمار دەکرێت ، کە لەساڵی ٣٣٠ ز دا لەسەر دەستی ئیمبراتۆری بیزەنتی قوستەنتینی یەکەم بنیات نراوە [٢].ئەم شارە پێگەیەکی جیهانی بێوێنەی هەیە ئەوەتا لەبارەیەوە دەوترێت ( ئەگەر دونیا یەك میرنشین بوایە ، ئەوا قوستەنتینیە لە بارترینی شارەکان بوو تاببێتە پایتەختەکەی ) [٣]. لەگەڵ دامەزران و بنیاتنانیدا بیزەنتییەکان کردیان بەپایتەختی خۆیان ، ئەو شارە لەگەورەترین و گرنگترین شارەکانی جیهانە .
کاتێك موسوڵمانەکان لەگەڵ دەوڵەتی بیزەنتیدا چوونە نێو جیهادەوە ، ئەو شارە لەو ململانێیەدا پێگەی تایبەتی خۆی هەبوو ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ چەندین جار مژدەی بە فەتح کردنی ئەوشارە ، لەوانە : ئەوەی کە لەکاتی جەنگی خەندەقدا ڕوویدا ، بۆیە خەلیفە و سەرکردەکانی موسوڵمانان بە درێژایی سەردەمە جیاوازەکان بۆ فەتح کردنی ئەو شارە کێبڕکێیان دەکرد ، لە خۆشی ئەوەی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ لە خۆیاندا بە دی بهێنن : (لتفتحنَ

---

[1] قيام الدولة العثمانية / ٤٣ .

[2] أوربة في العصور الوسطى –سعيد عاشور / ٢٩ .

[3] فتح القسطنطينية وسيرة السلطان محمد الفاتح –د. محمد مصطفى/ ٣٦-٤٦ .

القسطنطينية على يد رجل ، فلنعم الأمير أميرها ، ولنعم الجيش ذلك الجيش ) رواه أحمد :٣٣٥/٤ . واتە: بەدڵنیایی‌یەوە قوستەنتینیە لەسەردەستی پیاوێكدا فەتح دەكرێت ،میری ئەو سوپایە چەند میرێكی باشەو ئەو سوپایەش چەند سوپایەكی باشە{كە ئەو شارە فەتح دەكەن}.

بۆیە هەر لەڕۆژانی موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیانەوە لەسەر دەستی هێزە موسوڵمانە موجاهیدەكان یەكەم هێرشی ئیسلامی بەرەو ڕووی قوستەنتینیە لەساڵی {٤٤ك} دا كەوتە ڕێ . ئەو هیرشەش سەركەوتوو نەبوو ، چەندین هێرشی تر لەسەردەمی ئەودا دووبارە بوویەوە كە هەمان ئەنجامی پێشووی هەبوو ، هەروەها دەوڵەتی "ئومەوی" دەستی دایە هەوڵێكی تر بۆ فەتح كردنی قوستەنتینیە ، ئەو هێرشە بەبەهێزترین هێرشەكانی ئومەوی دادەنرێت بۆسەرئەو شارە ، ئەویش ئەو هێرشەبوو كە لە سەردەمی سولەیمانی كوڕی عبدالملك دا لەساڵی ٩٨ك دا ڕووی دا [1].

هەوڵدان بەردەوام بوو بۆ فەتح كردنی قەستەنتینیە ، هەروەك سەردەمی یەكەمی عەبباسی چەند هێرشێكی چڕو پڕی جیهادی دژ بە بیزەنتی بە خۆوە بینی ، بەڵام نەیتوانی بگاتە خودی قوستەنتینیە و هەڕەشە بخاتە سەری ، هەر چەندە شارەكەی كە هەژاندی و كاریگەری خستەسەر ڕووداوە ناوخۆیی‌یەكان بەتایبەت ئەو هێرشەی كە لە ڕۆژانی هارونەڕەشیدو لەساڵی{١٩٠ك} دا ڕووی دا [2] .

لەوەودوا چەند دەوڵەتۆكەیەكی ئیسلامی لە ئاسیای بچوكدا بەرپابوون ، گرنگترینیان دەوڵەتی سەلجوقییەكان بوو كە دەسەڵاتی درێژ بوویەوە تا ئاسیای بچوك ، هەروەك سەركردە ئەلب ئەرسەلان ( ٤٥٥-٤٦٥ك ، ١٠٦٣-١٠٧٢ز ) توانی نوشوستی بهێنێت بەسەر دیمۆنسی ئیمبراتۆری ڕۆم لەناوچەی ملازگرد

---

[1] إبن خلدون : ٧٠/٣ .

[2] تأريخ خليفة ابن خياط / ٤٥٨ .

له ساڵی ٤٦٤ك ، ١٠٧٠ز دا بەدیلی بیگرێت وتیری لێ بدات وبیخاتەبەندیخانەو ، پاش ماوەیەك لە دوای پەیمانبەستنێك لەبەرامبەر سەرانەی ساڵانە بۆسوڵتانی سەلجوقی ئازادی كرد ، ئەوەش نیشانەیەنەی ملكەچی بەشێكی گەورەی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی یە بۆ دەوڵەتی سەلجوقی ئیسلامی . دوای لاوازبوونی دەوڵەتی گەورەی سەلجوقیەكان ، چەند دەوڵەتێكی سەلجوقی دەر كەوتن ، لەوانە دەوڵەتی سەلجوقیەكانی ڕۆم لە ئاسیای بچوكدا كەتوانی دەسەڵاتی لە ڕۆژئاواوە درێژ بكاتەوە بۆ كەنارەكانی دەریای ئیجە و ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانیش لاواز بكات .

لەسەرەتای سەدەی ٨ی كۆچی ١٤٠ی زاینی عوسمانیەكان شوێنی سەلجوقیەكانی ڕۆمیان گرتەوە [1].

هەوڵە ئیسلامیەكانیش بۆ فەتح كردنی قوستەنتینیە سەریان هەڵدایەوە ، سەرەتاش بەوەبوو كە هەوڵێك لە ڕۆژانی سوڵتان بایەزید ( هەورە بروسكە) دا دەستی پێكرد ، كە هێزەكانی لەئابلۆقەدانی شارەكەدا لە ساڵی ٧٩٦ك –١٣٩٣ز دا سەركەوتن [2].سوڵتان دەستی كرد بە دانیشتن لەگەڵ ئیمبراتۆری بیزەنتیدا بۆ بەدەستەوەدانی شارەكە بەئاشتیانە بیداتە دەستموسوڵمانان، بەڵام ئیمپراتۆری بیزەنتە كەوتە فێڵ كردن ودەستی دەستی پێكردو بەردەوام هەوڵی دەدا یارمەتی ئەوروپیەكان لێ بگات تا ڕێگا بگرێت لە هێرشە ئیسلامییەكەی سەرقوستەنتینیە .

هاوكات سوپاكانی مەغۆل بەسەركردایەتی تەیموری لەنگ گەشتنە نێو خاكەكانی عوسمانی و دەستیان دایە ئاژاوەو گەندەڵی نانەوە سوڵتان بایەزید ناچار بوو هێزەكانی پاشەكشە پێ بكات و گەمارۆی سەر قوستەنتینیە

---

[1] قیام الدولة العثمانیة / ٤٦ .

[2] تأریخ سلاطین آل عثمان / ٤٦ .

هەڵبوەشێنێتەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل بە خۆی و هێزەکانی تری عوسمانی یەوەو لەنێوان هەردوولادا شەڕی بە ناوبانگی ئەنقەرە ڕووی‌دا کە تیایدا بایەزید"هەورە بروسکە" بەدیل گیراو دواتر لەساڵی ١٤٠٢ز دا لە بەدیلی دا مرد [1]. ئەوەبوو کە دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەکی کاتی هەڵوەشایەوەو بیرکردنەوەش لە فەتح کردنی قوستەنتینیە بۆ ماوەیەك ڕاوەستا .

کاتێك بارودۆخی دەوڵەت سەقامگیر بوویەوە ، سەرلەنوێ ڕۆحی جیهادی گەڕایەوە و لەڕۆژانی سوڵتان مورادی دووەمدا کە لەماوەی ( ٨٢٤-٨٦٣ك ، ١٤٢١-١٤٥١ز ) دەسەلاتی گرتەدەست ، چەند هەوڵێك درا بۆ فەتح کردنی قوستەنتینیە ، لە ڕۆژانی ئەودا سوپاکانی عوسمانی چەندین جار ئابلۆقەی قوستەنتینیەیان دا . ئیمبراتۆریش لە کاتی ئەو هەولانەدا لەڕێگەی ئەوانەوەکە یاخی بووبوون لەسوڵتان کاری دەکرد بۆ ئاژاوە نانەوە لەنێو ڕیزەکانی عوسمانی دا ،[2]. بەوڕێگەیەش سەرکەوتووبوو لەسەرقاڵکردنی سوڵتان لەو ئامانجە سەرەکی‌یەی کە هەردەم لەسەری سوور بوو ، بۆیە عوسمانی‌یەکان نەیانتوانی لەوسەردەمەدا ئەو خواستە بەدی بهێنن تا سەردەمی محمدی فاتحی ڕۆڵەیان کە دواتر هات وخواستەکەی هێنایە دی .

محمد فاتیح هەر لە ژیانی باوکیدا خەریکی کاروباری سوڵتانی دەبوو هەر لەو کاتەوە لە گەڵ ململانی یانەدا ئەژیا کە دەوڵەتی بیزەنتی هەیبوو لە هەل و مەرجە جۆر بە جۆرەکاندا ئاگادارییەکی تەواویشی هەبووە لەو هەموو هەوڵە عوسمانیانەی پێشتر درابوو بۆ فەتحکردنی"قوستەنتنیە". بەڵکو هەوڵە دووبارەبووەکانی پێشووی نێو دەوڵەتە ئیسلامی‌یە پێشوەکانی دەزانی . دواتر

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٥٨ .

[2] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٥٩ .

لەو کاتەی لەساڵی {٨٥٥ك - ١٤٥١ز} دا دەسەڵاتی عوسمانی گرتە دەست[1].
بەدووی فەتح کردنی قوستەنتینیەدا دەگەڕاو بیری لە فەتح کردنی دەکردەوە.
پەروەردەی زانایان ڕۆڵی بەشدار یان هەبوولە پێگەیان دنی محمد فاتح دا لەسەر خۆشەویستی ئیمان و ئیسلام و کارکردن بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ﷺ.
بۆیە پابەند بوو بە خۆشەویستی شەریعەتی ئیسلامەوە و بەلەخواترسی و خواپەرستی و خۆشەویستی زانست و زانایان ئەناسراو زۆر بڵاو بوونەوەی زانستەکان، ئەم دینداریە بەرزەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەروەردە ئیسلامی‌یە کاملەی کە هەر لەمناڵی یەوە لە ڕێنومایی یەکانی باوکی و هەوڵەکانی کەسایەتی‌یە زانستی‌یە بەهێزەکانەوە وەری گرتبوو کە لە سەرپەرشتی پەروەردەکردن یان دەکرد، هەروەها پاکی و دونیا نەویستی ئەو ماموستا گەورانەو بێفیزی و جیهادکردنی بەردەوامی دەرونی خۆیان {کە سەرپەرشتی د پێگەیاندنی محمدیان دەکرد}[2] ڕۆڵی گەورەیان هەبوو

محمدی فاتح هەر لەمنداڵیەوە لە ژێر کاریگەری زانا خواپەرستەکاندا بووە، کە تایبەتترینیان بریتی بوو لە {ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی گۆرانی} کە بەکەسێکی تەواو گەورە ناسراوە. ئەو لەسەردەمی سوڵتان مورادی دووەمی باوکی فاتح دا وانە بێژی محمدی فاتح بووە. لەوکاتەدا کە محمدی فاتح ئەمیری شاری مەگنیسیا بوو. باوکیشی ژمارەیەك لەماموستایانی بۆ ناردووە. بەڵام ئەو گوێڕایەڵی فەرمانەکانی نەکردن و هیچی نەدەخوێند و تەنانەت قورئانیشی خەتم نەکرد، سوڵتانی ناوبراویش مورادی دووهەم داوای کرد پیاوێکی بە هەیبە ت و توندو تیژبێت، ئەوانیش ماموستا (گۆرانی) یان پێ نیشان دا. ئەمیش کردی بە ماموستای کوڕەکەی و شوڵێکی پێدا تاکوو بەوە لێی بدات ئەگەر هاتوو

---

[1] الفتوح الإسلامي.ة عبر العصور / ٣٥٩.

[2] تأريخ الدولة العثمانية –د.على حسون / ٤٢.

لەفــەرمانی دەرچــوو . مامۆســتا گــۆران چــوو بــۆ لای محمــد وڕۆشــتە ژوورەوەوشوڵەکەشی هەر بە دەستەوە بوو. ئینجا ووتی : باوکت منی ناردووە بۆ فێرکردنت و لێدانت ئەگەر لەقسەی من لاتدا . سولتان محمد خانپێکەنی بەوقسەیە هات. مامۆستا گۆرانیش لە ودانیشتنەدا زۆر بەتوندی بەشوڵەکە هات بەسوڵتان محمد داو ئەوە بوو سوڵتان محمد خان ترسی لیٚ نیشت و لەماوەیەکی کەمدا قورئانی خەتم کرد [1].

ئەو پەروەردە ئیسلامییە ڕاستە قینەوو ئەو پەروەردەکەرە گەورەو بەڕێزانەی کە هەبوون بەتایبەت زانای گەورەی وەك گۆرانی کە فەرمانی نیشان ئەدراند ئەگەر بیانبینایە ناکۆکە لەگەڵ شەرعدا هەرگیز بۆ سوڵتان نەئە چەمایەوە وبە ناوی خۆی بانگی ئەکردو تەنیاتەوقەی لەگەڵ دەکردو دەستی ماچ نەدەکرد نەك ئەوە بەڵکو سوڵتان دەستی ئەوی ماچ ئەکرد ،زانای بەرزی وا زۆر سروشتی یە کە کەسانێکی گەورەی وەك محمدی فاتیح لەسەر دەستی دا پەروەردە دەبێت و موسوڵمانێکی باوەڕداری پابەند بەسنووری خوایی و فەرمان و نەهییەکانەوە بێت ، وگەورە سەیری شەریعەت بکات وپشتیوان وبەرگری کەر بێت لە دانانی ڕێو ڕەسم بۆ جێبەجێکردنی بەسەر خۆی دا پێش ئەوەی بەسەر خەڵکدا جێبەجێ بکات.سروشتی بەقوتابی ئەو پیاوە گەورانە بە کەسانی لەخواترس و پیاو چاك بن و داوای نزای خێرلە زانا ئیشکەرە چاکەکان بکات[2].

هەروەها ڕۆڵی شێخ ئاق شەمسەدین لە تەواوو کامڵ کردنی کەسایەتی محمدی فاتیح دا ئاشکرا دیارە کە هەر لەمنداڵیەوە مەسەلەی تێدا چاند کە بریتین لە :١- دووقات کردنەوەی بزوتنەوەی جیهادی عوسمانی . ٢- بەردەوام و هەر لەو منداڵی یەوە خەیاڵی بۆ ئەوە ڕادەکێشا کە تۆ ئەو میرەی کە فەرمودەکەی

---

[1] كتاب الشقائق النعمانية / ٥٢ .

[2] تأريخ الدولة العثمانية –د.علي حسون / ٤٣ .

پێغەمبەر ﷺ باسی ئەکات وئەفەرموێ {لتفتحنَ القسطنطينية على يد رجل ، فلنعم الأمير أميرها ، ولنعم الجيش ذلك الجيش } رواه أحمد :٣٣٥/٤ . واتە: بەدڵنیایی‌یەوە قوستەنتینیە لەسەردەستی پیاوێکدا فەتح دەکرێت) بۆیە محمدی فاتح خوازیاری ئەوەبوو کە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ لە ئەودا کۆتایی بێتە دی [1].

دووەم : ئامادەسازی بۆ فەتح کردن : سوڵتان محمدی دووەم هەوڵە هەمەجۆرەکانی خستە گەڕ لە پێناو نەخشەکێشان وخۆڕێکخستن بۆ فەتح کردنی قوستەنتینیە . لەمەشدا کۆمەڵە هەوڵێکی زۆری بەخەرج دا بۆ بەهێز کردنی سوپای عوسمانی لەڕێگەی هێزە مرۆیی یەکانەوە تائەوەی ژمارەیان گەشتە ٢٥٠٠٠٠دووسەد پەنجا هەزار موجاهید [2].ئەمەش بەبەراورد کردن لەگەڵ سوپاکانی دەوڵەتانی ئەوکاتەدا ژمارەیەکی گەورەبوو . هەروەك گرنگی‌یەکی تایبەتی دەدا بە مەشق پێکردنی ئەوهێزانە لەسەر هونەرە جۆراوجۆرەکانی جەنگ . ومەشقکردن لەسەر چەکی هەمە چەشنە کە سازیان بکات بۆ چالاکی‌یە سەربازی‌یە چاوەڕانکراوەکان . هەروەك فاتح گرنگی ئەدا بە ئامادەسازی‌یەکی بە هێزوو تەواو لەڕووی مەعنەوی یەوە وگیانی جیهادی تێدا ئەڕواندن وئەوەی ئەهێنایەوە بیریان کە پێغەمبەر ﷺ مەرجێکی گەورەی ئەو ئەو سوپایەی کردووە کە فەتحی قوستەنتینیە دەکات بۆ ئەوەی ببنە ئەوسوپا ی کە مەبەستە . ئەمەش هێزێکی مەعنەوی و دلێری‌یەکی بێوێنەی پێبەخشین . وەك چۆن بڵاوکردنەوەی زانایان لەنێو ڕیزەکانی سوپادا کاریگەری‌یەکی گەورەی هەبوو لەسەر بەهێز کردنی عەزمی سەربازەکان و پەیوەستی‌یان بە جیهادی ڕاست و دروستەوە بە پێی فەرمانەکانی خوای گەورە . هەروەها لەقوڵی ئەورووپی‌یەوە

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٥٩ .

[2] تأريخ الدولة العثمانية العلية / ١٦١ .

سوڵتان گرنگی زۆری  دا به بنیاد نانی قەڵای ( روملی حصار) لەسەر تەنگاوی بسفۆڕ لە تەسکترین خاڵیدا لەبەرامبەر ئەو قەڵایەوە کە لەسەردەمی سوڵتان بایەزید لە وشکانی ئاسیاییدا بونیات نرا .
ئیمپڕانۆریەتی بێزەنتی هەوڵی زۆری دا بۆ ئەوەی سوڵتان دەست لە دروستکردنی ئەو قەڵایە هەڵبگرێ لە بەرامبەر پاپەند بونێکی دارای زۆرەوەو کە پەیمانی دا ئەو بیداتە سوڵتان . بەڵام فاتح هەرسور بوو لەسەر بنیاتنانەکە لە بەر ئەوەی گرنگی سەربازی ئەوشوێنە ی ئەزانی ، ئەوە بوو قەڵایەکی بەرزی بتەوو بەهێزی تەواوکرد کە بەرزی‌یەکەی دەگەشتە ٨٢م ودوو قەڵاکە لە بەیەك وەستان وتەنیا ٦٦٠شەست سەدو شەست مەتر لەنێوانیاندا هەبوو ئەم دوو قەڵایە حوکمی هاتن و ڕۆشتنی کەشتی‌یە تێپەڕبووەکانیان دەکرد لە ڕۆژهەڵاتی {بسفور}ەوە تا ڕۆژئاوای کە ئاگری تۆ پەکانی ئەم دوو قەڵایە دەیتوانی ڕێگا بگرێت لە گەشتنی هەرکەشتی‌یەك لەوناوچانەوە کە دەکەوتنە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ قوستەنتینیە ، وەك میرنشینی تەرابزۆن و جگەلەوێش کە دەیانتوانی لەکاتی پێویستدا پشتیوانی و پاڵپشتی شارەکە بکەن [1].
أ : گرنگی دانی سوڵتان بە <u>کۆکردنەوەی چەکی پێویست</u> :سوڵتان محمد گرنگی‌یەکی تایبەتی دا بەکۆکردنەوەی چەکی پێویست بۆ فەتحکردنی قوستەنتینیە ، لە گرنگترینیان ئەو تۆپانەبوون کە گرنگی‌یەکی تایبەتی‌یان هەبوو ، بۆیە ئەندازیارێکی مەجەڕی هێنا کە بە "ئوربان" بانگ دەکرا و لەدروستکردنی تۆپدا هەڵکەوتەو لێهاتوو بوو . ئەویش پێشوازی‌یەکی چاکی لیٚ کرد و هەموو توانا دارایی و مرۆیی و ماددی‌یەکانی بۆ دابین کرد ، ئەو ئەندازیارە توانی لەڕووی نەخشەیەکەوە ژمارەیەکی تۆپی گەورە دروست بکات کە لەسەروو هەموویانەوە تۆپی ناوداری سوڵتانی بوو کە ئەڵێن: کێشی

---

[1] سلاطین آل عثمان / ٢٦ .

دەگەشتە سەدان تەن و بۆ جولاندنی پێویستی بە سەدان گای بەهێز هەبوو . سوڵتان خۆی سەرپەرشتی دروستکردن و تاقیکردنەوەی ئەو تۆپانەی دەکرد [1] .

ب: گرنگیدان بە کەشتیگەل :زیاد لەم خۆئامادەسازییەش سوڵتان فاتیح کەوتە گرنگیدانێکی تایبەت بە گەشتیگەلی عوسمانی دا بەوەی کاری کرد لەسەر بەهێز کردنی و زۆرو زیاد کردنی بە جۆرەهاکەشتیگەل ، تا ئامادەی ئەوە بێت بە ڕۆڵی خۆی لە کاتی هێرش کردنە سەر قوستەنتینیەدا، ئەوشارە دەریاییەی کە گەمارۆدانی بەبێ بوونی هێزێکی دەریایی نەدەهاتەدی تاهەستێت بەئەو ئەرکە گرنگە . باس دەکرێت : ئەو کەشتیانەی بۆ ئەو کارە ئامادەکرابون گەشتبوونە زیاتر لە ٤٠ کەشتی [2] .

ج: بەستنی پەیماننامەکان :هەروەك چۆن فاتح لەپێش هێرشی بۆسەر قوستەنتینیە ، کاری لەسەر بەرستنی گەلێك پەیماننامە کردلەگەڵ دوژمنە جۆراوجۆرەکانیدا تاخۆی بۆ تاکە دوژمنێك یەکلا بکاتەوە بۆ ئەمە پەیماننامەیەکی بەست لەگەڵ میرنشینی غەلتەی دراوسێی قوستەنتینیە لە بەری ڕۆژهەڵاتەوە کە تەنگاوی {قرن الذهبی} لەیەکی جیادەکردنەوە . هەروەها چەند پەیماننامەیەکی لەگەڵ {مەجەد}و {بوندوقیە}دا بەست کە دوو هەرێمی دراوسێی ئەوروپی بوون .

بەڵام ئەو پەیماننامانە لەوکاتەدا کە هێرش کرایە سەر قوستەنتینیە خۆیان نەگرت ونەمانەوە .ئەوە بوو چەند هێزێك لەو شارانەو جگە ئەو شارانەشەوە بۆ بەشداری کردن لەپارێزگاری کردنی لە قوستەنتینیە [3] . خۆیان گەیاندە ئەوێ وەك

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٦١ .

[2] محمد الفاتح –د. سالم الرشيدي / ٩٠ .

[3] تأريخ سلاطين آل عثمان / ٥٨ .

بەشداریکردنێکیان بۆ هاو دینەکانیان لە نەصرانیەکان هەموو ئەوە بوو پەیمان و گرێبەستەکانیان لەگەڵ موسوڵمانانندا لە بیری خۆیلن بردەوە .
لەوکاتەدا سوڵتان هێزی ساز دەدا بۆ فەتح کردن ، ئیمبراتۆری بیزەنتی هەوڵی مان ونەمانی ئەدا بۆ ئەوەی سوڵتان لە وئامانجەی لابدات بەناردنی دیاری جۆراوجۆر بۆ خۆی وناردنی "بەرتیل"بۆ هەندێ لە ڕاوێژکارانی سوڵتان بۆ ئەوەی کار بکەنە سەر بڕیارەکەی [1]. بەڵام سوڵتان سوور بوو لەسەر جێبەجێ کردنی نەخشە داڕێژراوەکەی و هیچ کام لەوانە دەستی پێ هەڵنەگرت لەئامانجەکەی .
ئیمبراتۆری بیزەنتی کە بینی سوڵتان سورە لەسەر جێبەجێ کردنی ئامانجەکەی پەنای برد بۆ داواکردنی یارمەتی لە دەوڵەتە جۆراوجۆر شارە ئەوروپیەکان ، لەسەرووی هەموویانەوە پاپای سەرکردەی ڕێبازی کاسۆلیکی ، ئەمە لە کاتێکدا کە کەنیسەکانی دەوڵەتی بیزەنتی و لەسەروو هەمووشیانەوە شاری قوستەنتینیە شوێنکەوتەی کەنیسەی ئەرسەزۆکسی بوون کە دوژمنایەتیەکی توند هەبوو لەنێوان "کاثولیك"و"ئەرسەزۆکس"دا..
ئیمبراتۆر ناچار بوو دڵی پاپاڕابگرێت وخۆی لێ نزیك بکاتەوەو ئامادە بێ خۆی دەربخات بۆ کارکردن لەسەر یەکخستنی کەنیسەی ئەرسەزۆکسی ڕۆژهەلاتی تا ملکەچی بکات بۆی . ئەمە لە کاتێکدا ئەرسەزۆکسی یەکان حەزیان بەوە نەدەکرد . لەسەر ئەمە پاپا هەستا بە ناردنی نوێنەری خۆی بۆ قوستەنتینیە و لەکەنیسەی ئەیاصۆفیا ووتاری دا و دوعا کرد بۆ پاپا و یەکخستنەوەی هەردوو کەنیسەکەی ڕاگەیاند ، ئەمەش بووە هۆی تووڕەکردنی جەماوەری ئەرسەزۆکسی لەوشارەداو هەستان بە بزوتنەوەیەکی دژایەتی کردنی ئەوکارە هاوبەشەی ئیمبراتۆری کاسولیکی،تەنانەت ، تائەوەی هەندێ لەسەر کردە

[1] فتح القسطنطينية –محمد صفوت / ٦٩ .

ئەرسەرۆکسی‌یەکان دەیانووت : ( من پێم باشترە لە شارەکانی بیزەنتەدا مێزەرەکانی تورك ببینم نەوەك کڵاوی لاتینی ) [1].

دووەم : <u>هێرشەکە</u> : قوستەنتینیە لەسیٚ بەرەوە بەئاوی دەریایی گەمارۆ درابوو ، لەتەنگاوی بسفۆڕو دەریای مەڕمەڕەو ( قرن الذهبی )کە بەزنجیرەیەکی تەواو گەورە و بەهێز پارێزگاری دەکرد لە هاتنە ناوەوەی گەشتی بۆ نێو قوستەنتینیە . زیاد لەوەش دووهێڵی پەرژین کراو لە ناوچەی ووشکانی کەناری دەریای مەرمەڕەوە چواردەوری {قەرن الذهبی} دابووکە ڕوباری"لیکۆس"لە نێوانیاندا بوو لە نێوان ئەم دوو شوراشدا بۆشاییەك هەبوو پانیەکەی ٦٠ شەست پیٚ ئەبوو شوراکەی ناوەوەش ٤٠ چل پیٚ بەرز بوو ، چەند بورجێکیشی لەسەر بوو کە بەرزی‌یان دەگەشتە ٦٠ پیٚ ، شورای دەرەوەش بەرزی‌یەکەی دەگەشتە نزیکەی ٢٥ پیٚ ، چەندبورجێکی تریش کە پڕ کرابوون لەسەربازی [2].

شارەکە لەڕووی سەربازی‌یەوە بەباشترین شارەکانی جیهان دەژمێردرا لەڕووی توندو تۆڵییەوە ، بەهۆی بوونی ئەو هەمووە شوراوقەڵانەوە زیادلەو قایمکارییە قەڵاسروشتی یانەیش کە خۆیان هەبوون ، بۆیە پێداتێپەڕینی سەخت بوو ، لەبەر ئەمە بوو لەدەیان هێرشی سەربازی کە بۆ داگیر کردنی ئەو شارە ئەکرا ڕزگاری بوو ، لەوانە ١١ هەوڵی پێشووی ئیسلامیی .

سوڵتان فاتح خۆئامادەسازی‌یەکانی قوستەنتینیەی کامڵ کردو هەواڵی زانی و نەخشە پێویستی‌یەکای ئابلۆقەدانەکەی ئامادەکرد . هەروەك خۆی هەڵدەستا بەسەردانە هەواڵگیری‌یەکان کە تێیدا قایمکارییەکان و شوراکانی قوستەنتینیەی دەبینی [3].

---

[1] محمد الفاتح –د. سالم الرشيدي / ٨٩.

[2] تأريخ سلاطين آل عثمان / ٢ .

[3] محمد الفاتح –الرشيدي / ٨٢ .

سولّتان کەوتە هەوڵی خۆشکردنی ڕێگاکانی نێوان ئەدرنە وقوستەنتینیە ، تا لەباربێت بۆ ڕاکێشانی تۆپە گەورە و زەبەلاحەکان لەوێوە بۆ قوستەنتینیە . بۆپەکان لە ئەدرنەوە بەرەو نزیکی قەستەنتینیە جولان و لەماوەی ٢مانگدا پاراستنی بەشی سوپایان تەواو کرد . تائەوەی لەڕۆژی پێنج شەممە ٢٦ی ڕەبیعولئەووەلی ٨٥٧ك ، ٦ی ئەبریلی ١٤٥٣ز دا سەربازە عوسمانیەکان بەسەرکردایەتی خودی فاتح گەشتنە چواردەوری قوستەنتینیە .

سەربازەکان کە نزیکەی ٢٥٠دووسەدو پەنجاهەزار سەرباز بوون کۆبوونەوە ، فاتیحیش وتارێکی بەهێزی بۆ دان وتیایدا هانیدان لەسەر جیهادکردن و خواستی سەرکەوتن یان شەهیدی . تیایدا خۆیەخشین و قوربانی دان و ، شەڕی ڕاستگۆیانە ی لەکاتی بەیەك گەشتنندا وە بیر هێنانەوە .

ئەوئایەتە قورئانیەشی بەسەردا خوێندنەوە کە هانیان دەدات لەسەر ئەو کارە . هەروەك ئەوفەرموودانەی پێغەمبەری ﷺ بەبیر هێنانەوە کەموژدەی دەدا بەفەتحکردنی قوستەنتینیە و گەورەیی و بەڕێزی سوپا ڕزگارکەرو ئەمیرەکەی و ئەوەی وەبیر هێنانەوە لەو فەتحکردنەدا چەندەعیززەت و سەربلندی ئیسلام و موسولمانانی تێدایە . سوپاش دەستی کرد بە ( لاإله إلا الله ) ووتن و ( الله اكبر) و دوعا کردن [1] . زاناکانیش لە نێو ڕیزی سوپاو جەنگاوەرو موجاهیدەکان دا لەگەڵیاندا بلاو بوونەوە کە ئەمەش کاریگەری خستە سەر مەعنەویەت و دەرونی هەموان تائەوەبووهەموو سەربازێك چاوەڕوانی جەنگی دەکرد زۆر بە خۆڕاگرانە ، بەڵکوو ئەوەی پێویستە لەسەری بەجێی بهێنێت [2] .

---

[1] سلاطين آل عثمان / ٢٤-٢٥ .

[2] الفتوحات الإسلامية عبر العصور / ٣٦٤ .

لە ڕۆژی داهاتوودا سوڵتان دەستی کرد بە دابەشکردنی سوپا ووشکانیەکە بەبەردەم شورا دەرەکییەکانی شاردا کە لەسیٚ بەشی سەرەکی پیٚکهیٚنابوو ، بەمە لە هەموو لاکانەوە بە توندی گەمارۆی ووشکانی دروست کرد .
هەروەك فاتح سوپاگەلیٚکی یەدەکیشی لەپشت سوپاسەرەکییەکەوە پیٚکهیٚنا .
هەروەها هەولی دامەزراندنی تۆپەکانی دا لەبەردەم شوراکاندا . گرنگترینیان تۆپی گەورەو زەبەلاحی سوڵتانی بوو کە لەبەردەم دەرگای "طب قابی"دا دانرا .
هەروەها لەپیٚگە نزیك و بەرزو جۆربەجۆرەکانی شاریشدا چەند دەستەیەکی دانا بۆ چاودیٚری کردن ، هاوکات کەشتیەیە عوسمانیەکانی بەنیٚو ئاوە کانی چواردەوری شارەکەدا بلاو کردەوە . بەلام بەهۆی بوونی زنجیرەیەکی گەورەوە کە ڕیٚگەی دەگرت لە هەر کەشتییەك بۆ چوونەناوەوە ،نە یتوانی بگاتە ( قرن الذهبي)نەك ئەمە
بەلکوو هەموو کەشتییەکی تیٚکدەشکاند کە هەولی چونە پیٚش و نزیکبوونەوەی بدایە . کە شتیگەلی عوسمانی توانی لەدەریای مەرمەڕەدا دەست بگریٚت بەسەر دوورگەکانی میواندا ( جزر الأمراء)[1] .
بیزەنتییەکان هەولیاندا ئەوپەڕی هەولەکانیان بخەنەگەڕ بۆ پاریٚزگاری کردن لە قوستەنتینیە ، بۆ ئەمە سەربازەکانیان دابەش کرد بەسەر شوراکاندا و قەلاکانیان پتەوو توندوتۆلْ کرد .
سوپای عوسمانی توانی دەست بگریٚت بەسەر شارەکەدا ، لەڕۆژانی یەکەمی ئابلۆقەدانەکەدا ڕەوشەکە ڕوودانی جەنگی نیٚوان عوسمانی وبیزەنتییە بەرگریکەرەکانی بەخۆوە نەدیت . دەرگاکانی شەهیدی کرانەوە و ژمارەیەکی زۆری عوسمانییەکان شەهید بوون بەتایبەت ئەو کەسانەی کە کاری نزیك بوونەوە لە دەرگاکانی پیٚ شپیٚردرابوو .

[1] العثمانيون والبلقان / ٨٩ .

تۆپـه عوسمانیـیـەکان لەشـوێنە جۆربـەجۆرو جیاوازەکانـەوە دەسـتیان کـردە تۆپبارانی شـارەکە دەنگـە ترسێناى ڕۆڵێکـی گـەورەى هـەبوو لـە دروسـتکردنی ترس لـەدڵی بیزەنتییـەکان دا . ئـەم تۆپبارانـە بـوو بـەهۆى ڕوخانـدنی هـەندێ لـە شوراکانی چواردەوری شارەکە ،بەڵام بەرگریکەران لەگەڵ هاویشتنی تۆپەکان دا بەپەلە شوراکانیان بنیاد دەنایەوە . کۆمەکی یە مەسیحییەکانیش لـە ئەوروپاوە بـەردەوام ئـەهات وهاوکاریـەکی زۆر لـە پێـنج کەشـتیدا کۆکرانـەوە و گەشتن بـە قوستەنتینیە کـە سـەرکردەى ئـەو کەشـتیانە جستینیان جەنـەوى لەگـەڵ ٧٠٠ جـەنگاوەرى خۆبەخـشى نێـو دەوڵـەتـە جیاوازەکـانی ئـەوروپاوە بـوون و هاودەمیـان دەکـردن . کەشـتییەکان تـوانی یـان بگەنـە پایتەختـە دێرینەکـەى بیزەنتــە لــەپاش بەرەنگاربوونەوەیــەکی دەریــایی لەگــەڵ کەشــتیگەلە ئابلۆقەدەرەکەى عوسمانییەکاندا . گەشتنی ئـەو هێـزە کاریگەرییەکی گـەورەى هەبوو لەسـەر بـەرز کردنـەوەى وورەى بیزەنتییـەکان . جەسـتینیانی سـەرکردەى کەشتییەکان کرا بە سەرکردەى هێزە بەرگریکەرەکانی شارەکە [1].

هێزە دەریاییە عوسمانییەکان هەوڵی بڕینی ئەو زنجیرە بەرزو گەورەیان دا کـە لە ( قرن الذهبي) دا دەستڕەو بوو بۆ ئەوەى کەشتی یە ئیسلامی یەکان بـەدى نەهێنا ، بۆیە تیرەکانیان وەشاند بەسەر کەشتییە ئەوروپی و بیزەنتییەکاندا . بـەڵام هەرلەسـەرەتاوە شکـستیان هێنـا لەبـەدیهێنانی ئامانجەکەیانـدا . بەمـەش ڕۆحی مەعنەوى بەرگریکەرانی شارەکە بەرز تربوویەوە [2].

قەشـە و پیـاوە ئاییزییـەکان بـەبێ بێزاربـوون بـە کۆڵانـەکانی شـارو شـوێنە قەڵاییەکانـدا دەگـەڕان و مەسـیحیەکانیان لەسـەر سـەقامگیرى و خـۆڕاگرى هانـدەداو خـەڵکیان هانـدەدا بـچن بـۆ کەنیـسەکان و هـاوار بکـەن مەسـیح و (

---

[1] العثمانيون والبلقان / ٩٢ .

[2] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٢٠ .

حەزرەتی مەریەم ) بەڵکو شارەکە ڕزگار بکەن . ئیمبراتۆر قوستەنتین بۆ ئەو مەبەستە ، بەردەوام خۆی دەچوو بۆ کەنیسەی ئایا صوفیا [1] .

سێیەم : دانیشتنەکانی نێوان محمدی فاتح و قوستەنتین :

عوسمانی یە هەڵمەتبەرەکان بۆ سەر شارەکە قارەمانانە شەڕیاندەکردو لەسەروو هەموویانەوەمحمد فاتح خۆی . بیزەنتیەکانیش بەسەرۆکایەتی قوستەنتین بەرگرییەکی قارەمانانەیان کردو. ئیمبراتۆری بیزەنتی هەوڵیدا ( شار و گەلەکەی بە هەموو فێڵ و ڕێگەیەك ڕزگار بکات کە لەتواناییدا هەبێت . بۆیە خواستگەلێکی جۆراوجۆری خستە بەردەم سوڵتان محمد لە خشتەی بەرێت وپاشە کشەی پێ بکات لەیەرانبەر بڕێك ماڵ یان گوێڕایەڵی کردندا جگە لەمانەش شتی تری زۆری خستە بەردەم. بەڵام لەبەرامبەردا فاتح ( بە ڕەحمەت بێت) یەك وەڵامی ئەدایەوە:بەدەستەوەدانی شارەکە [2]. لەو حاڵەتە شدا هیچ کەسێك وهیچ کەنیسەیەکی شار ئازاریان توش نابێ.

ناوەڕۆکی نامەکە بریتی بوو لەمە : با ئیمبراتۆرەکەتان شاری قوستەنتینیە بدات بەدەستەوە ، منیش سوێند دەخۆم سوپاکەم دەست بۆ ماڵ و گیان و ناموسی هیچ کەس نابات . کێیش ویستی بالەشارەکەدا بمێنێتەوە و بەئاسایش و ئارامش تیایدا بژیت . کێش ویستی شارەکە بەجێی بهێڵێت وکۆچی لێ بکات ، ئەوا بۆ کوێ حەز دەکات بابچێت وئارامەو ئاشتی پارێزراوە [3] .

بەمانەوەی تەنگاوی "قرن الذهبي" لەدەستی هێزی دەریایی بیزەنتیەکاندا ، ئابلۆقەدانەکە ناتەواو بوو . لەگەڵ ئەوەشدا هێرشی عوسمانی بەبێ پسان بەردەوام بوو سەربازانی "ئینکیشار"ی دلێریەکی زۆرو نەبەردیەکی کەم

---

[1] محمد الفاتح / ١٠٠ .

[2] تأريخ سلاطين آل عثمان / ٥٨ .

[3] محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ٩٢ .

وێنەیان نواند . ئەوان بەبێ ترس بەشوێنەواری هەر بۆمبارانێکی تۆپەکاندا بەرەو ڕووی مەرگ دەچوون . لە ڕۆژی ١٨ ی [1] ئەبریل دا تۆپەعوسمانیەکان توانییان لەبەشی ڕۆژئاوای شوراکەوە لەلای دۆڵی لیکۆس کونێك بکەنە شورای بیزەنتییەکان .سەربازە عوسمانییەکان بەهەموو نەبەردی و گەرموو گوڕییەکەوە دەستیان کرد بە هەوڵی داگیرکردنی شارەکە لە ڕێگای ئەو کونەوە . هەروەك هەوڵی داگیرکردنی شوراکانی تریان دا لەڕێگای ئەو پەیژانەوە کە نابوویان بە دیوارەکانەوە . بەڵام بەرگریکەرانی شارەکە بەسەرکردایەتی "جستنیان" لە پارێزگاری کردنی شوراو ئەو کونەکە مانەوە و ڕاوەستان و لەنێوان هەردوو لادا شەڕوکوشتار توند بوویەوە . کونەکە بچوك بوو . تیروڕم ئەو شتانەی تریش کە ئەگیرانە سەربازە موسوڵمانەکان زیادیان کرد . لەگەڵ تەسکی شوێنەکە و توندی بەرگری دوژمنان و هاتنی شەودا ، لەپاش ئەوەی ترسیان لە دڵی دوژمنە مەسیحییەکاندا بەجێ هێشت ، سوڵتان فاتح بڕیاری کشانەوەی بۆ هێرشبەران دەرکرد ، بەمەبەستی هەلێکی تر بۆ هێرش بردن [2] .

هەر لەوڕۆژەدا هەندێ لە کەشتییە عوسمانییەکان بەشکاندنی زنجیرەی بەربەستی "قرن الذهبي" هەوڵی گرتنی "قرن الذهبي"یان دا . بەڵام کەشتییە بیزەنتی و ئەوروپییە هاوبەشەکان لەگەڵ دەستە بەرگریکەرو بەئاگاکانی پشت زنجیرە کە پاراستنی کەنادوی گەورەکەیان لە ئەستۆدا بوو . بەهەموویانەوە توانییان ڕێگا بگرن لەو کەشتییە ئیسلامییانەو هەندێکیان تێك بشکێنن ، لەبەر ئەوەی ئامانجەکە نەهاتە دی کەشتییەکانی تر ناچار بوون بگەڕێنەوە [3] .

چوارەم : لە کارلادانی سەرکردەی کەشتیوانی عوسمانی و دلێری محمدی فاتح :

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٦٧ .

[2] محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١٢٣ .

[3] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٦٨ .

پاش دوو ڕۆژ لە ڕوودانی ئەوشەڕە ، جەنگێکیتر لەنێوان هێزە دەریایی یەکانی عوسمانی و هەندێ لەو کەشتی یە ئەوروپی یانەدا ڕووی دا کە هەوڵی گەشتن بەکەنداوەکەیان دەدا و کەشتی لە ئیسلامی یەکانیش هەوڵێکی گەورەیان خستەگەڕ بۆ ڕێگە لێگرتن لێیان . محمدی فاتح لە کەنارەوە خۆی سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد . هەواڵی نارد بۆ سەرکردەی کەشتیەوانەکانی و پێی ووت : یان دەست ئەگریت بەسەر ئەو کەشتی یانەدا ، یان دەیانکەیت بەژێر ئاودا ، ئەگەر لەوەدا سەرکەوتوو نەبوویت ، ئەوا بەزیندوویی مەگەڕێوە بۆ لامان [1].بەڵام کەشتییە ئەوروپییەکان لە گەشتن بە ئامانجەکەیاندا سەرکەوتوو نەبوون . کەشتییە عوسمانییەکانیش لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵە گەورانەی لەو پێناوەدا بەگەڕیان خست ، نەیانتوانی ڕێگرییان لێ بکەن ، دواتر سوڵتان محمد زۆر بەتوندی تووڕە بوو و لەپاش ئەوەی گەڕایەوە بۆ پێگەی سەرکردایەتییەکەی سەرکردەی کەشتیە کانی لەسەر لابرد [2].داوای کرد بانگی بکەن بۆی، ئینجا محمدی فاتح زۆر توند سەرزەنشتی ماتەی ئۆغلی سەرکردەی کەشتیە کانی کردو بەترسنۆك تۆمەتباری کرد ، ئەو توندو تیژیە کاری کردە سەر سەرکردەی کەشتیەوانی و ووتی : ( من بەدڵێکی قاییمەوە پێشوازی مەرگ دەکەم ، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەوەیە کەبمرم و بەوجۆرە تۆمەتە تۆمەتباربم ، من و پیاوەکانم بەهەموو توانایەکی وڕێگەیەك کە هەبوو نەتوانیمان شەڕمان کرد . ئیجا سوچی مێزەرەکەی لەسەر چاوە بریندارەکەی لابرد ) [3] . محمدی فاتح زانی

---

[1] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٠١ .

[2] مواقف حاسمة –محمد عبدالله عنان/ ١٨٠ .

[3] محمد الفاتح –الرشيدي/ ١٠٣ .

بۆی دەرکەوت کە ئەو پیاوەش عوزری خەڵکی بڕیوە ، بۆیە بەلەسەر کار لابردن وازی لیٚ هیٚناو وڕێگەی دابڕوات و حەمزەپاشای لەشوێنەکەی دا دانا [1].

سەرچاوە مێژوویی‌یەکان باس لەوە دەکەن کە سولْتان محمدی فاتح بە سواری ئەسپەکەیەوە، چاودێری ئەو جەنگە دەریایی‌یانەی دەکردوبە وورە بەرزی یەکەوە بەرەو دەریا پێشڕەوی کرد ئەوەبوو ئاو تا سەر سنگی ئەسپەکە هات ماوەی ئەم وکەشتیە شەڕ کەرەکان ئەوەندە بووبەڕوو هەڵدەی بیگاتیٚ هاواری ئەکردە{بالطـة ئـۆغلی}وبەدەنگی بەرز ئەیقیڕاند کەشتیەوان ! کەشتیەوان !هەڕەشەی لیٚ دەکرد .

عوسمانی‌یەکان بەبیٚ ئەوەی کاریگەریەکی دیاریان هەبێت بۆ کەشتی‌یەکان هەوڵەکانی هێرش بردنیان زیاتر دەکرد [2].

شکستە دەریایی‌یەکانی کەشتیوانی عوسمانی ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لەسەر هەندیٚ لە ڕاوێژکارەکانی سولْتان ، لەپێش هەمووشیانەوە ، "خەلیل پاشای وەزیر" بۆ ئەوەی واز لەوە بێنێت کە دەست بەسەر شارەکەدا بگرێت وداوای لێکرد کە، بەپەیمان بەستن لەگەلٚ خەڵکی شارەکەدا ڕازی بێت ووازلە ئازادکردنی شارەکە بهێنیٚ و ئابلۆقەی سەرشارەکە هەلْبگرێت، بەلاٚم سولْتان سوور بوو لەسەر هەولی فەتح کردنی شارەکەو لەهەموو لاوە بە تۆپەکانی بەردەوام بوو لەسەر بۆمباران کردنی بەرگریکەرانی شارەکە . هاوکات بەووردی بیری دەکردەوە بە هەر ڕێگەیەك بووە کەشتیە ئیسلامیەکان بەرێتە ناو{قرن الذهبي}ةوة ، بەتایبەت کە شوراکانی لای قرن الذهبي هەموو هاتبوونە خوارەوەو ، بیزەنتی یەکانیش ئەو کاتە ناچار ئەبن پاشەکشە بکەن بە هەندیٚ لە هێزە بەرگریکەرەکانیان لەشوراکانی ڕۆژئاوای شارەکە. بەم بەش بوونەی

---

[1] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٠٣.

[2] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٠٣.

هێزە بەرگریکەرەکان ، هەلێکی گەورە دەڕەخسێت بۆ هێرش کردنە سەر ئەو شورایانە پاش ئەوەی ژمارەی بەرگریکەرەکانی کەم دەکات [1].

<u>پێنجەم : لێهاتوویی‌یەکی جەنگی ناوازە :</u>

سولتان بیرۆکەیەکی زۆر جوانی بۆ هات ئەویش ئەوەیەکەشتیەکان لە"بشکطاش"ەوە کە شوێنی وەستانیان بوو-لە ڕێگەی ووشکانیەوە بگەیەنێتە "القرن الذهبی" ئەم کارەش لەو ڕێگە ووشکانیەی نێوان هەردوو بەندەرەکە وە ئەنجام بدات بۆ ئەوەی لە{حي الغلطة} خۆی بە دوور بگرێت وکەشتی یەکان لە مەترسی باشوریەکان بپارێزێت ،ماوەی نێوان ئەم دوو بەندەرە نزیکەی سێ میا ئەبوو ،زەوی یەکی تەختیش نەبوو بەڵکو پڕ بوو لە بەرزایی ونشێوی وتەختانی کەم بوو. محمدی فاتح سەرۆك جەنگی‌یەکانی خۆی کۆکردەوە و بیرۆکەکەی خۆی بۆ خستنە ڕوو و شوێنی جەنگی داهاتووشی بۆ دەستنیشان کردن وئەو پەڕی هاندانی لە هەموو یانەوە بەدی کردو هەموویان سەرسوڕمانی خۆیان بۆ بیرۆکەکە دەربڕی وجێ بەجێکردنی پلانەکە دەستی پێکرد.

سولتان محمد فەرمانی دەرکرد بۆچاککردن وتەختکردنی زەویەکان ، لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا تەخت کرا ، پاشان چەند پارچە دارێکیان هێناو بەزەیت و چەوری ئاژەڵ چەوریان کردن ، پاشان بەشێوەیەك کە ڕاکێشانی کەشتیەکان بەهۆیەوە ئاسان بێت ،ئەو پارچە دارانەیان لەسەر ڕێگە لەبارەکەدا دانا سەختترین بەشی پڕوژەکە بریتی بوو لە گواستنەوەی کەشتی‌یەکان بەسەر هەورازو تەپۆڵکەبەرزەکاندا ، هەرچەندە بەشێوەیەکی گشتی کەشتی یەکانی عوسمانی لە قەبارەدا بچوك ولە کێشیدا سوك بوون [2].

---

[1] الفتوح العثمانية عبر العصور / ٣٦٩ .

[2] محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١٠٠ .

کەشتی یەکان لە بسفۆڕەوە بەسەر دارە چەورەکاندا بەوشکانی دا ڕاکێشران و بەماوەی سیٚ میل پاڵیان پێوەنرا تا گەشتنە خاڵێکی ئارام وخرانە ناو" قرن الذهبي "وەو.عوسمانییەکان توانییان لەو شەوەدا ۷۰کەشتی ڕابکێشن و و بەبیٚ ئاگایی دوژمنان لە "قرن الذهبي" دا بەڕێگەیەك دایانبەزێنن ، کەپێشتر سولتان محمد ڕێگەی وای نەیگرتبووەبەر ، سولتان خۆی سەرپەرشتی ئەوپرۆسەیەی دەکرد کە بە شەوو دوور لەچاودێری دوژمنەوە بەڕێوە دەچوو [1].

ئەم کارە بەراورد بە سەردەمەی کە ئەوڕووداوەی تێدا ڕوو دا ، کارێکی گەورە بوو ، بەڵکوو موعجیزەیەك بوو ، کە خێرایی بیرکردنەوەو خێرایی جیٚ بەجێکردنی تێدا دەر دەکەوێت . ئەمەش بەڵگەبە لەسەر وەر بەرزی وبیری نایاب وئەو پەڕی لێهاتووی عوسمانیەکان .

کاتێك ڕۆمەکان ئەمەیان بینی تەواو واقیان وڕما ، کەس نەیدەتوانی بڕوا بەوە بکات کە ڕوویدابوو ، بەلاّم ڕاستەقینە{واقع} وای کرد کە دان بنێن بەو پلانە نایابەدا . شێوەی ئەو کەشتیانە کە بەچارۆکە بەرزەکانیانەوە بەناو ئەو کێڵگانەدا ڕێگەیان ئەکردو ئەڕۆیشتن وەك ئەوە وابوو بە ناو دەریایەکی لیٚ پەیدا بڕۆشتنایە دیمەنێکی تەواو دڵڕفێن وسەیرو جوان بوو گەو رەیی وفەزڵیش لەمەدا دەگەڕێتەوە بۆ خوا پاشان بۆ زۆر زیرەکی ووورە بەرزی وعەقڵییەتی گەورەی سوڵتان و توانای ئەندازیارە عوسمانی یەکان دەگەڕێتەوە هەروەك بۆ بوونی ئەو برە زۆرەی {دەستە ئیشکەرەکان } {الآيدى العاملة}ئەگەڕێتەوە کە ملیان بۆ ئەم کارە داو دەستیان دایە هەموو ئەم کاە لەیەك شەودا تەواو کرا

هەموو ئەمانە لە ماوەی یەك شەودا ڕوویان داو خەڵکە شارە هە<ارەکەش لە بەرە بەیانی ڕۆژی {۲۲/ئیبریل دا} بەدەنگی بەرزی الله اکبر هیتافکێشانی بەردەوام وسروودی ئیمانی پڕ مانای عوسمانییەکان خەبەریان بوویەوە کەلە القرن الذهبى

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ۳۷۰ .

وە ئەهات ،شتێکی کتو پڕی بوو کەشتیە عوسمانیەکان دەست بگرن بەسەر ئەو پردە ئاوی یەدا،وای لێهات لەنێوان عوسمانییەکان و بەرگریکەران لە شاری قوستەنتینە دا هیچ جۆرە بەربەستێکی ئاوی نەما [1].

یەکێك لەمێژوو نووسە بیزەنتیەکان سەرسوڕمانی خۆی دەردەبڕێت لەمەڕئەو ڕووداوەو دەڵێت : ( پێشتر هیچ شتێکی وەك ئەو شتە سەیروسەمەرەیەمان نەبینیبوو و نەبیستبوو . محمدی فاتح زەوی بگۆڕی بە دەریاو کەشتیەکانی لە بڕی شەپۆلەکان بەسەر شاخەکاندا برد ، بەڕاستی محمدی دووەم بەم ئیشەی پێشی ئەسکەندەری مەکدۆنی گەورەی داوەتەوە ) [2].

بێهیوایی بە خەڵکی قوستەنتینیە وە دەرکەوت و پڕوپاگەندەی زۆر بەناوخەڵکدا بڵاو بوویەوە یەکێك لەو پڕپاگەندانە کە لەنێوانیاندا بڵاو بوویەوە دەیووت :هەرکات بینرا کەشتی بەسەر ووشکانیدا ئەڕوات ئەوە "قوستەنتینیە"ئەڕووخێت [3].

بوونی کەشتیە ئیسلامیەکان لە {قرن الذهبی}دا ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە لاواز کردنی ڕۆحی مەعنەوی بەرگریکەرانی شارەکە کە ناچار بوون هێزێکی گەورەی بەرگریکەرانی شوراکانی تر بکشێننەوە بتوانن بەرگری بکەن لە شوراکانی سەر {القرن الذهبي} ، چونکە ئەو شورایانە لاوازترین شورا بوون ، بەڵام پێشتر ئاوەکە ئەیپاراستن ، ئەمەش بشێوی خستە نێو بەرگریکەرانی شوراکانی ترەوە [4].

---

1 الفتوح العثمانية عبرالعصور / ٣٧٠ .

2 تأريخ الدولة العثمانية –يلما أوزنتونا / ١٣٥ .

3 محمدالفاتح –الرشيدي / ١٠٦ .

4 محمد الفاتح –الرشيدي / ١٠٦ .

ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی چەند هەوڵێکی زۆری دا کەشتیگەلی عوسمانی لە {القرن الذهبی} دا تێك بشکێنێ،بەلاّم عوسمانیەکان لە کەمیندا بوون بۆ هەموو ئەو هەولّ وپەك قاژە کردنەیان وتوانیان نوشوستی بە هەموو نەخشەو هەوڵەکانیان بهێنن.

عوسمانیەکان بەردەوام خاڵەکانی بەرگری و شوراکانی شارەکە یان بە تۆپ ئەکوتاو هەولّی هەلّزنینیان ئەدا بەسەر شوراکاندا ، هاوکات بەرگریکەرانی شارەکە لە لایەکەوە سەرقالّ بوو بوون بە بنیاد نانەوەو چاکسازی ئەو بەشانەی شورای شارەکەیان کە ڕووخابوون لەلایەکی ترەوە سەرقالّ بووبوون بە بەرپەرچ دانەوەی هەوڵە چڕو پڕەکانی هەلّزنین بەسەر شوراکانداو گەمارۆش لە سەریان بەردەوام بوو ئەمانە بوون هۆی زیاد بوونی زەحمەت وماندوێتی وشەکەتبون و وایان لێهات شەو بدەنە دەم ڕۆژوو بەردەوام ئیش بکەو ئەمەش توشی بێ هیوایی کردبوون [1].

هەروەك چۆن عوسمانیەکان تۆپگەلێکی تایبەتیان لەسەربانە نزیکەکانی بسفۆڕو {قرن الذهبي} دانا کە گرنگی و ئەرکی ئەمانە کاولکردن و شکاندنی کەشتی یە کانی بیزەنتیو هاوکارانی بوو ، لە{ قرن الذهبي} و بسفۆڕ و ئاوە دراوسێکانی دا بوون وبەمەش گرێی لە جوڵەی کەشتیەکانی دوژمندا دروست کردوو توشی گۆجی کردن بەتەواوی [2].

شەشەم : کۆبوونەوەی نێوان پاشای قوستەنتینیە و یاریدەدەرەکانی :

پاشا قوستەنتین و یاریدەدەرو ڕاوێژکارەکانی و پیاوانی ئایینی شارەکە کۆبوونەوەیەکیان بەست کە تیایدا ئاماژەیان بەوەکرد پاشا خۆی بچێتە دەرەوەی شارەکەو داوای یارمەتی و فریاکەوتن لە گەلە مەسیحی و دەوڵەتە

---

1 الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٧١ .

2 الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٧١ .

ئەوروپی‌یەکان بکات ، بەڵکوو سوپا مەسیحی‌یەکان بێن و محمدی فاتح ناچار بکەن گەمارۆی لە سەر شارەکەیان هەڵبگرێت، بەڵام پاشا ئەو ڕایەی ڕەت کردەوە و سوور بوو لەسەر ئەوەی تاکۆتاسات بەرگری بکات و گەلەکەی لەشارەکەدا بەجێ نەهێڵێت تا سەرەنجامی خۆی و ئەوانیش یەك سەرەنجام بێت ، ئەوەشی بەئەرکی پیرۆزی سەر شانی دەزانی . هەروەها فەرمانی پێکردن کە هەرگیز ئامۆژگاری نەکەن بەچوونەدەرەوەی لەشارەکەدا ، بەڵکو تەنها هەستا بە ناردنی چەند وەفدێك وەك نوێنەری خۆی بۆ هەموو ناوچە جیاجیاکانی ئەوروپا بۆ داواکردنی یارمەتی [1]. ئەو وەفدانەش بە بێئومێدی ودەستی خاڵیەوە دەگەڕانەوە ، دەزگاکانی هەواڵگری دەوڵەتی عوسمانیش چیلێسی خۆیان لە قوستەنتینیەو چواردەوری شارەکەدا کرد بۆیە وای لێهاتبوو سەرکردایەتی عوسمانی زانیاری تەواوی هەبوو کە چی لە چواردەوریدا ڕوودەدات .

حەوتەم : جەنگی دەروونیی عوسمانییانە : سوڵتان محمدی فاتح هێرشی سەر شوراکانی توند کردەوەو کردی بە جێمەبەستی تەواوی لەنێو پلانێکدا کە بۆ لاوازکردنی دوژمن ئامادەی کردبوو ، هێزە عوسمانی‌یەکان بەشێوەیەکی پاڵەوانانە چەندین جار چالاکی هێرش بردن بۆ شوراکان و هەوڵی هەڵزنینپێیاندا دووبارە دەکردەوە کە ئەوپەڕی دلێری و خۆبەخت کردن و توانەوەی تێدا ئەبینرا، ئەوەی زیاتر سەربازەکانی ئیمبراتۆری قوستەنتینی دەترساند ، هاواری موسوڵمانەکان بوو کە ئەگەیشتە کەشکەکانی فەلەك و دەیانووت ( الله أكبر الله أكبر ) ئەو هاوارانە وەك هەورە بروسکەی کاولکەر دەبارین بەسەریاندا [2].

سوڵتان محمد دەستی کرد بە جێگیر کردنی تۆپە بەهێزەکانی لەبانەکانی پشت {غەلتە} دا ، ئەو تۆپانەش دەستیان کرد بە تۆپبارانێکی چڕوپڕی بەندەرەکە ،

---

[1] محمد الفاتح / ١١٦ .

[2] محمد الفاتح / ١٠٦ .

یەك لەتۆپەكان دای لەكەشتیەكی بازرگانی و یەكسەر ژێرئاوی خست ، بۆیە كەشتیەكانی تر ترسان و ناچار بوون بەڕاكردن ، شوراكانی {غەلتە}یان كردە پەناگە بۆ خۆیان ، هێرشی وشكانی عوسمانیش بەچەند پەلامارێكی خێراو كتوپڕو هێرش لەدوای هێرش بەردەوام بوو . سوڵتان محمدی فاتح بە بێ پچڕان و بەشەوو ڕۆژ لەدەریاو ووشكانیدا خۆی هاودەمی هێرشكردن و وەشاندنی تۆپەكانی دەكرد بۆ ئەوەی هێزی گەمارۆ ماندوو بكات وبواری حەسانەوە و بێخەم دانیشتنیان نەدات . بە وشێوەیە بەرگریكەران وورەو عەزیمەتیان لاواز بوو و دەروونیان ماندوو و بێزار و دەماریان گرژ وهیلاك بە ڕادەیەك بە هەموو شتێك تورە ئەبوون . هەر یەك لە وسەربازانە دەیڕوانی بۆ هاوڕێكەی و هێماكانی سەرشۆڕی و داڕمان و شكست خواردنی تێدا ئەبینی. كار گەییە ئەوەی بەئاشكرا دەستیان كرد بە قسەكردن لەبارەی ڕێگەی دەربازبوون و ڕزگاركردنی گیانیان لەوسەرەنجامەی كەلەعوسمانیەكانیان چاوەڕێی دەكەن كاتێك كە شارەكەیان دەگرن.

ئیمبراتۆر قوستەنتین ناچار بوو بۆبەستنی كۆنگرەی دووهەم كە تیایدا یەكێك لەسەركردەكان پێشنیاری ئەوەی كرد كەلە پڕێكدا هێرشێكی توند بكەنە سەر عوسمانی یەكان ، تاڕێگەیەك بكەنەوە كە بیانبەستێتەوە بەجیهانی دەرەوە . لەوكاتەی كە لەكۆڕەكەیاندا لێكۆڵینەوەی ئەو پێشنیارەیان دەكرد ، یەكێك لەسەربازەكان كۆبوونەوەكەیانی پێ بڕین و ئاگاداری كردنەوە كە عوسمانیەكان هێرشێكی قورسی چڕو پڕیان دەست پێ كردوە بۆ سەر دۆڵی لیكونس . بۆیە قوستەنتین كۆبوونەوەكەی بەجێهێشت و سواری ئەسپەكەی بوو و داوای كرد سەربازەكانی بانگ بكەن و بردنی بۆ شوێنی جەنگەكە ،

کوشتار وجەنگ تاکۆتایی شەو بەردەوام بوو تا عوسمانیی‌یەکان پاشەکشەیان کرد [1].

سوڵتان محمد{بەڕەحمەت بێت}هەر جارەی ناجارێك دوژمنەکەی توشە شتی کتو پڕی ئەکردوەك داهێنانی هونەرێکی تازەی شەڕ کردن یان گەمارۆ دروست کردن یان جەنگی ئەعصاب*یان بەکارهێنانی شێوازی نوێو ڕێگەی تازەو داهێنراوی واکە دوژمن پێیان ئاشنا نەبوو [2].

لە قۆناغە پێشکەوتووەکانی گەمارۆدانەکەدا عوسمانیی‌یەکان پەنایان بردە بەر ڕێگایەکی سەرسوڕهێنەری بۆ چوونەناوەوەی شارەکە ،هاتن دەستیان کرد بە هەڵکەندنی تونێل بەژێر زەوی‌دا بۆ ناو شارەکەو دانیشتوانی شار گوێیان لەتەقەتەقێکی زۆر بوو لە ژێر زەوی یەوەو هەستیان ئەکرد کەتەقەتەقەکە پلە پلە لە شار نزیك ئەبێتەوە . جا ئیمبراتۆر خۆی و چەند سەرکردەو ڕاوێژکارێکی بەپەلە چوون بەدەم دەنگەکەوە بۆیان دەرکەوت کە عوسمانیی‌یەکان بۆ گەشتن بەنێوشارەکە هەڵدەستن بە هەڵکەندنی تونێل بەژێر زەوی‌دا ، بۆیە بەرگریکەران بڕیاری خۆئامادەکردنیان دا بۆ بەرەنگاربوونەوەیان بە هەڵکەندنی تونێلی هاوشێوەی ئەوان لەبەرامبەر تونێلەکانی هێرش بەراندا بۆ بەرەنگار بوونەوەیان بەبێ ئەوەی عوسمانیی‌یەکان بزانن ، ئەوە بووعوسمانیی‌یەکان گەشتنە ئەو تونێلانەی کە بۆ ئەوان ئامادە کرابوون ، وایان زانی ڕێیان لە ژێر زەوی و گونجی تایبەتی ونهێنی نێو شارەکە کەوتووە . بەمەش دڵخۆش بوون ، بەڵام دڵخۆشی‌یەکە درێژەی نەکێشا وئەوە بوو ڕۆمی‌یەکان بەرەنگاریان بوونەوەو وەسیەت یان کردە ئاگر باران کردنیان و و نەوتی سوتێنەرو مادە گڕگرتووەکانیان بەسەردا باراندن ، ئەوە بووزۆرێکیان خنکان و بڕێکی تریان

---

[1] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١٠٨ .

[2] السلطان محمدالفاتح –عبدالسلام فهمی / ١٠٨ .

سوتان وئەوانەش ڕزگاریان بوو ، بەشوێن پێی خۆیاندا گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتبوون[1].
بەلاّم ئەو شکستە بازووی عوسمانیيەکانی لاواز نەکرد ، بەڵکو گەڕانەوە بۆ لێدانی تونێلگەلێکی تر لەچەند شوێنێکی تر لەناوچەی درێژەوەبووی نێوان "ئەکری فبو" و کەناری "القرن الذهبي" ،کە شوێنێکی لەبارە بوو بۆ ئەو کارە ، بەوجۆرە تا کۆتا ڕۆژەکانی ئابلۆقەدانەکە بەردەوام بوون ، خەڵکی قوستەنتینیە تووشی ترس وسامێکی گەورەی وابوون کە وەسف ناکرێت تائەو بارەی کە دەنگی پێی خۆشیان لەکاتی ڕۆشتنەڕێدا ببیستایە ، توشی دڵە خورپە دەبوون و لێیان دەبوو بەو دەنگ گەلە ترسناکەی ئەوهەڵکەندنەی کە عوسمانیيەکان پێی هەڵدەستان . زۆرێکیان واخەیاڵیان دەکرد کە زەویيەکە کەرت دەبێت و سەربازە عوسمانیيەکان دێنە دەرێ و شارەکە پڕدەکەنەوە ، ئیدی بەلای ڕاست و چەپ دا لایان دەکردەوەو لەترساندا ئاماژەیان بەملاولای خۆیان دەکرد و دەیانووت : ( ئەوە تورکێکە ! ئەوە تورکێکە !) . لەڕێڕۆشتنیاندا لەسێبەری خۆشیان دەترسان و وایان دەزانی دەیانفڕێنن . زۆر جاریش واڕوویدەدا پڕوو پاگەندەیەك بلاّو دەبوویەوە و وای لێدەهات کە وەك ڕاستیيەك وابێت و یەکێکیان بەدووچاوی سەری خۆی دیتبێتی ، هەروەها لەناو دانیشتوانی قوستەنتینیەدا ترسێکی توند و زۆر چووبووە دڵیانەوە ، وەك ئەوەی سەرخۆش بن ، کەو سەرخۆشیش نەبوون ، دەستەیەك دەڕۆشتن و دەستەیەکیش دەیانڕوانی یە ئاسمان و کۆمەڵێکیش زەویان دەپشکنی و هەنێکیش دەیانڕوانیە دەم وچاوی یەکتر وەك کەسێکی خراپ دۆڕاوی وزۆر تورە.

---

*شەڕی ماندوو کردنی مێشك بە ڕادەیەك دوژمن شپرزە بکەی نەزانیٚ بەرەنگاری کام نەخشە بێتەوە"وەرگێڕ.أ"

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٧٢ .

ئەو ئیشەی عوسمانیەکان ئاسان نەبوو ، چونکە ئەو تونێلانەی هەڵیانکەند ، ئەوە بوویە هۆی مردنی زۆرێکیان لەنێو زەوییەکەدا بەهۆی خنکانەوە یان سووتانەوە . هەروەك لەهەندێ هەوڵدا زۆرێکیان دەکەوتنە ژێر دەستی ڕۆمییەکان و سەریان دەبڕین وکەللەکانیان فڕێ ئەدانەوە بۆ سەربازگەی عوسمانییەکان [1].

پەلاماریکی لەناکاوی عوسمانیەکان : عوسمانی یەکان بۆ دەست گرتن بەسەر شارەکەداپەنایان بردە بەر شێوازێکی نوێی تر هاتن قەڵایەکی دارینی گەورەی بڵندی بزواویان دروست کرد کە لەسێ قات پێك هاتبوو ، کە بەرزتر بوو لەبەرزی شوراکان و بە زرێ و پێستی تەڕ کراو بەئاو داپۆشرابوو بۆ ئەوەی بیپارێزێت لەئاگر ، هەموو قاتەکانی ئەم قەڵایە پڕکرابوون لە پیاو ، ئەوانە یان کەلە قاتی سەرەوە بوون ئیشیان ئەوە بوو هەرکەسێك سەری لەشوراکەوە بەرز بکردایەتەوە ، تیر بارانیان دەکرد .

کاتێك عوسمانیەکان بەو قەڵایەوە کشان و بەهۆیەوە لەلای دەرگای "ڕۆمانوس"ەوە لەشوراکە نزیك بوونەوە ، ترس و بیم کەوتە دڵی بەرگریکەرانی شارەکەوە ، عوسمانییەکان توانییان قەڵاکە بلکێنن بەشوراکەوە ، لەنێوان ئەوانەی نێو قەڵاکەو مەسیحییەکاندا جەنگێکی توند ڕووی دا ،ئیمپڕاتۆر خۆی وسەرکردەکانی سوپاکەی چوون بۆ ئەوەی پاشەکشە بەو قەڵایە بکەن ولە شوراکانی دوور بخەنەوە تائەوەی هەندێ لەو موسوڵمانانەی لەقەڵاکەدابوون ، توانیان هەڵزنن بەسەر شوراکانداو لەوەدا سەرکەوتووبوون ، قوستەنتین وایزانی شکستی خواردووە تائەوەی بەرگریکەران بەچڕی ئاگربارانی قەڵاکەیان کرد ئەوە بوو کاری تێکرد و ئاگری تێبەربوو و سووتاو کەوت بەسەر بورجە

[1] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١١٠ .

بیزەنتی‌یەکانی پاڵی‌دا ، ئەوانەی لەبورجەکەدابوون کوژران و خەندەقەکەی پاڵی پڕ بوو لە بەرد وخۆڵ[1] .
عوسمانی‌یەکان بێ‌هیوا نەبوون لەهەوڵدان ، بەڵکوو محمەدی فاتح کە خۆی سەرپەرشتی ڕووداوەکەی دەکرد ، ووتی : بەیانی چواری تر دروست دەکەین[2] .
گەمارۆکە زیاد و توندو بەهێز بوویەوە ،وئەوەی لەناو شاری بیزەنتیدا بوو شەکەت وماندوو بوو بوو ، بۆیە سەرکردەکانی شارەکە لە ٢٤ی مایۆدا کۆبوونەوەیەکیان لەنێو کۆشکی ئیمبراتۆردا بەئامادەبوونی خودی ئیمپڕاتۆر بەست ، لەسەروو هەمووشتەکانەوە بێ‌هیوایی کۆبووەکان لە ڕزگارکردنی شارەکە بەدیارکەوت . تاهەندێکیان پێشنیاری‌ئەوەیان بۆ ئیمبراتۆر کرد کە پێش ئەوەی شارەکە بکەوێت ، با ئیمبراتۆر بچێتە دەرەوە بەڵکو هەوڵی کۆکردنەوەی یارمەتی و فریاکەوتنی بۆ بدات ، یان لەدوای شکست و کەوتنی بیگێڕێتەوە و بەدەستی بهێنێتەوە ، بەڵام ئیمبراتۆر دووبارەئەوەی بەرپەرچ دایەوە و سوور بوو لەسەر مانەوەی لەناو شارەکەدا وڕێبەرایەتی کردنی گەلەکەی . پاشان چوویەدەرێ بۆ سەردانیکردنی شوراو قەڵاکان .
وای لێ هات پڕوو پاگەندە دەستی کێشا بەسەر شارەکەداو لەبەرگری بەرگریکەرانی شارەکەی کەم دەکردەوە ، بەهێزترینی ئەو پڕوپاگەندانە ئەوە بوو کە لە ڕۆژی ١١ی جەمادای بە٢٥ی مایۆ ڕوویدا کە خەڵکی شارەکە پەیکەرێکی مریەمیان ( سەلامی خوای لەسەربێت ) بەرز کردەوە و بەناو بەشەکانی شارەکەدا دەیانگێڕاو لێی دەپاڕانەوە و ملکەچی خۆیان بۆ دەنواند ، تا سەریان بخات بەسەر دوژمنەکانیاندا ، لەناکاو پەیکەرەکە لەدەستیان کەوت و شکا ، ئەوانیش ئەمەیان بە شوم و ئاگادارکردنەوەیەکی ترسناک هاتە بەر چاو ، ئەمە کاری کردە

---

[1] محمد الفاتح –سالم الرشيدي / ١٤٤ .
[2] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمى / ١٢٢ .

سەر دانیشتوانی شارەکە بەتایبەت بەرگریکەرەکانی . لەڕۆژی دواتردا ٢٦ی مایۆ بارانێکی توندی هاودەم بەهەورە بروسکە دایکردو یەکێك لەهەورە بروسکەکان دای لە کەنیسەی ئەیاصوفیا ، بەتریاکی کەنیسەکە بەمە ڕەشبین بوو و چوو بۆ لای ئیمبراتۆر و هەواڵی پێدا کە خوای گەورە وازی لێ هێناون و شارەکە بەم زوانە شکست دەخوات و بەدەستی موجاهیدە عوسمانیەکان دەڕمێت . ئەمە زۆر کاری کردە سەر ئیمبراتۆرو بووریایەوە [1].

تۆپە عوسمانیەکان لەکاری خۆیان نەدەوەستان وبەردەوام شوراو قەڵاکانیان ئەکوتا، وبەشێکی گەورەی شوراو بورجەکانی ڕووخاند ، خەندەقەکانیش بەودارو پەردوانە پڕبوونەوە، کە بەرگریکەران بێهیوابووبوون لە لابردنیان ، بەمە توانستی دەستبەسەردا گرتنی شارەکە لەهەر چرکەساتێکدا هاتەدی تەنها ئەوە نەبێت کە کاتی دەستبەسەرا گرتنەکە هێشتا دیاری نەکرابوو [2].

هەشتەم : دانیشتنە کۆتاییەکانی نێوان محمدی فاتح و قوستەنتین :

محمدی فاتح دڵنیابوو کە شارەکە خەریکە نشوستی دێنێت . لەگەڵ ئەوەدا هەوڵیدا کە چوونەژوورەوەی بەئاشتی بێت ، بۆیە نامەیەکی نوسی بۆ ئیمبراتۆر بۆ بەدەستەوەدانی شارەکە بەبێ ئەوەی خوێن برژێت ، هەروەها پاراستن ودڵنیایی چوونەدەرەوەی خۆی و خێزانی و هاوکارەکانی و هەرکەسێکی تری دانیشتوانی شارەکەی بۆ خستە ڕوو کە بۆ کوێ دەیانەوێت بەئاسایش و دڵنیاییەوە بچن [3]. خوێنی خەڵکەکەش لەشارەکەدا پارێزراو دەبێت و بەرەنگاری هیچ ئازارێك نابنەوە ، سەربەستیش بن لە مانەوە لەشارەکەیان یان کۆچ کردن لێی ، کاتێك ئەو نامەیە گەشت بە ئیمبراتۆر ، ڕاوێژکارەکانی

---

[1] محمد الفاتح –الرشيدي / ١١٨ .

[2] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٧٥ .

[3] محمد الفاتح –الرشيدي / ١١٩ .

کـــۆکردەوە و ئـــەو باســـەی بـــۆ خـــستنەڕوو ، بەمـــە هەنـــدێك لایـــەنگری خۆبەدەســـتەوەدان بوونوهەنـــدێکی تـــریش ســـووربوون لەســـەر بـــەردەوامی بـەرگری‌کردن لەشـارەکە تـا مـردن ، ئیمبراتـۆریش بـەپاڵ ڕای ئەوانـەی ئـەتانوت تاکۆتاسات شەڕ دەکەین .

بۆیە ئیمبراتۆر پەیامنێرەکەی محمدی فاتحی بە نامەیەك ناردەوە کە تێیدا دەڵێت : ( ئەو سوپاسی خوا دەکات کە سوڵتان پەنای بۆ ئاشتی بردووەو ، ئەو ڕازی دەبێت جزیە بدات ، بەڵام بۆ قوستەنتینیە ئەوا سوێندی خواردوە کە تا کۆتا هەناسەی ژیانی بەرگری لیَ بکات ، جا یان دەسەڵاتی دەپارێزرێت یان لەژێر شوراکاندا دەنێژرێت ) [1].

کاتێك نامەکە گەشت بە فاتح ، ووتی : (زۆر باشە کەواتە یان بەزوویی لە قوستەنتینیەدا دەسەڵات بۆ من دەبێت یان گۆڕەکەمی تێدا دەبێت ) [2].

سوڵتان پاش بێ‌هیوابوون لە بەدەستەوەدانی شارەکە بەئاشتیانە ، دەستی دایە چڕکردنەوەی هێرشەکە ، بەتایبەت بۆمبارانکردنی شارەکە ئەوە بوو تۆپە گەورەکەی سوڵتانی لە ئەنجامی زۆر بەکارهێنانی تەقیەوە هەموو ئەوانەشی کوشت کە کاریان لەسەری کرد لەسەروو هەموویانەوە ئەندازیاری مەجەڕی "ئوربان" کە سەرپەرشتی نەخشەسازی تۆپەکەی گرتبووە دەست . لەگەڵ ئەمەدا سوڵتان ڕێنمایی دا بە جێبەجێ‌کردنی کاری سارد کردنەوەی تۆپەکان بەڕۆنی زەیتون ، تەکنیککارەکانی لەمەداسەرکەوتوو بوون و جارێکی تر تۆپەکان درێژەیان دا بە بۆمبارانکردنی شارەکە ، بەڵکو توانیان ئاڕاستەی

---

[1] محمد الفاتح –عبدالسلام / ١١٦ .

[2] الفتوح الإسلامية عبر العصور ٣٧٦ .

تۆپـەكان بەشـێوەیەك دابنـێن كـە لـە ناوەڕاسـتی شـارەكەدا بكەونـە خـوارەوەو تۆپبارانی شوراو قەڵاكانیش هەر بەردەوام بوونیە تۆپەكان [1] .

نۆیەم / سولْتان محمدی فاتح كۆبوونەوەیەك بۆ ئەنجومەنی ڕاوێژ دەبەستێت :

سولْتان محمدی فاتح كۆبوونەوەیەكی بەست كە ڕاوێـژكارو گەورەسـەركردەكانی خۆی لە خۆ دەگرت ،زیاد لە زاناو بەتەمەنەكان . محمدی فاتح داوای لەهەموویان كرد بەهەموو ڕاشكاویەك و بەبێ دوودڵی و پاشكەز بوونـەوە ڕاو بۆچوونەكانیان بڵێن ، هەندێكیان ئاماژەیان دا بەپاشەكشەكردن ، لەوانە خەلیل پاشای وەزیر كە بانگـەوازی دەكـرد بـۆ پاشەكـشە و نـەڕژانی خـوێن و ترسـان لـە تووڕەبـوونی ئـەوروپای مەسـیحی ، ئەگـەر بێـت و موسـوڵمانان دەسـت بگـرن بەسـەر شارەكەدا ، جگە لەوە چەندین پاساوی تری خستەڕوو . ئەو تۆمەتباربوو بەویە لەگەڵ بێزەنتی یەكانداڕێكەو تووەوهەوڵی ئەوە ئەدات كە خەڵكی لەجیاتی ئەوان سارد بكاتەوە [2] .

هەنـدێ لـە ئامـادەبوانیش دەسـتیان دایـە هانـدانی سـوڵتان لبـۆ درێـژە پێـدانی هێرشی سەر شارەكە تافەتح كردنی و دەستگرتن ن بەسەر ئەوروپا و هێزەكەیدا . هـەوەك ئاماژەیـان كـرد بـۆ وورەو هەڵـچوونی سـەربازانی ئیـسلام بـۆ فـەتح كردنەكـە ، لەگـەڵ باسـكردنی ئـەو ڕووخـانی مەعنـەویاتی جیهادییـەیان كـە لەپاشەكشەكردن و گەڕانەوەیاندا توشیان دەبێت .

لەوانە یەكێك لەسەركردە دلێرەكان بوو كە بە( زوغنوش پاشا ) بانگ دەكرا ، بە ڕەچەڵەك ئەلبانی بوو و پێشتر مەسیحی بوو موسوڵمان بوو بوو ، مەسەلەی هێزە مەسیحی یەكانی ئەوروپایی لەبەرچاوی سوڵتان زۆر ئاسان كرد [3] .

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور ٣٧٦ .

[2] فتح القسطنطينية –محمد صفوت / ١٠٣ .

[3] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٧٧ .

سەرچاوە مێژوویی‌یەکان باسی هەڵوێستەکەی "زوغنوش پاشا" دەکەن و دەڵێن : ( کە سوڵتان پرسیاری لە ڕای ئەو کرد ، لەجێگای خۆی ڕاپەڕی و بەزمانێکی تورکی کە زمان قورسی‌یەکی ئەڕنەئوتی تێکەڵ بوو ، هاواری کرد : ئەی سوڵتان ! حاشا و هەرگیز من ئەوە قبوڵ ناکەم کە خەلیل پاشا ووتی ، ئێمە جگە بۆ مەرگ بۆ هیچی‌تر نەهاتووینەتە ئێرە و ناشگەڕێینەوە ) . ئەو دەنگ هەڵبڕینە کاریگەری‌یەکی قووڵی دەروونی ئامادەبووان و ماوەیەك بێدەنگی باڵی کێشا بەسەر کۆڕەکەدا . پاشان زوغنوش پاشا درێژەی‌دا بە قسەکانی و ووتی : خەلیل پاشا بەو قسەیەی کەکردی ، ویستی ئاگری گەرموگوڕیتان تیٚدا دامرکێنێتەوە و دلێریتان بکوژێت ، بەڵام جگە لە هیوا بڕان و ماڵ وێرانی هیچی‌تری بۆ نامێنێتەوە . سوپای ئەسکەندەری گەورە کە لەیۆنانەوە هەستاو تاهیندستان کشا و نیوەی ئاسیای گەورەی بەرینی بەزاند ، سوپاکەی لە سوپاکەی ئێمە گەورەتر نەبوو ، ئەگەر ئەوسوپایە توانی زاڵ بێت بەسەر ئەو زەوی‌یە گەورەو بەرینانەدا ، ئایا سوپای ئێمە ناتوانێت ئەو کەڵەکە بەردە فشۆڵە تێپەڕێنێت !! خەلیل پاشا ڕایگەیاند کە دەوڵەتە ڕۆژئاوایی‌یەکان بەرەو ڕوومان دەکشێن و تۆڵە دەستێننەوە ، بەڵام ئەو دەوڵەتە ڕۆژئاوایی‌یانە کامانەن ؟ مەبەستی ئەودەوڵەتە لاتینی‌یانە نی یە کە لەنێو خۆیاندا سەرقاڵی ڕق و کینەو ڕکەبەرین؟ یان مەبەستی ئەو دەوڵەتانەی دەریای ناوەڕاستە کە جگە لە دزی و جەردەیی توانای هیچی تریان نی یە ؟ ئەگەریش ئەو دەوڵەتانە بیانویستایە بیزەنتە سەرخەن ، ئەوا دەیانکرد و سەربازو کەشتیگەلیان بۆ دەناردن ، باوادابنێین ڕۆژئاوایی‌یەکان لە دوای ئەوەی فەتحی قوستەنتینیەمان کرد ، دەست ئەدەنە جەنگ و شەڕیان لەگەڵدا کردین ، دە ئایا ئێمە بە دەست بەستراوی و بەبێ جوڵان لە ڕوویاندا ڕادەوەستین ؟ ئایا سوپایەکمان نی‌یە بەرگری ئابڕوو و شەرەفمان بکات ؟ ! ئەی خاوەن شکۆ ، تۆ لەبارەی ڕای منەوە پرسیارت لیٚ کردم ، وامنیش بەقسەیەکی ڕاشکاوانە دەری دەبڕم ، پێویستە دڵەکانمان وەك بەرد وابن و بەبیٚ

ئەوەی بچوکترین لاوازی و دڵە خورپێیەکمان لێ دەربکەوێت ، درێژە بەجەنگەکە بدەین ، بەڕاستی ئێمە دەستمان کردووە بە کارێك و دەبێت تەواوی بکەین ، پێویستە هێرشەکانمان بە توندی و هێزەوە زیاد بکەین و دەلاقەی نوێ فەتح بکەین وبە دلێرییەوە زاڵ بین بەسەر دوژمندا ، جگە لەوە هیچی تر نازانم و ناتوانم هیچی تر بڵێم ... ) [1] .

بەمە و بەبیستنی ئەو قسەیە ڕوخسارێکی موژدەو دڵکرانەوە بەنێو دەم و چاوی سوڵتاندا دەرکەوت ، پاشان لای کردەوە بەلای ئورخان و پرسیاری لەبارەی ڕای ئەویشەوە کرد ، ئەویش خێرا وەڵامی دایەوە : بەڕاستی زوغنوش پاشا بەوەی کەووتی پێکای ، ئەی سوڵتانم ، منیش لەسەر ڕای ئەوم ! پاشان پرسیاری کرد لەئاق شەمسەددین و مەولای گۆڕانی لەبارەی ڕای ئەوانەوە ، چونکە فاتح بەتەواوی متمانەی بەو دووانە هەبوو ، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە کە لەسەر ڕاکەی زوغنوش پاشان و ووتیان : ( پێویستە درێژە بدەین بە جەنگەکە ، چونکە بەئامانجی نەمرانەو هەمیشەیی ،سەرکەوتن و زاڵ بوونمان دەست دەکەوێت ) [2] .

گەرم و گوڕی و ووره کەوتە نێو هەموو ئامادەبووانەوە ، سوڵتان فاتحیش دڵخۆش بوو بەهۆی نزای هەردوو زانای گەورەوە-ئاق شەمسەددین و مەولای گۆڕانی ) موژدەی زاڵبوون و سەرکەوتنی دەخواست ،ئینجا خۆی نەگرت و ووتی: لە نەژادی مندا کێ هێزی وای هەبووە [3] ؟!

زانایان ڕای قایل بوونی بەردەوامی جیهادیان پشتگیری کرد ، هەروەك سوڵتان لە دەربڕینی ڕای خۆیدا ، درێژە پێدانی هێرش تافەتح کردنی دەربڕی ، کۆبوونەوەکە بەچەند ڕێنماییەکی سوڵتان کۆتایی هات ، کەدەیووت : هێرشی

---

1 محمد الفاتح —د.سالم الرشيدي / ١٢٢ .

2 محمد الفاتح —د.سالم الرشيدي / ١٢٢ .

3 محمد الفاتح —د.سالم الرشيدي / ١٢٢ .

گـشتی و ڕێنمایی‌یـەکانی دەسـت بەسـەرداگرتنی شـارەکە نزیـك بووەتـەوە ، بـەزووییش فـەرمانی دەرخـستنی هـەلی گونجـاو دەدات ، پێویـستە لەسـەر سەربازەکانیش خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەوە [1] .

<u>دەیـەم :محمـدی فـاتح ڕێنمایی‌یـەکانی ئاراسـتە دەکـات و خـۆی شـوێن پێـی سەربازەکانی هەڵدەگرێت</u> : لە ڕۆژی یەکشەممە ، ١٨ی جەمادی ولئەوەل ، ٢٧ی مایۆ ، دا سوڵتان محمدی فاتح ڕێنمایی سەربازەکانی کرد بە لەخوا ترسان و پاککردنـەوەی دەروونـەکان و نزیکبوونـەوە لەخوا بە نوێـژو هـەموو گوێڕایـەڵی و خۆکـەم نوانـدنێك لـە ڕووی خـواا و پێکـەوە پاڕانـەوە ، بـەڵکو خـوای گـەورە فەتحکردنەکەیان بۆ ئاسان بکات ، ئەو فرمانە بەنێو هـەموو موسـوڵمانانداا بڵاو بوویـەوە ، هـەروەك ئو ڕۆژە سـوڵتان فـاتح خـۆی هەسـتا بـە چـاودێری کردنـی شـوراکانی شـارەکەو ئاگـادار بـوونی کۆتـا ئـەو بارودۆخـەی ئـەویٚ لەگـەڵ ئـەو هەواڵەی بارودۆخی خاڵە جیاوازەکانی برگریکەراندا کە پێی گەشتبوو ، چەند پێگەیـەکی دیـاری کراویـشی دەستنیـشان کـرد کـە دەبـوو بۆمبـارانی عوسمـانی جەختی بخاتـە سـەر ، تیایـدا چاودێری بارۆدۆخەکەی دەکرد و هـانی دەدان بۆ جیددی بوون و خۆ بەخت کردن لە کوشـتاری دوژمنـدا . هـەروەك نوێنـەری نـارد بـۆلای غەلتی‌یـەکان کـە هەڵوێـستی بێلایـەنیان هـەبوو تـا دەسـت وەرنەدەنـە ئەوبارەی کە ڕوو دەدات .

بەمـەش دەسـەبەری پابەنـدبوون بـە پـەیمانی خـۆی دەکـات بۆیـان ، هـەروەها هـەرزەرەرو زیانێـك کـە بـەو هۆیـەوە توشـیان دەبێـت ، هـەموویانی بـۆ قـەرەبوو دەکاتەوە .

لـە ئێـوارەی ئـەو ڕۆژەدا عوسمانی‌یـەکان ئـاگرێکی چـڕوپڕیان بـەدەوری سەربازگەکەیاندا نایەوەو هاوارو دەنگی ( لاإله إلاالله )و( الله أكبر ) کردنیان بەرز

---

[1] تأريخ الدولة العلية –محمد فريد ١٦٤ .

دەبوویــــەوە [1] . تائــەوەی ڕۆم وایــان زانـــی ئـــاگر بەربووەتـــە ســـەربازگەی عوسمانیەکانەوە ، بەڵام بۆیان دەرکەوت عوسمانیەکان ئاهەنگ دەگێڕن بۆ سەرکەوتنێکی نزیکی خۆیان ، کە ئەمەش ترسی خستە دڵی ڕۆمەکانەوە .

لە ڕۆژی داهاتوودا ٢٨ی مایۆ ، خۆ ئامادەسازیە عوسمانیەکان بەتەواوی ئامادەبوون و تۆپەکان بەئاگربارانیان بیزەنتەیان تۆپ باران دەکرد . سوڵتانیش خۆی وەك چاودێری و ڕێنمایی کردن و بیرخستنەوەی نیاز پاکی و نزا و قوربانیدان و جیهاد کردن ، بەنێو پێگە سەربازیە جیاوازەکاندا دەسوڕایەوە [2] .

فاتح ئەگەر بەلای هەر سەربازگەلێدا تێپەڕ ببوایە ، ئەوا ووتاری بۆ دەدان و گەرم و گوڕی تێدا بەجێدەهێشتن و ووریای دەکردنەوە کە بە فەتح کردنی قوستەنتینیە شەرەفێکی گەورە و شکۆمەندیەکی هەمیشەیی و پاداشتێکی نەبڕاوەیان لەلای خوا دەست دەکەوێت ، بەزووییش ڕێگە لەو ئاژاوەگێڕیانەی شار دەگرێت کە هێشتا پڕ بوو لە دوژمن و پیلان گێڕان ، یەکەم سەربازیش کە لەسەر شوراکانی قوستەنتینیە ئاڵای ئیسلام داچەقێنێت ئەوا گەورەترین پاداشت و زەویەکی بەرفراوانی دەبێت [3] .

زاناو کەسە پایەبەرزەکانی موسوڵمانانیش ، بەنێو سەربازگەکاندا دەگەڕان و ئایەتە جیهادی و جەنگیەکان و سورەتی ئەنفالیان بەسەر موجاهیدەکاندا دەخوێندو گەورەیی شەهیدی ڕێگای خواو شەهیدە پێشووەکانی قوستەنتینیەیان بەبیر دەهێنانەوە ، لەسەروو هەموشیانەوە شەهیدی قوستەنتینیە ئەبو ئەییوبی ئەنصاری ، بە موجاهیدەکانیشیان دەووت: کە

---

[1] تأريخ سلاطين آل عثمان / ٦٠ .

[2] الفتوح الإسلامية عبرالعصور / ٣٦٨ .

[3] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٢٥ .

گەورەمان محمد ﷺ لەکاتی کۆچی بۆ مەدینە لەماڵی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری دابەزی و ئەبوو ئەییوبی نارد بۆ ئەم هەرێمە ن ئەویش لێرە دابەزی ، ئەو قسەیە سەربازەکانی کڵپە پێدەسەندو گوڕو تینی لەدەرونیاندا زیندوو دەکردەوە [1].

پاش ئەوەی محمدی فاتح گەڕایەوە بۆ چادرەکەی خۆی ، گەورە پیاوانی سوپاکەی خۆی بانگ کرد ، و کۆتا ڕێنماییەکانی بۆ خوێندنەوە . پاشان ئەم ووتارەی بۆ خستنەڕوو : ( ئەگەر فەتحی قوستەنتینیەمان کرد ، ئەوا فەرموودەیەك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و موعجیزەیەك لە موعجیزەکانی لەئێمەدا دێتە دی ، بەمەش لەوەدا بەختمان دەبێت کە پێغەمبەر ﷺ لەو فەرموودەیەدا لە لەبەرزو بڵندی و ڕێز لێنانەوە ئاماژەی پێداوە ، بۆیە بەتاکە تاکەی نەوە سەربازەکانمان بگەیەنن کە ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی کە بەم زوانە بەدەستی دێنین ، لە ڕێزو شەرەفی ئیسلام زیاد دەکات ، پێویستە لەسەر هەموو سەربازێکیش ، ڕێنماییەکانی شەریعەتە بەرزو بڵندەکەمان بخاتە سەر هەردوو چاوانی و هیچکامیان ئیشێك نەکەن کە ئەو ڕێنماییانە بسڕێتەوە ، خۆشیان لەکەنیسەو پەرستگاکان بپارێزن و زیانیان پێنەگەیەنن ، وازیش لەو کەناگیرە مەسیحی ولاوازو بێتواناانە بهێنن کە شەڕناکەن .... ) [2].

لەوکاتەدا ئیمبراتۆری بیزەنتی خەڵکی شارەکەی کۆکردەوە ، بۆ هەستان بە پاڕانەوەیەکی گشتی ، تا تیایدا پیاوو منداڵ و ئافرەتان بپاڕێنەوە و لەڕووی خوادا ملکەچ بکەن و لەسەر ڕێبازی مەسیحیەت لەکەنیسەکاندا بگرین ، بەلکو دوعاکەیان گیرابێت و شارەکە ڕزگاری بێت لەگەمارۆکە . ئیمبراتۆر ووتارێکی ڕەوانبێژانەی بۆ دان کە دووپاتی کردەوە بەرگری بکەن لەشارەکە ، تەنانەت ئەگەر ئەویش مرد ، لەگەڵ بەردەوامی پارێزگاری کردن لە مەسیحیەت لەڕووی

[1] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٢٦ .
[2] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٢٦ .

موســـوڵمانه عوسمانىیەکانـــدا ، ئـــەوه ووتـــارێکی بێوێنـــه بـــوو کـــه وەك مێژوونووسان دەڵێن : هەموو ئامادەبووان گریان ، هەروەك ئیمبراتۆر و هاودەمە مەسیدیيەکانی لـه کەنیسەی ئایا صوفیادا کۆتا نوێـژیان کـرد کـه پیرۆزتـرین کەنیسەبوو لەلایان [١] .

پاشان ئیمبراتۆر چوو بۆ کۆشکەکەی و کۆتا سەردانیکرد و ماڵئاوایی و تەوقەی کـرد لـه هـەموو ئەوانـەی کـه لـەوێن ، دیمـەنێکی کاریگـەر بـوو ، مێژوونووسـه مەسـیدیيەکان لـەبارەی ئـەو دیمەنـەوه نوسـیویانه و دەڵـێن : ( ئـەوەی لـەو دیمەنەدا ئامادەبوو ، هەرکەسێکیان که دڵیشی وەك تەختـه یان بـەرد بوایه ئەوا چاوەکانی بەو دیمەنه پڕ دەبوونه فرمێسك ) [٢] .

قوستەنتین و ئەوانی دیکەش چوون بەرەو ڕووی وێنەیەك که بەوێنەی مەسیح ناوزەدیـان دەکرد و لەیـەکێك لـه ژوورەکانـدا هەڵواسـرابوو ، قوسـتەنتین لـەژێردا داچەمی و هەندێ نزای بۆ خوێند .

پاشان هەستاو کڵاوەکەی کردە سەری و لەنیوەی شەودا لەگەڵ هاودەم و هـاوڕێ و پـارێزەرە مێژوویيەکەیدا –فرانتـزس– لەکۆشـکەکه چوونه دەرێ . پاشـان هـەردوکیان پێکـەوه هەسـتان بەسـەردانێکی چـاوەدێری و پـشکنینی هێـزه بەرگریکـەرە مەسـیدیيەکان و تێبـینی بزوتنـەوەی سـوپای چـالاکی عوسمـانی ئامادەبوونی هێرشی ووشکانی و دەریایيیان دەکرد ، کەمێك بەنزیکی ئەوشەوه ، ئاسمان بەبارشتێکی هێواش –نمەباران–دەستی کردە بارشت ، هەروەك ئەوەی ئاو پرژێنی زەوی بکات ، سوڵتان محمدی فاتحیش له چادرەکەیدا هاتـه دەرێ و چاوی بەرزکردەوه بۆ ئاسمان و ووتی : (خوای گـەورە ڕەحمـەت ویارمـەتی خـۆی

[1] محمد الفاتح –الرشيدي/ ١٢٩ .

[2] محمد الفاتح –الرشيدي/ ١٢٩ .

بۆ پێش خستن ، جا ئەو بارانە پیرۆزەی لەکاتی خۆیدا بۆ باراندین ن چونکە تۆز لادەبات و بزاوت و جوڵانی ئێمەش ئاسان دەکات )[1].

یانزەهەم : نصر من الله وفتح قريب : لەیەکەم کاتژمێری سەرلەبەیانی ڕۆژی سێشەممە ٢٠ی جەمادی لئولای ساڵی ٨٥٧ك ، ٢٩ی مایۆی ١٤٣٥ز دا هێرشی گشتی بۆ سەر شارەکە دەستی پێکرد ، پاش ئەوەی فەرمان بۆ ئەو موجاهیدانە دەرچوو کە دەنگیان بە ( الله اکبر ) بەرز دەبوویەوە و بەرەو شوراکە دەچوون . بیزەنتییەکان زۆر ترسان و دەستیان کرد بە لێدانی دەرگەی کەنیسەکان و زۆرێك لە مەسیحییەکان پەنایان بۆ ئەوێ برد .

هێرشە وشکاذییەکە لەیەك کاتدا لەڕووی دەریایی و وشکاذییەوە بەپێی ئەو نەخشە وردەی کە بەتوندو تۆڵی ئامادەکرابوو ، ئامادەو سازو لەبار بوو . موجاهیدەکان تامەزرۆی شەهیدی بوون ، بۆیە بەوپەڕی دلێری و خۆبەخت کردن و هەنگاونانێکەوە بەرەو ڕووی دوژمن پێشڕەوییان دەکرد ، زۆرێك لە موجاهیدەکان گەشتن بەشەهیدی . هێرشەکە دابەش کرابوو بەسەر زۆرێك لەناوچەکان دا . بەڵام بە پلەی یەکەم جەختی لەسەر ناوچەی دۆڵی لیکۆس بوو بەسەرکردایەتی خودی سوڵتان فاتح . دەستەی یەکەمی عوسمانییەکان بۆ هەوڵی لەپێشخستنی بزوتنەوەی بەرگریکەران ، شوراو مەسیحییەکانیان دایە بەر لێزمەیەکی تۆپ و تیر ، لەگەڵ نەترسی و ئازایی بیزەنتییەکان و دلێری عوسمانییەکاندا کە بەمە قوربانییە کانی هەردوولا بەژمارەیەکی زۆر داکەوتن[2].

پاش ئەوەی دەستەی یەکەمی هێرش پەکی دەکەوت ، سوڵتان دەستەیەکی تری ئامادەکردبوو . دەستەی یەکەم دەکشانەوەو دەستەی دووەمی ئاراستە

---

[1] محمد الفاتح –الرشيدي/ ١٣٠ .

[2] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٨٠ .

پێدەکردن . بەرگریکەران توشی ماندوویی بووبوون . دەستەی تازەش توانییان بگەن بەشوراکان . لەهەوڵێکی نوێی دەستبەسەرداگرتن دا سەدان پەیژەیان بەسەر شوراکاندا دانا ، بەڵام مەسیحی‌یەکان توانییان پەیژەکان هەڵگێڕنەوەو هەوڵە بێکۆتاکانی موجاهیدەکانیش بەردەوام بوو ، پاش دووسەعات لەو هەوڵانە ، فاتح فەرمانی کەمێك حەسانەوەی دەرکرد بۆ سەربازەکانی . لەدوای ئەوەی کە لەو ناوچەیەدا بەرگریکەرەکانیان ماندوو کردن ، هاوکات فەرمانی بۆ بەشی سێیەمی هێرشبەران دەرکرد بەهێرش کردنە سەر شوراکانی ئەو ناوچەیە ، پاش ئەوەی بەرگریکەران وایان زانی کە بارودۆخەکە ئارام بووەتەوە و ئەوانیش تەواو ماندوو بووبوون ، توشی ئەو شەپۆلە نوێیە بوونەوە ، ئەو هێرشبەرانە هەناسەیەکی تازەی ئامادەسازی‌یان هەبوو و حەسابوونەوەو تەواو خوازیاری بەدەستخستنی بەشی خۆیان بوون لەجەنگەکەدا [1].

جەنگەکە لە ناوچەی دەریایی‌دا بەدەست و بردی بەرێوە دەچوو ، کە هێزە بەرگری‌کەرەکانی پەرش و بڵاوە پێ‌کرد و لە زیاتر لەیەك بەرەوە لەیەك کات دا سەرقاڵیان کردبوون .

لەگەڵ هەڵهاتنی بەرەبەیاندا هێرشبەران توانیان بەوپەڕی ووردی‌یەوە پێگەکانی دوژمن دەستنیشان بکەنو دەستیان کرد بە زیاد کردنی هەوڵەکانی هێرش بردن . موسوڵمانەکان لەگوڕو تینێکی تەواودابوون و سووربوون لەسەر سەرکەوتویی هێرشەکە ، لەگەڵ ئەوەدا سوڵتان محمد بڕیاری پاشەکشەکردنی دەرکرد بۆ سەربازەکانی بەنیازی ئەوەی هەلێك بقۆزنەوە بۆ تۆپەکانیان ،تاکوو جارێکی‌تر هەستن بە کارەکەیان ، ئیدی شوراکان و بەرگریکەرەکانی بەشەپۆلی تۆپەکان تۆپباران دەکران . ئەمەش پاش ئەو بێداری‌یەکان بەدرێژایی شەو ماندووی کردن ، پاش ئەوەی تۆپەکان هێور بوونەوە ، بەشێکی تازەی دلێرە

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٨١ .

ئینکیشاری‌یەکان بەسەرکردایەتی خودی سوڵتان تیرو ڕمی ئەو موجاهیدانە دای‌پۆشین کە بە هەوڵی ڕێگری بەرگریکەرەکان لێك هەڵنەدەوەشان . سەربازە ئینکیشاریەکان دلێری‌یەکی سەرکەوتوو و نەبەردی‌یەکی کەم وێنەیان لە هێرشەکەدا نواند و ٣٠ کەسیان توانیان هەڵزنن بەسەر شوراکەدا لەبەرامبەر ڕاچڵەکین و سەرسوڕماوی دوژمناندا ، هەرچەندە کۆمەڵێکیان کە سەرکردەکەشیانی تێدا بوو شەهید بوون . ئەوان توانی‌یان ڕێگا ئاسان بکەن بۆ چوونە نێو شارەکەوە لەبەرەی طوب قاپی‌یەوە و ئاڵاکانی عوسمانی بەرز بکەنەوە [1]. کە ئەمە وورەو گوڕوتینی سوپاکەی تری زیاد کرد بۆ دەستبەسەردا گرتن ، هەروەك هێزی لەبازووی دوژمنانی بڕی .

هاوکات جستنیانی سەرکردەی بەرگریکەران توشی برینێکی توند بوو کە ناچاری کرد بە پاشەکشە لەمەیدانی جەنگدا ، ئەمەش کاری کردە سەر بەرگریکەرەکانی‌تر . ئیمبراتۆر قوستەنتینیش خۆی سەرکردایەتی بەرگری‌کەرەکانی لە جێی جستنیان گرتە دەست . جستنیان بەمەبەستی ڕاکردن لەمەیدانی جەنگەکە سواری یەك لە کەشتی‌یەکان بوو .

ئیمبراتۆر هەوڵگەلێکی زۆری خستەگەڕ بۆ سەقامگیرکردنی ئەو بەرگریکەرانەی کە بێ‌هیوایی و بێ‌سودی بەرگری کەڵەکە بوو بوو بەسەر دڵیانەوە ، لە کاتێکدا هێرشەکە بەتوند ترین شێوە بوو بەسەرکردایەتی خودی سوڵتان ، بەمەستی بەهەل وەرگرتنی لاوازی ڕۆحی مەعنەوی بەرگری‌کەران .

عوسمانی‌یەکان لەناوچەیەکی شارەکەوە هێرشەکەیان درێژە پێ‌دا تاکوو توانی‌یان دەست بگرن بەسەر شوراکاندا و زاڵ بن بەسەر هەندێ لە بورجەکان و سەرکەون بەسەر بەگریکەرانی لای دەگای ئەدرنەو ئاڵا عوسمانی‌یەکانی بەسەرەوە بەرز بکەنەوە . ئیدی لەو ناوچەوە سەربازە عوسمانی‌یەکان دەرپەڕین

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٨٢ .

بەرەو شارەکە ، کاتێك قوستەنتین ئاڵا عوسمانی‌یەکانی بینی ، ڕای‌کرد بەرەو بورجەکانی باکوری شارەکە ، ئیدی دڵنیا بوو لە بێ‌سوودی بەرگری ، جلەکانی لابرد تاکوو نەناسرێتەوە ، ئیجا لەئەسپەکەی دابەزی و جەنگی کرد هەتاکو لە مەیدانی جەنگەکەدا کوژرا [1] .

بڵاو بوونەوەی هەواڵی مردنی ئیمبراتۆر ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە زیاد کردنی وورەو گوڕو تینی موجاهیدە عوسمانی‌یەکان و کەوتن و ڕمانی عەزیمەتی مەسیدی‌یە بەرگریکەرەکان .

سوپا عوسمانی‌یەکان توانی‌یان لەناوچە جیاجیاکانەوە بچنە نێو شارەکەوە ، بەرگریکەرانیش دوای نەمانی سەرکردەکەیان ، ڕایانکرد ، بەمە موسوڵمانەکان توانی‌یان بەسەر شارەکەدا زاڵبن .

لەوساتانەدا محمدی فاتحیش بەشداری دەکرد لە خۆشی و چێژی سەرکەوتنی سەربازەکانی بەسەرکەوتن بەسەر دوژمناندا بەوپەڕی سەربڵندی‌یەوە . سەرکردەکان پیرۆزبای‌یان لێدەکرد و ئەویش دەی‌ووت : ( سوپاس بۆخوا ، خوا ڕەحم بکات بەشەهیدەکانمان و شەرەف و سەربڵندی بکاتە بەشی موجاهیدەکان ، شانازی و سوپاسیش بۆ گەلەکەم ) [2].

لێرەدا هەندێ سوکە بەرگری لەناو شارەکەدا هەبوو کە بوو بەهۆی شەهید بوونی ژمارەیەکی موجاهیدەکان . زۆربەی خەڵکی شارەکەش ڕایانکرد بۆ کەنیسەکان . دیمەنی ئەو ڕۆژەی سێ‌شەممە ٢٠ی جەمادی‌لئەوەلی ٨٥٧ك ، ٢٩ی مایۆی ١٤٥٣ز ، وابوو کە سوڵتان فاتح لەناوەڕاستی شارەکەدا بوو کەسەربازو سەرکردەکانی چواردەوریان دابوو بە ماشاءالله وەڵامی دەدانەوەو لای دەکردەوە بەلایانداو دەی‌ووت : بەڕاستی ئێوە بوون بەفەتحرکەری قوستەنتینیە . ئەوانەی

---

[1] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٣٩ .

[2] محمد الفاتح –الرشيدي / ١٣١ .

کە پێغەمبەر ﷺ هەواڵی لە بارەوە دابوون . ئینجا پیرۆزبایی سەرکەوتنی لێکردن و نەهی لێکردن لە کوشتن و فەرمانی پێکردن لەگەڵ خەڵکدا بەنەرمی و چاکە لەگەڵ کردندا بجولێنەوە . پاشان لەئەسپەکەی دابەزی و لەسەر زەوی کڕنووشی سوپاس و پێزانین و ملکەچی برد بۆ خودا [1] .

**دوانزەهەم : هەڵسوکەوتی محمدی فاتح لەگەڵ مەسیحییەیە بەسەرزاڵبوەکاندا :**

محمدی فاتح چوو بەرەو کەنیسەی ئایا صوفیا ، خەڵکێکی زۆری تێدا کۆبووبویەوە لەگەڵ ئەو قیس و ڕەهبانانەی نوێژو نزاکانیان بەسەردا دەخوێندنەوە . مەسیحییەکانی ناوەوە زۆرترسان . یەکێك لە ڕەهبانەکان هەستا بەکردنەوەی دەرگاکە بۆ سوڵتان ، ئەویش داوای لە ڕاهیبەکە کرد خەڵکەکە هێور بکاتەوە و دڵنیایان بکات و بەئارامشەوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان ، خەڵکەکەش دڵیان ئارام و هێور بوویەوە ، هەندێ لە ڕاهیبەکانیش لە ژێرخانی کەنیسەکەدا خۆیان شاردبوویەوە . کاتێك نەم و نیانی و لێبوردنی فاتحیان بینی ، هاتنە دەرێ و موسوڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند . دوایی سوڵتان فەرمانی کرد بە گۆڕینی کەنیسەی ئەیاصوفیا بەمزگەوت . ئەوانیش واخۆیان بۆ ئەوکارە ئامادەساز کرد کە بۆ یەکەم هەینی داهاتووی تێدا بکرێت . کرێکارەکان خۆیان ئامادەکرد بۆ ئەو کارە و خاچ و پەیکەرەکانیان لابرد و وێنەکانیان بەچینێك قسڵ داپۆشی . مینبەرێکیشیان دروست کرد بۆ ووتاربێژ .

هەندێ جار دروستە کەنیسە بگۆڕرێت بەمزگەوت چونکە شارەکە بەزۆر فەتح کرا ، لەشەریعەتی ئیسلامدا بەزۆر فەتح کردن حوکمی خۆی هەیە .

سوڵتان ئازادی بەرپاکردنی دروشمە ئایینییەکان و هەڵبژاردنی سەرکردە ئایینییەکانی بەمەسیحییەکان بەخشی کە مافی حوکمدانیان هەبوو لە باس و

---

[1] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٨٣ .

خواسە شارستانی‌یەکان دا . هەروەك ئەو مافانەی لە هەرێمەکانی تریشدا بەخشی بە پیاوانی کەنیسە . بەلاّم لەوکاتەدا سەرانەی سەپاند بەسەر هەموویاندا [1] .

مێژوونووسی ئینگلیزی ئیدوارد شیبردکریسی لە کتێبەکەی‌دا ( مێژووی عوسمانی‌یە تورکەکان ) هەوڵی دا وێنەی فەتحکردنی عوسمانی‌یەکان بۆ قوستەنتینیە تێك بدات ، سوڵتان محمدیشی بەکۆمەڵە سیفەتێکی ناشیرین وەسف کرد لەرِقی فەتحکردنی شکۆداری ئیسلامی دا ) [2] .

مەوسوعەی ئەمریکی چاپکراو لە ساڵی ١٩٨٠زدا لە قورِو چڵپاوی کینەی خاچ پەرستی دژ بەئیسلام دەچوو ، کەوا بانگەشەی دەکرد : سوڵتان محمد هەستاوە بە کۆیلە کردنی زۆرینەی مەسیحی‌یەکانی قوستەنتینیە و لەبازارِەنایابەکانی شاری ئەدرنەدا بازارِی پێوە کردوون و دواتر لەوێ فرۆشتوونی [3] .

راستی روونی مێژوویی دەڵێت : سوڵتان محمدی فاتح بەهەڵسوکەوتێکی میهرەبانانە لەگەڵ خەڵکی قوستەنتینیەدا هەڵسوکەوتی کردووەو فەرمانی کردووە بەسەربازەکانی کە بەچاکی لەگەڵ دیلەکاندا هەڵسوکەوت بکەن و نەرمونیان بن لەگەڵیاندا ، ژمارەیەکی زۆری دیلەکانیشی بەماڵی تایبەتی خۆی ئازاد کردووە بەتایبەت سەرکردە یۆنانی‌یەکان و پیاوانی ئاینی . لەگەڵ ئوسقوفەکانیش دا کۆبووەتەوەو ترس و بیمیانی هێور کردۆتەوەو دڵنیای کردوون لە پارێزگاری بیرو باوەرِ و شەریعەت و ماڵەکانی پەرستشیان ، فەرمانیشی پێکردن بە دانانی بەریکێکی نوێ . ئەوانیش ئەجنادیۆسیان بەبەتریك هەڵبژارد . ئەویش لەپاش هەڵبژاردنی لەمەراسیمێکی ئاهەنگگێرِی‌دا

---

1 الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٨٣ .

2 جوانب مضيئة / ٢٦٥ .

3 جوانب مضيئة / ٢٦٧ .

کە بەپێکهاتەی ئوسقوفەکانەوە بەرەو مەڵبەندی سوڵتان بەڕێکەوت . سوڵتان محمدیش بەپێشوازییەکی گەورەوە ئەوپەڕی ڕێزی لێ گرت ! لەگەڵیشیدا نانی خوارد و لەبارەی چەندین بابەتی هەمەلایەنە و ئاینی و سیاسیو کۆمەڵایەتی دوا .

بەتریك لەدیمانەی سوڵتان چووە دەرێ و بەتەواوی بیرۆکەی بەرامبەر سوڵتانە عوسمانی و تورکەکان گۆڕا . بەڵکو بە گشتی بەرامبەر بە موسوڵمانان ، وەهەستی کرد کە : ئەو لەبەردەم سوڵتانێکی ڕۆشنبیری خاوەن پەیام و بیروباوەڕێکی ئاینی چەسپاوو مرۆڤایەتی بەرز و پیاوەتی تەواودایە .
ڕۆمەکانیش لەبەتریکەکەیان کەمتر کاریگەرو سەرسوڕماو نەبوون ، ئەوان چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کە : کوشتاری بەکۆمەڵ هەر دەبێت بیانگرێتەوە . ئیدی چەند ڕۆژێکی کەم تێنەپەڕی تاکوو خەڵك لە ئاشتی و ئارامش و دڵئارامیدا ژیانی ئاسایی شارستانییان بەسەر دەبرد [1].
عوسمانییەکان سوربوون لەسەر پابەند بوون بە بنەماکانی ئیسلامەوە . بەمە لەنێوان خەڵکدا دادپەروەری گرنگترینی ئەو بوارانەبوو کە سووربوون لەسەری . هەڵسوکەوتیان لەگەڵ مەسیحییەکاندا دووربوو لە هەرشێوەیەکی ستەم و توڕەیی و دەمارگیری . بەخەیاڵی عوسمانییەکانیشدا نەدەهات کە مەسیحییەکان بەهۆی ئایینەکەیانەوە بچەوسێننەوە [2].
بەڕاستی میللەتە مەسیحییەکانی ژێر دەستی فەرمانڕەوایی عوسمانی هەموو مافە ئایینییەکانی خۆیان بەدەست هێنا . هەرگەلێکیش سەرکردەی ئایینی خۆی هەبوو کە ڕاستەوخۆ بەبێ حوکمی عوسمانی بڕیاری بەسەردا دەدا .

---

[1] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١٣٤، ١٣٥ .
[2] جوانب مضيئة / ٢٧٤ .

هەریەك لەوگەلانەش خوێندنگای تایبەتی و شوێنی پەرستن و دێریان هەبوو . هەروەك كەس دەستی وەرنەدەدایە دارایییەوە . هەروەها لەقسەكردن بەهەرزمانێك كە دەیانەوێت سەربەستی پێدابوون [1]. بەڕاستی سوڵتان محمدی فاتح ئەو نەرمی نواندنەی لەگەڵ مەسیحییەكانی قوستەنتینیەدا نەنواند تەنها لە بەر هاندەری پابەندبوونی ڕاستگۆیانەی نەبێت بەئیسلامی پیرۆزو بە پێشەنگیكردنی پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ و پاشان بە خەلیفە ڕاشیدینەكانی دوای پێغەمبەرەوە ﷺ ، ئەوانەی كە لاپەڕەكانی مێژوویان پڕبووە لە هەڵوێستگەلی نەرموونیانی ڕێزدار لەگەڵ دوژمنەكانیاندا [2].

## باسی دووەم

### فاتحی مەعنەوی قوستەنتینیە ( شێخ ئاق شەمسەددین ) :

ناوی محمدی كوڕی حەمزەی دیمەشقی ڕۆمییە . لەگەڵ باوكیدا كۆچی كردووە بۆ ڕۆم و لە دواییدا هونەری زانستەكانی خوێندووە و پسپۆڕی تیایدا وەرگرتووە و بووە بە ناسراوێكی نێو ناسراوانی شارستانی ئیسلامی لە سەردەمی عوسمانیدا . مامۆستا و پەروەرشیاری محمدی فاتح بووە . ڕەچەڵەكی دەگەڕێتەوە بۆ خەلیفەی ڕاشید ئەبوبكری صدیق رضي الله عنه . لەدایك بوونی لەدیمەشق بووە لەساڵی ٧٩٢ك ، ١٣٨٩ز . لەتەمەنی ٧ساڵیدا قورئانی لەبەركردووە ، لە ئەماسیا و پاشان لە حەلەب و ئینجا لە ئەنقەرە خوێندوویەتی . لەساڵی ١٤٥٩ز یشدا كۆچی دوایی كردووە .

شیخ ئاق شەمسەدین زانستە بنەڕەتیەكانی ئەو سەردەمەی بە میر محمدی فاتح وتووەتەوە كە بریتی بوون لەمانە: قورئانی پیرۆز، حەدیسەكانی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، فیقهی ئیسلامی، زمانەكان (عەرەبی و فارسی و توركی) و لە

---

[1] جوانب مضیئة / ٢٨٣ .

[2] جوانب مضیئة / ٢٨٧ .

بــواری زانــسته کرداریەکانیــشدا «بیرکــاری و فەلــەکیات و میــژوو و هونــەری جەنگی» پیێ وتووە.
شیخ ئاق شەمسەدین لەو زانایانە بووە کە سەرپەرشتی سوڵتان محمدیان دەکرد لەوکاتەی سوڵتان محمد میرنشینی مەگنیسیای لەدەستدابوو ،بۆ ئەوەی لەسەر بەڕێوەبردنی میرنشین و بنەماکانی فەرمانڕەوایی مەشقی پیێ بکات و ڕایبهێنێت.
شێخ ئاق شەمسەدین توانی ئەمیری بچکۆلە ڕازی بکات بەوەی وا هەڵسوکەوت بکـات کـە مەبەسـت و بـە فـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ ( لتفـتحن القـسطنطينية ....)ئەو و سوپاکەی ئەوە.
کاتێـك محمـد بـوو بەسـوڵتانی دەوڵـەتی عوسمـانی ، گـەنجێکی کـەم تەمـەن بـوو مامۆسـتاکەی خێـرا ڕێنومـایی‌کرد بـۆ بزوانـدنی سـوپاکەی بـۆ هێنانـەدی فەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ ، ئـەوەبوو عوسمانی‌یەکان لـە وشـکانی ولـە دەریـاوە گـەمارۆی قوستەنتینیەیان دا و ٥٤ڕۆژ جـەنگێکی تونـد بـەڕێوە چـوو . کاتێـك بیزەنتی‌یـەکان سـەرکەوتنێکی کاتی‌یـان بەدەسـت هێنـاو گـەلی بیـزەنتی بـە هاتنەناوەوەی چوارکەشتی کە پاپا بۆی ناردبوون دڵخۆش بوون و بەمە ڕۆحی مەعنەویی‌یان بەرز بوویەوە . سەرکردەو وەزیرە عوسمانی‌یەکانیش کۆبوونەوە و بەرەو ڕووی سوڵتان محمـدی فـاتح بوونـەوەو پێیـان ووت : ( تـۆ پاڵـت ناوە بەو ڕێـژە گەورەیـەی سـەربازانەوە بـۆ ئـەم گەمارۆیـە ، تـەنها لەبـەر قسەی یـەکێك لـە مامۆستایان –مەبەستیان ئاق شەمسەددین بوو – ئـەوەتا سـەربازەکان بەهیلاکدا چوون و زۆربەی چەکەکانیش لە کەڵك کەوتوون و کارەکەش گەیشتووەتە ئەوەی لـە وولاتـی ئیفرەنجـەوە کۆمـەکی بـۆ بێ‌باوەڕانی ناو قەلاکە بێـت ، ئیـدی لێرەدا هیوایەك نەماوە بۆ فەتح کردن ) [1].

---

[1] البطولة والفداء عند الصوفية / ١٤٦ .

سوڵتان محمدیش ولی الدین أحمد پاشای وەزیری خۆی نارد بۆ لای شێخ ئاق شەمسەددین لە چادرەکەیدا تاکوو لەبارەی چارەسەرەوە پرسیاری لێ بکات ، شێخیش وەڵامی دایەوە : ( هەردەبێ خوای گەورە بەوفەتحە منەت بخاتە سەرمان ) [1].سوڵتان بەو وەڵامە قایل نەبوو ، بۆیە جارێکیتر وەزیرەکەی ناردەوە تاکوو داوای ڕوونکردنەوەی زیاتری لێ بکات ، ئەویش ئەم نامەیەی بۆ محمد فاتحی خوێندکاری نارد کە تێیدا دەڵێت : ( خوا هەر خۆیخاوەنی عیززەتە و هەر خۆی سەرخەرە ،ڕاستە هاتنی ئەو کەشتییانە کاری تێ کردوون و تووشی دڵشکان و بێزاری کردوون، بێباوەڕەکانیشی دڵخۆش کردووە، بەڵام ئەوە کێشەی کە هەرگیز ناگۆڕێت بریتیە لەوەی بەندە تەگبیر ئەکات و خوای گەورەش بەرنامە دائەنێت و بڕیاریش هەر هی خوایە، ئێمە پەنامان بۆ لای خوا بردووە و قورئانی پیرۆزمان خوێندوەتەوە. ئەمەش تەنها وونەوزێکەو بەس ، تائەوەی میهری خوایی ڕوو دەدات و موژدەگەلی وادەردەکەوێت کە لەمەو پێش ڕووی نەداوە . . .) [2]. ئەم ووتارەی دا بۆ حەسانەوەو دڵئارامی سەربازەکان ، یەکسەر ئەنجومەنی جەنگی سەربازی بڕیاری درێژە پێدانی جەنگی دا بۆ فەتح کردنی قوستەنتینیە . پاشان سوڵتان چوو بەرەو چادرەکەی شێخ شەمسەددین و دەستی ماچ کرد و ووتی : گەورەم دوعایەکم فێر بکە کە لەلای خوا داوای سەرکەوتنی پێ بکەم . شێخیش نزایەکی فێر کرد . سوڵتان لەچادرەکەی مامۆستاکەی چوویە دەرێ بۆ ئەوەی فەرمان بکات بەهێرشی گشتی [3]. سوڵتان ویستی لەکاتی هێرشەکەدا مامۆستاکەی لەلای بێت . بۆیە کەسێکی نارد تاداوای هاتنی لێ بکات بەڵام شێخ داوای کرد کەس نەچێتە چادرەکەیەوە بۆ

---

[1] العثمانیون في التأریخ والحضارة / ٣٧٣ .

[2] العثمانیون في التأریخ والحضارة / ٣٧٣ .

[3] العثمانیون في التأریخ والحضارة / ٣٧٣ .

لای . پاسەوانەکانی چادرەکەش ڕێگایان گرت لە نێردراوەکەی سولْتان بۆ چوونە ژوورەوە . محمدی فاتح توورە بوو و خۆی چوو بۆ چادرەکەی تاکوو داوای لیّ بکات کە بێت ، ئەوکات پاسەوانەکان لەسەر بڕیاری شێخ ڕێگریان کرد لە سولْتان بۆ چوونەناو چادرەکەی . محمدی فاتحیش خەنجەرەکەی هەلْگرت و چادرەکەی لەلایەکیەوە دڕاندو سەیری ناوەوەی کرد ، بینی وا مامۆستاکەی لە کڕنوشێکی دووردرێژدایە بۆ خوای گەورەو مێزەرەکەی لەسەری کەوتۆتە خوارێ و قژی سپی و ڕەشی لەسەر زەوییە ، ڕیشی سپیشی وەك قژەکانی ڕوناکی دەداتەوە . پاشان سولْتان بینی مامۆستاکەی لەکڕنووشەکەی هەستایەوە لەکاتێکدا فرمێسکەکان لەسەر کولْمەکانی دەخلیسکان ، لەخوای خۆی دەپاڕایەوەو داوای داباراندنی سەرکەوتن و فەتحێکی نزیکی لیّ دەکرد [١].

بەدوای ئەوەدا سولْتان محمدی فاتح گەڕایەوە بۆ پێگەی سەرکردایەتییەکەی و سەیری شورا گەمارۆ دراوەکانی دەکرد ، کە سەربازەکانی چەند کەلێنێکیان کردبووە شوراکەوە و سەربازەکان پێیدا تێدەپەڕین بۆ نێو قوستەنتینیە [٢]. سولْتان زۆر بەوە دلْخۆش بوو و دەیووت : هۆی دلخۆشیم ناگەڕێتەوە بۆ فەتحی قوستەنتینیە، بەلْکو دەگەڕێتەوە بۆ بوونی کەسێکی وەك ئەو پیاوە موبارەکە لەم سەردەمەی مندا [٣].

شەوکانی لە ( البدر الطالع ) باس لەوە دەکات کە شێخ شەمسەددین بەرەکەت و فەزلی لە ناو خەلْکدا بوەو ئەو ڕۆژەی بۆ سولْتان دەستنیشان کردوە کە تێیدا قوستەنتینیە لەسەر دەستیدا فەتح دەکرێت [٤].

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٣٧٤ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٣٧٤ .

[3] البدر الطالع : ٢/ ١٦٧ .

[4] البدر الطالع : ١٦٦/٢ .

کاتێـك سـوپای عوسمـانی بـەهێزو گـوڕو تینێکـەوە ڕژانـە شـارەکەوە ، شـێخ پێشڕەوی کرد بۆ لای محمدی فاتح بۆ ئەوەی یاساکانی شەڕی لە شەریعەتی خوادا بیر بخاتەوە هەروەها لە گەڵ مافەکانی گەلی فەتحکراوی بیر بخاتـەوە بەو شێوەیەی لەشەریعەتی ئیسلامیدا هاتووە [1].

پاش ئەوەی محمدی فاتح بەدیاری و بەخشین ڕێزی نا لەسەربازەکانی و سفرەو خـوانێکی گـەورەی بـۆ کردنـەوە و سـێ ڕۆژ بـەردەوام بـوو ، و تێیـدا دیمـەنی خۆشی و جوانی و ئاهەنگ گێڕانی تێدا بەرپاکران . خودی سوڵتانیش هەڵدەستا بە خزمەتکردنی سەربازەکانی، وەك بەجێ گەیاندنی ئەو فەرموودەیەی پیغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرموێت(سید القوم خادمهم) واتا:( گەورەی گەلێك خزمەتگوزاریانـە ) . پاشـان ئـەو مامۆسـتا زانـا لێهـاتووە هەسـتا و ووتـارێکی بـۆ خوێندنـەوە و ووتـی : ئـەی سـەربازانی ئیـسلام ! بـزانن و لـە بیرتـان بێـت کـە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئێوەوە فەرموویەتی : ( لتفتحنّ ....) داوا لـەخوای گـەورە دەکەین کە سەرکەوتوومان بکات و لێمان خۆش بێـت . وریـابن زێـدەڕۆیی نەکـەن لـەو مـاڵ و دەسـکەوتەی بەدەسـتتان کـەوتووە بـەفیڕۆی نـەدەن . لەچاکەو خێـردا بیبەخـشن وە بەسـەر خـەڵکی ئـەم شـارەدا. گـوێ لـە سـوڵتانەکەتان بگـرن و گوێڕایەڵی بن و خۆشتان بوێت . پاشان ڕووی کردە فاتح و ووتی : ئەی سوڵتانم ! تـۆ بوویتـە بیلبیلـەی چاوی بنەماڵـەی عوسمـان ، جا بـەردەوام موجاهیـدێکی ڕێگـای خوابـە ، پاشـان بـەدەنگێکی زۆر بـەرزی نێرانـە دەسـتی کـردە (الله أکبر) کردن [2].

پاش فەتحی قوستەنتینیە ، شێخ ئاق شەمسەددین چوو بۆ لای گۆڕی هاوەڵی پایەبەرزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ئەبو ئـەییوبی ئەنـصاری ، کەلـەنزیك

---

[1] العثمانیون في التأریخ والحضارة / ٣٧٤ .

[2] محمد الفاتح / ١٤٩ .

شوراکەی قوستەنتینیەوە بوو [1].شێخ یەکەم کەس بوو لەمزگەوتی ئایاصوفیا دا ووتاری ڕۆژی هەینی پێشکەش کرد [2].

*شیخ ئاق شەمسەددین لەوە ئەترسێت کە سوڵتان سەرکەش ببێت : سوڵتان محمد زۆر ئاق شەمسەددینی مامۆستای خۆی خۆش دەویست ، پێگەیەکی گەورەشی لەدەروونی‌دا هەبوو ، پاش فەتحکردنەکە سوڵتان چواردەورەکەی کۆکردەوە و ووتی : (ئێوە دەمبینن دڵخۆشم ، دڵخۆشیم تەنها بە فەتحکردنی ئەو قەلایە نی‌یە ، بەڵکو دڵخۆشیم خۆی لەبوونی شێخێکی بە هەیبەتدا خۆی دەنوێنێت کە لەسەردەمی مندا ئەژی کە ئەویش شێخ ئاق شەمسەددینی پەروەردەکەرمە) . سوڵتان ترسی خۆی لە قسەیەکدا لەمەڕمامۆستاکەی دەردەبڕیٚ کە لەگەڵ محمود پاشای وەزیری‌دا قسەی دەکردوو دەیووت : ( بەڕاستی ڕێزم بۆ ئاق شەمسەددین ڕێزگرتنێکی خۆنەویستانەیە ، من کاتێك لای مامۆستاکەم دائەنیشم هەیبەت و گریان دەمگریٚ) [3].

خاوەنی ( البدر الطالع ) باس دەکات کە:(پاش ڕۆژێك سوڵتان هات بۆ چادرەکەی ئاق شەمسەددین کە شێخ ڕاکشابوو و لەبەری هەڵنەستایەوە . سوڵتان دەستی ماچکرد و ووتی:هاتووم بۆ لات بۆ پێویستییەك . ئەویش ووتی : چی‌یە ؟ ووتی : ڕێگەم بدەی بێمە خەڵوەتگە لەگەڵتدا کەمێك لە چۆڵەوانید! بەڵام شێخ ڕازی نەبوو . سوڵتان چەند جارێك ئەم داوایەی لێکرد . ئەویش دەیووت : ناء! سوڵتان تووڕە بوو ووتی : یەك لە تورکەکان دێت بۆ لات و بەیەك قسە لەگەڵ خۆتدا ئەیبەیتە خەڵوەتگە، بەڵام ڕێگە بە من نادەیت ؟! شێخ ووتی : تۆ کە چویتە خەڵوەتگە، تام وچێژێکی لیٚ دەبەیت و ئەو کاتە دەسەڵات و کورسیت

---

[1] محمد الفاتح / ١٤٩ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٣٧٤ .

[3] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٣٧٥ .

لەبەر چاو دەکەوێت و بەمەش تەرازووی دەسەلات کون و کەلەبەری تێدا دەکەوێت خواش لێمان عادز ئەبێت، مەبەست لە خەڵوەتکردن بەدیهێنانی دادپەروەری‌یە ، تۆش پێویستە ئاواو ئاوا بکەیت . چەند ئامۆژگاری‌یەکی بۆ باس کرد . دواتر سوڵتانیش ١٠٠٠ دیناری بۆ نارد ، بەلام شێخ قبوڵی نەکرد ، کاتێك سوڵتان چوویە دەرێ ، بەهەندێ لەوانەی ووت کە لە دەوروبەریدا بوون! شێخ لەبەرم هەڵنەسا، ئەوانیش پێیان ووت : پێ‌دەچێت سەرکەشی‌یەکی تێدا بەدی کردبێت بەهۆی ئەو فەتحکردنەی کە هاوشێوەی ئەوە بۆ سوڵتانە گەورەکان ساز نەدراوە ، بۆیە ویستوویەتی بەوە هەندێك لەو لەخۆبایی بوونەت لەسەر هەڵگرێ ) [1]. بەوجۆرە ئەو زانا پایەبەرزە سوور بووە لەسەر پەروەردەی محمدی فاتح ، لەسەر واتاکانی ئیسلام و چاکە ، ئەو شێخە تەنها لەزانستەکانی ئایین و دەرون پاکی‌دا دەریا نەبوو، بەڵکو زانایەکیش بووە لە گژو گیاو پزیشکی و دەرمان دروستکردندا .

لەسەردەمی خۆی‌دا ناسراو بووە بەوەی کە شارەزایەکی زانستە دنیایی‌یەکان و لێکۆڵینەوەکانی زانستی گژوگیایە و کام گیا بۆ کامە نەخۆشی ئەشێت، ناوداری لەو کارەدا گەشتە ئەوەی لەناو خەڵکدا بەنموونە دەیانووت : گژوگیا قسە بۆ ئاق شەمسەددین دەکەن [2].

شەوکانی لەبارەیەوە دەڵێت : لەگەڵ ئەوەی پزیشکی دڵەکان بووە بوو بەپزیشکی جەستەکانیش ، چونکە ئەو واناسرابوو کە درەخت بانگی دەکەن و دەڵێن: من شیفام بۆ فلانە نەخۆشی، پاشان فەزڵ و بەرەکەتی لە هەموو کەسێکەوە بەدیارکەوت [3].

---

[1] البدر الطالع : ٢/ ١٦٧ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٣٧٥ .

[3] البدر الطالع : ٢/ ١٦٦ .

شێخ بەهێندەی گرنگیدان بە نەخۆشییە دەروونییەکان گرنگی بەنەخۆشییە جەستەییەکان دەدا ، ، شێخ گرنگییەکی زۆری دەدا بە نەخۆشیە ساریەکان کە لەسەردەمی ئەودا ئەو نەخۆشییانە بووبوون بە هۆی مردنی هەزاران کەس .
لەم بارەیشەوە کتێبێکی بە تورکی داناوی بەناوی( مادة الحياة ) کە تێیدا دەڵێت :ئەو ڕوانینە هەڵەیە کە نەخۆشییەکان خۆبەخۆ لە کەسەکانەوە دەردەکەون ، نەخۆشییەکان بەهۆی میکرۆبەوە لەکەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوێزرێنەوە ، ئەو میکرۆبە بەئاستێك بچووك و ووردە کە بەچاوی ئاسایی نابینرێت ، بەڵام ئەمە بەهۆی چەند تۆوێکی زیندووەوە ڕوودەدات) [١]. بەمە شێخ ئاق شەمسەددین لەسەدەی ١٥ی زاییندیدا یەکەم کەس بوو کە پێناسەی میکرۆبی دانا ، کە تا ئەو کاتەمیکرۆسکۆب نەدۆزرابووەوە، بەڵکو پاش ٤سەدە دوای ئاق شەمسەددین ، کیمیازان و زانای بایۆلۆجی فەرەنسی ویس باستیر هات، دەستی دایە لێکۆڵینەوەکانی و گەشیتە هەمان ئەو ئەنجامەی ئاق شەمسەدینی پێی گەیشت.
هەروەها ئاق شەمسەددین گرنگیدا بە شێرپەنجە و نوسینێکی لەبارەیەوە نوسی ، شێخ لەبارەی پزیشکییەوە دوو کتێبی نوسیوە کە بریتین لە : ( مادة الحياة ) و ( كتاب الطب) کە هەردووکیان بەزمانی تورکی عوسمانین .حەوت کتێبیشی بەعەرەبی هەیە کە بریتین لە ( حلّ المشكلات ) و( الرسالة النورية ) و( مقالات الأولياء ) و( رسالة في ذكر الله ) و( تلخيص المتائن)و (دفع المتائن) ، نامەیەکیشی نوسیوە لە بارەی شەرح و پێناسی حاجی بایرامەوە [٢].
<u>مردنی شێخ شەمسەددین</u>: شێخ پاش ئەوەی بەپێویستی زانی گەڕایەوە بۆ (کونیوکی) زێدی خۆی ، هەرچەندە سوڵتان زۆر داوای لێکرد کە لە ئەستانبوڵ بمێنێتەوە. ئەوەبوو لە ساڵی ٨٦٣ك ، ١٤٥٩ز دا وەفاتی کرد (ڕەحمەت و

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٣٧٦ .
[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٣٧٦ .

لێخۆشبوون و ڕەزای خوای لێبێت )، ئەوەی سوننەتی خوایییە لە دروستکراوەکانیدا ئەوەیە کە هەرسەرکردەیەکی خواناس و ڕزگارکەرێکی پاڵەوان سەر هەڵبدات ، کۆمەڵێك لە زانا خواناسەکان لەدەوروبەریدا دەبن و بەشدار دەبن لە فێرکردن و پەروەردەو پێگەیاندنیدا . نموونە لەم بارەیەوە زۆرە وەك لە دەوڵەتی موڕابیتەکان دا باسی ڕۆڵی عبداللە ی کوڕی یاسینمان کرد ، لەگەڵ یەحیای کوڕی ئیبراهیم دا ، وقازی أبوالفضل لەگەڵ صلاح الدینی ئەییوبیدا . ئەوەش لە دەوڵەتی عوسمانیدا ئاق شەمسەددین لەگەڵ سوڵتان فاتح دا . ڕەحمەتی خوا لەهەموویان ، خوا هەوڵ و کارەکانیان قبوڵ بکات و لەنێو چاکەکاراندا ناویان پایە بڵند بکات [1].

## باسی سێیەم

## کاریگەری فەتحی قوستەنتینیە لەسەر جیهانی ئەورووپی ئیسلامی

قوستەنتینیە لەپێش فەتح کردنیدا بەربەستێکی گەورەبوو لەڕووی بڵاو بوونەوەی ئیسلام لە ئەوروپادا ، بۆیە کەوتنی ئەو شارە یانی دەرگای چوونە ناو ئەوروپا بە ئاشتی و قارەمانانە کراوەتەوە لە بەردەم ئیسلامدا ،بەشێوەیەکی زیاتر بۆ ئەوانەی ئیسلام وەردەگرن . فەتحی قوستەنتینیە بەگرنگترینی ڕووداوەکانی مێژووی جیهانی دادەنرێت ، بەتایبەت لە مێژووی ئەوروپاو چۆنیەتی پەیوەندی بەئیسلامەوە تەنانەت مێژوو نووسە ئەوروپییەکان و ئەوانەش بەشوێن ئەواندا ئەڕۆن ئەم ڕووداوە بە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتای سەدەی نوێ دادەنێن [2].

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٣٧٦ .

[2] تأريخ الدولة العثمانية –يلماز أوزنتونا/ ٣٨٤ .

دوای ئەوەی سوڵتان هەستا بەڕێکخستنی کارو بەشە جیاوازەکانی شارەکەو بنیاد نانەوەی قەڵاکانی و کردنی بەپایتەختی دەوڵەتی عوسمانی و نازناوی (ئیسلام بول)ی لێنا ، واتە شاری ئیسلام [١] .

ڕۆژئاوای نەصرانی بەهەواڵی ئەو فەتحکردنە کاریگەربوون و هەستیان بەترس و دڵگرانی و سەرشۆڕی کردو مەترسی سوپاکانی ئیسلامیان لە ئەستامبوڵ بۆ دەرکەوت . بەمە شاعیرو ئەدیبەکانیان هێندەی لەتوانایاندابوو بۆ هەڵگیرساندنی ئاگری کینەو گڕکانی تورەیی لەدەروونی مەسیحییەکاندا دژ بە موسوڵمانان خستیانە گەڕ ، هەروەها سەرکردەو پاشاکان چەندین کۆبوونەوەی دوورو درێژو بەردەوامیان بەست و مەسیحییەکانیان بانگ کردن بۆ پشتگوێ خستنی ناکۆکی و شەڕەقسەکانیان لە نێوان خۆیاندا.

پاپا نیقۆلای پێنجەم لەهەموو خەڵك زیاتر کاریگەر بوو بەوهەواڵی کەوتن و ڕووخاندنەی قوستەنتینیە . بۆیە هەوڵی خۆی خستەکارو کاتی خۆی سەرف کرد لەیەکخستنی دەوڵەتە ئیتالییەکان و هاندانیان بۆ کوشتاری موسوڵمانان . سەرکردایەتی کۆنگرەیەکی کرد کە لە ڕۆما بەستراو تێیدا دەوڵەتە هاوبەشەکان ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ یارمەتیدانی یەکترو ئاراستەکردنی هەموو هەوڵ و تواناکانیان دژ بە دوژمنی هاوبەشیان .خەریك بوو ئەو هاوپەیمانێتییە تەواو بێت و سەربگرێت کەچی مەرگی کتوپڕ هاتەسەر پاپا و بەهۆی ئەو خورپە لێکەوتنە توندەی کە ڕووخانی قوستەنتینیە بەدەستی عوسمانییەکانەوەی بۆی دروستکرد ، کەبوویە هۆی خەم و خەفەتی پاپا لە مەراقاندا لە ٢٥ی مارسیساڵی ١٤٥٥زدا مرد[٢].

---

[1] تأريخ الدولة العلية –محمد فريد بك / ١٦٤ .

[2] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١٣٧، ١٣٦.

میر فیلیپ طیبي کە دۆقی[1] بۆرگەندیا بوو و هەڵچوون و گەمبوونی زیادی کردو پاشاکانی مەسیحی بانگ کرد بۆ کوشتنی موسوڵمانان ، بەمەش سوارچاك و خوێنگەرم و دەمارگیرە مەسیحیەکان پەیرەویان کرد تاکوو بیرۆکەی کوشتنی موسوڵمانان گۆڕا بۆ بیروباوەڕێکی پیرۆز کە پاڵی پێوە دەنان بۆ داگیرکردنی وولاتەکەیشیان ، پاپاکان لەڕۆما سەرکردایەتی جەنگەکانی مەسیحیان دەکرد دژ بە موسوڵمانان ، سوڵتان محمدی فاتحیش لە قەرەوڵدابوو بۆ هەموو جموجووڵێکی مەسیحیەکان ، بەهەرجۆرێك کە بەباشی دەزانی بۆ وزە پێدانی دەوڵەتەکەی و داڕوخاندنی دوژمنەکانی ، نەخشەی بۆ دەکێشاو جێبەجێی دەکرد . بەمە ئەو مەسیحیانەی دراوسێی سوڵتان محمد بوون یان سنوریان لە ئاماسیاو وولاتی مۆرە و تەرابزۆن وەی ترەوە لەپاڵ یەکدا بوون ، ناچار بوون هەستی ڕاستەقینەی خۆیان بشارنەوە و خۆشی و خۆشحاڵی پیشان بدەن و وەفدەکانیان بنێرن بۆ ئەدرنە بۆلای سوڵتان بۆ ئەوەی لەسەر سەرکەوتنەگەورەکەی پیرۆزبایی لێ بکەن [2].

پاپا (پیۆسی دووەم) بەهەموو توانایەکی وتاربێژی وژیریەکی سیاسیەوە ، هەوڵی کڵپە پێسەندنی ڕق و کینەی خاچپەرستی دەدا لە نێو دەروونی مەسیحیەکاندا بەگەل و پاشاو سەرکردەو سەربازیانەوە .

هەندێ لە دەوڵەتەکان ئامادەی جێبەجێ کردنی بیرۆکە پاپابوون ، کە ئامانج لێی لەناوبردنی عوسمانیەکان بوو. کەچی کە کاتی دەرچوونی ئەو کارە هات ، دەوڵەتە ئەوروپیەکان بە بیانووی چەرمەسەریە ناوخۆییەکانیانەوە

---

[1] دۆق: بەرزترین پلەی ڕێداریە دوای پلەی (میر)، بۆ یەکەمجار لە فەرەنسادا بەکارهێنرا و ئێستا لە ئینگلتەرا بەکاردەهێنرێت و مەبەست پێی (پێشەوا)یە وشەکە لە بناغەدا لاتینیە (ن. وەرگێڕ).

[2] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١٤٠.

بەشداری شەڕیان نەکرد، چەنکە جەنگی سەد ساڵە فەرەنساو ئینگلتەرای هیلاك کردبوو، هەروەها بەریتانیا سەرقاڵ بوو بە کێشە و سەرقاڵی‌یە دەستوری‌و جەنگە ناوخۆییەکانیەوە ، ئیسپانیاش سەرقاڵی بنەبڕکردنی موسوڵمانانی ئەندەلوس بوو. کۆمارەکانی ئیتالیاش بە ناچاری و لەبەر خۆشویستنی ماڵ و سامان ، گرنگی‌یان بە پتەوکردنی پەیوەندی‌یان لەگەڵ عوسمانی‌یەکاندا ئەدا .
پڕۆژەی هێرشی خاچ پەرستی بەمردنی پاپای سەرکردەی پرۆژەکە کۆتایی پێ‌هات و هەریەکە لەمەجەڕ و بوندوقیە بە تەنها ڕووبەڕووی دەوڵەتی عوسمانی بوونەوە ، بوندوقیە بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆی گرێبەستێکی دۆستایەتی و چاك ڕەفتاری لەگەڵ دراوسێدای لەگەڵ عوسمانی‌یەکاندا بەست ، مەجەڕیش لەبەردەم سوپای عوسمانی‌دا داڕماو عوسمانی‌یەکان توانی‌یان وولاتی صرب و یۆنان و ئەفلاق و قەڕەم و دورگە سەرەکی‌یەکانی ئەرخبیل بدەنە پاڵ دەوڵەتەکەی خۆیان ، ئەمەش لەماوەیەکی کەمدا کۆتایی پێ‌هات ،ئەوەبوو سوڵتان محمد فاتح لەناکاودا دای بەسەریانداو ڕیزەکانیانی تێك شکاندن و بەتەواوی لەناوی بردن[1] .
پاپا بیۆسی دووەم بەهەموو لێهاتوویی و توانایەکی سیاسی‌یەوە هەوڵی‌دا کە هەوڵەکانی لە دوو ناوچەوە توند بکاتەوە :
یەکەم : هەوڵی‌دا تورکەکان قایل بکات بەوەی ئاینی مەسیحی وەربگرن ، بۆ ئەم مەبەستەش نێردراوی موژدەدەری نەدەنارد ، بەڵکوهەستا تەنیا پەیامنێرێکی نارد بۆ سوڵتان محمدی فاتح کە داوای لێ کرد یارمەتی مەسیحی‌یەت بدات و بەهێزی بکات هەروەك چۆن پێشتر قوستەنتین و کلۆفس یارمەتیان داو بەهێزیان کرد ، پەیمانیشی دا ئەگەر بێت و بە دڵسۆزی مەسیحیەت وەربگرێت ، ئەوا لەتاوانەکانی خۆش دەبێت ، هەروەها پەیمانی ئەوەی پێدا کە بەرەکەتی بۆ

[1] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١٤٠.

بنێرێت و باوەشی بۆ بکاتەوە و کارتی چوونەبەهەشتی پێبدات!! جا کە لەم نەخشەیەیدا شکستی خوارد ، پەنای بردە بەر نەخشەی دووهەم : کە نەخشەی هەڕەشەکردن و بەکارهێنانی هێز بوو ، ئەنجامەکانی ئەم نەخشەی دووەمەش بەشکست هێنان و بەداڕمانی سوپا خاچ پەرستییەکان دەستی پێکرد کە هونیاوی مەجەڕی سەرکردایەتی دەکرد [1].

لەبارەی شوێنەواری ئەو فەتحە ڕوونە لەڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا ، دەڵێین : خۆشی و شادی لە پارچەکانی ئاسیاو ئەفریقیادا موسوڵمانانی داگرت . ئەو فەتح کردنە خەونی باوباپیران و هیوای هەموو نەوەکان و دەستەو تاقمە یەك لەدوای یەکەکان بوو ، ماوەیەکی درێژ بەدوویدا گەڕان هاتەدی .

سوڵتان محمەدی فاتح چەند نامەیەکی نارد بۆ فەرمانڕەواکانی ناوچە ئیسلامییەکان لەمیسر و حیجاز و وولاتی فارس و هیند و ... هتد ، کە هەواڵی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی پێدەدان ، هەواڵەکانی ئەو سەرکەوتنە لەسەر مینبەرەکانەوە بڵاو کرانەوە و نوێژی سوپاسگوزاری بەرپاکراو ماڵ و دوکانەکان ڕازێنرانەوە و پۆستەرو لافیتەی ڕەنگاوڕەنگ بە دیوارو حەوشەکانەوە هەڵواسران [2].

ئبن ئیباس خاوەنی کتێبی ( بدائع الزهور ) دەربارەی ئەو ڕووداوەوە دەڵێت : ( کاتێك ئەو فەتحکردنە ڕوویدا و وەفدی فاتح گەشت ، موژدەکان لە قەڵاکاندا دادەکوتران و لەقاهیرە دا بانگەوازکرا بۆ ئاهەنگ ، پاشان سوڵتان برسبای ئەمیر ئاخوری دووەمی وەك نوێنەر دەستنیشان کرد بۆ لای (ئیبن عوسمان)تا پرۆزبایی ئەو فەتحکردنەی لێ بکات ) [3].

---

[1] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي / ١٤١.

[2] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي /١٤٢.

[3] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمي /١٤٢.

ئەبولمەحاسینی کوڕی تغری بردی مێژوو نوس ، هەست و حاڵی خەڵکی قاهیرە وەسف دەکات لەوکاتەیدا کە وەفدی فاتح لەگەڵ دوو دیل دا کە لەگەورەکانی ڕۆا ئەگەنە قاهیرە، و دیاری و خەڵاتیان پێ یە ، دەڵێت : ( دەڵێم : سوپاس و منەت بۆ خوایە لەسەر ئەو فەتحە گەورەیە ، ئینجا نێردراوی ناوبراو هات و دوو دیلی لە گەورەکانی ئەستانبولی پێبوو کە هێنانی بۆ لای سوڵتان ئینالی سوڵتانی میسر . ئەو دوانە هەردوکیان خەڵکی قوستەنتیەنیە بوون کە گەورەترین کەنیسەی ئیستانبول بوو، سوڵتان زۆر دڵخۆش بوو ، خەڵکیش بەو فەتحکردنە گەورەیە سەرسام بوون ، تەپڵی خۆشی لە شاردا لێدرا، بەوهۆیەوە چەند ڕۆژێك قاهیرە ڕازێنرایەوە ، پاشان لە ڕۆژی ٢شەممە ٢٥ی شەووالدا نێردراوەکە لەگەڵ دو دیلەکەی بەردەستیدا پاش ئەوەی بە کۆڵانەکانی شاردا تێپەڕبوون چوو بۆ قەڵا ، خەڵکی بە جوانکردنی دوکان و شوێنەکان ئاهەنگیان دەگێڕا ، لەم مەبەستەشیاندا چوست و چالاك بوون ، سوڵتانیش لەقەڵای جەبەل لە حەوشەی کۆشکی سوڵتانیدا خزمەتگوزاری خستە ڕوو .........) [١].

ئەوەی (ئیبن تغری بردی) لەوەسفی ئاهەنگ گێڕان و دڵخۆشی خەڵکی قاهیرە بەفەتحکردنی قوستەنتینیەی باسی کرد، تەنها وێنەیەکە لەو دیاردانەی کە لەووڵاتە ئیسلامیەکانی تردا بەرپاکرا .

هەروەها سوڵتان محمدی فاتح چەند نامەیەکی سەبارەت بەم فەتحکردنە نارد بۆ سوڵتانی میسرو شای ئێران و شەریفی مەککە و ئەمیری قرمان ، هەروەك هاوشێوەی ئەونامانەی نارد بۆ سەرکردە مەسیحیەیە دراوسێکانی لە مۆرە و ئەفلاق و مەجەڕ و بۆسنە و صربیا و ئەلبانیا و هەموو دەوروبەری خاکی دەسەڵاتەکەی [٢].

---

[1] النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة : ٧١/١٦ .

[2] محمد الفاتح –سالم الرشيدي / ١٤٢ .

*هەندێ بڕگە لەنامەکەی فاتح بۆ سوڵتانی میسر : ئێستاش چەند پارچەیەکی نامەکەی فاتح دەخەینە ڕوو کە بۆ براکەی خۆی سوڵتانی خانەدانی میسر ئینالی نارد کە لە داڕشتنی شێخی گۆرانی‌یە : (یەکێك لە چاکترین نەریتی پێشنیەکانمان —ڕەحمەتی خوایان لێ بێت _ ئەوەیە کە موجاهیدی ڕێگەی خوابوون و لەلۆمەی لۆمەکاران نەترساون ، ئێمەش لەسەر ئەو نەریتە دەڕۆین و لەسەر ئەو ئومێدەش بەردەوامین ، صیڕەوی ئەکەین قسەی خوا کە دەفەرموویت﴿قاتلوا الذين لايؤمنون بالله ﴾ التوبە: ٢٩ ، و پابەندین بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ ( من اغبرت قدماه في سبيل الله حرمه الله على النار) —واتە: هەرکەس پێکانی لە ڕێی خوادا تۆزیان لێ بنیشێ خوا ئاگری دۆزەخی لێ حەرام دەکات — کە بەفەرمانی خوا فەرمانی بەسەردا داوین ﴿ قاتلوا الذين يلونكم من الكفار ﴾ هەروەها سەربازو موجاهیدەکانمان لە وشکانی و دەریادا ئامادەکردووە بۆ فەتحکردنی شارێك کە پڕ بووە لە خراپەو بێباوەڕی و لە نێو مەملەکەتە ئیسلامی‌یەکانیشدایە و شانازی بە بێباوەڕی خۆشیەوە ئەکات و کەش و فشی دەکات:

كأنها حصف على الخد الأغر وكأنها كلف على وجه القمر

ئەو شارەی لایەکی لە سەردەریایە و لایەکەی تری لەسەر وشکانیە، ئێمەش هەروەك خوا فەرمانی پێ‌کردوین ، خۆمان ئامادەسازس کردووە ﴿ واعدوا لهم مااستطعتم من قوة﴾ هەموو تفاقێکیش کە هێرشی پێ بکرێت و هەموو چەکێك کە پشتی پێ دەبەسترێ چ ئەوەی ڕووناکی بداتەوە و ئەوەی بگرمێنێ هەروەها مەنجەنیق و بیرهەڵکەن و دیوار کونکەر و هی تریش کە لە وشکانی‌دا کەڵك بگرێ، لەگەڵ کەشتی‌یە بارهەڵگرەکان و ئەوانەی وەك بەیداخ هاتوچۆدەکەن ، هەموو ئەمانەمان ئامادە کردوو، لە ٢٦ی ڕەبیعولئەووەلی ساڵی ٨٥٧ك دا دابەزینە ناوشارەکە .

فقلت للنفس جدّي الآن فاجتهدي وساعديني فهذا ما تمنيت

ئەمانە هەرکات بانگ بکرایەن بۆ ڕاستی لووتیان بەرز ئەکردەوە و لەسەر بێباوەڕی بەردەوام ئەبوون خۆیان ئەبردە ڕیزی بێباوەڕان. ئێمەش بەتەواوی گەمارۆمان دان و جەنگمان لەگەڵداکردن ، ئەوانیش جەنگیان لەگەڵدا کردین ولێمان کوشتن و لێیان کوشتین ، و ٥٤ شەوو ڕۆژ جەنگ لەنێوانماندا بەردەوام بوو .

إذاجاء نصر الله والفتح هيّن على المرء معسور الأمور وصعبها

ئینجا لەڕۆژی ۳شەممە ، ۲۰ی جەمادی ولئەووەل دا گزنگی ڕاستی هەڵهات و ئێمەش لەو کاتەدا بەوێنەی ئەستێرەکان تیربارانی سەربازانی شەیتانمان کردوهێرشمان کردنەسەر ، حوکمی صدیقی –واتە ئەبوبکری صدیق ﷺ – بەبەرەکەتی دادپەروەری فاروقی –عمری کوڕی خطاب ﷺ – بەلێدانی حەیدەری –علی کوڕی ابوطالب ﷺ –ئالی عوسمان ئامادی کرد ، خوای گەورەش پێش هەڵهاتنی خۆر لەخۆرهەڵاتەوە بەو فەتحە منەتی خۆی دابەسەرماندا ﴿سيهزم الجمع ويولون الدبر *بل الساعة موعدهم والساعة أدهى وأمر﴾ القمر : ٤٥-٤٦ ، یەکەم کەسیش کەکوژرا و سەری لێ کرایەوە ،سەرکردە سپڵە نەفرین لێکراوەکەیان بوو ، بەمە وەك گەلی عاد و ثمود لەناوچوون و فریشتەکانی سزا چواردەوریان دان و ئاگریان بەسەردا باراندن و سەرەنجامێکی خراپیان تووش بوو ، ئەوەی کوژرا کوژرا ، ئەوش مایەوە بەدیل گیرا ، ئینجا تاویان دا بۆ لای خەزێنەکانیان و زێڕو زیوەکانیان دەرهێنان ، بەمەش بارودۆخێکیان بەسەردا هات کە ناویان نەما ، ﴿ فقطع دابر القوم الذين ظلموا والحمد لله رب العالمين ﴾ الأنعام : ٤٥ ،ئەو ڕۆژە باوەڕداران دڵخۆش بوون بەو سەرکەوتنە خواییە ، جاکەوتین بەسەر ئەو پیسە گلاوە دۆڕاوانەدا و ئەو بازنە و ناچانەمان پاك کردەوە و قەشەو خەچپەرست و زەنگەکانمان –لەجێی بانگی موسوڵمانانە– دەرکردن ، پەرستگای بت پەرستەکانمان گۆڕی بەمزگەوتی دارو دەستەی

**ئیسلام ، ئەو نەخشەیە بەهۆی دراوو وتاردانەوە سەرپەرشتی کرا ، بەمەش فەرمانی خوایی هاتەدی و ئەوەش ئەوان دەیانکرد پووچەڵ بوویەوە )** [١].

**هەروەها سوڵتان فاتح نامەیەکی نارد بۆ شەریفی مەککە لە ڕێگای سوڵتانی میسرەوە ، سوڵتانی میسریش پەیامەکەی سوڵتان محمدی بەدیاریگەلێکی پارچە پەخشانێکی ئەدەبی شکۆمەند وەڵام دایەوە ، چەند دێڕە شیعرێکیشی تێدا هاتبوو ، وەك قسەی شاعیر کەدەڵێت :**

خطبتها بكرا وما أمهرتها  إلا قنا و قواضبا و فوارسا
من كانت السمر العوالى مهره  جلبت له بيض الحصون عرايسا
الله أكبر ماجنيت ثمارها  إلا وكان أبوك قبلك غارسا [٢]

**هەروەها لە نامەکەی سوڵتانی میسردا ئەم دێڕە شیعرە هاتووە کە دەڵێت :**

الله أكبر النصر والظفر  هذا هو الفتح لايزعم البشر [٣]

**شاعیرەکەی سوڵتانی میسریش بەبۆنەی فەتح کردنی قوستەنتینیەوە دەڵێت :**

كذا فليكن في الله جل العزايم  وإلا فلا تجفو الجفون الصوارم
كتائبك البحر الخضم جيادها  إذا ما تهدّت موجه المتلاطم
تحيط بمنصور اللواء مظفر  له النصر والتأييد عبد وخادم
فيا ناصر الإسلام يامن بغزوه  على الكفر أيام الزمان مواسم
تهنّ بفتح سار في الأرض ذكره  سرى الغيث يحدوه الصبا والنعايم [٤]

**نامەی سوڵتان محمدی فاتح بۆ شەریفی مەککە :**

**بەبۆنەی فەتح کردنی قوستەنتینیەوە سوڵتان محمدی فاتح نامەیەکی ئاراستەی شەریفی مەککەی پیرۆز کرد کە تێیدا موژدەی ئەو فەتحکردنەی پێدابوو ، و داوای دۆعاو نزای لێ کردبوو و چەند دیارییەکی ناردبوو لەگەڵیدا لەو**

---

[1] **محمد الفاتح –د.سالم الرشيدي / ١٦٣، ١٦٧ .**
[2] **محمد الفاتح –د.سالم الرشيدي /١٧٥.**
[3] **محمد الفاتح –د.سالم الرشيدي /١٧٦.**
[4] **محمد الفاتح –د.سالم الرشيدي /١٧٧.**

دەستکەوتانەی بەدەستیان خستبوو ، ئەمەش جەند بڕگەیەکیەتی کە لەپاش پێشەکی‌یەکی پێداهەڵدان و سوپاسی شەریفی مەککە ، دەڵێت : ( ئەم نوسینەمان وەك موژدەیەك ناردووە بەوەی خوای گەورە لەم ساڵەدا ئەو فەتحکردنەی پێبەخشین کە هیچ چاوێك نەیبینیوە و هیچ گوێیەك نەیبیستووە ، ئەویش ژێربارخستنی شاری بەناوبانگی قوستەنتینیەیە ، ئەوەی لە مەقامی موبارەکی ئێوە چاوەڕوان دەکرێ، ئەوەیە کە موژدەی ئەو دڵخۆشی و سەرسوڕمانە گەورەیە بدەن بەدانیشتوانی هەردوو حەرەمی پیرۆزو زاناو سەرکردە ڕێنموونی کراوو دنیانەویست و بەندەچاك و شێخ و مامۆستاو پایە بڵندەکانی ئەوێ و خەڵکی چاکی لەخواترس و گەورەو بچوك هەموویان کە دەستیان بە گۆشەی چادر و خێوەتی ماڵی خواوەیە و وەك ئەوەی گرێیەکی مەحکەم بن و جیابوونەوەیان لێی نی‌یە و مژدەبە هەموو ئەوانەش بدەن کە سەرپەرشتیارانی زەمزەم و مەقامی پیرۆز ئەکەن هەروەها بە ئیعتیکاف کەرانی نزیکی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی لە بەردەم خوادا و لەعەرەفاتدا نزای سەرکەوتنمان بۆ بکەن بۆ بەردەوامی دەوڵەتەکەمان ، تاخوا بەرەکەتی ئەوانمان پێبدات و پلەیان بەرز بکاتەوە ، لەگەڵ ئەم شاندەشدا دیاری‌یەکی تایبەتمان بۆ ناردوون کە ٢٠٠٠ سکەی ئاڵتوونی ڕەشی کێشی عەیارقورسە کە لەو دەسکەوتە بەدەستهاتوەیە کەبە دەستمان هێنا ، ٧٠٠٠ی تریشی بۆ هەژاران و لەوەشدا ٢٠٠٠ ی بۆ سەرکردەو نەقیبەکان و ١٠٠٠ بۆ خزمەتگوزارە تایبەتی‌یەکانی مزگەوتی کەعبەو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ ، ئەوی تری بۆ هەژارە موحتاجەکانی نێو مەککە و مەدینە ، خوا شکۆی هەردووکیان زیاد بکات . جا ئەوەی چاوەڕوان دەکرێ لەتۆ دابەشکردنی ئەم لەنێوانیاندا بەپێی پێویستی و هەژاری‌یان ، لەگەڵ ناردنی ڕاپۆرتێك بۆمان لە چۆنیەتی بەڕێوە چوونی ئاو کارە . هەروەها بەدەستخستنی نزای بەردەوامی ئەوان بۆ ئێمە بە داواکردنی میهرو چاکەی خوا

بەویستی خۆی ، خوا بتانپارێزێت و بەکامەرانی هەمیشەیی و سەروەری بەردەوام و تاڕۆژی قیامەت بتانهێڵێتەوە ) [1] .

شەریفی مەککەش وەلامی نامەکەی سوڵتان محمدی فاتحی دایەوە : ( بەوپەڕی ڕێزەوە نامەکەمان کردەوە و لەبەرامبەری کەعبەی گەورەو لە نێو خەڵکی حیجازو نەوەکانی عەرەبدا خوێندمانەوە ، ئەوەی شیفاو ڕەحمەتی نێو قورئانە بۆ باوەڕداران لەنێو نامەکەدا دیتمان ، لە ناوەڕۆکی نامەکەتانەوە دەرکەوتنی موعجیزەیەکی پێغەمبەرمان ﷺ دێت کۆتایی بە پێغەمبەران هێناوە، ئەمە هەرئەو فەتحکردنە گەورەیەی قوستەنتینیەو ناوچەکانی سەر بەو شارەن لەنێو خەڵکدا قاییمی قولە و قەلاکانی ناودارو بەناوبانگە و ، پتەوی شوراکانی لای کەسانی تایبەت و خەڵکی ئاساییش ناسراوە، سوپاسی خواشمان کرد بە ئاسان کردنی ئەو ئیشە قورسە و بەدەستهێنانی ئەو گرنگییە ترسناکە ، بەتەواوەتی گەشاینەوە و بەزیندووکردنەوەی ڕێو ڕەسمی باوباپیرانی گەورە و کاری ڕێڕەوی باپیرانی بەڕێزتان دڵخۆش بووین ، خوا ڕۆحیان بحەوێنێتەوە و چاکترین کۆشکی بە هەستیان بکاتە نسیب و کە بووە هۆی دروستبوونی ئەو هەموو خۆشەویستیە لە مخاکە پیرۆزانەدا) [2] .

## باسی چوارەم

### هۆکارەکانی فەتحکردنی قوستەنتینیە :

بەڕاستی فەتح کردنی قوستەنتینیە لەلایەن موسوڵمانانەوە هەرلەخۆوە نەبوو ، بەڵکوو لەئەنجامی چەندین هەوڵی کەڵەکەبوەوە بوو کە موسوڵمانان هەر لەسەردەمە یەکەمەکانی ئیسلامەوە داویانە بەهۆی خواستی ئەو نەوانەوە بۆ هێنانەدی مژدەی کە پێغەمبەر ﷺ . گرنگی دان بەفەتحکردنی قوستەنتینیە

---

[1] الدولة العثمانية –د. جمال عبدالهادي / ٤٧ .

[2] الدولة العثمانية –د. جمال عبدالهادي / ٤٨ .

لەگەڵ دەرکەوتنی دەوڵەتی عوسمانییەکاندا زیادی کرد ، تێبینی دەکەین کە سوڵتانە عوسمانییەکان لەبەکارهێنانی هۆکاردا خاوەن لێزانی و شارەزاییەکی قووڵ بوون ، محمدی فاتحیش ئەو شارەزاییەی خستەکار ، ئەوەش لەماوەی ژیانی جیهادی و سوربوونی لەسەر ئایەتی خوادا دەردەکەوێت ، کە دەفەرموێت ﴿ وأعدوا لهم ماستطعتم من قوة ومن رباط الخيل ﴾ الأنفال : ٦٠ . واتە:( ئەوەندی لەتواناتاندایە ئامادەسازی بکەن بۆ دوژمنانتان لەئەسپ و ..... ) .

محمدی فاتح لەم ئایەتەوە تێگەشتبوو کە بواری تەمکین و دەسەڵات بۆ ئەم ئایینە پێویستی بە هەموو جۆرەکانی هێز هەیە ، ئەمیش بە شێوەیەکی کرداری لە نێو جیهادە موبارەکەکەی هەستا بە ڕاڤە و شیکردنەوەی ئەوئایەتە و دەستی دایە کۆکردنەوە و یەکخستنی سوپایەکی گەورە بۆ گەمارۆدانی قوستەنتینیە ، کەمتەرخەمیشی نەکرد لەبەدەستخستنی هەموو چەکێکی ناوداری ئەو سەردەمەی وەك تۆپ و سوارەو تیرو ....هتد .

ئەو سوپایەی کە بەسەرکردایەتی محمدی فاتح ئابلۆقەی قوستەنتینیەی دا ،خواناسانە ساز و ئامادەکرابوو لەسەر واتاکانی ئیمان و لەخواترسان دامەزرا و چووە ژێر باری ئەم ئیسلامە و ئەو پەیامەی خرابویە سەر شانی بە ئەنجامی گەیاند و لەسەر واتاکانی بیرو باوەڕی ڕاست پەروەردە بووبوو .

زانایانیش سەرپەرشتی ئەو پەروەردەیان دەکرد و لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ بەرنامەیەکی پەروەردەکردنیان بۆدانان تا تاکەکانیان پەروەردە بکەن لەسەر ئەمانە:

١) خوا تاکەو هاوەڵی نییە و هاودەم و کوڕی بۆ خۆی دانەناوە و دوورە لە کەم و کورتی و هەرچی سیفەتی (کەماله) بە بێ سنوور لە خوا هەیە.

٢) خوا دروستکەرو پادشای هەموو شتێکە و خۆی کارەکانی ڕێك دەخات ﴿ الا له الخلق والأمر﴾ أعراف : ٥٤ .

٣) لەم بوونەدا خوای گەورە سەرچاوەی هەموو شتێکە کە کەمی بکاتەوە یان زیادی بکات ، بەدیاری بخات یان بیشارێتەوە ﴿ومابكم من نعمة فمن الله﴾ النحل : ٥٣ .

٤) زانستی خوا گەمارۆدەرو زاڵە بەسەر هەموو شتێکدا ، هیچ شاراوەیەکی لەئاسمان و زەوی دا لیٚ ناشاردرێتەوە ، مرۆڤیش نەخۆی پیٚ دەشاردرێتەوە و نەخۆی بەدیار دەخات ﴿ أن الله قد أحاط بكل شيء علما ﴾ الطلاق : ١٢ .

٥) خوای گەورە بەهۆی فریشتەوە لە کتێبێکدا کارەکانی مرۆڤ تۆمار دەکات کە بچووك و گەورە بە جیٚ ناهێڵێت و دەیژمێرێت ، ئەوەش لەکاتی پێویستدا بڵاو دەکرێتەوە ﴿ مايلفظ من قول إلا لديه رقيب عتيد ﴾ ق : ١٨ .

٦) خوای گەورە بەچەند شتێك بەندەکانی تاقی دەکاتەوە کە پێچەوانەی ئەوەیە ئەوان حەزی پیٚ دەکەن و خەیاڵیان بۆی دەچێت ، تاکوو خەڵك کانگای خۆیان بناسن کە کامیان ڕازی یە بە قەزاو قەدەری خواو بەئاشکرا و نهێنی خۆی دەدات بەدەستیەوە ، ئائەوە شیاوی خەلیفایەتیو پێشەنگی و سەرکردایەتییە ، هەروەها بزانن کامیان تووڕەو سەرکەش دەبێت و هیچ ناژی و بۆ ئەوە ناشێت هیچ کارێکی بدرێتە دەست ﴿ الذي خلق الموت والحياة ليبلوكم أيكم أحسن عملا ﴾ الملك : ٢ .

٧) خوای گەورە پاڵپشتی هەموو کەسێك دەکات و سەری دەخات کە پەنای بۆ دەبات و خۆی دەداتە پەنای خواوەو هەموو ئەو فەرمانانەی خوا بەکار دەهێنێت بۆ هەر شتیٚ ویستی بیکات یان وازی لیٚ بهێنیٚ ﴿ إن وليّي الله الذي نزّل الكتاب وهو يتولى الصالحين ﴾ الأعراف : ١٦٩.

٨) خوای گەورە ماف بەسەر بەندەکانیەوە هەیە کە بیپەرستن و بەتاکی دابنێن و هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێن ﴿ بل الله فاعبد وكن من الشاكرين ﴾ الزمر : ٦٦ .

٩) خوای گەورە واتای ئەو پەرستنش و یەکتاپەرستییەی لە قورئاندا دەشتنیشان کردووە ، جا زاناکانی دەوڵەتی عوسمانی لە پەروەردەکردنی تاك

و سەربازەکاندا لەڕاستی سەرەنجام و ڕێگای ڕزگاریدا بەرنامەی پێغەمبەری ﷺ پەیڕەو دەکرد، جەختیشیان دەکردەوە لەسەر خستنەڕووی ئەم لایەنانە :

أ- ئەم ژیانە چەندە بخایەنێت هەر بەرەو ئاوابوونە ، خۆشیەکەشی چەندە زۆربێت هەر کەمە ﴿إِنَّمَا مَثَلُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا كَمَاءٍ أَنْزَلْنَاهُ مِنَ السَّمَاءِ فَاخْتَلَطَ بِهِ نَبَاتُ الأَرْضِ مِمَّا يَأْكُلُ النَّاسُ وَالأَنْعَامُ ..﴾یونس : ٢٤ .

ب- هەمووکەس دەگەڕێتەوە بۆ لای خواو هەموو بەرپرسن لەکارەکانیان ولێیان دەپرسرێتەوە و لەبەهەشت یان دۆزەخ دا سەقامگیر دەبن ﴿ أيحسب الإنسان أن يترك سدى ﴾ القيامة: ٣٦ .

ج- خۆشی و بەخششی بەهەشت هەموو ماندوویی و تاڵییەکی دونیا لەبیر دەباتەوە ،ئاگری دۆزەخیش هەموو حەسانەوەو چێژێکی ئەم دونیایە لە بیر دەباتەوە ﴿ أفرأيت إن متعناهم سنين *ثم جاءهم ماكانوا يوعدون ماأغنى عنهم ماكانوا يمتّعون ﴾ الشعراء :٢٠٥-٢٠٧ .

د- خەڵك لەگەڵ ئاوابوونی دونیا و جێگیربوونیان لە بەهەشت یان دۆزەخدا بە زنجیرەیەکی دوورودرێژی سەختی و توندو تیژیدا تێدەپەڕێت ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ * يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ﴾الحج : ١-٢ . ﴿سَأُرْهِقُهُ صَعُودًا * إِنَّهُ فَكَّرَ وَقَدَّرَ﴾المزّمل : ١٧-١٨ .

هـ- ڕێگای ڕزگاری لەو سەختی و توندییانەو زەفەربردن بەبەهەشت و دووری لە ئاگر[1] بەبڕوابوونە بەخواو ئیشی چاك لەپێناو ڕەزامەندی خوادا ﴿ إن الذين

---

[1] منهج الرسول في غرس الروح الجهادية / ١٩، ٣٤ .

آمنوا وعملوا الصالحات لهم جنات تجري من تحتها الأنهار ذلك الفوز الكبير ﴾ البروج : ١١ .

زانا خواپەرستەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانی لە بۆ ڕێپیشاندانی تاك و سەرکردەو گەل و ڕۆڵ و پەیامیان لەزەوی داو پێگەیان لە لای خوا ، لەسەر بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ دەچوون ، لەسەر ئەو بارە لە ڕێپیشاندان و بیرخستنەوە بەردەوام بوون تائەوەی لەلای خواوە هاتبوو لە بیریاندا نەخشی دەگرت و ڕۆڵ و پەیامیان لەسەرزەوی دا چی یە، بەهۆی کاریگەری ئەم پەروەردە بەرزەوە وورەو گوڕو تین لەنێو دەروونی تاك و سەربازو سەرکردەکاندا پەیدابوو ، ئەوە محمدی فاتحە کە لەسەر ئەو بەرنامەیە پەروەردە بوو ، لەشیعرەکانیدا و شانازی بەو واتا و چەمك و ئاکارانەوە دەکات وەك دەبینین دەڵێت :

هەڵچون و حماسەتم : هەوڵدانمە ، بۆ خزمەتی ئایینەکەم ، ئایینی خوا .

عەزم و سووربوونم : ئەوەیە کە هەموو داروودەستەی بێباوەڕان ببەزێنم بەسەربازەکانم ، سەربازەکانی خوا .

(تفكيري) بیرکردنەوەم : دامەزراوە لەسەر فەتحکردن و لەسەر سەرکەوتن و لەسەر بردنەوە لە ڕێگەی میهری خواوە.

(جيهادي) جیهادم : بەگیان و ماڵمەوە ، لەدونیادا جگە لە جێبەجێکردنی فەرمانەکانی خوا چی تر چاکترە ؟؟

(أشواقي) شەیداییم : جەنگە و هەر جەنگە و سەدان هەزار جار هەر جەنگە.

(أرجائي) داخوازیم : هەر ئەوەیە خوا سەرم بخات ئەم دەوڵەتە پایەدار بکات بەسەر دوژمنانی خوادا [1] .

کاتێك سوڵتان محمد ویستی شاری تەرابزۆن ئازادبکات کە فەرمانڕەواکەی مەسیحی بوو ، دەیویست کتوپڕ بدات بەسەریدا ، بۆیە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٢٥٨ .

کرێکارانی درەخت بڕین و ڕێگاچاککردندا کە هاودەمی بوون ، خوسازدانێکی خستەڕوو ، فاتح لە ڕێگاکەیدا تووشی هەندێ شاخی بەرزی قورس و گران بوویەوە ، بۆیە لە ئەسپەکەی دابەزی و وەك هەموو سەربازەکانی تر بەدەست و پێکانی هەڵدەزنی ، (هەروەها دایکی حەسەن ئۆزونی سەرکردەی هۆزە تورکمانەکانی لەگەڵدا بوو کە هاتبوو بۆ ئاشتەوایی نێوان سوڵتان محمد و کوڕەکەی )بەسوڵتانی ووت :ئەرێ کوڕم لەپێناو چیدا! ئەم هەموو سەختییە دەدەیتە بەرخۆت و ئەم هەموو چەرمەسەرییە دەچێژیت ؟ ئایا تەرابزۆن ئەم هەمووەزەحمەتە ئەهێنێ ؟ سوڵتانیش وەڵامی دایەوە : دایەگیان .. خوای گەورە ئەو شمشێرەی خستۆتە دەستم تاکوو لەپێناو خۆیدا جەنگی پێبکەم ، جائەگەر من لەڕووی ئەم سەختییانەدا خۆم نەگرم و مافی ئەم شمشێرە نەدەم ، ئەوە شیاوی نازناوی (غازي)[1] نیم کە هەڵمگرتووە ، پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا چۆن ڕووم بێ بگەم بەخوا ؟ [2] بە هەمان شێوە زۆربەی سەرباز و سەرکردەکانیش بەهۆی ئەم پەروەردە ئیمانییە قوڵەوە هەر وابوون .

بەڕاستی سوپای محمدی فاتح لە ئابلۆقەدانی قوستەنتینیەدا لەسەر لایەنێکی گەورەی پابەندبوون بە بیرو باوەڕی ڕاست و پەرستشەکان و هەستان بە دروشمەکانی ئایین و ملکەچی نواندن بۆخوا بوون [3].

مێژوونووسان لە فەتحکردنی قوستەنتینیەدا هۆکاری زۆر باس دەکەن ، وەك لاوازی دەوڵەتی بیزەنتی و ململانێ مەزهەبیە ناوخۆییەکان و یەکتر خواردنەوەی نێوخۆیی دەوڵەتە ئەورووپییەکان بەهۆی ئەو کوشتارەی کە بۆ ماوەیەکی زۆر

---

1 بەسوڵتان محمدیان ئەووت: سوڵتانی غەزاکەر.

2 محمد الفاتح –د. سالم الرشيدي / ٢٦٣ .

3 الحسبة في العهد المملوكي / ٢٠٦.

دوورو دریـژ لـەنێو دەوڵەتـە ئەوروپی‌یەکانـدا سـەری هەڵـدابوو، لەگـەڵ چـەند هۆکاری تریشدا:

*کاریگەری حوکم کردن بە شەرعی خوا لەسەر دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان محمدی فاتح دا :ڕامان لەقورئان و سوننەتی پێغەمبەری خواو ﷺ ژیانی گەلان، شارەزایی ڕاست و تەواو کاریگەری سوننەتە خوایی‌یەکان لەنێو دەروون و بوون و هۆشدا بەدەست دەخات ، قورئانیش پڕە لە سوننەت و یاسا بڵاوەکانی خوا لەنێو کۆمەڵگاو دەوڵەت و گەلاندا ، خوا دەفەرموێت : ﴿ يريد الله ليبين لكم ويهديكم سنن الذين من قبلكم ويتوب عليكم والله عليم حكيم ﴾ النساء .

واتە: خوای گـەورە ئەیـەوێ بەرچاوڕوونیتان بداتێ و ڕێچکە و ڕێبازی ئەوانـەی پێش خوتانتان بۆ ڕۆشن بکاتەوە و لێتان خۆش ببێت و خواش دانا و زانایە.

سـوننەتەکانی خـوا بەبیرکردنـەوە لەقورئانـدا و هەرچـی‌یەك بەڕاسـتی لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ هـاتووە ڕوون دەبنـەوە ، پێغەمبـەر ﷺ هەلـەکانی بەهەنـد وەردەگرت و سودی لە ڕووداوەکان وەردەگرت تاکوو هاوەڵانی ڕێنموونی بکات بـۆ بەشـێك لـە سـوننەتەکانی خـوا ، لەوانـە وشـترەکەی پێغەمبـەر ﷺ نـاوی ( عـضباء) بـوو ، هـیچ وشـترێك پێـشی نەدەکـەوت ، جارێکیـان وا ڕووی‌ـدا دەشـتەکیەك بـە جوانـە حوشـترێکەوە پێـشی کـەوت ، ئـەو بـارە بـەلای هـاوەڵانی پێغەمبـەرەوە ﷺ گـران بـوو ، بۆیـە پێغەمبـەر ﷺ بەمەبەسـتی دەرخـستنی سوننەتێك لە سوننەتەکانی خوا پێی فەرموون (حق على الله ان لايرفع شيء من الدنيا الا وضعه)، واتـا: خـوای گـەورە لەسـەر خـۆی داناوە کـە لـەدونیادا هەرچی بەرزکرایەوە ، دایبەزێنێتەوە ) رواه البخاري[1].

هـەروەها قورئـان ڕێنموونیمـان دەکـات تـاکوو شـوێن شـوێنەواری سـوننەتەکان بکەوین و بیاندۆزینەوە بە هەوڵدان و ڕۆشتن چ ئەوانەی لـە سـەردەمی خۆمانـدا و

[1] رواه البخاري، كتاب الجهاد والسير، باب ناقة رسول الله (صلى الله علية وسلم).

چ ئەوانەش بوونەتە مێژوو لە سەردەمە پێشووەکاندا، خوا دەفەرموێت : ﴿ قد خلت من قبلكم سنن فسيروا في الأرض فانظروا كيف كان عاقبة المكذبين * هذا بيان للناس وهدى وموعظة للمتقين ﴾ آل عمران.

واتە: پێش ئێوە-بە دڵنیاییەوە- زۆر سونەت و یاسای خوای گەورە هاتووە و ڕۆیشتووە دەی بڕۆن بە زەویدا بگەڕێن و بیدۆزنەوە و سەیر بکەن بزانن سەرەنجامی خەڵکی درۆزن چۆنە* ئەمە بەرچاوڕوونیەکە بۆ خەڵکی و هیدایەت و ئامۆژگاریشە بۆ خەڵکی خواناس.

لە ڕوانگەی ئایەتەکانی قورئانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە سوننەتە خوایی‌یەکان چەند تایبەتمەندی‌یەکیان هەیە :

یەکەم : ئەوە یاسا و بڕیاری پێشتری خوایە : خوای گەورە دەفەرموێت :﴿ ماكان على النبي من حرج فيما فرض الله له سنة الله في الذين خلوا من قبل وكان أمر الله قدرا مقدورا ﴾ الأحزاب :٣٨.

واتا: شتێ کە خوا بەرنامەی بۆ دانا و بڕیاری لەسەردا هەر ئەبێ ببێ، ئەوەی خوا ویستی ئەبێت و ئەوەی خوا نەیویست نابێ ببێت.

دووەم : ئەمەش وەرچەرخان و گۆڕانی تێدا نیە: خوا دەفەرموێت: ﴿سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَلَنْ تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلاً﴾الأحزاب : ٦٢.

هەروەها دەفەرموێت : ﴿ولو قتلكم الذين كفروا لولوا الادبار ثم لا تجدون وليا ولانصيرا*سنه الله التى قد خلت من قبل ولن تجد لسنه الله تبديلا﴾ الفتح ٢٢-٢٣ .

واتە: ئەگەر ئەوانەی کافرن جەنگیان لە دژتان بکردایە بێگومان تێك دەشکان و پاشان هیچ پشتیوانێکیان دەست نەدەکەوت* ئەوەش یاسا و بەرنامەی خوایە و پێشتریش هەر وا بووە و قەت بەرنامە و یاسای خواش گۆڕانی بەسەردا نایەت.

سێیەم : ئەمە بەردەوامە و ناوەستێت: خوا دەفەرموێت : ﴿ قل للذين كفروا إن ينتهوا يغفر لهم ماقد سلف وإن يعوادوا فقد مضت سنة الأولين ﴾ أنفال : ٣٨ .

واتە: بەوانە بڵێ کە بێ باوەڕن کە کۆتایی بهێنن بە بێ باوەڕیەکەیان خوا لە گوناهی پێشوویان خۆش دەبێت بەڵام ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ بێباوەڕی بەڕاستی باو و یاسای پێشینە خراپەکان چی بوو بۆ ئەمانیش وا دەبێت.

چوارەم : ئەمە لانادات و لادانیشی سودی نابێت ، خوا دەفەرموێت : ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓاْ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِي ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَـٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَـٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾﴾ غافر : ٨٢-٨٥ .

پێنجەم : لاسارەکان سودی لێ نابینن ، بەڵام لەخواترسان ئامۆژگاری لێ وەردەگرن :

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِي ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَـٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾﴾ آل عمران ١٣٧-١٣٨ .

واتە: پێش ئێوە-بە دڵنیاییەوە- زۆر سونەت و یاسای خوای گەورە هاتووە و ڕۆیشتووە دەی بڕۆن بە زەویدا بگەڕێن و بیدۆزنەوە و سەیر بکەن بزانن

سەرەنجامی خەڵکی درۆزن چۆنە* ئەمە بەرچاوڕوونیەکە بۆ خەڵکی و هیدایەت و ئامۆژگاریشە بۆ خەڵکی خواناس.

شەشەم : ئەمە بەسەر چاکەکارو بەسەر لادەریشدا دەڕوات و جێبەجێ دەبێت ، باوەڕدار و پێغەمبەران کە زۆرترین ڕێزیان هەیە ، سوننەتە خوایییەکانیان بەسەردا جێبەجێ دەبێت ، خوای گەورە چەند سوننەتێکی بەردەوامی هەن کە پەیوەندیان بە شوێنەوارە یەك بەدوای یەکەکانەوە هەیە بەرامبەر هەرکەس کە فەرمانی خوا جێبەجێ بکات وازی لێ بهێنێت ، جابەوەی عوسمانییەکان لەهەموو کاروبارەکانیاندا پابەندی شەرعی خوابوون ،بەچەند قۆناغێکی ئاسایی ژیانی دەوڵەتاندا تێپەڕبوون ، بۆیە کاریگەری حوکمی خواتیایاندا ڕوون و دیاربوو ، حوکم کردن بە پەیامی خوا کاریگەری دونیاییشی هەیە و هەندێکی دواڕۆژیشی هەیە ، ئەو کاریگەریە دونیایانەی کە لەماوەی لێکۆڵینەوەکەمدا لەسەر دەوڵەتی عوسمانی بۆم دەرکەوتن ئەمانەن :

یەکەم : بوون بە خەلیفە و دەسەڵاتدار :

دەبینین عوسمانییەکان هەر لەسەرکردەی یەکەمیانەوە کە عوسمانە تاکو محمدی فاتح و دوای ئەویش سور بوون لەسەر بەرپاکردنی دروشمەکانی خوا بەسەر خۆیان و کەسوکاریان دا .لە حوکم کردنی شەرعی خواش دا نیازیان بۆ خوا پاك بووە ، بۆیە خوای گەورەش بەهێزی کردن و پشتی گرتن و لەزەوییدا جێگیری کردن ، عوسمانییەکانیش لەو زەویانەدا کە فەرمانڕەوایییان دەکرد ، بەرنامەی خوایان بەرپادەکرد ، بۆیە خوای گەورە سەقامگیری کردن و سوڵتانی پێ بەخشین ، ئەمەش سوننەتێکی جێبەجێکراوی خوای گەورەیە لەنێو ئەو میللەتانەدا کە هەوڵی بەرپاکردنی بەرنامەی خوا دەدەن و ناگۆڕێت .

خوای گەورە باوەڕدارانی ئەم ئوممەتە ئەدوێنێت و پەیمانی ئەوەیان پێدەدات کە باوەڕدارانی پێشوو پەیمانیان پێ دراوە . وەك خوای گەورە لە سورەتی نوردا دەفەرموێت : ﴿ وعد الله الذين آمنوا منكم وعملوا الصالحات ليستخلفنهم في

الأرض كما استخلف الذين من قبلهم ﴾ النور :٥٥ . بەڕاستی عوسمانیەکان زۆر گوێیان بە ئیمان ئەدەدا دەست خستبوو و بەبەرنامەی خوا فەرمانڕەواییان دەکرد ، بۆیە بەرهەم و شوێنەواری ئەوکارەیان بەدەست کەوت : ﴿ وليمكنن لهم دينهم الذي ارتضى لهم ﴾ النور :٥٥ .
کە ئەوان خۆیان دایە دەستی ئایینی خوا، خواش سەقامگیری و دەسەڵاتداری دایە دەستی ئەوان.

دووەم: ئاسایش و سەقامگیری : وولاتی ئاسیای بچوك پشێوی تێکەوتبوو، میرنشینێکی زۆری تێدا دروست بووبوو کە لە ناو خۆیاندا ناکۆك بوون، پاش ئەوەی خوای گەورە ڕیێزی لە عوسمانیەکان گرت لەسەر دەستی ئەواندا ئەو میرنشینانە یەکیان گرت، عوسمانیەکان هەموویان خستە ڕێ بۆ جیهادکردن لە پێناوی خوادا، خوای گەورەش ئاسایش و بەرقەراری بەخشیە دەوڵەتی عوسمانی لە هەموو ئەو شوێنانەداە بە یاسای خوا حوکمیان ئەکرد.
دەبینین دەوڵەتی عوسمانی پاش ئەوەی بەرقەرار بوو خوای گەورە هوکارەکانی ئاسایش و سەقامگیری پێ بەخشین و بۆی بەدیهێنا ، تا پارێزگاری لە پێگەی خۆیان پێ بکات، ئەمەش سوننەتێکی بەردەوامی خوای گەورەیە گرەنتی داوە بە دارو دەستەی ئیمان وئەوانەی بەبەرنامەو حوکمی خواکار دەکەن کە ئەو ئاساییش و ئارامیەیان بۆ ئاسان بکات کە لەژیان و دەرونیاندا بەدوایدا دەگەڕێن ، جا خوای گەورە کلیلی کاروبارەکانی پێیە و گۆڕانی قەدەری تاکەکان بەدەستی ئەوە ، ئەوە کەدەتوانێت دڵەکان بگۆڕێت ، خوای گەورەش ئاسایشی تەواو بەکەسێك دەبەخشێت کە لەسەر یەکتاپەرستی بەردەوام و چەسپاوبێت و لەهەموو جۆرەکانی هاوەڵ دانان خۆی پاك بکاتەوە ، خواش دەفەرموێت : ﴿ الذين آمنوا ولم يلبسوا إيمانهم بظلم أولئك لهم الأمن وهم مهتدون ﴾ الأنعام: ٨٢.
واتا: ئەوانەی بڕوادارن و بڕواکەیان تێکەڵ بە زوڵم و (شیرك) ناکەن، ئاسایشی تەواویان پێ ئەدرێت و هەر ئەوانیش بەر چاو ڕوون ئەبن.

ئەوانە دڵ و دەروونیان لەبارەی ترس وسزاو سەختییەوە دڵنیاو ئارامە ، بەمەرجێك بەدوور لە هاوەڵ دانانی بچوك و گەورە و دڵسۆز بن بۆ خوای گەورە ، بەڕاستی جێبەجێکردن و حوکم کردن بە بەرنامەی خوا ئارامی دەرونەکانی تێدایە ، چەنکە ئایینی دادپەروەری و ڕەحمەت و دانایییە کی خوا دووپات دەکاتەوە. خوای گەورە دوای ئەوەی پەیمان و بەڵێن دەدات بە باوەڕداران کە بیانکاتە خەلیفە و دواتریش دەسەڵاتیان بداتێ،ئیتر دیارە بێبەشیان ناکات لە ئاسایش و دڵ ئارامی و دووری لەترس و دڵەخورپێ. عوسمانییەکان کاتێك بەندایەتی خوایان هێنایەدی و هەموو جۆرەکانی هاوەڵ دانانیان دابڕی ، ئەوکات خوای گەورش لەسەر ئاستی گەل و دەوڵەت ئاسایشی دەروونەکانی هێنایە دی .

سێیەم : <u>سەرکەوتن و فەتح کردن</u> :عوسمانیەکان بەهەموو توانایەك کە لەدەسەڵاتیاندا بوو کاریان ئەکرد بۆ سەرخستنی ئایینی خوا ، بەمەش سوننەتی خوا بۆ ئەوانیش هاتەدی بەوەی سەریان بخات تیایاندا هاتەدی، چونکە خوای گەورە گرەنتی ئەوەی داوە هەرکەس لەسەر پەیامی خوا جێگیرو چەسپاو بێت ، ئەوا بەعیززەت و توانای خۆی سەری دەخات بەسەر دوژمنەکانی‌دا ، خوا دەفەرموێت : ﴿ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ۝٤٠ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُواْ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَنَهَوۡاْ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلۡأُمُورِ ۝٤١﴾ **الحج : ٤٠-٤١ .**

(هیچ کات لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ڕووی نەداوە کە کۆمەڵێك لەسەر ڕێنموونی خوا مکوڕ بوون و بن ، لە کۆتایی ڕێدا خوای گەورە هێز و بەرگری و سەرکردایەتی پێنەبەخشیبن ، زۆر کەس بەزەییان دێتەوە بەو کەسانەدا کە شوێن بەرنامەی خوا دەکەون لە ژێر ڕۆشنایی هیدایەتی ئەودا ڕێدەکەن لەبەر ئەوەی دوژمنانی خوا و فێڵ و تەڵەکەی ئەوان گەلە کۆمێی دوژمنان لەسەریان وگەمارۆی ماددی و مەعنەوی چاوەڕوانیان ئەکات!! ئەمەش جگە لە وەهم و خەیاڵۆکەی زیاتر هیچی تر نییە ، وەك ئەو ڕۆژەی قورەیش بە پێغەمبەریان ﷺ ووت : ﴿ إن نتبع الهدى معك نتخطف من أرضنا ﴾ القصص : ٥٧ .

واتا: ئەگەر ئێمە شوێن ئەم ئایین و هیدایەتە بکەوین لە نیشتیمانی خۆماندا ئەمانڕفێنن.

کەچی شوێن بەرنامەی خوای گەورە کەوتن، لەماوەی چارەکە سەردەیەك یان کەمتردا دەستیان گرت بەسەر ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای جیهان دا )[1].

خوای گەورە پاڵپشتی عوسمانیەکانی کرد بەسەر دوژمنان دا ، و بەپێبەخشینی فەتحکردنی زەوییەکان و ملکەچ کردنیان بۆ حوکمی خواو فەتحکردنی دڵەکان و ڕێنموونییان بۆ ئایینی ئیسلام ، منەتی خۆی دابەسەریان دا . کاتێك عوسمانییەکان ئامادەباشی و هەستانەوەیان هەبوو بۆ حوکمی خوا ، فەتحکردن بوو بە بەشیان و سەرخستنی خوایی دابەزی بۆ سەریان ، ئەو گەلە ئیسلامییانەی لەشەریعەتی خوا دوور دەکەونەوە ، ئەوا لەدونیا و دوا ڕۆژدا خۆیان زەلیل دەکەن .

بەڕاستی کاری فەرمانڕەواو دادوەرو زاناو بانگخوازانبۆ ئەوەی خەڵکی بە شەریعەتی خوا حوکم بکەن بەرپرسیارییەتیەکی گەورەیە کە لەرۆژی دوایی دا لەبەردەم خوادا لەو بارەیەوە پرسیاریان لێ دەکرێت ( ئەگەر کاربەدەستان

[1] في ظلال القرآن : ٤/ ٢٠٧٤ .

بەبەرنامەیەك جگە لەو بەرنامەی خوا دایبەزاندووە حوکم بکەن ، ئەوا شەڕ و شۆڕ ئەکەوێتە نێوان خۆیان...) ، ( ئەمەش گەورەترین هۆکارەکانی گۆڕان و نەمانی دەوڵەتەکانە کە جار دوای جار لەسەردەمی ئێمەو لەسەردەمانی تریشدا ڕوو دەدات ، خوای گەورەش بەختەوەری هەرکەسێکی بووێت ، وای لیٚ دەکات پەند وەربگرێت لە کەسانی تر کە تووشی چەرمەسەری بوو ون)، ئەوکات ڕێڕەوی ئەوکەسە دەگرێتە بەر کە خوای گەورە پاڵپشتی کردوەو سەری خستووە ، دووریش دەکەوێتەوە لەڕێڕەوی ئەوکەسەی خوا ڕیسواو سەرشۆڕی کردووە .

خوا لەقورئاندا دەفەرموێت ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ۝ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ۝﴾ الحج ٤٠-٤١

واتە: هەر کەس دینی خوا سەربخات خواش ئەو سەردەخات بە ڕاستی خوا بەهێز و خاوەن عیزەتە* ئەوانەی خوا بەرقەراری کردن لە زەویدا، نوێژیان دەکرد و زەکاتیان ئەدا و فەرمانیان بە چاکە ئەکردو لە ڕووی خەراپەدا ئەوەستان و داهاتووی هەموو کارێکیش هەر بە دەستی خوایە.

جا خوا پەیمانی سەرخستنی داوە بەو کەسەی کە خواسەر بخات ، سەرخستنی خواش بریتیيە لەسەر خستنی قورئان و ئاین و پێغەمبەرەکەی ، ئەوە سەرخستن نیيە کە کەسێك بەبەرنامەی جگەلە خوا حوکم دەکات و قسە بە شتێك دەکات کە نایزانێت )[1].

<u>چوارەم قەدرو سەربەرزی</u> :سەربڵندی و شەرەف گەورەی عوسمانیيەکان کە لە کتێبە مێژوویيەکاندا تۆمارکراوە ، دەگەڕێتەوە بۆ دەستگرتنیان بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ ،ئەوەی شانازی بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە

[1] مجموع الفتاوی –الإمام إبن تیمیة : ٣٨٨/٣٥ .

ﷺ بكات كە بەهۆیەوە ئوممەت قەدر پەیدا ئەكات و ناوی دەمێنێتەوە ، ئەوا پێی لەسەر رێگای ڕاست داناوە و ڕێی كەوتووە لە سوننەتی بەدەوامی خوا لە سەربڵندو شەرەفداركردنی هەركەسێك كە دەستبگرێت بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە ﷺ . خوا دەفەرموێت : ﴿ لقد أنزلنا إليكم كتابا فيه ذكركم افلا تعقلون ﴾

واتا: ئێمە كتێبێكمان بۆ دابەزاندوویت كە باس و یادی خۆتانی تێدایە،دەی ژیر بن.

إبن عباس لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت:(فيه شرفكم)واتا: (قەدرو ڕێتانی تێدایە )[1] .

عوسمانیەكان قەدرو ڕێزی خۆیان لە دەستگرتنیان بە حوكمەكانی ئیسلامەوە وەرگرت، وەك عومەری كوڕی خەتتاب ﷺ دەفەرموێت : ( ئێمە سەرشۆڕترین گەل بووین كە خوا بەئیسلام سەربڵندی كردین ، جاهەركات بە شتێك سەربڵندیمان بووێت جگە لەو شتەی كە خوا سەربڵندی كردوین پێی، ئەوا خوا سەرشۆڕمان دەكات )[2] .

جا عومەر ﷺ بەو ووشانەی چۆنیەتی پەیوەندی نێوان سەر برزی و سەر كزی بۆ دەرخستووین سەبارەت بە هەڵوێستی بەرامبەر بە قبوڵ كردنی بەرنامەی خوا یان پشت لێكردنی . ئەم ئوممەتە ڕۆژێك بە جگە لەئایینی خوا سەربڵند نەبووە ، هیچ ڕۆژێكیش بە جگە لە لاڕێبوونی ئەم ئایینە سەرشۆڕ نەبووە . خوا دەفەرموێت : ﴿ من كان يريد العزة فلله العزة جميعا ﴾ فاطر : ١٠ . هەروەها دەفەرموێت ﴿ ولله العزة ولرسوله وللمؤمنين ولكن المنافقين لايعلمون ﴾ المنافقون : ٨ .

---

[1] تفسير إبن كثير : ٣/ ١٧٠ .

[2] رواه الحاكم في المستدرك ، كتاب الإيمان : ٦٢/١ .

ژیاننامەی سوڵتانە عوسمانیییەکانی وەك عوسمانی یەکەم و موراد و محمدی فاتح . سەربڵندبوونی ئەوانە بە ئیسلام و خۆشەویستییان بۆ قورئان و ئامادەبونیان بۆ مردن لە ڕێگای خوادا ڕوون دەکاتەوە بۆمان .

بەڕاستی ئەمانە لەژیانێکی پڕ پیت و فەڕو بەرەکەت و بەسەربردنی ژیانێکی خۆش وکامەراندا بوون ، تەنها بە بەرپاکردنی ئایینی خواش گەشتن بەوە ، خوا دەفەرموێت ﴿ ولو أن أهل القرى آمنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماءوالأرض ولكن كذّبوا فأخذناهم بما كانوا يكسبون ﴾ الأعراف : ٩٦ . واتە :( ئەگەر خەڵکی شار و گوندەکان باوەڕیان بهێنایەو لە خوا بترسایەن ئەوا لەئاسمان و زەوییەوە بەرەکەت گەلێکمان بەسەردا دەکردنەوە ، بەڵام درۆیان کرد بۆیە بەهۆی ئەو کارەی بەدەستیان خستبوو لەناومان بردن ).

<u>پێنجەم : بڵاو بوونەوەی ڕەوشتە باشەکان و گرمۆڵە بوونی ڕەوشتە خراپەکان :</u>

لەسەردەمی محمدی فاتح دا هەرچی شتی چاکەو باش هەیە بڵاو بوونەوەو خراپەش تووشی گۆشەگیری بوو، لە ئەنجمی ئەمەشدا بەرەیەك دروست بوو کە خانەدانی و ڕێز و دلێری و بەخشندەیی و قوربانیدانی لە پێناوی بیروباوەڕ و شەریعەتدا لیێ کەوتەوە ، کە چاویان بڕیبووە پاداشتی خوا ولە عادزی ئەو ئەترسان، ئەو کۆمەڵگایە بەگەل و دەوڵەت و فەرمانڕەواکانیانەوە چوون بەدەم ئەو پەیامەوە کە خوا پێیی خۆشەو ڕێنماییەکانی ئیسلامە .

شوێنەواری جێبەجێکردنی بەرنامەی خوا لەو گەل و دەوڵەتانەدا کە فەرمان و نەهییەکانی خوای تێدا جێبەجێ دەکرێت ، بۆ لێکۆڵەری مێژوو ڕوون و دیارە ، ئەو شوێنەوارە پاك و جوانەش کە دەوڵەتی عوسمانی بەدەستی کەوت ، لە ڕێگەی ئەو سوننەتە بەردەوامانەی خواوە بوو کە ناگۆڕدرێن ، جا هەرگەلێك هەوڵی بۆ ئەو مەبەستە بەرز و کارە گەورەیە بدات ، ئەوا هەر پێی دەگات ، ئەگەر ماوەیەکی دواتریش بێت ، هەروەها شوێنەواری ئەو حوکم پێکردنە بەسەر تاك و کاربەدەستان دەوڵەتەکەیەوە دەبینێت .

ئامانج له توێژینەوە مێژوویی‌یە ئیسلامی‌یەکان ، سوود وەرگرتنی تەواوە لەوانەی کە لە پێش ئێمەوە بە ئیمانەوە ڕۆیشتوون، سوود وەردەگرن لە جیهاد و زانست و پەروەردە و هەوڵی بەردەوامیان بۆ حوکمڕانکردنی بەرنامەی خوا و بەرکارهێنانی سوننەتەکانی بەرقەراربوون و دەسەلآت گرتنە دەست چۆنیەتی تێگەیشتن و ڕەچاوکردنی پلەبەندی و قۆناغ بڕین، تا بزانین چۆن تاکەکانی گەلیان پالآوتووە بەرەو ئەو کەماڵ و پێگەیشتنەیان بردوون کە ئیسلام ئەیەوێت. سەرکەوتنە گەورەکانی نێو مێژووی ئوممەتەکەمان ، خوای گەورە لەسەر دەستی کەسێك دەیبات بەڕێوە کە نیازی پاکە بۆ خواو ئایین و بەرنامەی شەریعەت ڕائەگرێت و دەروونی خۆی پاك کردۆتەوە ، بۆیە هەرگیز فەتح و ڕزگاری گەورە و ڕوون نایەت ، مەگەر بۆ کەسانێك نەبێت کە ئەو سیفەتانەی بەرەی خاوەن دەسەلآت و تەمکینیان تێدابێت کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردوون.

## باسی پێنجەم

هەندێ سیفەتی ڕێبەریم لە کەسایەتی محمدی فاتح دا لەکاتی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوندا بەدەرخستن کە لەگرنگترینی ئەو سیفەتانە ئەمانەن :

١) خاوەن بڕیار بوون: ئەمە لەکاتێکدا دەکەوت کە گومانی زۆری بۆ دروست بوو کە کەمتەرخەمی و خاوو خلیچکیەك هەیە لەلایەن (بالطة اوغلی) سەرکردەی کەشتی گەلی عوسمانیەوە هەیە، لە کاتی ئابلۆقەدانی قوستەنتینیەدا ، بۆیە نوێنەری نارد بۆ لای و ووتی : یان دەست بەسەر ئەو کەشتی‌یانەدا دەگریت یان نوقمیان دەکەیت ، ئەگەر لەوەدا سەرکەوتوو نەبوویت ، ئەوا بەزیندوویی مەگەڕێوە بۆ لامان [1].ئەوە بوو نەیتوانی کارەکەی جێبەجێ بکات ، لای بردو حەمزە پاشای لەشوێنی ئەودا دانا .

[1] محمد الفاتح / ١٠١ .

٢) دلێـری: محمـــدی فـــاتح خـــۆی بەشـــداری نێـــو جەنگـــەکانی دەکـــردو بەشمشێرەکەی خۆی لەگەڵ دوژمنان دەجەنگا ، لەیەکێك لەشەڕەکان لەووڵاتی بەلقان دا سوپای عوسمانی بەرەو ڕووی کەمینێك بوویەوە لەلایەن سەرکردە بوغـدان أسـفان ،لەکاتێکـدا لەگـەڵ سـوپاکەیدا لەپـشت درەختەچڕو پـڕە پێکداچـوو و هـەڵزنیوەکان دا خۆیـان شـاردبوویەوە ، کەموسـوڵمانەکان دایـان بەلای ئەو درەختانەدا ، تۆپ بارانی توندی تۆپـەکان لەنێو دارو درەختەکانەوە ڕژا بەسەریاندا و سەربازەکانیش شالاویان بردنەسەر ، خەریك بوو پێکدادانەکە ڕیزەکـانی سـوپا لەیـەك بترازێنێـت ، ئەگـەر بهاتبـا و سـوڵتان محمـد پەلـەی نەکردایە و لە تۆپ بارانی تۆپەکان دوور نەکەوتایەتـەوە ،محمد فاتح هەڵشاخا بەسەر سەرکردەی ئینکشارییەکاندا (محمد ترابزۆنـی) کە بۆچـی سەربازەکان ئەوەنـدە کـەم ورەبـوون جـا خۆیبەنێویانـدا هـاواری کـرد: ( ئـەی جـەنگاوەرە موجاهیدەکان ! سەربازی خوابن وورەو غیرەتی ئیسلامەتیتان تێدابێت [١].

قەڵغانەکەی گرتە دەست و شمشێرەکەی هەڵگرت و سواری ئەسپەکەی بوو ، بەرەوپێش چوو بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بیگەڕێنێتـەوە ، بەمە ئاگری وورەو حەماسـەتی لـەنێو سـەربازەکانیدا کلّپـەی سـەند و هـەموو بەدوایـدا چـوون و جەنگەڵەکـەیان دارمانـد بەسـەریاندا لـەنێو درەختەکانـدا جـەنگێکی تونـدی شمشێری ڕوویدا لەنێوانیاندا کە لەچێشتنگاوە تائێوارە بەردەوام بوو .

عوسمانیەکان سەربازە بۆغەندیەکانیان بەخراپترین شێوە تێك شکاند و أستفان لەسەر ئەسپەکەی کەوتە خوارەوە و زۆر بە زەحمەتی ڕزگاری بوو ، بەڕاکردنەوە ڕووی وەرگێڕا لە جەنگەکە ، عوسمانیـیەکانیش سـەرکەوتن و دەسـتکەوتێکی زۆریان بەدەست هێنا [٢] .

---

[1] محمد الفاتح /٢٤٦.

[2] محمد الفاتح /٢٤٧.

٣) زیرەکی : ئەم سیفەتەی لەو بیرۆکە هەڵکەوتوەیدا دەردەکەوێت کە ئەویش گواستنەوەی کەشتییەکان لە پێگەی خۆیانەوە لە بشکطاش بۆ قرن الذهبي ، ئەویش بەڕاکێشانیان بەسەر ڕێگای ووشکانی نێوان هەدوو بەندەرەکەوە، بەدوور لە ناوچەی غەلتە لەترسی کەشتی (جەنەوییەکان). ئەو نێوەندەش نزیکەی ٣ میل ماوەی هەبوو ، زەوییەکەشی ئاسان و فراوان نەبوو ، بەڵکو گردۆڵکەو چاڵایی سەخت و ناسازی تێدابوو ، دەستی کرد بە جێبەجێکردنی نەخشەکەو زەوییەکەی ڕێککردو لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا تەخت کرا و پارچەدار هێنرا و بەپیوی ئاژەڵ و زەیت چەور کرا و بە شێوازێك خرانە سەر ئەو ڕێگایە کە خلیسکان و ڕاکێشانی کەشتییەکان ئاسان بێت لەسەری، بەڕاستی ئەو ئیشە لەچاو سەردەمی خۆیدا کارێکی گەورە بوو ، بەڵکو خێرایی بیرکردنەوەو جێبەجێکردن تێیدا بە جوانی دەدەکەوێ کە ئەویش بەڵگەیە لەسەر زیرەکی وهەڵکەوتەیی محمدی فاتح [١].

٤) عەزیمەت و سوربوون : کاتێك سوڵتان محمدی فاتح نوێنەری نارد بۆ لای ئیمبراتۆر قوستەنتین و داوای بەدەستەوەدانی قوستەنتینیەی لێ کرد تاکو خوێنی خەڵکەکە لەشارەکەدا نەڕژێت و دوچاری ئازار نەبن و سەربەست بن لەمانەوە یان بەجێ هێشتنی شارەکەدا ، جاکاتێك قوستەنتین بە دەستەوەدانی شارەکەی بەرپەرچ دایەوە ، سوڵتان محمد ووتی: زۆر باشە !! بەمزووانە لە قوستەنتینیەدا یان تەختێکم دەبێت یان گۆڕێك [٢].

کاتێکیش بیزەنتییەکان توانییان قەڵادارینە گەورەکە ئاگر تێبەردەن ، وەڵامی محمدی فاتح ئەوەبوو کە ووتی : بەیانی چواری تر دروست دەکەین [٣]. ئەو

---

[1] السلطان محمد الفاتح –عبدالسلام فهمی / ١٠٢ .

[2] الفتوح الإسلامية عبر العصور / ٣٧٦ .

[3] السلطان محمد الفاتح / ١٢٢ .

هەڵوێستانەش بەڵگەن لەسەر عەزیمەت و سوور بوونی لەسەر گەشتن بە ئامانجەکەی .

٥) دادپەروەری : ئەمە لەکاتێکدا کە بەپێی شەریعەتی ئیسلام لەگەڵ ئەهلی کیتاب دا وەك ( خاوەن پەیامە ئاسمانیی‌یەکان هەڵسوکەوتی دەکرد ، مافە ئایینی‌یەکانی پێدان ، هیچ یەك لەمەسیحی‌یەکان ڕووبەڕووی ستەم و دەست درێژی نەبوویەوە، بەڵکو ڕێزی گەورەکانیانی دەگرت و چاکەی لەگەڵدا دەکردن ، دروشمی ئەوەبوو ( دادپەروەری بناغەی دەسەلاتە ) [1].

٦) لەخۆبایی نەبوون بەتوانای خۆی و زۆری سەربازو فراوانی دەسەلاتی : دەبینین سوڵتان محمد لەکاتی چوونە نێو قوستەنتینیەدا دەڵێت : سوپاش بۆ خوا ، خوا ڕەحم بەشەهیدانمان بکات و شکۆو پایەبڵندی بکاتە بەشی موجاهیدەکانم ، شانازی و سوپاسیش بۆ گەلەکەم [2]. بەڵێ ئەو فەزڵ و گەورەیی‌یەکەی دەدایە پاڵ خوا ، بۆیە زمانی بەسوپاس و پێزانین دەدوا بەرامبەر ئەو هاودەمەی کە سەری خست و پاڵپشتی کرد ئەویش بەڵگەیە لەسەر قوڵی ئیمانی محمدی فاتح بەخوای گەورە .

دڵسۆزی : زۆربەی ئەو هەڵوێستانەی لە مێژووی محمدی فاتح دا تۆمار کراون ، بەڵگەن لەسەر قوڵی دڵسۆزی محمد بۆ ئایینەکەی و بیرو باوەڕی لەشیعرەکانیدا و موناجاتی لەگەڵ خوای خۆی دا لەکاتێك دا دەڵێت : نیەتم : ملکەچکردنمە بۆ فەرمانی خوا ﴿ وجاهدوا فى سبيل الله﴾ البقرة: ٢١٨.

هەڵچون و حماسەتم : هەوڵدانمە ، بۆ خزمەتی ئایینەکەم ، ئایینی خوا .

عەزم و سووربوونم : ئەوەیە کە هەموو داروده‌ستەی بێباوەڕان ببەزێنم بەسەربازەکانم ، سەربازەکانی خوا .

---

[1] السلطان محمد الفاتح /١٥٢ .

[2] محمد الفاتح /١٣١.

(تفكـيري) بيركردنـەوەم : دامـەزراوە لەسـەر فـەتحكردن و لەسـەر سـەركەوتن و لەسەر بردنەوە لە ڕێگەی میهری خواوە.

(جیهـادي) جیهـادم : بـەگیان و ماڵمـەوە ، لـەدونیادا جگـە لـە جێبـەجێكردنی فەرمانەكانی خوا چی تر چاكترە ؟؟

(أشواقي) شەیداییم : جەنگە و هەر جەنگە و سەدان هەزار جار هەر جەنگە.

(ارجائي) داخوازیم : هـەر ئەوەیـە خـوا سـەرم بخـات ئـەم دەوڵەتـە پایـەدار بكـات بەسەر دوژمنانی خوادا [1].

٧) زانستی محمد فاتح : باوكی هـەر لەمنداڵیەوە گرنگی پێدەدا ، بەمەش سوڵتان محمدی فاتح ملكەچی سیستەمێكی پەروەردەیی بوو كە كۆمەڵێك لە زانـاو ناودارەكـانی سـەردەمەكەی سەرپەرشتییان دەكـرد ، بەمـەش قورئـان و فـەرموودەو فیقـه و زانـستە سـەردەمییەكانی وەك بیركـاری و گەردونناسـی و مێژوو و وانە گەلی زۆری سەربازی چ تیۆری( نظري ) و چ كردارەكـی فێـر بـوو ، ئەوەی كە خوا ڕێزی لە سوڵتان محمدی فاتح نا ئەوە بوو كە كۆمەڵێك گەورەو زاناكانی سەردەمەكەی سەرپەرشتییان دەكرد ، لەپێش هەموویانەوە شێخ ئاق شەمـسەددین و مـەلای گـۆرانی ، (كەزانایـەكی ئـایینی بـوو لـەلای عوسمانیـە پێشینەكان و دەریایەك بوو لـە زانیـاری*[2] لـە زانـستە نـاودارە جۆراوجۆرەكـانی ئەو سەردەمەدا)، محمدی فاتح پێشوازی پەروەردەی مامۆستاكانی كاریگەریان لەسەر دانابوو، شوێنەواری ئەو پەروەردەیـەش لەڕوانگـە ڕۆشـنبیری و سیاسـی و سـەربازی یەكانیـدا دەردەكـەوتن [3]. محمـدی فـاتح لـە سـێ زمانـە سـەرەركییە

---

[1] العثمانیون في التأریخ والحضارة / ٢٥٨ .

[2] فەرهـەنگی زمانـەوانی كـوردی لـە جیـاتی وشـەی (موسـوعة) وشـەی (دەریـای زانیاری) بەكاردێنێ (وەرگێڕ:ن).

[3] السلطان محمد الفاتح / ١٣١ .

ئیسلامیەیەکاندا تەواو ڕۆچووبوو ، کە ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە لە کەسیان بێ منەت نەبوو ، ئەویش عەرەبی و فارسی و تورکی بوو ، سوڵتان محمدی فاتح شاعیر بووەو دیوانێکی بە زمانی تورکی بەجێ هێشتووە [١] .

## باسی شەشەم

## شتێك لەکارە ژیارییەکانی

❖ گرنگی دانی بە خوێندنگە و پەیمانگاکان: سوڵتان محمدی فاتیح زانست و زانایانی خۆش دەویست بۆیە گرنگی ئەدا بە دروستکردنی خوێندنگا و پەیمانگاکان لە هەموو بەشەکانی دەوڵەتەکەیدا، (سوڵتان ئورخان) یەکەم کەس بوو کە خوێندنگای نمونەیی لە دەوڵەتی عوسمانیدا دامەزراند، لەدوای ئەویش سوڵتانەکانی دەوڵەت لەسەر ڕێبازەکەی ئەو چوون و خوێندنگا و پەیمانگاکان لە پروسە و ئەدرنە و شارەکانی تردا بلاو بوونەوە.

محمدی فاتیح لەو ڕوانگەیەوە باوباپیرانی خۆی لە بیرنەکردو هەوڵگەلێکی زۆری خستەڕوو بۆ بلاوکردنەوەی زانست و دامەزراندنی خوێندنگا و پەیمانگا، چەند چاکسازیەکیشی خستە نێو پرۆسەی فێرکردنەوە ، هەروەها سەرپەرشتی پوختەکردن و گەشە پێدانی بەرنامەکانی دەکرد و سوور بوو لەسەر بلاو کردنەوەی خوێندنگاو پەیمانگاکان بەهەموو شارە گەورەو بچوکەکان و هەروەها لادێکانیشدا، بۆ سەرپەرشتی ئەمەش چەند وەقفی گەورە گەورەی تایبەت کردپێیانەوە.

هەروەها ئەو خوێندنگایانەی ڕێکخست و کردنیە چەند پلە و قۆناغێك و بەرنامەیەکی بۆ هەموو ئەو قۆناغانە دانا و ئەو زانست و بابەتانەی دەستنیشان

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٢٥٤، ٢٥٩ .

کرد کە لەهەریەك لە قۆناغەکاندا دەخوێندران، یاسای بۆ تاقیکردنەوەکانیش دانا و هیچ خوێندکارێك لە قۆناغێکەوە نەدەچووە قۆناغێکی تر تا لە زانستەکانی قۆناغی پێشوودا شارەزایی پەیدانەکردایە و ملکەچی تاقیکردنەوەیەکی وورد نەبوایە. سوڵتان محمد خۆی چاودێری و سەرپەرشتی ئەو کاروبارانەی دەکرد ، هەندێ جاریش ئامادەی تاقیکردنەوەکانی خوێندکاران دەبوو و ساتەوناسات سەردانی خوێندنگاکانی دەکرد ولای عەیب نەبوو گوێی لەو وانانە بگرێت کە مامۆستاکان پێشکەشیان دەکردن و ئامۆژگاری خوێندکارەکانی دەکرد بۆ کۆشش کردن و هەوڵدان. درێغی نەدەکرد لە دیاری ناردندا بۆ مامۆستا و خوێنکارە هەڵکەوتوەکان. خوێندنی لە هەموو خوێندنگاکانی دەوڵەتدا کرد بەخۆڕایی. ئەو وانانەی کە لەو خوێندنگایانەدا دەوترانەوە ئەمانە بوون: تەفسیر ، فەرموودە ، فیقه ، ئەدەب ، ڕەوانبێژی ، زانستەکانی زمان ، لە ( معانی ، بیان ، بدیع ) و ئەندازیاری و .....هتد .

لەپاڵ ئەو مزگەوتەی کە لە قوستەنتینیەدا دروستی کرد ، هەشت خوێندنگای دامەزراند کە لە هەرلایەکی مزگەوتەکەوە چوار خوێندنگە هەبوو کە حەوشەیەکی فراوانی لەناوەڕاستدا دروست کرابوو ، تێیدا خوێنکار قۆناغی کۆتایی خوێندنی دەبردەسەر . لەگەڵ ئەو خوێندنگایانەدا شوێنی نیشتەجێبوون بۆ خوێنکاران هەبوو کە تێیدا دەخەوتن و نانیان دەخوارد ، موچەیەکی مانگانەی داراییشی بۆ بڕیبوونەوە ، ماوەی خوێندن لەو خوێندنگایانەدا بە درێژایی ساڵ بەردەوام بوو ، لە پالیشیدا کتێبخانەیەکی تایبەتی دامەزراند ، کە مەرج بوو ئەو کەسەی ئەو خوێندنگایە دەگرێتە ئەستۆ لە ئەهلی زانست و لە خواترسان بێت و شارەزا بێت لە ناوی کتێب و نووسەرەکاندا.

سەرپەرشتیاری کتێبخانەکە بەشێوەیەکی وورد و دروست بۆ ماوەیەکی کاتی کتێبی دەدا بەلای خوێندکارو وانەبێژەکانەوە بەپێی داخوازی ئەو کتێبەی دەیانەوێت. ناوی کتێبە بەماوە وەرگیراوەکانی لە دەفتەرێکی تایبەت دا تۆمار

دەكرد، ئەو ئەمیندارەش بەرپرسیار بوو لەو كتێبە و پاراستنی لاپەڕەكانی كە لەلایەتی [1]. ئەو كتێبخانە بەلایەنی كەمەوە دەبوو سێ مانگ جارێك بپشكنرایە، بەرنامەی ئەو خوێندنگایانەش بریتی بوو لە سیستەمی پسپۆری هێنانەوە، بۆ نموونە بەشی تایبەت هەبوو بۆ زانستە عەقلی و نەزەرییەكان، زانستە جێبەجێكارییەكانیش بە شی تایبەتیان هەبوو ، وەزیرو زانا خاوەن سامانەكان كێبڕكێیان دەكرد لە دامەزراندنی پەیمانگاو خوێندنگاو مزگەوت و دانانی ماڵە وەقفیەكاندا [2].

❖ گرنگیدانی سوڵتان محمدی فاتیح بە زانایان: بەڕاستی زانایان و ئەدیبەكان پێگەیەكی تایبەتیان هەبوو لەلای سوڵتان محمدی فاتیح ، زانایانی لەخۆی نزیك دەكردەوە و ڕێزیانی بەرز رادەگرت، هانی دەدان لەسەر كاروبەرهەمهێنان، ماڵ و سامانی پێدەدان و دیاری و خەڵاتی ئەرشت بەسەریاندا، تاكوو خۆیان یەكلابكەنەوە بۆ زانست و فێركردن، ئەوپەری ڕێزی لێ دەگرتن ئەگەر لە دژیشی بوونایە! جا كاتێك هەرێمی قرمان خرایە سەر دەوڵەتەكەی، فەرمانی دەركرد بە گواستنەوەی كرێكار و پیشەگەرەكان بۆ قوستەنتینیە، كە بیستی (روم محمد پاشا)ی وەزیری ستەمی لەخەڵكەكە كردوەو لەوانەش كە ستەمیان لێكراوە هەندێك لە زانا و پیاوماقوولیشی تێدابووە وەك زانا: محمد چەلەبی كوڕی سوڵتان ئەمیرعەلی، كاتێك سوڵتان بەم كارەی زانی ، داوای لێبوردنی لێ كرد و لەگەڵ هاوڕێكانیدا بەسەربەرزی و بەڕێزلێنانەوە گێڕایەوە بۆ نیشتمانی خۆی ، پاش ئەوەی ئوزون حەسەنی سەركردەی توركمان شكستی خوارد ، ئەو سەركردەیەی كە پابەندی هیچ پەیمانێك نەدەبوو و بەردەوام یارمەتی دوژمنانی عوسمانیەكانی دەدا لە هەرگەلێ بوونایە ، جاكە سوڵتان محمدی فاتیح شكستی

---

[1] محمد الفاتح / ٣٨٤، ٣٨٥ .

[2] محمد الفاتح / ٣٨٤.

پێ هێنا ، ژمارەیەکی زۆر دیلی کەوتە بەردەست ، سوڵتان محمد فەرمانی کرد بە کوشتنیان جگە لە زانا و خاوەن مەعریفەکانیان نەبێت وەك قازی محمد شورەیجی کە یەکێك بوولە پایەدارەکانی سەردەم ، ئەوە بوو سوڵتان ڕێزێکی زۆری لێگرت .

سوڵتان فاتیح ڕێزی زانا و خاوەن وەرع وپیاوە لەخواترسەکانی دەگرت ، ئەگەر هەندێ کات هەڵپەیەکی سەرکێشی و توڕەبوونێکی لەناکاوی توش بهاتایە ، بەپەلە دەگەڕایەوە سەر نەرمونیانی و لەسەرخۆیی و ڕێز لێگرتنیان .

کتێبەکانی مێژوو ئەوەمان بۆ باس دەکەن کە سوڵتان محمد لەگەڵ یەکێك لە خزمەتگوزارەکانیدا نوسراوێکی ناردووە بۆ لای شێخ احمد گۆرانی کە لەو کاتەدا دادگای سەربازانی بەدەستەوە بوو ، شێخ فەرمانێکی تێدا دیت کە پێچەوانەی شەرعی ئیسلام بوو ، بۆیە نامەکەی دڕاندو دای لە خزمەتگوزارەکە ، ئەوە سەخت بوو لەسەر سوڵتان محمد لەو کارەی شێخ احمد گۆرانی توڕەبوو و لەپلەکەی لای برد . بەمە دڵ ئێشان و لێکدووری کەوتە نێوانیان و شێخی گۆرانی چوو بۆ میسر ، سوڵتانی ئەوێ (قیتبای) پێشوازیەکی گەرمی لێکرد و ڕێزی لێنا . لەوێ ماوەیەك مایەوە ، زوو بەزوو سوڵتان لەو کارەی پەشیمان بوویەوە و نامەیەکی بۆ سوڵتانی (قیتبای) نووسی و داوای لێکرد کە شێخی گۆرانی بنێرێت بۆ لای ، سوڵتان (قیتبای) نامەناردنەکەی سوڵتان محمدی بۆ شێخی گۆرانی گێڕایەوە و پاشان پێی ووت مەڕۆ بۆ لای ، من زیاد لە ئەو ڕێزەی ئەو ڕێزت دەگرم ، ئەویش ووتی بەڵێ وایە ، بەڵام لە نێوان من و ئەودا خۆشەویستییەکی گەورە هەیە ئەو خۆشەویستیەی وەك لەنێوان باوك و کوڕدا هەیە ، ئەوەش لە نێوانماندا ڕوویدا شتێکی ترە و ئەو لێم تێدەگات و ئەزانێ بەردەوام دڵم لایەتی ، جا ئەگەر نەچم دەزانێت کە بەهۆی تۆوەیە و بەمەش دوژمنایەتی دەکەوێتە نێوانتانەوە ، سوڵتان (قیتبا)یش ئەو قسەیەی بەباش زانی و ماڵێکی زۆری پێداو هەموو ئەو پێویستیانەی بۆ ئامادەکرد کە بۆ سەفەر

پێویستن ، چەند دیارییەکی گەورەشی لەگەڵدا نارد بۆ لای سوڵتان محمد خان ، سوڵتان محمدی فاتحیش کاری دادوەری و دواتر فەتوادانیشی دایە دەستی و دیاریەکی زۆری پێبەخشی و بەشێوەیەکی بێوێنە ڕێزی لێگرت [1].

شەوکانی لەبارەیەوە دەڵێت : ( لەبواری دادگای سەربازیەوە گواستیەوە وبەردەوام پیاوە گەورەکان هاتووچۆیان ئەکرد و کتێبی ( جمع الجوامع ) ی راڤەکرد و پەراوێزێکی زۆریشی لەسەر کتێبی ( المحلی ) ی (جلال الدینی محلی تەفسیرکەری قورئان) نووسی زیادی تەفسیر و شەرحێکی بۆ صەحیحی بوخاریش کرد و قەسیدەیەك لە شەش سەد بەیتیشی لە زانستی ( عروض) دانا. مزگەوتێکیشی لە ئەستانبوڵ دامەزراند لەگەڵ خوێندنگەیەك کە ناوی نا( دار الحدیث ) . دنیا لێی کۆبوویەوە وئاوەدانی خستە ووڵات و زانستی بەهەموو لەیەکدا بڵاوبوویەوە و زانا گەورەکان ئەهاتنە خزمەتی بۆ وەرگرتنی زانست، لەساڵی ٧٦١ك حەجی ماڵی خوای کرد ، بەردەوام پایەبەرز بوو تا لەکۆتاییەکانی ساڵی ٧٩٣ك دا وەفاتی کرد و سوڵتان و کەسانی تری خوار ئەو نوێژیان لەسەر کرد . هەندێك لەسەرەتای قەسیدەکانی لە پیاهەڵدانی سوڵتانەکەیدا دەڵێت:

هو الشمس الا انه اللیث باسلا هو البحر الا انه مالك البر

واتا: سوڵتان خۆرە هەرچەندە شێرێکی نەبەرد، ئەو دەریایە هەر چەندە خاوەنی گشت ووشکانیە.

خاوەنی کتێبی ( الشقائق النعمانیة ) ژیاننامەیەکی ڕازاوەی نوسیوەتەوە...شێخی گۆرانی سوڵتانی بەناوی خۆیەوە بانگ دەکرد و پیایدا هەڵی نەئەداو دەستی ماچ نەدەکرد ، بەڵکو تەنها تەوقەی لەگەڵ دەکرد ، هەروەها نەدەچوو بۆ لای سوڵتان مەگەر بیناردایە بەشوێنیدا . بەسوڵتانی دەووت : خواردن و جل و بەرگت حەرامە ، بۆیە پێویستە ئاگات لە خۆت بێت.

---

[1] محمد الفاتح / ٣٨٩ .

چەند شتی جوانی زۆری تری باس کردووە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی یەکێك بووە لە زانا ئیشکەرەکان..)[1]

سوڵتان لەهەر شوێنێکدا بیبیستایە کە زانایەك هەژاری یان کەمدەستی تووش بووە یەکسەر دەچوو بە هانایەوەو ئەوەی لە بواری دنیاییدا پێویستی پێی بوایە بۆی دابین دەکرد .

سوڵتان سروشتی وابووە کە لە مانگی ڕەمەزاندا لە دوای نوێژی نیوەڕۆ کۆمەڵێك لە زانا تەواو شارەزاکانی قورئانی دەهێنا بۆ کۆشکەکەی و هەر جارەی یەکێکیان تەفسیری ئایەتێك لە ئایەتەکانی قورئانی ئەکرد و هەموو زانایان گفتوگۆیان لەسەری دەکرد. سوڵتان محمد خۆشی بەشداری لەگەڵدا دەکردن و ئەو زانایانەی بەردەوام هان ئەدا لەسەر کارەکەیان بەخەڵات و دیاری و دەستگرۆیی زۆری مادی بۆیان.

❖ گرنگیدانی بەشاعیرو ئەدیبەکان : مێژوو نوسی ئەدەبی عوسمانی باس دەکات کە سوڵتان محمدی فاتیح ( سەرپەرشتیاری ڕاپەڕینی ئەدەبی بوو، شاعیرێکی پایە بەرز بوو ٣٠ ساڵ حوکمی کرد، کە ئەو ساڵەیان پڕ پیت و بەرەکەت وا خۆشگوزەرانی گەشەی بەردەوام بوو، بە ( أبو الفتح) یش ناوی دەرکرد، چونکە بەسەر دوو ئیمبراتۆریەتی گەورەدا زاڵبوو هەروەها حەوت میرنشینی ئازادکرد و دەستی گرت بەسەر ٢٠٠ شاردا ژمارەیەکی زۆر خانەی زانست و خانەی پەرستشی دروستکرد و هەروەها بە ( أبو الخیرات )یش ناسرا)[2].

محمدی فاتیح بەشێوەیەکی گشتی گرنگی بە ئەدەب و بەشێوەیەکی تایبەتی بە شیعر دەدا ، هاوڕێیەتی شاعیرانی دەکرد و هەڵی دەبژاردن و زۆرێکیانی دەکردە

---

[1] البدر الطالع :١/ ٤١ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة /٢٤٧ .

وەزیر ، لەوانە : أحمد پاشا محمود ، محمود پاشا ، قاسم جزری پاپا ، کە هەبوو شاعیر بوون [1] . هەروەك لە کوشکی پاشادا ٣٠ شاعیر هەبوون کە هەریەکەیان مانگانەی بەبڕی هەزار درهەم موچەی دەدرایە ، بۆیە لەدوای ئەو گرنگی پێدانە ئاساییە کە شاعیرو ئەدیبەکان لە مەدحی سوڵتان محمددا بکەن لە پاداشتی ئەو هەموو خزمەتەیدا کە بەرامبەر زانست و ئەدەب کردی بەوەی زۆر جوان هانی شاعیران و ئەدیبانی ئەداو زۆر بەخشندانە سەرپەرشتی ئەکردن.
سوڵتان ڕێگری لە شاعیرەکان دەکرد کە خۆیان سووك بکەن و دەست بدەنە گاڵتەوگەپ و بێ بێ نەزاکەتی، ئەوەش لە نەزاکەت و ئەدەب لایبدایە بەزیندان کردن یان دەرکردنی لە کۆشك سزای دەدا [2] .

❖ گرنگیدانی بە وەرگێڕان : سوڵتان محمدی فاتیح توانای قسەکردنی بەزمانی ڕۆمی هەبوو، لە پێناو ئەوەی کە ڕاپەڕینێکی فکری لە گەلەکەیدا بەرپا بکات فەرمانی کرد بە وەرگێڕانی زۆربەی ئەو کەلەپوورانەی بە زمانی یۆنانی و لاتینی و عەرەبی و فارسی نووسرا بوون بۆ زمانی تورکی. لەوانەیش کتێبی ( مشاهیر الرجال) ی بلوتارك ، هەروەها کتێبی ( التصریف فی الطب )ی أبو قاسم زەهراوی دکتۆری ئەندەلوسی وەرگێڕا بۆ تورکی، لەگەڵ هەندێ زیادەیەکاریدا لە وێنەی ئامێرەکانی برینپێچی و باری نەخۆشان لەکاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەریدا.
❖ کاتێك کتێبەکەی بەتلیمۆسی دیت لە جوغرافیادا کە نەخشەیەکیشی لەگەڵ دابوو هەستا بە موتاڵەعەو لێکۆڵینەوەی لەگەڵ (جۆرج امیروتزوس) زانای ڕۆمی دا، پاشان فاتیح داوای لە خۆی و کوڕەکەی کرد کە دوو زمانی ڕۆمی و عەرەبی بەباشی دەزانی هەستن بە وەرگێڕانی کتێبەکە بۆ عەرەبی و دووبارەکێشانەوەی نەخشەکە لەگەڵ بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە لەمەڕ ناوی شارەکان و نوسینی

---

[1] العثمانیون فی التأریخ والحضارة / ٢٤٧ .
[2] محمد الفاتیح / ٣٩٣ .

بەهەردوو زمانی عەرەبی و ڕۆمی ، بۆ ئەو ئیشەیش خەڵاتێکی گەورە و زۆری کردن، زانای گەورەیش علی القوشچی کە گەورەترین زاناکانی سەردەمی خۆی بوو لە بیرکاری و گەردونناسیدا، هەرکاتێك بە فارسی کتێبێکی دانابنایە خێرا وەریدەگێڕایە سەر عەرەبی و پێشکەشی فاتیحی کرد.

❖ فاتیح گرنگی بە زمانی عەرەبی دەدا، چونکە زمانی قورئانی پیرۆز بوو ، هەروەك لە زمانە زانستیە بڵاوەکانی ئەو سەردەمە بوو ، بەڵگەش بۆ گرنگی دانی فاتیح بە زمانی عەرەبی زیاتر ئەوەیە کە داوای لە مامۆستاکانی هەر هەشت خوێندنگەکەی شار کرد کە لە کاتی وتنەوەی زانستی زمانەوانیدا هەر شەش کتێبە (صەحیحەکەی) زمانی عەرەبی وەك، وەك صحاح ، التکملة ، القاموس ، و هاوشێوەکانی[1] پێەکەوە بڵێنەوە، فاتیح پاڵپشتی بزوتنەوەی وەرگێران و دانانی کتێبی کرد لە پێناو بڵاو بوونەوەی هۆشیاری لە نێو ژێردەستەکانیدا، ئەویش بە زیادکردنی کتێبخانە گشتیەکان، لە کۆشکەکەیدا خەزێنەیەکی تایبەتی بە کتێب دروستکرد کە چ کتێبی سەیر هەیە لە هەموو زانستێکدا لەو کتێبخانەدا هەیبوو، شێخ لوتفی کردە ئەمینداری و کتێبخانەکە ١٢هەزار بەرگ کتێبی تێدا بوو. مامۆستا (دیزمان) ئەو کتێبخانەیە بەوە وەسف دەکات کە خاڵی وەرچەرخانە لە ڕووی زانستەوە لە نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا [2].

❖ گرنگیدانی بە ئاوەدانی و تەلارسازی دروستکردنی خەستەخانە: سوڵتان محمدی فاتیح زۆر کەیفی ئەهات بە بنیاد نانی مزگەوت و پەیمانگاو کۆشك و

---

[1] شەش کتێبی ناسراو هەیە لە زانستی زمانەوانیدا (فەرهەنگی عەرەبی) وەك: الصحاح کە هی ئیمامی جەوهەریەو ئیمامی ڕازی لە ناو (مختار الصحاح) کورتی کردووەتەوەو (القاموس المحیط)یش هی (فەیروز ئابادی)یە، وە هەروەها (وەرگێڕ: ن).

[2] محمد الفاتح / ٣٩٦ .

خەستەخانەو بنکەو حەمام و بازاڕی گەورەو باخچە گشتیەکان. بەهۆی لولەکێشی تایبەتەوە ئاوی هێنایە نێو شارەکەوە . هەروەها وەزیرەکان و گەورەیاوانی دەوڵەت و دەوڵەمەندان و ناسراوانی هان دەدا بۆ دامەزراندنی بیناو دروست کردنی دوکان و حەمام و بینای تر کە نرخ و جوانیەك دەدات بە شارەکان . گرنگیەکی تایبەتیشی بە ئەستانبوڵی پایتەخت داو سوور بوو لەسەر ئەوەی بیکاتە جوانترین پایتەختەکانی جیهان و سەرچاوەی زانست و هونەر . لەسەردەمی محمد فاتح دائاوەدانی زۆر زیادی کردو پەرەی سەند و گرنگی بە خەستەخانە دەداو یاسایەکی نموونەیی بۆ دانا کە ئەو پەڕی وردی و سەرسامی وجوانی تێدا بوو. جا هەر بنکەیەکی ئەسپارد بە پزیشکێك ودواتر کردیە دوو پزیشك لە پزیشکە لێهاتوەکان ئیدی لەهەر ڕەگەزێك بوونایە، لەگەڵ ئەو دوو دکتۆرەدا ( کحّال)[١] و برین پێچێك و سەیدەلانیەك و کۆمەڵێك لە خزمەتگوزارو دەرگاوان یارمەتیان دەدان. مەرج بوو بۆ هەموو کارگوزارێکی خەستەخانە قەناعەت و نەرمونیانی و مرۆڤ دۆست بێت. لەسەر پزیشکەکانیش پێویست بوو کە لە ڕۆژێکدا دوو جار سەردانی نەخۆشەکان بکەن و دەرمان بۆ نەخۆشەکان نەنوسن تا لەئامادەکردنەکەی وورد نەبنەوە . لەسەر چێشت لێنەری خەستەخانەیش پێویست بوو کە شارەزا بێت بەجۆرو شێوەی ئەو خواردنانەی کە لەگەڵ نەخۆشەکاندا دەگونجێت. چارەسەرو دەرمان لەو خەستەخانانەدا بەخۆڕایی بوو ، خەڵکیش هەموو سودی لێوەردەگرت بەبێ جیاوازی لە ڕەگەز و ئاینیاندا[٢] .

---

[1] کحال: پێ دەچێ مەبەست پێی ئەو کەسە بێت کە (کحول) (واتا پیسقرتۆ) بدات لە برین و پاکی بکاتەوە (وەرگێڕ: ن).

[2] محمد الفاتح / ٤١٣ .

❖ گرنگیدان بە بازرگانی و پیشەسازی : سوڵتان محمد گرنگی بە بازرگانی و پیشەسازی ئەداو ئیشی زۆری کرد لە پێناو بوژاندنەوەیاندا بەهەموو ئامێرو هۆکارێك. بەمەش ڕێبازی باوباپیر و سوڵتانەکانی گرتەبەر کە بەردەوام لە هەوڵی ئامادەسازیدا بوون بۆ بوژاندنەوەی پیشەسازی و کەری بازرگانی، لە نێو ژێردەستەکانیاندا . زۆرێك لە شارەگەورەکان گەشەسەندنی گەورەیان بەخۆوە دیت پاش ئەوەی فەتتحی عوسمانی ڕزگاری کرد لەوەی کە لەسەردەمی بێزەنتیەکاندا توش بووبوو بە هۆی ئەوەی سامانی دەوڵەتی دەستی گرتبوو بەسەر هەموو بوارێکدا و تەگەرەی خستە نێو ڕاپەڕینیەوەو بزاوتنی لەپێ خستبوو ، لەوشارانە : نیقیە بوو، عوسمانیەکان زۆر شارەزایی بازاڕە جیهانیەکان و ڕێگە دەریایی و وشکان بوون و ڕێگە کۆنەکانیان گەشە پێدەداو پێگەی بازرگانی نوێیان دادەمەزراند کە بزوتنەوەی بازرگانی لە هەموو بەشەکانی دەوڵەتدا خستە جووڵە. دەوڵەتە بیانیەکانیش ناچار بوون کە مەرزەکانیان بەڕووی خەڵکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بکەنەوە تاکوو پیشەی بازرگانی لە ژێر سێبەری ئالای عوسمانیدا مومارەسە پێبکەن و فێربن .

کاریگەری سیاسەتی گشتی دەوڵەت لە بوارەکانی بازرگانی و پیشەسازیدا ئەوەبوو کە خۆشگوزەرانی و ئاسانکاری باڵی کێشابوو بەسەر هەموو بەشەکانی دەوڵەتدا ، بەمەش دەوڵەت دراوی تایبەتی زێڕینی دەستکەوت [1]. هەروەها دەوڵەت دامەزراندنی ڕۆڵی پیشەسازی و پیشەسازیەکانی زەخیرەو چەکی پشتگوێ نەخست بەڵکو قەڵاو شوراکانی لە هەموو ناوچە گرنگ و سەربازیەکانی وڵاتدا بنیاد نا [2] .

---

[1] محمد الفاتح / ٤١٤ .

[2] محمد الفاتح / ٤١٠ .

❖ گرنگیدانی بەڕێکخستنەکارگێڕیەکان : سوڵتان فاتیح ئیشی ئەکرد بۆ گەشەپێدانی دەوڵەتەکەی، بۆ ئەمەش چەندیاسایەکی دانا تا بتوانێت کاروباری کارگێڕی خۆجێیی لە دەوڵەتەکەیدا ڕێك بخات . ئەم یاسایانە لەشەریعەتی ئیسلامەوە سەرچاوەیان گرتبوو . سوڵتان محمد لیژنەیەکی لە چاکترینی زاناکان پێکهێنا بۆ سەرپەرشتی دانانی ( قانون نامە) کە لەشەریعەتی پاکی ئیسلامەوە سەرچاوەی دەگرت. و کردی بە بناغەی حوکمی دەوڵەتەکەی ، ئەو یاسایە لەسێ بەش پێك هاتبوو، کە پەیوەندی بە پایەی کارمەندان و هەندی داب و نەریتەوە هەبوو لەگەڵ ئەوەی کە پێویستە ڕێو ڕەسم و ئاهەنگە سوڵتانیەکاندا بکرێت. هەروەها سزاو غەرامەکردنی دانا و بە ڕاشکاوی دەوڵەتی بە حکومەتێکی ئیسلامی ناوزەند کرد کە لەسەر بالادەستی ڕەگەزی ئیسلامیدروست ئەبێت و ئیتر لەهەر ڕەگەز و بنچینەك بێت[1] .

محمدی فاتیح گرنگی زۆری بەوە دا کە یاسایەك هەموار بکات پەیوەندی دانیشتوانی ناموسوڵمان ڕێك بخات بەو دەوڵەتانەوە کە دراوسێیانن و موسوڵمانن، هەروەها پەیوەندی ئەو دانیشتوانە ڕێك بخات لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەدا کە حوکمیان دەکەن و سەرپەرشتی ئەوانیان لە ئەستۆدایە، هات دادی خستە ناو دانیشتوان و زۆر بە (جیدی) کەوتە ڕاوەدونانی دز و ڕێگر و ئەوەی بڕیاری ئیسلام بوو بەسەریاندا جێبەجێی ئەکرد، بەمەش هێمنی و ئاسایش باڵی کێشا بەسەر هەموو لایەکی دەوڵەتی عوسمانیدا. سوڵتان محمد هەموو ئەو یاسایانەی هێشتەوە کە بۆ فەرمانڕاوایی کردنی هەرێمەکان بەکاردەهات لەپێش خۆیدا، بەڵام چەند گۆڕانکاریەکی کەمی تێدا کرد کە لەگەڵ سەردەم و دەوڵەتەکەیدا بگونجێت، دەوڵەت دابەش دەبوو بۆ چەند میرنشینێکی گەورە، کە میری میران فەرمانڕەوایی دەکرد کە بە ( بەگلەربەگ ) ناودەبرا و

---

[1] السلطان محمد الفاتح / ١٥٤ .

هەروەها چەند میرنشینێکی بچوك کە (میری لیوا) فەرمانڕەوایی دەکرد و بە ( سنجق بەگ ) ناودەبرا، هەریەك لەم دوو فەرمانڕەوایە هەڵدەستان بە چەند کارێکی شارستانی و سەربازی لەیەك کاتدا ، هەندێ لە میرنشینەکانی (صەقالیبە) هەر لەسەرەتاوە جۆرێك لەسەربەخۆیی ناوخۆییان پێ دەدرا کە هەندێ لەسەرکردەکانی خۆیان فەرمانڕەواییان دەکردن، بەڵام پاشکۆی دەوڵەت بوون و فەرمانەکانی سوڵتانیان بەوردی جێبەجێ دەکرد، خۆ ئەگەر لەفەرمانی سوڵتان لایان بدایە یان بیریان لەشۆڕش بکردایەتەوە بەسەر حکومەتی عوسمانی دا ئەوە لەسەر کار لای ئەدان و تۆڵەی لێ ئەسەندن، کاتێك دەوڵەت جیهادی ڕاگەیاندایە و میری میرنشین و لیواکانی بانگ بکردایە لەسەریان پێویست بوو بچن بەدەم بانگەوازەکەوەو بەو سوارانەی کە چاك ئامادەیان کردبوون بەشداری لە جەنگدا بکەن ، ئەمەش بەپێی ڕێژەیەکی دیاری کراو، کە بەچەکی تەواوو بەتوانای جەنگ کردنەوە سوارەیان ئامادەسازی پێدەکرد لە هەموو (٥) هەزارێك یەك لە ئەندامانی هەرێمەکەی جا ئەگەر هەرێمەکەی ٥٠٠ هەزار بوایە پێویست بوو سەد سوارە بەشداری پێ بکات . سەربازانی ناوچەکان لە سوارەوە پیادە پێك هاتبوو ، پیادەکانیش لەژێر سەرکردایەتی و کارگێڕی پاشاو بەگەکانی ناوچەکەو لیواکاندا بوون[1] .
سوڵتان محمد هەستا بە پاکسازیەکی فراوانی هەموو کارمەندە کۆنە بێتواناکان و کەسی لێهاتووی لە شوێنیاندا دانا و بەتەنها لێهاتوویی کردە بنەمای هەڵبژاردنی پیاوان و یاریدەدەرو والیەکان ، هەروەها گرنگی بە نیزامی ماڵ و دارایی داو بنەما گەلێکی پتەوی لە پارێزگاری ماڵ و دارایی دەوڵەتدا دانا و کەمتەرخەمی باجگران و یاریکردن بە سامانی دەوڵەتی لەناو برد کەئەم کەمتەرخەمی و یاریکردنە بە سامانی دەوڵەت سەروەتێکی زۆری لە کیسی

---

[1] السلطان محمد الفاتح / ١٥٥ .

دەوڵەت دەدا ، بەڕاستی سوڵتان محمد لێهاتوویی و توانستێکی وای لە لایەنی کارگێڕیەوە نیشاندا کە هیچی کەمتر نەبوو لەو لە لێهاتوویی و توانایەی کە لە لایەنی ڕامیاری و جەنگیدا نیشانی دابوو [1].

❖ گرنکیدانی بە سوپاو هێزی دەریایی : سوپای نیزامی هەر لەسەردەمی سوڵتان ئورخاندا دامەزرا، ئەو سوڵتانانەی دوای ئەویش هاتن گرنگیان بە گەشەپێدانی سوپا زۆر ئەدا بەتایبەت سوڵتان محمد کە گرینگیەکی تایبەتی ئەدا بەسوپا. لە ڕوانینی ئەودا سوپابناغەی دەوڵەتە و یەکێکە لە پایە گرینگەکانی بۆیە دوبارە ڕێکی خستەوەو دایمەزراندەوە و بۆ هەر دەستەیەك (ئاغا)یەکی دانا کە سەرکردایەتی بکات ، ماف پێشڕەویشی دا بە سەرکردایەتی ئینکیشاری بەسەر هەموو سەرکردەکانی تردا ، ئەویش فرمانەکانی لەسەرەوە پێدەگەشت لە کەسێکەوە بەناوی (الصدر الأعظم) کە سوڵتان کردبوویە سەرکردەی گشتی سوپا .

سەردەمی سوڵتان محمدی فاتیح بەوە جیا دەکرێتەوە کە هێزی میرۆیی سوپا زۆر بەهێز و بە ژمارەش زۆربوون، ئەمەش بەهۆی دامەزراندنی چەندین سەربازگەی جۆراوجۆرەوە هاتە بەر، هەروەها پیشەسازی سەربازی هاتە کایەوە بۆ دابین کردنی پێویستیەکانی سوپا لە جلوبەرگ و ڕەخت و قەڵغان و پیشەسازی زەخیرەو چەك . قەڵاکانیشی لە ناوچە خاوەن گرنگیە سەربازیەکاندا بنیاد نا ، لێرەدا ڕێکخستنی سەربازی جۆراوجۆر بەوردەکاری و دروستی هەبوو لە سوارەو پیادەو تۆپ و دەستەی هاوکاری کە پێویستی ئازوقەو چەك و ئالیکی ئاژەڵ و سندوقی خەزێنەکانی دەگەیاندە هێزە جەنگاوەرەکان لە مەیدانی جەنگ دا . لێرەدا دەستەیەك لە سەربازان هەبوون کە بە (لغمچیە) ناسراو بوون و کاریان چاندنی مین و لێدانی تونێل بوو بەژێر زەویدا لە کاتی

---

[1] محمد الفاتح / ٤٠٦ ، ٤٠٧ .

ئابلۆقـەدانی قەلأیەکـدا کـە بیانویـستایە ئـازادی بکـەن. هـەروەها ئاوگێڕەکـان لەسەریان بوو ئاو بگەیەنن بەسەربازەکان .

لەسەردەمی فاتیح دا زانکۆی سەربازی گەشـەی سـەندو دەسـتە لـە دوای دەسـتە ئەندازیارو پزیشك و بەیتالْ و زانایانی کەش و هەوا و ڕووبەرەکان پێدەگەیاند و دەری دەچاندن ( تخرج). هەروەها بـەردەوام سـوپای پـڕ چـەك ئـەکرد بـە کەسـانی پسپۆڕ لە بواری تەکنیکدا ئەم عوسمانیانە شۆرەتێکی بەرفراوانیان لە وردەکاری و ڕێکخستندا بەدەست هێنا [١] .

سوڵتان محمد سور بوو لەسەر گەشەپێدانی سوپای ووشکانی و هێـزی دەریـایی ، ئـەو گرنگـی پێدانەیـشی لـە کـاتی فـەتحی قوسـتەنتینیەدا دەرکـەوت کاتێـك کـە کەشـتیگەلی عوسمـانی ڕۆڵێکـی دیـاری هـەبوو لـە بـەهێز کردنـی ئابلۆقـەدانی شارەکە و چواردەودانی لە دەریاو وشکانیەوە .

لـەدوای فـەتحی قوسـتەنتینیە پـشت بەسـتن بـە چـەکی دەریـایی دووبەرامبـەر بوویەوە ، بۆیە ماوەیەکی کەمی نەبرد کە کەشتیگەلی عوسمانی زالْ بـوو بەسـەر هەردوو دەریای ڕەش و سپی دا . کاتێك کتێبی ( حقائق الأخبار عن دول البحار ) ی ئیـسماعیل سـەرهەنگ دەخوێنینـەوە ، تێبـینی گرنگیـدانی سـوڵتان محمـد دەکـەین بـە دەریـاوانی عوسمـانی . ئـەوەیش گرنگـی پێـدانێکی گـەورەبوو کـە شیاوی ئەوەیـە مێـژوو نوسـان بـە دامەزرێنـەری کەشتیگەلی دەریایی عوسمانی دابنێن . هەروەها محمـدی فاتیح سـودی لـەو دەوڵەتانـە وەرگـرت کـە گەشـتبوونە ئاستێکی بالأ لە دروست کردنی کەشتیگەلدا، وەك کۆمارە ئیتالیەکان بە تایبەت (بوندوقیـە) و (جەنـەوا) کـە گـەورەترین دەوڵـەتـە دەریاییـەکانی ئەوکاتـە بـوون [٢] . کاتێك سوڵتان لە (سیئوب) کەشتیەکی گەورەی کەم وێنەی بینی فەرمانی کرد بە

---

[1] محمد الفاتح /١٦٣ .

[2] محمد الفاتح /٤١١ .

هێنانی ودروستکردنی چەندین کەشتی لەسەر شێوازی ئەو ، لەگەڵ چەند چاکسازییەك کە تیایدا کردیان[1].
کەشتیگەلی عوسمانی بە ئەسکەلەی چاککردنی کەشتی سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی دەکرا ، یەك لە بەشە تایبەتیەکانیشی کە بە (طائفة الغرب) دەناسرا و ژمارەیان نزیکەی ٣ هەزار سەربازی دەریایی دەبوو کە لە کەشتیەوان و سەرکردەی کەشتی و ئەفسەر و دەریاوان پێك هاتبوو [2].
❖ گرنگیدانی بەدادپەروەری : هێنانەدی دادپەروەری لەنێو خەڵکدا لە ئەرکەکانی سوڵتانە عوسمانیەکان بوو ، سوڵتان محمدیش لەمەدا لەسەر ڕۆڵی باو باپیرانی دەچوو بە سووربوون لەسەر جێبەجێکردنی دادپەروەری لە بەشەکانی دەوڵەتەکەیدا . بۆ دڵنیابوونیش لەوە جاربەجار هەندێ پیاوانی ئاینی مەسیحی وەك نوێنەری دەنارد بۆ گەڕان و سەردانی بەشەکانی دەوڵەت و نوسراوێکی ڕەسمی پێدەدان کە ئەك و دەسەلاتی ڕەهایانی پێ ئەدان لە پشکنین و گەڕان و لێکۆڵینەوە تا ئاگاداری ئەوەبن چۆن کاروباری دەوڵەت بەڕێوە دەبرێت و تەرازووی دادپەروەری لەنێو خەڵکیدا چۆن بەڕێوە دەچێت لە دادگاکاندا .
هەروەها سەربەستی تەواوی بەو نێردراوانە دا بە ڕەخنەگرتن و تۆمار کردنی ئەوەی کە دەیانبینی و پاشان هەمووی بەرز بکەنەوە بۆ لای سوڵتان . هەمیشەش ڕاپۆرتەکانی ئەو نێردراوە مەسیحیانە بە چاکی باسی کاری دادگاکان و بەڕێوە چوونی دادپەروەری تەواویان و ووردەکارانەیان لە نێو خەڵکدا باس دەکرد بەبێ ئەوەی خزم خزمێنە بکرێ یان جیاوازی بکرێت لە نیوان خەڵکدا. سوڵتان محمد لەکاتی دەرچوونی بۆ جەنگەکان لە هەندێ لە

[1] محمد الفاتح /٤١١ .
[2] محمد الفاتح /١٦٢ .

هەرێمەکاندا ڕادەوەستا و چادری هەڵدەدا تا خۆی دابنیشێت بۆ لابردنی ستەم و هەرکەس شکایەت و مافێکی خوراوی هەیە بەرزی بکاتەوە بۆ لای.

محمدی فاتیح بەتەواوی هەستی بەوە دەکرد کە پیاوانی فیقه و شەریعەت شارەزاترین و بینەرترینی خەڵکن بەدادپەروەری و پێگەکانی و لە هەموو کەس مکوڕترن لە جێبەجێکردنیدا. ئەو وای دەبینی کە زانایان لە دەوڵەتدا وەك دڵ وان لە جەستەدا. ئەگەر ئەوان چاك بن دەوڵەتیش چاك دەبێت، بۆیە گرنگی زۆری ئەدا بەزانست و یاوەرانی زانست و ڕێگای زانستی بۆ خوازیارەکانی ئاسان کرد و بژێوی ژیانی و دەستکەوتی بۆ دابین کردن تاکوو یەکلا ببنەوە بۆ خوێندن و بەدەستهێنانی زانست . ڕێزی زانایانیشی ئەگرت و پێگەیانی بەرز ئەکردەوە. فاتیح بە شێوەیەکی تایبەتی گرنگی بە قازی و پیاوانی دادوەری ئەدا کە حوکم و یەکلاکردنەوەی کاروباری خەڵکیان دەبرد بەڕێوە بۆیە بۆیە لای ئەو ئەوە بەس نەدەبوو ئەو زانایانە دەستی بالاّیان هەبێت لە فیقه و شەریعەت و دەستپاکی و نەدۆڕاویدا، بەڵکوو دەبوو لەگەڵ ئەوەشدا جێگەی ڕێزو خۆشەویستی بن لە نێو خەڵکیشدا، دەوڵەتیش ئەبوو پێویستییە ماددیەکانیان بگرێتە ئەستۆ تا هەموو رێگەکانی بەرتیل و فریودان دابخات و هەر بۆیە خۆی باری گوزەرانیانی زۆر خۆش کرد و پلە و کارەکەیانی بە سام و هەیبەت و پیرۆزی دەوردەدا[1] .

کتێبەکانی مێژوو باسمان بۆ دەکەن کە : یەك لە غولامەکانی محمدی فاتیح هەندێ گەندەڵی لێ دەرکەوت لە (ئەدرنە)دا، ئەوەبوو دادوەر هەندێ لە خزمەتکارەکانی نارد بۆ ڕێگە لێگرتنی ، ئەویش وازی نەهێنا، دادوەر خۆی چوو، غولامەکەیش هێرشی کردەسەری و بەتوندی لێیدا ، کەسوڵتان محمد ئەمەی بیست تورەیی گرتی و بەرچاوی ڕەش کردو فەرمانی کوشتنی ئەو

---

[1] محمد الفاتح /٤٠٩ .

غولامەی دا لە بەر بێڕێزی نواندن لە ڕووی جێگری شەریعەتدا ، وەزیرەکان سکالایان بۆ ئەو غەلامە کرد لە لای سولتان فاتیح، بەڵام ئەو سکالاکەی قبوڵ نەکردن ، بۆیە تکایان کرد لە مەولا محی الدین محمد کە ئەو کێشەیە لەلای سولتان چارەسەر بکات بەڵام فاتیح لە ڕویدا وەستاو قسەکەی بەرپەرچ دایەوە ، مەولا محی الدین پێی ووت : دادوەر بەهەستانی لە کۆڕی دادوەریدا بەهۆی توڕەییەوە لە پلەی دادوەری کەوتوە و بەمە ئەو لە کاتی لێدانەکەدا دادوەر نەبووە ، بۆیە ئەمە ئەمە نابێتە سوکایەتی کردن بە شەریعەت تا کوشتنی ئەو منداڵە ڕەواببێت، بەمە سولتان محمد بێدەنگ بوو ، پاشان منداڵەکەیان هێنا بۆ قوستەنتینیە و بردیان بۆ لای سولتان محمد خان تا لەپاداشتی لێبوردنیدا، دەستی سولتان ماچ بکات ، سولتانیش دارێکی گەورەی هەڵگرت و بەتوندی هات لە غولامەکەی داو بەو بۆنەیەوە منداڵەکە ٤ مانگ نەخۆش کەوت .

دوایی چارەسەریان کرد وا چاك بوویەوە. دوایی ئەو غولامە کە ناوی (داود پاشا) بوو، بوو بە وەزیری سولتان بایەزید. لە دواییدا ئەم کوڕە نزای خێری بۆ سولتان دەکرد و دەیوت : ئەم پێگەشتنەم تەنها بەهۆی لێدانەکەی ئەوەوە بوو[1].

بەڵام هەر دادوەرێکیش بەتیلی بخواردایە لە لای سولتان جگە لە کوشتن سزایەکی تری بۆ نەبوو.

سولتان فاتیح لەگەڵ سەرقاڵ بوونی بە جیهادو ئازادکردنی ولاتانەوە، چاودێری هەموو لایەنەکانی دەوڵەتی دەکرد بەبێداری و گرنگی پێدانەوە، ئەوەی یارمەتی دەدا لەمەدا ئەوەبوو کە خوا زیرەکیەکی بەهێزو چاوڕونیەکی جێبەجێکەرانەو بیرەوەریەکی پارێزەرو جەستەیەکی بەهێزی پێ بەخشیبوو . زیاتر بەشەواندا

---

[1] محمد الفاتح / ٤٠٩.

دادەبەزیە نێو ڕێگاو کۆڵانەکان تا بۆ خۆی شارەزای باری ژیانی خەڵك بێت و سکاڵایان ببیستێت[1].

هەروەك دەزگای ئاسایشی دەوڵەت یارمەتی دەدا لە شارەزایی باری خەڵکدا کە زانیاری و هەواڵەکانی کۆ دەکردەوە کە پەیوەندیان بە دەسەڵاتەوە هەبوو و بەرزیان دەکردەوە بۆلای سوڵتان کە سوربوو لەسەر بەدواداچوونی بارودۆخی ژێردەستەکانی و چاودێری کاروبارەکانیان و ئاگاداربوون لە لایەنی هەڵەو کەم و کورتی تاك و کۆمەڵەکەی. سوڵتان فاتیح ئەم چاودێری کردن و بەدواداچوونەی لە بارودۆخی (سولەیمان علیه السلام) دەرگرتبوو کە خوا دەفەرموێت: ﴿ وتفقد الطير ﴾ ئەمەش بەپێی ئەوەی کە کاروبارەکانی پاشاکان ئەیخوازن و پێویست ئەبێ لەسەریان کە گرینگی بە هەموو بەشێکی مەملەکەت بدەن و چاودێری هەموو حاڵەتێك بکەن، بەتایبەتی حاڵی لاوازەکان[2].

## باسی حەوتەم

### وەسیەتەکەی سوڵتان محمد بۆ کوڕەکەی

ئەمە وەسیەتی محمدی فاتحیە بۆ کوڕەکەی لەناو جێگای مردنیدا کە ڕاستترین دەربڕینە بۆ بەرنامەو ئاکارو ئامانجێك کە باوەڕی پێی هەبوو لە ژیانداو خوازیاربوو لە خەلیفەکانیش کە لە دوای خۆی لەسەر بڕۆن : ( ئەوامن دەمرم ، بەڵام خەمم نی‌یە، چونکە تۆم لە دوای خۆم بەجێ هێشتووە . دادوەرو پیاوچاك و میهرەبان بەو بەبێ جیاوازی کردن با بەرگریکردنت لە ژێردەستەکانت بە هەموو لایەك بێت، کار بکە بۆ بلاو کردنەوەی ئاایینی ئیسلام ، چونکە ئەوە ئەو ئەرکە گەورەیە لەسەر زەویدا لە هەموو کەسەوە دیارە، گرنگیدان بەکاروباری ئایین لە پێش هەموو شتێك دابنێ و مەپسێ و ماندوو مەبە لە پارێزگاری

---

[1] محمد الفاتح / ٤٠٩.

[2] تفسير القرطبي : ١٧٧/١٢ .

کردنیدا، ئەو کەسانە بەکار مەهێنە کە گرنگی نادەن بەکاروباری ئایین و لە تاوانە گەورەکان دوور ناکەونەوە و لە خراپەکاریدا ڕۆچون و خۆت لە (بیدعە)ی گەندەڵ بەدوور بگرە. ئەوانیش لە خۆت دوور بخەرەوە کە هانت دەدەن بۆ کردنی ئەو بیدعانە، خاکی وولات بە جیهاد کردن فراوان بکە و پاسەوانی ماڵ و سامانی ( بیت المال) بکە لەوەی کە پەرش و بلاو بێتەوە، دەخیلت بم دەستت نەبەیت بۆ ماڵی هیچ کەسێك لە ڕەعیەتەکەت مەگەر بەمافی ئیسلام نەبێت. خۆراکی بێ دەرەتان و پەککەوتەکان دابین بکەو، ڕێز لە هەموو ئەو کەسانە بگرە کە شایەنی ئەوەن ڕێزیان لێ بگری، لەبەر ئەوەی کە زانایان پێگەی هێزی بلاو بوەوەن لە جەستەی دەوڵەتدا، بۆیە پشتیان بگرە و هانیان بدە، ئەگەر هەواڵی یەکێکیانت زانی کە لەشارێکی تردایە ئەوا بنێرە بەپێشوازیداو بیهێنە بۆ لای خۆت و بەماڵ و سامان ڕێزی بنێ، وریابە! وریابە! سەروەت و سامان و سەرباز لە خۆت نەکەن. دەخیلت بم! هەرگیز ئەهلی شەریعەت لە دەرگاکەت دوور نەخەیتەوە ! دەخیلت بم! دلّ نەدەیت بەکارێك کە پێچەوانەی یاساکانی شەریعەت بێت، چونکە ئایین ئامانی ئیمەیەو هیدایەتی خوا بەرنامەمانەو هەر بەوەیش سەرکەوتوو دەبین.

لە منەوە ئەم پەندە وەربگرە : کە هاتمە ئەم ولاتە وەك مێرولەیەکی بچووك وابووم، خوای گەورە ئەم هەموو بەخششە گەورانەی پێبەخشیم ، دەی تۆیش بە ڕێگەکەی مندا بڕۆو جێ پێکانی من هەڵبگرە، کار بۆ ئەوە بکە ئەم دینە بڵند و بە دەسەلات بێت، ئەهلی ئەم دینە بەڕێز و حورمەت گیراو بن، وریابە سەروەت و سامانی دەوڵەت لە خۆشگوزەرانی و گاڵتە و گەپدا خەرج مەکە یان زیاد لە ڕێژەی پێویست لە کارەکە خەرج بکەی! چەنکە ماڵ بەفیڕۆدان لە گەورەترین هۆکارەکانی تیاچوونە[1].

---

[1] السلطان محمدالفاتح / ١٧١-١٧٢.

١. دادپەروەرو پیاوچاك و میهرەبان بە : بەڕاستی محمدی فاتیح ئەو بنەمایەی بە چاکی جێبەجێ کرد لەگەڵ ئەو مەسیحیانەی کە کەوتبونە ژێر چاودێری دەوڵەتەکەیەوە ، کاتێك چویە نێو قوستەنتینیە کە بە پێی ڕێنماییەکانی ئیسلام جەنگی دەکرد ( واتە وەك ئیسلام داوای دەکات) کە تیایدا: ئابڕوی کەس ناتکێنرێ و منداڵ و پیر و ئافرەت ناکوژرێ و کێڵگەی کشتوکاڵی ناسوتێنرێت و هیچ لاوازێك لەناو نابرایێت و سوکایەتی بە جەستەی هیچ کوژراوێك ناکرێت و جگە لەو جەنگاوەرانەی چەکیان لە ڕووی موسوڵماناندا هەڵگرتووە کەس تووش هیچ زیانێك نابێت)[1]. محمدی فاتیح کە نوێنەرایەتی ئیسلامەتی و بیرو باوەڕو مەنهەجە ئیسلامی ئەکرد لە جەنگدا لەسەر ڕێنمونیەکانی حەزرەتی (ابو بکر) ڕەزای خوای لەسەر بێت بوو لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ ڕۆمدا کە ئەیفەرموو: (ناپاکی مەکەن و تەندڕەو مەبن و غەدر مەکەن سوکایەتی بە جەستەی کوژراو مەکەن، منداڵانی بچوك و پیرە بەتەمەنەکان و ئافرەت مەکوژن و دارخورما مەبڕن و مەیسوتێنن و هیچ درەختێکی بەردار مەبڕن ، مەڕو وشتر سەرمەبڕن بۆ خواردن نەبێت، ئەوەی بزانن لەمەودوا بەلای گەلانێکدا دەدەن کە خۆیان یەکلا کردووەتەوە بۆ کلێسا و خەڵوەتگەکان ئێوەیش واز لە خۆیان و ئەو کلێسا و خەڵوەتگەکایانە بهێنن، بەناوی خواوە هەڵمەت بەرن)[2].

محمدی فاتیح چووە نێو دڵی پایتەختی بیزەنتی و وانە گەلێکی لە دادپەروەری و میهرەبانی بەخشی بە جیهانی ڕۆژئاوای مەسیحی . ئەمەش بوویە مەشخەڵێك لە مەشخەڵەکانی مێژوی عوسمانی ، دەوڵەتی عوسمانی لەسەر بەرنامەی ئیسلام دەڕۆیشت، بەمەش دادپەروەری و میهرەبانی بۆ ئەوانەی کە فەرمانڕەواییان دەکردن لێوە وەرگرت (عبدالرحمن عەززام) لەمەڕ میهرەبانی و دادپەروەری

---

[1] المسألة الشرقية / ١٠٤ .

[2] المسألة الشرقية / ١٠٦ .

عوسمانیەکان دەدوێت لە بەرامبەر ئەو گەلانەدا کە حوکمیان دەکردن، وەدەڵێت:
( هەندێ کەس بڕوا ئەکات بەو قسەو شۆخیانەی کە دەیگوێزنەوە دەربارەی سەردەمەکانی دەوڵەتی عوسمانی کە ئەڵێن: دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێکی گەورەبووە، بەڵام سیفەتی میهرەبانی لە تایبەتمەندیەکانی ئەو نەبووە، ئەمە هەڵەیەکی بڵاوە کە لەبەردەم لێکۆڵینەوەو وردکردنەوەدا خۆی ناگرێت من خۆم باسی ئەو میهرەبانیەم لە (بسرابیا) لە (ڕۆمانیا)و لەسەر ڕوباری (دنیستز ) بیستوە کە پێیان وتم: نمونەی جوتیارانی ئەم دەورەوبەرەی جێماوی دەسەڵاتی عوسمانی هێشتا ئاماژە بە میهرەبانی و دادپەروەری تورکی دەکەن ، ئەو قسانە ئاماژەی بۆ ئەوە دەکرد کە دادپەروەری لە تورکەکانەوە کەوتووەتە سەرزەوی ، سەیرم کرد لە پۆڵۆنیا و ڕۆمانیا و وڵاتی بەلقانداو لەو سەفەرە جۆراوجۆرانەدا ئەمکردن، چەند نموونەو ئەفسانەی زۆریان ئەوتەوە کە بەردەوام ئاماژەیان بەو ڕێزگرتنەی تورکی موسوڵمان دەکرد وەك میهرەبانێکی دادپەروەر کە لە دەرونی ئەو گەلە مەسیحیانەدا جێگەی گرتبوو ، لە ساڵی ١٩١٧دا من لە (ڤیەننا) بووم، بۆم گێڕدرایەوە کە پۆڵۆنییەکان موژدەیان بە یەکتری داوە بەگەیشتنی سەربازی عوسمانیەکان دەدا بۆ گالیسیا وەك کۆمەکێك بۆ نەمساویەکان[1] .
(بە دڵنیاییەوە دادپەروەری و میهرەبانی ئیسلامی ئەو دووشتەبوون کە لە ئەوروپادا ڕیشەی عوسمانی داکوتا، بە هۆی دادپەروەری و میهرەبانیشەوە بوو کە ئەو ئوممەتانە لەبەر بەریەت و کەللەڕەقی ڕزگاریان بووو یەکسانی و ویژدان بە خەرجدان فێربوون، ئەوەندە بەسە کە بزانیت: بەکۆیلە کردنی دەستەو تاقمەکان بەناشیرینترین شێوە یاسایەکی نێو دەوڵەتی پەیمانبەستوی ئەوروپای ناوەڕاست و ئەوروپای باشور بووە، تائەو کاتەی عوسمانیەکان هەڵیان

---

[1] الرسالة الخالدة / ٢٤،٢٢.

وەشاندەوە چەندین پەیمانی نێودەوڵەتی لە نێوان (مەلداف) و (پۆڵۆنیەکان) و (مەجەڕ)دا هەبوو بەتەسلیم کردنەوەی هەموو جوتیارێك کە لە کێڵگەی کشتوکاڵی گەورەکەی هەڵبهاتایە بۆ یەکێك لەو وولاتانە کۆچی بکردایە! ئەو کێڵگە کشتوکاڵیانە بە ئاژەڵو جوتیارەکانیانەوە ئەفرۆشران! عوسمانیەکان کە هاتنە ئەوروپا هەڵگری ئەم سۆز و میهرەبانیە بوون هەروەك چۆن پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) ئەوەی دەویست ، تورکەکان بەژمارەیان بە چەك و تفاق لە هیچ گەلێك لەو گەلانە زیاترنەبوو کە زاڵ بوون بە سەریاندا و لە ڕێگەی ئەوانەوە گەیشتنە ڤیەننا هەر ڕەوشتی میهرەبانی بوو کە ڕێگەی سەختی شاخ و دەریاو چالاییەکانی بۆ ئاسان دەکردن ، هەروەك پێشتر ئەو سیفەتە فەتحکردنی ئەفەریقیا و ئاسیای بۆ عەرەبەکان ئاسان کرد[1]. محمدی فاتیح لەسەر بەرنامەی میهرەبانی و دادپەروەری دەچوو و وەسێتی بۆ نەوەکانی دوای خۆشی هەر ئەوەبوو کە پابەندی ئەو بەرنامەیە بن کە ڕاستی ئیسلامی دەردەخات.

٢. بەبێ جیاکاریکردن با بەرگری کردنت لە ژێردەستەکانت بۆ هەموو لایەك بێت:
ئەمە ئەو کارەبوو کە سوڵتان محمد خۆی پێی هەڵئەستا زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی پارێزگاری هەموو ژێردەستەکانی دەوڵەت بکات، ئیدی موسوڵمان بن یاخود مەسیحی ، لەو چیرۆکە خۆشانەی لەم بارەوە ئەیگێڕتەوە ئەوەیە کە خەڵکی دورگەی (خیوس ) قەرزی یەکێك لە بازرگانەکانی (غەلتە)یان لەسەربوو و بەبڕی ٤٠هەزار دۆقیە کە ئەو بازرگانە ناوی ( فرانسسکوادرابیریو) بوو، کاتێك ئەو قەرزدەرە نەیتوانی قەرزەکەی وەربگرێتەوە لەخەڵکی دوورگەکە سوڵتان فاتح وای ئەبینی کە ئەبێت ئەو هەستێت بەو کارە چەنکە ئێستا ئەو بازرگانە یەکێکە لە ژێر دەستەکانی ئەم و پاراستنی مافەکانی یەکێکە لە ئەرکەکانی دەسەڵاتی عوسمانی، بۆیە محمد فاتح هەستا بە ناردنی چەند کەشتیەك بۆ دورگەکە

[1] المسألة الشرقية / ١٠٧ .

بەسـەرکردایەتی حـەمزە پاشـا. هەرچـەندە خـەڵکی دورگەکـە هەنـدێ لەسەربازەکانیان کوشتن و ملکەچ نەبوون و ئامادە نەبوون گوێ بۆ داواکانیان بگرن! بۆیە محمدی فاتیح بە(درابیریـو)ی بازرگانی ووت ( من قەرزەکەی تۆ لەخەڵکی دوگەکە وەردەگرم بە دووکان و داوای پارەی خوێنی ئەو سەربازانەش دەکەم کە لەناوچوون)[1]. سوڵتان محمد کەشتیگەلێکی بەڕێخست بۆ ئەو دورگەیە و خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی کرد بۆ دورگەنزیکەکانی و (دورگەی خیوس)ی بەبێ جەنگ و کوشتار ئازادکرد و هەردوو دورگەی (ئیمبروس) و (ساموتراسی) ناچار بەخۆدەستەوەدان کرد و هەدوو دەرگاکەی بەگرتنیان کرانەوە بۆ عوسمانیەکان، بۆیە دورگەی (خیوس) ناچاربوو بەدانەوەی ئەو قەرزەی بازرگانە جەنەویەی کە لەسەری بوو لەگەڵ پێدانی سەرانەیەکی ساڵانە بەسوڵتان بەبڕی ٦هەزار دۆقیە لەگەڵ دانەوەی قەرەبووی ئەو کەشتیە عوسمانیانەك کە کەوتنە ژێر دەریاوە. ڕاستە بەرگریکردن لە ژێردەستەو پاراستنی مافەکانیان یەکێکە لەئەرکەکانی دەوڵەتی عوسمانی.

٣. ئیش بکە بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی ئیسلام چونکە ئەوە ئەو ئەرکە گەورەیە لەسەر زەویدا لە هەموو کەسەوە دیارە: سوڵتان محمد لەجەنگەکانیدا ئەوەی لەبیر نەدەکرد کە ئەو بانگخوازێکی ئیسلامیە، بۆ ئەمەیش سەرکردەو سەربازەکانی هاندەدا بۆ بڵاو کردنەوەی ئایین و بیرو باوەڕو ئیسلامەتی، سوپاسی ئەو سەرکردانەی دەکرد کە لەسەر دەستیان شارەکان ئازاد دەکران، کاتێك فەرمانی کرد بە عمری کوڕی طرخانی سەرکردەی بۆ ئەوەی بەسوپاکەیەوە بەرەو ئەسینا بکشێ و لە ئەنجامدا دەستی گرت بەسەر شارەکەدا و بەستیەوە بە دەوڵەتی عوسمانیەوە، سەرکردە عومەر کە بەسوپاکەیەوە بەڕێکەوت و شارەکەی

---

[1] محمدالفاتح / ٢١٧ .

ناچار بەخۆبەدەستەوەدان کرد ، سوڵتان لەدوای دووساڵ لە ئازادکردنی شارەکە سەردانی شارەکەی کردو ووتی: ئیسلام چەند قەرزاری ئیبن طرخان بوو).
دەوڵەتی عوسمانی گرینگی زۆری ئەدا بەبانگەوازکردنی خەڵك بۆ لای خواو جێ پەنجەی خۆی بەڕوونی و بە چاکی لەبواری بڵاو کردنەوەی بانگەوازدا بەجێ هێشتووە لەئەوروپادا، بەدرێژایی سەدەکان و یەکبەدوادا هاتنی ساڵ و سەردەمەکان چەندین کۆمەڵی ئیسلامی بەرەنگاری هەموو جۆرە فشارێکیان دەکرد بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ مەسیحیەت. بەردەوام ئەو کەمینە ئیسلامیانە تا ئەمڕۆش لە بولغاریا و ڕۆمانیا و ئەلبانیاو یۆنان و یۆغسلافیادا هەن کە ژمارەیان دەگاتە ملیۆنەها کەس[1].
ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ فەزڵی خوا بەسەر ئەو گەلانەوە و پاشان بۆ ئەو سوڵتانە عوسمانیانەی کە سوور بوون لەسەر ڕێنمونی خەڵك و هێنانیان بۆنێو ئیسلام.
٤. گرنگیدان بە کارو باری ئایین لە پێش هەموو شتێك دابنێ ماندوو مەبە لە پارێزگاری کردنیدا: سوڵتانە عوسمانیەکان چ پێش سەردەمی محمدی فاتیح و چ پاش ئەویش پاك و ئیسلامیانە پەروەردە بووبوون پەروەردەیەك تێکەڵ بە باوەڕێکی قووڵ کە ئاڕاستە کرابوون بۆ بەدەستهێنانی چەند ئامانجێکی بیروباوەڕی ڕاشکاو، کە لە پێناو ئەو ئامانجانەدا چەندین جەنگی توندی ئاینی یان ئەنجام دا. جوانترین دەستەواژەی سەر زمانی عوسمانیەکان لەکاتی هەڵمەت بردن و جیهاددا ئەوە بوو: (اما غاز او شهید) واتا: یان جەنگاوەری یان شەهیدی. ئەوەبوو لە سەرەتای دامەزراندنیدا نازناوی ( غازی) نرا لە سەرکردەکەیان کە بەواتای (موجاهیدی ڕێی خوا) دێت، ئەو نازناوە بەردەوام لە پێش هەموو نازناوەکانی ترەوە بوو لەلای سوڵتانە گەورەکان. ئامانجی دەوڵەتی

---

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية : ١/ ٢٩، ٣٠ .

عوسمانیش بریتی بوو لە: (بەرگریکردن لە ئیسلام و بەرزکردنەوەی ئالآی بەسەر هەموو خەڵکدا).
بۆیە دەوڵەت وەك گەل و سوڵتان وەك حکومەت و سوپاو وەك ڕۆشنبیری و یاسای دەوڵەت و وەك بەرنامەو ویژدانی خەڵکەکەوەك ئامانج و پەیامیان هەمووی پێکەوە بەڕەنگێکی ئیسلامی بێگەرد هەر لەسەرەتاوە و بەدرێژی حەوت سەدە ڕەنگ کرابوون. بەڕاستی گرنگیدانی سوڵتانەکان بە بواری ئایین زۆر گەورەبوو و پێش هەموو شتێکیان دەخست و لەسەری ئەڕۆیشت تائەو پەڕی سنوور، دوپاتیشیان دەکردەوە کە ئەوان ئیمانیان تەنها بۆ ئیسلام و کەلەپورو ژیاری ئیسلام دەگەڕێتەوە. نیشتمانیش لەلایان هەموو زەویەك بوو کە موسوڵمانانی تێدا نیشتەجێ بێت ، ووشەی میللەتیش لایان واتای هەموو ئوممەت و ئایینی دەدا پێکەوە ، ئەو ئامانجەی بەرنامەی پەروەردەیی هەیبوو لە هەموو خوێندنگەو زانکۆو پەیمانگەکاندا کە دەرونە تازە پێگەیشتووەکانی هەر لەسەرەتای فێرکردنیانەوە لە نوسینەکاندا پێ ڕەنگ دەکرد هەر ئیسلام بوو، هەموو موسوڵمانان لە دەزگاکانی باری تاکە کەسیدا تۆمار دەکران و لە شوناسنامە عوسمانیەکانیشدا وەك پسوڵەی پێناسی تەنیا ناسنامە ئیسلامە کە ئەنوسرا. بێ ئەوەی لەگەڵ ئەمەدا باسی ئەو لایەنە نەتەوەییەکە بکرێت کە تورکە یان عەرەبە یان شەرکەسیە یان ئەلبانە یان کوردە. ئەوەی لای دەوڵەت گرنگ بوو و لە میللەت و ئایینیاندا ببووە جێ مەبەست ئەوەبوو کە موسوڵمانن و بەس. عوسمانیەکان هەموو جەنگاوەرێکی موسوڵمان کە لە پێناو خوادا جەنگی بکردایە بە کەلەپوری پاڵەوانێتی و خەلیفەی مێژوویی خۆیان دەزانی، با ڕەگەزەکانیش جیاواز بوونایەو سەردەمەکانیش لێك دوور بوونایە .
لەوانە: ( عبدالله البطال) ی موجاهید کە لە جەنگی ئەگرتیون دا لە ئاسیای بچوك لە ساڵی ١٢٣ك لەسەردەمی دەوڵەتی ئومەویشدا شەهید بوو، کە طبري کاتێك باس لە ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٣ وە ئەکات و دەڵێت: تیایدا (عبدالله

البطال) لەگەڵ کۆمەڵێکی موسوڵماندا لە خاکی ڕۆمدا کوژرا[1]. عوسمانیەکان بە پاڵەوانی نەتەوەیی خۆیانی دەزانن لە کاتێکدا ( عبدالله البطال ) عەرەب بووەو دامەزراندنی دەوڵەتی عوسمانی نزیك بە ۷۰۰ ساڵ دوای ئەوە بوو، بەڕاستی مێژووی عوسمانیەکان و پاڵەوانە عوسمانیەکان بریتی بوو لە ڕەگەز و ڕەچەی ئیسلام و مێژوو و موجاهیدانی ئیسلام[2].

سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەزۆر نازناو ناوزەد دەکران کە دەردەکەوێت ئامانجی گەورەو مەبەستی سەرەکیان خزمەتی ئایینی خوابووە .وەك نازناوی : سوڵتانی (غەزاکەرەکان) و (موجاهیدەکان)، (خزمەت گوزاری دوو حەرەمە پیرۆز)ەکە، خەلیفەی موسوڵمانان[3].

٥. ئەو کەسانە بەکار مەهێنە کە گرنگی بەبواری ئایین نادەن و لە تاوانە گەورەکان دوور ناکەونەوەو لە خراپەکاریدا ڕۆچوون: سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانی گرنگی زۆریان ئەدا بە دامەزراندنی زانکۆگەلێك بۆ دەرچواندنی کۆمەڵێك سەرکردە بۆ سوپاو ئەرکە گرنگەکانی دەوڵەت ، بەرنامەیەکی پەروەردەییشیان بۆ ئامادە سازی سەرکردەکان و بەتایبەت لە نێو سوپادا دانا . سووربوون لەسەر ئەوەی کە کەسە دەستپاك و لێهاتوو و خاوەن عەقڵ و ژیری و لە خواترسی هەڵبژێرن بۆ ئەو پلەو پایەیەکانی دەوڵەت و لە پاشاندا ئەوە بوو کە هەرێمەکان و سەرکردایەتیەکانی نێو سوپاو پایەکانی دادوەریان دایە دەست ئەوانە. هەرچی شتێکیش کە گرنگی بە کاروباری ئایین نەدایە لێی دوور ئەکەوتنەوە هەروەها دورکەوتنەوە لە تاوانە گەورەکان و داوێن پیسی و خراپەکاری. سوڵتانە پێشووەکانیش هەروابوون.

---

[1] تأريخ الطبري : بەشی دووەم ڕووداوەکانی ساڵی ١٢٢ك .

[2] المسألة الشرقية /٥٧ .

[3] المسألة الشرقية / ٥٧ .

٦. دووركەوەرەوە لە ئەوانەش هانت دەدەن بۆ ئەو بیدعانە لە خۆتی دوور بخەوە: سولّتانە پێشینەکانی عوسمانی لەسەر بەرنامەی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەچوون و مەترسی بیدعە (داهێنراو) و نزیک خستنەوەی ئەو کەسانەیان دەزانی. خۆیان وابەستەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و یەکدەنگی زانایان و ئیجتیهادە سەقامگیرو دروستەکانی زانایان دەکرد .

٧. ڕووبەری وولّات بە جیهاد کردن فراوان بکە: بەڕاستی سولّتانە پێشینەکانی عوسمانی هەستان بە فراوان کردنی ڕووبەری وولّات بە جیهاد کردن ، وە ئاساییشیان بلاّو کردەوە و ئەو مەترسیانەیان لە ناوبرد کە هەڕەشەیان لە دەولّەتەکەیان دەکرد ، کاریشیان کرد لەسەر پتەوکردنی سنوورەکان بەچەند بەربەست و هێزێکی ڕێگر تاکوو دوژمنان لەو سنوورانەوە دزە نەکەن یان سنور نەبەزێنن و خوێنی موسولّنان و پەیماندەران نەڕێژن . سولّتان محمد و ئەوانەی پێش کاریان کرد لەسەر ئامادەکردنی ئوممەت بە ئامادەسازیەکی جیهادیانە و هەستان بە ئەرکی خۆیان لە جیهادکردنی بێباوەڕە نکۆلّی کەرەکان لە ئیسلام تا موسولّمان بن یاخود بێنە نێو (پەیمان)ی موسولّمانانەوە. کۆمەلّگەی عوسمانی بەڕەنگێکی جیهادی بانگەوازی ڕەنگ کرابوو ، تاکەکانی سوپایش هەر لەسەرەتای پێگەیشتنیانەوە بە ئامادەسازیەکی وورد وتەواو ئامادەی ژیانێکی توندی جیهاد کرابوون .

بەڕاستی سوپا عوسمانیەکان چەندین سەرکەوتنی بەرز و بلّندیان لە مەیدانە ئەوروپیەکاندا بەدی هێنا [1].

دەولّەتی عوسمانی تا سەردەمی سولەیمانی قانونی چەندین هیوای بەرزیان بەدی هێنا کە موسولّمانان ماوەی ٩ سەدە بوو کردبوویان بەئامانج ،

---

[1] المسألة الشرقية / ٦٠ .

بەبەرزکردنــەوەی ئــاڵای محمــد لەســەر قەڵاگــەلێکی پایتەختــە گــەورەکان لــە ئەوروپاوملکەچ کردنی زۆرێك لە دەسەڵات و هەرێمەکان بۆ حکومەتی ئیسلامی و سێبەری ئیـسلام درێـژ دەبوویـەوە تائـەوەی سـوپای موسـوڵمانان خـەریك بـوو ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای بەتەواوی بگرن و بگەنە زەوی گەورە [١].

لە کۆنگرەی حەوتـەمی وەزیرانـی دەرەوەی دەوڵەتـە ئیسلامیەکان لە ئەستانبول موجاهیدی پرۆفیسۆر ئەندازیار ( نجم الدين ئەربەکان ) ووتارێکی پێشکەش کرد کـە تیایـدا خوازیـاری گەڕانـەوەی ڕۆڵـی پێـشووی ئیـسلام بـوو کـە دەوڵـەتی عوسمـانی نوێنەرایـەتی دەکـرد . لـە ووتارەکەیـدا ووتـی: ( ... ئەم کۆشـکەی کە خوا ویستی تیایدا کۆنگرەی گەورەی ئیسلامی تێدا ببەسترێت و ووشـەی ( لاإله إلا الله ) لەسەر دەرگاکەی نەخشێنراوە ئەو وشەیەی کە هەموو ئیسلامی تێدا جێ ئەبێتـەوە، ئـەوە کۆشـکی محمـدی فاتیحـە کـە لـە دوای فـەتحکردنی ئەسـتانبول بنیادی نا ئەم شوێنە چۆن مێژووی نەبێ لە کاتێکدا کاروباری جیهانی ئیسلامی بۆ ماوەیەکی زۆر لێرەوە نەخشەی بۆ دائەنرا؟ چۆن مێـژووی نـەبێت لـە کاتێـکدا تیایدا سوپاکانی موسوڵمان بەرەو هەموو ناوچەکانی جیهان بەمەبەستی جیهاد کردن لە ڕێی خوادا دەرچوون و ڕووناکی و ڕێنمونی و دادپەروەریان لە هەرکوێ لە بارو لـە چەندە توانرابێـت بـڵاو کردۆتـەوە . چۆن مێـژووی نـەبێت لـە کاتێـکدا لەســەر ئــەو بــەردەی کــە مایکرۆفۆنەکــەی لەســەر چەسـپاوە ئاڵاکـانی سـوپا ئیـسلامیەکان لەســەر دائــەکوترا و هەریەکــەیان بــۆ بــەرگریکردن لــە وولاتــانی موسوڵمانان هەریەکەو لە تۆڵێکەوە دەردەچوو، بۆ وێنەش چەند دانەیەکیان باس دەکـەم: لێـرەدا بڕیـاری نـاردنی گەلـە کەشـتی عوسمـانی بۆ بـەرگریکردن درا بـۆ ئـەوەی ئەندەنوسـیاو فلیـپین نەکەونــە ژێــر چــنگی داگیرکــەری هۆڵەندیــەوە،

---

[1] المسألة الشرقية /٦٣ .

هەرلێرەدا چەندان بڕیاری تر درا بە ناردنی سوپاو گەلەکەشتیی عوسمانی بۆ پارێزگاری کردنی باکوری ئەفەریقا لە جەنگاوەرە چاو چنۆکەکان.
لەسەر هەموو ئەمانەوە ئەو بنیادە مێژوویيە لە نێوەندی دیوارەکانیدا ئالآی پێغەمبەری گەورەی (صلی الله علیه وسلم) لە خۆگرتبوو لەگەڵ عەبا پیرۆزەکەی و شمشێر و زۆرێك لە شوێنەوارە پیرۆزەکانی )[1].
٨. پاسەوانی ماڵ و دارایی ( بیت المال ) بکە لەوەی پەرش و بڵاو ببێتەوە: سوڵتانە عوسمانیەکان وایان دەدیت کە: دەوڵەت دەستەیەکی جێبەجێکاری و دەمڕاستی ڕای ئوممەت و ئەرکباری پارێزگاری بەرژەوەندیەکانیەتی. جا بەرپرسیارێتی دەوڵەت تانیا دابینکردنی ئاسایش وپارێزگاری نەبوو، بەڵکوو بەرپرسیار بوو لە چاودێری بەرژەوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و پارێزگاری ( بیت المال) لە زیادە خەرج کاری و بەفیڕۆدانی، هەروەها پاراستنی سەرچاوەو داهاتەکانی بیت المال.
٩. ووریابە دەستت درێژ نەکەی بۆ ماڵی هیچ کەس لە ژێردەستەکانت مەگەر بەمافی ئیسلام نەبێت: ئەرکی دەوڵەت جێبەجێکردنی فەرمانەکانی شەریعەتە ، شەریعەتیش بۆ پاراستنی ماڵ و سامانی خەڵك هاتووە کە ڕاگری ژیانیانە ، ئیسلامیش هەموو هۆکارێکی ماڵ بردنی بەبێ مافی شەرعی حەرام کردووە. ئەرکی فەرمانڕەوایش پارێزگاری ماڵ و سامانی ژێر دەستەکانیەتی لە دزی و تالآنکاری، نە دەست ڕاکێشێت بۆ ماڵی خەڵکی و دەستدرێژی بکاتە سەر سامانیان، بەبێ هیچ مافێك.
١٠. خۆراکی بێدەرەتان و پەککەوتەکان دابین بکەو ڕێز لە هەموو ئەوانە بگرە کە شایەنی ئەوەن ڕێزیان لێ بیگرێت: سوڵتانە عوسمانیەکان پێشبڕکێیان دەکرد لە بەخشین بۆ هەژاران و کەمدەستان و ڕێبواران و هەر کەسێك پێویستی

---

[1] المسألة الشرقیة / ٦٣،٦٤،٦٥.

بەچاکەو بەخشین بێت ، دەوڵەت لەو بوارەدا هەستا بە چەند کارێکی گەورە، بەڵکو سوڵتان و وەزیرەکان بەشێکی زۆر لە وەقفیان تایبەتکرد بۆ زانستخوازان و هەژارو کەمدەست و بێوەژنان و ...هتد ، وەقف کردنیش پایەیەکی سەرەکیە لە ئابوری دەوڵەتدا . مامۆستا محمد حرب دەڵێت : ( ... بزوتنەوەی زانستی لە زانکۆکانی ئەستەنبولدا زۆر چالاك بوو... بۆ نمونە صقوللي محمد پاشا داهاتی وەقفی نزیکەی ۲۰۰۰ گوندی چیکۆسلۆفاکیا واتە بەلقان بوو کە پاشکۆی دەوڵەتی عوسمانی بوون ئەبەخشی بە بزاڤی زانستی لە ئەستەمبۆڵدا! ئەسعەد ئەفەندیش کە دادوەری سەربازی ڕوملی دوو وەقفی گەورەی تایبەت کرد بۆ ئەو کچۆڵە نەدارانەی کە گەیشتبوونە تەمەنی شووکردن، عوسمانیەکان وەقفگەلێکی گەورەو جۆراوجۆریان هەبووە. نموونەیەکی تر: وەقفگەلێك هەبوون بۆ دابەشکردنی موچەی مانگانە بۆ خێزانە پەککەوتەکان –جگە لە خواردن– چونکە خواردنی بەخۆڕایی وەقفگەلی تری گشتی هەبوو کە بە ( عمارات وقفی ) ناودەبرا . واتە : وەقفی چێشتخانە خێریەکان . ئەو ( عمارات ) ە خواردنی بەلاشی پێشکەش دەکرد بە بڕی ۲۰۰۰۰ کەس لە هەر ڕۆژێکدا بە خۆڕایی ، ئەمەش لە هەموو هەرێمەکانی تردا هەبوو[1]. چێشتخانەی خەیری لە مزگەوتی سولەیمانیە میزانیەی ساڵی ۱۹۵۸ ی دەگەشیتە ۱۰ ملیون دۆلاری ئەمەریکی تۆزێ کەمتر[2]. سیاسەتی دەوڵەتیش لەسەر ئاستی سوڵتان و ئەمیرو وەزیرەکان خۆراکی پەککەوتەکانی دابین دەکرد و بەتەواوی ڕێزی کەسانی شیاویان دەگرت.

١١. لەبەر ئەوەی زانایان بێچکەی هێزی بڵاو بوەوەن لە جەستەی دەوڵەتدا بۆیە پشتیان بگرەو هانیان بدە ،ئەگەر هەواڵی یەکێکیانت زانی لەشارێکی تردایە ئەوا

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٤٤٢ .

[2] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٤٢٢.

بنێره به شوێنیدا و بیهێنه بۆ لای خۆت و بەماڵ و سامان ڕێزی لێ بنێ: سوڵتان محمدی فاتیح هەستا بە ڕێکخستنی ئەرکەکانی زانایان لە زانکۆگەوەرکاندا، چەند یاسایەکی پێش وەختیشی بۆ دانا و بە نوسراوێکی تایبەتی ئەو یاسایانەی ڕێك خست. گرنگترین پلەکانی مزگەوتە گەورەکان بریتی بوون لە ووتاربێژ، بەرنوێژ، ڕاگر، بانگدەر، کەسانی هەڵبژێردراو بۆ ئەو ئەرکانە هەڵدەستان بە خوێندن لەو خوێندنگە گەورە ئایینیانەی کە سوڵتان و وەزیرەکان بەردەوام کێبڕکێیان دەکرد بۆ دامەزراندن و پێشخستنیان بە کێبڕکێیەکی خانەدانانە.ئەم کاربەدەستە ئایینیانە لە پایتەختدا ڕاستەوخۆ ملکەچ بوون بۆ دەسەڵاتی موفتی. لە هەرێمە گەورەکانیشدا دادوەری سەربازیی ئەبویە جێگری (موفتی)، لە هەرێمە بچکۆلەکانیشدا ئیمامی مزگەوت هەڵدەستا بە هەموو کارە گرنگە ئایینیەکان بە تایبەت لە لادێکاندا. ئەو خوێندنگایانەی کە کارمەندە ئایینیەکانی پێئەگەیاند سێ چین زانستخوازانی هەبوو کە ( سوفتا) نزمترینی بوو لە دوای ئەوە دەستەی ( میعد)ەکان بوو کە لە کاتی دەرچووندا نازناوی (دانشمند) یان (زانا)ی لێدەنرا، بەزرترین چین وانە بێژ (مدرس) بوو. ژمارەی (سوفتا) لەسەردەمی سوڵتان مورادی دووەمدا گەیشتە ٩٠هەزار کەس، زۆرجار ئەوانە ڕۆڵیان هەبوو لە کاروباری دەوڵەتدا[1].

١٢. وریابە، وریابە کەماڵ و سامان و سەرباز لە خۆت بایی نەکەن، دەخیلت بم! هەرگیز ئەهلی شەریعەت لە دەرگاکەت دوور نەخەیتەوە، دەخیلت بم! دڵ نەدەیت بە کارێك کە پێصچەوانەی یاساکانی شەریعەت بێت، چونکە ئایین ئامانی ئێمەیەو هیدایەتی خوا بەرنامەمانەو هەر بەوەیش سەرکەوتوو دەبین: سوڵتان محمدی فاتیح هۆشیاری بە خەلیفەی دوای خۆی ئەدات کە ماڵ و سەرباز لە خۆ بایی نەکەن. مەترسی دورخستنەوەی زانایان و فیقه ناسانی لە فەرمانڕەوا بۆ

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية ، د. علي حسون / ٤٠٥ .

ڕوون کردۆتەوە ، هەروەك ووشیاری دەکاتەوە لە وەی پێچەوانەی حوکمەکانی شەریعەت نەکات چونکە دەبێتە هۆی ڕاکێشانی سەرگەردانی و چەمەسەری بۆ تاك و ئوممەت لە دونیادا و بەهیلاکدا چوون و سزا لە قیامەتدا ، ئاسەواری خراپی دوورکەوتنەوە لەشەرعی خواو حوکمەکانی لە ژیانی ئوممەتدا لە مەیدانەکانی ئایینی و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئابوریدا ڕەنگ ئەداتەوە. نهێنی ووزەو تواناو عیزەت و شکۆداری عوسمانیەکان لەگوێڕایەڵی خواو جێبەجێکردنی حوکمەکانی و پابەند بوون بەشەریعەت و جیهادکردن بۆ خوا و بانگەواز بۆ کردنی دا مۆڵی دابوو. بۆیە محمدی فاتیح بەکوڕەکەی دەڵێت: چونکە ئایین ئامانی ئیمەیە هیدایەتی خوا بەرنامەمانەو هەر بەوەیش سەرکەوتوو دەبین).

١٣. کار بۆ ئەوە ئەم دینە بکە بڵند و بەدەسەلات بێت و ئەهلی ئەم دینە بەڕێزو حورمەت گیراو بن: بەڕاستی سەربڵندکردنی ئەم ئایینە و سەقامگیرکردنی لە زەویدا ئانجامگەلێکی باش لە ژیانی ئوممەت و دەوڵەتدا دێنێتەدی . لەو ئەنجامانەیش پوخت کردنەوەی دەرونە لە خراپەو تاوانەکان . و ڕازاندنەوەیەتی بە چاکە، بۆیە سام دروستکردن بۆ ئایین بەرهەمێکە لە بەرهەمەکانی سەربڵند کردنی ئەم ئایینە و ڕێگرێك دەبێت لە بەردەم تاوان و سەرگیری دەرون لەسەری ، لەبەردەم چاویشدا دەبێتە وێنەیەك کە دەروون والێدەکات لە خوا بترسێت بە هەمیشەیی، هەوەك سەربڵندکردنی ئەم ئایینەو سەقامگیرکردنی شەرعی ئیسلام یەکسانی نێوان سەرپەرشتیارو سەرپەرشتیکراودا دێنێتە دی لە ماف و ئەرکەکانداو دادپەروەری لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بۆ هەموو دانیشتوانەکەی بڵاو دەبێتەوە ، هەروەك جێبەجێکردنی شەریعەت هۆی دابەزینی بەرەکەت و یەکبەدوایەکدا هاتنی بەخششەکانە ، چونکە ڕێگەیەکی سەربەخۆ نیە بۆ پاداشتی خێر وەرگرتنەوە لە ڕۆژی دواییداو ڕێگەیەکی تریش هەبێت بۆ بەرژەوەندیەکانی ژیان لە دونیادا. بەڵکو یەك تاکە ڕێگە هەیە کە دونیاو دواڕۆژی

پیّ چاك دەكریّت و لە جیّبەجیّكردنیدا بەرەكەتی تیّدایە بۆ دەروون و هەستەكان و خۆشیەكانی ژیان. كە ئەویش ڕیّگەی دینە هەندیّ جار بەرەكەت لە شتی كەمدایە ئەگەر چاك سود لیّببینینی. یەكیّك لە ئەنجامەكانی خەڵبژاردنی ئیسلام بریتیە لە بنیادنانی كۆمەڵگەیەكی ئیسلامی كە شانازی بە ئایین و بیرو باوەڕەوە ئەكات بەوەی پابەندە بە ئاكارگەلیّك كە سەرچاوەكەی قورئان و سوننەتی پیّغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، ئەم سەرچاوەیە هەموو كەرەستەپیّویستەكانی تیّدایە بۆ بنیادنانی تاكی موسوڵمان و كۆمەڵی ئیسلامی و ئوممەت و دەوڵەتی موسوڵمان. هەروەك لە ئەنجامەكانی ئەم پەیڕەوكردنە لە ئیسلامدا ئەوەیە ورە بە مرۆڤ ئەدات و دەرونەكان زیندوو ئەكاتەوە بۆ دەست گرتن بە هۆكارەكانی زانست و ژیارو پیّشڕەوتی و پیّشكەوتنەوە كە ئەم شەریعەتە لە بانگەواز بۆ ژیاندا ئەگریّتە خۆی و هەر ئەم شەریعەتە باس و خواستیّكی زۆری دەربارەی ژیانی شارستانیّتی ئەو كۆمەڵگە خراپانە لە خۆگرتووە هەرچی بن و لە هەر كویّ بن[1].

خەڵك پیّویستیان بە زانا خواویستەكان هەیە تا ئایینەكەیانیان فیّر بكەن و دەرونەكانیان لە سەر گویّڕایەڵی خوا پەروەردە بكەن ، بۆیە پیّویستە لەسەر سەركردایەتی ئیسلامی كە ڕیّزیان بگریّت ، چونكە ئەوانن كە حوكمی خواو پیّغەمبەرەكەی واژووی ( تەفسیر) دەقە شەرعیەكان بۆ خەڵك ڕوون دەكەنەوە بەپیّی بنەما گشتیەكانی ئیسلام ، خوا دەفەرمویّت : ﴿ فاسألوا أهل الذكر إن كنتم لا تعلمون ﴾ النحل: ٤٣.

١٤. وریابە سەروەت و سامانی دەوڵەت لە خۆشخۆری و گاڵتەو گەپدا خەرج مەكە یان زیاد لە ڕیّژەی پیّویست لە كارەكە خەرج بكەی، چونكە ماڵ بەفیڕۆدان لە گەورەترین هۆكارەكانی تیاچوونە: ئەم وەسیەتە جیّگری سوڵتان ( ولی

[1] تطبيق الشريعة الإسلامية ، الطريقي / ٦٠، ٦١ .

العهد)ی محمدی فاتیح ڕێنموونی دەکات بۆ دادو میانڕەوی لە خەرجکردندا، ئەم وەسیەتەش ئەو تێگەیشتنەیە لە فەرمانی خوا و پێغەمبەرەکەی کە موسوڵمانان بانگ دەکرێن بۆ میانڕەوی. سوڵتان محمد وای دەبینی کە پێویستە فەرمانڕەوا و دەوڵەتەکەی دورەپەرێزی بکەن لە زیادەڕۆییدا چونکە نیگوێیی خواو پێغەمبەری تێدا بەدی دەکرێت.

مردنی محمدی فاتیح و کاریگەری لەسەر ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات :

لەمانگی ڕەبیعی لە ساڵی ٨٨٦ک -١٤٨١ز . دا سوڵتان محمدی فاتح قوستەنتینیەی بەجێ هێشت بەرەو ئاسیای بچوك کەوتە ڕێ، لە ( إسکدار)دا سوپایەکی تری گەورەی ئامادە کردبوو ، سوڵتان محمد پێش دەرچونی لە ئیستانبول توشی ئازارێکی تەندروستی بوو بەڵام بەهۆی خۆشەویستی زۆری بۆ جیهاد کردن و شەیدایی بەردەوامی بۆ جەنگ و غەزا ، گرنگی پێنەدا، بە سوپاکەیەوە دەرچوو کە خۆی سەرکردایەتی ئەکرد ، عادەتی وابوو کە لە تێوەگلانی نێو گەرمەی جەنگەکاندا شیفاو چارەسەری دەبینی بۆ ئەو نەخۆشیانەی . بەڵام ئەمجارە نەخۆشیەکەی لە سەری توند بوو ، و لەدوای گەیشتنی بە ( إسکدار) نەخۆشیەکەی تەواو قورس بوو لەسەری ، داوای لە پزیشکەکانی کرد بۆ چارەسەر، بەڵام کار لە کار ترازابوو ، نەچارەسەرو نەدەرمان سودی نەبوو ، سوڵتان محمد لە نێو سوپا بێ شومارەید لە ڕۆژی پێنج شەممە ٤ی ربیع الأول ی ٨٨٦ک -٣ی مایۆی ١٤٨١ز دا وەفاتی کرد ، کەلەتەمەتی ٥٢ساڵیدا بوو پاش ئەوەی سی و شتێ ساڵ حوکمی کرد [1].پاش ئەوەی هەواڵی مردنی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوادا بڵاو بوویەوە ، شڵەژانێکی کوت و پڕ ڕویدا کە مەسیحیەت و ئیسلامی هەژاند ، مەسیحیەکان لەنێو خۆشی و

[1] محمد الفاتح / ٣٧٢ .

دڵخۆشبوون و مزگێنیدا ڕۆچوون و لە ڕۆدس هەستان بە ئەنجامدانی نوێژی سوپاس بە ڕزگاربوونیان لەو دوژمنە ترسێنەرە [1].

سوپاکانی دەوڵەتی عوسمانی گەیشتنە باشوری ئیتالیا بۆ ئازادکردنی هەموو ئیتالیا و نوساندنی بە دەوڵەتی عوسمانیەوە ، کە هەواڵی مردنی محمدیان پێگەیشت ، پەژارەیەکی توند و خەفەتێکی قوڵ سەربازەکانی داگرت و عوسمانیەکان ناچار بوون بچنە نێو چەند دانوستانێکەوە( مفاوضات) لەگەڵ پاشای (ناپۆلی) دا تا بەدڵنیابوون لە ژیان و کەلو پەل و چەکیان وەپاشەکشەبکەن ، ڕێکەوتن لەسەر ئەوە کرا . بەلام مەسیحیەکان بەرامبەر بەو پەیمانەیان وەفایان نەبوو و هەندێ لە سەربازە بەجێماوەکانیان گرتن و بەئاسن کەلەبچەیان کردن و بەستنیانەوە [2]. کاتێك هەواڵی مردنی سوڵتان گەیشت بە ڕۆما ، پاپا دڵخۆش بوو و فەرمانی کردنەوەی کەنیسەکانی داو تیایدا نوێژ و ئاهەنگەکان بەرپاکران و جموجوڵە گشتیەکان کۆڵان و ڕێگاکانی داگرتبویەوە کە سرودەکانی سەرکەوتن و خۆشیان دەوتەوەو تۆپیان ئەتەقاند بە ئاسماندا ، ئەو ئاهەنگ و میهرەجانانە لە ڕۆمادا بە درێژایی ٣ ڕۆژ بەردەوام بوو ، بەڕاستی مەسیحیەت بە مردنی محمدی فاتیح لە گەورەترین مەترسیەك ڕزگاری بوو کە هەڕەشەی لێدەکرد [3]. کەس شتێکی لەو لایەنە نەدەزانی کە محمدی فاتیح بەم سوپایەوە بە نیازی کوێ بوو، گومانەکانی خەڵك لەمەدا بۆ چەندین لادەچوو ، ئایا مەبەستی ئەوە بوو بچێت و ڕۆدس بکات ئەو دورگەیەی کە ڕێگرە لەبەر دەم مەسیح پاشادا کە یەکێکە سەرکردەکانی ئەم ؟ یان بۆ لای بە سوپا سەرکەوتووەکەی ئەڕوات لە باکوری ئیتالیادا تا یەك بگرنەوە، و دواتر بکشێن بۆ

---

[1] محمد الفاتح / ٣٧٣ .

[2] محمد الفاتح / ٣٧٣ .

[3] محمد الفاتح / ٣٧٤ .

ڕۆما و باکوری ئیتالیا و فەرەنسا و ئیسپانیا ؟ [1] ئەوە نهێنیەك بوو كە محمدی فاتیح لە دڵی خۆیدا پێچابوویەوە و كەس پەی پێنەدەبرد ، پاشان لە دوای ئەوە مەرگیش ئەم نهێنیەی پێچایەوە. بەڕاستی محمدی فاتح عادەتی ( خوی) وابوو كە پارێزكاری بكات لەو جێگەیەی بۆی ئەڕوات و بەتەواوەتی بیشارێتەوە و دوژمنەكانی لە بێئاگایی و سەرسوڕمانی كارەكەیاندا بهێڵێتەوە و هیچكامیان نەزانن كەكەی گورزی داهاتوویان تێ ئەسرەوێنێ. پاشان ئەو تەواو شاردنەوەیە هەنگاوی كتوپڕی بەپەلەی بەدوادا دەهات ، بەمە بوارێكی بۆ دوژمنەكەی نەدەهێشتەوە تا خۆسازدان و ئامادەسازی بكات. جارێكیان یەك لە (قاضي)ەكانی پرسیاری لێكرد : بەم هەموو سوپاوە نیازت كوێیە ؟ فاتیح وەڵامی دایەوە : ئەگەر تاڵێك لە ڕیشم بەوە بزانێت ئەوا هەڵی دەكێشم و ئەیخەمە نێو ئاگرەوە ..) [2] .

لە ئامانجەكانی فاتیح ئەوەبوو كە هەستێت بە بزاڤی فتوحاتی ئیسلامی لە باشوری ئیتالیاوە بۆ ئەو پەڕەكەی لە باكورەوە ، و بەردەوام بێت لەم فتوحانەدا تا فەرەنسا و ئیسپانیا و ئەو دەوڵەت و گەلانەی لەوێشدا هەن هەموویان ئازاد بكات.

بەڕاستی موسوڵمانان لە جیهانی ئیسلامیدا بەمردنی سوڵتان محمد كاریگەر بوون زۆر خەفەتیان پێ خوارد و موسوڵمانان لە هەموو لایەكەوە بۆی گریان كە سەركەوتنەكانی سەسامی كردبوون و ژیانی موجاهیدە یەكەمەكانی لە پێشینەی ساڵحی ئەم ئوممەتە بۆ گەڕاندنەوە [3] .

---

[1] محمد الفاتح / ٣٧٣ .
[2] محمد الفاتح / ٢٦٠ .
[3] السلطان محمد الفاتح / ١٦٨ .

عبدالحی کوڕی عماد الحنبلی لە مردووەکانی لە ساڵی ٨٨٦ك دا لە مەڕ مردنیەوە دەڵێت: ( ... لە گەورەترین سوڵتانەکانی نەوەی عوسمان بوو ، پاشایەکی بەرزو بەڕێز و هەڵکەوتەو گەورەو شکۆدار بوو . لە هەموو پاشاکان زیاتر جیهادی دەکرد و لەپێشڕەوی و ئیجتیهاددا لە هەموویان بەهێزتربوو ، لە هەمووشیان دامەزراوتر بوو لەڕووی ئازایەتی و هەڵەت بردندا. لەهەموویان زیاتر پشتی بەخوا دەبەست و دەیکردە وەکیلی خۆی ، ئەوبوو دەسەڵاتی نەوەی عوسمانی دامەزراند ، و چەند یاسایەکی بۆ دانان کەوەك ملوانکە کردیە ملی سەردەمەکانی دوای خۆشی. چەند هەڵوێست و جوامێریەکی جوان وتایبەتمەندی بەرز و بڵندی شکۆدارو شوێنەواری بە جێماوی لە نێو لاپەڕەکانی شەوو ڕۆژەکاندا هەیە ، لەگەڵ چەند ئاسەواری بەجێماو کە بەهاتن و ڕۆیشتنی ساڵەکان نایسرێتەوە و چەندین داستانی قارەمانێتی هەیە کە پشتی خاچپەرست و بت پەرستانی تێدا شکاندووە، لە گەورەترینی ئەو داستانانە: فەتحی گەورەی (قوستەنتینیە)یە ، کە تونای بە ناو دەریاو بەناو وشکانیدا گەلە کەشتیەك بەرێتە شارەکە بە سەربازو پاڵەوانەکانیەوە هێرشیان بردە سەر شارەکە و بە ئەسپ و پیاوەکانیانەوە پێشڕەویان دەکرد . توندترین ئابلۆقەی بۆ ماوەی ٥٠ ڕۆژ خستە سەری و گوشاری برد بۆ ئەو بێباوەڕە لادەرانەی کە تیایدا بوون ، شمشێری هەڵکێشراوی خوای لە ڕوودا دەرهێنان و قەڵغانی پتەوی خوایی بەکارهێناو دای لە دەرگای سەرکەوتن و بە سواری ئەسپی ئارامگرتنەوە و لە دەرگای داو چووە ژوورێ و تا خوای گەورە هات بەهانایانەوە و دەرووی لێ کردنەوە لە ڕۆژی ( ٥١)ەمی ئابلۆقەدانەکەیدا ئەستامبولی فەتح کرد کە ڕۆژی چوارشەممە ٢٠ی جمادی الآخرە ساڵی ٨٥٧ بوو ، لە ناو گەورەترین کەنیسەکانی مەسیحیدا نوێژی هەینی کرد کە کەنیسەی ( ئایاسوفیا )بوو کە گومەزیەکی هەبوو و بەگومەزی ئاسمان دەناسراو تیایدا شێوازی پتەوکاری

گومـــەزی هەرەمـــەكانی دوبـــارە دەكـــردەوە و پریـــشكی گـــەورەیی دەدایـــەوەو هەرەمەكانیش پێی نەدەگەیشتن .

لەئەستانبول بناغەیەكی ڕیشەداری بۆ زانست دانا كە ترسی ئەوەی لێ نەكرێ خۆری ئاوابێت، چەند خوێندنگەیەكی دامەزراند لە شێوەی حەوزێكی گەورەدا وەك ( جفان) كە هەشت دەرگای هەبوو ئاسان لێوەی ئەڕۆیشتیتە ژووری، چەند یاسایەكی دانا بۆ ئەو قوتابخانانەكە گونجاو بوو لەگەڵ (شەرع) لەگەڵ (عەقڵیشدا) چونكە كارێكی وای كرد خوای گەورە لە جیاتی ئەو زانستخوازانە پاداشتی بداتەوە و دەستمایەو پاداشتی گەورەی پێبەخشێت، زانستخوازان تووشی هەژاری و كەمدەستی نەبن لە ڕۆژانی خوێندندا و ئەو هاوكاریانەی بۆ قوتابیان ئاهی هێنایەوە بە بەریاندا و لە دوای ئەوەیش چەند قۆناغێكی دانا كە پلە پلە بۆی سەردەكەوتن و بۆ بەدیهێنان و پێگەیشتنی هەنگاویان ئەنا تا بگەنە كامەرانی لە دونیا و بیكەنە هۆكاری پەیوەندی بۆ كامەرانی ڕۆژی دواییش ، هەروەها زانا گەورەكانی لەوپەڕی شارەكانەوە ڕادەكێشا و بەخششی بەسەردا دەڕژاندن و چاكەی زۆری لەگەڵیاندا دەكرد، وەك (مەولانا عەلی قوشجی) و (طوسي) و (گۆرانی) و زانایانی تری ئیسلام و پیاو ماقوڵانی نێو خەڵك ، بەمە ئەستانبوڵ بۆیان بوو بەدایكی جیهان و كانی شانازی و سەربەرزی . ئەهلی كەماڵی لە هەموو هونەرو بەشەكان تیایدا كۆ بویەوە. تائێستاش زاناكانی ئەو شارە گەورەترین زاناكانی ئیسلامن ، پیشەگەرەكانیشی تایبەتمەندترین هەڵكوتەی نێو خەڵكین ، سەرپەرشتیارانی دەوڵەتەكەیشی خاوەنی كامەرانی بێوێنە بوون ، ئەم پیاوە پیرۆز كۆچكردووە زنجیرەیەك منەت و سەروەری هەیە لە گەردنی موسوڵماناندا بەگشتی و زانا بەڕێزەكان بە تایبەتی كە نایەتە ژمارە[1].

---

[1] شذرات الذهب : ٧/ ٣٤٥ .

ڕەحمەت و لێبودن و ڕەزامەندی خوا بڕژێ بەسەر سوڵتان محمدی فاتیحدا و باسی لە نێو چاکسازاندا نەمر و شکۆدار بێت .

## بەشی چوارەم

## سوڵتانە بەهێزەکانی دوای محمدی فاتح

### باسی یەکەم : سوڵتان بایەزیدی دووەم

پاش مردنی سوڵتان محمدی فاتح ، بایەزیدی دووەمی کوڕی (٨٨٦-٩١٨ك ) لە وولاتدا دەسەلاتی گرتەدەست . بایەزید سوڵتانێکی نەرمونیان بوو ، بەخۆشویستنی ئەدەب پێگەشتبوو . لە زانستی شەریعەتی ئیسلامدا شارەزابوو ، هۆگری زانستی فەلەك بوو ، لە چاککردنی تۆڕی ڕێگەو پردەکاندا بۆ پێکەوە بەستنەوەی هەرێمەکان بەیەکترەوە ، پشتی دەبەست بە تەکنیککارە شارەزاکانی یۆنانی و بولغاری [1] .

یەکەم : ململانێ لەگەڵ براکەیدا لەسەر دەسەلات :

میر(جەم) کاتێك هەواڵی مردنی باوکی پێگەیشت ، ئەو کات ئەو لە بروسە دادەنیشت ، توانی وەك هەر سوڵتانێکی دەوڵەتی عوسمانی ،متمانەی دانیشتوانی ئەو ناوچانە بەدەست بهێنێت کە لە ژێر دەسەلاتیدابوون ، پاش ئەوەی لە (بروسە) و دەوروبەریدا کاروباری کەوتە دەست ، ناردی بەدوای بایەزیدی برایدا تا داوای گرێبەستی ئاشتی لێ بکات و پێشنیاری ئەوەشی کرد کە ئەو دەست لە دەسەلات هەڵبگرێ بۆ ئەم، سوڵتان بایەزیدیش بەرپەرچی ئەوەی دایەوە ، چونکە باوکی وەسیەتی دەسەلات گرتنەدەستی لە دوای خۆی بۆ ئەم کردبوو ، بەلام میر (جەم) بەوە قەناعەتی نەکرد ، بۆیە جارێکی تر پێشنیاری بۆ بایەزیدی برای کرد کە دەوڵەتی عوسمانی بکەنە دووبەش ، بەشی ئەوروپی بۆ بایەزید ، و بەشی ئاسیای بۆ ئەو ، بەلام دووبارە بایەزید هەر

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٥٠ .

له بنەڕەتەوە بیرۆکەی دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی بەرپەرچ دایەوە ، چونکە دواتر ئەوە دەبێتە هۆی لەناوچوونی ئەو دەوڵەتەی کە پێشینان لە پێناو بنیادنان و یەکخستنیدا چەندین شەونخونیان کێشاوە ،لەسەر ئەوە سوربوو کە دەوڵەت بە یەکگرتوویی لە ژێر دەسەلاتی خۆیدا بمێنێتەوە ، بۆیە سوپایەکی گەورەی سازداو بەرێی خست بۆ (بروسە)و هێرشی کردەسەری (جەم) هەلات بۆلای ( قابتای ) سولتانی مەمالیکەکان لەمیسر [١] . ئەویش بەخێرهاتنی کردو ڕێزی لێگرت و بە هەموو جۆرە پێویستیەکی ماڵ و سامان یارمەتی دا تا لەگەڵ خێزانەکەیدا سەفەر بکات بۆ حیجاز بەمەبەستی بەجێهێنانی فەریزەی حەج .

پاش ئەوەی کە لە خاکەپیرۆزەکان گەڕایەوە بۆ میسر ، سولتان بایەزید نوێنەری نارد بۆلای و پێی ووت : ( تۆ کە ئەمڕۆ لە حەجدا گەڕاویتەتەوەهەستاویت بە پێویستیە ئایینیەکانت ، دەی ئیتر بۆچی هەوڵی شتە دنیایەکان دەدەیت ! ؟ خۆت ئەزانی کە دەسەلات بەفەرمانی خوا بەشی منە*، ئیدی بۆچی ڕێگری لە خواستی خوا دەکەیت ؟ ) ئەویش بەم قسەیە وەلامی دایەوە : ئایا ئەوە دادپەروەریە کە تۆ لەسەر بێشکەی حەسانەوەو خۆشگوزەرانی ڕاکشێیت و ڕۆژەکانت بەئاسودەیی و چێژەوە بەریتەسەر ، منیش بێبەش بم لەو چێژو حەسانەوەیە و سەرم لەسەر دڕك دابنێم ؟ [٢]

دوای ئەمە (جەم) هەستا بە پەیوەندی کردن بەگەورە شوێنکەوتوەکانیەوە لە (ئەنادۆڵ)دا و دژ بە بایەزید هانی دان و لەگەڵ شوێنکەوتوەکانیدا پێشڕەوی کرد تا تەختی خیلافەت داگیر بکات، بەلام نشوستی هێنا و جارێکی تریش هەوڵی دایەوە ،بەلام دیسان نوشوستیەکیتریشی بەسەردا هات.

---

[1] قيام الدولة العثمانية / ٥٧ .

[2] تأريخ سلاطين آل عثمان ، يوسف آساف / ٦٣– ٦٥ .

(جەم) پەنای برد بۆ (ڕۆدس) کە سوارەکانی (قدیس یوحەننای) تێدا بوون و لەگەڵ سەرۆکی سوارەکاندا گرێبەستێکی بەستا بەڵام لەژێرفشاری بایەزیدداگرێبەستەکەی هەڵوەشانەوە ، (جەم) لە دورگەی ڕۆدسدا بەدیل گیرا ، سوارەکانی (قدیس یوحەننا) بەم بارمتە گرینگە چەند ئیمتیازێکیان جارێك لە بایەزیدی دووەم و جارێکیش لە هەوادارانی (جەم) لە قاهیرەدا بەدەست هێنا ، پاش ئەوەی ماڵ و سامانێکی زۆریان بەدەست کەوت هاتن ئەم بارمتەیان فرۆشت بە پاپا (أنوستی هەشتەم)، کاتێك کە ئەو پاپایە مرد ، لە دوای خۆی (جەم)ی بەجێ هێشت بۆ ئەسکەندەری شەشەم ، بەڵام ئەسکەندەر زۆر (جەم)ی ڕانەگرت و کوشتی، لە مەشدا بایەزیدی دووەمی تۆمەتبار کرد کە ڕزگاری بوو بوو لەمەترسی براکەی[1].

دووەم : هەڵوێستی سوڵتان بایەزید لەگەڵ مەمالیکدا :

سنوری شامدا چەندین شەڕ لە نێوان عوسمانی و مەمالیکەکاندا ڕوویدا ، هەرچەندە ئەمە نەگەیشتە ئاستی هەڕەشەی ڕوودانی جەنگێکی هەمەلایەنە لە نێوانیاندا ، هەرچەندە بووە هۆی ئەوەی بێ متمانەیی باڵ بکێشێ بەسەر هەردوو لادا ئەمە وایکرد گفتوگۆی ئاشتی لەساڵی ١٤٩١ ز دا سەر هەڵبدات لە نێوانیاندا،هەرچەندە (قیبتای) سوڵتانی مەمالیکەکان چەند ترسێکی لێ نیشت لە ئەگەری بەرپابوونی جەنگێکی فراوانی نێوان ئەو و دەوڵەتی عوسمانیدا .

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٤٩، ٥٠ .

* مەبەستی بایەزید ئەوەیە کە وەك بڕیاری یاسای شەریعەت: هەر کەس موسوڵمانان هەڵیان بژاردو کردیانە خەلیفە و بەیعەتیان پێدا ئەوە ئیتر خواش بەوە ڕازیە، ئیمامی عەلی ئەفەرمووێت:(فان اجتمعوا على رجل وسموه اماما كان ذلك لله رضى) واتا: کە موسوڵمانان ڕێککەوتن لەسەر کەسێك و ناویان نا ئیمام (خەلیفە) ئەوە خواش بەوە ڕازییە.(وەرگێڕ:ن).

ئیدی بەهۆی هەستکردنی بەو هێزە بێت کە عوسمانیەکان هەیانبوو ، یان بەهۆی سەرقاڵ بوونی بەشێکی گەورەی هێزەکانی خۆی بێت لە بەرەنگاری پورتوگالیەکاندا .بەڵام سوڵتانی عوسمانی بایەزیدی دووەم ئەو مەترسیانەی ڕەواندەوە و هەستا بە ناردنی نوێنەرێك لە لایەن خۆیەوە بۆ لای سوڵتانی مەمالیکەکان لە ساڵی ١٤٩١ ز دا کە کلیلی ئەو قەڵایانەی پێبوو کە عوسمانیەکان لەسەر سنور دەستیان بەسەردا گرتبوو ، ئەم کارە لە لایەن سوڵتانی مەمالیکیەوە پێشوازی لێکرا ، بۆیە هەستا بەبەردانی دیلە عوسمانیەکان . ئەم سیاسەتە ئاشتیخوازیەی بایەزید ئاماژەیەك بوو بۆ گرێبەستی ئاشتی نێوان عوسمانی و مەمالیکەکان ، کە لەو ساڵەوە -١٤٩١ز- ئەو ئاشتیە تاساڵی ١٥١٢ز بەردەوام بوو کە کۆتایی سەردەمی سوڵتان بایەزیدی دووەمە . ئەو ڕووداوەیش مکووڕی سوڵتان بایەزید دوپات دەکاتەوە لەسەر سیاسەتی ئاشتی لەگەڵ موسوڵماناندا [1].

سێیەم : سوڵتان بایەزیدو دیبلۆماسیەتی ڕۆژئاوایی :

بەدرێژایی سەردەمی سوڵتان بایەزید ، ئاڵای جیهاد بەردەوام بەرزو بڵند بوو ، بەمە دوژمنان زانیان کە ناتوانن لە جەنگی نیزامیدا بەرەنگاری هێزە جیهادیەکان ببنەوە تیایدا چاوچنۆکیەکانیان بهێننەدی . بۆیە پەنایان بردە بەر ئاکارێکی تر کە لە ژێر ناوی پەیوەندیە دیبلۆماسیەکاندا دایانپۆشیبوو ، تا وەك خۆرە ئێسکی ئوممەت بکرۆژن و کۆمەڵگەی ئیسلامی و لە ناوەوە بڕوخێنن .

لەسەردەمی سوڵتان بایەزیددا و لەساڵی ٨٩٨ك -١٤٩٢ز ، یەکەم باڵوێزی ڕووسی گەیشتە ئەستانبوڵ .

بەڕاستی گەیشتنی باڵوێزی ڕووسی لە ساڵی ١٤٩٢ز لەسەردەمی دوق موسکو ( إیڤان) کە بەدوایدا پتەوی و جێگیری و چەندین ئیمتیازی بەخشی بە دۆق

---

[1] قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين / ٦٦.

موسکو و کەسانی تری کە دەرگای لەبەردەم دوژمنانی ئوممەتی ئیسلامیدا کردەوە بۆ دەرخستنی کەم و کورتی و ناسینی خاڵە بێهێزەکانی و کارکردن بۆ گەندەڵکردن و پیلانگێڕان لە دژی و بێهێزکردنی دەسەڵاتی بیروباوەڕ لە دەرونی نەوەکانیدا .

هەر لەسەردەمی بایەزیدی دووەمدا لە ٨٨٦ ك دا دوق موسکو ئیڤانی سێیەم توانی میرنشینی موسکو لە دەستی موسوڵمانە عوسمانیەکان بسەنێتەوە ، لەسەر حیسابی هەرێمە ئیسلامیەکان دەستی کردە فراوانخوازی[1]. ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە سوڵتان بایەزید هەڵوێستێکی لاوازی لەبەردەم ئەم بارودۆخانەدا بە خەرج دابێت بەڵکو مەسەلەکە ئەوە بوو کە دەوڵەت بە هەڵ و مەرجێکی نالەباردا ئەڕۆییشت و لە شەڕێکی گەورەدابوو لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا لە نیمچە دورگەی ئەنادۆڵ و هەموو ئەوروپای ڕۆژهەلاتدا و بەوانەشەوە سەرقاڵ بوو[2].

چوارەم: وەستانی لەگەڵ موسوڵمانانی ئەندەلوسدا :

لەگەڵ سەرهەڵدانی سەردەمە نوێکاندا ، ڕووداوەکان لە نیمچە (دورگەی ئیبریە)دا گەشەیان سەند ، ئیدی تەنیا کاری ئیسپانیا بوو بە یەکخستنی خاکەکانی و داڕنینی ئەو شوێنانەی تر کە هێشتا موسوڵمانەکانی تیایدا مابوون ، بەتایبەت دوای هاوسەرگیری (ئیزابیلای) شاژنی (قشتالە) لەگەڵ (فردیناندی) پاشای (ئارگۆن) دا کە کەوتە ژێر یەك دەسەڵاتەوە ، ئیدی میرنشینە یەکگرتووەکانی ئیسپانیای تۆزێك پێش ڕووخانی (غەرناتە) کەوتنە پاکتاوکردنی بوونی ئیسلامی لە هەموو ئیسپانیادا بۆ ئەوەی لەوەو دوا خۆیان یەکلا بکەنەوە و

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٤٩-٥٠ .

[2] الدولة العثمانية –د. جمال عبدالهادي / ٥٠ .

گرنگیان بخەنە سەر تاکە میرنشینی ئیسلامی کە غەرناتەیە ئەو میرنشینەی کە هێمایەك بوو بۆ مەملەکەتی ئیسلامی ئەو کاتە[1].

ئیسپانیا توندترین و نارەترین ڕێورەسمی سەپاند بەسەر موسوڵمانەکاندا بۆ ئەوەی موسڵمانان بکەنە مەسیحی و پەتی خنکان تەند بکەن لە ملی موسوڵمانەکاندا تا لە نیمچە دورگەی ئیبریە کۆچیان پێ بکەن.

لە ئەنجامی ئەمەدا موسوڵمانە ( مورسکیەکان) پەنایان بردە بەر چەندین شۆڕش و ڕاپەڕین لە زۆرینەی شارە ئیسپانیەکان و ئەو شوێنانەی کەکەمینەی موسوڵمانانی تێدا بوون ، بەتایبەت (غەرناتە)و (بلنسیە)، ئەو شۆڕشانەیش بەبێ هیچ سۆزو ڕەحمێك سەرکوت کران لەلایەن ئەو دەسەلاتە ئیسپانیانەوە کە وەك هۆکارێك بۆ قوڵکردنەوەی بێزاری و کینەی دژ بە موسوڵمانان بەکار دەهێنران . لە لایەکی ترەوە سروشتی و ئاسایی بوو کە ئەو موسوڵمانە مورسکیەکان وەك ڕزگارکەرێك بڕواننە پاشایانی موسوڵمانانی لە ڕۆژهەلات و لە ڕۆژئاوادا. چەند جار نوێنەر و نامەیان بۆ ناردن تا کاربکەن بۆ ڕزگار کردنیان لەو ستەمکارانەی کە ئازاریان دەدان بەتایبەت پیاوانی کەنیسەوئەو دەزگا و دیوانانەی دانرابوون بۆ بە دوادا چوون و لێکۆڵینەوە، کە بەردەوام خراپەو گەندەڵیان دەنایەوە و هەموو جۆرەکانی سزاو خۆسەپاندنیان بۆ خۆیان حەلاڵ کردبوو دەرهەق بە موسلمانان[2].

هەواڵەکانی ئەندەلوس گەیشتنە ڕۆژهەلات و جیهانی ئیسلامی هەژاند[3].

ئەشرەف پاشا (پاشای موسوڵمانەکان) چەند شاندێکی نارد بۆ لای پاپا و پاشا

---

1 جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس / ١٢٥ .

2 رسالة من مسلمي غرناطة للسلطان ، سليمان التميمي ، مجلة المغربية ، العدد : ٣ ، س: ٣٨

3 خلاصة تأريخ الأندلس ، شكيب ارسلان / ٢١٣ .

مەسیحیەکان و بەئاگای هێنانەوە کە ئەو مەسیحیانەی لە ژێر چاودێری ئەودان بەئازادی دەیگوزەرێنن ، لە کاتێکدا نەوەکانی ئایینەکەی ئەم لەشارە ئیسپانیەکاندا بە دەست توند ترین جۆرەکانی ستەمەوە دەناڵێنن ، هەروەها هەڕەشەی کارکردنی بە سیاسەتی تەندو تیژی تۆڵە سەندنەوە کرد لە بەرپرسە مەسیحیەکان ئەگەر بێت و پاشای (قشتاڵە) و (ئارگۆن) لەو دوژمنایەتیەو وەدەرنانی موسوڵمانان لە خاکەکانیان دەست هەڵنەگرن هەموو ئەو زەویانەیشیان کە داگیرکرابوون نەگێرنەوە بۆیان، بەڵام پاپا و دووپاشا کاسۆلیکیەکە وەڵامیان بۆ ئەو هەڕەشەیە نەبوو کە لەلایەن ئەشرەف پاشاوە لێیان کرا ، وەبەردەوام نەخشەکانیان جێبەجێ دەکرد لە پاکتاو کردنی بوونی ئیسلامی لە ئەندەلوس دا .

بەردەوامیش نامەی سکاڵا و هانا بردن بۆ سوڵتان بایەزیدی دووەم ئەهات بۆی تا ئەم نامەیەی پێگەیشت: ( جەنابی شکۆدار ، خوا کامەرانی بکات و بەرزی بکاتەوەو سنوری هەرێمەکەی درێژتر بکاتەوە و پشتیوانانی سەربخات و دوژمنانی ڕیسوا بکات . جەنابی گەورەمان پایەی دونیاو ئایینمان ، سوڵتانی پاشای سەرخەری دین و دونیا ، سوڵتانی ئیسلام و موسوڵمانان و سەرکوتکەری دوژمنە بێباوەڕەکانی خوا ، پەناگەی ئیسلام و سەرخەری ئایینی پێغەمبەرمان محمد (صلى الله عليه وسلم) و زیندوکەرەوەی دادپەروەری ، دادگەری ستەملێکراو لەو کەسەی کە ستەمی لێکردووە ، پاشای عەرەب و عەجەم و تورك و دەیلەم ، سایەی خوا لە زەویدا کە هەڵدەستێت بە سوننەت و فەرزەکانی ، پاشای هەردوو ووشکانی و سوڵتانی دوو دەریاکە ، پارێزەری شتە پیرۆزەکانی موسوڵمانان سەرکوتکەری بێباوەڕان ، گەورەو پایەی ژیانمان و فریادڕەسمان کە موڵکەکەی بەردەوام پشتیوانی هەیە و هاوڕێی سەرکەوتنە ، ئەو سوڵتانەی کە شاکارەکان و شوێنەوارەکانی هەمیشە زیندوون وسەروەری و کارە پڕ شانازیەکانی بە ناوبانگە تەنیا ئەو خەریکی ئەو چاکانەیە کە لە ڕۆژی دواییدا

پاداشتی زیادی لەسەر وەردەگرێت، لە دونیایشدا سوپاسگوزاری جوان و ڕێك و سەرکەوتنی دەبێت ، بەردەوام خۆسازدانە بەرزو بڵندەکانی بە فەزڵەکانی جیهادەوە تایبەتمەندن ، ڕووتە نەلەڕووی دوژمنانی ئایینداو خراپەو توندی لە ڕووی دڵانی بەرەبەیان و چاکدا نابێت ، زەمانی چەك کە خوازیاری ئەو کۆگایانەن کە لە دونشینگانەدان کە تێیدا چاکەکان وابەستەی جیاخوازی جەستەکانن لە ڕۆحەکان ، شوێنپێ هەڵگری ڕێگای پێشینە براوەکانە لەڕۆژی دواییدا بە ڕەزامەندی و گوێڕایەڵی خوا .[1])

لە نێو نامەکەدا چەند دێڕێکی قەسیدەیەك هەیە کە پیاهەڵدانی خاوەنەکەی بوو بۆ سوڵتان بایەزیدی سێیەمی سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی ، و دوعا ئەکات بۆ بەردەوامی و مانەوەی دەوڵەتی عوسمانی، کە دەڵێ:

سلام كريم دائم متجدد — اخص به مولاي خير خليفة
سلام على مولاي ذي المجد والعلا — ومن البس الكفار ثوب المذلة
سلام على من وسع الله ملكه — وايده بالنصر في كل وجهة
سلام على مولاي من دار ملكه — قسطنطنية اكرم بها مدينة
سلام على من زين الله ملكه — بجند واتراك من اهل الرعاية
سلام عليكم شرف الله قدركم — وزادكم ملكا على كل ملة
سلام على القاضي ومن كان مثله — من العلماء الاكرمين الاجلة
سلام على اهل الديانة والتقى — ومن كان ذا رأي من اهل المشورة

پاشان قەسیدەکە باسی ئەو بارودۆخەی دەکات کە موسوڵمانانی پیرو ئافرەت تێیدا ئەژیان بەرەو ڕووی ئەو ناموس شکێنی ئەبوونەوە و ئایینەکەیان تووشی نارەحەتی ئەبوو، ئەوەتا دەڵێ:

سلام عليكم من عبيد تخلفوا — باندلس بالغرب في ارض غربة
احاط بهم بحر من الردم زاخر — وبحر عميق ذو ظلام ولجة
سلام عليكم من عبيد اصابهم — مصاب عظيم يا لها من مصيبة
سلام عليكم من شيوخ تمزقت — شيوخهم بالنتف من بعد عزة
سلام عليكم من وجوه تكشفت — على جملة الاعلاج من بعد سترة
سلام عليكم من بنات عوائق — يسوقهم اللباط قهرا لخلوة

---

[1] ازهار الرياض في اخبار الرياض/التلمساني(١٠٨/١,١٠٩).

سلام عليكم من عجائز اكرهت على اكل خنزير ولحم جيفة

**دوای ئـەو وەسـفە قەسـیدەکە ڕێڕەوێکـی تـر دەگرێتـەخۆ بـەوەی هەسـتی موسوڵمانان بەرامبەر بە دەوڵـەتی عوسمـانی ڕوون دەکاتـەوە و سکاڵا پێشکەش بە سوڵتان دەکات و دەڵێ:**

نقبل نحن الكل ارض بساطكم وندعو لكم بالخير في كل ساعة

ادام الاله ملككم وحياتكم وعافاكم من كل سوء ومحنة

وايدكم بالنصر والظفر بالعدا واسكنكم دار الرضا والكرامة

شكونا لكم مولاي ما قد اصابا من الضر والبلوى وعظم الرزية

**پاشان قەسیدەکە دەگەڕێتەوە بۆ ڕاڤەی چەرمەسەریەکان وئەو گۆڕانانەی بەسەر ئاییندا هاتووە و هەندێ لەو بابەتانە دەڵێ:**

غدرنا ونصرنا وبدل ديننا ظلمنا وعوملنا بكل قبيحة

وكنا على دين النبي محمد نقاتل عمال الصليب بنية

ونلقى امورا في الجهاد عظيمة بقتل واسرثم جوع وقلة

فجائت علينا الروم من كل جانب بسيل عظيم جملة بعد جملة

ومالوا علينا كالجراد بجمعهم بجد وعزم من خيول وعدة

فكنا بطول الدهر نلقى جموعهم فنقتل فيها فرقة بعد فرقة

وفرسانها تزداد في كل ساعة وفرساننا في حال نقص وقلة

فلما ضعفنا خيموا في بلادنا ومالوا علينا بلدة بعد بلدة

وجاءوا بانفاض عظام كثيرة تهدم اسوار البلاد المنيعة

وشدوا عليها الحصار بقوة شهورا واياما بجد وعزمة

فلما تفانت خيلنا ورجالنا ولم نر من اخواننا من اغاثة

وقلت لنا الاقوات واشتد حالنا احطناهم بالكره خوف الفضيحة

وخوفا على ابنائنا وبناتنا من ان يؤسروا او يقتلوا شر قتل

على ان نكون مثل من كان قبلنا من الدجن من اهل البلاد القديمة

**پاشان قەسیدەکە باس لەوە دەکات لەوەها حاڵەتێکدا پێویستداچی بکرێ،ئەبێت یان ملکەچ بکرێت بۆ ئەو بارودۆخەی پێشوو، یان ئەبێ هەموو ڕەو بکەن، جا فریا ئەکەوێت و ئەڵێت:**

ونبقى على اذاننا وصلاتنا ولانتركن شيئا من امر الشريعة

ومن شاء منا الجر جاز مؤمنا بما شاء من مال الى ارض عدوة

الى غير ذلك من شروط كثيرة تزيد على الخممسين شرطا بخمسة
فقال لنا سلطانهم وكبيرهم لكم ما شرطتم كاملا بالزيادة
فكونوا على اموالكم ودياركم كما كنتم من قبل دون اذية

**هەرچەندە دووپاشا كاسۆليكيەكە وەفايان بۆ پەيماننامەكە نەبوو و دەستيان كرد بە ناپاكى لەڕووى موسوڵماناندا قەسيدەكە ئەڵێ:**

فلما دخلنا تحت عقل امامهم بدا بدرهم فينا بنقص العزيمة
وخان عهودا كان قد غرّنا بها ونصرنا كرها بعنف وسطوة
وكل كتاب كان في امر ديننا ففي النار القوه بهزءة وحقرة
ولم يتركوا فيها كتابا لمسلم ولامصحفا يخلى به للقراءة
ومن صام او صلى يعلم حاله ففي النار يلقوه كل حالة
ومن لم يجيء منا لموضع كفرهم يعاقبه اللبّاط شر العقوبة
ويلطم خديه ويأخذ ماله ويجعله في السجن في سوء حالة
وفي رمضان يفسدون صيامنا بأكل وشرب مرة بعد مرة

**بەو شێوەيە مەسيحيەت بەردەوام بوو لە ئابڕوو بردن و زەليل كردنى موسوڵمانان هەر لە دەستخستنەنێو پەرستشى موسوڵمانان تا قسە ووتنيان بە ئيسلام و قەسيدەكە ئەڵێ:**

وقد امرونا ان نسب نبينا ولا نذكرنه في رخاء وشدة
وقد سمعوا قوما يغنون باسمه فادركهم منهم اليم المضرة
وعاقبهم حكامهم وولاتهم بضربوتغريم وسجن وذلة
ومن جاءه الموت ولم يحضر الذي يذكره لم يدفنوه بحيلة
ويترك في زبل طريحا مجدلا كمثل حمار ميّت او بهيمة

**، پاش ئەوە پاشا كاثوليكيەكان دەستيان كرد بە تواندنەوەى كۆمەڵگاى ئيسلامى ، ئەويش بە گۆڕينى پێناسى ئيسلامى قەسيدەكە ئەڵێ:**

وقد بدلت اسمائنا وتحولت بغير رضا منا وغير ارادة
فاه على تبديل دين محمد بدين كلاب الروم شر البديلة
واه على اسمائنا حين بدلت باسماء اعلاج من اهل القيادة
واه على ابنائنا وبناتنا يروحون للباط في كل غدوة
يعلمهم كفرا وزورا وفرية ولا يقدر ان يمنعوهم بحيلة
واه على تلك المساجد سورت مزابل للكفار بعد الطهارة

واه على تلك الصوامع علقت نواقيسهم فيها نضير الشهادة
واه على تلك البلاد وحسنها لقد اهدمت بالكفر اعظم ظلمة
وصارت لعباد الصليب معاقلا وقد امنوا فيها وقوع الاغارة
وصرنا عبيدا لا اسارى فنفتدي ولا مسلمين منطقهم الشهادة

**دواتر قەسیدەکە ئاماژە دەکات بە داخوازی فریاکەوتن لە سوڵتان بۆ فریاکەوتن و ڕزگارکردنیان لەو چەرمەسەریە وەك ئەڵێ:**

فلو ابصرت عيناك ما صار حالنا اليه لجادت للدموع الغزيرة
فياويلنا يا بؤس ما قد اصابنا من الذل والبلوى وثوب المذلة
سألناك يا مولاي لله ربنا وبالمصطفى المختار خير البرية
عسى تنظروا فيناوفيما اصابنا لعل اله العرش يأتي برحمة
فقولك مسموع وامرك نافذ وما قلت من شيء يكون بسرعة
ودين النصارى اصله تحت حكمكم ومن ثم يأتيهم الى كل كورة
فبالله يامولاي منوا بفضلكم علينا برأي او كلام بحجة
فانتم اولوا الافضال والمجد والعلا وغوث عباد الله في كل افة

**،پاشان موسوڵمانەکان داوا لە سوڵتان بایەزید دەکەن تا بکەوێتە نێوان ئەوان و پاپای ڕۆما. چەنکە سەڵتان قورسایی سیاسیی خۆی لای پاپا لە ئەوروپا هەیبوو قەسیدەکە ئەڵێ:**

فسل بابهم اعني المقيم برومة بماذا اجازوا الغدر بعد الامانة
وما لهم مالوا علينا بغدرهم بغير اذى منا وغير جريمة
وجنسهم المقلوب في حفظ ديننا واحسن ملوك بوفاء اجلة
ولم يخرجوا من دينهم وديارهم ولا نالهم غدر ولا هتك حرمة
ومن يعط عهدا ثم يغدر بعهده فذلك حرام الفعل في كل ملة
ولاسيما ان الملوك فانه قبيح شنيع لا يجوز بوجهة
وقد بلغ المكتوب منكم اليهم فلم يعلموا منه جميعا بكلمة
وما زادهم اعتداءا وجرئة علينا واقداما بكل مساءة

**، موسوڵمانەکان ئاماژەیان بەوە دەکرد کە کەوتنە نێوان پاشاکانی میسر لەلای مەسیحیەکان هیچی لە مەسەلەکان نەگۆڕی، بەڵکو کەلەڕەقیی و لاساریانی زیاتر کرد ، و دەڵێن:**

وقد بلغت ارسال مصرا اليهم وما نالهم غدرا ولا هتك حرمة

وقالوا بتلك الرسل عنا باننا　　　رضينا بدين الكفر من غير قهرة
وساقوا عقود الزور ممن اطاعهم　　　وواالله ما نرضى بتلك الشهادة
لقد كذبوا في قولهم وكلامهم　　　علينا بهذا القول اكبر فرية
ولكن خوف القتل والحرق رونا　　　نقول كما قالوه من غير نية
ودين رسول ما زال عندنا　　　وتوحيدنا لله في كل لحظة

**، دوای ئەوە موسوڵمانەکان ئەوە بۆ سوڵتان بایەزید ڕوون دەکەنەوە کە لەگەڵ ئەمەیشدا هێشتا ئەوان پابەندن بە ئاییینی ئیسلامەوە ، ئەمەیشیان بەوقسەیان دووپات دەکردەوە کە دەڵێن:**

وواالله ما نرضى بتبديل ديننا　　　ولا بالذي قالوا من امر الثلاثة
واين زعموا انا رضينا بدينهم　　　بغير اذى منهم لنا ومساءة
فسل وحرا عنهم كيف اصبحوا　　　اسارى وقتلى تحت ذل ومهنة
وسل بلفيقا عن قضية امرها　　　لقد مزّقوا بالسيف من بعد حسرة
وضيافة بالسيف مزّق اهلها　　　كذا فعلوا ايضا باهل البشرة
واندرش بالنار احرق اهلها بجامعهم　　　صاروا جميعا كفحمة

**موسوڵمانەکان بەردەوام داوای یارمەتیان لە دەوڵەتی عوسمانی دووبارە دەکەنەوە و لە دوای پێشکەشکردنی ئەو سکاڵایە کە دەڵێت :**

فها نحن يامولاي نشكو اليكم　　　فهذا الذي نلناه من شر فرقة
عسى ديننا يبقى لنا وصلاتنا　　　كما عاهدونا قبل نقل العزيمة
والا فيجلونا جميعا عن ارضهم　　　باموالنا للغرب دار الاحبة
فاجلاؤنا خير لنا من مقامنا　　　على الكفر في عزّ على غير ملّة
فهذا الذي نرجوه من عز جاهكم　　　ومن علمكم تقضي لنا كل حاجة
ومن عندكم نرجو زوال كروبنا　　　وما نالنا من سوء حال وذلة
فانتم بحمدالله خير ملوكنا　　　وعزتكم تعلوا على كل عزة
فنسأل مولانا دوام حياتكم　　　بملك وعز في سرور ونعمة
وتهدين اوطان ونصر على العدا　　　وكثرة اجناد ومال وثروة
وثم سلام الله قلته ورحمة　　　عليكم مدى الايام في كل ساعة

**ئەمە ئەو نامەیە بوو کە موسوڵمانانی ئەندەلوس ناردیان وداوای کۆمەکیان ئەکرد بۆ ئەوەی هەڵوێستەکەی پێ ڕزگار بکەن، سوڵتان بایەزیدیش گیرۆدەی دەست ئەو ڕێگریانەبوو کە ڕێگەیان دەگرت لە ناردنی موجاهیدان بۆ ئەوێ .**

زیاد لەوەیش کێشەی ناکۆکی لەگەڵ میر (جەم)ی برای لەسەر دەسەڵات ، لەگەڵ ئەو شوێنەوارانەیش کە ئەو کێشەیە نایەوە [1] لەگەڵ پاپای ڕۆما و هەندێ لە دەوڵەتە ئەوروپییەکان و هێرشی پۆڵەندیەکان بۆسەر مالدیفیا و جەنگەکانی لە ترانسلڤانیا و مەجەڕ و بوندوقیە و سازدانی هاوپەیمانی نوێی خاچپەرستی لە دژی دەوڵەتی عوسمانی لە لایەن پاپا جویلسی دووەم و کۆماری بوندوقییە و مەجەڕو فەرەنساوە . کە لە ئەنجامی ئەمەدا هاوپەیمانی لە ئاڕاستەکردنی هێزە عوسمانیەکانی لێکەوتەوە بۆ ئەو ناوچانە . لەگەڵ ئەمەیشدا سوڵتان بایەزید هەستا بە پێشکەش کردنی یارمەتی و هودنەی ئاگربەستی لەگەڵ سوڵتانی گەورەی مەمالیکەکاندا بەست بۆ یەکخستنی هەوڵەکان لە پێناو یارمەتیدانی (غەرناتە) و گەیشتنە ڕێکەوتنێك کە دەبوو سوڵتان بایەزید گەلە کەشتیەك بنێرێت بۆ سەر کەنارەکانی (سەقلیە) لەبەر ئەوەی کە پاشکۆی میر نشینی ئیسپانی بوو ، سوڵتانی مەمالیکەکانیش چەندین هێرشی تر ئامادە بکات بۆ سەر ناوچەی ئەفریقی [2]. هەر بەو جۆرە سوڵتان بایەزید کەشتیگەلێکی عوسمانی نارد و کەوتنەڕێ بۆ کەنارەکانی ئیسپانیا، سەرکردایەتیەکەیشی دایە دەست کەمال ڕایس کە ترس و بیم و سامی خستە نێو کەشتیگەلە مەسیحیەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی پانزەهەمدا [3].

هەروەك چۆن سوڵتان بایەزید موجاهیدەکانی لە کەنار دەریادا هان دەدا بەدەستپێکردنی گرنگی بۆیان و بوونی سۆزی لە ڕوویاندا ، موجاهیدە عوسمانیەکانیش دەستیان کرد بە جووڵەو بەڕێکەوتن بۆ بەدەمەوە چوونی برا موسوڵمانەکانیان ، لە هەمان کاتدا زۆرێك لە دەستکەوتی ئاسانیان بەدەستکەوت

---

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية مفترى عليها :٢/٩٠٣ .

[2] علاقات بين الشرق والغرب ، عبدالقادر أحمد / ٢٥٦ .

[3] خلاصة تأريخ الأندلس ، شكيب ارسلان / ٢١٣ .

لـه مەسیحیەکانەوە، بەو جۆرە ژمارەیەکی زۆری موجاهیدە موسولْمانەکان لـه کاتی دامەزراندنی کەشتیگەلی عوسمانیدا پێراگەشتن و چوونە ژێر خزمەتیەوە ، دوای ئەوە عوسمانیەکان لە ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاستدا هێزی دەریایی نوێیان بەکار دەهێنا بە هانی ئەم موجاهیدانەوە[1]. ئەمەیش ئەوە بوو کە سولْتان بایەزیدی دووەم توانی بیکات .

بێگومان هەڵسوکەوتە نەنگەکانی (جەم) بوو بەهۆکارێك کە بزوتنەوەی فراوانخوازی هەرێمی لەنگ کردو تەگەرەی خستە بەردەم کارە دروستکەرانی سولْتان بایەزید ، بەمە گرنگی و کاری سولْتان گۆڕا بۆ گەڕان بەدوای هەواڵی براکەی و کارکردن لە سەر ڕزگار بوون لێی بەهەموو هۆکارێك[2].

بەگشتی بایەزید توانی لەساڵی ١٤٩٩ز دا لە کەنداوی (لبانتو) لە وولاتی یۆنان سەرکەوتنێکی دەریایی بەدەست بهێنێت بەسەر (بوندوقیەکاندا) ، لەساڵی داهاتوویشدا شاری (لبانتو)ی گرتەدەست ، کە عوسمانیەکان دەستیان گرت بەسەر ناوچەی بوندوقیەکان لە یۆناندا ، پاپا ئەسکەندەری شەشەم لەسەر داوای بوندوقیەکان هەستا بە دروستکردنی هاوپەیمانێتیەك لە دژی عوسمانیەکان کە پێکهاتبوو فەرەنساو ئیسپانیا ، ئیدی عوسمانیەکان ڕوو بەڕووی هێرشی هەرسێ گەلە کەشتی فەرنسا و ئیسپانیا و پاپا بوونەوە .

دەوڵەتی عوسمانی توانی کە ڕێککەوتنێك ببەستێت لەگەڵ بوندوقیەکاندا[3]، بایەزید زۆر خوازیاری ئاشتی بوو ، پێشتر پەیوەندیە دیبلۆماسیەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئەوروپا تەنیا لەگەڵ ئەو شارانەدا بوو کە کەوتبونە سەر سنورەکانی دەولْتی عوسمانی، بەلاّم پاشتر ڕووی لە پاپایی و فلۆرەنساو ناپۆلی

---

[1] في اصول التأريخ العثماني / ٧٤ .

[2] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ٥٢ .

[3] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ٥٢ .

و فەرەنسادا كردوو ڕێكەوتنێكی لەگەڵ بوندوقیەكان و مەجەڕدا بەست ، بایەزید گرنگی بە داڕشتنەوەی پێگە گشتی و كارە خێر خوازیەكان ئەدا، مزگەوت و خوێندنگەو بینای بەرزو شوێنی میوانداری و تەكیەو نەخۆشخانەكانی بۆ نەخۆشەكان و حەمام و پردەكانی كردەوە ، بۆ موفتی وئەو زانایانەی لە پلەی ئەودا بوون لەسەردەمی ئەمدا موچەی هەموو ساڵێك ١٠ هەزاری عوسمانی بڕیەوە ، بۆ هەموو مامۆستایەكی خوێندنگە سوڵتانیەكانیش لە نێوان ٧ بۆ ١٢هەزاری عوسمانی ، هەروەها بۆ شێخەكانی ڕێبازە سۆفیەكان و موریدەكانیشیان لەگەڵ ( زوایا ) كان هەریەكەو بەپێی پلەكەی ، ئەوەیش بڕیارو فرمانێكی لە كارنەكەوتوو و بەردەوام بوو ، خەڵكی مەككەو مەدینەی زۆر خۆش دەویست [1] .

لەسەردەمی ئەودا چەند بومەلەرزەیەكی گەورە لە قوستەنتینیەدا ڕوویاندا كە ١٠٧٠ماڵی كاول كرد لەگەڵ ١٠٩ مزگەوت و لایەكی گەورەی كۆشك و شوراكانی شارەیش ، جۆگە ئاویەكانی لەكار خست و دەریا هەڵزنی بۆ سەر وشكانی ، شەپۆلەكانی ئاوەكە سەركەوتن بەسەر شورەكانیدا ، ئەو بومەلەرزەیش ڕۆژانە ئەهاتەوەو ٤٥ ڕۆژی خایاند ، كاتێك كاروبارەكان هێور بوونەوە ، سوڵتان ١٥ هەزار لە كرێكارەكانی خستەكار بۆ چاككردنەوەی ئەوەی كاول بوو بوو [2] .

بایەزید ٧٦ساڵ ژیا و پیاوێك بوو بنیادێكی بەهێزی هەبوو ، لوتی چەماوەو قژی ڕەش و سروشتی نەرم و نیان بوو، زانستەكانی خۆش دەویستن و دەرسی نەئەفەوتاند، شاعیرێكی هونەرمەند و خاكی و لە خواترس بوو ، دەڕۆژەی كۆتایی ڕەمەزانی بە پەرستش و زیكرو گوێڕایەڵی بەسەر دەبرد ، لەوەشاندنی

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ٥٣ .

[2] تأريخ سلاطين آل عثمان ، يوسف آساف / ٦٦ .

تیرو ڕمدا هەڵکەوتەبوو ، خۆی بەشداری شەڕەکانی دەکرد[1]. بڕۆیشتایەتە هەر شوێنێك تۆزی سەر جل و بەرگەکەی ناو شەڕەکانی تێدا کۆئەکردەوە و هەڵی دەگرتن، کە کاتی سەرەمەرگی هات ، فرمانی کرد ئەو تەپوتۆزەیان هێنا و خشتێکی بچوکیان لێ دروست کرد ،پاشان فەرمانی کرد کە لەگەڵیدا بخرێتە نێو گۆڕەکەی و لەژێر ڕوومەتی ڕاستیدا دایبنێن ، ئەو کارەیشی بۆیە کرد مەبەستی بوو ئەو ناوەڕۆکی فەرموودەیەی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسام) بێنێتەدی کە دەفەرمووێت: ( من اغبرّت قدماه في سبيل الله حرم الله عليه النار ).

واتە: هەرکەس پێکانی لە پێناوی خوادا تۆزاوی بووبن ئەوا خوا ئاگری لەسەر حەرام دەکات .

ماوەی دەسەڵاتەکەی ٣١ساڵ بوو و چەند ڕۆژێکی کەم نەبێت[2].

سوڵتان بایەزید زانابوو لە زانستە عەرەبی و ئیسلامیەکاندا ، وەك چۆن لە گەردون ناسیدا شارەزابوو ، گرنگی دەدا بە ئەدەب و ڕێزی شاعیر و زانایانی دەگرت ، موچەی تایبەتی بۆ زیاتر لە ٣٠ شاعیرو زانا بڕیەوە، خۆیشی شاعیرێکی چاك بوو ، شیعرەکانی بەوە دەناسرانەوە کە زۆر قوڵ هەستکردن بە گەورەیی و توانای خوایان پێوە دیاربوو ، چەند شیعرێکیشی هەبوو لە حیکمەتدا ، وەسیەتی دەکرد بە هەستانەوە لەخەوی بێئاگایی و ڕوانین لە جوانی ئەو سروشتەی کە خوا دایهێنابوو ، لەو بارەیەوە ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| إستيقظ من نوم الغفلة | وانظر الى زينة في الأشجار |
| انظر الى قدرة الله الحق | انظر الى رونق الأزهار |
| وافتح عينيك لتشاهد | حياة الأرض بعدالممات [3] |

---

[1] تأريخ سلاطين آل عثمان ، يوسف آساف / ٦٦ .

[2] تأريخ سلاطين آل عثمان ، القرماني / ٣٦ .

[3] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٢٤٩ .

واتـه : لەخـەوی بێئاگـایی ڕابـەو سـەیری جـوانی درەختـەکان بکـە ، سـەیری دەسـەڵاتی خـوای باڵادەسـت بکـە ، سـەیری ڕەونـەقی گوڵـەکان بکـە ، چاوەکانت بکەرەوە تا ژیانەوەی زەوی پاش مردنی ببینیت .

لـە ١٨ی سـەفەری ٩١٨ك دا هاوکـات بـە ٢٥ی ئـەبریلی ١٥١٢ ز فـەرمانڕەوایی دەوڵـەتی بەجێهێشت بۆ کوڕەکـەی کە سەلیمی یەکەمە (٩١٨ -٩٢٦ك ، ١٥١٢- ١٥١٩ ) ئەوەیش بە پاڵپشتی سوپا ، کەوای بۆ دەڕوانی کە جێگـەی هیوایە لە زیندوو کردنەوەی چالاکی جەنگی بۆ دەوڵەتی عوسمانی بەشێوەیەکی فراوانتر و پاڵنان بە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازیەکانەوە بۆ پێشەوە ، بۆیە سوپا پەلەی کرد لە لابردتی باوکیداو دانانی سەلیمی کوڕی لە شوێنەکەیدا [1].

سـوڵتان بایەزیـد لەکاتێکـدا بـۆ دیمتوقـە دەچـوو وەفـاتی کـرد و تەرمەکـەی گوازرایەوە بۆ ئەستانبوڵ و لە پاڵ مزگەوتەپیرۆزەکەیدا نێژرا [2].

## باسی دووەم

## سوڵتان سەلیمی یەکەم

## ( ٩١٨ -٩٢٦ك ، ١٥١٢-١٥٢٠ ز )

سـوڵتان سـەلیمی یەکـەم لـە سـاڵی ٩١٨ ك دا کورسـی دەسـەڵاتی عوسمـانی گرتەدەسـت و هـەر لەسـەرەتای فەرمانڕەواییـەوە خواسـتی بـۆ پاکتـاوکردنی نەیارەکانی بەدەرکەوت ، تەنانەت ئەگەر نەوەکانی خۆیشی بن ، حەزی لە ئەدەب و شیعری فارسی و مێژوو بوو ، لەگەڵ ئەو دڵڕەقیەیدا کە هەیبوو بەڵام حەزی لە هاوەڵایـەتی پیـاوانی زانـست بـوو و مێـژوونووس و شـاعیرەکانی لـە مەیـدانی جەنگدا دەکـردە هـاودەمی خـۆی تـا قۆناغـەکانی جەنگـەکان تۆمـار بکـەن و ئـەو قەسیدە شیعریانە بهۆننەوە کە سەروەریەکانی ڕابردوو دەگێڕنەوە .

---

[1] قيام الدولة العثمانية / ٥٨ .

[2] تأريخ سلاطين آل عثمان ، يوسف آساف / ٦٦ .

کاتێك سوڵتان سەلیمی یەکەم چووە سەر کورسی دەسەڵاتی عوسمانی ، دەوڵەتی عوسمانی توشی دوو ڕیانەیەك هات، ئایا لەم بارودۆخەو ئاستەدا کە دەوڵەتێکی بەلقانی ئەنادۆڵی فراوانە بمێنێتەوە؟ یان بەردەوام بێت لە فراوانخوازی هەرێمی لە ئەوروپادا ؟ یان ڕووبکاتەوە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی؟
ڕاستی ئەوەیە کە سوڵتان سەلیمی یەکەم گۆڕانکاریەکی ڕیشەیی لە سیاسەتی جیهادی دەوڵەتی عوسمانیدا هێنایە دی ، لەسەردەمی ئەودا کشانی عوسمانی بەرەو ڕۆژئاوای ئەوروپی ڕاوەستا یان نزیك بوو لەوە ڕابوەستێت ، دەوڵەتی عوسمانی ئاڕاستەی خۆی گۆڕی بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، هەندێ لە مێژوو نوسان ئەو هۆکارانە باس دەکەن کەبووە هۆی گۆڕانی سیاسەتی عوسمانی، لەوانە :
١ . تێربوونی سەربازی عوسمانی لە ئەوروپا . خاوەنی ئەم ڕایە وا دەبینێت کە دەوڵەتی عوسمانی لە کۆتایی سەدەی ١٥ دا گەیشتە پلەی تێر بوون لە بزاڤە ئازادیخوزییەکانیدا لە ڕۆژئاوادا، بۆیە دەبوو لەسەرەتاکانی سەدەی ١٦دا بگەڕێت بەدوای مەیدانگەلێکی تری نوێدا بۆ چالاکی و فراوانخوازی . ئەو ڕایەش دژی ڕاستیە ، چونکە بزاڤی ئازادیخوازی عوسمانیەکان بە تەواوی لە بەرەی ڕۆژئاواییەوە هەر بەردەوام بوو، هەرچەندە مەڵبەندی قورسایی لە فراوانخوازی عوسمانیدا بە یەکجارەکی لە ڕۆژئاواوە گوازرایەوە بەرەو ڕۆژهەڵات[١] بە هۆکاری تێربوون نەبوو ، هەروەك هەندێ لە سەرچاوەکان کە شارەزای بارودۆخی ڕاستی نین دەیڵێن .
٢ . بزاڤی دەوڵەتی عوسمانی بەرەو ڕۆژهەڵات لە پێناو ڕزگار کردنی جیهانی ئیسلامی بوو بەشێوەیەکی گشتی و پیرۆزیە ئیسلامیەکان بە شێوەیەکی تایبەتی لە بەرامبەر ئەو بزاڤە نوێیەی خاچپەرستیدا کە لە لایەن ئیسپانیا (لە دەریای

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٢٦ .

ناوەڕاست) و پورتوگالیەکان (لە زەریای هیندی و دەریای عەرەب و دەریای سوور)ەوە دەستی پێکردبوو، ئەمانە کە گەمارۆی جیهانی ئیسلامیان دابوو ئابلۆقەیەکی ئابووریان سەپاندبوو بە سەریدا تا قوتدانی ئاسان بێت[1].

٣ . سیاسەتی دەوڵەتی سەفەوی لە ئێران و پەیوەند بە هەوڵی فراوانکردنی دەسەلاتی مەزهەبی شیعە لە عێراق و ئاسیای بچوکدا کە پاڵی نا بەدەوڵەتی عوسمانیەوە بۆ دەرچوون بەرەو ڕۆژهەلاتی عەرەبی بۆ پاریزگاری لە ئاسیای بچوك بە شێوەیەکی تایبەت و جیهانی سوننی بەشێوەیەکی گشتی[2].

سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان سەلیمدا لەسەر ئەم بنەمایانە دەڕۆیشت: لەناوبردنی دەوڵەتی سەفەوی شیعە، دەوڵەتی مەملوکی بخاتە سەر خۆی و پارێزگاری لە زەویە پیرۆزەکانبکات و گەلەکەشتیەکەی بورتوغالیەکان ڕاوبنێت و پاڵپشتی بزوتنەوەی جیهادی دەریایش بکات لە باکوری ئەفریقیدا بۆ ئەوەی ئیسپانیەکان لە ناو بەرن و بەردەوامی دان بە جیهادی دەوڵەت لە ڕۆژهەلاتی ئەوروپادا .

یەکەم : جەنگان لەگەڵ دەوڵەتی سەفەوی شیعەدا :

ڕەگەزی سەفەویەکان دەگەڕێتەوە بۆ شێخ صفی الدین ئەردەبیلی (٦٥٠-٧٣٥ك ، ١٢٥٢-١٣٣٤ز) کە باپیرەگەورەی شا ئیسماعیلی سەفەوی دامەزرێنەری دەوڵەتی سەفەویە .

ژمارەیەکی زۆر لە شوێنکەوتوە موریدەکان لە دەوری شێخ صفی الدین ئەردەبیلی کۆبوونەوە دایانە پاڵی لە ئەنجامی ئەو بانگەوازە بەهێزەی هەیانبوو، ئەو بانگەشە کاریگەرەی کە خۆی و شوێنکەوتوەکانی لە سۆفی و دەروێشەکان

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ٢٦ .

[2] ئیسلام لە ئاسیا / ٢٤٠ .

پێی هەستان و توانیان بانگەوازەکەیان نەك لە تەنیا ئێران بەڵکوو لە هەندێ لە هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی و عێراق و وڵاتی شامدا بڵاو بکەنەوە[1].
شێخ سفی الدین توانی لە ڕێگەی یەکێك لەو دەستانەی کە سەرکردایەتی دەکرد ڕێگەی خۆی لە کۆمەڵگەی ئێرانیدا ببڕێت بچێتە ناویانەوە هەوەك توانی پشتگیری و متمانەی زۆربەی ئێرانیەکان بەدەست بهێنێ کە بویە هۆی ئەو دەستەیە یەکجاری ببنە شیعە و بانگەواز بۆ مەزهەبی شیعە بکەن لە کاتێکدا وا بڵاوی بکەنەوە کە شێخ صفی الدین و منداڵەکانی لە نەوەی (ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو تالیب)ن ڕەزای خوای لێبێت، هەر بۆیە ڕەوایە بۆیان داوای دەسەڵات بکەن.
صفی الدین پەنای برد بۆ ( توقیەکردن، بەڕواڵەت ئەیوت من (سوونی مەزهەب)م و لەسەر ڕێڕەوی ئیمام شافیعیم، کە ڕێگە لەبەر دەم ئەم بانگەوازی بە شیعەکردنە والابوو بۆیان یەکێك لە کوڕەزاکانی ئەم صفی الدینە بە ناوی (شا ئیسماعیل)ە بانگەوازی شیعەگەرایی ڕاگەیاند، نەك هەر ئەوە بەڵکو سوڵتان (حیدر) بە ئاشکرا لەناو خەڵکدا ئەیووت من لە نەوەی (ئیمام موسای کاظم)م و ئیتر بەو شێوەیە دەوڵەتی صەفەوی لە ئێراندا خۆی وا ئەناساند کە دەوڵەتی ئالو بەیتی پێغەمبەری خوایە (صلی الله علیه وسلم).
ئیسماعیلی سەفەوی سوور بوو لەسەر سەپاندنی مەزهەبی شیعە بەسەر گەلەکەیدا و وەك مەزهەبێکی ڕەسمی دەوڵەتی ڕاگەیاند لە ئێراندا و بەزەبری چەك هەموو نەیارەکانی لەناو برد، سەفەویەکان توانیان ژمارەیەکی بێشومار لە شوێنکەوتەو موریدەکان بەدەوری خۆیاندا کۆبکەنەوە و بانگەشەی بەهێزی شیعە ڕابگەیەنن چ لەناو پاشماوەکانی ( عەبیدیە) فاتیمیەکانی میسردا و چ لەناو ئیسماعیلیەکان و چ لەناو خودی بنەماڵەی سەفەویداو بەواتە توانیان

---

[1] بڕوانە (الإسلام في آسیا الوسطی منذ الغزو المغولي) د.محمد نصر،/ص٢٤٠ .

مەزهەبی شیعە لە ئێراندا جێ بکەنەوە دوای ئەوە ئێران بەگشتی لە مەزهەبی سوننیەوە ببنە شیعە مەزهەب کە مەزهەبی ڕەسمی دەوڵەتە نوێیەکە بوو.
پەرچەکرداری توند هەبوو بەتایبەت کە زۆرینەی دانیشتوانی شارە سەرەکیەکان لە ئێراندا وەك تەبریز لە سوننەکان بوون ، بەڵکوو خودی زاناکانی شیعە لە مەزهەبەکە دەترسان بەرەفزکردنی سوننە و ڕاگەیاندنی یاخیبوونیان دژ بە فەرمانڕەوای سەفەوی شیعە مەزهەب .
شائیسماعیلی سەفەوی هەوڵێکی زۆری خستەگەڕ بۆ سەپاندنی مەزهەبی شیعە لە ئێراندا ، جا لەگەڵ ئامادەبوونی ڕۆحی بۆ بانگەوازی شیعەدا لە نێو ئەو دانیشتوانە ئێرانیانەدا کە زۆربەیان سوننەبوون ، ئیسماعیلی سەفەوی وای دەبینی کە ئەو هەڵوێستە بە لەکارخستنی ڕەگەزی شیعەکان ئاراستە بکات بۆ ئەو مەبەستە ، لەمەدا پشتگیری و سەرخستنێکی بەدی کردو ئەو گەرموگوڕیەی سەرخستنەیانی بەهەل قۆستەوە و پاڵی پێوە نان بۆ لێدانی بەرەنگارەکانی و دووپات کردنەوەی مەزهەبەکەی لەئێراندا .
شائیسماعیلی سەفەوی پەنای برد بۆ سیاسەتێکی لێهاتوانە لە دوپاتکردنەوەی بانگەوازە سیاسی و مەزهەبیەکەی ، هات پشتی بە هۆزەکانی تورلباش بەست کە لە بنەڕەتدا تورکن تاکوو ببێتەناوکێك بۆ هێزە سەربازیەکەی ، ئەویش ئەوەیە کە کۆمەڵگەی ئێرانی لەو کاتەدا لە چەند ڕەگەزێکی جۆراو جۆر پێك هاتبوو کە لە ئەندامی چەندین پەلاماری سەربازی یەك بەدوای یەکدا بۆ ئەو وڵاتە دروست بووبوو، کە زۆر زەحمەت بوو هەموو ئەو ڕەگەزانە لە بۆتەیەکدا بتوێنێتەوە.
بەڕاستی ئیسماعیلی سەفەوی توانی بەو سیاسەتەی ئەو ووزە مەزهەبیەی لە لای ئەو ڕەگەزانەوە هەبوو لەکار بخات تا ببێتە تەوەرەیەك و بە دەوریدا کۆببنەوەو دەستە هەڵکەوتەکانی تر تیایدا بتوێنەوە و شوێنی خۆی وەك

یەکبونێکی مەزهەبی جێگیر بکات و ئەوەی بۆ بێتە دی کە قەوارەیەکی سیاسی نوێی لەسەر بنیاد بنێت [1].

بەڕاستی ئیسماعیلی سەفەوی زۆر دڕندە بوو لە جەنگەکانیدا و بێبەزەیی بوو بەرامبەر نەیارانی، بەتایبەت ئەگەر ئەو نەیارانەی لە ئەهلی سوننە بونایە ( .. هەموو میرنشینەکانی عەجەمی داگیرکردو هەموو کەسێکی دەکوشت کە بەسەریاندا زاڵ ببوایە و هەموو ئەو ماڵ و سامانەی کە تالانی کرد دابەشی دەکرد بەنێو هاوەڵەکانیدا و هیچی لێ هەڵنەدەگرت ، لەوانەی کە دەستی بەسەریدا گرت: تەبریز و ئازەربایجان و بەغداد و عێراقی عەجەم و عێراقی عەرەب و خوراسان بوو ئەم شا ئیسماعیلە گەیشتە ئەوەی خەریك بوو بانگەشەی خوایەتی بکات و سەربازەکانی کڕنوشیان بۆ دەبرد و بەفەرمانەکانی ئەو کاریان دەکرد ، قوتبەدینی حەنەفی لە ( الأعلام ) دا دەڵێت : شا ئیسماعیل زیاتر لەیەك ملیۆن کەسی کوشت بەمەرجێك لە سەردەمی نەفامی و لە ئیسلامی و لە گەلە پێشوەکانی تریشدا هەرگیز ئەوەندە خەڵك نەکوژراوە کە شائیسماعیل کوشتونی ، ژمارەیەکی زۆریشی لە زانا گەورەکانیش کوشت بە جۆرێك کە لە وڵاتانی عەجەمدا کەسێك لە ئەهلی زانست نەمایەوەو هەموو کتێب و قورئانەکانیشی سوتاند ، ئەو بە پێچەوانەی باوباپیری زۆر توندڕەو بوو لە شیعەگەریدا، لەوێنەی بەگەورە نواندنی لەلایەن هاوەڵەکانیەوە ئەوەبوو کە جارێك دەستەسڕێك لە دەستی کەوتە ناو دەریاوە ، کە لەسەر شاخێکی بەرزدا بوو لەسەر ئەو دەریایەدا ، خۆی بەدوای ئەو دەستەسڕەدا فڕێدایە ناوی دەریاکە کە هەزار کەس لە مورییدەکانی پێش ئەو خۆیان هەڵدایە ناو ئاوەکەو هەموویان تیاچوون و خنکان ، ئەوان خواوەندێتیان تێدا دەبینیەوە ، قوتب ئەمەش دەگێڕێتەوە ، هیچ

[1] الإسلام في آسيا ../ ٢٤٢، ٢٤٣ .

ئالأیەکی شکستی نەخواردووە تاکوو سوڵتان سەلیم (کە پێشتر باسمان دەکرد) جەنگی لەگەڵدا کردو تێکی شکاند)[1].

شا ئیسماعیل بەڕاستی سەرکردایەتی مەزهەبی شیعەی ئەکرد و سوور بوو لەسەر بڵاو کردنەوەی شیعەگەری، بانگەوازەکەی گەیشتە هەرێمە پاشکۆکانی دەوڵەتی عوسمانی ، ئەو بیرۆکەو بیروباوەڕانەی کە لەو هەرێمانەدا بڵاو دەبوویەوە ، کۆمەڵگەی سوننی عوسمانی ڕەفزی دەکردەوە ، لەو بیروباوەڕە خراپانەیان هەیانبوو بەکافردانانی صەحابەکان ، نەفرین کردن لە بەرەی یەکەمی موسوڵمانان وەك، بڕوایان وایە کە قورئانی پیرۆز تەحریف کراوە و چەندین بیرۆکەو بیرو باوەڕی تر . جا سروشتی بوو کە سوڵتان سەلیمی سەرکردەی دەوڵەتی سوننی بەرەنگاری ئەو بانگەوازە ببێتەوە و ڕێگری لێبکات ، لە کۆبوونەوەیەکی گەورە پیاوانی دەوڵەت و دادوەرو پیاوانی سیاسەتمەدار و دەستەی زانایاندا لەساڵی ٩٢٠ ك ، ١٥١٤ز دا ڕایگەیاند کە ئێران بە حکومەتە شیعەگەرایی مەزهەبە شیعەکەیەوە مەترسیەکی گەوەر دەنوێنن نەك بەتەنها لەسەر دەوڵەتی عوسمانی بەڵکو لەسەر هەموو جیهانی ئیسلامی ، بۆیە جیهادی پیرۆزی دژ بە دەوڵەتی سەفەوی بەباش دەزانی ، ڕای سوڵتان سەلیم ڕای زاناکانی ئەهلی سوننە بوو لە دەوڵەتدا، شائیسماعیل کاتێك چووە نێو عێراق هەستا بەسەربڕینی موسوڵمانە سوننیەکان بە شێوەیەکی فراوان و مزگەوت و گۆڕستانەکانیانی کاول کرد ، دڕندەیی و مەترسی شیعە لە ساڵانی کۆتایی سەردەمی سوڵتان بایەزیددا زۆر زیادی کرد ، کاتێك سوڵتان سەلیم دەسەڵاتی گرتە دەست ، دەزگا ئاسایشیەکانی دەوڵەتی عوسمانی هەستان بە ئابڵوقەدانی ئەو شیعانەی کە هەواداری شائیسماعیل و نەیارانی دەوڵەتی عوسمانی بوون.

---

[1] البدر الطالع : ١/ ٢٧١ .

پاشان هەستا بە پاکتاوکردنی شوێنکەوتوانی شائیسماعیل و ڕێژەیەکی زۆری پشتیوانانی شائیسماعیلی لە ئەنادۆڵ بەدیل گرتن و لە سێدارەی دان ، پاشان هەستا بەهێرش کردنە سەر خودی ئیسماعیل ، جا چەند نامەیەکی زەبر لە نێوانیاندا گوازرایەوە ، بەو شێوەیەی کە ئەیخواست.

سوڵتان سەلیم نامەیەکی بۆ شا ئیسماعیلی سەفەوی نوسی کە تیایدا ئەڵێت: ( .. ئەی ئیسماعیل ، زاناکانمان و پیاوانی یاسا بڕیاری کوشتنیان بەسەر تۆدا داوە لەبەر ئەوەی کە پاشگەزبوویتەتەوە، لەسەر هەموو موسوڵمانێکی ڕاستیشیان پێویست کردووە کە بەرگری لە ئاینەکەی بکات و ئەم بیدعەیەی لە دیندا تۆو شوێنکەوتووە گەمژەکانت دروستتان کردووە،وردو خاش بکەن، بەڵام پێش ئەوە جەنگ لەگەڵ ئێوەدا دەست پێ بکات، ئێمە بانگتان دەکەین بۆ هاتنەوە بۆ نێو ئایینی ڕاستەقیینە پێش ئەوەی شمشێرەکانمان دەربکێشین ، لەمەش زیاتر پێویستە لەسەرت کە ئەو هەرێمانە چۆڵ بکەیت کە لە ئێمەت داگیر کردووە ، ئەو کات ئێمە ئامادەین دڵنیاییت بکەینەوە کە ژیانت پارێزراوە... ) [1].

وەڵامی شائیسماعیل بۆ ئەو نامەیە ئەوەبوو کە هەندێ تلیاکی بەدیاری بۆ نارد و بۆی نووسی: ئەو پێی وایە کە ئەو دەقەی لەژێر کاریگەری مادەی سەرخۆشکەردا نوسیوە [2].

---

[1] جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس / ٤٣٥ .

[2] جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس / ٤٣٥ .

*داری دەسەڵات: بە عەرەبی پێی ئەوترێت (صولجان) کە هەر میرو شایەك لە شێوەیەکی تایبەتیدا دروستی دەکەن، هەیە وەك سەری مار دروستی دەکات و هەیە وەك گۆچان و هەیە وەك شێوەی ئەستێرە، سەیری المنجد/وشەی(صلج) بکە (وەرگێڕ:ن).

هەروەها لە دەقێکی تری هاوشێوەدا هاتووە کە : ( ... من سەرکردەو سوڵتانی ئالی عوسمانم ، من گەورەی سوارچاکانی ئەم سەردەمەم ، من خاوەن دلێری و توندی ئەفریدۆنی خاوەن شکۆداری ئەسکەندەر و هاوشێوەی دادوەری کیسرام من بت شکێن و لەناوبەری دوژمنانی ئیسلامم . من ترسی زۆرداران و سامی ستەمکارو خۆ بەزل زانەکانم، من ئەوەم کە پاشا دکتاتۆرو خۆسەپێنەکان لە بەردەمیدا سەرشۆڕ دەبن. من ئەو کەسەم کە داری دەسەڵات*لەتاو هێزی من فەرمانڕەوایی دەکات و ملکەچ ئەبێت بۆم، من پاشای جوامێر سوڵتان سەلیم خانی کوڕی سوڵتانی گەورە موراد خانم ، ئایا بە ئاماژەیەك بۆ تۆ ئەی شا ئیسماعیل سەردانەوێنم؟! ئەی سەرکردەی سەربازە فارسیەکان !! جا کەمن یەکێکم لە موسوڵمانە تایبەتیەکان و سوڵتانی کۆمەڵی باوەڕدارانی یەکتاپەرست و سوننی ڕێباز... ئەوە بزانە ئەو زاناو فیقە ناسانەی کە لە نێوانماندان فەتوایان داوە بەپێویستی کوشتنی خۆت و جەنگان لە دژی گەلەکەت ، بۆیە هەقمانە کە زۆر چالاکانە شەڕ بکەین دژ بە تۆو خەڵکی لە شەڕەنگێزی تۆ ڕزگار بکەین)[1] .

سوڵتان سەلیمی یەکەم ئامادەبوو بۆ جەنگێکی درێژخایەنی یەکلاکەرەوە لەگەڵ دەوڵەتی سەفەویدا ، کە گەیشتە ئەستانبول و دەستیکرد بە لەشکر کێشی بەرەو خاکی ئێران، (اسکرتراى) بەجێهێشت، نامەیەکی هەڕەشەی نارده سەر شا ئیسماعیلی سەفەوی و تیایدا دەڵێت: ( بەناوی خوای گەورەومیهرەبان خوای گەورەی دەسەڵاتداری زانا دەفەرموێت : ( إن الدين عندالله الإسلام ) آل عمران: ١٩

﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾﴾ آل عمران : ٨٥ ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰا۟ لَا يَقُومُونَ

---

[1] فتح العثمانيين عدن / ١١٣ .

إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَـٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوٓا۟
إِنَّمَا ٱلْبَيْعُ مِثْلُ ٱلرِّبَوٰا۟ ۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟ ۚ فَمَن جَآءَهُۥ
مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَمَنْ عَادَ
فَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٢٧٥﴾»البقـــــرة : ٢٧٥.

خوايه بمانكەيتە ڕێنمونی كەرونەمانكەيتە ئەوانەی سەریان لێ شێواوە و سەر لە خەڵكیش ئەشێوێنن درودی خواش لەسەر گەورەی جیهان محمدی پێغەمبەری هەڵبژێردراوو هەموو یارانی بێت)[1].

هەر لەو كاتەدا سوڵتان سەلیمی یەكەم نامەیەكیشی نارد بۆ یەكێك لە ئەندامانی خێزانی (ئاق قۆیونلو) كە (محمدی كوڕی فەرەج شابەگ) بوو و هانی دا بۆ ئەوەی بەشداری بكات لەگەڵیدا لە جەنگی ئیسماعیلی سەفەویدا ، جەنگی هەواڵگری لە نێوان هەردوو سەربازگە جەنگاوەریەكەدا دەستی پێكرد ، بەلام سوڵتان سەلیمی یەكەم دەستی كرد بە سەرەقا هەڵچنین بۆ چوونە نێو جەنگەكەوە و لە بیابانی (یاس جمن) لە نزیكی ئازەربایجان سەربازگەی داكوتا، ئەو هەواڵانەی كە هەواڵگرەكانی (یاس جمن) پێیان دەگەیاند دەیانووت شا ئیسماعیلی سەفەوی نیازی شەڕی نیەو دوای ئەخات بۆ وەرزی زستان تا سوپای عوسمانیەكان لە تاوسەرماو برسێتی لەناوبچن[2].

[1] الإسلام في آسيا / ٢٤٦ .
[2] الإسلام في آسيا / ٢٤٦ .

سوڵتان سەلیمی یەکەم پەلەی دەکرد لە بزواندنی ململانێی نێوان خۆی و شا ئیسماعیل ، بۆیە بۆ جاری دووەم کەسێکی نارد بۆ لای و لەگەڵ نامەکەدا خەرقەیەك* و تەزبیحێك و کەشکۆڵێك و دارێکی بۆ نارد هێمای دەستەی درویشانە مەبەستی ئەوەبوو ڕەچەڵەکی خۆی و بنەماڵەی سەفەوی بەبیر بهێنێتەوە کە ناتوانێت لە جەنگدا خۆی ڕابگرێت، لەگەڵ ئەمەدا شا ئیسماعیل وەڵامی نامەکەی بەوە دایەوە کە ئەو خواستی هودنەکردن و نوێکردنەوەی پەیوەندیەی دۆستانە و ئاشتیانەی هەیە لە نێوان هەردوو دەوڵەتەکەدا، سەلیم ئەمەی لە شای سەفەویەکان قبوڵ نەکرد و بەڵکو سوکایەتیشی کرد بە نێردراوەکەی شا ئیسماعیل و فەرمانی کرد بە کوشتنی، سەلیم ئەیزانی کە پلانی دوژمنەکانی لە هودنەکردندا لەمەدا کورت ئەبێتەوە کە کاتی شەڕەکە دوابخەن تابگاتە وەرزی زستان، سوڵتان سەلیم پەلەی کرد لە بزاوتنیدا . هەواڵی پێگەیشت کە ئیسماعیلی سەفەوی دەستی کردوە بە خۆئامادەسازی بۆ جەنگ نەك ئەوە بەڵکو خەریکە ئەگاتە بیابانی (چاڵدێران)، بۆیە سەلیمی یەکەم دەستی کرد بە ڕێبڕین بەرەو لای چاڵدێران، لە ئوغسگسی ساڵی ١٥١٤ ز دا پێی گەیشتە ئەویّ و شوێنە گرنگەکانی داگیر کرد و سەرکەوت بەسەر پێگە بەرزاییەکانی کە دەیتوانی شکست پێهێنانی ئیسماعیلی سەفەوی و سەربازەکانی بۆ بەدی بهێنێت ، لە ناو خاکی خۆیدا شکستێکی توند توشی سوپای سەفەوی شیعە بوو[1].

شا ئیسماعیل ناچار بەڕاکردن بوو لەو کاتەدا کە سەلیمی یەکەم ئامادەبوو بۆ چونە نێو تەبریز کە پایتەختی سەفەویەکان بوو، سەلیم چووە نێو تەبریز و ماڵو

---

[1] الإسلام في آسيا / ٢٤٦ .

دارایـی شـای سـەفەوی و پیـاوە قزڵباشـیەکانی ئابلۆقـەداو کردیـە مەڵبەنـدی چالاکیە جەنگیەکانی[1].

ململانێ لەنێوان سوننەی نێو دەوڵەتی عوسمـانی و شیعەی نێو ئێرانـدا کۆتـایی پـێ نـەهات بـە جـەنگی چـاڵدێران، بـەڵکو دوژمنایـەتی بەشـێوەیەکی بەرچـاوو ململانـێ بەتونـدی زیـادی کـرد ، هـەردوولا قـەرەوڵی دەگـرت بـۆ ئـەوی تریـان . بەفەزڵی خـوا سـوڵتان سـەلیم و بیرو باوەڕەسـاغەکەی و بەرنامـە پوخـت و چەکە پێشکەوتوو و سـوپا عەقائیدیـە مەشـق پێکراوەکـەی سـەرکەوت و گەڕایـەوە بـۆ وڵاتەکـەی خـۆی پـاش ئەوەیدەسـتی گـرت بەسـەر کوردسـتان و دیاربـەکر و مەرغەش و ئیبلسین و موڵکەکانی تری (دلفاود)دا ، بەمە ئەنادۆڵ بێترس بوو لە دوژمنایـەتی لـە ڕۆژهەڵاتـەوەو ڕێگـەکان بـۆ ئازەربایجـانی قـەوقاز لەبـەردەم عوسمانیەکاندا کرانەوە[2].

کە فارس لـە پێگـەی چاڵدێرانی پێشوودا لەبەردەم سوڵتان سـەلیمدا شکستیان خـوارد زیـاتر خۆیـان ئامـادە کـرد و چـونە پـێش بـۆ هاوپـەیمانێتی لەگـەڵ پورتوگالیەکان ، ئەم خۆسـازدانی پەیوەندیە بە پورتوگالیـەکان لـەدوای زاڵبـونی (بـوکرك) بەسـەر (هـورمز)دا دەسـتی پێکـرد دوای ئـەوە نوێنـەرێك لـە لایـەن شـا ئیـسماعیلەوە نێـردرا و ڕێکـەوتنێکی سـنوردار لـە نێـوان پورتوگـالی و سـەفەویەکاندا بەسترا کـە بـەم دەقـە هـاتبوو : پورتوگـال گەلەکەشتیەکەی بـەرەو پـێش بـەرێت بـۆ یارمـەتی فارسـەکان لەجـەنگی بـەحرەین و قەتیفـدا ، هـەروەك

---

[1] الإسلام في آسيا / ٢٤٧، ٢٤٨ .

[2] جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس / ٤٣٦ .

* خەرقە: جلێکی هەژارانەیە زۆرتر سۆفیەکان لەبەری ئەکەن بۆ بەزاندنی نەفسی خۆیـان،ئەوتریێ فـلان خەرقـەی سـۆفێتی کـردە بـەر، یـان فـلان خەرقـەی سـۆفێتی فڕێدا..(وەرگێڕ:ن).

یامەتی پێشکەش بکات بە شائیسماعیل بۆ سەرکوتی شۆڕش لە مەکران و بلوجستان . وە هەردوو گەلی پورتوگالی و فارسی یەکێتیەك پێك بهێنن لە دژی عوسمانیەکان ، بەڵام مردنی (بوکرك) کە لە دوای ئەوەهات ئەو ڕێکەوتنەی پەك خست[1] .

بەڕاستی پورتوگالیەکان خوشەویستیەکیان بۆ شائیسماعیل نواند پێش جەنگی چاڵدێران کە لەپشت ئەو خۆشەویستی نواندنە بۆ سەفەویەکان ئامانجیان ئەوەبوو کە هەلی بەدی هێنانی ئامانجەکانیان بۆ هەڵکەوێت لە بەدیهێنانی چەند مەڵبەندێك بۆ خۆیان لەکەنداوی عەرەبیدا ، چونکە دەیانزانی کە ئەگەر ئەو یەکانگیری و خۆشەویستیەی سەفەویەکان بە دەست نەهێنن ئەوکات یارمەتی هێزەکەیان لەگەڵ هێزە خۆجێیەکانی کەنداودا دەبێتە هۆی فەشەلی پورتوگالیەکان لە بەدیهێنانی ئامانجەکانیاندا ، بەتایبەت کە پڕۆژەکانیان لە بەدیهێنانی مەڵبەندەکانی تێپەڕبوون بە دەریای سوردا تائاستێکی زۆر شکستی هێنابوو[2] .

سیاسەتی ئاڕاستەکراوی پورتوگال بۆ هاوپەیمانی لەگەڵ فارسەکاندا لە نامەیەکدا دەردەکەوێت کە (بوکرك) ناردبووی بۆ (شا ئیسماعیلی سەفەوی) و تیایدا هاتبوو : ( من ڕێزگرتنی مەسیحیەکان لەولاتەکەدا لەبەرچاو دەگرم و کەشتیگەل و سەربازو چەکت بۆ دەستە بەر ئەکەم بۆ بەکارهێنانی لە دژی قەڵای تورك لە هیندستان ، گەر ویستیشت پەلاماری ولاتانی عەرەب بدەیت یان هێرش بکەیتە سەر مەککە ئەوا من لە لای دەریای سورەوە لە بەرامبەر (جەددە) یان (عەدەن) یان (بەحرەین) و (قەتیف) یان (بەسرە)دا دەبینیتەوە . با(شا) ئەوە

---

[1] جهودالعثمانيين لإنقاذ الأندلس / ٤٣٧ .

[2] قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين / ٦٣ .

بزانیٚ بە درێژایی کەناری فارسیدا دەمبینێتەوە و لەگەڵیدام و هەموو ئەوەی دەیەوێت بۆی جێبەجیٚ دەکەم)!![1].

بەڕاستی شکستی شائیسماعیل لەبەردەم عوسمانیەکاندا بووە هۆی سوربوونی تەواوی بۆ هاوپەیمانێتی لەگەڵ مەسیحیەکان و دوژمنانی دەوڵەتی عوسمانیدا. بۆ ئەمەیش هاوپەیمانی لەگەڵ پورتوگالیەکاندا بەست دانی نا بە دەست گرتنیان بەسەر تەنگاوی هورموزدا لەبەرامبەر یارمەتیدانی بۆ شەڕی بەحرەین و قەتیف و لە هەمان کاتدا پەیمانیان بە سەفەویەکان دابوو کە هاوکاریان بن دژ بە هێزە عوسمانیەکان (لە هەموو شوێنێکدا). (پرۆژەی هاوپەیمانێتی پورتوگالی سەفەوی) دابەشکردنی ڕۆژهەڵاتی عەرەبی لە خۆگرتبوو ناوچەکانی دەسەڵاتی نێوانیان وەك برا بەش بکەن پێشنیاری ئەوە بوو سەفەویەکان میسر و پورتوگالیەکان فەلەستین داگیر بکەن[2].

د. عبدالعزیز سلیمان نواز دەڵێت : ( شا لەگەڕان نەوەستا بەدوای هاوپەیمانانی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی کە بوونە هێزی گەورە کە لە نێوان ئەوان وگەیشتنیان بە دەریای ناوەڕاست. شا ئیسماعیل ئامادەبوو کە هاوپەیمانی ببەستێت تەنانەت لەگەڵ پورتوگالیەکان کە ترسناکترین هێزی مەترسیداری سەر جیهانی ئیسلامی بوون لەوکاتەدا. لە کاتێکدا کە پورتوگالیەکان لە بوونی بەرەیەکی بەهێزی ئیسلامی دەترسان لە ئاوە ئیسلامیەکاندا ، دیتیان کە لەوێدا کەسانێك هەن دەیانەوێت یامەتیان بدەن!

هەرچەندە هورمز –ئەو دورگە بچوکە زیانی ئابووری زۆری لیٚ کەوت بەهاتنی پورتوگالیەکان– بەڵام شائیسماعیل بەرژەوەندیە تایبەتیەکانی خۆی و ڕقی توندی بەرامبەر توکە عوسمانیەکانی خستە ڕوو هەر ڕێکەوتن و

---

[1] قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين / ٦٣ .

[2] قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين / ٦٤ .

هاوپەیمانیەتیەك لەگەڵ پورتوگالیەکاندا ببیەستێت. جا گرنگ نەبوو کە هورمز لەژێر دەسەلاتی پورتوگالیەکاندا بمێنێتەوە لە بەرامبەر دەستکەوتنی (احساء )دا، هەرچەندە پورتوگالیەکان ئەو هەلەشیان لە بار برد بۆ شای هاوپەیمانیان، ئەنجام ئەوەبوو کە ئەم سیاسەتەی شا بوو بەهۆی بەهێزکردنی پورتوگالیەکان و توانیان دەست بەسەر کەنداودا بگرن...)[1].

سوڵتانی عوسمانی بەسەرکەوتنی لە چاڵدێراندا وازی هێناو ناچار بوو بەگەڕانەوە بۆ وولاتەکەی خۆی دوای سەپا بەزیوەکەی شائیسماعیل نەکەوت لەبەر چەند هۆیەك:

١ . ڕوودانی جۆرێك لە یاخیبوون لە ڕیزی ئەفسەرەکانی سوپای عوسمانیدا بە هۆی بەردەوام بوونی جەنگ لەگەڵ فارسدا دوای ئەوەی سوڵتان ئامانجەکەی بەدی هێنا و سام و شکۆی شائیسماعیلی سەفەوی بێهێز کرد .

٢ . ترسی سوڵتان سەلیم لەوەی کە سوپاکەی بکەوێتە کەمینەکانی سەفەوییەکانەوە ئەگەر بچنە نێو وولاتەکەیانەوە .

٣ . وایدەبینی کە گرنگی بە لەناوبردنی مەمالیکەکاندا بدات باشترە چونکە دەزگای ئاسایشی دەوڵەتی عوسمانی چەند نامەیەکی نێوان مەمالیك و صەفەویەکانی دەستکەوتبوو کە ئاماژەی بەبوونی یارمەتی نێوانیان دەکرد دژ بە دەوڵەتی عوسمانی[2].

ئەنجامی ململانێی نێوان عوسمانی و سەفەویەکان ئەمانەی لێ کەوتەوە:

١ . باکوری عێراق و دیاربەکر درایە پاڵ دەوڵەتی عوسمانی .

٢ . عوسمانیەکان ئاساییشیان لەسنوری ڕۆژهەلاتی دەوڵەتەکەیان دەستەبەرکرد.

---

[1] الشعوب الإسلامية / ٢٢٦ .

[2] الشعوب الإسلامية / ٢٢٥ .

٣ . زاڵبونی مەزهەبی سوننی لە ئاسیای بچوکدا دوای ئەوەی شوێنکەوتەو هەوادارانی ئیسماعیلی سەفەویان لەناو برد وپاشان نشوستیان هێنا بەسەر شیعەدا لە چاڵدێران. بەمەش هەستی دەوڵەت بەرامبەر جیهانی ئیسلامی زیندووکردەوە بەتایبەتی دوای ئەوەی خۆی وەك پارێزەری موسوڵمانان ڕاگەیاندبوو[١].

٤ . هەست کردنی دەوڵەتی عوسمانی بەوەی پێویستە ئەم هێزی دووهەمە کە مەمالیکەکانە نەهێڵێت[٢].

٥ . پێکدادانی چەکدارانەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویەکان کاریگەری خراپی دروستکرد لەسەر نرخی باجی گومرگی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕێگە کۆنەکانی ئەنادۆڵدا. بەڕاستی لە دوای سالآنی ٩١٨ ك-١٥١٢ ز ڕێژەی هاوردە زۆر هاتە خوارەوە ئەویش لە ئەنجامی جەنگی نێوان سەفەوی و عوسمانیەکانەوە بوو کە زۆربەی ڕێگە کۆنەکانی بازرگانی داخست و مەترسیان کەوتە سەر و ئاڵوگۆڕی بازرگانی لە نێوان هەرێمە ئێرانی وعوسمانیەکاندا سنورداربوو،لەوانە اوردنی ئاوریشمی فارسی بۆ دەوڵەتی عوسمانی زۆر دابەزی[٣].

٦ . پورتوگالیەکان سودی زۆریان وەرگرت لە ململانێی سەفەویەکان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا و هەوڵیاندا کە ئابلۆقەیەکی گشتی بسەپێنن بەسەر دەریاکانی ڕۆژهەلآتدا لە هەموو ڕێگە کۆنەکانی نێوان ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاواوە[٤].

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية / ٥٦، ٥٧ .

[2] تأريخ العرب / ٣ .

[3] جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس / ٤٣٧ .

[4] جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس / ٤٣٨ .

٧ . کامەرانی ڕووی لە ئەوروپییەکان کرد بەهۆی جەنگەکانی نێوان عوسمانی و سەفەوی ، ئەوروپییەکان کاریان لەسەر ئەوە ئەکرد کە لەگەڵ شیعەی سەفەویدا بن لە دژی دەوڵەتی عوسمانی بۆشپرزەکردنی تا نەتوانێت بەردەوام بێت لە کشانی بەرەو ئەوروپا[١] .

دووەم : ڕاکێشانی دەوڵەتی مەمالیك : پاش ئەوەی سوڵتان سەلیمی یەکەم سەرکەوت بەسەر سەفەویەکاندا لە باکورو ڕۆژئاوای ئێراندا ، دەستی کرد بە خۆ ئامادەکردن بۆ لەناوبردنی دەوڵەتی مەمالیك. چەند هۆکارێك بەشدار بوون لە ئاڕاستە بوونی عوسمانیەکان بۆ ڕاکێشان و پێکەوەلکاندنی شام و میسر ، لەوانە :

١ . هەڵوێستی دوژمنکارانەی مەمالیك لە دەوڵەتی عوسمانی ، ئەوەبوو قانصوی الغوری ( ٩٠٧-٩٢٢ك ، ١٥٠١-١٥١٦ز ) سوڵتانی مەمالیکی هەستا بە پشتگیریکردنی هەندێ لە ئەمیرە عوسمانیە هەڵهاتوکان کە لە سوڵتان سەلیم یاخی بوون، لەپێش هەموویانەوە أحمدی برای سوڵتان سەلیم، دەسەڵاتە مەملوکیەکان دەیانویست ئەو ئەمیرانە وەك ئامێرێك بە کاریان بهێنن لە لایان خۆیانەوە بۆ دروستکردنی زەحمەتی زیاتر بۆ سوڵتان سەلیم، هەروەها هەڵوێستی ناباش ( سلبی ) دەوڵەتی مەمالیك لەدا کە پاڵپشتی مەعنەویان لە شا ئیسماعیلی سەفەوی ئەکردو نەیانتوانی بەتەواوی بێ لایەنی خۆیان لە نێوان عوسمانی و سەفەویەکاندا ڕابگرن، هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی ڕوونیان لە مەڕسوڵتان سەلیم وەرنەگرتبوو!!

٢ . جیاوازی و ناکۆکی لە نێوان هەردوو دەوڵەتدا لەسەر سنوری لە گرسوس لە ناوچەی نێوان لای باشوری ڕۆژئاوای ئاسیای بچوك و باکوری شام ، لەو ناوچەیەدا چەند میرنشین و هۆزێك هەبوون کە لە نواندنی ( ولا و ) هۆگری بۆ

---

[1] القوة العثمانية بين البر والبحر / ١١١ .

دەوڵـەتی عوسمـانی و مـەمالیك دا ئـەملاولایان بـوو ، ڕاڕاییئـەو خێڵانـە مایـەی نائارامی پەیوەندی نێوان هـەردوو دەوڵـەت بـوو بوویـە سەرچاوەی ململانێیـەکی بـەردەوامیش. سـوڵتان سـەلیمی یەکـەم ویـستی سـەرەتا کێـشەی سـنور یـەکلا بکاتەوە بەوە دەست بەسەر تەواوی ناوچەکە و دانیشتوانەکەیدا بگرێت.

٣ . بڵاوبونـەوەی سـتەمی مـەملوکی لـەناو خەڵکیـدا و خواسـتی خـەڵکی شـام و زانایـانی میـسر لـە ڕزگـاربوون لـە دەوڵـەتی مـەملوکی و لکانیـان بـە دەوڵـەتی عوسمانیەوە . جا زانایان و قازیەکان ناوداروپیاو ماقووڵان و خاوەن ڕاکان لـەناو جـەماوەردا کۆبونـەوەو لـە بـاری خۆیـان دەکۆڵینـەوە ، پاشـان بڕیاریـان دا کـە قازیـەکانی هەرچـوار مەزهەبەکە پیاوماقووڵان، عەریزەیـەك کـە جێـی ڕەزامەنـدی هەموان بێت بنوسن و تیایدا لەگەڵ سوڵتان سـەلیمی یەکـەمی عوسمانیـدا قسە بکەن و بڵێن : بەڕاستی گەلی سوریا لەستەمی مەملوکی بێزارو بـارگران بووە و فـەرمانڕەواکانی مـەمالیك پێـچەوانەی شـەرعی پـیرۆز ڕەفتـار دەکـەن ، جائەگـەر سوڵتان بڕیاری پەلامار بۆ سەر دەوڵـەتی مەملوکی بدات ، ئـەوا (گـەل) پێشوازی لیّ دەکات و خۆشی دەردەبڕێت بە هاتنی هەموو چین و توێژەکانی بۆ عینتـاب – کە لەدووری حەلەبەوەیەو– تەنها بە پێشوازی کردنیان بـۆ وولاتەکـەیان ناوەستن ، داوایان لە سوڵتان سەلیمیش کرد کە نوێنەری بنێرێت بـۆ لایـان ، وەك وەزیـری کە جێگەی باوەڕبێـت تـا بـەنهێنی گفتوگۆیان لەگەڵدا بکات و پـەیمانی ئـەمانیان بداتیّ تادڵی خەڵك ئارام بگرێت و لە سەر و ماڵیان دڵنیا بن[1].

(د. محمدحرب)وا باس دەکات: کە ئەو بەڵگەنامەیە لە ئەرشیفی عوسمانیدا هەیە لـە مۆزەخانـەی (طـوب کـابي) لـە ئەسـتانبوڵ بـە ژمـارە ١١٦٣٤ ( ٢٦) ڕوونـی دەکاتەوە کە وەرگێراوی بەڵگەنامەکە لـە عوسمانیـەوە بـۆ عـەرەبی بـەم شـێوەیەی خـوارەوە: (هـەموو خـەڵکی حەلـەب زانایـان و نـاودارو ناسـراوان ، خانـەدان و

---

11 العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٧٠ .

خەڵکانی وڵات، بەبێ هەڵاوێرکردنی گوێڕایەڵی و پشتیوانیان بە خۆشی خۆیان بۆ سوڵتان (خوا سەربڵندی بکات) دەدەبڕن و بەموڵەتی هەموو خەڵکی ئەم نامەیە دەنوسن : ئێمە ئەم نامەیەمان نوسی تا بنێردرێت بۆ لای جەنابی سوڵتانی گەورە ودڵنیاتان ئەکەینەوە کە هەموو خەڵکی (حەلەب) کە لە پشتیوانانی ئێوەن داوا ئەوە لە جەنابتان دەکەن کە ئەمانیان پێ بدەن، ئەگەر ئێوەش بڕیارتان دا ئەوا ئێمە ئەو شەڕکەسیانە دەگرین و دەیاندەینە دەستان یان ڕاویان دەنێین ، هەموو خەڵکی حەلەبیش ئامادەی هاتنە دەم و پێشوازیتانن تەنها بەوەی پێ بخەنە نێو خاکی عینتاب ، ئەی سوڵتان! ڕزگارمان بکە لەدەستی حوکمی تاوان و زۆرداری ( شرکسی ) هەروەها لەدەستی بێباوەڕان بمانپارێزە پێش ئامادەبوونی تورکمان، با سوڵتانی گەورەمان ئەوە بزانێت : کە شەریعەتی ئیسلامی لێرەدا ڕێڕەوی خۆی نەگرتووەو کاری پێ ناکرێ، مەمالیکەکان حەزیان لە هەرشتێك بێت یەکسەر دەستی بەسەردا دەگرن، ئیدی ماڵو سامان بێت یان ئافرەت و خێزان. ڕەحم بە کەسیان مەکەن هەریەکەیان زۆردارێکە بۆ خۆی. ئەوان لە هەرسێ ساڵێك داوای پیاوێکیان لێدەکردین، ئێمەیش بەدەم خواستەکەیانەوە نەچووین ، ئەوانیش دەستیان دایە دوژمنایەتی کردنمان و حوکمی ناڕەوا دەربارەمان. ( دەمانەوێت ) پێش ئەوەی تورکمان بڕوات وەزیرێکی خۆتان بێت بۆ لامان ئەی سوڵتانی خاوەن دەوڵەت ، ئارامش و ئەمان بەخۆمان و کەسوکارو خێزانمان بدەن و کەسێکی جێباوەڕو متمانەی خۆتان بنێرن بۆ لامان تابە نهێنی بێت و پێمان بگات و پەیمانی ئەمان و پارێزراویمان بداتێ تا دڵی ئەو هەزارانە ئارام بگرێت . وصلى الله على محمد وعلى آله أجمعين [1].

دەربارەی زاناو فیقهـ زانەکانی میسریش (عبدالله ی کوڕی رچوان) لەکتێبەکەیدا ( تأريخ مصر ) بە پێی دەستنووسی ژمارە( ٤٩٧١ ) کە لە کتێبخانەی بایەزید لە

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ١٧٠ ، ١٧١ .

ئەستانبول هاتووە باسی ئەوە دەکات: کە زانایانی میسر ( کە خودی خەڵکی میسر و نوێنەرانی ئەوێ بوون ) بە نهێنی بەهەموو باڵیۆزێکی عوسمانی دەگەیشتن کە دەهاتە میسر ، وەگلەیی و گازندەی خۆیان و ( سکالای ڕەوای خۆیان) لاباس دەکرد و ( داوای ڕاپەڕینی دادی سوڵتانی عوسمانیان دەکرد تا بێت و میسر بگرێت، بەڕاستی زانایننانی میسر بەردەوام نامە گۆڕینەوەیان هەبوو لەگەڵ سوڵتان سەلیمی یەکەمدا تا بێت بۆ میسر بە سوپاکەیەوە ودەست بگرێت بەسەریدا مەمالیکەکانی لێدەر بکات[1].

٤ . ڕای زانایانی دەوڵەتی عوسمانی ئەوەبوو کە یەککگرتنەوەی شام و میسر لە بەرژەوەندی ئوممەتە و سوود بە ئامانجە ستراتیژیەکانی ئەگەیەنێت، چونکە مەترسی پورتوگالی لەسەر دەریای سورو ناوچە پیرۆزە ئیسلامیەکان و هەروەها مەترسی سوارەکانی (قدیس یوحەننا) لە دەریای ناوەڕاست هۆی سەرەکی بوو کە سوڵتانی عوسمانی هاندا تا ڕوو لە ڕۆژهەلات بکات و لەگەڵ هێزە مەملوکیەکاندا بۆ ئەو مەبەستە لەسەرەتاوە هاوپەیمانی ببەستێت و دواتر هەموو قورساییەکە بگرێتە ئەستۆ بۆ بەرەنگاری ئەو مەترسیانە کاتێك کە حوکمی مەملوکی ڕماو نەما[2].

بۆ ئەمەیش ئەوە بەبەڵگە دێنینەوە کە سوڵتان سەلیم بە (تومان بای) کۆتا سوڵتانەکانی مەمالیکی وتووە پاش ئەوەی لە جەنگی ریدانیەدا شکستی پێهێنا ( من تەنها لەسەر فەتوای زانایانی سەردەم و ئەم ولاتانە) هاتووم، من بەرەو جیهادی ڕافیزەکان ( واتە سەفەویەکان) و خراپەکارو لادەرەکان ( واتە پورتوگالی و سوارەکانی قدیس یوحننا) ڕووم نابوو بەڵام کاتێك کە (میر غوری) سەرکردەتان یاخیبوونی ڕاگەیاند بەسەربازەکانیەوە هات بۆ حەلەب و لەگەڵ

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة/ ١٦٩ .

[2] قراءة جديدة في التأريخ العثماني / ٧٠ .

ڕافیزیەکاندا ڕێککەوت و ئەوەی هەڵبژارد کە بچێتەمەملەکەتی من کە لە باوو باپیرانەوە بۆبەجێماوە، کە ئەمەم بۆ دەرکەوت، ڕافیزەکانم واز لێهێناو ملی ڕێگەم بەرەو ئەو گرت)[1].

أ : ڕووداني پێکدادانەکە: پاش ئەو پەرەسەندنانەی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و سەفەویەکان ڕووی دا ، لەسەر سوڵتان قانصوهی مەملوکی پێویست بوو کە یەکێك لەم هەڵوێستانە بەرامبەر ڕووداوەکە وەربگرێت ، یان :

١ . بداتە لای عوسمانیەکان لە دژی سەفەویەکان.

٢ . بداتە لای سەفەویەکان دژی عوسمانیەکان.

٣ . یان بێلایەنی هەڵبژێرێت لە نێوان هەردوولادا .

(غوری) ئەوەی بە چاك ئەزانی کە بەبێ لایەنی خۆی نیشان بدات ، بەڵام دەزگای زانیاری عوسمانی دەستی گرت بەسەر دەقی هاوپەیمانیەکی نهێنیدا کە پەیوەندی نهێنی نێوان مەمالیك و فارس دووپات دەکاتەوە. دەقەکەش لە ئەرشیفی مۆزەخانەی (گوب قابو) لە ئەستانبوڵ پارێزراوە، سوڵتان سەلیم دەیویست هێرش بکاتە سەر شیعەی سەفەوی لە وولاتی فارسدا ، لەگەڵ ناجێگیری ڕووداوەکاندا ، سوڵتان سەلیم ئەوەی بەباش زانی کە پشتەوەی خۆی ئارام و دڵنیا بکات ، ئەوەیش بەوە دەبوو کە دەوڵەتی مەملوکی بخاتە سەر موڵکی خۆی.

هەردوو کۆمەڵ لە دەوروبەری (حەلەب) لە (مەرج دابق) لە ساڵی ١٥١٧ز دا بەیەك گەیشتن و عوسمانیەکان سەرکەوتن و (غوری) سوڵتانی مەمالیك کوژرا . لە دوای مردنی غوری عوسمانیەکان ڕێزی تەرمەکەیان گرت و نوێژی جەنازەیان لەسەر کرد و لە دەوروبەری حەلەب ناشتیان . سەلیم چووە حەلەب ، پاشان دیمەشق و

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٧١ .

لەمزگەوتەکاندا دۆعای بۆ کراو دراو بەناوی ئەوەوە وەك سوڵتان و خەلیفە لێدرا [1].

لـە شـامەوە سـوڵتان سـەلیم نامەیـەکی نـارد بـۆ (گومـال بـای) کـە سـوڵتانی مەمالیکـەکان بـوو لـە میـسر تـا پابەنـدی گوێڕایـەڵی دەوڵـەتی عوسمـانی بێـت ،وەڵامـی مەمالیکـەکان ئـەوەبوو تێـر گاڵتـەیان بـە نوێنـەری سوڵتان کـرد و دواتـر کوشـتیان. سـوڵتان سـەلیم جـەنگی ڕاگەیانـد و بـەرەو میـسر کـشاو بیابـانی فەلەسـتینی بـەرەو میسر بـڕی و قـەدەری خـوا بـاران دابـاری بەسـەر شـوێنەکان گەشـتی هێرشـەکەدا کـە بـڕینی بیابـانی لمـاوی بـۆ ئاسـان کـردن چـونکە بارانەکـە لمەکەی تەڕو پاراو و توندکردەوە کە تێپەڕبوون بەسەریدا ئاسان بوو.
(سـلام نـوری) مێژوونوسـی خـاوەنی دەسـتنوویی ( فـەتح نامـە دیـار العـرب ) کـە هاودەمی سەلیم بوو دەگێڕێتەوە کە : سەلیمی یەکـەم لـە مزگـەوتی ( صـخرە ) لـە قودس بەتوندی و گەرمـی دەگریـا و نوێژی پێویـستی* کـرد وەك پاڕانـەوە لـە خـوا کە میسری بۆ فەتح بکات .
عوسمانیـەکان سـەرکەوتنێکی تـەواویان بەسـەر مەمالیکـدا بەدەسـت هێنـا لـە جەنگی (غەززە) پاشان لە جەنگی زیدانیە دا .
ئەوهۆکارانەی بونە هۆی شکستی مـەمالیك و کۆتـایی پێهێنـانی دەوڵەتەکـەیان و سەرکەوتنی عوسمانیەکان و بەرزبوونەوەی ئەستێرەیان چەند شتێك بوو:
١ . پێـشکەوتنی سـەربازی لـەلای عوسمانیـەکان: چـەکی تۆپهاوێـژی مـەملوکی پشتی بە تۆپگەلێکی گەورەی جێگری نەجوڵاوی دەبەست ، لە کاتێکدا چەکی تۆپهاوێژی عوسمـانی پـشتی بـە تـۆپی سـوکی شـیاو بـۆ جـوڵان دەبەسـت بـەرەو هەموو ئاراستەکان .

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٢٩ .

٢ . سەلامەتی نەخشە و پلانە سەربازیەکانی عوسمانیەکان : لەگەڵ ئەوەی عوسمانیەکان بۆ بڕینی ماوەیەکی زۆر کە ناچار بوون بە بڕینی و جەنگیان لە زەویەکدا کە هی دوژمن و بەرامیەرەکەیان کە مەمالیك بوون کەچی کتوپڕ دایان بە سەریاندا و شەڕەکەیان هەڵگیرساند، هەموو ئەمانە دەچوونە نێو هۆکارەکانی سەرکەوتن. سەلامەتی نەخشە و پلانەکانی عوسمانی لەوەدابوو کە هێزە عوسمانیە کان لە پشت تۆپە قورسەکانی مەمالیکەوە هێرشیان کردنەسەر کە ئەگەر بویستراپە بجولێنرێن نەئەتوانرا بجولێنرێن چونە ناوەوەی ئەو هێزە عوسمانیە بەتوانایە لە ڕێگەی هەڵمەت و بڕیندا کە ڕۆڵی تۆپی مەملوکی لە کار خست، دواتر شپرزی لە نێو سوپای مەملوکیدا ڕوویدا و توانای بەرگریان نەما لە پشت عوسمانیەکانەوە بە ناڕێك و پێکی هەر ئەهاتن بەیەکدا.

٣ . مەعنەویاتی بەرزی سوپای عوسمانی و پەروەردە بەرزە جیهادیەکەی و بڕوا بوونی بەوەی کە جەنگەکەی دادپەروەرانەیە ، بەپێچەوانەی هێزە مەملوکیەکان کە ئەو سیفەتانەیان لە دەست دابوو.

٤ .سوور بوونی دەوڵەتی عوسمانی لەسەر پابەند بوون بەشەرع لە هەموو لایەنەکانی ژیان و گرنگیدانی زۆریان بە دادپەروەری لە نێو ڕیزی ئەندامانی دەوڵەت دا ، بە پێچەوانەی دەوڵەتی مەملوکی کە لایدابوو لەو شەریعەتە بێوێنە بەرزەو هەر خەریکی ستەم بوون بەسەر تاك و ئەندامانی دەوڵەتەکەیاندا[1].

٥ . بوونی کۆمەڵێکی سەرکردایەتی لە کاربەدەستانی مەمالیك کە بڕوایان وابوو بدەنە پاڵ سوپای سوڵتان سەلیم و ئامادەی هاوکاریکردن بوون لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی فەرمانڕەوایی لە چوارچێوەی حوکمی

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة /٣١ .

عوسمانیدا ، لە نموونەی ئەوانە: (فایر بەگ) کە سوڵتان سەلیم حوکمی میسری دایە دەست، (جان بردی غەزالی) کە دواتر حوکمی دیمەشقی گرتەدەست[1].

بەڕاستی مەمالیك تووشی شکست و داڕمان بوونەوە لەساڵی ١٥١٦ -١٥١٧ ز ، لەکاتێکدا کە لە تەمەنی پیری دەوڵەتەکەیان و کۆتا لاپەڕەکانی مێژوویاندا بوون وەك هێزێکی ئیسلامی گەورە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا یان لە جیهاندا، ئەوان زیندوێتی و توانای خۆیان لەدەست دابوو نەیانئەتوانی گەنجێتیان تازە بکەنەوە ئەوەبوو دەوڵەتەکەیان ئاوابوو و ئەو وڵاتانەی لەژێر فەرمانڕەواییاندابوون کەوتنە ژێر دەسەلاتی عوسمانی[2].

(د. علی حسون) کە لە (جبرتی) وەرگرتووە لە کتێبەکەیدا ( تأریخ عجائب الآثار في التراجم والأخبار) لە بەرگی یەکەمدا وەسفێکی بۆ سەردەمی حوکمی عوسمانیەکانی کردووە لە میسردا لەکاتی سوڵتانە بەهێزەکانیاندا کە بڕێکی لێ وەردەگرین: ( میسر گەڕایەوە بۆ سەردەمی نوێنەرایەتی، هەروەك لەسەردەمی ئیسلامدا هەبوو . کاتێکیش سوڵتان سەلیم کاروباری میسری کەوتە دەست، لە هەموو ئەوانە خۆش بوو کە جەرکەسی و منالی جەرکەسی بوون، دەستی نەبرد بۆ وەقفەکانی سوڵتانە میسریەکان ، بەڵکو بڕیاری کارکردنی پەمووچڕی و وەقفەکان و شوێنە خەیریەکان و ئالیك و کرێی دوو شارە پیرۆزەکە و گەنجینەکاندا وە موچەی بۆ هەتیوان و پیرو خانەنشینەکان و بەڕێوەبەرانی قەڵاو سەنگەرنشینان بڕیەوە و بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی داگیرکاری و سەرانە و باجی دا. کاتێك کە مرد کوڕە جەنگاوەرەکەی کە سوڵتان سولەیمانە (بەڕەحمەت بێت) هاتە جێگەی کە ڕێسا و یاسای دەمەزراند و مەبەستی دانا بۆ شتەکان و هەرێمەکانی ڕێك خست و تاریکیەکانی چراخان کردەوە و بانگۆی ئایینی بەرز

[1] الشعوب الإسلامية / ٩٣ .

[2] الشعوب الإسلامية /٩٢ .

کـردەوە و ئـاگری بێبـاوەڕانی کوژانـدەوە....دوای ئـەوان بـەردەوام وڵاتـەکان ڕێکوپێکی بەڕێوە ئەڕۆیشتن و گوێڕایەڵی حوکمی ئەوان بوون... عوسمانیەکان بەتایبەت لە سەرەتای دەوڵەتەکەیاندا کەسانی وایان هەبوو چاکترین کەسانێك بوون کە دوای خەلیفەکانی ڕاشیدین کاروباری ئەم ئوممەتەیان گرتبێتە دەست، چاکترین کەسێك بوون کە بەرگریان لەم ئایینە کردبێت، قارەمانترین کەسێك بوون کـە جیهـادی بێباوەڕانیـان کردبێـت، هـەر بۆیـە خـوا لەسـەر دەسـتی ئـەوان و نوێنـەرانی ئەوانـدا ئـەو هـەموو وڵاتـەی ئـازادکرد.... لەگـەڵ ئەمانـەدا هـەرگیز کاروبـاری دەوڵـەتیان فـەرامۆش نەئـەکرد و هـەروەك ناوچـەو سـنورەکان و بـەرز ڕاگــرتنی دروشمــە ئیــسلامیەکان و ســوننەتە محمدیەکانیــشیان پــشتگوێ نەدەخست و حورمـەتی زۆری زانایـان و ئـەهلی ئـایین و خزمـەتگوزارانی کەعبەو مزگەوتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لابوو[1].

ب : <u>باســی گواســتنەوەی خیلافــەت</u>: باســی گواســتنەوەی خیلافــەت بــۆ ئــالی عوسمـان پەیوەنـدی بـە ئـازادکردنی میـسرەوە هەیـە لەلایـەن عوسمانیەکانـەوە، ووتویـشیانە : کۆتـا خەلیفـەی عەبباسـیەکان لـە قـاهیرە نەوازشـی لـە خیلافـەت کـردوە بـۆ سـەلیم . هـەروەها مێژوونووسـی هاوچـەرخ (ابـن إيـاس) لـە باسـی ڕاکێشان و پێکەوە لکانی میسر بە دەوڵـەتی عوسمانیەکانەوە باسـی شتی وای نەکردووە، هەروەها ئەو نامانەی کە سوڵتان سـەلیم نـاردی بـۆ سـولەیمانی کـوڕی هیچ ئاماژەیەکی تێدا نەهاتووە بە نەوازش پێکردنی خەلیفە لە نازناوی خـۆی بـۆ سوڵتان . هەروەها سەرچاوە هاوچەرخەکانیش ئاماژە بە مەسەلەی گواسـتنەوەی خیلافەت بۆ ئالی عوسمان بە ڕێگەی نەوازش کردن ناکەن ، کە لە نـەوەو وەچـەی پێغەمبەریش نین (صلی الله علیه وسلم).

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية / ٦٣ .

ڕاستی مێژوویی دەڵێت : سوڵتان سەلیمی یەکەم نازناوی ( خەلیفەی خوا لە هەموو زەویدا ) ی لە خۆی نا ، لە ساڵی ١٥١٤ ز ، ٩٢٠ك ، واتە : پێش فەتحکردنی شام و میسر و ڕاگەیاندنی حیجاز بە سەردانەواندنی بۆ ئالی عوسمان . جا سوڵتان سەلیم و باوباپیرانی پێگەیەکی گەورەیان بەدەست هێنا کە لەبار بوو بۆ بەکارهێنانی نازناوی خەلیفە ، لە کاتێکدا مەرکەزی خەلیفە لە قاهیرەدا هاوشێوەی نەبوو، هەروەك فەتحکردنەکەی سەلیم تواناو دەسەڵاتێکی مەعنەوی و ماددی بۆ بەدەست خست بەتایبەت دوای چوونی مەککەو مەدینە بۆ ژێر دەسەڵاتی سوڵتان . سوڵتانی عوسمانی بوو بە پەناگەیەك بۆ ئەو موسوڵمانە لاوازانەی کە دەگەڕان بەدوای یارمەتیدانیدا لە دوای ئەوەی پورتوغالیەکان هێرشیان کردەسەرد ناوچە ئیسلامیەکان لە ئاسیاو ئەفەریقادا .

پوختەی باسەکە ئەوەیە کەسوڵتان سەلیم گرنگی بە نازناوی خەلیفە نەدەدا ، هەروەها سوڵتانەکانی تری عوسمانی دوای خۆیشی وابوون ، گرنگی دان بەو نازناوەش هەندێ لە لاوازیەکانی دەوڵەتی عوسمانی گەڕاندەوە [1] .

ج : هۆکارەکانی ڕووخانی دەوڵەتی مەملوکی : لێرەدا چەند هۆکارێك کۆبوونەوە و یارمەتیان دا لە کۆتایی پێ هێنانی دەوڵەتی مەمالیك ، گرنگترینیان :

١ . گەشەنەدانی مەمالیك بە چەك و هونەرە جەنگیەکانیان ، مەمالیکەکان پشتیان دەبەست بە نیزامی سوارەیی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زاڵ و بەرچاو بوو . عوسمانیەکان پشتیان دەبەست بە بەکارهێنانی چەکی ئاگرین و بەتایبەت تۆپ .

٢ . زۆری ئاژاوەو ڕاڕایی و پێکدادانەکان لە نێوان مەمالیکدا لەمەڕ ویلایەتی حوکم کە بوویە هۆی نەبوونی جێگری فەرمانڕەوایی حوکم لەسەرختترین کاتەکاندا .

---

[1] الدولة العثمانية في التاريخ الإسلامي الحديث / ٦١-٦٢ .

٣ .بێزاری ژێردەستەکان لە سوڵتانە مەمالیکەکان ، کە چینێکی ئەرستۆکراتی سەرەوەی دوورەپەرێز لەگەڵەکانیان پێك هێنابوو .
٤. لێدانی هەندێ ناکۆکی و بەش بەشی لە نێو ڕیزەکانی مەمالیکدا ، هەروەك والی حەلەب ( خایربك و جانبرد الغزالي) کردی کە بوویە هۆی پەلەیی ڕووخانی دەوڵەتی مەملوکی .
٥ . خراپی بارودۆخی ئابووری و بەتایبەت کاتێك ڕێگەکانی نێو میسر گۆڕان و دۆزینەوەی ڕێگەی لوتکەی هیوای چاك ( رأس الرجاء الصالح ) ڕوویدا .
٦. هۆکاری کەرەوەی هۆکارە پێشینەکان : لاوازی پابەندی مەمالیك بوو بە بەرنامەی خواو لە
بەرامبەریدا بەهێزی دەست پێوەگرتنی عوسمانیەکان بەشەرعی خوا [1].
د : ملکەچی حیجاز بۆ عوسمانیەکان : حیجاز شوێن کەوتەی مەمالیك بوو ، کاتێك شەریفی مەککە زانی بەکوژرانی سوڵتان غوری و تومان بای جێگری، شەریفی مەککە ( بەرەکاتی کوڕی محمد) ی نارد بۆ نواندنی گوێڕایەڵی خۆی بۆ سوڵتان سەلیمی یەکەم و کلیلەکانی کەعبە و هەندێ شوێنەواری دایە دەست ، بەمە سوڵتان سەلیم دانی نا بە شەریفی حیجازدا وەك ئەمیری مەککە و حیجاز و چەند توانستێکی ( صلاحيات ) بەرفراوانی پێبەخشی [2].
بەمە سوڵتان سەلیم بوو بە خزمەتگوزاری هەردوو حەرەمی پیرۆز و پێگەی تەواو بەهێز بوو لە لای گەلانی ئیسلامی و بەتایبەت دەوڵەت چەند وەقفێکی زۆری دانا بۆ ناوچە پیرۆزەکان ، دەسکەوتەکانی لە خەزێنەیەکی سەربەخۆی کۆشکی سوڵتانیدا دادەنرا ، پێکەوەلکانی حیجاز بە عوسمانیەکان بووە هۆی فراوانی دەسەڵاتدارێتی عوسمانی لە دەریای سوردا کە بوو بە هۆی لابردنی مەترسی

[1] تأريخ العرب الحديث / ٤٠ .
[2] تأريخ العرب الحديث / ٤٠ .

پورتوگالی لە حیجاز و دەریای سووردا. ئەوەیش تا کۆتایی سەدەی ١٨ بەردەوام بوو [1].

ھ : یەمەن : دوای شکستی مەمالیك فەرمانڕەوای مەملوکی چەرکەسی یەمەن (إسکندر) وەفدێکی نارد بۆ لای سوڵتان سەلیم تاکوو هۆگری و گوێڕایەڵ بوونی خۆی بۆ بخاتە ڕوو، سوڵتانی عوسمانیش ڕازی بوو بەمانەوەی لە پایەی خۆیدا ، یەمەن پێگەیەکی ستراتیژی پێکدەهێنا و بەکلیلی دەریای سوور دادەنرێت ، لە سەلامەتیدا ، سەلامەتیە بۆ پێگە پیرۆزەکان لە حیجازدا ، دەسەڵاتداری عوسمانی لە سەرەتادا لاواز بوو ، بەهۆی ململانێی ناوخۆیی نێوان سەرکردەکان و مەمالیك لە بواری قەڵەمڕەوی ئیمامەتی زەیدیەوەلە نێو هۆزەکانی شاخدا . ئەمە و لەگەڵ مەترسی پورتوگالی کە هەڕەشەی کەنارە یەمەنیەکان دەکرد ، ئەمەش سوڵتانی پاڵ پێوەنا بۆ ناردنی هێزێکی دەریایی ، بەڵام بەهۆی ئەو ململانێیەوە سەرنەکەوت کە لە نێوان سەرکردەکەیدا ( حسین ڕۆمی ) تەواو سەربەست لە جموجوڵدا و ( ڕەیس سلمان )ی یەك لە سەرکردە عوسمانیە دەریاوانەکاندا ڕوویدا [2].

پاشان سوڵتان سلیمان( سلیمان پاشای ارنائۆوگی ) هێرشێکی نارد لەساڵی ٩٤٥ك ١٥٣٨ ز ، هێرشەکە ٧٤ کەشتی و ٢٠٠٠٠ کەسی لە خۆ گرتبوو کە ئامانجی هێرشەکە داگیرکردنی یەمەن و بەتایبەت عەدەن بوو ، پاشان داخستنی گەرووی بابولمەندەب لە بەردەم کەشتیە پورتوگالیەکاندا . عوسمانیەکان لە ساڵی ٩٤٦ك ١٥٣٩ز دا چونە عەدەن و لە ٩٥٢ ك ١٥٤٥ز چوونە تعز ، سەنعایش لە ساڵی ٩٥٤ك ، ١٥٤٧ ز دا کەوتە نێو دەستیان ، سلیمان پاشا بە کەشتیگەلەکەیەوە ڕۆیشت تاکوو دەست بگرێت بەسەر هەندێ ناوچەی عەرەبی

---

[1] تأريخ العرب الحديث / ٤١ .

[2] تأريخ العرب الحديث / ٤١ .

لـه حەزرەمـەوت ، لەوانـە ( الـسحر، المكـلا) و کـەناری حەبەشـە و سـەواکین و مصوعی لە سەر کەناری ڕۆژئاوای دەریای سووری گرتەوە لە ٩٦٤ك ، ١٥٥٧ز .
یەمەن لە ماوەی ملکەچبوونیدا بۆ حوکمی عەباسـی ( ١٥٣٨، ١٦٣٥ز ) بەردەوام لە ململانێی هێزە عوسمانیەکان و ئیمامەتە زەیدیەکاندابوو . جا عوسمانیەکان نەیانتوانی کە تەواو زاڵبن بەسەر شارەکاندا لە ئەنجامی ئەو بزوتنـەوە بەرگریـەی کە بەرەنگاریان بوویەوە [١] .
بەڕاستی یەمـەن لـە مـاوەی زاڵبـوونی دەوڵـەتی عوسمـانی بەسـەریدا ( ١٥٣٨ – ١٦٣٥ز ) هێزەکانی عوسمانی و ئیمامەتە زەیدیەکەی ململانێیـان بوو لەسـەری ، جـا عوسمانیـەکان نـەیانتوانی بەتـەواوەتی زاڵ بـن بەسـەر شـارەکانیدا بـەهۆی هەڵگێڕانەوەی هەندێ لە هۆزەکان [٢] .
عوسمانیـەکان لـە بونیـان لـە یەمەنـدا سـودیان وەرگـرت و هەسـتان بـە چـەند هێرشـێکی دەریـایی بـۆ سـەر کەنـداو بەمەبەسـتی ڕزگـارکردنی لـە فـشاری پورتوگالی [٣] .
<u>سێیەم : ململانێی عوسمانی پورتوگالی</u> : دەوڵەتی پورتوگال لەساڵی ١٥١٤ ز دا هەستا بە بزواندنی هێرشێك بۆ سەر ڕۆژئاوای دوور کە سەرکردە هنری گەشتیار سـەرکردایەتی دەکـرد . ئـەو هێرشـە تـوانی بەنـدەری سـەبتەی ڕۆژئـاوایی داگـیر بکـات . ئەمـە سـەرەتایەك بـوو بـۆ زنجیرەیـەك لـە کـارە دوژمنکارییـە یـەك بەدوای یەکدا هاتووەکان [٤] .

---

[1] تأريخ العرب الحديث / ٤١ .
[2] تأريخ العرب الحديث / ٤٢ .
[3] تأريخ العرب الحديث / ٤٢ .
[4] التأريخ الأوروبي الحديث في عصر النهضة الى مؤتمر فينا / ٤٨ .

پاشان پورتوگال هێرشەکانی گەیاندە باکوری ئەفریقی تاکوو زاڵبوو بەسەر ئەصیل و ئەرائیش و دواتر تەنجە لە ساڵی ١٤٧١ زدا[1].

دوای ئەوە چاوچنۆکیەکانی گەیاندە مەڵبەندە تەواو گرنگەکانی وەك بەندەری ( اسفی ، ئەغادیر ، أزمورە ، ماسە )[2].

ئەو ئاراستەی پورتوگال کە بەرەو زەریای ئەتڵەسی و هەوڵی چواردەوردانی جیهانی ئیسلامی بوو ئەوا بەپلەی یەکەم بە پاڵپشتی خاچپەرستی دڵڕەقانە دژ بە موسوڵمانان کاریکرد. کاتێك پورتوگال وای دەردەبڕی کە ئەو سەرخەرو پارێزەری مەسیحییەتە و دژی موسوڵمانان و کوشتنی موسوڵمانانی بەپێویستیەکی گرنگ و یەکلایی داناو ئیسلامی وادەدیت کە دوژمنی ناحەزیەتی و پێویستە لە هەموو شوێن کوشتاری بکەیت[3].

هنری گەشتیار دەمارگیری توندی هەبوو بۆ مەسیحیەت و تەواو ڕقی بوو لە موسوڵمانان ، هنری ئەمەی لەلای پاپا نیقولای پێنجەم بەدەست هێنابوو وەك مافێك لە هەموو دۆزینەوەکانیدا هەتا گەیشتە هیند ، بەوەی دەڵێت : ( بەختەوەری گەروەمان ئەوەیە کە دەزانین هنری کوڕمان ئەمیری پورتوگال ڕێبازو جێپێی باوکی گەورەی پاشا یوحەننا دەنوێنێت ، ئەو غیرەتەی قوتداوە و لوش داوە کە دەرونە بەرزەکان دەبنە خاوەنی وەك سەربازێکی نەبەردی سەربازانی مەسیح ، بەناوی خواوە بەرەوپێش چوو بۆ ئەوپەڕی وولاتەکان و دورترین شوێنەکانی جێماوەی زانیاریمان ، هەروەك لە نێو کۆشکی کاسۆلیکیە دلێرەکاندا دوژمنانی خواو مەسیحی وەك عەرەب و بێباوەڕانی دەرکرد ..)[4].

---

[1] الكشوف الجغرافية / ٩٩، ١٠٠ .

[2] الكشوف الجغرافية / ٩٩، ١٠٠ .

[3] آسيا الوسطى المغربية / ٢٤، ٢٥ .

[4] دراسات متميزة من العلاقات بين الشرق والغرب / ٥٨ .

بوكرك لەو ووتارەیدا كە دای بۆ سەربازەكانی لە دوای گەیشتنی بە ( مەلقا) بەم دەقە ووتی : ( دورخستنەوەی عەرەب لە بازرگانی ( افاویە) ئەو هۆكارەیە كە پورتوگالیەكان بۆ لاوازكردنی هێزی موسوڵمانان خوازیارینی ) .
لەهەمان ووتاردا ووتی: ( ئەو خزمەتە بەرزو بەنرخەی كە پێشكەش بە خوای دەكەین وەدوونانی عەرەب لەم وولاتانەو كوژاندنەوەی ڕوناكی یارانی محمد بەجۆرێك كە جارێكی تر كلّپەو گڕێكی تر نەبینێت بەخۆوە لێرەدا ، ئەوەش چونكە من دڵنیام ئەگەر ئێمە بازرگانی ( مەلقا) مان لە دەستیان دەركرد ( واتە موسوڵمانەكان) ئەوا هەریەك لە قاهیرەو مەككە دەبنە شوێنەوارێكی دوور لە چاو ، لە بوندوقیەش هەموو بازرگانیەكی لیّ بێبەش دەبێت گەر بازرگانەكانی نەچن بۆ پورتوگال بۆ شەڕكردن لێرەدا )[1].
ڕۆژێكی تریش ووتی: ( ئامانجمان گەیشتنە بە شوێنە پیرۆزەكانی موسوڵمانان و كاولكردنی مزگەوتی پێغەمبەر و بردنی لاشەی پێغەمبەر محمد وەك ڕەهینە تاكوو بەرەنكاری عەرەبی پێبكەین لە پێناو گەڕاندنەوەی قودس)[2].
عەمانۆئێلی یەكەمی پاشای پورتوگال بە ئاشكراكردنی ئامانجی هێرشە پورتوگالیەكان دەڵێت : مەبەستی دۆزینەوەی ڕێگەی دەریایی بۆمینا بلاوكردنەوەی مەسیحیەت و بەدەستخستنی سامانی ڕۆژهەلاتی بوو[3].
هەروەها بۆ توێژەری بەویژدان دەردەكەوێت : كە پالنەری ئایینی بۆ دۆزینەوە جوگرافیەكان لە گرنگترین ئەو هۆكارانە بوو پورتوگالی هاندا بۆ تێپەڕاندنی دەریاكان و سوڕانەوە بەدەوری جیهانی ئیسلامیدا . بوكرك بڕیارو فرمانەكانی دەركردو وێنەی خاچ و تۆپەكان نەخشێنرا وەك دروشمی هێرشەكان ، ئامانج

---

[1] دراسات متميزة من العلاقات بين الشرق والغرب / ٥٩.

[2] الدولة العثمانية دولة إسلامية : ٢ / ٦٩٨ .

[3] موقف أوربة من الدولة العثمانية / ٣٧ .

لەوەیش ئەوە بوو کە لەسەر موسوڵمانانە مەسیحیەت لەکۆش بگرن ، ئەگەر نا دەبێت بەرەنگاری تۆپەکان ببنەوە .
پاڵنەری ئابوری لە پلەی دووەمدا بوو ، وەك هۆکارێکی کاریگەر لە گەڕانی دۆزینەوە جوگرافیە پورتوگالیەکان ، کە دۆزینەوەی ڕێگەی لوتکەی هیوای چاك ( رأس الرجاء الصالح ) ی لە ساڵی ٩٠٤ك ، ١٤٩٧ ز ئاسان کرد بەهۆی فاسکودی ماجا جێگرنگی گەیشتنی بەرهەمەکانی ڕۆژهەڵاتی دوور بە بازاڕە ئەوروپیەکان بەبێ پێویستی تێپەڕبوونی بەڕێگەی میسردا . ئەمەش یارمەتی گۆڕینی هێڵی بازرگانی دا لە ناوچەکانی تێپەڕبوونی عەرەبی و ئیسلامیەوە بۆ بەدیهێنانی ئامانجی ئایینی . ئەمەش بەوەی کە بواری ئابوری کاریگەری بەهێزی هەبوو لە لاوازکردنی هێزی ئیسلامی کە کاریگەریەکەی گەیشتە لە راندن و شۆکاندنەوەی ئەوروپا بۆ چەند سەدەیەك بەهۆی ئەو لاوازی بازرگانیەی کە دەوڵەتی مەمالیکی بەهۆی ئەو گۆڕانە لە ناکاوەوە توشی بووبوو [١] .
ئەوەی شیاوی باسکردنە ئەوەیە : پورتوگالیەکان لە هێرشەکانیاندا داوای یارمەتی و پاڵپشتیان لە جولەکەکان کرد کە وەك جاسوس بەکاریان دەهێنان . لەمەشدا شارەزاییان لە زمانی عەرەبی یارمەتی دان ، بۆ نمونە پاشای پورتوگال یوحەننای دووەم خزمەتگوزارە تایبەتیەکەی خۆی نارد بۆ میصرو هیندستان و حەبەشە کە هاوڕێیەکی جولەکە بوو لەگەڵیدا. ئەنجامی کۆچ و سەفەرەکەیان پێشکەشکردنی پەیامێك بوو کە هەندێ نەخشەی عەرەبی وسەر زەریای هیندیان گرتبوە خۆ [٢] .
إبن إیاس باس دەکات : لە سەردەمی شەریف بەرەکاتی ئەمیری مەککەدا سێ کەس چوونە نێو مەککەو بەدەوری کەعبەدا دەسوڕانەوە کە جل و بەرگی

---

[1] دراسات متميزة / ٦٠-٦١ .

[2] أوربة في مطلع العصور الحديثة : ١/ ١٢٣ .

عوسمانیان لەبەربوو و بەعەرەبی و تورکی قسەیان دەکرد ، ئەویش فەرمانی کرد بـە گرتنیـان و دەرخـستنی جەسـتەیان . ڕوون بوویـەوە کـە مەسـیحین ، چـونکە ئەوان خەتەنە نەکرابوون ، پاش لێکۆڵینـەوەیان دەرکەوت کە ئـەوان جاسوسن و نێـردراون بـۆ کـارکردن وەك ڕێنیـشاندەری سـوپای پورتوگـالی خاچپەرسـتی لـە کاتی چونە نێو مەککە پاش ئەوە نێردران بۆ لای سوڵتان قانصوەی غوری .

بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجـە پورتوگالیـەکان ، سیاسـەتمەدارو گێـڕەوە دۆزینـەوەکان پێویـستی دەستەسـەرداگرتنی گـەرووی ( هـورمز) یـان دادەنـا تـاکوو دوژمنـانی ئیـسلام هێرشـەکەیان لـە پـشتەوە بـۆ سـەر جیهـانی ئیـسلامی دەسـتپێبکەن و دەماری بازرگانی لەناوچە عەرەبی و ئیسلامیەکاندا وەلاخەن و دواتر مەسیحیەت لە هەموو ئەو شوێنانە بڵاو بکەنەوە کە پێی دەگەن [1] .

پورتوگالیـەکان لـە پلانەکانیانـدا سـەکەتووبوون و توانیـان زاڵـبن بەتێپەڕگـە بازرگانیـەکانی لـە کـەناری ئـەفریقی و کەنـداوی عـەرەبی و دەریـای عەرەبـدا و هەستان بە ڕێگری گەیشتنی بەرهەمە ڕۆژهەلاّتیـەکان بۆ ئـەوروپا لـەو ڕێگەیـەوە. بـۆ بـەدیهێنانی ئـەوەیش نـەبوونی هـیچ ڕکەبـەرێکی دەریایی یان یارمەتیدان تـا زاڵبن بەسەر مەڵبەندە گرنگەکانـدا. پاشـان پورتوگالیـەکان دەسـتیان نەگرتـەوە لـە بەکارهێنانی تونـدو تیـژی دژ بـە ئـەو ناوچانەی کە پێیان دەگەیشتن و داگیریـان دەکردن ، قەسابخانە و خستنەوەی ئاگرو کاول کردن و دەستدرێژی کردنـە سـەر ئابڕوی خەڵك و ڕێگری موسوڵمانان بوو چوون بۆ حەج و ڕوخاندنی مزگەوتەکان بەسەریاندا لەو دیمەنانە بوون [2] .

هەڵوێـستی موسـوڵمانان لـەو جەنگـە دڵڕەقانـەدا ئـەوە بـوو کـە مەمالیکـەکان لـەو کاتەدا لە بارێکی نالەباردا بوون چونکە لاوازی ئابووری و سیاسیان تـوش بوبوو

---

[1] موقف أوربة من الدولة العثمانية / ٣٨ .

[2] علاقة ساحل / ١٩ .

و سـوڵتانەکان سـەرقاڵ بـوون بـە کێـشە ناوخۆییـەکان و سـەنگەرگرتنی دژبـە دەوڵـەتی عوسمـانی و سـەرکوت کردنـی چـالاکی سـوارە ئیـسپارتیەکان لـە ڕۆژهەلاتی دەریای سپی ناوەڕاستدا [1].

بۆیە دانیشتوانی کەناری ئەفریقی و کەنداوو یەمەن سەرەنجامیان بەرەو ڕووی خۆیان بوویەوەو لە هەموو شوێن لە ڕۆژهەلاتی ئەفریقیاو لە مەسقەت و بەحرەین و قریات و عەدەن هێرشیان دەکردە سەر پارێزگە پورتوگالیەکان بەبێ گوێدانە جیاوازی کێشی تواناییان [2].

پاشان مەمالیکەکان هەستیان کرد بە بەرپرسیارێتی لەگەڵ بوونی ئەو کێشانەی کـە دەوڵەتەکـەیان تیایـدا دەژیـا ، جێش لـە توانایانـدا بـوو خـستیانە گـەڕ بـۆ سـنورداركردنی گەیـشتنی پورتوگالیـەکان بـە پێگـە پیرۆزەکـان ، جـا سـوڵتان قانصوە الغوری هەستا بە ناردنی هێرشێکی دەریایی پێکهاتوو لە ( ١٣) کەشتی کە ١٥٠٠ کەسی تێدابوو بەسەرکردایەتی حوسەینی کوردی و گەیشتە کەنداوی ( دیـو) پاشـان ( شـول) و لەگـەڵ کەشـتیگەلی پورتوگالیـدا بـە یەکگەیـشتن بەسـەرکردایەتی ( الـونزدی المیـدا ) ئـەوەیش لـە سـاڵی ٩١٤ ك ، ١٥٠٨ ز دا و سەرکەوتن بوو بە بەش وهاودەمیان . پاشان پورتوگال هێزەکانیان بەهێز کرد و جـارێکی تـر زەویـان گەڕانـدەوە بـۆ خـۆ کـە بـووە هـۆی شکـستی کەشـتیگەلی ئیسلامی لە ساڵی ٩١٥ك ، ١٦٠٩ ز لە جەنگی ( دیو) ی بەناوبانگ لە مێژوودا [3].

دەوڵەتی عوسمانیش لەسەرەتادا دووربوو لە مەیدانی جەنگەکەو نێوانی ئەو و پورتوگال دەوڵەتی مەمالیك و دەوڵەتی سەفەوی بوو ، لەگەڵ ئەوەیشدا سوڵتان بایەزیدی دووەم داوای یارمەتی سوڵتان غوری پەسەند کرد دژ بە پورتوگالیەکان

---

[1] دراسات في .../ ١١٤ .

[2] موقف اوربة من الدولة العثمانية / ٣٨ .

[3] النفوذ البرتغالي في الخليج العربي / ١٠٦ .

لە مانگی شەوالی ساڵی ٩١٦ك ، ١٥١١ز چەند کەشتیەکی هەڵگری تیرو ڕم و چل سندوقی باروت و چەندین پێداویستی تری سەربازی و ماڵ و سامانی پێویستی نارد[١]. بەڵام ئەو یارمەتیە بەتەواوی نەگەیشت بەهۆی بەرەنگاربوونەوەی لەگەڵ سوارەکانی قدیس یوحەننادا[٢].

پاش ئەوەی عوسماینەکان ووڵاتی میسرو شامیان گرتەخۆو ووڵاتانی عەرەبی چوونە ژێر باری فەرمانڕەوایی عوسمانی دەوڵەتی عوسمانی بەرەنگاری پورتوگالیەکان بوویەوە بە دلێریەکی کەم وێنەوە و توانی هەندێ بنکەو شوێنی ئیسلامی لەدەریای سوربگێڕێتەوە وەك ( مصوع ، زەیلەع ) هەروەك توانی هێزێکی دەریایی بەسەرکردەیی میرعەلی بەگ بنێرێت بۆ کەناری ئەفریقی بەمەیش ڕزگارکردنی مەقدیشۆ و مەبسە هاتەدی و سوپا پورتوگالیەکان کەوتنە ژێر باری زیانگەلێکی گەورەوە[٣].

لەسەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانونی ٩٢٧-٩٧٤ك ، ١٥٢٠ -١٥٦٦ز ، دەوڵەتی عوسمانی توانی پورتوگالیەکان لەدەریای سور دوور بخاتەوە و هێرشیان بکاتە سەر لەومەڵبەندانەی کە لە کەنداوی عەرەبیدابوون و تیایدا نیشتەجێ بووبوون . سوڵتان سولەیمان هەستی کرد کە بەرپرسیارێتی پارێزگاریکردنی پێگەپیرۆزەکان ئەرکی دەوڵەتی عوسمانیە ، بۆیە ڕێککەوتنێکی بەست لە گەڵ هەردوو فەرمانڕەوا (قالیقوگ )و ( کامبای) کە دوو فەرمانڕەوای هیندی بوون و کاریگەری جەنگی پورتوگالیان بەرکەوتبوو. ئەو ڕێککەوتنە جەختی لەسەر کاری هاوبەش دەکردەوە دژی پورتوگال ، لەدوای ئەو ڕێککەوتنە دەقەکەی نێردرا بۆ سولەیمان پاشای خادم والی میسر کە ئەمە دەقەکەی بوو : (

---

1 المماليك الفرنج / ١١٥ .

2 تأريخ كشف أفريقيا / ١٧٢ .

3 موقف أوربة من الدولة العثمانية / ٣٩ .

ئەی بەگی بەگەکان سولەیمان پاشا لە میسر پێویستە بەپەلە هەستیت بە جێبەجێ کردنی ئەم فەرمانانە ، بە ئامادەکردنی جانتاو پێویستیەکانت و خۆ ئامادەکردن بۆ جیهاد لە ڕێی خوادا لەسویس ، دەبێ بەرەو هیند دەربچیت و زاڵ بیت و پارێزگاری لەو بەشانە بکەیت ، چونکە تۆ ئەگەر ڕێگەکەت بڕی و ئابلۆقەی ڕێگەکانی سەر مەککەی پیرۆزت دا ئەوا ئەو خراپانە دوور دەخەیتەوە کە پوتوگالیەکان دەیکەن و ئاڵاو دروشمیان لە دەریادا کۆتایی پێ دێنیت )[1].

سولەیمان هەستا بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی سوڵتانی عوسمانی و پاش حەوت ڕۆژ گەیشتە جەددە و پاشان بەرەو کەمران چوو ، دواتر دەستی گرت بەسەر عەدەن داو یەکێك لە کاربەدەستە سەربازیەکانی ( چابگ ) لەسەر داناو بەژمارەیەکی سەربازەکانی کە دەگەیشتنە ٦٠٠ سەرباز پارێزگاری لێکرد، پاشان درێژەی دا بە ڕۆیشتنی بەرەو هیند ، لەکاتی گەیشتنی بە (دیو) نەیتوانی بەسەریدا زاڵ بێت ، و پاشەکشەی کرد پاش ئەوەی نزیکەی ٤٠٠ سەربازی لەدەست دا جارێکی تریش هەوڵی دا زاڵبێت بەسەر قەڵاکانی پێشەوە تاکوو یەکێکیان خۆی بەدەستەوەداو ٨٠ پورتوگالی گیران ئەگەر یارمەتی نوێی پورتوگالی نەبوایە ئەوا هەموو قەڵاکان دەگیران ، بەمە دەرکردنی پورتوگالیەکان لە هیند هاتەدی و قەڵای دیو بەتەواوی ملکەچی عوسمانیەکان بوو[2].

بەمجۆرە عوسمانیەکان توانیان ڕێگە لە پورتوگالیەکان بگرن و بەدوور لە خاکە ئیسلامیەکان بیانوەستێنن و سنوردابنێن بۆ چالاکیان ، هەروەها دەوڵەتی عوسمانی سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە ئاسایش پێدانی دەریای سوور و پارێزگاری شوێنە پیرۆزەکان بەرامبەر فراوانخوازی پورتوگالی خاوەن ئامانجی

---

1 موقف أوربة من الدولة العثمانية / ٤٠ .

2 صراع المسلمين مع البرتغاليين / ٢٢٦ .

داگیرکاری و مەبەست نزمخاوەن هەوڵی زاڵبوون بەسەر ئیسلام و موسوڵماناندا بەهەموو جۆرە ڕێگەیەك .
ئەو سەرکەوتنەی دەوڵەتی عوسمانی بەدیهێنا بە لادانی مەترسی پورتوگالی لەسەر جیهانی ئیسلامی شیاوی هەموو ڕێزلێنان و دەستخۆشیەکە ،چونکە دەوڵەتی لاواز و ماندووی مەمالیکی لەسەر لێواری دارمان بوو ، لە ئاستێکی هێزێکی وایشدا نەبوو کە بتوانێت لە بەردەم هێرشی پورتوگالیدا بووەستێت . دەوڵەتی عوسمانیش ئەرکی بەرگریکردنی لە ماف و موڵکی موسوڵمانانی گرتە ئەستۆو بەتەواوی سەرکەوت لە سنوردانان بۆ چاوچنۆکی جەنگاوەرو هێرشبەران و گەیشتنیان بە شوێنە پیرۆزەکان بەو جۆرەی دەیانویست [1] .
لەمەڕ دەوڵەتی سەفەوی ، ئەوا ئەو دەوڵەتە بێڕۆڵ بوو لە یارمەتی دانیشتوانی ئەو ناوچانەدا، کە هێرشی بەریتانی پێگەیشتبوو ، ئەو وازی هێنا لە شارەکانی کەنداوی عەرەبی تا بۆ خۆیان بەرەو سەرەنجامێك بڕۆن ، زیاتر لەوەیش دەوڵەتی سەفەوی بەڕێگەی کەشتی دوژمندا دەڕۆیشتن و بەڵێیان بۆ خواستەکانیان دەکرد بەتایبەت لە کاتێکدا کە ئەو لە باری دوژمنایەتی و ناکۆکی مەزهەبیدا بوو لەگەڵ مەمالیك و دەوڵەتی عوسمانیدا ، بۆیە دەبینین سەرکردەی پورتوگالی بوکیرکلە ئەو هەڵوێستە بە هەند وەدەگرێت و لەساڵی ٩١٥ك ، ١٥٠٩ ز دا نوێنەری خۆی ( روی جومیری ) دەنێرێت کە نامەیەکی پێیەو تیایدا هاتووە ( من ڕێزی ئەو ڕێز لێنانەت دەگرم کە لە مەسیحیەکانی وڵاتەکەت دەگری و کەشتیگەلەکەم و سەربازو چەك دەخەمە خزمەتت تا دژ بە قەڵای تورك لە هیندستان بەکاری بهێنیت ، ئەگەریش ویستت قەرەوڵ بگریت بۆ وڵاتانی عەرەب ، یان هێرش بکەیتە سەر مەککە ئەوا من لە لای دەریای سورەوە لە بەرامبەر جەددە یان لە عەدەن یان لە بەحرەین یان لە قطیف یان لە بەسرە دەبینیەوە و شا من لە لایەن

---

[1] موقف أوربة من الدولة العثمانية / ٤٠ .

خۆیەوە دەبینێت بۆ بەرفراوانکردنی کەناری فارسی ، هەرچیەکیش ئەو بیەوێت جێبەجێی دەکەم)[1] .

ئەو خستنەڕوو یان ئەو هەڵوێستە هاوکاتی ئەو ماوەیەبوو کە هێزە عوسمانیەکان تیایدا بەرەنگاری سەنگەری سەفەوی بووبوونەوە لە سەر سنوردا ، کە لە دوای ئەو جەنگی چەڵدێران ڕوویدا لە ساڵی ۹۲۰ ك ، ۱٥۱٤ز دا کەتیایدا فارس بەشکستێکی توند لە بەرامبەری عوسمانیدا شکاو وای لە فارس کرد زیاتر ئامادەی هاوپەیمانی بێت لەگەڵ پورتوگالیەکان دژ بە عوسمانیەکان ، پورتوگالیەکانیش هەلیان بۆ نەدەڕەخسا کە نەدەهاتەوە بەتایبەت کە ئەوان ئاستی ئەو مەترسیەیان دەزانی کە هەڕەشەی لێدەکردن و ئاسایشیانی لەق دەکرد لەلایەن دەوڵەتی عوسمانیەوە ، بۆیە داگیر کردنی هورمز یان لەساڵی ۹۲۱ك ، ۱٥۱٥ز قۆستەوە و یەکسەر لە دوای ئەو پەیوەندییەیان لەگەڵ سەفەویەکاندا بەست بە گرێبەستێك کە لە گرنگترین خاڵەکانی بریتی بوو لەوەی پورتوگال کەشتیگەلەکەی پێشکەش بە شا بکات بۆ یارمەتی دانی لە هێرشەکەی بۆ بەحرەین و قطیف لە بەرامبەردانانی شا بە پارێزگاری و بوونی پورتوگالی لەسەر هورمز و یەکخستنی هەردوو هێزەکە لە کاتی بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی دوژمنی هاوبەشیاندا[2] .

دەردەکەوێت پورتوگال لە هاوپەیمانیان لەگەڵ سەفەویەکاندا هۆکاری بەدیهێنانی یەکنەگرتنی دەوڵەتە عوسمانیەکانیان بەدی دەکرد ، کە ئەگەر یەکیان بگرتایە لە دژی نەیدەتوانی زاڵ بێت بەسەر توانستەکانی گەلەکاندا لە ناوچەی کەنداوو دەریای سورو عەدەن و ئەو ناوچانەی تر کە چونە ژێر باری پورتوگالی ، لەلایەکی ترەوە هاوپەیمانی سەفەوی پورتوگالی و باری سیاسی و

---

[1] التیارات السیاسیة / ۱۷ .

[2] التیارات السیاسیة / ۹۸ .

ئابوری شکست خواردووی مەمالیکەکان هەموو ئەمانە وای کرد کە دەوڵەتی عوسمانی بەرپرسیارێتی تەواوی بەرگریکردنی لە پێگە ئیسلامیەکان لە هەموو شوێنێکدا بگرێتە ئەستۆ کە پورتوگالیەکان هەوڵیان دەدا پێی بگەن و بەسەریدا زاڵ بن .

لەبەرهەمەکانی ململانێی عوسمانی پورتوگالی بریتی بوو لەوەی کە :

١. عوسمانیەکان پارێزگاریان لە شوێنە پیرۆزەکان و ڕێگەی حەج کرد .
٢. پارێزگاری سنورە وشکانیەکانیان کرد لە هێرشی پورتوگالیەکان بەدرێژایی سەدەی ١٦ .
٣. بەردەوامی ئەو ڕێگە بازرگانیانەی کە هیندستان و ئەندەنوسیای دەبەستەوە بە ڕۆژهەڵاتی نزم لە ڕێگەی کەنداوی عەرەبی و دەریای سورەوە .
٤. بەردەوامی چالاکیەکانی ئاڵوگۆڕی شمەکە هیندیەکان لەگەڵ بازرگانانی ئەوروپا لە بازاڕەکانی حەلەب و قاهیرە و ئەستانبوڵدا . جالە ساڵی ١٥٥٤ دا بوندوقیەکان ٦هەزار سندوقی تەوابیل یان کڕی لە کاتێکدا کە ٢٠ کەشتی هەڵگری شمەکی هیندی ( بەهارات و پێستەو قوماش ) گەیشتە بەندەری جەددە .

مردنی سوڵتان سەلیم :

لە ٩ی شەوالی ساڵی ٩٢٦ لە شەوی شەممەدا سوڵتان سەلیم وەفاتی کرد ، وەزیرەکان مردنەکەیان شاردەوە و ناردیان بەدوای سوڵتان سولەیمانی کوڕیدا ، کاتێك گەیشتە قوستەنتینیە مردنی سوڵتان سەلیمیان ڕاگەیاندو لە مزگەوتی سوڵتان محمد نوێژیان لەسەر کرد و پاشان هەڵیان گرت و لە گۆڕەکەیدا ناشتیان ، سوڵتان سولەیمان خان فەرمانی کرد بە بنیادنانی مزگەوتێکی گەورە و بینایەك بۆ خۆراك دان بە هەژاران وەك خێرێك بۆ باوکی .

سوڵتان سەلیم بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت، کەسێکی شکۆدار و زیرەك و ئاکار جوان بوو، سەرکەش نەبوو ، خاوەن ڕاو بیرکردنەوەو بڕیار بوو ، هەرسێ زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی دەزانی ، نیزامێکی هەڵکەوتەی باشی دانا ، هەمیشە بیری لە بارودۆخی ژێر دەستەو وولاتەکەی دەکردەوە ، پاشاکانی گوێپێنەدەدا و لە ناوی دەبردن ، کاتێك لە میسر بوو لەسەر لێواری دیواری ئەو کۆشکەی کە تیایدابوو بە دەستنوسی خۆی نووسی :

| | |
|---|---|
| الملك لله من يظفر بنيل منى | يردّده قهرا ويضمن بعده الدركا |
| لوكان لي أو لغيري قدر أنملة | فوق التراب لكان الأمر مشتركا |

لە تەمەنی ٥٤ساڵیدا مرد ، ماوەی فەرمانڕەواییەکەی ٩ساڵ و ٨ مانگ بوو [١].

## باسی سێیەم

## سوڵتان سولەیمانی قانونی

سولەیمانی قانونی لە شاری ( تەرابزۆن ) لەدایك بووە کە لەوکاتەدا باوکی والی ئەو شارە بووە ، باوکی گرنگیەکی گەورەی پێداوە و بەخۆشەویستی زانست و ئەدەبو زانایان و ئەدیب و فیقە زانەکان پێگەیشت ، هەر لە گەنجیەوە بەکەسێکی ووردو جیددی و لەسەرخۆ ناسراو بووە ، لە ٢٦ساڵیدا چووەسەرکورسی دەسەلات ، لە هەموو کاروبارەکانیدا لەسەرخۆبوو ، پەلەی لەوکارانەدانەدەکرد کە دەیویست جێبەجێیان بکات ، بەڵکو بەقووڵی بیری دەکردەوەو پاشان بڕیاری دەدا . ئەگەر بڕیارێکیشی بدایە لێی پاشگەز نەدەبویەوە [٢].

یەکەم : ئەو کێشانەی لەسەرەتای فەرمانڕەواییدا بەرەوڕووی بوونەوە :
سولەیمان لەساڵانی یەکەمی فەرمانڕەواییدا توشی چوار هەڵگەڕانەوەبوویەوە کە دوایخست لە بزوتنەوەی جیهادکردن ، کاتێك والییە چاوچنۆکەکان وایان دیت

---

[1] تأريخ سلاطين آل عثمان / ٤٠ .

[2] السلاطين / ٥١ .

که هەلی سەربەخۆیی لە هەرێمەکانیاندا کاتی هاتووە ، بۆیە جان بردی غەزالی والی شام هەستا بە هەڵگەڕانەوە لە دەوڵەت و سەرکەشی خۆی ڕاگەیاند و هەوڵی دا دەست بگرێت بەسەر حەلەبدا بەڵام لەوەدا شکستی خوارد ، سوڵتان سەلیم فەرمانی کرد بەسەرکوتکردنی کێشەکە و کێشەکە سەرکوت کراو سەری جان بردی هەڵگەڕاوە بڕدراو نێردرا بۆ ئەستانبوڵ وەك بەڵگە لەسەر کۆتایی پێهێنانی هەڵگەڕانەوەکە .

هەڵگەڕانەوەی دووەم ئەحمەد شاهی ناپاك لەمیسر پێی هەستا کە لەساڵی ٩٣٠ك ، ١٥٢٤ز بوو ئەو پاشایە چاوچنۆك بوو لەمەڕ پلەی ( صدرالأعظم ) بەڵام لە بەردیهێنانی ئامانجەکەیدا سەرنەکەوت و داوای لە سوڵتان کرد وەك والی دایبنێت لەسەر میسر ، ئەویش دەستنیشانی کرد بە والی میسر ، کە گەیشتە میسر هەوڵی ڕاکێشانی خەڵکی بۆ لای خۆی دا ، خۆی بە سوڵتانێکی سەربەخۆ ڕاگەیاند ، بەڵام ئەهلی شەرع و سەربازانی دەوڵەتی عوسمانی لە ئینکیشاریەکان لە دژی والی هەڵگەڕاوە هەستان و کوشتیان ، ناویشی لە مێژوودا بەناپاك و خیانەتکار نوسرا .

هەڵگەڕانەوەی سێیەم دژی خەلیفەی موسوڵمانان ، هەڵگەڕانەوەیەکی شیعەیی ڕافیزی بوو کە پاپا ذوالنون پێی هەستا لە ساڵی ١٥٢٦ز لەناوچەی یوزغاد ، کاتێك ئەو پاپایە نزیکەی ٣بۆ ٤ هەزار شۆڕشگێڕی کۆکردەوە و خەراجی بەسەر ناوچەکەدا سەپاند و بزوتنەوەکەی بەهێز بوو تائەوەی توانی هەندێ لەوسەرکردە عوسمانیانە شکست پێ بهێنێت کە بەرەو سەرکوتکردنی بزوتنەوەکەی دەچوون ، فیتنەی شیعە بەشکستی پاپا ذوالنون کۆتایی پێهات و سەری نێردرا بۆ ئەستانبوڵ .

هەڵگەڕانەوەی چوارەم دژی دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی سولەیمان قانونیدا هەمدی هەڵگەڕانەوەیەکی شیعەیی ڕافیزی بوو لەسەرو هەمویشیەوە قەلەندەر چەلەبی بوو لە دووناوچەی قونیەو مرعش کە ژمارەی شوێنکەوتوەکانی ٣٠٠٠٠

شیعه بوون هەستان بە کوشتنی موسوڵمانە سوننیەکان لەو دوو ناوچەیەدا ، هەندێ لە مێژوو نوسان دەڵێن : قەلەندەر چەلەبی دروشمەکەی ئەوەبوو کەهەرکەس موسوڵمانێکی سوننی بکوژێت و دەستدرێژی بکاتە سەر ئافرەتێکی سوونی بەوە گەورەترین پاداشتی بەدەست خستووە . بەهرام پاشا چوو بۆ سەرکوتکردنی ئەو سەرکەشیە ، بەڵام سەرکەشەکان کوشتیان ، پاشان فێڵ کردن لەگەڵیاندا سەرکەوتوو بوو بەوەی إبراهیم پاشای (الصدر الأعظم ) هەندێ لە پیاوانی قەلەندەر چەلەبی لەلای خۆدا ڕاکێشاو هێزەکانی کەمبونەوە و شکستی خوارد و کوژرا .

دوای ئەوە کاروبارەکان لە دەوڵەتی عوسمانیدا هێور بوونەوە و سوڵتان دەستی کرد بە پلان دارشتن بۆ سیاسەتی ج
یهاد لە ئەوروپادا [1].

دووەم : فەتحکردنی ڕۆدس : ڕۆدس دورگەیەکی نالەبارو تەخت بوو ، کە قەلایەکی پتەوبوو بۆ سوارەکانی قدیس یوحەننا کە ڕێگەی حاجیە موسوڵمانە تورکەکانیان بۆ حیجاز دەبڕی بەهۆی کردارە دوژمنکاریەکانیان دژ بە هێڵەکانی گەیاندنی دەریایی عوسمانی ، بۆیە سوڵتان سولەیمان گرنگی دا بەفەتحکردنی و هێرشێکی گەورەی ئامادە کرد کە چەند هۆکارێك یارمەتی دا لەهێنانەدییدا :

١. سەرقاڵی ئەوروپا بەجەنگی گەورەی نێوان شارلی پینجەم ( کنت ) و ئیمبراتۆری دەوڵەتی پیرۆزی ڕۆمانی و فرانسوای پاشای فەرەنسا .
٢. بەستنی ئاشتینامە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و بوندوقیەدا .
٣. گەشەسەندنی دەریایی عوسمانی لەسەردەمی سەلیمی یەکەمدا .

سولەیمانی قانونی جەنگێکی گەورەی دژی ڕۆدس بەرپاکرد لە نێوەندی ساڵی ١٥٢٢ ز دا، و فەتحی کرد ، ماف گواستنەوە و جێهێشتنی بە سوارەکان دا ،

---

[1] العثمانيون في التأريخ والحضارة / ٩١ ، محمد حرب .

ئەوانیش چوون بۆ ( مالطة ) و شارل کنت ماڤ فەرمانڕەوایی ئەو دورگەیەی پێدان [1] .
<u>سێیەم</u> : کوشتاری مەجەڕ و ئابلۆقەی ڤیەننا :پاشای مەجەڕ ( فیلادیسلاڤ دووەم گاگیلۆ ) بوو کە سوور بوو لەسەر هەڵوەشاندنەوەی هەر پەیماننامەیەك کە لە پێشتردا درابوو بە سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانی ، تاگەیشتە کوشتنی نێردراوی سوڵتان سولەیمان بۆلای ئەو ، نێردراوەکە داوای سەرانەی ساڵانەی سەپێنراوی سەرمەجەڕی دەکرد ، بۆیە سولەیمان لەساڵی ١٥٢١ز بە هێرشێکی گەورە دژی مەجەڕ وەڵامی دایەوە ، بەڵام جەنگەکان بەردەوام بوون تا تورکەکان سەرکەوتنەگەورەکانیان بەدەست هێنا لەناوچەی موهاکس لە ساڵی ١٥٢٦ ز .
سولەیمانی قانونی لە ١١ی سبتێمبەری ١٥٢٦ز دا چووە ناو ( بودا ) لەگەڵ ئەوەیشدا بەرەنگاربوونەوەی هەنگاری بەردەوام بوو ، سوڵتان فشارەکەی خۆی درێژە پێدا تائەوەی سوپاکانی گەیشتنە شوراکانی ڤیەننای پایتەختی ئیمبراتۆریەتی پیرۆزی ڕۆمانی لەساڵی ١٥٢٩ ز بەڵام دوورو درێژی هێڵەکانی پەیوەندی و هەڵگەڕانەوەی شارل کنت لە جەنگی فرانسوا بۆ ئاشتیبەستن لەگەڵی تاهەلی جەنگی عوسمانیەکانی هەبێت ، لەگەڵ ڕزگارکردنی مایسبورجی پایتەخت ، وایانکرد سوڵتان سولەیمانی قانونی نەتوانێت ئەو پایتەختە فەتح بکات و پاشەکشەی لێ کرد ، لەکاتێکدا کە ململانێ لەنێوان سولەیمان و هێزە ئەورووپیە پاڵپشتەکانی پاشای مەجەڕ بەردەوام بوو لە پێناو زاڵبوون بەسەر ئەو وڵاتەدا تامردنی سولەیمان . دیارترین ڕووداوی مێژوویی لەسیاسەتی دەرەکی عوسمانی لەسەردەمی سولەیمانی قانونیدا بریتی بوو لە پەیوەندی لەگەڵ فرانسوا ، ئەو پەیوەندیەی کە گۆڕا بۆ هاوپەیمانی بەستن [2] .

---

[1] الشعوب الإسلامية / ١٤٧ .

[2] الشعوب الإسلامية / ١٤٧ .

چوارەم : سیاسەتی نزیکبونەوەی عوسمانی فەرەنسی : سەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانونی وەك سەری هەرەم وابوو لەمەڕ هێزو پێگەی دەوڵەتی عوسمانی لەنێو دەوڵەتانی ئەو سەردەمەی جیهاندا ، سەردەمی سوڵتان سولەیمان بەسەردەمی زێڕینی دەوڵەتی عوسمانی دادەنرێت کاتێك کە ساڵانی حوکمی لە٩٢٦-٩٧٢ ك هاوکات بە ١٥٢٠-١٥٦٦ ز فراوانخوازیەکی گەورەی بەخۆوە دیت کە پێشتر وێنەی نەبوو ، هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە سێ کیشوەری جیهانیدا بڵاو بوونەوە .

ئەو دەرکەوتنە کاریگەری خۆی لەسەر دەوڵەتانی ئەو سەردەمەی جیهان هەبوو بەتایبەت لەسەر دەوڵەتانی ئەوروپا کە لە دابەشبونێکی سیاسی و ئاینی مەترسیداردا دەژیان ، بۆیە هەڵوێستەکانی دەوڵەتە ئەوروپیەکان بەرامبەر دەوڵەتی عوسمانی بەپێی بارودۆخی هەردەوڵەتێکیان جیاوازبوو . تشارلزی پێنجەمی پاشای ئیمبراتۆریەتی پیرۆزی ڕۆمانی کێبڕکێی لەگەڵ فرانسوای یەکەمی پاشای فەرەنسادا دەکرد لەسەر کورسی حوکمڕانی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی ، پاپا لیۆی دەیەمیش کێبڕکێی لەگەڵ ڕاهبی ئەڵمانی ماتن لوسەری سەرکردەی بەرەنگاری پرۆتستانتی دەکرد [1].

بەلگراد دەینالاند بەدەست پێکدادانە نێوخۆییەکانەوە بەهۆی بچوکی تەمەنی پاشاکەیەوە لویسی دووەم کە بوویە هۆی پەیدابون و کەوتنەوەی ناکۆکی لەنێوان ئەمیرەکاندا [2].

بۆیە فرانسوای یەکەم وای بەباش زانی پێگەو هێزی دەوڵەتی عوسمانی بقۆزێتەوە و بیکاتە دۆستی خۆی ، بۆیە هەڵوێستی دۆستانەو خواستی یەکگرتنی لەگەڵدا نواند بەو بڕوایەی دەوڵەتی عوسمانی سنور بۆ

---

[1] دراسات متميزة / ٩٢ .
[2] دراسات متميزة / ٩٢ .

چاوچنۆكیەكانی تشارلزی پێنجەم دادەنێت و لە سنوری خۆیدا ڕایدەوەستێنێت . ئەوەی ئەو تێڕوانینە فەرەنسیە بە دیاردەخات ئەوەیە كە نوێنەری ڤینیسی باسی دەكات كاتێك دەڵێت : ( بەختەوەری نوێنەر وام لێناكات كە ئەوە دەرنەبڕم كە من بەتەواوی ئەوە بەباش دەزانم توركەكان بەتەواوی بەبەهێزو ئامادەی جەنگ بزانم ، تەنها لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی سوڵتانی عوسمانی نا ، بەڵكو بۆ لاواز كردنی هێزی ئیمبراتۆر تشارلزی پێنجەم و بەو پەڕەوە سكاڵا لێكردنی و پێدانی ئاسایش و دڵنیایی هەموو حكومەتەكان دژی دوژمنێكی گەورەی وەك ( ئیمبراتور تشارلز ) [١] .

دانوستانەكانی فەرەنسا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی لە دوای جەنگی ( بافیا) دەستی پێكرد كە تیایدا پاشای فەرەنسی فرانسوای یەكەم لەساڵی ١٥٢٥ز دا گیرا ، بۆیە دایك و جێگرەكەی كە لەسەر كورسی دەسەڵات بوو نوێنەری خۆی نارد ( جون فرانجیبانی ) كە دەقێكی ئەوی پێبوو لەگەڵ دەقێكی پاشای گیراودا كە تیایدا داوای هێرش كردنە سەر هێزەكانی بنەماڵەی هایسبوج و ڕزگاركردنی پاشای گیراویان دەكرد [٢] .

لەگەڵ ئەوەی پاشای گیراو بەپێی پەیماننامەیەك بەردرا كە لە مەدرید لە نێوان فەرەنساو خێزانی هایسبورج دا بەسترا لە ساڵی ١٥٢٦ز ، بەڵام فرانسوا لە دوای بەربونی لەساڵی ٩٤١ك ، ١٥٣٥ز ( جان دی لافوریە ) ی سكرتێری خۆی نارد بۆ لای سوڵتان سولەیمان بە ئامانجی بەستنی هاوپەیمانیەك لە شێوەی پەیماننامەیەكدا [٣] .

---

[1] موقف أوربة / ٤٧ .

[2] موقف أوربة / ٤٧ .

[3] موقف أوربة / ٤٧ .

کە دەواتر بە ( پەیماننامەی ئیمتیازاتی عوسمانی فەرەنسی ) ناونرا ، لەگەڵ ئەوەی ئەو پەیماننامەیە گرنگیەکی گەورەی هەیە ، دواتر لێرەدا گرنگترین دەقەکانی دەهێنین :

١. ئازادی تەواوی ئاڵوگۆڕ و بەیەکگەیشتن لە نێو کەشتیگەلی چەکداری و ناچەکداری.
٢. مافی بازرگانی کردن لە هەموو بەشەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا لەمەڕ ژێر دەست و کەسانی پاشای فەرەنسا .
٣. باسا گومرگیەکان و باجەکانی تر یەکجار لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەسەنرێت .
٤. ئەو باجانەی فەرەنسیەکان دەیدەن بە دەوڵەتی عوسمانی هەمان ئەو باجانەیە کە ژێر دەستە تورکەکان دەیدەن .
٥. مافی کاری قونصولی ، لەگەڵ قەڵایەکی قونصولی بۆ خۆی و نزیکان و کارەکەرەکاندا .
٦. قونصولی فەرەنسی مافی ئەوەی هەیە لەو کاروبارە شارستانی و تاوانیانە بڕوانێت کە لە لای ژێر دەستەکانی پاشای فەرەنساوە دەبن ، وە دەتوانێت حوکم بدات بەسەر ئەو کاروبارانەدا ، بەڵکو قونصول بۆی هەیە پشت بە دەسەڵاتە ناوچەییەکان ببەستێت بۆ جێبەجێکردنی بڕیارەکانی .
٧. لە ومەسەلەو کاروبارە جۆراو جۆرانەی کە یەك لە لایەنەکانی ژێردەستەکانی عوسمانی تێدایە ، ئەوا ژێر دەستەی پاشای فەرەنسی بانگ ناکرێت بۆ لێپرسینەوە و دادگایی ناکرێت مەگەر بە ئامادەبوونی نوێنەری قونصولی فەرەنسی .
٨. ئیفادەی ژێردەستەی پاشا لە کاروبارو مەسەلەکاندا وەرگیراوەو دەرکردنی بڕیاری پێوەردەگیرێت .

٩. ئازادی پەرستش پارێزراوە بۆ ژێر دەستەکانی پاشا .

١٠.ڕێگری بەبەندە کردنی ژێردەستەکانی پاشا .

لە بەرهەمەکانی ئەو پەیماننامەیە زیادبوونی یارمەتی نێوان دوو کەشتیگەلی فەرەنسی و عوسمانی بوو لەگەڵ ئەوەی کەشتیگەلی عوسمانی چەند هێرشێکی بەهێزی دەستپێکرد بۆ سەر کەنارەکانی مەملەکەتی ناپۆلی کە پاشکۆی شارل کنت بوو ، وەلە ساڵی ١٥٤٣زدا یەکەکانی کەشتیگەلەکانی عوسمانی و فەرەنسی کۆبونەوەو هێرشیان کردە سەر ( نسیر) ی پاشکۆی دوق سافۆی هاوپەیمانی شارل کنت [1] .

فەرەنسا لە نزیکبونەوەی لە دەوڵەتی عوسمانی لە بواری سەربازی و ئابوری و سیاسیەوە سودی بینی ، لە وپەیماننامەیەی پێشویش هۆکاری کردنەوەی دەرگاکانی بازرگانی لەگەڵ ڕۆژهەلاتدا دەستکەوت بەبێ سەردانەواندن بۆ قۆرخکاری بازرگانی کە پورتوگال لە دوای دۆزینەوەی ڕێگەی لوتکەی هیوای چاك ( راس الرجاء الصالح ) سەپاندبووی . هەروەك بەهۆیەوە ماف تایبەتی پارێزگاری لە ژێر ئالاکەیدلا بەدەست خست بۆ ژێردەستەکانی دەوڵەتانی تری ڕۆژئاوایی . کە بەمە پێگەیەکی بڵندی ناسراوی لە نێو دەوڵەتانی ڕۆژئاوای ئەوروپادا بەدەست خست .

بەهەموو پەژارەیەکەوە ئەو پەیماننامەیە لە لایەن ژێردەستەکانی دەوڵەتی عوسمانیەوە سودی لێنەبینرا ، وەك ئەوەی تەنها بۆ بەڵێ کردن بۆ خواستەکانی ڕۆژئاوایی و بەدیهێنانی بەرژەوەندیەکانی دوژمن بەسترابێت بەبێ بەرامبەرێك کە جێی باس بێت . ئەو پەیماننامەیە ئەو بنەمایەبوو کە لەسەری بنیاد نرا ، زۆرێك

---

[1] موقف اوربة / ٤٧ .

لـەو پەیماننامانـەی تـریش لەسـەر هـەمان ڕێـڕەوی بەسـتران کـە دواتـر لـەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتە ئەوروپییەکاندا بەشێوەیەکی گشتی بەسترا [1].

پاشای فەرەنسا نەیتوانی پابەند بێت بە پەیمانەکانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بەهۆی ڕای گشتی مەسیحیەوە بۆیە ناچاربوو بە پاشەکشەو هەڵوەشاندنەوەی پەیمانـەکان، پاشـان سـەرلەنوێ دەسـتپێدەکاتەوەو خوازیـاری سـۆزو پـشتگیری عوسمانیەکان دەبێتەوە. بەڵام ڕای گشتی لـە دژی ڕادەپـەڕێت ، ڕاسـتی مێـژوویی دەڵێت : خاچپەرستانی دوژمنانی ئیسلام ناتوانن هەندێکیان لە هەندێك ببڕێن لە بـەردەم هەڕەشـەی تونـدی بەرامبەریانـدا، ئەگـەر بەڕوخـساریش نـاکۆك بـن لەبـەر شوێنکەوتنی بەرژەوەندی و ئارەزوەکانیان .

بەڕاسـتی دوژمنـانی ئیسلام لـە خاچپەرسـتە کینەلەدڵـەکان هـیچ هاوپـەیمانی و گرێبەستێکیان بۆ نیە لە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ موسوڵماناندا ، وەك خـوای گـەورە لە قورئاندا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە ( الأنفال ٥٦ ، البقرة ١٠٠) هەرکـە خـاڵێکی لاوازی موسوڵمانیان بۆ دەربکـەوێت ، ئەوا بەپەلـە یارمـەتی دانـی یـەکتریان بـەهێز دەکەن تا خۆیان ئامادەکـەن بۆیان و لێیـان دەن ، لـە کاتێکدا ئـەوان نەوازشیان بۆ هـیچ فەرمانڕەوایـەکیان نیـە باهـەر جۆرە تێڕوانینێکـی هـەبێت یان بیـەوێت لەگـەڵ موسـوڵماناندا هاوکـاری بکـات . هەرچـەندە بەرژەوەندیـەکانیش جیـاواز بـن ، بـەڵام ئـەوان بـۆ دژایـەتی کردنـی ئـەم ئایینـەو کوشـتنی خەڵکەکـەی لـە هـەموو کـات و شوێنێکدا ڕێکدەکەون [2].

بەڕاستی ئەو ئیمتیازاتانەی درا بە دەوڵەتی فەرەنسی یەکەم ( إسفین ) بـوو کـە نـرا بە تابوتی دەوڵەتی عوسمانیەوە کە کاریگەریە دورەکانی لە دواتردا دەکەوتن .

---

[1] موقف اوربة / ٤٧ .

[2] تأريخ الدولة العثمانية / ٧٥ .

لە کۆتا ڕۆژەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا دەوڵەتە مەسیحیە ئەوروپیەکان دەستیان وەردەدایە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی لە ژێر چاودێری ئیمتیازاتەکانەوە و پارێزگاری و پاڵپشتی ئەو مەسیحیانەیان دەکرد کە دەگەڕێنەوە بۆ ژێر دەستەیی و ئەندامی دەوڵەتە بیانیەکان بەتایبەت لە وولاتی شامدا [١].

## باسی چوارەم

## دەوڵەتی عوسمانی و باکوری ئەفریقی

لە کاریگەریەکانی کۆچکردنی بەکۆمەڵی موسوڵمانان لەئەندەلوس و کشانی ژمارەیەکی گەورەیان بۆ باکوری ئەفریقی کێشەیەکی زۆری کۆمەڵایەتی و ئابوری لە هەرێمەکانی باکوری ئەفریقیدا ڕویدا ، لەگەڵ ئەوەی لە نێو موسوڵمانە کشاوەکان بۆ ئەو ناوچانەدا ژمارەیەکی زۆری دەریاوان هەبوو ، بۆیە پێویست بوو کە بگەرێت بە دوای هۆکارە لەبارەکانی جێگیربوونی ئەوانەدا، بەڵام هەندێ لە هۆکارەکان لە باربوون بۆ پاڵنان بە ژمارەیەکی ئەو دەریاوانانە بۆ ڕێگەی جیهاد دژی هێزە مەسیحیەکان لە دەریای ناوەڕاستدا ، لەپێشەکیەکانی ئەو هۆکارانەدا پاڵنەری ئایینی دێت بەهۆی ململانێی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت و دەرکردنی موسوڵمانان لە ئەندەلوس و بەدووکەوتنی ئیسپانیاو پورتوگالیش بە دوای موسوڵمانان لە باکوری ئەفریقیدا . بزوتنەوەکانی جیهادی ئیسلامی دژی ئیسپانیا و پورتوگالیەکان ڕێکخراو نەبوو تا دەرکەوتنی هەردوو برا خیرالدین و عروج بربروسا ، کە توانیان هێزە ئیسلامیەکان لە جەزائیر کۆ بکەنەوەو بەرەو ئامانجی هاوبەشیان ببەن بۆ ڕێگری لە دوژمنانی ئیسلام لە فراوانخوازی بۆ کەنارو شارەکانی باکوری ئەفریقی .

ئەو هێزە ئیسلامیە نوێیە لە جیهادەکەیدا شێوازی ( کرّ و فرّ ) ی لە دەریادا بە کار دەهێنا بە هۆی نەبوونی توانستی چونە نێو جەنگێکی ڕێکخراوەیی دژی هێزە

---

[1] قراءة جديدة في تأريخ .. / ٧٧-٧٨ .

مەسیحیەکانی ئیسپانیا و پورتوگالیەکان و سوارەکانی قدیس یوحەننا ، ئەو موجاهیدانە سەرکەوتنێکیان بەدەست هێنا کە کاریگەری پاڕایی بۆ سەر هێزە دوژمنەکان هەبوو پاشان کونەبەرێکیان دۆزیەوە تا لە ژێر سەرپەرشتی و سەرکردایەتی دەوڵەتی عوسمانیەوە بچنە ژوریَ بۆ یەکخستنی هەولەکانی موسولمانان دژی مەسیحیە کینە لە دڵەکان .

مێژوو نوسە ئەوروپیەکان هەولی دوودلَ و پاڕا کردنی سروشتی بزوتنەوە جیهادیەکەی نێو دەریای ناوەڕاستیان داوە ، بە ڕۆڵی جەردەیی وەسفیان دەکەن ، هەروەها دوودلی دەخەنە نێو بنچینەو ڕەچەڵەکی گرنگترین سەرکردەکانیەوە کە خیرالدین و عوروجی برای بوون ، ئەو بوارەی کە پێویستی دەکات تیشك بخرێتە سەر ڕۆڵی ئەو دوو براو بنچینەیان لەگەڵ کاریگەری ئەو بزوتنەوە یە لە سەر ڕۆڵی خاچپەرستی لە دەریای ناوەڕاست لەسەردەمی سوڵتان سەلیم و سوڵتان سولەیمانی قانونی دا .

یەکەم : ڕەگەزی دووبراکە ( عروج و خەیرەدین ) : بنچینەی ئەو دووبرا موجاهیدە دەگەڕێتەوە بۆ تورکە موسوڵمانەکان ، کەباوکیان یەعقوبی کوڕی یوسف بوو لە پاشماوەی فەتحکەرە موسڵمانەکانی تورکیا کە لە دورگەی (مدللی) یەکێك لە جەزیرەکانی ئەرخەبیل نیشتەجیَ بوونە[1].

دایکیشیان موسوڵمانێکی ئەندەلوسی بوو کە کاریگەری هەبوو لەسەر منداڵەکانی لە گۆڕینی چالاکیان لە کەرتی وولاتی ئەندەلوسدا کە لە وکاتەدا لەژێر چاوچنۆکی و برسیەتی ئیسپان و پورتوگالیەکاندا بوو [2].

عوروج و خەیرەدین دووبرای موجاهیدیان هەبوون کە ئیسحاق و محمد إلیاس بوون ، مێژوو نووسە موسوڵمانەکان بنچینەیان دەدەنە پالَ ئیسلامی بەم بەڵگانە :

---

[1] المغرب العربي بداية العصور الحديثة / ٣٧ .

[2] حرب الثلاثمائة / ١٦٠، ١٦١ .

١ . ئەوەی مێژوو نوسی جەزائیری ( أحمد توفیق مدنی ) باسی دەکات بەپشت بەستن بە دوو شوێنەوار کە تائێستایش لە جەزائیر هەن ، یەکەمیان: ( مەرمەڕێکی نەخشێنراوە کە لەسەر دەرگای قەڵای شرشال دانراوە .دووەمیشیان : مەرمەڕێکە کە لەسەر دەرگای مزگەوتی شەوواس لە پایتەختی جەزائیریدا هەیە لەسەر مەرمەڕی یەکەم ئەمە نەخشێنراوە : ( بسم الله الرحمن الرحيم وصلى الله على سيدنا محمد وآله ، ئەمە بورجی شەرشالە کە محمودی کوڕی فارسی تورکی موجاهید لە خیلافەتی ئەمیری حاکم بأمر الله موجاهیدی ڕێگەی خوا ( ئوروجی کوڕی یەعقوب ) بە مۆڵەتی ئەو لە مێژووی ٢٥ی دوای نوسەد ( ١٥١٨ ز ) بنیاد نراوە . لەسەر مەرمەڕی دووەم ئەمە نەخشێنراوە : ( ناو ( ئوروج ) ی کوڕی ئەبو یوسف یەعقوبی تورکی ) . هەروەها مەرمەڕێکی تر هەیە کە هەندێ لەو شتانەی لەسەر نووسراوە کە خەیرالدین لە جەزائیر لە ساڵی ١٥٢٠ ز دا بنیادی ناوە [1] .

٢ . ناوی عوروج ( ئوروج) لە ڕوداوی ئیسراو میعراج وەرگیراوە کە ڕای زیاتر وایە لەو شەوەدا لەدایك بووە، کە تورك بە ( ئوروج) دەری دەبڕن پاشان کرا بە ( عروج) [2] .

٣ . ئەوەی لە و ڕۆڵە باس دەکرێت کە هەردوو براگێڕایان ، دووپاتی سوربونیان دەکاتەوە لەسەر جیهادکردن لە ڕێی خوا و بەرگری لە مەملەکەتە ئیسلامیەکانی باکوری ئەفریقی لە ڕووی چاوچنۆکیەکانی ئیسپانیا و پورتوگال.

بەڕاستی ئەو دوو برایە داهێنانیان کرد لە جیهادی دەریایی دژی مەسیحیەکان و بزوتنەوەی جیهادی دەریایی لە سەدەی ١٦دا چەند مەڵبەندێکی گرنگی لە شرشال و وەهران و جەزائیر و دلس و بجایە و پاشماوەکانی ڕاوەدونانی موسوڵمانان لە ئەندەلوسدا دانا . لە ڕاستیدا بزوتنەوەکە بەهۆی دانەپاڵی

---

1 حرب الثلاثمائة / ١٦٠ ، ١٦١ .

2 الدولة العثمانية العلية / ٩٥ .

موسـولمانه ڕاکردوەکـانی ئەنـدەلوس و شـارەزایانی دەریـاوانی و هونـەرەکانی و ڕاهێنەرانی دروستکردنی کەشتی بە هێز بوو [1].

دووەم : ڕۆڵـی دووبراکـە لـە جیهـادکردن دژ بـە جـەنگی مەسـیحی : هـەردوو بـرا ، عوروج و خەیرەدین هەر لە منداڵیەوە کەوتنە جیهادی دەریایی، لەسەرەتاوە و لە ساڵی ١٥١٠ز دا چالاکی یان بەرەو دەریای ئەرخەبیلی سەرەکیان بوو، بەڵام ئاڵۆزی ململانێی نێوان هێزە مەسیحیەکان لە وولاتی ئەندەلوس و لە باکوری ئەفریقیا لە نێوان موسوڵمانان ئەوەیش کە ئەو ئاڵۆزیەی توند کرد لە سەرەتای سەدەی ١٦، هـەردوو بـرا کەناریان گـرت تـاکوو چالاکی یـان بـەرەو ئـەو ناوچـانە بگوێزنـەوە بـە تایبـەت پـاش ئـەوەی ئیـسپانیا و پورتوگالیـەکان توانیـان دەسـتبگرن بەسـەر ژمارەیەك لە مەڵبەندو کەنارە دەریاییەکانی لە باکوری ئەفریقیادا [2].

هەردوو برا ژمارەیەك سەرکەوتنیان بەدەست هێنا بە سەر جەردە مەسیحیەکاندا ، ئەو کارەی کە سەرسوڕمانی هێزە لاوازە ئیسلامیەکانی ئەو ناوچەی لێ کەوتەوە ، ئەمـەیش لـە و ماوەیـەدا دەردەکـەوێت کـە سـوڵتان ( حفـصی ) مـافی جێگیربـوونی پێـدان لــە دورگــەی جوربــەی تونــسیدا. ئەوەیــشی خــستە ڕوو بــۆ هێرشــێکی بەردەوامی ئیسپانی کە ناچاری کرد بە قبوڵ کردنی پارێزگاری ئیسپانی بـەزەبرو هێز هەروەك لە داخوازی ڕزگاری خەڵکی ئەو ناوچانەدا دەردەکەوێت کە لە و دوو برا یەیان کرد لەگەڵ کاریگەریان لە ناو وولاتەکەیاندا کە بەشداربوو لە بەدیهێنانی بنکەیـەکی جـەماوەری بـۆ دوو براکـە چـونکە فـەرمانڕەوایی جـەزائیر و هەنـدێ ناوچەی دراوسێی بۆ بەدیدەهێنان . هەندێ لە مێژوو نوسان وا دەبینن کە چونی عـوروج و براکـەی بـۆ جـەزائیر و فـەرمانڕەواییان بەڵگـە نیـە لـە سـەر خواسـتی دانیـشتوانەکەی ، بـەڵکو ئەوانـە دەدرێنـە پـاڵ بـوونی هەنـدێ هێـز کـە چاودێری

---

[1] قراءة جديدة في التأريخ العثماني / ٧٩-٨٠ .

[2] الدولة العثمانية / ٥٣ .

هەڵەکانیان دەکرد بۆ دەرکردنی ئەو دوو برایە و تورکە پشتگیرەکانیان ، بەڵام هەندێکی تر وا دەبینن کە گەیشتنی عوروج و براکەی لەسەر داخوازی و بانگکردنی دانیشتوانەکەی بنیاد دەنرێت بۆ ڕزگارکردنیان لە هێرشی شەڕەنگێزانەی ئیسپانی . ئەو هێزە ساکارانەیش کە بەرەنگاری بونیانی دەکرد ، شوێن پێی هەندێ لە و فەرمانڕەوایانە یان دەگرت کە لە فەرمانڕەوایی دوور خرابوونەوە لەبەردەم هەوڵە گرنگەکانی هەردوو براکەدا بۆ یەکخستنی وڵات کە پێش هاتنی ئەو دوو برایە لە شێوەی دەوڵەتی ( ملوك الطوائف) پاشای هۆزەکانی ئەندەلوس دەچوو .

زوربەی خەڵکی ووڵات دایانە پاڵ هەوڵەکانی دووبراکە و ژمارەیەکی زۆریان لە و هێرشانەدا بەشداریان کرد ، هەروەك ژمارەیەك لە و فەرمانڕەوا ناوچەییانەیش دایانە پاڵیان کە هەستیان بە مەترسی هێرشی خاچپەرستی ئیسپانی کردبوو[1] .

ڕۆڵی ئەو دوو برایە دەردەکەوێت لە هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی ( بجایە ) لە حوکمی ئیسپانی لە ساڵی ١٥١٢ز دا ، بۆ ئەو مەبەستەیش بنکەی چالاکیەکانیان گواستەوە بۆ بەندەری جیجل لە ڕۆژهەڵاتی جەزائیردا دژ بەهێزە ئیسپانیەکان دوای ئەوەی توانیان بچنە ناوی و پارێزەرە جەنەویەکانی بگوژن لە ساڵی ١٥١٤ ز دا، تاکوو ببێتە وێستگەی وزە پێدان بۆ ڕزگارکردنی ( بجایە) لە لایەك و هەوڵی یارمەتی موسوڵمانانی ئەندەلوس لە لایەکی ترەوە . دەردەکەوێت کە هەردوو براکە بەرەنگاری هاوپەیمانیەکی بەهێز بووبوونەوە کە لە ئەنجامیدا ژمارەیەك جەنگی ڕێکخراوەیی لێکەوتەوە . ئەویش کارێك بوو کە خویان بۆ ئامادە نەکردبوو ، بەڵکو پێی ناچار بوون بە هۆی جێگیربونی حوکمیان لە جەزائیردا.

کوشتنی عوروج لە یەکێك لە جەنگەکان لە ساڵی ١٥١٨ ز بارەکەی خراپتر کرد کە خەیرەدینی ناچار کردبگەڕێت بە دوای هاوپەیمانیەکا کە جێگیری و بە رگری و

---

[1] المغرب في بداية العصورالحديثة / ٣٨/٣٧ .

بەردەوامی جیهادی بۆ دەستەبەر بکات . دەوڵەتی عوسمانیش بەهێزترین هێزە پاڵاوتەکان بوو بۆ ئەو هاوپەیمانێتیە ، ئیدی بە هۆی ڕۆڵی دەرکەوتووی بێت لە مەیدانی دەریای ناوەڕاستدا یان بەهۆی ئەوەی هێزە ناوچەییەکانی باکوری ئەفریقیا سۆزیان هەبوو بۆی [١].

سەرکەوتنەکانی عوسمانی درێژەی کێشا بۆ سەر مەیدانی ئەوروپی هەر لە فەتحکردنی قەستەنتینیەوە چوونە هاوپەیمانیەتی ئەو دوانەیش ڕۆڵی زیاتری خەیرەدینی تیابوو لە پاڵپشتی کردن لە لایەن ئەو هێزانەوە، لە پاڵ ئەوەیشدا دەوڵەتی عوسمانی بەڵێ و وەڵامدانەوەی هەبوو بۆ یارمەتیدان هەر کاتێك دووبراکە داوایان لێبکردایە ، هەروەك خواستی خۆی دەربڕی بۆ زیاتر یارمەتیدانی ڕۆڵی ئەوو پاشماوەی موسوڵمانەکانی ئەندەلوس . لە ڕوانگەیەکی ئاینیشەوە بەشداری کرد لە بەدەستهێنانی ڕۆڵی وەك پاڵپشتیەکی جەماوەری و بەدیهێنانی هەوڵی لێ نزیك بوونەوە یان نرخ پێدانی هاوپەیمانی لە گەڵیاندا [٢].

لە لایەکی ترەوە بارودۆخەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانی لە سەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا لە باربوو بۆ قبوڵ کردنی ئەو هاوپەیمانێتیە ، بەتایبەت دوای ئەوەی هێزە عوسمانیەکان دەچوون بەرەو ڕۆژهەڵاتی عەرەبی، لە دیارترین ئامانجەکانی دەوڵەتەکەی لەو ئاراستەیەدا —وەك پێشتر ڕوون کرایەوە— بریتی بوو لە ڕێگریکردنی لە ڕۆڵی پورتوگایەکان و ئیسپانیاو سوارەکانی قدیس یوحەننا لە ناوچەکەدا . شتێکی مەنتیقیشە کە هاوپەیمانی هەبێت لەگەڵ هەریەك لە و هێزە ناوچەییانەی کە یارمەتی بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەیان دەدا [٣].

---

[1] الدولة العثمانية دولة اسلامية : ٣/ ٩٠٢ .

[2] الدولة العثمانية دولة اسلامية: ٩٠٢/٣ .

[3] قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين / ٨٣ .

سێیەم : هاوپەیمانی لەگەڵ عوسمانیەکاندا : زانایانی مێژوو ناکۆکیان هەیە لەسەر سەرەتای هاوپەیمانی نێوان عوسمانیەکان و هەردووبرا عورووج و خیرالدین . هەندێ لە سەرچاوەکان باس دەکەن کە سوڵتان سەلیمی یەکەم لە پشت ناردنیانەوە بوو بۆ کەناری ئەفریقی وەك بەڵێ کردن بۆ داخوازی یارمەتیدانی دانیشتوانی باکوری ئەفریقی و کارکردن بۆ لەکارخستنی ئامانجەکانی پورتوگالیەکان و ئیسپانیا لە ناوچەی دەریای ناوەڕاستدا. لەگەڵ نەبوونی گشتگیری ئەو سەرچاوە لە لای مێژوو نوسان ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە عوسمانیە کان بەدوور نەبوون لەو ڕووداوانەی کە لەسەر مەیدانی دەریای ناوەڕاست ڕوویان داوە [1] .

هەندێ لە مێژوو نوسان هاوپەیمانی نێوان هەردوولا دەگێڕنەوە بۆ ساڵی ١٥١٤ ز لە دوای ئەوەی عورووج و خەیرەدین بەندەری ( جیجل ) یان فەتح کرد کاتێك هەردوو برا کۆمەڵێك لە و شمەکە گرانبەهایانەیان نارد بۆ سوڵتان سەلیمی یەکەم کە لە دوای فەتح کردنی شارەکە دەستیان بەسەردا گرتبوو . سوڵتانیش قبوڵی کردن و دیاریەکی بۆ ناردن بەناردنی ١٤کەشتی جەنگی پڕچەك و سەرباز [2] . ئەم وەڵامەی سوڵتانی عوسمانی ڕەنگدانەوەی خواستی بوو لەسەر بەردەوامی چالاکی ڕۆڵی دووبراکە و پاڵپشتی کردنی ئەو چالاکیە . لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە مێژوونووسان باس دەکەن کە پاڵپشتی عوسمانی بۆ ئەو بزوتنەوەیە لە دوای مردنی ( عورووج) بووە لە ساڵی ١٥١٨ ز دوای گەڕانەوەی سوڵتانی عوسمانی لە میسرەوە بۆ ئەستانبوڵ لە ساڵی ١٥١٩ ز دا [3] .

---

[1] قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين / ٨٣ .

[2] قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين / ٨٤ .

[3] الدولة العثمانية دولة إسلامية : ٢/ ٩٠٩ .

لەگەڵ ئەوەدا ڕای دروستت ئەوەیە کە پەیوەندیەکانی نێوان عوسمانیەکان و ئەو بزوتنەوەیە پێش مردنی عوروج و فەتحی شام و میسر بووە لە لایەن عوسمانیەکانەوە . ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دووبراکە لە ئەوپەڕی پێویستی پاڵپشتی کردن یان هاوپەیمانیدابوون لەگەڵ عوسمانیەکاندا پاش سەرنەکەوتنیان لە فەتحکردنی ( بجایە ) هەروەك لە ( جیجل ) ئابڵوقە درابوون لە نێوان ئەو حەفصیانەدا کە بووبوونە شوێنکەوتەو پاشکۆی ئیسپانیا لە گەڵ ( سالم تومی ) فەرمانڕەوای جەزائیر کە فەرمانڕەواییەکەی بەخت کرد بۆ پاڵپشتی ئیسپانیا بەهۆی هێزی ئیسپانیاو سوارەکانی قدیس یوحەننا کە لە دەریادا ئابڵوقەی دابوون . جا گەیشتنی پاڵپشتی عوسمانیەکان کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر پاڵپشتی ڕۆڵیان و دەستکردنیان بەچونە نێو جەزائیر بەهۆی ئەو هۆکارانەوە ، کاتێك عوسمانیەکان لەگەڵ دووبراکە دا ڕێك کەوتن لەسەر پێویستی پەلەکردنیان بۆ چوونە ژوورەوەیان لە پێش هێزە ئیسپانیەکان بەهۆی نایابی ناوچە کەیان لە لایەك و تاپێش ئیسپانیەکان بکەون تابیکەنە بنکەیەك بۆ کاولکردنی پێگە ئیسلامیەکانی ژێر داگیرکاری ئیسپانی وەك ( بجایە ) و هتد ، لەلایەکی ترەوە .

عوروج توانی بەهۆی ئەو پاڵپشتیەوە بچێتە ناو جەزائیرەوە فەرمانڕەواکەی بکوژێت پاش ئەوەی دڵنیا بو لە هەوڵەکانی ئەو فەرمانڕەوایە بۆ پشت بەستن بە هێزە ئیسپانیەکان . هەروەك توانی بچێتە بەندەری شرشال و کاروباری جەزائیری لەدەستیدا کۆبوویەوە و لە هەمان ساڵدا کە تیایدا هێزە مەملوکیەکان لەشام لە ساڵی ١٥١٦ ز دا لە ڕووداوی مەرج دابق لە بەردەم هێزەکانی عوسمانیدا شکان . بەیعەتی پێدرا [1] .

---

[1] حرب الثلاثمائة سنة بين الجزائر وإسبانيا / ١٧٤، ١٧٥ .

ئەو دووبرایە نەیاندەتوانی هەستن بەو فەتحکردنانە ئەگەر هاندانی سوڵتانی عوسمانی و پاڵپشتی نەبوایە بۆ پاڵ پشتی گەلانی ناوچەکە . پێشتر باسکرا کە شکستیان خوارد بۆ چوونە ناو بجایە لە بەرامبەر هەمان ئەو هێزە دوژمنانە دا [1].
پاش ئەوەی خەیرەدین لە جەزائیر بەڵێنی پێدرا لە دوای ئەو سەرکەوتنانەی کە بەسەر ئیسپانیاو سەرکردەناوچەییە هاوپەیمانەکانی ئیسپانیدا بەدەستی هێنا . بوویە وێستگەی هیوای زۆرێك لە و ویلایەت و ناوچانەی کە هێشتا ملکەچ بوون بۆ ئیسپانیەکان یان بەکرێگیراوە ئیسپانیەکانیان .
یەکەمینی ئەوانەی داوای سەرخستنیان لێکرد ، خەڵکی تلمسان بوون ، لەگەڵ ئەوەی دا دەکرا داخوازی ڕزگارکردن و فریاکەوتنی خەڵکەکە کە بەست بێت بۆ دەستێوەردانی ( خەیرەدین ) لەگەڵ ئەوەدا پێگەی ستراتیژی تلمسان بوونی خەیرەدینی لە جەزائیر دەکردە هۆی لاواز نەبوون و لە ناو نەچوونی ، ئەمە وای لە خەیرەددین کرد بیر بکاتەوە لە دەستێوەردان پێش ئەوەی خەڵکی ناوچەکە داوای ڕزگارکردن و فریاکەوتنی لێبکەن . داواکاریەکانیش دەبوونە هۆی پەلە کردنی لەو کارەدا [2].
خەیرەدین سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد و پێی کشا بۆ تلمسان لە ساڵی ١٥١٧ز و ڕێگەکەی بۆ ئارام و بێترس کرد ، دوای ئەوەی توانی سەرکەوێت بەسەریدا ، ئیسپانیاو بەکرێگیراوەکانیان توانیان بە هۆی بەنوحەمودەوە بیگێڕنەوە و یەك لە براکانی خەیرەدین لە ناو بچێت کە ئیسحاق بوو ، هەروەك عوروج و زۆرێك لە پیاوەکانی لە کاتی ئابلۆقەی شارەکەدا کوژران ، ئەو ئابلۆقەیەی کە بۆ ماوەی ٦ مانگ یان زیاتر درێژەی کێشا تا ساڵی ١٥١٨ ز .

---

[1] قراءة جديدة في تاريخ العثمانيين / ٥٨ .

[2] قراءة جديدة في تاريخ العثمانيين / ٨٦ .

ئەو ڕوداوانە کاریگەریەکی گەورەی لە دەرونی خەیرەدیندا بەجێهێشت کە پاڵی پێوە نا بۆ بیرکردنەوە لە بەجێهێشتنی جەزائیر ئەگەر بێت و خەڵکەکەی زۆریان لێنەکردایە بۆ مانەوە . ڕازی بوونی لەسەر مانەوە وای لێکرد هەوڵی زیاتر بە خەرج بدات لە ترسی ئەوەی ئیسپانیاو هاودەمەکانی هێرشی نەکەنەسەر . هەروەك ئەوە بووە هۆی ئەوەی زیاتر ئاراستەی بەرەو پەیوەندی بە دەوڵەتی عوسمانی ببات بە تایبەت دوای ئەوەی میسرو شامی گرتەدەست . ئەوەیش پێویستبونی هەردولا دوپات دەکاتەوە بە زیاتر پەیوەندی لەگەڵ ئەوی تریاندا[1] .

چوارەم : دانیشتوانی شاری جەزائیر نامەیەکی فریاکەوتنیان نارد بۆ سوڵتان سەلیمی یەکەم ، مامۆستا دکتۆر عبدالجلیلی تەمیمی هەستا بە وەرگێڕانی بەڵگەنامەیەکی تورکی پارێزراو لە ( دار المحفوظات التأريخية ) لە ئیستانبوڵ ،- طوب قابی سیرای - لە ژمارە ٤٦٥٦ ئەو بەڵگەنامەیە ئاماژەیە بە نامەیەکی ئاراستەکراو لە لایەن خەڵکی شاری جەزائیرەوە بە هەموو پایەو ئاستەکانیانەوە ، کە مێژووی سەرەتاکانی مانگی ذي القعدە ی ساڵی ٩٢٥ك پێوەیە لە ماوەی ٢٦ ی مانگی ئۆکتوبەر ( تشرینی یەکەم ) بۆ ٣ی مانگی نۆڤەمبەر ( تشرینی دووەم )ی ساڵی ١٥١٩ ز ، کەبە فەرمانی خەیرەدین نوسرابوو بۆ سوڵتان سەلیم دوای گەڕانەوەی لە میسرو شامەوە بۆ ئەستانبوڵ ، مەبەست لەم نامەیە بەستنەوەی جەزائیر بوو بە دەوڵەتی عوسمانیەوە . لە نامەکەدا هاتبوو کە خەیرەدین تەواو خوازیاری ئەوەیە خۆی بچێت بۆ ئەستانبوڵ تاکوو خودی خۆی لایەنەکانی باس و خواسی جەزائیر بخاتە ڕوو بۆ سوڵتان سەلیمی یەکەم ، بەڵام سەرکردەکانی شاری جەزائیر داوایان لێکرد لەوێ بمێنێتەوە تابتوانێت بەرەنگاری دوژمنان ببێتەوە ئەگەر جولان . داوایشیان لێکرد باڵوێزێك بنێرێت لە جیاتی خۆی ، ئەو نامەیەی کە دەستەیەکی نێردراو بەناوی دادوەرو وتاربێژ و فیقە زان و خەڵکەکەو بازرگان و

---

[1] قراءة جديدة في تاريخ العثمانيين / ٨٦ .

ناوداران و هەموو دانیشتوانی نیشتەجێی شاری جەزائیرەوە هەڵیان گرتبوو .
هۆگری قوڵی بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەنواند ، ئەوەیش سەرکردایەتی باڵوێزەکەی دەکرد ( فیقهـ زانی زانا مامۆستا أبو العباس احمدی کوڕی قاضي ) بوو کە لە گەورەترین زاناکانی جەزائیر بوو هەروەك سەرکردەیەکی سەربازی و پێشەوایەکی سیاسیش بوو دەیتوانی بارودۆخی وولاتەکەی و ئەو مەترسیانە بخاتە ڕوو کە لە هەموو لاوە چواردەوریان دابوو .
باسی جیهاد کردنی ( عوروج ) لە بەرگری بێباوەڕاندا کرد لەگەڵ ئەوەی ناصر الدین چۆن بووە بە پارێزگاری موسوڵمانان ، هەروەها باسی ئەوەیان کرد کە چۆن جیهادی کردووە تاکو شەهید بووە لە ئابلۆقەی شاری تلمسان لە لایەن ئیسپانیایەکانەوە ، وەچۆن براکەی ( موجاهیدی ڕێگای خوا أبو التقی خیرالدین ) جێگەی گرتەوە کە چاکترین جێگیر بوو و بەرگری لێکردین ، جگە لە دادپەروەری و بەویژدانی و شوێنکەوتنی پەیامی پیرۆزی پێغەمبەرایەتی هیچی ترمان لێنەدیتوە ، ئەو بە چاوێکی گەورەو شکۆوە دەڕوانێت بۆ پایەی ئێوەو ماڵ و سامان و گیانی خۆی بۆ جیهاد لە پێناو ڕەزامەندی خواو بەرزکردنەوەی قسەی خوادا تەرخان کردووە ، سەری هیوایشی دەسەلاتی بەهێزتانە کە شکۆداری و گەورەیەکەی دیارە ، هەروەك خۆشەویستیمان بۆی پاك و ڕوونە و ئێمەش لە گەڵیدا ڕادەوەستین ئێمەو ئەمیرەکەمان خزمەتگوزاری دەرگای ئێوەین ، خەڵکی هەرێمی بجایە و ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات لە خزمەتی پایەی بەرزی ئێوەدان ، ئەوەی جێباسە هەڵگری ئەو نامە نوسراوە ئەوەتان بۆ دەخاتە ڕوو کە چی ڕوداوو ئاشتی لەو وڵاتەدا ڕووئەدات)[1] .
ئەو نامەی پێشوو ڕای جەزائیریەکان ڕوون دەکاتەوە بۆ لێکۆڵەر بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی ، لەو ڕایانە ئەوەیە کە خەیرەدین وەك حاکمێکی موسوڵمان لە

---

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية : ٢/ ٩١٠ .

باكوری ئەفریقادا ڕەفتار دەكات ، ئەو ڕێزی ڕێبازی شەریعەتی ئیسلام دەگرێت و جێبەجێی دەكات ، وە بە دادپەروەری بەرنامەو یاسای لێوەردەگرێت لە فەرمانڕەواییدا :
–چالاكی ئەو جەخت دەكاتەوە لەسەر سەركردایەتی چالاكیە جیهادیەكان دژ بە مەسیحیەكان .
–ئەو هەموو ڕێزو پێزانینێك دەخاتە ڕوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی و پاشاكەی.
–نامەكە بەڵگەیە لەسەر پابەندی و یەكانگیری بەرەی ناوخۆیی و ڕونی ئامانجی بەرامبەر موسوڵمانانی جەزائیر [1] .
پێنجەم : وەڵامدانەوەی سوڵتان سەلیمی یەكەم بۆ خەڵكی جەزائیر :
سوڵتان سەلیم بە پەلە پایەی بەگلەربەگی دا بە خەیرەدین پرپروسە ، بەمە بووە سەركردەی هەرەگەورەی هێزە چەكدارەكان لە ناوچەكەیدا ، وەك نوێنەری سوڵتان ، بەمە جەزائیر كەوتە ژێر حوكمی دەوڵەتی عوسمانی و هەر دەستدرێژیەكی دەرەكی بۆ سەر خاكەكانی بەواتای دەستدرێژی بوو بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی ، سوڵتان سەلیم ئەو بڕیارەی پاڵپشتی كرد بەوەی هێزێكی لە چەكی تۆپ و ٢٠٠٠ سەربازی ئینكیشاری نارد بۆ جەزائیر لەو كاتەوە ( ١٥١٩ز ) ئینكیشاریەكان لە ژیانی سیاسی و سەربازیدا دەركەوتن لە هەرێمەكانی عوسمانی لە باكوری ئەفریقادا و بوونە ڕەگەزێكی دیار و كاریگەر لە ڕووداوی ڕوودوەكاندا پاش ئەوەی ڕێژەیەكی زیاتریان لێنێردرا بۆ ئەو هەرێمانە .
سوڵتان مۆڵەتی دابە هەریەك لەو ژێر دەستە موسوڵمانانەی كە بیویستایە گەشت بكەن بۆ جەزائیر و چونە نێو ڕیزی موجاهیدەكان ، بڕیاری پێدانی دەستكەوت ( إمتیان) ی دا بۆ ئەو خۆبەخت كەرانەی كە دەچن بۆ جەزائیر بۆ نێو فەیلەقە ئینكیشاریەكان وەك هاندانێكیان بۆ چوونەنێو كەتیبەی موجاهیدەكانەوە .

---

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية :٢ / ٩١١ .

دانیشتوانی ئەنادۆڵ لە ڕۆژهەڵاتەوە کۆچیان کرد بۆ جەزائیر بۆ جیهاد کردن دژی مەسیحیەکان ، ئەو بڕیارانەی کە سوڵتان سەلیمی یەکەم دەری کردن چەند ئەنجامێکی گرنگی لێکەوتەوە ، لەوانە :

١. جەزائیر بەڕەسمی چووە ژێر سەرکردایەتی عوسمانی لە ساڵی ١٥١٩ ز دا، وەلەسەر مینبەرەکان دۆعا بۆ سوڵتان سەلیم کراو بەناوی ئەوەوە دراو لێدرا .

٢. ناردنی هێزە عوسمانیەکان لە ئەنجامی داخوازی فریاکەوتنی خەڵکی جەزائیرەوە بوو لە دەوڵەتی عوسمانی و وەڵامدانەوەی خواستەکەیان، بۆیە چوونە ناوی هێزە عوسمانیەکان بە جەنگ یان فەتح کردنی سەربازی نەبووە دژ بە خواستی خەڵکی وڵاتەکە .

٣. هەرێمی جەزائیر یەکەم هەرێم بوو لە هەرێمەکانی باکوری ئەفریقیا کە چووە ژێر سەرکردایەتی عوسمانی ، جەزائیریش بووە جێگەی جەختی بزوتنەوەی جیهادی دەوڵەتی عوسمانی لە دەریای ناوەڕاستدا [1] .

کە دوای ئەوە سوربوو لەسەر کشانی قەڵەمڕەوی بۆ هەموو هەرێمەکانی باکوری ئەفریقی بۆ یەکخستنی لە ژێر ئاڵای ئیسلام و کارکردن بۆ ڕزگار کردنی موسوڵمانانی ئەندەلوس لەو کارە دڕندانانەی کە ئیسپانیای مەسیحی پێی هەڵدەستا .

بەڕاستی سەردەمی سوڵتان سەلیم سەرەتایەکی نەوازشی بوو بۆ کشانی قەڵەمڕەوی عوسمانی بۆ هەرێمەکانی باکوری ئەفریقیا لە پێناو پارێزگاری کردن لە ئیسلام و موسوڵمانان ، سولەیمانی کوڕیشی ئەو پرۆژە جیهادیەی درێژە پێدا .

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية : ٢/ ٩١٣ .

سوڵتان سەلیمی عوسمانی وەڵامی ئەو بانگەوازەی برا ئایینیەکانی دایەوە بۆ جیهاد کە هەر لەسەرەتاوە پەیوەست بوو بە ناوی دوو براکەوە ، عوروج و خەیرەدین پرپروسە [1] .

شەشەم : ئەو هەڕەشانەی لە بەرامبەر خەیرەدیندا هەبوون :

خەیرەدین دەبوو لە بارودۆخی سیاسی و سەربازی نوێیدا جەنگ لە دژی دوو بەرە بکات :

١. بەرەی ئیسپانی بۆ ڕاوە دوونانی ئیسپانیەکان لەو شوێنانەی کە تیایدا جێگیر بووبوون و دەستەو کەمینەیەك لە ڕۆژهەڵاتی جەزائیر دایانە پاڵیان و سەرکەوتنێکی دیاریان بەسەر ئیسپانیەکاندا بەدەست هێنا کاتێك لە ساڵی ١٥٢٩ ز دا زاڵبوون بەسەر قەڵای بینونی ئیسپانی لە سەر جەزیرەی بەرامبەری وڵاتی جەزائیردا. بەردەوام ئەو قەڵایەی بە گوللەی تۆپەکانی تۆپباران دەکرد بە درێژایی ٢٠ ڕۆژ تاکوو لاکانی کەوتن و ڕوخان ، پاشان قەڵاکە تێکشکا لەگەڵ هێزێکی ژمارە چڕدا کە ٤٥کەشتی هەڵیانگرتبوون کە لە کەنارەوە هاتبوون ، ئینجا سەرکردەی قەڵاکە لەگەڵ گەوەر ئەفسەرەکانیدا گیرا .

زاڵبوونی خەیرەدین بەسەر بینون دا لەساڵی ١٥٣٩ ز دا بەسەرەتای ئەو دامەزراندنە دادەنرێت کە بە ناوی (نیابة الجزائر) ناسراوە ، لەو مێژووەوە بەندەری جەزائیر بوویە پایتەختێکی گەورەی ڕۆژئاوای ناوەڕاست ، بەڵکو دواتر هەموو باکوری ئەفریقیای عوسمانی بوو ، بەمە بەکارهێنانی چەمکی جەزائیر بۆ ئاماژە بۆ هەرێمەکانی جەزائیر بوو تاکۆتایی سەدەی ١٨ز .

٢. بەرەی ناوخۆیی : ئەمەش خۆی دەنواند لە هەوڵی یەکخستنی ڕۆژئاوای ناوەڕاستدا کە بێبەش نەبوو لە پیلانەکانی بەنی زیان و حەفصیەکان و هەندێ لە هۆزەبچوکەکان ، بەلام توانی کە ناوچەی قەڵەمڕەوی بەناوی دەوڵەتی

---

[1] المشرق العربي والمغرب العربي / ٩٧ .

عوسمـانی بـەوە درێـژە پێبـدات ، ئیمارەتـە بـچوکەکان چـوونە ژێـر قەڵـەمڕەوی عوسمانیـەوە تـاکوو بـەو هێـزەوە پارێزگـاری لـە چاوچـنۆکیە خاچپەرسـتیە ئیسپانیەکان وله کۆش نەگرتنی مەسیحیەت بکات. خـەیرەدین بـەردەوام بـوو تا قەڵەمڕەوی عوسمانی گەیاندە هەندێ شاری گرنگی ناوخۆیی وەك قوستەنتینیە [1].

بەڕاسـتی خـەیرەدین سـەرکەوتوو بـوو لـە دانـانی پاڵپشتی بەهێزدا بۆ دەوڵـەتی گـەنجی جـەزائیر ، یارمەتیـە عوسمانیـەکانیش بەبـەردەوامی لـە لایـەن سـوڵتان سـولەیمانی قانونیـەوە دەگەیـشتن کـە بەهۆیـەوە تـوانی هـەزاران موسـوڵمان لـە ئیسپانیا ڕزگار بکات .

لە ساڵی ٩٣٦ك ، ١٥٢٩ ز هەستا بە ئاراستەکردنی ٨٦کەشتی بەحـەوت جار بۆ کـەنارە ئیـسپانیەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی لەحـەوزی ڕۆژهـەڵاتی دەریـای ناوەڕاستدا ، بەفـەزڵی خـواو پاشـان بەهۆی یارمەتیەکانی دەوڵـەتی عوسمانی و دەسـتکەوتەکانی خەزێنـە جۆراوجۆرەکـانی جـەزائیر لـە بـاج و ( سـبی ) و دەسـتکەوت و زەکـات و دەیـەك و سـەرانەو فـەیئ و خـەراجـەوە، هەروەهائـەو دابینکاریـەی دەسـکەوت و شـتی تـر لەلایـەن فـەرمانڕەواو سـەرۆك هـۆزو عەشیرەتەکانەوە هەبوو، دەوڵەتی جەزائیر بنکەیەکی ئابوری بـەهێزی بۆ دروست بوو [2].

بەڕاستی ئیسپانیا بە سەرکەوتنی خەیرەدین لە باکوری ئەفریقیدا زیانی لێکەوت کە ئیسپانیا لە لایەن شارلی پێنجەمەوە ئیمبراتۆری دەوڵـەتی ڕۆمانی پیرۆزەوە سـەرکردایەتی دەکـرا ئـەو کاتـەیش ئیـسپانیا و بـەلجیکاو هۆڵەنـدا و ئـەڵمانیا و نەمساو ئیتالیـای لـە خـۆ دەگـرت ، ئـەو دەوڵەتـە ڕۆمانیـە پیرۆزە بـەرگری لـە

---

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية : ٢/ ٩١٣ .

[2] جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس / ٣١١ .

ئـەوروپای مەسـیحی دەکـرد دژ بـە مەترسـی عوسمـانی لەسـەر ڕۆژهـەڵات و ناوەڕاستی ئەوروپا ، بۆیە دەکرێت بڵێین ململانێی نێوان شارلی پێنجەم و نێوان بەگلەربەگی جەزائیر کردنەوەی بەرەیەکی جەنگی نوێیە دژی دەوڵەتی عوسمانی لە باکوری ئەفریقیدا، بۆیـە شارل بەهێرش بردنـی لەناکاو بۆ سـەر کەنارەکانی جـەزائیر نەوەسـتا بـەڵکو لەسـاڵی ٩٤٠ ك ، ١٥٣٣ز دانێردراوێکـی نـارد بـۆ هـەواڵگری لـە باکوری ئـەفریقیا ، کـە ( اوشـوا دوسـلا ) ی ئەفسەر بـوو دوسـلا چـواردەوری تـونس گـەڕا ، لێـرەدا ئامـادەیی حەفـصیەکان دەردەکـەوێت بـۆ یارمەتیدانی شارلی پێنجەم ، کە دەترسا لە فراوانبوونی قەڵەمڕەوی عوسمانی بۆ سـەر تـونس ، باس دەکرێـت کـە ئـەو زاڵبونـە دەبێتـە هـۆی ئاسان زاڵبـونی عوسمانیەکان بەسەر ئەفریقیادا ، پاشان دوای ئەوە دەکەونە ڕێ بۆ گەڕاندنەوەی ئەندەلوس ئەوەیش ئەوەبوو کە جیهانی مەسیحی لێی دەترسا .

سیاسەتی مەملەکەتی حەفصی لە تـونس بەرەو دواکـەوتنێکی بەدەوام دەچوو ، سوڵتانی حەفصی حەسـەنی کوڕی محمد خراپەکاری ئـەنجام دەدا لە وڵاتـدا و ژمارەیـەك لـە براکـانی خـۆی کوشـت بەمـە بارودۆخـەکان لـە تونسدا پێکیانـداداو هەندێ کەس لە گوێڕایەڵی سوڵتانی حەفصی دەرچوون .

براکەی حەسەن ناو دەبرا بە ( الامیر الرشید) لە ترسی کوشتن لە براکەی ڕایکردو پەنای برد بۆ لای عەرەب لە بادیە ، پاشان چوو بۆ جەزائیر بۆ لای خەیرەدین و داوای پاراستن و یارمەتیدانی لێکرد دژ بە براکەی[1] .

خـەیرەدینیش ئامادەیی خـۆی نوانـد بـەو هۆیـەی کـە گرینگیـدانی ئـەو جەختی دەکردەوە لەسەر تونس بەهۆی لاوازی حەفصیەکان و ئەو ناکۆکیە ناوخۆییانەی کە بنەماڵـەی حەفـصی تواندەوە . هـەروەك لـە ڕوانینی ئـەودا تـونس گرنگیـەکی سـتراتیژی گـەورەی هـەبوو بـۆ سەرپەرشـتی کردنـی گـەرووی سـەقلیە بـەجۆرێك

[1] جهود العثمانيين لإنقاذ الأندلس / ٣١١ .

زاڵبون بەسەریدا سنوورداركردن و بڕینی پەیوەندیەكانی نێوان هەردوو حەوزی ناوەڕاستی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی یان بۆ لەبار بكات .
ئەمە لەگەڵ خواستی خەیرەدیندا بۆ یەكخستنی ولاتانی ڕۆژئاوا لەژێر حوكمی دەوڵەتی عوسمانیدا تاكوو گەڕاندنەوەی ئەندەلوسیان بۆ بەدەست بهێنێت .
حەوتەم : سەفەری خەیرەدین بۆ ئەستانبوڵ : سوڵتان سولەیمانی قانونی پاش ئەوەی دەستی گرت بەسەر بەلگراد دا سوربوو لەسەر بەڕێكردنی سەربازەكانی بۆ ئیسپانیا تاكو سەركەوێت بەسەر ئەوێیشدا .
سوڵتان سولەیمان ڕای وابوو كە دەبێت كەسێك هەبێت كە پشتی پێببەسترێت بۆ چوونەنێو ئەو وولاتانە بەوەی شارەزای بارودۆخەكەی بێت . بۆیە خەیرەدینی هەڵبژارد چەنكە ئەو دلێربوو و ئامادەبوو شارەزایی هێرش كردنە سەر ئەو ناوچەیەشی هەبوو جگە لەوەی كە هەستابوو بە فەتحكردنی وولاتانی عەرەب لە باكوری ئەفریقیدا و حوكمی عوسمانی تێدا چەسپابوو. بۆیە دەقێكی ئاراستەكرد كە تیایدا داوای ئامادەبوونی لێ دەكات و فەرمانی پێدەكات تا كەسێك لەوانە بكاتە جێگیر لە جەزائیردا كە جێی متمانەی ئەون، ئەگەر كەسی نەدۆزیەوە بۆ لەباركردتی ئەو كارە ئەوا سوڵتان جێگرێكی بۆ دەنێرێت . ئەو دەقەی لەگەڵ پیاوێكدا نارد كە بە ( سنان جاوشی ) بانگ دەكرا . ئەویش گەیشتە جەزائیر و دەقەكەی سوڵتانی گەیاند بە خەیرەدین و ئەویش قبوڵی كرد. كاتێك خوێندیەوە و شارەزای مەبەست و خواستی ناو دەقەكە بوو ، دیوانێكی گەورەی سازدا و هەموو زانایان و ناودارانی وولاتی ئامادەكرد و دەقەكەی سوڵتانی بۆ خوێندنەوە كە سوڵتان ئاراستەی كردبوو . وەتێیگەیاندن كە ناتوانێت لە فەرمانەكەی سوڵتان لابدات، كاتێك ئەندریا دوریا پێشەوای كەشتیەوانی مەسیحی لە دەریای ناوەڕاست ئەو سووربونەی سوڵتانی بیست

لەمەڕ فەتح کردنی ئیسپانیا هاوکات بەدەمەوەچوونی خەیرەدینیش لە جەزائیردا بۆ ئەو کارە، ویستی کە خەیرەدین سەرقاڵ بکات تا نەچێت بۆ لای سوڵتان [1].
لە نێو دیلە مەسیحیەکانی جەزائیردا بانگەشە بڵاو بوویەوە لەبارەی سوربونی حکومەتی ئیسپانی لەمەڕ هێرش کردنە سەر بۆ سەر جەزائیر و ڕزگارکردنیان لە دیلی . بۆیە دیلەکان دڵخۆش بوون بەو هەواڵە و لە خەیرەدین هەڵگەڕانەوە کە وایدەبینی بەرژەوەندی گشتی وایە کە ئەو دیلانە لەسێدارە بدات تاکوو دڵنیابێت لە زیاد نەبوونیان ، پاشان هەستا بەبەهێز کردنی قایمکاریەکانی جەزائیر ، ژمارەی قەڵاکانیشی بەشێوەیەکی دیار زیاد کردو گوێڕایەڵی بۆ سوڵتان هێنایەدی [2].
خەیرەدین سووربوو لەسەر چوونی بۆ ئەستانبوڵ لە ٩٤٠ك ، ١٥٣٣ز و حەسەن ئاغا طوشي لە شوێنی خۆیدا دانا کە پیاوێکی ژیر و پیاوچاك و خاوەن زانستێکی فراوان بوو [3].
خەیرەدین لە دەریای ناوەڕاستەوە بە هاودەمی ٤٤ کەشتی ڕووەو ڕۆژهەڵات چوو ، لە ڕێگەکەیدا دەستەیەك لە کەشتیەکانی ئالی هایسبوجی لە نزیك مۆرە تێکشکاند، خەیرەدین لە گەشتەکەیدا بەردەوام بوو و گەیشتە بیروزان ، خەڵکی شارەکە بە هاتنی خۆشحاڵ بوون ، چونکە ئەوان لە هێرشی ئەندریا دوریا دەترسان کاتێك خەیرەدینی هات، هێرشەکە دورکەوتەوە ، پاشان خەیرەدین درێژەیدا بە گەشتەکەی ، تاکوو گەیشتە قەڵای أواریـن ( أناوارنیە) لەوێدا گەیشت بە کە شتیگەلێکی سوڵتان سولەیمانی قانونی هەموان بەمە خۆشحاڵ بوون ، پاشان هەموو پێکەوە دەرچوون تا گەیشتنە چەند شیلانێك ( قرون)

---

[1] سيرة خير الدين باشا ،ق ٤٨١٤٨ب .
[2] حقائق الأخبار عن دول البحار : ١/ ٣٦١ .
[3] فتوحات خيرالدين ، ق ٢٧٠ ا ، ٢٧٠ .

پاشان خەیرەدین نامەیەکی نوسی بۆ سوڵتان و ئاگاداری دەکردەوە بە گەیشتنی و داوای وەرگـرتنی مۆڵـەتی ئامـادەبوونی لێـدەکرد ، سـوڵتانیش دەقێکـی ئاراستەکرد کە شەیدایی خۆی نیشان دەدات بە هاتنی [1].

خـەیرەدین لـەو شـیلانانەوە بەڕێکـەوت و لەگەشـتەکەیدا بـوو تاکووگەیـشتە ئەستەنبوڵ و لـەوێ وەستا ، لـەوێ وەك نـەریتیان تۆپیـان وەشاند بەئاسمانـدا ( لەخۆشیدا) خەیرەدین چووە لای سوڵتان بوو و لەبەردەستیدا ڕاوەستا ئەویش فـەرمانی کـرد ك خـۆی و هاوەڵـە تایبەتیـەکانی لـە ( الجرایـات الـوافرە) سـەگە هاودەمـەکانیان دوور بگـرن و لەیـەکێك لـە کۆشـکەکانیدا دایبەزانـدن و لـە (دار الصناعە) چاوخشاندن بە کاروبارەکانی پێ سپارد[2] و نازناوی ( قبودان پاشا — وەزیری دەریایی) پێبەخشی تاکو دەسەڵاتی تـەواوی یارمەتیدان و دەستگرۆیی هەبێت .

( الـصدر الأعظـم ) سـەدری گـەورە لـەو کاتـەدا لەشـاری حەلـەب بـوو کـەهاتنی خـەیرەدینی بیـست بـۆلای سـوڵتان ، ئـەو هـەواڵی جەنگـەکانی بـەرەنگاری مەسیحیەکانی پێـی گەیشتبوو ، بۆیە تامـەزرۆی بینـینی خـەیرەدین بوو ، بۆیـە دەقێکی ئاراستەی سوڵتان کرد کە تیایدا تکای لێ دەکرد خـەیرەدین بنێرێـت بۆ لای تـا بیبینێـت ، سوڵتانیش هـەواڵی نـارد بۆ لای خـەیرەدین لەمـەڕ تامـەزرۆیی سەدری گەورە ، خـەیرەدینیش بەڕەزامەنـدی وەڵامـی دایـەوە ، خـەیرەدین بەرەو حەلـەب بەڕێکـەوت ، سەدری گەورە بەهاتنی خـەیرەدین بۆ حەلـەب ئاهـەنگێکی گێـڕاو لــە هەنـدێ کۆشــکی سەرسـوڕهێنەردا دایبەزانـد ، لـە ڕۆژی دووەمـی گەیشتنی خەیرەدین دا نێردراوێك لە لایەن سوڵتانەوە گەیشت کە جلێکی پێبوو تیایـدا فـەرمانی بـەوە کـرد کـە خـەیرەدین لـە وەزیرەکـانی سـوڵتانەو ئـەو جل

---

[1] فتوحات خیرالدین ، ق ٢٧٠ أ ، ٢٧٠ .

[2] فتوحات خیرالدین ، ق ٢٧٠ أ ، ٢٧٠ .

لەبەردەکات ، ئەو کات چووە دیوانی گەورە و جل و بەرگی وەزارەتیان لەبەرکرد و ئاهەنگێکی سەرسوڕهێنەریان بۆ گێڕا و ڕێزێکی گەورەیان لێگرت بەو هۆکارەی ئەو لە حەوزی دەریای ناوە لە ڕاستیدا چەندین خزمەتگوزاری پێشکەش کردبوو بە ئیسلام و موسوڵمانان.

پاشان خیرەدین گەڕایەوە بۆ ئەستانبول و سوڵتان ڕێزی لێگرت ، خەیرەدین دەستی کرد بە ڕوانینە نێو کاروباری ( دار الصناعه ) هەروەك سوڵتان ئەو ئەرکەی پێ سپاردبوو[1].

پاش ئەوەی ئامادەکردنی کەشتیگەلی نوێی عوسمانی تەواو بوو ، خەیرەدین بربروسە بە کەشتیگەلە بەهێزەکەیەوە لە دەردەنێلەوە دەرچوو بەرەو کەنارەکانی ئیتالیای باشور و توانی زۆرێکیان بگرێت و شارو کەنارەکانی دەست بەسەردا بگرێت ، پاشان بەرەو دورگەکانی صەقلیە چوو و کورون و لیبانتوی گەڕاندەوە (بۆ دەوڵتی عوسمانی)[2].

سوڵتان سەلیم لەگەڵ خەیرەدین بربروسەدا گفتوگۆی لەسەر گرنگی تونس و پێویستی چونی تونسی دەکرد نێو چوارچێوەی ستراتیژی دەوڵەتی عوسمانی لە پێناو بەدیهێنانی ئامانجەکەی بەرەو گەڕاندنەوەی ئەندەلوسدا. گرنگی تونس لەمەڕ دەوڵەتەوە بەپێی پێگە جوگرافیەکەی دێت کە دەکەوتە نێوەندی کەناری باکوری ئەفریقی و نێوان جزائیر وتەرابلوسەوە ، هەروەها لەبەر نزیکی لە ئیتالیا کە یەکێکە لە باڵەکانی ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی پیرۆز لە کاتێکدا باڵەکەی تری ئیسپانیابوو ، لەسەرو ئەوەیشەوە ، هاوسێیەتی لەگەڵ دورگەی ماڵتەی پێگەی سوارەکانی قدیس یوحەننای هاوپەیمانی ئیمبراتۆر شارلی پێنجەم و توندترین هۆزە مەسیحیە دوژمنکارەکانی موسوڵمانان و پاشان ئەو توانا لە بارانەی کە

---

[1] جهود العثمانيين لإسترداد الأندلس / ٣١٧ .

[2] ليبيا بين الماضي والحاضر / ١٦٦ .

شـوێنەكانی تونـسی دەگرتـەوە لـە حـوكم پێكردنـی پەیوەندیـە دەریاییـەكانی دەریـای ناوەڕاسـتدا. بـەو جـۆرە ئـەو هۆكارانـە بوونـە مایـەی باڵكێشانی گرنگـی سەربازی بەسەر تونسدا [1].

قۆناغی دووەم لـەبارەی خەیرەدینـەوە لـە دوای هێرشـەكەی بۆ سـەر كـەنارەكانی باشـوری ئیتالیـاو دورگـەی صـەقلیە تـونس بـوو ، ئەمـەیش بـۆ جێبـەجێكردنی پلانـی دەوڵـەت بـوو كـە پاككردنـەوەی بـاكوری ئـەفریقای لـە خـۆ دەگـرت لـە ئیـسپانیەكان وەك سـەرەتایەك بـۆ گەڕاندنـەوەی ئەنـدەلوس كـە پێـشتر ئامـاژە بەوەكرا خیرەدین بربروسە ئاماژەی بۆ سوڵتان سەلیمی قانونی كرد لەو دەقەیدا كە بۆ سوڵتانی نارد كە كەمێك پێش داواكاری و بانگكردنەكەی سوڵتان بـوو لـە ٩٤٠ك ، ١٥٣٣ز ، تیایدا ووتی: ( ... ئەگـەر پایـەی بەشداریم پێدرا ئامانجی مـن بریتیە لە دەركردنی ئیسپانیا لە ئەفریقیا لە كورتترین كاتـدا ، دەشكرێت دوای ئـەو ببیـستیت كـە ڕۆژئاواییـەكان سـەرلەنوێ دەدەن بەسـەر ئیـسپانیادا تـاكوو مەملەكـەتی قرتاجـە بگێڕنـەوە ، و تـونس بكەوێتـە ژێـر دەسـەڵاتی تـۆوە ، مـن لەپـــشت ئەمـــەوە نـــاتوانم نێـــوانی تـــۆو ئاراســـتەكردنی هێزەكانـــت لەبـــارەی ڕۆژهەڵاتەوە لێك جیابكەمەوە ، نەخێر ، چونكە ئەوە پێویستی بەوەندە هێز نیە ، بەتایبەت كاتێك جەنگەكانت لە ئاسیا یان ئەفریقیا زیاتر پشت بەوە دەبەستێت كە بەهێزی ووشكانی پشتی بەستبێت ، لەمەڕ ئـەم بەشـی سێیەمەی جیهانیش ئەوەی مـن داوای دەكـەم بەشێكە لـە كەشتیگەلەكەت و ئـەوەیش بەسـت دەبێـت ، چونكە ئەو بەشە پێویستە ملكەچی دەسەڵاتی تۆ بێت ..) [2].

كەشـتیگەلی عوسمـانی لـەژێر سـەركردایەتی خـەیرەدین دا گەیـشتە كـەنارە تونسیەكان و لەسەر شاری عەننابە وەستاو هەندێ فریاگوزاری ئەنجامدا، پاشان

---

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية مفترى عليها : ٢/ ٩١٥-٩١٦ .

[2] فتح العثمانيين عدن/ ١٢٧ .

بەرەو بنزرت پێشکەوت پاشان بەرەو حلق الواد چوو ، کە بەبێ سەختی و گرفت دەستی گرت بەسەریدا[1] . خەیرەدین لەلایەن وتاربێژو زانایانەوە پێشوازی لێکراو ڕێزیان گرت ، لەو کاتەدا بەرەو تونس چوون ، سوڵتانی حەفصی حەسەنی کوڕی محمد ڕایکرد بۆ ئیسپانیا ، پاشان خەیرەدین ڕەشیدی برای حەسەنی کوڕی محمدی لەسەر تونس دانا و لکانی تونسی ڕاگەیاند بە مەملەکەتەکانی عوسمانیەوە لە کاتێکدا کە قەڵەمڕەوی عوسمانیەکان لە حەوزی ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاستدا بڵاوبووبوویەوە[2] .

هەشتەم : کاریگەری جیهادی خەیرەدین لە سەر ڕۆژئاوای دوور:

سوڵتان أحمد أعرجی سەعدی سودی بینی لەو هەلانەی کە دەوڵەتی عوسمانی و گەلی جەزائیری خستیەگەڕ بە سەرکردایەتی خەیەردین بربروسە ، بۆیە هەستا بە گەمارۆدانی شاری ئاسفی لە ئەزمور ، ئەوەیش لە ساڵی ٩٤١ك ، ١٥٣٤ز بوو کە خەریك بوو شارەکە بکەوێتە دەستی سەعدیەکان ئەگەر بێت و ئەو فریاگوزاریانە نەبوایە کە پورتوگالیەکان ناردیان بۆ شارە گەمارۆ دراوەکە، وادیاربو هاوکاریەك لە نێوان عوسمانیەکان و هێزە ئیسلامیەکانی ڕۆژئاوادا دژ بە مەسیحیەکان و مەڵبەندەکانیان لە باکوری ئەفریقی هاتەدی ، کاتێك پاشای پورتوگالی جانی سێیەم هەواڵی گەیشتنی کەشتیگەلی عوسمانی بیست لە ٣ی ڕەبیعی یەکەمی ٩٤١ك ، ١٣ی سێبتەمبری ١٥٣٤ز بەسەرکردایەتی خەیرەدین بربروسە بۆ باکوری ئەفریقی ، بیری کردەوە لە دەست بگرێت بەسەر هەندێ لە مەڵبەندەکاندا وەك سەبتەو تەنجە کە بەڕای ئەو ناوچەی زیندوی بەرگری بوون لە بەرژەوەندیەکانی مەسیحیەکان لە ڕۆژئاوای دەریای ناوەڕاست و بەرگری هێرشی عوسمانی لە نیمچە دورگەی ئیبیریەوە پاشا یوحەننای سێیەم

---

[1] حرب الثلاثمائة سنة / ٢٣٠ .

[2] فتح العثمانيين عدن / ١٢٨ .

ڕاپرسیەکی نارد بۆ هەموو دەستەو ناوداران و ئوسقوفەکان لە وڵاتەکەیدا کە ڕاویـژی پێدەکردن لەمەڕ باس و خواسی دەستگرتن بەسەر هەندێ لە مەڵبەندەکانی بونی پورتوگالیەکان لە باشوری ڕۆژئاواوە . ئەوەیش جێی داخوازی بوو بریتی بوو لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە ئایا شیاوە کە ئاسفی و ئەزمور بە جێ بهێڵێین بۆ ڕۆژئاواییەکان ؟ ئایا شیاوە بەسەریاندایان بەسەر بەشێکیاندا زاڵ ببین ؟ ئەگەریش شیاوی پارێزگاری لێکردنیانن ، ئایا نەگۆڕێن بۆ قەڵا تاکوو کێشی تێچونیان کەم بکرێتەوە ؟ پاشان ئەو زیانە دەرەنجامەکانی چین و چۆن چارەسەریان بکەین؟.
پاشای پورتوگالی وەڵامگەلێکی پێگەیشتەوە لەنێو هۆگرانیدا لەبارەی مانەوە لە ناوچە باشوریەکانی حەوزی پورتوگالیدا. لەگەڵ بوونی نەیارانێکی ئەم ڕایەدا ، وەڵامی پیاوانی ئایینی بۆ پاشا جانی سێیەم ئێوە یەکدەنگ بوونێك بووکە ئامۆژگاری پاشایان دەکرد بە چۆڵ کردنی مەڵبەندەکانی باشورو پاشا هەموو هۆکارەکانی بەرگری ئەوێ بگوازرێتەوە بۆ مەڵبەندی باکور بۆ ڕێگری مەترسی عوسمانی بەسەرکردایەتی خەیرەدین بربروسە . ئوسقوفیش ئامۆژگاری دەکرد بە چۆڵ کردنی سانتاکروز و ئاسفی و ئەزمور . چونکە گرنگیان کەمترە لە زۆربەی ئەو تیچونانەی کە تیایدا بەخەرج دەدرێن ، هەروەها ئاراستەی هێزەکانی دژ بە فاس بەچاك دەزانی ، هەوەك ئامۆژگاری دەکرد بەچاك کردنی هۆکارەکانی بەرگریکدن لەسەبتە لەترسی هێرشی خەیرەدین بربروسە [1].
بونی عوسمانی لە جەزائیردا کاریگەری نواند لەسەر هەڵوێستی پاشای پورتوگالی لە ڕۆژئاوادا بەوەی پاشەکشەی کرد لە هەستانی بە چالاکی سەربازی لەو ناوچەیەدا هەروەك زاڵبوونی عوسمانیەکان بەسەر تونسدا سامێکی خستە نێو دەرونی پاپاو ئیمبراتۆر شارلی پێنجەمەوە پاپا کە ئەوەی بەهەڕەشەیەکی

---

[1] جهود العثمانيين / ٣٢٠ .

ڕاستەوخۆ دادەنا بۆ سەر مەسیحیەت و هێڵەکانی پەیوەندی دەریایی لەگەڵ دەوروبەری مەملەکەتەکەیدا [1].

هەڕەشەی عوسمانی گەیشتە ئەوپەڕ ، بەو هۆیەی کە دەوڵەتی عوسمانی زمانەتی زاڵبون بەسەر ڕێڕەوە تەسکەکانی نێوان صەقلیەو ئەفریقیای کردبوو [2].

نۆیەم : دەستگرتنی شارلی پێنجەم بەسەر تونسدا : هەڵوێستەکە بۆ ئیسپانیا لەباربوو ، ئەوەیش بۆ هەستان بە وەڵامدانەوەیەکی توند ، چونکە دەوڵەتی عوسمانی سەرقاڵ کردبوو بەجەنگ لەگەڵ شیعە لە وولاتی فارسدا و زاڵ بووبوو بەسەر ململانێی نێو ئەوروپادا ، فرانسوای یەکەمی پاشای فەرەنسایش پەیمانی بە شارلی پێنجەم دا بێ لایەن بوەستن، شارل دوودڵ بوو لە هەڵبژاردنی ئەو شوێنەدا کە بۆی بڕوات بۆ لێدانی جەزائیر یان تونس لە باکوری ئەفریقیادا، بەڵام ڕزگاریخوازی سوڵتانی حەفصی حەسەنی کوڕی محمد و خواستی لە دەرچوون لە ئیستانبوڵ، شارلی پێنجەمی پاڵ پێوەنا بۆ هەڵبژاردنی هێرش کردنە سەر تونس [3].

شارلی پێنجەم سەرکردایەتی چالاکیەکی سەختی دەریایی کرد کە لە ٣٠ هەزار جەنگاوەری ئیسپانی و هۆڵەندی و ئەڵمانی و ناپۆلی و صەقلی پێك هاتبوو لە نێو ٥٠٠ کەشتیدا . ئیمبراتۆر لە بەندەری بەرشەلۆنەوە چووە نێو دەریا ، کاتێك کەشتیەکانی لە بەرامبەر تونسدا وەستاند، جەنگانێکی توندو قورس لە نێوان هەردوو لادا بەرپابوو [4] .ئەو هۆکارەی کە زاڵبوونی ئیسپانیای بەسەر تونسدا

---

[1] رسالة غرناطة الى سلطان سليمان ، العدد :٣ تونس .

[2] جهود العثمانيين لإسترداد الأندلس / ٣٢١ .

[3] تأريخ الجزائر الحديث / ٣٤ .

[4] حقائق الأخبار عن دول البحار : ١/ ٤٣٠ .

گەڕاندەوە لە ساڵی ٩٤٢ك ، ١٥٣٥ز [1] ئەوەبوو کە هێزی خەیرەدین هێندەی پێویست نەبوو بۆ وەڵامدانەوەی ئەو هێرشە ، سوپای ئیسلامی ژمارەی سەربازەکانی ٧هەزار سەربازی عوسمانی بوو کە لەگەڵ خەیرەدیندا هاتبوون لەگەڵ ٥هەزار تونسیشدا ،هەروەك عەرەبەکان لە جیهادکردنەکە دواکەوتن ، بۆیە ئەنجامی بەدڵنیایەوە ئەوەبوو کە شارل دەستی گرت بەسەر قەڵای ( حلق الواد مرسی تونس ) دا [2].

ئیسپانیا حەسەنی کوڕی محمدیان بەفەرمانڕەوا دانا تاکوو بەپێی ئەو گرێبەستە کار بکات کە حەسەنی کوڕی محمد (بونەو مهدیە) بدات بە دەستی شارلی پێنجەمەوە ، بەڵێ دەستی گرت بەسەر (بونەدا) ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە مەهدیە لە حەوزەی عوسمانیەکاندابوو ، بۆیە حەسەن نەیتوانی پەیمانەکەی بێنێتەدی ، بۆیە ئیسپانیەکان مەرجیان لەسەر دانا کە ببێتە هاوپەیمان و یارمەتیدەری سوارەکانی قدیس یوحەننا لە تەرابلوس [3]و هەستێت بە دژایەتی کردنی عوسمانیەکان و بەلایەنی کەمەوە ئەرك و خەرجی ٢هەزار ئیسپانی بگرێتە ئەستۆ کە وەك پارێزەر لە قەڵای حلق الواد دا بەجێ دەمێنن ، شارلی پێنجەم گەڕایەوە بۆ ئیسپانیا و پێشوازی کرا جەنگاوەرە فەتحکەرەکان لە کاتێکدا کە سوڵتان جەنگی لەگەڵ سەفەوی شیعەی ڕافیزی دا دەکرد لە وڵاتی فارس [4].

دەیەم : گەڕانەوەی خەیرەدین بۆ جەزائیر : خەیرەدین لە دوای شکانی لە تونسدا گەڕایەوە بۆ جەزائیر و یەکەم جار لە قوستەنتینیەدا جێگیر بوو ، لێرەوە خۆی ئامادە کرد بۆ بەرپاکردنی جیهاد دژ بە ئیسپانیا لەو بەرانەوە کە دەست نیشانی

---

1 جهود العثمانيين / ٣٢١ .

2 حرب الثلاثمائة / ٣٢١ .

3 الأتراك العثمانيون في الأفريقية الشمالية / ٣٨ .

4 فتح العثمانيين عدن / ١٣٠ .

دەکـردن و بـە خـەیرەدینـەوە پەیوەسـت بـوون، بـۆ ماوەیـەکی کـاتی لـە شـاری جەزائیردا جێگیر بـوو لەبـەر ئـەو پابەند بوونانـەی کە نەخشە نوێیەکە بەسەریدا دەچەسپاند ، وەك بـەەنی قبـودان پاشـا بۆکەشـتیگەلی ئیـسلامی عوسمـانی کـە شارلی پێنجەم هەستی بە بوونی دەکرد تا بە لێدانێکی هاوشێوە بەرپەرچی ئەو لێدانـەی تـونس بداتـەوە. بۆیـە هەسـتا بـە هێـرش کردنـە سـەر دورگـەی ئیـسپانیەکانی بلبـار و کـەنارەکانی باشـوری تاگەیـشتە گـەروی جبـل تـاریق ، عـەننان خـۆی هەسـتا بـە هێـرش بردنـە سـەر کەشـتیە ئیـسپانی و پورتوگالیەگـەراوەکانی زەویـەکانی ئـەمریکا کـە هـەڵگری زێـڕو زیـو بـوون ، ئـەم ڕووداوانـە هـەموو نێوەنـدەکانی مەسـیحیەتی هەژانـد و شـارل دودڵـی و ڕاڕایـی تێکەوت لە کاتێکدا وای دەزانـی خـەیرەدین هـەرگیز خـۆی بـەهێز ناکاتـەوە پـاش ڕووداوی پێشووی تونس لە ٩٤٢ك ، ١٥٣٥ز دا [١] .

لەلایەکی ترەوە دەوڵەتی عومسانی چووە نێو هاوپەیمانێتیـەکی ڕەسمـی لەگـەڵ فەرەنسادا لەسـاڵی ٩٤٣ك ، ١٥٣٦ز کـە ئەمـەیش بـە دژە هەڵوێـستێك دادەنرێـت بەسەر ئەو هێرشە دژایەتیەی کە ئیسپانیا پێی هەستا بۆسەر تونس [٢] .

بۆیـە واهاتـە پـێش کـە ئیمبراتۆیـەتی پیرۆزی ڕۆمـانی لەلایـەن نـەیار فەرەنـساو عوسمانیەکانـەوە گـەمارۆ دراوە ، کـە بوویـە هـۆی سـەرلەنوێ سـەرهەڵدانەوەی جەنگـەکانی نێوانیـان ، هـەروەك ئامانجـەکانی ئیـسپانیا و پورتوغـال بووبەیـەك ، ئەمـەیش لـە داگـیر کردنـی مەڵبەنـدەکانی ڕۆژئـاوادا لەگـەڵ بـوونی ترسـیان لـە پێشڕەوی عوسمانیەکان بو نیمچە دورگەی ئیبیری .

---

[1] حرب الثلاثمائة عام / ٢٢٧، ٢٣٦، ٢٤١، ٢٤٢ .

[2] جهود العثمانيين / ٣٢٣ .

## دیبلۆماسیەتی پورتوگالی و هەڵوەشاندنەوەی یەك ڕیزی لە باکوری ئەفریقیادا :

ئەحمەد وەطاس لە ٩٤٣ك ، ١٥٣٦ز لە ڕووی سەعدیەکاندا لە ناوچەی ( بیرعقبە) لەنزیك ( وادی العبید ) توشی شکست بوو. پشێوی لە هەموو سوپادا بڵاو بوویەوە ، بەهۆی ئەو شکستەوە ئەحمەدی وەطاسي لە پورتوگال نزیك بوویەوە ، ئەمەیش لە ئەنجامی هەستکردنی بوو بە سەرقاڵ بوونی عوسمانیەکان لە جەنگەکانیاندا دژ بە ئیسپانیا ، بۆیە لە گەڵیاندا گرێبەستێکی بەست بۆ ماوەی ١١ساڵ کە بارودۆخی ڕۆژئاواییە نیشتەجێکانی ناوچەکانی ئەهیلا و طنجة و ( القصر الصغیر) ی دەخستە ژێر دەسەڵاتی قەڵەمڕەوی پاشای فاسەوە ، هەروەك بۆ ژێردەستە بازرگانە دەریاییەکانی پاشای وەطاسي هەبوو کە بچنە ئەو ناوچانەوە بە مەرجی نەبونی بازرگانی چەك و شمەکە مەترسیدارەکان .

ئەگەر پاپۆڕە عوسمانی یان فەرەنسی یان شوێنکەوتوەکانی مەسیحیەکانی جگە لە ئیسپانیا و پورتوگالیەکان هاتن بۆ خاکی پورتوگالیەکان بە شمەکەوە ، ئەوا ڕۆژئاواییەکان هیچیان لێناکرن ، هەروەها لەمەڕ ڕۆژئاواییەکان دەبێت شمەك لە عوسمانیەکان نەکرن تادەست بەسەر دەستکەوتەکاندا بگیرێت و لەلایەکەوە بۆ لایەکی تر بنێردرێن تا هێزەکانی دوژمن هەلی هێرش کردنە سەریان بۆ نەڕەخسێت [1].

## بەشی پێنجەم

### سەرەتای پوکانەوەی دەوڵەتی عوسمانی

مێژوونوسان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە پاش مردنی سولەیمانی قانونی کە سوڵتانێکی عوسمانی بوو ، دەوڵەتی عوسمانی شەوکەتی نەما کە دروست ئەکاتە ساڵی ٩٧٤ك ، ١٥٦٦ز ، بەڵێ سەرەتاکانی بێهێزی دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمی سوڵتان سولەیماندا دەرکەوتن ، سەرەتاکەش ئەوەبوو کە سوڵتان

---

[1] جهود العثمانیین / ٣٢٣ .

سولەیمان کەوتە ژێر کاریگەری (ڕۆکسلانا) ی ژنیەوە کە دەستی کردە پیلانگێران دژ بە ( ئەمیر مستەفا ) بۆ ئەوەی لە جێی ئەو سەلیمی دووهەم {کە کوڕی خۆی بوو} دوای باوکی خیلافەت بگرێتە دەست ، {مستەفا} سەرکردەیەکی گەورەو خۆشەویست بوو لە لای ئەفسەرو دەرەجەدارەکانی سوپا ، ئەم دەستێوەردانەی ژنەکەی بوو بەهۆی ئەوەی کە ( ئینکیشارەیەکان ) تووڕەبن و شۆڕشێك دژ بە سوڵتان دروست بکەن ئەوەبوو {سوڵتان سولەیمان} دای مرکاندەوە و {مستەفا}و کوڕە شیرە خۆرەکەشی لەم شۆڕشەدا تیاچوون ، هەروەها بە دەسکیسەی هەندێ لە وەزیرەکان سوڵتان ( بایەزیدی کوڕی و چوار کوڕی ئەویشی ) لەناو برد [١].

هەندێك لە نیشانەو دیاردەکانی بێهێزی دەوڵەتی عوسمانی ئەوەبوو لەسەردەمی سوڵتان سولەیماندا کە سوڵتان خۆی بەشدای دانیشتنەکانی دیوانی نەئەکرد ، ژن و منالْ دەسەڵاتیان بەسەر حوکمدا پەیدا کردبوو ، دەستەوسان مابوون لە بەرامبەر کێشە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکاندا ، بەڕادەیەك ڕێگەیان خۆش کرد بۆ یاخی بوونی جەماوەری لە ( رومیلی ) و ( ئەنازۆڵ ) دا [٢].

باسی یەکەم

{سوڵتان سەلیمی دووەم}

لە ٩ی ربیعی یەکەمی ٩٧٤ی کۆچیدا حوکمی گرتەدەست ، بەڵام نەیتوانی پارێزگاری لە سەروەری و فتوحاتەکانی سوڵتان سولەیمان بکات ، خۆ ئەگەر{محمد پاشای صقللی} [٣] کە وەزیرێکی تێکۆشەرو لێوەشاوەو پیاوێکی ورياو سیاسەتمەدار بوو نەبوایە ئەوە هەرزوو دەوڵەتەکەی ئەڕوخا ، ئەم وەزیرە

---

[1] في أصول التأريخ العثماني / ١٠٢ .

[2] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ٩٤ .

[3] تأريخ الدولة العثمانية ، د. علي حسون / ١٢٣.

هەرزوو هەستا بە دروستکردنەوەی سام و هەیبەت بۆ دەوڵەت لە دڵی دوژمنەکانیدا و ئاشتینامەیەکیشی مۆر کرد لەگەل ( نەمسا ) لە ساڵی ٩٧٥ی کۆچیدا کە بەرامبەر ئەوەستێ لەگەڵ ساڵی ١٥٦٧زاینیدا ، بەپێی بڕگەکانی ئەو ئاشتینامەیە ( نەمسا ) دەست ئەگرێتەوە بەسەر موڵکەکانیدا لە وڵاتی ( مەجەر) دا و ساڵانەش ئەو بڕە باجە ئەدات بە دەوڵەتی عوسمانی وەك لە پێشەوە بڕیاری لەسەر دراوە بەپێی دان پیانانەکانی میروکانی هەریەك لە ( تراسلفانیا ) و ( ئەفلاق ) و ( بەغدان ) [1].

یەکەم :نوێ کردنەوەی ( شەڕ ڕاگرتن و ئاگربەست –هدنە –) لەگەڵ شارلی نۆیەمی پاشای فەرەنسا دا :

ئاگربەست لەگەڵ پۆڵۆنیا شارلی نۆیەمی فەرەنسا تازە کرایەوە لەساڵی ٩٨٠ی کۆچی بەرامبەر بە ١٥٦٩ی زاینی ، هەروەك ( إمتیازات ) زیادکرا بۆ قونصولی فەرەنسا و ( هنری دی فالوا) کە برای پاشای فەرەنسابوو کرایە پاشای پۆڵۆنیاو بەپێی ڕێکەوتننامەیەك لەگەڵ فەرەنسادا بەو پێیە فەرەنسا بوویە پاشای بازرگانی لە دەریای ناوەڕاستدا ، هەروەها بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیەی پێشوو فەرەنسا بۆی هەبوو کە شاندی هەمەجۆرەی نەصرانی بنێرێت بۆ ئەو شوێنانەی کە نەصرانیەکانی تێدایە لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا ، بە تایبەت وڵاتی شام ، ئەم شاندانە هەڵئەسان بەوەی کە فەرەنسایان لای نەصرانیەکانی وڵاتی شام خۆشەویست ئەکرد ، کە ئەم خاڵە یەکێکە لەو خاڵانەی باس ئەکرێت دەربارەی بێهێز بوونی دەوڵەتی عوسمانی چونکە دەستی فەرەنسا گەیشتە نەصرانیەکانی شام و بەو شێوەیەش گوێڕایەڵی نەکردن دەستی بەزیادکردن کرد و گەیشتە یاخی بوون لە دەوڵەت ، دیارترین ئاسەواری ئەم دەستکێشانەناو نەصرانیانە ئەوەبو بە هەمووشێوەیەك پارێزگاریان لە ( ڕەگەز ) و ( زمان) ی کەمە نەتەوەییە

---

[1] تأریخ الدولة العثمانية ، د. علي حسون / ١٢٣.

نەصرانیەکان ئەکرد تا سازو ئامادەبن بۆ ئەو ڕۆژەی دەوڵەتی عوسمانی تەواو لاواز ئەبێت و ئەم کەمە نەتەوەییانە داوای سەربەخۆیی ئەکەن و دەست ئەدەنە شۆڕش کردن ،ئەو کاتە ئەوروپاش پشتیوانیان لێ ئەکات بە هەموو دەوڵەتە نەصرانیەکانەوە [١].

بونی ئەو قەناعەتە لەناو دەوڵەتە ئەوروپیەکاندا کە وەرگرتنی ( إمتیازات) لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا یەکێکە لە مافە سروشتیەکانی خۆیان ، وای کرد لە فەرەنسا کە سوپایەك بنێرێت بۆ ( بوندوقیە ) کە سوڵتان مورادی چوارەم ( ١٦٢٤-١٦٤٠ز ) شەڕی لەگەڵ ئەکردن ، نەك هەرئەمە بەڵکو سەفیرەکەی خۆشی بە هاوڕێیەتی هێزێکی سەربازی دەریایی نارد تا دەوڵەتی عوسمانی پێ چاوترسێن بکات و داوای دیاری کردنی ( إمتیازات )ی تر بکات ، بەلام ( صەدری ئەعزەم ) هەرئەوکاتە کە هێشتا بڕیاری سیاسی لەدەستی خۆیدا بوو ، خێرا پێی ڕاگەیاند کە ئەو ڕێکەوتننامانە ئیلزامی نین بەو شێوەیەی کە هەرئەبێ جێبەجێ بکرێن .چونکە ( إمتیازات ) تەنیا بەخششێکی سوڵتانیە و بەس ، ئەمە وای کرد کە فەرەنسا دەست هەڵبگرێ لەو هەڕەشەو گوڕەشانەی خۆی و دەستبکاتە فرت و فێڵ لە بەردەم سوڵتاندا بۆ ئەوەی سوڵتان سەرلەنوێ یاسای ( إمتیازات) ەکان مۆر بکاتەوە لەساڵی ١٦٧٣ ز ، جا ئەمە قوڕەکەی خەستتر کردەوە ، بەلام دەوڵەتی عوسمانی لە بری ئەوەی دەرس وەرگرێ لەوەی ڕوویدا ، هات سوڵتان محمدی چوارەمی ( ١٦٤٨-١٦٨٧ز ) ڕاسپارد کە ماف سەرپەرشتی کردنی ( قدس ) بدات بە ( فەرەنسا ) [٢] !!

فەرەنساش دەستی دایە داوای تازەترو ( امتیازات )ی زۆرترو هەرجارەش کۆتێکی زیاتری لەسەر سوڵتان دائەنا ، لەکاتی تازەکردنەوە( إمتیازات ) دا

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية ، د. علي حسون / ١٢٣.

[2] الدولة العثمانية قراءة جديدة لعوامل الأنحطاط ، جواد العزاوي / ٢٦ .

لەساڵی ١٧٤٠ ز سوڵتان ( إمتیازات) ی بازرگانی تازەتری دایە فەرەنسا ، هەرچەندە ئەم ( إمتیازات)انە بە تەواوی توشی هەڕەشە هاتن لە کاتی داگیرکردنی میصردا لەلایەن ( ناپلیون پۆنابارت ) ەوە ، چونکە سوڵتان کارکردن بەو ( امتیازات) انەی ڕاگەیاند ، بەڵام ناپلیۆن بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ سوڵتاندا وەك خۆی بمێنێتەوە خێرا پاشەکشەی لە میصر کرد و لەگەڵ سوڵتاندا ڕێکەوتننامەی تازەکردنەوەی ( إمتیازات) ەکانی بەمەرج گرت بۆ پاشەکشەی لەمیصر و لە ڕاستیشدا لە ٩ی تشرین یان ئۆکتۆبەری ١٨٠٠ز ئەو ڕێککەوتننامەیە ئیمزاکرا و سوڵتان ( إمتیاز) ێکی تری تازەی دایە فەرەنسا ئەویش ئەوەیە : فەرەنسا بۆی هەیە کە بازرگانی لە دەریای سوردا بە ئازادی بکات [1].

دانی ئەم ( امتیازات)انە دەرەنجامێکی ڕەشی هەبوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی ، ( ویمێتری کیستیکس) مێژوو نوسی یۆنانی ئەڵێ : ( ... پێدانی ئەم ( امتیازات) ە زۆرانە ئابوری ئیمبراتۆریەتی عوسمانی تێك شکاند چونکە یاسای باجی دەوڵەتی عوسمانی ڕوخاند ، کەیاساکە پارێزگاری لەبازرگانی خۆجێی ئەکرد لە بەرامبەر بازرگانیە بیانیەکاندا کە بەردەوام پێشبڕکێی بوو لەگەڵیدا ) [2] ، نەك هەرئەمە ، بەڵکو ئەم ( امتیازات) دانە بوویە پەرچێکی گەورە لە بەردەم دەوڵەتی عوسمانیدا کە نەیتوانی پرۆژەیەکی ئیصلاحی جێبەجێ بکات یان سەرچاوەی دارایی تر بەدەست بهێنێت بۆ خۆی تا ڕووبەڕووی ئەو هەموو خەرجیە بێتەوە کە دەوڵەت لە حوکم و بەڕێوەبردندا ئەیکات ، بۆیە بەڕاستی ئەو پەیماننامانەی کە ئیمتیازاتیان ئەدا بە دەوڵەتانی تر هەمووی بوونە مایەی زەلیلکردنی

---

[1] الدولة العثمانية قراءة جديدة لعوامل الأنحطاط ، جواد العزاوي / ٢٦ .

[2] الدولة العثمانية قراءة جديدة لعوامل الأنحطاط ، جواد العزاوي / ٢٧ .

عوسمانیەکان دەوڵەتە ئەوروپییەکانیش کە ملکەچ نەبوون بۆ دەوڵەتی عوسمانی وایان لێهات بوونە حکومەتێك لەناو حکومەتی عوسمانیدا [١].

دووهەم : سەرۆکی ( خوارەزم) داوای هێزی پارێزەری ( الحمایە) ئەکات لە سوڵتان سەلیمی دووهەم : سەرۆکی خوارەزم شکاتێکی بەرز کردەوە بۆ سوڵتان سەلیمی دووەم و تێیدا ئەڵێ : پاشای فارسەکان دەست ئەگرێت بەسەر هەموو ئەو حاجیانەدا کە لە تورکستانەوە دێن هەر لەبەر ئەوەی کە ئەدەن بە سنورەکانی ئەودا ، هەروەها مۆسکۆ پاش داگیرکردنی ( استراخان) نایەڵێ نە حاجی و نەبازرگانی ئێمە بچنە وولاتی ئەو و چەندان ڕێگری داناوە لەبەردەممانـدا ، بۆیە چ سەرۆکی خوارەزم و چ سەرۆکەکانی ( بوخارا) و ( سەمەرقەند) داوا ئەکەن لە سوڵتان سەلیمی دووهەم کە هەرچی کردووە ( استراخان) بگێڕێتەوە تا ڕێگەی حەج کردن والأبێت لەبەردەمیاندا [٢].

ئەم داوایە جێگەی قەبوڵی دەوڵەتی عوسمانی بوو ، بۆیە ( صوۆقللی باشا ) کە ( صەدری ئەعزەم ) بوو لە دەوڵەتدا هێزێکی پەلاماردەری گەورەی پێکەوەنا ، لەساڵی ( ٩٧٦-٩٧٧ك ، ١٥٦٨-١٥٦٩ز ) تا ( استراخان) ڕزگار بکات و بیکاتە بنکەیەکی سەربازی عوسمانی بۆ ئەوەی هەموو ئەو ناوچانە بپارێزێت و لە نێوان دوو ڕووباری ( قولجا) و (دون) دا کەنداوێکی گەورە ببەستێت بە ڕادەیەك ببێتە ڕێگەیەکی چاك بۆ هاتوچۆی گەلە کەشتی عوسمانی بەئاسانی بۆ ناو دەریای خەزەر ( قەزوین ) لە ڕێگەی دەریای سورەوە ، تا عوسمانیەکان لەلایەك بتوانن ڕێ بگرن لە فراوان خوازیو کشانی ڕوسیا بەرەو باشور ، و لە لایەکی تریشەوە نەك هەر فارسەکانیش لە قەوقاز و ئازەربایجان دەربکات بەڵکو ڕێگەی ئەوەشیان لێبگرێت کە بەرەو باشوور بکشێن ، جگە لەمانە ڕێگەش بۆ سوپای

---

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية مفترى عليها : ١/ ٧٥ .

[2] في اصول التاريخ العثماني / ١٤٤ .

عوسمانی خۆش ئەو بێ و ناچار نابن کە بە زەوی ئازەربایجاندا ڕێ بکەن کە زەویەکی سەخت و پڕ کەندەڵانە ، هەروەها پەیوەندی کردنیشیان بە ئۆزبەکیەکانەوە بۆ ئاسان ئەکات کە دوژمنی سەرسەختی دەوڵەتی سەفەوی و تەتارەکانی ( قرم ) بوون ، هەمووئەمەش ڕێگەی کاروانیە کۆنەکان کە لە ئاسیای ناوەڕاستەوە بەرەو ڕۆژهەڵات و بەرەو ڕۆژئاوا ئەڕۆیشتن زیندوو ئەکاتەوە [1].

عوسمانیەکان دەستیان دایە جێبەجێ کردنی پرۆژەی بەستنەوەی دەریای ( دون ) بە ( ڤولجا) وە ، و مانگی جەمادی یەکەمی ساڵی ٩٧٧ ك ، ئۆکتۆبەری ١٥٦٩ ز هاتە پێشەوەو سێیەکی پرۆژەکە تەواو بوو بوو ، هەرچەندە وەرزی زستان بوویە هۆی ڕاگرتنی پروژەکە بەڵام سەرۆکی هێرشەکە پێشنیاری ئەوەی کرد کە کەشتی بچوك بەکار بهێنرێت لە هێرشەکەدا بۆ ڕزگارکردنی ( استراخان) ،بەوەی چەك و تفاق و تۆپەکان بگوازرێنەوە پێیان و هێرش بکرێتە سەریان ، بەڵام بە بۆنەی نەگونجاوی هەلومەرجە سروشتیەکانەوە ئەم شەڕە سەری نەگرت ، لەگەڵ ئەوەشدا ( صوٚقللی پاشا) توانی هەندێ دەستکەوت بە دەست بهێنێ لەوانە سنوردانان بۆ سەرۆکەکانی ( مولدافیا) و ( ولاشیا ) و ( پۆلندا) و بەو شێوەیەش دەوڵەتی عوسمانی توانی ڕێگە لە فراوان خوازیەکانی ڕوسیا بەرەو باکور و خۆرئاوای دەریای سور بەشێوەیەکی کاتی بگرێت [2].

سێیەم : ڕزگارکردنی ( قبرص)

ئیتالیا و ئیسپانیا گرنگی دورگەی قبرصیان چاك ئەزانی ، لە ئەوروپاشدا هەواڵێك بڵاو بوویەوە گوایە دژ بە سوڵتانی عوسمانی ( هاوپەیمانیەتیەك) دروست بووە ، هەرچەندە ئەو هاوپەیمانیەتیە نەیتوانی ( قبرص) لە دەستی

---

[1] فتح عدن ، محمد عبداللطيف البحراوي / ١٤٥ .

[2] جهود العثمانيين / ٤٤٧ .

عوسمانیـەکان بـسەنێتەوە کـە بـە هێزێکـی بێـشومارەوە چـوونە نـاوی ، عوسمانیەکان بە ئاسانی چوونە ناو دوورگەکەو ڕووبەڕووی هیچ ناڕەحەتیەك نەبوونـەوە ، تـەنها شـاری ( فامرجـستا) کـە قەڵایـەکی سەخت بـوو لـە بـەردەم عوسمانیەکانـدا وەسـتان بەسـەرۆکایەتی (بـاحلیون ) و (براجـادنیو) و هێـزی عوسمانیەکان ئەوکاتە ئەگەیشتە سەد هـەزار سەربازی شەڕکەر ، عوسمانیـەکان هەرچی کەرەستەی ( ئابلۆقەدان) لەوکاتەدا هەبوو بەکاریان هێنا وەك ( کرّ و فرّ) و چاندنی ( مین) ، بـەڵام هیچ کاریگـەری لەسـەریان دروست نـەکرد ، هەرچـەندە ئەگەر هێزێکی مەسیحی بهاتایە بە هانایانەوە ئەوە حاڵی عوسمانیەکان ئەکەوتە مەترسیەوە ، بەڵام ئەوەبوو کە برسێتی کاریگەری خۆی لەسەریان بەجێ هێڵاو ناچار شارەکەیان تەسلیم کرد لە ڕەبیعی دووەمی ٩٧٩ك ، اغسگسی ١٥٧١ز دا . دەوڵەتی عوسمانی خەڵکێکی زۆری ئەنازۆلی گواستەوە بۆ ئەوێ کە تائێستاش نەوەیان هـەر لـەو دورگەیـەدا هەیە ، هەرچەندە قوبروسیە ئەرسەزۆکسەکان زۆر دڵخۆش بـوون بـە حـوکمی عوسمانیـەکان چـونکە لـەژێر ستەم و چەوسـانەوەی کاسـۆلیکەکان ڕزگاریـان کـردن کـە ( بوندوقـدارەکان) بـۆ چـەند سـەدە ئـەو چەوسانەوەیان خستبوونەسەر ، لەگـەڵ ئەوەدا داگیرکردنـی {قبرص} لـە لایـەن عوسمانیەکانەوە دەوڵەتی ( کاسۆلیکی ) ورووژاند [١] .

گەلـە کەشـتی عوسمـانی دوای ئـەم کـارەی لـە ( ابنـانجني) دا دامـەزرا و زۆربـەی سەربازەکانیـشی بـە بۆنـەی وەرزی زسـتانەوە گەڕانەوە شوێنی خۆیـان ، چـونکە شەڕ لەو وەرزەدا ئەوەستێ و خەڵك خۆی بۆ ساڵی داهاتوو ئامادە دەکات [٢] .

چوارەم : شەڕی لیبانتۆ [٣]

---

[1] في أصول التأريخ الإسلامي : ٢/ ١٤٦-١٤٧ .

[2] فلسفة التأريخ العثماني ، محمد جميل بيهم / ١٤٢ .

[3] ئەکەوێتە ڕووی باکوری دەروازەی کەنداوی ( کورنت) لە یۆنانی ئەمڕۆدا .

میللەتە مەسیحیەکان بە گشتی ترسی ئەوەیان لێ نیشت کە ئەم مەترسیە ئیسلامیە دوورنیە هەموو ئەوروپا بگرێتەوە ئەگەر هەر ئاوا سوپای عوسمانی لە وشکانی و لە ئاوەوە داببەزنە ئەوروپا ، بۆیە ( پاپا بیوسی پێنجەم ، ١٥٦٦-١٥٧٢ز ) سەرلەنوێ کەوتەوە هەوڵی کۆکردنەوەی دەوڵەتە ئەوروپیەکان کە ناکۆکی زۆر لە نێوانیاندا هەبوو ، بەمەبەستی ئەوەی هێزێکی یەکگرتوویان لە ژێر ئالای ( پاپا)[1] دا لە ئاوو لە وشکانیدا لێ دروست بکات ، بۆ ئەم مەبەستەش نامەیەکی نوسی تێیدا دەڵێت : ( ... بەراستی سوڵتانی تورك لەبەر خوێڕیەتی و بێنرخی ئێمە تەواو گەشەی کردووەو دەسەلاتی فراوان بووە )[2].

{پاپا بیوسی پێنجەم} و {فیلیپی دووهەم}ی پاشای ئیسپانیا و کۆماری بوندوقدارەکان پەیماننامەیەکیان لە نێوان خۆیاندا مۆر کرد لەسەرەتای ( ٩٧٩ك ، ١٥٧١ز ) کە تێیدا پەیمانیان بەیەکتری دا کە هێرشێکی گەورەو بەرفراوان بکەنە سەر عوسمانیەکان لە دەریاوە ، لەم هێرشەدا هەندێ لەشارەکانی ئیتالیاش بەشدارییان کرد چونکە {پاپا بیوسی پێنجەم}گیانی هاوپەیمانیەتی تێدا بزواندن و بەوبۆنەیەوە ( توسکانی ) و ( جنوە) و ( سافوی ) و هەندێ لە ئیتالیەکانیش هاتنە ناو ئەم هاوپەیمانیەتیە پیرۆزەوە[3].

{پاپا} نامەیەکیشی نارد بۆ پاشای فەرەنسا و داوای کۆمەك و یارمەتی لێکرد ، بەلام {شارلی نۆیەم} داوای لێبوردنی کرد و ووتی : من لەگەڵ عوسمانیەکاندا چەند رێکەوتننامەیەك هەیە لەنێوانماندا . پاپا لە وەلامدا داوای ئەوەی لێکرد کە پەیمانەکانی لەگەڵ عوسمانیەکاندا بشکێنێ ، چەند رۆژێکی کەمی خایاند ئەوەبوو ئیمبراتۆر هەموو پەیمانەکانی لەگەڵ عوسمانیەکاندا هەڵوەشاندەوە و

---

[1] حرب الثلاثمائة سنة / ٣٩٦ ص ٩.

[2] تأريخ الدولة العثمانية / ١٢٥ .

[3] جهود العثمانيين / ٤٥٢ .

چوویه ناو هاوپەیمانیەکە و ڕووی لە ( إیڤان) یش کرد کە پاشای روسەکان بوو پێی ڕاگەیاند کە ئەویش بێت بەدەم ئەم جاڕی شەڕەوە کە پاپا داوێتی ، خاوو خلیچکیەکی لە پاشای پۆلۆنیادا بینی و ئەوەبوو ( دون جوان )ی نەمساوی کرا بە سەرکردەی ئەم سوپا پەلاماردەرە ، لەیەکێك لە برگەکانی ئەم پەیماننامە نەصرانیەدا هاتووە : ( پاپا بیوسی پێنجەم و فلیب پاشای ئیسپانیا و کۆماری بوندوقدارەکان شەڕی پەلاماردان و شەڕی بەرگری دژ بە تورکەکان ڕادەگەیەنن ، بەمەبەستی ئەوەی هەموو ئەو شوێنانەی کە ئەوان لەژێر دەستی مەسیحیەکاندا دەریان هێناوە لە دەستیان بسەنرێتەوە ، بەناوچەکانی تونس و جەزائیرو تەرابولسیشەوە )[1].

( دون جوان) بەخۆی و سوپاکەیەوە بەرەو دەریای ( ئەدریاتیك ) کشاو تاگەیشتە تەنگەلانی کەنداوی کورنت نزیك ( باتراس ) کە زۆر دوورنەبوو لە ( لیبانتۆ) کە پاشان شەڕەکە بەم ناوە ناونرا .

ڕای سەرکردەکانی کەشتیگەلی ئیسلامی ئەوەبوو کە کەنداوەکە بپارێزن و مەحکەمکاری تێدا بکەن و هەنەگژێن بە کەشتیگەلی صەلیبیەکاندا ، تەنیا ( علی پاشا ) نەبێت کە سەرۆکی گشتی بوو ، ئەو بڕیاری ئەوەی دا کە لە دوژمن بچنە پێشەوە و شەڕی لەگەڵدا بکەن چونکە بەزۆری کەشتیەکانیدا ئەینازی ، بەڵێ ( علی پاشا ) سوپای ڕێکخست و هەموو کەشتیەکانی بەیەك شێوە لە باکورەوە بۆ باشور دامەزراند ، بە شێوەیەك بەندەرلای ( لیبانتۆ ) ئەکەوتە لای ڕاستی سوپاکە و ناوەڕاستی دەریاکەش لەبەردەم سوپاکەدا بوو ، جا ( علی پاشا ) سوپاکەی کردە دوو باڵ و چەقێك ، خۆی لە چەقی سوپاکەدا بوو ، ( سیروکو) ی لە باڵی ڕاستیدا داناو باڵی چەپیشی سپارد بە ( قلج علی) ، سوپای صەلیبیەکانیش بە بەرانبەریانەوە بەهەمان شێوە سوپاکەیان کردە سێ بەشەوە

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية / ١٢٥، ١٢٦ .

هەروەك سوپای ئیسلامی ، باڵی چەپی سوپاكە ( دوریا) سەركردایەتی دەكرد بە بەرامبەر ( قلج علی ) یەوە و سەرۆكایەتی لای چەپیش درا بە ( بربوریجو ) لە بەرامبەر {سیروكو}ەوە ، و ( دون ) خۆشی سەرۆكایەتی چەقی سوپاكەی ئەكرد و كەشتیگەلێكی ( یەدەك)یشی بەسەرۆكایەتی ( سانت كروز) لە دوورەوە دانا [1].

پینجەم : گەرمبوونی شەڕەكە :

شەڕەكە لە ڕۆژی ١٧ی جەمادی یەكەمی ٩٧٩ك ، ١٧ی أكتوبری ١٥٧١ ز هەڵگیرسا ، سەرەتا گەلە كەشتی ئیسلامی گەمارۆی گەلە كەشتی مەسیحی دا و عوسمانیەكان دڕیان بەكەشتیەكانی دوژمن داو زۆر چوونە ناوەوە و شەڕ گەرم بوو ، هەردوو سوپاكە ئەلهەق قارەمانیەتیەكی بەرچاویان نواند و شەڕێكی پیاوانەیان كرد [2]، ویستی خوا وابوو كە موسوڵمانەكان بشكێن و لەو شەڕەدا سی هەزار {٣٠٠٠٠} پیاوی شەڕكەریان لێ بكوژرێت و ئەشوترێت بیست هەزار كەس ، ( ٢٠٠ ) كەشتی جەنگیشیان لەدەست دا كە {٩٣} دانەیان ژێرئاو كەوت و ئەوانی تریان كەوتنە ژێر دەستی دوژمن وگەلە كەشتی یەكگرتووە نەصرانیەكە لە ناو خۆیاندا دابەشیان كردن [3].

دەهەزار كەسیشیان بەئەسیر لێ گیرا ، بە لێ ( قلج علی ) توانی كەشتیەكانی لای خۆی ڕزگار بكات و هەموو ئەوكەشتیانەش كە بە غەنیمەت گرتبوونی لە دوژمن لای خۆی بپارێزێ كە یەكێك لەو كەشتیانە كەشتی تایبەتی ( پاپا ) خۆی بوو ، ( قلج علی ) ئەم كەشتیەی پاپای هێنایەوە بۆ ئەستەنبوڵ كە لەوێدا پێشوازیەكی سەركەوتوانەی لێ كرا ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو شكستە تاڵەی بەسەردا هاتبوو ، سوڵتان سەلیمی دووهەم لەپاش ئەم شەڕە هەستا بە بەرزكردنەوەی پلەی ( قلج

---

[1] حرب الثلاثمائة سنة / ٣٩٦ .

[2] جهود العثمانيين / ٤٥٤ .

[3] تأريخ الدولة العثمانية / ١٢٦ .

علـی) بـۆ ( سـەرۆکی دەریـایی عوسمانیـەکان ) ( واتـە:قبـودا ن پاشـا ) لەگـەڵ مانەوەی کارەکەی خۆشی کەبریتی بوو لە ( کبیرلربك ) ی وولاتی جەزائیر [1] .

شەشەم : شوێنەواری ( لیبانتۆ ) لەسەر ئەوروپا و لەسەر دەوڵەتی عوسمانیش : کیـشوەری ئـەوروپا ئاهـەنگیان دەگێـڕا بـە بۆنـەی سـەرکەوتنیان لـە ( لیبـانتۆ) چـونکە بـۆ یەکـەمجارە لەسـەرەتای سـەدەی ( ١٥)دا کـە عوسمانیـەکان شکـست بخـۆن [2] ، ئەوروپاییــەکان دەســتیان دایــە هەلهەلــە کێــشان و ئەوەنــدە ئــەم سـەرکەوتنەیان بـە گـەورە دایـە قەڵـەم لـە هـەموو شـوێنێکدا دەسـتیان دایـە ڕازاندنەوەی شارەکان و ئەوەندەش موبالەغەیان لە سوپاسکردنی ( دون جون) دا کـرد کـە ڕابەرایـەتی ئـەم هێرشـەی کردبـوو گەیـشتنە ئـەوەی کـە تەنانـەت پاپـا خۆشی لەوە نەپاراست کە لە کاتی ئاهەنگ گێڕاندا لە کەنیسەی ( قدیس بترس ) دا کە بە بۆنەی ئـەم سەرکەوتنەوە گێـڕرا بڵـێ : ( ئینجیل مـژدە ئـەدات بـەوەی لـە لایەن خواوە پیاوێك بەناوی ( حنا) وە دێتـە بوون بـە دڵنیاییەوە مەبەسـتی بـەو پیـاوە ( دون جـون ) ە ، لـەو ڕۆژەوە ئـیتر دونیـای مەسـیحیەت بـەردەوام ئـەو سـەرکەوتنە دەریاییـە بـاس ئەکـەن و پیایـدا هەڵئـەدەن ، تەنانـەت لـە فەرهەنگـە تازەکـانی قوتابخانەکانیانـدا کاتێـك کـە باسـی ( لێـواری لیبـانتۆ ) ئـەکرێت ، یەکسەر بەدوایـدا باسـی ( دون جـون) ئـەکرێت وەك کەسـێك کـە مەسـیحیەتی لـە ترسناکیەکی گەورە ڕزگار کردبێت کە گەمارۆی داوە لە ڕۆژگارێکدا [3] .

پاپـا زۆر زۆر دڵخـۆش بـوو بـەم سـەرکەوتنە هەرچـەندە هـەر لـە دڵـە ڕاوکێـدا بـوو چونکە دوژمنەکەی هێشتا هەر مەزنەو سامی تایبەتی خۆی هەبوو ، بۆیە هـەوڵی دا کە شیعە دوانزە ئیمامیەکانی صـەفەوی دژ بـە عوسمانیـەکان هـان بدات و ئـەو

---

[1] جهود العثمانيين / ٤٥٤ .

[2] في أصول التأريخ العثماني / ١٤٧ .

[3] فلسفة التأريخ العثماني / ١٤٣ .

جیاوازی بیرو باوەڕەی کە شیعە هەیبو لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بقۆزێتەوە ، بۆیە نامەیەکی بۆ ( تهماسب پاشا) نارد کە پاشای عەجەمەکان بوو تێیدا نووسی : ( ... هیچ کاتێك هەلی لەمە باشترت بۆ ڕێ ناکەوێك بۆ پەلاماردانی عوسمانیەکان ، چونکە ئێستا لە هەموو لایەکەوە گومانی پەلاماردانیان هەیە [1].

هەروەها پاپا کاغەزێکیشی بۆ پاشای حەبەشەو ئەمیری یەمەن نارد تا هانیان بدات لە دەوڵەتی عوسمانی بەلام مەرگ یەخەی پێ گرت و مرد [2].

دەرەنجامی شەڕی لیبانتۆ ئومێدەکانی دەوڵەتی عوسمانی کوژاندەوە ، چونکە ترسناکی دەوڵەتی عوسمانی لە دەریای ناوەڕاستدا نەهێشت ، کە ترسناکی نەما ئەو ترسەش نەما لەلای خەڵکی تادەست بگرن بەو هاوپەیمانیە تی یە پیرۆزەوە کە هەمووی کۆکردبوویەوە ، بۆیە لەبری ئەوە سەر لە نوێ ئێرەیی بردن و غیرەتکێشی دەوڵەتە مەسیحیەکان دەستی پێکردەوە [3].

لە ڕاستیدا گرنگی ( لیبانتۆ) نکولی لێ ناکرێ و ئەو ئەفسانەشی نەهێڵا کە گوایە عوسمانیەکان هەرگیز ناشکێن ، هیچ نەبێت بۆ شەڕی ناو دەریا ئەو ترسەی ڕەواندەوە ، ڕەوینەوەی ئەم ترسەش لەدڵی کاربەدەستانی ئیتالیاو ئیسپانیادا شتێکی گرنگ بوو ، هەر ئەم شەڕە وای کرد کە کاریگەری دەوڵەتی عوسمانی لەسەر سیاسەتی هێزە ڕۆژئاواییەکانی ئەوروپا نەمێنێ ، چونکە ئەوە ڕاستەقینەیەك بوو بوو کە هێزی عوسمانی هێزی زاڵ و گەورەیە چ لە وشکانیدا بێت یان لە دەریادا بێت [4].

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية / ١٢٦ .

[2] تأريخ الدولة العثمانية / ١٢٦ .

[3] جهود العثمانيين / ٤٥٥ .

[4] جهود العثمانيين / ٤٥٥ .

هەر ئەم سەرکەوتنەی لیبانتۆ بوو لەساڵی ١٥٧١ ز کە ڕێگەی خۆش کرد بۆ خۆ ئامادەکاری بۆ هاوسەنگ کردنی هێزە دەریاییەکان لە دەریای ناوەڕاستدا ، هەروەك چۆن قۆناغێکی کۆتایی پێهێنا کە بەردەوام لە دەریادا شەڕ ئەکرا و ئەوەش خەرجی و ئەرکێکی گەورەی خستبوە سەر هەموو لایەك [١] .

دوای ئەمە ئیتر عوسمانیەکان بیریان لەوە نەئەکردەوە کە سەروەری زیاتر زیاد بکەن بۆ ئەو زنجیرە سەروەریەی تۆماریان کردبوو لە دەریادا [٢] . بۆیە ئەم تێکشکانە بە خاڵی وەرچەرخان و سەرەتا دائەنرێ بۆ ڕاوەستانی سەردەمی گەشەی هێزە دەریایەکانی دەوڵەتی عوسمانی [٣] .

حەوتەم : چاوتێبڕینی فەرەنسا بۆ کیشوەری ئەفریقا دەردەکەوێت :

شەڕی لیبانتۆ هەلێکی چاك بوو بۆ ئەوەی فەرەنسا چاو ببڕێتە ڕۆژئاوای دونیای ئیسلامی ، ئەوەبوو هەرکە هەواڵی شکستی گەلە کەشتی عوسمانی لەو شەڕەدا بڵاو بوویەوە خێرا پاشای فەرەنسا ( شارلی نۆیەم ) پرۆژەیەکی نارد بۆ سوڵتانی عوسمانی ( ٩٨٠ ك ، ١٥٧٢ ز ) لە ڕێگەی باڵوێزەکەیەوە لە ( استنبول) ، ئەم پرۆژەیە داوا ئەکات کە دەسەڵات بدرێتە فەرەنسا لە ( جەزائیر) دا بە بیانوی پاراستنی ئیسلام و موسوڵمانان لەو وولاتەدا ، بەرامبەر ئەمەش فەرەنسا ئامادەیە کە باجێك بداتە ( باب العالی )ی لە دەوڵەتی عوسمانیدا ، سەرەتا سوڵتان ئەم پرۆژەیەی ڕەت کردەوە و پشتی تێکرد ، بەڵام فەرەنسا هەر کۆڵی نەداو سوربوو لەسەر ئەو داوایەو چەندەها ڕێگەی دیبلۆماسی گرتەبەر تا ئەوەبوو چەند ( امتیازات) ێکی تایبەتی وەرگرت و لە ( سقاله) و چەند

---

[1] جهودالعثمانيين / ٤٥٥ .

[2] بداية الحكم المغربي في السودان / ٩٤ .

[3] فلسفة التأريخ العثماني / ١٤٣ .

شوێنێکی تری کەناری جەزائیر و فەرمانێکی سوڵتانیشی بۆ ئەو مەبەستە وەرگرت کە چەند بنکەیەکی بازرگانی دابنێ تێیاندا [1].

هەشتەم / دروستکردنەوەی سەر لە نوێ گەلە کەشتی عوسمانی:

قبودان پاشا قلج علی بە وورەو چالاکیەکی زۆرەوە سەرلەنوێ دەستی دایەوە تازە کردنەوەی گەلەکەشتی عوسمانی تا قەرەبووی ئەوە بکاتەوە کە لە شەڕەکەدا لەدەستی دابوو ، هاوینی ساڵی ٩٨٠ ك ، ١٥٧٢ز ، هاتە پێش و تائەو کاتە توانی دوسەدو پەنجا کەشتی تازە سازو ئامادە بکات ، {قلج علی} بەم کەشتیە تازانەوە لە ناو دەریادا خۆنواندنێکی گەورەی ئەنجام داو {بوندوقدارەکان} لەم ئامادەباشیەی گەلە کەشتی عوسمانی زۆر ترسان و ناچار بەپەلە داوای ئاشتینامەیەکی سەرشۆڕانەیان لە عوسمانیەکان کرد بەوەی ( قبرص ) یان بۆ جێهێڵان و سێ سەد هەزار ( دوکە ) [2] ش باجیان دا بەدەوڵەتی عوسمانی ، بەڵام ئەم بەخەبەر هاتنەوەی گەلە کەشتی عوسمانی وەك پەلە فرتەی پێش مەرگ بوو ، چونکە دەوڵەت لە هەموو لایەکەوە توشی شەڕ هاتبوو لە لایەکەوە نەمساو هاوپەیمانەکانی شەڕیان تێ ئاڵاندبوو ، لەلایەکی تریشەوە فارس و لە لایەکی تریشەوە سەرقاڵی دامرکاندنەوەی شۆڕشە ناوخۆییەکان بووبوویەوە و هێزی لەبەر چنرابوو [3].

نۆیەم : داگیر کردنی تونس :

{فلیپی دووەم} تەماحگیری تونس بوو دوای ئەوەی کە ( سوڵتانی حفصیی ئەبولعەباسی دووهەم ) کە حوکمی تونسی ئەکرد ( ٩٤٢-٩٨٠ ك ، ١٥٣٤-١٥٧٢ ز ) داوای ئەوەی لێکرد کە هاوکاری بکات بۆ دامرکاندنەوەی ئەو شۆڕشانەی دژ

---

[1] تأريخ الجزائر العام : ٣/ ٩٧ ، ٩٨ .

[2] حرب الثلاثمائة سنة / ٣٩٩ .

[3] جهود العثمانيين / ٤٥٦ .

به ئەم ئەکرا، ئەویش لەبری ئەم هاوکارییەدا داوای ( امتیازات) یّکی زۆری کرد کە بیداتیٚ ، لەوانە بۆیان ببێت لە هەرشوێنێکی تونسدا نیشتەجیٚ بن ، و دەستیش لە{عینایە} و{بنزرت}و ( حلف الواد ) یش هەڵبگریٚ[1] ، ( ئەبولعەباس ) ئەم مەرجانەی ڕەت کردەوە بەڵام (محمد بن الحسین) ی برای مەرجەکانی قەبولٚ کرد [2]. دوای ئەمە ( دون جون) لە رەجەبی ٩٨١ك ، اکتوبری ١٥٧٣ ز لە دوورگەی {صقلیە} وە بەخۆی و سەدو سی و هەشت کەشتی و بیست و پێنج هەزار سەربازەوە ڕووی کردە تونس و لە قەڵای ( حلق الواد) کە ئیسپانیا داگیری کردبوو نیشتەجیٚ بوو ، جا دون جون لە ناکاودا دای بەسەر تونسدا و داگیری کرد و خەڵکەکەشی لە ترساندا لە دۆڵی تونسەوە رایان کرد،لە پێناو پاراستنی دینی خۆیان لەشەڕەنگێزی ئیسپانیەکان [3]. و حاکمەکەی تونسیش ڕای کردو خۆی گەیاندە ( قەیرەوان )[4] و ئەورووپاش ئەوەی باش ئەزانی کە تا کۆنەبنەوە ناتوانن زالٚ بن بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا [5].

دووەم : {قلج علی} زۆر گرنگی بەوە ئەدا کە هێزی دەریایی دەوڵەتی عوسمانی فێری شەڕکردن بکات لەسەر چەکی تازە ، ئەم گرنگی دانەی ( قلج علی ) سەرنجی هەموو ئەو بێگانانەی ڕاکێشا کە لە دەوڵەتی عوسمانیدا ئیقامەیان پیٚ درابوو ، هەروەها پلەی {قلج علی}شی لای خەڵك بەرز کردەوە بەڕادەیەك ( پاپا) ئامۆژگاری فلیپی دووهەمی کرد کە پاشای ئیسپانیا بوو تا هەولٚ بدات بە شتێك

---

[1] تأريخ الجزائر الحديث / ١٤٣ .

[2] جهود العثمانيين / ٤٥٧ .

[3] حرب الثلاثمائة سنة / ٣٩٩، ٤٠٠ .

[4] تأريخ الجزائر الحديث / ٥٠ .

[5] جهود العثمانيين / ٤٥٧ .

له خشتەی بەرێت [1]، بەوەی کە مووچەیەکی دەهەزاری بۆ ببڕێتەوە و ناوچەیەکی گەورەشی لە میرنشینی نابلس یان هەرشوێنێکی تر بۆ دیاری بکات ، لە موڵکەکانی شانشینی ئیسپانیا کە ببێتە موڵکی خۆی و نەوەکانی دوای خۆی وە پلەی ( کونت) یان ( مارکین) یان ( دۆق) یشی پێ بدرێ ، ئەم پرۆژەیەی پاپا ئەوەشی تێدابوو کە هەمان ( امتیازات ) بدرێت بە دوو کەسی تر لە یاریدەدەرەکانی [2].

پاپا لەوەباش حاڵی بووبوو کە ئەم هەوڵە ئەگەر سەریش نەگرێت خۆ سوڵتانی عوسمانی دڵ کرمیین ئەکات لە {قلج علی} کە تاکە کەسێکی بە توانایە لە پشتیوانی کردنی دەوڵەتی عوسمانیدا ، بەڵام ئەم هەوڵە سەری نەگرت ، و لەبری ئەوەی کە {قلج علی} لە پاپا نزیك بکاتەوە ئەوەندەی تر ڕقی لێی هەستا ، چونکە ووتی ڕێی تێناچێ موسوڵمانی تێکۆشەری دەستپاك خۆی بفرۆشێ لەکاتێکدا ئەو بوونی لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا بەوە ئەزانێ کە نەفسی خۆی فرۆشتوە بە خواو لە ڕێگەی خوادا بەنیازە پێشکەشی بکات ، ئەمەش یەکێك بوو لەو سیاسەتانەی کە دەوڵەت بە درێژایی فتوحاتی ئیسلامی کاری لەسەردەکرد ، ڕێی تێ ئەچێ کە ئەم ڕۆحیەتە ڕۆڵی گرنگی بینیبێت لە سەرخستن و خێرا کردنی پرۆسەی فتوحاتدا ، لە هەموو ئەو هەرێم و مەیدانانەدا کە دەوڵەتی عوسمانی ئەچوویە ناوی ، لەبەر ئەوە هەر عوسمانیەك کە لە شوێنێکدا کاری دەکرد بە هەموو دڵێکەوە کارەکەی ئەکردو وای ئەزانی کە خزمەتی ئەم خزمەتە بە ئیسلام [3].

یازدەهەم : {سوڵتان سەلیم} فەرمانی گرتنەوەی تونس دەردەکات :

---

[1] تاريخ الجزائر الحديث / ٥١ .

[2] أطوار العلاقات المغربية العثمانية / ٢٨٠ .

[3] جهود العثمانيين / ٤٥٨ .

{سوڵتان سەلیمی دووهەم} فەرمانێکی دەرکرد بۆ {سنان پاشای} وەزیر و {قلج علی قبودانی} ، تاخۆیان ئامادە بکەن و پێویستە کە تونس بەتەواوەتی ڕزگار بکەن و دەسەلاّتی دەوڵەتی عوسمانی بگێڕنەوە بەسەریدا ، بە هەمان شێوە فەرمانی دەرکرد بۆ هەموو هەرێمەکان کە سەربازو ئازوقە ئامادە بکەن بۆ ئەو مەبەستە ، و لەگەڵ سەربازەکانیشدا پێویستە ( ٢٨٣) کەشتی قەبارە جۆراوجۆر ئامادە بکەن ، هەروەها فەرمانی کرد بەهەموو ئەو سەربازانەی کە لە ئەرکی سەربازی ( ئەنازۆڵ و ڕۆم یلی) دا بوون لە ڕێگەی دەریاوە بگەڕێنەوە و بەشداربن لەو شەڕەدا ، هەروەها فەرمانی کرد بە هەموو ئەو سەوڵ لێدەرانە ئەبێ لەگەڵ گەلە کەشتی عوسمانیدا بەشداربن و ئاگاداریشی دا بەوەی هەرکەسێك بەشدار نەبێت دەرئەکرێت و شوێنەکەی لێ ئەسەنرێتەوە و لە داهاتوویشدا ناخرێتە سەر هیچ کارێك ، کە کەشتیگەلی عوسمانی کەوتە جوڵە ( حیدر پاشا ) حاکمی عوسمانی لە تونس {ئەوەی کە ڕایکرد بۆ قەیرەوان} دەستی دایە کۆکردنەوەی (موجاهیدەکان) لە هەموو ئەو خەڵکەی کە دەوریان لێدابوو [1] .

گەلەکەشتی عوسمانی بە سەرۆکایەتی سنان پاشا و {قلج علی} لە ٢٣ی محرمی ٩٨٢ك ، ١٤ی مایوی ١٥٧٤ ز دا لە دەریادا دەستیان بە جووڵە کرد و لە تەنگەلانەکانیان هاتنەدەرەوە و جارۆکەیان هەڵدا لەناو دەریای سپی دا ، و دەستیان کردە تۆپبارانکردنی کەنارەکانی ( کالابربا مسینا) و هەرزوو دەستیان گرت بەسەر گەلە کەشتیەکەی مەسیحیەکاندا ، و لەماوەی پێنج ڕۆژدا چوونە ناوەڕاستی دەریا [2] و لە هەمان کاتدا {حیدر پاشا}ی حاکمی تونس و هێزێکی خەڵکی جەزائیر بە سەرۆکایەتی ( رمەزان پاشا ) و هێزێکی تەرابولسی بە

---

[1] الأتراك العثمانيون في أفريقيا الشمالية / ٢٥١ .

[2] الأتراك العثمانيون في افريقيا الشمالية / ٢٥٠ .

سـەرۆكايەتی موسـتەفا پاشـا و ژمارەيـەكيش خـەڵكی خۆبەخـشی ميـسری گەيشتنە ئەویٚ [1].

شەڕ لە ڕەبيعی يەكەمی ٩٨١ك ، ١٥٧٤ ز دەستی پێكرد ، عوسمانيـەكان توانيان دەسـت بەسـەر ( حلـق الـواد) دا بگـرن پـاش گەمارۆيـەكی تونـد [2] ، هێزێكـی تـر لـەولاوە گـەمارۆی شـاری تونـسی داو ئيـسپانيەكان ناچـار هـەڵاتن و شـای حەفصيەكان {محمد بن الحسن پاشا}ش هەڵات بۆ {بستيون} [3] ، كە قەڵايەكی مەحكەمی ئيسپانيەكان بوو زۆر تێيدا خەريك بوو بوون و كردبوويانە بەهێزترين قەڵاو مەڵبەندی خۆيان لەباكوری ئەفريقيادا .

عوسمانيەكان پاش ئەوەی هێزەكانی خۆيـان سەرلەنویٚ كۆكردەوە بەرەو قـەڵای {بستيون} كشان و لەهەرچوارلاوە گەمارۆيان خستەسەر و تينيان بۆ خەڵكەكەی هێنـا ، {سـنان پاشـا} ی وەزيـر خـۆی وەك يـەكێك لەسـەربازەكان شـەڕی ئـەكرد ، تەنانەت فەرمانی دا كە قەڵغانێكی گەورەی بۆ دروست بكەن بچێتە سەری و بـەرز بكرێتـەوە تـا لـەو بەرزاييـەوە درێـژەی شـەڕی نـاو {بـستيون} ببينیٚ ، هـەروەها خــۆی بــەردو خــۆڵی ئــەنا بەشــانيەوە وەك هــەموو ســەربازێك ، ســەربازێك ئەيناسێتەوەو پێـی ئەڵیٚ : جـەنابی وەزيـر چـی ئەكـەی ؟ ! ئێمـە پێويـستيمان بـە بـيروڕای جـەنابت هەيـە نـەك دەسـت و بـازوت ، {سـنان پاشـا} پێـی ووت : جـا بۆچی لەخێر و پاداشت بێبەشم ئەكەی ؟

{سنان پاشا} تا ئەهات گەمارۆكەی لەسەر توندئەكردن ، ئەوەبوو قەڵاكەی ڕزگار كرد [4]. حەفصيەكان ڕايان كرد بۆ ( صقليە ) و لەویٚ مانەوەو ئيتر دەستيان دايە

---

1 حرب الثلاثمائة سنة / ٤٠٠ .

2 تأريخ الجزائر الحديث / ٥١ .

3 بڕوانە :{بستيون قلعة بناها الاسبان بجانب تونس} .

4 حرب الثلاثمائة سنة / ٤٠١ .

فرت و فێڵ و پیلانگێڕی و مامەحەمەیی کردن بۆ پاشاکانی ئیسپانیا تا بەڵکو دەسەڵاتەکەیان بۆ وەربگرنەوە ، ئیسپانەکانیش کردنیان بە خزمەتکارو دەرباری خۆیان و بۆ خۆیان بەکاریان دەهێنان ، لە دەستدانی تونس چی ئومێدو نەخشەی ئیسپانەکان هەیە لە ئەفریقیادا هەمووی دا بەئاودا و کەمکەم دەسەڵاتیان کز بوو تاوای لێهات تەنیا دەسەڵاتیان بەسەر چەند کەنارێکدا مایەوە وەك ( ملیلە ) و ( وهران ) و ( مرسی گەورە) ئەو خەوەی ئیسپانیش ئەیبینی گوایە دەوڵەتێکی ئیسپانی لە باکوری ئەفریقادا دروست بکات بە تەواوی بەرباد بوو و چووە ژێر لمی ئەو بیابانانە [1] .

دوانزەهەم : {سوڵتان سەلیم} سوپایەکی گەورە ئەنێرێت بۆ یەمەن :

بارودۆخی یەمەن ئاژاوەی تێکەوت چونکە ( مگهر) کە ڕێبەرێکی زەیدیەکان بوو دەستی کردە نامە نوسین بۆ خەڵکی یەمەن تا لە حاکمە عوسمانیەکەی ئەوێ ڕابپەڕن و دەری بپەڕێنن ، پاش چەند سەرکەوتنێکی بەسەر عوسمانیەکاندا ئەم (مگهر) ە چووە ( صنعاو ) [2] . حکومەتی عوسمانی هەستی بە ترسناکی هەڵوێستەکەی کرد بۆیە بڕیاریدا کە سوپایەکی گەورە بەسەرۆکایەتی {سنان پاشا} بنێرێت بۆ یەمەن ، {سوڵتان سەلیم} گرنگیەکی زۆری دا بەم سوپایە چونکە ئەیزانی یەمەن شوێنێکی ستراتیژی گرنگی هەیە بۆ عوسمانیەکان لە دەریای سوردا ، چونکە ئەتوانن هەرکەی ویستیان ئەو دەریایە دابخەن بە ڕووی ترسناکی پورتوگالیەکاندا [3] .

لەسەروو ئەوەشەوە یەمەن قەڵغانێکی بەهێز بوو بۆ حیجاز و بنکەیەکی هەڵمەتبردنیش بوو بەرەو ئۆقیانوسی هیندی .

---

[1] جهود العثمانيين / ٤٦٠ .

[2] البرق اليماني في الفتح العثماني ، قطب الدين النهرواني / ١٧٣-١٧٧ .

[3] دراسات في تاريخ العرب القديم ، عمر عبدالعزيز / ١٠٢ ، ١٠٣ .

{سنان پاشا} ی وەزیری عوسمانی گەیشتە میصر بۆ جێبەجێکردنی ئەم فەرمانەی سوڵتان ، و لەوێدا لە هەموو لایەکەوە سەربازی بۆهات و لێی کۆ بوونەوە ، تەنانەت لە میصردا وای لێهات جگە لە پیرو پەککەوتەکان هەموو دەستان دایە چەك [1].

سوپاکە کەوتە ڕێ و گەیشتە ( ینبع ) و ( قاچی القچاه ) ی مەککە هاتە پێشوازی {سنان پاشا} و کە سوپاکە گەیشتە مەککە هەموو خەڵکی مەککە هاتنە پێشوازیان و لەوێدا سوپا میصریەکەو سوپاکانی { شام }و {حەلەب} و {فەرمان} و {مرعش} یەکانگیر بوون ، {سنان پاشا} سوپاکەی سەرلەنوێ ڕێك خستەوە و دەستی کردە دابەش کردنی زەکات و تفاق بەسەریانداو ڕێزی تایبەتی بۆ زاناو فەقیهەکان نواند ، چەند ڕۆژێك لە مەککەدا مایەوەو پاشان بەرەو ( جازان ) کەوتە ڕێ و کە لەوشارە نزیك بوویەوە ئەو حاکمەی کە ( مگهر ) ی زەیدی دانابوو ، هەڵاتن و سنان پاشا لە {جازان} ماوەیەك مایەوەو عەرەبەکانی ئەوێ هەموو هاتنە لای گوێڕایەڵی خۆیان بۆ نواند ، لەوانەی کە هاتنەلای ( خەڵکی صیبا) بوون کە لە ڕاستیدا {سنان پاشا} ڕێزی زۆری لێگرتن و فەرمانی دا کە جل و بەرگ و کالای باشیان پێ بدرێت ، هەروەها نوێنەرانی عەرەبەکانی یەمەن هەموو هاتن و گوێڕایەڵیان دەربڕی بۆ دەوڵەت و داوای (ئەمان)یان بۆ خەڵکەکە کرد .

{سنان پاشا} بە پەلە خۆی نابە ( تعز) ەوە پاش ئەوەی کە ( جازان ) ی کۆنترۆڵ کرد و دایمەزراند ، هۆکەشی ئەوەبوو کە هەواڵی پێگەیشت حاکمی عوسمانی (تەعز)ە ئەو سەربازانەی کە لەگەڵیدان ئابلۆقەیەکی توندیان کەوتووەتە سەر چونکە ( عەرەبە شاخیەکان) ی ئەوێ ڕێگەی خواردن و ئازوقەیان لێ گرتوون و توشی گرانی و برسێتی بوون ، {سنان پاشا} ئەو

---

[1] غاية الأماني في أخبار القطر اليماني ، يحيى بن الحسين : ٢ / ٧٣٣ .

ماوەیەی بە خێرایییەکی پێوانەیی بڕی و لە دەرەوەی (تەعز)سوپاکەی مۆڵدا و سەربازەکانی بە شاخەکاندا بڵاو کردەوە ، کە زەیدیەکان ئەو سوپا بێشومارەیان بینی ناچار هەڵاتن و خۆیان لە شاخی (ئەغبەر)دا قایم کرد .

{سنان پاشا} بە هێزێکی بچوکەوە پەلاماری زەیدیەکانی دا لە شاخی ( ئەغبەر) دا و ناچاری کردن کە لە حەشارگەکانیان بێنە دەرەوەو دەست بکەنەوە لە عوسمانیەکان ، بەڵام زۆری نەبرد شکان و هەڵاتن و هەریەکەی بە لایەکدا ڕۆیشتن ، {سنان پاشا}ش لە پاداشتی ئەم نەبەردیەدا هەموو ئەو سەربازانەی خەڵات کرد کە بەشداری ئەم شەڕەیان کردبوو [1] .

سیازدەهەم : گرتنی ( عەدەن ) :

{سنان پاشا} دوو سوپای بۆ گرتنی عەدەن ئامادە کرد ، یەکەمیان لەڕێگەی دەریاوە بەسەرۆکایەتی {خیرالدینی کەشتیەوان} کە بە ( قووت اوغلی) ناوبانگی دەرکردبوو ، لەگەڵ برایەکی {سنان پاشا} خۆیدا ، سوپای دووەم لە ڕێگەی وشکانیەوە بوو بە سەرۆکایەتی {ئەمیر حاجی} کە چەند سوارچاکێکی لەگەڵدا بوو .

{قاسم کوڕی شوەیع} کە حاکمی عەدەن بوو لە لایەن مگهرەوە دانرابوو کە ئیمامی زەیدیەکان بوو، دەستی دابوویە بانگەشە بۆ مەزهەبی زەیدی ، خەڵکی عەدەنیش لەبەر ئەوەی شافیعی مەزهەب بوون و لەسەر قورئان و حەدیس ئەڕۆیشتن هەموو رقیان لێ هەڵگرتبوو ، ئەم کابرایە قوتابخانەیەکی لە عەدەندا کردبوو بەناوی (مطهر) ەوەو وانەی مەزهەبی زەیدی تێدا ئەوتەوە، جگە لەمە داوای کۆمەك و هاوکاریشی لە پورتوگالیەکان کردو هێنانیە ناو عەدەن و ئاگاداری کردن بەسەر هەرچی لە ناو قەڵاکەدا هەبوو ، هەموو ئەو تۆپ و ئازوقەیەش کە هەبوو لە عەدەندا دابوویان بە پورتوگالیەکان بۆ ئەوەی ئەوان لە

---

[1] البرق اليماني في الفتح العثماني / ٢١٨ –٢٢٨ .

دەریاوە بەرگری لە عەدەن بکەن و زەیدیەکان و ئەوانەش لەگەڵیاندان لە ووشکانیەوە بەرگری بکەن ، بەڵام {خیرەدینی کەشتیەوان} هەرزوو خۆی گەیاندە عەدەن و سەیر ئەکات لە ناوەڕاستی دەریادا بیست کەشتی چارۆکەداری مەسیحیەکان بەرەو عەدەن دێن کە {خەیرەدین} لەوە دڵنیابوو بەرەو ئەو کەشتیانە کشاو ناچاری هەڵاتن و ڕاکردنی کردن و بە شوێنیاندا هەر ڕۆیشت تا تەواو لە دوور کەوتنەوەیان دڵنیابوو .

{خەیرەدین }گەڕایەوە بۆ کەناری دەریاو تۆپەکانی ڕووکردە قەڵای عەدەن و چاوەڕوانی ئەوەی ئەکرد کە سوپاکەی وشکانیش {کە ئەمیر حاجی سەرۆکایەتی ئەکرد} بگەنە ئەوێ و پێکەوە پەلاماری عەدەن بدەن ، بەڵام زەیدیەکان توشی هێرشێکی کتوپڕی یان کردن و شەڕ دروست بوو زۆری نەبرد ئەمیر حاجی بەخۆی و سوپاکەیەوە هاتن و لە هەموو لایەکەوە گەمارۆی عەدەنیان داو لەیەك کاتدا لە هەموو لاکانەوە پەلاماریان دا و خەیرەدین ( ئەمان) ی دا بەو خەڵکەی کە ( قاسم کوڕی شوەیع ) و کوڕەکەو نزیکەکانیان هێنایە بەردەستی ، یەکێك لەوانەی کە لەناویاندا بوو دانەویەوە کەدەستی خەیرەدین ماچ بکات لە ژێرەوە خەنجەرێکی دەرهێناو بە پەلە کردی بە سکی خەیرەدیندا و برینداری کرد ، ئەمیر حاجی هاتە پێشەوەو قاسمی کوڕی شوەیعی کوشت ، چونکە ئەو ناپاکیەی بە پیلانی ئەو زانی ، و یستی کوڕەکەی و هەموو هەوادارەکانیشی بکوژێ بەڵام {میر خەیرەدین} نەیهێشت و لێیان خۆش بوو ، {سنان پاشا} ی وەزیر دڵخۆشی زۆری بەم سەرکەوتنە دەربڕی و سەربازەکانیش بەهەمان شێوە ، ئەوەبوو هەموو شارەکانی ( تەعز) و ( زبید) و هەموو میرنشینەکانی عەدەنیان ڕازاندەوە و دەستیان کردە ئاهەنگ گێڕان .

سنان پاشا ( خوشکەزاکەی ) خۆی کە ناوی {ئەمیر حسینی} بوو دانا بە حاکمی عەدەن و دووسەد سەربازیشی لەگەڵدا داناو ، هەموو ئەو سەربازانەی کە بەشداری ئەم شەڕەی عەدەنیان کرد پلەی بەرز کردنەوە [1] .

چواردەهەم : گرتنی ( صنعاو )

{سنان پاشا} کە دەستی خاڵی بوو لە خوارووی یەمەن ، بەرەو ( ژمار) کەوتە ڕێ و فەرمانی دا کە تۆپەکان بکشێنرێنەوە بۆ گەمارۆدانی ( صنعاو ) ، {مگهر} کە بەمەی زانی هەرچی تفاق و چەك هەیە کۆی کردەوە و پاشەکشەی کرد لە ( صنعاو ) ، کە {سنان پاشا} بەرەو ( صنعاو )کەوتە ڕێ وادەی ( ئەمان ) ی دا بە خەڵکی ، کە خەڵکەکە لەوە دڵنیابوون ژمارەیەکی زۆریان کردە نوێنەری خۆیان و ناردیانە لای {سنان پاشا} ، ئەویش ڕێزی زۆری لێگرتن و بەبێ شەڕ چوویە ناو شارەکە هەرچەندە لەشارەکەدا نەمایەوە و بەڵکو ئەو سوپا بێشومارەی خستەڕێ بۆ شەڕی ( کوکبان ) و ( پلا) . چونکە سنان پاشا ئەیزانی بارودۆخی یەمەن دانامەزرێ ئەو کاتە نەبێ کە مگهر و شوێنکەوتوەکانی سەرکوت ئەکرێن ، ئەوەبوو کە هێز دوای هێز ئەینا بەیەکترەوە و والی عوسمانیەکانیش بە شوێنیاندا هات و شەڕی ئەم مگهرە نزیکەی دوو ساڵی خایاندو جارێك ئەم و جارێك ئەو ئەیبردەوە ، تاکوو لە کۆتاییدا و لەساڵی ٩٨٠ ك ، ١٥٧٣ ز ، ئیمام {مگهر} لە ( پلا) وەفات ئەکات و بزوتنەوەکەی کز ئەبێت ، مردنی ئەم {مطهرة} ڕێگەیەکی زۆری خۆش کرد بۆ عوسمانیەکان تا بەتەواوەتی دەسەڵات بکێشن بەسەر ئەو وولاتەدا ، بەڕادەیەك ( حسن پاشا ) کە والی عوسمانیەکان بوو توانی دەست بکێشێ بەسەر هەریەك لە ( ثلا) و ( مدع) و ( عفار) و ( دی مرمر) هەردوو ( شرفینی ) سەرو و خواروو هەروەها ( صعدە) کە بنکەی سەرەکی ئیمامانی زەیدیەکان بوون ، بەم شێوەیە بۆ ماوەیەك توانرا کە

---

[1] البرق اليماني في الفتح العثماني / ٢٤٩ –٢٥٥ .

بزوتنەوەی بەرگری یەمەنی دابمرکێننەوە و {حسن پاشا}ش توانی کە ( ئیمام حەسەنی کوڕی داود ) کە دوای {مطهر} بوویە ڕێبەری زەیدیەکان بە ئەسیری بگرێت [1].

دوای شەڕی لیبانتۆ ( ٩٧٩ ك – ١٥٧١ز ) دەوڵەتی عوسمانی غەمی گەورەی ئەوەبوو کە پارێزگاری لە شوێنە ئیسلامیە پیرۆزەکان بکات بە پلەی یەکەم و پاشان دەریای سوورو کەنداوی عەرەبی قایم بکات وەك پشتێنەیەکی ئەمنی بەدەوری ئەو شوێنانەدا ، ئەمەش وای ئەخواست کە کەشتیگەلێکی بەهێزیان تێدا دابنێ تا ڕێگە لە پورتوگالیەکان بگرێت [2].

بەڵێ دەوڵەتی عوسمانی توانی قەڵغانێکی بەهێز بە دەوری ئەو شوێنە ئیسلامیە پیرۆزانەدا دابنێ لەبەرامبەر هێرشی مەسیحیەکاندا ، لەگەڵ ئەمەشدا سوڵتان توانی کە هێزێکی تایبەتی عوسمانی لە ( مەککە ) و ( مەدینە) و ( ینبع ) دا بهێڵێتەوە ، هەروەها دەوڵەتی عوسمانی چەند قوللە و قەلایەکیشی بۆ پاسەوانی دانا بەدرێژایی ڕێگەی میسرو سوریاو مەککە بۆ پاراستنی بیرە ئاوەکان و کاروانەکانی بازرگانی ، هەروەها دەوڵەت ئەو بڕیارەشی دا کە پێویستە والی ( جدە ) نوێنەری {باب العالی} بێت لە حیجاز دا ، حیجاز یەکێك بوو لەو وولاتانەی لەسەردەمی عوسمانیەکاندا دوو جۆر کاربەدەستی هەبوو ، بۆیە بڕیاری دەوڵەت وابوو کە ئەو گومرگ و باجەی لە مینای {جدە} دا لە کەشتی وەردەگیرێ بکرێتە دوو بەشەوە بەشێکیان بدرێتە والی عوسمانیەکان و بەشەکەی تری بدرێتە شەریفی مەککە [3].

پازدەهەم : بەرگری یەك لە سوڵتان سەلیم و مردنەکەی ( بەڕەحمەت بێت ) :

---

[1] الفتح العثماني لليمن ، فاروق أباظة / ٢٣ .

[2] جهود العثمانيين / ٤٨٤ .

[3] جهود العثمانيين / ٤٨٧ .

( كارل بروكلمان) [1]ی ڕۆژهەلاتناس وا وەسفی سوڵتان سەلیم ئەكات گوایە بە (پیاوە سەرخۆشەكە) خەڵك ناویان بردوە ، هەروەها كابرایەكی گوناهكار و ئەهلی كەبیرە بووە و هاودەمی خەڵكی خراپ و گوناهبار و بەرەڵلا بووە ،( د. عبدالعزیز الشناوی)[2]یش –بەڕەحمەت بێت – هەمان قسەی بروكلمان ئەكات ، بەلام {د. جمال عبدالهادی} ، بەبەڵگەوە وەلامی هەموو ئەو تۆمەتانە ئەداتەوەو ئەڵێ :

١ ٠شایەتی كافر دژ بە موسوڵمان وەرناگیرێ ، ئیتر نازانم نووسەری ئیسلامی چۆن ڕێگە بە خۆی ئەدات كە ئەم جۆرە درۆ و شایەتیانە بجوێتەوە دەربارەی كاربەدەستانی موسوڵمانان بەبێ ئەوەی بەڵگەیان هەبێت ، ئایا لە قوتابخانەی ئیسلامدا فێری ئەوە نەبوو كە خوای گەورە ئەفەرموێ : ﴿ لولا إذ سمعتموه ظن المؤمنون والمؤمنات بأنفسهم خيرا ﴾ النور : ١٢ ، یان ئەفەرموێ ﴿ ياايها الذين ءامنوا إن جائكم فاسق بنبأ فتبينوا ﴾ الحجرات : ٦ .

٢ ٠ ڕۆژهەلاتناسان و ئەوانەی كە لەسەر هەمان بەرنامەی ئەوان ئەڕۆن ، خوویان بەوەوە گرتووە كە هەركات هاتنە سەر باسی كاربەدەستانی ئیسلامی بە تایبەتی ئەوانەیان كە موجاهیدو تێكۆشەربوون خێرا پەنا ئەبەن بۆ ئەوەی وای نیشان بدەن كە پیاوێكی مەشروب خۆربووەو خۆی لە خراپەو خراپەكاری نەپاراستوە ، نەك هەر ئەمە بەڵكو ئەو كەسانە ڕاهاتوون كە هاتنەسەرباسی دین ئیتر ئەوەی نەشێ بەرامبەری دەیڵێن ، هەروەك بەرامبەر بە پێغەمبەران هەموو شتێكی ناڕەوا دەڵێن ، دەی ئیتر چۆن ئەبێت ئێمە قسە لەمانە وەربگرین پاش ئەوە ئەزانین ئەم ڕۆژهەلاتناسانە دەستپاك و ئەمین نین ؟

---

[1] الأتراك العثمانيوون ، كارل بروكلمان : ٣/ ١٣٧ .

[2] الدولة العثمانية دولة مفترى عليها : ١/ ٦٧٩ .

پاشان دێته سەر باسی گرنگترین کارەکانی سوڵتان سەلیمی دووهەم کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەو کابرایە دوورە لە هەموو ئەو تۆمەتانەی ئەدرێنە پاڵی ، دوای ئەوە ئامۆژگاریەکی هەموو ئەو مامۆستایانەی مێژوو ئەکات کە گوێ بە ڕاستی و ڕادەی زانستی زانیاریەکان نادەن و ئەڵێ : ( ئامۆژگاریەکم هەیە بۆ هەموو ئەوانەی کە بەدوای ڕاستیدا ناگەڕێن و خەڵکی بەردە باران ئەکەن بەبێ بەڵگە و بەرچاوو ڕوونی ، باهەرچیان بیست داوای بەڵگە بکەن بۆی و بەبێ بەڵگەش خۆیان شت نەڵێن ، ئەوەشیان هەمیشە لەبەرچاو بێت کە ناشیرین کردن و ( قذف ) جینایەتێکی گەورەیە ، و سزای لەسەر دانراوە ( لەشەرع و لە یاساشدا ) ، ئومێدەوارم کە مامۆستایانی مێژوو بە تایبەتی زۆر ئاگایان لەمە بێت و خۆیان لەوە بپارێزن کە کاتێك گومانێك یان تۆمەتێك ئەدرێتە پاڵ هەرکەسێك بەبێ بەڵگە نەوەری بگرن و نەبیشی لێنەوە .

با ئەوەشیان لەبەر چاودا بێت کە خوای گەورە کێشانە بۆ کردەوەی چاك و کردەوەی خراپ دائەنێت ، خۆ خوای گەورە ترازوو تەنها بۆ خراپەکان دانانێت و چاکەکان پشتگوێ بخات ، مێژوو نوس ئەبێت ئەمەی هەمیشە لەیاد بێت ، ئەبێت ئەوەش بزانێ کە ووشە سپاردەو ئەمانەتێکە و شایەتیدانێکە لەبەردەم خوادا ( خوا لێی ئەپرسێتەوە) ، ئالێرەوە پێویستە کە سەرەتا لە هەموو قسەکانی دڵنیا ببێت پاشان بێت و لە کتێبەکەیدا بینوسێ )[1] .

هەموو ئەوانەی کە لێکۆڵینەوە دەربارەی دەوڵەتی عوسمانی دەکەن ئەوەیان بۆ دەردەکەوێت کە دەوڵەت چەند هێزو پێزی بووە لەسەردەمی سوڵتان سەلیم دا . جێگری بوندوقدارە صەلیبیەکان لە ( استانبول) دوای شەڕی {لیبانتۆ} و تێکشکانی کەشتیگەلی عوسمانی ، داوای کرد کە چاوپێکەوتنێك لەگەڵ {صەدری ئەعزەم محمد صوقلو پاشا} دا بکات ، تا لەو چاوپێکەوتنەدا بەناخی

---

[1] اخطاء يجب أن تصحح في التاريخ ، جمال عبدالهادي / ٦٥ .

{صەدری ئەعزەم} دا بچێتە خوارەوەو سیاسەتە باڵاو ئاراستەکانی دەوڵەتی بۆ دەرکەوێت بەرامبەر بوندوقدارەکان ، بەڵام {صەدری ئەعزەم} هەرزوو پێی ووت : من دڵنیام کە تۆ بۆ ئەوە هاتووی سیخوڕی بکەیت بەسەرمانەوە و ئەتەوێ بزانی ئێمە ئەم ئازایەتیەمان لە کوێ بوەو لەکوێوە سەرچاوە دەگرێ ، بەڵام حەز ئەکەم ئەوە چاك بزانی دۆڕاندنی ئێمە و دۆڕاندنی ئێوە زۆریان جیاوازە ! دەست بەسەراگرتنی ئێمە بۆ ( قبرص) وەك ئەوە وابوو کە باڵێکی ئێوەمان شکاندبێت و بڕیبێتمانەوە ، بەڵام ئێوە کەشتیگەلەکەی ئێمەتان تێك شکاندووە وەك ئەوە وایە ڕیشمانتان تاشیبێت و ڕیشیش زۆر نابات دێتەوە و پڕ ئەبێتەوە ، زۆر لەوە بەپەلەتر کە بۆ یەکەمجار لە دەموچاودا ئەڕوێت !! [1]

لە ڕاستیدا {صەدری ئەعزەم} قسەو کردەوەی وەك یەك بوو : هەرزوو دەستی دایە دروستکردنەوەی کەشتیگەلی عوسمانی ، لەڕووی ویژدانیشەوە قسە بکەین کە سوڵتان سەلیمی دووهەمیش زۆر بە حەماسەتەوە هەوڵی دابۆ دروست کردنەوەی ئەم کەشتیگەلە، ئەوەبوو زۆر دەسکراوانە و لەماڵی تایبەتی خۆی شتێکی زۆری بەخشی بۆ ئەو کارەو دەستیشی نا بە ئەو هەموو مافەی هەیبوو لەباخەکانی کۆشکی سوڵتانیدا تا کۆمەڵێکی زۆر حەوزی تێدا دروست بکرێت و بەپەلە کەشتیەکان دروست بکرێنەوە و یەکەیەکی دریایی تازە بنیات بنرێتەوە ، ئەوەبوو کەشتیگەلێکی تازەی عوسمانی دەستی کردەوە بە هاتن و ڕۆیشتن لە ناو دەریای ناوەڕاستدا [2] .

ئەم هەڵوێستە ئەوە دەردەخات کە بەڕێوە بردن تەنیا بە حەماسەت نابێ ، بەڵکو ئەبێ لەگەڵ ئەوەشدا کاری جیدی بۆ بکرێت ، ئەوەبوو لە ماوەیەکی زۆر کەمدا سەرلەنوێ کەشتیگەلێکی تازە بنیات نرایەوە ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە

---

[1] الدولة العثمانية دولة إسلامية : ١/ ٦٧٨ .

[2] الدولة العثمانية دولة إسلامية : ١ / ٦٧٧ -٦٧٨ .

لەو سەردەمەدا خەڵك لە خۆشگوزەرانیدا ژیاوە ، ئەوەبوو نە باجیان دانا لەسەر خەڵك و نەماڵی کەسیش دەستی بەسەردا گیراو نەبە خەڵکیشیان ووت ئەبێ لە برساندا بمرن چونکە نابێ دەنگی کەس لە دەنگی شەڕ بەرزتر بێت ، {سوڵتان سەلیم} خۆی و لەماڵی تایبەتی خۆی و خێزانەکەی ئەرکی مەسەلەکەی گرتە ئەستۆ چونکە لە قوتابخانەی ئیسلامەوە ئەوە فێر بووە کە خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ وما تنفقوا من شيء في سبيل الله يوفّ إليكم وأنتم لاتظلمون ﴾ الأنفال : ٦٠ .

مردنەکەی :

مێژوونووسە ڕۆژئاواییەکان واباس ئەکەن کە {سوڵتان سەلیمی دووهەم} بە هۆی مەشروب خواردنەوەی زۆرەوە مردووە ، بەڵام مێژوو نووسە موسوڵمانەکان ئەڵێن : هۆی مردنەکەی ئەوەبوو کە ڕۆژێکیان لە ( گەرماو ) دا پێی ئەخلیسکێ و زۆر خراپ ئەدات بەزەویداو بەو بۆنەیەوە چەند ڕۆژێك نەخۆش ئەکەوێت و پاشان ئەمرێت لەساڵی ٩٨٢ ك دا [١].

باسی دووهەم: سوڵتان مورادی سێهەم ( ٩٨٢-١٠٠٣ ك ، ١٥٧٤-١٩٥٤ز )

پاش مردنی باوکی تەختی پاشایەتی گرتەدەست کەوتە گرنگیدان بە زانیاری و ئەدەب و شیعر ، سێ زمانی بە چاکی ئەزانی ، تورکی و عەرەبی و فارسی ، پیاوێك بوو حەزی لە ( تصوف ) بوو ، بەوە بەناوبانگ بوو کە پیاوێکی لە خواترسەو حورمەتی زانایانی زۆر لایە ، بۆ هەموو سەربازێکی ( دانیشتوو) بڕی ( ١١٠٠٠٠) سەدو دە هەزار لیرەی ئاڵتونی بڕیەوە ، ئەمەش بوویە هۆی ئەوەی پشێوی نەمێنێ کە زۆر جار بەهۆی دواکەوتنی خەڵات و موچەوە ڕووی ئەدا [٢].

یەکەم : هەستا بە یاساغ کردنی عارەق :

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية ، د . جمال عبدالهادي / ١٢٨ .

[2] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي /١١٠ .

یەکەمین کارێك پێی هەستا ئەوەبوو عارەق خواردنەوەی یاساغ کرد چونکە خەڵکی سەری کردبوویە ئەو کارە خراپە ، تەنانەت سەربازەکانیش و بە تایبەتی ( ئینکیشاریەکان) ، بۆیە بەرگەی ئەم فەرمانەیان نەگرت و لەسوڵتان ڕاپەڕین و ناچاریان کرد کە لەو فەرمانە پاشگەز بێتەوەو ئەویش ملی بۆدان ، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەوڵەت نیشانەکانی بێهێزبوونی لێوە دەرکەوتبوو ، چونکە یانی چی سوڵتان نەتوانێت عارەق یاساغ بکات و یاساکانی شەرع بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێ ؟ هەروەها ئەمە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی کە (ئینکیشاریەکان ) لە ئیسلامی ڕاستەقینە لایان داوە و لە یاسا بەرزەکانی پەروەردەی ئیسلام دوور کەوتوونەتەوە و خۆشەویستی و عەشقی جیهاد لە دڵیاندا نەماوە [1].

دووهەم : بڕیاری پاراستنی {پۆڵۆنیا} و تازەکردنەوەی ( امتیازات) :

{سوڵتان موڕادی سێهەم} لەسەر هەمان سیاسەتی پێشوی باوکی ئەڕۆیشت ، ئەوەبوو لەسەردەمی ئەمیشدا چەندان شەڕی ئەملاولای کرد ، لەساڵی ٩٨٢ك ، ١٥٧٤ز پاشای پۆڵۆنیا ( هنری دی فالوا) هەڵات و ڕۆیشت بۆ فەرەنسا ، خەلیفەی عوسمانی گەورە پیاوانی پۆڵۆنیای ئاگادار کردەوە کە ئەمیری ( ترانسلفانیا) بە پاشای خۆیان هەڵبژێرن، ئەوانیش بەگوێیان کرد ، ئیتر پۆڵۆنیا ( پۆڵندا) بەیەکجاری و لە ساڵی ( ٩٨٣ك ، ١٥٧٥ز ) هاتە ژێر چاودێری دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ( نەمسا) ش لە ڕێکەوتنامەیەکی ئاشتیدا کە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا مۆری کرد بۆ ماوەی (٨) ساڵ دانی بەمەدا نا ، تەتارەکان لە ساڵی ( ٩٨٤ك ، ١٥٧٦ز ) پەلاماری سنورەکانی پۆڵۆنیایان داو ئەویش هانای برد بۆ دەوڵەتی عوسمانی و بەڕەسمی ئەوە ڕاگەیەنرا کە ( پۆڵۆنیا) لەژێر پاراستنی دەوڵەتی عوسمانیدایە [2].

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية العلية / ٢٥٩ .

[2] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ١٠٠ .

{سوڵتان موراد} سەرلەنوێ لەگەڵ فەرەنساو بوندوقداەرکاندا ( امتیان)ەکانی تازەکردەوە و هەندێ لە ( امتیان) ی زیاتر تری دابە قونسوڵگەری و بازرگانیەکانیان لەگەڵ زیاد کردنی چەند بڕگەیەك بۆ ڕێکەوتننامەی ئاشتی نێوانیان کە لە بەرژەوەندی ئەوان بوو، گرنگترینیان ، ئەبێ باڵوێزی فەرەنسا لەپێش هەموو باڵوێزەکانی تری وڵاتانەوە بێت لە ئاهەنگە ڕەسمیەکان و چاوپێکەوتنە حکومەتیەکاندا ، ئەمە وای کرد کە هاتوو چۆی باڵوێزەکانی فەرەنسا زۆر بە چڕی چاوپێکەوتن و سەردانی ( باب العالی) بکەن و هەریەکەی لە لایەکەوە پەیماننامەی بازرگانی لەگەڵدا مۆر بکات و ئەوەش بوویە هۆکارێك بۆ دەستخستنە ناو کاروباری دەوڵەتەوە ، لەسەردەمی {سوڵتان موراد}دا بوو کە ( ئیزابێلا) شاژنی ئینگلیز ( امتیان) ی تایبەتی وەرگرت بۆ بازرگانەکانی وڵاتی خۆی کە کەشتیە دەریاییەکانی ئینگلیز ئاڵای ( بەریتانیا) یان ئەکرد بە کەشتیەکانیانەوە و بەئازادی ئەهاتنە ناو بەندەرەکان و ڕۆخەکانی دەوڵەتی عوسمانیەوە [1].

سێهەم : ململانێ لەگەڵ شیعەی صەفەویدا :

لە ساڵی ٩٨٥ ك ، ١٥٧٧ ز دا پاش ئەوەی کە وڵاتی فارس ئاژاوەی تێکەوت بە مردنی ( طهماسب ) ، عوسمانیەکان هێرشێکی سەربازیان کردە سەر ئەو وڵاتەو توانیان ڕووبەرێکی زۆر فراوان داگیر بکەن لە وڵاتی قەوقاز و شاری ( تفلیس ) و گورجستان ( کەرەج ) بگرن ، پاشان عوسمانیەکان چوونەناو شاری تەورێز لە ساڵی ٩٩٣ك ، ١٥٨٥ ز ، سوپای {سوڵتان موراد} توانی دەست بکێشێ بەسەر ناوچەکانی ( ئازەربایجان و کەرەج و جۆرجیا و شیروان و لوزستان دا ، بەڵام کە شاعەباسی گەورە حوکمی وڵاتی فارسی کەوتە دەست هات لەگەڵ عوسمانیەکاندا ئاشتینامەیەکی مۆرکرد و بەپێی ئەو ئاشتینامەیە

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية العلية / ٢٦٠ .

دەستی لە هەموو ئەو ناوچانە هەڵگرت کە کەوتبوونە ژێر دەستی عوسمانیەکان و هەر بەپێی ئەو ڕێکەوتننامەیەش پەیمانی ئەوەیان دا کە لەوەودوا بە هیچ شێوەیەك لە شانشینی ئەودا قسە نەوترێت بە خەلیفەکانی ڕاشیدین ( أبوبکر و عومەر و عوسمان "خوایان لێ ڕازی بێت" ، ( حیدر میرزا) کە ئامۆزای خۆشی بوو بە ( بارمتە ) ناردیە ( استنبول) وەك گرنتیەك بۆ جێبەجێ کردنی ئەوەی ڕێککەوتبوون لەسەری [1].

چوارەم : یاخیبوون وبیگوێیی لەسەر دەستی"ئینکشاریەکان"دا دەست پێ دەکات :

پاش ئەوەی جەنگ ڕاوەستا ئینکیشاریەکان لە ویلایەتە عوسمانیەکاندا یاخیبوون و لاساریان ڕاگەیاند ، ئەویش ئەوەبوو سوڵتان فەرمانی پێ کردبوون کە لەگەڵ ( مجر ) دا بەشەڕبێن ، کەچی ئەمان هەر لەبەردەم ( نمسا) دا کە هاوکاری ( مجر) بوو شکان و هەڵاتن ، و چەند قولەو قەڵایەکی قایمیان لە عوسمانیەکان گرت و ئەوەبوو ( سنان پاشا ) هەمووی لە ژێر دەست دەرهێنانەوە ، لەهەمان کاتدا ئەمیرەکانی { ئەفلاق}و{بەغدان}و ( ترانسلفانیا) ش یاخی بوون و دایانە پاڵ نەمسا دژ بە عوسمانیەکان ، سنان پاشاش لە ساڵی ١٠٠٣ ك ، ١٥٩٤ ز هێرشێکی بردنە سەر بەڵام نەك هەر تێیدا سەرکەوتوو نەبوو بەڵکوو چەند شارێکیشی لەدەست دا [2].

پێنجەم : کوژرانی {صەدری ئەعزەم صوقللی محمد پاشا} :

بەپیلانی هەندێ لە نزیکەکانی سوڵتان کە دەستی دوژمنیان پێگەیشتبوو- ئەوانەی کە چاویان هەڵنەدەهات بەم وەزیرە بەڕێزە -صەدری ئەعزەم کوژرا ، کە پیاوێکی تا بڵێی نەگۆڕ بوو ، لەسەر بەرنامەیەکی پڕ حیکمەت هەنگاوی هەڵدەنا

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ١٠١ .

[2] الدولة العثمانية في التاريخ الإسلامي/ ١٠١ .

، و هەوڵی بنیادنانی دەوڵەتی ئەداو پیاوێکی لێوەشاوەش بوو بۆ سەرکردایەتی کـردن ، و لـە بەرنامـەدانان و کـۆنترۆڵکردنی بەڕێوەبەرایـەتی و بەدواداچـوونی کاربەدەستان و قۆستنەوەی هەلدا هەناسەیەکی درێژی هەبوو ، بۆیـە لـە ڕاستیدا مردنـی ئـەم پیـاوە گـورزێکی کوشـندە و لێقـەومانێکی گـەورەبوو بـۆ دەوڵـەتی عوسمـانی و دوای ئـەم دەرگـای فیتنەیـەکی گـەورە کرایـەوە لـەڕووی پلـەی ( صـەدری ئـەعزەم)یـدا و کێبـەرکێو ململانێـی لەسـەر ردوسـت بـوو ،کـە ئـەو ململانێیانە دەوڵـەتی عوسمانی زۆر بێهێز کرد و پشێوی لـە وولاتـدا نایـەوەو ، هەندێ لە (فرق) ەکانی سوپای فێری لاساری و یاخی بوون کرد و حکومـەتیش نەیتوانی بەسەر ئەو یاخی بوونانـەدا زاڵ بێت و لـە ئـەنجامی ئـەم یاخی بـوون و شۆڕشـە ناوخۆییانەشـدا {پۆڵۆنیـا} لـەژێر دەسـەڵاتی عوسمـانی هاتـە دەرەوە ودەستی دایە هەندێ دەرگیری لەگەڵیدا [1] .

شەشەم : جوولەکەو {سوڵتان مورادی سێهەم} :

جوولەکە وای بۆ ئەچوون کە هەل هەڵکەوتووە بۆ هاتنەدی ئەو شتەی ماوەیەکی زۆر بـوو خـەویان پێـوە ئـەبینی ، بۆیـە دەسـتیان دایـە کۆچـکردنی پـچڕ پـچڕ و بـەدوای یەکدا بـۆ {سـینا} و لـە وێـدا نیـشتەجێ ئـەبوون ، بەرنامەکـەی خۆیـان وابوو کە لە قۆناغی یەکەمدا هەوڵیان لەوەدا چڕ بکەنەوە کە لـە شـاری ( گـور ) دا زۆرترینەی کۆچکەران نیشتەجێ بکەن و هەڵبژاردنی ئەم شـارە هـەروا لـە گـۆترە نـەهاتبوو ، بـەڵکو ئـەوان ئـەیانزانی کـە ئـەم شـارە ئەکەوێتـە کـەناری ڕۆژهـەڵاتی {کەنداوی سویس} کە بەندەرێکی چاکی لێیە بۆ ئـەوەی کەشتیە بازرگانیەکان لەنگەری تێدا بگرن و هەموو ئەو کەشتیانەش کە لـە ( جدە ) و ( ینبع ) و (عقبە )و (قلزم ) ەوە ئەهاتن هەر لەوێدا لەنگەریان ئەگرت ، هەروەها ئەوەشیان ئە زانی

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ١٠٢ .

که ئەم شارە هێڵی وشکانیش بەستراوەتەوە بە کاروانەکانی (قاهیرە) و (فرما) وە.
بەم بەرنامەیە جوولەکە باشترین پەیوەندی دەرەکی دروست ئەکات لەگەڵ دونیادا و لە جیهان دانابڕێن و هەموو ئەو کەشتیانەش کە دێنە بەندەری (گور) ئەتوانن کۆمەڵ کۆمەڵ جوولەکەی تازە هەڵگرن و بیانگوازنەوە ..
(ابراهام ) ئەو کەسەبوو کەسەپەرشتی ئەم کۆچکردنەی جوولەکەی ئەکرد ، سەرەتا خۆی و منداڵەکانی هاتنە ( گور) و تێیدا نیشتەجێ بوون ، ئەم جوولەکانە هەرئەوەندەی تۆزێك ژمارەیان زۆر بوو دەستیان دایە ئەزیەتدانی ڕاهیبەکانی ( دیرسانت کاترین ) ، ئەوانیش شکاتنامەیەکیان بڵاو کردەوە و گەیاندیانە سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانی و تێیدا باسیان لە ئەزیەتدانی جولەکەکان کردوە بۆ ئەمان و ئەوەش وەبیر دەوڵەتی عوسمانی دێننەوە کە چۆن دەوڵەتی عوسمانی بڕیاری پاراستنی ئەمانی لەئەستۆ گرتووە هەروەها ئەو حەزەرەش ئەدەنە دەوڵەتی عوسمانی کە ڕێگە بگرێت لەوەی جوولەکە {سینا} بکەنە نیشتمانی خۆیان و لەشوێنەکانی ترەوە بگوازنەوە بۆ ئەوێ ، بەتایبەتی ناوشاری ( گور) چونکە مەبەستیان فیتنەو ئاژاوەنانەوەیە.
بە حوکمی ئەوەش کە لەڕووی شەرعەوە دەوڵەتی ئیسلامی بەرپرسە لە پاراستنی ( ئەهلی زیممە) بۆیە بەپەلە سوڵتانە عوسمانیەکان سێ فەرمانی دیوانیان دەرکرد لەسەردەمی {مورادی سێیەم }داو تێیدا فەرمانیان کرد بە دەرکردنی ( ابراهام ) و ژن و هەموو ئەندامانی خێزانەکەی و هەموو ئەو جولەکانەش کە هاتبوونە {سینا}و ئەوەشیان لێ یاساغ کردن کە لەمەودواش بگەڕێنەوە ناوچەی {سینا} و شاری ( گور) و تێیدا نیشتەجێ بن یان بمێننەوە [1].

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٦٨ .

حەوتەم : مردنی {سوڵتان موورادی سێهەم} :

{سوڵتان موورادی سێهەم} لە ١٩ی کانونی دووەمی ١٥٩٨ز و کە تەمەنی بەرەو ٤٩ ساڵی ئەڕۆیشت کۆچی دوایی کرد و {بەڕەحمەت بێت} لە حەوشەی (ئایا صۆفیا) دا نێژرا [١].

## باسی سێهەم

## {سوڵتان مورادخانی سێهەم}

لە ساڵی ٩٧٤ك دا لەدایك بووە، ولەساڵی ١٠٠٣ك لەسەر تەختی پاشایی دانیشتووە، لەپاش مردنی باوکی بە دوازدە ڕۆژ، چونکە لە ( مغنیسیا ) دائەنیشت [٢]. دایکیشی لە بنەڕەتدا خەڵکی {ئیتالیایە} و ناوی ( صفیە ) بوو [٣].

هەرچەندە بێهێزی و داڕوخان ڕووی کردبوویە دەوڵەتی عوسمانی کەچی ئاڵای ( جیهاد ) دژ بە خاچپەرستەکان هەر ئەشەکایەوە، یەکێك لەو سەروەریانەی بۆ ئەم سوڵتانە باس ئەکرێت ئەوەیە ئەم کە دەرکی بەوە دەکرد بەشێك لە بێهێزی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە بەرپرسە باڵاکان خۆیان ناچن بۆ شەڕ و سەرکردایەتی شەڕەکان بکەن، ئەم هات ئەو باوەی شکاند و خودی خۆی ئەچوو بۆ شەڕو هەمان شوێنی {سوڵتان سەلیم} و {موورادی سێهەم}ی بۆ خۆی وەرگرتەوە لە ناو خەڵکدا، ئەویش ئەوەبوو پێشەوایەتی هەموو سوپای ئەکرد بەخودی خۆی و بەرەو ( بلغراد) کەوتەڕێ و لەوێوە بەرەو مەیدانی شەڕو جیهاد کردن ، کە خەڵکی ئەمەی لێ بینی بە جارێك وورەو غیرەتی ئایینی و سەربازی گرتنی و گیانێکی تازەیان هاتەوە بەبەردا ، ئەوەبوو لەساڵی ١٥٥٦ز دا قەڵاسەختەکەی ( ئارلو) ی گرت کە تەنانەت {سوڵتان سولەیمان} نەیتوانی

---

[1] السلاطين العثمانيون / ٥ .

[2] تأريخ سلاطين آل عثمان ، يوسف آصاف / ٨٦ .

[3] الدولة العثمانية / ٧٠ .

بیگریٚ که له ٢٦ی ئۆکتۆبەری ١٥٥٦دا،ئەم توانی سوپای ( مجر) و ( نەمسا) له دۆڵی ( کوزن) تێك بشکێنێت که نزیك بەم قەڵایه مۆڵیان دابوو ، ئەوەبوو پاشان ئەم شەڕەیان هاوشێوەئه کرد بەشەڕی ( موهاکز ) [١] که لەساڵی ١٥٢٦ز دا {سوڵتان سەلیم} تێیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا ، دوای ئەم شەڕە بەردەوام شەڕ ڕوویئەدا بەڵام شەڕی گەورەی وا ڕووی نەئەدا که یەکلاکەرەوە بێت .

لەسەردەمی {سوڵتان محمد خانی سێهەم} دا دەوڵەتی عوسمانی تووشی شۆڕشی ناوخۆیی زۆر بوویەوە که ( قەرەیازیجی ) ڕێبەرایەتی ئەکردن ، هەندێکیشیان ئەسپ سوارەکان ڕێبەرایەتیان ئەکردن ، هەرچەندە سوڵتان زۆر به نارەحەتیش سەرکوتی کردن ، ئالەم ئاژاوە زۆرانەوە لێکۆڵەرەوەی وورد بۆی دەرئەکەوێت که تاچ ڕادەیەك پشێوی له یاسای سەربازی دەوڵەتدا دروست ببوو بەڕادەیەك بۆ ئەوە نەئەشیا مرۆڤ بەو جۆرە یاسا سەربازیانە بڵێٚ سوپای وولاتپارێز لەڕووی دوژمنەکانیدا.

یەکەم : {شێخ سعدالدین ئەفەندی} :

ئەم زانا بەرزە یەکێك بوو له ماموستاکانی {سوڵتان محمدی سێهەم} و هەرئەمیش بوو که هانیدا خودی خۆی سەرکردایەتی سوپا بکات و بەسوڵتانی فەرموو : ( منیش حەز ئەکەم لەشەڕدا لەگەڵ تۆدا بەشداری بکەم تا گوناهەکانم بسڕمەوە چونکه بەڕاستی بوومەتە ئەسیریان ) [٢] ، له یەکێك له شەڕەکاندا زۆری نەمابوو سوڵتان بکەوێتە دەست دوژمن و ئەسیر بکرێت و چی سەرباز و هاوڕێکانی هەیە ڕایان کرد و بەجێیان هێشت ئەم شێخە بەڕێزە نەبێت ، ڕووی تێکرد و فەرمووی : سوڵتانی بەڕێز خۆڕاگربە و دڵنیابە کەسەرکەوتن بەدەست دێنی لەسایەی فەزڵی ئەو خوایەوە که فەزڵێکی زۆری بەسەرتا ڕشتووەو لای لیٚ

---

[1] تاریخ الدولة العثمانیة العلیة / ٢٦٨ .

[2] تأریخ سلاطین آل عثمان ، القرماني / ٦٣ .

کردویتەتـەوە ، سـولّتان بـەم چـەند قـسە کەمـە وورەی هاتـەوە بـەرو سـواری ئەسـپەکەی بـوو بـەدەم دووعـا کردنـەوە شمـشێرەکەی لـە کـێلان دەرکێـشا و پەلاماری دا ، زۆری نەبرد خـوای گـەورە بێ دلـی نـەکرد و سـەرکەوتنی بۆ نـارد، ئەم شەڕە دوای شەڕی گرتنی قەلاّی ( ئاکری) بوو [1].

دووهەم : هەندێ لە شیعرەکانی :

{سولّتان محمدی سێهەم} ئاستێکی بەرزی هەبوو لە ڕووی ئـەدەبی و ڕۆشنبیری و خوێندەواریـەوە، پیـاوێکی زۆر بـەدینیش بـوو ، حـەزی لـە ( تـصوف ) بـوو، ئەمەش نمونەیەکە لە شیعرەکانی کە چەندین مانای بەرزی تێدایە :

( ئێمـە حـەزمان لەسـتەم نیـە بـەڵکو ئەوینـداری دادو یەکسانین [2]، ئێمـە بـۆ ئـەوە کاردەکـەین خـەڵك خـوای خـۆش بوێـت ، خۆشمـان بـەوردی گـوێ ڕادێلّـین بـۆ فەرمانەکانی ئەو خوایە [3]، ئاواتمـان ئەوەیـە ئـەو خوایـە لێمـان ڕازی بێـت [4]، ئێمـە خەڵکێکی خواناسین و دڵیشمان ئاوێنەی هەموو دونیایە ، هەر لـە ئەزەلـەوە ئێمـە دڵمان بەئاگری عەشق سوتاوە، ئێمە دورین لە فرت و فێلّ و خـەڵکێکی بێگـەرد و دڵپاکین [5]. )

سێهەم : مردنەکەی :

{سولّتان محمدی سێهەم} پاش ئەوەی کە هەموو ئەو شۆڕشە توندو بزاڤ یـاخی بونانـەی سـەرکوت کـرد، و بـاوی سـەرکردایەتی کردنـی سـوپای لـە لایـەن سولّتانەکان خۆیانەوە زیندوو کردەوە، خۆی وەفاتی کرد، مردنەکەشی لە ڕۆژی

---

[1] تاریخ سلاطین آل عثمان / ٦٣ .
[2] السلاطین العثمانیون / ٥٧ .
[3] تاریخ الدولة العثمانیة / ١٣١ .
[4] السلاطین العثمانیون / ٥٧ .
[5] السلاطین العثمانیون / ٥٧ .

یەك شەممە ١٨ی ڕەجەبی ١٠١٢ ك دا بوو، ماوەی فەرمانڕەوایی ئەم سوڵتانە (نۆ ساڵ و دوومانگ و دووڕۆژبوو، تەمەنیشی ئەوکاتەی کەمرد ( ٣٨ ) ساڵ بوو [1]، ئەم سوڵتانە سیفەتێکی سەیری هەبوو، هەرکات ناوی پێغەمبەر {صلى الله عليه وسلم } ببرایە هەڵئەسایە سەرپێ و سڵاوی لە دیداری ئەدا وەك زیادە ڕێزو زیادە بەگەورە زانینێکی پێغەمبەری گەورەی کائینات [2].

## باسی چوارەم

### {سوڵتان ئەحمەدی یەکەم} ( ١٠١٢ –١٠٢٦ك ، ١٦٠٣ –١٦١٧ز )

پاش مردنی باوکی حوکمڕانی کەوتە دەست و ئەوکاتە تەمەنی ( ١٤) ساڵ بوو، جگە لەم کەس لە سوڵتانەکانی عوسمانی لە ئەم تەمەنە کەمەدا حوکمڕانی نەکەوتووەتەدەست ، لەکاتی ئەمدا دەوڵەت زۆر شپرز بووبوو بەدەست شەڕی {نەمساوە} لە ئەورووپادا و هەروەها بەدەست شەڕی ئێرانەوە ئەمە بێجگە لە شۆڕشە ناوخۆییەکانی ئاسیا ، ئەم سوڵتانەش هەروەك باوکی دەستی دایە کۆکردنەوەی تفاقەکانی شەڕ [3].

یەکەم : شەڕ لەگەڵ {نەمسا} و دەوڵەتانی ئەورووپیدا:

{سوڵتان ئەحمەد} ، {لالا محمد پاشا} ی بە {صەدری ئەعزەم} دانا ، لەپاش ( یمشجی حسن پاشا )، کە سەرداری گشتی هەموو ئەو سوپایە بوو کە جیهادیان دژ بە {نەمسا} ئەکرد ، ئەم پیاوە لە باشترین سەرکردە سەربازیەکان بوو ، گرنگیەکی زۆری بە سوپای عوسمانی ئەداو قەڵای ( استراغون ) ی گەمارۆ داو لە کۆتاییدا ئازادی کرد ، هەروەك چۆن لە هەمان کاتدا هێرشی کردە سەر میرنشینەکانی ( ئەفلاق و بەغدان و ئەردەڵ ) و ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵیاندا

---

[1] تأريخ سلاطين آل عثمان ، القرماني / ٦٤ .

[2] السلاطين العثمانيون / ٥٧ .

[3] الدولة العثمانية في التاريخ الإسلامي / ١٠٥ .

ئیمزاکرد ، کە ( لالاپاشا )ش مرد ( قبوجی مراد پاشا ) جێگەی گرتەوە و بوویە {صەدری ئەعزەم} کە پێشتر سەرکردەی یەکێك لە تیپەکانی سوپا بوو ، سوپای عوسمانی شەڕی لە {نەمسا} بردەوەو توانی هەموو قەڵاسەختەکانی لە شارەکانی ( یاتق) و ( استراغون ) و ( بلغراد) و هەندێکی تریشی لێ بگرێ ، هەروەها لە سوپای عوسمانی بەسەر سوپای نەمسادا لە مەجەریشدا هەرسەرکەوتنی بەدەست هێنا ، سەرەنجامی ئەمەش ئەوەبوو کە نەمسا ئاشتینامەی قەبوڵ کرد و بڕیاری دا کە باج بداتە دەوڵەتی عوسمانی کە بڕەکەی بریتی بوو لە ( دووسەد هەزار دوکەی ئاڵتون ) ، بەپێی ئەم ڕێکەوتننامەیەش وڵاتی مەجەڕ بوویە وڵاتێکی پاشکۆ بۆ دەوڵەتی عوسمانی [1] هەروەها لە چەند شەڕێکی ناو دەریاش لە نێوان کەشتیگەلی عوسمانیەکان و کەشتیگەلی ئیسپانیاو ڕاهیبەکانی ( قدیس یوحەننا ) لە {ماڵتە} و میرنشینە {ئیتالیەکان} دا ڕوویان داو سەرکەوتن هەرجارەی دەستی لایەکیان ئەکەوت [2].

دووهەم : تازە کردنەوەی ( ئیمتیازاتەکان ) :

لەم ماوەیەدا دەوڵەتی عوسمانی ( امتیازات )ی بۆ{ فەرەنسا }و {بەریتانیا} تازە کردەوە ، وەك خۆی، هەروەها ( امتیازات) ی پۆڵۆنیای تازە کردەوە بەو شێوەیەی کە دەوڵەتی عوسمانی ڕێ لە تەتاری {قەرەم} بگرێ و نەیەڵێ پەلاماری {پۆڵۆنیا} بدات ، و {پۆڵۆنیا}ش ڕێگە بگرێ لە هێرش و پەلاماری ( کازاق) بۆ سەر دەوڵەتی عوسمانی [3] .

{هۆڵەندا} توانی چەند ( امتیازات)ێك بۆ خۆی وەربگرێ و بەو ڕێگەیە کەوتە بڵاو کردنەوەی {جگەرە} لە ناو وڵاتانی ئیسلامیدا و سەربازەکان سەریان

---

1 الدولة العثمانية في التأريخ العثماني / ١٠٥ .

2 الدولة العثمانية في التاريخ العثماني / ١٠٥ .

3 الدولة العثمانية في التأريخ العثماني / ١٠٥ .

کـردە جگـەرە کێـشان ، مفـتی وولاّت فـەتوای حـەرامبونی جگـەرەی دەرکـرد ، سەربازەکان کەوتنە هات و هاوار و فەرمانبەرەکانیش پشتیان گرتن و زانایانیش ناچار بوون کە لە مەسەلەکە بێدەنگ بن [1].

بەم شێوەیە سەربازانی دەوڵەت کەوتنە شوێن هەواو ئارەزووی خۆیـان و کەوتنـە ڕەخنەگرتن و بەرپەرچدانەوەی زانایان !

هێزە بێدینەکان بە هەموو شێوەیەك لـە هـەوڵی ئـەوەدان کـە هەرچی حـەرام هەیـە ئاسانی بکەن لە لای گەلانی ئیسلامی .

ڕاسـتە خـوای گـەورە هەرشـتێك کـەڵکی ببێـت بۆمـان بـۆی حـەڵاڵ کـردوین بـەڵام هەرشتێکیش زیانمان پێ بگەیەنێ حەرامی کـردووە لێمـان ، ئیتر ئـەو زیانـە لـە ( عەقڵ) مان یان لە ( لەش ) مان یان لـە ( ماڵ ) مـان بکـەوێت وەك یەکـە، هەربۆیـە زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ، جگەرەخواردن و فرۆشتن و کـڕینی بـە حـەرام ئـەزانن ، لەبـەر ئـەوەی کـە لـە هـەموو ڕووەکـانی ( ئـایینی) و ( دوونیـایی) و ( تەندروسـتی ) و ( کۆمەڵایەتی ) یەوە زیان ئەگەیەنێت پێمان ، بۆ نمونە :

١. ئەم دوکەڵە ،مرۆڤ نە گۆشتی پێ ئەگرێ و نەبرسێتیشی لە کۆڵ ئەخات .
٢. ئەم دوکەڵە پیسە زیان بەم لەشە بەنرخـەی مـرۆڤ ئەگەیـەنێت و هەرچیش حاڵی وابێ کەواتە حەرامە بەکار بهێنرێت .
٣. جگەرە لەوشتە پیسانەیە کە خوای گەورە ئەفەرموێ ( ويحل لهم الطيبات ويحرم عليهم الخبائث ) الأعراف : ١٥٧ . واتە : هـەموو شـتێکی پاکتـان بـۆ حـەڵاڵ ئـەکات و هـەموو شـتێکی پـیس و زیانبەخشیـشتان لـێ حـەرام ئەکات
٤. بۆنی جگـەرە زۆر ئازاری خـەڵك ئـەدات بـە تایبـەت ئەوانـەی کـە نـایخۆن و بەکاری ناهێنن ، نەك ئەوە بەڵکو مەلائیکەی خواش ئازار ئـەدەن ، چونکە

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٧٢ .

مەلائیکە بە هەموو ئەوانە ئازار ئەخۆن کە مرۆڤ ئازاری پێ ئەخوات ، خوای گەورەش ئازاردانی موسوڵمانانی حەرام کردووە وەك ئەفەرموێ : ( والذين يؤذون المؤمنين والمؤمنات بغير مااكتسبوا فقد احتملوا بهتانا واثما مبينا ) الأحزاب : ٥٨ .واتە : ئەو کەسانەی ئازاری موسوڵمانان ئەدەن بەبێ ئەوەی کارێکی وایان کردبێ شایەن بێت بەو ئازاردانە ، ئەوە بۆختان و گوناهێکی ئاشکرا ئەکەن بە کۆڵەوە لە ئەنجامی ئەو ئازار دروست کردنەیاندا .

ئەمەو چەندین بەڵگەی تریش هەیە زانایان باسی ئەکەن دەربارەی حەرامبونی جگەرە ، بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵك دینی لاواز بووەو سوڵتانی دەوڵەتیش کزە و ناتوانێ یاساکانی ئیسلام جێبەجێ بکات ئاوەها سەربازەکان و خەڵکی تریش دەست ئەدەنە یاخی بوون .

سێهەم : شەڕ لەگەڵ {شیعە صەفەویەکان}دا ( فارسەکان) :

{شا عەباسی صەفەوی} ئەوەی بەهەل زانی کە دەوڵەتی عوسمانی پشێوی کەوتوەتە ناوی بۆیە پەلاماری عیراقی عەجەمی داو ( تەبریز ) و ( وان) و چەند شوێنێکی تریشی داگیر کرد، هەروەها توانی ( بەغداد ) و شوێنە پیرۆزەکانی شیعە لە ( نجف) و( کربلا) و ( کوفە) داگیر بکات و خۆی لە ناو ئاپۆرەیەکی گەورەدا هەستا بە زیارەتکردنی ئەو شوێنانە، مێژوو نووسان ئەڵێن {شا عەباسی صەفەوی} لەم سەردانەی دا ( دە ) ڕۆژ لە نەجەف مایەوەو خۆی خزمەتی حاجیانی لەو شوێنەدا ئەکرد ، هەروەها باسی ئەوەش ئەکەن کە بۆ زیاتر دەربڕینی گەردنگیری بە مەزهەبی شیعەگەری و پشتیوانی لە ڕافیزیەت ئەمەی کردووە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر دەمارگیر بووە بەمەزهەبی شیعەگەریەوە کەچی نەیهێڵاوە پیاوانی ئایینی دەست بخەنە کاروباری سیاسەت و حوکمڕانیەوە و خۆی بەتەنیا جۆرێك لە دەسەڵاتی ڕەهای بۆ خۆی بڕیار داوە .

{شا عەباسی صەفەوی} سەختترین سزای بۆ دوژمنانی دەوڵەتەکەی لە ئەهلی سوننەت بڕیارداوە ئەویش یان کوشتنی بەکۆمەڵ یان چاو هەڵکۆڵین و لەگەڵ کەسدا نەرمی نەنواندووە کاتێك نەبێت کە دەستبەرداری مەزهەبی سوننی بووبێت و خۆشەویستی و پشتیوانی بۆ مەزهەبی شیعە ڕاگەیاندبێت ! [1] ، دەوڵەتی عوسمانی ناچار بوو کە هەموو ئەو قەڵاو شارو ناوچانە بۆ دەوڵەتی صەفەوی شیعەی ڕافیزی مەزهەب جێ بهێڵێت کە لەکاتی سوڵتانی غەزاکەر سولەیمانی یەکەمدا فەتحکرابوون ، بەغداد یەکێك بوو لەو شارانە ، ئەمەش بە یەکەمین پەیماننامەیەك دائەنرێت کە دەوڵەتی عوسمانی دەستی لە وولاتی فەتحراو هەڵگرتبێت و هەرئەمەش بە سەرەتای تیاچوون و بێهێزی دائەنرێت و ئەو پەیماننامەیەش بەیەکەمین پەیماننامە دائەنرێت کە بێهێزی دەوڵەتی عوسمانی دەرخستبێت [2].

{شا عەباسی صەفەوی} زیادەڕەوی زۆری لە دوژمنایەتی کردنی مەزهەبی سوننیدا کردو پەیوەندی کرد بەپاشاکانی مەسیحیەوە و بۆ زیاتر ڕۆچوون لە لێدانی دەوڵەتی عوسمانی کە پاسەوانی مەزهەبی سوننی بوو ، هات پەیماننامەیەکی لەگەڵیاندا مۆرکرد ( بەرگری هاوبەش لە یەکتری) بۆ ئەوەی بە هەردوولاوە کۆڵەکەکانی دەوڵەتی عوسمانی سوننی لەبن و بێخ بهێنن ! بۆ ئەمەش هیچ گوێی بەو هەمووە دابەزینە نەدا بۆ دەوڵەتانی ئەوروپا لە پێناوی ئەوەی ئەم هاوپەیمانیەی سەربگرێت و دۆژمنان هان بدات لە دەوڵەتی عوسمانی {شاعەباسی صەفەوی} لەگەڵ مەسیحیەکانی ئێراندا زۆر باش مامەڵەی دەکرد بە پێچەوانەی مامەڵەی لەگەڵ ئەهلی سوننەتی ئێران دا، هۆی ئەم مامەڵە باشیەی لەگەڵ مەسیحیەکاندا بزاڤ بەمەسیحیکردن ( تبشیر) لە ئێراندا زیادی

---

[1] الإسلام في آسيا ، د. محمد نصر مهنا / ٢٤٩ – ٢٥٠ .

[2] تأريخ الدولة العثمانية العلية / ٢٧٢

گەڵیدا جۆڵایەوە و کردیە پەند و صەدری ئەعزەم ( قبوجی مراد پاشا ) توانی کە ئەنازۆڵ لە خەڵکە ڕاپەڕیوەکە پاك بکاتەوە [1] .

پێنجەم : بزوتنەوەی {فەخرەدین دورزی کوڕی مەعنی دووهەم} :

{فەخرەدینی کوڕی مەعنی دووهەم} لە ساڵی ٩٩٩ك دا دەسەلاتی لە لوبناندا گرتە دەست ، پیاوێکی دورزی گەورەی هەلپەرست بوو ، توانی ژمارەیەکی زۆری دوژمنانی ئیسلام لە {نەصاری }و{ دورزی} و {نوصەیری} و لەو هاوچەشنانە لە خۆی کۆ بکاتەوە [2].

کورتەیەك دەربارەی دورزیەکان :

تاقمێکی بابی مەزهەبن ( حاکم بأمر الله) کە خەلیفەی فاتمیەکان بوو – بەخوا ئەزانن {والعیاذ بالله} ، ئەم تاقمە زۆربەی بیروڕاکانیان لە ( ئیسماعیلیەکان) وەرگرتووە ، دورزیەکان خۆیان ئەدەنە پاڵ ( نشتکین دورزی ) ، ئەم تاقمە سەرەتا لە میصردا دروست بوو پاشان هاتنە وولاتی شام ، ئەم پێڕە مەزهەب و بیرو باوەڕیان تێکەڵەیەکە لە هەموو بیرو باوەڕو دینەکان ، بڕوایان بە کاری نهێنی هەیە و بیرو ڕای خۆیان لە خەڵك ئەشارنەوە ولای خەڵك باسیان ناکەن [3].

لە گرنگترین بیرو ڕاکانیان ئەمانەی خوارەوەیە :

- {حاکم بأمر الله }کە خەلیفەی فاتمیەکانە ، بە خوا ئەزانن و کاتێکیش کە مرد وایان ڕاگەیاند کە ( غەیب بووە ) و زۆر نابات ئەگەڕێتەوە بۆ دونیا .
- نکولی لە پێغەمبەران و خاوەن پەیامە خوداییەکان ئەکەن و بە ( شەیتان) ناویان ئەبەن .
- بڕوایان وایە ( حەمزە) کە ڕێبەرێکی خۆیانە بریتیە لە حەزرەتی مەسیح .

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية ، د. علي حسون / ١٣٢ .

[2] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٧١ .

[3] الموسوعة الميسرة في الأديان : ١/ ٤٠ .

- ڕقیان لە خەڵکی هەموو ئایینەکانی تر ئەبێتەوە ، بە تایبەتی موسوڵمانەکان ، هەموو شتێکی ئەوان بە حەلاڵ ئەزانن وەك خوێن وماڵیان و گزی لێکردنیان ئەگەر هەلیان بۆ هەڵکەوت .
- بڕوایان وایە ئەم دینەی ئەوان هەموو دینەکانی تری پێش خۆی سڕیوەتەوە و نکولی لە هەموو ئەو عیبادەت و یاسا و بنەمایانە ئەکەن کە ئیسلام دایناون .
- هەرکەسێك کە ( پەیمانی تایبەت ) نەنوسێ یان نەخوێنێتەوە بە {دورزی} نازانن .
- بڕوایان بە ( تناسخ الارواح )[1] هەیە ، و بڕوایان وایە کە ( پاداشت ) و ( سزا) ی مرۆڤ ئەوەیە ئەو گیانەی کە دەرئەچێت ئەڕواتە لەشی گیاندارێکی تر کە تێیدا یان ( ناڕەحەت ) یان ( ئاسودە) ئەبێت .
- نکولی لە بەهەشت و دۆزەخ و پاداشت و سزای قیامەت ئەکەن .
- نکولی لە قورئان ئەکەن و ئەڵێن گوایە سەلمانی فارسی قورئانی داناوە و خۆیان قورئانێکی تایبەتیان هەیە کە پێویستە مرۆڤ کە تەنیا بوو ئەوجا دەستی لێ بدات .
- بیروڕاکانیان ئەبەنەوە سەر سەردەمە زۆر کۆنەکان و شانازی بەوەوە دەکەن گوایە ئەمان نەوەی فیرعەونە کۆنەکان و فەیلەسوفە کۆنەکانی هیندستانن .

---

[1] بیروڕای ( تناسخ الأرواح ) واتە : دەرچوونی گیان لە لەشی مرۆڤ و چوونە ناو لەشی گیاندارانی تر ، ئەم تاقمە بڕوایان وایە کە گیانی مرۆڤ کە لە لەشی دێتە دەرەوە ناچێتە دونیای ڕۆحەکان ( عالم الأرواح ) بەڵکو ئەگەر گیانێکی پاك بێت ئەچێتە لەشی ئاژەڵێکی ماڵی بێ زیان و ئەگەر گیانی کەسێکی خراپیش بێت ئەچێتە لەشی ئاژەڵێکی بەزیان (( وەرگێڕ))

- مێژوو لە لای ئەوان لە ساڵی ٤٠٨ کۆچییەوە دەست پێ ئەکات ، کە ئەکاتە ئەو ساڵەی ( حمزە) ی ڕێبەریان ( خوایەتی ) {حاکم بأمر الله} ی ڕاگەیاند {سبحان الله عما یشرکون}.
- بیروڕایان وایە کە قیامەت بریتییە لە گەڕانەوەی حاکم بۆ دونیاو ڕابەرایەتی کردنیان تا ئەیانبات کەعبەیان پێ ئەڕوخێنێت و موسوڵمانان بە جارێ هەموو تێك ئەشکێنێت و لە تەواوی سەرزەمیندا و پاشان ئیتر تا هەتاهەتایە فەرمانڕەوایی خۆیان ڕائەگەیەنن و (جزیە) ی کزۆڵی بەسەر موسوڵماناندا ئەسەپێنن .
- بڕوایان وایە کە حاکم پێنج پێغەمبەری ناردووە بۆ خەڵکی کە ( حمزة ) و ( ئیسماعیل) و ( محمد الکلمة) و ( أبو الخیر) و ( بهاء) ن .
- ژن هێنان لە جگە لەخۆیان بە حەرام ئەزانن هەروەك هاوکاری کردن و خێر پێکردنیان بە حەرام ئەزانن ، فرەژنی و هێنانەوەی ژنی تەڵاق دراویش هەر بە حەرام ئەزانن .
- کچان بێبەش ئەکەن لە میرات .
- خوشك و برای شیری بە حەرام نازانن بۆ یەکتری .
- قسەی خراپی زۆر بەرامبەر بە هاوەڵان ئەکەن بۆ نموونە ئەڵێن : ( فحشاء ) و( منکر) واتە : ( أبو بکر و عمر ) –ڕەزای خوایان لێبێت –
- لە ڕەمەزاندا بەڕۆژوو نابن و حەجی ماڵی خواش ناکەن ، بەڵکو سەردان کردنی ( خلوة البیاضة ) لە هەرێمی حاصبییەی لوبناندا بە حەج ئەزانن .
- ڕەگ و ڕیشەی بیروڕاکانی دورزیەکان ئەگەڕێتەوە بۆ مەزهەبی باتنی بە تایبەت {فیساغورس} کە ئەوان بە ڕێبەری ڕۆحی گەورەی خۆیانیان ئەزانن ، زۆربەی بیروباوەڕەکانیان هەمان بیروباوەڕی تاقمی ئیسماعیلیەکانن ، کاریگەری مولحید و دەهریەکانیان لەسەرە بە تایبەتی لەوەدا کە ئەڵێن ژیان تەواو بوونی بۆ نیە ، هەروەها کاریگەری (

بوگیه)کان و ( فەیلەسوفەکانی فارس و هیندو فیرعەونە کۆنەکان)یان زۆر بەسەرەوە دیارە [1].

ئەمە کورتەیەکی گرنگ بوو دەربارەی بیروڕاکانی دورزیەکان بۆیەش باسم کرد تا نەوەی داهاتوو بزانن کێ دوژمنیانە و چۆن هەمیشە لە هەلێك ئەگەڕێن کە قەلاچۆی ئیسلام و ئەهلی ئیسلام بکەن .

ئەم {فەخرەدینی کوڕی مەعنی دووهەم}ە خۆی لە خەلیفەی عوسمانیەکان نزیك کردەوەو بەدەم ڕایگەیاند کە گوێ لەمشتی خەلیفەیە تادەسەلاتی بەسەر شاخەکانی لوبنان و کەنارەکانی فەلەستین و هەندێ پارچەی سوریادا پەیدا کرد ، کە دەسەلاتەکەی دامەزراند و بەهێزی کرد دەستی کردە دانوستان لەگەڵ ئیتالیەکان دا ئەوانیش پشتیوانیەکی گەورەی ئابوریان لێکرد و بەو هۆیەوە توانی قولەو قەلای زۆر دروست بکات و سوپایەکی گەورەی پێکەوەنا کە خۆی ئەدا لە زیاتر لە ( چل هەزار )کەس و پاش ئەمە یاخی بوونی خۆی لە دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند لەساڵی ١٠٢٢ ی کۆچیدا ، بەلام سوپایەکی عوسمانی تێکیان شکاند و هەلات و ڕای کرد بۆ ئیتالیا ، ئەم {فەخرەدین دورزیە} کۆمەکی لە میرنشینی فلۆرنسا ی ئیتالی و پاپا و ڕاهیبەکانی دوورگەی مالْتە ( سوارەکانی قدیس یوحەننا) وەرئەگرت [2].

لە ساڵی ١٦١٨ی زاییندا فەخرەدین گەڕایەوە بۆ لوبنان ، پاش ئەوەی کە سوڵتان فەرمانێکی لێبوردنی بۆ دەرکرد ، کەچی ئەم بانگەشەی بۆ بەڕۆژئاواکردنی وولات ئەکرد و سەرلەنوێ و جارێکی تر یاخی بوونی ڕاگەیاندەوە و هەلی شەڕی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و شیعەی صەفەوی قۆستەوە ، بەلام ئەم جارەش دۆڕاندی و بەئەسیرگیرا و ڕاپێچ کرا بۆ ئەستەنبوڵ

---

[1] الموسوعة الميسرة في الاديان :١/٤٠٠-٤٠٤ .

[2] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٧١ .

و پاشان شۆڕشی ساڵی ١٠٥٤ ك ڕوویدا و ئیتر ئەم جارەیان کە بە ئەسیری گیرا لە سێدارە دراو ، شۆڕشە چەکداریەکەی دوای خۆشی کە ( ملحم ) ی برای بۆ تۆڵەسەندنەوە سەرۆکایەتی ئەکرد هەر ئاشبەتاڵی پێ کرا و نەگەیشتە ئەنجام [١].

شەشەم : مردنی {سوڵتان ئەحمەدی یەکەم} :

{سوڵتان ئەحمەد} بەرەحمەت بێت پیاوێکی تا بڵێی خواناس بوو ، بەردەوام خەریکی عیبادەت کردن بوو ، ڕاستەوخۆ کاروباری دەوڵەتی بە خودی خۆی ئەبرد بەڕێوە ، پیاوێکی خاکی بوو لە جل و بەرگداو ڕاوێژی زۆری بە زانایان و ڕۆشنفکران و سەرکردەکانی سوپا ئەکرد ، پێغەمبەری {صلى الله عليه وسلم} زۆر خۆش ئەویست ، لەسەردەمی ئەمدا بوو کە لە ئەستەنبوڵەوە پەردە بۆ کەعبەی شەریف ئەنێردرا ، پێش ئەم لە میصرەوە بۆی ئەبرا ، لە ساڵی ١٦١٧ ی زایینیدا وەفات ئەکات و لە مزگەوتی ( سوڵتان ئەحمەد) دا ئەخرێتە ناو قەبر [٢]

ئەم چەند دێڕە شیعرانەی داناوەو لەژێر عەمامەکەیدا هەڵی ئەگرتن :

ارغب دوما في حمل صورة　　انطباع اقدام النبيّ عالي المقام
من هوسيد الأنبياء فورد حديقة　　الأنبياء ملكة هذه الأقدام الشريفة
فيا أحمدي لا تتردد ولو للحظة　　ومرغ وجهك بأقدام الوردة الرفيعة الشريفة [٣]

## باسی پێنجەم

## هەندێ لە سوڵتانە بێهێزەکانی عوسمانی

یەکەم : {سوڵتان موستەفای یەکەم} :

پاش مردنی براکەی لەساڵی ١٢٠٦ك دەسەڵاتی گرتە دەست ، لەسەردەمی ئەمەوە بەئاشکرا دیارە کە دەستێکی شاراوە ڕۆڵی ئەبینی لە دانان و لابردنی

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية / ١٤٣٣ .

[2] السلاطين العثمانيون / ٥٩ .

[3] تأريخ الدولة العثمانية / ١٣٣ .

خەلیفەکانی عوسمانیدا ، ئەم سوڵتانە هەردوای سێ مانگ لەسەر کار لابرا ، و برازاکەیان هێنایە سەر تەخت کە ناوی ( عوسمانی دووهەم ) بوو ، کە ئەو کاتە تەمەنی نەئەگەیشتە سیازدە ساڵ[1] .

دووهەم : {سوڵتان عوسمانی دووهەم} ( ١٠٢٦ – ١٠٣١ ك ، ١٦١٧ – ١٦٢١ز):

پاش ئەوەی {موستەفای یەکەم} یان لەسەرکار لابرد ئەمیان خستە جێگەکەی ، ئەم زۆر منداڵ بوو هێشتا سیازدەساڵی پڕ نەکردبوویەوە ، کەچی جیهادی دژ بە {پۆڵۆنیا} ڕاگەیاند چونکە دەستی کێشابوویە ناو کاروباری میرنشینی ( بغدان ) ، لە ئەنجامدا و لەسەر داوای پۆڵۆنیا ئاشتینامەیەك لە ساڵی ( ١٠٢٩ ك ، ١٦٢٠ ز ) لە نێوان هەردوولادا مۆر کرا ، ( ئینکیشاریەکان) توانای درێژەدانی شەڕیان نەمابوو و بۆیە داوای ئاشتیان ئەکرد و خەلیفەش زۆر لێیان تووڕە بوو[2] ، چونکە ئەوەی بە تەمبەڵی و بەزین و پاڵدانەوە ئەزانی کە زۆری لێ دەکەن قەبوڵی ئاشتی بکات لەگەڵ پۆڵۆنیادا ، بۆیە بڕیاری هاتە سەر ئەوەی کە ڕۆژێك زووتر لەم تاقمە یاخیە خۆی ڕزگار بکات ، جا بۆ جێبەجێکردنی ئەم کارە ترسناکەی دەستی کردە ڕاهێنان و دروست کردنی سوپایەکی تازە لە ویلایەتەکانی ئاسیادا تا جێگەی ئەمانی پێ بگرێتەوە و کە ئینکیشاریەکان بەمەیان زانی هارو شێت بوون و دەستیان دایە هات و هاوارو لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە ئەبێ سوڵتان لەسەر کار لابەرن ، ئەوەبوو لە ٩ی ڕەجەبی ١٠٣١ ك کە ئەکاتە ٢٠ی مایۆی ١٦٢٢ ز کارەکەیان ئەنجام دا و {سوڵتان موستەفا}یان سەرلەنوێ خستەوە جێی خۆی و {سوڵتان عوسمانی دووهەم}یان کوشت .

هەندێ شیعری لە دوای خۆی بۆ جێ هێشتووین کە ئەمە نموونەیەکیانە :

---

1 الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي/ ٧٢ .

2 الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ١٠٦ .

كانت نيتي الخدمه لحكومتي ودولتي        وللعجب أن الحسود يعمل لنكبتي [1]

{سوڵتان موستەفا} بۆ جاری دووهەم دەسەڵاتی گرتەوە دەست بە هۆی ئاژاوە گێڕی ئینکیشاریەکانەوە و دەوڵەت بوویە یاری دەستیان و بە ئارەزووی خۆیان ئەم وەزیریان دائەناو ئەو وەزیریان لەسەر کار لائەبرد ، و وای لێهات وەزارەتەکان بە ئاشکرا سەوداو مامەڵەیان پێوە ئەکراو جۆرەها زوڵمیان لێ ئەوەشایەوە [2].

( وەزیرەکانی صەدر) لەسەردەمی ئەمدا و لە ماوەی ساڵێك و چوار مانگ دا حەوت جار گۆڕانکاریان بەسەردا هێنان ، ناکۆکی لە نێوان میرانی ئەنازۆڵ و تاقمی ( سباهیە ) دەستی پێکرد لەسەر ماوەی وەزیرەکانی ( صەدر) ، چونکە هی وایان هەبوو مانگی پڕ نەئەکردەوە لەسەر کارەکەی لائەبرا ، بەهۆی لاوازی و بەکارنەهاتوویی سوڵتان بۆ بەڕێوە بردنی کاروباری وڵات ئەوە بوو لەسەر کار لایان داو {میر موڕادی چوارەم} یان کردە خەلیفە کە کوڕی {سوڵتان ئەحمەدی یەکەم} بوو [3].

سێهەم : موڕادی چوارەم ( ١٠٣٢ -١٠٤٩ ك ، ١٦٢٢ – ١٦٣٠ ز ) :

دوای لادانی موستەفای مامی لە ساڵی ( ١٠٣٢ ك ، ١٦٢٢ ز ) کاروباری سوڵتانی گرتە دەست ، ئەم موڕادە برای {عوسمانی دووهەم} بوو ، لەبەر ئەوەی زۆر منداڵ بوو ، ئینکیشاریەکان بەتەواوەتی دەستیان زاڵ بوو بەسەریدا ، بارودۆخی دەوڵەتی لەوپەڕی خراپیدا بوو ، ئەم سوڵتانە سەرەتا گرنگی دا بەڕێکخستنی کاروباری ناوخۆی تا دواتر بۆ کاروباری دەرەوە خۆی یەکلا بکاتەوە ، یەکەم کارێك کە پێی هەستا ئەوە بوو هەموو ئەو سەربازە یاخیانەی لەناو برد کە

---

[1] السلاطين العثمانيون / ٦١ .

[2] تأريخ الدولة العلية العثمانية / ٢٧٩ .

[3] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ١٠٧ .

دەستیان لە کوشتنی عوسمانی برایدا هەبوو [1]. هەروەها ئەوانەشی کە لە ئەستەنبوڵ و تەواوی ناوچەکانی دەوڵەتدا دەستیان دابوویە دەمدرێژی و دەستدرێژی هەموویانی گرت و لەناوی بردن و دەستی دایە دروست کردنی تۆڕێکی هەواڵگری توندوتۆڵ و ناوی هەموو ئەوانەی کە دەستیان دابوویە تاکڕەوی لە ناو دەوڵەتدا کۆکردەوە و هەرێم بە هەرێم کە ئەگەڕا ئەو ناوانەی لەگەڵ خۆی ئەبرد و یەك یەك بانگی ئەکردن و لەناوی ئەبردن [2].

لەسەردەمی ئەمدا جگەرە خواردن و عارەق خواردنەوە قەدەغە کراو هەرکەسیش لە ئیسلام پاشگەز ببوایەتەوە ئیعدام ئەکرا [3].

شەڕکردن لەگەڵ شیعەی صەفەویدا :

لە ساڵی ( ١٠٤٤ ك ، ١٧٦٣٤ ز ) شەڕ لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و شیعەی صەفەویدا لە عیراق هەڵگیرسا ، {سوڵتان موراد} خودی خۆی سەرکردایەتی سوپای عوسمانیەکانی گرتە ئەستۆ و بەرەو بەغداد کەوتە ڕێ ، ئەوکاتە {شا عەباسی فارسی} پاش کوشتنی والی عوسمانیەکان دەستی بەسەر بەغدادا گرتبوو دەستی دابووە زەلیل کردنی ئەهلی سوننەت و کاری زۆر خراپی دەرهەقیان ئەکرد ، سوڵتان موراد ئابلۆقەی بەغدای داو بەشێکی گەورەی شورای شارەکەی بە تۆپ ڕوخاند و لە ساڵی ١٠٤٨کۆچییدا چوویە ناو شارەکەو بیست هەزار سەربازی شیعەی تێدا کوشت و ماوەیەکی باشیش لە بەغدا مایەوە و دەستی کردە ئاوەدانکردنەوەی شارەکەو هەموو شوراکانی بۆ دروست کردەوەو وەزیرێکی بۆ دانا ، ئەم سوڵتانە ڕاستەوخۆ خۆی بەشداری شەڕەکانی ئەکرد و

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي الحديث / ١٠٧ .

[2] السلاطين العثمانيون / ٦٣ .

[3] تأريخ الدولة العثمانية / ١٣٦ .

سەرپەرشتی ئەکردن ، لەگەڵ سەربازەکاندا بە تێکەڵ دائەنیشت و جاری واش هەبوو لە هەندێ لەشەڕدا بەسەر ئەسپەکەیەوە ئەخەوت [1].

مردنەکەی :

{سوڵتان موراد} لە ساڵی ١٦٤٠ی زاینیدا نەخۆش ئەکەوێت و زۆر لێی ئەترسن کە بمرێت بەڵام چاك ئەبێتەوە ، زۆرنابات جارێکی تر نەخۆش ئەکەوێتەوەو لە ٨ی شوباتی ١٦٤٠ی زاینیدا بە نەخۆشی پێ ئێشە[2] وەفات ئەکات [3]، ماوەی دەسەڵاتی ئەم سوڵتانە شازدە ساڵ و یازدە مانگ بوو ، کە ئەم خەزێنەی دەوڵەتی گرتەدەست بە خاڵیتی وەریگرت کە مرد {بەڕەحمەت بێت} خەزێنەی دەوڵەت لێی ئەڕژا [4].

ئەم سوڵتانە پیاوێکی ژیرو ئازاو خاوەن ڕا بوو ، گەندەڵی لە ڕەگ و ڕیشە دەرهێنا و خەڵکی لاساری تەمێ کرد ، {سوڵتان موراد} بە دامەزرێنەری دووهەمی دەوڵەتی عوسمانی ناو ئەبرێت ، چونکە بۆ جارێکی تر دەوڵەتی زیندوو کردەوە کە خەریك بوو ئەڕووخا ، هەروەها خەزێنەی دەوڵەتی ئاوەدان کردەوە کە خەریك بوو ئیفلاسی ئەهێنا [5].

چوارەم: {سوڵتان ئیبراهیمی کوڕی ئەحمەد} ( ١٠٤٩ – ١٠٥٨ ك ،١٦٣٩ – ١٦٤٨ ن) :

---

[1] السلاطين العثمانيون / ٦٣ .

[2] توشی نەخۆشی ( نقرس ) ئەبێت کە نەخۆشیەکە قاچ ئەخوات و ئەداتە جومگەکانی لەش ( وەرگێڕ )

[3] السلاطين العثمانيون / ٦٣ .

[4] السلاطين العثمانيون / ٦٣ .

[5] الدولة العثمانية / ١٣٦ .

پاش مردنی موڕادی برای کە هیچ کوڕێکی لە دوای خۆی جیٚ نەهێشت ئەم دەسەلاٚتی گرتە دەست ، پاش مردنی {سوڵتان موڕادی چوارەم} یش لە نەوەی ئالی عوسمان جگە لە {سوڵتان ئیبراهیم} ی برای هیچ نەوەیەکیان نەمابوو ، {سوڵتان ئیبراهیم} یش لە ماوەی دەسەلاٚتی موڕادی برایدا لە زینداندا ژیانی بەسەر ئەبرد ، کە {سوڵتان موراد} مرد گەورە بەرپرسەکانی دەوڵەت چوونە لای {ئیبراهیم} لە زیندانەکەیدا و هەواڵی مردنی براکەیان پیٚ ڕاگەیاند ، کاتێك هاتنە ژوورەوە بۆلای وای گومان برد هاتبوون بۆ کوشتنی ، بۆیە زۆر ترساو کەوتە ئەملاولاکردن و بڕوای بەقسەکەیان نەکرد و دەرگای زیندانەکەی داخست و بۆی نەکردنەوەو ئەوانیش ناچار دەرگاکەیان شکاند و چوونە ژوورەوە و پیرۆزباییان لیٚ کرد ، کەچی هەر بڕوای نەئەکرد و وای ئەزانی فێڵی لیٚ ئەکەن تا بزانن چی لە دڵیدا هەیە پێی دەربهێنن ، بۆیە پێی ووتن : لێم گەڕێن من ئەم تەنیاییەم نادەم بە هەموو موڵکی دونیا ، ئەوەبوو کاتێك ئەم گەورە بەرپرسانە نەیانتوانی قەناعەتی پیٚ بکەن ، چوون دایکیان هێنا بۆلای و مەیتی براکەیان پیشان دا بۆ ڕاستی قسەکەیان و ئەوکاتە قەبوڵی کورسی دەسەلاٚتی کرد ، و فەرمانی کرد جەنازەی براکەی ئەسپەردەی خاك بکەن لە مەراسیمێکی گەورەو پڕ شکۆدا کە سیٚ ئەسپ لە چاکترین ئەو ئەسپانەی کە بۆ شەڕی ( بغداد) سواریان ئەبوو لە پێش جەنازەکەوە ڕێیان ئەکرد ، کە لە بەخاك سپاردنی براکەی بوویەوە ، بەرەو مزگەوتی ( ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ) کەوتە ڕیٚ و لە وێدا شمشێری خیلافەتیان لە ناوقەد بەست و بوون بەخەلیفەییان ڕاگەیاند لەناو خەڵکدا [1].

کەچوویە سەر عەرشی خیلافەت ئەیووت : سوپاس بۆتۆ خوایە ، خوای پەروەردگار عەبدێکی لاوازی وەك منت بە شیاو زانیوە بۆ ئەم پلەوپایەیە ، دەی

[1] تاريخ سلاطين آل عثمان ، يوسف آصاف / ١٠٥ .

خوای گەورە چاکەم بەرامبەربکە و لەماوەی حوکمڕانی مندا خێرو خۆشی بخەرە ناو ئەم میللەتەوەو وامان لیٚ بکە لە یەکتری ڕازی بین [1].

نوسەری کتێبی ( السلاطين العثمانيون ) بەرگری زۆر لەم سوڵتانە ئەکات و ئەڵیٚ : ( ئەو درۆو بوختانانەی بەرامبەر ئەم سوڵتانە ئەکریٚ هەرهەمووی هەڵبەستراوو درۆی شاخدارن و ئەوانە بۆیان هەڵدەبەست کە لە دواییدا لەسەر کار لایان بردو کوشتیشیان [2]، بارودۆخی ناوخۆ لەسەردەمی ئەمدا تا ڕادەیەك هێمن و ئارام بوو چونکە {سولْتان موراد} ی برای چاکسازی زۆری کردبوو بە تایبەت بەرکەنارکردنی ( ئینکیشاریەکان) و تازەگەری کردنی ناو سوپا ، بۆیە ئەم توانی ڕووی خۆی بکاتە چاکسازی لە ئابووری و بودجەی سوپاو کەشتیگەل و ڕێکخستنی دراوو دانانی بناغەیەکی تازە بۆ باج وەرگرتن لەسەر چەند بنەمایەکی تازە [3].

{صەدری ئەعزەم} کە ( قەرە موستەفا پاشا ) بوو توانی دەستێوەردانی ژنان لە کاروباری خیلافەتدا ڕابگرێت ، هەروەك توانی سنوریش دابنێت بۆ هەموو ئەو پیاوانەی کۆشکی سولْتانی کە بۆ گەندەڵکردنی دەولْەت هەولْیان دەدا ، لەولاشەوە ئەم صەدری ئەعزەمە توانی لە هەرێمە جۆربەجۆرەکاندا زاڵ بێت بەسەر هەموو ئەوانەدا کە گەندەڵیان ئەکرد و گاڵتەیان بە ئاسایشی خەڵك ئەکرد و ڕێگەیان لیٚ ئەگرتن و ڕوتیان ئەکردنەوە [4].

شەڕ دژی {بوندوقدارەکان}

---

[1] السلاطين العثمانيون / ٦٤ .

[2] السلاطين العثمانيون / ٦٤ .

[3] الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي / ١٠٨ .

[4] تأريخ الدولة العثمانية ، اسماعيل سرهنط / ١٥٠ .

کۆماری بوندوقدارەکان دەسەڵاتیان بەسەر دوورگەی ( کریت) و جوڵەی بازرگانی لە ناو دەریان ئیجەدا هەبوو ، ئاشتیان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیەکاندا بەهەل ئەزانی بۆ ئەمە ، بۆیە عوسمانیەکان بڕیاری ئەوەیان دا کە دەسەڵاتی بوندوقدارەکان نەهێڵن و بۆ ئەم مەبەستەش سوپایەکیان پێکەوەناو کەشتیگەلیان ڕێك خست و شەڕیان دژ بە بوندوقدارەکان ڕاگەیاند ، و هەرچی بوندوقدار هەیە لە تەواوی وولاتدا دەستگیر کران و ماڵ و موڵکەکانیشیان دەستی بەسەردا گیرا ، و پاشان هێرشێکیشیان برد بۆ ( دوورگەی کریت ) لە ساڵی ١٠٥٥ك ، ١٦٤٥ ز و چەند پارچەیەکی دوورگەکەیان داگیرکرد [1] ، بەڵام سەربازەکان یاخی بوونێکیان دەست دایە لە ئەستەنبوڵدا و هاروشێت بوون و بڕیاری ئەوەیان دا کە {سوڵتان ئیبراهیم} لەسەر کار لابدەن و {محمدی چوارەم} کە کوڕیەتی کە هێشتا تەمەنی حەوت ساڵی پڕ نەکردبووبەوە بیکەنە خەلیفە لە جێی باوکی ، ئەوەبوو {سوڵتان ئیبراهیم} کوژراو ماوەی حوکمڕانیەکەشی هەشت ساڵ و نۆ مانگی خایاند و تەمەنی هێشتا لە سی و چوار ساڵیدا بوو [2] .

پێنجەم / {سوڵتان محمدی چوارەم} ( ١٠٥١ –١١٠٤ك ، ١٦٤٢-١٦٩٢ ز) :

ئەم سوڵتانە لەساڵی ١٠٥١ ك دا لە دایك بووە ، لە حەوت ساڵاندا لەسەر تەختی دەسەڵات دانیشتووە ، ئەورووپا لەکاتی ئەمدا وایان ئەبینی کە کاتی ئەوە هاتووە دەست لە دەوڵەتی عوسمانی بوەشێنن ، بۆیە هاوپەیمانیەکیان لە ناوخۆیاندا پێکەوەنا کە ئەم وولاتانەی لە خۆ گرتبوو : نەمسا ، پۆڵۆنیا ، بوندوقدارەکان ، ڕاهیبەکانی ماڵتە ، پاپا ، روسیا، ئەم هاوپەیمانیەشیان ناونا ( هاوپەیمانی پیرۆز ) مەبەست لەمەش ئەوەبوو لەبەردەم ئەو هێرشە ئیسلامیەدا بوەستن کە لە

---

1 الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي / ١٠٩ .

2 تأريخ الدولة العثمانية / ١٣٧ .

هەموو ماڵێكی ئەوروپی ڕۆژهەڵات نزیك بووبوویەوە لە ئەنجامی ئەو هەمووە جیهادەی كە عوسمانیە قارەمانەكان بەردەوام تێیدا ئەژیان ، هێرشی خاچ پەرستان بۆ سەر وولاتانی دەوڵەتی عوسمانی دەستی پێكرد ، خوای گەورەش بۆ ئەم ماوەیە ( بنەماڵەی كوبریللی ) نارد كە بەشداری بەرچاویان هەبوو لە بەهێزكردنی دەوڵەت و پوچەڵ كردنەوەی ئەم هێرشانەی دوژمناندا ، {محمد كوبریللی} كە صەدری ئەعزەم بوو لە ساڵی ( ١٠٧٢ك ، ١٦٦١ ز ) وەفاتی كردوە ، توانی سام و هەیبەت بۆ دەوڵەتی عوسمانی دروست بكاتەوە ، ئەحمەدی كوڕیشی لەسەر هەمان ڕێچكەی باوكی ئەڕۆیی ، ئەمیش ئاشتی لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و بوندوقدارەكان و نەمسادا ڕەت كردەوە و بەسەرۆكایەتی سوپایەكەوە پەلاماری نەمسای دا و لەساڵی ١٠٧٤ك توانی گەورەترین قەڵا لە نەمسادا ڕزگار بكات كە پێی ئەوترا قەڵای ( نوهزل) كە ئەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی ( ڤیینا) وەو دروست لە ڕۆژی ( ٢٥ ی صەفەری ١٧٠٤ك كە بەرامبەر بە ٢٨ ی سبتێمبەری ١٦٦٣ ز دەكات، هەرلەسەردەمی ئەم صەدری ئەعزەمەدا بوو كە فەرەنسا خۆی لەدەوڵەتی عوسمانی نزیك كردەوە و هەوڵی دابوو كە ( امتیان)ەكانی خۆی تازە بكاتەوە ، بەڵام {صەدری ئەعزەم} ڕەتی ئەمەی كردەوە ، فەرەنسا ویستی هەڕەشەی لێ بكات بەوەی {لویسی چوارەم} باڵوێزی فەرەنسای بەسوپایەكەوە نارد هاوڕێ لەگەڵ كەشتیگەلێكی سەربازیدا ، بەلام ئەمە زیاتر صەدری ئەعزەمی لەسەر ئەوە سوور كرد كە خۆی ڕابگرێ و ووتی:(ئەو ( امتیازات)انەی دراوە بە فەرەنسا وەك بەرات و خەلات بووەو پەیماننامە نەبووە كە پێویست بێت گەردنگیربین پێوەی )[1].

فەرەنسا ناچاری پاشەكشە بوو لە بەرامبەر ئەم ویستە پۆلاییینەدا و سیاسەتی نەرمی نواندن و سەرداخستنی بۆ دەوڵەتی عوسمانی پێڕەو كرد و دەوڵەتی

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٧٣ .

عوسمانیش پەیمانە کۆنەکانی لەگەڵدا تازە کردەوە ،کە پاراستنی ( بیت المقدس ) ی ساڵی ١٠٨٤ ك تێدا بوو [1].

بە مردنی {احمد کوبریللی} کە صەدری ئەعزەم بوو ڕژێمی عوسمانی لاوازی ڕووی تێکرد ، و نەمسا پەلاماری ( مجر) ی داو قەڵای ( نوهزل) و شاری ( بست) و ( بودا) ی لیٚ گرت ، پاشای پۆڵۆنیا پەلاماری ( بغدان ) ی داو کەشتیگەلی بوندوقدارەکانیش پەلاماری کەنارەکانی ( مورە) و ( یونان) یان داو ( اپینا) و ( کورنثة) و چەند شارێکی تریان لە ساڵی ١٠٩٧ دا گرت .

کتێبە مێژووییەکان باسی ئەوە دەکەن کە زانایان و پیاوانی دەوڵەت لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە ( سوڵتان محمدی چوارەم لەسەر تەخت لابدەن و ئەوەبوو ساڵی ١٠٩٩ لەسەر کار لایان برد و {سولەیمانی دووهەم} ی برای هاتە جێگەکەی [2].

شەشەم : {سوڵتان سولەیمان خانی دووهەم} :

لەساڵی ١٠٥٢ی کۆچیدا لە دایك بووە و پاش محمدی چوارەمی برای و لەساڵی ١٠٩٩ی کۆچیدا حوکمی گرتوەتە دەست و لەسەردەمی ئەمدا دەوڵەتی عوسمانی بەبەردەوامی بەرەو داڕمان ئەڕۆیشت و دوژمنانیش لەسەردەمی ئەمدا زیاتر هار و دڕندە بوون ، {نەمسا} زۆرێك لە شوێن و شارەکانی داگیر کرد لەوانە ( بەلگراد) لەساڵی ١٠٩٩ کۆچی ، بوندوقدارەکانیش کەنارەکانی {دالماسیا}و کەارەکانی ڕۆژهەلاتی دەریای ئەدریاتیك و هەندیٚ ناوچەش لە یونانیان داگیر کرد ، شکست دوای شکست بە سەردەوڵەتدا ئەهات ، بەڵام خوا پیاوێکی بۆ ئەم سەردەمەش نارد کە ناوی ( موستەفا کوڕی محمدی کوبریللی ) بوو کە ئەوکاتە صەدری ئەعزەم بوو ، ئەم پیاوە لەسەر هەمان بەرنامەی پێشووی باوکی ئەڕۆیشت و ڕێگەی بە مەسیحیەکان دا کە لە ئەستەنبوڵدا هەموو ئەو

---

[1] الدولة العثمانية ، د جمال عبدالهادي / ٧٤ .

[2] الدولة العثمانية ، د. جمال عبد الهادي / ٧٤ .

کلیسانەی کە ڕووخابوون چاك بكەنەوە و ئەمیش هاوكاریان بكات [1]. وبڕیاری ئەوەشی دا كە توند ترین سزای ئەو كەسانە بدات كە بەرامبەریان خراپەیەك دەكات لەسەر بەرپاكردنی شیعارێكی خۆیان ، ئەوەندە چاكەی بەرامبەریان كرد تا توانی دڵی هەموو مەسیحیەكانی دەوڵەت بكاتە خۆی ، ئەنجامی ئەم بەداد جوڵانەوەی لەگەڵ مەسیحیەكاندا وای كرد كە دانیشتوانی ( مورە) دژ بە بوندوقدارە كاسۆلیكەكان ڕابپەڕن و سوپاكەیان لە وڵاتی خۆیان دەربكەن چونكە زۆریان ئەچەوساندنەوەو زۆریان لێدەكردن كە بچنە سەر مەزهەبی كاسۆلیكی ، ئەوەبوو هاتنە ژێر ڕكێفی دەوڵەتی عوسمانی بەئیرادەی خۆیان چونكە ئەیانزانی كەدەست بۆ كاروباری ئایینی یان بەهیچ شێوەیەك نابەن [2].

ئەمە شایەتی نەوەكانی ( نصاری) یە لەسەر سەماحەتی ئیسلام كە هەموو مرۆڤایەتی ڕۆژێك لە ڕۆژان لەژێر سێبەری ئیسلامدا نەبووبێ دڵنیا نەبوون لە ( دین ) و ( ناموس ) و ( ماڵ) و ( خوێن) ی خۆیان ، چونكە قورئانی پیرۆز و سوننەتی سەرداری پێغەمبەران {صلى الله عليه وسلم} فێری ئەوەیان ئەكات ، خوای گەورە ئەفەرموێت :﴿ لاينهاكم الله عن الذين لم يقاتلوكم في الدين ولم يخرجوكم من دياركم ان تبروهم وتقسطوا إليهم إن الله يحب المقسطين ﴾ الممتحنة : ٨ . واتە : خوای گەورە ڕێگەی ئەوەتان لێ ناگرێ كە چاكە بكەن بەرانبەر بەو كەسانەی كە شەڕتان بەرامبەر ناكەن لەسەر دین و لە ماڵ و حاڵی خۆتان دەرتان ناپەڕێنن ، وەخوا ئەو كەسانەی خۆش ئەوێ كە چاكەكارن .

ویستی خوا وابوو كە ئەم صەدری ئەعزەمە بەشەهیدی و لە مەیدانی جیهاد دا بباتەوە بۆ لای خۆی لە كاتێكدا كە قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵكرد بۆ بەرگری كردن

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي/ ٧٤ .

[2] تأريخ الدولة العلية / ٣٠٦ .

لە پیرۆزیەکانی ئەم دینەو لە یەکێك لەشەڕەکاندا دژ بە دەوڵەتی نەمسای خاچپەرست لە ساڵی ١١٠٢ کۆچیدا شەهید ئەبێت [1].

مردنی {سوڵتان سەلیمی دووهەم} :

لە ٢٨ ی ڕەمەزانی ١١٠٢ کۆچی کە بەرامبەرە لەگەڵ ٢٣ی یونیو ی ١٦٩١ی زاینی و لەتەمەنی ٥٠ ساڵیدا کۆچی دوایی ئەکات ، و هیچ نەوەیەکیش لە دوای خۆی بەجێ ناهێڵێت ، ماوەی حوکمڕانی ئەم سوڵتانە سێ ساڵ و هەشت مانگ بوو ، لە گۆڕستانەکەی {سوڵتان سولەیمانی یەکەم} ی باپیری دا بەخاك ئەسپێردرێت و براکەی ئەچێتە سەر کورسی دەسەڵات [2].

حەوتەم : {سوڵتان ئەحمەدی دووهەم} ( ١١٠٢ -١١٠٦ ك ، ١٦٩٠- ١٦٩٤ ز ) :

پاش مردنی {سوڵتان سولەیمانی دووهەم} ی برای و لەساڵی ١١٠٢ ی کۆچیدا حوکمی گرتە دەست و لەسەردەمی ئەمدا صەدری ئەعزەم {موستەفا کوبریلل} ی شەهید کرا کە پیاوێکی زۆر بەکەڵك بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی و پاش ئەم ( جی علی پاشا عریجی) بوویە صەدری ئەعزەم کە پیاوێکی لاواز و بێدەسەڵات بوو ، بوندوقدارەکان هەندێ لە دوورگەکانی دەریای ( ایجە) یان داگیر کرد ، ئەم سوڵتانە زۆر حوکمی نەکرد و لەساڵی ١١٠٦ ك ، ١٦٩٤ ز دا کۆچی دوایی کرد و لەسەردەمی کورتی ئەمدا شەڕەکان زیاتر دووەر تەقە ( مناوشات) بوون نەك پەلاماردان ، دوای ئەم {موستەفای دووهەم کوڕی محمدی چوارەم} کە برازای {سوڵتان ئەحمەد} ئەکات دێتە سەر حوکم [3].

هەشتەم : {سوڵتان موستەفای دووهەم} : ( ١١٠٦ -١١١٥ ك ، ١٦٩٤-١٦٠٣ز):

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٧٥ .

[2] تأريخ الدولة العثمانية / ٣٠٦ .

[3] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ١١٥ .

لەساڵی ١٠٧٤ کۆچیدا لەدایك بووە و لەسەر تەختی خیلافەت لەساڵی ١١٠٦ ك ، ١٦٩٤ز دا دانیشتووە ، کوڕی {سوڵتان محمدی چوارەم}ە ، لەسەردەمی ئەمدا بزاڤی بڵاو بوونەوەی ئیسلام بە ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا ڕاوەستا ، لەبەر ئەوەی خەڵکی باوەڕیان کز بووبوو ، گیانی جیهادکردن لاواز بووبوو ، هۆکارەکانی داڕووخان ڕوویان کردبوویە قەوارەی ئوممەتی ئیسلامی ، و بێ ڕەحمانەش خاچپەرستەکان هێرشیان ئەکردە سەر وڵاتانی دەوڵەتی عوسمانی ، لەسەردەمی ئەمدا بوو کە پەیماننامەی ( کارلوفس ) ی خوارووی ڕۆژئاوای ( زغرب) لەسەر ڕووباری دانوب لەساڵی ١١١٠ ك ، ١٦٩٩ ز ئیمزا کرا لەگەڵ ڕوسیادا ، بەپێی مەرجەکانی ئەم پەیماننامەیەش دەوڵەتی عوسمانی پاشەکشەی کرد لە وڵاتی ( مجر) و هەرێمی {ترانسلفانیا} ، و ئەمەش ئاماژەیەکی خراپی مێژووی هەندێ لە کاربەدەستە عوسمانیەکانە ، کە پاشەکشە لە شەڕ بکەن و واز لە موسوڵمانانی ئەو شوێنانە بهێنن و بیانخەنە ژێر دەستی دوژمنێکەوە کە چیی پێی بوترێ سۆزو بەزەیی لە دڵیدا دەرهاتبوو [1].

ئەمە وای کرد هەموو ئەو دەوڵەتانەی کە ( جزیە) یان بەدەستی خۆیان ئەدا بە دەوڵەتی عوسمانی و بەوەش ڕازی بوون ، لە جزیەدان یاخی بوون و هەموو لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون کە نەیەڵن دەوڵەتی عوسمانی پێشڕەوی بکات ، و لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە پارچەپارچەی بکەن لە ترسی ئەوەی بزاڤ بڵاو بوونەوەی ئیسلام نەگاتە دونیا .

دەست هەڵگرتنی دەوڵەتی عوسمانی لەزەویەکانی خۆی سەرەتای پاشەکشەی بوو لە ئەورووپا ، هەروەها ئەمە بەخاڵی وەرچەرخان دائەنرێ لە مێژووی هەڵوەشانەوەو پوکانەوەی بەپەلەی دەوڵەتی عوسمانیدا ، و لەئەنجامی ئەوەی ئینکیشاریەکان داوای لادانی صەدری ئەعزەمیان ئەکرد و سوڵتانیش ئەمەی

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٧٦ .

قەبووڵ نەئەكرد ، بڕیاریان دا كە سوڵتان لەسەر كار لابەرن و دوای چوار مانگ و لە سی و حەوتساڵی تەمەنیدا وەفاتی كرد .

نۆیەم : {سوڵتان ئەحمەدی سێهەم} ( ١١١٥ -١١٤٣ ك ، ١٧٠٣ -١٧٣٠ ز ) :

لەسەردەمی ئەمدا ئالآی جیهاد بەردەوام ئەشەكایەوە ، و دەوڵەتیش توانی ( مورە) و ( ئازاق) بگێڕێتەوە ، و بەردەوامییش بەجیهاد بدات دژ بە ڕوسیاو گورزێكی پشت شكێنی لێ بوەشێنێ كە زۆری نەمابوو بیخات ، ئەوەبوو موجاهیدە عوسمانیەكان گەمارۆی قەیسەری ڕوسیاو ژنەكەیان دا كە ( ٢٠٠٠٠٠ ) دووسەد هەزارجەنگاوەریان لەگەڵدا بوو و زۆری نەمابوو كە بە ئەسیری دەستی موسوڵمانان بكەون ، بەڵام ناپاكی لە "بەرماڵ" و لە بەر "ژن" وای لە {صەدری ئەعزەم} كرد كە گەمارۆكەیان لەسەر هەڵبگرێ و ئەو ناپاكیە گەورەیە بەرانبەر بە دەوڵەتی عوسمانی بكات ، و پەیماننامەی ( فلكزن) ی لە جمادی دووەمدا لەساڵی ١١٢٣ ك لەگەڵ ڕوسیادا مۆر بكات ، و بەپێی ئەو پەیماننامەیە ئەبوو دەوڵەتی عوسمانی شاری ( ئازاق ) بداتە خاچپەرستە ڕوسیەكان و پەیمانی ئەوەش بدات كە دەست نەكێشێتە كاروباری ( قۆزاق) ، هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو كە سوڵتان ئەحمەدی سێهەم ، ( بلطة چی پاشای ) صەدری ئەعزەمی لەسەر كار لاداو جاڕی جیهادی دژ بە ڕوسیا لێدایەوە ، بەڵام هۆڵندا و ئینگلتەرا سەیریان كرد بەرژەوەندی ئەوان لەوەدایە كە شەڕ ڕابگیرێت بۆیە هاتنە ناو مەسەلەكە و پەیماننامەی ( ئەدەرنە) ی ساڵی ١١٢٥ ك ، ١٧١٦ز ڕوویدا [١] .

ڕوسیا لە ئەنجامدا دەستی هەڵگرت لە هەموو ئەو كەنارانەی دەریای ڕەش كە پێشتر دەستی بەسەردا گرتبوو ، هەرچەندە لەگەڵ ئەمەدا ئەو باجەی لەسەر خۆی هەڵگرت كە ئەیدا بە كاربەدەستانی ( قەرەم) [٢] ، لە قۆڵی ڕۆژئاواشەوە

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٧٦ .

[2] الدولة العثمانية ، د . اسماعيل ياغي / ١١٧ .

عوسمانیەكان سەركەوتنیان بەدەست هێنا و بوندوقدارەكانیان شكاندو دەستان گرت بەسەر ( كریت) و هەندێ دوورگەی تردا ، ئەوەبوو كە بوندوقدارەكان پەنایان برد بۆ {نەمسا} و ئەویش داوای كرد لە دەوڵەتی عوسمانی كە هەموو ئەوانەی كە لە بوندوقدارەكانیان گرتووە بۆیان بگێڕنەوە ، بەڵام دەوڵەت ئەم داوایەی ڕەت كردەوە و ئەوەبوو شەڕ لە نێوان هەردوولادا بەرپا بوو ، {نەمسا} شەڕەكەی بردەوەو ( بەلگراد) ی لەساڵی ١١٢٩ك ، ١٧١٧ ز دا گرت ، پاشان ئاشتینامە كەوتە نێوانیان لە ساڵی ١١٣٠ك ، ١٧١٨ز دا و {بەریتانیا} و {هۆڵندا} كەوتنە نێوان هەردولای شەڕكەر و ڕێكەوتننامەی (بساروێتن) بەسرا ، بەپێی ئەم ڕێكەوتننامەیە نەمساییەكان توانیان ( بەلگراد) و زۆربەی وولاتی ( صرب) و بەشێك لە (ئەفلاق) و {دالماسیا} ( ڕۆژهەلاتی ئەدریاتیك ) بدرێتە بوندوقدارەكان ، وولاتی ( مورە) ش بدرێتەوە بە عوسمانیەكان ، ئەم ئاشتینامەیەش ڕێگەی خۆش كرد بۆ پیاوانی ئایینی كاسۆلیك كە شوێن و بەهای كۆنی خۆیان وەربگرنەوە لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا ، ئەمەوای كرد كە چ ئەمان و چ نەمسا بە بیانوی پاراستنی پیاوانی ئایینیەوە دەست وەربدەنە ناو كاروباری دەوڵەتی عوسمانی، ڕێكەوتننامەیەكی تری جیاواز لەمە بە دەق باس لەوە ئەكات كە ئەبێت هەموو ئەوانەی كە ئیمزایان هەبوو لەسەر ئەم ڕێكەوتننامەیە ئازاد بن لە بازرگانی كردندا ، و بەم شێوەیە نەمسا توانی ماف پاراستنی بازرگانە بیانیەكانی لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا بۆ خۆی دەستەبەر بكات [1].

كە ڕوسیا سەیری كرد دەوڵەتی عوسمانی بێهێز بووە ، ئەویش داوای ئەوەی كرد كە ڕێگە ئاچوخ بكرێت لەبەردەم ئەو بازرگان و كەسانەدا كە بۆ زیارەتی ( بیت المقدس ) ئەچن بەناو زەویەكانی دەوڵەتی عوسمانیدا ، بێ ئەوەی داوای

---

[1] في اصول التأريخ العثماني / ١٥٦، ١٥٧ .

هیچ گومرگ و باجێکی دەوڵەتییان لێبکرێت ، عوسمانیەکانیش بەڵێنی ئەمەیان پێدان ، عوسمانیەکان وولاتی {ئەرمینیا} و وولاتی { کرج } یان داگیر کرد و {بگرسی گەورە}ش وولاتی {داغستان } و کەنارەکانی ڕۆژئاوای {دەریای خەزەر} یان داگیر کرد چونکە دەوڵەتی صفوییش بێهێزی ڕووی تێکردبوو ، هەموو ئەو دەوڵەتانەش بە ئاسانی لە ئەو شوێنە تازانەدا مانەوە بێ ئەوەی بەرەنگاری بکرێن لە لایەن کەسەوە ، تەنیا دەوڵەتی صفوی نەبێت لە عوسمانیەکان یاخی بوون و دەستیان دایە جەنگ کردن لەگەڵیدا ،هەرچەندە تێکشکان و {تەورێز} و {هەمەدان} و چەند قوللەو قەلایەکی تریشیان لەدەست داو کەوتە ژێر دەستی عوسمانیەکان ، پاشان ئاشتینامەیەك لە ساڵی ١١٤٠ ك ، ١٧٢٨ز مۆر کرا لەنێوانیاندا ، لەو ماوەیەدا ئینکیشاریەکان بە هەلیان زانی وشۆڕشێکیان بەرپاکردو خەلیفەیان لەسەر کار لاداو لە جێگەیدا براکەیان دانا [1].

{داماد ئیبراهیم} پاشاو شارستانیەتی ڕۆژئاوا :

ژمارەیەکی کەمی عوسمانیەکان بانگەشەی ڕیفۆرمیان هەڵگرتبوو ، بۆ ئەوەی بگەنە ئەو هۆکارانەی کە ئەوروپای گەیاندە ئەو هێزو پێشکەوتنەی بە تایبەتی لە بواری ڕێکخستنی سەربازی و چەکی پێشکەوتوودا ، {داماد ئیبراهیم} پاشا کە لەسەردەمی {سوڵتان ئەحمەدی سێهەمدا} پلەی {صەدری ئەزەم}ی وەرگرتبوو ، بەیەکەم کەس دائەنرێ کە دانی بەوەدا نابێت کە ناسینی ئەوروپا و کرانەوە بەڕوویدا یەکێکە لە شتە گرنگەکان ، بۆیە هەرزوو دەستی کردە بەستنی چەند پەیوەندیەك لە ڕووی بەرنامەیەکی داڕێژراوەوە بە هەموو ئەو باڵوێزە ئەوروپیانەوە کە لە ئەستەنبوڵ دائەنیشتن ، هەروەك ژمارەیەکی زۆریش باڵوێزی عوسمانی نارد بۆ پایتەختە ئەوروپیەکان ، بە تایبەتی هەردوو پایتەختی {ڤیننا} و {پاریس} لە یەکەمجاردا ، کاری ئەم باڵوێزانە هەر ئەوە نەبوو کە

---

[1] تاريخ الدولة العثمانية ، اسماعيل سرهنگ / ٢٠٧ ، ٢٠٨ .

ئیمزا لەسەر ئەو ڕێکەوتننامە بازرگانی و دیبلوماسیە تایبەتانە بکەن کە پێشتر لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا مۆر کرابوون ، بەڵکو داوای ئەوەی لێ کردن کە ڕاپۆرتی تەواو بدەنە دەوڵەتی عوسمانی دەربارەی بزاڤ دیبلوماسی ئەوروپا و هۆی هێز و گەشەی سەربازی ئەوروپا ، ئەمەش مانای ئەوەیە ، کە ئەو دیوارە ئاسنینەی عوسمانیەکان کێشابوویان کەلێنێکی تێ بووە و ناچارن هەر ئەبێ دان بەو ڕاستیەدا بنێن کە مومکین نیە عوسمانیەکان چاو لە ئاست ئەو هەمووە پێشکەوتنە ناوخۆییانەدا دابخەن کە لە ئەوروپا ڕوویداوە [١] .

ئەم کەوتنە ژێر کاریگەریەی ئەوروپا زیاتر لە بواری دروست کردنی کۆشك و تەلارو زیادەڕەوی و ماڵ بەفیڕۆداندا ڕەنگی دایەوە کە {سوڵتان ئەحمەد} خۆی یەکێك بوو لەوانە کە پشکی گەورەی هەڵگرت لەم بوارەدا ، ئەوە بوو دەوڵەمەندەکان و ئەشرافەکانی دەوڵەت هەموو سەریان کردە گواستنەوەی ئەو عورف و عادەتانەی ئەوروپیەکان بە تایبەتی لە بواری ڕازاندنەوەی ناو ماڵ و کردنی کۆشکی گەورە و دروست کردنی باخ و باخچە [٢] .

دیاردەی لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاوا لە بواری زیادەڕەوی ومال بەفیڕۆداندا بەزۆری لەناو خەڵکدا ئەبینراو شتێکی سروشتیشە کە خوای گەورەش بەدەردی میللەتە پێشوەکانیان بەرێت وەك ئەفەرموێت : ﴿ ولو أن أهل الكتاب آمنوا واتقوا لفتحنا عليهم بركات من السماء والأرض ولكن كفروا فأخذناهم بما كانوا يكسبون ﴾ الاعراف : ٩٦ . هەروەها ئەفەرموێت ﴿ وإذا اردنا أن نهلك قرية أمرنا مترفيها ففسقوا فيها فحق عليهم القول فدمرناها تدميرا ﴾ الإسراء : ١٦ .

ئەم ماوەیە بە سەرەتای دەرکەوتنی بزاڤ تازەی ئەدەبی عوسمانی دائەنرێت کە تێیدا بزوتنەوەی وەرگێڕان بۆ سەر زمانی تورکی زۆر چالاك بوو ، {سوڵتان

---

[1] في اصول التاريخ الإسلامي/ ١٥٩ .

[2] الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي / ١١٩ .

ئەحمەد}یش دوو نوێنەری نارد بۆ {فەرەنسا} تا لەنزیکەوە زانیاری تەواو دەربارەی کارگەکان و دەستکەوتەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوا وەربگرێت و لە ئەستەمبوڵیشدا ئوفیسێکی گەورە بۆ چاپ و چاپەمەنی دائەنرا [1].

دەیەم : {سوڵتان محمودی یەکەم} ( ١١٤٣ -١١٦٨ ك ، ١٧٣٠-١٧٥٨ ز ) :

پاش ئەوەی کە ئینکیشاریەکان پشێویەکی زۆریان نایەوە وولات هێمن بوویەوە {سوڵتان محمودی یەکەم} چوویە سەر کورسی حوکمڕانی ، و بڕیاری ئەوەیدا کە ڕاوێژکارێکی ئەوروپایی فەرەنسی بۆ کاروباری سەربازی دابنێت کە ناوی ( الکسندر الکونت دی بونفال) بوو ، کاری زیندوو کردنەوەی تیپی تۆپ هاوێژەکانی پێ سپارد ، و هەندێ سستمی نوێی سەربازی بە پێی بنەما فەرەنسی و نەمساویەکان هێنایە ناو کاروباری سەربازیەوە بەو ئامانجەی کە خزمەتی سەربازی سەرلەنوێ بکرێتەوە بە پیشە یەکی ڕاستەقینە و هەر لەبەر ئەمەش مووچەی باش و هاوکاری باشایان بۆ سەربازەکان بڕیار دا ، پێشنیاری ئەوەشی کرد کە ئینکیشاریەکان دابەش بکرێنە سەر تیپی بچوك بچوك و ئەفسەرێکی گەنج بکرێتە سەرپەرشتیاریان ، بەڵام ئینکیشاریەکان بەم نەخشەیە ڕازی نەبوون و کەوتنە ڕەخنە گرتن لێی و ڕایان گرت ، ئەمە وای کرد لە ( بونفال) کە گرنگی بە تیپی تۆپهاوێژەکان بدات و هەوڵی چڕ بکاتەوە لەواندا ، هەروەها گرنگی زۆری تەرخان کرد بۆ کارخانەی تۆپ و باروت و تفەنگ و مین و ئۆتۆمبێلی تۆپ هەڵگر ، قوتابخانەیەکی بۆ ئەندازەی سەربازی کردەوە ، هەرچەندە ئینکیشاریەکان لەبەردەم هەموو ئەم پرۆژانەدا وەستان و دەستیان کردە دژایەتی کردنیان ، کەچی لەسەروو ئەمانەشەوە کارگەیەکی کاغەز دروست

---

[1] الدولة العثمانية ، د . اسماعيل ياغي / ١١٩ .

کردنی کردەوە ، بەڵام هەموو ئەم چاکسازیانە زۆری نەبرد پەکیان کەوت و لەکار کەوتن [1] .

دەوڵەتی عوسمانی ڕووی شەڕەکانی کردە شیعە صەفەویەکان و سەرکەوت بەسەر ( طهماسپ) دا کە لەساڵی ١١٤٤ ك ، ١٧٣١ ز دا داوای ئاشتینامەی کرد و بەوپێیە عوسمانیەکان دەستیان هەڵگرت لە {تەوریز} و {هەمەدان} و{ لورستان } ، هەرچەندە والی خۆراسان کەناوی ( نادرشاه ) بوو ئەم ڕێکەوتننامەیەی قەبوڵ نەکردو ڕووی کردە {ئەصفەهان} و لەوێ{شا طهماسب} ی لەسەر کار لابردو لە جێگەیدا {عباسی کوڕی} دانا ، و ئەنجومەنێکی سەرپەرشتیاری بەسەریەوە دانا ، و خۆی بەرەو شەڕی عوسمانیەکان کەوتە ڕێ و سەرکەوتنی بەدەست هێناو هات و گەمارۆی {بغداد} یشی دا و دەوڵەتی عوسمانی داوای ئاشتی لێ کرد و ڕێکەوننامەی ساڵی ١١٤٩ ك ، ١٧٣٦ز لەشاری {تفليس} ڕوویدا و {نادرخان} ئەوەی ڕاگەیاند کە ئەو پاشای فارسەکانە و عوسمانیەکانیش هەرچیان گرتبوو هەموویان گەڕاندەوە بۆ شیعە ئێرانیەکان [2] .

شەڕ لەگەڵ دەوڵەتە ئەوروپیەکاندا :

{ڕوسیا} و {نەمسا} شەڕیان دژ بە ( پۆڵەندا ) ڕاگەیاند ، و لە ئەنجامدا {ڕوسیا} {پۆڵەندای} داگیر کرد ، {فەرەنسا} حەزی بەوە بوو کە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا هاوپەیمانیەك ببەستێت بۆ ئەوەی {پۆڵەندا} لەژێر دەستی {نەمسا}و {ڕوسیا} دەربهێنێ ، نەمساش هات {فەرەنسا}ی ڕازی کردو ڕێکەوتننامەی {ڤیننا}ی لەگەڵدا بەست و لە قۆڵێکی ترەوە ڕێکەوتن لەسەر شەڕکردن لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا ، و {ڕوسیا} کەوتە شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی

---

[1] في اصول التأريخ العثماني / ١٦٢، ١٦٣ .

[2] التأريخ الإسلامي ( ٨) ، محمود شاكر / ١١٠– ١١٢ .

عوسمانیدا و عوسمانیەکان توانیان ڕێگە لە پێشڕەوی {ڕوسیا} بگرن لە هەرێمی( بەغدان ) دا ، هەروەك توانیان ڕێگە لە {نەمسا}ش بگرن و پێشڕەوی نەکات بەرەو ( بۆسنەو صرب و ئەفلاق ) و سەرکەتنیان بەدەست هێنا لەشەڕی صربەکان و شەڕی نەمسادا کە زۆری نەبرد پاشەکشەی لەشەڕ کردو لە ڕێگەی {فەرەنسا}وە داوای ئاشتی کرد و ئەوە بوو ئاشتینامەی ساڵی ١١٥٢ ك ، ١٧٣٩ ز لە {بەلگراد} مۆر کرا ، {نەمسا} دەستی لە {بەلگراد} و }صرب }و {ئەفلاق} هەڵگرت و ڕوسیاش پەیمانی ئەوەی دا کە کەشتیگەل لە دەریای ڕەشدا دروست نەکات و قەڵاو قوللەکانی {بەندەری ئازوف}ش بڕوخێنێ و نەیهێڵێ [١] .

{سوڵتان عوسمانی سێهەم} ( ١١٦٨ –١١٧١ ك ، ١٧٥٨ –١٧٦١ ز ) :

ئەم سوڵتانە لە تەمەنی ٥٨ساڵیدا حوکمی گرتەدەست ، لە مزگەوتی ( ئەبو ئەیوبی ئەنصاری ) دا بەیعەتی پێدرا ، و باڵوێزەکانی ئەوروپا پیرۆزباییان لێکرد ، و تەنیا سێ ساڵ حوکمی کرد و لەو ماوەیەدا نەشەڕو نە ناکۆکی دەرەکی ڕووی نەدا و گرنگی دانی ئەم بە کاروباری ناوخۆبوو ، فەرمانێکی دەرکرد کە هەر شتێك پێچەوانەی شەرعی پیرۆزی ئیسلام بێت قەدەغەیە ، هەموو ئەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی کە هەبوو دایمرکاندنەوە بەتایبەتی ڕاپەڕینی کوردەکان [٢] .

لە ژیانی ئەم سوڵتانەدا ئەوە باس ئەکرێت کە شەوانە بە پەنهانی و نەیهێڵاوە کەس بزانێ لە دەنگوباسی میللەتی پرسیوەتەوە [٣] .

یازدەهەم : {سوڵتان موستەفای سێهەم} ( ١١٧١ –١١٨٧ك ، ١٧٥٧–١٧٧٣ز ) :

---

[1] تأريخ الدولة العثمانية ، اسماعيل سرهنگ / ٢٠٨ –٢١٢ .

[2] الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي / ١٢١ .

[3] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٧٩ .

ئەم سوڵتانە کە حوکمی گرتەدەست تەمەنی چل و دوو ساڵبوو ، ئاگاداریەکی تەواوی لە کاروباری دەوڵەتداری هەبوو ، هات ( قوجە راغب) کە وەزیر بوو کردیە صەدری ئەعزەم چونکە زۆر شارەزاو ئاگاداری کاروباری وولات بوو ، {محمد راغب پاشا} توانی شۆڕشی عەرەبەکانی شام کە هەموو جاریێ پەلاماری کاروانی حاجیانی ماڵی خوایان ئەدا بە تەواوەتی دابمرکێنێتەوە [١].

{سوڵتان موستەفا} وای ئەبینی کە گەورەترین ترسناکی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی ئەو هێزە ڕوسیە تازەیە کە دروست بووە ، ئەمە وا ئەگەیەنێت کە سوڵتان ئاگاداری هەبووە بەسەر ئەو نەخشە ڕەشەی ڕوسیادا کە کێشابووی بۆ لەت و پەت کردنی دەوڵەتی عوسمانی کە {بگرسی گەورە} لە وەسیەتەکەیدا دایبنابوو [٢]، لەبەر ئەمەبوو {سوڵتان موستەفای سێهەم} ئامادە باشیەکی گەورەی کرد بۆ شەڕی ڕوسیا و هات دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی هەموو ئەو بەرنامانەی کە دانرابوو بۆ سوپای عوسمانی تا بگاتە ئەو ئاستەی توانای شەڕکردنی لەگەڵ ڕوسیادا هەبێت ، {صەدری ئەعزەم} توانی ڕێکەوتننامە لەگەڵ {بروسیا} دا بکات بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا لەشەڕی دژ بە {نەمسا} و {ڕوسیا} دا هاوکاری دەوڵەتی عوسمانی بکات ، هەروەها توانی بواری بازرگانی دەریایی و ووشکانی فراوان بکات و هات پرۆژەیەکی دانا بۆ کردنەوەی ( کەنداو ) و بەستنەوەی ڕووباری دیجلە بە ( ئەستانە) ەوە و ڕێگەی دروست کرد بۆ بەکارهێنانی هەموو ڕووبارە سروشتیەکان ، تابەکار بهێنرێن بۆ ئاسانکردنی گواستنەوەی باج و خەراج لە ویلایەتەکانەوە بۆ سەنتەری خیلافەت و هاوکارێکی باشیش بێت بۆ بلاو بوونەوەی بازرگانی بەهەموو لایەکدا ، بەلام ئەوەبوو مەرگ ڕێگەی پێ نەدا ئەم پرۆژانە بگەیەنێتە ئەنجام و لەساڵی ١١٧٦ ك

---

1 الدولة العثمانية ، اسماعيل ياغي / ١٢٢ .

2 تأريخ الدولة العلية العثمانية / ٣٣٠ – ٣٣٢ .

١٧٦٢ ز دا کۆچی دوایی کرد و ( حامد حەمزە پاشا ) لە جێگەی ئەو بوویە {صەدری ئەعزەم} و دوای ئەویش {موستەفا باهر پاشا} لەساڵی ١١٧٧ ك ، ١٧٦٣ز و دوای ساڵێك ( محسن زادە محمد پاشا ) و لەساڵی ١١٧٨ ك ، ١٧٦٤ ز بوویە {صەدری ئەعزەم} .

دەوڵەتی عوسمانی دیسان کەوتەوە شەڕ لەگەڵ ڕوسیا دا لەسەر ئەو هەمووە دەست درێژیەی کە (قوازق )ئەیانکردە سەر ناوچە سنوریەکان ، پاشان قەرەم لە پەلاماردانەکەیدا لەساڵی ١١٨٢ ك ، ١٧٦٨ ز توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ و ژمارەیەکی زۆریش موڵك و ماڵ تێك و پێك بدات ، {صەدری ئەعزەم} یش بە خۆی و سوپاکەیەوە چوو بەگژ ڕوسیادا بۆ ئەوەی ئابلۆقەی سەر ئەو شوێنانە بشکێنێ کە ڕوسیا خستبونیە سەری ، بەڵام خۆی تێك شکاو بوویە قوربانی ئەو تێك شکانەی ، ئەو صەری ئەعزەمەش کە پاش ئەم دانرا بەهەمان شێوە شکێنراو ڕوسیا توانی کە هەردوو هەرێمی ( بەغدان ) و {ئەفلاق} داگیر بکات و دەست بدەنە هاندانی نەصرانیە ڕۆمیە ئەرسەزۆکسەکان تا شۆڕش بکەن دژ بە دەوڵەتی عوسمانی ، ئەوەبوو نەصرانیەکانی نیوە دورگەی {مۆرە} یان هانداو هەستان شۆڕشێکیان دژ بە دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند ، هەرچەندە دەوڵەت توانی ئەم شۆڕشە دابمرکێنێتەوە [1] .

هەروەها ڕوسیا پەلاماری شاری ( ترابزون) ی دا بەڵام نەیانتوانی بیگرێت، هەرچەندە لە لایەکی ترەوە توانی وولاتی ( قەرەم) داگیر بکات و دەسەڵات پەیدا بکات بەسەریدا ، ئەمەش لەساڵی ١١٨٥ك ، ١٧٧١ز دابوو ، پاشان دانوستان لەنێوانیاندا دەستی پێکرد بەڵام نەگەیشتە ئەنجام لەبەر ئەوەی ڕوسیا داوای

---

[1] الدولة العثمانية في التأريخ الإسلامي / ١٢٢ .

ناڕەوای زۆری هەبوو ، بۆیە جارێکی تر شەڕ لە نێوانیاندا هەڵگیرسایەوەو عوسمانیەکان ئەوانیان شکاند [1].

گرنگیدان بەپشتیوانی کردنی شۆڕشە ناوخۆییەکان :

پیلانی ڕوسیای خاچپەرست دژ بە وولاتانی دەوڵەتی عوسمانی بەئاشکرا و روونی بۆ هەموان دەرکەوت و هەستان بە لەت و پەت کردنی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوەوە ، کەوتنە دندەدان و هاندانی ( عەلی بەگی گەورە ) کە بە شێخی وولات ناو ئەبراو والی میصر بوو لە لایەن دەوڵەتی خیلافەتەوە دانرابوو ، تا یاخی ببێت لە دەوڵەتی عوسمانی لەساڵی ١١٨٣ك ، ١٧٧٠ز و ئەویش بە قسەی کردن و فەرمانی کرد کە لەسەر مینبەرەکان ناوی ئەم ببرێت نەك خەلیفە . لە دورگەی ( باروس) دا دوو نوێنەری {عەلی بەگی گەورە} لەگەڵ ڕووسە خاچپەرستەکاندا کۆ بوونەوە و ئەو نەخشە پڕفێڵەیان دانا کە بریتی بوو لە ڕووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی لە ناوخۆدا ، بۆ ئەمەش {عەلی بەگی گەورە}کرایە چنگوڵ ( مخلب)ی پشیلەو ( طاهر العمر) یش کە والی شاری عەککا بوو لەگەڵیدا هاوکاربێت کە والی عوسمانیەکان بوو ، بەپێی ئەم نەخشەیە عەلی بەگ هەستا بە دنەدانی ڕۆڵە موسوڵمانە میصریەکان و دانی بەگژ هێزەکانی عوسمانیدا لەشامدا و سوریای بە هێزی چەك گرت لەساڵی ١١٨٥ ك ، نەك هەر ئەوە بەڵکو چوویە ناو ( دمشق) و {صەی}داو {یافا}شی گەمارۆدا بە هاوکاری {گاهر العمر} ، کە هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانیش هەستان و گەمارۆی {صەیدا}یان دا ، خێرا ڕوسیا هات بە هانای بەکریێ گیراوەکانی خۆیەوە و چەك و تفاقی پێدان و گەمارۆکەی شکاند لەسەریان وشاری {بەیروت}یان لەساڵی ١١٨٦ك دا گرت .

ڕۆژان هات و {عەلی بەگی گەورە} بە ئەسیری کەوتە دەست عوسمانیەکان و هەر لەو ماوەی ئەسارەتەیدا وەفاتی کرد ، ناپاکەکەی تریش کە {گاهر العمر} بوو

---

[1] الدولة العثمانية ، اسماعيل ياغي / ١٢٢ .

دوای گەمارۆی {عەککا} کوژرا لە سەر دەستی {محمد بەگ} دا کە بە {ئەبو زەهەب} ناسرابوو [1].

خاچپەرستە نەصرانیەکان کە بۆیان دەرکەوت لەبەرەکانی شەڕدا دەرەقەتی دەوڵەتی عوسمانی نایەن هاتن پەنایان برد بۆ تەقاندنەوەی دەوڵەت لە ناوەوە لەڕێگەی هەندێ کەسی نەفس نزمەوە کە بەناو موسوڵمان بوون و نوێژو ڕۆژوشیان هەبوو ، بەڵام چەمکی ( ولاء) و (براء) یان لە ناو دەریای ئارەزوەکانیان و دونیاویستیەکانیاندا زایە کردبوو ، ئەگەر وانیە ئەی یانی چی خوای گەورە ئەفەرموێت ﴿ ياأيها الذين آمنوا لا تتخذوا عدوي وعدوكم أولياء تلقون إليهم بالمودة وقد كفروا بما جائكم من الحق ﴾ الممتحنه: ١ ، هەروەها ئەفەرموێت ﴿ لايتخذ المؤمنون الكافرين أولياء من دون المؤمنين ﴾ آل عمران : ٢٨ . موسوڵمانی ڕاستەقینە کە لەگەڵ خۆی و خوای خۆی و ئوممەتەکەیدا ڕاست بکات هەرگیز ناچێتە بەرەی ڕوسە ئەرسەزۆکسەکان و دژ بە موسوڵمانە سوننیە عوسمانیەکان بجەنگێت و خوێنیان حەڵاڵ بکات [2] ، دوژمنانی ئەم ئوممەتە موسوڵمانە هەمیشە پەنا بۆ ئەوە ئەبەن کە ئاگری فیتنە خۆش بکەن لە ناو وڵاتانی ئیسلامیدا ، تا ئەو هێزە مرۆیی و ئابوری و ڕەوشتیەی ئوممەتی ئیسلامی بڕوخێنن و بیکەنە سەرەتایەك بۆ ئەوەی هەر بەدەستی خۆیان بیدەن بە زەویدا [3].

{سوڵتان موستەفای سێهەم} یەکێك بوو لەو سوڵتانانەی کە سەرقاڵی جیهاد کردن بوو، لەسەردەمی خۆیدا بەرەنگاری ڕوسیای خاچپەرسی زۆر ئەکرد و لە زۆر شەڕدا تێکی ئەشکاندن ، پیاوێکی ژیرو ووردبین بوو ، هەستی بەوە کردبوو

---

[1] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٨٠ .

[2] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٨٠ .

[3] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٨٠ .

کە دەوڵەتی عوسمانی کەوتۆتە سەردەمی پاشەکشەو داڕووخانەوە ، ئەم بینشەشی لەم شیعرەیدا بە ڕوونی دەردەکەوێت :

دونیا خەراباتەو گومان مەبە کە بۆ ئێمە هەر ئەمێنێتەوە
تەواوی پلەوپایەکانی دەوڵەت کەوتونەتە دەستی خەڵکی هەرچی و پەرچی
هەموو ئەوانی ئەمڕۆ دڵیان خۆشەو بەختیارن هەموو ئەوانەن کە نەفسیان نزمە
ئێمەش پشتمان هەر بەخوا {جل جلاله} قایمە

ئەم سوڵتانە گرنگی زۆری بە مێژووی ئیسلامیی بەگشتی و مێژووی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی ئەدا .

شەڕ لەگەڵ ڕوسیادا ماوەیەکی زۆری خایاند ، لەساڵی ١٧٦٨ ی زاینیەوە دەستی پێکرد و لەساڵی ١٧٧٤ دا کۆتایی پێ هات ، و لەوماوەیەدا دەوڵەتی عوسمانی زەوی فراوان و گرنگی زۆری لەدەست دا و بێهێزی و دواکەوتن و هاتنە دواوەی ڕاستەقینەی لە ڕووی دەوڵەتداریەوە لێوە دەرکەوت و {سوڵتان موستەفای سێهەم} یش لە ناو خەفەتخواردن بۆ شەڕەکانی لەگەڵ ڕوسیادا نەخۆشی ڕووی تێکرد و لە دەوروبەری ٥٧ساڵەی تەمەنیدا وەفاتی کرد [1]، کە خەلیفە لەساڵی ١١٨٧ ی کۆچیدا وەفاتی کرد {عبدالحمیدی یەکەم}ی برای هاتە جێگەکەی [2].

دوازدەهەم : {سوڵتان عبدالحمیدی یەکەم} ( ١١٨٧ –١٢٠٣ ک ، ١٧٧٣– ١٧٨٨ز ) :

لە ساڵی ١١٨٧ك ، ١٧٧٣ز و پاش مردنی {موستەفای سێهەم}ی برای هاتە سەر حوکم ، لەماوەی حوکمڕانی موستەفای برایدا ئەم لە کۆشکەکەی خۆیدا دەستبەسەر بوو ، ڕوسیا توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێ و عوسمانیەکان

---

1 السلاطين العثمانيون / ٧٢ .

2 الدولة العثمانية ، اسماعيل ياغي / ١٢٣ .

بشكێنیٚ لەشاری ( فارنا) لە {بولغاریا}دا کە ئەیپروانی بەسەر دەریای ڕەشدا ، صەدری ئەعزەم داوای ئاشتی و دانوستانی کرد و ئاشتیەکە سەری گرت و لەشاری ( قینارجە ) لە بولغاریاداو لە ساڵی ١١٨٧ ك ، ١٧٧٤ز مۆرکرا ، گرنگترین خاڵەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە بریتی بوون لە :

١. وەلانانی دوژمنایەتی لە نێوان روسیاو دەوڵەتی عوسمانیدا و چەسپاندنی ئاشتی و پاراستنی ڕێکەوتننامەکانی نێوان و نەگۆڕینیان و چاوپۆشی کردن لە هەموو ئەو تاوانانەی کە هاووڵاتیانی هەردولا کردونیان .

٢. نەپاراستنی ئەو کەسانەی کە یاخی بوون یان ناپاکیان کردووە یان پەنایان بۆ شوێنی تر بردووەو بە پێی هەندیٚ مەرج .

٣. هەدولا دان ئەنێن بە سەربەخۆیی هەموو ووڵاتی {قەرەم} دا بەبیٚ هەڵاوێران ، و ئازادی تەواویان هەیە لە هەڵبژاردنی ( خان ) ێك بۆ خۆیان بەبیٚ ئەوەی دەخالەت بکرێت لەوەدا ، هەروەها باج نادەن ، لەبەر ئەوەش کەموسوڵمانن کاروباری مەزهەبیان لەلای سوڵتانەوە بۆ ڕێك دەخرێت بەپێی شەریعەتی ئیسلامی .

٤. کشاندنەوەی هێزەکانی عوسمانی لە {قەرەم} و تەسلیمکردنەوەی قەڵاکان بە خۆیان و دوای ئەوەش نەسەربازو نە پارێزگاری سەربازی نەنێرێت بۆیان .

٥. هەموو دەوڵەتێك ئازادە لە دروست کردنی قوللەو قەڵاو خانوو و ڕەبیە دروست کردندا یان نەوژەن کردنەوەی ئەوانەی پێویستن .

٦. دانانی باڵوێزێکی روسی پلەدوو لە {ئەستانە}دا و پۆزشی بۆ بهێنرێتەوە لە هەر کەمو کورتیەك بەرابەری بکرێت .

٧. دەوڵـەتی عوسمـانی پـەیمانی ئـەوە ئـەدات کـە مافـەکان و کلێـساکانی نەصـرانیەکان لـە زەویـەکانی خۆیانـدا ئـەپارێزێت و قـەرەبووی کـەم و کورتیەکانیش ئەکاتەوە .

٨. ڕوهبانـە ڕوسـیەکان ئـازادن لـە سـەردان کردنـی ( قـدس) و هـەموو ئـەو شوێنانەی لای ئەوان ماف سەردان کردنیان هەیە ، بەبێ ئـەوەی باج یـان ( خـەراج)یـان لـێ وەربگیرێـت و ئاسانکاریان بـۆ ئـەکرێت و ئـەپارێزرێن لـەم سەردانکردنەیاندا .

٩. هاتوچۆی کەشتیگەلی ڕوسـی لـە هـەموو بەندەرەکانی عوسمانیدا کە لـە هەردوو دەریای ناوەڕاست و ڕەش دا هەیە ، ئازادە و گرنتی بۆ وەرگیراوە ، هـەروەها ئـازادی بازرگـانی بـۆ هاولاتیـانی ڕوس پـارێزراوە لـە هـەموو ولاتانی عوسمانیدا چ لە دەریا و چ لە وشکانیدا بێت ، بازرگانە ڕوسەکان ئـازادن لـە بـردن و هـاوەردن و مانـەوە لـە دەوڵـەتی عوسمانیـدا ، و ڕوسـیا بـۆی هەیـە قونـصوڵیە لـە هەرشـوێنێکدا بکاتـەوە کـە خـۆی بـە گونجـاوی ئەزانێت .

١٠. لەسـەر دەوڵـەتی عوسمـانی پێویـستە کـە ئەوپـەڕی هـەوڵی خـۆی بـدات ببێتـە کـەفیلی ئـەو حکومەتانـەی لـە ویلایەتـە ئەفریقیەکانـدا هـەن تـا ڕێکەوتننامەی بازرگانی لەگەڵ ڕوسیادا ببەستن ئەگەر ڕوسیا حەزی لـەوە کرد .

١١. ڕوسیا ماف ئەوەی هەیە کە کلێسایەك لەسەر ڕێگای گشتی و لەگـەڕەکی ( بکل اوغلی ) لە ئەستەنبوڵ بکاتەوە جگە لەو کلێسا تایبەتـەی کە هەیـە ، و لەلایـەن بـاڵوێزی ڕوسـیاوە پارێزگـاری و سەرپەرشـتی ئـەکرێت و پاسەوانیی و پاراستنی تەواویشی بۆ دەستەبەر ئەکرێت بۆ ئـەوەی کـەس دەخالەت نەکات لە کاروباریدا .

١٢. بەپێی چەند مەرجێك ڕوسیا هەندێ ناوچە ئەگێڕێتەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی لەو مەرجانە : لێبوردنی گشتی بۆ خەڵکەکەی و دابینکردنی ئازادی بۆ نەصرانیەکان لە هەموو ڕوویەکەوە ، وەك دروست کردنی کڵێسای تازە و بەخشینی ( امتیازات) بە ڕاهیبەکان و ئازادی دان بە پیاو ماقوڵان بۆ هەرکوێ کۆچ بکەن و دەست نەهێنرێتە ڕێگەیان و لە هەموو ئەرکێکی شەڕو جزیەدان ببەخشرێن .

١٣. ڕوسیا هەموو ئەو دورگانەی لە دەریای سپی ناوەڕاستدا هەیە و ئەو حوکمیان ئەکات ، ئەگێڕێتەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی بەو مەرجەی لە خەڵکەکەی ببورێت و باجی ساڵانەیان لێ وەرنەگرێت و ئازادی ئایینیان بداتێ و هەرکەسیش حەزی لەوە بوو وولاتی خۆی جێ بهێڵێ دەست نەهێنێتە ڕێگەی .

هەروەها چەند برگەیەکی تری ئەم ڕێکەوتننامەیە پەیوەندی بە هەندێ ناوچەی ترەوە هەیە لە {قەرەم} و باس لە چۆنیەتی کشانەوەو چۆڵکردنی {ئەفلاق} و {بوجاق} و {بەغدان} دەکات و باس لە بەردانی ئەسیرەکان و دانانی باڵوێز دەکات لە پێناوی ئاشتبوونەوەدا ، دەوڵەتی عوسمانیش پەیمانی ئەوە ئەدات کە پازدە هەزار کیس ( پارە —وەرگێڕ—)لە ماوەی سێ ساڵدا بداتە ڕوسیا و هەرساڵەی پێنج هەزار کیس بدات .

کە وورد ئەبینەوە لەم مەرجانە تێبینی ئەمانەی خوارەوە دەکەین :

١. لەدەست دانی دەسەلاتی عوسمانی بەسەر دەریای ڕەشدا لە لایەك و لەلایەکی تریشەوە بارودۆخ ساز ئەبێت بۆ ئەوەی ڕوسیا دەخالەت بکات لە کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتی عوسمانیدا لە دەرگای بنەماکانی ئەو دبلۆماسیەتەوە کە لە داهاتوودا ئەیکەنەوە .

٢. فراوانبونی سنورەکانی ڕوسیا کە تا ڕووباری ( بوغی خۆرئاوا) درێژ ئەبێتەوە و هەموو ناوچەکانی ( ئازروف ) و ( سهوب کرش ) و ( نیکال)ی

دێته سەر کە ئەکەوێتە کۆتایی خۆرهەڵاتەوە لە نیوە ڕووباری ( دینیبر) و ( بوغ) و ( سهوب ) و ( کینبورن) .

٣. وولاتـی {قـەرەم} بەیـەکجاری سـەربەخۆ ئـەبێت و هـیچ پەیوەندیـەکی بـە دەوڵـەتی عوسمانیـەوە نـامێنیّ و هاوولاتیـانی دانیـشتوانی دەوڵـەتی عوسمانی نین ئەوە نەبێت یەك ئایینیان هەیە .

٤. ڕوسیا مافی ئەوەی دەست کەوتووە کە لە هەر شوێنێکدا لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا بیەویّ قونصوڵگەری دائەنێت و بەئازادیش لە ئاوەکانی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عوسمانیدا دێت و دەچێت .

٥. ئەم پەیماننامەیە لەگەڵ ڕوسیادا هەندیّ ( امتیازات) ی دایە ڕوسیا کە سەرپەرشتی ئەرسەزۆکسەکانی ناو ( افلاق ) و ( بەغدان) و دورگەکانی درەیای (ایجە ) بکەوێتە دەستی و بەوشێوە ڕوسیا سەرپەرشتی کردنی هەموو ئەرسەزۆکسەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی لە هەرکوێدا بن کەوتە دەستی [١] .

ڕوسیا خاچپەرستەکان بـەوەوە نەوەستاون و بـەردەوام خـەریکی پـیلان گێڕان بوون و ئەوەبوو لە کتوپڕدا بە حەفتا هەزار سەربازەوە چوونەناو وولاتـی ( قـەرەم ) کـە بەشـێك بـوو لـە ویلایەتـەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی ، بـیّ ئـەوەی گـویّ بـە ڕێکەوتننامەی ( کینارجە) بدەن [٢] .

{کاترینـا }ی شـاژنیان زۆر دڵخۆشـی دەربـڕی بـەم سـەرکەوتنە و بـە هـەموو ناوچەکانی قەرەمدا گەشتێکی کرد و ئاهەنگی بۆ سازدراو تیری سەرکەوتنیان بۆ دروست کـرد کـە لـە هـەموویان نوسـیبوو ( ڕێگـای بیزەنتـە ) و ئەمـەش دەوڵـەتی عوسمـانی سـەرلەنویّ ووروژانـد بۆیـە ( بـاب العـالی) یاداشـتێکی نـارد بـۆ باڵوێزی

---

[1] العثمانيون والروس / ٨٥ .

[2] الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي / ٨٢ .

ڕوسیا لە ئەستانە لە هاوینی ساڵی ١٢٠٠ ك دا و تێیدا چەند داواکاریەکی باس کردبوو ، لەوانە : داوای کردبوو کە دەست هەڵگرن لە سەرپەرشتی کردنی وولاتی (کەرەج)کە لەژێر دەسەلاتی عوسمانیدا و ( فلاح ) ی فەرمانڕەواکەی کە لە عوسمانیەکان یاخی بووە تەسلیم بە دەوڵەتی عوسمانی بکەن .

ڕوسیا ئەم یاداشتنامەیەی ڕەت کردەوە و بێ سێ و دوو ( باب العالی)یش شەڕی دژی ڕوسیا ڕاگەیاند و باڵوێزی ڕوسیاشی بەند کرد [1].

هاوپەیمانێتی نەمسا لەگەڵ ڕوسیادا :

{کاترینا} نامەیەکی بۆ ( بوتمکین )- کە سەرکردەی سەربازەکان بوو ، نووسی - کە چاوەڕوانی عوسمانیەکان نەکات و پێشڕەوی بکات بەرەو هەردوو شاری ( بندر) و ( ئاوزی) ، ئەوەبوو سەرەنجام توانی بچێتە ناو ( ئاوزی) یەوە و بەدوایدا {نەمسا} یەکسەر شەڕی دژی دەوڵەتی عوسمانی ڕاگەیاند ، {یوسفی دووهەم} کە {ئیمبراتۆری نەمسا}بوو هەوڵی داگیرکردنی ( بلگراد) ی دا ، بەلام تێکشکاو کلکی بێ ئومێدی بەدوای خۆیدا ڕائەکێشا و پاشەکشەی کرد بۆ شاری ( تمسوار) و سوپای عوسمانیش بەشوێنیدا هات و زۆر خراپ تێکی شکاندن .

مردنی {سوڵتان عبدالحمیدی یەکەم} و ئاسەواری لەسەر ڕووداوەکان :

لەم ماوەیەدا {سوڵتان عبدالحمید} کۆچی دوایی کرد و وورەی سەربازەکان هاتە خوارەوە و بێ ئومێدی ڕووی کردە دڵەکانیان ، دوژمنان ئەمەیان بەهەل زانی و هەوڵەکانیان کرد بەیەکدا بۆ زیاتر بێهێز کردنی عوسمانیەکان ، و توانیان لە ٣١ی تەمووز و لە ١١ی ئەیلولی ساڵی ١٧٨٩ ز سەرکەوتن بەدەست بهێنن و {روسیا} توانی دەست بەسەر شاری ( بندر) دا بگرێ کە شارێکی مەحکەمیش بوو ، هەروەها زۆربەی ( فلاح و بوغدان و بسارابیا) بگرێ و نەمساییەکانیش

---

[1] العثمانيون والروس / ٨٦ .

چوونە ناو ( بلگراد) و وولاتی صرب کە لە پاشانداو بەپێی ڕێکەوتننامەی ( زشتوی) درایەوە بە دەوڵەتی عوسمانی [1].

باسی شەشەم

{سوڵتان سەلیمی سێهەم} ( ١٢٠٣-١٢٢٢ك ، ١٧٨٨-١٨٠٧ ز ) :

پاش مردنی ( عبدالحمیدی یەکەم ) ی مامی لەساڵی ١٢٠٣ك ، ١٧٨٨ز دەسەلاتی گرتەدەست ، لەسەردەمی ئەمدا قۆناغێکی تازە لە قۆناغەکانی شەڕ هاتە پێشەوە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دوژمنەکانیدا ، ئەم سوڵتانە دەستی دایە زیندوو کردنەوەی گیانی مەعنەوی لەناو سەربازەکانیدا ، و پشتی بە مێژووی دەوڵەتی عوسمانی و قارەمانێتیەکانیان ئەبەست ، لەمەراسیمی چوونە سەرکورسی حوکمیدا ئەم سوڵتانە ووتارێکی پڕ حەماسەتی داو لەبەردەم بەرپرسە گەورەکانی دەوڵەتداو زۆری هەڵدا بەو سەرکەوتن و سەروەریانەی کە سوپای عوسمانی لەڕابردوودا بەدەستیان هێناوە لەبەرامبەر دوژمنەکانیاندا ، و باسی هۆی ئەو شکست و گلانانەشی کرد کە لەم دواییەدا دەوڵەتی عوسمانی بەسەریدا هاتووە لە ڕووی دوژمنەکانیدا ، ئەوەی ڕۆشن کردبوویەوە کە هۆی ئەو شکستانە ئەوەیە کە لە دینەکەیان دوور کەوتوونەتەوە و بەشوێن قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەردا درودی خوای لەسەر بێت ناڕۆن ، و هانی ئەوەشی دابوون کە پێویستە ڕێگەی قوربانیدان و جیهادکردن دژ بە دوژمنەکانیان بگرنەبەر و ، پشت بە خوا ببەستن لە هەموو ئیش و کارەکانیاندا و گوێڕایەڵی کاربە دەستەکانی خۆیان بکەن و لەو دوژمنانەی ڕاپەڕن کە دەستیان گرتووە بەسەر زەوی موسوڵمانداندا و هەزارانیان لێ کوشتون و زیندانیان کردوون ، تا ئەو کاتەی کە وولاتی {قەرەم} یان لێ ئەسەننەوە [2].

---

[1] العثمانيون والروس / ٨٦.

[2] تأريخ سياسي ، دولة علية عثمانية ، كامل باشا : ٢/ ٢٥٠ .

یەکەم / سووربونی لەسەر جیهاد کردن :

ئەم ئومێدانە لە دڵی {سوڵتان سەلیمی سێهەم}دا وایان لیٚ کرد کە ئەو هەوڵانە ڕەت بکاتەوە کە باڵوێزەکانی ( ئیسپانیا ) و ( فرنسا ) و ( ڕوسیا ) ئەیاندا بۆ ئاشتی ، و داوای لە {صەدری ئە عطە م } یش کرد کە ئەو کاتە ( یوسف پاشا ) بوو ، بەرنامەی وورد دابنیٚ بۆ بەرپەرچدانەوەی دوژمنانی دەوڵەت .

{سوڵتان سەلیم} لەوە حاڵی بوو بوو کە ئەو شکستانەی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا هاتووە چەند کاریگەری خراپی لەسەر گەل داناوە و بۆ ئەوەش هەندیٚ لەو تورەیی و بێزاری یەی خەڵك کەم بکاتەوە هات هەوڵەکانی ئاشتی دایە دواوە و خودی خۆی سەرۆکایەتی سوپایەکی گرتە دەست و بەرەو ( دانوب ) کەوتە ڕیٚ .

مووچەی سەربازەکانی گەڵیٚ زیاد کرد و خەلاّتی زیاتریشی دانا بۆیان کە بەراورد بە سوڵتانەکانی پێش ئەم زۆر زۆر تر بوو [1] .

ئەم سوڵتانە عوسمانیە وای ئەبینی بۆ بەهێزکردنی سەنتەری دەسەلاّتەکەی پێویستە ( حسین پاشای کریدلی ) هاوڕیٚ ی کۆنی خۆی بوو ، دابمەزرێنیٚ و بیکاتە سەرۆکی کەشتگەلی عوسمانی و هەموو ئەو دەسەلاّتانەی کە {حەسەن پاشا} سەرۆکی پێشوو هەیبوو دای بە سەرۆکایەتی سوپای وشکانی لە ( مولدافیا ) و کردیشیە حاکمی ڕاستەوخۆ لەسەر شاری ( اسماعیل ) و لە هەمان کاتیشدا فەرمانی پیٚ کرد کە ( اوزی ) بگێڕێتەوە و لە ڕێگەی وشکانیەوە بەرەو ( قەرەم ) بچێت [2] .

ئەم گۆڕانکاریانەی کەکردنی لە پلەکانی سوپا دا هۆکارێکی تایبەتی خۆیان بوو ، لە لایەکەوەئەم {حسن پاشا}یە بیروڕای دژی بیروڕای {صەدری ئەعطە م}یوسف پاشا بوو کاتیٚ یەکەمیان ڕای وابوو کە ڕاگەیاندنی شەڕ بەرامبەر ڕوسیا کاتەکەی گونجاو نی یە و ئەمان پێویستی زۆریان بە خۆ ئامادەکردنی تەواو هەیە پێش ئەوەی بچنە ئەو شەڕەوە ، لەلایەکی تریشەوە گلانی سوپای عوسمانی بە سەرۆکایەتی ( حسن پاشا ) کاری لە دەرونی سوڵتان زۆر کردو بە پێویستی زانی کە گۆڕانکاری لە سەرۆکایەتی سوپادا بکات ، بەلاّم هۆکارێکی لوژیکی تر هەیە کە لە ڕاستی یەوە نزیکترە ئەوەیە ئەم سەرۆکە تازەیە یەکێکە لە

---

[1] ) بڕوانە : تأریخ نوري في بیان ، احوال الدولة العلیة ، ص١١٠ .

[2] ) بڕوانە : موقف اوروبا من الدولة العثمانیه ، ص٦٨، ٦٩ .

هاوڕێ کۆنەکانی سوڵتان خۆی [1] ، کە ئەمە وای لێکرد بێت بیکاتە {صەدری ئەعطە م} بۆ ئەوەی ببێتە پشتیوانێکی بەهێز و سەنتەری دەسەڵاتی بەهێز بکات لەبەردەم دوژمنەکانیدا چ لە ناوخۆدا بێت یان لە دەرەوە بێت [2] .

{سوڵتان سەلیم} کەوتە هەڵویستێك کە پێویستی کرد لەسەری هەر ئەبێت ڕووبەڕوو ببێتەوە لەگەڵ دوژمنەکانیدا ، بۆیە {سەدری ئەعطە م} یوسف پاشای ڕاسپارد کە گرنگی زۆر بدات بە هەرێمی ( ولاشیا ) و ( بەلگراد ) بپارێزێت لە هەر هێرشێك کە لە ناوچەی ( کوبان ) ەوە بکرێتە سەریان بەو مەبەستەی کە تەتارەکانی قەوقاز دژ بە ڕوسیا بوروژێنێت و ببێتە کۆمەکێکیش بۆ دەوڵەتی عوسمانی و وڵاتی ( قەرەم ) بگەڕێتەوە ژێر ڕکێفی خۆیان .

{صەدری ئەعظەم} زۆر دڵ خۆش بوو بە ئەو متمانەیەی کە {سوڵتان سەلیمی سێ یەم} بە ئەوی هەبوو ، گومانیشی وابوو کە سەرکەوتن زۆر نزیکە و ئومێی وابوو تەوای ئەو ئامانجانەی دەوڵەت لەوی داوا ئەکات ئەیهێنێتە دی [3] .

دووەم / تێکشانی سوپاکانی عوسمانی :

هێزەکانی{ڕوسیا} و {نەمسا} شوێنەکانی خۆیان قایم کرد ، و سوپاکانی خۆیانیان کۆکردەوە و نزیك بە ( بلگراد ) و ( مولدافیا ) مۆڵیان دا ، و {صەدری ئەعطە م}یش توانای ئەوەی نەبوو لە ( بەلگراد ) دوریان بخاتەوە بۆیە سوڵتان ناچار بوو لەسەر کار لای ببات و لە جێگەیدا ( حسن پاشا ) دابنێ ، یوسف پاشا لەسەر دەستی هەردوو سەرکردەی ڕوسی ( سواروف ) و نەمسایی ( کوبرف ) دا چەند شکستی یەك لە دوای یەکی بەسەردا هات .

{سوڵتان سەلیم} زۆر لەسەر ئەوە مکوڕ بوو کە ( قەرەم ) بگێڕێتەوە و بەسەر دوژمناندا زاڵ ببێت ، بۆیە ڕای وابوو سەرلەنوێ سوپا دروست بکاتەوە و فەرمانی بۆ {صەدری ئەعطە م} دابەزاند کە بەرنامەی بەرەو پێشبردنی سوپا دابنێ و هەوڵەکانی بخاتە سەر یەك لە پێناو چاکردنی باری سوپادا و هەرچی کردووە هێزێکی سەربازی بنێرێت بۆ گۆڕەپانەکانی شەڕ ، و سوڵتانیش بۆ ئەوەی ئەم ڕاسپاردانەی پشت قایم بکات هات پەیمانامەیەکی هاوڕێیەتی لەگەڵ {سوييد}دا مۆر کرد ، بەپێ ی ئەو پەیماننامەیە ئە بوو دەوڵەتی عوسمانی بۆ ماوەی

---

[1] ) بڕوانە : تأريخ العثمانية ، اسماعيل سرهنگ ،ص٢٣٥ .

[2] ) بڕوانە : موقف اوروبا من الدولة العثمانية ، ص٦٩ .

[3] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٦٩ .

"ده " ساڵ بڕێكی دیاری كراو پارە بدات بەرانبەر ئەوەی سوید لە باكورەوە پەلاماری سوپای ڕوسیا بدات و لەسەر ئەمە ڕێكەوتن كە بە هەردووكیانەوە بدەن لە ڕوسیا بەو مەرجەی هیچ كام لەم دوو دەوڵەتە لەگەڵ دەوڵەتێكی تردا ڕێكەوتنی ئاشتی نەكات بەبێ ئاگاداری ئەوی تر [1]

سێیەم/ هەڵوێستی دەوڵەتە ئەوروپایەكان لەم ڕێكەوتنامانە :

دەوڵەتە ئەوروپایەكان یەك هەڵوێست نەبوون لەم ڕێكەوتنامانە ، {بروسیا} پێ خۆشحاڵی خۆی بۆ ئەم ڕێكەوتنامەیە دەربڕی چونكە بەردەوام {سوڵتان سەلیمیسێهەمی} هان ئەدا كە درێژە بەشەڕ بدات لە ترسی ئەوەی نەك ئەویش ببێتە نێچیرێكی تری ڕوسیا ، {فەڕەنسا} پشتیوانی لەم ڕێكەوتامەیە نەكرد بەو شێوەیەی هەبوو ، چونكە خزمەتی بەسیاسەت و ئامانجەكانی ئەو نەئەكرد ، بەلاّم {بەریتانیا} كەوتە ئەو هەڵویستەی كە شاعیر ئەڵێ :

يعطيك من طرف اللسان حلاوة و يروغ منك كما يروغ الثعلب [2]

واتە / بە زمانی قسەی شیرینت بۆ ئەكات و لەو لاشەوە وەكو ڕێوی خەریكی فێڵ كردنە .

بەریتانیا خۆشحاڵی خۆی بەو ڕێكەوتنامەیە دەربڕی و حەزی لەوە ئەكرد كە دەوڵەتی عوسمانی بە بەهێزی بمێنێتەوە ، بەلاّم پێ ی باش نەبوو لە بەرەی دەوڵەتی عوسمانی دا بێت دژ بە ڕوسیا یان نەمسا ، و پێ ی باش نەبوو هیچ جۆرە كۆمەكێك بكات .

ئەم جۆرە هەڵوێستانە لە ئەوروپاوە شتێكی سەرسوڕهێنەر نی یە ، بەڵكو شتێكی سروشتی یە ، چونكە پەیوەندی یان لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی تەنیا پەیوەندی بەرژەوەندی بوو ، ئەگەر دەوڵەتێكی ئەورووپیش هەوڵی ئەوەی دابێ كە دەوڵەتی عوسمانی بەو بەهێزی یەی بمێنێتەوە ، لەبەر خۆشەویستیان بۆ دەوڵەتی عوسمانی نەبووە، بەڵكو ئامانجیان ئەوە بووە خزمەت بە مەبەستە سیاسی یەكانی خۆیان بكات كە مەبەستیان بوو ترازووی هێزەكان لە كیشوەری ئەوروپا دا ڕابگرن و پارێزگاری لە بەرژەوەندی یە ئابوری یەكانیان بكەنە چ لە ناوەوەی دەوڵەتی عوسمانی دا بێت یان لە دەرەوەی دا .

لەگەڵ ئەوەدا كە ئەم هەڵویستانە كاریگەری هەبوو لەسەر ڕەوتی گشتی سیاسەتەكانی دەوڵەتی عوسمانی و پێشڕەوی پێ كردنی لە ناوچەكانی ئەوروپادا ، بەلاّم سوڵتانی

---

[1]) بڕوانە : موقف اوروبا من الدولة العثمانية ، ص٧١ .

[2]) بڕوانە : تأريخ الدولة العثمانية ، عبدالرحمن شرف ، ص٢١٠ ، ٢١١ .

عوسمانی هەر بێ ئومێد نەبوو ، بەڵکو هەر هیوای وابوو سوپاکەی سەردەکەوێت لەم ئیشەیدا ئەگەر ئاراستەی باش بکرێت ، ئەوە بوو فەرمانی کرد سوپای عوسمانی بخرێتە ڕێ لە ( ئەفلاق ) و ( بغدان ) ەوە تا سەرەتای سوپاکە گەیشتە ڕووباری ( رمینیك ) لە نزیك سنوری ( نمسا ) دا ، بەڵام لەوێدا ئەوەی کە بەخەیاڵی کەسدا نەهاتبوو ڕوویدا و هەردوو سوپای ڕوسیا و نەمسا ، سوپای عوسمانیان غافڵگیر کردوو لە ناکاوێکدا پەلاماریان دان و تێکیان شکاندن ، ئەم ڕووبەڕووبونەوەیە ناونرا { شەڕی یوزا } یان { رمینیك } چونکە شەڕەکە لەلای ئەو ڕووبارەدا ڕویدا [1] .

ئەم شەڕە شوێنەواری خراپی لەسەر دەوڵەتی عوسمانی جێ هێشت ، و هەلی ڕێکخستنەوەی سوپا نەماو ، تێکشکان لە دوای تێکشکان بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا ئەهات و بەرەبەرە کەوتە پاشەکشە کردن تا گەیشتە ڕۆژهەڵاتی (دانوب ) و ئەم شەڕە هەلی ڕەخساند بۆ نەمساویەکان کە ئابڵوقەی سەرشاری ( بلگراد ) لابەن و ڕێگە بکەنەوە بۆ هێزەکانی ( هاوپەیمانان ) و عوسمانیەکان لە ئەوروپا دەر بکەن [2] .

ئەم هێرشە خاچپەرستی یانە بۆ سەر هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە مانگە دوایینەکانی ساڵی ( ١٧٨٩ ) زاینیدا خراپترین باری بۆ ئەو ناوچە سنوریانە دروست کرد کە لە نێوان هەردوو لادا هەبوون ، بۆیە دوای ئەو هێرشانە ئەم قۆناغە دوو حاڵەتی جیاوازی لە خۆ گرت :

یەکەم / لەوەدا خۆی ئەبینیەوە کە چالاکی دبلۆماسی و بزاوتی ئایینی و سیاسی لە ناوەندە ئەوروپایی یەکاندا گوروتینێکی زیاتری وەرگرت و خەڵکیان لەشەڕ ئەترساند ، ئەمە وای کرد دەوڵەتە بەهێزەکان بە دوای ئاشتیدا بگەڕێن و بانگەشەی ئەوە بڵاوبکەنەوە کە با شەڕ ڕابگیرێت لە نێوان دەوڵەتی عوسمانی و نەمسا و ڕوسیای دوژمنیدا .

خۆری شۆڕشی فەڕەنساش لە ئاسۆوە دەرکەوت و ترسناکی یەکەی لە هەموو ئاستەکاندا بۆ ئەوروپا کەوتە دەر ، و هەستێکی بەهێزی دروست کرد لەلای دەوڵەتە ئەوروپی یەکان و ڕوسیاشی لەگەڵ بێت کە کاتی ئەوە هاتووە سۆز بە دەوڵەتی عوسمانی بدەن لە ترسی

---

[1] ) بڕوانە : تأريخ الدولة العثمانيه ، عبدالرحمن شرف ، ص٢١٠ ، ٢١١ .

[2] ) بڕوانە : موقف اوروبا من الدولة العثمانية، ص٧٣ .

ئەوەی نەك شۆڕشی ناپلیۆنی ئەوەندە گەورە بێت و فەڕەنسا بالآدەست بێت بەسەر هەموو کیشوەری ئەوروپادا [1] .

دووەم / ئەو ماوەیە هەندێ گۆڕانکاری و ئامادەباشی تازەی بە خۆیەوە بینی لە ڕووی سەربازی یەوە ، هۆکەشی ئەوە بوو ئەو شکستە یەك لە دوای یەکانەی کە تووشی دەوڵەتی عوسمانی هاتبوو پێشترو پاش شەڕی (( یوزا )) وای کرد خەڵکی توورە بکات و بێزاری و دەنگ هەڵبڕێ و داوای ڕاستکردنەوەی بارودۆخەکە بکەن و {صەدری ئەعظە م}یش لە سەر کار لابدەن [2] .

ڕوداوەکان یەك لە دوای یەك ئەهات و شکستیش هەر بەردەوام بوو ، دەوڵەتی عوسمانی لاواز ئەبوو ، کە شۆڕشی فەڕەنسی دەرکەوت لە خەڵکی، دەوڵەتە ئەوروپیەکان بە پێویستیان زانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی ڕێك بکەون تا بتوانن خۆیان کۆبکەنەوە و لە بەردەم بزاوتی فراونخوازی نابلۆییدا بوەستن ، و سنور بۆئەو هەمووە چاوچنۆکیەی فەڕەنسا دا بنێت کە داگیرکردنی زەوی یەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە بیر هەموویان بردبوویەوە وەك قۆناغی یەکەمین ، لە ڕاستیدا دەوڵەتە ئەوروپیەکان لەم ناوبژیوانەیاندا سەرکەوتن و پەیماننامەی بەناوبانگی ( زشتویی ) مۆر کرا لە ٢٢ / ذی الحجة / ١٢٠٥ ك دا کە بەرانبەرە لەگەڵ ٤/ اغسطس / ١٧٩١ زاینیدا ) [3] .

کە ئەمە سەری گرت بۆیان ، مایەوە سەر قۆناغی دووەم ئەویش ئەوە بوو شەڕی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ڕوسیا ڕابگرن ، بەبێ ئەو ڕاگرتنە ناوچەکانی ئەوروپا بەردەوام ڕوو لە ترسناکی ئەبوون بەهۆی ئەو موغامەرانەی کە نابلیون بەردەوام ئەیکردن ، لەولاشەوە ڕوسیا بالآ دەست بووبوو لە ناو دەوڵەتی عوسمانی داو ئەمەش هەڕەشەیەك بوو بۆ ئەوروپا [4] .

بارودۆخی دەوڵەتی عوسمانیش لە ئاستێکدا بوو بەهۆی ئەو هەموە شکستە کە ڕووی دا بوو لیێ ی و کاری کردبویە سەر هێزەکەی و وای لێکرد بوو هێرشەکانی بۆ سەر ئەوروپا ڕابگرێت ، ئەمانە وای کرد کە دەوڵەتی عوسمانی ڕەزامەندی بدات بۆ هەموو ڕێکخستنێك

---

[1] ) بڕوانە : موقف اوروبا من الدولة العثمانية، ص٧٤ .

[2] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو .

[3] ) بڕوانە : موقف اوروبا في الدولة العثمانية ، ص٨٢ .

[4] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٨٣ .

سـەر لـە ئاشـتی یـەوە دەربکـات بـە هـەر مـەرجێك بێـت ! ئـەو ڕووداوانـە یارمـەتی زۆری ناوبـژیوانانی دا کـە لـە کارەکەیانـدا سـەرکەوتن بەدەسـت بهێنن و پـاش چـەند دانوسـتانێك لەگەڵ ڕوسیاو دەوڵەتی عوسمانیدا گەیشتنە ئەوەی ڕێکەوتننامەی ئاشتیان لـە نێوانیاندا و لە شاری ( یاش ) ڕاگەیاند لە بەرواری ١٥/ جی دی الاولی / ١٢٠٦ ك بەرانبـەر بـە ٩ / ینـابر / ١٧٩٢ زایینی .

گرنگترین بڕگەکانی ئەو ڕێکەوتنامەیە :

١- گۆڕینەوەی دیلەکانی شەڕ و ڕێگەدان بەو هاوڵاتیانەی کـە لـە دەرەوەی دەوڵـەتـەکانی خۆیاندا ئەژین -بەهۆی قەیرانە سیاسیەکانەوە -بگەڕێنەوە وڵاتـە سـەرەکی یـەکانی خۆیان یان لەو شوێنانەدا بمێننەوە کە خۆیان حەزی لیّ دەکەن .

٢- دەوڵـەتی عوسمـانی بـۆ ڕوسـیا دەسـت هەڵئـەگریّ لـە بەنـدەری ( ازوف ) و وڵاتـی {قـەرەم} و نیوەدورگـەی ( طمــان ) ووڵاتـی ( قویـان ) و {بـسیاربیا} و هـەموو ئـەو هەرێمانەی کە ئەکەونە نێوان دەریـای ( بجد ) و ( دینـستر ) ، و ((ڕووبـاری کـۆتـایی = الاخیر )) ئەبێتە سنووری نێوان هەردوو دەوڵەتەکە .

٣- ڕوسیا ئەم شوێنانە ئەگێڕێتەوە بۆ دەوڵەتی عوسمانی : {بەغدان} و {ئەکرمان} و {کیلی} و {اسماعیل} ، بەرانبەر ئەمە دەوڵەت ئەبێت باج لەسەر خـەڵکی " بەغدان " هەڵبگریّ و داوای قەرەبووی شەڕ و ئەو جۆرە شتانەش نەکات لە ڕوسیا .

٤- " باب العالی " ئەبێت بەرگری لە خەڵکی بکات و نەیـەڵێت کـەس هێـرش بەرێتـە سـەر هەردوو پارێزگای ڕوسی ( تفلیس ) و ( کاتالینا ) ، وئەو کەشتیە ڕوسـی یانـەی کـە لە دەریای ناوەڕاستدا هات و چۆ دەکەن ، قەرەبوو کردنەوە ئەکەوێتە سـەر دەوڵـەتی عوسمـانی ئەگـەر هـەر جـۆرە زیانێـك دوای ئـەوە ڕووبـدات بەدەسـتی خـەڵکی نـاو دەوڵەتی عوسمانی [1] .

ئـەم ڕێکەوتنامەیـە شـەڕی نێـوان ڕوسـیا و عوسمـانی یـەکانی ڕاگـرت ، و ئامانجـەکانی دەوڵەتی ئەوروپاشی هێنایە جیّ ، کە گرنگترنیان ڕاگرتنی شەڕ بوو لـە کاتێکدا ئـەوروپا زۆر لە بڵاوبوونەوەی شۆڕشی نابلیونی ئەترسا بگاتە هەموو ڕژێمەکانی حوکمڕانی لـە ئـەوروپادا ، بـەو شـێوەیە هـەموو ئومێـدەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی تیاچـوون و بەمـەش هـەموو ئـەو

---

[1] ) بڕوانە : موقف اوروبا من الدولة العثمانية ، ص٨٣ .

شوێنانەشی لەدەست داو وای لیٚ هات {دەریای ڕەش}یش کەوتە ژێر بەزەیی ئالأی ڕوسیا و هەموو بەندەرەکانی عوسمانی وەك ( ارزوف ) و ( أوديسا ) و ( سيفا ستبول ) بونە بنکەی کەشتی گەلی ڕوسی و هەموو ئەو شوێنانەی ئاوی دەریا گەورەکان ئەچووە سەری وەك (دانوب ) و ( بج )و (دنستر ) و ( بروت ) و هاتوچۆی کەشتی تێیاندا ، کەوتنە ژێر دەستی ڕوسیا ، بەو شێوەیە ئەم ڕیکەوتنامەیە سنوورەکانی دەوڵەتی عوسمانی زۆر تەسك کردەوە لە ئەوروپادا و بەڕەسمی دەستی بە دەوڵەتی عوسمانی هەڵگرت لە زۆرێك لەو دەستکەوتانەی هەیبوو بۆ دوژمنەکانی !

بەم جۆرە دەوڵەتە ئەورووپی یەکان بەچەند هەنگاوێك توانیان قەوارەی عوسمانیەکان لە ئەوروپادا نەهێڵێن و بەمەش گەیشتنە جیٚ بەجیٚ کردنی ئەو هەمووە پڕۆژە زۆرەی [1] کە سیاسەتمەداران و هێزە ئیمپریالیزمەکان و هێزە یەهودیەکان بەردەوام بە شێوەیەکی نەخشە بۆ کێشراو کاریان بۆیەك ئامانج ئەکرد وەك بلَیٚ ئەو ئامانجەش ئەوە بوو: (( کۆپانیایەکی جیهانی هەیە دامەزرێنەرانی ئەوروپا لەوێدا ڕای جۆرا و جۆربگۆڕنەوە ، با لەهەندیٚ شتیشدا ڕێنەکەون بەلأم دژ بە " ئالی عوسمان " هەموو یەك دەنگ و هەموو یەکێکیان لەوی تر زیاتر حەزی بە خواردن و لەناوبردن و قوتدانیان دەکات ) [2] .

بەلیٚ ڕێکەوتنامەی ( یاش ) کۆتایی هێنا بەو ڕووبەڕووبونەوانەی نێوان ڕوسیا و عوسمانیەکان بۆ ماوەیەکی کورت بەلأم لە ڕاستیدا ئەوە سەرەتایەك بوو بۆ کۆتایی یەکی پڕ ئازار تر لە یەکەمجار [3] .

چوارەم / چاکسازی ناوخۆ و ئۆپۆزسیون :

پاش ئەوەی بەرەی جەنگ هێور بوویەوە ، {سوڵتان سەلیمی سیٚ یەم} خۆی تەرخان کرد بۆ چاکسازی ناوخۆیی ، سەرەتا دەستی کردە ڕێکخستنەوەی سوپا تا پاکی بکاتەوە لە ( ئینکشاری یەکان ) کە هۆی هەموو " ئاژاوە " یەك بوون ، دەستی کردە چاو کردن لە ئەوروپاش کە زۆر پێشی دەوڵەتی عوسمانی دابوویەوە ، بۆیە دەستی دایە دروستکردنی

---

[1]) بڕوانە : موقف اوروبا في الدولة العثمانية ، ص٨٣ .

[2]) بڕوانە : المسألة الشرقية الشاذلي ، ص١٢٢ .

[3]) بڕوانە : موقف اوروبامن الدولة العثمانيهة ، ص٨٦ .

کەشتیگەل و چەك و بەتایبەتی تۆپ لەسەر نەخشەی فەرەنسی یەکان ، لەسەردەمی ئەمدا سەرەتای خوێندنی سەربازی لە شێوازی ڕۆژئاوادا دەستی پێ کرد .

جا کە سوڵتان سەلیم دەستی دایە ئەم چاکسازیانە و تیپی نیزامی تازەی دامەزراند ، سەربازە ئینکشاریەکان ڕاپەڕین و پیاوانی ( ئەشراف ) یش پشتیوانیان کردن لەم وەستانەیاندا دژ بەم یاسا تازانە ، هەرچەندە سوڵتان فەرمانی کرد بە هەڵوەشاندنەوەی یاسا تازەکە کەچی ڕاپەڕیوەکان هەر دانەمرکانەوە و بڕیاری لەسەر لادانی خەلیفەیان داو دەسەڵاتیان لێ سەندەوە [1] و {مصطفی} ی چوارەم کە ئامۆزای بوو دەسەڵاتی گرتە دەست کە کاندیدکراوی موحافیزکارەکان بوو ، ئەوە بوو لە پاشاندا بوویە داشی دەستی ئەوانەی لەسەر کورسی دەسەڵات دایان نابوو ، لە دوایدا فەرمانێکی سوڵتانیان دەرکرد و تێیدا ئەو یاسا تازەیە و هەموو ئەو چاکسازی یانەو ئە وقوتابخانە و دامەزراوانەیان هەڵوەشاندەوە کە پەیوەند بوون بەو یاسایەوە ، لەگەڵ ئەمەدا چەند کێشەیەك لەسەردەمی ئەمیشدا ڕووی داو وای کرد لەسەر کار لایبەرن [2] .

پێنجەم / شەڕی فەرەنسی خاچپەرست دژ بە دەوڵەتی عوسمانی لە ( میصردا ) ( ١٢١٣ك ـ ١٧٩٨ز ) :

دوژمنانی ئیسلامی داڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیان بەهەل زانی و فەرەنسا ئەم هەلەی قۆستەوە و سوپایەکی گەورەی بەسەرۆکایەتی سەرۆکی ناودار ( ناپلیون بۆنابرت ) ئامادە کرد ، ئەم سوپایە وەك زایەڵەیەك وابوو بۆ شۆڕشی فەرەنسی و لەژێر کاریگەری بیروڕاکانی ئەو شۆڕشەدا بوو ، " نابلیون بۆنابرت "ژمارەیەکی گەورەی لە زانایانی فەرەنسا لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو کە ژمارەیان ئەگەیشتە ( ١٢٢) زانا ،ئەم ژمارەیە چەند قاتی ئەو ژمارانە بو کە نابلیون خووی پێوە گرتبوو لە هەڵمەتەکانی تریدا بۆ سەر ئەوروپالەگەڵ خۆی ئەبردن ، ئەم زانایانە لە ژێر کاریگەری ڕۆڵی فەرەنسا دا بوو کە هەوڵی ئەوەی ئەدا چاکسازی لە کڵێسای کاثولیکەکاندا بکات و دژ بە ئەو هەوڵە چاکسازیانە بوەستێتەوە کە بزاوتە چاکخوازیەکانی پرۆتستانەکان دەستیان دابوویە لە سەرەتای سەدەی شازدە هەمدا، لە

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانیه ، اسماعیل یاغی ، ص١٢٧ .

[2] ) بڕوانە : قراءة جدیدة لسیاسة محمد علی التوسعیة ، د. سلیمان الغانم ، ص١٢ .

پەشاندا ئەمانە و لە ماوەیەکی پێشوتردا کە پوویان لە پۆژ هەڵات کرد بوو ، کەوتنە ژێر کاریگەری بیروڕاکانی ( ڕۆسو ) و ( فولتێر ) و ( مونتسکیو ) کە دیارترین بیرمەندی شۆڕشی فەڕەنسی بوون و وا ناسرابوون ئەمانە سەر بە گۆرەکانی ( ماسۆنیە ) یەهودیەکانن چونکە ئەوانیش بەهەمان شێوە دروشمی ( ئازادی ، برایەتی ، یەکسانی ) یان بەرز ئەکردەوە ، ئەم دروشمانەش بیروباوەڕو ئاڕاستەیەکن لە گشتی دا دژ بە دینن و دژ بەو بیروڕایانەشن کە لە دینەوە سەرچاوە ئەگرێت ، بەم پێ یە ئەوە کەم دەرکی یە هەندێ نورسەری مێژوویی ڕەواج بۆ ئەوە دروست دەکەن گوایە ئامانجی سەرەکی ئەم پەلاماردانانە تەنیا ئەوە بوو لە بەبەرژەوەندی یەکانی بەریتانیا بدرێت لە پۆژهەڵاتدا ، ئامانجێکی لەو شێوەیە پێویستی بە کۆکردنەوەی ئەو هەمووە زانا زۆرە نی یە لەگەڵ خۆت بیهێنی [1] ، بۆیە ڕاست ئەوەیە کە بوترێ ئامانج ئەوە بوو ئیمپراتۆریەتێکی فەڕەنسی لە پۆژهەڵاتدا دروست بکرێت تا ئەو توێژە بۆرجوازە تێر ببێت لە فەڕەنسادا کە گەیشتبوونە کورسی دەسەڵات پاش شۆڕشی فەڕەنسی ، ئەمە و ڕازی کردنی کەنیسەش ئامانجێکی ترە ، هەرچەندە ئەم شۆڕشە هەندێ گورزیشی بە شێوەیەك سرەواندە کەنیسەوڕۆڵی بێ هێز کرد لەچاو جاراندا ، بەڵام کاریگەری گەورەی کەنیسە لەسەر زۆرێك لە گەلی فەڕەنسی هەر مابوو ، ئەمە جگە لەوەی کەنیسە ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە پشتیوانی کردنی دەسەڵاتی فەڕەنسی لە ( شوێنە داگیرکراوەکان )ی فەڕەنسی یەکاندا لە پۆژهەڵاتی ئیسلامیدا ، لەمەوەیە کە ئەوترێ ئامانجی ئەم پەلاماردانە تێکەڵەیەکە لە ئامانجی ئابوری و سنور زیادکردن و ئامانجی سیاسی و ئایینی ، یان ووردتر بڵێن هێرشێکی سەربازی و فیکری بوو ،بۆ ئەمەش بوو نابلیون ئەو هەمووە زانایەی لەگەڵ خۆیدا هێنا [2] .

باسی حەوتەم / ڕەگ و ڕیشەی هێرشە خاچپەرستی یەکەی فەڕەنسا :

گومان لەوەدا نی یە ئەم داگیرکەرانە زاناو ئاگادار بوون لە سروشت و حاڵی موسڵمانان لە میصردا بەهۆی زۆر ڕێگەی خۆیانەوە ، یەکێك لەوانە : ئەو گەشتە زۆرانەی کە گشتیارەکانی فەڕەنسا ( سیخوڕەکان ) لە نێوان سەدەی هەڤدە و هەژدە دا ئەیان کرد کە

---

[1] ) بڕوانە : قراءة جديدة في تأريخ الدولة العثمانية، ص١٤١ _ ١٤٢ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٤١ ،١٤٢ .

پەیوەندی پتەویان هەبوو لەگەڵ ( قبطیه کان ) و ( جولەکەکان ) و هەندێ لە پاشماوەکانی مەمالیکەکانـدا لـە میـصر ، وزۆر بـە ووردی لێکۆڵێنـەوەیان کردبـوو دەربـارەی هـەموو لایەنەکانی سیاسی و ئابوری و فیکری و سەربازی . ئەوەی وامان لێدەکات ئەم رایە پەسەند بکەین ئەوەیە بەردەوام بازاڕیان بۆ بیروڕاکانی خۆیان گەرم ئەکرد و تەنانەت دوای ئەوەش کە ئەو وڵاتەیان بەجێ هێڵا کۆنگرەکانی یەهودیە ماسۆنیەکانیان ڕواند لە میصردا کە پەیوەندی پتەویان بە {محمد علی پاشا}وە دروست کرد ، هەنگاوەکانی هێرشی فەرەنسا بە بەرنامەیەکی زۆر وورد ئەنران پێش ئەوەی بێنە میصر ، ئەوە شتێکی کوتوپڕی نەبوو، تەنانـەت دۆزینـەوەی ( بـەردە کۆنەکـەی رشـید = حجـر الرشـید الاثـوی ) و شـیکردنەوەی ڕەمزەکانی زمانی ( هیرۆغلیفی ) کە زمانی میصرە کۆنەکانە ، ئەمە ئەگەر شتێکی لە پڕیش بوبێت –کە ئەو مەسەلەیە تا ئێستاش پێویستی بە پشکنین و لێکۆڵینەوە هەیە خۆگرنگی دان بـەو ڕووداوە و بـازاڕ گـەرم کردنـی و شـیتەڵ کردنـەوەی ڕەمزەکـانی زمـانی فیرعـەونی و بەکارهێنانی گارێکی بە بەرنامـە و ووردە و ئەچێتە بازنـەی ئامانجە گشتیە دیارەکان یان نادیارەکانی هێرشی فەرەنسی یەوە ، {عبدالرحمن الجبرتی} کە مێژوو نوسێکی موسڵمانە و لە سـەردەمی ئـەو پەلاماردانـەدا ژیـاوە ، ئامـاژەیـەك بۆ ئـەو مەسـەلانە ئەكات لە باسـی ئـەو پەیمانگا زانستیەدا کە فەرەنسی یەکان لە گەڕەکی ( ناصریە ) دا دروستیان کرد ، ئەوەتا ئەڵێ : (( کاتێك هەندێ موسڵمان ئەهاتە لایان _ ئەوانەی کە مەبەستیان درز دروست کردن بوو تەنانـەت ڕێگـەی چوونە ئەو شوێنانەیشیان لـێ نە ئەگرتن کە لای خۆیان زۆر گرنگ و تایبەت بوو ، بەڵکو بە ڕوویەکی خۆش و دەم بە پێکەنینەوە بە خێریان ئەهێنا و ئەوەشیان بۆ دەرئەبڕین کە زۆر بە هاتنی دڵخۆشن ، بە تایبەتی ئەگەر ئامادە باشی یان بە ئاگایی یان حـەزیان تێـدا شـك ببردایـە دەربـارەی بابەتـەکانی زانـست و هەرێمـەکان و زینـدەوەران و پەلـەوەران و ڕووەك و مێـژووە کۆنـەکان وژیاننامـەی میللـەتان و چیرۆکی پێغەمبـەران و وێنـەکانیان و موعجزەکانیـان و ڕووداوەکـانی مێـژوو _ بەتایبـەت _ ئەوانـەیان کـە سـەری خەڵك سوڕ دەمێنێ لێ یان ... ))[1] .

یەکەم / نهێنی هێزی موسڵمانان : _

---

[1] ) بڕوانە : عجائب الاثار في التراجم و الاخبار ( ٣/ ١٢٠ ) .

فەڕەنسی یەکان _ و ڕۆژئاوایی یەکان بە گشتی _ لەوە حاڵی بوو بوون کە نهێنی هێزی موسڵمانان لە دووڕووەوەویە : یەکەمیان : ئەو پابەندبوونەیانە بە دینەوە ، دووەمیان : ئەم وڵاتە یەککرتووەیە لە ژێر سێبەری حکومەتێکی ئیسلامی سامدار دا کە هەموو گویٚ لە مشتینی ، پیاوانی ئەم هەڵمەتە فەڕەنسیە حاڵی بوونی خۆیان لەم دوو فاکتەرە دووپات کردەوەتەوە ، ئەوەتا نایلیۆن و هەندیٚ لە پیاوەکانی [1] ئەوە ڕائەگەیەنن کەئەمان ئیسلامیان قبوولٚ کردووەو بەچاوی ڕێزەوە سەیری یاساو ڕێنمای یەکانی ئەکەن و حەزئەکەن ژنی موسڵمان بهێنن بۆ ئەوەیەی ئەوە بکەنە هۆکارێك بۆ نزیکبونەوە لەموسڵمانی نەخوێندەوار بەئومێدی ئەوەی بارودۆخە کە دابمزریٚ ، ئەوەش بەئاشکرا لەیەکەمین بەیانی ناپلیۆندا بۆ گەلی میصر دەردەکەوێت ، ئەوەتا دەڵێت : (( ئەی خەڵکی میصر ! دڵنیام پێیان وتوون ، بەمەبەستی ئەوە هاتومەتە ئەم وڵاتە تا دینەکەی ئێوە بسڕمەوە ، ئەوە قسەیەکی درۆی ئاشکرایە و بڕوای پیٚ مەکەن و بەو کەسە هەڵخەڵەتاوانە بڵێن من بە دڵنیای یەوە بۆ ئەوە هاتووم تاماق ئێوە لەستەمکاران دەربهێنمەوە ، من زۆر لە مەمالیکەکان خواپەرست ترم و لەوان زیاتر ڕێزی پێغەمبەرو قورئانی گەورە ئەگرم [2] .

هەروەها پیاوانی ئەم هێرشە هەوڵی زۆریاندا بۆ ئەوەی دین لەرزۆك بکەن لە دەروونی ڕیش سپی و زانا موسڵمانەکاندا بەوەی هەندیٚ نمونەیان لە شارستانیەتی ڕۆژئاوا خستە پێش چاویان ، بەلاٚم فاکتەری دووەمیان کە هەوڵدانە بۆ لەت و پەت کردنی یەکێتی موسڵمانان ئەوە بە ئاشکرا لە هەوڵی فەڕەنسیەکاندا دەرئەکەوت یەکێك لەو هەوڵانە ئەوە بووهێزێکی چەکداریان لە مەسیحی یەکانی میصر دروست کرد بەسەرۆکایەتی ( معلم یعقوب ) بۆ لێدانی ئەو شۆڕشە جەماوەری یەی کە زانایان دروستیان کرد لەلایەك و لە لایەکی تریشەوە بۆ وەستانیان لە بەرامبەر هێزەکانی خیلافەتی عوسمانی ئیسلامی دا [3] .

دووهەم / دنەدان و هاندانی تاقمە ناوخۆی یەکان :

---

[1] ) بڕوانە :قراءة جديدة فی تاريخ الدولة العثمانية ، ص١٤٣ .

[2] ) بڕوانە : الصراع الفكري بين اجيال العصور الوسطى والعصر الحديث / للعدوي ، ص ٨٣ .

[3] ) بڕوانە : قراءة جديدة في تأريخ الدولة العثمانية ، ص ١٤٤ .

فەڕەنسیەکان لەوەدا سەرکەوتوو بوون کە توانیان هەندێ لە مەسیحییە قبطی یەکان والێبکەن بە هەموو هۆکارێك یارمەتی ئەم هێرشەیان بدەن ، هەندێ لە نوسەرە مەسیحی یەکانیش وا خەڵك حاڵی ئەکەن کە ئەو سودانەی دەستی میصر کەوت لەو سێ ساڵەدا زۆر زۆر تر بوون لەو سودانەی بە درێژای حوکمی عوسمانی دەستی میصر کەوتبوو ، هەندێکی تر لەو هەڵقە لە گوێیانە زۆر بە شان و باڵی ( معلم یعقوب ) و ئەو ڕۆڵە ناجوامێرو ناشیرینانەیدا هەڵیان ئەدا لەکاتێکدا ئەو دەستی لە ناو دەستی فەڕەنسیەکاندا بووە دژ بە عوسمانیەکان ، تەنانەت وا دەر ئەخەن کە :{ ئەو هاوکاری کردنەی شایانی ئەوەیە هەیکەلێکی لە ئاڵتون بۆ دروست بکرێت و لە گەورەترین گۆڕەپانی قاهیرەدا دابنرێ و لەسەری بنوسرێ : ئەمە یەکەمین کەسێکە ، بانگی ( سەربەخۆیی میصری ) لە سەدەی تازەدا هەڵگرتووە }[1] .

ئەم هەڵوێستەی " نصاراکان " دژ بە حەزو ئارەزووی زۆربەی خەڵکە موسڵمانەکە بوو بە هەمان ڕێژەی حەزەکانی ئەوان ، ئەتوانرێت ئەمە هەست پێ بکرێت لە بۆچوونی دوژمنکارانەی زۆربەی بیرمەندەکانی نەصاردا بەرامبەر بە زۆرینەی موسڵمانانی میصر، لەم سەردەمەشدابە ئاشکرا دیارە بەردەوام پشتیوانی ناپاکانە ئەکەن بەرانبەر وڵاتەکەیان بەو مەرجەی دژ بەبوونی ئیسلامی بێت ، تەنانەت هەر بە چەمکی {یەکێتی نیشتمان}یش کە ئەوان زۆر خۆیانی پێوە هەڵدەکێشن ، ( معلم یعقوب ) یەکێکە لە دیارترین ئەو کەسانەی ناپاکیان بەرانبەر وڵاتەکەیان کردووە ، بە هەرحاڵ ئەم ڕووداوە لە مێژووی میصریدا بە سەرەتای ( فیتنەی طائفی ) دا ئەنرێت[2] .

کە نەتەوە نائیسلامی یەکان چ ( نصاری ) و چ ( یونان ) هاوکاریەکی زۆری داگیرکەری فەڕەنسی یان کرد ، دکتۆر عبدالعزیز الشناوی قسە لەسەر ئەمە ئەکات و ئەڵێ : (( هەندێ لە میللەتە نائیسلامیەکان لە هاوکاری کردنی فەڕنسیەکاندا زیادە ڕەوی زۆریان کردو گەیشتنە ئەوەی کە هێزێکی سەربازیان لە ڕۆڵەکانی ئەم میللەتانە دروست کردو دەرەجەدار و سەربازەکانی داگیرکەری فەرەنسیش هەستان بە مەشق کردنیان و پڕچەککردنیان بە چەکی تازە بابەت ، و دوای ئەوە تێکەڵ بە سوپای داگیرکەری فەڕەنسیشیان کردن تا کەمی

---

[1] ) بڕوانە : تاريخ الفكر المصري الحديث ، د. يونس عوض ، ( ١/١٨٠- ١٨٨)
[2] ) بڕوانە قرأة جديدة في تاريخ الدولة العثمانية ، ص ١٤٤ .

سەربازەکانی خۆی پێ پڕ بکاتەوە ئەو کەمی یەی کە لە ئەنجامی ئەو هەمووە شەڕەی لە میصر و شام و سەرکوتکردنی شۆڕشە جەماوەریەکاندا توشی هاتبوو لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە {طاعون} و {نەخۆشییە ساریەکان} هەرای کردبوو بە سەربازە فەڕەنسیەکان ، گەلی میصری وا سەیری ئەم هێزە سەربازیانەی ئەکرد کە بەکرێگیراوی داگیرکەری فەڕەنسین لە میصردا ، ڕابەری ئەم هێزانەش بریتی بوو لە (( معلم يعقوب حنا )) کە چەند هێزێکی سەربازی لە {قبطی یەکان} دروست کرد ، جل و بەرگەکانیشیان هاو شێوەی جل و بەرگی سەربازە فەڕەنسی یەکان بوو ، (( کلیبر )) یش بەڕەسمی کردی بە سەرۆکی ئەم هێزانە و پلەی ( ئاغا ) ی پێ بەخشی ، و لە سەردەمی ( مینو ) شدا پلەکەی بەرز کرایەوە بۆ لیوا ( جەنڕاڵ ) و بە شێوەیەکی ڕەسمیش نازناوی ( پێشەوای گشتی ) هەموو هێزە قبطی یەکان ی لە ناو سوپای فەڕەنسیدا پێ بەخشرا [1] .

سەرباری ئەو موقاوەمەتە زۆرە و بزاوتە جەماوەری یەی کە زانایانی ئەزهەر پێشەوایەتیان ئەکرد ، هێزەکانی فەڕەنسا توانیان میصر داگیر بکەن بە هاوکاری و کۆمەکی ( معلم يعقوبی ) میصری .

ئەوندەیش ئیشی خراپ و ناشیرینی ئەنجام دا زۆر جێگەی خۆیەتی کتێبی تایبەت دەربارەی ئەو ماوەیە بنوسرێت ، تا نەوەکانی داهاتوو هەموو بزانن چەند لادێ ی ئاوەدان سوتێنرا و چەند خانووماڵی خەڵکی دزراو چەند ناموسی ئافرەتی داوێن پاك ئەتك کراو چەند خێزان ئاوارەو دەربەدەر کرا لە سەر دەستی فەڕەنسادا کە خۆی بەڕێبەری ( ئازادی ) و ( برایەتی ) و ( یەکسانی ) و ( مرۆڤدۆستی ) ئەزانی !!

پاش داگیرکردنی قاهیرە ناپلیۆن کەوتە داگیر کردنی شارەکانی تری میصر ، و " غەزە " و "ڕەملە " و" یافا " ی داگیرکردو هەوڵی گرتنی ( عەکا ) شی دا بەڵام بێداری خەڵکی ( عەکا ) بەڕابەرایەتی ( احمد پاشا الجزار ) بوونە بەربەست لە بەردەم حەز و ئارەزووەکانی ناپلیۆنی خاچ پەرستدا .کە ناپلیۆن گەیشتە ( عەکا ) بەیانێکی بڵاوکردەوە و تیایدا هەموو جولەکەی دنیای بانگ کرد بۆ ئەوەی لەسەر زەوی فەڵەستیندا دەوڵەتێك بۆ خۆیان دروست بکەن و ناوی نا ( میرات گرە شەرعیەکانی فەڵەستین ) !! ، باشە هەر ئەمە ئەوە دەرناخات کە

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية دولة اسلامية ( ٢ / ٩٣٨ ) بە دواوە .

پەیوەندیەکی پتەو هەبووە لە نێوان ئەو ناپلیۆنە -کە پەردەی ئیسلامی بە خۆیدا دابوو – و جوولەکەدا کە بەرنامەی ئەو شتەیان دانا کە دوایی پیٚ ی ئەوترا ( شۆڕشی فەڕەنسی )[1] .

سێهەم / {سوڵتان سەلیمی سێیەم} جیهاد دژ بە فەڕەنسا ڕادەگەیەنێت :-

هێرشی فەڕەنسا بۆ سەر میصر لە مێژووی تازەدا بە یەکەمین هێرشی خاچپەرستی دائەنرێت بۆ سەر یەکێك لە ولاّتە عەرەبیەکانی ژێر دەسەلاّتی عوسمانی ، بۆیە بەمە {سوڵتان سەلیمی سێیەم} جیهادی دژ بە فەڕەنسی یە خاچپەرستەکان ڕاگەیاند لە ( ١٢١٣هـ – ١٧٩٨ز ) دا ، موسڵمانانی حیجاز و شام و باکوری ئەفریقا یەکسەر هاتن بەدەم ئەم بانگەوازەوە ، لە حیجازەوە موسڵمانان بە ڕابەرایەتی ( محمد الگیلانی ) هاتن ، ( جەبرە)تی لە ڕووداوەکانی ( مانگی شەعبانی ساڵی ١٢١٣هـ -٨ ینایر تا ( ٥ ) فیرایر ی ساڵی ١٧٩٩ز ) دا ئەڵیٚ :( کە هەواڵی فەڕەنسیەکان گەیشتە حیجاز و دڵنیا بوون وولاّتی میصریان داگیر کردووە ، خەڵکی حیجاز زۆر دڵگران و توڕە بوون و لە ناو حەرەمی کەعبەدا کۆبوونەوە و ئەم شێخ گەیلانیەیش دەستی کردە ئامۆژگاری کردن و ووتار دان بۆ خەڵکی و بانگی ئەکردن بۆ جیهاد و ئەیوت پێویستە پشتیوانی لە ( دین ) و ( ڕاستی ) بکەین و کۆمەڵێکی زۆری هاندا بۆ ئەوەی ماڵ ونەفسی خۆیان ببەخشن و لە ئەنجامدا ( شەش سەد ) موجاهید خۆیان پێچایەوەو سواری کەشتی بوون و لەگەڵ ئەوانەشدا کە لە شارەکانی ( ینبع ) و ( خلافە ) هاتنە ناویانەوە ڕوەو ( میصر ) کەوتنەڕیٚ ، موسڵمانەکانی حیجاز زۆر ڕکابەری جەنراڵ (( دیزیە )) بوون کە پۆناپەرت پەلاماردانی ( صعید ) و سەرکوتکردنی هێزە جیهادی یەکانی ( مرادبگ ) ی پیٚ سپاردبوو ، لە ناو خۆیاندا بڕیاری ئەوەیان دابوو ئەبیٚ یەکێك لە دوو چاکەکە دەست بخەن ، یان {شەهیدی} یان {سەرکەتن} ، و ئەم ئایەتەیان کردە دروشمی خۆیان (انفروا خفافا و ثقالا وجاهدوا باموالکم و انفسکم في سبیل الله ذلکم خیر لکم ان کنتم تعلمون ) التوبە / ٤١. بەرەیەکی جەنگی ئیسلامی لەمان و لە موسڵمانە عەشایەرەکانی میصر بەتایبەتی عەرەبەکانی ( هەوارە ) و خەڵکی {نوبە}وهێزەکانی {مرادبگ} دروست بوو ، لە بەرامبەر بەرە جەنگی یە نەصارنیەکەی فەڕەنسا دا، کە لە

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانیة ، د . جمال عبدالهادي ، ص ٨٦ .

هێزەکانی فەڕەنسا ( بە هێزی وشکانی و بە هێزی دەریای یەوە ) و هێزە قبطی یەکان کە ( معلم یعقوب حنا ) ڕابەرایەتی ئەکردن لە ناو سوپای فەڕەنسادا )[1] .

چوارەم / {مەهدی دەرناو}ی لیبیاش دێت بەدەم بانگی جیهادەوە دژ بە فەڕەنسا :

عزەتی ئیسلامی وورەی دینیی ئەمیشی جولاند و کەوتە بانگ کردنی موسڵمانانی ڕۆژهەلاتی لیبیا بۆ جیهادکردن لە پێناوی خوادا ، موسڵمانانی ئەویش پۆل پۆل ئەهاتن بەدەمیەوە وەك تیرەکانی ( ( بنەماڵەی علی ) و ( هەنادی ) و جگە لە وانیش لە ڕێگەشدا دانیشتوانی ئەو لادێیانەش ئەهاتنە ناویان کە لە ڕێگەیاندا بوون و بە و لەشکرە زۆرەوە کەوتە ڕێ تا گەیشتە ( دە مەنهور ) لە ساڵی ( ١٢١٤ ك _ ابریلی ١٧٩٩ ) ز ، و لە وێدا سەربازگەیەکی فەڕەنسی هەبوو ، {مەهدی} تەفروتونای کردن ، و ئەم سەرکەوتنەی ( دەرناوی ) لیبیا بەسەر کافرەفەڕەنسیەکاندا زایەڵەیەکی گەورەی هەبوو لەناو خەڵکدا ، و پاڵی نا بە جەنراڵ ( مارمون )ەوە کە حاکمی سەربازی فەڕەنسی ( ئەسکەندەریە ) بوو ، سوپایەکی پشتیوانی پرچەك بە تۆپەوە بنێرێتە سەر ( مەهدی ) بەلام ئەم سوپایەش دیسان تێك شکا ، دووبارە سوپایەکی تری ناردە سەر لە ( رشید ) ەوە و شەڕی {سنهور} ڕوویدا و حەوت کاتژمێری خایاند و کۆتایی یەکەی بە سەرکەوتنی " مەهدی دەرناری " هات و فەڕەنسیەکان ناچار بوون پاشەکشە بکەن بۆ ( رحمانیە )[2]، هەیە ئەڵێت : مەهدی دەرناوی لافی ( مەهدیەت ) ی لێ داوە .

یەکێك لە مێژوو نوسان قسە لەسەر ئەمە ئەکات و ئەڵێ : (( ناپلیۆن دان بەوە دا ئەنێ کە دین بوەتە پەردەیەك لە نێوان فەڕەنسی یەکان و گەلانی موسڵماندا و گەیشتە ئەو ڕایەی شەڕکردن لەگەڵ موسڵماناندا شەڕی خوێنڕێژی بەردەوام ئەبێت بۆ فەڕەنسی یەکان ، و توانای زاڵ بوونی نی یە بەسەر ئەمەدا ، یەکێکی تر ئەڵێ : میصریەکان ناپلیۆنیان وا وەسف ئەکرد کە، گاوری کوڕی گاورە [3] .

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية دولة اسلامية ( ٣٩/٢ ) .

[2] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي ، ص٩٠ .

[3] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د . جمال عبدالهادي ، ص٩٠ .

لەگەڵ ئەو هەمووە ڕووپامایی و خۆخۆشەویست کردنەدا ، کەچی میصریەکان هەر ئەم فەڕەنسیانە ئەویست {جەبرەتی} سالآنی داگیرکاری فەڕەنسی یەکان بۆ میصر بەم شێوەیە باس ئەکات :

(( ئەوسالآنە سالآنی داستانی خوێناوی و ڕووداوی گەورە گەورەو شتی تازەو کارەساتی جەرگبڕی کەڵەکە بوونی خرپەکاری و یەکسانبونی حاڵەتەکان و لێقەومان لە دوای لێقەومان بوون، هەروەك سالآنی گۆڕانی زەمانەوپێچەوانە بوونەوەی سروشتی خەڵك و ئاوەژووکردنەوەی بابەتەکان و تێکچونی حاڵەتی خەڵك و گەندەڵبونی بەرنامەی دەوڵەت و وێرانکاری هەمەلایەنەو لەیەك ترازانی هۆکارەکان بوو (( الاالـذین صبرواو عملوالصالحات اولئك لهم مغفرة واجر كبير )) [1] ( هود /١١ ) مەگەر ئەوانە نەبێت کە دانیان بەخۆیاندا ئەگرت و خەریکی کاری چاکە بوون کە ئەوانە دیارە خواش لێیان خۆش ئەبێت و پاداشتێکی گەورەشیان دەست ئەکەوێت، مامۆستا و دکتۆر ( شناویی ) کۆمەڵێك ڕاستی کە پەیوەندە بەم هێرشەی فەڕەنساوە بۆ سەر میصر باس دەکات و ئەڵێ:

* گەلی میصر و بەڕێوە بەرایەتی زانایانی ئەزهەر پەلاماردانی فەڕەنسیەکانیان بۆ میصر وا ئەبینی کە ئەمە شەڕێکی خاچپەرستی یەو ئامانجی ئەوەیە دەست بخاتە ناو دینیانەوە و دەست بخاتە ناو خیلافەتی ئیسلامی یەوە .

* ئەوەی کە ناو ئەبرێ بە ڕاپەڕینی یەکەمی قاهیرەو ڕاپەڕینی دووەم ، لە ڕاستی دا هیچی تر نی یە ئەوە نەبێت بزاوتێکی جیهادی یەو بە ئامانجی ئەوەوە هەڵگیرساوە تا دەسەڵاتی فەڕەنسای خاچپەرست لە میصردا نەهێڵێ و میصر بگێڕێتەوە بۆ باوەشی خیلافەتی ئیسلامی عوسمانی .

* عوسمانی یەکان و مەمالیکەکانیش هەردوك هەر موسڵمانن ، و مەمالیکەکانیش کەحوکمی میصریان ئەکرد بەناوی ئەو سوڵتانە موسڵمانەی عوسمانیەوە حوکمیان ئەکرد .

* دانیشتوانی هەرێمە عەرەبیە کان کەسەیری سوڵتانی عەسمانیان ئەکرد هەرئەوە نەبوو کەبە سوڵتانێکی موسڵمانانیان ئەزانی بەڵکو وەك خەلیفەی موسڵمانا نیش سەیریان ئەکرد [2].

---

[1] ) بڕوانە :عجائب الاثار (١/٣ )

[2] بڕوانە: الدولة العثمانية دولة اسلامية مفترى عليها ، ( ٢ / ٩٤٣ ) .

پێنجەم/{ ئینگلیزو} چاو لەشوێنی بۆمیصر :

بەریتانیا زۆر بەووردیچاودێری ئەو چڵیسی ( طماع ) ەی فەڕەنسای ئەکرد بۆ میصر و شوێنەکانی تر ، لەبەر ئەوە کاتێك فەڕەنسا پەلاماری میصری داو چووەناوی ، بەریتانیایە دوایدا کەشتیگە لێکی بەڕێبەرایەتی ( ئمیراڵ نسلون )ی  ناردە کەنداو بۆ شوێنپێهە ڵگرتنی فەڕەنسیەکان ، {نیسلون}  بەشێوەیەکی کتوپڕی لە کەنداودا ڕووبەڕووی کەشتیگەلی فەڕەنسابوویەوە کە لە کەنداوی ( ئەبی قیر ) دا مۆڵیان دابوو ، پاش ئەوەی هێزە پیادەکەی لە { اسکندریە } دا قایم کرد ، ئەوەبوو هەڵگژان بەیەکدا و شەڕێکی گەورە ڕوویدا لە نێوانیاندا ، بەریتانیا کەشتیگەلەکەی فەڕەنسایان خستە ژێر ئاولە ( یەکی / اغسطس / ١٧١٨ز ) دا ، ئەم شەڕی دەریای ( ابی قیر ) ە چەند ئەنجامێکی ترسناکی لیٚ کەوتەوە کە گرنگترینیان ئەمانەن :

١-هێزە دەریایی یەکانی فەڕەنسا تێکشکانێکی گەورەی وای بەسەردا هات کە ئومێدی ئەوەی بۆ نەهێشتەوە جارێکی تر بتوانن چاکیان بکەنەوە ، بۆیە ئینگلیز دوای ئەوە بوونە دەسەڵاتداری ناو دەریا .

٢- ئینگلیز ئابڵوقەیەکی توندی خستە سەر هەموو ئەو کەنارانەی میصردا ئەیان ڕوانی بەسەر دەریای ناوەڕاستدا ، کار گەیشتە ئەوەی  فەڕەنسا نەیئەتوانی هیچ جۆرە کۆمەکێك بنێرێت بۆ هێزەکانی لەناو میصردا .

٣- فەڕەنسی یەکان لە میصردا ناچار بوون بە تەواوەتی وبەتەنیاپشت بەسەرچاوە ناوخۆیی یەکان ببەستن بۆ پڕکردنەوەی پێویستی یەکانیان ، ئەمەش زۆر کاریگەری هەبوو لەسەر ئەوەی {بۆنابارت} شوێن ئەو سیاسەتە بکەویٚ کە پیٚ ی ئەوترا (( سیاسەتی نیشتمانی ئیسلامی = السياسة الاسلامية الوطنية )) کە مەبەست پیٚ ی ئەوەبوو هۆکارەکانی ژیان بۆ فەڕەنسی یەکان دەستەبەر بکات و میصریەکانیش ڕابهێنیٚ لەسەر ئەوەی دەسەڵاتێکی بیانی بەسەر خۆیانەوە قەبووڵ بکەن ، ئەم سیاسەتەی فەڕەنسا لەسەر سیٚ دینگە وەستا بوو:

١- بەڕووکەش ڕێز لە ئایینی ئیسلام بگرن و پارێزگاری لە نەریتی وڵاتەکە و خەڵکەکە بگرن.

٢- هەوڵدان بۆ ئەوەی میصریەکان لە باوەشی خیلافەتی ئیسلامی دەربهێنیٚ .

٣- دروست کردنی حکومەتێکی نیشتمانی لە (( خەڵکی عاقڵەکان )) و پیاوە ناودارەکانی میصر .

ئەم سیاسەتە شکستی خوارد ، شکستێکی خراپ ، و نەیتوانی ئامانجەکانی ( پۆنابارت ) بێنێتە دی ، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو موقاوەمەتە ئیسلامیە توندە بوو کە بەردەوام سەربازەکانی ئەویان ئەکوشت لە هەر لایەکدا بڕۆشتنایە و لە هەر شوێنێکی ( دلتا ) و ( صعید) دا مۆڵیان بدایە ، ئەوە بوو پاشان شۆڕشێکی یەکەمی قاهیرەی بەدوادا هات ( شۆڕشی یەکەمی جیهادی ) کە موسڵمانانی قاهیرە شۆڕشەکەیان هەڵگرساند .

{پۆنابرت} لەکاتی هەڵگیرسانی شەڕەکەدا لە دەرەوەی قاهیرە بوو ، بۆیە بەپەلە گەڕایەوە قاهیرە و تۆپێکی زۆری لەسەر قولەکان ( مقطم ) دابەست تا هاوکاری تۆپەکانی قەڵای {قاهیرە} بکات و پێکەوە گەڕەکی ئەزهەر تۆپباران بکەن کە بنکەی بزاوتی جیهادەکە و مەشخەڵی هەڵگرساوی شۆڕشەکە بوو .

بە پێ ی گێڕانەوەی ( جبرتی ) و گێرانەوەی فەڕەنسیەکانیش خۆیان بێت، ڕۆژی دووەمی ڕاپەڕینەکە ( ٢٢/ اکتوبر ) و پاش ئەوەی خەڵکە ڕاپەڕیوەکە پەلاماری بنکەی سەرکردایەتی فەڕەنسا لە گەڕەکی ( ئەزبکیە ) ئەدەن ، سەربازە فەڕەنسی یەکانیش پەلاماری زانکۆی ئەزهەر ئەدەن هەۆ بەسواری ئەسپەکانیانەوە ئەچنە ناوی و کەل و پەلەکانی ناوی فەرهود ئەکەن و چی کتێب و قوڕئانی تێدایە پەرش و بلاوی دەکەنەوە و بە پێلاوەوە ئەچنە سەریان و سەربازە فەڕەنسی یەکان ئەمێننەوە تا شاندێك لە زانایانی ئەزهەر ئەچنە لای ( یونابرت ) و داوای لێ دەکەن کە زانکۆی ئەزهەر چۆڵ بکەن و ئەمەش کۆتایی هاتن بوو بەو ڕاپەڕینەی کە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ بەردەوام بوو ( لە٢١ تا ٢٣ / اکتوبر / ١٧٩٨ ز ) .

فەڕەنسی یەکان زۆر دڕندانە ئەم داخەیان بە موسڵمانانی قاهیرە و دەوروبەری ڕشت ، ئەوە بوو ماڵەکانی ( گەڕەکی ئەزهەر ) و گەڕەکەکانی چوار دەوریان فەرهود کردو هەموو ئەو زانا گەنجانەش کە خەڵکیان هاندا بوو بۆ ڕاپەڕین ، لەناو بردو دەستشیان گرت بەسەر ماڵ و سەروەتەکانیاندا و لە چواردەوری قاهیرەدا ژمارەیەکی زۆر قولە و قەڵای قایمیان دروست

کرد و له پێناو ئەم کارەشدا ژمارەیەکی زۆر خانوو کۆشکی خەڵکیان ڕووخاند و لەناویان برد)[1].

شەشەم / عوسمانی یەکان و سیاسەتە نێو دەوڵەتی یەکانیان : ـ

تێکشکانی کەشتیگەلی فەڕەنسا لە شەڕی ( ئەبی قیر ) دا بویە هاندەرێك بۆ ( بابالعالی ) تا پەلاماری سوپای فەڕەنسی بدات لە میصردا ، ئەوەبوو شەڕی دژ بە فەڕەنسای ڕاگەیاند و فەرمانی دەرکرد ئەوەی کاری باڵوێزی پێ سپێردراوە لە باڵوێزخانەی فەڕەنسادا دەستگیر بکرێت و هەموو ئەوانەش دەستگیر بکرێن کە هاوڵاتی فەڕەنسین و لە پایتەختی عوسمانیەکاندا دائەنیشن و بخرێتە زیندانەوە ، زۆری نەبرد وەزارەتی دەرەوەی عوسمانی لەگەڵ ئینگتەرا دا لە قۆڵێکەوە و لە قۆڵێکی تریشەوەلەگەڵ ڕوسیادا کەوتە دانوستان ئەوەبوو هاوپەیمانیەك بۆ بەرگری و بۆ هێرش بردن لەنێوان ڕوسیاو تورکیادا مۆرکراو لەو لاشەوە هاوپەیمانی یەکی تر لە نێوان تورکیا و ئینگلتەرا دا لە ( ٥ / ینایر / ١٧٩٩ ز ) دا مۆرکرا ، عوسمانیەکان لە ولاتی شامدا کەوتنە خۆ سازدان بۆ جیهاد دژ بە هێزەکانی فەڕەنسا لە میصردا ، ئەمە وای کرد {بۆنابرث} فریای خۆی بکەوێت و دەست پێشخەری بکات و ئەم پەلاماری دوژمنەکان بدات بەرلەوەی ئەوان پەلاماری بدەن ، ئەوە بوو لە ( فبرایر / یونیو / ١٧٩٩ ز ) دا پەلاماری ولاتی شامی دا و توانی گورزێك بوەشێنێتە ئەو هێزە عوسمانیانەی لە وێدا کۆبوو بوونەوە ، هەرچەندە نەیتوانی هێزەکانی ( احمد پاشا الجزار ) تێك بشکێنێ چونکەپێشتر نەیتوانی ( عکا ) بگرێ ، کە هێزە فەڕەنسی یەکە گەڕایەوە بۆ میصر {بونابرد} لە شەڕی وشکانی ( ئەبی قیر ) دا توانی هێزێکی عوسمانیەکان تێك بشکێنێ کە بە نیاز بوون لە (( ڕۆدس )) ەوە بۆ میصر بڕۆن ، گرنگترین دەستکەوتی {بونابرد} لەم شەڕەدا ئەوە بوو کە ( مستەفا پاشا ) ی فەرماندەی عوسمانی یەکانی بەدیل گرت و زانیاری یەکی زۆری لێ وەرگرت کە بەکورتی باس لەوە ئەکات شەڕێکی گشتی لە ئەوروپاوە هەڵگیرساوە دژ بە فەڕەنسا ، بۆیە {بونابرد} بەنهێنی میصری جێ هێشت و گەڕایەوە بۆ فەڕەنسا و ڕێبەرایەتی هێزەکانی سپارد بە ( جەنراڵ کلیبر ) [2] .

---

[1]) بڕوانە : عجائب الاثار ( ٣/١٨ ) .

[2]) بڕوانە : العالم العربي في التأريخ الحديث ، د. اسماعيل یاغی ، ص٢١١ .

بەهەرحاڵ ، دوای گەڕانەوەی {بۆنابرد} بۆ فەرەنسا ، " کلیبر " بە ورەیەکی بەرزەوە کەوتە بەڕێوەبردنی کارەکانی ، سەرتا حکومەتی ڕێکخستەوە و هات میصری کردە ( هەشت ) هەرێمی ئیداری ، هەموو ئەو دیوانانەی کە {بۆنابرد} دایمەزراندبوون لە هەرێمەکاندا هێشتنیەوە ، هەروەها کاروباری باج وەرگرتنی ڕێکخستەوە و گرنگی زۆری دا بە کۆنتڕۆڵ کردنی حساباتی بەڕێوەبەرایەتی یە جۆربەجۆرەکان لەو لاشەوە گرنگی زۆری دا بە هەموو لق و پۆپەکانی تری بەڕێوەبردن و ئەمانە و گرنگی تایبەتی ئەدا بە چالاکی ( دیزیەی سەربازی ) لە ( صعید ) دا ، بەلاّم لەبەرئەوەی لە فەرەنساوە بەردەوام داوای ئەوەیان لێ ئەکرد کە بگەڕێتەوە فەرەنسا بۆیە ( کلیبر ) دەستپێشخەری یەکی کرد بۆ ( صەدری ئە عظە م ) لە ١٧ / سبتمبر / ١٧٩٩ ز) و تێیدا ئەوەی دەر بڕیوە کە فەرەنسا نایەوێ میصر لە تورکیا بفرێنێت ، ئەو هۆکارانەشی بۆ باس ئەکات کە وای کردووە فەرەنسا پەلاماری میصر بدات کە بریتین لە ترس خستنە ناو دڵی ئینگلیز و هەڕەشە خستنەسەر موڵك و سەروەت و سامانیان لە هیندستاندا تا وایان لێ دەکەن بە زۆر ئاشتیان پێ ئەکەن لەگەڵ فەرەنسادا _ زیاد لەمانەش تۆڵەسەندنەوەیە کە لە مەمالیکەکان کە ئەزیەتێکی زۆری فەرەنسی یەکانیان داوە لە سەردەمی خۆیاندا و فەرەنساش ئامانجی ئەوەیە میصر لە ژێر دەستی " بەگەکاندا " دەربهێنێت و بیخاتە ژێر دەستی تورکیا ، پاشان " کلیبر " داوا لە {صەدری ئە عظە م} ئەکات دەرگای دانوستان بکاتەوە بۆ ئەوەی فەرەنسی یەکان میصر جێ بهێڵن [1] )) ئەوە بوو بە شێوەیەکی کرداری دانوستان لە شاری " عەریش " ەوە دەستی پێ کردو پەیماننامەی " عەریش " ی لێ کەوتەوە لە ٢٤ / ینیر / ١٨٠٠ ز ) کە بەدەق ئەمانەی تێدایە :

١- ئەبێت فەرەنسی یەکان میصر چۆڵ بکەن و چی چەك و تەقەمەنی یان هەیە لەگەڵ خۆیاندا بیبەن و بگەڕێنەوە بۆ فەرەنسا .

٢- بۆ ماوەی سێ ڕۆژ ( ئاگربەست ) ڕائەگەیەنرێت وئەکرێ ئەو ماوەیەش درێژ بکرێتەوە ئەگەر پێویستی کرد ، و ئەبێ لەو ماوەیەدا هێزەکان بگوازرێتەوە .

٣- " باب العالی " یان هاوپەیمانەکانی _ ئینگلیز و ڕوسیا- ئەبێ پەیمانی ئەوە بدەن کە لە کاتی پەشەکشەی فەرەنسادا دەست لە هێزەکانی نەوەشێنن .

---

[1] ) بڕوانە : العالم في التاريخ الحديث ، د. اسماعيل ياغي ، ص٢١٢ .

بەلاّم حکومەتی بەریتانیا کە دەنگ و باسی دانوستانەکەی عەریشی پێ گەیشت هەلّویستی وەرگرت تا ئەو ڕێکەوتننامەیە سەرنەگرێت و ئیمزانەکرێت ، چونکە بەریتانیا لەوە زۆر ئەترسا کە سوپای گەمارۆدراوی فەڕەنسا ئەگەر لە میصر پاشەکشە بکات و بگرێتەوە گۆڕەپانەکانی شەڕ لە ئەوروپادا ئەوە تای ترازووی سوپاکەی فەڕەنسا قورس ئەبێت و هاوکێشەی هەلّویستەکان لەوکیشوەرەدا تێك ئەچێت ، بەریتانیا لەژێر ڕۆشنایی ئەو نامانەشەوە کە سەربازە فەڕەنسی یەکان بۆ کەس و کارەکانیان ئەناردەوە لە فەڕەنسا و ئەکەوتنە دەست پیاوانی دەریایی بەریتانیا ئەو بیرو ڕایەی بۆدروست بو بوو کە کاری هێزەکانی فەڕەنسا زۆر خاو بووەتەوە لە میصردا ، بۆیە حکومەتی لەندەن وای بەباش ئەزانی فەڕەنسی یەکان هەر لە میصردا _ بەو لاوازیە _ بمێننەوە یان وەك گیراوی شەڕ خۆیان بدەن بەدەستەوە ، لەبەرئەمانە لە ( ١٥/ دیسمبر / ١٧٩٩ ز ) دا فەرمانێکی ڕوون و بێ پەردەی بۆ ( لۆردکیث ) _ کە سەرکردەی گشتی کەشتیگەلی بەریتانی بوو لە دەریای ناوەڕاستدا _ نارد وتێیدا پێ ی ئەلّێ : هەر ڕێکەوتن و پەیماننامەیەك پەیوەند بێت بە چۆلّکردنی میصرەوە ، ڕەت بکاتەوە ئەگەر ئەوەی تێدا نەبێت کە فەڕەنسی یەکان پێویستە وەك گیراو خۆیان بدەن بەدەستەوە بەبێ هیچ جۆرە مەرج و داوایەك ، " کیث " یش نامەیەکی لەو مانایەدا نارد بۆ ( کلیبر ) و لەسەرتای مانگ ( مارس / ١٨٠٠ ) ز گەیشتە دەستی ..

لەبەردەم ئەم گۆڕانە کتوپڕیەدا ، " کلیبر " هیچ چارەیەکی نەماو چۆلّکردنی میصری ڕاگرت کە بە پێ ی ڕێکەوتننامەی ( عەریش ) دەستی پێ کرد بوو ، و بەپەلە بەسەرکردایەتی سوپایەك لەبەرەبەیانی ڕۆژی ( ٢٠/مارسی / ١٨٠٠ م ) بۆ ڕێگەگرتن لە پێشڕەوی عوسمانی یەکان کە سەرەتای سوپاکەیان گەیشتبوە ( مطرية )_ کە دوو سەعات لە قاهیرەوە دوور بوو کەوتە ڕێ و شەڕی ( عين شمس ) هەلّگیرسا و ڕووبەری گۆڕەپانی شەڕەکە لە ( مطرية ) ەوە تا هەر چوار لای ( صالحيه ) درێژبوویەوە و فەڕەنسی یەکان توانیان عوسمانی یەکان خراپ بشکێنن ، و لەماوەی شەڕی ( هليوبويس ) دا کۆمەلّێك لە سوپای ( صەدری ئە عظە م ) و هەندێ لە ئەندامانی مەمالیك توانیان دزە بکەن بۆ ناو

قاهیره و خەڵکەکەی بوروژێنن دژ بە فەڕەنسی یەکان و ئەوە بوو ڕاپەڕینی دووهەمی قاهیره ڕوویدا و نزیکەی یەك مانگ درێژەی کێشا لە ۲۰ / مارس / ەوە بۆ ۲۰ ابریل / ۱۸۰۰ ز [1] )).

" کلیبر " نەیتوانی ئەم ڕاپەڕینەی قاهیره دابمرکێنێتەوە ئەوکاتە نەبێ کە پەنای برد بۆ سەرکورتکردن و توندو تیژی ، و دەستی دایە تۆپبارانکردنی قاهیره لە هەموولایەکەوە بەتایبەتی تۆپبارانکردنی گەڕەکی ( بوّلاق ) بەخەستی _ کە ڕاپەڕینەکەی تێدا چڕبووبوویەوە _ و وای لێ هات بڵێسەی ئاگر لە هەموو شوێنێکەوە بەرز ئەبویەوە و ژمارەیەکی زۆری خانو دوکان و خانی سوتاند و دانیشتوانی بۆلاق ناچار بوون خۆیان بدەن بەدەستەوە و بە دوای ئەوانیشدا گەڕەکەکانی تر یەك لە دوای یەك خۆیان دا بەدەستەوە و زانایانی ئەزهەر کەوتنە نێوان و پەیمانی ئەوەیان لە ( کلیبر ) وەرگرت کە لێبوردنی گشتی بۆ هەمووی دەربکات و دەست لەکەس نەدات ، بەڵام هەر دوای ئەوەی ڕاپەڕینەکە کپ بوویەوە ناپاکی کرد بەرامبەر موسڵمانان و زۆر دڕندانە تۆڵەی لە خەڵکەکە کردەوە وباجێکی زۆری خستە سەر هەندێ لە زانایان و پیاوە ناودارەکان و بە گشتیش باجی لەسەر خەڵکی قاهیره دانا ، و تەنانەت توێژە هەژارەکانی میللەتیشی هەڵنەوێرا لەم باجە _ ناڕەوایە [2] . "

کلیبر " دەسەڵاتی دا بە ( معلم یعقوب ) کە چی ئەوێ بیکات بە موسڵمانان ، ئەوەی پێویستە باس بکرێ ئەوەیە کە ( بطریارکی قبطی یەکان ) لە میصردا بەم هەڵسوکەوتەی " معلم یعقوب " ڕازی نەبوو ، زۆریش ئامۆژگاری کرد واز لە و بەرنامەیە بهێنێت ، بەڵام (( یعقوب )) قسەی زبری زۆریشی بەرامبەر ئەو ئەکرد و هەر بە سواری ئەسپەکەیەوە خۆی ئەکرد بە کەنیسەدا و چەکەکەی بەرز ئەکردەوە و تا ئەهات هاوکاری و پشتیوانی بۆ فەڕەنسیەکان زیادی ئەکرد [3] .

دوو مانگ بەسەر دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکەدا نەڕۆیشت (( کلیبر )) تیرۆر کرا لە ۲٤ / یولیو / ۱۸۰۰ ز لە لایەن ( سلیمان الحلبی ) یەوە کە یەکێك بوو لە قوتابیە ئەزهەریەکان و لە وڵاتی شامەوە هاتبوو، ڕێ ی تێ ئەچێت دەسەڵاتدارانی عوسمانی دەستیان لە کوشتنی (( کلیبر )) دا هەبوو بێ ، لە ۱۷ / یولیو / دا سوپای فەڕەنسیمەراسیمێکی گەورەی بۆ بەخاك

---

[1] ) بڕوانە : العالم العربي في التأريخ الحديث ، ص٢١٤ .

[2] ) بڕوانە : العالم العربي في التأريخ الحديث ، ص٢١٤ ،٢١٥ .

[3] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي ، ص٨٩ .

سپاردنی " روفاتی " " کلیبر " گێڕا ، پاش شاردنەوەی تەرمی (( کلیبر )) " سلیمان حلبی " یان لە ناو برد و سەرکردایەتی گشتی کەوتە دەستی ( جنرال منیو ) ، لەبەرئەوەی بەتەمەنترین ئەفسەری هێزەکە بوو [1] .

ئەم سەرکردەیە پشتیوانی ئەو ڕایە بوو کە سوپای فەڕەنسی لە میصردا بمێنێتەوە و نەخشەی سیاسەتێکی دانا بە ئامانجی ئەوەی جێ قاچی فەڕەنسی یەکان توند بکات بەلاّم فشارە ناوخۆیی و دەرەکی یەکان ناچاری کرد میصر بەجێ بهێڵێت _ بەتایبەت _ پاش ئەوەی کە ئینگلیز و عوسمانی یەکان هێرشێکی هاوبەشیان کردە سەر فەڕەنسی یەکان لە میصردا .

ئەو هۆیانە زۆر بوون وای کرد هێزی داگیرکەری فەڕەنسی لە کۆتاییدا لە میصر دەربچن لەوانە :

_ تێکشکاندنی کەشتی گەلەکەیان لە شەڕی ( ئەبی قیر ) دا کە لە دەریادا ڕوویدا .

_ ئینگلیز دەسەلاّتی بەسەر دەریای ناوەڕاستدا پەیدا کرد و گەمارۆی خستە سەر هەموو کەنارە دەریایی یەکانی میصر و ئەمەش وای کرد حکومەتی فەڕەنسا نەتوانێ هیچ هاوکاری و کۆمەکێك بنێرێت بۆ هێزەکانی لە میصردا .

_ عوسمانی یەکان دایانە پاڵ ئەوانەی دوژمنی فەڕەنسا بوون .

_ کەرت کەرت بوونی هێزەکانی فەڕەنسا کە سەرەتاکانی لە سەردەمی ( بۆناپرت ) ە وە دەستی پێکرد ئەو کاتەی کە زۆر بە نارەحەتی سوپاکە لە ئەسکەندەریەوە بۆ ( قاهیرە ) کەوتنە ڕێ و پاشان لەت بوونەکە دوای مردنی {بۆناپرت} گەورە بوو بە تایبەتی دوای کوژرانی " کلیبر " و سەرکردایەتی کردنی ( مینو ) بۆ هێزەکە .

_ دروست بوونی جیهاد لە ناو گەلی موسڵمانی میصردا دژ بە داگیرکەری خاچپەرستی فەڕەنسی کە خۆی لە ڕاپەڕینی یەکەم و دووەمی قاهیرەدا نیشان دا ، هەروەك خۆی لە چالاکی یە جیهادی یەکانی " دلتا " و مقاوەمەتی توندی ( صعید ) دا ئەبینیەوە . بە بێ هیچ دودڵیەك جیهادی موسڵمانانی میصر گەورەترین کاری کردە سەر لەرزۆکردنی دەسەلاّتی فەڕەنسا لە میصردا و نەیهێلاّ بگەنە ئاواتەکانیان و ئامانجەکانیان بپێکن وتوانیان ئومێدەکانیان بدەن بە ئاودا کە بەتەمای ئەوە بوون میصر بکەنە ولاّتێکی جوانی

---

[1] ) بڕوانە : عجائب الاثار (٣/٣٠ ) .

ژێـر چـنگی خۆیـان و خـەویان بـەوە وە ئـەبینی بیکەنـە نـاوکی ئیمپراتۆریەتـە تـازە داگیرکەرەکەیان لە میصردا [1] .

حەوتەم / کاریگەری پەلاماری فەڕەنسا لە سەر میللەتی ئیسلامی :

بـەبێ گومـان ئـەم پەلاماردانـەی فەڕنـسا بـۆ سـەر میـصر کاریگـەری خراپـی زۆری هـەبوو لەسـەر میللـەتی ئیسلامی وهۆیـەك بـوو لـەو هۆیانـەی کـە میللـەتی ئیسلامی لـە نـاو خـۆدا تووشـی شکـست کـرد ، مامۆسـتا " محمـد قطـب " وێنـەی ئـەو کاریگـەریانـە بـەم شـێوەیە ئەگرێت و ئەڵێ : ( .. پاشان ئەو تێکشکانە سەربازی یەی بەسەر مەمالیکدا هات لە ( امبابە ) و لەسـەر دەسـتی ناپلیونـدا ، سـەرەتایەك بـوو بـۆ تێکـشکانی نـاوخۆی ، تێکـشکانی {عەقیـدە} لـەدڵ و دەرونەکانـدا ، تۆپـە دورهاوێـژەکانی نـاپلیۆن موسـڵمانانی ڕاچڵەکاند و بۆیان دەرکەوت کە شمشێری مەمالیکەکان شتێکی بۆش و گاڵتەیە لە چاو تۆپە تازەکانی ئـەودا کـە لـەوەو پـێش شـتی وایـان نـەدیبوو یـان بڕوایـان نـەبوو شـتی وا لـە دەسـت دوژمنەکانیاندا هەبێت ، ترازوی هێزەکان لە دڵ و دەرونیاندا زۆر خراپ پێچەوانەیە بوویەوە و ئـەوە یەکـەم جار بـوو کـە موسـڵمانان بـەو شـێوەیە تێـك بـشکێن و سـوپای خاچپەرسـتان سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لەبەر ئەوەی هێزێکی ڕاستەقینەی لە چەك و تفاق و تەکنیکی سەربازی و زانیاری هەیە و موسوڵمانان ئەوەیان نی یە ، هەرچەندە ئەگونجا ئەم تەرازووە بەو شێوەیە لە دڵ و دەرونەکاندا گۆڕانی بەسەردا نەهاتایە ، ئەکرا دڵ و دەروونـەکان خۆیـان لەبـەردەم ئـەم تێکشانەدا ڕابگرتایـە تاجـارێکی تـر کۆدەبوونـەوە و سـەرلەنوێ ڕاپـەڕینێکی تریان بەرپا ئەکردەوە وەك چۆن چەند جار لـەوەو پێش شتی وا ڕویـداوە ، بـەڵام ئـەو ڕێـژەی لە{عەقیدە} مابویەوە لە دڵیاندا لەو ماوەیەدا ئەوەنـدەی هێـز تێیـدا نـەمابوو کـە بەرگـەی ئـەم گورزە بگرێت و جارێکی تر سەرلەنوێ خۆیان کۆبکەنەوە ، نکۆڵی لـەوە نـاکرێ گـەل بـەرگری یەکی قارەمانانەیان کرد لە بەرانبەر پەلاماری فەڕەنسی یەکان دا و قاهیرە ڕاپەڕینی گەورە ی بـەرپاکرد بـە ڕێبـەری زانایـان و ئـەوان کاریگـەری ڕۆحـی زۆری زۆریـان دانـا لەسـەریان و داسـتانی قارەمـانێتی سـەیر تۆمـار کـرا ، .. ڕاسـتە ئەمانـە هـەمووی ڕوویانـدا ، بـەڵام زۆر تـر کـاری فیـداکاری تاکەکەسـی بـوون، هەرچـەندە قـەوارە شـەڕکەرە ڕاسـتەقینەکەی دەوڵـەتی موسـڵمانان کـە بـەرەی شـەڕی ڕێکئەخـست و سـوپای ئەجوڵانـد و لەبـەردەم داگیرکەرانـدا

---

[1] ) بڕوانە : الحملة الفرنسية وخروج الفرنسيين من مصر ، ص١٨٨ .

ئەوەستا بەو سیفەتەی ( دەوڵەتی ئیسلامیە ) ، ئەوانە هەمخووی لە شەڕی ( امبابە ) دا بە تەواوەتی توایەوە و بوونی نەما لەوە و دوا .
کاتێك موسڵمانان دەرکیان بەو شکستە ڕاستەقینەیە کرد کە دۆڕاندنی شەڕ بوو ، ناپلیۆن هات و یاسایەکی دانا بەسەر موسڵمانەوە بۆ ئەوەی لە جیاتی ( شەریعەتی خوا ) حوکمیان بکات ، یاسایەك کە لە یاسای فەڕەنسی یەوە وەرگیرا بوو ، شەریعەتی خواشی تایبەت کرد بە ( باری تاکە کەسی ) یەوە وەك ژنهێنان و ژن تەڵاقدان و میرات ... ئەوە بۆ یەکومجار بوو لە مێژووی موسڵماناندا جگە لە یاسای خوا یاسایەکی تر حوکمی بکات و لەلایەن ناموسڵمانانەوە دانرێ و جێ بەجێ بکرێ ! خاچپەرستەکان جارجارە پەلاماری نیشتمانی ئیسلامیان ئەدا و هەندێ کاتیش چەند ساڵ ئەمانەوە ، نەك هەر ئەوە بەڵکو پێش {صلاح الدین} وایان لێهاتبوو هەندێ دەوڵەتی بچوکیشیان لە ولآتی شام و لە کەنارەکانی دەریای سپی دا دائەمەزراند ، بەڵام هەرگیز زاتی ئەوەیان نەئەکرد کە خۆیان یاسایەك دابنێن و بێن حوکمی موسڵمانان بکەن بەپێی ئەو یاسایە ، هەموو جارێ وەك داگیرکەرێك ئەهاتن پارچە زەوی یەکیان فەرهوود ئەکرد ، بەڵام هەرگیز وەك دەوڵەتێك کە حوکمی ئەو زەوی یە بکات هەڵسوکەوتیان نەئەکرد ، ئەم جارە نەبێت ، ئەوە یەکەم جار بوودەستیان کرد بە حوکم کردن لە زەوی ئیسلامیدا پاش ئەوەی دەوڵەتە موسڵمانەکەیان پاڵ پێوەنا و لە گۆڕەپانی شەڕدا تواندیانەوە !

ئەمە سەرتای تێکشکانی ڕاستەقینە بوو ، تێکشکانی {عەقیدە} ، و گرمۆڵە بوونی لە دونیای ڕیالیستیدا ، و پاشان گرمۆڵە بوونی لە ناو دڵ و دەرونەکانیش دا و ئیتر لە ژێر سێبەری ئەم شکستەدا سەرسامی دروست بوو بۆ گەلی میصری بەرامبەر ئەو شتە تازانەی کە هێزی فەڕەنسا هەیبوو ، یەکەمجار بە چەکە تازەکانی فەڕەنسا سەرسام بوون و دوایی بە زانیاری ئەو پیاوانەی لەگەڵ هێزە فەڕەنسی یەکاندا هێنرا بوون ، هەروەها سەرسام بوون بەو چاپخانەیەی کە ناپلیۆن بۆ میصری هێنا بوو ، سەرسام بوون بەو ڕێکخستنانەی کە دایان هێنا بوو ، : بەیەك ووشە ئەمە بڵێین ، سەرسام بوون بە هەموو ئەو شتانەی کە لە ڕۆژئاواوە هاتووە و هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەندیان بە ئیسلامەوە نی یە .
ئا ئەمە بوو {شکستی ڕاستەقینەی هەمە لایەنە} کە سەرەتای هەڵچنی بۆ ئیمپریالیزمی خاچپەرست لەوە و دوا چی وێرانکاری هەیە بیکات لە ژیانی موسڵمانان و لە {عەقیدە} و {بیروڕا} و {هەست} و {هەڵسوکەوتی یان}دا لە ژیاندا ، لەبەرئەوە دەرکردنی فەڕەنسی

یەکان لە میصر یان پاشە کشەیان لێی ، دوای ئەوەی ئەم پەلامارەی فەڕەنسا لەناخەوە شکستی بۆ موسڵمانان دروست کرد ، ئەو پاشەکشە لە ڕاستیدا ڕووداوێکی وانی یە شایەنی باس کردن بێت [1] .

ئەم پەلامارەی فەڕەنسا بۆ میصر شوێنەواری خراپی بۆ سەر میصر بەتایبەتی و بۆ ڕۆژهەلآت بە گشتی هەبوو ، لە پاسەکانی دواتردا _ بەویستی خوا _ ئەمەت زیاتر بۆ دەرئەکەویٚ و لێت ڕۆشن دەبێت کە چۆن گۆڕە ماسۆنیە فەڕەنسی یە یەهودیەکان توانیان ئەو ڕێگەیە بگرنە بەر و لە وێوە و خەنجەرێکی ژەهراوی بدەن لە ئیسلام ، فەرەنسی یەکان توانیان بیروباوەڕەکانی خۆیان بناژن و خەڵکێکی ئەڵقە لە گوێشیان لەناوچەکەدا دەست کەوت بۆ کارەکانیان ، دوای ئەوەی کە هێزە سەربازی یەکانیان کشانەوە زۆر سوودیان لەو ڕۆڵە ترسناکەی ( محمد علی پاشا ) ی حاکمی میصر بینی کە ئەیگێڕا ، بەدڵنیای یەوە ئەم پەلاماردانەی فەڕەنسا بۆ سەر میصر و پاشان دەرچوونی لێی و دەرکەوتنی کەسایەتی یەکی وەکو {محمد علی} پاشا لەسەردەمی {سوڵتان سەلیمی سیٚ یەم}دا کە لەسەر کار لایان برد لەبەرئەوەی هەندیٚ نەریت و باوی ( فەرەنجی یەکانی ) هێنایە ناو سوپا و بەوەش وە نەوەستا تەنیا سوود لە چەکی تازە وەربگرێت بەڵکو ئەوەبوو دوایی ئەونەریتانە بونە شتێکی ترسناك لەسەر عەقیدەی میللەتی ئیسلام ، ئەمانە لە دەقی فەتواکەی موفتی میصردا هاتووە کە ئەڵێت : (( هەر سوڵتانێك یاسا و نەریتی ( ئیفرەنجی یەکان ) بهێنێتە ناو وزۆر لە میللەت بکات بۆ ئەوەی کاریان پیٚ بکات ، ئەوە بەکەڵکی پاشایەتی نایەت [2] )) .

## باسی هەشتەم

{ سوڵتان محمودی دووەم }( ١٢٢٣ _ ١٢٥٥ ك / ١٨٠٨ _ ١٨٣٩ ز ) :

ئەم سوڵتانە کە حوکمی گرتە دەست تەمەنی بیست و چوارساڵ بوو ، زۆر سوودی لەو ماوەیە بینی کە دەستبەسەر بوو لەگەڵ سەلیمی سێهەمدا چونکە ئەم کابرا ئاگاداری کردبوو لە هەمووئەو ڕیفۆرمانەی کە ئەیەویٚ بیانکات ، بەلآم ئەم سوڵتانە تازەیە لەسەرەتادا ناچاری

---

[1] ) بڕوانە : هل نحن مسلمون ؟ ص١١٥ _١١٨ .

[2] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي ، ص٩١ .

ئەوەبوو مل بۆ ئینکشاریەکان بدات و فەرمان دەربکات بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو ریفۆرمانە، بۆ ئەوەی ڕازییان بکات تاکاتی ئەوە دێت دەست بەو چاکسازییانە بکات ، ئەم محمودە زۆر خۆگر بوو ، هەمیشە چاوەڕوانی ئەوە بوو ئەو کاتە بێتە پێشەوە لەدەست ئەم ئینکشاریانە ڕزگاری بێت کەبە هەموو شێوە یەك هەرەشەیان لەقەوارەی دەوڵەتی عوسمانی ئەکرد، بەڵام ئەو هەلەی دوای چەند ساڵێك نەبێت بۆ هەڵنە کەوت ، بەتایبەت سەردەمی ئەم پڕبوو لە شەڕو شۆڕ و گۆڕنکاری گرنگ کەچی هەوڵ و توانای هەیە لیٚ ی چنی [1]

یەکەم / شەڕلەگەڵ ڕوسیادا :

{سوڵتان محمودی دووهەم} ڕێکەوتنامەیەکی لەگەڵ ئینگلتەرادا لەساڵی ١٢٢٤ ك ١٨٠٩ ز بەست و هەوڵی دا هەمان ڕێکەوتنامەش لەگەڵ ڕوسیادا مۆربکات بەڵام سەرکەتونەبوو ، ئەوە بوو شەڕ لەنێوانیاندا هەڵگرسا و عوسمانیە کان شکان و ڕوسیا دەستی گرت بەسەر هەندێ شوێنی تردا ، {صەدری ئەعظەم}یش { ضیادیوسف پاشا } ی لابردو( احمەد پاشای خستە جێگەی کە سەرکەوتنی بەسەر ڕوسیادا بەدەست هێنا وظیـــاء توانی ئەوشوێنانە یان پیٚ چۆڵ بکات کە هاتبونە ناوی ، و پەیوەندی نێوان فەڕەنساو ڕوسیا ڕووی لەخراپەکرد و ئەوە ندەی نەمابوو شەڕ لەنێوانیاندا هەڵگرسێت ، ڕوسیا داوای ئاشتی کرد لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا و ڕێکەوتنامەی ( بوخارست ) لەساڵی ١٢٢٧ ك – ١٨١٢ ز ڕوویدا کە بەدەق باسی ئەوە ئەکات {ئەفلاق} و{بەغدان} و ولاٌتی{صیرب}ئەبێت لە ژێر دەسەلاٌتی عوسمانیدا بمێنێتەوە ئەم ئاشتەوایی یە ڕێگەی خۆش کرد بۆ {سوڵتان مەحمود} دەست بداتە هەندێ ڕیفۆڕم و سەرکوتکردنی ئەو ڕاپەڕین و یاخی بوونانەی کە لەناو دەوڵەتدا ڕوو ئەدەن [2] .

کە صیربیەکان ئاگادار بوون لە ڕێکەوتنامەی ( بۆ خارست ) و گەڕانەوەیان بۆ ژێر دەوڵەتی عوسمانی ، دەستیان دایە ڕاپەڕین،بەڵام هێزەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە ڕێگەی هێزەوە ملی پیٚ کەچ کردن و ڕێبەرەکانی ئەم ڕاپەڕینە ڕایان کرد بۆ ( نەمسا ) بەلاٌم (( ثیودور فتش ))

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانیة ، د. اسماعیل باقی ، ض١٢٧ ، ١٢٨

[2] ) بڕوانە : التاریخ الدولة العثمانیة ، احمد سرهنط ، ص٢٢٦ _ ٢٢٨ .

کە ڕێبەرێکی ئەم ڕاپەڕینە بوو پشتیوانی خۆی بۆ عوسمانیەکان دەربڕی و ملی کەچ کرد بۆ دەسەلأتیان و چەند (( امتیازات )) ێکی زۆری وەرگرت لە دەوڵەت [1] .

## هەڵوەشاندنەوەی ( ئینکشاری یەکان )

سروشتی ئینکشاری یەکان ڕووی لە خراپ کرد و ڕەوشتیان زۆر گۆڕا ، کارە سەرەکی یەکان گۆڕا بۆ کارێکی ترو بوونە سەرچاوەی نەگبەتی بۆ دەوڵەت و ئەو گەلانەی سەربە دەوڵەت بوون ، وایان لێهات دەستیان وەرئەدایە هەموو کاروبارێکی دەوڵەت ، و دڵیان هەر بۆ کورسی و دەسەلأت لیْ ی ئەدا و بەتەواوەتی ڕۆچوو بوون لە حەرامخۆری و ڕابواردندا ، زۆر لایان زەحمەت بوون لە سەرمای زستاندا داوای ئەوەیان لیْ بکریْ شەڕبکەن و ئەچوونە هەر ولأتێك دەستیان ئەدایە دزی کردن و فەرهود و باج خستنە سەر خەڵکی بەناوی سوڵتانەوە و ئەو مەبەستەیان وەلا ئەنا کە ئەوانی بۆ دروستکرا بوو ، هەروەك بەتەواوی ڕۆچوون لە مەی خواردنەوەدا ، وای لیْ هات چی شکست هەبوو لە قوڵی ئەوانەوە ئەهات بەهۆی ئەوەی وازیان لە {شەریعەت} و {عەقیدە} و {بنەما ئیسلام}ی یەکان هێنا بوو لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە لە هەموو ئەو هۆکارانە دوور کەوتبوونەوە کە سەرکەوتنی ڕاستەقینەی پیْ دروست ئەبێت ، هاتن دەستیان دایە لابردنی ئەم سوڵتان و کوشتنی ئەوی تریان وەك عوسمانی دووەم بۆ نمونە ، ئەم ئینکشاری یانە لەسەردەمی {سوڵتان مورادی چوارەم}دا و بۆ ماوەی ( دە ) ساڵی ڕێك بەردەوام بە ڕێگەی گومڕایی دا ئەڕۆیشتن و تا بهاتایە هەر ڕۆئەچوون و خراپ تر ئەبوون ، لەبەرئەوەی خۆیان دایان نابووبۆیە {ئەبێت} و{ نابێت} هەر لە دەستی خۆیاندا بوو ، هەر ئەمان بوون کە {سوڵتان ابراهیم}ی یەکەمیان خنکاند کاتێك هەوڵی ئەوەی دا خۆی ڕزگار بکات لێیان ، هەر ئەمان بوون کە دەوڵەتیان شپرزکردبوو ، وایان کردبوو دەوڵەت کەوتبووە ناو پشێوی یەکی زۆرەوە بەهۆی ئەوەی کە سوڵتانەکانیان ئەکوشت و منداڵە ووردەکانیان ئەخستە سەر کورسی دەسەلأت وەك {سوڵتان محمدی چوارەم} و ئەوەبوو دوای ئەوە ئیفرنجیەکان چەند بەشێکی ولأتیان داگیرکردوو {صەدری ئەعظەم} و زانایانیش ناچار بوون کەلە سەرکار لای بەرن و ئینکشاریەکان جارێکی تر ڕاپەڕین بەڕووی {سوڵتان سەلیمی

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٢٨ .

دووەم}دا و بە دوایدا سوپای دوژمن هاتن و چەند شوێنێکی تریان داگیرکرد ، ئینکشاری یەکان {سوڵتان مستەفای دووەم} و{ئەحمەدی سێ یەم} و {مستەفای چوارەم}یان لەسەر کار لابرد و ، بەو شێوەیە کار هات تا خوای گەورە {سوڵتان محمودی دووەم}ی لە ساڵی ١٢٤١ ك دا نارد و خەڵکی لەمانە ڕزگارکرد [١] .

سوڵتان کۆمەڵێکی زۆر لە پیاوە گەورەکانی دەوڵەت و گەورە ئەفسەرەکانی ئینکشاری لە ماڵی " موفتی " دا کۆکردەوە و ( صەدری ئەعظەم ) ( سەلیم ئەحمەد پاشا ) هەستاو دەستی کردە ووتار دان و باسێکی ئەو حاڵەتەی کرد کە ئینکشاری یەکان چەند ڕووخان و لاواز بوون ڕووی تێکردون و باسی ئەوەیشی کرد پێویستە بەپێی ڕێکخستنە سەربازی یە تازەکان دروست بکرێنەوە ، ئامادەبووان هەموو قەناعەتیان بە قسەکانی کردو ( موفتی ) یش فتوای ئەوەی دەرکرد دروستە کار بکرێت بۆ سەرکوتکردنی یاخی بووان ، هەموو ئەو ئەفسەرو دەرەجە دارانەی ئینکشاری یەکانیش کە لەوێدا بوون بەڕووکەش ڕەزامەندیان دەربڕی و لە ناخەوەش ناڕازی بوون ، کە هەستیان کرد کە نزیکە (( امتیازات )) ە کانیان هەموو لە دەست بدەن و سنوور بۆ هەڵسوکەتیان دائەنرێت ، خۆیان کۆکردەوە بۆ ڕاپەڕین و هەندێ کەسی نەخوێندەواریش هاتن بە دەمیانەوە و لە ٨ی ذی القعدة / ١٢٤١ ك دا ئینکشاری یەکان دەستیان کردە دنە دانی سەربازەکان لە کاتی مەشق کردنیان دا و فێری بێ گوێیان ئەکردن بۆیە سوڵتان بەپەلە زانایانی کۆکردەوە و ئاگاداری کردن لە نیازی خراپی ئینکشاری یەکان و ئەوانیش زۆر هانی سوڵتانیان دا کە لە ڕەگ و ڕیشە دەریان بهێنێ و سوڵتانیش فەرمانی دەرکرد بۆ هێزی بۆمب هاوێژ تا خۆیان بۆ شەڕی ئینکشاری یەکان ئامادە بکەن و ئاماژەشی کرد کە نەرمونیانیش لە هەمان کاتدا بەخەرج بدەن لە ترسی ئەوەی نەك بڵێسەی خراپەیان بگاتە هەموو شوێنێ ، و لەبەرەبەیانی ڕۆژی ٩/ ذی القعده / دا سوڵتان خۆی و بەدوایەوە سەربازانی هێزی بۆمب هاوێژو بە دوای ئەوانیشدا زانایان و قوتابیان هاتن بۆ گۆڕەپانی ( آت میدانی ) کە یاخی بووانی لێ کۆبوبوویەوە بۆ ئەوەی پشێوی بنێنەوە ، ئەڵێن سوڵتان ( شێخ و ئیسلام قاضی زادە طاهر ئەفەندی ) و {صەدری ئەعظەم}سەلیم پاشاش لە پێشی هەموو ئامادەبووانەوە وەستاند بوو کە زیاتر لە ( ٦٠٠٠٠ ) شەست هەزار کەس ئەبوون و هێزی بۆب هاوێژ چواردەوری گۆڕەپانەکەیان دا و

---

[1] ) بڕوانە : تاريخ الدولة العثمانية ، د. علي حسون ، ص١٠٧_١٠٨ .

بەرزایەکانیان لێگرتن و ڕووی تۆپەکانیان تێکردن و ئینکشاری یەکان خەریك بوو دەست بکەنەوە و پەلاماری تۆپەکان بدەن بەلاَم ئەوان ئاگربارانیان کردن و ناچاریان کردن بچنە سەنگەرەکانیان لە ترسی مردن و ئەوەبوو هەموو سەنگەرەکانیان بەسەریاندا سوتاند و ڕووخاند و بەوشێوەیەش تەکیەکانی بە کتاشیی یەکانشیان بۆمب باران کرد ، و سوڵتان شەڕەکەی بردەوە و زاڵ بوو بەسەریاندا ، بۆ ڕۆژی دوای مەرسومێکی سوڵتانی دەرکرا و تێیدا تاقمی ئینکشاری لە هەموو هەرێمەکانی دەوڵەت دا و هەموو ئەو شتانەی پەیوەند بوو پێیانەوە هەڵوەشێنرایەوە وەك جل و بەرگەکانیان ، زاراوەکانیان ، ناویان ، و بڕیار درا کە هەموو ئەوانەش ماونەتەوە و ڕایان کردووە بۆ ویلایەتەکانی تر لەناو ببرێن یان ( نەفی ) بکرێن ، پاشان {سوڵتان محمودی دووەم} ، ( حسین پاشا ) ی کردە سەرۆکی گشتی ( سەرعەسکەر ) کە دەستێکی باڵای هەبوو لەقەلاچۆکردنی ئینکشاری یەکان دا و دوای لەناو بردنیان دەستی کردە جێ بەجێ کردنی یاسای تازەی سوپا [1] .

پاش ئەوە {سوڵتان محمود} هەستی بە ئازادی ئەکرد لە پێش خستنی سوپادا و دەستی کردە هەنگاو هەڵگرتن بەرەو شارستانیەتی ڕۆژئاوا و لە جیاتی " مێزەر " هات ( ترپووشی ڕۆمی ) دانا و جل و بەرگی ئەوروپای کردە بەر ، و فرمانیشی کرد ئەو جل و بەرگە ببێتە جل و بەرگی ڕەسمی بۆ هەموو کاربەدەستەکانی دەوڵەت چ سەربازی و چ مەدەنی ، و مەدالیایەکی داهێنا ناوی نا ( مەدالیای شانازی ) [2] و {سوڵتان محمود} یەکەم سوڵتانێکی ئالی عوسمانە کە ئەمەی داهێنابێت [3] .

ئەم کارانەی {سوڵتان محمود} کە پێ یان هەڵئەسا وەك ئەوەی مێزەری گۆڕی بۆ تەربووش و جل و بەرگی ئەورووپی سەپاند بەسەر هەموو یەکە سەربازی یەکاندا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە لەناخەوە هەستی بەو ڕووخانە دەرونی یە کردووە کە ئێمە لە دوایدا باسی ئەکەین ( ان شا ءالله ) .

دووەم / {محمد پاشا}ی والی میصر :

---

[1]) بڕوانە : تأريخ الدولة العثمانية ، د. علی حسون ، ص١٦٩ .

[2]) بڕوانە : المسلمون وظاهرة الهزيمة النفسية ، عبدالله بن حمد ، ص٧٣ .

[3]) بڕوانە : تاريخ الدولة العثمانية ، د. علی حسون ، ص١٦٩ .

{محمد پاشا} کەسایەتی یەکی ناوبانگ خراپ بوو، وا ناسرابوو کە پیاوێکی توند و دڵ ڕەقە، دەوڵەتی عوسمانی ئەینارد بۆ تەمێ کردنی ئەو لادێیانەی کە باجەکانی دەوڵەتیان دوا ئەخست تا لێیان وەربگرێتەوە ، کەچی ئەو لە چواردەوری لادێکەدا سەربازگەی دائەمەزراند و خۆی و هێزەکەی کە بۆ تەمێ کردن ڕۆشت بوون دەستیان ئەدایە فەرهود کردن و تالآنی و برۆ و تۆقاندنی خەڵکی بێ دیفاع ، تا ئەیانگەیاندە ئەوەی خەڵکی ئەو لادێیە وایان لێ ئەهات دانی ئەو باجە چەند زۆر بوایە لایان باشتر بوو لەو هەمووە فەرهود و تۆقاندنە ، ئەم کابرایەش ئەوەندە حەزی لە لوت بەرزی ئەکرد گەیاندبوویە سنووری شێتی [1] .

{محمد علی} بەسەرۆکایەتی تیمێکی ڕۆحانی هاتە ناو میصر بەنیازی دەرکردنی فەڕەنسی یەکان و ئەوەبوو توانی بە زیرەکی خۆی و فرت و فێڵ متمانەی زانایانی میصر بۆ خۆی بەدەست بهێنێ و کەوتە هەوڵی ئەوەی ڕکەبەرەکەی کە والی میصر بوو لەناوبەرێت بەهەموو ڕێگەیەکی لارو وێرو فرت و فێڵ تا ئەوە بوو بویە والی میصر لەسەرەتای ٢٠ / ربیع الاول / ١٢٢٠ ك بەرامبەر ١٨ / یونیو / ١٨٠٥ ز دا .

لەگەڵ ئەوەدا کە {محمد علی} سەرەتا زۆر هەوڵی ئەدا ببێت بە خزمەتکارێکی گوێڕایەڵی سوڵتان [2] و لەو پێناوەشدا ووشە و دەستەواژەی زیللەت ئامێزی زۆری بەرامبەر سوڵتان و دەوڵەتی سوڵتان بەکار ئەهێنا [3] ، بەڵام سوڵتان زۆری نەمابوو لە دووریەکانی ئەو جۆرە دەستەواژانە تێ بگات بەوەی ترسی خۆی لەم والیە تازەیە نەشاردەوە و فەرمانی کرد بگوازرێتەوە لە والیەتی میصر کەچی زانایانی میصر، جارێکی تر دەخالەتیان کرد و وایانکرد سوڵتان فەرمانێکی تر دەربکات و لەسەر کورسی حوکمڕانی میصردا بمێنێتەوە لە ٢٤ / شعبان / ١٢٢١ هـ _ ٦/ نوڤمبری / ١٨٠٦ ز .

لێرەوە {محمد علی} کەوتە بەهێزکردنی بنکەی کەسایەتی خۆی و قۆرخ کردنی دەسەلآت لە خۆیدا [4] ، و بەو شێوەیەش لە نەوەکانی خۆیدا ، پرسیارێکی زۆر هەیە و پێویستیان بە

---

[1] ) واقعنا المعاصر ، محمد قطب ، ص٢٠٥ .

[2] ) بڕوانە :قراءة جديدة لسياسة محمد علیپاشا التوسعية،د.سليمان،ص ١٧.

[3] ) لە بەڵگە نامەیەکی تورکی بە ژمارە{ ٥٠/١-٢٤٨لە "ربيع الاول"ی ساڵی ١٢٣٠ك،لە الرياض}وەر گیراوە

[4] ) بڕوانە : تاريخ الدولة العثمانية ، ص٣٩١ .

وەلاّم هەیە دەربارەی حەقیقەتی ئەرِۆڵەی {محمد علی} پێی هەستا کە هەمووی لە بەرژەوەندی فەرەنسا و بەریتانیا دا بوو، ئایا ئەوانە کیّ بوون لە پشت کاری لەناو بردنی دەوڵەتی یەکەمی سعودی یەوە بوون ؟ نەیان هێلاّ {شام}و {میصر} ببێتە یەك ؟ ئێمە لەم لێکۆڵینەوە مێژووی یە هۆشمەندانەوە هەوڵی وەلاّمدانەوەی ئەو پرسیارانە ئەدەین .

سیّ یەم / {عبدالرحمن جبرتی} مێژوو نوس بەم شێوەیە باسی محمد علی دەکات :

" عبدالرحمن جبرتی " مێژوو نوس بەم شێوەیە وەسفی {محمد علی} دەکات و ئەڵیّ : پیاوێکی گزی بازو درۆزن بوو، سوێندی درۆی زۆری ئەخوارد ، ستەمکارێکی وا بوو، نە پەیمان ئەیخوارد لە لای ئەو نە نزیکی و رِەفیقایەتی ، بەردەوام نیازی خراپی لە دلّ دا بوو ، هەر خەریکی توندو تیژی و ستەم بوو ، لەهەمان کاتدا بەڵێنی دادی بە خەڵك ئەدا ، ستەم و ئازاری تەنانەت لەسەر پیرێکی ووشك هەلاّتوش کەم نەئەکردەوە کە دەستی بدایەتە ستەم و تاکرِەوی [1] .

ئەم سیفەتانەی وای کرد لە هەندێك بڵێن : {محمد علی} " میکافیلی " بوو یان بیرورِای میکافیلی خوێندوە ( میکافیلی خاوەنی کتێبی : – الغایة تبرر الوسیلە = مەبەست هۆکارنەشەرعێنیّ ) ، جارێکیان بە {محمد علی} وترا میکافیلی کتێبێکی داناوە و ناوی ناوە ( میر ) ، یەکسەر یەکێك لە ( نەصرانییەکانی ) دەوروبەری کەناوی ( ئەرتین ) بوو ئاگادار ئەکات ئەو کتێبەی بۆ وەر بگێرتەوە سەر زمانی عەرەبی {محمد علی} خووی گرتبوو بەوە وە کە زۆربەی هاوەڵەکانی لە جولەکەکان و گەورەکان بوو،ئەم{ئەرتینە}، هەموو رِۆژیّ لاپەرِەیەکی وەرگێرِاوی ئەو کتێبەی بۆ ئەخوێندەوە ، کاتێك کە گەیشتە لاپەرِە ( دە ) وەرگێرِانەکەی رِاگرت و ووتی : من فێڵی وا ئەزانم بە خەیاڵی میکافیلیدا هەر نەهاتووە [2]

**چوارەم** / ( محمد علی ) و ماسۆنیەت :

---

[1] ) برِوانە : قراءة جديدة لسياسة محمد علي پاشا التوسعية ، د. سليمان الغنام ، ص١٧ .

[2] ) برِوانە : مصر في مطلع القرن التاسع عشر ، د. محمد فؤاد شكري ( ٢/ ٨٥٧ ) .

ئاسان نەبوو بۆ هیچ کوڕێکی گەنج لە کاتێکدا کەم ئەزموون و کەم زانیاری بێت بە میصرو سروشتی میصرو بگاتە ئەو پلە و پلەیەی کە( (محمد علی) پێی گەیشت ، هەرچەندە ئەو گەنجە زیرەك و بە تواناش بێت ئەگەر پشتیوانێکی بەهێزی لە پشتەوە نەبێت کە نەخشەی بۆ بکێشێت و هاوکاری بکات بۆ دەستخستنی ئامانجەکانی ، و لە هەمان کاتیشدا ئەو هێزە ئامانجەکانی خۆی پێ جێبەجێ بکات ، ئەمەیش ئەڵێن چونکە (محمد علی) دەربارەی خۆی دەڵێ ( بەکەڵکی بەرپرسیارێتی نایەت و وەزیر نی یە و ئەمیر نی یە و لە گەورە پیاوانی دەوڵەمەنیش نی یە ) ئەو سیفەتانە ش لەڕاستی دا لە ئەودا هە بوون ئیتر خۆی هەر مەبەستێکی هەبێت لە و دەربڕینەیدا، بۆیە هەندێ پرسیار لێرەدا دێتە پێشەوە ، باشە بۆچی ئەبێت تیپی (( ئەلبانی یەکان )) کە ئەو کەسی دووەم بوو تێیدا بەتەنیا لە ناو ئەو هەموو هێزەی عوسمانیدا ، دەستیان دایە ڕاپەڕین دژ بە ( خسروپاشا ) و لەسەر کار لایان برد بەبیانوی ئەوەی کە (( موچەکانیان )) دوا کەوتووە ، ؟! هەروەها ئەو ئەپرسێ بۆچی زانایان بەو خێرای یە داوای دامەزراندنی( طاهر پاشا) یان کرد کە سەرۆکی هێزە ئەلبانی یە ڕاپەڕیووە کە بوو ، تا بکرێتە ( قائیمقام ) و بریکاری والی یە دەرکراوەکە و دوای بیست ڕۆژ یەکسەر ئەکوژرێت ؟! یان بۆچی ئەم والی یە تازە ( واتە ئەحمەد پاشا ) دوای یەك ڕۆژ لە دەسبەکاربوونی دەردەکەرێت ؟! یان بۆچی( (محمد علی)) یارمەتی ( خورشید پاشا ) ئەدات بۆ ئەوەی ببێتە والی و پاشان کودەتای کرد بەسەریدا ؟ یان ئایا( (محمد علی)) چۆن توانی مووچەی ئەو هەمووە سەربازە بدات بەتایبەتی پاش ئەوەی کە ( مەمالیکەکان ) لە ((صعید )) دا دەستیان گرت بەسەر تەواوی مووچەی خەڵکەکەدا لەوێ ؟ هەروەها بۆچی وبۆچی زۆر لایەنی نادیاری هەیە لەم پرسەدا !!

زۆر بەڵگە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن کە ئەو هێزە _ کە بەدەرەوە نە بوو _ بریتی یە لە بزوتنەوەی ماسۆنیەت کە لە میصردا و لە ساڵی ( ١٧٩٨ز ) و لەسەر دەستی پیاوانی هێزە داگیرکەرەکەی فەرەنسادا دامەزرا کە ناپلیۆن ڕێگەی بۆخۆشکردن و(کلیبر)ی جێگری دوای خۆی لەگەڵ کۆمەڵێك ئەفسەری ماسۆنی سوپای فەرەنسادا کۆڕێکیان [1]. لە( قاهیر)دا

---

[1] ) ووشەی : کۆڕم بۆ ( محفل ) بەکار هێناوە چونکە (( مجلس )) و (( مجمع )) ی بۆ بەکار دەهێنرێت . (وەرگێڕ:ن)

دامەزراند و ناویان نا ( کۆڕی ایزیسی ) و ڕێبازێکی تایبەتیان بۆ تەرخان کرد بەناوی ( ڕێبازی مەمفیسیە ) یان ڕێبازی کۆنی ڕۆژهەلآت [1].

ئەم کۆڕە توانی هەندێ ئەندام بۆ خۆی دروست بکات لە میصری یەکان هەرچەندە کەم بوون ، پاشان بە ڕەسمی و لە دوای کوشتنی ( کلیبر ) و لە سالی ( ١٨٠٠ز ) ( کۆڕەکە ) هەلوەشێنرایەوە و ئەندامەکانی بە شێوەیەکی نهێنی و لە پشت پەردەوە ئیشیان دەکرد .

یەکەم پەیام کە ناپلیۆن بەسەر میصری یەکاندا بەخشی کردووە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات کە ئەو لە سەرەتای پەلامارەکەیشیەوە هەرکاری بۆ ئەو کردووە ئەو جۆرە بیرو ڕایانە بلأوبکاتەوە ، ئەوەتا باسی ئەکات و ئەلێ (( پێیان بلێن (یانی بە میصری یەکان ) خەلکی هەموو لای خوا یەکسانن و ئەوەی لە یەکتریان جیا ئەکاتەوە تەنیا ئەقلّ و ڕەوشت بەرزی و زانیاری یە ) [2] ، ڕێبەرێتی کردنی هێزەکانی فەڕەنسا بۆ بیروباوەڕی ماسۆنیەت هەر لەسەرەتاوە زۆر ڕووونە ، ئەوە بوو دەستیان کردە سەپاندنی ئەو خووە پیس و شاراوانەی کەمایەی بێزاری بوو لای موسلمانانی میصر" وەك لەش فرۆشی و بێ حەیایی و هاندانی ئافرەتانی گوێ ی دەریاکان و ئافرەتانی هەوەس پەرست تا بە شێوەیکی ئاشکرا کاری بەد ڕەوشتی بکەن ، چونکە ئەم شێوازە یەکێکە لە کەرەسەکانی ماسۆنیەت [3]

هەندێك لە بەلگەکان ئەوە ئەگەیەنن کە هەر ئەوان _ واتە فەڕەنسی یەکان _ توانی یان هەندێك لە پیاوە ئایینی و زاناکان لە خەلکی میصر ببەنە ناو کۆڕە ماسۆنیەکەی خۆیان وەك (شێخ حسن‌العطار) ، ئەو کۆڕە کە (کلیبر) لە سالی ١٨٠٠ز دروستی کرد ، پاش ئەوەی کە شێخ حسن‌العطاروەك زانایانی تر ڕای کرد بۆ( صعید ) لە ئەنجامی ئەو قەلامارەی کە کرایە سەر میصر ، پاشان گەڕایەوە بۆ قاهیرە دوای ئەوەی کە فەڕەنسی یەکان هەموو زانایانیان بانگ کردەوە ، جا حسن‌العطارخێرا پەیوەندی کرد بە پیاوانی هێزە فەڕەنسی یەکانەوە و ئەو زانیاریانەی ئەوانی وەرگرت و لە هەمان کاتیشدا دەستی کردە ووتنەوەی وانەی عەرەبی پێیان [4]. تاڕادەیەکی زۆر لەگەلّ زانیاری یەکانی ئەواندا خۆی جووت کرد و لە هەندێ لە

---

[1]) بڕوانە : نهاية اليهود محمد عزت ، ص١٣٢ .

[2]) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص١٦٧ .

[3]) بڕوانە : عجائب الاثار ( ٣/ ١٦١ ) .

[4]) بڕوانە : الصراع الفكري بين اجيال العصور ، ابراهيم العدوي ، ص٨٥ .

شیعرەکانیدا بە باڵای هەندێ لەو هاوڕێ خۆشەویستانەیدا هەڵدەدات کەلەناو ئەواندابوون[1]، ئەم کارانە وای کرد لە ( العطار ) کە بە کەسێك لە بانگخوازانی ( نوێبونەوە ) ناوزەند بکرێت [2]. شێخ عطاردوای ئەوەی ((محمد علی)) بوویە والی میصر پەیوەندی لەگەڵیدا زۆر پتەو بوو بە ڕادەیەك وای لێهات کە بوویە یەکێك لە کۆڵەکەکانی کاری ئەو و بۆ هەنگاوەکان پڕۆسەی ( نوێبوونەوە ) زۆر پشتی پێ ئەبەست لە میصردا و ئەمەش ئاماژەیە کە بۆ ئەوەی کە ((محمد علی)) پەیوەندی هەبووە بە کۆڕە ماسۆنی یەکانەوە لە میصر کە لە سەرتای پەلامارەکەی فەرەنسادا بۆ میصر دامەزرا [3].

بەرەو پێش چوونی ڕووداوەکان ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن کە( (محمد علی)) ئینتەلای کردبوو بە بیروباوەڕی ماسۆنیەت و بە هەمووو جۆرێك ئامادەیی هە بوو بۆ وەرگرتنیان بە هۆی بونیەی سروشتی خۆیەوە ، ئەوەتا دانوستان لەگەڵ فەرەنسی یەکاندا ئەکات دەربارەی ( داگیرکردنی جەزائیر ) پێیان دەڵێ(( متمانەتان هەبێت بڕیارێك کە من ئەیدەم لە هەستی ئایینمەوە هەڵنا قوڵێ ، چونکە خۆتان ئەمناسن و ئەزانن من لە هەموو ئەو شتانەی کە میللەتەکەم خۆیانیان پێوە بەستوەتەوە من خۆم لێ ڕزگار کردووە .. لەوانە یە بلێین هاولاتی و خەڵکەکەی لای تۆ هەمووی کەرو گان، من خۆم ئەو ڕاستی یە ئەزانم )) [4].

لە سەردەمی( (محمد علی)) زیاد لە کۆڕێکی ماسۆنیەت لە میصردا دەمەزرا ، ماسۆنیە ئیتالیەکان _ مەحفەلێکیان لە ئەسکەندەریە دا لە ساڵ ( ١٨٣٠ز ) دا دامەزراند لەسەر ڕێبازی ( ئیسکوتلەندی یەکان ) ، هەروەها جگە لە مە هی تری زۆریش دامەزرا ) .

﴿ماسۆنیەت ئەو پردە بوو کە زانیونیزمی جیهانی لێوەی پەڕیەوە ، (نۆ) کەسی جولەکە لە بناغەوە ماسۆنیەتیان دامەزراند بە مەبەستی ئەوەی ئەو خەوەی زانیۆنیزم بهێنێتە دی کە دروست کردنی حکومەتێکی زایۆنیزمی جیهانی یە کە بتوانێت دەست بەسەر هەموو دنیادا بکێشێت ، ماسۆنیەتیش هات و نەخشەی بۆ ئەم ئەمانجە کێشا و ئالیەتەکانیشی دانا بۆ دەست کەوتنی ئەو ئامانجانە ، و ناوی خۆی نا (( هێزی شاراوە )) و کاری نهێنی و وادەو

---

[1] ) براونە : الجبرتي والفرنسيس ، صلاح العقاد ، ص٣١٦ .

[2] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التاريخ العثماني ، ص١٦٩ .

[3] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص١٦٩ .

[4] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٧٠ .

پەیمانی وایان لە ئەو کەسانە وەردەگرت کە ئەبوونە ئەندام تێیدا ، کەلە دواییدا ئە بویە کارتی فشار لەسەریان و وای لێدەهات ئەبوو بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکات کە ئەوان ئەیانەوێت ، گەندەڵی ماسۆنیەت زۆر زوو لەناو کۆمەڵگاکانی ڕۆژئاوادا بلاّوبوویەوە و توانیشی لە ڕێگەی دروشمە ئاشکراکانیانەوە خەڵکێکی زۆر بۆلای خۆیان ڕابکێشین وەك دروشمی ( ئازادی ، برایەتی ، یەکسانی ) [1] .

( ماسۆنیەکان دەسکەلای جولەکەن و ئیشەکانیان بۆ ڕائەپەڕێنن وەك نەخشەکانیان بۆ توندی و تژی و پلانی چەوساندنەوە و لە ناوبردنی خەڵك و سڕینەوە یان، کە بەسەر هەموو میللەتانی دونیادا جیّ بەجێی ئەکەن ) [2] .

( ماسۆنیەت ئامێری ڕاوکردنە بەدەستی جولەکەوە ، بە ماسۆنیەت گەورە سیاسەتمەدارەکان ئەدەن بە زەویدا ، گەل و میللەتە بیّ ئاگاکانی دونیا هەڵئەخەڵەتێنن ، ماسۆنیەت ترسناکیەکەی خۆی لە پشت ئەو هەمووە ڕەمزو مەتەڵ و ئارمەوە شاردوەتەوە ، خەنجەرێکە جولەکە کردوویەتی بە دڵی هەموو میللەتەکاندا ، و کردوویانەتە دوژمنێك لە ناوگەلانداو مایەی نەخۆشیە بۆ ناویان ، ، ماسۆنیەت ئەو دووپشکەیە کە چەند سەدە لەسەر یەك بەردەوام بە گەلانیەوە ئەدا لەژێر پەردەی ئازادی و یەکسانی و برایەتی دا .. ) [3] .

ماسۆنیەت هیچی تر نی یە ئەوە نەبێت شەتڵگە و بەچکەی جولەکەیە و مادامێکیش وایە کەواتە جۆرەها فێڵ و تەڵەکە ئەزانێت ، و چاك ئەزانێت چۆن گومان بەرامبەر هەموو ئایینێك دروست ئەکات و کوفرو بیّ دینی لە هەموو دنیادا بلاّودەکاتەوە ، و خەڵك بۆ گەندەڵی و بەرەلاّی و پیسی بانگ بکەن ، جولەکە مێژوویان لای هەموو کەسیّ دیارە کە چۆن لادانیان لە کتێبە خوایی یەکاندا دروست کردووە و چۆن پێغەمبەرانیان سەربڕیوە و هەموو چەپکە نورێکیان کوژاندوەتەوە و هەمیشە هەر بەدوای سەروەتدا ئەڕۆن و بەندەی ئاڵتونن و هەربەدوای (( شت شاردنەوە= احتکار )) دا ئەگەڕێن و ماڵ کەڵەکە ئەکەن لەسەر یەکتری .... هەروەها چەندان خووی تری خراپیان هەیە کە زیاتر ئەوان بەوەوە ئەناسرێن ، ئەمڕۆیش لەکەس شاراوە نی یە کە ماسۆنیەت ڕێکخراوێکی یەهودی یەو مەبەست پیّ ی

---

[1] ) بڕوانە : الماسونية وموقف الاسلام منها ، د. محمود الرجيلى ، ص٣،٤ .

[2] ) بڕوانە : اليهود الماسونيه ، عبدالرحمن الدوسري ، ص٤٢ .

[3] ) بڕوانە ((حقيقة الماسونية)) ی (محمد على)الزعبي ، ص٧٠ .

کاولکردنی جیهانە لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی و دینداری یەوە ... دەستی ژەهراویشی گەیشتوەتە هەموو بەهاو بیرو باوەڕێك و مەبەستی ئەوەیە کە تێکی بشکێنیٚ و لەناوی بەرێت ) [1].

کۆمەڵگەکانی ماسۆنیەت لە هەموو وولاٚتانی میصرو شام و تورکیا دا بلاٚوبونەوە و شەو ڕۆژ لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە دەوڵەتی عوسمانی لاواز بکەن و لەیەکی هەڵوەشێنن بە پاچە گەندەڵەکانیان کە ئاگای ماندوو بوون و پسانیان نە ئەزانی ، هەر کۆمەڵگەکەی فەڕەنسا بوو لە میصر کە وای کرد فەڕەنسا بە دڵ و بە گیان ((محمد علی)) گرتە باوەش تا سەراپای نەخشەکانی لە ڕێگەی ئەوەوە جێبەجیٚ بکات و هات سوپایەکی مەشقپێکراوی بۆ دروست کرد لەسەر تازەترین شێواز و بە تازەترین چەك پڕچەکی کرد کە لەو ڕۆژەدا هە بوو ، سولەیمان پاشای بارگە بووی بە فەڕەنسا کردە سەرپەرشتیاربۆئە وهێزە )) [2].

بەرژەوەندی یەکانی ( فەڕەنسا ) وایان بە پێویست ئەزانی کە پشتیوانی لە (محمد علی) بکەن تا ئاواتەکانی داهاتووی مسۆگەر بکات بەوەی کۆمەڵگەکانی ماسۆنیەت بپارێزێت و بەهێزیشیان بکات ، و دەوڵەتی بەرزیعوسمانی ، لاواز بکات و خەنجەرە ژەهراویەکەیشی بچەقێنێتە دڵی دەوڵەتی عوسمانی ، بۆ ئەمەیش گەلە کەشتیەکی دەریای پێشکەتوو و گەشەسەندووی بۆ دامەزراند ، لە ( دمياط ) تیشدا پاشخانێکی دەریای بۆ دانا ، و چەندان پردو بەستی خێری بۆ دامەزراندن تا کاروباری ئاودێری لە میصردا بکات ، هەموو ئەمانەش بۆ ئەوە بوو کە نەخشەی خاچپەرستەکانی پیٚ جێبەجیٚ ببێت کە پەلامارە سەربازی یەکەی فەڕەنسا نەیتوانی جێبەجیٚ ی بکات و ناچاری پاشەکشە و هاتنە دەرەوە بوو لە وولاٚتدا .

( (محمد علی)) ڕۆڵێکی گوماناوی بینی لە گواستەوەی میصردا لە ناسنامە ئیسلامی یە گشتی یەکەیەوە بۆ شتێکی تر کە لە کۆتاییدا بەوە تەواو دەبوو کە بە تەواوەتی لە بازنەی شەریعەتی خوا بچێتە دەرەوە ، ئەم ئەزموونەی ((محمد علی)) بوویە مامۆستایەك بۆ خەڵکانی دوای خۆی وەك (کمال ئەتاتورك) و(جمال عبدالناصر) ...هتد .

---

[1] ) بڕوانە : الماسونية و موقف الاسلام منها ، د. محمود الحيلي ، ص١٨ .

[2] ) بڕوانە (( واقعنا المعاصر )) ص٢٠٥ .

موسڵمانی ڕاستەقینە ناکرێ بەوەها ڕۆڵێك هەڵستێت ، ئیتر ئەو موسڵمانە هوشیار بێت یان گێل و گەمژەبێت ، چونکە ئایینەکەی ڕێگەی نادات ئاڕاستەی خۆی لە دوژمنان وەربگرێت .

دوژمنانی ئیسلام ئەیانویست دەوڵەتی عوسمانی لە ناوبەرن ، جیهانی ئیسلامی بکەنە ڕۆژئاوا یەکی تر و گرنگترین تایبەتیشیان ئەدا بە وولاّتی ئەزهەر بۆ ئەوەی لە وێوە و هەموو بیروباوەڕەکانی خۆیان بنێرنە ناوگەلە ئیسلامی یەکانی تر ، سەربارەت بە لەناوبردنی دەوڵەتی عوسمانی، ئەوە( (محمد علی)) ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە بێهێزکردنی دەوڵەت و بە فیڕۆدانی ووزەکانییدا ، و سامی نەهێلاّ لای خەڵك و حورمەتی شکاند لایان ، سەبارەت بە نزیك بوونەوەشی لە دوژمنان و سوڕانەوە لە خولگەی فیکری و ژیاری ئەواندا و پلە پلە خۆ داڕنینی پاشخانەعەقیدەیی و فیکری و ڕەوشتی یەکەی، ئەوە بە دڵنیای یەوە قۆناغێکی زۆری ڕیبوو کە هاوپەیمانەکانی لە ماسۆنی یە فەڕەنسی یەکان و بەریتانی یەکان زۆر پێیان دا هەڵدەدا و نکوڵیش ناکرێ کە دۆڕاندنی خۆی لە بەرانبەر هێرشی فیکری چێنراوی ئەواندا ڕاگەیاند و کەوتە کارکردن بە سیاسەتی شاند ناردن _ )واتە ناردنی قوتابیان بۆ ئەوروپا) تا لەوێدا فێری شت بن کە ئەمە یەکێك بوو لە شتە ترسناکەکان کە بوونە پەنجەرەیەك و لە ئەوانەوە ئاڕاستەی (( عەلمانی )) ئەهاتە ناوەوە و سەرتا هاتە گۆڕەپانی خوێندنەوە و پاشان هاتە ناو گۆڕەپانی هەمووو ژیانەوە لە میصری ئیسلامیدا ، و ((محمد علی)) ئەزهەر و شێخەکان و زانایانی پشت گوێ خست و هەر گرنگی بەوە ئەدا منالّە ووردکری زۆری ئەنارد بۆ ئەوروپا کە هەموو لە تەمەنی (( مێردمنالّیدا )) بوون و شتی وایان پێ نە بوو بۆئەوەی ڕۆبچن بۆ گوناهو تاوان و گومان و دوو دڵی کاریان تێ بکات و بگەڕێنەوە و ببنە ئەو سەرەڕمەی کە لە ڕۆژئاواوە ئاڕاستەی بۆ دانرابێت ، ڕاستە لەگەڵ هەموو شاندێکدا مەلایەکیان ئەنارد بۆ ئەوەی نوێژیان بۆ بکات ، بەلاّم ئەم مەلایانە چیان کرد ؟ ((رفاعە رافع الطهطاوی )) یەکێك بوو لەو مەلایانە ، کەچی کە گەڕایەوە ئەویش یەکێك بوو لەوانە بانگەشەی بۆ (( غەربزەدەیی))[1] ئەکرد ، تەنانەت کاتێك کە خزم و کەس و

---

[1] ) ووشەی غەربزەدەیی لەجیاتی (( التغریب )) ی عەرەبی بەکارهاتووە و مەبەست پێ ی گواستنەوەی بەها و بیروباوەڕو نەریتی ڕۆژئاوایە بۆ ناو دونیای موسڵمانان ( وەرگێر:ن) .

کارەکەی چوونە پێشوازیکردنی کە لە فەڕەنسا گەڕایەوە و خۆشی و شادی یان دەربڕی بە هاتنەوەی پاش چەند ساڵ غەریبایەتی ، ناوچاویان لێ ئەدا بەیەکدا و وا باسیان ئەکات گوایە ئەوان خەڵکانێکی عەشایەر و جوتیارن و شایانی ئەوە نیین ڕێزی پێشوازی کەریان پێ ببڕێت بۆ کەسێکی وەك ئەم !! [1]

ئەوە بوو لە پاشاندا کتێبێکی نوسی و تێیدا باسی هەواڵەکانی ( پاریس ) ئەکات و خەڵکی بۆ ئەوە بانگ ئەکات کە حیجاب فڕێ بدەن و ژن و پیاو تێکەڵی یەك ببن و باسی ئەوەیش ئەکات هیچ شورەیی یەك نی یە لە سەماکردندا و سەماکردنیش تەنیا کۆمەڵێك مەشقی وەرزشی یە لەسەر ئاوازێکی موسیقی و ڕاست نی یە وەك کارێکی ناشیرین و حەرام سەیر بکرێت [2].

پرۆسەی لەسەرخۆ بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشتن نزیکەی سەدەیەکی خایاند ، بەڵام پرۆسەیەکی بەردەوام بوو ، نەئەوەستا و هەمیشەش بازنەی پرۆسەکەی بەرەو فراوانی ئەبرا [3].

( (محمد علی)) ڕێوی یەکی فێڵباز بوو ، هەموو خەیاڵی هەر لای خۆی و منداڵەکانی بوو بۆ دوای خۆی ، بۆیە کۆمەڵێ کاری ناشایستە و خراپی زۆری کرد بۆ بهێزکردنی میللەتی ئیسلامی و چزی نەهێلاو تەواوی نەخشەکانی فەڕەنسا و بەریتانیای جێبەجێ کرد ، زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کە لە چاوی ڕۆژئاوادا جوان بنوێنێ و خەڵك بە دوایدا بڕۆن لە نوێخوازیدا ، تەنانەت بیرکردنەوەیشی وەك دەربارەی خۆی ئەڵێ (( بەعەقڵێکی فەرەنگیانەوە بیر ئەکاتەوە لە کاتێکدا کە کڵاوێکی عوسمانی لەسەردایە )) [4].

(محمد علی) لەبری فەڕەنسا و بەریتانیا و نەمسا و ڕوسیا و هەموو دەوڵەت ئەوروپی یەکانی تریش کاری ئەوە بوو کە چەند گورزێکی کاریگەر و تاقەتپڕوکێن بسرەوێنێتە (( ئاڕاستەی ئیسلامی )) لە ناو خەڵکدا لە میصر و دوورگەی عەرەبی و شام و خیلافەتی

---

[1] ) بڕوانە : واقعنا المعاصر ص٢٠٩ .
[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢٠٩ .
[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل ٢١٠ .
[4] ) تجربة (محمد علی) الکبیر ، منیر شفیق ، ص٣٨ .

عوسمانی دا ، ئەو هەولانەی ئەو زەمینەی خۆش کرد بۆ ئەوەی ڕۆژئاوا چاو ببڕێنە جیهانی ئیسلامی .

**پێنجەم** / ( محمد علی )و لێدانی ئیسلام لە میصردا :

پاش ئەوەی (محمد علی) سەرکەوتنی بەدەست هێنا لەوەدا کە جێگەی خۆی قایم کرد لە دەسەلاتدا و پەرژینێکی بەدەوری خۆیدا دروست کرد لە هاوڕاو یاریدەدەران لە خەلکی نەصارای ئەرۆمی و ئەرمەنی و چەند نوسەرێکی قبطی و جولەکە . ، چەندان مەمالیکی هێنا و کردنیە کاربەدەست لە هەرێمەکاندا ، هەموو ئەمانەشی کۆمەلانی خەلکی لە موسلمانانی میصر بێزار ئەکرد و مانای ئەوەی تێدا بوو کە گرنگی یان پێنادات و گوێیان ناداتیٚ ، بەتایبەت ئەو یاریدەدەرانە لە سیاسەتی چەوساندنەوەی جوتیاراندا زۆر کۆمەکیان ئەکرد ، ( جەبرەتی ) ئەمە سیاسەتە بەم شێوەیە وەسف ئەکات (( دەرگای خستە سەر پشت بۆ ئەرمەنەکان و ڕۆمیەکان(*)و بوونە سەردارو خەلکە هیچەکانی خۆیان بەرزکردەوە و (محمد علی) یش ئەوەندە حەزی لەدەسەلات و زۆرداری بوو وای لێهاتبوو خۆشی لە هیچ کەسێك نەئەهات کە ڕکەبەرایەتی بکات )) [1].

(محمد علی) و ناموسلمانە شوێنکەوتوەکانی سیاسەتێکیان پیادە ئەکرد کە کورتەکە بریتی بوو لە ستەمکاری و داپلۆساندن و بە کۆیلە کردنی هەموو گەلانی میصری ، هەموو جوتیارو خاوەن زەوی یەکانی میصری کۆکردەوە و بەبیٚ کریٚ کاری پیٚ ئەکردن ، یان ئەبوو لە بری ئەوە با جێك بدەن ، یاساغی کرد لەسەریان کە ئیش بۆ خۆیان بکەن و نانی دەستی خۆیان بخۆن ، بازرگانی هەلوەشاندەوە و نرخی بژێوی خەلکی زۆر گران کرد ئەوەندەی باج خستە سەر خەلکی بۆیان هەلنە ئەسوڕا ، و هەرچی چالاکی ئابوری هەیە گریٚ ی دا بەخۆیەوە و بووە نەگبەتی بەسەر خەلکەوە [2] ، (( جەبرەتی )) ئەو هەلسوکەوتەی (محمد علی) ئەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی کە (( نەخۆشی ڕژدی و چاوبرسێتی و چاو بڕینە مولك و مالی خەلك، ئەو سیفەتانە بوون کە ڕەنگیان دا بوویەوە تێیدا )) [3].

---

[1]) بڕوانە : عجائب الآثار (٤/١٥٠ ) .

[2]) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثمانيين ، ص١٧٩ .

[3]) بڕوانە : عجائب الآثار (٤/١٥٠ ٩ ) .

ئەم سیاسەتە داپڵۆساندنە ڕقێکی زۆری لەجوتیاراندا دروست کرد بەرامبەر (محمد علی) و هاوکارانی و کەوتنە هەڵاهاتن لە زەوی یە کوشتوکاڵیەکانیان و بە جێ هێڵانی گوندەکانیان لە تاو سیاسەتی پڕ لە ستەمیان ، و بە هیچ شێوەیەکیش بەشداریان لە ناو سوپاکەیدا نە ئەکرد ، ژمارەی ئەو جوتیارانەی لە ماوەی ساڵێکدا ( واتە لە ( ١٨٣١ ز ) دا هەڵاتن گەیشتە شەش هەزار جوتیار [1] .

لە شارەکانیشدا بەتایبەتی لە قاهیرەدا ( جەبرەتی ) باسی ئەو ئەکات کە کاتێك (محمد علی) داوای لە خەڵك کرد کە شارەکان نەوژەن بکرێتەوە ( ((دە )) شتی خراپی تر کەوتە سەر خەڵك کە ئەمانەن : کار کردن بەبێ کرێ ، خزمەتکاری ، کرێ دەستی ، زەلیلی ، سوکایەتی پێکردن ، جل دڕین ، پارەدان ، دوژمن دڵخۆش کردن ، بڕینی بژێوی ، کرێ ی گەرماو ) [2] .

(جەبرەتی) هاوچەرخ بووە لەگەڵ ئەو سیاسەتە ستەمکاری یەی کە (محمد علی) بەسەر گەلی موسڵمانی میصردا سەپاندوویەتی ، کە هەموو خێرو بێرومافەکانی مژیبوون و دەرگای وڵاتی بۆ بازرگانە ئەوروپیەکان خستبوە سەرپشت، تابێتە میصر و دەست بگرن بەسەر ئابوری ووڵاتدا ، و وای لێ هات میصر بوویە ئەو کێڵگەیەی کە بازاڕەکانی ئەوروپا پشتیان پێ ئەبەست بۆ هەموو بەرهەمێکی کشتوکاڵی ، میصرو ئەوروپا بەیەکەوە بەسترانەوە لە ڕووی بازرگانی و لە ڕووی شارستانیەتەوە ، میصر وای لێ هات ئەو توێژە بازرگانە تازە پێگەیشتوەی هەبوو هەموو پشتیان بە تەواوی بەستبوو بە ئەوروپا لە هەردوو بواری ئابوری و سیاسەتیشدا ، ئەمە سەرەڕای ئەوەی بانگخوازانی ڕۆشنبیری ئەوروپا بەچاکی دەستیان گرتبوو بەسەر ژیانی فیکری دا بەتایبەتی دوای ئەوەی کە بانگخوازانی ڕەوتە ئیسلامیەکە ئیفلیج بوو بوون [3] . ، (محمد علی) بەرنامەکانی خوێندنی ڕاگرت ئەو بەرنامانەی کە لەسەر ئایین ڕاوەستا بوون ، بۆ ئەوەی سیاسەتە ماسۆنیەتەکەی ناپلیۆن پیادە بکات ، ئەم کارە مێژوونوسی ئینگلیزی (( ئارنوڵد توینبی ))یش دووپاتی ئەکاتەوە بەو قسەیەی کە ئەڵێ ((

---

[1] ) بڕوانە : تأريخ الشرق العربي ، د. عمر عبدالعزيز ، ص٣٤٦ .

[2] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص١٨٠ .

[3] ) بڕوانە : تاريخ الشرق العربي ، د . عمر عبدالزيز ، ص٣٢٢ ، ٣٢٣ لە (( قراءة جديدة )) وەری گرتووە .

(محمد علی) کابرایەکی دیکتاتۆر بوو ، بەتاك ڕەوی خۆی توانی هەموو بیروڕاکانی ناپلیۆن بکاتە چەند ڕاستیەکی کاریگەر لەمیصردا )) [1] .

ئیمپریالیزمی ئەوروپی ئامانجەکانی خۆی هێنایە دی بەوەی سوودی زۆری وەرگرت لە و دامەزراوە و چاکسازی یە ماددیانەی کە (محمد علی) دەسکەلایان بەرپای کردن ، بەلاَم گەلی موسلْمانی میصر بێئومێدی باڵی کێشا" بو بەسەریدا و ئەوەندە باجی گەورەی دا کە زۆر لەو چاکسازی یانە گەورەتر بوون ئەویش ئەوە بوو کە ناسنامە شارستانیەکەی لەدەست داو ئەو ناسنامەیەی کە ئیسلام ڕەنگ و ژیواری پێوە نەهێلاَ بوو ، بویە هۆی ئەوەی کە بە درێژایی سەردەمە ئیسلامی یەکان ڕۆلْی تایبەتی و بەرچاوی هەبێت [2] .

دەرگای (بیری ناسیۆلیزمی و نیشتمانی) لە خەلْك کردەوە و دەستی دایە سیاسەتی بەرتەسك کردنەوە لە ڕووی هەلْگرانی بیری ئیسلامی لە زانا و مەلاکان ، ئەم ئاڕاستەیە تەریب بوو لەگەلْ ئەو هەولاَنەیدا کە ئەیدا بۆ سەربەخۆیی میصر و پاشان پچڕاندنی لەدەولْەتی خیلافەتی ئیسلامی [3] . کۆڕەکانی ماسۆنیەت کە ئەم ئاڕەستەیان وا دا ئەنا لە کرۆکی ئەنجامەکانی ئەوانە ، هاوکاری و کۆمەکییەکی زۆریان کرد .

دیارترین کەسێك کە هاوکاری ئەم ئاڕاستەیەی کرد (شێخ حسن العطار) بوو لە سالْی ( ٧٧٦ك _ ١٨٣٥ ز) کە بەلْگەکان ئامارژە بۆ ئەوە ئەکەن ئەم شێخە ئەندامێکی کۆڕی ماسۆنیەتی میصری بووە ، (( عطار )) وای ئەبینی کەئە بێ میصر (( حالْەتەکانی گۆڕانکاری بەسەردا بێت و هەندێ زانستی تێیدا تازە بکرێتەوە کە تا ئێستا تێیدا نە بووە )) ، مەبەستیش لەم ئاڕاستەیە ئەوە بوو کە بەتەواوەتی ڕووبکرێتە ڕۆشنبیری ئەوروپی بەتایبەتی دوای ئەوەی بە قەناعەتی ئەو مەلا و زانایان دەستەوسان وەستا وون لە وەی کە وەك موسلْمانە پێشینەکان بەردەوام لە هەولْداندا بن ) [4] .

(( رفاعة طهطاوی )) (١٨٠١ _ ١٨٧٣ ز ) کە قوتابی ( عطار ) بوو بە شوێن مامۆستاکەیدا ئەڕۆیی ، (محمد علی) پێنج سالْ وەك شاند ناردیە فەڕەنسا ( واتە لە ( ١٨٢٦

---

1 ) بڕوانە : ئارنولْد توینبي / عبدالرحمن الجبرتی و عصرة ، ص١٤ .

2 ) بڕوانە : قراءة جدیدة في التأریخ العثمانی ، ص١٨٢ .

3 ) بڕوانە : مصر في مطلع القرن التاسع عشر ، محمد فؤاد (١٢٣٢/٣ ) .

4 ) بڕوانە : التیارات الساسیة بین المجددین والمحافظین ، بیومي ، ص٢ .

) ەوە تا ١٨٣١ز ) گەڕایەوە بۆ ئەوەی بیرۆکەی ( نیشتمان پەروەری و بیرۆکەکانی تری کۆمەڵایەتی برەو پێ بدات ، ئەو بیرۆکانەی کە لە فەرەنسا دا باویان بوو کە لەگەڵ بارو دۆخی ئەو کۆمەڵگایە نە ئەگونجا کە پەیوەند بوون بە بیری ئیسلامی یەوە ، ئەم بیروڕایانەی (طهطاوی) لە زۆرێك لەو هۆنراوانەدا دەرئەکەون کە دای ئەنان ، یان لەو کتێبانەدا کە وەری ئەگێڕان لە کاتێکدا کە کرابوویە سەرپەرشتیاری قوتابخانەی زمانەکان [1] ، ئەم( طهطاوی) یە کاریگەری تەوژمە فیکری یەکانی ئەورووپا لە ئەم پەڕی ڕاستەوە بۆ ئەو پەڕی چەپ لەسەری چەند بەرامبەر بوو لە چاو کاریگەری بیری ئیسلامی لەسەری ، وای لێهاتبوو لە زۆربەی لایەنەکانی فیکرو قۆناغەکانی ژیانیدا سەرسامی خۆی دەرئەبڕی بەرامبەر بە بیری (( ئازادی )) و (( یەکسانی )) و(( پشت بەستن بە عەقڵ )) ، کاری لەسەر ئەوانە ئەکرد کە ناپلیۆن لە پەلامارە بە ناوبانگەکەیدا بانگەشەی بۆ ئەکرد ، طهطاوی کاریگەری خۆی نە شاردوەتەوە بە بیروڕاکانی ( مونتسکیو ) و تێربوونی بە بیری ماسۆنیەت .

خەڵکێکی زۆر بە شوێن (طهطاوی) دا ڕۆیشتن و بانگەشە یان بۆ نیشتمان پەروەری ئەکرد ، باسی ئەوەیان ئەکرد کە پێویستە بەتەواوەتی ڕووبکرێتە شارستانێتی ڕۆژئاوا ، لەوانە ( علی مبارك ) و ( ابراهیم ادهم ) و ( صالح مجدی ) و ( محمد عثمان جلال ) و ( عبدالله ابو السعود ) عبداللەفکری و خەڵکی تریش ، ئەمانە هەموویان هێرشێکی بەردەوامیان ئەکردە سەر تەوژمی ئیسلامی لە هەموو ڕوویەکەوە [2].

**شەشەم** / بزوتنەوەی( شێخ محمد عبدالوهاب ) و ململانێ ی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا :

سەرەتایەك :

شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب کوڕی سلیمان کوڕی علی کوڕی محمد کوڕی احمد کوڕی ڕاشدی تەمیمی لە ساڵی ( ١١١٥ك _ ١٧٠٣ . ) لە شاری ( العینیة )لەدایك بووە کە ئەکەوێتە باکوری ( ریاض ) ەوە و هەفتا کیلۆمەتر لێوەی دوورە یان نزیك بە ماوەیەك لەلای خۆرئاوا ،[3].

---

[1]) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٣ .

[2]) بڕوانە : قراءة جدیدةفي التأریخ العثمانیین ، ص١٨٤ .

[3]) بڕوانە : امام التوحید محمد بن عبد الوهب ، احمد القطان ، ص٣٥ .

( شێخ محمد) هەر لەم ناڵیەوە حەزی لە زانیاری ئەکرد و بە و مناڵیە بە شوێنیدا ئەگەڕا و بلیمەتی و لێهاتووی پێوە دەرکەوت و توانی هەموو قورئانی پیرۆز لەبەر بکات و (( فقهی حەنبەلی )) و تەفسیرو فەرمودە بخوێنێت ، سەردەمی قوتابیەتی لەگەڵ کتێبەکانی( ئیبن تەیمیەد)ا بەسەر برد چ لە بواری فقهدا چ لە بوارەکانی ( عقائید ) و ( بیروڕا ) دا و ئەوەندە سەرسام بوو بۆ( ئیبن تەیمیە) هەر مەپرسە ، کاریگەری کتێبەکانی (( ئینولقەییم )) و (( ئبن عوروەی حەنبەلی )) و جگە لە وانیش لەسەردروست بوو لە زانایانی ئەم سەرچاوە سەلەفی یە... [1].

بۆ وەرگرتنی زانیاری" کۆچی کرد بۆمەککە و مەدینە و بەصرەو ئەحساء و لە عێراقدا توشی تاقی کردنەوەی زۆر بوو کاتێك کە بیروڕاکانی خۆی باس ئەکرد لە ناو خەڵکیدا، و ئەوە بوو گەڕایەوە بۆ ( نجد ) .

کە گەڕایەوە بۆ ( حریملاء ) لە وولاتی ( نجد ) دا دەستی دایە بانگەشەکردنەکەی و فەرمانی بە چاکە ئەکردوو بەرگری لە خراپە ئەکرد و سەرقاڵ بوو بە زانیاری و خەڵك فێرکردن و ، بانگەشە کردن بۆ یەکتاپەرستی بێ لەکە وخەڵك ترساندن لە ( شیرك ) و ترسناکیەکانی و جۆرەکانی و شێوەکانی ، هەندێ لە نەفامەکانی ( حریملاء ) هەوڵی تیرۆرکردنیانی دا و پێوە نە بوو ، پاش ئەوە گەڕایەوە ( العینیة ) ی زێدی خۆیی و میری ئەوێ زۆر بە خێرهاتنەوەی کردو و هانی زۆری دا لەسەر بانگەواز کردن بەردەوام بێت ، ئەویش دەستی دایە بەرپاکردنی شەریعەت و جێبەجێکردنی سزاکان ( حدود ) ، و ڕوخاندنی گومەزی سەرقەبرەکان ... لە ( حریملاء ) دا زۆر بەردەوامی نە بوو بەهۆی ئەو فشارەی کە میری ( احساء ) هێنای بۆ میری ( حریملاء ) بۆ ئەوەی شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب بکوژرێت ، بۆیە شێخ بەپێ خۆی گەیاندە ( درعیه ) .

**هاوپەیمانی بەستن لەگەڵ ( محمد بن سعود ) دا :**

محمد کوڕی عبدالوهاب توانی لەگەڵ (میر محمد بن سعود)دا هاوپەیمانی ببەستێت ئەو (( سعود )) ەی کە بە پارەو بە پیاو لە پێناو بانگەوازی یەکتاپەرستیدا رایدا بوویە مەیدان ، ئەم هاوپەیمانێتە لەسەر بناغەیەکی پتەو دامەزرا بوو ، شێخ توانی بانگەوازەکەی بگەیەنێتە هەموو خەڵکی لە ڕێگەی دەرس ووتنەوە و پەیام نوسین و ئامۆژگاری کردنی خەڵکی یەوە ،

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٣٦ .

لەسەر ئەم حاڵەتە بەردەوام بوو ، خەڵکی فێر ئەکردوو پەیامی ئەنوسی و سەرەتاکانی ئەو پەیامانەی ئەئاخنی بە بەڵگەو ئایەت و حەدیس لەسەر ڕاستی بانگەوازەکەی ، خەڵکی بۆ ئەوە بانگ ئەکرد کە بەرگری لە خراپە بکەن و گومەزی و قسنی سەر قەبرەکان بڕوخێنن و دەرگاکانی ( شیرك ) دابخەن و تەنیا و بە تەنیا ببنە عەبدی خوا [١].

ئەم بانگەوازە بە ئاشتی و لەسەر خۆ ئەیدا لە دەرگای دڵەکان و لێیان ئەوەستا تا وەڵامیان ئەدایەوە ، بە ( حیکمەت ) و ( ئامۆژگاری باش ) خەڵکی بانگ ئەکرد و بەردەوام خەریکی فێرکردنی ئەوانە بوو کە ئامادەی دەرسەکانی ئە بوون و سنورەکانی عەقیدەی بۆ ڕۆشن ئەکردنەوە و بنەماکانی بانگەوازی بۆ دوورو نزیك ڕاڤە ئەکرد ، بەلاّم سەیری کرد هەندێ خەڵك بەرامبەر ئەم نەرمیەی ئەم توندن و بەرامبەر ئەم ڕاستگۆیی یەی ئەو درۆزنن و بەرانبەر ئەم ئامۆژگاری یە باشانەی ئەو پیلان ئەگێڕن ، بۆیە چار نەما ئەوە نەبێت کە قۆناغی جیهادکردن ڕاگەیەنێت و بڕیاربدات کە خراپە بە هێزی بازوو ڕابماڵێت

اذا لم يكن غير الأسنة مركبا

في حيلة المظطر الا ركوبها [٢].

واتە کە جگە لە شمشێر ڕێگەیەکی ترت نەما (کەسی ناچار) چارەیەکی تری نی یە ئەوە نەبێت ئەوڕێگەیە بگرێتە بەر.

(شێخ) بە هاوکاری (میر محمد بن سعود) دەستی دایە سازکردنی کەرەسەی ئەو جیهادە و ئامادەکردنی ( پیاو ) و ( چەك ) تا بە ژمارەیەکی زۆری موجاهیدەوە لە ((درعيه )) بچنە دەرو ئەم بانگەوازە بلاّو بکەنەوە و کۆڵەکەکانی لە دوورگەی عەرەبی و دەرەوەی دوورگەشدا دا بکەوتن ،( شێخ) خۆی سەرپەرشتی ئەم ئامادەکاریەی پیاوانی ئەکرد و خۆی سوپای ڕێك ئەخست و مەفرەزەکانی بە مەلاولادا ئەنارد ، لەگەڵ ئەمانەیشدا بەردەوام دەرسی ئەوتەوە و نامەی بۆ خەڵکی ئەنارد و پێشوازی لە میوانان و خوا حافیزی لە شاندەکان ئەکرد ، خوای گەورە زانیاری و پلەپایەی بۆ یەکخستبوو وەك چۆن سەربەرزی و دەسەلاّتی

---

[1]) بڕوانە : امام التوحيد الشێخ محمد بن عبد الوهاب ، ص٤٥_٤٦ .

[2]) بڕوانە : استمرارية الدعوة ، محمد السيد الوكيل (١٩٣/٣ ) .

بۆ یەکخستبوو پاش جیهادێکی دوورودرێژ [١] . ..( محمد کوڕی عبدالوهاب )پیاوێکی سیاسی و بیر تیژ بوو ، خاوەن ئەزمونێکی فراوان بوو لە مەسەلەکانی ( شەڕ ) و ( سیاسەت ) دا [٢].

شەر لە نێوان هەوادارانی ئەم بانگەوازە و دوژمنەکانیدا چەند ساڵی خایاند و زۆربەی جارەکانیش سەرکەوتوون ئەبوو بە هاوڕێ و هەوادارى ئەم بانگەوازە و لادێ دوای لادێ ئازادئەکراو لە ساڵی ( ١١٧٨ ك _ ١٧٧٣ ز ) دا ریاض ئازاد کرا بەرابەرایەتی (میر عبدالعزیزی کوڕی محمدی کوڕی سعود) و فەرمانڕەوا پێشوەکەی کە ناوی ( دهام کوڕی دەواس ) بووو رای کرد ، کە فەرمانڕەوایەکی ستەمکارو دەگیرکەر بوو ، چەند جار هەڵی ئەکوتا یە سەر بانگخوازان و ئەو پەیمانانەی ئەشکاند کە لەگەڵ ڕێبەرانی ئەو بانگەوازە دا ئەیبەستن ، پاش ئازادکردنی (( ریاض )) سەرزەمینی ئەم بانگەوازە زۆر فراوان بوو ، خەڵکێکی زۆر بەویستی خۆیان هاتنە ناو بازنەی بانگەوازەکەوە و هەموو ئەوڕێگرانەی کە لەبەردەم خەڵکیدا بوون نەماو کاروبارەکان گوشادی ڕووی تێ کردن و دوای سەختی ئاسانی هات و پارە زۆر بوو ، بارودۆخەکان هێور بوونەوە و خەڵکی لە ژێرسێبەری ئەم دەوڵەتە ئیسلامیە ساوایەدا هەستیان بە ئارامی کرد کە ماوەیەکی زۆر بوو لەو بەهرەیە بێ بەش بوو بوون، [٣] .

پاش مردنی( محمدی کوڕی عبدالوهاب) بانگەوازەکە هەر بەردەوام بوو لە ڕێکردن و( ئالی سعود) بە هەموو هێزی و دەسەڵاتیانەوە پشتیوانیان لێ ئەکرد ، و بەرەو حیجازیان کردەوە ، کە ئەوکاتە ( شەریف غالب بن مساعد ) دەسەڵاتی بەسەریدا هە بوو ، ئەم شەریفە دەستی کردە هێرش بردن بۆ (( سعودییەکان )) لە ڕووە ئایینی و لە ڕووی سەربازیشەوە ئەم ململانی یەی نێوانیان درێژەی کێشا تا ساڵی ( ١٨٠٣ ) ز ئەو ساڵەی کە سعودیەکان چوونە ناو مەککەوە بەبێ ئەوەی هیچ بەرگری یەك بێتە ڕێگایان لە لایەن ( شەریف غالب ) ەوە کە هەڵاتنی بەرەو ( جدە )بەباشترزانی، و پاش دوو ساڵ سعودیەکان( مەدینە)یشیان دایە دەم سنوری دەسەڵاتەکەیان [٤].

---

[1] ) بڕوانە : امام التوحید محمد بن عبدالوهاب ، ص٥٣ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٧٨.

[3] ) بڕوانە : استمرارية الدعوة ، د. محمد الوكيل ، ( ٢٩٤/٣ ) .

[4] ) بڕوانە : العالم العربي في التأريخ الحديث ، ص ١٧.

دەسـەڵاتی بزوتنـەوەی سـەلەفی بـاڵی کێـشا بەسـەر زۆربـەی دوورگـەی عەرەبییـدا و بەریتنانیا هەستی بە مەترسی ئەم دەسەڵاتە بۆ سەر بەرژەوەندی یەکانی کرد ، دەوڵـەتی سعودی یەکەم وای لیَ هات باڵی کێشا بەسەر کەنداوی عەرەبی و دەریای سوردا و ( قواسم ) کەوتە ژێر دەستیان و دەسەڵاتیان بەرەو خواروی عێراقیش کشا ، کار گەیشتە ئەوەی کە لە ڕیَ ی وشکانیەوە کاریگەریشیان لەسەر ئەوروپا و ڕۆژهەلاّت دروست کرد لەسەرو ئەمە و ئەوەشەوە ، ئەو بنەما ئایینی یانەی کە ئەم دەوڵەتە پشتی پیَ ئەبەستێت ڕێگە بە ئەو گریمانە نادات کە بەریتانیا بتوانیَ دەستەمۆی بکات یان پەیماننامەی لەگەڵدا ببەستێت چونکە یەکێك لە گرنگترین ئامانجەکانی ئەم دەوڵەتە دژایەتی کردنی دەسەڵاتی بێگانە یە لە ناوچـەکەدا [1] ، ( قواسم ) ەکـان و لـە پـشتیانەوەش هێـزی سـعودیەکان توانیـان گـورزێکی کوشندە بسرەوێننە گەلەکەشتی ئینگلیز لە ساڵیی ( ١٨٠٦ ز) وای لیَ هات ئاوی کەندا و کەوتە ژێر دەسەڵاتیان [2] .

لەسەردەمی سعودی کوڕی عبدالعزیز ئەم دەوڵەتە گەیشتە لوتکەی دەسەڵاتی لە بوارە سیاسی یەکەیدا ، ئەوە بوو لە عێراقدا تا ( کربلاء ) ڕۆیشت و لە وولاّتی شام دا ( حوران ) و دوورگەی عەرەبی بەگشتی کەوتە ژێردەستی ( یەمەن ) نەبێت [3] .

**دووەم / پیلان دژی بزوتنەوەی( شێخ محمد بن عبدالوهاب ) :**

شەیتانەکانی مرۆڤ لە ڕۆڵەکانی ئەوروپا کەوتنە بیرکردنـەوە لـەو ئەنجامـەی ئـەم دەوڵـەتی یەکەمی سعودیەی پیَ ئەگات ئەگەر بەردەوام بێت لە دەسەڵاتدا ، وایان ئەبینی بەدڵنیای یـەوە بەرژەوەنـدی یـەکانی ئـەمان لـە ڕۆژهەلاّتـدا لـە نـاو ئـەبات ، بۆیـە ئـەبێت ئـەم دەوڵەتـە بڕوخێنێرێت ، لەبەر ئەوە هـەموو ڕێگەیـەکیان گرتەبەر بۆ لـەناوبردنی دەسـەڵاتی بانگەوازی سەلەفیەکان لەوانە :

١- هاندانی ڕای گشتی لە ناو وولاّتە ئیسلامیەکاندا دژ بە بانگەوازی( شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب ) ئەوانەی کە بڕوایان بە بیدعە و ئەفسانە هە بوو وە وایان ئەزانی کە ئەوانە لە ئایینی ئیسلامدا هەیە بۆیە دژ بە (شێخ )وەستانەوە و دستیان کردە بەرگری کردنی ، ئەم

---

[1] ) بڕوانە : قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين، ص١٥٦ .

[2] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٥٦ .

[3] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي ، ص٩٤ .

بەرگری کردنە تەنیا لەلایەکی دیاری کراوە وە نە بوو بەڵکوو لە هەموو لایەك و لە هەموو لایەنێکەوە بوو ، لە لایەن ئەو شێخانەوە بوو کە دەستیان بەو دەسەڵاتەیانەوە گرتبوو کە خەڵکی نەخوێندەوار و نەزان بۆیان دروست کرد بوون ، گومانیشیان وا بوو ئەو بیدعە و ئەفسانەی ئەوانی لەسەر بوو دینە و پێویستە بیپارێزن، هەروەها لەلایەن خزمەتکارانی گۆڕستانەکانەوە بەرگری ئەکران و لەلایەن ئەوانەوە کە سودی زۆریان دەست ئەکەوت لەو سندوقانەوە کە پارەی نەزریان تێئەخرا ، لەلایەن ئەوانەوە کە لەسەر ئەو خواردن و پارەیە ئەژیان کەلە کاتی سێ ڕۆژە و چلە گیرانی مردووەکاندا دەستیان ئەکەوت کە خزم و کەس و کاریان ئەهاتنە سەردانی قەبرەکانیان ، لەوانەشەوە بەرگری ئەکران کە ڕایان وابوو (شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) ئایینێکی تازەی هێناوە ئەمان ئاشنانین پێ ی و ئەمانەش لە هەموو ناوچەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا و بەڵکوو لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا هە بوون، ئەمانە هەمووی لە کاتێکدا ڕوویان دا کە ئینگلیزەکان و فەڕەنسی یەکان و دوژمنانی ئیسلام توانیان بە چەند زانایەکی خراپ فەتوای ئە وە دەربکەن بانگەوازی( محمدی کوڕی عبدلوهاب) و شوێنکەوتەکانی بانگەوازێکی گەندەڵوخراپە .[1]

٢- تێکدانی نێوان بزوتنەوەی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب و سەرکردایەتی دەوڵەتی عوسمانی و فیتنەیی کردن لە نێوانیاندا ، ئینگلیز و فەڕەنیسیەکان و جگەلەوانیش سوڵتان محمودی دووەمیان تۆقاند لەم بزوتنەوەیە وایان تێگەیاند کە بزوتنەوەی( شێخ محمدی کوڕی) عبدالوهاب ئامانجی ئەوەیە کە لە دەوڵەتی عوسمانی جیابێتەوە و( دوورگەی عەرەبی ) بکاتە وولاتێکی سەربەخۆ ، و پاشان جیهانی عەرەبی یەك بخاتەوە ، و پەرچەمی ( خیلافەت ) و سەرکردایەتی لە دەوڵەتی عوسمانی بسێنێتەوە و خیلافەتێکی عەرەبی دروست بکات ، سوڵتان محمودی دووەمیش چووە ژێر کاریگەری ئەم پروپاگەندانەی دوژمنان کە نە ئەبوو وای بکردایە و بەڵکوو ئە بوو بەگومانەوە سەیری ئەم دڵسۆزی نواندنە درۆزنانەی بکردایە و چەند کەسێکی دەستپاکی دەوڵەتی بناردایە و ئەوان لەمەسەلەکە بکۆڵنیاتەوە ، بەڵێ سوڵتانی موسڵمانان سەرنجی بۆ ترسناکی ئەو خۆش بڕوایی یەی نەکرد کە هەواڵێکی دروستکراوی وا بدرێتە پاڵ بزاڤێکی ئیسلامی ڕاستەقینە و وەڵامی

---

[1]) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهدي ، ص٩٤ .

پێشنیارەکانی دوژمنانی دایەوە بەوەی پێویستە ئەو بزوتنەوەیە لەناو ببرێت پێش ئەوەی گەورە ببێت و خەرجییەکی زۆر لەڕووی پارەو پیاوەوە بخاتە سەر دەوڵەتی عوسمانی [1] .

دەوڵەتی عوسمانی نەخشەی شەڕکردنی لەگەڵ دەوڵەتی یەکەمی سعودیەدا داڕێژا و وای ئەبینی مە ئەم کارە بەو ( والی ) یانە بسپێرێت کە هەرێمەکانیان هاوسێن لەگەڵیدا ، ئەمەیش بۆ دوو مەبەست بوو:

یەکەم / ڕێگرتن لە فراوانبونی سعودیەکان لە ڕۆژهەلاتی عەرەبییەوە ،

دووەم / لاوازکردنی ئەو والی یانە و خوێنڕێژی کردنی سەرچاوەکانیان تا بەو بهێزی یە بمێنێتەوە و بەتەواوەتی ملکەچ بن بۆ دەوڵەت ، سەرەتا ڕوویان کردە (( والی )) بغداد ، چونکە نزیکترین والی بوو لە ( نجد ) ەوە ، بەلاّم ئەم والی یە سەرقاڵ بووبە بشێوی یە ناوخۆی یەکانی خۆیەوە و سوپاکەشی ئەوەندە بێهێز بوو توانای ڕووبەڕووبوونەوەی نە بوو لەگەڵ سعودیەکاندا و چەند جاریش تێ شکا بوو لە بەردەم هەڵمەتهێنانیاندا بۆ سنورەکانی عێراق ، دوای ئەم ڕوەیان کردە والی شام بەڵکوو ئەم لەو کارەدا سەرکەوتوو بێت کە والی عێراق تێیدا سەرکەوتوو نە بوو ، کەچی ئەم لە هاوڕێکەی خراپ تر تێك شکا ، کە دەوڵەت بی ئومێد بوو لە توانای والی یەکانی ( بغداد ) و ( شام ) [2] ، ڕووی وەرچەرخاند بەرەو میصر و لە ساڵی ( ١٨٠٧ ز ) دا داوای لە (محمد علی) والی ئەوێ کرد کە پەلاماری وولاّتی عەرەبی بدات و مەککە و مەدینەی پیرۆز پاك بکاتەوە و لە ژێر چنگی سعودیەکان دەری بهێنێت ، و دەسەلاّتی دەوڵەت بگێڕێتەوە کە خەریك بوو لە دوورگەی عەرەبی دا هەر نە ئەما ، بەلاّم (محمد علی) لە ساڵی ( ١٨١١ ز ) دا ئەم داوایەی قبوڵ کرد پاش ئەوەی خۆی ڕزگار کرد لە( بەگەکانی مەمالیك ) بەکارەساتەخوێناویەکەی قەلاّ (مزبحة ) دا .

شوینەکەوتەکانی بانگەوازی سەلەفی داوای خیلافەتیان نەئەکرد و ڕەخنەیان لەوە نە بوو کە هاولاّتی بن لە ناوئەوخیلافەتەخوێناوێناویەدا ،بەڵکو هەموو ناکۆکی یەکان لە دوو خاڵی سەرەکیدا کۆبووبوویەوە :

یەکەم : سەلەفیەکان داوای یان ئەکرد هەموو ئەو شاندانەی دێن بۆ حەجی ماڵی خوا پێویستە گەردنگیر بن بە پەیامی خواوە و دەست لە هەموو ئەوە شتانە هەڵگرن کە

---

[1] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ص٩٥ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ص١٧٢ .

دەرچوونە لەو پەیامە ، خاڵی دووەم ئەوە بوو دەوڵەتی عوسمانی هەستی بە بێهێزی و لە ڕووداوان ئەکرد لە بەرامبەر دەسەڵاتی وەهابیەکاندا بەسەر شارە پیرۆزەکانەوە لە حیجازدا، ئەیانزانی ئەوە ئەبێتە هۆی ئەوەی سام و پلەی سیاسی خۆیان لەدەست بدەن [1].

(جەبرەتی) ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە هەڵوێستی وەهابیەکان لە شاندەکانی شام کە ئەهاتن بۆ حەجی ماڵی خوا ئەوە بوو کە بەو مەرجانە بێن کە ئەوان دایان ناوە کە بریتی بوو لە (( حاجی کەدێت نابێ کۆڵی پێ بێ ، نابێ تەپڵ و جوزەلە و چەك و هەرشتێکی تری پێ بێ کە پێچەوانەی شەریعەتە ، کە ئەوانیش گوێیان لەمە بوو گەڕانەوە و حەجیان نەکردوو وازیان لە شتە ((منکر)) ەکانی خۆیان نەهێنا [2] )) هەروەها هەڵوێستێکی لەم شێوەیەیش لە کاروانی حاجیانی میصر ئەگەڕێتەوە ...[3] .

مەرسومەکەی سوڵتان کە داوا لە (محمد علی) ئەکات شەڕ لەگەڵ سعودیەکاندا بەرپا بکات کە بەهەڵنانی نامەکانی ( شەریفی جدة ) و نیگاو سروشی ئینگلیزنوسیبووی بوو ، تەنیابۆ ئەوەندە : مەککە و مەدینە لەچنگی ئەوان دەربێنێ وچاك ڕەفتاربکات لەگەڵ هاوولاتیان و بازرگانەکاندا [4].

بۆ جارێکی تر ئەم داوایە دووپات کرایەوە و سەرلەنوێ تەنیا داوای ڕزگارکردنی مەککە و مەدینەی پیرۆز ئەکات ، دوای ئەوەی لە ڕێگەی هێزە سەربازیەکانەوە سەرکەوتن بەدەست هات بەسەر وولاتی حیجازدا کە چەند جارێك تێك شکێنراو شکا لەبەردەم شوێنکەوتەکانی( شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب)دا ، سوڵتان محمودی دووەم مەرسومێکی نارد بۆمیصربۆ ئەوەی لە مزگەوتەکاندا بخوێنرێتەوە کەمەککە و مەدینە گێڕراوەتەوە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی [5]، ئەمە دەری ئەخات کە سوڵتانی عوسمانی جگە لە گێڕانەوەی حیجاز بۆ ژێر دەسەڵاتی عوسمانی هیچ ئامانجێکی تری نە بووە لەو کارەدا .

---

[1] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثمانى ، ص١٨٥ .

[2] ) بڕوانە : من اخبار نجد و الحجاز ، محمد اديب صالح ، ص١١١ .

[3] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١١١ ،ص١١٢ .

[4] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثمانى ص١٨٦ .

[5] ) بڕوانە : من اخبار الحجاز ونجد ، محمد اديب غالب ، ص١١٠ .

ئەم شەڕە هەرئە بوو بە ئەم ئەنجامە بگات ، ئەو بووو هێزەکانی (محمد علی) دەسەڵاتیان باڵی کێشا بەسەر شارەکانی حیجازدا و (محمد علی) کرا بە شەریفی تازەی ناوچەی حیجاز کە ناچار بوو بچێتە ئەویٚ و( شەریف غالب) دەربکات لەکاتێکدا کە هێزەکانی ئەو چاوساغی هێزەکانی ئەم بوون لە چوونە ناو حیجازدا ![1] ، بە هەمان شێوە سەرکردە سعودیەکانی بانگەوازی سەلەفیەت داوای ئاشتنامەیان کرد لە (محمد علی) بەڵام ئەو چەند مەرجێکی قورسی دانا بۆ قبولٚ کردنی ئەو ئاشتی یە و لە ناو مەرجەکاندا هەندیٚ هەڕەشەی کرد بوو وەك (جەبرەتی ) ئەگێڕێتەوە و ئەڵیٚ : (( سەبارەت بە ئاشتی ئێمە ڕەتی ناکەینەوە بە چەند مەرجێك ، ئەبێت هەموو ئەو خەرجیەی کە سەرفمان کردووە بۆ سەربازەکانمان لە یەکەم ڕۆژی شەڕەکەوە تا مێژوی ئەمڕۆ بۆمانی بگێڕنەوە ، وە هەموو ئەو شتانەیش کە وەری گرتووە و پێی دراوە لە گەوهەرو شتی نەختینە کە لە حوجرەی پیرۆزدا بووە ، بدات پێمان ، نرخی هەموو ئەو شتانەیش بدات کە نەماون لەوێداوفەوتاون، دوای ئەمانەش هەمووی ئەبێت بێت و چاوپێکەوتنێك بکات لەگەڵمدا و لەگەڵ خۆیدا ڕێئەکەوم و ئاشتیەکە تەواو ئەکەین دوای ئەمانە ، ئەگەر ئەمە ناکات و نایەت ... ئەوە ئێمە بەرەو ئەوئەڕۆین ) [2] .

**هەشتەم / ڕاستی ئەم پەلاماردانەی ( محمد علی ) بۆ سەر( حیجاز) و ( نجد ):**

شەڕی نێوان (محمد علی) و شوێنکەوتەکانی( شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب) شەڕی نێوان دوو لایەن نە بوو هەردووکیان گویٚ بۆ ئیسلام بگرن ، هەروەك ئەمە نە بوو شەڕێکی عەرەبیش نە بوو وەك هەندێك ئەیانەوێت وا بیناسێنن ، بەڵکوو ئەم شەڕە شەڕێك بوو لە نێوان دوو هێزدا هێزێکی ئیسلامی کە هیچ طموحێکی سیاسی نە بوو ، ئەوە نەبێت غیرەتی بۆ ئیسلام ئەجوڵاو سوربوو لەسەر ئەوەی کەوا بگەڕێتەوە بۆ بنەما سەرەکی یەکانی ئیسلام ، ئەویش هێزی سعودیە بوو هەروەك ئەو هێزە حەزەرێکی زۆری دەر ئەبڕی بۆ ئەوەی ترسناکی ئیمپریالیزم ( کافران ) دوور بخاتەوە لە وولاتی ئیسلامی ، بەڵام هێزەکەی تر کە شەڕی پێچایە ئەوهێزەی کە والی میصر نارد بوویە سەریان کە لە ڕاستیدا بە هیچ جۆرێك خەڵکی میصر نەبوون و زۆربەیان (( ئەونا ئوطی)) ی و هەندێك تورکی و نصارا و هەندیٚ

---

[1] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١١٠ .

[2] ) بڕوانە : عجائب الآثار _ اخبار یوم آخر العقدة ستة ١٣٢٨ك ، ادیب غالب ، ص١٤٩ .

ئەفسەری فەڕەنسی بوون [1] ، ( ئەو هێزە ) زۆربەی سەرکردەکانیان هەر بە ناو موسڵمان بوون ، (( جەبرەتی ))ی مێژووو نووس باسێکی ووردی ئەو هێزە ئەکات وەك پاشکۆیەك لەسەر قسەی ئەوانەی کە بە هێزێکی باش و لە خوا ترسیان دانا بوو ، (جەبرەتی) شایەتێکەو بە چاوی خۆی شتەکەی بینیوە چۆن لەسەرەتادا ئەو هێزە لەبەردەم شوێنکەوتەکانی بانگەوازی سەلەفیەتدا تێك شکا وەو هەلاتووە ، ئەوەتا ئەڵێت : (( سەرکەوتن لەکوێ دەستی ئێمە ئەکەوێت ... کە زۆربەی سەربازەکانمان لە ئایینی ئیسلام چوونەتە دەرەوە ، هەشیانە هیچ ئایینێکی نی یە و ڕێبازی ئێمەیشی قبوڵ نی یە ، چەندان صندوقە ئارەقمان پێ بوو ، لەسەر بازگەکانی ئێمەدا کەس گوێ ی لە بانگ نەئە بوو ، نوێژە فەرزەکان نەئەکران ، کەس نەدین و نە دروشمە ئایینی یەکانی هەر بەخەیاڵدا نەئەهات ، کەچی خەڵکەکەی تر ( مەبەستی وەهابیەکانە ) کە کاتێ نوێژ ئەهاتە پێشەوە خێرا بانگوێژەکانیان بانگیان ئەداو ڕیزەکانیان ڕێك ئەخست و لە پشت ئیمامێکەوە بە کزی و ملکەچیانە ئەوەستان و ئەگەر لە گەرمەی شەڕیشدا بوونایە و کاتی نوێژ بهاتایە ، بانگوێژ بانگی ئەداو نوێژی ترسیان ئەکرد ، و کۆمەڵێکیان ئەچوونە پێشەوە و خەریکی شەڕەکە ئەبوون و کۆمەڵێکی تریان دوا ئەکەوتن و نوێژەکەیان ئەکرد و سەربازگەکەی ئێمە سەریان لەمە سوڕ ئەما ، شتی وایان نە بیستبو چ جای ئەوەی ببینن ، لەسەربازگەکەی خۆیانەوە هاواریان ئەکرد وەرن بابڕۆین بۆ شەڕی موشریکەکان ، ڕیش تاشراوەکان ، ئەوانەی نێربازی و زینایان حەڵاڵ کردووە ، ئەوانەی عارەق ئەخۆنەوە ، کە زۆرێك لە کوژراوەکانی سەربازگەکەی ئێمەشیان سەیرکردووە ئەبینن خەتەنە نەکراون ، کەچی ئەوانەی ئێمە کە گەیشتنە ( بدر ) و دەسەڵاتیان بەسەر ئەوێ و چەم و دۆڵەکانی تردا پەیدا کرد سەیرئەکەن باشترین خەڵکی تێدایە و هەموو پیاوی باش موسڵمانن کەچی ئەمان فەرهودیان کردن و ژنەکان و کچەکان و مناڵەکانیان و کتێبەکانیان هەموو بردن ) [2]. (محمد علی) کەسێك نە بوو پابەند بێت بەشەرعەوە لە کاتی شەڕکردندا ، بەڵکوو کابرایەك بوو پێچەوانەی شەرع ئەجولایەوە و هەموو سنورەکانی خوای گەورەی ئەبەزاند ، گوێ ی نەئەدا بەیاساکانی ئیسلام ، ئەوە سوپاکەی بوو کە خەڵکی

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. محمد انيس ، ص٢٣٣ .

[2] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص١٨٨ .

ئەکوشت و وولاتی وێران ئەکرد ومالی فەرهود ئەکردو ناموسی موسلمانە یەکتاپەرستەکانی ئەشکاند .

(علی رضی الله عنه) لەشەڕی ( جمل ) دا بە هاوەڵەکانی ووت : کەس بەدوای یەکێکدا نەڕوات کە لە شەڕ هەڵدێت ، پەلاماری کەسی برینداریش مەدەن ، هەر کەسیش چەکەکەی دانا دەستی بۆ نابرێت ))[1] .

هەروەها ئەڵێت : (( نەکەن دەست بۆ ئافرەتان بەرن با تێر قسە بەشەرفتانیش بڵێن و تێر جنێویش بە ئەمیرەکانتان بدەن ، پیاوی وا هەیە بە دار لە ژنێك ئەدات یان بە ( گالۆك ) تا خۆی و وەچەی ئەمێنێ بەوە عەیب دار ئەبێت ... ))[2] .

(ئەبی ئومامەی باهیلی) (( رضی الله عنه )) ئەگێڕێتەوە : ( لەشەڕی " صفین " دا بەشدار بوون ، کەس پەلاماری بریندارى نەئەدا و بەشوێن ئەو کەسەیشدا نە ئەڕۆی کە پشتی هەڵبکردایە و هیچ کوژراوێکیش شتی لێنە ئەکرایەوە ... ) [3] .

سولتانی عوسمانی ئەوەندەی بەس بوو کە حیجاز لەژێر دەسەلاتی ئەودا بێت و پەلاماردانی ( درعیە ) داوایەکی وا زۆر نەبوو یان پێویست نە بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی ، بەلام (محمد علی) زۆر توند بوو لە دانانی مەرجەکانی ئاشتیدا هەر بۆ ئەوەیش بووتا شەڕ بەردەوام بێت چونکە ئامانجی ئەو لە و شەڕەدا تێر کردنی ئارەزووە فراوانخوازی یەکانی بوو لە و سنورەدا کە ئامانجەکانی بەریتانیا لە ناوچەکەدا ڕێگەی بدایە ، دوای ئەوەی کە دەوڵەتی سعودیە ترسناکی یەکی زۆری دروست ئەکرد لەسەر بەریتانیا لە ناوچەکەدا بە گشتی ئیتر لە دەریای سور دابێت یان لە کەنداوی عەرەبیدا بێت یان لەو ناوچە وشکانیانەدا بێت کە ڕێگەن بۆ ناو عێراق ، ئەوە بوو بەریتانیا هەستی بەو هەڕەشە ڕاستەقینەیە کرد بۆ سەر بەرژەوەندی یەکانی لە ڕۆژهەلاتدا ، جا وەسفکردنی ئەو پەلامارە بەوەی پەلامارێکی خاچپەرستانە بوو لە بەرگێکی ئیسلامیدا لەوە ئەچێ زۆر لە ڕاستی یەوە نزیك بێت [4] .

---

[1] ) رواه ابن ابي شيبة ، كتاب الجمل ( ١٥/ ٢٦٣ ) .

[2] ) نصب الرايه ى زەیلەعی ، (٤٦٣/٣ ) .

[3] ) الحاكم بسند صحيح ، ووافقة الذهبي ، سەبری المستدرك (١٥٥/٢) بكه .

[4] ) بڕوانه : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص١٨٩ .

کاتێك کە(طوسون کوڕی محمد علی) تێك شکا لەبەردەم میر (عبدالله ی کوڕی سعود)دا و نیوەی سوپاکەی لە دەستدا ، (محمد علی) بۆ خۆی بەرەو حیجاز و لە ساڵی ( ١٨١٣ ز) دا کەوتە ڕێ و ( غالب کوڕی مساعد ) ( شەریفی مەککە ) ی دەستگیر کرد و تۆمەتباری کرد بەوەی دەستی لەگەڵ سعودیەکاندا تێکەڵ کردووە ، و هەموو پارەو کەل و پەل وماڵ و سەروەتەکەی داگیر کرد و شەریفی مەککە بوویە کارمەندێکی (محمد علی) لە حیجازدا و زۆری نەبرد (محمد علی) سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەسەر هێزەکانی سعودیە دا لە ساڵی ١٨١٥ . دا و شەڕی ( بسل ) دا [1]، ئەو شەڕەی کە هەندێك وای دائەنێ کە (( لە گەورەترین ئەو شەڕانەیە لەگەڵ وەهابیەکاندا کراوە ، بەڵکوو گرنگترین شەڕێکە لە مێژووی جەنگی میصردا )) [2] .

(محمد علی) لە دوورگەی عەرەبیدا نەمایەوە بۆ بە دواداچوونی ئەو سەرکەوتنەی بەدەستی هێنا بوو ، بەڵکوو گەڕایەوە بۆ میصرو ئەوێ ی جێ هێڵا بۆ(طۆسۆنی) کوڕی [3] و ئەویش هەر زوو توانی و بۆ یەکەم جار تێکشکانێکی تر بەسەر سعودیەکاندا بهێنێ و پەلاماری باکوری (نجد) بدات و لەم پەلامارەیدا گەیشتە شاری ( برس ) و پاشان ( الشبیة ) و وای لێهات ڕێگەی " درعیە " کرایەوە لە بەردەمیدا ، میر (عبدالله) بەپەلە داوای کرد دەرگای دانوستان بکرێتەوە بۆ ئەوەی خوێنی زیاتر نەڕژرێت و پارێزگاری لەشارو لادێکان بکرێت و دانوستان لە نێوان هەردوولادا دەستی پێ کردوو لەسەر ئەم پرۆسەی ئاشتی یە و بەم مەرجانە ڕێکەوتن :

١- هێزەکانی میصر " درعیە " داگیر بکەن .

٢- میر (عبدالله) خۆی بخاتە ژێر هەڵسوکەوتی طوسون پاشاوە و ئەو ویستی بۆ هەرکوێ ی بنێرێ پێویستە بچێتە ئەوێ .

٣- پێویستە میر (عبدالله) ڕێگەکانی " حج " بپارێزێ و ملکەچی شار بێت کە (محمد علی) فەرمانڕەوایی ئەکات تا ئەو کاتەی کە ئیمزا لەسەر ئەم ئاشتی یە ئەکرێت .

---

[1] ) بڕوانە : الدولة السعودیة الاولی ، د. عبدالرحیم عبدالرحمن ، ص١٩٩_—٢٣٥ .

[2] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص١٧٢ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٧٢ .

٤- ئەم مەرجانەیش لەکاتی ڕێکەوتندا کاری پێ ناکرێت تا (محمد علی) خۆی ئیمزا یان لەسەر نەکات .

ئەوە بوو هێزەکانی لای ئەمیر عبدالله بەمە قایل نە بوون و بڕیاری ئەوەیان دا کە شاندێك بچێت بۆ میصر و ڕاستەوخۆ لەگەڵ (محمد علی) خۆیدا دانوستان بکەن و قسە لەو مەرجانە بکەن ، بەڵام شاندەکە بەسەرنەکەوتووی گەڕایەوە بەهۆی توندڕەوی پاشاوە و سعودیەکان جارێکی تر خۆیان کۆکردەوە و خۆیان ئامادە کرد بۆ شەڕوکوشتار ، (محمد علی) یش هێزێکی تری تازەی لە ساڵی ١٨١٨ز دا و بەسەرکردایەتی ابراهیم پاشای کوڕی ناردە ئەوێ[1].

(ابراهیم پاشا) بە خۆی و هێزەکانەوە بەرەو (نجد) کەوتە ڕێ و دەستی گرت بەسەر شارەکانی ( عنیزە ) و ( بریدە ) و ( شقرا ) و هەمووناوچەی ( قصیم ) یشی خستە ژێر رکێفی خۆی ،(ابراهیم پاشا) لەم پەلاماردانەیدا سیاسەتی نەرم جوڵانەوەی لەگەڵ خێڵەکاندا پیادە ئەکرد ، ئەو سیاسەتەی کە توانی دڵی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی (نجد) بەلای خۆیدا ڕابکێشێت ، چونکە بەردەوام لە هەموو شوێنێکدا کۆڕی ئەگرت و خەڵاتی بەسەر خەڵکیدا دابەش ئەکرد و شێوازێکی وای لەسەرەتاوە گرتە بەر خێڵەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا ئەویش ئەوە بوو فەرهودو تاڵانی کردنی یاساغ کرد ، بە هاوکاری شارەزایی سەربازی یە فەڕەنسی یەکان توانی بەردەوام بە هەڵمەتەکەی بدات و بگاتە ( درعیە ) ، بەڵام لەبەر ئەوەی شوێنێکی سەخت بوو هات گەمارۆی خستە سەری و ئەم گەمارۆیە درێژەی کێشا و لە ( ٦ ) ابریلەوە تا ( ٩ ) ی سێپتەمبەر ( ١٨١٨ ) ز خایاند ، کۆتایی بەوە هات کە میر (عبدالله کوڕی سعود) خۆی دا بەدەستەوە و (ابراهیم) چوویە ناو " درعیە " وە و لەوێوە میر عبدالله ی لە ژێر چاودێری یەکی توندا بەرەو میصر نارد ، و لە میصریشەوە ناردیان بۆ ( استنبوڵ ) [2] ، میر عبدالله بۆ ماوەی سێ ڕۆژی تەواو بەشەقامەکانی استنبوڵدا ئەیانگەڕاند و ئەیانناساند بە خەڵکی و پاشان فەرمان کرا کە لە ناو ببرێت و بکرێت بە دارا ، ڕەحمەتی خوا لەو پیاوە ستەملێکراوە بێت [3] ، ڕۆژی قیامەت دەرئەکەوێت چۆن و لەبەرچی ئەو پیاوە لەناو برا ، ئەم

---

[1]) بڕوانە : الدولة السعودية الاولى ، ص٣٣٩- ٣٤٥ .

[2]) بڕوانە : العالم العربي في التأريخ الحديث ، ص١٧٤ .

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو . ص١٧٤ .

پیاوە بە ناوی خەڵکی دوورگەوە داوای ئاشتی کرد و لە و نامەیەدا کە ( ئەحمەد الحنبلی ) ئەینێرێت بۆ طوسون تێیدا ئەوە ڕۆشن ئەکاتەو کە ئەمان دان ئەنێن بە حوکمڕانی سوڵتانی عوسمانیدا و لەژێر ڕکێفی دەوڵەتی خیلافەتدا ئەبن و ناچنە دەرەوە لێ ی ، دەی کەواتە ئیتر ئەم سووربوونە لەسەر ئەوەی پەلاماری دوورگەی عەرەبی بدرێت لە پێی چی ؟ و بەو شێوەیەیش گیانی ئەو هەمووە موسڵمانە بەدەستی یەکتری لە ناوبرا لە ئەنجامی فرت و فێڵی دوژمنانی ئیسلام خۆ خەڵکی دوورگە پشتیوانی موسڵمانانی میصر یان کرد کە فەرەنسی یەکان هاتن بۆ داگیر کردنی ، دەی ئەم ستەمە ناهەقیە ئیتر بۆ ئەکرێ لەمان ؟ (محمد علی) توانی بەهۆی ئەو سەرکردانەوە کە ناوی ئیسلامیان لە خۆیان ناوە زۆرێك لە خەڵکە نەخوێندەوارەکە قەناعەت پێبهێنن کە ئەم شەڕەیان جێبەجێ کردنی فەرمانی خەلیفەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە ئەرکی سەرشانیانە ( سمع ) و ( طاعة ) ی بکەن و بۆ ئەوەشە نەیەڵن دوورگەی عەرەبی لەلەشی دەوڵەتی خیلافەت بکرێتەوە [1].

مەسەلەی ( ولاء ) و (براء ) لای (محمد علی) بە تەواوەتی باری کرد بوو ، بەبەڵگەی ئەوەی ئەو پشتیوانی تەواوی خۆی دابویە دوژمنانی ئیسلام و بڕیاری دابوو پێکەوە لەگەڵ ئەواندا ئەم میللەتە بەرەو مەرگ بەرن ، ئەمە پاداشتێکی عملی بوو بۆ بازرگانێکی جگەرە (کە کەس نەیئەزانی وەچەی کێ یە) بێت و بچێتە سەر کورسی دەسەڵات لە دونیای موسڵماناندا [2] .

بەریتانیا زۆر کامەران بوو کاتێك کە ( درعیە ) گیرا کە پایتەختی دەوڵەتی یەکەمی سعودیە بوو _ و کەوتە ژێر دەستی هیزەکانی ابراهیم پاشا [3] ، ئەو دەوڵەتە دەوڵەتی ئەو سەلەفیانە بوو کە پشتیوانیان لە ( قواسم ) ە کان کرد کاتێك جیهادیان دژ بە بەریتانیا ڕاگەیاند لە کەنداوی عەرەبیدا ، کە ئەوەش واتە هەڕەشە دروست بوون لەسەر بەرژەوەندی یەکانی بەریتانیا لە هیندستاندا وەك وتمان [4]، لێرەدا جێی خۆیەتی بپرسین _ بەتایبەت لە ناو ئەو ڕووداوانەدا کە جیهانی ئیسلامی لە مێژووی تازەدا پێیدا تێئەپەڕێ _ و بڵێین :

---

[1]) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي ، ص٩٦ .

[2]) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٩٧ .

[3]) بڕوانە : دراسات في التأريخ الخليج العربي الحديث والمعاصر ، (١٩٨/١ ) .

[4]) بڕوانە: تأريخ الآحساء السياسي ، د. محمد عرابي ، ص٤٢_٤٣ .

ئەگەر سوپاکەی (محمد علی) و سوپاکەی دەوڵەتی عوسمانی هاوکاربوونایە لەگەڵ دەوڵەتی یەکەمی سعودیەدا لەبری ئەوەی شەڕی تێ بئاڵێنن ، و هەموو پێکەوە لەبەردەم چاوچنۆکی ئەوروپایەکاندا بە شێوەیەکی گشتی و لەبەردەم بەریتانیا دا بەشێوەیەکی تایبەت بوەستایە ، ئەگەر وایان بکردایە ئایا ڕووی مێژوویان نە ئەگۆڕی؟ ، بەتایبەتی دەوڵەتی "سعودی" دەوڵەتی موسڵمان و پایەکانی لەسەر میتۆدێکی سەلەفیانەی ڕاستەقینە ڕاوەستا بوو ، خۆ جیهانی ئیسلامیش لەو ڕۆژەدا زۆر پێویستی بەوەها هەنگاوێك هە بوو ، بە هەرحاڵ بەریتانیا باش بەوەی زانی کە چۆن سود لەو بارو دۆخە وەربگرێت بۆیە هەر زوو پیرۆزبایی نارد بۆ (ابراهیم پاشا) بەپێی (( بنەمای دەسەمۆکردنی بەرامبەر لە ژێر ڕۆشنایی بەرژەوەندی یەکانی خۆیدا )) ئەوە بوو" کابتن جورج فورستر سادلیر " ی نارد تا پیرۆزبایی پێشکەش بە (ابراهیم) بکات بەبۆنەی گرتنی ( درعیە ) ەوە و هەوڵیش بدات بنکەیەك دروست بکات و لەوبنکەیەوە هەماهەنگی لە نێوان هێزەکانی وشکانی پاشاو هێزە دەریای یەکانی بەریتانیا دا دروست بێت تا پێکەوە شەڕ دژ بە ( قواسم ) ەکان کە شوێنکەوتەی دەوڵەتی یەکەمی سعودیە بوون ڕابگەیەنن[1] .

پەیوەندی نێوان (محمد علی) و بەریتانیا پەیوەندی یەکی کۆنە ، لەسەرتای حوکمڕانیدا بۆ ماوەی چوار مانگ بەردەوام لە دانوستاندا بوو لەگەڵیاندا و لەو ماوەیەدا (محمد علی) دڵنیای کردن کە ئەو زۆر بەڕاستێتی و دڵپاکانە حەز بەوە ئەکات پەیوەست ببێت بە بەریتانیاوە ، نەك ئەوە بەڵکوو ئامادەیی دەربڕی کە بچێتە ژێر دەسەڵاتی ئەوان ، ئەم ڕاستی یە لە ڕاپۆرتێکی ( فریزر ) دا دەرئەکەوێت کە بەرپرس بوو لە و دانوستانە ، ئەمە وای کرد پاش ئەوەی کە بەریتانیا دڵنیا بوو لیێ ی _ وازیان لە مەمالیکەکانی هاوڕێیان هێنا.

لەو ڕاپۆرتەدا کە (( فریزر )) سەرکردەی هێزەکەی بەریتانیا کە کاری دانوستانی لەگەڵ نوێنەرانی (محمد علی) پێ سپێردرا بوو _ ناردی بۆ جەنراڵ مۆر لە ١٦/ اکتوبر / ١٨٠٧ ز دا هاتووە گرنگترین لایەنەکانی ئەو دانوستانە دەرئەخات ، بۆ نمونە تێیدا هاتووە :

( ئومێد ئەکەم ڕێگەم بدەن بە درێژی باسی ئەوە بکەم بۆتان .. تا ڕوون بێت لەبەرچاوتان لە نێوان پاشای میصرو مێجەر جەنراڵ (( شریرول )) و کابتن (( فلیوز )) چی ڕوویداوە

---

[1] ) بڕوانە : حروب (محمد علی) في الشام ، د. عايض الروقي ، ص١١٢ .

کاتێك بەکاری دانوەستان هەستاون ، جا ڕای ئەوە و منیش ئەو قەناعەتەم بۆ دروست بووە لە ڕێگەی ئەم گفتوگۆیانە و لە ڕێگەی ئەو پەیوەندی یە زۆرو تایبەتیانەی ترەوە کە خۆم لەگەڵیدا هەمە ، (محمد علی) بە ڕاستێتی و لەو پێشنیارە دا کە ئەیکات ڕاست ئەکات ، بە دڵنیای یەوە (محمد علی) والی میصر ئامادەیی و حەزی خۆی نیشان داوە کە خۆی بخاتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیاوە و ئێمەیش پەیمانی ئەوەمان پێداوە کە ئەم پێشنیارەی بگەیەنینە سەرکردەکانی هێزی بەریتانیا و ئەوانیش لە ڕێگەی خۆیانەوە بەرزی بکەنەوە بۆ حوکمەتی ئینگلیزی تا بڕیاری خۆی بدات لەسەری ... (محمد علی) لەلای خۆیەوە پەیمانی ئەوەش ئەدات کە نەیەڵێت نە فەڕەنسیەکان و نە تورکی یەکان و نە سوپای هیچ دەوڵەتێکی تر لە ڕێگەی دەریاوە بێتە ناو " ئەسکەندەریە " و ئەو پەیمانەش ئەدات کە دەست بە ئەسکەندەریە وە بگرێت و وەك هاوڕێ و هاوپەیمانێك بۆ بەریتانیای گەورە بمێنێتەوە ، بەڵام چارەمان نی یە ئەبێ ئینگلتەرا وادەی ئەوەی بداتێ کە پشتیوانی لێ بکات بە هێزە دەریای یەکان ئەگەر لە ڕووی دەریاوە هێرش بکرێتە سەری چونکە ئەو هیچ کەشتی جەنگی نی یە ، (محمد علی) پاشا لەهەمان کاتدا پەیمانی ئەوە ئەدات کە هەموو هاوکاری یەکی کەشتیەکانی بەریتانیا بکات کە نزیك بە ئەسکەندەریە لەنگەریان گرتووە ، بە هەموو ئەو شتانەی ئەوان پێویستیانە لە ئاوی (نیل)دا ، ئەو کاتەی کە ئاماژەی ئەوەی ئەدرێتێ کە ڕێکەوتنامەکە کراوە ))[1] . " دروفتی " کە قونسوڵی فەڕەنسی بوو ، کاتێك ئەم زانیاری یانەی دەربارەی ئەو ڕێکەوتنامەیە پێ گەیشت کە لە نێوان (محمد علی) و ئینگلیزدا دروست بووە ئەمڕایە دەربارەی ئەڵێ :

( ئەم جۆرە ڕێکەوتنامەیە ئەگەر مۆر بکرێت ئەوە هەموو ئەو ئامانجانە ئەپێکێت کە بەریتانیا هە یبوو لە ناردنی ئەو سوپایەدا بۆ میصر ئەگەر زیاد لە هەموو ئەو شتە چاوەڕوانکراوە نەش نەبێت کە ئەوان هە یانبوو بۆ ناردنی ئەو سوپایە )[2].

ئینگلیز نەیان ویست هەموو بڕگەکانی ئەم ڕێکەوتنامەیە ڕابگەیەنن لە پاش ئیمزاکردنی و چۆڵکردنی ئەسکەندەریە و تەسلیمکردنەوەی بە پاشای میصر ، لەبەر ئەوە بوو کە بەریتانیا

---

[1]) بڕوانە : میصر في مطلع القرن التاسع عشر ، د . محمد فؤاد شکري ، (٢/ ٨٥٦،٨٥٧ ) .

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو (٢/٨٢٦ ) .

بە پێویستی ئەزانی هەندێ خۆی بگرێت و هەمووی ڕانەگەیەنێت چونکە بڕگەکانی دوژمنایەتی ئاشکرای بەرامبەر بە دەوڵەتی عوسمانی دەرئەبڕی ، بەوەی پشتیوانی لە کاربەدەستێکی ئەم ئەکات و هانی ئەدات جیاببێتەوە و سەربەخۆیی خۆی ڕائەگەیەنێت ، ئەمە لە کاتێکدا دیبلۆماتێکی ئینگلیزی و بەرژەوەندی یە باڵاکانی ئەوەی ئەخواست ئەو پەیوەندی یە تێك نەچێت و سودیش لەم بەکرێ گیراوە تازەیە وەربگرن بۆ ئەوەی دەست بکێشن بەسەر تەواوی ناوچەکەدا ئەگەر توانیان [١].

**نۆیەم / شۆڕشی یۆنان :**

ئەوروپا سور بوو لەسەر لەت و پەت بوونی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەم ئامانجەیش چەندان ڕێگەی گرتە بەر : لەوانە زیندکردنەوەی ئاژاوەی تایفەگەری و ئاینی و هەڵگرساندنی شۆڕشە ناوخۆی یەکان بە کۆمەکی ئەمان چ لە ڕووی ماددی و چ لە ڕووی مەعنەوی یەوە ، وولاتی یۆنان پارچەیەکی لە وولاتانی ئیسلامی پێك ئەهێنا ، لە ناو لادێ و شارەکانیدا پێنج فەرزە بانگ ئەدرا شەو و ڕۆژ و بۆ ماوەی چەند سەدە بە یاساکانی شەریعەت کاریان ئەکرد ، ئەم حاڵەتە مایەی دڵخۆشی گەورەپیاوانی نەصرانی نەبووچ ئەوانەی یۆنان وچ ئەوانی دەوڵەتانی ئەوروپاش ، بۆیە دەستیان دایە دروست کردنی کۆمەڵەی نهێنی لە ناو یۆنان و لە ناو ڕوسیاو جگە لە وانیشدا ، کە مەبەستیان ئەوە بوو ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کۆن زیندو بکەنەوە بەو مەرجەی لە ژێر بەڕێوەبەرایەتی باتریاکی ئەرسە زۆکسی ڕۆمیدا بێت لە ئەستەنبوڵ ، با زۆربەی ( باتریاك ) و ( قەشە ) و ( پیاوانی ئاینی ) ئەندامی سەرەکیش بن لە و ڕێکخراوە نهێنی یانەدا کە بۆ دژایەتی دەوڵەتی عوسمانی دانراون [٢].

پیاوانی ئاینی هەستان بە بەکارهێنانی دەسەڵاتی خۆیان لە ناو گەلدا و کەوتنە جوڵاندنی خەڵك تا شۆڕش بکەن دژبە دەوڵەتی عوسمانی ، ( قەشە ) و پیاوە ئاینی یەکانیش پەیوەندی باشیان بە سەرۆکی وولاتە ئەورووپی یەکانەوە و بە تایبەتی ڕوسیاوە هە بوو ، لە م بوارەدا بەڵگەننامەیەکی مێژووی هەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم پەیوەندی یە بۆ ئەوە بووە هەماهەنگی و هاوکاری بکرێت بۆ ڕووخاندنی دەوڵەت وگەل و کۆڵەکەکانی

---

[1]) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص١٧٤ .

[2]) بڕوانە : دور الكنيسة في هدم الدولة العثمانية ، ثريا شاهين ، ص٥٦،٥٧ .

دەوڵـەتی عوسمـانی : ئەمـەی خـوارەوە دەقـی نامەکـەی ( باتریـاك گریگوریـوس ) ە کـە بـۆ قەیـسەری ڕوسـیای نـاردووە و تێیـدا ئـەوە ڕۆشـن دەکاتـەوە کـە چـۆن لـە نـاوەوە دەوڵـەتی عوسمانی ڕوخێنراوە ) ....

﴿ مەحاڵە بە ڕوو بەڕووبونەوەی سەربازی تورکە عوسمانی یەکان لەناو ببرێن و بڕوخێنـرێن ، چونکە تورکە عوسمانی یەکان لە ڕاستیدا زۆر شۆڕش گێرو قارەمانن و بڕوایان بە خۆیان زۆرە و خەڵکانێکن خاوەنی نەفسێکی بەرزن ، ئەم سیفەتە بەرزانەشیان لە پەیوەندی یان بە ئایینەکەیانەوە سەرچاوەیگرتووە و لە وەوە فێری ئەوە بوون کە بە قەزاو قەدەری خوا ڕازی بن و تێریش کراون لەم بیروباوەڕە ، هەروەها لە هێـزی کەلەپورو مێـژووی ئیسلامیانەوە ئەم سیفەتانەیان وەرگرتووە و فێری ئەوە بوون کە گویٚ ڕایەڵی سـوڵتانەکانیان بن و پشتیوانی لەوان و سەرکردەکانیان بکەن و ڕێز بۆ گەورەکانیان دا بنێن .

تورکـە عوسمـانی یـەکان خـەڵکێکی زیـرەکن و زۆر جـدی و تێکۆشـەر و ڕێکـن لەگـەڵ گەورەکانی خۆیاندا کە ئەوانیش جوان ئاڕاستەیان ئەکەن و کردونیـان بە هێزێکـی وا خـەڵك لێیان بترسێت ، و هێزێکی بە قەناعەت و خاوەن بڕیار و قارەمان و ڕاوەسـتا و بێـت لـە کـاتی ڕووبوڕووبونەوەدا .

هەرچی ئەم سیفەتە جوانانەی تورکە عوسمانی یەکان هەیە ، بەڵکوو هەرچی قارەمانێتی و ئازایـەتی یـان هەیـە هەمـوولـە هێـزی پابەنـد بونیانەوەیـە بـە دینەکـەیان و بـە بـاوو نـەریتی کۆمەلاٚیەتی و پتەوی ڕەوشتیانەوە وەریان گرتووە ، بۆیە پێویستە :

یەکەم / ئەو هەستی گوێڕایەڵی یەیان بەرامبەر سوڵتان و سـەرکردەکانیان بشکێنین و گیـانی مەعنـەوی و پەیوەنـدی یـە ئـایینی یەکـەیان بڕوخێنین ، کورتترین ڕێگـەش بـۆ ئەمـە ئەوەیـە ڕایان بهێنین لەگەڵ ئەو (بیروڕاو)و (هەڵسوکەوتە) ڕۆژئاوایانەکە لەگـەڵ کەلـەپوری نیشتمانی و مەعنەوی ئەواندا ناجۆرە وناگونجێت .

دووەم / پێویستە تورکە عوسمانی یەکان لە خشتە ببرێن و وایـان لێبکرێـت کـە ئـەو کۆمـەك و هاوکـاری یـە دەرەکـی یانـە قبـوڵ بکـەن کـە هەمیـشە ڕەتـی ئەکەنـەوە و نەفـسیان نایهێنێـت دەسـتی بـۆ بگرنـەوە ، ئـەبێت ڕابهێنـرێن لەسـەر وەرگرتنـی ئەوکۆمەکوهاوکاریانـە ، تەنانـەت ئەگەر ئەوەندە ش هێزو توانایان بۆ دەستەبەر کراوە کە بە ئاشکرا بە هێزیان بکـات ، بەلاٚم ئەبێت تەنها بۆ ماوەیەکی دیاری کرا وبێت .

ئەو ڕۆژەی کە مەعنەوی یاتیان لەرزەی تیٚ ئەکەویٚت، هەر ئەو ڕۆژە هیٚزە زاتی یەکەیان لەرزەی تیٚ ئەکەویٚت ، چونکە هەر ئەو مەعنەوییات و پەیوەندی یە پتەوانە یانە کە بەرەو سەرکەوتنیان ئەبات ، زیاد لەو هەمووە توانایەی تریان و ئەو ژمارە زۆرەی لە خەڵك هەیانە کە لەڕوودا زیاد لەوە ئەنویٚنیٚت کە لەکاتی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی و بوونیان لە کۆڕە نیٚو دەوڵەتی یەکاندا پیٚیانەوەدیارە .

هەروەها ئەتوانریٚت لە ڕوویەکی ترەوە بڕوخیٚنریٚن و تیٚك بشکیٚنریٚن ئەویش ئەوەیە لە زەین و عەقڵیاندا بەهای شتە ماددی یەکان گەورە بکریٚت ، واتە گەندەڵ بکریٚن و بەشتی ماددی و بخەڵەتیٚنریٚن ، چونکە لە ڕاستیدا ئەوە بەس نی یە کە لە گۆڕەپانی شەڕی سەربازیدا بشکیٚنریٚن ، بەڵکو پیٚچەوانەکەی ڕاستە ، چونکە ئەگەر تەنیا ڕیٚگەی شەڕکردن بگیریٚتە بەر بۆ لەناو بردنی دەوڵەتی عوسمانی ، ئەو ڕیٚگەیە ئەبیٚتە هۆی ئەوەی کە زوو خەبەریان ببیٚتەوە و بگەنە ئەو ڕاستی یەی کە چ نەخشەیەك بۆ لەناوبردن و کاولکردنی خۆیان و وولاٌتیان هەیە و لە نهیٚنیدا بۆیان ئەتەنریٚت .

ئەوەی ئەرکی سەرشانی هەموومانە و ئەبیٚت پیٚی هەستین ئەوەیە بەردەوام بونیەی زاتی و کۆمەڵایەتیان لە ناو ڕوسیادا بڕوخیٚنین بە بیٚ ئەوەی بهیٚڵین خۆیان هەست بە هیچ بکەن )[1].

باتریاك ( گریگوریوس ) کە باتریاکی ئەستەنبوڵ بوو ، ئەندامیٚکی کارا بوو لە خزمەت کۆمەڵەکەدا و هەرچی کارمەند و دەسەڵاتی هە بوو لەکاردا بوون بۆجیٚبەجیٚکردنی فەرمانەکانی ئەو ڕیٚکخراوە نهیٚنی کە هەوڵی ئەوەی ئەدا (دەوڵەتی گەورەی یۆنانی) دروست ببیٚت ، هەنگاوەکانی ئەو کۆمەڵەیە بەم شیٚوەیە بوو :

١- دروست کردنی ڕیٚکخراوی نهیٚنی جۆراو جۆر لە هەموو شویٚنیٚکی دەوڵەتی عوسمانیدا ، و ناونوسی هەموو دەوڵەمەندەکانی ڕۆم بکریٚت _ ئەوانە یان دەسەڵاتیان لە هەموان زۆرترە لەناو ئەو کۆمەڵانەدا ، بۆ ئەوەی هاوکاری ماددی و مەعنەوی مسۆگەر بکریٚت .

---

[1] ) بڕوانە : دور الكنسية في هدم الدولة العثمانية ، ترجمة محمد حرب ، تأليف ثريا شاهين ، ص٧٠تا٧٢ .

*((ئەسقف))پلەیەکیئاینیە لەناو کلیٚسادا لەقەشەگەورەترە ولە(مطران)بچوکترە" المنجد/ووشەی(سقف)(و:ن)

٢- ناوداره هیلینیەکان ئەوانەی پیاوی کەنیسەن بەپلەی بەرپرس دابمەزرێنرێن لەناو کۆمەڵەکەدا .
٣- دروست کردنی کۆمپانیای بازرگانی تا سەرچاوەی دارایی کۆمەڵە نهێنی یەکە دەستە بەر بکرێت .
٤- سود لەو گەنجە هیلینیانە وەربگیرێت کە لە ئەوروپادا ئەخوێنن .
٥- کار بکرێت بۆ ئەوەی یارمەتی دەوڵەتە گەورەکان دەستەبەر بکرێت [1].
تۆڕەکانی ئەم کۆمەڵە نهێنی یە لە هەمو وولاتی ( مۆرە ) و دەوروبەریدا بلاوبوویەوە لە ڕێگەی فرت و فێڵەوە توانیان خۆیان لە پەرچە ناوخۆی یەکان ڕزگاربکەن و لە ساڵی (١٨٢١ ز ) دا یاخی بوونی خۆیان ڕاگەیاند ، و لەم یاخی بوونەدا ( جرمانوس ) کە ئەسقوفی "باتراس " وسەرۆکی ڕێکخستنی کۆمەڵە نهێنی یەکە بوو لە مۆرەدا _ ئالأیەکی هەڵگرتبوو وێنەیەکی مەریەمی تێدا بوو _ بە خەیاڵی خۆی _ پڕبەدەم هاواری ئەکرد ( ئەی ئومەتی یۆنان ! بێداربەرەوە و هەستە تورکەکان بکوژە ) ، هاواری ئەکردە هەموو ڕۆم و داوای ئەکرد شەڕ دژ بە عوسمانی یەکان بەرپا بکەن و هەر لەم کاتەدا یاخی بوون کەمە کەمە بازنەکەی فراوان دەبوو .
ئەم یاخی بوونە لە ساڵی ١٨٢١ز دا دەستی پێکرد و زۆر کەسایەتی نیشتمانی و ئاینی و سەرکردەی لە پیاوانی ئایینی بۆ خۆی ڕاکێشا .
" مەکاریۆس " کە سەرۆکی پێشووی کۆماری (قبرص) بوو لە گفتوگۆکەیدا کە ڕۆژنامە نوس و پارێزەری تورکی ( نەوزاد قراکیل ) لە ساڵی ١٨٥١ لەگەڵیدا سازی دا بوو ئەڵێ :
( ... لەوانەیە ئەوە بزانن کە کڵێسا ڕێبەرایەتی یاخیبونەکەی یۆنانی دژ بە عوسمانی یەکان کرد لە ساڵی ١٨٢١ز دا و قەشەکان بوون خاوەنی دەستپێشخەری بوون واتە ئەوان یەکەم کەس بوون کە ئالأی یاخیبونەکەیان بەرزکردەوە و یۆنان لە ڕێگەی ئەوانەوە بوو گەیشتە سەربەخۆیی خۆی و لە دەوڵەتی عوسمانی جیابوونەوە ) [2] ، پاشان ئەڵێ ، (( ئازادی ئەو تاکە بیرۆکەیە کە مەسیحیەت بەهی خۆی ئەزانێ )) [3]..لەڕاستیدا ئەمەیش وایە ،

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو . ص٦٠ .
[2] ) بڕوانە : دور الكنيسة في هدم الدولة العثمانية ، ص٦٤ .
[3] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٨٥ .

قەشـەكان هەسـتان بەوەیکـە هەرچـی لادێ و شارۆچـكە هەیـە ئاگاداریـان كـرد كـە شـەوی جەژنی (( فصح )) پەلاماری توركەكان ئەدرێت بۆ ئەوەی لە ناوبرێن و هاتن سوێنیان خوارد كە ئەم نهێنـی یە بۆ كـەس باس نەكـەن تا كـاتی دیاری كـراوی خۆی ، عوسمانیەكان بـەم هەڵوێـستەیان زانـی لـە ڕێگـەی هەنـدێ لـە دۆسـتانی خۆیانـەوە بۆیـە وەك گریمانێـك پاشەكشەیان كـرد بـەرەو قـەڵاكان ، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی هـیچ كۆمـەكیان پـێ نەئەگەیـشت" نەیاتوانی زۆر لەو قەڵایانەدا بمێننەوە بۆیە قەڵا دوای قەڵا كەوتە دەست یاخی بووان .

لە ماوەیەكی كەمدا _ نزیكەی سێ هەفتە _ یاخیبوان توانییان دەست بەسەر هـەموو ( مورە ) دا بگرن ، تەنیا قەڵای ( تریبولیجە )نەبێت كە سەنتەری ویلایەتی (مورە) بوو بەرگری یەكی توندیان كرد و ماوەی چەند مانگ بەردەوام بەرگریان دەكرد ، ڕۆمەكان بە شێوەیەكی زۆر دڕاندانە كە وێنەی نی یە _ كەوتنە قەتڵ و عام كردنی ئەو عوسمانیانەی بە دیل ئەگیران _ لە كاتی ئەم یاخیبونەدا _ و ماڵەكانیشیان هەموو تاڵان كردن .

پیـاوانی ئـایینی بـەردەوام پەیوەنـدی پتـەویان هـە بـوو لەگـەڵ گـەورە پیـاوانی كۆمەڵـەی (بـەرزترین بیرۆكـە) و هەمیـشە هاوكـاری و كۆمـەكیان بـۆ ئـەناردن ، قەشـەكان لـە كڵێـسا كانیانـەوە هاوكـاری هێـزە ڕۆمیـەكانیان ئەكردلـە (ئـەفلاق) و( بەغـدان) دا ، چـی پـارەی نـاو صندوقەكانی كڵێسە ش هە بوو هەموویان بۆ ناردن، هـەروەها قەشـەكان ڕێگـەیان دا بـەوەی كـە كڵێـساكان بكرێنـە هـەمباری تـۆپ و بـاروت هـەروەك چـۆن ڕێگـەیان دا بكرێنـە ( واتـە كەنیسەكان ) ژێر زەمین و پەناگا بۆ خۆیان .

مطران(بالیا بادرا) نامەیـەكی بـۆ قونسوڵی ڕۆسـیا نووسـی و تێیـدا ئـەڵێ : ( لە پێنـاوی ئـەوەی كـە بەتـەواوی لـەم توركانـە ڕزگارمـان ببێـت پێویـستە ڕوسـیا هاوكـاری ئـەم گەلـە یاخیبوانە بكات )[1] .

با ترپاك گریگوریوس ڕۆڵێكی گەورەی گێڕا لە دروست كردنی ئەم یاخیبونەی ڕۆمەكان دا دژ بـە حـوكمڕانی عوسمـانی یـەكان وەك لـە پێـشەوە باسمـان كـرد ، بـەڵام پێویـستە ئـەوە ڕۆشـن بكەینـەوە كـە ئـەم باترپاكـە لەگـەڵ ئـەوەدا كـە ئەنـدامی كۆمەڵـەی ( بنـەمای دروسـت كردنی یۆنانی گەورە )بوو یان وەك ڕۆمەكان ناویان ئەبرد بە ( بنەمای گـەورە )یـان(بـەرزترین بیرۆكـە) ، ئـەو كاتـەی كـە ڕوسـیا _ وەك چـۆن سیاسـەتی ڕوسـیی ئەیخواسـت _ نكـۆڵی لـەو

---

[1] ) بڕوانە : دور الكنيسة في هدم الذولةالعثمانية ، ص ٦٥ .

یاخیبونەی ئەرسەزوکسەکان کرد ، بۆیە باتریاك گریگوریوس ناچار بوو کە مەرسومێك دەربکات دژ بە یاخیبوەکان و ناوی نا ( بەیانی بێ بەش بوون ) [1].

دەزگای هەواڵگری عوسمانی توانی لە ڕووی چەند زانیاری یەکی متمانە دار و دڵنیاکەرەوە بگاتە ئەوەی کە ( نەخشەی دامەزراندنی دەوڵەتی گەورەیئەرسەزۆکسی یۆنانی ، لەلایەن باتریاك خۆیەوە داڕێژراوە ) [2].

کە ئەم هەواڵانە گەیشتە سوڵتان محمدی دووەم توشی سەرسامی کرد و بڕیاری دەرکرد بنکەی باتریاك بپشکنێرێت ، و (علی پاش)ا توانی نەخشەیەکی وردو توند تۆڵ دابنێ بۆ دان بەسەر بنکەی باتریاکیدا و لە ئەنجامدا هەموو ئەو دیکۆمێنت و بەڵگە نامانەی لە پێشەوە باسمان کردن کەوتە دەست کاربەدەستان و پیاوانی حکومەت .

لەناو ئەو بەڵگەنامانەدا هەموو ئەو نامانە گیران کە بۆ ئەو قەشانە نێردرا بوون کە ڕێبەرایەتی یاخیبونەکەیان ئەکرد لە ناو (مۆرە)دا هەروەك چۆن هەموو ئەو زانیاری یانەش گیرا کە لە ئەستەنبوڵەوە دەرچوو بوون بۆ ئامادە باشی و دانانی ڕێوشوێنی پێویست بۆ یاخی بوونەکە ، هەروەها هەموو ئەو ڕێکخستن و ڕێگەیانەی کە دەوڵەتی عوسمانی گرتبویە بەر بە شێوەیەکی نهێنی، کە چی ئەو میرانەی ڕۆم کە سەر بە کڵێسا بوون هەموویان ئاشکرا کرد بوو ، ئەمە جگە لە و زانیاری یانەی کە لە هەردوو باڵوێزخانەی ( انگلتەرە ) و ( فەرەنسا ) وەوە گەیشتبونە باتریاکی بەتایبەتی ئەو زانیاری یانەی باس لە هەنگاوەکانی ئامادە باشی ڕۆمەکان ئەکەن لەڕوسیا دا و هەواڵی ئەو چەك و تفاقانەی کەلەسەنتەری کۆمەڵە نهێنی یەکەوە لە شاری ( اودیسا ) وەوە ڕەوانە کراون ، بۆیان و هەموو ئەو بەیان و داوانەش کە تکای ناردنی کۆمەك ئەکەن لەگشت "سەئوکسی یەك " لە هەموو کونو قوژبنێکی دونیادا و لیستی هەموو ئەو پارەو کۆمەکی دارایی یانەش گیراکە دراوە بە باتریاکی بۆ ئەوەی یاخی بین.

هەموو ئەم زانیاری یانە کەوتە دەستی حکومەتی عوسمانی، باتریاك خۆیشی نکۆڵی لەهیچ کامێکیان نەکرد ! و ووتی : بەڵێ من بە هەموو ئەو شتانە هەستاوم و هەموو ئەو

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو . ص٦٦ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٦٧ .

تۆمەتانەیشی سەلماند کە ڕووبەڕووی کرایەوە ، و لەم تاوانەیشدا هاوکاری زۆری هە بوو کە حوکمەت هەموویانی ناسی لە دواییدا .

سوڵتان محمدی دووەم فەرمانێکی بۆ لەسەر کار لابردنی باتریاك گریگوریوس و پاشان لە سێدارە دانی دەرکرد [1] ، بڕیاری لە سێدارەدانەکەی ڕۆژی ( فصح ) جێبەجێ کرا کەلای ڕۆمە ئەرسەثوکسی یەکان ئەو ڕۆژە جەژنە ، پاشان سوڵتان فەرمانێکی تریشی دەرکرد کە کەسێکی تر هەڵبژێرێت بۆ جێگەکەی باتریاکی پێشوو ، ئەم فەرمانەشی دایە دەست ( ئیستا فراك بەگ ) کە وەرگێڕی دیوانی هەمایونی بوو ، کۆمەڵەکەی ترسێکی زۆریان لێنیشت کە ( ئیستا فراکی ) نێرا بۆ باتریاکی ، ئەویش فەرمانەکەی بەسەردا خوێندەوە و ئەوانیش لە دواییدا ( أویانیوس ) یان هەڵبژارد و کردیانە ( باتریاك ) [2] .

حکومەتی عوسمانی دەستی کردە لە ناوبردنی هەندێ لە سەرکردەکانی ئەم یاخیبونە و ئەمەش کاریگەری زۆری کردە سەر دامرکاندنەوەی خەڵکی و تەنانەت ( باتریاك ) خۆی بوویە ناو بژیوان لە نێوان حکومەتی عوسمانی و یاخیبواندا لە ( مۆرە ) ، کارەکەشی گەیشتە ئەوەی کە باتریاك پەیامێکی بەناوی ( عەرزەو حاڵ ) نارد بۆ حوکمەت و داوای _ ئەمان _ ی کرد بۆ یاخیبوان ، دەسەڵاتدارانی عوسمانیش وەڵامی باتریاکی تازەیان دایەوە و بڕیاری لێبوردن دەرکرا بۆ هەموونەوانەی کە پەشیمانی دەر ئەبڕن ، و بەو جۆرە ماڵ و موڵکی خۆیشیان دەست کەوتەوە و ئەوانەش مردبوون هەموو مافەکانیان دران بە میراتگرەکانیان و کڵێساش لەوە و دوا دەستی بە کارەکانی خۆی کردەوە و هەمو طقوسە ئایینی یەکانی خۆیشی هەروەك خۆی مایەوە ،

حکومەتیش پەیمانی ئەوەی دا بە خەڵکی نیشتە جێیان بکات و بیانخاتە خۆشی یەوە و ئەم بڕیارەی حکومەتیش گەیەنرایە باڵوێزەکانی دەوڵەتە بیانی یەکان و لەگەڵ ئەمانەشدا ڕووداوەکان هەر بەردەوام بوون و حکومەتیش ناچاری دەست وەردان ئە بوو [3] .

**دییەم** / ( محمد علی پاشا ) و یۆنان :

---

[1] ) بڕوانە : دور الكنيسة في هدم الدولة العثمانية ، ص٧٣ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو . ، ص٧٤ .

[3] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادی ، ص٩٨ .

(محمد علی) بە ڕۆڵی خۆی هەستا و بانگەوازی سەلەفیەتی لە دورگەی عەرەبیدا لە ناوبرد ، و کاتی ئەوە هات لاواز بکرێت و نینۆکی بقرتێنرێت ، بۆیە دەوڵەتە ئەوروپی یەکان داوایان کرد لە (سوڵتان محمود) کە سوپاکەی (محمد علی) بنێرێت و ئاژاوەی یۆنانی پێ دابمرکێنێتەوە ، و لەو لاشەوە دەوڵەتە ئەوروپی یەکان " (محمد علی) " یان ئاگادار کردەوە کە ئەگەر داوای وای لێکرا قبوڵی بکات و خستیانە ناو ئەو خەیاڵەی کە ئەگەر ئەو کارە بکات ئەوە ئەبێتە تاکە سەرکردە لە ناوچەکەدا و دوور نی یە کە کارەکە سەر بۆ ئەوەش بکێشێ کە بشبێتە خەلیفەی موسڵمانان کاتێك کە سوڵتانی خیلافەت بێهێز ئەبێت! ، (محمد علی) ئەم داوایەی سوڵتان محمودی دووەمی قبوڵ کرد بەو مەرجەی فەرمانڕەوایی ( کریت ) و ( یۆنان ) بەو بسپێرێت ، هەر کە هەواڵی قبوڵکردنی مەرجەکەی پێگەیشت خێرا (ابراهیم پاشای) کوڕی نارد بۆ سەرپەرشتی کردنی شەڕی ( مورە ) [1] و سوپای میصر بەسەرکردایەتی (ابراهیم پاشا)و( سێمان پاشای فەرەنساوی ڕاوێژکاری" لە ڕێگەی دەریاو لە(ئەسکەندەریە)وە دەستیان کردە جووڵە ، لە ساڵی ( ١٢٣٩ ك ١٨٢٣ ز ) دا بە ئاڕاستەی (کریت) و نیوە دوورگەی (مورە) کە سەنتەری یاخیبونە خاچپەرستییەکە بوو ، و لە ساڵی ( ١٢٤٠ك _ ١٨٢٤ ز ) دا ( نافرین ) ی گرت و لە ساڵی ( ١٢٤١ك _ ١٨٢٥ ز ) یشدا چوویە ناو ( اثینا ) لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەی دەریایی ئینگلیز ( لۆرد کوشران ) هاوکاری یەکی زۆری خاچپەرستە یۆنانی یەکانی کرد ، پاش ئەوەی کە هێزە ئیسلامیەکە بزوتنەوە خاچپەرستە یۆنانیە یاخیبوەکەی لە باربرد ، خاچپەرستی ئەوروپی ڕووی ڕاستەقینەی خۆی دەرخست و ئەوەی ڕاگەیاند کە وڵاتی یۆنان لە ژێر دەسەڵاتی ئەو دایە و ڕوسیایش کە بە ئاشکرا پشتیوانی لەو یاخیبوونەی یۆنانی ئەکرد ، سەیری کرد هەل هەڵکەوتووە کە پەلاماری ( استنبوڵ ) بدات و بیگێڕێتەوە بۆ سەردەمی پێشووی خۆی و بیکاتەوە بەسەنتەری خاچپەرستی و بت پەرستی و ئینگلیزیش دایە پاڵی و پشتیوانی بۆ دەربڕی [2].

ڕوسیا دەوڵەتی عوسمانی ناچار کرد کە ڕێکەوتنامەی (ئاق کرمان ) لە ٢٨ / صفر / ١٢٤٨ بەرامبەر ( ١٨٣٢ ) مۆربکات کە گرنگترین بڕگەکانی ئەوە بوو کە :

---

[1] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٩٩ .

[2] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٩٩ .

( ڕوسیا مافی ئەوەی هەیە کە بە ئازادی بە ناو دەریای ڕەشدا بێت و بڕوات ، بەبێ ئەوەی کەشتی یەکانی پشکنین بکرێن بە تەنگاوەکانی عوسمانیدا دێن و دەڕۆن ) ، لەگەڵ ئەوەدا کە هۆی ئەم ڕێکەوتنامەیە یاخیبونی یۆنانە خاچپەرستەکان بوو کە چی لەم ڕێکەوتنامەیەدا هەر باسیش نەکرا ، زۆری نەبرد ( ئینگلتەرە ) داوایەکی خستە بەردەم دەوڵەتی عوسمانی سەربەخۆیی بە ( یۆنان بدات و دەوڵەتی عوسمانیش ئەمەی ڕەت کردەوە چونکە ئەوە دەستێوەردانێکی ئاشکرایە لە کاروباری ناوخۆیدا )[1] ، ئەم ڕەت کردنەوە یە بەس بوو بۆ ئەوەی کە ئەوروپا بۆ جارێکی تر شەڕ رابگەیەنێتەوە .

ڕوسیا و فەڕەنسا و ئینگلتەرا لە ( ١١ / ذی الحجة / ) دا ڕێکەوتن کە زۆر لە دەوڵەتی عوسمانی بکەن تا سەربەخۆیی بداتە یۆنان ، بەو مانایەی جیای بکاتەوە لە لەشی دەوڵەتی دایك ( دەوڵەتی عوسمانی ) ، سوڵتانی عوسمانیش ئەم داوایەی ڕەت کردەوە و دەوڵەتە ئەوروپی یەکانیش فەرمانیان دەرکرد بۆ گەلەکەشتیەکانیان بەرەو کەنارەکانی ( یۆنان ) بڕۆن و داوای شەڕ ڕاگرتنیشیان کرد لە ابراهیم پاش و ئەویش سروشتی یە پێی ىەووتن من فەرمان یان لە خەلیفەی موسڵمانانەوە یان لە باوکمەوە وەرئەگرم نەك لە خەڵکی تر ، لەگەڵ ئەوەیشدا بۆ ماوەی بیست ڕۆژ شەڕ ڕاگیرا بۆ ئەوەی ڕێنمایی و زانیاری پێ بگات[2] .

سوپا هاوپەیمانەکانی ئەوروپی یەکان گەشتنە بەندەری ( نوارین ) بێ ئەوەی ئاڵای شەڕ هەڵبکەن ، بۆیە ئەم هاتنە ناوە گزی و فێڵ کردن بوو ، ئەوە بوو لە ناغافڵێکدا ئەم گەلەکەشتیە دەستیان کردە تۆپ باران کردنی کەشتیگەلە هاوبەشەکەی عوسمانی و میصری و زۆر خراپ تێکیان شکاندن و خستنیانە ژێر ئاو ، ئەم شتە ئەوەندە کتوپڕ بوو کەس چاوەڕوانی نە ئەکرد ، بۆیە هیچ جۆرە کارێکی بۆ نەکرا بوو ، بە بۆنەی ئەم شەڕە ناپاکەوە بارودۆخەکە پێچەوانە بوویەوە و هێزەکانی عوسمانی توشی بێهێزی و داڕوخان هاتن کە لەوەو پێش لە حاڵەتی هێزو سەرکەوتن دا بوون ، گەلانی ئەوروپا بە ئاهەنگ گێڕان پێشوازیان لەم سەرکەوتنە کرد[3] ، زیاد لە سی هەزار ( ٣٠٠٠٠ ) سەرباز لە سوپاکەی (محمد علی) کوژران و بە و شێوەیە دوژمنان هێزەکانی (محمد علی)ان بێ هێز کردوو پارچەیەکیشیان لە وڵاتی ئیسلام و

---

1 ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي ، ص١٠٠ .

2 ) هەوان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٠٠ .

3 ) بڕوانە : دور الكنيسة هدم الدولة العثمانية ، ص٧٧ .

دەوڵـەتی عوسمـانی کـردەوە و فەڕەنساو ئینگلتـەرە کـارێکی دوو سـەریان کـرد ، لـە لایەکـەوە هـانی سوڵتانیان دا کـە سـوپایەك بنێرێـت بۆ ئـەوەی یـا خیبـوان لـە وولاتـی یۆنـانـدا سـەرکوت بکات و لەلایەکی ترەوە ئەو سوپایەیان لە وولاتدا قەتڵ و عام کرد ......

کە (محمد علی) والی میصر ئەمەی بینی بەسەر سوپاکەیدا هاتووە فەرمانی بە کوڕەکەی کرد کە پاشەکشە بکات و هێزەکانی فەڕەنسا هەموو ئەو شوێنانەیان گرت کە سوپای (محمد علی) لێ ی کشابوونەوە ، فەڕەنسا و ئینگلتەرە کۆنگرەیەکیان بەست و بڕیاریان دا کە وولاتی یونان لە دەوڵەتی عوسمانی جیا ببێتەوە بەو مەرجەی کەسێکی نەصرانی فەرمانڕەوایی بکات کە بەڕای هەرسێ وولاتەکە هەڵی ببژێرن ... خوای گەورە ڕاست ئەفەرموێ ﴿ وقد مكروامكرهم وعندالله مكرهم وإن كان مكرهم لتزول منه الجبال ﴾ (ابراهيم ٤٦) فێڵ و تەڵەکەی وا ئەکەن شاخ لە بن ئەهێنێ .

یان ئەفەرموێ ﴿ ولا يزالون يقاتلونكم حتى يردوكم عن دينكم ان استطاعوا ﴾ البقرة /٢١٧ ، بەردەوام شەڕتان پێ ئەفرۆشن تا لە دینەکەتان پاشگەزتان ئەکەنەوە _ ئەگەر بۆیان بکرێت _ هەروەها ئەفەرموێ ﴿ لايرقبون مؤمن الا ولاذمة ﴾ التوبه : ١٠ ، نە خزمایەتی و نە پەیمان هیچیان ڕەچاو ناکەن دەرحەق بە ئیماندار ... دوژمنان لەگەڵ خەڵکانی هەر بەناو موسڵمان و لە سەردەمی سوڵتان محمودی دووهەمدا دەستیان دایە پیلان گێڕان بۆ داگیرکردن و بەتاڵان بردنی وولاتانی ئیسلام [1].

**یازدەیەم / ( محمد علی ) پاشا دەست بەسەر شامدا ئەگرێت و ئەکەوێتە شەڕفرۆشتن بە دەوڵەتی عوسمانی :**

سیاسەتمەداری بەریتانی و فەڕەنسی یەکان بینیان ڕێگە دان بەوەی (محمد علی) سوپاکەی بەرەو شام و پاشان بەرەو ( ئەنا ضنول ) بەرێت ، خزمەتێکی باشی بەرژەوەندی یەکانی ئەمان ئەکات چونکە ڕێگە ئەگرێت لە دەسەلاتی بەردەوام ڕوو لە زیادی ڕووسیا لە موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ، (محمد علی) یش بەم بیرکردنەوە دڵخۆش بوو چونکە بەتایبەتی خزمەت بە ئامانجەکانی ئاغا ئینگلیزەکان ئەکات ، ئەوەش وا ئەکات مرۆڤ ئەم قەناعەتە بسەلمێنێ ئەوەیە ئینگلتەرە زۆر بەتوندی دژایەتی ئەوەی ئەکرد کە (محمد علی) کار لەسەر ئەو پێشنیارەی فەڕەنسا بکات و پەلاماری جەزائیر بدات ساڵێك پێش ئەوەی پەلاماری

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، ص١٠١ .

شام بدات ، نەك هەرئەوە بەڵكوو هەڕەشەی ئەوەیشیان لێ کرد کە پەلاماری کەشتیگەل و سوپاکەشی ئەدەن ئەگەر کاری وابکات و پەلاماری جەزائیر بدات ، ئەوە بوو کار گەیشتە ئەوەی لە جێبەجێ کردنی ئەو کارە پاشە کشە بکات هەرچەندە ڕێکەوتنامەیشی مۆر کردبوو لەگەڵ فەڕەنسی یەکانداکەوەها کارێك بکات ... ئەمەیە وائەکات بوترێ (محمد علی) لەبەر نەخشە و فشاری بەریتانیا وازی لە شەڕی جەزائیر هێنا ، چونکە ئەمیان ( واتە شەڕ فرۆشتن بە شام ) یارمەتی بەریتانیا ئەدات پەرچ لەبەردەم دەسەلاّتی ڕوسیادا دروست بکات کە بەردەوام لە زیاد کردندا بوو لە ناوچەکەدا ... هەرچۆنێك بێت ، (محمد علی) زۆر هەوڵی ئەوەی ئەدا ڕۆڵی ڕاستەقینەی خۆی بشارێتەوە و وای دەربخات کە لە بەر فلاّنە هۆ و فیسار هۆ پەلاماری شام ئەدات وەك ئەوەی ئەیوت (( عبداللە پاشا )) والی (( عکا )) دالّدەی شەش هەزار هاوولاّتی میصری داوە کەلە خزمەتی سەربازی لە سوپای (محمد علی) هەلاّتوون تەنیا لە ساڵی ١٨٣١ ز و ئەوەیشی قبوڵ نی یە بیانگێڕێتەوە ، یان گوایە ( عبداللە پاشا ) فشار ئەخاتە سەر بازرگانەکانی سەر بە پاشاو بەزۆر شتیان پێ ئەکات ، (محمد علی) نامەیك بۆ ( باب العالی ) ئەنوسێ و ئاگاداری ئەکاتەوە کەلەبەر ئەو هۆیە پەلاماری ( عبداللە پاشا ) ئەدات ، " صەدری ئەعظەم " یش لە وەلاّمدا نامەیەکی بۆ ئەنوسێ کە ئەو کەسەی لێکۆڵەرەوە بێت لەو نامەیەوە بۆی دەرئەکەوێت کە دەوڵەتی عوسمانی لە چ بێهێزی یەکدا ژیاوە لەو کاتەدا و چۆن نەیتوانیوە ڕێگە لە (محمد علی) بگرێت کەتێیدائەڵێ : (( شکاتکردنی هەندێ بازرگان پاساوی ئەوە نادات کە شمشێر بخرێتە کار وئاگری شەڕهەڵبگیرسێت، و ئەو دووبەرەکی و ناکۆکیەش لە نێوان پاشاکانی دەرو جیراندا ڕووئەدات ڕاست نی یە بە هێزی شمشێر چارەسەر بکرێت بەڵکوو چارەسەر بەوەیە کە باب العالی دەخالەت بکات ) [1] .

(محمد علی) بەم قسانەی ( صەدری ئەعظەم) قایل نە بوو ، بۆیە بەسەرکردایەتی (ئیبراهیم پاشا)ی کوڕی سوپاکانی خستە ڕێ و مارۆنیەکانیش بە هەموو شێوەیەك پشتیوانیان کرد لە (محمد علی) و لەگەڵیدا هاو هەڵوێست بوون ، فەڕەنسی یەکانیش هانی (مارۆنیە مەسیحی یەکانیان) ئەدا کە لەگەڵ (ئیبراهیم پاشا)دا بن و چەکی باشیشیان پێ دان ، و نەصرانی یەکانی شامیش ڕایان گەیاند کە ئیبراهیم پاشا هاورێ و دۆستیانە و ئامادەیی تەواویان دەربڕی بۆ هاوکاری کردن ، (ئیبراهیم پاشا)ش هەموو ئەو ئەرکانەی لەسەر جولەکە و نەصاری

---

[1] ) بڕوانە : قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين ، ص١٩٢ .

هه بوون ( تەنیا ئەوان ) هەڵگرت لەهەر وولاّتێکدا کە ئە کەوتە ژێر دەستیان بە هۆی ئەوەی کە بانگەشەی بۆ ئازادی و یەکسانی ئەکرد [1]. ئەوانەش بەڵگەی بەهێزن کە( ئیبراهیم پاشا)ش لەژێر کاریگەری کۆڕی ماسۆنیەتدا بووە ، ئەو کۆڕەی سەر بە فەڕەنسا بوو کە بە هەموو جۆرێك پشتی نیازەخراپەکانی کانی خۆی و باوکی ئەگرت )) [2].

هەرچەند سوپای (ئیبراهیم پاشا) توانی سوپای عوسمانی تێك بشکێنێ و توانی بەتەواوی دەست بە سەر ( شام ) دا بکێشێ ، بەلاّم عوسمانیەکان لەوەدا سەرکەوتوو بوون کە خەڵکیان هاندا لە (ئیبراهیم پاشا) و زۆر شتیان کردە هۆ بۆ ئەم بێزار بوونە ، وەك هۆی ئایینی یان ئابوری بەتایبەت دوای ئەوەی کە ( ئیبراهیم پاشا ) دەستی نابویە بینی موسڵمانان لە کاتێکداکە ئەو پەڕی ئازادی دا بوویە نەصاراو جولەکەکان ، و کارەکە گەیشتە ئەوەی کە ڕێکەوتنامەی "لندن " لە ساڵی ١٨٤٠ ز دا مۆر بکرێت ، ئەو ڕێکەوتنامەیە کە بوونی دەسەلاّتی میصری ( بۆ والی میصر ) لە شامدا بەوە دیاری کرد تا (محمد علی) لە ژیاندا بمێنێت [3].

قۆناغەکانی داگیرکاری (محمد علی) بۆ وولاّتی شام ئەوە دەردەخات کە ئەو کابرایە چەندە دوژمن بووە بە موسڵمانان و چەندە هاوکارو پشتیوان بوو بۆ جولەکە و نەصاراکان ، ئەوەش دەردەخات کە (محمد علی) لە شامدا خزمەتکارێکی ئامانجەکانی بەریتانیا بووە و لە ڕووی سیاسیەوە (ئیبراهیم پاشا) دەرگای خستە سەر پشت بۆ تیمە تەبشیری یە فەڕەنسی و ئەمریکایی یەکان ، چی یاسای قۆڕخکراویش هەیە دەربارەی نصاری ( بەتەنیا ئەوان ) هەمووی هەڵوەشاندەوە و هەندێ لە نوسەران ساڵی ١٨٣٤ ز بەساڵی وەرچەرخانی مێژوویی و ساڵی ( یەسوعیەکان ) دا ئەنێن .

لەم ساڵەدا تیمە ئەمریکی یەکان بە هەموو لایەکدا بلاّو بوونەوە ، و چاپخانەی شاندە ئەمریکای یەکان لە مالطاوە گوازرایەوە بۆ ( بیروت ) و لەوێدا قوتابخانەیەکی بۆ ئافرەتان دروست کرد لەسەر دەستی "ایلی سمیث " و ژنەکەی دا [4]. چاپخانە درا بە هەندێ

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٢ .

[2] ) بڕوانە : الجامعة الاسلامية ، احمد الشويكة ، ص١٠١ .

[3] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص١٩٣ .

[4] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٣ .

لەكڵێساكانی تر بە پێی ئەو بەرنامەیەی كە دەوڵەتە ئەوروپی یەكان هەیان بوو تا چاپخانە و پەخش تەنیا لە دەستی مەسیحی یەكاندا بێت تا بتوانن بگەنە هەموو ئامانجەكانی خۆیان لەو كاتەدا كە موسڵمانەكان دەستەوسانن لە پەیداكردنی ئەو كەرەسانەی كە لەڕێگەیەوە بیروڕاكانی خۆیان بەدنیادا بڵاوبكەنەوە لەم بوارەدا [١] .

چوونی سوپای (محمد علی) پاشا بۆ شام خاڵی دەستپێكردن بوو بۆ ئەوەی تیمە مژدەدەرەكان ڕۆڵیان دەست پێ بكات ، ئەگەر كوڕەكەی ئەو نەبوایە پشتی بگرتنایە ، ئەقڵیان هەر بە گۆجی و بیروباوەڕیان بە گەنیوی ئەمایەوە .

كردنەوەی كۆلێژی " عين طورة " كە جارێكی تر دەرگای كرایەوە و تا ئێستا هەرماوە _ ڕۆڵێكی گەورەی بینی لە دروست كردنی چەندان كادیرو بیرمەندا ، لە هەمان كاتدا (محمد علی) سیاسەتێكی خوێندنی لە ناو موسڵماناندا پەرەپێدادا كە ئامانج لێ ی ئەوە بوو خەڵكی فێری ناسیولیزمی بكات لە وڵاتی شام دا ، ئەوە بوو لە میصرەوە كابرایەكی فەرەنسی بە ناوی " كلوت بگ " [٢] وە هێنا بۆ ئەوەی سەرپەرشتی ئەم سیاسەتە بكات چونكە ئەزمونێكی باشی لە میصردا وەرگرتبوو لە كاتی جێبەجێكردنی ئەم سیاسەتەدا ، و یەك چابخانەش بە هەموو كەرەسەكانەوە خرایە ژێر دەستی تا بە عەرەبی ئەو كتێبانە بڵاو بكاتەوە كە ئەم ئامانجەی بۆ ئەهێنێتە دی ، ئەگونجێ بە هەموو ئەم كەرەسانە _ و بە هاوكاری شاندەكانی بە فەلەكردن و پیاوانی كە هەنووتی لە كڵێساكاندا _ لە چەند ساڵێكی كەمدا هاوكێشەكانی خوێندن و پەروەردە هەموو هەڵبگێڕنەوە و ئامانجەكانی كوڕە ماسۆنیەكان فەرەنسا بهێننەدی لە ئەم شەڕفرۆشتنەیدا بە موسڵمانان و بە ئیسلام [٣] ) .

لە و كاتەدا كە سوپای (محمد علی) ڕێگەی خۆش ئەكرد بۆ نەصارەكان لە وڵاتی شامدا و شەوكەتی موسڵمانانی لاواز ئەكرد ، سوپای فەرەنسا و لە ساڵی ١٨٣٠ ز دا جەزائیری داگیر كرد پاش ئەوەی خیلافەتی عوسمانی لاوازی ڕووی تێكردوو بە خۆی و نزیكەی بیست و هەشت هەزار جەنگاوەر وگەلەكەشتیەك كە سەد كەشتی و سێ بارهەڵگر كە بیست حەوت هەزار سەربازی دەریای بەسەرەوە بوو چوونە ناو جەزائیر و دەوڵەتە ئەوروپای یەكانیش

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٦ .

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٦ .

[3]) هەمان سەرچاوەی پێشوو . ص١٩٦ .

پشتیوانیان کرد لەم داگیرکاری یە بیٚ شەرمانە ، کاتی ئەوە هات ئیتر دەست بە دابەشکردنی میراتی پیاوە نەخۆشەکە بکەن لەسەرڕێو ڕێچکەی ئەورووپا .
لێرەدا جیٚ ی خۆیەتی بپرسین ، باشە (محمد علی) پاشای والی میصر لە کویٚ بوو کاتێك کە فەرەنسی یەکان وولاّتی جەزائیریان داگیر کرد ؟ بۆچی خۆی کڕکرد ؟ ئایا لەبەر ئەوە بوو کە هیچی نەبوو پشتیوانی لەجیهادی گەلی موسڵمانی جەزائیر بکات ، یان لێیان دوور بوو نەئەگەیشت پێیان ؟ یان لەبەر ئەوە بوو کە لە پاداشتی بیٚ دەنگ بوونی دا دەوڵەتە ئەورووپای یەکان و لەوانە فەرەنسا ، لێئەگەڕێن (محمد علی) هەر بە پاشاو والی میصر بمێنێتەوە و هەلی یەك خستنەوەی وولاّتی شام و میصری بۆ بەجیٚ دەهێڵن ، یان پەیمان و وادەی کارێکی تری پێدرا بوو کەلە پشت پەردەوە بۆیان چنی بوو ؟
(محمد علی) چنگول و خەنجەرێکی ژەهراوی بوو کە دوژمنان بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکانیان بە کاریان ئەهێنا بۆیە لەو ڕاپەڕینە زانستی و ئابوری و سەربازیەی دەستی دایە لە گەڵیدا بوون و هاوکاریان دەکرد پاش ئەوەی دڵنیا بوون لەوەی کە لایەنی ( عەقیدە ) و ئیسلام لە خۆی و یاریدەدەرو سەربازەکانیدا کز بووە [1] .
ڕۆڵی (محمد علی) لە ناوچەکەدا بە گشتی ئەوەی لێئەکەوتەوە کە دەوڵەتە ئەورووپای یەکان ڕادەی بێهێزی دەوڵەتی عوسمانی یان ڕوونتر بۆ دەرکەوت و بەو شێوەیە خۆیان ئامادەکرد بۆ دابەش کردنی زەوی و زارەکانی، ئەو کاتەی کە هەل و مەرجە سیاسی یەکان سازو ئامادە ئەبن [2] .
لەدوای ئەوەی کە سوپاکانی عوسمانی لەبەردەم سوپاکانی " (محمد علی)" دا لە شام و(ئەناچۆڵ)دا شکا دەوڵەتی عوسمانی ناچار بوو داوای یارمەتی لە ڕوسیا بکات ، چونکە لەوە تێگەی کە (محمد علی) بەریتانیا و فەرەنسا بونەتە باوان بۆی ، ئەوە بوو کە ڕێکەوتنامەی ((نکیار ئەسکلە سی )) لە ساڵی ١٨٣٣ زدا کەوتە نێوانیان داوای ئاگربەستی ( کوتا هیە )) ئەم ڕێکەتنامەیە وەك هاوپەیمانێتی بەرگری کردن لەیەك وا بوو لە نێوان ڕوسیا وعوسمانی یەکاندا ، ئەمە وای کرد کە بەریتانیا و فەرەنسا بچن بە گژ" محمد علی " دا لە ترسی ئەوەی نەك ڕوسیا دەست وەربداتە ناوچەکە و بۆیە ڕێکەوتنامەی لەندەنی لەسەر فەرز کرد لە ساڵی

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي ، ص١٠٢ –١٠٣ .
[2] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثمانية ، ص١٩٧ .

١٨٤٠ زدا ، ئەم ڕووداوانە وای کرد هەوڵەکانی سوڵتان محمودی دووەم بۆ چاکسازی لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا لەبار بچن و ئەمەیش وای کرد دەوڵەتی عوسمانی ناچاری مل بدات بۆ ئەوەی دەوڵەتە ئەوروپای یەکان لە چاوبرسێتی (محمد علی) بپارێزن ،ناچار قبوڵی کرد لە ژێر (( وصایە )) ی ئەوان دا بێت ،![1] .

ئا بەو شێوەیە نەخشەی دوژمنانی ئیسلام بۆ (محمد علی) نەخشەیەکەی وردو لە ڕووی لێکۆڵینەوەوە دانرا بوو ، تا ناوچەکە هەمووی ساز بکەن بۆ قۆناغێکی تری ئیمپریالیزمی کە تا ئەمڕۆیش میللەتی ئیسلامی بە دەست ئاسەوارەکانی ئەو داگیرکاری یەوە ئەناڵێنێ ، سیاسەتی نەصرانیانەی ئەوروپا توانی لە ڕێگەی بەکریٚ گیراوێکی دڵسۆزی وەك " (محمد علی) " یەوە ئەم هەموو ئامانجە بەدەست بهێنێت :

١- ڕووخاندنی دەوڵەتی یەکەمی‌سعودیە کە خەریك بوو ئەبوویە بەربەستێکی سەخت لەبەردەم چاوبرسێتی بەریتانیا لە ڕۆژهەلاًتدا بە گشتی و لە کەنداوی عەرەبی دا بەتایبەتی .

٢- دەرگا خستنە سەر پشت بۆ ئەوەی چەندان دامەزراوەی دوژمن بە ئایینی ئیسلام و موسڵمانان دروست بکرێت وەك : کۆڕەکانی ماسۆنیەت ، شاندە تەبشیری یەکان ، کڵێساو شوێن دروست کردن بۆ ڕاهی یەکان و دروست کردنی قوتابخانە بۆ چاندنی تۆی ڕەوتە ناسیونالیزمیەکان تا بدرێن بەگژ ئیسلامدا و ڕەواج بدەن بەو بیروباوەڕانەی کەلە بەرژەوەند یەکانی میللەتی ئیسلام ئەدات .

٣-ڕێگە دان بە کۆپانیاکانی بازرگانی ئەورووپیەکان تا دەست بەسەر بواری ئابوریدا بگرن .

٤- دانی ( امتیازات ) ێکی بەربلاًو بە ئەوروپاییەکان . گرتنەوەی ئەو ( امتیازاتانە ) لە خەڵکی شام و میصر .

٥ -خنکاندنی ڕەوتی ئیسلامی و بەرتەسك کردنەوە لە زانایان و شەرع زانەکان و ڕێگە پیٚ نەدانیان کە کاری کوتلەیی بکەن لە پێناو ئامانجە پیرۆزەکانیاندا .

٦- (محمد علی) بوویە نمونەیەك تا دەوڵەتە ئەورووپای یەکان لەگەڵ هەموو کەسێکدا بەو شێوەیە بکەن کاتێك ئەیانەوێت بیکەنە هەڵقە لە گوێی خۆیان لە ناو دنیای موسڵماناندا ، بۆ نمونە کەمال ئەتاتورك و جگە لەویش .

---

[1] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٠٨ .

پاش ئەوەی کە دەوڵەتە ئەوروپای یەکان لە ڕێگەی (محمد علی) هەڵقە لە گوێی خۆیانەوە ئامانجەکانیان هێنایە دی ، کاتی ئەوە هات هێزەکانی خۆیشی لاواز بکەن ،بۆیە ئینگلیز بەبێ پەردە کەوتە دژایەتی هێزەکانی (محمد علی) و بە هاوکاری خەڵکی شام توانی شکست بە هێزەکانی بهێنێت و دەست بەسەر سنورەکانی شامدا بگرێت و لەو شەڕەدا سێ لە سەر چواری هێزەکانی (محمد علی) تیا بچێت کە لە ڕۆڵەکانی میصرو شام پێك هات بوون ، ئینگلیز وای کرد کە بەناچاری (محمد علی) ڕێکەوتنامەیەك مۆر بکات کە ئەمانە گرنگترین خاڵەکانی یەتی :_

١- دەست لە فەرمانڕەوایی وولاتی شام هەڵبگرێت و لەبەرامبەر دا بە فەرمانڕەوایی میصر بمێنێتەوە و سیستەمی پشتاوپشت پیادە بکات بۆ خۆی و مناڵەکانی لەوەو دوا .

٢- ئەبێت تەنیا هەژدە هەزار سەربازی هەبێت لە میصردا .

٣- نابێت میصر گەلەکەشتی جەنگی دروست بکات .

٤- نابێ لە سوپای میصردا ئەفسەری دەرەجە داری بەرزتر لە ( ملازم ) هەبێت .

ساڵانەش ئەبێت هەشتا هەزار کیس بداتە دەوڵەتی عوسمانی .

فەڕەنساو بەریتانیا کەوتنە ورووژاندنی فیتنەی تایفەگەری .. ( لە ساڵی ١٨٤١ زی یەوە تا ساڵی ١٨٦٠ ز ) لە نێوان کەمایەتیە ناموسڵمانەکانی لوبناندا ، ئامانجیش لەمە لە لایەکەوە ئەوە بوو کە هێزە عوسمانی یەکان شەکەت بکەن ، ئەو هێزانەی کە بۆ دامرکاندنەوەی فتنەکە ڕەوانەکرا بوون ، و لە لایەکی ترەوە بیانو بۆ دەست وەردانە لوبنان دروست ببێت لە لایەن بەریتانیا و فەڕەنسا وە تابیکەنە سەرەتایەك بۆ لەت و پەت کردنی و پاشان داگیرکردنی [1] .

ڕوسیا ( ئەفلاق) و ( بەندان ) ی داگیرکرد ، و ڕێکەوتنامەیەکی تر بەناوی ( بلطە لیمان ) لە نێوان عوسمانی و ڕوسیا دا لە نزیك ئەستەنبوڵەوە لە ساڵی ( ١٢٦٥ك _ یونیوی ساڵی ١٨٤٨ز ) مۆر کراو بە پێی ئەو ڕێکەوتنامەیە ئەبوو سوپای ڕوسی عوسمانی لە و دوو هەرێمەدا بمێنێتەوە تا بارودۆخەکە جێگیر دەبێت ! ، ئاخر ڕوسیای کافر چ پەیوەندی یەکی بەمەوە هەیە ؟ ! بەم فرتو فێڵە نەصرانی یەکان پێگەیەکی سەربازی یان بۆ دروست بوو لە ناو وولاتی ئیسلامدا ﴿ وان كان مكروهم لتزول منه الجبال ﴾ ( ابراهيم : ٤٦ ) .

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٠٨ .

ململانیٚ گەرم بوو لە نێوان دەوڵەتە ئەوروپای یەکاندا لەسەر دابەش کردنی هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی ( ماڵ ومیراتی پیاوە نەخۆشەکە [1] ) ، ئەو دەوڵەتانەی کە زۆر گرنگی بە چارەنوسی دەوڵەتی عوسمانی و موڵکەکانی ئەدا ئەمانە بوون :-

١- بەریتانیا ، کە زۆر لای گرنگ بوو ڕێگەی هات و چۆ بۆ ڕۆژهەلآتی ئەوسەرو هیندستان بەتایبەتی دەستەبەر بکات و ڕێگەی بازرگانی سازو بیٚ ترس بکات لەگەڵ هیندستان ، ئیتر لە ڕێگەی " سویس" ەوە یان " دەریای سورەوە " بێت یان لە ڕێگەی کەنداوی عەرەبی و هەردوو ڕووباری دجلە و فوراتەوە بێت .

٢- ڕوسیای قەیسەری کە ئەیویست ڕێگەیەکی دەست بکەوێت لێوەی لە دەریای ڕەشەوە بگاتە ئاوە گەرمەکانی دەریای ناوەڕاست ، ئەوەش بە ئەوە دەبێت کە دەست بەسەر ( قوستەنتینیە و تەنگاوی "بسفور " و "دردنیل " دا بگرێت ..

هەروەها ڕوسیا ئەوەشی ئەویست کە دەسەلآتێکی گەورەی هەبێت لە نیوە دوورگەی بەڵقاندا بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی گەورەی سلاڤی دروست بکات لەوێدا .

٣- فەڕەنسا ، کە هەر زوو ئەرکی پاراستنی بەرژەوەندی یەکانی هاوولآتی یە نەصرانە کاثولیکەکانی گرتەئەستۆی خۆی لە وولآتی شام بە شێوەیەکی گشتی و مارۆنی یەکان لە لوبناندا بە شێوەیەکی تایبەتی ، هەروەها ئەیویست بیٚ ترس بەرژەوەندی یەکانی خۆی لە ناوچەکەدا بپارێزێت و دەسەلآتی بگاتە ئەو موڵك و هەرێمانەی کە وولآتانی تری لێیە لە کەنارەکانی باکوری ئەفریقادا ، بەتایبەتی لە تونس و جەزائیر دا .

٤- بێجگە لەم سیٚ دەوڵەتە سەرەکی یە کە باسمان کردن ، هەندیٚ دەوڵەتی تر هە بوون وەك ( نەمسا ) و ( بروسیا ) گرنگی یان بە چارە نوسی دەوڵەتی عوسمانی ئەدا ، ئەو دەوڵەتەی کە هەموو کەس چاوەڕوانی تیاچوون و کوژانەوەی ئەکرد ، بۆیە ناو نرا ( پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا ) [2] .

فاکتەری زۆر ڕۆڵیان ئەبینی لەوەدا کە پرسی ڕۆژهەلآت بەم شێوەیە دەربکەوێت و بێتە بوون ، لەوانە :-

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٠٨ .

[2] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د . اسماعيل ياغي ، ص١٤١ .

١- ئەو ڕێگەیەی کە ڕوسیا بتوانییّت لیّوەی بگاتە ئاوە گەرمەکان ، هەر ئەو ڕێگەیەیە کە دەریای ڕەش ئەبەستیّتەوە بە دەریای ( مەڕمەڕ ) ەوە و ئەویش بەدەریای ( ئیجە ) ەوە و لە دوای ئەوان بە دەریای ناوەڕاستەوە ، واتە : لە ڕێگەی هەر دوو تەنگاوی " بسفۆر " و " دردنیل " دا ئەبیّت بڕوات ، دەی ئەو دوو تەنگاوەش لە ژێر چنگی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دایە .

٢- ئەو دەوڵەتە گەورەیەی بتوانیّت بنکەی بەهیّز لە دەریای ڕەش دا دابمەزریّنیّت ئەتوانیّت دەست بەسەر هەموو تەنگاوەکاندا بگریّت و ببیّتە خاوەنی سەنتەریّکی دیارو بەرچا و و بەو ڕێگەیەش ئەتوانیّت دەسەلاّتی خۆی بکیّشیّت بەسەر وولاّتانی حەوزەی ڕۆژهەلاّتی دەریای ناوەڕاست و ڕێگەکانی بازرگانیدا لە دەریای ناوەڕاستەوە تا ئەگاتە هیندستان و ئەوپەڕی ڕۆژهەلاّت .

٣- ئەو دەوڵەتەی دەسەلاّتی بگاتە بەڵقان ئەتوانیّت بخوڕیّت بەسەر هەموو گەلانی بەڵقاندا، کاتیّك دەسەلاّتی عوسمانی بپوکیّتەوە لەو ناوچەیەدا ، ئەو دەوڵەتە بنکەو دەسەلاّتیّکی وای بۆدروست ئەبیّت ئەتوانیّت فەرمانڕەوایی ( قوستەنینیە ) خۆیشی بکات و هەڕەشە لە هاوکیّشە دەوڵەتی یەکان بکات لە ئەوروپادا و ئەو هاوکیّشانە تیّك بدات ..[1] .

لە چارەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا ، دەوڵەتان بە گشتی ( فەڕنسا و ڕوسیا نەبیّت ) سیاسەتیان وای ئەخواست کە پاریّزگاری لە قەوارەی ئیپراتۆریەتی عوسمانی بکەن ، لەبەر ئەو فاکتەرانەی کە لە پیّشەوە باسمان کرد .

بەریتانیا لەو کاتەدا لە پیّشەوەی ئەو وولاّتانەوە بوو کە ڕایان وا بوو پاریّزگاری لە قەوارەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بکریّت[2] .

کە کار گەیشتە ئەوەی بتوانریّت ئەو بۆشای یە پڕبکریّتەوە کە لە نەمانی دەسەلاّتی عوسمانیدا بەسەر بەڵقانەوە دروست ئەبیّت ، بەریتانیا و هەموو دەوڵەتانی تریش وازیان لە و بنەمایە هیّنا کە پاریّزگاری لە دەوڵەتی عوسمانی بکەن و کەوتنە ئەوەی کە کار بکەن بۆ سەربەخۆ بوونی دەوڵەتەکانی بەڵقان ، ئەو دەوڵەتانەی کە سەربەخۆیی یان وەرگریت لە

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. عبدالعزيز الشناوي ، ( ١/ ١٩٤ ، ٢٣٢ ) .

[2] ) بڕوانە : الدولة العثمانية د. اسماعيل ياغي ، ص١٤٣ .

بەڵقاندا تا کۆتای سەدەی نۆزدەهەم بریتی بوون لە : (یۆنان) و (ڕۆمانیا) و (صرب) و (بولغاریا) )) [1] .

## باسی نۆیەم

### سوڵتان عبدالمجیدی یەکەم ( ١٢٥٥ _ ١٢٧٧ )ك ( ١٨٣٩ _ ١٨٦٠ ) ز.

سوڵتان عبدالمجیدی یەکەم هەر چەندە لەش و لاری بێهێز بوو ، بەڵام زۆر زیرەك بوو ، پیاوێکی بەسۆزو واقیع بین بوو ، لە ناو هەموو سوڵتانەکانی تری عوسمانیدا ئەم لە هەموویان بە قەدرتر بوو ، حەزی لە چاکسازی ئەکردوو ڕێکخستنە خۆی یەکانی هێنایە ناو ، دەستی کردە کارکردن لەسەریان ، و چاکسازی زۆری کرد لە سوپاکانی عوسمانیدا و لەسەردەمی ئەمدا زانیاری و زانست پێشکەوتنی باشی بەخۆیەوە بینی ، و بازنەی بازرگانی فراوان بوو ، خان و کۆشکی زۆر دروست کرا ، هێڵی تەلەفون و هێڵی ئاسنینی شەمەندەفەر لەسەردەمی ئەمدا دامەزرا [2] .

پاش مردنی باوکی ( واتە سوڵتان محمودی دووەم ) لە ساڵی ١٨٣٩زدا دەسەڵاتی گرتە دەست کە ئەو کاتە تەمەنی شازدە ساڵ بوو ، ئەم منداڵیەی هەلی بۆ هەندێ لە وەزیرە غەربزەدەکان(*) خۆش کرد کە ئەو چاکسازی یەی باوکی دەستی پێکرد بوو لەسەر ڕێچکەی ئەورووپای یەکان بەردەوام بێت ، و زۆر ڕۆبچن بۆ داهێنانی کەرەسەی ڕۆژئاوایی ، یەکێك لەو وەزیرانە کە لەبەرگی خەڵکی ڕیفۆرم خوازو پیاوی چاك دا خۆی پیشان ئەدا ( مستەفا ڕەشید پاشا ) بوو ، کە باڵوێزی دەوڵەت بوو لە ( لەندەن ) و ( پاریس )و دا لە کۆتای یەکانی سەردەمی سوڵتان محموددا بەرز بوویەوە بۆ پلەی وەزیری دەرەوە .

نۆبەرەی چاکسازی یەکانی بریتی بوو لە دەرکردنی مەرسومێکی سوڵتانی ناونرا ( بەرنامەیژیرۆزی گوڵخانە) واتە مەرسومێك کە بە دەسەخەتی سوڵتان تاجی لەسەر نراوە ، ئەم مەرسومە لە ( سرای زەهر ) و لەساڵی ( ١٨٣٩ ز ) دا دەرکرا کە تێیدا هاتووە ئەڵێ : ( ...

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٤٤ .

(*)(غەربزەدەکان)زاراوەیەکەبۆئەوانەمان بەکارهێناوەکەلەژێرکاریگەری بیروبەهای ڕۆژئاوادان.(وەرگێڕ:ن)

[2] ) بڕوانە : تأريخ الدولة العثمانية ، د. علی حسون ، ص١٩٨ .

له هیچ كەس شاراوە نی یە كە دەوڵەتە بەرزەكەی ئێمە لەو كاتەوە دروست بووە و تائێستاش بۆ ئەوە بووە پارێزگاری لە بڕیارە بەنرخەكانی قورئان و ئەو یاسا شەرعیانەش بكات كە تەواوكەری ئەون ، بۆیە سوڵتان و هێزی دەسەلاتمان لە خۆشگوزەرانی وئاوەدانی ناو خەڵكدا گەیشتە ئەوپەڕی مەبەستی ، بەلام ئەوە بۆ سەدو پەنجاساڵ ئەچێت كارەكە پێچەوانە بووەتەوە و هۆكەشی ئەوەیە كە گوێڕایەڵی و ملكەچی لەناو خەڵكدا بۆ شەرعی پیرۆزی ئیسلام و ئەو یاسا هەڵگۆڕاوانە لە ئەوەوە نەماوە ، لە بەرزۆر هۆو شتی تازە كە یەك لە دوای یەك هاتووە بەسەر خەڵكدا و وای لێهاتووە لەبری هێز لاوازی دروست بووە و لەبری سەروەت و سامان هەژاری .... ) [1] ، پاشان چەند بەیانی تر دەركراو ئەكرێ هەندێكیان لەم خاڵانەدا كورت بكەینەوە :-

١- پاراستنی ژیان و ناموس و سەروەت و سامانی هاوولاتیان بە شێوەیەكەی گشتی بێگوێدانە بیروباوەڕە ئایینی یەكانی

٢- دابینكردنی ڕێگەیەكی دروست بۆدابەشكردن و وەرگرتنی باج .

٣- ڕەچاوكردنی دادو یەكسانی لەتەوزیم كردنی سەربازی و ماوەی دیاری كراویدا .

٤- یەكسانی دروست كردن لە ( نێوان موسڵمان و ناموسڵماندا لە ئەرك و مافەكاندا) [2] بچێتەسەردێڕ سەردەمێكی تازە دەستی پێ كرد كە بە سەردەمی( ڕێكخستنە خێرخوازی یە عوسمانی یەكان ) ناو دەبرێت كە لەناو ئەو ڕێكخستنانەدا ئەم بڕیارە هە بوو كە ڕێز لە ئازادی یە گشتی یەكان ئەگیرێت و ڕێز لە خاوەنداریتی و كەسایەتی هەموو كەس ئەگیرێ بەدەر لەوەی سەیری بیروباوەڕە ئایینی یەكان بكرێ و بەدەق بڕیاری ئەوە درا كە هەموو خاوەن ئایینێك لەبەردەم یاسادا یەكسانن ) [3] .

له دوورگەی ( متلینی ) كۆمەڵێك لە پیاوانی ئایینی یۆنانی و ئەرمەنی و جولەكە كۆبونەوە و لەوێدا ( رضا پاشا ) كە بەكەسێكی ڕیفۆرمخواز دا ئەنرێ بە ناوی سوڵتانەوە هەستایەوە و وتارێكی بۆ دان و ووتی : بەڕێزان ! موسڵمانەكان و جولەكەكان و نەصاراكان ، ئێوە هەموو

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. علی حسون ، ص١٨٥ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٨٨ .

[3] ) بڕوانە : الأنحرافات العقيدية والعلمية ، د. علی الزهراتي (٢٦٦/٢ ) .

هاوولاتی یەك ئیمپراتۆرن و كوڕی یەك باوكن ، سولتان بەیەك چاو سەیری هەمووتان ئەكات)[1] .

( ئەم بەرنامە پیرۆزە)یان ئەم دەستورەی كە ( مستەفا ڕەشید ) و هەندێكی كەمی چواردەوری پشتیوانیان لیێ ئەكرد ڕای گشتی موسلمانانی عوسمانی پێشوازیان لیێ نەكرد و پشتیان نەگرت و زانایان نكوڵیان لیێ كردو هەستان فتوای كافربوونی ( ڕەشید پاشا ) یان دەركرد و وایان دانا كە ئەم بەرنامەپیرۆزە دژ بە قورئانی پیرۆزە بە شێوەیەكی گشتی و بەتایبەتی لەو بڕگەی دا كە موسلمان و مەسیحی یەكسان ئەكات بەیەكتری ، و وایان ئەبینی كە ئەم بڕیارە _ بەدەر لە لایەنە ئایینی یەكەی _ ئەبێتە مایەی پشێوی نانەوە لەناو هاولاتیانی سولتاندا لە ڕاستیشدا ئامانجی بزوتنەوەی ماسۆنیەكان هەر ئەوە بوو ، زیندوكردنەوەی هەستی ناسیونالیزمی لەناو گەلە مەسیحی یەكاندا دژ بە دەولەت ) [2] .

ئەم مەرسومە خەنجەرێكی تا خواری خوارەوە دا لە بیروباوەڕی ( ولاء ) و ( براء ) و كۆمەڵێكی زۆر لە یاساكانی شەریعەتی ئیسلامی وەلانا كە پەیوەندن بە چۆنیەتی هەڵسوكەوت و پەیوەندی موسلمانان لەگەڵ ناموسلماناندا ) [3] .

ئەوەی سەرنجی مرۆڤ ڕادەكێشیێ كە دەركردنی( بەرنامەی پیرۆزی گوڵەخانە )( * ) ئەوەیە ئەم دەستورە ئەو نرخە بوو كە بەریتانیاو دەولەتە ئەوروپی یەكان لە سولتانی عوسمانیان سەند لە بەرامبەر ئەوەدا كە كێشەی نێوان ئە و (محمدعلی پاشا) والی میصر یان چارەسەر كرد ، ئەو والی یەی كە ئەیویست جیا ببێتەوە و سەربەخۆیی خۆی ڕابگەیەنێت لەو ماوەیەدا كە پەیوەندی یەكانی نێوان میصرو عوسمانی یەكان گرژی كەوتە ناو وەك زانراوە ( ١٢٥٥ _ ١٢٥٧ ك/١٨٣٩ _١٨٤١ ز ) ، نابیێ لەم قسەیە ئەوە وەربگیریێ كە فشاری ئەوروپا بە شێوەیەكی گشتی و بەریتانیا بە شێوەیەكی تایبەتی ، تاكە فاكتەری دروست بوونی ئەو ڕێكخستن و بزاڤی ریفۆرم و چاكسازی یە بوو لەناو دەولەتی عوسمانی دا بە درێژایی سەدەی نۆزدەهەم ، بەلكوو بە دلنیای یەوە فاكتەرێكی تریش ڕۆلی لەم بزاڤە دا هە بوو ئەویش ئەوەیە دەولەت

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية دولة اسلامية مفترى عليها (٢٥٣/١ ) .

(*)(بەرنامەی پیرۆزی گوڵخانە)مان بەكارهێناوەبۆ(حظ شريف طلخانة).

[2] ) بڕوانە : قراءة جديدة في التأريخ العثماني ، ص٢٠٨ .

[3] ) بڕوانە : الآنحرافات العقدية والعلمية (٢م٢٦٧ ) .

خۆی و ئەوانەش کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری ڕۆشنبیری و شارستانێتی ئەورووپاوە بڕوایان بە پێویستی چاککردنی دەزگای دەوڵەت و تازەکردنەوەی هە بوو لەسەربناغەی (وەرگرتنی سیستمە ئەورووپی یەکان یان ئیلهام وەرگرتن لێیان بەبێ ئەوەی زیان بە یاسا شەرعی یەکان بگەیەنێت )[1] .

( بەم لێدوانە ترسناکانە کە دەوڵەت دەری کردن بۆ ئەوەی لە دەوڵەتە ئەورووپی یەکان نزیک ببێتەوە ... سوڵتان نەریتە عوسمانی یەکانی دڕاند و دەستی گۆڕانکاریشی برد بۆ شەریعەتی ئیسلام ، چونکە نەریت و شەریعەت هەردووکیان ڕێگەیان نەئەدا کە موسڵمانان و ناموسڵمانان هەمان مافیان هەبێت لە ژێر سایەی خەلیفەی موسڵماناندا ، ئەبێ جیاوازی بکرێت لە نێوان موسڵمانان خۆیشیاندا وەك چۆن لەناو ئەهلی زیمەدا جیاوازی ئەکرێ بەلاّم ئەم لێدوانە ترسناکە مانای خۆی هەیە ، ئەویش ئەوەیە پیاوانی دەسەلاّتدار دان بەوەدا ئەنێن کە نەریتە کۆنەکان بەکەڵکی ئەوە نەماون بکرێتە ترازوو بۆ حوکمکردن ، بۆیە پێویستە کەرەستەکانی ڕۆژئاوا وەربگرین و حوکمی پێ بکەین با لەگەڵ شەریعەت و نەریتی خۆیشماندا دژایەتی هەبێت )[2] .

(ڕەشید پاشا) ئەنجومەنێکی نوێنەرانی دروست کرد و یاسایەکی بۆ سزادان دەرهێنا لە ژێر ڕووناکی ڕژێمە تازەکاندا و پیاوێکی فەرەنسی هێنا بۆ ئەوەی یاسایەکی مەدەنی تازە بۆ دەوڵەت دابنێ ، و زۆر بە توندی دەستی دایە جێبەجێ کردنی ئەو یاسایانە و داوای لە خەڵك ئەکرد ڕێز لەو یاسایانە بگرن ، و پاش ئەوەش بانکێکی تازەی دەوڵەتی دروست کرد و دراوی کاغەزی لێدا[3] .

پاشان مەرسومێکی تر دەرچوو لە ساڵی ( ١٨٥٦ز ) دا کە سوڵتان عبدالمجیدی یەکەم هەموو ئەو یاساو بنەمانەی کەلەسەر زمانی ڕەشید پاشا دەری کردبوون دووپات کردەوە و هەندێ ( امتیازات ) و ( حصانە ) ی زیاتری دا بە هاوولاّتیانی ناموسڵمان لە دەوڵەتدا[4] ، وە ئەم

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٥٤ .

[2] ) بڕوانە : الشرق الاسلامي ، حسين مؤنس ، ص٢٥٦ .

[3] ) ئەم دراوەی لێدا بێ ئەوەی پاشخان ( رصيد ) ی کانزایی هەبێت بۆیە هەر خێرا نرخەکەی خۆی لەدەستدا .

[4] ) بڕوانە : الانحرافات العقدية والعلمية ( ٢/ ٢٦٨ ) .

مەرسومەی تر لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا بە ( هێڵی هەمایۆن ) ناو ئەبرا ، کە چاو نەترسی لەوە ی پێشوو زیاتر پێوە دیار بوو هەروەك لەوەی پێشوو زیاتر هەڵپەکردنی پێوە دیار بوو بۆ وەرگرتنی بەها لە ڕۆژئاواوە ، ئەم ( هێڵی هەمایۆن ) یە لەم بڕگانەی خوارەوە پێك دێت :_

١- هەڵوەشاندنەوەی یاسای گەردنگیری و لە ناوبردنی سووخواردن و گەندەڵی .

٢- بەر قەرارکردنی یەکسانی لە نێوان موسڵمانان و ناموسڵمانان دا لەسەربازی کردندا .

٣- هەموو هاووڵاتیانی دەوڵەت بەیەك جۆر مامەڵەیان لەگەڵ دا ئەکرێت هەردین و مەزهەبێکیان هەبێت [1] .

٤- پاراستنی هەمووئەو ماف و امتیازاتانەی کە پێشتر سەرۆکەکانی کۆمەڵە ناموسڵمانەکان هەیان بووە .

٥- لە ناوبردنی بەربەستەکانی ( یاسای کۆمەڵەکان = نظام الملل ) ، تا هەموو هاووڵاتی یەکی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە مافی هاووڵاتی بووندا بەیەکتری یەکسان بن .

٦- پێویستە ئەو پرسە مەدەنیانەی تایبەتن بە هاووڵاتیانی مەسیحی یەوە تایبەت بکرێن بە ئەنجومەنێکەوە کە تێکەڵە لە خەڵك و پیاوانی ئایینی مەسیحی کە(گەل) خۆی هەڵیان هەبژێرێت .

٧- کردنەوەی چەند پەیمانگەیەکی خوێندن لەبەردەم مەسیحی یەکاندا بۆ ئەوەی دەرگای کارەکانی دەوڵەت لە ڕوویاندا بکرێتەوە .

٨- ڕێگە بەخەڵکی بیانی ئەدرێت لە هەموو شوێنێکی دەوڵەتی عوسمانیدا زەوی بکڕێت ، هەروەك سوڵتان پەیمانی ئەوە ئەدات کە پشت ببەستێت بە سەرمایە و شارەزایی یە ئەورووپی یەکان بە ئامانجی ئەوەی ئلبوری دەوڵەت گەشە پێ بدات [2] .

سوڵتان عبدالمجیدی یەکەم بەیەکەمین سوڵتانێکی عوسمانی دائەنرێت کە شەرعیەتی بە برافی بە ڕۆژئاوایی کردن دابێت ، چونکە خۆی فەرمانی بە دەوڵەت کرد کە کار بکات بۆ ئەو مەبەستە و دوو فەرمانی سوڵتانی لە ساڵی ١٨٥٢ ، ١٨٥٦ زدا تایبەت بە (( ڕێکخستنەکان )) دەرکرد ، کە بەو دوو فەرمانە دەوڵەتی عوسمانی سەردەمێکی تازەی دەست پێکرد کە پاشترناو ئەبرا بە (( سەردەمی ڕێکخستنەکان (عهد التنظیمات) )) کە ئەوە زاراوەیەك بوو

---

[1] ) بڕوانە : تأریخ العرب الحدیث / مجموعة علماء ، ص١٤٠ .

[2] ) بڕوانە : تأریخ العرب الحدیث ، ص١٤٠ .

مەبەست پێی (( ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەت بوو بە میتۆدێکی ڕۆژئاواییانە)) ، بەم دوو فەرمانە ئیش کردن بە شەریعەتی ئیسلامی دوورخرایەوە و دەوڵەت دەستی دایە یاسا دانان و دروستکردنی دامەزراوەکان [1] .

ئەوەی ڕاستی بێت ئەوەیە کە سوڵتان عبدالمجید لە ژێر کاریگەری ڕەشید پاشای وەزیریدا بوو ، کە ئەو ماموستایەی بوی ئەگەڕا لە ڕۆژئاوادا دەستی کەوتوو" ئەو فەلسەفەیەی بە شوێندا وێڵ بوو لە ماسۆنیەتدا دۆزیەوە ، ڕەشید پاشا ئەو کەسە بوو کە بەرەی دووەمی دوای خۆی دروست کرد لە وەزیرەکان و پیاوانی دەوڵەت بۆ ئەوەی ئەو ڕەوڕەوەی غەربزەدەیی‌یەی کە ئەو خستبوویە جووڵە ئەمان بەردەوام پاڵی پێوە بنێن [2] .

کە موسڵمانەکان بینیان دەوڵەت ئەمان و نەصاراو یەهودی یەکسان کردووە و لە بڕی یاسا (ئیسلامیە ڕێکو ڕاستەکان ) یاساکانی نەصارا جێبەجێ دەکات و جلو بەرگی پیرۆزی باوباپیرانی فڕێ داوە و جل و بەرگی نەصارای پۆشیوە و هەستی ئەوەشیان کرد کە حکومەتی ڕەشید پاشا وای لێ هاتووە هەر یاسایەك دەربکات لەبەر چاوی کاڵی نەصارا دەری ئەکات و ڕەچاوی ئەوە ئەکات ئەوان دڵیان گەرد نەگرێ و مافیان نەفەوتێ ، کە خەڵکی ئەمەیان بینی زۆر بێزار بوون و سوڵتان و پیاوانی دەوڵەتەکەشی چارێکی تریان نەما لە کار خستن و لابردنی ڕەشید پاشا نەبێت لە کارەکەی ، لە ترسی دیاردەی بێزاری جەماوەری ، و ترسی ئەوەی موسڵمانان هەڵمەت بەرن و دەست بدەنە شۆڕش کردن [3] .

هەرچەندە لابردنی ڕەشید پاشا ڕێگەی لە بزاڤی بەرەو ڕۆژئاوا چوون نەگرت و بەردەوام هەر سیستەم و یاسا لە ڕۆژئاواوە ئەهێنرا دوای ئەوەی کە ئەو ڕێگەکەی بۆ خۆش کرد بوو ، دەرگاکانی بۆ کردبوونەوە ، بەڵێ ئەم ناڕەزایی یە بۆ ڕەشید پاشا و دەستورەکەی لە وەدا سەرکەوتوو بوو کە ڕەشید پاشای لەسەر کار لابرد لە ساڵی ١٨٤١ زدا ، بەڵام دوای چوار ساڵ واتە لە ساڵی ( ١٨٤٥ ) زدا جارێکی تر گەڕایەوە و ئەم جارە کۆمەڵێك لە ئەندامانی کۆڕی ماسۆنیەتیش لە پشتیەوە بوون ، ئەوانەی کە زۆر بە خەستی ڕێگەی گۆڕان بەرەو

---

[1] ) بڕوانە : الانحرافات العقدية والعلمية (٢/٢٦٨ ) .

[2] ) بڕوانە : مذكرات السلطان عبد المجيد ، ترجمة محمد حرب ، ص٣ .

[3] ) بڕوانە : الشرق الاسلامي ، حسين مؤنس ، ص٢٥٦ .

عەلمانیەتیان گرتبووە بەر [1] ، ئەم جارەیان گەڕایەوە بۆ ئەوەی پلەی ( صەدری ئەعظەم ) بگرێتە دەست لە ساڵی ١٨٤٦ زدا و لە ساڵی ١٨٥٨ زدا دیسان لەسەر ئەو کارە لابرا [2] .

بارودۆخەکان تا ئەهات بەرەو خراپتر و ڕووخانی زیاتر ئەڕۆیشتن ، وای لیٚ هات پیاوانی دەوڵەت لە ڕاستیدا بیر لە گۆڕان و چاکسازی بکەنەوە و هیچ ڕێگەیەکیشیان شك نەئەبرد ڕێچکەی ئەوروپی یەکان نەبێت لە ڕیفۆرمدا ، و ئاراستەی ڕۆژئاوایی یەکان نەبێت لەم گۆڕانکاریانەدا کە ئەوان دەستیان بەسەرە تاکەکانی کردبوو ، بەتایبەت کاتێك کە بزانین زۆربەی ئەو پیاوانەی دەوڵەت لەوانە بوون کە دەوڵەت خۆی ناردبوونیە دەرەوە وەك نوێنەری سیاسی یان بۆ خوێندنی سەربازی لە دەرەوەی وولآت ، ئەمەش دوای ئەوە بوو کە گۆڕەپانەکە چۆڵ بوو بوو لە پیاوی ڕیفۆرمخوازی ئیسلامی تا بێت و کاروبارەکان بەرێتەوە جێگەی خۆیان ، و ڕێگە بگرێت لە پشتیوانانی ئەم هێرشە فیکری یە و خۆی کار بۆ ڕیفۆرم بکات لەسەر میتۆدێکی ئیسلامی [3] ، یان وەك مامۆستا

" نجیب فاضل " کە نوسەرێکی تورکی یە ئەڵێ : لەبەرئەوەی کە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ ماوەی سیٚ سەدە یان چوار سەدە هیچ سەرکردەیەکی فیکری یان ڕیفۆرمخوازێکی کۆمەڵاتی گەورەو ڕەسەنی تێدا ناما بوو ، بوارەکە جێهێڵرا بوو بۆ کۆمەڵێك دیبلۆماتی سادەی کەم ئەزموون کە سەرسام بوو بوون بە ڕۆژئاواوە و بوبونە لاساکەرە بۆی ... ئەوە بوو ئەنجامەکەی بووە ئەوەی پرسەکانی ڕۆح تیاچوون و ویژدانەکان پوکانەوە و ئیرادەکان وشك هەڵاتن و ئیفلیجی لە هەموو شتێکدا دەرکەوت )) [4] .

بیروڕاکانی ئەم هێرشە فیکری یە لەناو زۆربەی زۆری سیاسەتمەدارە تورکەکان و بەرپرسەکانیاندا بلآوبوویەوەو سواری کۆڵی ئیفرەنجیەت و خۆداڕنین لە دین بوون ، تەنانەت زانای هەڵکەوتەی عێراقی ( ئالوسی ) لە ساڵی ( ١٢٦٧ ) ك کاتێك کە ئەچێتە سەردانی والی کرکوك کە ناوی ( علی پاشا ) ئەبێت ، سوپاسی ئەکات مەدحی ئەکات کە زانایانی خۆش ئەوێت و ڕێزیان لیٚ ئەگرێت ، و پیاوێکی ڕەوشت بەرزە و پاشان ئەڵیٚ : ( ئەوە لە ئێمەوە

---

1 ) بڕوانە : قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين ، ص٢٠٩ .

2 ) بڕوانە : الدولة العثمانية دولة اسلامية مفترى عليها ، (١٨١/١ ) .

3 ) بڕوانە : الانحرافات العقدية والعلمية (٢/ ٢٧٠ ) .

4 ) بڕوانە : السلطان عبد المجيد حياته و احداث عصره ، ص٤٣ .

دیاره ئەم کابرایە تائێستا دینی نە دۆڕاندوه ، و نە چووەتە ژێر کاریگەری بیروڕا تازەکانی ئیفرینجی یەکان ، ئەوەی لەگەڵیدا دانیشتبێ نەیبستووه باسی ( وندره ) و ( باریس ) بکات ! خەڵکی ئەم شارە ئەوەندەیان بەسە خوا ڕەحمی پێ کردوون ، والی یەکەیان پاکە و لەو شتانە دووره ، زۆر کەم خەڵکی لەم ڕۆژە خراپەدا ڕەحمەتی وای تووش ئەبێت )[1] !!

ئەم ڕەوتە (غەربزەدەیی) یە بەردەوام هەوڵی ئەوەی ئەدا کە دەست بەسەر هەموو بوارەکان و دەزگاکانی ناو دەوڵەت دا بگرێت .

بەهەرحاڵ نیشانە سەرەکی یەکانی ئەم بزاڤی ڕیفۆرم و نوێبوونەوەیەی عوسمانیەکان بەدەوری سێ خاڵی گرنگدا ئەسوڕایەوە : _

١- سود وەرگرتن لە سیستەمەکانی ڕۆژئاوا لە هەموو ئەو شتانەی پەیوەند بوون بە ڕێکخستنی سوپا و پڕچەك کردنی لە یاساکانی حوکم و بەڕێوە بردندا .

٢- بردنی جامیعەی عوسمانی بەرەو کۆمەڵگە و تەشکیلەیەکی عەلمانی .

٣- ڕۆشتن بەرەو پەیڕەو کردنی دەسەڵاتی ( مەرکەزی ) لە ئەستەنبوڵ و هەرێمەکانی تردا[2] .

ساڵی دەرچوونی یاساکانی (بەرنامەی گلخانە ) ڕووداوێکی مێژووی بوو لە ناو ئەوروپی یەکاندا و یەکێك لە فەڕەنسی یە نەصرانیەکان بەم شێوەیە تۆماری ئەکات و ئەڵێ : (( ساڵی ١٨٣٩ ز ساڵێکی زۆر گەورە بوو سەبارەت بە ڕۆچوونی فەڕەنسا لە ناو تورکیادا .. بە دڵنیایی یەوە ئەو ساڵە سەرەتای ڕێکخستنەکان بوو ، یەکەم ساڵی ڕیفۆرم بوو ... ئێمەی پیاوانی ئایینی سودی باش لەم لیبراڵێتە شەرمنە وەردەگرین ، و دەست بە ناردنی شاندی تەبشیری ئەکەین تا خەڵکی فێری کاثولیی بکەین )[3] ، بەڕێز ئیتان کە سەرۆکی ئەم شاندە بوو ئەڵێ : (( ئەمە یەکەمین هەلێکە هەڵکەوتووه بۆ ئەوەی قایمکاری لەو سەرکەوتنەی ( باوەڕ ) دا بەکەین کە ئێمە ئەیزانین ، چونکە قورئان تا ئەو کاتەیش فێر کردنی بە حەرام ئەزانی[4] .

---

1 ) بڕوانە : نشوة المدام في العودة الى مدينة السلام ، ص١٠٣ .

2 ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٥٢ .

3 ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، قراءة جديدة لعوامل الاغطاط ، د. قيس العزاوي ، ص٦٠ .

4 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٦١ .

یەکەم شاند کە لە حەوت پیاوی ئایینی پێك هاتبوو لە ڕۆژی ١٨٣٩/١١/٢١زدا بەرەو ئەستەنبوڵ ڕۆیشتن ، خوشکان خانەیەکی بێ باوکانیان دروست کردو پاشان قوتابخانەیەکیشیان پێوە لکاندو لە کۆتایی ساڵی ١٨٤٠ زدا ژمارەی قوتابیەکان گەیشتە ( ٢٣٠ ) قوتابی و لە ساڵی ١٨٤٢ زدا ژمارەکە گەیشتە ( ٥٠٠ ) پێنج سەد )[١] .

بەم شێوەیە ئەوروپای مەسیحی و کڵێساکانی کاتێکی زۆریان لەدەست نەدا بۆ ئەوەی سود لە هەل و مەرجی نوێبونەوە و ڕێکخستن وەربگرن ، ئەوە بوو دوای حەڤدە ڕۆژ لە دەرچوونی ( بەرنامەکە ) ، یەکەمین شاندەکانی تەبشیری " مارسیلیە " یان بە جێ هێشت و بەرەو پایتەختی عوسمانی کەوتنە ڕێ ، و بارێك بیروڕای دوژمنکارانەیان بەرامبەر موسڵمانان و قورئانە پیرۆزەکەیان پێبووو ، ئەوەتا قورئان تۆمەتبار ئەکەن بەوەی کە خوێندن حەرام ئەکات ! ، پەتای ڕێکخستنەکان بە خێرایی گەیشتە هەموو ویلایەتە عەرەبی یەکانی عوسمانی کە نیوە سەربەخۆیی یەکانیان بەدەست هێنا بوو ، بۆنمونە لە ( تونس ) دا " محمدبای " ، یاسای (( سەردەمی نەترسی )) لە ساڵی ١٨٥٧ زدا ، دەرکرد کە لەسەر ئەم بنەمانە وەستا بوو :

یەکەم / ئازادی :

لەبەر ئەوەی مرۆڤ ناتوانێ بگاتە لوتکەی سەرکەوتنی کاتێك نەبێت کە ئازادی بۆ دەستە بەرئەبێت و شورای دادیش بە دەوریدا ئەکرێ" دژ بە دەست درێژی خەڵك .

دووەم / بێ ترسی تەواو :

سێ یەم / یەکسانی تەواو لە نێوان موسڵمانان و ناموسڵماناندا لەبەردەم یاسادا :

ئەم خاڵەیان لەناو خاڵی دووەمیشدا هەیە ، چونکە ئەم مافە بۆ هەموو کە سێك، هەموو کەسێکی بیانی ئەبێ هەمان مافەکانی تونسیەکانی هەبێت ، و بۆیان هەیە هەموو جۆرە کاروبارێکی بازرگانی بکەن ، و مافی ئەوەشیان هەیە ببنە خاوەنی موڵك لە وڵاتدا[٢] ، میصریش لەسەر هەمان سیاسەت ئەڕۆیی ، بە دەرچوونی ئەم یاسایانە لە ئەستنبوڵ و تونس ومیصرەوە ، ئەو نوێخوازی یەی کە ئەوروپا حەزی پێ ئەکرد و هەندێ کۆمەڵی نوخبەش پشتیوانیان لێ ئەکرد لە نوێخوازی یەوە بوونە یاسای ڕەسمی و سوڵتان خۆی کاری

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٦١ .

[2] ) بڕوانە : الدولة العثمانية قراءة جديدة لعوامل الانحطاط ، ص٦١ .

پێویستی بۆ ڕێکخستن و جێبەجێ کردنی دەر ئەکرد ، تا جامیعەی ئیسلامی بکاتە کۆمەڵگەیەکی ڕۆژئاوایی ، ململانێ یەکە کە کاتی خۆی هەندێ فشاری دەرەکی بوو لەسەر دەوڵەتی عوسمانی و داوای گۆڕانکاری لێ دەکرد ، گۆڕاو بوویە ململانێ یەکی ناوخۆیی توند لە نێوان دەسەڵاتێکدا کە ئەوەی هەڵبژاردووە ( یان ناچار کراوە ) دام و دەزگاکانی وەك ڕۆژئاوایی لێ بکات و کۆمەڵگەیەك کە ئەم ئاڕاستەیەی لاپەسەند نی یەو لە پشت ئەمانەوە ئەو زاناو شەرعزان و بانگخوازانە وەستاون کە زۆر بەتوندی دژایەتی ئەم ڕەوتی بەڕۆژئاوا بوونە ئەکەن لەو سۆنگەیەوە کە ئەوە شتێکە و پێچەوانەیە بە شەریعەتی ئیسلامی [1] .

**لە دیارترین تایبە تمەندی یەکانی ئەم ڕێکخستنانە :**

١- یەکەمین بەڵگەننامەیەکی ڕەسمین کەوا لەسەر چاوەی شەریعەتی ئیسلامی یەوە وەرنەگیرا بن ، بەڵکوو لەسەرچاوەیەکی تەشریعی دەستکردەوە هاتوون کە ئەویش لە ئەزموونی دەستووره ئەوروپای یەکانەوە وەرگیراوە و چەندان چەمکی نامۆیان لە خۆ گرتووە وەك چەمکی (( نیشتیمان )) کەلەناو " بەرنامەی گلخانە " دا باسی هاتووە و خراوەتە جێگەی (( ئومەت )) ، ئەمەش واتای ئەوە ئەگەیەنێ کە ئەمە یەکەمین هەنگاوە بۆ جیاکردنەوەی (( دین )) لە (( دەوڵەت )) .

٢- سەلماندنی (( بێ ترسی تەواو )) و (( سەردەمی نەترسی )) و (( ئەنجومەنی شورای نوێنەران )) یان دیاردەکانی تری وەرگیراو لە ئەزموونی ڕۆژئاوا ، جۆرێك لە شەرعیەتی دا بە ئەو ستەمە بەردەوامەی لە جەماوەری خەڵك ئەکرا لەلایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە ڕێگەی والأ کرد بۆ ئەو بازرگانە ڕۆژئاوایانە و مژدەدەرانە تا جامیعەی عوسمانی پەیوەند بکەن بە یاساکانی بازاڕو بەها فیکری یە تەبشیری یەکانی خۆیانەوە .

٣- هەر دوو بەرنامەی ( گولخانە ) و ( هەمایۆن ) گەردن بەند کرا بە دەستورەکەی (مدحت پاشا)وە کە لە ساڵی ١٨٧٦ز دەریکرد ، کە ئەو بۆ یەکەمجار بوو لە مێژووی ئیسلام و دەوڵەتەکانیدا کار بە دەستورێك بکرێت کە لە دەستوری بەلجیکی و فەرەنسی و سویسری وەرگیرابێت کە هەموو دەستوری دەستکردوو عەلمانین .

---

[1] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٦٢ .

ئەم ڕێکخستنانە دەوڵەتی عوسمانیان بەشێوەیەکی ڕەسمی خستە سەر ئەو ڕێگەیەی کە کۆتایی پێ بێت وەك دەوڵەتێکی ئیسلامی ، چونکە بە عەلمانی کردنی یاسا و زۆرکردن لە دامودەزگاکان تا کار بەو یاسا دەستکردانە بکەن و دوورکەوتنەوە لەسەر چاوەکانی یاسادانی ئیسلامی لە بوارەکانی بازرگانی و سیاسەت و ئابوریدا ئەمانە شەرعیەتیان لە دەوڵەتی عوسمانی سەندەوە لە دیدی موسڵمانانندا، ئیتر با ئەوە بوستێت کە دەوڵەت لە ناوەوە دوژمنی بۆ دروست بوو ، شۆڕبوونەوەی ئەوروپا بۆ ناو هەمووئاستەکانی ڕۆشنبیری و ئابوری و سیاسی لەلایەکەوە و گومان و دوودڵی زانایان و موسڵمانان لەم ڕێبازەی دەوڵەت گرتبوویە بەر لەلایەکی ترەوە مایەی دروستبوونی ململانێ یەکە کە کۆتایی پێنایەت تەنانەت دوای نەمانی دەوڵەتی عوسمانیش، نەك ئەوە بەڵکو تائیستاش هەر بەردەوامە [1] .

زۆر گرنگە ئەوەی ڕوویدا جوان هەڵی بسەنگێنین ، سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەم لە (( یاداشتەکانی )) دا شایەتی یەکانی خۆی بۆ مێژوو جێهێشتووە بۆمان ، ئەو زۆر هەوڵی دا کە دەوڵەتی عوسمانی ڕزگار بکات پاش ئەوەی کە لە هەر چوار دەورەوە گەمارۆی خرایە سەرو توندیان کرد لەسەری ، (عبدالحمید)ی دووەم سوڵتانێکی زۆر وورریا بوو ، لە ڕاستی ئەو دروشمانەی داوای نوێخوازیان ئەکرد تێ گەیبوو ، کە لە ژێر پەردەی (( بزاڤی ڕیفۆرم )) دا نیازی سەرەکی خۆیانیان شاردبوویەوە ئەویش ئەوە بوو کە دەوڵەتی عوسمانی پەیوەست بکەن بە ڕۆژئاواوە ، هەربۆیە دەستورچی یەکان و جولەکەکانی دۆنمە دستیان کردە شەڕ فرۆشتن پێ ی و پاشان لەسەر کار لایان برد ، لە کۆتایی سەردەمی خۆیدا کە کرابویە سوڵتانێکی بێ دەسەلات و بێ ئیرادە ، ڕاستی بزاڤی ( نوێخوازی ڕیفۆرم ) باس ئەکات و ئەڵێ :-

( ئەم نوێخوازی یەی ئەوان داوای ئەکەن لە ژێر دروشمی (( ڕیفۆرم )) دا هۆیەکە بۆ پوکانەوەی ئێمە ، باشە ئەبێ بۆچی دوژمنانی ئێمە کە پەیمانیان بە شەیتان داوە ئەوەندە ئامۆژگاری ئێمە بەتایبەتی بەم شتە ئەکەن ، بەبێ دوولی و من دڵنیام کە ئەوان باش ئەوە ئەزانن کە ئەم ڕیفۆرمە دەردە نەك دەرمان ، و هەرئەمە بەسە بۆ ئەوەی ئەم ئیمپراتۆریەتە لەناو بەرێت ، ئەگەر ئێمەش بمانەوێ هەندێ لەو چاکسازی یانە جێبەجێ بکەین ئەبێ هەل و مەرجی ناو وڵاتی خۆمانمان لە یاد بێت و نابێ بارودۆخەکان لەسەر بناغەی ئاستی فیکری مشتێکی

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، قراءة جديدة لعوامل الانحطاط ، ص٦٣ .

کەمی کارمەندەکانی دەوڵەت بپێوین ، ئەبێت ئەوەشمان لە یاد بێت کە توێژی زانایان زۆر بە گومانەوە ئەڕوانن بۆ هەرشتێك لە ئەوروپاوە بێت ، ئەورووپی یەکان لە خەیاڵدا ئەژین ئەگەر وابزانن تاکە ڕێگەی ڕزگاری ئەوەیە کە ووردوو درشتی شارستانێتی ئەوان وەربگیرێت ، گومان لەوەدا نی یە کە ڕەوتی گۆڕانکاری لای ئێمە وەك ئەوە نی یە کە لای ئەوان هەیە ، ئێمە پێویستە گەشەیەکی سروشتی بکەین و بەویست و ئیرادەی خۆمان بێت ، و سودیش لە هەل و مەرجە دەرەکی یەکان وەردەگرین لە چەند حاڵەتێکی تایبەتی دا ، ئەوە ستەمێکی زۆر ناڕەوایە ئێمە بەوە تۆمەتبار بکرێن گوایە دوژمنی هەموو شتێکین کە لە ڕۆژئاواوە بێت )[1] .

(سوڵتان عبدالحمید) ترازوی دادی دۆزیوەتەوە لەو هەڵسەنگانانەیدا بۆ بزوتنەوەی ڕیفۆرمی عوسمانی و ئەوەی ڕوونکردەوە تەوە چۆن و بەچ ڕێگایەك ئەتوانرێ سوود لە شارستانێتی ڕۆژئاوا وەربیگرێت . منیش وا بەباشی ئەبینم کە بۆ خوێنەری بەڕێزی ڕوون بکەمەوە تا بزانێ هەڵوێستی ئیسلام لە شارستانێتی ڕۆژئاوا و هەر شارستانێتیەکی جاهلی تریش چی یەو چۆن ئەتوانرێت سوودیان لێ ببینرێت .

**سوود وەرگرتن لە شارستانێتی کافرانی ڕۆژئاوایی و جگە لەوانیش سێ جۆرە :**

یەکەم / سوود وەرگرتن لەپیشەسازی و بنەماکانی و ئەو شتانەی زانست دەری خستوون و هەموو زانستە ئەزموونی و سەربازی و سروشتی یەکان وەك بیرکای و کیمیا و فیزیا و ئەندازە و زیندەوەرزانی و زانستی گەردوون پاش ئەوەی کە تاقی ئەکرێتەوە و ڕزگار ئەکرێت لەو کاریگەریانەی نەفامی بەسەریەوە دای ناون ، و باشتریش وایە بخرێتە قاڵبێکی بێ گەردی ئیسلامیەوە ، ئەو جۆرە شتانە حوکمیان لە ئیسلامدا ، یان ( واجیبە )[2] . وپێویستە سوودی لێ وەربگیرێت و دەستە بەر بکرێت ، چونکە یان شتێکە موسڵمانان زۆر پێویستی یان پێ ی هەیە یان شتێکە پێویستی یەکی ئیسلامی هەیە و بەو شتە نەبێت جێبەجێ نابێت وەك چەك و تەقەمەنی ، وسیستەمە سەربازی ی یەکان ، کەلە بوارەکانی خەڵك بانگ کردنەوەدا بۆ لای خوا یان لە بواری جیهاد کردن و تێکۆشاندا لە پێناو ئەودا سودیئەبێت... هەموو شتێکی حەلاڵ کە موسڵمانان پێویستیان پێ ی هەبێت لەو بوارانەدا ئەوە پێویستە موسڵمانان دەستی بخەن و سوودی لێ وەربگرن ، چونکە موسڵمانان لەهەموو کەس شیاو ترن بەو شتانە

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، قراءة جديدة لعوامل الانحطاط ، ص٧٦ .

[2] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، قراءة جديدة لعوامل الانحطاط ، ص٧٦ .

هەروەها هەموو ئەو شتانەی کە دەوڵەتی ئیسلامی پێ بەرقەرار ئەبێت وەك کەرەسەی حەڵاڵ ، بەڵام بە وریای و ئاگابوونەوە لە خۆ ئەبێ وەریبگریت ، ئەگەر نا ئەوە دەست نەبردن بۆی باشترە یان حەڵاڵ ترە [1] و ئەمەش زۆر کەمە ، چونکە خوای گەورە بەئەرکی داناوە لەسەر موسڵمان هۆکاربەکاربهێنێت و شتی تەنگانە دابنێ و خۆی " خود کەفا " بکات تا پێویستی نەکەوێتە ئەو شتانەی لە دەستی کافراندایە ، هەرچ شتێك بێت .

دووەم / چاولێکردنیان لە پەرستش و بیروبڕواو بنەماو چەمك و بڕوا فەلسەفیەکانیان سەبارەت بە ( بونەوەر ) و ( ژیان ) و ( مرۆڤ ) ، ئەوەی کەپەیوەندە بە ( بیروباوەڕ)ەوە، ئەم جۆرە کارانە بێ ئەوەی درێژەی بدرێتێ بەبێ قسە حەرامن و نابێت هیچ شتێکی لە کافرانەوە وەربگیرێت و بە گوێکردنی کافران لەمەدا یان ( پاشگەزبوونەوە ) یە یان ( کافربوونە ) ئەگەر کەسی چاولێکەر ئەو شتە بەڕاست بزانێ و بیکاتە بەرنامەی ژیانی خۆی ، لانی کەم ئەو کارە حەرامە ئەگەر کابرا ڕاستی مەسەلەکەی نەئەزانی .

سێ یەم / چاولێکردنیان لە جۆرەکانی ئاکارو ڕەوشت و چۆنیەتی هەڵسوکەوت و جۆری ڕۆشنبیری و بیروڕا و بەرهەمی هونەری و ئەو جۆرە شتانەیان ئەمانە دوو حاڵەتیان هەیە ، حاڵەتی یەکەم ئەوەیە دژایەتی لەگەڵ یەکێك لە بناغە و بنەماکانی ئیسلام دا ئەکات یان مرۆڤ بەرەو شتێك پەلکێش ئەکات کە خوای گەورە قەدەغەی کردووە لەو شتەدا چاو لەکافر بکرێت ، ئەوە دیارە حەرامە .

حاڵەتی دووەم ئەوەیە شتەکە نازانرێ و حوکمەکەشی دیار نی یە ئەوە لانی کەم باش نی یە ، بەڵام هەرشتێك بە کارێکی باش بزانرێ _ لەو شارستانێتی یەدا _ کە ئەویش زۆر کەمن _ ئەوە کارێکی ڕێگە پێ دراوە [2] _ خوا باشتریش ئەزانێ .

هەندێ لە زانایان و بیرمەندە موسڵمانەکان و هاوچەرخەکان باسیان دەربارەی چاولێکەری و چۆنیەتی سوود وەرگرتن لە شارستانێتی ڕۆژئاوا زۆر کردووە لەوانە :

* **مستەفا صادق الرافعی ئەڵێ** : (( من ڕام وایە کە هاووڵاتیانی هەرێمە عەرەبیەکان نابێت وەك لاسایی کردنەوە سوود لە شتەکانی شارستانێتی ڕۆژئاوا وەربگرن بەڵکوو ئەبێ وەك لێکۆڵەرەوەیەك ئەو شتانە وەربگرن ، وەرگرتنەکەیان ئەبێت دوای ئەوە بێت کە ئەو شتە مافی

---

[1] ) بڕوانە : " مجلة المنار " ی محمد رشید رضا (ج١/٥٥٣،٥٥١ ) .

[2] ) بڕوانە : التقلید والتبعیة ، د. ناصر عبدالکریم العقل ، ص٣٨ .

تەواوی خۆی وەربگرێت لە لێکۆڵینەوە و ووردکردنەوە ، لاسایی کردنەوە سروشتی توێژە نزمەکانی کۆمەڵگەن ، ئێمە مەبەستمان بەمە ئەوە نی یە هیچ شتێك لەو خەڵکەوە وەرنەگرین ، چونکە جیاوازی زۆرە لە نێوان ئەوەدا بریق و باق و ئارەزووبازی ئەو شارستانیەتە وەربگرین یان هونەرەکانی ئەندێشە و جوانی لێکۆڵنەوە وەربگرین )[1] .

* حسن بنا ( بەڕەحمەت بێ ) ئەڵێ : ( جێگەی خۆیەتی ئەوە بزانین کە ئێمە زۆر دوورکەوتووینەتەوە لە ڕێنمای یەکانی ئیسلام و بناغە و بنەماکانی ، و ئیسلام ڕێگەمان لێ ناگرێ سوود لە شتی بەکەڵك وەربگرین ، یان دانایی و ژیریمان لە هەر شوێنێکدا بینی بیقۆزینەوە ، بەڵام ڕێگەی ئەوەمان لێ ئەگرێ و بەتوندیش لە هەر شتێکدا خۆمان بخەینە بەرگی ئەوانەوە کە هیچ پەیوەندی یەکیان بە ئاینی خواوە نەماوە ، یان بێین بیرەوباوەڕ و یاساو سنورو فەرزەکانی خوا پشت گوێ بخەین و شوێن ئەوانە بکەوین کە دونیا هەڵیخەڵە تاندوون و شەیتان لە خشتە ی بردوون )[2] .

* (ئەبولئە علی مەودودی)( بەڕەحمەت بێت) ئەڵێت : هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە میللەتێك لە میللەتانی تر وەریبگرێ و شایانی ئەو گواستنەوە یە بێت ئەو بەرهەمانەیە کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی زانستی دەستیان کەوتووە ، و گوشراوی هێزە فیکری یەکانیانە و ئەنجامگیری ئەو دۆزینەوە و میتۆدە زانستیانەیە کە ئەوان هەر بەو شتانە وا گەشەیان کردووە و چونەتە لوتکە ، هەر میللەتێك لەم زەوی یەدا هەبێ ، ئەگەر لە مێژوویدا یان لە سستەمە کۆمەڵایەتی یەکەیدا یان لە ڕەوشت و ئاکاریدا وانەیەکی بەکەڵك هەبێت ئەوە ئەرکی سەرشانمانە سوودی لێ وەربگرین و ئەرکی سەرشانمانە کە بە دوای ئەو هۆیانەدا بڕۆین کە وای لە و میللەتە کردووە گەشە بکەن و بگەنە لوتکە ، بەڵام ژیرانە و ووردەکارانە ، هەروەها ئەرکی سەرشانمانە ئەوەی لەگەڵ هەل و مەرج و پێویستە کانماندا گونجاو و لەبارە لەوان وەری بگرین ، بەڵام ئێمە ئەگەر واز لەم شتە جەوهەریانە بهێنین و بێین لە جل و بەرگ و شێوازی ماڵ و جێگە و کەرەسەکانی خواردن و خواردنەوە دا چاویان لێ بکەین لەگەڵ ئەوەدا نهێنی سەرکەوتن و گەشەکردنیان لەوانی تریاندایە نەك ئەمانە ! ئەوە بەڵگەی هیچی تر نی یە بەڵگەی ئەوە نەبێ ئێمە زۆر نادان و داماو گێلین ، چونکە کەس هەیە یەك تۆزقال عەقڵی هەبێت

---

[1] ) بڕوانە : وحی القلم (٣/٢٠٣ ) .

[2] ) بڕوانە : رئیس الامام الشهید حسن البنا ، ص٣٠٧ ، طبعة دار الاندلس .

بڕوای وابێت هەموو ئەو پێشکەوتن و گەشە زۆرەی ڕۆژئاوا دەستی کەوتووە لەبوارە جیاجیاکانی ژیاندا بەچاکەت و پانتۆڵ و بۆینبباخ و کڵاو پێڵاو دەستی کەوتووە ؟! یان لەبەرئەوە ڕۆژئاوا پێشکەوتووە چونکە بە چەقۆو چەتاڵ شت ئەخۆن ؟ یان کەرەسەکانی خۆڕازاندنەوە و خۆشگوزەرانی و سوراو سپیاو و بۆیە و ماکیاج ڕۆڵیان بینیوە و ڕێگەی پێشکەوتن و ئەو پەڕی گەشەکردنیی بۆ دیاری کردووە ؟ ئەگەر ئەمانە وانین _ کە دیارە واش نین _ ئەی مەسەلە چی یە ئەوانەی دەم لە پێشکەوتن ئەدەن و خۆیانی پێوە هەڵدەکێشن و لافی ڕیفۆرم لێ ئەدەن لە ناوماندا هەوڵ بۆ ئەو شتانە نادەن و هەرخەریکی ئەو شتە رووکەشانەن ؟!! [1] .

* شێخ محمد الامين الشنقطي _ بەڕەحمەت بێ _ لە (( اضواء البيان )) هەڵوێستی موسڵمانان لە شارستانێتی ڕۆژئاوا دەردەخات و ئەڵێ :

( خوێندنەوەی تەواو سەلماندویەتی کە شارستانێتی ڕۆژئاوا شتی بەکەڵك و شتی زیانبەخشی تێدایە ، شتە بەکەڵکەکانی ئەوانەن لە بواری ماددەدا دەستی کەوتووە ، پێشکەوتنی ڕۆژئاوا لە هەموو گۆڕەپانەکانی ماددەدا لەوە ڕۆشنترە کە من ڕوونی بکەمەوە ، ئەو پێشکەوتنانەش ئەوەندەی شتی بەکەڵکیان تێدایە بۆ مرۆڤ لەسەروی خەیاڵەوەیە ، و بەدڵنیای یەوە خزمەتێکی زۆری جەستەی مرۆڤی کردووە وەك ئەوەی جەستەیەکی زیندووە ، بەڵام شتە زیانبەخشەکانی بریتی یە لەو دەسبەردانەی بە گشتی لەو لایەنەی کەسەری هەموو خێرێکە و نەك ئەوە بەڵکوو لەم دونیایەدا بەبێ ئەو هیچ شتێك خێری تێدا نابێت ئەویش پەروەردەی ڕۆحی و پاڵفتەکردنی ئاکاری ئەم مرۆڤەیە ) [2] .

پاش ئەوەی حوکمی شەرعی سوود وەرگرتن لە شتە بەکەڵکەکان باس ئەکات ئەڵێ :

( پێغەمبەر (ﷺ)بە دڵنیای یەوە سودی لە شارەزایی (( ابی الاريقط الرؤلي )) لە ڕێگەو باندا وەرگرت بۆ ڕێگەی کۆچکردنی لەگەڵ ئەوەدا پیاوێکی کافریش بوو ، لەم بەڵگەوە بۆمان دەرئەکەوێت کە هەڵوێستی سروشتی ئیسلام و موسڵمانان لەم شارستانیەتەی ڕۆژئاوا ئەوەیە هەموو هەوڵێك بدەن بۆ بە دەستهێنانی ئەو شتانەی لە بوارە مادديەکاندا دەستیان کەوتووە و

---

[1] ) بڕوانە : ( الاسلام في مواجهة التحديات المعاصرة ) ی مەودودی ، ص١٦٣_١٦٤ .

[2] ) بڕوانە : اضواء البيان في إيضاع القرآن بالقرآن (٤١٢/٤ ) .

خۆیان بپارێزن لە و شتانەش کە یاخی کردوون لە دروستکەری ئەم گەردوونە ( جل جلالە ) ، ئەگەر وابکەن ئەوە دونیاش و ئاخیرەتیشیان ڕوو لە باشی ئەبێت ، بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زۆربەیان کێشەکە ئاوەژوو ئەکەنەوە و بە دڕەوشتی و خۆداڕنین لە ئایین و دوورکەوتنەوە لە گوێگرتن بۆ دروستکەری گەردوون ، وەك خۆی وەری دەگرن و هەوڵی وەرگرتنی ئەو شتانە نادەن کە ئەم لایەنە ماددی یە بەکەڵکەی بەرهەم هێناوە ، هەر بۆیە لە دونیا و ئاخیرەتیش بوون و بە ڕاستی ئەوەش دۆڕاندنێکی ئاشکرایە )[1] .

( سید قطب )بەڕەحمەت بێت ئەڵێت :

( بیٚ دوودڵی پێغەمبەر (ﷺ) لەمەسەلەی وەرگرتنی عەقیدەو میتۆدا چەند توند بوو لەگەڵ ئەصحابەکانیدا (ڕەزای خوایان لێبێت ) بە ئەندازەی ئەوە بواری بۆ وەرگرتنی ڕاو ئەزموون لە هەموو بوارە زانستیەکانی ژیاندا ئەکردەوە کە ملکەچە بۆ ئەزموون وزانیاری وەك کاروباری کشتوکاڵ و نەخشەکانی شەڕ و لەو جۆرە پرسانە کە شتی زانستی پەتی یە و هیچ پەیوەندی یەکی بە بینشی باوەڕی و سیستەمی کۆمەڵاتی و ڕژێمە پەیوەندەکانەوە نی یە کە ژیانی ئەم مرۆڤە ڕیك دەخەن ، جیاوازی لە نێوان ئەوە و ئەمەدا زۆر ئاشکرا دیارە ، میتۆدی ژیان شتێکە و زانیاری پەتی و ئەزموونی و تاقیگەکان شتێکی ترن ، ئیسلامێك کە بۆ ئەوە هاتبێت ڕێبەرایەتی ژیان بکات بە میتۆدی خوا ، هەر ئەو ئیسلامە ژیری ئاڕاستە کردووە بۆ ئەوەی زانست وەربگریٚ و سود لە هەموو داهێنانێکی ماددی ببینیٚ لە بازنەی میتۆدەکەیدا بۆ ژیان...

پاشان ئەو چیرۆکەی عمر (خوای لیٚ ڕازی بێت ) باس ئەکات کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ ) ئەبینیٚ پارچەیەك تەوراتی بەدەستەوەیە ، لیٚ ی تووڕە ئەبێت و ئەویش واز دەهێنێت ... فەرمودەکە ... ئەوەش پێغەمبەر (ﷺ)ئەفەرمویٚ : (( لا تسألوا اهل الکتاب عن شئ فأنهم لن یهدوکم وقد ضلوا ... )) فەرمودەکە ئەڵیٚ : ( ئەوانە "خاوەن کتێبەکانن" ... ئەمەیە ئاکاری پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو پرسانەدا کە پەیوەندن بە کاروباری عەقیدە و بینش ، و شەریعەت و میتۆدەوە ، دوای ئەوە هیچ کێشەیەك لەوەدا نی یە و بە پیٚ ی گیانی ئیسلام و ئاڕاستەکانی کە سود لە کۆششەکانی هەموو ئەم مرۆڤانە وەربگیرێت _ ئەوانەی‌سەرەوە نەبیٚ _ لە هەموو بوارێکی زانستی پەتی چ زانیاری و چ ئەزموون _ لەگەڵ ئەوەدا ئەبیٚ پەیوەستیش بکرێت بە میتۆدی باوەڕەوە واتە واهەست بکەی ئەو شتانە هەموو پەیوەندن بە خواوە و ئەو دەستە مۆی

---

[1] ) بڕوانە : القلید والتبعیة ، د. ناصر العقل ، ص٤١ .

کردوون بۆ مرۆڤەکان ، لەو لاشەوە بەهەستی باوەڕدارانەی ئاراستەی بکات و بیکاتە شتانێك کەلە خێری ئەم مرۆڤە تەواو بێت و بۆبە دەسهێنانی بێ ترسی و خۆشگوزەرانی ئەو بێت و هەستی باوەڕدارانەی پەیوەند بکات بەوەوە کە بەندایەتی کردنی بۆ ئەو خوایە جۆرێکە لە سوپاسگوزاری و پێزانین بەو نیعمەتەی کە خوا پێ ی داوە چ وەك ئەوەی فێری ئەو زانستانەی کردووە و چ وەك ئەوەی ئەو هێزو ووزانەی گەردوونی بۆ دەستە مۆ کردووە و چ وەك ئەوەش خوا ئەوەی فێر کردووە کە ئەم زانستە بخاتە خزمەتی ئەم مرۆڤەوە ...

بەڵام وەرگرتنی بەها لێیان لە بواری بینشی بیرو باوەڕدا ، لە بواری تەفسیرکردنی ئەم گەردوونەو ئامانج لە بوونی مرۆڤ و کارکردن بە میتۆدێکی تایبەت بۆ ژیان و سیستەمەکانی ژیان و یاساکانی ژیان یان لە میتۆدی ڕەوشت و ئاکاردا ، وەرگرتنی شت لە هەموو ئەوانەدا کە باسمان کردن و وای کرد کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕووی بگۆڕێ لەبەر کەمترین شتێك لەو باسەدا ، ئەمە هەر ئەوەیە کە خوای گەورەش میللەتی موسڵمان ئاگادار ئەکاتەوە لە داهاتووەکەی ، هەر ئەمەشە سەر لە کوفری ئاشکراوە دەر ئەکات [1] .

شەپۆلی لاسایی کردنەوەی ڕۆژئاوا زۆر شێتانە دەستی پێ کرد لەوکاتەدا کە بێ هێزی و لاوازی ڕووی لە خیلافەتی عوسمانی کرد و هێزە ڕوخێنەرەکانیش سەریان کرد بەیەکدا بۆهەرەس پێ هێنانی لە ناوەوەو دەرەوە — کە ئەم دەوڵەتە لاوازەش هەستی بەکەمی خۆی کرد لەبەردەم دەوڵەتە نەصرانیە تازە پێگەیشتووەکاندا ، دەستی دایە چاو لێکەری بۆ ئەو دەوڵەتانە و وەرگرتنی بەرهەمە تازەکانیان ، ئەمەش هاوزەمان بوو لەگەڵ مەشلول بوونی بیروبیرکردنەوەی موسڵمانان و دوورگرتنیان لە میتۆدە ڕەسەنەکەیخوا ، دەستیان دایە وەرگرتنی هەموو شتێك لە کافران بێ ئەوەی هۆشیان یان بیرو بیرکردنەوەیان بۆ ئەوە بڕوات ئەو هۆکارو کەرەسانە چی بوون کە ئەم دەوڵەتە کافرانەی بردە پێشەوە ، و بێ ئەوەش کە هەوڵی جیدی بدەن بۆپشت بەستن بە هێزی خۆیان و هێزە ئیسلامیەکەیان بگەیەننەوە بەو دەوڵەتانەدا ) [2] .

ئەم لافاوی لاسایی کردنەوە کوێرانەیە زۆر بەتین و شێت بووبەهۆی نەفامی وگێلی ئارەزوو پەرستی و لادانی زۆر لە ناوەوە و هەوڵی بە بەرنامە و فێڵبازی دەرەوەش ، و زۆری نە

---

1 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٤٢ .

2 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ل٢٠ .

برد وولاَته ئیسلامی یەکان یەك لەدوای یەك ئەو ڕێگەیان گرتە بەر ، سەرەتا تورکیا و دوای ئەو میصر و شام و پاشان تونس و ایران و هیند .

سەیر ئەوەیە هەموو جۆرەکانی چاولێکەری لە دونیای ئیسلامیدا بەوە دەستی پێ کرد کە هەستیان ئەکردلە لایەنی سەربازی یەوە زۆر لاوازن و پێویستی بە ڕێکخستنەوەی سوپاکان هەیە لە وولاَتە ئیسلامیەکاندا ، لێوە گرێ ی پشت بەستن بە ڕۆژئاوا و سەرسامی بە هەموو شتێك لە وولاَتی کافرەوە بێت با زۆر گەندەڵ و پیسیش بێت سوك کردنی هەمو شتێکی ڕۆژهەلاَتیش با زۆر چاك و گەورەش بێت لە ناو خەڵکدا دروست بوو [1] .

خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا بەرگری لەوە ئەکات کوێرانە چاو لە خەڵکی بکرێت ، ئەو کارە زۆر زەم ئەکات و خەڵکی ئەترسێنێ لە داهاتووەکەی لە زۆرێك لە ئایەتەکاندا ، و لە زۆر بۆنەداو بە زۆر شێوە نەخوازەلاَ چاوکردن لە کافر ، هەندێ جار بەرگری لەوە ئەکات شوێن کافران بکەوی و بە گوێیان بکەی ، هەندێ جاریش لە خودی خۆیان مرۆڤ ئاگادار ئەکاتەوە و داوا ئەکات بە فرت و فێڵیان کەس نەخەڵەتێ و مل بۆ ڕاو بۆچوونیان بدات و بچێتە ژێر کاریگەری ئیش و کارو ئاکارو ڕەوشتی ئەوان ، جاری واش هەیە قورئان باسی هەندێ ڕەوشتی نادروستیان ئەکاتو ئەو ڕەوشتانە و چاوکردن لەو ڕەوشتانەش قێزەون ئەکات لای ئیمانداران .

زۆرترین ئاگاداری یەك لە قورئاندا هاتبێ دەربارەی جولەکەو دووڕوەکان هاتووە ، دوای ئەوە دەربارەی هەموو (( ئەهلی کتاب )) و دووباوەڕەکان هاتووە .

خوایگەورە (جلّ جلالە ) ڕۆشنی کردووەتەوە کە هەندێ چاولێکەری بۆ کافران و بە گوێکردنیان پاشگەزبوونەوەی لێ ئەکەوێتەوە ، ئەوەتا ئەفەرموێ :

﴿ ان الذین ارتدوا علی ادبارهم من بعد ماتبێن لهم الهدی الشیطان سول لهم وأملی لهم ذلك بأنهم قالو للذین کرهوا مانزل الله سنطیعکم فی بعض الامر والله یعلم اسرارهم ﴾ ( محمد : ٢٥ _٢٦ ) .

خوایگەورە چۆن کەماڵ و تەواوەتی داوە بە شەریعەتەکەی ، هەرواش بەرگری ئەکات لەوەی شوێنی جگە لەئەو بکەوی ئیتر ئەوشتە ئارەزوی خەڵك بێت یان یاسا مرۆڤی یەکان بێت ، ئەوەتا بەرگری لەوە ئەکات کە شوێنی ئەو کافرانە بکەوی کە شتەکە نازانن ، ئەفەرموێ : ﴿

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢١ .

ثم جعلناك على شريعة من الامر فأتبعها ولاتتبع اهواء الذي لايعلمون "١٨" انهم لن يغنوا عنك من الله شيئا وإن الظالمين بعضهم أولياء بعض والله ولى المتقين "١٩" ﴾ ( الجاثية : (١٨و ١٩ )

.

خوای گەورە لەو شوێنەدا کە ئاگاداری دەربارەی( ئەهلی کیتاب ) ئەدات ئەفەرموێ ﴿ ود كثير من اهل الكتاب لو يردونكم من بعد إيمانكم كفارا حسدا من عند انفسهم من بعد ماتبين لهم الحق ﴾ ( البقرة : ١٠٩ ) .

وە هەروەها ئەفەرموێ : ﴿ ما يود الذين كفروا من اهل الكتاب والمشركين ان ينزل عليكم من خير من ربكم ﴾ ( البقرة : ١٠٥ ) .

هەروەها ئەفەرموێ : ﴿ياأيها الذين امنوا لاتتخذوا اليهود والنصارى اولياء ﴾ ( المائدة : ٥١ )

.

بەو شێوەیەش بەرگی لەوە ئەکات کە بەگوێیان بکرێت و بە شوێنیاندا بڕۆن و چاو لە کردەوە خراپەکانیان بکرێت وەك ئەفەرموێ : ﴿ ولن ترضى عنك اليهود ولا النصارى حتى تتبع ملتهم ﴾ ( البقرة : ١٢٠ ) .

هەروەها ئەفەرموێ : ﴿ياأيها الذين آمنوا ان تطيعوا فريقا من الذين آوتوا الكتاب يردوكم بعد ايمانكم كافرين ﴾ ( آل عمران : ١٠٠ ) .

هەروەها ئەفەرموێ : ﴿ ولاتتبع اهواءهم واحذرهم ان يفتنوك ﴾ ( المائدة : ٤٩ ) .

ترسناکی نزیك بوونەوە لێیان و خۆش ویستینیان و کردنیان بە هاوەڵ و هاودەم بە وردی باس ئەکات و وای ئەناسێنێ کە زیانەکەی هەڕەشە لە هەموو میللەتی ئیسلامی ئەکات وەك ئەفەرموێ : ﴿ياأيها الذين آمنوا لاتتخذوا بطانة من دونكم لا يألونكم خبالا ودوا ماعنتم قد بدت البغضاء من افواههم وما تخفي صدورهم اكبر ﴾ ( آل عمران : ١١٨ ) .

هەروەها بەرگری کردن لە چاولێکەری و ئاگا بوون لێ ی بە شێوەی چیرۆك گێڕانەوە لە قورئاندا زۆر هاتووە ، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەو میللەتە کافرانەی کردووە کە لە ناوچوون و دەنگ و باس و هەڵوێستی دوژمنکارانەیان دژ بە بانگەوازی ( یەکتاپەرستی ) و کاروانی باوەڕ بە درێژایی مێژووگێڕاوەتەوە ، هەروەها ئەوەی باس کردووە کە چۆن جۆرەها سزا و ئازاریان دراوە لە پاداشتی ئەو گومڕاهی و لادانانەیاندا ، لەو گێڕانانەوە فەرمانمان پێ ئەکات کە پەندو ئامۆژگاری وەربگرین و چیرۆك و بەسەرهاتی ئەوان ببێتە پەند و وانە بۆ مان و

لـێ ی دوربکەوینـەوە لاسـایی یـان نەکەینـەوە و بـەو ڕێبـازە وئاکارانـەی ئەوانـدا نـەڕۆین [1] ..
ئەمەش وەك خوای گەورە ئەفەرموێ لەو کاتەدا کە باسـی ئەو پەندانە ئەکات بەسەر (( ئەهلی کتاب )) دا هاتووە ﴿ فأعتبروا یا اولی الابصار ﴾ ( الحشر : ٢ ) .

هەروەها ئەفەرموێ ﴿ لقد كان في قصصهم عبرة لاولی الالباب ﴾ ( یوسف : ١١١ ) .
زانایان هەموو ئەو ئایەتانەی لەقورئانـدا کە بەرگری لە موسڵمان ئەکەن چاو لە کافران بکات ئەکەنە دوو بەشەوە :

* بە شێکیان ئەوە ڕوون ئەکەنەوە بە گشتی کە ئەوە باشە بۆ موسڵمان کە لە هـەموو شتێکدا پێچەوانەی ئەوان بێت ، ئەمەش ئایەتە کان بەگشتی بەڵگەن بۆ ئەمە .

* بەشێکیان ئەوە ڕوون ئەکەنەوە کە جولاّنەوە بە پێچەوانەی ئەوانەوە یەکێکە لە داواکانی شەرع و واجیبە وا بکرێت ، ئەمەش هەندێك لە ئایەتەکان ئەبنە بەڵگە بۆی [2] .

لـە سـوننەتی پێغەمبـەری خواشـدا (ﷺ) فـەرمودەی زۆر هـاتووە لەسـەر ئـەوەی بەگشـتی بەرگری ئـەکات لـە چـاولێکەری کوێرانـە ، لـە خـۆ نوانـدن وەك ئـەوان ، لەسـەرنجامی ئەوانـەش ئاگاداری ئەدات ، پێغەمبەر (ﷺ) بەرگری ئەکات لەوەی کە چاو لە کـافران بکرێت لە شـتێکدا کە لە ئیسلامدا باس نەکرابێت یان نەسەلمێنرابێت ، هـەروەها بـەرگری لـە لاسـایی کردنـەوە ی ئەو شتانەش ئەکات کە کاری ناوسڵمانانە یە وەك ئەفەرموێ :

* (( من تشبه بقوم فهو منهم )) [3] هەرکەسێك خـۆی وەك هـەر میللـەتێك لـێ بکـات ئەوە ( لە قیامەتدا ) [4] وەك ئەوان ئەبێت .

* زۆر فەرمودەی تری ( صحیح ) هاتووە دەربارەی بەرگری کردن لەچاو کردن لە کـافران (بە گشتی) و (( ئەهلی کتاب )) و دووباوەڕەکان و ئاگرپەرستەکان و خەڵکی جاهیلی .
پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرموێ

---

[1] ) بڕوانە : التقليد والتعبية ، ص٥١ .

[2] ) بڕوانـە : اقتـضاء الـصراط المـستقيم مخالفـة اصـحاب الجحـيم / ابـن تيميـة ، ص١٧ .

[3] ) سنن ابی داود ، كتاب لباس الشهرة (٢/٣٦٧ ) .

[4] ) ئەوەی ناو کەوانەکە وەرگێڕ زیادیکردووە ( ٠ ن ٠ ) .

* " خالفوا اليهود " [١]

* " خالفوا المشركين " [٢]

* " ولا تشبهوا باليهود " [٣] .

كە پێغەمبەر (ﷺ) ئاگاداری ئەدات و خەڵك ئەترسێنێ لە لاسایی کردنەوەی کافران و لەسەرنجامی ئەو لاسایی کردنەوەیە و ترسناکی لەسەر بیروباوەڕی موسڵمانان و قەوارەیان ، هۆیەکەیشی باس ئەکات بەوەی ئەوان لەسەر گومڕاهی و لادانن ، جابر(ی کوڕی عبدالله )(رضی الله عنه) [٤] ئەگێڕێتەوە و ئەفەرموێ : (( پێغەمبەر (ﷺ ) فەرمویەتی : ( لاتسالوا اهل الكتاب عن شئ فأنهم لن يهدوكم وقد ضلوا ، وانكم اما ان تصدقوا بباطل واما ان تكذبوا بحق ، وانه والله لو كان موسى حيا بين اظهركم ماحل له الا ان يتبعني )) [4] واتە : پرسیار لە (( خاوەن کتێبەکان )) مەکەن بۆ هیچ شتێك ، بە دڵنیای یەوە ڕێگەی ڕۆشتنتان فێر ناکەن ، ( چونکە ) ئەوان خۆیان ڕێگەیان وون کردووە ، ئێوەش ئەوکاتە یان ئەبێ شایەتی بۆ ناحەقێك بدەن یان درۆ بەدەم حەقێکەوە بکەن ، سوێند بە خوا ئەگەر موسی زیندو بوایە و لەناو تاندا بوایە ، حەڵاڵ نە بوو بۆی شوێن من نەکەوێ .

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ ) ئەو ترسەش باس ئەکات و ئاماژە ئەدات بەوەی چی دێت بەسەر موسڵمانان دا کاتێك واز لە بەرنامەی خوا ئەهێنن و بە شوێن ئاسەواری جولەکە و گاورەکان و میللەتە لادەرەکاندا ئەڕۆن ، ئەمەش لەو فەرمودەیەدا دەرئەکەوێ کە ئەبوسەعیدی خودری ( ڕەزای خوای لێبێ ) ئەفەرموێت : پێغەمبەر (ﷺ) فەرموی : ( لتتبعن سنن من كان قبلكم شبرا بشبر وذراعا بذراع ، حتى لو دخلوا جحر ضب تبعتموهم )) قلنا : يارسول الله: اليهود والنصارى ؟ قال : فمن )) واتە : بە شوێن ڕەوشت و ئاکاری خەڵکانی پێش خۆتاندا بست بە بست و باڵ بەباڵ ئەڕۆن ، تەنانەت ئەوان چوونە کونی بزنمژە شەوە ئێوەش بە دوایاندا ئەڕۆن ، وتمان : ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەشوێن جولەکە و گاورەکاندا ؟ فەرموی : ئەی کێ )) ؟ !

---

[1] و٢و٣ ) لە چەند فەرمودەیەکدا هاتووە لەوانە ئەم فەرمودەیەی ( ﷺ ) (( خالفوا اليهود فأنهم لا يصلون في نعالهم )) .

یەكێك لەمەبەستە گەورەكانی شەریعەتی ئیسلام ڕێگەگرتنە لە چاو لێگەری كوێرانە ، چونكە خوای گەورە پێغەمبەری خوای (ﷺ)بە ئایینێكە پڕ ڕاستی و چاو ڕۆشنیەوە ناردووە بۆ ئەوەی زاڵی بكات بەسەر هەموو ئایینەكانی تردا و دینی تەواو كردوە و كەم و كوڕی تێدا نە هێلاوە لەبەر خەڵكی﴿ الیوم اكملت لكم دینكم واتممت علیكم نعمتي ورضیت لكم الاسلام دینا ﴾ ( المائدة : ٣ ) .

ئەمڕۆ بۆ بەرژەوەندی ئێوە ئاینم بۆ تێرە تەسەل كردوە ، نیعمەتەكانی خۆمم بۆ تەواو كردن و ڕەزامەندیم ڕشت بەسەر ئەوانەدا كە ئیسلام ئەكەنە ڕێبازی خۆیان .

بەدڵنیای یەوە ئەم شەریعەتە چی بەرژەوەندی ئەم مرۆڤە هەیە بۆ هەموو كات و هەمو شوێنێكی لە خۆ گرتووە ، بۆیە پێویست نە بووەهیچ شتێك لە كافران داوا بكرێت و چاویان لیٚ بكرێت ، ئەوە ڕوونە لاسایی كردنەوە چ زیانێك بە كەسایەتی موسڵمان ئەگەیەنێت ، لەوەدا هەستی خۆ بەكەم زانین و سوكێتی و لاوازی و داڕوخان دروست ئەكات تێیدا و وای لیٚ دەكات كە لە بەرنامەی خوا و شەریعی خوا دووربكەوێتەوە و پەیوەندی نەمێنیٚ ، ئەزمونیش دەری خستووە كە سەرسام بوون بە كافران و لاسایی كردنەوەیان هۆیەكە بۆ ئەوەی خۆشەویستیان بچێتە دڵەوە و متمانەی بیٚ سنوریان پیٚ بكرێت و پاشان ( ولاء ) یان بدرێتیٚ و خۆی لە ئیسلام و پیاوانی ئیسلام و قارەمانەكانی ئەم ئایینە و كەلەپور و بەهاكانی بدزێتەوە و عەوام ببێتەوە پێیان ... ئەمە ئەو شتە بوو كە لە دەوڵەتی عوسمانی و هەرێمەكانی دا ڕوویدا لە هەردوو سەدەی ڕابردوودا ، كاتێك كە وازیان لە پەیامەكەیان هێنا و خۆیان دا بەدەست دەسەڵاتی ڕۆژئاواوە و دەمی نا بە ژەهری كوشەندەیانەوە [1] .

بڕیاری شەرعی دەربارەی لاسایی كردنەوە لە شتێكەوە بۆ شتێكی تر ئەگۆڕێت بەپیٚ ی جۆرو چۆنیەتی و سنوری ترسناكی و ئاسەواری ئەو شتە هەروەها بە پێی جیاوازی ئەو كەسەی لاسایی ئەكرێتەوە و ئەو كەسەی لاسایی یەكە ئەكاتەوە و ئەو دوو كەسە پەیوەندیان چۆنە ، بیروڕای كابرای لاسایی كەرەوە بە لاسایی كردنەوەی ناموسڵمان چی یە و چۆنە ، ئەمانە هەمووی ڕۆڵیان هەیە لە بڕیارەكەدا ، لاسایی كردنەوە كوفرو بیٚ دینی یە ئەگەر لە بواری بیروباوەڕ دا بێت بۆ پرسەكانی ئیمان و بنەماكانی بیروباوەڕ ، یان لە بواری یاسا نە گۆڕاوەكانی شەریعەت دا بێت یان لە " پرسە غەیبی یەكان " دا بێت كە بە (( دەق )) بوونیان

---

[1] ) التقلید والتبعیة ، ص٨١ .

سەلمێنراوە بۆ نمونە : لاسایی کردنەوەی نەصاراکان لە بیروباوەڕی ( تثلیث ) [1] دا یان لاسایی کردنەوەی شیوعیەکان لە وەدا نکوڵی لە پێغەمبەرایەتی و ئایینە ئاسمانی یەکان دا ئەکەن هەر بۆ نمونە دیسان : لاسایی کردنەوەی دەوڵەتە کافرەکان لەوەدا شەریعەتی خوا چز بکرێت و بووترێت شەریعەتی ئیسلامی کەڵکی ئەوەی نی یە جێبەجیٚ بکرێت و شتی تریش .

لاسایی کردنەوە جاری وا هەیە کوفر نی یە بەڵکو گوناهباری یە وەك ئەوەی چاو لە ڕەوشتە گەندەڵەکانی کافران بکات و سەر بکاتە گوناهکردن و مەشروب خواردنەوە و لەو جۆرە شتانە .

لاسایی کردنەوە جاری وا هەیە کارێکی حەرامە و چاك نی یە وەك لاسایی کردنەوەیان لە جەژن و ئاهەنگەکانیاندا ... جاری واش هەیە ( مەکروهە ) وەك ئەوەی بە بیٚ مەبەست و نیازی شتێك لە کاروباری ژیاندا وەك ئەوان بکرێت بەو مەرجەی پەیوەندی بە( عقیدە ) ەوە نەبێت یان شتێك نەبێت تایبەت بێت بەوانەوە و بەو شتەوە بناسرێنەوە .

ئەگەر لاسایی کردنەوە ترسی ئەوەی تێدا بوو کە سەربکێشیٚ بۆ یەکێك لەو شتانەی پێشەوە واتە ( کوفر یان گوناهباری یان حەرامی یان کەراهەت ) ئەوە بڕیارە شەرعیەکە ئەوەیە ( حەرام بکرێت ) بۆ داخستنی دەرگای فتنە لاساییکردنەوە بەچەند مەرج و سنورێك حەلاٚڵ دەبێت بۆ نمونە ئەگەر لە شتی ( ماددی ) و ( زانستە مرۆڤایەتی ) و ( زانستە ئەزموونی یە پەتی یەکان ) و ئەزموونە سەربازی یەکاندا بێت یان ئەو شتانەی لەو شێوەیەن ئەمەش پاش ئەوەی جارێکی تر ئیسلامیانە دائەڕێژرێنەوە و چڵك و لەکەکانی ( جاهیلیەت ) یان لیٚ ئەکرێتەوە و نیازەکانی کافرانیان لیٚ دائەنرێت و ئەو مەرجەی تێدا دروست ئەبێت کە نەچێت بەگژی بەرژەوەندی ئایینی یان دونیای یەکانی [2](موسڵمانان و جامیعەی ئیسلامیدا) [3].

کەلە مێژووی میللەتان ئەکۆڵیتەوە و هەل و مەرج و قۆناغەکانی ژیانیان ئەخوێنیتەوە بە وردی بۆت دەرئەکەوێت لاسایی کردنەوە لە نێوان ئوممەتێك و ئوممەتێکی تردا ، میللەت و

---

[1] ) تثلیث : واتە سیٚ شت بە خوا بزانریٚ ، خوای گەورە و حەزرەتی عیساو ، دایکی عیسا . (وەرگێڕ:ن)

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٨٣ .

[3] ) ئەو زیادەیە ماناکەی ساغ دەکاتەوە و وەرگێڕ خستویەتیە سەری (و. ن . ) .

میللەتێکی تردا ، لەیەك چوون و توانەوە لەیەکتری و کارلەیەك کردن لە نێوانیاندا وای لێدێت جیاوازی و سەربەخۆیی لەوەیاندا نامێنیٚ کە چاو لەوی تریان ئەکات و ئەو لاسایی کردنەوە یە کەساییەتی یەکەی لەرزۆك ئەکات و نایهێڵێت ، خوای گەورەش ئەم خەڵکەی وا دروست کردووە کەئوممەتی لاوازو ژێر دەستە هەمیشە سەرسام ئەبێت بە ئوممەتی زاڵ و دەسەڵاتدار و پاشان دەست بە لاسایی کردنەوەی ئەکات لە ڕەوشت و ئاکار و شێوازی ژیانیدا [1] .

کار ئەگاتە ئەوەی لە ( بیروباوەڕ ) و ( بیروڕا ) و ڕۆشتنبیری و ئەدەب و هونەرەکانیشدا هەر لاسایی ئەکاتەوە و بەو شێوەیە ئەم ئوممەتە لاساکەرەوە هەموو بنەمازاتی یەکانی خۆی و شارستانیە تەکەی لە دەست ئەدات _ ئەگەر خاوەن شارستانێتی بێت _ و ئەبێتە بار بەسەر جگە لە خۆیەوە .

ئەگەر ئەو ئوممەتە بارکەوتووە فریای خۆی نەکەوێت و لەو چاولێکەریە کوێرانە (وپشت ئەستور بە هێزە زاتی یەکانی) خۆی قوتارنەکات بەبیٚ گومان و دوودڵی کاری لەکار ئەترازێت و بەرەو پوکانەوە و کۆیلەیەتی و لە دەستدانی کەسایەتی خۆی ئەچێت بەتەواوەتی ، و تووشی چەندان دەردی کۆمەڵایەتی ترسناك ئەبێت وەك ( سەرکزی ) و ( سوکێتی ) و ( داڕوخان ) لە هەموو شتێکدا ، سەبارەت بەو ئوممەتە خواییانەی کە پەیامی خوداییان بۆ هاتووە _ وەك ئوممەتی ئیسلام _ لاسایی کردنەوە یان بۆ جگەلە خۆیان لە پەیامەکەیان دووریان ئەخاتەوە و هەوڵدان و ووزەکانیان لە ئەم دینە دوور ئەخاتەوە و کۆڵیان بە ( بیدعە) و ( ئەفسانە ) ئەکوتێت و باریان ئەکات بە هەموو ئەو شتانەی کە خوا بڕیاری نەداوە لەسەریان چ لەمەیدانی سیستەم و یاساکان دا بێت،یان لە مەیدانی دەردە ڕەوشتەکانیاندا بێت کە ئەنجامەکەی سەر لەوەوە دەردەکات کە دەست بنێن بە پەیامەکەیانەوە و ( ولاء ) ی خۆیان بدەنە ( طاغوت ) و ( کافران ) و لێیان بچنە پێشەوە و دڵیان بدەنیٚ !! و ئیتر کاتی ئەوە دیٚ خوای گەورەش لێیان تووڕە ببێت و سزایان بۆ بنێرێت ، هەروەك لە زۆر چیرۆکی قورئاندا باسی ئەم جۆرە میللەتانە کراوە ، ئەم ئوممەتەش ئەمڕۆ وەك میللەتانی تر دەستی داوەتە لاسایی کردنەوەی کوێرانەی کافران و پشتی کردووەتە پەیامی خوا و وەلائی داوەتە کافران و بە شوێن ئەواندا ئەڕوا لە هەموو شتێکی ژیانیدا و فەرمانڕەوایی بەشتێك ئەکات جگە ئەو شتەیە

---

[1] ) بڕوانە : مقدمة ابن خلدون ، فضل ، اقتداء المغلوب بالغالب ، ص١٤٧ .

خوا ناردوویەتە خوارەوە و زینا و سوو خواردن و داوێنپیسی داوەتە بەرو کەچی هێشتا هەر ئەو " منەت " بەسەر خوادا ئەکات ! چی یە ؟ ؟ موسڵمانێتی خۆی ڕاگەیاندووە )) [1] !!

## باسی سێیەم

### سوڵتان عبدالعزیز ( ١٢٧٧_١٢٩٣ك/ ١٨٦١ _ ١٨٧٦ ز ) :

دوای براکەی و لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٢٧٧ ك ، دەسەڵاتی گرتە دەست و لە سەردەمی ئەمدا شۆڕشێك لە دوورگەی (کریت)دا دروست بوو ، لە ساڵی ١٢٨٣ ك _١٨٦٣ ز دا کپ کرایەوە ، و کەناڵی سویس لە ساڵی ١٢٨٥ ك _ ١٨٦٩ ز ) کرایەوە و گۆڤاری ( الاحکام العدلیە ) و ( یاسای بازرگانی دەریای ) لەسەرتای سەردەمی ئەمدا دەرکران ، سەردانێکیئەوروپای کرد و بیری لەوە ئەکردەوە سوود لەو جیاوازی یە ناوخۆیانە ببینیّ کە لەنێوان دەوڵەتە ئەوروپیەکاندا هەیە ، بەڵام سەیر ئەکات هەموویان لە دژایەتی دەوڵەتی عوسمانیدا یەك هەڵوێستیان هەیە لەبەرئەوەی دەوڵەتێکی ئیسلامی یە ، و ئەوروپای یەکان نەیانتوانیوە ئەو ڕقە خاچپەرستی یەی خۆیانیان لە بیربچێتەوە کە ڕەگی بەناخیاندا داکوتاوە ، با هەریەکەیشیان لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆی لەگەڵ ئەوی تریاندا جیاوازی بۆ دروست ببێت [2] .

دەوڵەتە ئەوروپی یەکان بڕیاریان دابوو کە بەردەوام فشار بەرن بۆ دەوڵەتی عوسمانی تا دەست هەڵنەگرێت لە هەنگاوەکانی ڕیفۆرم و ڕاپەڕین _ بەحسابی ئەوان _ بەپیّ ی میتۆدەکەی ئەوان و بیروبیرکردنەوەی ئەوروپا و بنەما عەلمانی یەکانی ، سوڵتان عبدالعزیزیش بڕیاری دا بوو کە لەسەر هەنگاوەکانی باوکی ( سوڵتان محمودی دووەم ) و ( عبدالمجیدی ) ی برای بەردەوام بێت ، بۆیە هەموو ئەوانەی لەکاردا بوون لە ناو دەوڵەتدا و کاری هەڵسوڕاندنی پرۆسەی ڕیفۆرمیان پیّ سپێردرا بووو وەك خۆی هێشتنیەوە ... لە گرنگترین چاکسازیە ئیداری یەکانی سەردەمی ئەم دەرکردنی ( یاسای هەرێمەکان ) بوو لە ساڵی ١٢٨١ : _ ١٨٦٤ ز ،دیسان لە بواری بەڕێوەبردندا دادگای باڵای بڕیاردان ( دیوانی یاسا دادگەری یەکان ) دامەزرا ، هەروەها لە ساڵی ١٢٨٥ك _ ١٨٦٨ ز ئەنجومەنێك بۆ دەوڵەت

---

[1] ) بڕوانە : القلید والتبعیة ، ص١١٤ ، ١١٥ .

[2] ) بڕوانە : تأریخ الشعوب الاسلامیة / ص٤٩٠ ، ٤٩٢ .

دامەزرێنرا لەسەر شێوازی فەرەنسی ناونرا ( شورای دولت ) : واتە ئەنجومەنی شورای دەوڵەت و لە گرنگترین تایبەتمەندی یەکانی لێکۆڵینەوە بوو لە میزانەی ساڵانە [1] .

هەروەها لە بواری خوێندندا ، قوتابخانەیەکی دواناوەندی لە ساڵی ١٢٨٥ ك _ ١٨٦٨ز دامەزراند کە ناوی (( قوتابخانەی غلطه سراي )) بوو ، بەرنامەی خوێندن لەم قوتابخانەیەدا زۆر باشتر بوو لە بەرنامەی خوێندنی قوتابخانە دواناوەندی یەکانی تر ، هەموو وانەکانی بەزمانی فەرەنسی تێیدا ئەخوێنرا ، وانەی زمانی تورکی نەبێت مەبەست لە کردنەوەی ئەم قوتابخانەیە ئەوە بوو کە کۆمەڵێك گەنج پێبگەیەنێت بتوانن باری کارە گشتی یەکانی دەوڵەت هەڵبگرن ، ئەم کۆمەڵە گەنجە لە شوێنکەوتەی هەموو ئایینەکان هەڵبژێردرابوون ، زۆر بەیان لە موسڵمانەکان بوون ، و هەندێ لە ئەرمەنە یۆنانی یەکان کە نەصرانی بوون و هەندێ کەسی جولەکە شی تێدا بوو ، لە ڕاستیدا قوتابیان ڕوویان کردە ئەم قوتابخانەیە تا ژمارەی قوتابیان لە ساڵی ( ١٨٨٩ز ) دا گەیشتە ( شەش صەد ) قوتابی لە موسڵمانان و نەصاراو جولەکەکان)[2].

لەگەڵ ئەو هەموو هەنگاوە چاکسازی یەی کەلەسەردەمی سوڵتان عبدالعزیز دانرا ، کەچی دەوڵەتە ئەوروپای یەکان بەوەیان نەئەزانی کە دەوڵەتی پێ بەرزبێتەوە و بەڵگەش بێت لەسەر ئەوەی کە دەوڵەتی عوسمانی ڕیفۆرمی دەوێ ! و کار بۆ ئەوە ئەکات بارودۆخی هاووڵاتی یە نصاراکان چاك بکات و ئەوەش بەس بێت بۆ ڕاماڵینی ئەو گەندەڵی یەی سەراپای سیسەمی بەڕێوە بەرایەتی و حوکمەتی گرتبوویەوە ، ئەو گەندەڵیانە لەدیدی زۆرێك لە ئەوروپی یە هاوچەرخەکاندا هەڕەشەی داڕووخانی یەکجاری لە دەوڵەت ئەکرد [3] .

ڕای کۆمەڵێکی گەورە لە ئینگلیزە هاوچەرخەکان و جگە لە وانیش ئەوە بوو کە ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی خەریکە ئەبێتە شتێکی پێویست ، چونکە لەوەدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا کە میتۆدی ئەوروپی بگرێتە بەر بۆ ڕیفۆرم ، ( لورد کلا رندون ) وەزیری دەرەوەی بەریتانیا لە ساڵی ( ١٨٥٦ ز ) دا ئەڵێ :

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٥٩ .

[2] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٥٩ .

[3] ) بڕاونە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٥٩ .

( تاکە ڕێگەیەك هەبێت بۆ چاکسازی حاڵەتی عوسمانی یەکان ئەوەیە بەشێوەیەکی یەکجارەکی لەم سەر زەوی یەدا نەیانهێڵین )[1] .

دەوڵەتی عوسمانی لەوەدا سەرنەکەوت کە دەست بە هۆکارەکانی ڕیفۆرمی ئەورووپای یەوە بگرێت هۆکەشی ئەوە بوو کە هیچ جۆرە پەیوەندی یەك لە نێوان پرەنسیپەکانی دەوڵەتە ئەورووپای یەکان و پرنسیپەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا نە بوو ، ئەو پرنسیپانەی کە لە قورئان و حدیثی پێغەمبەرەوە (ﷺ ) وەرگیرا بوون[2] .

(لابردنی سوڵتان عبدالعزیز لەسەر کارەکانی )

سوڵتان عبدالعزیز سەردانی ئەورووپای کرد بووو ، لەوە حاڵی بوو کە دەوڵەتە ئەورووپیەکان هەموو لەسەر ئەوە ڕیکەوتن و پلانی ئەوەیان بە دەستەوە یە کە دەوڵەتی عوسمانی لە ناو بەرن ، بۆیە هەوڵی دا بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتی عوسمانی سوود لە و ناکۆکی یانە ببێنێ کە لە نێوان دەوڵەتە ڕۆژئاوایی یەکانی ئەورووپا و ڕوسیادا هەیە . لەبەر ئەوە زوو زوو بانگێشتی باڵوێزی ڕوسیای ئەکرد بۆ ئەستانبوڵ ، ئەمە وای کرد دەوڵەتە ئەورووپای یەکان بترسن و دەستیان دایە پڕوپاگەندە کردن لەسەر سوڵتان و تۆمەتباریان کرد بەوەی پیاوێکی دەست بڵاو و سەروەت بە فیڕۆدەرە و ئەوە بوو مدحت پاشا توانی لەسەر کار لای بدات و پاش ماوەیەك لەگەڵ تاقمەکەیدا لە ساڵی ( ١٢٩٣ك _ ١٨٧٦ ز ) بیکوژن[3] .

مدحت پاش لە جولەکەکانی ( دۆنمە ) بوو ، پڕوپاگەندەی ماسۆنیەت لە هەوو ڕۆژهەڵاتی عەرەبی و ڕۆژئاوادا توانی وەك قارەمانێکی گەورە و هەڵگری ئاڵای چاکسازی و ئازادی لە دەسەڵاتی عوسمانی دا بیناسێنێ ، و ناوی نا ( باوکی دەستور ) و هەموو کەناڵەکانی پڕوپاگەندەی خستە خزمەتی چ گۆڤارو ڕۆژنامەکان و چ ئێستگە دەنگی یەکان ، بەو شێوەیە گەیشتە بەرزترین پلەی پاشایەتی لە سوریا و عێراقدا و گەیشتە پلەی ( صەدری ئەعڤەم ) کە باڵاترین پلەی بەرپرسیارێتی بوو لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا ، پاشان دەستی دایە سیخوڕی کردن و وێرانکاری هەرچۆن مەزهەبە جولەکەی یەکەی و ماسۆنیەتەکەی داوای بکردایە ، و هەمیشە و بەهاوکاری لەگەڵ ماسۆنیەتدا خەریکی گاڵتە کردن ڕەخنەگرتن بوون لەشتە

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. جمال عبدالهادي ، ص١١٠ .

[2] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی ی پێشوو ، ص١١٠ .

[3] ) بڕوانە : اليهود والماسونية ، عبدالرحمن الدوسري ، ص٧٠ _ ٧١ .

سلبیەکانی دەسەلاَت بەتایبەتی دەسەلاَتی (سولَتان عبدالحمید) _ دوژمنی هەرە گەورەی ماسۆنیەت کە هیچ کونێکی نەهێلاَیەوە جولەکە لێوەی ئومێدی ئەوەیان هەبێ بێنەناو فەلَەستین ، پاشان ئەم مدحت پاشایە و جولەکە ماسۆنی یەکانن دۆنمەی جیهانی کەلە دەوری بوون ( کۆمەلَەی یەکێتی گەشەکردن =الاتحاد الترقی ) یان دروست کرد کەهەمان دروشمەکانی ماسۆنیەتی هەلَگرت و لە ( سلانیك ) بنکەیان بۆ دانا ، هەندێ لایەنی نهێنی ئەم جولەکە یە بۆ سولَتان عبدالعزیز دەرکەوت و ئەویش فرمانی گرتنی بۆ دەرکرد و پاشان لەسەر کار لایبرد و دوای ئەوە دووری خستەوە )[1] .

**هۆی کوشتنی سولَتان عبدالعزیز :**

ڕەتکردنەوەی هەموو دەستووورە ڕۆژئاوایی یەکان بەگشتی ، هەروەها هەموو ئەو باوو نەریتە ڕۆژئاوایی یانەی کە بە وولاَتی ئیسلامی نە ئەخوارد ، زالَبوونی بەسەر پڕۆسەی چاکسازیدا لە ناو دەولَەتی عوسمانیدا تاڕادەیەکی باش بەتایبەت لە بواری سەربازیدا ، ئەوە بوو هێزێکی باشی دایە سوپا و چەکە کۆنەکانی هەموو بۆ گۆڕین بە چەکی تازە و لە چاکترین ئەمبارەکانی چەکەوە لە ئەوروپا ئەوەی پێویست بوو لە چەك بۆی کڕین ، لەسەر سیستەمی تازە سەرلەنوێ پلەی سەربازی یەکانی داڕشتەوە و چەند تیپی تازە سەربازی دروست کرد لە منالَی خەلَکی عەشایەر و خێلَە جیاجیاکانی گشت هەرێمەکان ، قەلاَو قولەکانی هەموو پڕ چەك کرد بە گەورەترین و تازە ترین تۆپهاوێژ ، و وای لێ هات هێزە دوور هاوێژەکانی دەولَەتی عوسمانی بە نمونە ئەهێنرایەوە لە پێشێکەوتندا ، خانەی تۆپهاوێژەکان ( تۆپخانە ) ی نوێژەن کردەوە و تفاق و چەکی زۆری بۆ پەیدا کرد ، تا وای لێ هات ئەتوانرا هەموو جۆرە چەکێکی تازەی تێدا دروست بکرێت ، هەروەها لە بواری دەریایشدا چاکسازی زۆری کرد و خەلَکی شارەزای عوسمانی لە جێگای شارەزا بیانی یەکان دانا هەرچەند خۆیشیان و دەولَەتە کەیشیان ناڕەزایی یان دەردەبڕی ، لەسەر دەمی ئەمدا دەولَەتی عوسمانی بوویە یەکەمین دەولَەتێکی دەریایی لە دونیادا ، و تیمی دەریای ئەناردە دەرەوە و کەوتە کڕینی تانك و چەند کارگەی دانا بۆ دروست کردنی تانك و دەزگای تر و دروستکردنی گەنجینە بۆ دەزگای هەلَمی ، خانەی کارگەی ( ازمیت ) هەمان شانوشکۆی جارانی بۆ گەڕایەوە و زۆرێك لە حەوزەکانی تایبەت بە کەشتی نەوژەن کردەوە و گۆڤاری ( الاحکام العدلیە ) ی دامەزراند و کاری بۆ ئەوە

---

[1] ) بڕوانە : تأریخ الدولة العثمانیة / د. علی حسون ، ص٢٠٥ ، ٢٠٦ .

ئەكرد هەق و ڕاستی بچەسپێنیٚ و چەند گەورە بەرپرسی دایە دادگا وەك " خسروپاشا " و " عاكف پاشا " و ( طاهر پاشا " و بەو كارانەش دادو چاكسازی بۆ هەموو لایەك دەركەوت و ئەمەش مایەی خۆشحاڵی دەوڵەتە ئەوروپای یەكان نە بوو ، چونكە ئەوان ئەیانویست ستەم و زۆرداری ئەوەندە زۆر بێت دەوڵەتە كە بە خێرایی بڕوخێنیٚ ، هەروەها سوڵتان عبدالعزیز چاكسازی زۆری لە كاروباری ئابوریدا كرد و فەرمانی كرد بە كۆنترۆڵكردنی ( بوجە ) و هەڵوەشاندنەوەی سیستەمەكانی پارەو بەو شێوەیە هەموو قەرزەكانی دەوڵەتی پاك كردەوە و وای لیٚ هات مامەڵە بە پارە ئەكراو و كاروباری پارە كەوتە ژێر كۆنترۆڵ ، دەوڵەتە ئەوروپی یەكان كە ئەمانەیان بینی لە ماوەیەكی كورتدا ڕووئەدەن لەسەر دەستی ئەم سوڵتانەدا و نەخشەكانیان بۆ لەناو بردنی ئەم پیاوە نەخۆشە پەرچی لەبەردەمدا دروست بووە ، وایان بە باش ئەبینی پیلان بۆ لەسەر كارلابردنی و پاشان كوشتنی دابنێن [1]، ڕەگ و ڕیشەی كوشتنی سوڵتان عبدالعزیز ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو نەخشە بەبەرنامەیەی كە قونسوڵگەر و نوێنەرانی دەوڵەتی ئەوروپی یەكان لە پایتەختی عوسمانیدا دایان نا ، هەر خۆشیان لە ڕێگەی بەكرێگیراوەكانیان جێبەجیٚ یان كرد ، ئەو بەكرێگیراوانەی كە بەبیروباوەڕی خۆیان ئاخنیبونیان و لە پیاوانی دەوڵەتیش بوون ، لەسەرو هەموو یانەوە دەسكەلای دەستی ماسۆنیەت ، ( مدحت پاشا ) [2]، كە لەكاتی دادگای كردنەكەیدا دانی بەوەدا نا كە لە لابردن و كوشتنی سوڵتان عبدالعزیز دا ئەویش بەشدار بووە و ئەمەش شتێكی ئاشكرایە لە مێژوودا و لە دیكۆمێنێتەكاندا تۆمار كراون [3] .

## باسی بازدەیەم

**سوڵتان مورادیپێنجەم ( ١٢٩٣ك ) و ماوەی دەسەلأتەكەشی تەنیا ( ٩٣ ) ڕۆژ بوو .**

كوڕی " سوڵتان عبدالمجید "ە ، لە ٢٥ / رجب / ١٢٥٦ ك بەرانبەر بە ( ١٨٤٠ ز ) لە دایك بووە ، لە ( ٧رجبی الاولی / ١٢٩٣ ) دا هاتە سەركورسی دەسەلأت [4] .

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٠٥

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص ٢٠٨ .

[3] ) بڕوانە : تأریخ الدولة العثمانیة ، علی حسون ، ص٢٠٩ .

[4] ) بڕوانە : الدولة العثمانیة ، د. اسماعیل یاغي ، ص١٧٧ ، ١٧٨ .

پیاوێکی تاڕادەیەك زیرەك و ڕۆشنبیری تورکی و ڕۆژئاوایی بوو ، گرنگی یەکی باشی بەئەدەب و زانست و کاروباری ئەوروپا ئەدا ، سەردانی ئەوروپای کرد و چاوپێکەوتنی لەگەڵ هەندێ لە ئەوروپیەکاندا کرد ، چوویە ناو بازنەی ماسۆنیەتەوە و پەیوەندی بە ( نامق کمال ) و جگە لەویشەوە هە بووە کە ئەندامێکی بزوتنەوەکەیە ، زۆر لایەنگری دەستوور و لیبڕاڵیەتی و عەلمانیەت بوو [١] .

بزوتنەوەی ماسۆنیەت ئەم سوڵتانەی بردە سەرکورسی دەسەڵات ، بەڵام تووشی پشێوی عەقڵی ئەبێت لە ئەنجامی ئەوەی تووشی ترس و ڕاچڵەکینێکی زۆر ئەبێ کە نیوە شەو خەبەری ئەکەنەوە و هەواڵی لەکارلادانی سوڵتان عبدالعزیز ی ئەدەنێ ، کاتێکیش هەواڵی کوشتنی ( حسن الجرکسی ) ئەدەنێ تووشی حاڵەتێکی دەروونی و دەماغی ئەبێت کە کار لە دەزگای هەرسی ئەکات ، باری تەندروستی ئەم سوڵتانە بەبەردەوامی بەرەو خراپی ئەڕۆیی هاوکات لەگەڵ ئەو هەولانەی کە مدحت پاشا ئەیدان بۆ ڕاگەیاندنی دەستوری دەستکرد وەك ئەڵتەرناتیڤێك بۆ شەریعەت لەسەروبەندی نەخۆشیەکەی ئەودا و خەریکی لێکۆڵینەوەی یاساو سیستەمە ڕۆژئاوایی یەکان و پەیوەندی کردن بوو بە هاوکارەکانیەوە ، تا گەیشتە ئەوەی دەستورەکەی ئامادەکرد، ئەڵێن عەقڵ لەدەستدانی سوڵتان لە هەموو کەسێکەوە دەرکەوت بە ڕوونی ، و لابردنی لەسەر کار پێویست بوو بۆیە ( شێخول ئیسلام ) لە ساڵی ( ١٨٧٦ ز ) دا ئەوەی ڕاگەیاندو ئەمەش دەقی فەتواکەیە : (( ئەگەر پێشەوای موسڵمانان بە تەواوەتی شێت بوو بەوڕێژەیەی کە مەبەست لە پێشەوایەتی یەکەی لەدەست بدرێت ، ئایا دروستە مافی پێشەوایەتی لێبسێنرێتەوە ؟ وەڵامەکەی ئەوەیە : بەڵێ دروستە و خواش باشتر ئەزانێ : بەندەی هەژار ( حسن خیر ) ئەمەی نوسیوە _ خوا لێ ی ببورێت )) [٢] .

پاش ئەوەی لەسەر کار لایان برد لە نەخۆشیە عەقڵی یەکەی چاك بوویەوە ، و ئەو تەمەنەی تری کە مابووی لە کۆشکی ( چراخان ) بردیە سەر ، تا لەتەمەنی نزیك شەست و چوار ساڵیدا وەفاتی کرد [٣] ، هەندێ لە لاوانی ( کۆمەڵەی یەکێتی و گەشەکردن ) کاریگەری زۆریان لەم موورادی پێنجەمە کرد و بردیانە ناو کۆڕی ماسۆنیەت و فێری مەشروب

---

[1] ) بڕوانە: تأريخ الدولة العثمانية ، د. علی حسون ، ص٢٠٩ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢١٠ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢١٠ .

خواردنـەوەش بـوو ، تێـریش بـوو لـە بـیروڕای عـەلمانی و فەلـسەفەی ڕۆژئـاوایی [1] ، (سـوڵتان عبدالحمید) دەربارەی ئەڵێت : ( سروشتی وابوو هەر کە س زەردەخەنەیەکی بەڕوودا بنواندایە پێی ئەخەڵەتا ، بیٚ ئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کامە عەقڵ ئەیبڕیٚ و کامە عەقڵ نای بڕیٚ هەر لەبەر ئەمە بوو کە هەر بەخەیاڵیشیدا نە ئەهات ئەوە جوان نی یە بۆ کەسێکی وەك ئەو سەر بە کۆڕی ماسـۆنیەت بێـت و لـە داهاتوویـشدا خەلیفـەی موسـڵمانان بێـت و نەیئـەزانی ڕێـژەی ئـەو کارەساتەی لەمەوە دروست ئەبێت چەندێکە ، ئەوە بوو هەندیٚ کەس ئەوانەی کە لافی ئـەوەیان لـیٚ ئـەدا هـەواداری نوێبوونـەوەن توانیـان هـانی بدەن و فێـری مەشروب خواردنـەوەی بکـەن و هەندیٚ شتی ناو ژیانی ئەوروپای لا جوان بکەن کە لای ئێمە زۆر سووك سەیر ئەکرا )) .

## بەشی شەشەم

### سەردەمی ( سوڵتان عبدالحمید )

### باسی یەکەم

(سوڵتان عبدالحمید) ( ١٢٩٣ _ ١٣٢٦ : / ١٨٧٦ _ ١٩٠٩ ) :

(سوڵتان عبدالحمید) سوڵتانی سی و چوارەمە لە سوڵتانەکانی دەوڵـەتی عوسمـانی ، کە هاتـە سەر کورسی دەوڵەت و دەسەلاٚت لە تەمەنی سی و چوار سالاٚندا بوو ، چونکە خۆی لە ( ١٦/ شعبان / ١٢٥٨ك _ ١٨٤٢ ز ) دا لە دایك بوو بوو .

دایکی (سوڵتان عبدالحمید) کە مرد ئەم تەمەنی لە دەسالاٚندا بوو ، ژنـی دووەمـی بـاوکی کە ژنێکی نەزۆك بوو کەوتە سەرپەرشتی کردنی ئەم ، لە ڕاستیدا جوان پـەروەردەی کـردو هـەوڵی دا بـۆی ببێتـە دایـك ، هەرچـی خۆشەویـستی خـۆی هـە بـوو دای بـە ئـەم و پاشـانیش کـەمرد وەسیەتی کرد کە هەموو میراتەکەی بدەنە (عبدالحمید) .

(سـوڵتان عبدالحمیـد) زۆر لـە ژێـر کاریگـەری ئـەم پەروەردەیـەدا بـوو ، بەشـەرم و شـکۆ و دینداری و دەنگی نـرم و فێنکـی ئـەم ئافرەتـە سەرسـام بـوو ، ئەمـەش بـە ئاشـکرا لـە کەسـایەتی (عبدالحمید) دا بە درێژایی ژیانی ڕەنگی دابوویەوە .

(عبدالحمیـد) خوێنـدنێکی ڕێـك و پێکـی لـە کۆشـکی سـوڵتاندا تـەواو کـرد لەسـەر دەسـتی کۆمـەڵێك پیـاوی زانـا و هەڵبـژاردەی سـەردەمی خـۆی دا لـە زانیـاری و لـە ڕەوشتیـشیدا ، فێـری

---

[1] ) بڕوانە : والدي السلطان عبدالحميد ، ص١٧٨ .

زمانی عەرەبی و فارسی بوو ، وانەی مێژووشی خوێند و خۆشەویستیەکی بۆ ئەدەب تێدا دروست بوو ، لە زانستی ( التصوف ) دا زۆر ڕۆچوو ، بە زمانی تورکی عوسمانی هەندێ شعریشی هۆنیوەتەوە [1] .

مەشقی تەواوی لەسەر بەکارهێنانی چەك کردوە و بە لێزانینەوە ئەیتوانی شمشێر بەکار بهێنێت ، و بە دەمانچە نیشانەی بە وردی ئەپێکا ، پارێزگاری لە وەرزشە لەشی یەکان ئەکردو بەردەوام ئەیکردن ، گرنگی زۆری بەسیاسەتەکانی جیهانی ئەدا زۆر بە وردەکاری یەکی بێوێنەوە و گرنگی یەوە بەدواداچوونی بەردەوامی هە بوو بۆ ئەو هەواڵانەی دەربارەی وولاتەکەی و جێگەی لە جیهاندا بلاّو ئەکرایەوە .

یەکەم / سەردانی (عبدالحمید) بۆ ئەوروپا لەگەڵ (سوڵتان عبدالعزیز)ی مامەیدا :

سوڵتان عبدالعزیز سەردانێکی ئەوروپای کرد هاوڕێ لەگەڵ شاندێکی باڵای عوسمانیدا کە لە ناویاندا میر (عبدالحمید) بوو ، کە لە بەرگێکی سادەو ڕەوشتێکی پاك و بەرزدا کەوتە بەرچاوی ئەوروپی یەکان [2] ، میر (عبدالحمید) پێشوەخت خۆی بۆ ئەم سەردانی یە ئامادە کرد بوو ، کتێبێکی زۆری خوێندبوویەوە ، پیاوێکی زۆر وورد بوولە ڕوانین و لە بڕیاردانیدا بەسەر هەرشتێکدا کە لە ڕۆژئاوادا ئەیبینی ، ئەم وەفدەی عوسمانی یەکان لە ئەوروپادا چاوپێکەوتنێکیان لەگەڵ گەورە سیاسەتمەدارەکانی ئەوێدا کرد وەك : ناپلیۆنی سێ یەم لە فەڕەنسا و (ڤیکتۆریا) شاژنی ئینگلتەرەو لیو بلدڤی دووەم لە بەلجیکا و غلیومی یەکەم لە ئەڵمانیا و فرانسواجوزیف لە نەمسا [3]

میر (عبدالحمید) پێش ئەم سەردانەشی لەگەڵ (سوڵتان عبدالعزیز)دا سەردانی میصریشی کردووە ، لەو ماوەیەی کە لە میصردا مابویەوە سەرنجی ئەوەی دا بوو کەئەم بریق و باقەی ئەوروپا پڕە لە درۆ و گزبازی و خەڵکی ئەوێش تەنیا شتە ڕووکەشەکانی ئەوروپایان وەرگرتووە ، هەر بۆیە میصر فێری قەرزکردن بووە و بووە بە ژێر قەرزیشەوە لەبەرئەوەی کە (خدێوی اسماعیل) دەستی داوەتە زیادەڕۆیی و ئەیەوێت میصر بکاتە پارچەیەك لە ئەوروپا .

سەردانەکەشی بۆ ئەوروپا لە ٢١ یۆنیوی /تا / ٧ / اغسطس / ی لە ساڵی ١٨٦٧ ز خایاند ،

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، محمد حرب ، ص٣١ .

[2] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٣٢.

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٣٣

ئەم شاندە عوسمانی یە ئەم وولاّتانە گەڕان ، فەڕەنسا ، و ئینگلتەرا و بەلجیکا و دەولّەتی نەمسای مەجەڕی .

لەم سەردانەدا بۆ ئەورووپا ، زەینی (عبدالحمید) کرایەوە بە سەر زۆر شتدا ، کە ئەو شتانە لە دواییدا ڕەنگیان دایەوە لە هەموو ئەو ماوەیەدا کە ئەو دەسەلاّتی لەدەستدا بوو ، ئەو شتانەش ئەمانەن :

١- ژیانی ئەورووپایانە بە هەموو ئەو شتانەوە کە هەیانە وەك ڕێبازی جۆربەجۆریان بۆ ژیان و ئاکاری جۆربەجۆرو گرنگی دانیان بە هەندیّ شتی ڕووکەش .

٢- ئەو پێشکەوتنە سەربازی و پیشەسازیەی هەیانە بەتایبەت لە هێزە وشکانی یەکەی فەڕەنسا و ئەلّمانیا و هێزە دەریای یەکەی بەریتانیا دا .

٣- گەمەکانی سیاسەتی جیهانی .

٤- ڕادەی کاریگەری هێزە ئەورووپای یەکان لە سەر سیاسەتی دەولّەتی عوسمانی ، بەتایبەتی کاریگەری ناپلۆنی سیّ یەم لەسەر سولّتان عبدالعزیزی مامەی ، و فشاری ناپلیۆن لەسەری تا پشتیوانی لە علی پاشای وەزیری بکات لەگەلّ ئەوەدا کە سولّتان عبدالعزیز هەرگیز نەی ئەهێلاّ کەس هەست بەوە بکات کە ئەم لە ژێر کاریگەری هیچ هێزێکی ڕۆژئاوایی دایە )) [1].

میر (عبدالحمید) لەم سەردانەی دا گەیشتە ئەو بڕوایەی کە فەڕەنسا وولاّتی گالّتەو گەپە و ئینگلتەرا وولاّتی سەروەت و کشتوکالّ و پیشەسازی یەو بەلاّم ئەلّمانیا وولاّتی سیستەم و سەربازی و بەڕێوە بەردنە و زۆر سەرسام بوو بە ئەلّمانیا وە ، هەر بۆیە کاری مەشقکردن بە سوپای عوسمانی سپارد بە ئەوان کاتێك کە بوو بە ( سولّتان ) میر (عبدالحمید) ئەم سەردانەی ئەوەندەکاریگەری هە بوو لەسەری وای لێکرد کە گرنگی زۆر بدات بەوەی کە هەموو داهێنراوێکی تازە بێنێتە ناو دەولّەتەکەی لە هەموو بوارەکانی ژیاندا : چ بواری خوێندن و پیشەسازی و چ بواری دەزگاکانی پەیوەندی کردن و دەزگا سەربازی یەکان نمونە لەسەر ئەمەش وەك ، دوو کەشتی ژێر دەریا ( غواصە ) ی کڕی ، ئەو کاتە ئەو جۆرە چەکە زۆر کەم بوو، بە پارەی تایبەتی خۆی " تەلەگرافی " هێنایە ناو وولاّت ،قوتابخانە تازەکانی دامەزراند ، و زانیاری یە هاوچەرخەکانی کردە بەرنامەی خوێندن تیاندا ، یەکەم ئوتۆمبێل و یەکەم

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ،ص ٥٦ .

پاسکیلی هێنایە ناو وولات و سیستەمی پێوانەی بە ( مەتر ) ی داهێنا ، بەڵام زۆر ئازایانە دژی ئەوە وەستایەوە کە بیروڕای ڕۆژئاوا لە وولاتدا بلاْوببێتەوە [1] .

ئەم سەردانەی بۆ ئەوروپا ئەو کاریگەری یەشی لە (عبدالحمید)دا دروست کرد کە یەك سیاسەتی سەربەخۆ پەیڕەو بکات لەگەڵ ئەوروپادا ، بۆیە کەس ئەوەی لەسەر تۆمار نەکردووە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان چووبێتە ژێر کاریگەری هیچ کاربەدەستێکی ئەوروپای یەوە ، چەند هاوڕێیەتیشیان بە هێز بوو بێت ، یان ئەو دەوڵەتە نزیك بوو بێت لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا .

لەم سەردانەیدا ئەو چاوپێکەوتنەی (فؤاد پاشا ) ی صەدری ئەعظەم کە لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی ئەوروپای دا سازی دا ، سەرنجی (عبدالحمید)ی ڕاکێشا .

پرسیار کرا لە (فؤاد پاش) لەم سەردانەدا : دوورگەی کریت بەچەند ئەفرۆشن ؟ (فؤاد پاشا) لە وەڵامدا ووتی : ( بەو نرخەی کەکڕیومانە ) ، مەبەستی بەمە ئەوە بوو ، عوسمانی یەکان لە پێناو پاراستنی دوورگەی کریتدا ٢٧ ساڵ لەجەنگدا بووم .

هەروەها پرسیارێکی تریان کرد لە (فؤاد پاشا) : ( بە هێزترین دەوڵەتی ئەمڕۆ لە جیهاندا کێ یە ؟

لە وەڵامدا ووتی : (( بە هێزترین دەوڵەتی ئەمڕۆ بریتی یە لە دەوڵەتی عوسمانی ، ئەوە ش لەبەر ئەوەیە ئێوە بەردەوام لە دەرەوە ئەیڕوخێنن و ئێمەش بەردەوام لە ناوە وە ئەیڕوخێنین ، کە چی بەرهەر دوولامانەوە نەمانتوانیوە بیڕوخێنین [2] .

(عبدالحمید) لەمەوە ئەووانەیە فێر بوو چۆن ئەو هێزانە بێدەنگ بکەی کە مەبەستیانە دەوڵەتی عوسمانی بڕوخێنن ، فێری زیرەکی و وورپای بوو لە کاتی حیواری سیاسی دا لە کۆتایشدا هەر لەم بوارەدا زۆر هەڵکەوتوو بوو .

تەمەنی (عبدالحمید) لەم سەردانەدا ٢٥ ساڵ بوو .

دووەم / ( بەیعەت ) وەرگرتنی بۆ خەلافەت و گەیاندنی دەستور : پاش مرادی برای بەیعەت بەئەم درا ، لە ڕۆژی پێنج شەمە ١١ی شعبان ی ١٢٩٣ ك ، ١٣ اغسطس ١٨٧٦ز ، ڕۆژی بەیعەت دانەکەی هەموو وەزیرەکان و ئەشرا ف و گەورە بەرپرسانی دەوڵەت لە مەدەنی یەکان و سەربازیەکانەوە لە ( سرای طوبقبو ) ئامادە بوون و سەرۆکەکانی هەموو تایفە

---

[1] ) هەامان سەرچاوەی پێشوو ، ص٥٧ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٥٨ .

جۆربەجۆرەکانیش پیرۆزبایی یان لیٚ کردو لە هەموو لایەکی دەوڵەتەوە وەك ئاهەنگێرانێك بەم بۆنیەوە دەست کرایە تۆپ تەقاندن ، و سیٚ ڕۆژ لەسەریەك لە ئەستەنبوڵدا کۆڵان و بازاڕ ڕازێنرایەوە و ( صەدری ئەغطە م ) بروسکەی نارد بۆ هەموو دەوڵەتانی جیهان و لەم ئاگارداری کردن [1] .

(سوڵتان عبدالحمید) مدحت پاشای دانا بە ( صەدری ئەعظە م) و پاشان لە ٢٣/ دیسمبر / ١٢٩٢ك و ١٨٧٦ز ) دا دەستور ڕاگەیەنرا کە ئازادی یە مەدەنی یەکانی تێدا دەستەبەر کرا بوو وبە دەق باس لەوە کرا بوو کە ئەمە حکومەتێکی پەرلەمانی یە و ئەم دەستورە بەدەق باسی ئەوەشی کرد بوو کە پەرلەمان لە دووئەنجومەن دروست ئەبێت ، ئەنجومەنی نوێنەران یان ( نێرراوان ) ، پاشان ئەنجومەن ئەشراف یان پیران [2] .

(سوڵتان عبدالحمید) لەسەرتای دەسەلاٚتدارێتی دا تووشی دیکتاتۆریەتی وەزیرەکان و سیاسەتی غەربزەدەکان بوو کە "کۆمەڵەی عوسمانیە تازەکانی " ڕێبەرایەتی ئەم سیاسەتەیاندەکرد ، ئەم کۆمەڵە ژمارەیەك نوخبەی ڕۆشنبیر بوون کە چووبوونە ژێر کاریگەری ڕۆژئاواوە و ماسۆنیەتیش توانیبوی دەستیان پیٚ بگەیەنێت و بەکاریان بهێنیٚ بۆ ئامانجەکانی خۆی ، دیکتاتۆریەتی وەزیرەکان گەیشتە ئەو ڕادەیەی کە مدحت پاشا ئەو کاتەی سەرۆکی نوخبە عوسمانیە تازەکان بوو ، نامەیەکی نوسی بۆ (سوڵتان عبدالحمید) لەسەرتای چوونە سەرتەختیەوە ( ١٨٧٧ ز ) و ئەڵیٚ : ( ئامانجی ئێمە لە ڕاگەیاندنی دەستور هیچ نە بوو ئەوە نەبیٚ کلکی دیکتاتۆرییەت ببڕین و مافەکانی جەنابت و ئەرکەکانی سەرشانت دیاری بکەین و کاری وەزیرەکانیش بە هەمان شێوە دیاربێت و ئازادی و مافی هەموو هاوولاٚتیانیش دەستەبەر بکرێت ، تا وولاٚت بەرزببێتەوە بۆ پلەکانی پێشکەوتن ، منیش لەو شتانەدا گوێڕایەڵی تۆ ئەکەم کە پێچەوانەی سوودی ئوممەت نەبێت ... ) [3] .

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية في تأريخ الاسلامي الحديث ، ص١٨٣ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٧٨ .

[3] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص٥٩.

(سوڵتان عبدالحميد) دەربارەی ئەمە ئەڵێت : (( سەیرم ئەکرد مدحت پاشا خۆی کردوە بە کوێخا و "وەسی " بەسەرمەوە فەرمانم بۆ دەرئەکات ، ئەم هەڵسوکەتەشی زۆر دوور بوو لە گیانی ( مەرجداری یەوە ) ( دیموکراتیەتەوە ) و لە دیکتاتۆریەتەوە نزیك بوو ) [1] .

مدحت پاشا و هاورێ ماسۆنی یەکانی تری قاڵبوو بوون لە مەشروب خواردنەوەدا ،( سوڵتان عبدالحميد) لە یاداشتەکانیدا ئەڵێ : (( ... ئەوەی زانراوە کە ئەوانەی لافی ئازادی یان لێ ئەدا لەو سەردەمەدا لە شاعیران و ئەدیبان دوای دەرکردنی بڕیاری (( یاسای بنەڕەتی )) ، ئێوارەیەك لە کۆشکی مدحت پاشادا هەموو کۆئەبنەوە ، بۆ ئەوە نا کە باس و خواست لە کاروباری دەوڵەت بکەن ، بەڵکوو بۆ ئەوەی باس لەسەرخۆشی و بەدڕەوشتی بکەن وپێك بنێن بەسەریانەوە ، مدحت پاشا لە مەشروب خواردنەوەدا ڕۆچوو بوو هەرلە کاتی لاوێتی یەوە ، و هەمووکەس ئەوەی ئەزانی ، جا ئەو شەوە لە خۆشی مەشروبەکە و لە خۆشی ڕاگەیاندنی ( پێڕەوی ناوخۆدا ) کە تێکەڵ یەك ئەبن مەدحەت پاشا لەسەر مێزی نان خواردنەکە هەڵئە سێت و چەند کەسێك دەستی ئەگرن بۆ ئەوەی نەکەوێتە سەر زەوی ، کە ئەڕوات دەست بشۆرێت بە ( طوسون پاشا ) ی مێردی خوشکە کەی ئەڵێت لەو کاتەدا کە زمانی نەئەچەرخا لە دەمیدا ( بەهۆی سەرخۆشی یەوە بە ئارەقەکە ) :

ئەرێ پاشا ! ئێستا کێ ئەتوانێ دوای ئەوەی کە گەیشتوومەتە ئەم پلەیە دوورم بخاتەوە ؟ کێ ئەتوانێ ؟ پێم بڵێ بەڕای تۆ چەند ساڵ لە پلەی (( صەدری ئەعظە م )) دا ئەمێنمەوە ؟ طوسون پاشا وەڵامی ئەداتەوە و ئەڵێ : ئەگەر لەسەر ئەم بەزمەتان بەردەوام بن هەفتەیە ناخایەنن ) [2] .

مدحت پاشا زۆر جار لەم کۆڕی مەشروب خواردنەوەدا ووردترین نهێنی دەوڵەتی ئەدۆڕاند ، و بۆ بەیانی لە ناو خەڵکی ئەستەنبوڵدا هەموو باسی ئەو زانیاری یانەیان ئەکرد ، شەوێکیان لە کاتی سەرخۆشیدا باسی ئەوە ئەکات کە بەنیازە ڕژێمی کۆماری لە دەوڵەتی عوسمانیدا ڕاگەیەنێت و خۆشی ببێتە سەرۆکی کۆمارەتازەکەی عوسمانی و پاشان ببێتە _ ئیمپراتۆر _ی ئەو کۆمارە و وەك چۆن ناپلیۆنی سێ یەم لە فەڕنسا دا بەو کارە هەستا

مدحت پاشا تۆمەتی ئەوەی لەسەر بوو کە بە دەسکیسەی ئەو (سوڵتان عبدالعزیزە کوژراو) ، (سوڵتان عبدالحميد) لیژنەیەکی لێکۆڵینەوەی بۆ ئەو مەبەستە دانا و هەموو

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص٦٠ .

[2] ) بڕوانە : ذمکرات السلطان عبدالحميد ، محمد حرب ، ص٧٧ .

گومانلێکراوەکانی دایە دەست دادگا و ئەویش بڕیاری دادگای بەسەردا سەپاندن و دادگا بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ مدحت پاشا دەرکرد بەڵام (سوڵتان عبدالحمید) دەخالەتی کردو بڕیارەکەی سوك کرد لەسەری و کردیە (( زیندانی )) بۆی و پاشان دووری خستەوە بۆ شام چونکە زیندانی سەربازی لەوێ بوو .

دەستوور دەسەڵاتەکانی (بە ڕووکەش نەك بە ناوەڕۆك) لەیەك جیاکردبوویەوە ، هەروەها ئەو گۆڕانکاریانەی کە بە پێی دەستوور هاتبوو بەسەر سیستەمی فەرمانڕەوایی دا ، وەك گەشە کردنێك وابوو نەك گۆڕین ، کەس بیری لەوە نەکردبووویەوە کە مافی دەسەڵاتی سوڵتان کەم بکاتەوە ، هەر دەستوور خۆی بە دەق ئەوەی باس کرد بوو کە کەسایەتی سوڵتان پارێزراوە و کەس بۆی نی یە دەستی بۆ بەرێت ، و لەبەردەم هیچ کەسێکدا پرسیاری ئەوەی لێ ناکرێ فلانە ئیشی بۆچی و لەبەر چی کرد ، ئەمە وای کردبوو کە دەستوور لە دەستی خۆیدا بوو [١] .

تەنیا سوڵتان مافی ئەوەی هە بوو کە وەزیرەکان دابنێ یان لەسەر کار لایان ببات ، هەروەها هەر ئەو مافی بەستنی ڕێکەوتنامە و ڕاگەیاندنی شەڕ و بەستنی ڕێکەوتنامەی ئاشتی هەیە ، خۆی سەرۆکی گشتی هێزی چەکدارە و مافی ئەوەی هەیە کە هەموو جۆرە یاسایەك دەربکات لە هەموو بوارەکاندا بە بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ ( پەرلەمان ) بەو شوەیە(سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) لە ساڵی ( ١٢٩٣ ك ) تا ساڵی ( ١٣٢٧ ك ) بەرامبەر ( ١٨٧٦ _ ١٩٠٩ ) ز بە هەمان دەسەڵاتەوە مایەوە کە هیچ کام لە سوڵتانەکانی پێش ئەو ئەوەندە دەسەڵاتیان نە بوو ، ئەوە بوو مدحت پاشا خۆی بووبە یەکەم قوربانی ، ئەو دەسەڵاتە زۆرەی کە دەستوور دای بە سوڵتان وای کرد کە سنور بۆ سەرۆکی وەزیران دابنێت و وای لێهات جگە لە ڕۆڵێکی دووەمی دەسەڵاتی لەبەڕێوەبردنی کورسی فەرمانڕەوایی دا ڕۆڵی تری بۆ نەمایەوە [٢] .

دەستوور بە دەق باسی ئازادی ئەندامانی پەرلەمان ئەکات لە کاتی ڕادەربڕین و لە کاتی دەنگداندا و نابێت دادگایی بکرێت کاتێك نەبێت سنورە یاسای یەکانی ئەنجومەن ببەزێنن ، دەستوور ئەوەیشی دیاری کردبوو کە زمانی ڕەسمی دەوڵەت زمانی تورکی عوسمانی یەو ئەنجومەن بەو زمانە بەڕێوە ئەبرێت هەروەك دەستوور باسی ئەویشی کردووە کە دەنگدان بە

---

[1] ) بڕوانە : في اصول التأريخ العثماني ، ص٢٣٤ .

[2] ) بڕوانە : هە مان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٣٤ .

نهێنی یان ئاشکرا ئەبێت بە پێ ی هەلومەرج بێت، بەو مەرجەی کە بوجە ئەنجومەنی نوێنەران دیاری بکات و سوڵتان بۆی نەبێت بڕیاری تێدا بدات بە پێچەوانەی ئەوەی پەیوەندی بە یاسا ڕۆتینەکانەوە هەیە.

سەربارەت بە مافە تاکە کەسی یەکان دەستوور ئەوەی ڕاگەیاند بوو کە (عوسمانی یەت) بریتی یە لە سیاسەتی ڕەسمی و لەسنوری بنەمای ( یەکسانی ) دا کە ڕێکخستنەکان بەڕوونی باسیان لێوە کردووە ، دەستوور سیفەتی "عوسمانیەت " ی دا بوو بە هەموو هاوولاتی یەکی دەوڵەت سەر بەهەر ئایینێك بوایە ، و بە دەق باسی ئەوەی کردووە کە هەموو کەس ئازادە و هەموو عوسمانی یەك لەبەردەم یاسادا یەکسانن و هەموو کەسێك ئەو مافانەی هەیە کە بەرامبەرەکەی هەیەتی وەك چۆن هەمان ئەرکی ئەویشی لەسەرە ، دەستوور بە دەق سەربەخۆیی ( قەزا ) ی سەلماند بوو ، دەستوور ئەوەشی باس کرد بوو کە دادگا شەرعی یەکان بۆ خۆیان ئەمێننەوە و ناموسڵمانەکانیش بۆیان هەیە کە پەنا بۆ دادگاکانی تایبەت بە خۆیان بەرن لەو پرسانەدا کە پەیوەندن بە کاروباری ئایینەکانیانەوە [1]

(سوڵتان عبدالحمید) بڕیاری دا کە دەست بکرێت بە جێبەجێ کردنی دەستوور و هەڵبژاردنی گشتی بکرێت کە ئەوە لە مێژووی عوسمانیەکاندا یەکەمجار بوو ، ئەنجامەکەی ئەوە بوو کە موسڵمانەکان ( ٧١ ) کورسی یان بەدەست هێنا و نەصارەکان ( ٤٤ ) کورسی و جولەکە ( ٤ ) کورسی و یەکەمین پەرلەمانی عوسمانی لە ٢٩ / مارسی / ١٢٩٤ك _ ١٨٧٧ ز ) کۆبوونەوەی کرد وئەنجومەنی ئەشراف یان ئەنجومەنی پیران لە ( ٢٦ ) ئەندام پێك ئەهات کە دائەنران و لەوانە ( ٢١ ) یان موسڵمان بوون ، هەندێ لە نوێنەرە عەرەبەکان ڕۆڵێکی گەورەیان ئەگێڕا لە کاتی موناقەشە و ڕا گۆڕینەوەدا ، هەرچەندە تەمەنی ئەنجومەنی نوێنەران کەم بوو ، پێش ئەوەی قۆناغی دووەمی دانیشتنەکان دەست پێ بکاتەوە لە ( ١٣/فێبرایەر / ١٢٩٦ك _ ١٨٧٨ ز ) دا نوێنەران داوایان کرد کە سێ وەزیر لەبەردەم ئەنجومەندا ئامادە بن بۆ بەرگری کردن لە خۆیان دەربارەی ئەو تۆمەتانەی کە ڕووبەڕویان کراوەتەوە ، (سوڵتان عبدالحمید)یش چاری نەما هەڵوەشاندنەوەی ئەنجومەن نەبێت و پاشان فەرمانی کرد هەر نوێنەرەی بگەڕێتەوە بۆ وولاتی خۆی و هەندێ لەوانیشی نەفی کردوو دووری خستنەوە [2] .

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٨٠ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ،ص١٨١ .

بەو شێوەیە ماوەی بەستنی ئەنجومەن لە قۆناغی یەکەمەوە بۆ قۆناغی دووەم دە مانگ و بیست و پێنج ڕۆژ بوو ، دوای ئەوە تا سی(٣٠) ساڵی تر ئەنجومەن بانگ نەکرایەوە و دەرگای ئەنجومەنی نوێنەنەران بۆجارێکیش چیە نەکرایەوە[1] .

(سوڵتان عبدالحمید) ناچار بوو کە دەستوور ڕابگەیەنێت بە هۆی ئەو فشارانەی کە ماسۆنیەت لە ڕێگەی مدحت پاشاوە ئەیانخستە سەری ، بۆیە کە هەلی دەست کەوت خێرا ئەنجومەنی پەك خست .

(عبدالحمیدی دووەم) دژ بە دیموکراتیەت و کار کردن بەسیستەمی دەستوور بوو کە لە زاراوەی عوسمانیدا پێی ئەوترا ( مەرجداری = المشروطیة ) واتە مەرج دانان بۆ فەرمانڕەوا بەوەی سنوری دەسەلاتی دیاری بکرێت ، لای ئەو ئەمە بیروڕایەکی هاوردەی ڕۆژئاوا بوو ، بۆیە دژی هەموو ئەوانە ئەوەستاوە کە لافی ئەوەیان لیَ ئەدا و لە پشتی هەموویانەوە ( مدحت پاشا ) ، ڕەخنە لەم وەزیرەی ئەگرێت و ئەڵێ : ( تەنیا لایەنە چاکەکانی فەرمانکردن بە ( مەرجداری ) لە ئەورووپادا ئەبینی ، نە لە هۆکارەکانی ئەم ( مەرجداری ) یە کۆڵییەوە و نە لە ئاسەوارەکانیشی ، ئاخر خۆ ( حەبی سلفات ) بۆ هەموو نەخۆشیەك و هەموو لەشێك بە سوود نی یە ، من ڕام وایە کە بنەماکانی ئەم ( مەرجداری ) یە بۆ هەموو گەل و هەموو شوێنەوارێك بە کەڵك نی یە ، سەرەتا منیش ڕام وابوو شتێکی بەکەڵکە بەلاَم ئێستا دڵنیا بووم لەوەی کە زۆر زیان بەخشە )[2] .

سوڵتان بەڵگەی خۆی هە بوو بۆ ئەمە ، یەکێك لەو بەڵگانەی هەڵسوکەوتی خراپی ئەوانە بوو کە داوای دەستووریان ئەکرد هەر لەیەکەم دەستشلکردنی سوڵتاندا بۆ بیبروڕاکانیان ، بۆ نمونە :

حکومەت هەر لەگەڵ ڕاگەیاندنی دەستووردا داوای لە سوڵتان کرد کە ئیمزا لەسەر چەند بڕیارێك بکات بۆ ئەوەی لە چەند هەرێمێکدا کە موسڵمانان تێیدا زۆرترینی( اغلبیة ) دانیشتووان پێك دەهێنێت ، چەند کەسێکی نصاری ببنە کار بەدەست بەسەریانەوە، هەروەها ئەو داوایەی نصاراکان ئیمزا بکات کە قوتابیانی ئەوانیش لە کۆلیژی سەربازی عوسمانی وەربگیرێن کە ئەو کۆلیژە کۆڵەکەی سوپای عوسمانی بوو ، سوڵتان ئیمزای نەکرد و مدحت

---

[1]) بڕوانە : البلاد العربیة والدولة العثمانیة ، ساطع الحصري ، ص٩٩_١٠٠ .

[2]) بڕوانە : مذکرات السلطان عبدالحمید ، محمد حرب ، ص٨٠ .

پاشای وەزیریش تێیدا نەوەستا و بە سوڵتانی ووت : (( مەبەستی ئێمە لە ڕاگەیاندنی دەستوور ئەوەیە دیکتاتۆریەتی کۆشك نەهێڵین ، جەنابیشتان پێویستە ئەرکەکانی خۆتان بزانن ) [1].

(سوڵتان عبدالحمید) هەندێ هۆی تر ئەهێنێت بۆ پاساوی ئەو هەڵوێستە کە هەیبوو لە ( بیری دەستووری ) وەك دەڵێت : (( دەوڵەتی عوسمانی دەوڵەتێکە چەندان گەلی جیاوازی لە خۆ گرتووە و((مەرجداریش )) لە ولاتێکی لەو شێوەیە دا مراندنی توخمە سەرەکی یەکانە لە وولاتدا ، ئایا لە هەموو ئینگلتەرەدا یەك نوێنەری هیندی هەیە ؟
یان لە پەرلەمانی فەرەنسی دا یەك نوێنەری جەزائیری هەیە ؟ ) [2] .

(سوڵتان عبدالحمید) ئەم هەڵوێستەی خۆی بەرامبەر بە ( فەرمانڕەوایی دەستووری ) نەگۆڕی لە دەوڵەتەکەیدا ، تەنانەت پاش ئەوەی کە لەسەر تەختیش لابرا ، خەڵکی دەستیان دایە حوکمڕانی کردن بە دەستوور ، ئەوەتا ئەڵێ : (( باشە چ شتێك ڕوویدا کە ( مەرجدارێتی ) ڕاگەیەنرا ؟ ئایا قەرزەکان کەمیان کرد ؟ ڕێگاو بان و بەندەر و قوتابخانە زیادی کرد لە وولاتدا ؟ ئایا ئەو یاسایانەی ئێستا عاقڵانە ترو لوژیکی ترن لەوانەی پێشوو ؟ ئایا خەڵك ترسی لە خۆی نەماوە ؟ ئایا جەماوەر ئێستا لە خۆشگوزەرانی زۆرتردان ؟ ئایا منداڵ بوون زیادی کردووە و مردن کەم بووەتەوە ؟ ئایا ڕای گشتی نێو دەوڵەتی ئێستا لە جاران زیاتر لە گەڵماندایە ؟ دەرمان ئەبێتە ژەهرێکی کوشندە بۆ خەڵکی ئەگەر لە دەستی دکتۆری خۆیدا نەبێت یان لە دەستی کەسانێکدا بێت کە بنەماکانی بەکارهێنانی نەزانێ ، من زۆر بەداخم کە ڕووداوەکان هەموو ڕاستی قسەکانی منیان دەرخست ) [3] .

(سوڵتان عبدالحمید) ئەوە ڕۆشن ئەکاتەوە کە هەڵوێستی هەمیشەیی لە فەرمانڕەوایی دەستوری وانی یە ، و هەل و مەرجەکان بڕیار لە پرسەکەدا ئەدەن ، ئەگەر هەل و مەرجەکان گۆڕران ئەوا باری سەرنجی ئەمیش لە فەرمانڕەوایی دەستووری ئەگۆڕێت .

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص٩٥ .

[2] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٩٥ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٩٦ .

لەم بارەیەوە ئەڵێ : ( پێویستە وا گومان نەبرێت کە بیروڕای من هەمیشە دژ بە سیستەمێکە پشت بە بناغەکانی ( مەرجداریێتی ) ببەستێت ) [1] .

(سوڵتان عبدالحمید) کەوتە سەردەمێك کە هەل و مەرجێکی زۆر ناڕەحەت و کۆمەڵێك قەیرانی تاقەت پڕوکێنی هاتە ڕێگە و پیلانێکی جیهانی لەناوە وە و دەرەوەدا کەوتبوویە سەر دەوڵەتی عوسمانی ، ئەمیش بە پێ ی یاسا و ڕێنمای یەکانی ئیسلام کەوتە چاکسازی بۆ ئەوەی ڕێگە بگیرێت لە دەستێوەردان لە کاروباری دەوڵەتی عوسمانی لە لایەن ئەوروپای یەکانەوە بگرێت ، زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی کە ( شەریعەت ) جێبەجێ بکات ، و هەستا نوسەروڕۆژنامە نوسەکانی لە پایتەخت دوورخستەوە و لەبەردەم هەموو ئەو ئاڕاستە ڕۆژئاوای یانەدا وەستا کە (کەلە هەرێمەکانی دەوڵەتدا هە بوون) پێچەوانەی شارستانێتی بەرزی ئیسلامی ، توانی دەزگایەکی هەواڵگری بە هێز دروست بکات بۆ پاراستنی دەوڵەت لە ناوە وە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری دەربارەی دوژمنانیش لە دەرەوە ، بیرۆکەی ( (جامیعەی ئیسلامی ) بویە جێگەی گرنگی پێدانی و بەرهەمی گەورە گەورەی پێ بەدەست هێنا ، و ئەوروپای یەکان کێچ کەوتە کەوڵیان لەم بیرکردنەوە قووڵە ستراتیژی یە و دەستیان کردە کار کردن بۆ هەڵوەشاندنەوە و لەت لەتکردنی .

(سوڵتان عبدالحمید) دەربارەی ئەم دەزگای هەاڵگریەی خۆی قسە ئەکات ومەبەست لێی روون ئەکاتەوە و ئەڵێت : (( بە پێی نەریتی عوسمانی ، سوڵتان لە ڕێگەی دەزگای حوکمڕانیەوە ئاگاداری پەیدا ئەکات بەسەر بیروبیرکردنەوەی خەڵکی ژێر دەستی خۆی و ئاگادارئەبێت لە گلەی و گازندەکانیان لە ڕێگەی والی و قازی یەکانەوە لە لایەکەوە و لەلایەکی تریشەوە لە ڕێگەی ئەو هەموو تەکیەی بە هەموو لایەکی وولاتدا بلاوبووەتەوە بە شێخەکان و دەروێشەکانیشەوە ، جا سوڵتان ئەم زانیاریانە کۆئەکاتەوە و بەپێ ی ئەو زانیاری یانە وولات بەڕێوە ئەبات .

سوڵتان محمودی باپیرم ( محمودی دووەم ) بازنەی هەواڵگری لەسەردەمی خۆیدا فراوان کرد و هەموو ئەو دەروێشە گەڕۆکانەشی بۆ زیاد کرد کە هە بوون ، ئەمە لەو کاتەدا بوو کە چوومە سەرتەخت و لەسەر ئەوەش بەردەوام ئەبم ، ڕۆژێکیان هەواڵێکیان بۆ هێنام لە ( موسورس پاشا ) وە کە باڵوێزی ئێمە بوو لە ( لندن ) ، گوایە حسین عەونی پاشا ( صەدری

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٩٦ .

ئەعظەم ) ی پێشوو کە ( فەرماندەی سوپا = سرعسکر ) بوو ، پارەی لە ئینگلیز وەرگرتبووە ، جا ئەگەر صەدری ئەعظەم کە حوکمی وولات ئەکات بەناوی سولتانەوە ناپاکی بەرامبەر وولاتەکەی بکات ، کەواتە سیخوڕەکانی بە دڵنیایەوە وا هەواڵ بە کۆشك ئەدەن کە بەجوانترین شێوە کارەکانی ئەنجام ئەدات ، لەبەر ئەوە ئەو هەواڵە زۆر کاری تێکردم و دڵی گۆڕیم ، هەر لەو ڕۆژانەدا بوو کە (محمود پاشا) پێ گەیی و هەندێ زانیاری دەربارەی چەند ئەندامێکی (( تورکیای لاو ( ترکیا الفتاة ) پێ ڕاگەیاندم کە ئەو زانیاریانەی ئەو پێیدام زۆر گرنگ بوون ، پرسیاری ئەوەم لێ کرد ئەم زانیاری یانەی لە چ ڕێگەیەکەوە دەست کەوتووە ، بۆم دەرکەوت کە ئەویش دەزگایەکی هەواڵگری تایبەت بە خۆی دروست کردووە و بە پارە هەندێ لە خزمە نزیکەکانی چەند کەسی ناو ( ترکیا الفتاە ) ی کڕیوە و ئەوانیش بە حوکمی خزمایەتی یەکەیان هەموو جارێك لە نزیکەوە ئەیانبینن و چییان لێ ببیستن دێن بۆ ئەمی ئەگێڕنەوە و ئەویش پارەیان ئەداتێ ڕاستە ئەو مێردیخوشکەکەی بەلام ڕاست نی یەهیچ کەسێك پلەی پاشایەتی هە بوو دەزگایەکی سیخوڕی سەربەخۆ بە جیا بۆ خۆی دروست بکات دوور لە دەزگای هەواڵگری دەوڵەت ، بۆیە پێم ووت ، ئەبێ هەر ئێستا ئەو دەزگایە هەڵبوەشێتەوە و جارێکی تریش ئەو جۆرە کارانە دووبارە نەکەیتەوە ، هەرچەندە زۆری پێ ناخۆش بوو بەلام دەزگاکەی خۆی تەسلیم بە من کرد .

دەوڵەت ناتوانێ بێ ترس بمێنێتەوە کاتێك کە دەوڵەتە گەورەکان بۆ خزمەت کردنی ئامانجەکانیان کەسانێك بکڕن کە لە ئاستی وەزیرێکی گەورە دابێت .

لەبەر هەموو ئەمانە بڕیارم دا کە دەزگایەکی هەواڵگری دروست بکەم کە پەیوەندی ڕاستەو خۆی بە خۆمەوە هەبێت ، ئەم دەزگایەش ئەو دەزگایە بوو کە دوژمنان ناویان نا بوو ( جۆرنالجیەت ) ( پۆلیسی نهێنی = هەواڵگری ) ، پێویست بوو کە ئەوە بزانم لەناو ئەندامانی دڵسۆزو ڕاسەقینەی دەزگای جۆرنالجیەتدا ( هەواڵگری ) دا ، کەسانێکی بوختان چیش هەن ، بەلام من بڕوام نەئەکرد و هەموو شتێکی ئەو دەزگایەم بەڕەهایی وەرنەئە گرت تا بە ووردی لێکۆڵینەوەم نەکردایە لەسەری، سولتان سەلیمی باپیرم ( سەلیمی سێ یەم ) هەمیشە هاواری ئەکردو ئەیووت : ( دەستی بێگانە بەسەر جەرگ و هەناو مانەوە بەردەوام ئەگەڕێت ، پێویستە باڵوێز بنێرین بۆ دەوڵەتە بیانی یەکان تا کەرەسەکانی پێشکەوتنی ئەوروپامان بۆ بگوازنەوە ، پێویستە لەسەرمان نوێنەر زۆر بنێرین بۆ دەرەوە ، ئەبێ کاربکەین بۆ ئەوەی بەپەلە خۆمان فێری ئەو شتانە بکەین کە ئەوان پێ ی گەیشتوون .

منیش له ڕاستیدا هەستم بەو دەستانەی بێگانە ئەکرد ، نەك لەسەر جەرگ و هەناومانا ، بەڵکوو لە ناو جەرگ و هەناومدا ، ئەوانە ( صەدری ئەعظەم) ەکان و وەزیرەکان ئەکرن و دژ بە وولاتەکەم بە کاریان دێنن ، ئەمە چۆن ڕوو ئەدات لە کاتێکدا ئەوانە لە خەزێنەی دەوڵەت پارەیان بۆ سەرف ئەکرێت و کەچی من نەتوانم ئاگاداری ئەوە بم خەریکی چین و چی ئەکەن و چی لەژێر سەریاندایە ؟

بەڵێ من دەزگای جۆرنالجیەت ( هەواڵگری ) م دروست کردوو هەرخۆشم بەڕێوەم ئەبرد ... بەلام ئەمە کەی ڕوویدا ؟ .

پاش ئەوەی ئەبینم صەدری ئەعظەمەکان بەرتیل لە دەوڵەتە بیانی یەکان وەرئەگرن بە بەرامبەر ئەوەوە کە دەوڵەتەکەی خۆیان بڕوخێنن و پیلان لە سوڵتانەکەیان بگێڕن ! ئەم دەزگایەم بۆ ئەوە دروست نە کرد کە کەرەسەیەك بێت دژ بە هاوولاتیان بەڵکوو بۆ ئەوە بوو کە بە شوێن هەموو ئەوانە دا بڕوات کە ناپاکی بەرامبەر دەوڵەتەکەی من ئەکەن لە کاتێکدا کە بە ڕۆزی و نیعمەتی عوسمانی دەمیان تا قوڕقوڕاگەیان ئاخنرا بوو [1].

" کۆمەڵەی ئیتیحادوتەرەقی " لەسەر دروست کردنی ئەم دەزگای هەواڵگری یە ڕەخنەیەکی زۆریان باراند بەسەر (سوڵتان عبدالحمید) دا ، لە ڕاستیشدا ئەم دەزگایە کارێکی چاکی زۆری بۆ دەوڵەتی عوسمانی کرد ، لە کاتێکدا کە ( ... ئاژاوە چی و تیرۆرستە ئەرمەنی یەکانیان هان ئەدا بچن بە گژ دەوڵەتی عوسمانیدا ، و هەر جارەی کە سەربازەکان بەریان لێ ئەگرتن خوێنێکی زۆر ئەڕژا ... بەلام کە (سوڵتان عبدالحمید) ئەم دەزگایەی دروست کرد _ لەماوەی ئەو ( ٣٠ ) ساڵەدا _ سوڵتان لەگەڵ دەرکەوتنی هەر جۆرە جوڵەیەکدا خێرا هەواڵیان ئەدایە و توانی هەموو یاخیبونێکی ناوخۆیی دابمرکێنێتەوە پێش ئەوەی بگاتە خوێن ) [2].

**سێیەم** / یاخی بوونەکان و شۆڕشە کانی بەلقان :

دانیشتوانی ( جبل الاسود ) و ( صرب ) و وولاءی ( هرسك ) یان هان ئەدا بۆ ئەوەی لە دەوڵەتی عوسمانی جیا ببنەوە ، ئەوەش لە ساڵی ( ١٢٩٣ك _ ١٨٧٦ز ) بوو ، بەلام عوسمانی یەکان توانیان کپیان بکەنەوە ، (سوڵتان عبدالحمید) حەزی لەوە بوو کە ڕێگە لە دەوڵەتە

---

[1] ) بڕوانە : مذكرات السلطان عبدالحميد ، ص١٦٠ .

[2] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٨٩ .

ئەوروپی یەکان بگرێت و نە یەڵێت دەست وەردەنە وولاٌت ، بۆیە هات بڕیاری ئەوەی دا کە ( قەزاوەت ) لە دەسەلاٌتی جێبەجێ کردن جیا بکاتەوە ، و بە هەڵبژاردن ( قازیەکان ) دابنرێن لە ڕێگەی جەماوەرەوە ، موسڵمانەکان و نەصارەکان وەك یەك باج بخرێتە سەریان ... دانیشتوان بەمە ڕازی نە بوون و جارێکی تر شۆڕشیان هەڵگیرساندەوە و ئەویش سەرکوت کرا ، بەلاٌم نەمسا کەلە پشت ئەم شۆڕشەوە بوو ئەیوسیت " بۆسنە و هەرسك " بخاتە سەر خۆی، لە هاندانی جەماوەر دژ بە دەوڵەتی عوسمانی هەر بەردەوام بوو ، ئەوەبوو نەمسا لەگەڵ ڕوسیا و ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئینگلتەرا داویان لە سوڵتان کرد هەندێ چاکسازی بکات و سوڵتانیش داواکەی قبوڵ کردن ، بەلاٌم نەصرانی یەکانی بۆسنە ئەمەیان قبوڵ نەکرد ، ئەمەیش دەری ئەخات پرسی داوا کردنی چاکسازی جگە لە چەند بیانویەکی بێهێز هیچی تر نە بوو ، ڕاستی پرسەکە ئەوەیە کە ئەوان ئەیانویست ڕاستەو خۆو نا ڕاستەوخۆ دەست ووربدەنە کاروباری دەوڵەت و لاوازی بکەن و پاشان پاڵی پێوە بنێن و بیخەن [1] .

هەروەها شۆڕشی بولغاری یەکانیش دەستی پێکرد هەر لەو کاتەی کە نەصاراکانی بۆسنە و بەدنە دانی نەمسا و دەوڵەتە ئەوروپای یەکان و بەتایبەت ڕوسیا دەستی پێکرد بوو ، چەند ڕێکخراوێك لە وولاٌتی بولغاریادا دروست بوون بۆ بلاٌوکردنەوەی دەسەلاٌتی ڕوسیا لە نێوان نەصاڕا و ئەرسەزۆکسەکان و (( صەقالیبەکان ))دا ، ڕوسیا بە هەموو شێوەیەك پشتی ئەمانەی ئەگرت و چەکیشی پێ ئەدان ، ئەم ڕێکخراوانەش بە هەموو توانایانەوە دانیشتوانی (( صرب و بۆسنە وهرسك )) یان هان ئەدا بۆ ئەوەی دژ بە عوسمانی یەکان ڕاپەڕن ، کاتێك عوسمانی یەکان هەندێ لە خێزانە ( شرکسیە ) کانیان هێنایە ئەوێ ، بولغاری یەکان خۆپیشاندانیان کرد لەسەر ئەمە ، و ڕاپەڕنێکیان دروست کردو ڕوسیا و نەمسا دنەیان ئەدان و چەك و پارەی باشیشیان پێ ئەدان ، بەلاٌم دەوڵەتی عوسمانی توانی ئەمجارەش کپیان بکاتەوە و ڕاپەڕینەکە لەناو بەرێت ، دەوڵەتە ئەوروپای یەکان کەوتنە پروپاگەندە بلاٌو کردنەوە گوایە عوسمانی یەکان قەسابخانەیان لەو وولاٌتەدا دژ بە نەصاڕاکان ئەنجام داوە ، لە کاتێکدا پێچەوانەکەی ڕاستە ، بەم پڕوپاگەندانە ڕای گشتی ئەوروپا دژ بە دەوڵەتی عوسمانی کەوتە جوڵەجوڵ و حوکمەتە ئەوروپای یەکانیش داوای ئەوایان ئەکرد کە هەڵوێستی توند دژ

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٨٩ .

بە عوسمانی یەکان بنوێنرێ و لەوانە هاوکاری بولغاری یەکان بکرێت کە سەربەخۆیی وەربگرن و فەرمانڕەوایەکی نەصرانی یان بۆ دابنرێ [1] .

ڕوسەکان و ئەڵمانەکان و نەمساوی یەکان پێکەوە دنەی صربەکان و ( جبل الاسود ) یان ئەدا بۆ ئەوەی شەڕ دژ بە عوسمانی یەکان ڕابگەیەنن ، ڕوسیا حەزی لەوە بوو کە سنورەکانی خۆی لە ڕووی بولغاریاوە فراوان بکات ، نەمساش بەهەمان شێوە ئەیویست سنورەکانی لە ڕووی ( بۆسنە و هرسك ) ەوە فراوان بکات ، ئەم دەوڵەتانە پەیمانی ئەویان بە میری ( صرب ) و ( جبل الاسود ) دا کە هەموو هاوکاری یەکی بکەن ، ئەوە بوو ڕوسیا بە نهێنی سەربازێکی زۆری بردە ناو وولاتی ( صرب ) و ( جبل الاسود ) ، دەوڵەتی عوسمانی توانی صربەکان و هاوپەیمانەکانیشیان تێك بشکێنێ و دەوڵەتە ئەوروپای یەکان دەخالەتیان کرد و داوای ڕاگرتنی شەڕیان کرد وە گەر نا ئەوا شەڕی سەرانسەری ڕائەگەیەنن [2] .

نوێنەرانی دەوڵەتە ئەوروپای یەکان لە ئەستەنبوڵ کۆبونەوە و چەند پێشنیارێکیان خستە بەردەستی دەوڵەتی عوسمانی ، گرنگترینیان ئەمانە بوون :

دابەشکردنی وولاتی بولغاریا بۆ دوو هەرێم و فەرمانڕەواکانیشیان ئەبێت لە ( نصاراکان ) بن ، لیژنەیەکی نێو دەوڵەتیش دروست بکرێ بۆ جێبەجێ کردنی ئەم بڕیارانە ، و هەمان ( امتیازات ) یش بدرێتە هەردوو میرنشینی بۆسنە و هرسك ودەوڵەت دەست لە هەندێ زەوی هەڵبگرێت بۆ صربەکان و جبل الاسود .

بەلاَم دەوڵەتی عوسمانی ئەم بڕیارانەی ڕەت کردەوە و یەك تەرەفە لەگەڵ صربەکاندا ڕێکەوتن و سوپاکانی لەوڵاتی (صرب ) کشانەوە ، بەو مەرجەی ئالاَی (صرب ) و (عوسمانیەکان ) هەردوك هەڵبکرێت تابەڵگەبێت کە صرب لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکاندایە [3] .

(سوڵتان عبد الحمیدی دووهەم) لەوە دڵنیا بووبوو کەئامانجی دەوڵەتە ئەوروپیەکان ئەوەیەکە دەوڵەتی عوسمانی بڕووخێت ، ئەوەتا لە (یاداشتەکان ) ی دا ئەڵێ : (( لەناو کۆنگرەی دەوڵەتە گەورەکاندا کە لە ئەستەبنوڵدا گیرا بۆم دەرکەوت ئەو دەوڵەتانە نیازیان چی یە ،

---

1 ) بڕوانە : الدولة العثمانية د. اسماعيل ياغي ، ص ١٨٩ .

2 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٠ .

3 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٠ .

ئەویش ئەوە نی یە کە بەدەم ئەڵێن : دەستەبەرکردنی مافی هاووڵاتی یە مەسیحی یەکان ، بەڵکوومەبەستیان دەستەبەرکردنی سەربەخۆیی ئەو هاووڵاتیانەیە و پاشان سەربەخۆیی تەواو بۆیان و بەو شێوەیە دابەشکردنی هەموو دەوڵەتی عوسمانی ، ئەوان بۆ دابەشکردنی دەوڵەتی عوسمانی و گەیشتن بەم ئامانجە دوو ڕێگەیان گرتبوویە بەر :

یەکەم / وورژاندنی هاووڵاتی یە مەسیحی یەکان و لێڵ کردنی بارودۆخەکە و بەو شێوەیەش ئەو دەوڵەتانە خۆیان ئەکەن بە خاوەنیان .

دووەم / داواکردنی ( سیستەمی مەرجدارێتی ) تا لەناو خۆشماندا دووبەرەکی دروست بکەن بۆ بەدەست هێنانی هەردوو مەبەستەکەیان ، بەداخەوە ئەو نانەی دوژمن ئەیدا هەندێ گەزۆشی پێوە کردبوو بۆیە هەندێ لە گەنجە ڕۆشنبیرە عوسمانی یەکان نەیاتوانی جیاوازی لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا بکەن ، جیٚ بەجیٚ کردنی سیستمی دەستوور بە ئاسانی لە وولاتێکدا کە یەك نەتەوەیی یە ومحاڵی ئەو جیٚ بەجیٚ بوونە لە وولاتاندا کەیەك نەتەوە نین

**چوارەم** / شەڕی نێوان ڕوسیا و عوسمانی یەکان :

ڕوسیا ئەیویست هەرچونێك بووە بگاتە ئاوە گەرمەکان لەبەر زۆر هۆکاری ئایینی و ئابوری وجوگرافی ( بطرسی گەورە) ( ١٦٢٧_١٧٢٥ ز ) لەوەسیەتەکەیدا بۆ ڕووسەکان لە بڕگەی ( نۆیەم ) و ( یازدەهەم ) و ( سیازدەهەم ) دا باسی ئەوە ئەکات کە پێویستە ململانیٚ ی شارستانی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بکرێت تا ئەو دەوڵەتە کۆتایی پیٚ ئەهێنرێت ...

" بطرسی گەورە " لە بڕگەی نۆهەمی وەسیەتەکەی دا ئەڵیٚ :

( لە قسطنطینیة ) ەو ( هیندستانەوە ) کەمە کەمە بە پیٚ ی توانا نزیك ئەبینەوە ، چونکە هەرکەس ( قسطنطینیة ) ی هەبێت ئەوە بە دڵنیای یەوە هەموو دونیای ئەبێت ، لەبەر ئەوە ئەبێت دەست لە شەڕی عوسمانیەکان هەڵنەگرین )

لە بڕگەی یازدەهەمیشدا ئەڵیٚ : ( لەگەڵ نەمسادا بەشدار ئەبین بۆ ئەو مەبەستەی بڕیارمان داوە کە بریتی یە لە دەرکردنی عوسمانی یەکان لە ئەورووپادا ) .

لە بڕگەی سیازدەهەمیشدا ئەڵیٚ : ( پاش ئەوەی دەست ئەگرین بەسەر میرنشینە عوسمانی یەکاندا ، سوپاکانمان کۆئەکەینەوە وگەلەکەشتیەکانمان ئەبەینە دەریای ( بەلطیق ) و دەریای

ڕەش و دەست بە دانوستان ئەکەین لەگەڵ فەڕەنسا و نەمسادا بۆ ئەوەی هەموو دونیا لە نێوان خۆماندا دابەش بکەین )[1]

ڕوسیا گرنگی زۆری بەم وەسیەتە ئەدا ، لە سەردەمی (سوڵتان عبدالحمیدی دووهەم)دا شۆڕش و ڕاپەڕین بە دنەدانی ڕوسیا و دەوڵەتە ئەورووپییەکان زیادی کرد لە بەلقان و یونان و شوێنەکانی تری هەرێمە عوسمانی یەکاندا ، هەربەمەوە نەوەستا بەڵکو کاری بۆ ئەوەش کرد کە دەوڵەتیکی نەصرانی سەربەخۆ لە شوێنێکی چاکی لە ( بەلقان ) دا بە دەست هێنا ، ڕوسیا خۆی ئامادە کرد بۆ شەڕ ، و پاشماوەیەك شەڕێکی وای ڕاگەیاند دژ بە عوسمانی یەکان کە ئومێدی ئاشتی لیٚ نەئەکرا[2] .

ڕۆمانیاش دایە پاڵ ڕوسیا و عوسمانی یەکان کەوتنە شەڕێکەوە لەگەڵ ڕوسیادا هەردوو لایانی هاڕی، سوپاکانی ڕوسیا لە دەریای " دانوب " ەوە پەڕینەوە و دەستیان گرت بەسەر هەندیٚ شاردا کەلە ژێر دەسەڵاتی عوسمانیدا بوون وەك ( تیرنوە ) و ( نیقولبلی بل ) کە ئێستا ئەکەونە بولغاریاوە ، هەروەها ڕوسیا دەستی گرت بەسەر چەند خاڵی گرنگ و پردی تردا کە ڕێگە بوون بۆ بەلقان ، (سوڵتان عبدالحمید) گۆڕانکاری زۆری لەسەرکردەکانی سوپادا کرد تا ڕێگە لە شەڕی ڕوسیی یەکان بگرێت ، ڕوسەکان هەوڵیان دا کە دەست بەسەر شاری ( بلفنە ) شدا بگرن _ کە ئێستا ئەکەوێتە وولاٚتی بولغاریاوە _ کە یەکێکە لە ڕێڕەوە گرنگەکان بۆ ( بەلقان ) ، بەلاٚم ( عثمان پاشا ) کە سەرکردەیەکی عوسمانی ئازاو شەڕکەر بوو ، زۆر قارەمانانە بەڕوودا وەستا و پاشەکشەی پیٚ کردن ، جارێکی تر بە هێزێکی زۆر ترو چڕترەوە هێرشێکی تریان هێنایە وە کەچی ئەم سەرکردە عوسمانی یە کەم وێنەیە بەڕووی ڕووسەکاندا جارێکی تر وەستایەوە و توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنیٚ ، ئەمەوای کرد کە سوڵتانی عوسمانی مەرسومێکی تایبەتی بۆ بنێرێت و سوپاسی بکات بۆ ئەو کارەی[3] .

لەبەردەم ئەم خۆڕاگریەدا ڕوسەکان ویستیان گۆڕانکاری لە سیاسەتەکانیاندا بکەن بۆ دەست گرتن بەسەر ئەو شارەدا و هاتن سیاسەتی گەمارۆخستنە سەر شارەکەیان پەیڕەو کرد،

---

[1] ) بڕوانە : التحفة الحلبية ، ابراهيم حلمي يط ، ص٢٤١ .

[2] ) ڕستەی ( حرب لا هوادة فيها ) بەو شێوەیە واتەکەمان لێکدایەوە چونکە بناغەی ووشەکە لە عەرەبیدا بەو مانایە دێت ( وەرگێر . ن. ) .

[3] ) بڕوانە : الفتوح الاسلامية عبر العصور ، ص٤١٨ .

و ڕێگەکانی کۆمەکی ناردنیان بۆ سوپای عوسمانی هەموو گرت و لە هەمان کاتدا هێزەکانی خۆیانیان زیاتر قاییم کرد و قەیسەری ڕوسیا خودی خۆی ئامادەی شەڕەکە بوو ، میری (ڕۆمانیا)ش بە خۆی و سەد هەزار شەڕکەرەوە دایە پاڵ ڕوسیا و تای ترازووی شەڕەکە لەبەرژەوەندی ڕوسیا وەستایەوە ، چونکە ژمارەی ئەوان بوویە ( سەدو پەنجا هەزار شەڕکەر) و لە سێ قۆڵەوە گەمارۆیان خستەسەر هێزەکانی عوسمانی ، لەگەڵ ئەمانەدا سوپای عوسمانی بەسەرکردایەتی ( عوسمان پاشا ) زۆر پاڵەوانانە خۆیان گرت ، هەرچەند ژمارەی ئەوان پەنجا هەزار شەڕکەر بوو کەچی نەك هەرخۆڕاگر بوون بەڵکوو نەخشەیەکی جوانیشیان دانا بۆ ئەوەی دژە هێرشێك بکەنە سەر هێڵەکانی ئەو دوژمنەی کە گەمارۆی خستوەتە سەریان ، بە ئومێدی ئەوەی یان سەرکەوتن و شکاندنی گەمارۆکە دەست ئەخەن یان شەهید بوونیان دەست ئەکەوێت .

عوسمان پاشا بەخۆی و سوپاکەیەوە بەدەنگی ( " لااله الا الله " و الله اکبر ") ەوە پەلاماری دوژمنیان دا و ژمارەیەکی زۆریان بەدەستی ڕوسەکان لێ شەهید بوو ، بەڵام توانیان هێڵی یەکەم وهێڵی دووهەمی گەمارۆکە بشکێنن و دەستیان گرت بەسەر تۆپهاوێژەکان دا و عوسمان پاشای سەرکردە هەندێ بریندار بوو لە کاتی شکاندنی هێڵی سێهەمدا ، لە پڕێکدا هەواڵێکی درۆینەی توند کەوتە ناو سەربازە عوسمانی یەکان گوایە ( عوسمان پاشا ) شەهید بووە ، بەو هەواڵە سەربازەکان ورەیان بەردا و دەستیان کەوتە لاو هەوڵیان دا بگەڕێنەوە بەرەو شار بەڵام هەندێ هێزی ڕوسی چووبوونە ناو شارەکەو سەربازە عوسمانی یەکان دەرکەوتن و کەوتنە ناو تەقەی هەموو لایەکی دوژمنەوە ، بۆیە ناچاربوون کە خۆیان بدەن بەدەست هێزە ڕوسەکانەوە ، ئەمەش لە ساڵی ١٢٩٤ك _ کۆتایی یەکانی ساڵی ١٨٧٧ز دا بوو ، سەرکردە عوسمانیەکە بە برینداری خۆی دابەدەست ڕوسەکانەوە کە زۆر سەرسام بوون پێ ی و باسی پەلاماردان و قارەمانێتی ئەویان ئەکرد [1] ، تەنانەت سەرکردەی گشتی هێزەکانی ڕوسیا هات پیرۆزبایی ئەو بەرگری یە جوانەی لە عوسمان پاشا کردو شمشێرەکەشی بۆ گەڕاندەوە وەك ڕێزێك بۆ ئەو خۆڕاگری و ئازایەتی یەی لەشەڕدا هەیبوو ، عوسمان پاشا ڕەوانەی ڕوسیا کرا

[1] بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٤١٩ .

لە مانگی دیسە مبەری هەمان ساڵدا ( ١٨٧٧ز ) ،قەیسەر بە هەموو ڕێوڕەسمێك شایانی ئەو بێت پێشوازی لە ( عوسمان پاشا ) کرد و مامەڵەی گیراو ( ئەسیر ) یان لەگەڵ نەئەکرد [١] .

ئەم سەرکەوتنانەی ڕوسیا ( صربەکانی ) لە بەلقاندا هان دا تادژ بە عوسمانی یەکان دەست بە جولە بکەن ، و سوپاکانیان پەلاماری بنکە و بازگەکانی عوسمانەکانیاندا لەوێدا ، و سەرقاڵیان کردن و نەیانپەرژایە سەر ڕوسەکان ، لەهەمان کاتدا لە هەوڵی ئەودا بوون چەند ناوچەیەکی تری تازە داگیر بکەن ، ئەوە بوو ڕوسیا توانی دەست بەسەر ( صوفیا ) _ پایتەختی ڕۆمانیای ئێستا _ دابگرێت و هەر ئەوەندەش نا ، بەڵکوو بەرەو باشور کشان ڕوو بە بە پایتەختی کۆنی عوسمانیەکان و گەیشتنە چەند ناوچەیەك کە تەنیا پەنجاکیلۆمەتر لەئەستەنبوڵەوە دوور بوون ، و بارودۆخەکە لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا تەواو ڕووی لە خراپتر کرد .

هەر لەم کاتەدا چەندان شەڕی تر لە نێوان ڕوسەکان و عوسمانی یەکاندا لە ناوچەی ئاسیادا ڕوویدا ، کەلە ئەنجامدا ڕووسەکان گەیشتنە ( ئەنادۆڵ ) بەڵام عوسمانی یەکان توانیان تێکیان بشکێنن و بیانکەنەوە بەناو ڕوسیادا ، عوسمانی یەکان و بەسەرکردایەتی (احمد مختار پاشا) زیاد لە شەش سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لە شەڕەکانیاندا ، بۆیە (سوڵتان عبدالحمید) مەرسومێکی سوڵتانی دەرکرد بۆی و سوپاسی کرد تێیدا ، ڕوسەکان لە پاشاندا هەر لەو ناوچانەوە هێرشێکی تریان کردە سەر عوسمانی یەکان و توانیان لە ساڵی ( ١٢٩٥ ) کۆچیدا هێزە عوسمانی یەکان تێك بشکێنن و دەست بەسەر هەندێ ناوچەی ئەنادۆڵ خۆشیدا بگرن [٢] .

لەبەردەم ئەم هەمو تێکشکانەی عوسمانی یەکاندا لە ئەوروپا و ئاسیادا ، دەوڵەتی عوسمانی ناچاری ئەوە بوو کە بکەوێتە هوودنە بەستن لەگەڵ ڕوسیادا و دانوستان لەگەڵیاندا بکات و ئەوە بوو کە پەیماننامەی ( سان ستیفاس ) ی ساڵی ( ١٨٧٨ ز ) کەوتە نێوانیان ، ئەم پەیماننامەیە لە ( ٣/ مارس / ١٨٧٨ز ) بەستراو لە جیاتی دەوڵەتی عوسمانی ( صفوت پاشا )

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ، ص١٤١ .

[2] ) بڕوانە : الفتوح الاسلامیة عبر العصور ، ص٤١٨ .

به چاوی پڕ فرمێسکەوە ئیمزای کردوسروشتی یەکە ئەو پەیماننامەیە هەندێ مەرجی تاقەت پڕوکێنی [1] تێدا بوو بۆ دەوڵەتی عوسمانی [2] .

**پەیماننامەی ( سان ستڤانو ) لە ١٥ی فبرایر / ١٢٩٥ك / ١٨٧٨ز :**

نوێنەری ڕوسیا چەند مەرجێکی پێش وەختی خستە ڕوو ، داواشی کرد ڕاستەو خۆ ئیمزای لەسەر بکرێت ، ئەگەر نا ئەوە سوپای ڕوسیا پێشڕەوی ئەکات و ئەستەمبوڵ ئەگرێت ، عوسمانی یەکان ڕێگەیەکی تریان نەما ئیمزا کردن نەبێت و دەقی پەیماننامەکەش ئەمانەی تێدایە :_

١- دیاری کردنی سنور بۆ ( جبل الاسود ) بۆ ئەوەی کۆتایی بە کێشمە کێشەکە بێت و ئەم میرنشینە سەربەخۆیی خۆی دەست بکەوێت .

٢- میرنشینی ( صرب ) یش سەربەخۆ ئەکرێت و ئەبێت هەندێ زەوی تازەشی بخرێتە سەر .

٣- بولغاریاش خود موختاری یەکی ئیداری سەربەخۆیی پێ ئەدرێت و ساڵانە بڕێکی دیاری کراو باج ئەداتە دەوڵەتی عوسمانی، و فەرمانبەرەکانی دەوڵەت و سەربازەکان تەنیا خەڵکی (نصرانی ) ئەبن ، بە ئاگاداری عوسمانی یەکان و ڕوسەکان سنورەکەیان دیاری ئەکرێت ، و میری وولات لە لایەن دانیشتوانەوە هەڵدەبژێرێت و عوسمانی یەکان بەیەکجاری سەربازەکانیان لە بولغاریادا ناهێڵن و چۆڵی دەکەن .

٤- دەوڵەتی ڕۆمانیاش سەربەخۆیی تەواوی ئەدرێتێ .

٥- ئەبێت ( باب العالي ) پەیمانی ئەوە بدات کە پارێزگاری لە ئەرمەنەکانو نصرانی یەکانی ( کوردەکان ) و ( شەرکسەکان ) بکات .

٦-( باب العالي) ئەبێت هەستێت بە باشکردنی بارودۆخی نەصاڕاکان لە دوورگەی ( کریت )دا.

---

[1] ) مەرجی تاقەت پڕوکێن بۆ ( شروط مجحفة ) بەکار براوە ، عەرەب ئەڵێ (اجحف فلان بعبده ، كلفه ما لايطاق ): المنجد / مادەی _جحف _ :وئەشکرێ بڵێ ی:مەرجی ناهەق دەرهەق بەعوسمانیەکان.عەرەب ئەڵێ"اجحف بحقه"انقصه انقاصا فاحشا( وەرگێڕ ن.).

[2] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص١٤٤ .

٧- دەوڵەتی عوسمانی باجی ئەم شەڕە ئەدات کە بڕەکەی ( دوو ملیارو نیو ) لیرەی ئاڵتونی یەو ڕوسیا ئەتوانێت لە جیاتی ئەوە بڕە پارەیە زەوی وەربگرێت .
٨- تەنگاوەکانی ( بسفور ودردنیل ) بە کراوەیی ئەمێننەوە بۆ کەشتی یە ڕوسی یەکان لە هەردوو حاڵەتی شەڕو ئاشتیدا .
٩- موسڵمانەکانی بولغاریا بۆیان هەیە ڕەو بکەن بۆ هەر شوێنێك بیانەوێت لە پارچەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا[1] .

بەم شێوەیە هەرچی موڵکی دەوڵەتی عوسمانی هەیە لە ئەوروپادا بەش بەش کرا هەرچەندە گەورە بوونی بولغاریا بویە مایەی عادز بوونی دەوڵەتەکانی تری بەڵقان وەك : (نەمسا) و (یۆنان) و ( صرب ) ، هەروەها بەریتانیاش بە زیاد بوونی دەسەڵاتی ڕوسیا لە بەڵقاندا قەڵس بوو ، بۆیە ئامادە باشی وەرگرت بۆ شەڕکردن دژ بە ڕوسیا و لە لایەنی دەوڵەتی عوسمانی یەوە مافی داگیرکردن و بەڕێوە بردنی ( دوورگەی قبرص ) ی لە ( یونیو / ١٨٧٨ ز ) دا پێ درا بەو مەرجەی کە هەر وەك بەشێکی دەوڵەتی عوسمانی بمێنێتەوە ، بە بەرامبەر ئەوە بەریتانیا ئەبێت پەیمانی ئەوە بدات کە بەرگری لە موڵکەکانی دەوڵەت بکات لە ئاسیادا دژ بە هەر هێرشێکی ڕوسیا ، بەریتانیاش مەرجی وا بوو بۆ ئەم کارە سوڵتانی عوسمانی پەیمانی ئەوە بدات کە چاکسازی بکات لە موڵکەکانی ئاسیادا بەڕاوێژ لەگەڵ بەریتانیادا ، بەریتانیا ئەو پەیمانەشی دا کە هەرکات ڕوسیا ئەو ناوچانەی جێهێشت کە داگیری کردوون ، بەریتانیاش ( قبرص ) جێ بهێڵێت[2] .

(سوڵتان عبدالحمید) لە بناغەدا ڕازی نە بوو کە بچێتە ئەم شەڕەوە ، بۆیە ئیمزای لەسەر پەیماننامەکە نەکرد، و هەستا بە هەندێ هەوڵی چڕی دیبلۆماسی و سیاسی تا ئەوە بوو بەریتانیای هێنایە سەر ئەو بڕوایەی لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانیدا بوەستێ و بەمەش کۆنگرەی ( برلین ) ی مسۆگەرکرد تا لەلایەك ئاسەواری خراپی پەیماننامەی ( سان ستڤانو ) سوك بکات و لەلایەکی تریشەوە ڕوسیا بترسێنێت بە پاڵپاڵێنی بەریتانیا و دەست لە شەڕی هەڵبگرێت ، سوڵتان توانی دەستکەوتی تر بۆ دەوڵەت بەدەست بهێنی و بڕگەکانی ئەم کۆنگرەیە زیانەکانی پەیماننامەی یەکەمی کەم کردەوە .

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٩٢_ ١٩٣ .
[2] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٣ .

بەستنی ئەم دوو پەیماننامەیە بەڵگەیە لەسەر لێهاتووی سیاسیانەی (سوڵتان عبدالحمید) ، کە توانی قەڵسی لە نێوان دەوڵەتی ڕوسیا و دەوڵەتی ئەڵمانیاشدا دروست بکات [1] .

( غلیومی دووەم )کە ئیمپراتۆری ئەڵمانیا بوو لە ( یاداشتەکانیدا ) ئەڵێ :

( لەسەردەمی ( ئەلیکسەندەری دووەم ) کەقەیسری ڕوسیا بوو ، لەگەڵ یەکێك لە گەورە سەرکردەکاندا کە دانرا بوو بۆ خزمەت کردنی دیوانی قەیسەری [2]،چەند قسەیەك کەوتە نێوانمان دەربارەی پەیوەندی هەردوودیوانی ڕوسیاو ئەڵمانیاو پەیوەندی نێوان سوپا و وولاتی هەردوولا ، بەو سەرکردەیەم ووت : ئەریٚ من هەست ئەکەم کودەتایەك لەو پەیوەندی یانەماندا ڕوویداوە ، ئەو بە منی ووت : جا خەتای کۆنگرەی برلین بوو ! ئەوە گەورەترین هەڵە بوو کە ( بسمارك ) کردی ، بەو کارەی ئەو هاوڕیٚ یەتی یە کۆنەی نێوانمانی لە ناو برد ، و لە دیوانی ڕوسەکان و لەناو حوکمەتی ڕوسیادا متمانە بە ئەڵمانیا نەما دوای ئەو کۆنگرەیە ، سوپای ئێمە وا هەست ئەکەن کەگەورەترین جنایەتیان بەرامبەر کرا دوای ئەو هەموو شەڕە خوێناوی یەی کە کەوتنە ناوی لە ساڵی ١٨٧٧ ز دا [3] .

**کۆنگرەی برلین ( ١٣٠٥ك _ ١٨٨٧ز ) :**

لەم کۆنگرەیەدا هەموو دەوڵەتە گەورەکانی وەك ( ئینگلتەرا ، فەرەنسا ، ئەڵمانیا ، نەمسا ) بەشداریان کرد ، کەوتنە باسی ڕێککردنەوەی پەیماننامەی ( سان ستڤانو ) کە لە نێوان ڕوسیا و دەوڵەتی عوسمانیدا بەسترا بوو ، ئەمەش لەوەوە هات کە هەندیٚ دەوڵەت ڕەخنەی لیٚی هە بوو چونکە بەرژەوەندی یە ستراتیژی یەکانی یەکیان نەئەگرتەوە لەگەڵ ئەم پەیماننامەیەدا ... ئەندامانی کۆنگرە لەسەر ڕێککردنەوەی پەیماننامەی ( سان ستڤانو ) ڕێکەوتن و پەیماننامەی( برلین) بەسترا و ئەم مەرجانەی خوارەوەی لە خۆ گرت :

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید ، ص١٤٥ .

[2] ) دیوانی قەیسەرمان بۆ ( البلاط القیصري ) داناوە چونکە لە ئەم ڕۆدا واتاکەی گشت گیر ترە ، عەرەب ئەڵیٚ : ﴿ بلاط الملك : اي قصره ومجازا مجلسه وزعماؤە ﴾ واتە / کۆشکی پاشا کە بۆ ئەنجومەن و سەرکردەکانیشی بەکار دێت ... (المنجد/وشەی:بلط)(وەرگێڕ:ن)

[3] ) بڕوانە : مذکرات غلیوم الثاني ، ص١٨_١٩ .

١- بولغاریا سەربەخۆیی وەرگرێت بەڵام سنورەکەی ڕێك بکرێتەوە ، و لە خوارووی بەلقاندا میرنشینێك دروست بکرێت بە ناوی ( رومیللی ڕۆژهەلاتەوە ) کە لە ژێر دەسەلاتی دەولەتی عوسمانیدا بێت لە ڕووی سیاسی و سەربازی یەوە ، و کەسێکی نەصرانی فەرمانڕەوایی بکات ، بۆ ماوەی پێنج ساڵ دا ئەنرێت بەڕێکەوتن لەگەڵ دەولەتدا ، و هێزێکی ڕوسیش لە بولغاریا و ( رومیللی ) دا ئەمێننەوە لەسنوری پەنجا هەزار سەربازدا .

٢- سنوری یۆنان تۆزێك بەرەو باکور دێتە پێشەوە لەگەل ئەوەدا پێویستە ئەوە بزانرێت کەیۆنان پەیوەندی بە بابەتی شەڕەوە نی یە و پەیماننامەی ( سان ستڤانو ) پەیوەندی بە هیچ بە شێکی ئەو وولاتەوە نی یە .

٣- بۆسنە و هرسك ئەدرێنە ( نەمسا ) .

٤- " بسارابیا " ئەدرێتە ڕوسیا دوای ئەوەی لە ڕۆمانیائەسەنرێتەوە ، و کەرتی ( دوبرجیە ) و هەندێ دوورگەی تر ئەدرێتە ڕۆمانیا و سەربەخۆیی پێ ئەدرێت .

٥- سەربەخۆیی ئەدرێت بە ( صرب ) و ( جبل الاسود ) .

٦- شارەکانی ( قارص ) و ( ردهان ) و ( باطوم ) ئەدرێن بە ڕوسیا .

٧-کۆنگرە بڕیاری ئەوە ئەدات کە ئەوباجی شەڕەی کە پەیماننامەی سان ستڤانو بڕیاری داوە دەولەتی عوسمانی بیدات ، کە بڕی ( دووملیارو نیولیرەی ئاڵتونی یە ) وەك خۆی بمینێتەوە .

٨- " باب العالي " پەیمان ئەدات کە بەبێ جیاوازی لە ئاییندا شایەتی هەموو هاوولاتی یەکانی لەبەردەم دادگاکان وەردەگرێت .

٩- کۆنگرەش هەمان بڕیاری هەیە بۆ چاکردنی هەلومەرجی نەصرانی یەکانی دوورگەی کریت[1] .

" بسمارك " کە ڕاوێژکاری ئەلمانیا بوو ، ئەو بانگێشتی بۆ ئەم کۆنگرەیە کرد لە ترسی ئەوەی نەوەك پاڵپاڵێنی بەریتانیا و ڕوسیا سەر بۆئەوە بکێشێت کە شەڕێکی سەرانسەری ئەورووپای لێبکەوێتەوە و ببێتە هەڕەشە لەسەر یەکێتی ئەلمانیا کە ئەو زەحمەتێکی زۆری لە پێناو دروست بوونیدا کێشا بوو، بۆیە ئەو دەولەتە گەورانەی بانگێشت کرد بۆ (برلین) تا دووبارە بە

---

[1] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، د. اسماعيل ياغي ، ص١٩٥ .

ئاشتی نامەی (سان ستڤانو)دا بچنەوە و مەرجەکانی شەڕی تورکیا و ڕوسیا سەرلەنوێ چاك بکەنەوە [1] ) .

هەندێ لە مێژونوسان [2] باسی ئەوە ئەکەن کەلەپشت پەردەوە (( بسمارك ))پێشنیاری بەشبەشکردنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کردووە لە قەسابخانەی ئاشتی ئەوروپادا و ووتویەتی : میصر بدرێت بە بەریتانیا و تونس و شام بدرێت بە فەڕەنسا و بۆسنە و هرسك بدرێت بە نەمسا و بوغازین ( بسفۆر ودردنیل ) و شوێنی تریش لە موڵکەکانی سوڵتان بدرێتە ڕوسیا ، بەلاَم ئەم پێشنیارانە لەناو ڕاسپاردە و بڕیارەکانی کۆنگرە دا نەنوسراونەتەوە [3] .

بەم شێوەیە کۆنگرەی برلین خاڵێکی وەرچەرخان بوو بۆ داڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە ناچار کرا دەست لە ڕووبەرێکی زۆر و فراوانی موڵکەکانی هەڵبگرێت ، هەروەك ئەوەش ئەبێ بنوسرێ کە بەریتانیا و فەڕەنسا پەیمانی پاراستنی موڵکەکانی دەوڵەتی عوسمانیان گرتە ئەستۆ ، هەرچەندە چ بەریتانیا و چ فەڕەنساش نیازی ئیمپریالیزمی خۆیانیان ئاشکرا کردو فەڕەنسا تونسی لە ساڵی ( ١٢٩٩ ك_ ١٨٨١ ز ) داگیر کرد وەك چۆن بەریتانیا ( قبرص ) ی داگیر کرد ، و میصری داگیرکرد لە ساڵی ١٣٠٠ك _ ١٨٨٢ ز ، بەلاَم واشی ڕاگەیاند کە ئەم داگیرکردنە شتێکی کاتی یە [4] .

ئەمە ئەنجامی ئەو شەڕە بوو کە لە نێوان ڕوسیا و دەوڵەتی عوسمانیدا بەرپا بوو ، سوڵتانیش بۆ ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ ئەم هەل و مەرجە نالە بارەدا بە پێویستی زانی کە نازناوی خەلیفە بەکاربهێنێ بۆ ئەوەی ( تحدی ) تازەکان ڕابگرێ ، ئەوە بوو هەستا بە دروست کردنی((جامیعەی ئیسلامی ) تا لەو ڕێگەیەوە هەموو موسڵمانان لە دەرەوە و ناوە وە بکاتە یەك کوتلە لە دەوری خۆیدا .

گومانی تێدا نی یە بزوتنەوەی جامیعەی ئیسلامی لەلایەن موسڵمانانەوە پێشوازی جوانی لێ کرا ، ئەوانەی بڕوایان وا بوو کە بێهێزی دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٥ .

[2] ) دکتۆر اسماعیل یاغی و ئەمجەد مستەفا عبدالرحیم .

[3] ) بڕوانە : في اصول التأريخ العثماني ، ص١٩٥ .

[4] ) بڕوانە : الدولة العثمانية ، اسماعيل ياغي ، ص١٩٥ .

هەستی ئایینی لای موسڵمانان بێهێز بووە ، ئەمەیە وای کردووە دوژمنانی ئیسلام هێرشیان بۆ دونیای ئیسلام هێناوە و وولاَت دوای وولاَت بە تالاَن ئەیبەن [1].

## باسی سێیەم

### جامیعەی ئیسلامی

بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی لە گۆڕەپانی سیاسەتی نێو دەوڵەتیدا باسی نە بووبەڵکو لە سەردەمی (سوڵتان عبدالحمید)دا دەستی پیَ کرد ، و دروست دوای ئەوەی کە لە ساڵی ١٨٧٦ زاینیدا چوویە سەر تەختی خیلافەتی عوسمانی ، ڕاستەوخۆ و دوای ئەوەی کە (سوڵتان عبدالحمید) ئاهێکی هاتوەتەوە بەبەردا و هەموو ئەوانەی کە چووبوونە ژێر کاریگەری بیری ئەورووپاوە دایمالین لە دەسەلاَتەکانیان ، و خۆی دەسەلاَتی ڕاستەقینەی لە وولاَتدا گرتە دەست، گرنگی یەکی زۆری دا بە بیرۆکەی ( جامیعەی ئیسلامی ) ، لە بیرەوەریەکانیدا " باسی پێویستی ئەوە ئەکات پشتیوانی لە پەیوەندی برایانەی ئیسلامی لەناو هەموو موسڵمانانی دونیا دا بکرێت لە چین و هیندستان و ناوەڕاستی ئەفریقا و شوێنەکانی تردا تەنانەت ئێرانیش ، لەم بارەیەوە ئەڵیَ : ( دروست نە بوونی لەیەکتر گەیشتن لەگەڵ ئێراندا مایەی داخە ، ئەگەر بمانەویَ هەل لە دەستی ئینگلیز و ڕوسیا دەربکەین ئەوە من شتێکی بەسوود ئەزانم کە نزیکبوونەوەیەکی ئیسلامی دروست ببێت ) [2] باسی پەیوەندی یەکانی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و ئینگلتەرا ئەکات کە هەمیشە پەرچی لەبەردەم یەکێتی عوسمانیدا دروست ئەکرد ، (عبدالحمیدی دووەم) ئەڵێت : (( ئیسلام و مەسیحیەت دوودیدی جیاوازن و ناکریَ هەردووکیان بەیەکەوە لەیەك شارستانێتی دا کۆبکەیتەوە ) [3] بۆیە وا ئەبینیَ کە (( ئینگلیز عەقڵی میصری یەکانی گەندەڵ کردووە و هەندێکیان وایان لیَ هاتووە ناسیونالیزمیان پیَ چاکترە لە ئایین و وا گومان ئەبەن کەئەکریَ شارستانێتی میصری و شارستانێتی ئەورووپا لەناو یەکتردابتوێنەوە ، ئینگلتەرە ئامانجی لە بلاَوکردنەوەی بیری ناسیولیزمی لە وولاَتە ئیسلامی یەکاندا ئەوەیە کە ئەم تەختەی من لەرزۆك بکات ... بیری ناسیونالیزمی

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو . ، ص١٩٦ .

[2] ) بڕوانە : مذكرات السلطان عبدالحميد ، ص٢٣ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٣ .

پێشکەوتنێکی بەرچاوی بە خۆوە بینیوە لە میصردا و ڕۆشنبیرە میصری یەکان وایان لێ هاتووە بێ ئەوەی هەست بەخۆیان بکەن بوونەتە دەسکەلای دەستی ئینگلیز ، ئەوانە بەم کارانەیان توانای دەوڵەتی ئیسلامی لەرزۆك ئەکەن و بەهەمان شێوە ڕێزی خیلافەتیش لەرزۆك ئەکەن لەگەڵ ئەوەدا [1] .

دەربارەی سیاسەتی ئینگلیزیش بەرامبەر خیلافەت ئەڵێ : (( ڕۆژنامەی ستاندەر)) ی ئینگلیزی بەدەق ئەڵێ : (( پێویستە دوورگەی عەرەبی بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزی یەوە و ، پێویستە لەسەر ئینگلتەرا دەست بەسەر هەموو شارە پیرۆزەکانی موسڵماناندا بگرێت )) ... ئینگلتەرا بۆ دوو ئامانج هەوڵ دەدات : - بێهێزکردنی کاریگەری ئیسلام و بەهێزکردنی دەسەڵاتی خۆی ، بۆیە ئینگلیز ئەیەوێ خدێوی لە میصردا ببێتە خەلیفەی موسڵمانان ، بەڵام یەك موسڵمانی ڕاست گۆ نی یە ئەمەی پێ قبوڵ بکرێت کە خدێوی ببێتە ( امیر المؤمنین ) چونکە کابرایەکە سەرتای خوێندنی لە جنێف دەست پێ کردووەو لە ( ڤییننا ) تەواوی کردووەو خۆی بردووەتە پێستی کافرانەوە ) [2] هەروەها هەر ئینگلیز بوو کە پێشنیاری ئەوەی کرد کە ( شەریف حسین ، میری مەککە بکرێتە خەلیفەی موسڵمانان ) [3] .

سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەم دان بەوەدا ئەنێ کە ئەوەندە توانا و هێزی نی یە شەڕی پێ بکات لەگەڵ دەوڵەتە ئەوروپای یەکاندا ، بەڵام دەوڵەتە گەورە کان زۆر لە چەکی( خیلافەت ) ئەترسان ، ئەم ترسەیان لە خیلافەت وای لێکردبوون کە هەموو سەر بکەن بەیەکدا بۆ کۆتایی پێ هێنان بە دەوڵەتی عوسمانی ) [4] هەروەها ئەڵێ : ( دەوڵەتی عوسمانی هەموو جۆرە ڕەگەزێکی لە خۆی گرتووە ، تورك و عەرەب و ئەلبان و بولغار و یۆنانی یەکان و زنجەکان و چەند ڕەگەزێکی تریش ، لەگەڵ ئەوەشدا ئیسلام وای لێکردووین هەمومان وا ئەزانین ئەندامی یەك خێزانین [5] .

---

1 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ٢٣.

2 ) بڕوانە : مذكرات السلطان عبدالحمید ، ص٢٤ .

3 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٤ .

4 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٤ .

5 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٤ .

(سوڵتان عبدالحمیدی دووەم )متمانەی خۆی بە یەکبوونی جیهانی ئیسلامی دەرئەبڕی و ئەڵێت : ( پێویستە پەیوەندیمان بە هەموو موسڵمانێکەوە بەهێز بکەین لە هەرکوێدا بێت ، پێویستە زیاتر وزیاتر لە یەکتری نزیك ببینەوە ، هیچ ئومێدێکمان لە داهاتوودا نی یە ئەم یەکێتی یە نەبێت ، هەرچەندە کاتی نەهاتووە بەڵام هەر دێت ، ئەو ڕۆژە هەر دێت کە هەموو موسڵمانان تێیدا یەك دەگرن و هەموو بەیەکەوە ڕائەپەڕن و وەك لەشی یەك مرۆڤ ڕاست ئەبنەوە و لەو ڕۆژەدا گەردنی کافرەکان ئەشکێنن [1] .

بە بیرۆکەی ( (جامیعەی ئیسلامی ) لە دیدی (سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) دا ئەتوانرا ئەم ئامانجانە دەست بخرێن :* ڕووبەڕووبونەوە لەگەڵ دوژمنانی ئیسلامدا ، ئەوانەی بە ڕۆشنبیری ڕۆژئاوا گۆش کراون ، و ئەوانەی کە چوونەتە ناوسەنتەرە هەستیارەکانی بەڕێوەبردن و سیاسەت ، لە دەزگاکانی هەموودەوڵەتانی ئیسلامیدا بەگشتی ، و لە دەزگاکانی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەتی ، ئەتوانرێت لە سنوری خۆیاندا ڕابگیرێن کە هەستیان کرد بەربەستێکی ئیسلامی بەهێزو گەورە لە بەردەمیاندا وەستاوە .

* چەسپاندنی ئەوەی موسڵمانان ئەتوانن ببنە هێزێکی سیاسی نێودەوڵەتی ، کە حسابیان بۆ بکرێت لەم شەڕە فیرکی وڕۆشنبیری و عەقائیدی یەی کە ڕوسیا و ئەوروپای نصرانی بەرپایان کردووە لەگەڵیدا .

* ئەم یەکێتی یە تازە ئیسلامی یە ڕۆڵی خۆی لەوەدا ئەبینێ کە کاریگەری ئەخاتە سەر سیاسەتی جیهانی [2] .

* دەوڵەتی عوسمانی بەو سیفەتەی دەوڵەتی خیلافەتە هێزی جارانی خۆی ئەگێڕێتەوە و بەو شێوەیەش ئەتوانرێ کە سەرلەنوێ بەهێز بکرێتەوە و هەموو جۆرە دەزگایەکی زانستی تازەی بۆ پەیدا بکرێت لە هەموو بوارەکاندا و بەو شێوەیەش ئەتوانێ سامی خۆی بگێڕێتەوە و ببێتە وانەیەکیش لە مێژوودا .

( سوڵتان عبدالحمیدی دووەم ) [1] ئەڵێ : ئیشکردن بۆ بەهێزکردنی قەوارەی سیاسی و کۆمەڵاتی ئیسلامی ، باشترە لەوەی ئەو قەوارەیە بدەی بەزەویدا یان لە هەمان زەویدا قەوارەیەکی تر دروست بکەیت نامۆ بێت لە ڕووی بیرو لە ڕووی کۆمەڵایەتی یەوە [2] .

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٤ .

[2] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمیدی الثاني ، ١٦٨ .

* زیندوکردنەوەی پلەی خیلافەت تا ببێتە کەرەسەیەکی بەهێز نەك شتێکی رووکەش وەك ماوەیەك وا سەیرئەکرا ، ئەگەر وا کرا ئەوکاتە سوڵتان خۆی بەتەنیا نابێت لە رووی چاوچنۆکی یەکانی رۆژئاوا و بەکرێگیراوەکاندا لەناوەوە ، بەڵکوو یەك گیانی یەکگرتوو دروست ئەبێ لەناو هەموو گەلانی ئیسلامی دا ، و ئەوکاتە ئەو یەکێتی یە ئەبێتە سونبول و ئاراستە کە رو یەکخەر .

مێژوو نوسی بەریتانی " ئارنوڵدتوینبی" باس لەوە ئەکات کە ئەڵێ : (( (سوڵتان عبدالحمید) ئامانجی لەو سیاسەتە ئیسلامی یەی پەیرەوی دەکرد ئەوە بوو کە هەموو موسڵمانانی جیهان لە ژێر یەك ئالأدا کۆبکاتەوە ، ئەمەش یەك مانا نەبێت مانای تری نی یە ئەویش ئەوەیە دژە هێرشێك دروست بکات کە هەموو موسڵمانان بێنە گۆڕەپانەکەوە و دژ بە و هێرشەی جیهانی رۆژئاوا کە کردیە سەر جیهانی موسڵمانان رابوەستن) .

هەربۆیە (سوڵتان عبدالحمید) هەرچی شك ئەبرد و دەستی پێ ئەگەیی لەو کاتەدا بەکاری هێنا بۆ ئەم ئامانجە وەك : بانگکردنی گشت بانگخوازانی ئیسلام لە هەموو رەگەزێك لە دونیای ئیسلامیدا ، چ زانایان و چ ئەوانەی رۆشنبیری ناودار بوون ، لە بوارە جۆراو جۆرەکانی سیاسەتدا ، ئەو بانگخوازانەی کە ئەیانتوانی بە هەموو جیهانی ئیسلامیدا گەشت بکەن و بێن و برۆن ، و چاوپێکەوتن لەگەڵ گەلانی ئیسلامیدا بکەن ، و ئەو میللەتانە ئاگادار بکەنەوە و راو بۆچوون و ئاراستەی سوڵتان و خەلیفەیان تێبگەیەنن و زانیاری ئیسلامی بلأوبکەنەوە ، هەموو سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە لە ئیسلام ، لە ناوەوە و دەرەوە ، چاپکردنی کتێبە ئیسلامی یە بنەرەتی یەکان ( رەسەنەکان ) ، هەوڵبدات بۆ ئەوەی زمانی عەرەبی بۆ یەکەمجار لە مێژووی دەوڵەتی عوسمانیدا بکرێتە زمانی رەسمی دەوڵەت یان ئەوەی کە ئێستا پێ ی ئەوترێ (( تعریب _ بەعەرەب کردن )) ی دەوڵەتی عوسمانی ، گرنگی دان بە مزگەوتەکان و شوێنی ناوداران سەرلەنوێ ، نۆژەنکردن و دروست کردنی مزگەوتی تازە و هەڵمەتی پیتاك کۆکردنەوە بۆ زیندوکردنەوەی مزگەوتەکان لە هەموو جیهاندا و گرنگی دان بە رێگەکانی هات و چۆ تا هەموو پارچەکانی دەوڵەتی عوسمانی ببەسترێت بەیەکەوە و راکێشانی دڵی سەرۆك عەشیرەتە عەرەبی یەکان و دروست کردنی قوتابخانەیەك لە پایتەختی خیلافەتدا بۆ خوێندنی منالأنی سەرۆك تیرە و عەشیرەتەکان و راهێنانیان بۆ بەرێوە بردنی( کاری دەوڵەت

) ، ڕاکێشانی دڵی شێخەکانی ڕێبازە ( تەسەوف ) یەکان ، سوود وەرگرتن لە ڕۆژنامە ئیسلامی یەکان بۆ پڕوپاگەندە کردن بۆ ( (جامیعەی ئیسلامی ) و تەرخان کردنی هەندێ ڕۆژنامە و تایبەت کردنی بە پڕو پاگەندە کردن بۆ ئەم کۆمەڵەیە ، کارکردن بۆ بەرەو پێش بردنی ڕاپەڕینی زانستی و تەکنەلۆجی لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا ، تازەکردنەوەی دەوڵەت لە هەموو ئەو لایەنانەوە کەپێویستە [1] .

کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان و بانگخوازانی ئوممەتی ئیسلامی هاتن بەدەم ئەم بانگێشتەوە و دەوری پڕۆسەی (جامیعەی ئیسلامیان ) دا ، وەك (جمالە ددین ئەفغانی) و (مستەفا کامیل) لە میصر و( ئەبی الهدی الصیادی) لە سوریا و (عبدالرشید ابراهیم) لە سیبریا و (بزوتنەوەی سەنوسیەکان) لە لیبیا و کەسانی تریش .

**یەکەم / ( جەمالوددینی ئەفغانی ) و ( سوڵتان عبدالحمید ) :**

(جمال الدین) زۆر پشتیوانی کرد لە بانگەشەی (سوڵتان عبدالحمید) بۆ پڕۆسەی ((جامیعەی ئیسلامی ) و چەند پڕۆژەیەکی تری خستە بەردەم سوڵتان کە لە حەز و ئاواتی ئەو زۆر گەورە تر بوون ، سوڵتان ئامانجەکەی ئەوەندە بوو کە هەموو گەلانی ئیسلامی لە دەور یەك ئامانج کۆببنەوە و بەیەك ئاڕاستە بجوڵێن ، ئەمەیش لە هەمان کاتدا یەکگرتنێکی هەستی و عەمەلیشە ، و خیلافەتیش تێیدا بە بەهێزی و سام داری خۆی ئەمێنێتەوە ، بەلاّم ئەفغانی پڕۆژەیەکی خستە بەردەم (سوڵتان عبدالحمید) مەبەست پێ ی یەکگرتنی (شیعە) و (سوننە) بوو بەلاّم سوڵتان لەم کارەدا هەر ئەوەندەی مەبەست بوو کە بزاڤی سیاسی لە نێوان هەردوولادا یەك بخات بۆ ئەوەی پێکەوە ڕووبەڕووی ئیمپریالیزمی جیهانی ببنەوە [2] .

(سوڵتان عبدالحمید) سوودی زۆری وەرگرت لە ئەفغانی ، بۆ ناساندنی جامیعەی ئیسلامی ، هەرچەندە جیاوازی لە نێوان بیری سوڵتان و بیری ئەفغانیدا هە بوو، هەندێ لە هۆیەکانی ئەم جیاوازی یە باس بکەین :

١- ئەفغانی بڕوای بە پرسی یەکبوونی موسڵمانان هە بوو ، لە هەمان کاتدا پشتیوانی لە و شۆڕشانەش ئەکرد کە دژ بە سوڵتان ئەکران چ ناسیونالیزمە تورکەکان پێ ی هەستایەن یان بە گشتی هاوولاّتی عوسمانی پێ ی هەستایە .

---

[1]) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص١٧٢ .

[2]) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص١٨١ .

٢- ئەفغانی بانگەشەی بۆ یەکبوونی هەموو گەلانی ئیسلامی ئەکرد ، بەڕادەیەك هەموو ببنە یەك لاشەو یەك دڵ بۆ ئەوەی لەبەردەم دەوڵەتە ئەوروپای یەکاندا بوەستن کەمەبەستیانە دەوڵەتی عوسمانی بەش بەش بکەن و کاریشیان بۆ ڕوخاندنی ئەکرد ، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەفغانی لە ڕووی ئیمپریالیزمی فەڕەنسیدا نەئەوەستا ئەگەر بە دەربڕینی ووشەی ناڕازی بوونیش بوایە ، لە کاتێکدا کە (سوڵتان عبدالحمید) زۆر پێویستی بەوە بوو کە لە باکوری ئەفەریقادا دژایەتی فەڕەنسی یەکان بکرێت و بە ڕوویاندا بوەستن [1] .

٣- (جمال الدین) ئیمپریالیزمی ئینگلیزی تاوانبار ئەکرد کە چی (سوڵتان عبدالحمید) باسی ئەوە ئەکات کە دەزگای هەواڵگری عوسمانی نەخشەیەکی دەست کەوتووە لە وەزارەتی دەرەوەی بەریتانیادا دانراوە کە (جمال الدین ئەفغانی) و ( بلنت ) ی ئینگلیزی تێیدا بەشدار بوون ، ئەم نەخشەیە بڕیاری ئەوەی تێدایە کەخیلافەت لە ژێر دەستی (سوڵتان عبدالحمید) و لە ژێر دەستی هەموو عوسمانی یەکان دەربهێنرێ، و ئەم " بلنت "ە پیاوێکی سیاسەتمەداری ئینگلیزی بوو لە وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیزدا کاری ئەکرد و نوسەری کتێبی (( مستقبل الاسلام )) ە کە لەو کتێبەدا بێ پەردە بانگەشە بۆ ئەوە ئەکات کار بکرێت بۆ دەرهێنانی خیلافەت لە ژێر چنگی عوسمانی یەکان و بدرێتە عەرەبەکان ، (مستەفا کامل پاشا) کە ڕێبەری بزوتنەوەی نیشتمانی بوو لە میصردا لە کتێبکدا بە ناوی (( المسالة الشرقیة )) وەڵامی ئەم " بلنت " ە ئەداتەوە و ئەڵێ : (( بە شێوەیکی گشتی بەڕێز نوسەری کتێبی (( مستقبل الاسلام )) وا ئەبینێ _ کە ئەوەش ئاوێنەی حەزو ئاواتەکانی ڕۆڵەکانی ڕەگەزەکەی خۆیەتی _ واجوانترە وشیارترە بۆ ئیسلام کە ئینگلتەرا دەوڵەتێك بۆ ئیسلام دروست بکات ، بەڵکوو وا ئەبینێ کە پێویستە خەلیفە کەسێکی ئینگلیزی بێت ) [2] .

٤- لەگەڵ ئەو هەموو چاوبرسێتی یەی ڕوسیا و ئەو هەمووە شەڕەی دژ بە دەوڵەتی عوسمانی ئەیکرد ، و ئەو هەمووە زەوی یەی لە عوسمانیەکانی ئەگرت ، کە چی هەڵوێستی بەڕێز جمال الدین ئەفغانی سەربارەت بە فراوانبوونی سنوری ڕوسیا زۆر نامۆ بوو بە چەمکی (جامیعەی ئیسلامی ) چونکە جمال الدین دانی بەوەدا ئەنا کە ڕوسیا مافی خۆیەتی بڕوات هیندستان بگرێ چونکە بەرژەوەندی ستراتیژی و زیندووی زۆری هەیە لەو

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٨٢ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٨٣ .

ناوچەیەدا ! ئەگەر ڕوسیاش وا بکات ئەوە ئەفغانی ڕەخنە لەو کارە ناگرێت ، و بەڵکوو ئامۆژگاری بۆ ڕوسیا ئەوەیە کە بێزیانترین و ئاسانترین ڕێگە بگرێتە بەر بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو بەرنامەیە ، ئەویش ئەوەیە داوای یارمەتی لە دەوڵەتی فارس و وولاتی ئەفغان بکات بۆ ئەوەی دەرگاکانی هیندستانی بۆ بکەنەوە ، بەو مەرجەی دوایی پشکیان لە غەنیمەتەکە دا هەبێت و بیانکاتە شەریك لە قازانجەکانی ئەو کارەدا .

٥- هەندێ جیاوازی ( عەقائیدی ) هە بوو لە نێوان جمال الدینی ئەفغانی و زانایانی ئەستەنبوڵدا ، شێخ " خلیل فوزی الفیلیباوی " کتێبێکی بەناوی " السیوف القواطع " دەرکردوو تێیدا بیرو باوەڕەکانی ئەفغانی هەڵوەشاندەوە ، جمال الدین هیچ وەڵامێکی نەبوو بۆی ، و بەرگری لە خۆی نەکرد ، کتێبەکە بە زمانی عەرەبی نوسرا و پاشان وەر گێڕایە سەر زمانی تورکی ...

(سوڵتان عبدالحمید) بڕوای ئەوەی بۆ دروست بوو بوو کە هەموو دەسەڵاتەکان بهێنێتەوە ژێر دەستی خۆی چونکە دووچار [1]تالآوی ئەچەشت بەدەست وەزیروئەفسەروصەدرە ئەعظەمەکانەوە کەکەوتبونە ژێر کاریگەری بیری ڕۆژئاواوە،ئەوانەی کەئامانج لێیان ئەوەبو دیموکراتیەتێکی ئەوروپی بەرپا بکەن،ئەنجومەنێکی هەڵبژێردراو بگرێتەخۆی کەلە هەمووگەلانی ناو دەوڵەتی عوسمانی پێك هاتبن،(سوڵتان عبدالحمید) نەیاری ئەم بیرۆکەیەبوو بەڵگەی ئەوەبووکە ژمارەی نوێنەرە موسڵمانەکان نزیکەی نیوەی ژمارەی گشتی پەرلەمان ئەبێت، کەچی (جمالالدینی) ئەفغانی رای لەگەڵ دیموکراتیەتەکەدا بوو،ڕای نەبوو کەدەسەلآت هەمووی لەدەستی یەك کەسدا بمێنێتەوە،ئەفغانی ڕای لەگەڵ ئەوەدا بووکە ئازادی ڕادەربڕین دەستەبەربکرێت [2] .

(سوڵتان عبدالحمید) لە یاداشتەکانیدا باسی ئەوە ئەکات کە (جمال الددین ئەفغانی) بووەتە قوشمەچی و پەیوەندی بە دەزگای هەواڵگری ئینگلیزەوە هەیە ئەوەتائەڵێ : (( نەخشەیەکم گەیشتووەتە دەست کە لە وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیزدا ئامادە کراوە کە کابرایەکی

---

[1]) عەرەب ئەڵێ (( ذاق الامرّین )) یان ئەڵێ (( لقی منه الامرین )) دوو تاڵیەکەی چەشت بەدەستیەوە ، مەبەست ئەوەیە خراپەی خۆیان و خراپەی کارەکانیشیان هەر تاڵی بوون بۆ سوڵتان ( وەرگێڕ: ن. ) المنجد / وشەی "مر".

[2]) بڕوانە: السلطان عبد الحمید الثاني ، ص١٨٤ .

قوشمەچی کە ناوی (جمال الدین ئەفغانی) یە کابرایەکی ئینگلیزی کە ناوی ( بلنت ) ە دایان ناوە ، ئەو دوو کەسە لەو نەخشەیەدا ئەڵێن ئەبێ خیلافەت لە تورکەکان بسەنرێتەوە و پێشنیاریان کرد وە بۆ ئینگلیز کە (شەریف حسین) ، میری مەککە بکەنە خەلیفە بەسەر موسڵمانانەوە .

من (جمال الدین) لە نزیکەوە ئەناسم ، کاتی خۆی لە میصر بوو ، پیاوێکی ترسناکە ، جارێکیان پێشنیاری ئەوەی بۆ کردم (خۆشی لافی مەهدیەتی لێ ئەدا) کە هەموو موسڵمانانی ئاسیای ناوەڕاست بوروژێنێ من ئەمزانی شتی وا ناتوانێ ، ئەم کابرا پیاوی ئینگلیز بوو ، زۆر هەڵئەگرێ کە ئینگلیز ئەم کابرایان بۆ تاقیکردنەوەی من دروست کردبێت ، منیش یەکسەر پێشنیارەکەم ڕەت کردەوە و ئەویش لەگەڵ ( بلنت ) دا یەکیان گرت ، لەڕێگەی ( ابو الهدی الصیادی الحلبی ) ەوە کە لەهەموو وڵاتە عەرەبی یەکاندا ڕێزی تایبەتی هە بوو بانگم کرد بۆ ئەستەنبوڵ .

هەریەك لە ( منیف پاشا ) کە پارێزەری( ئەفغانستانی کۆن) بوو ، و (عبدالحمید حامد)ی شاعیرو ئەدیب ، کەوتنە ئەو ناوەندە بۆ تکا کردن ، جمال الدین کەهات بۆ ئەستەنبوڵ ئیتر ڕێگەم نەدا جارێکی تر لە ئەستەنبوڵ بچێتە دەرەوە )[1].

بەڵام بیروڕای (جمال الدین) دەربارەی (سوڵتان عبدالحمید) بەم شێوەیە بوو ، (سوڵتان عبدالحمید) ئەگەر لەگەڵ چوار پیاوی هەڵکەوتووی سەردەمی خۆیدا بخرێتە ترازوویەکەوە ، تاکەی ئەو قورستر ئەبێت لە ڕووی زیرەکی و ووریای و سیاسەتمەداری یەوە ، بەتایبەت لەڕووی کارکردنە سەر بەرامبەرەوە ، جێگەی سەرسوڕمان نی یە کە ئەتبینی کێشەی گەورە گەورەی لەڕێگەی دەسەڵاتەکەیدا دەستە مۆ ئەکرد کە دەوڵەتە ڕۆژئاوایی یەکان بۆیان دائەڕێژا، یان ئەتبینی کابرای ناحەزی کە لە ژوورەکەی دێتە دەرەوە زۆر ڕازی و دڵخۆشە لە خۆی و لە ژیان و هەڵسوکەوتی ، و بڕوای دێتە سەر بیروڕاکانی ئەو ، ئیتر ئەو کەسە هەرکێ بێ ، پاشا بێت یان میر یان وەزیر یان باڵوێز بێت ... )[2]. هەروەها ئەڵێت : (( ئەو پیاوەم ئەبینی ووردترین ئاگاداری لە پرسەکانی سیاسەت هە بوو ، لە نیازی دەوڵەتە ڕۆژئاوایی

---

[1] ) بڕوانە : مذكرات عبدالحميد ، ص١٤٨ .

[2] ) بڕوانە : جمال الدين الافغاني ، المصلح المفترى عليه ، د. محسن عبدالحميد ، ص١٣٧ .

یەکان تێ گەیشتبوو ، بۆ هەموو کارەساتێك کە کەلێنێکی لە سیاسەتدا دروست بکردایە ڕێگە چارەیەکی ئامادەی هە بوو، ئەو شتەی زۆر سەرنجی منی ڕاکێشابوو ئەم پیاوە کەرەسە و فاکتەری زۆر کاریگەری شاراوەی هە بوو لە کاتی خۆیدا بەکاری ئەهێنان و نەیئە هێلا دەوڵەتە ئەورووپی یەکان لەسەر شتێکی ترسناك ڕێبکەون سەبارەت بە هەرێمە عوسمانی یەکان ، جاری واش هە بوو دەوڵەتە ئەورووپی یەکانی ئەگەیاندە ئەو بڕوایەی کە بەچاوی خۆیان ئەوە ببینن لەت و پەت بوونی دەسەلاتی عوسمانی ئەو کاتە ئەبێت کە وێرانکاری لە هەموو هەرێمە ئەورووپی یەکاندا ڕووئەدات بەگشتی ) [1].

هەروەها ئەڵێت : (( ئەوەی من بیبینم لە وریای سوڵتان و عەقڵ و بە ئاگابوونی و ئامادەکردنی هەموو کەرەسەیەکی پێویست بۆ پوچکردنەوەی فرت و فێڵی ئەورووپا هەروەها ئەو نیازپاکی وئامادەیی یەم تێدا بینی بۆ ئەوەی دەوڵەت بەرێتە پێشەوە کە ئەوەش بەرەو پێشبردنی هەموو موسڵمانانی تێدایە ، بڕیارم دا دەستی خۆم بخەمە ناودەستی و بەیعەتی پێ بدەم کە ئەو خەلیفە و پاشا بێت ، هەرچەندە ئەوەم باش ئەزانی و دڵنیا بووبووم کە هەرێمە ئیسلامی یەکان لە ڕۆژهەلاتدا هەرگیز لە داوی ئەورووپا دەرناچن و لە هەوڵی بێهێزکردن و پارچەپارچەکردنی ڕزگاریان نابێت ، و لەکۆتایشدا یەك لە دوای یەك ئەیانکەنە گاڵتە جاڕی خۆیان کاتێك نەبێت کە بەخەبەربێن و هەموو ڕیز ببەستن لە ژێر دەسەلاتی یەك تاکە خەلیفەی گەورەدا )) [2] .

کارو کردەوەی (جمال الدین ئەفغانی) مرۆڤ دوودڵ ئەکات ، هەیە بەرگری لێ ئەکات و هەشە تۆمەتباری ئەکات بەوەی بەکرێگیراو بووە و لە ناو کۆڕەکانی ماسۆنیەتدا ئیشی کردووە ، بۆ نمونە کتێبی ( دعوة جمال الدين الافغاني في ميزان الاسلام ) ی نوسەر مستەفا فوزی عبدالطيف الغزال وا ئەبینێ کە یەکێك بووە لە فاکتەرەکانی ڕووخاندنی ئوممەتی ئیسلامی لە مێژووی تازەدا بەلام کتێبی ( جمال الددين الافغانى المصلح المفترى عليه ) ی دکتۆر محسن (عبدالحميد) بەیەکێك لە چاکخوازە کانی ئەبینێ .

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٣٧

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٣٧ .

**دووەم / ڕێبازەکانی سوفیزم :**

(سوڵتان عبدالحمید) ڕێبازەکانی سۆفیزمی کردە ئامانجی خۆی و کەوتە هەوڵدان بۆ کێشکردنی ( ولائیان ) بۆ دەوڵەتی عوسمانی ، و بۆ بیرۆکەی ( جامیعەی ئیسلامی) ، سوڵتان توانی پردێك دروست بکات لە نێوان مەڵبەندی خیلافەت (لە ئەستەنبوڵ) و سەنتەرەکانی سۆفیزمدا لە هەموو شوێنێکی جیهانی ئیسلامیدا ، و سۆفیزمی کردە بڵندگۆیەك بۆ ئەوەی پڕوپاگەندەی پێ بکات بۆ جامیعەی ئیسلامی ، هەروەها جگە لە سۆفیزم هەموو ئەو دونیا نەویست ( زهّاد ) انەشی کردە هۆکارێکی بانگەشە بۆ _ بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی ، لە پایتەختی خیلافەتی ئیسلامیدا لیژنەیەکی ناوەندی دروست بوو کە پێکهات بوون لە زانایان و شێخەکانی ڕێبازی سۆفیزم کە پلەی ڕاوێژکاری سوڵتانیان هە بوو بۆ کاروباری جامیعەی ئیسلامی ، : شێخ ( احمد سعید ) بریکاری ( پەردەی پیرۆز ) لە حیجاز شێخ (( ابو الهدی الصیادی )) ڕێبەری ڕێبازی (( رفاعی ) ، شێخ (محمد ظافر الطرابلوسي) ڕێبەری ڕێبازی مەدەنی ، شێخ (رحمة الله علیه) ، کە یەکێك بوو لە زاناکانی حەرەمی مەککی ، ئەمانە دیارترین ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی جامیعەی ئیسلامی بوون ، چەند کەسی تریشیان لەگەڵ بوو ، دەستەی خۆجێی بۆ ئەم لیژنە ناوەندی یە لە هەموو هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا دروست کرا بوون ، گرنگترینیان ئەو لیژنەیە بوو کە لە مەککەدا لە ژێر سەرپەرشتی ( شەریفی مەککە ) دا دامەزرا بوو ، ئەرکی ئەم لیژنەیە ئەوە بوو کە چەمکی ( جامیعەی ئیسلامی ) لە وەرزی حەج کردندا بڵاوبکاتەوە بەناو حاجیەکاندا ، لیژنەیەکی تریش لە (بەغداد) هە بوو ، کە هەمان ئەرکی پێ سپێردرا بوو لەناو شوێنکەوتەکانی ڕێبازی قادریدا ، کە بەژمارەی زۆر زۆر لە باکوری ئەفریقاوە ئەهاتن بۆ سەردانی شێخ عبدالقادری گەیلانی دامەزرێنەری ڕێبازەکە ، یەکێك لەساڵەکان ژمارەی ئەوانەی تۆمارکران لەکاتی سەردان کردنیاندا گەیشتە نزیکەی( ٢٥ هەزار کەس ) .

لیژنەی بەغداد هەڵئەسا بە فێرکردن و سازکردنی هەموو ئەوانەی ئەهاتنە ئەوێ تا بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی بە جوانی هەڵبگرن و فێری بەرخۆدان بن لەبەردەم ئیمپریالیزمی فەرەنسی دا کە لە باشوری ئەفریقادا بوونیان هە بوو ، دەزگای هەواڵگری فەرەنسا باسی تێکۆشانی ئەمانە ئەکات کە لە باکوری ئەفریقادا بوون و لە بەغدادەوە ئەهاتن ، چ چالاکی یەکیان دژبە فرەنسی یەکان و دژ بە ئیمپریالیزمی فەرەنسی ئەنواند ، ئەڵێ :

( ئەو کارانە هاندانێك بوو لەلایەن هەندێ پیاوانی ئاینی یەوە ئەکران کە شوێنکەوتەی ڕێبازی قادری بوون [1]

ئەم لیژنە ناوەندی یەی جامیعەی ئیسلامی لە ئەستەنبوڵ لقێکی لە ئەفریقاشدا هە بوو ، کارای ئەوە بوو لە ئەفریقادا ئیش بکات ، بەڵام بە ڕێگەیەکی زۆر نهێنی ، ئەرکی ئەوە بوو کەکار لە نێوان کۆمەڵە ئایینی یەکانی ئەوێدا گرێ بدات بەیەکەوە ، و دژ بە ئیمپریالیزمی فەڕەنسی بجولێن ، ئەو کۆمەلأنەش وەك (شازلیەکان و قادریەکان و مەدەنی یەکان ) [2] .

دەسەلأت و سامی ئەم بزوتنەوەیە گەیشتە ئەوەی کە بەڕێوەبەرایەتی هەواڵگری فەڕەنسی لە باکوری ئەفریقادا بەم شێوزەیە وەسفی بکات :

( سوڵتان عبدالحمید _ بەو سیفەتەی کە سەرۆکی جامیعەی ئیسلامی یە _ ئەتوانێت لە ڕێگەی ئەو پەیوەندی یە پتوانەی بەکۆمەڵە ئایینی یەکانەوە هەیەتی لە باکوری ئەفریقادا ( ئەتوانێ سوپایەکی خۆجێی ڕێك و پێکی وا دروست بکات ئەگەر کارەکە خواستی بەو سوپایە شەڕ لەگەڵ هەموو هێزێکی بیانیدا بکات ) [3] .

دەزگای هەواڵگری فەڕنسی نەیتوانی ئەوە دەربخات چۆن و بە چ ڕێگەیەك ئەم ڕێبازانەی سۆفیزم(کەسەر بە خیلافەتی ئیسلامین) لە ئەفریقادا ڕێك دەخرێن و هان ئەدرێن لێیان ، هەموو ئەوەی کە توانی بیکات ئەوە بوو کە هەوڵی دا سام و هەیبەتی (سوڵتان عبدالحمید) لە دڵی موسڵمانانی باکوری ئەفریقادا لاواز بکات ، و هەوڵ بدات زیان بگەیەنێت بەو سیاسیەتەی جامیعەی ئیسلامی ئەجولێنێ ، ئەم کارەش بەم سیاسیەتە فەڕنسی یەوە خوارەوە ئەنجام درا : _

١-فریودانی هەندێ لە شێخەکانی ڕێبازی سۆفیزم بە ماڵ و پلەو پایە ، تا بدەنە پاڵ فەڕنسا و سیاسەتەکانی لە باکوری ئەفریقادا .

٢-ڕێگەگرتن لە حاجیەکان تاحەج نەکەن بۆئەوەی لەوێ چاویان بە بانگەوازانی ((جامیعەی ئیسلامی )) نەکەوێت ، ئەمەش بەچەند سیاسەتێکی ئەنجامدا گونجاو لەوانە : ڕانەگەیاندی

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ، ص١٩٩ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٧ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ،ص ١٩٧ .

حەجنە کردن و گرتنە بەری هۆکاری تەندروستی تا خەڵك بترسێ ونە چێت بۆحەجکردن ، بۆنمونەئەوە بلاْو بکرێتەوە کە نەخۆشی کولێرا لەناو خەڵکدا بلاْوبوّتەوە [١] .

(سوڵتان عبدالحمید) کۆمەڵێك سۆفیزم و پیاوی زاهیدو دونیا نەویستی ڕەوانەی هیندستان کرد بۆ ئەوەی ئەو هەولاْنەی ئینگلیز پوچەڵ بکەنەوە کە ئەیدا بۆ ئەوەی خیلافەت لە عوسمانی یەکان بسەنرێتەوە و بدرێتە عەرەب ، هەرئەم کاروانە سەردانی هەندێ کار بەدستی ناو دوورگەی عەرەبیشیان کرد بە تایبەتی ئەوانەی حیجار ) [٢] .

(سوڵتان عبدالحمید) بەو سیفەتەی سەرۆکی جامیعەی ئیسلامی و خەلیفەی موسڵمانان و سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی بوو ، پەیوەندی بەردەوامی بە کۆمەلاْنی ڕێبازەکانی سۆفیزم و شێخەکانیانەوە هە بوو لە تورکستان و خواروی ئەفریقا و چین ، هەندێك لەو پەیوەندی یانە پەردەیان لەسەر لابراوە و زۆر بەشیان تا ئێستاش بەڵگەننامەکان بە شێوەیەکی تەواو پەردەیان لەسەر لانەبراوە )) [٣] .

( سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) لەوەدا سەرکەوتوو بوو کە توانی ئەو هەمووە ڕێبازە لە سۆفیزم لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە ، بەلاْم وای بەباش ئەزانی کە چاوپۆشی لەو هەموو لادانەیان بکات کە لە بیروباوەڕدا لێیان ڕوویداوە ، چونکە ڕێبازە سۆفیزمەکان لەو قۆناغەدا لە قورئان و حەدیسی پێغەمبەر (ﷺ ) لایان دا بوو مەگەر کە سانێکیان نەبێت کە خوا ڕەحمی پێ کردبن ، بۆیە ئەوانیش بەش بە حاڵی خۆیان پشکیان هە بوو لە بێهێزکردن و نشوستی هێنان بە خیلافەتی بەرزی ئیسلامی ، بەویستی خوا لە هۆیەکانی نشوستی هێناندا ڕۆشنی ئەکەینەوە ..

**سێ یەم / بە عەرەب کردنی دەوڵەت :**

(سوڵتان عبدالحمید) هەر لە سەرەتاوە هاتە سەر کورسی دەسەلاْت بە پێویستی ئەزانی کە زمانی عەرەبی بکاتە زمانی ڕەسمی دەوڵەتی عوسمانی ، لەم بارەیەوە خۆی ئەڵێ : (( زمانی عەرەبی زمانێکی جوانە ، خۆزگە هەر لەسەرەتاوە بمانکردایە بە زمانی ڕەسمی

---

1) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ١٩٨ .

2) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٨ .

3) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٨ .

دەوڵەت ، کاتی خۆی کە( خیرالدین پاشای تونسی) صەدری ئەعظم بوو پێشنیاری ئەوەم کرد کە زمانی عەرەبی بکرێتە زمانی ڕەسمی ، بەڵام سعید پاشا کە گەورە ئەمینداری کۆشك بوو ، ڕەخنەی لەم پێشنیارەم گرت و ووتی : (( ئەگەر دەوڵەت بکەینە عەرەب ئەوە هیچ ڕەگەزێکی تورکی دوای ئەوە نامێنێ )) .

سعید پاشا پیاوێکی بۆش بوو ، قسەکانی پووچ بوون ، ئەگەرنا ئەوە چ پەیوەندی یەکی بەڕەگەزی تورکەوە هەیە ؟ ئەم پرسە بەتەواوەتی پێچەوانەی قسەکەی ئەوە ، ئەمە پرسیێکەو ئەوەش پرسیێکی ترە ، ( زیاد لەوەش ) ئێمە ئەگەر زمانی عەرەبی بکەینە زمانی ڕەسمی دەوڵەت _ لانی کەم ئەوسوودەی ئەبێ کە پەیوەندیمان بە عەرەبەوە پتەوتر ئەکا )[1] .

(سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) شکاتی حاڵی خۆی زۆر ئەکرد بەتایبەتی لەسەرەتای دەسەلاتەکەیدا لەوەزیرەکان و ئەمیندارەکانی کۆشکی سوڵتان ، چونکە بیرکردنەوە یان وەك ئەو نە بوو ، ئەوان کەوتبوونە ژێر کاریگەری بیری ناسیۆنالیزمی ڕۆژئاواوە و بوو بوونە کارتی فشار لەسەر کۆشکی سوڵتانی ، چ لەسەردەمی (سوڵتان عبدالمجید)ی باوکیدا بووبێت یان لەسەردەمی (سوڵتان عبدالعزیز)ی مامەیدا بووبێت و یان لەسەردەمی خۆیدا بووبێت ، ئەم ڕەخنە و پەرچ دروست کردنە لەبەردەم ئەم پێشنیارەی( سوڵتان عبدالحمید)دا سەربارەت بە بەعەرەب کردنی دەوڵەتی عوسمانی لەوەدا نەوەستا کە تەنیا هەر ئەو وەزیرانە بن کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری ڕۆژئاواوە بەڵکوو گەیشتە هەندێ لە زانایانی ئایینیش )[2] .

یەکێك لەو هەڵە گەورانەی دەوڵەتی عوسمانی تێ کەوت ئەوە بوو کە نەیتوانی دەوڵەتی عوسمانی و گەلی عوسمانی ( تەعریب ) بکات ، کە زمانی عەرەبی زمانی ( قورئانی پیرۆز ) و( شەرعی پڕدانایی ) ئیسلامە .

مامۆستا محمد قطب ئەڵێ : (( ئەگەر ئەوە بهێنینە بەرچاوی خۆمان ئەگەر دەوڵەتی خیلافەت ببوایەتە عەرەب و بە عەرەبی قسەی بکردایە کە بەو زمانە ئەم دینە هاتووەتە خوارەوە ، گومانی تێدانی یە ئەو کاتە فاکتەرەکانی یەکێتی لەناو ئەو دەوڵەتەدا بەهێزتر ئە بوو و بەتواناتریش ئە بوو لەبەرپەچدانەوەی خەڵکانی گاڵتەجاڕدا ، زیاد لەوەش کە فێربوونی عەرەبی چەند بواری بۆ فێربوونی زانیاری ڕاست و دروست زیاتر ئەڕەخسان

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٩٩ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٠٠ .

دەربارەی ئەم ئایینە لەسەرچاوە ڕەسەن و ڕاستەوخۆکانەوە : ( واتە ) لە کتێبەکەی خواوە و لە سوننەتە پیرۆزەکانی پێغەمبەرەوە (ﷺ ) ، کە هەموو لایەك چ کاربەدەست و چ جەماوەر زۆر پێویستیان بەو زانیاری یە دروستانە هە بوو ، ئەمە ونکوڵی لەو هەمووە ( کتێبە چاکانەش ) ناکرێ کە وەرگێڕرایە سەرزمانی تورکی یان بە زمانی تورکی دائەنران لەسەر ئەم ئایینە ) [1] .

## چوارەم / چاودێری کردنی سوڵتان بۆ قوتابخانەکان و ڕوانینی بۆ پرسی ئافرەت و بێ حیجابی ئافرەت :

ئەو کاتەی (سوڵتان عبدالحمید) دەسەڵاتی گرتە دەست سەیر ئەکات ، قوتابخانەکان و سیستەمی خوێندن کەوتوونەتە ژێر کاریگەری بیری ڕۆژئاواوە ، و ڕەوتی ناسیۆنالیزمی بریتی یە لە و ڕەوتەی کە لە قوتابخانەکاندا زاڵ بووە ، بۆیە خێرا دەستی وەردایە کاروباریان و بەپێ ی دیدە سیاسی یەکەی خۆی دەستی دایە ئاڕاستە کردنیان بەرەو خوێندنی ئیسلامی ، و ئەم فەرمانەی دەرکرد :

* دوورخستنەوەی وانەی ئەدەب و مێژووی گشتی لە بەرنامەکانی خوێندن ، لەبەرئەوەی ئەو وانەیە کەرەسەیەك بوو لە کەرەسەکانی ئەدەبی ڕۆژئاوا ، و مێژووی ناسۆنالیزمی گەلانی تر کاریگەری خراپی لەسەر نەوە ئیسلامی یەکانی دا هاتوو دروست ئەکرد .
* دانانی وانەکانی ( فقە ) و ( تەفسیر ) و ( ڕەوشت ) لەبەرنامەکانی خوێندن دا .
* تەنیا مێژووی ئیسلامی بخوێنرێ و مێژووی عوسمانیش بەشێك بێت لەو وانەیە .

(سوڵتان عبدالحمید) قوتابخانەکانی دەوڵەتی خستە ژێر چاودێری خۆیەوە و بەو شێوەیە ئاڕاستەی ئەکرد کەلە خزمەت " جامیعەی ئیسلامیدا " بێت [2] .

( سوڵتان ) گرنگی زۆری بە ئافرەت ئەداو خانەیەکی تایبەتی دانا بۆ مامۆستایانی ئافرەت و تێکەڵ بوونی لەگەڵ پیاواندا یاساغ کرد ، (سوڵتان عبدالحمید) کە بەرگری لەخۆی دەکات سەربارەت بەو تۆمەتەی کە کۆمەڵەی (ئیتیحادوتەرەقی) ئەیدەنە پاڵی گوایە ئەو دوژمنی عەقڵ و زانستە ، سوڵتان ئەڵێ : (( ئەگەر من دوژمنی ( عەقل ) و( زانست ) بوومایە ، ئایا

---

[1] ) بڕوانە : واقعنا المعاصر ، ص١٥٣ .

[2] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص٢٠١ .

زانکـۆم ئـەکردەوە ؟ مـن ئەگـەر بـەو شـێوەیە دوژمنـی زانـست بوومایـە ، ئایـا خانـەی مامۆستایانی ئافرەتم دائەمەزراند بۆ ئەو ئافرەتانەی کەتێکەڵ نابن بە پیاوان ؟! ) [1] .

( (سـوڵتان عبدالحمیـد) ) دەسـتی دایـە دژایـەتی کردنـی بـێ حیجـابی ئافرەتـان لـەناو دەوڵەتی عوسمانیدا و هێرشـی زۆری کردە سـەر ئـەو ڕەوشـت و ئاکارانـەی کە لـە ڕۆژئاواوە دزەیان کردوەتـە نـاو ژیانی ئافرەتانی عوسمانی ، لـە ڕۆژنامـەکانی ئەسـتەنبوڵدا و لـە ڕۆژی ٣/اکتـوبر/ ١٨٨٣ زدا ، بە یـانێکی حکومـەتی دەرچـوو کـە ئاڕاسـتەی جـەماوەر کرابـوو، کـە دیـدی خـودی سـوڵتانی دەرئـەبڕی سـەربارەت بـە پۆشـاکی ئـافرەت ، ئـەو بەیانـە ئـەڵێت : (( هەندێ لە ئافرەتە عوسمانی یەکان ئەوانەی کە لە کاتـە درەنگـەکان ئەچـنە سـەرجادەکان جل و بـەرگێك لەبـەر دەکـەن کـە پێـچەوانەی شـەریعەتە ، سـوڵتان حکومـەتی ئاگـادار کـردووە کـە ڕێوشوێنی پێویست دابنێ بۆ نـەهێڵانی ئـەو دیاردەیـە ، هـەروەك سـوڵتان حکومـەتی ئاگـادرا کـردووە پێویـستە ئافرەتـان بگەڕێنـەوە بـۆ پۆشـینی حیجـابی شـەرعی تـەواو لەگـەڵ پەچـەدا کاتێك کە ئەچنە سەرجادەکان ، بۆ جێ بەجێ کردنـی ئەمـە ئەنجومـەنی وەزیـران کۆبونـەوە و ئەم بڕیارانەی خوارەویان دا :

* مـاوەی یـەك مـانگ دائـەنرێ و پـاش ئـەوە یاسـاغ ئـەکرێت کـە ئافرەتـان بێنـە سـەرجادەکان کاتێك نەبێت کە حیجابی ئیسلامی یە کۆنەکەی پۆشیبێت و ئەبێ ئەو حیجابـە هـیچ ( زینـە ) و نەخشێکی تێدا نەبێت .

* ئـەو پەچـە دەسـتکردانەی کـە لـە قوماشـێکی تـەنك یـان سـوکەڵە دروسـت کـراوە هەڵدەوەشێتەوە و بەو شێوەیە پێویستە بگەڕێنەوە بۆ ئەو پەچە شەرعیەی کە خـەت و خـاڵی دەم و چاو دەرنەخات .

* ئەرکی سەرشـانی پۆلیسە کە دوای مانگێك بەسـەر دەرچـوونی ئـەم بەیانـەدا ، جـێ بـەجێ کردنی هەموو ئەو بڕیارانەی کە لەو بەیانـەوە دەرچـوون دەسـتەبەر بکـەن بـە شـێوەیەکی ڕێـك وپێك ، و هێزەکانی ڕێکخستن ( القوات الـضبطیة ) یـش پێویـستە هاوکاربن لەگـەڵ پۆلیـسدا بۆ ئەم مەبەستە .

* سوڵتان ئیمزای ئەم بڕیارانەیحکومەتی کردووەوسیفەتی ڕەسمیان وەرگرتووە.

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ،ص٩٩ .

*ئـەم بەیانـە لەڕۆژنامەکانـدا بلاّوئەکرێتـەوەو لـەجادەو بازاڕەکانداهەلّئەواسـریّ[1] ، یـەك ڕۆژدوای بـلاّو کردنـەوەی ئـەم بەیانە،واتـە لـە ڕۆژی (٤/ئۆکتۆبـەر/دا ڕۆنامـەی(وقـت) کەلەئەسـتەنبولّ دەرئەچـوو ئەنوسـێت:((کۆمەڵگـەی عوسمـانی بەگـشتی پـشتی ئـەم بڕیارەڕاست ئەکاتەوەو بەبڕیارێکی بەکەڵکی ئەزانیّ[2] ).

(سولّتان عبدالحمید) ڕای وابووکە:( ئافرەت وپیاو یەك نین لەڕووی "مودیریەتەوە"[3] ) هەروەها ئەلّیّ:((مادامێك قورئان ئەمەی وتووە،کەواتە پرسەکە کۆتایی پیّ هاتووەونایەویّ باس لەوە بکریّ کە ژن وپیاو یەکسانن بەیەکتری )) .

هەروەها ئەلّیّ : ( ئەم بیرۆکەی (( یەکسانی یە )) بەدلّنیای یەوە بیرۆکەیەکی ڕۆژئاوای یە هاتووەتـە ناومـان )[4] . (سـولّتان عبدالحمیـد) بـەرگری لـە فـرە ژنـی ئـەکرد لـە کاتێکـدا دەزگاکـانی ڕاگەیانـدنی عوسمـانی ئـەم باسـەیان زۆر ئـە وروژانـد و ڕەخنـەیان لـیّ ئەگرت ، سولّتان ئەلّیّ : (( هـۆی چـی یـە هەنـدیّ خەلّکی ڕۆشنبیر ڕەخنە لـەم کـارە ئـەگرێت؟ ئەی بۆ هەمان ڕەخنەی لیّ ناگرن لە کاتێکدا کە لەناو جگە لە دەولّەتی عوسمانیدا هەیە وەك هەندیّ شوێنی ئەفریقا و ئەمریکا ؟ ) سولّتان بۆ دلّنیایی ئەلّیّ : (( بنەمای فرە ژنی لە ئیسلامدا ڕێگەی پیّ دراوە کەواتە ڕەخنە گرتن لیّ ی مانای چی ئەگەیەنێت [5] .

(سـولّتان عبدالحمیـد) لایـەنگری ئـەوە بـوو ئـافرەت بخـوێنیّ ، بۆیـە خانەیـەکی بـۆ مامۆستایانی ئافرەت دامەزراند تا ئەرکی دەرچوواندنی مامۆستای ئافرەت بگرێتە ئەستۆی ، لەگـەلّ ئـەوەدا دژ بـە تێکـەلّ بـوونی ژن و پیـاو بـوو ، دژی بـیّ حیجـابی بـوو ، لەسـەردەمی ئەودا ئافرەت دەستی وەرنەئەدایە کاروباری دەولّـەت ، ئەو کاروبارە هەرچی بوایە ، بەلّکوو ڕۆلّـی سـەرەکی بریتـی بـوو لـە مـالّ و پـەروەردەکردنی نـەوەی نـویّ ، هەلّسوکەتی لەگـەلّ ئافرەتدا زۆر مەردانە و ناوازە بوو ، ئەوەتا کە ئەچێتە سەرتەختی دەسەلاّت ، ژنەکەی باوکی ( باوەژنەکـەی ) کـە ئـەرکی پـەروەردەکردن و دایـەنی ئـەمی هـەلّگرت هەسـتاو ناوی ( دایکی

---

[1])بڕوانە: السلطان عبدالحمیدالثانی ،ص١٠٠.

[2])بڕوانە: موسوعةأتاتورك (١/٦٠،٥٩ )

٣)مدیرییەت بە مانای( القوامة)

[4]) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ، ض١٠٠ .

[5]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٠١ .

سوڵتان ) بڕی بە باڵایدا ، کە بەچەمکی تازەو سەردەم پیٚ ی ئەوتریٚ (( شاژن )) ، شاژن لە دەوڵەتی عوسمانیدا بریتی بوو لە (( دایکی سوڵتان )) نەك ژنی سوڵتان وەك لە دەوڵەتەکانی ترا هەبوو ، لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ، ڕۆژێك دوای ئەوەی کە (سوڵتان عبدالحمید) خرایە سەر تەختی دەوڵەتی عوسمانی ، چوو بۆ بینینی باوەژنەکەی _ کە زۆری خۆش ئەویست _ دەستی ماچ کردوو پیٚ ی ووت :

( سۆزی تۆ وای لێکردم هەستم نەئەکرد دایکم نی یە ، لە چاوی مندا تۆ هەر دایکی خۆمی و لای من هیچ جیاوازیتان نی یە ، بڕیارم داوە کە (دایکە سوڵتا)ن بیت ، واتە قسەی کۆتایی لەم کۆشکەدا هی تۆیە ، بەڵام تکا دەکەم و لەسەر ئەم تاکەیەشم سورم کە بە هیچ شێوەیەك دەست وەرمەدەرە هیچ کاروبارێکی دەوڵەت ، ئەو کارە گەورە بێت یان بچوك بێت [1] .

**پێنجەم / قوتابخانەی خێڵەکان :**

(سوڵتان عبدالحمید) لە ئەستەنبوڵدا بەوپیٚ یەی کە مەڵبەندی خیلافەتە و سەنتەری دەسەلاٌتە قوتابخانەی ( خێڵە عەرەبەکانی ) دامەزراند ، کە سەرەتا مەبەست پیٚ ی ڕاهێنان و پیٚ گەیاندنی خێڵە عەرەبەکان بوو لە هەرێمی ﴿( حلب ) و سوریە و بەغداد و بەصرە و موصل و دیار بەکر و طرابلس ی ڕۆژئاوا و یەمەن و حیجاز و بەنغازی و قودس و دیرالزور﴾دا.

ماوەی خوێندن لە قوتابخانەی خێڵە عەرەبەکاندا لە ئەستەنبوڵ ( پێنج ) ساڵ بوو ، قوتابخانەیەکی ناوخۆیی بوو ، خەرجی هەموو قوتابیان لەلایەن دەوڵەتەوە دابین ئەکرا ، هەموو قوتابیەکیش (( مۆڵەتی پەیوەندی خزم و کەس و کاری ( اجازة صلة الرحم ) ی هە بوو کە مۆڵەتێك بوو دووساڵ جارێك ئەدرا بە قوتابی و لەسەر خەرجی دەوڵەت سەفەری ئەکرد.

بەرنامەی (قوتابخانەی خێڵە عەرەبی یەکان) لە ئەستەنبوڵدا بەم شێوەیە بوو :

ساڵی یەکەم / قورئانی پیرۆز _ ئەلف بیٚ _ زانستە ئایینی یەکان _ خوێندنەوەی تورکی _ نوسین _ مەشقی سەربازی .

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص٩٨ .

**سالی دووەم** / قورئانی پیرۆز _ تەجوید _ زانستە ئایینی یەکان _ نوسین _ بیرکاری _ خوێندنەوەی تورکی _ خەت خۆشی _ مەشقی سەربازی .
**سالی سێ یەم** / قورئانی پیرۆز _ تەجوید _ زانستە ئایینی یەکان _ نوسین _ خەت خۆشی _ بیرکاری _ جوگرافیا _ زمانی فەرەنسی _ مەشق کردن .
**سالی چوارەم** / قورئانی پیرۆز _ تەجدید _ زانستە ئایینی یەکان _ (صرف)ی عەرەبی _ زمانی فارسی _ نوسینی ڕێزمانی تورکی _ جوگرافیا _ بیرکاری _ خەت خۆشی لە زمانی فەرەنسیدا _ مەشق کردن .
**سالی پێنجەم** / قورئانی پیرۆز _ تەجوید _ زانستە ئایینی یەکان _ ڕیزمانی عەرەبی _ زمانی فارسی _ مێژووی عوسمانی _ ڕێزمانی عوسمانی _ نوسین و خوێندنەوەی تورکی _ قسەکردنی تورکی _ جوگرافیا _ بیرکاری _ ئەندازە _ خەت خۆشی_ زانیاری گشتی _ چۆنیەتی پاراستنی تەندروستی _ بنەماکانی هەڵگرتنی تیا نوسەکان [1] _ زمانی فەرەنسی و خەت خۆشی لە زمانی فەرەنسی دا _ وێنە _ مەشق کردن [2] .

دەرچووی ئەم قوتابخانەیە ئەچوونە قوتابخانەی بالای سەربازی و دوای ئەوە پلەیەکی بەرزیان پێ ئەدرا ، ئەیشیان توانی بچنە قوتابخانەی ( مولکیەت ) کە قوتابخانەیەکی ئەهلی بوو ، سالێك لەوێشدا ئەیان خوێند و دوای ئەوە پلەی ( قائیمقام ) یان پێ ئەدرا و ئەگەڕانەوە بۆ وولاتەکانی خۆیان [3] .

هەروەها (سولتان عبدالحمید) ( پەیمانگەی ڕاهێنانی ڕێبەرو وەعز خوێنەکان ) ی دامەزراند ، کە ئەرکی پێگەیاندنی بانگخواز بوو ، ئەمانە کاریان ئەوە بوو خەلك بۆلای ئیسلام و جامیعەی ئیسلامی بانگ بکەن ، پاش ئەوەی لەم پەیمانگایە دەردەچوون بەرەو

---

[1] ) ئەو وانەیە پێ ئەچێت : بنەمای چۆنیەتی پارستنی ئەرشیف و کتێبخانەکان بێت . ( وەرگێڕ .ن . ) .

[2] ) بڕوانە : تاریخ التربیة الترکیة ، عوسمان أرکین ، ص٦١٤ _٦١٥_٨٨٤_١١٨٠_١١٨٢یةك لة دوای یةك .

[3] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ، ص٢٠٢ .

شوێنە جیاجیاکانی جیهانی ئیسلامی ئەنێردران و خەڵکیان بەرەو ئیسلام و خیلافەتی ئیسلامی و جامیعەی ئیسلامی ئەهێنایەوە [1] .

دیدی (سوڵتان عبدالحمید) زۆر دوور ئەیڕوانی و زۆر تیژ شتی ئەبینی لەبەرئەوە گرنگی یەکی باشی بە موسڵمانانی چین ئەدا .

ڕۆژنامەکانی ئەستەنبوڵ هەواڵێکیان بڵاوکردەوە کە کورتەکەی ئەوەی ، ژمارەیەك لە موسڵمانانی چین زۆر حەزیان لە زانست وزانیاری یە و ئەیانەوێت شارەزا ببن لە زانستە ئیسلامی یەکاندا ، و چەندان دامەزراوەی خوێندن و قوتابخانەیان هەیە ، هەر لەناو ( پەکین ) دا بەتیا ، (سی و هەشت) مزگەوتی بچوك و گەورە هەیە کە موسڵمانانی ئەوێ نوێژی تێدا ئەکەن و ووتاری تێدا ئەدەن و دوعا بۆ خەلیفەی موسڵمانان ( سوڵتان (عبدالحمید)ی دووەم ) ئەکەن ، ووتاری جومعە لە مزگەوتە گەورەو بچوکەکانی پەکیندا بەعەرەبی ئەخوێنرێتەوە و پاشان وەردەگێڕێتە سەر زمانی ( چینی ) ، دوعا کردن بۆ خەلیفەی موسڵمانان قۆرخ نی یە لە پەکیندا بەڵکوو لە مزگەوتە گەورە و بچوکەکانی هەموو ووڵاتی چیندا ئەم دوعایە ئەکەن [2] .

لە پەکین ( پایتەختی چین ) زانکۆیەك دامەزرا ، موسڵمانانی ئەوێ ناویان نا ( خانەی حمیدی بۆزانستەکان )، مەبەست بە (حمیدی)( سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) بوو ، یان وەك باڵوێزی فەڕەنسا لە ( ئەستەنبوڵ ) بە ( زانکۆی حمیدیە لە پەکین ) ناوی بردووە لە ڕاپۆرتێکدا کە بۆ وەزارەتی دەرەوەی بەرزکردووەتەوە لە پاریس .

بۆ ئاهەنگی کردنەوەی ئەم زانکۆیە هەزاران موسڵمانی چینی ئامادە بوون هەروها موفتی چین و زۆرێك لە زانا موسڵمانەکانی ئەوێ بەشداریان کردوو لە ڕێو ڕەسمی کردنەوکەیدا بە زمانی عەرەبی ووتاریان خوێندەوە و ووتارە خوێنەکە دوعای بۆ (سوڵتان عبدالحمید) ( خەلیفەی موسڵمانان ) کردوموفتی پەکین هەستایەوە و ووتارەکەو دوعاکانی وەرگێڕایە سەر زمانی چینی و زۆر بەی موسڵمانانە ئامادە بووەکان لەوێدا دەستیان کرد (گریانێکی بەکوڵ لە دڵەوە ) و ( موسڵمانانی چین پەیوەندیان بەیەکەوە زۆر پتەو بوو ، پەیوەندی یەکی ئایینی ڕۆشن کە ئەم دیینە دروستی کرد بوو بۆیان ، ووتاردان بە زمانی

---

[1] ) بڕوانە : الانقلاب الاسلامی ، مصطفی طورن ، ص٣٧ .

[2] ) بڕوانە : جریدة ترجمان حقیقه رسالة من الصین ، ١٣٢٥/١٢/٢٦ ك .

عـەرەبی ، زمـانی ئـایینی موسـڵمانان و بەرزکدرنـەوەی ئـاڵای دەوڵـەتی عوسمـانی بەسـەر زانکۆکەوە ، بوونە هۆی ئەوەی کە بەتوندی کار لەو خەڵکە دڵ پاکە بکەن و بەو شێوەیە فرمێسکی چاویان برژێنێت [1] .

**شەشەم / هێڵی ئاسنینی حیجاز :**

(سوڵتان عبدالحمید) کاری بۆ ئەوە ئەکرد کە گەلانی ئیسلامی بە لای خۆیدا ڕابکێشێت لە ڕێگەی گرنگی دان بە دامەزراوە ئایینی و زانستی یەکان ، بەوەی پارەیەکی باشی بۆ خەرج ئەکردن و خەڵاتی پێ ئەدان و بڕێکی زۆر پارەی تەرخان ئەکرد بۆ چاککردنی مەککە و مەدینە و نەوژەنکردنەوەی مزگەوتەکان و ڕازاندنەویان ، (سوڵتان عبدالحمید) بە هەموو هۆکارێك ئەیویست دڵی موسڵمانی عەرەب بۆ لای خۆی ڕابکێشێت ، ئەوە بوولە عەرەبەکان تیپی پاسەوانی تایبەتی خۆی دانان و هەندێ لە و عەرەبانەی کە پشتیوانی بوو لە پلەی بەرز بەرزدا لە ناو حوکمەتدا دایمەزراندن وەك ( عیزەت پاشا العابد ) _ خەڵکی شام بوو _ کە ئەو پیاوە گەورەترین پشکی لە خزمەت سوڵتاندا بەرکەوت و کرایە ڕاوێژکاری سوڵتان بۆ کاروباری عـەرەبی ، و هـەر ئـەو بـوو ڕۆڵـی گـەورەی بینـی لـە ڕاکێشانی هێڵـی ئاسـنین لـە دیمەشقەوە بۆ ( مەدینەیمنەوەرە ) .

ئەم پڕۆژەیە (سوڵتان عبدالحمید) بەیەکێك لە هۆکارە گرنگەکانی ئەزانی کە ڕۆڵـی بینـی لەبەرزکردنەوەی کاروباری خیلافەت و بڵاوکردنەوەی بیرۆکەی ( جامیعەی ئیسلامی ) .

(سوڵتان عبدالحمید) گرنگی یەکی زۆری بە هێڵی ئاسنین ئەدا لە شوێنە جۆربەجۆرەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا و سێ ئامانجی هەبوو ئەیویست بەم هێڵە ئاسنینا دەستی بخات :-

١- بەستنەوەی هەموو پارچە دوورەکان بەیەکەوە ، کە ڕۆڵی گەورەی بینـی لە سەرکەوتنی بیرۆکـەی ( یـەکێتی عوسمـانی ) و ( جامیعـەی ئیـسلامی ) دا و تـوانرا کـۆنترۆڵی تـەواوی هەرێمەکان بکرێت کەپێویستە دەوڵەت بە دەستێکی بەهێزز ڕایانبگرێت .

٢- زۆر بکرێت لە هەرێمەکان تا هەموو لەناو دەوڵەتدا بتوێنەوە و ملکەچ بن بۆ ئەو یاسا سەربازیانەی کە بەرئەرکی ئەزانی هەموو بەشدار بن لە پارستنی خیلافەتدا بە پارەو بە پیاو.

---

[1] ) بڕوانە : سولطان عبدالحمیدالثاني ، ص٢٠٥ .

٣- ئاسانكردنی كاری بەرگری كردن لە دەوڵەت كاتێك لە هەر قوڵێكەوە هێرش بكرێتە سەری ، چونكە ئەم هێڵە ئاسنینانە ڕۆڵی زۆری بینی لە دابەشكردنی هێزەكانی عوسمانی و گەیاندنیان بە بەرەكانی شەڕ بەشێوەیەكی زۆر خێرا [1] .

هێڵە ئاسنینەكانی حیجاز لە گرنگترین ئەو هێڵە ئاسنینانەیە كە لەسەردەمی (سوڵتان عبدالحمید) دا دامەزراوە ، لە ساڵی ( ١٩٠٠ ) زدا دەست كرا بە دامەزراندنی هێڵی ئاسینینی دیمەشق بۆ مەدینە .

ئەمە بۆ ئەوە بوو كە قەرەبووی ئەو هەمووە كاتە بكاتەوە كە كاروانەكانی حاجیان ئەچوو ، كاروانەكان بە ( چل ) ڕۆژ ئەو ڕێگەیان ئەبڕی ، ئەگەر لە دەریاشەوە بڕۆشتنایە نزیكەیی دوانزە ڕۆژیان پێ ئەچوو لە كەنارەكانی شامەوە تاناو حیجاز ، كەچی بەم ڕێگە ئاسنینە تەنیا چوار ڕۆژ یان ئەگەر زۆریان پێ بچوایە پێنج ڕۆژیان پێ دەچوو ، ئامانج لە دروست كردنی ئەم هێڵە ئاسنینانە تەنیا خزمەتی حاجیانی ماڵی خوا نە بوو كە بە ئاسانی بگەیەنرێنە مەككە و مەدینە ، بەڵكوو (سوڵتان عبدالحمید) لە پشت ئەمەشەوە هەندێ ئامانجی سیاسی و سەربازی تریشی هە بوو، لە ڕووە سیاسی یەكەیەوە ئەم پڕۆژەیە وورە و وزەیەكی ئایینی زۆری جوڵاند لەناوچەكانی جیهانی ئیسلامیدا ، ئەوە بوو (سوڵتان) بەیانێكی بەناو هەموو موسڵمانی سەرزەویدا بڵاوكردەوە و داوای ئەوەی لێ كردن كە بەبەخشین بەشداری بكەن بۆ دامەزراندنیئەم هێڵە ئاسنینانە [2] ، (سوڵتان عبدالحمید) لە گیرفانی تایبەتی خۆی بڕی ( پەنجا هەزار لیرەی عوسمانی ) بەخشی بە پڕۆژەكە و لیستی بەخشینەكانی بە خۆی كردەوە و بڕیاریش درا لە سندوقی ( منافع ) سەد هەزار (لیرەی )ئاڵتونینی عوسمانی بدرێت بە پڕۆژەكە و چەند كۆمەڵێكی خێرخوازی بۆ ئەم مەبەستە دروست كرا و موسڵمانان كەوتنە پێشبڕكێ لە هەموو لایەكەوە بۆ كۆمەكی كردن بە نەفس و بەماڵ تا پڕۆژەكە سەربكەوێت [3] .

---

1 ) بڕوانە : صحوة الرجل المريض ، د. موفق بني المرجة ، ص١١٣ .

2 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١١٣ .

3 ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص٢٢٢ .

گەورە پیاوانی دەوڵەتیش هەریەکەی لەلای خۆیەوە کەوتنە ماڵ بەخشین بۆ پرۆژەکە ، وەك (صەدری ئەعظە م) و وەزیری جەنگی ( حسین پاشا ) و وەزیری بازرگانی و ئەشغاڵ ( زهنی پاشا ) و(عزت پاشا)کە سەرۆکی لیژنەی پرۆژەکان بوو.

فەرمانبەرەکانی کۆمپانیاکان زەمیان بەسەر یەکتردا ئەکرد لەم بەخشینانەدا ، بۆ نمونە فەرمانبەرەکانی کۆمپانیای کەشتی یە هەڵمی یەکانی عوسمانی ، فەرمانبەرانی دەوڵەت بەگشتی و هەرێمەکان بەتایبەتی هەرێمی بەیروت و دیمەشق و بۆرصە و شوێنانی تریش .

کۆشکی فەرمانڕەواش لە میصر بەشداریان کرد لەم هەڵمەتی بەخشینەدا ، و لیژنەیەك بۆ بانگەشە کردن بۆ پرۆژەکە و پیتاك کۆکردنەوە بۆی بەسەرۆکایەتی ( احمد پاشا المنشاوی ) دروست کرا ، هەروەها ڕۆژنامەکانی میصر ڕۆڵی چاکیان بینی و بەحەماسەتەوە بەشداریان کرد لە هەڵمەتی پیتاك کۆکردنەوە بۆ هێڵی ئاسنینی حیجاز بۆ نمونە ڕۆژنامەی ( المؤید ) ، ڕۆژنامەی ( اللواء ) ی میصریش بڕی سێ هەزار لیرەی عوسمانی تا ساڵی ( ١٩٠٤ ) ز کۆکردەوە بۆ ئەم پرۆژەیە ، سەرۆکی ئەم ڕۆژنامەیە ( مصطفی کامل پاشا ) بوو ، هەروەها ( علی کامل ) یش بڕی ( ٢٠٠٠ ) لیرەی عوسمانی بۆ ئەم پرۆژەیە کۆکردەوە تا ساڵی ١٩٠١ زاینی .

ڕۆژنامەی ( المنار ) و ڕۆژنامەی ( الرائد المصری ) یش پێکەوە بۆ بەشداری کردن لەم هەڵمەتەدا پێکەوە ( لیژنەیەکی بەخشین ) یان دروست کرد بۆ قاهرەو ئەسکەندەریە و شاری تریش لە میصردا .

موسڵمانەکانی هیندستان لە هەموموسڵمانی تری دنیا زیاتر دڵ گەرمی و حەماسەتیان بۆ ئەم پرۆژەیە دەربڕی ، میر حیدر اباد لە هیندستان دروست کردنی وێستگەکەی مەدینەی منەوەرەی لە ناو پرۆژەکەدا خستە سەر شانی خۆی ، شای ئێرانیش بڕی پەنجا هەزار لیرەی عوسمانی بەخشی بە پرۆژەکە .

لەگەڵ ئەوەی ئەم پرۆژەیە پێویستی بە هەندێ تەکنیککاری بیانی هەبوو بۆ دروست کردنی پردو تونێل ، کەچی ( موسڵمانان کەسیان بەکار نەهێنا لە کاتی زۆر پێویستدا نەبوایە ، پێویستە ئەوە بزانرێ بە هیچ جۆرێك هیچ بیانی یەك بەشداری پێنەکرا لەم پرۆژەیەدا هەر لە خاڵی دەست پێکردنی یەوە لە وێستگەی ( الاخضر ) ەوە _ کە ئەکەوێتە " ٧٦٠ " کیلۆ مەتر خوار دیمەشقەوە _ تا خاڵی کۆتایی پرۆژەکە ، هۆکەشی ئەوە بوو کە

لیژنەی ( سەرپەرشتیاری ) پرۆژەکە ئیشی نەکەوتە بیانی یەکان و لەبری ئەوان تەکنیککارە میصری یەکانی بەکار ئەهێنا .

ژمارەی کرێکارەکان جگە لە شارەزایان لەم پرۆژەیەدا سالی ( ١٩٠٧ ) ز گەیشتە حەوت هەزار وپێنج سەد کرێکار ، خەرجی گشتی پرۆژەکەش گەیشتە ( ٤,٢٨٣,٠٠٠ ) چوار ملیۆن و دووسەدوو هەشتاو سێ هەزار لیرەی عوسمانی ، دامەزراندنی ئەم پرۆژەیە بەخەرجی یەکی کەم ترو کاتێکی کەم تر دامەزرا لەوەی کە بدرایەتە کۆمپانیایەکی بیانی کە لە خاکی دەولەتی عوسمانیدا کاریان دەکرد [1] .

لە ( اغسطس ) ی سالی ١٩٠٨ زدا هێلی ئاسنین گەیشتە " مەدینەی منەوەرە " و وابریار بوو کە درێژبکرێتەوە و بگاتە مەککەش بەلام ئەوە بوو کارەکە راگیرا و هۆکەشی ئەوە بوو شەریفی مەککە ( کە حسین ی کوری عەلی بوو _ ترسی لەناوچوونی دەسەلاتی بەسەر حیجاز دا لێ نیشت و لەبەر زات و زۆری دەولەتی عوسمانی کەوتە دروست کردنی رێگر لەبەردەم درێژبوونەوەی پرۆژەکە تا مەککە (کە مەلبەندی میرنشین و هێزی ئەو بوو) ، هێلەکە تا مەدینە درێژبوویەوە و کە شەری گەورەی یەکەمی جیهانی روویدا ، ئینگلیز کاری کرد بۆ دروستکردنی هاوپەیمانی یەك لەگەل هێزە عەرەبەکاندا کە دایانە پال ئەوان و (فیصل ی کوری حسین ی کوری علی) سەرکردایەتی ئەکردن و لەگەل ئینگلیزدا پێکەوە ئەم هێلی ئاسنینی حیجازەیان وێران و کاول کرد و تائێستاش هەر ماوەتەوە بە پەککەوتووی و ئومێد ئەکرێ کە هەول بدرێ نەوژەن بکرێتەوە تا جارێکی تر بکەوێتەوە کارو کاروانی حاجیانی مالی خوا خزمەت بکات [2].

بالوێزی بەریتانیا لە( قسطنطینیە) لە راپۆرتی سالانەیدا بۆ سالی ( ١٩٠٧ ) ز باسی گرنگی ئەم هێلە ئاسنینەی حیجاز ئەکات و ئەلێ : (٠ یەکێك لە رووداوە گرنگەکانی ناو ئەم " دە " سالەی کۆتایی چەند هەلویستێکی سیاسی گشتی دیار هەیە ، گرنگترینیان ئەو نەخشە زیرەکانەی سولتانە کە توانی لەبەردەم سێ سەد ملیۆن موسلماندا بەبەرگی خەلیفەوە خۆی دەربخات وەك تاکە سەرۆکی هەموو موسلمانان ، توانی بەو نەخشەیە بەلگە بداتە دەستی خەلکی کە چەند هەست و غیرەتی ئایینی زیندووە تێیدا ، نەخشەکە ئەوە بوو

---

[1] ) بروانە : سولتان عبدالحمید الثاني ، ص٢٢٤ .

[2] ) بروانە : صحوة الرجل المریض ، ص١١٤ .

هێڵی ئاسنینی حیجازی دامەزراند کە لەم نزیکانەدا ڕێگا ئاسان ئەکات بۆ ئەوەی هەموو موسڵمانێك بەفەریزەی حەجی ماڵی خوا هەڵبستێت و ڕوو لە شوێنە پیرۆزەکانی مەککە و مەدینە بنێت ) .. جێگەی سەرسوڕمان نی یە کە ئینگلیز بەو شێوەیە قەڵسبێت لەم هێڵە ئاسنینە و هەوڵی دروستکردنی قەیران بدات بۆ ئەوەی ڕێگە لە درێژبوونەوە بگرێت ، و لەیەکەمین هەلێکدا کە بۆی هەڵکەوت هێڵەکەی پەك خستوو وێرانی کرد تا ڕێگەی هاتووچۆکردن لە هۆزەکانی عوسمانی بگرێت .

یەکەمین شەمەندەفەرێك کە لە دیمەشقی و وڵاتی شامەوە گەیشتە وێستگەی مەدینەی منەوەرە لەم هێڵە ئاسنینانەوە ڕۆژی ٢٢/ ێب / ( اغسطس ) / ١٩٠٧ زاینی بوو ، ئەمە وەك بەدیهاتنی خەونێك بوو لە خەونەکانی سەدان ملیۆن موسڵمان لە هەموو شوێنێکی دنیادا ، ئەم شەمەندەفەرە لەم کاروانەیدا تەنیا سێ ڕۆژی برد و تێدا ( ٨١٤ ) کم ی بڕی کە ناڕەحەتی زیاتر لە پێنج هەفتە زەحمەتی ئەو ڕێگەیەی لە کۆڵ خەڵکی کردەوە کە پێشتر پێویستیان بوو بۆ ئەوسەفەرە ، هەروەك لەو ڕۆژە مێژووی یەدا دڵی هەموو ئەوانەی کەعاشقی فەریزەی حەجی ماڵی پیرۆزی خوا بوون دەستی کردە جووڵە جووڵ [1] .

سیاسەتەکانی (سوڵتان عبدالحمید) سیاسەتێکی ئیسلامیانەی پەتی بوو ، ئەیویست دڵی هەموو موسڵمانان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە بەو سیفەتەی کە خەلیفەی موسڵمانانە ، جا دامەزراندنی ئەم هێڵی ئاسنینەی نێوان شام وحیجاز یەکێك بووو لەو هۆکارە جوانانەی کە ئەم ئامانجە بەرزەی پێ ئەهێنرایە دی [2] .

( کرۆمەر) کاربەدەستی بەریتانی لە میصردا ( ١٣٠١_١٣٢٥ك / ١٨٨٣ _ ١٩٠٧ ز ) لەو کەسانە بوو کە لە سەرەتای هەموانەوە ئەورووپای هاندا لەجامیعەی ئیسلامی ، زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لە ڕاپۆرتی ساڵانەیدا زۆر بە ڕقەوە باس لە جامیعەی ئیسلامی بکات ، لە هەمان کاتدا ڕۆژنامەی ( الاهرام ) ی میصری لێدوانێکی ووروژێنەری ( هانو تو)ی بڵاوکردەوە کە وەزیرێکی فەرەنسی بوو ، تێیدا هێرشێکی زۆر ئەکاتە سەر جامیعەی ئیسلامی ، دیارە هێرش کردنە سەر جامیعەی ئیسلامی بەدوایدا ئەوە دێت هێرش بکرێتە سەردەوڵەتی عوسمانیش بۆئەوەی ئەویەکێتی یەی دەوڵەتە ئیسلامیە کان پێکەوە گرێ

---

1 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١١٤ .

2 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١١٤ .

ئـەدان ببـچڕێت و نـەمێنیٚ کـە لـەڕووی دەسـەلاٚتی ئیمپریـالیزمی داگیرکـەردا وەسـتاوە، ئەوئیمپریالزمـەی نەخـشەی ئـەوەی کێشاوە هەموونـەم ولاٚتانـە هـەلٚ لوشـیٚ و بەربەسـتێك دروست بکات و نەهێلٚێت جارێکی تر یـەك بگرنـەوە لـەژێر هـەر ناونیشانێکدا بێت ، تا ئـەوە دەستە بەربکات بۆ خۆی کەدەسەلاٚتی بەردەوام بێت لەسەریان [1] ، بـۆ ئەمـەش چـەند کرێکـی سەرەکی یان گرتەبەر :

١- قولٚکردنـەوەی بانگـەوازە هـەرێمی یـەکان و تایبـەت بـە نیـشتمان و خـاك و ئوممـەت و ڕەگەزەکانەوە .

٢- دروست کردنی کەش و هەوایەکی فیکری گشتی ی وا کە شەڕ لەگەلٚ یـەکێتی ئیسلامی دا بکات و لەناوی بەرێت .

هەموو ئەمانەش سەرەتا بوون بۆ هەلٚوەشاندنەوەی خیلافەتی عوسمانی بۆ هەتاهەتایە بەهاوکاری زایونیزمی جیهانی [2] .

لەگەلٚ جولەکەکانی ( دۆنمە ) و کلکەکانیان وەك ( کۆمـەلٚی تورکیـای فـەتات ) و ( کۆمەلٚـەی ئیتحـاد و تـەرەقی ) ، ...سیاسـەتی دلٚ ڕاگـرتن و خۆخۆشەویـست کردنیـان گرتـە بـەر [3] ( سولٚتان عبدالحمیدی دووەم) سیاسەتی نزیکبوونەوە لە کەسایەتی یە قسەڕۆشتووەکانی ناو خەلٚکی پیادە ئەکرد لە هەموو شوێنەکاندا ، ئەوە بوو لە لایەکەوە ڕێزێکـی زۆری بۆ خـەلٚکی زانا دەرئـەبڕی و بـاوی ئـەدان بەسـەر خەلٚکدا و هـەر بـۆ ئەمـەش ئەنجومـەنی زانایـان (مجلس المشائخ ) ی دروست کردو موچەی بۆ هەموو ئەندامانی دیاری کرد، و لەگەلٚ ڕێبەرەکانیاندا زۆر دلٚ پاك بوو ، خـەلٚکی زانـا پلـەی زۆر بـەرزیان هـە بـوو لـەلای ئـەو ، زۆر سـۆزی ئـەدا بـەو کەسایەتی یە گرنگانەی کە خەلٚکیان تیار ئەکرد بۆ بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی و لەگەلٚیدا ئەوەستان ، وەك ( مستەفا کمال پاشا ) لە میصر ، چاوپۆشی لەهەلٚەی ئەو پیاوە گەورانەش ئـەکرد کاتێـك ئـەیزانی نیازیـان پاکـە لەگەلٚیـدا و بیروایـان بـە جامیعـەی ئیـسلامی هەیـە و پشتیوانی لەو بیرۆکەیە دەکەن ، بۆ نمونە وەك ( نامق کمال ) .

---

[1] ) بڕوانە : حاضر العالم الاسلامی ، د. جمیل المصری ( ١/ ١٠١ ) .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو (١ / ١٠١ ) .

له قوتابییانی ( قوتابخانەی خێڵە عەرەبەكان ) ئەوانەیانی لیٚ هەڵئەبژاردن كە لە بنەماڵە ڕەسەن و پیشەدارەكان بوون و خاوەنی دەسەلاّت و هێزو حورمەتی جوان بوون لە كوڕانی سەرۆك خێڵە عەرەبەكان، ئەم قوتابخانەیە تا ئەهات گەورەتر ئەبوو ، ئەوە بوو ڕۆڵەكانی كورد و ئەلبانەكانیشی گرتە خۆی ، سوڵتان زۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی كە پەیوەندی بەردەوامی هەبێت بە سەرۆك و شێخ و میرەكانی خێڵە عەرەبەكانەوە لە ڕێگەی ئەو پەیام و نوێنەرانەی بەردەوام ئەیناردن بۆ بەهێزكردنی پەیوەندی خۆشەویستی وبرایەتی ئیسلامی نێوانیان ، سوڵتان ئاگاداری تەواوی ئەوەش بوو كە ئینگلیز پەیوەندی هەیە بە هەندیٚ سەرۆك خێڵەوە وەك ( شریفی مەككە ) و ( شێخ حمیدالدین ) لەیەمەن و ( شێخ عسیر ) و هەندیٚ شێخی تر تا هانیان بدات لە دەوڵەتی عوسمانی و فێری یاخی بوونیان بكات لە گوێڕایەڵی خەلیفە و جیابوونەوە لە دەوڵەتی عوسمانی .

( سوڵتان عبدالحمیدی دووهەم ) كاری ئەكرد بۆ ئەوەی نەخشە وپیلانە گلاّوەكانی ئینگلیز هەڵبوەشێنێتەوە ، هەرگیز كەمتەرخەمی نەئەكرد لە دەست بەسەركردنی كەسانێكدا كە گومان لە وەلائیدا ببوایە بۆ دەوڵەتی عوسمان ، هەر زوو ئەینارد بە شوێنیدا و لەژێر چاودێری دەولەتدا دایئەنا لە ئەستەنبولٚ پلەی ڕەمزی و موچەی باشی پیٚ ئەدا ، ئەمەش بۆ ئەوەی دەوڵەت بیٚ ترس بێت لە پیلانەكانیان ، وەك چۆن لەگەڵ شریفی مەككەدا ئەمەی كردوو كردیە ئەندامی ئەنجومەنی شورای دەوڵەت لە ئەستەنبوڵدا بۆ ئەوەی ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ مەككە لیٚ بگرێت ، (سوڵتان عبدالحمید) ڕای خۆی لە شریف حسین دەربڕی لەو لێدوانەدا كە لەگەڵ صەدری ئەعظە م ( فرید پاشا ) دا ڕوویدا ، (سوڵتان عبدالحمید) ووتی : (( شریف حسین ئێمەی خۆش ناوێت ، ئێستا هێمنە و كڕ لیٚ ی دانیشتووە ، بەلاّم مەگەر هەرخوا بزانیٚ سبەینیٚ ئەم شریفە چی دەكات ) ، ئەوە بووو كە شۆڕشی عەرەب بەسەرۆكایەتی( شریف حسین) كەوتە دوای ئەوەی ( ئیتحادیەكان ) (سوڵتان عبدالحمید)یان لەسەر كار لادا .

كە حیزبی ( ئیتحاد تەرەقی ) ماسۆنی دەسەلاتی گرتە دەست ، (شریف حسین ) یان گەڕاندەوە بۆ مەككە و ئەویش توانی لەگەڵ ئینگلیزدا هاوپەیمانی ببەستێت و ئەو درزە گەورەیە بكاتە نێوان موسڵمانانی عەرەب وتوركەكان [1].

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ، ٢٢٧ .

**حەوتەم / ( (سوڵتان عبدالحمید) ) نەخشەی دوژمنان هەڵدەوەشێنێتەوە :**

بەریتانیا لە چارەکی سەدەی نۆزدەهەمدا کەوتە هەڵنانی کوردەکان بۆ دژایەتی کردنی دەوڵەتی عوسمانی بە ئامانجی ئەوەی دوژمنایەتی (عوسمانی_ کوردی) دروست بکات لەلایەك و کوردەکانیش لە دەوڵەتی عوسمانی ببچڕێنێت و دەوڵەتیان بۆ دروست بکات و لە لەشی دەوڵەتی عوسمانی یان بکاتەوە لەلایەکی ترەوە .

کە کۆمپانیای هیندی بەریتانی دامەزرا گرنگی دانی بەریتانیا بە عێراق زیادی کردو دەستی دایە ئیش کردن بۆ دروست کردنی بزوتنەوەیەکی ناسیۆنالیزمی لەناو کوردەکاندا و نوێنەرە بەریتانی یەکان دەستیان کردە گەشتکردن بەناو خێڵە کوردی یەکانی عێراقدا بۆئەوەی خێڵە کوردەکان ڕێکبخەن و بیاندەن بە گژ دەوڵەتی عوسمانیدا دەزگای هەواڵگری دەوڵەتی عوسمانی ئەوپەڕی ووردەکاریەوە چاودێری ڕووداوەکانی ئەکرد ، و (سوڵتان عبدالحمید) بۆ بەرنگاربوونەوەی ئەم نەخشە ئینگلیزی یە ، ئەم دژە نەخشەیەی دانا :

* دەوڵەتی عوسمانی هەستا بە پاراستنی هاولاتی یە کوردەکان لە هێرش وپەلاماردانە خوێناوی یەکانی ئەرمەن کە ئەیانکردە سەر کوردەکان .

* چەند شاندێکی لە زانایانی موسڵمان ناردە ناو کوردەکان بۆ ئەوەی ئامۆژگاری خەڵك بکەن و خەڵك ئاگادار بکەنەوە و بانگیان بکەن بۆ ئەوەی لە ژێر بانگەوازی جامیعەی ئیسلامیدا هەموو کۆبنەوە ، ئەم شاندانەش ڕۆڵی خۆیان بینی لە ئاگادار کردنەوەی کوردەکان لەو چاوچنۆکی یەکەی ڕۆژئاوا هەیبوو .

* (سوڵتان عبدالحمید) هەندێ ڕێوشوێنی گرتەبەر بۆ ئەوەی پەیوەندی میرە کوردەکان بە خۆی و بەدەوڵەتەوە دەستەبەر بکات .

* چەند یەکەیەکی سەربازی حەمیدی لە ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵدا لە کوردەکان دروست کرد بۆ ئەوەی ڕێگە لە پەلامارەکانی ئەرمەن بگرن .

* هەڵوێستی دەوڵەت زۆر توند بوو دژ بە چاوبڕینەکانی ئەرمەن سەربارەت بەدامەزراندنی دەوڵەتێك لەسەرحسابی زەویەکانی و دەوڵەتی عوسمانی ، ئەمە وای کرد کە کوردەکانی ئەو ناوچانە هەست بە بێ ترسی یەك بکەن [1] .

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ، ص١٣١_١٣٢ .

* دەوڵەت کاری زۆری لەسەر ئەوە ئەکرد کە پەردە لەسەر ئەو نەخشانەی ئینگلیز لابدات کە ئامانجی ئەوە بوو دەوڵەتی عوسمانی لەت و پەت بکات ، بەلأم لەژێر پەردەی ئازادی میللەتان بەوەی هەر میللەتێك ئەبێت دەوڵەتێك تایبەت بە خۆی دروست بکات .
(سوڵتان عبدالحمید) توانی دەسەلأتی بەریتانیا بەرتەسك بکاتەوە لە ( یەمەن ) دا و سەرکەوتنی بەرچاویشی لەو ناوچەیەدا بەدەست بهێنێت لەم زۆرانبازی یەدا ، ئەوە بوو" لەیەمەندا " تیپێکی سەربازی دروست کرد کە پێك هاتبوو لە هەشت هەزار سەرباز بۆ ئەوەی جارێکی تر ( یەمەن ) بگێڕێتەوە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی عوسمانی ، گرنگی دان بەیەمەن ئەوەندە زۆر بوو کام سەرکردە زۆر ناودار بوو ناردی بۆ ئەوەی سەرکردایەتی ئەو تیپە بکات وەك ( احمد مختار پاشا ) و ( محمد فوزی پاشا ) و ( حسین حلمی پاشا ) و ( توفیق پاشا ) و ( موشیر عثمان پاشا ) و( ئیسماعیل حقی پاشا) ، ئینگلیز هەوڵی دا کە ئاگری یاخیبوون لەیەمەن دا بگرسێنێت دژ بە دەوڵەتی عوسمانی بەلأم ئەو سیاسەتە حەکیمانەی کە (سوڵتان عبدالحمید) گرتبوویە بەر سەرکەوتنی لەیەمەندا بۆ دەستەبەر کرد)[1].
عەقڵیەتی عوسمانی هەوڵی بۆ ئەوە ئەدا کە هێڵی ئاسنینی لە حیجازەوە بۆ یەمەن بەرێت و بەڵگەنامە و دیکۆمێنتی عوسمانی یەکانیش ئاماژە بەوە ئەدەن کە نەخشە و لێکۆڵینەوەیەکی وورد بۆ جێ بەجێکردنی پڕۆژەیەکی وەها گەورە هە بووە .

**هەشتەم / چاوبرسێتی یەکانی ئیتاڵیا لە لیبیادا :**

ئیتاڵیا خەونی بەوەوە ئەبینی کە باکوری ئەفریقا بداتە دەم وولأتەکەی چونکە بەکەلە پورو میراتی ئیتاڵیای ئەزانی ، " ماترینی " سەرۆك وەزیرانی ئەو کاتەیان بەبێ پەردە ئەمەی باس کردبوو [2] ، بەلأم ئەوە بوو کە فەرەنسا تونسی داگیرکردوو ئینتگلتەراش میصری داگیرکردو هیچ بۆ ئیتاڵیا نەمایەوە جگە لە لیبیا .
ئیتاڵیا سیاسەتی خۆی بە سێ قۆناغ دیاری کردبۆ داگیرکردنی لیبیا :

---

[1]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٢٤ .
[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٣٨ .

یەکەم / چارەسەری ئاشتیانە ، بەوەی قوتابخانە و بانك و دەمەزراوەی خزمەتگوزاری تری دامەزراند .
دووەم / لە ڕێگەی دیبلۆماسی یەوە کاری بۆ ئەوە ئەکرد کە دەوڵەتانی تر دان بنێن بە ئاواتەکانی ( مافەکانی ) ئیتاڵیادا بۆ داگیرکردنی لیبیا .
سێ یەم / ڕاگەیاندنی شەڕ دژبە دەوڵەتی عوسمانی وداگیرکردنی لیبیا بە عەمەلی .
سیاسەتی ئیتاڵیا نەی ئەهێلا کەس بە جوڵەکانی بزانێ ، بە پێچەوانەی سیاسەتی بەریتانیا و فەرەنساوە لەو ڕۆژانەدا ، ئیتاڵیەکان زۆر (( دانایانە )) و (( هێمنانە )) ئەجولاّن و نەیان ئەهێلا عوسمانی یەکان بوروژێن .
(سوڵتان عبدالحمید) ئاگای لەو چاوتێبڕینەی ئیتاڵیا بوو ، بۆیە داوای لە چەند سەرچاوەیەکی جیا جیا کرد کە زانیاری بدەنێ دەربارەی چالاکی و ئامانجەکانی ئیتاڵیەکان لە لیبیادا ، زانیاری یەکانی پێ گەیشت کە ئەڵێ : (( مەبەستی ئیتاڵیا بەم قوتابخانە و بانك و دامەزراوە خێر خوازی یانەی لە هەرێمە عوسمانیەکاندا ئەیانکاتەوە چ لە لیبیاو چ لە ئەلبانیادا ، ئەوەیە لەکۆتایدا دەست بگرێت بەسەر :
١- طرابلسی ڕۆژئاواو .
٢- ئەلبانیاو .
٣- ناوچەکانی ئەنادۆڵ کە ئەکەونە سەردەریای ناوەڕاست :وەك ئەزمیر و ئەسکەندەرۆن و ئەنطاکیا ) .
( سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) هەستا بەدانی ڕیو شوێنی پێویست بۆ ڕێگە گرتن لە ئەم چاوچنۆکی یانەی ئیتاڵیا ، کە هەستی کرد دوور نی یە ئیتاڵیا هێرشێکی سەربازی بکاتە سەر لیبیا ، خێرا بۆ بەهێزکردنی هێزەکانی عوسمانی لەوێ ( پازدە هەزار ) سەربازی تری ناردو بەردەوام چاوی لە شوێن جوڵەی ئیتاڵیا بوو لە لیبیادا ، و لە ڕێگەی باڵوێزی دەوڵەتی عوسمانیەوە لە ( ڕۆما ) و لە ڕێگەی والی ( طرابلس ) ەوە خودی خۆی بە ووردی چاودێری هەموو کاروبارەکانی لیبیای ئەکرد ، ئەمە وای کرد کە ئیتاڵییەکان ناچار ببن داگیرکردنی لیبیا دوا بخەن و لەسەردەمی کۆمەڵەی ( ئیتیحادو تەرەقی ) دا ئەو کارە بکەن [1] ، ئێمە بە درێژی و بەویستی خوا لە کتێبی حەوتەممان‌دا باسی ئەوە ئەکەین کە کتێبەکە باس لە

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص١٣٩ .

بزوتنـەوەی سەنوسـینەکان و کاریگـەریان ئـەکات لەسـەر ئـەفریقا لـە ڕووی بانگـەوازی و جیهادی یەوە ...

بیرۆکەی (( جامیعەی ئیسلامی )) زایەڵەیـەکی دووری هـە بـوو لـەناو جیهانی ئیسلامیدا ئەویش لەبەر زۆر هۆ لەوانە : _

١- دەوڵەتە ئەوروپای یەکان لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا کێ بـەرکێ یـەکی زۆریان لـە داگیرکردنـی ڕۆژهەڵاتـدا کەوتبوویـە نێـوان ، و سـتەمێکی زۆریـان خـستە سـەر گـەلانی ئیـسلامی ، فەڕەنـسا تونـسی لـە ١٨٨١ زدا داگیرکـرد ، ئینگلتـەرا میـصری لـە ١٨٨٢ زدا داگیرکـرد ، فەڕەنـسا دەسـتی وەردایـە کاروبـاری مـراکش و گەیاندیـە ئـەوەی کـە لـە سـاڵی ١٩١٢زدا بـەڕەسمی ڕاگەیانـد کـە مـراکش لـە ژێـر ( پاراستنی ) ئەودایـە و لەگـەڵ ئیسپانیادا زەوی یـەکانیان ( بـرا ) بـەش کـرد ، بـەو شـێوەیەش ئیمپریـالیزمی ئـەوروپی لـە وولاتـی ئەفریقای ئیسلامیدا دەستی کێشایە ناو سودان و نێجریاو زنجبار و شوێنەکانی تریش ..

٢- هۆکارەکـانی گواستنەوە و پەیوەنـدی کـردن لـە نێـوان دونیـای ئیـسلامیدا گەشـەی کـردو بزاڤی ڕۆژنامەگـەری لـە میـصر و تورکیـا و جـەزائیر و هینـدسـتان و فـارس و ناوەڕاسـتەکانی ئاسـیا و جـاوە ( ئەندەنوسـیا ) دا بڵاوبوویـەوە ، ڕۆژنامـەکان بابـەتی ئیمنپریـالیزم و چاوچنۆکی دەوڵـەتـە ئـەوروپای یـەکان بـۆ دونیـای ئیـسلام ئەدایـە بـەرباس و لێکۆڵینـەوە و هەواڵـە چـەند بارەبووەکـانی ئـەو پەلامارانـەیان بڵاوئـەکردەوە کـە هـەرجارەی لـە شـوێنێکەوە ئەکرایە سەر خاکی ئیسلامی ، دڵەکان بەو هەواڵانە ڕائەچڵەکان و دەروونەکان تاویان ئەگرت و هەست و سۆزی موسڵمانان یەکی ئەگرتەوە لەگەڵ ئەو برا موسڵمانانەی کە ئەکەوتنە ژێر داگیرکاری .

٣- هـەوڵ و تەقـەلای زانایـان و قسەکردنیان لەسـەر ئـەرکی زیندووکردنـەوەی شانوشکۆی ئیسلام ( گاڵتە ی پێ نە ئەکرا ) ، بانگەواز بۆ یەکرپزی لە هەموو پارچە زەوی یەکی جیهانی ئیسلامیدا تەشەنەی کرد بوو ، ئەو هەستە دروست بوو لـەناو خەڵکیدا کـە زوڵـم و سـتەمی ڕۆژئاوا ناوەستێت و بەردەوامە بۆ سەر گەلانی ئیسلامی کە ئەوەش مایەی ئەوەیە پەیوەندی یەکان زیاتر و پتـەوتر بکرێن وکـاتی ئـەوە هـاتووە کـە گـەلانی ئیـسلامی هـەموو لـەناو یەکدا بتوێنەوە و هەموو بچنە ژێر ئالای خیلافەتی عوسمانی یـەوە ..وە هـەروەها، هۆکـاری تـریش

هـەر هـە بـوو[1] (سـوڵتان عبدالحميـد) لـە زيندوكردنـە وەی هەسـتی موسـڵمانانـدا سـەبارەت بـەگرنگی هەوڵـدان بـۆ يـەكبوون و يـەكريزی ئوممـەتی ئيـسلامی لـەژێر ئـالأی خيلافـەتی عوسمانيـدا ، سـەركەوتوو بـوو ، بـەم سـەركەوتنەش تـوانی دوو ئامـانجی گـەورە بەدەسـت بهێنێت : _

يەكـەم / قايم كردنـی دەوڵـەتی خيلافـەت لـەناوەوە دژ بە هـەموو هەڵمەتـە ناسۆناليزمی يـە يەهوديە ماسۆنيە ڕۆژئاواييە ئيمپرياليزمی يە نەصڕانی يەكان .

دووەم / لە دەرەوەش توانی هەموو ئەو موسڵمانانەی كە لە ژێر دەسەلأتی دەوڵەتـە ئەوروپای يـەكانی وەك ڕوسـيا و بـەريتانيا وفەڕەنـسادا ئـەژين ، هـەموو لـەدەوری ئـالأی خيلافـەت كۆببنـەوە ، بەمـەش سـوڵتان تـوانی لـە ڕووی ئـەو دەوڵەتانـەدا بوەسـتێت و و هەڕەشـە لـەو وولأتانە بكات بەوەی ئەو موسڵمانانە بوروژێنیٚ و بانگی جيهاد لەهەموو جيهانی ئيسلاميدا دژ بەو دەوڵەتانە ڕابگەيەنێت[2] .

## باسی سێیەم

### ( سوڵتان عبدالحميد ) و جولەكە

ڕاسـتی ململانـیٚ ی نێـوان( سـوڵتان عبدالحميـدی دووەم )و جولەكـە لـە گـرنگترين ئـەو ڕووداوانەيە كە لەمێژووی ئەم سوڵتانە موسڵمانە بە عيزەتەدا هە بووە .

كاری جولەكە و دوژمنايەتی كردنيان بۆ ئيسلام ڕەگ و ڕيشەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی دەركەوتنی ئيسلام ، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوكاتـەی ئيسلام تێيـدا سەركەوتوو، پێغەمبـەر ( ﷺ ) لە مەدينەی منەوەرە دەری كردن لە پاداشتی ئەو دوژمنايـەتی يە هەميشەيی و ئـەو هـەمووە ناپـاكی يـەی چـەند بارەيـان ئـەكردەوە ، پـاش ئـەوە لـە هـەموو دوورگـەی عەرەبيـدا دەركـران لەسەر دەستی خەليفە عومەری كوڕی خەتتابدا ( رضی الله عنه ) كە بەردەوام پلانيـان ئـەگێڕا لیٚ ی ، هەندیٚ لەم جولەكانـە بەڕووكـەش موسـڵمان ئـە بوون و دوای ئـەوە دەسـتيان ئـەكردە ژەهر ڕشتن بەناو لەشی ئوممەتی ئيسلاميدا و ئەمەش لە مێژووی درێژيانـدا هەر هە بووە ، ( عبدالله ی كـوڕی سـبأ ) و ( قەرمـەتی يـەكان ) و ( حەشـاشـی يـەكان ) و ( ڕەوانـدی يـەكان ) و

---

[1] ) بڕوانە : صحوة الرجل المريض ، ص١١٢

٢) بڕوانە : صحوة الرجل المريض ، ص ١١٣ .

بانگەوازە ڕووخێنەرەكان كە لە مێژووی موسڵماناندا دەركەوتوون لە ( دەستی ئەوان ) دوور نە بوون .

تەتارەكانی وولاتی قەڕەم ئافرەتێكی جولەكەی ڕوسییان بە دیاری نارد بۆ (سوڵتان سولەیمانی قانونی) لەسە دە ی پازدەهەمی زاینیدا ، ئافرەتەكەیان لە یەكێك لە شەڕەكاندا گرتبوو ، (سوڵتان سولەیمانی قانونی)ش ئافرەتەكەی مارەكردوو كچێكی لیێ بوو ، كە كچە گەورە بوو دایكە جولەكەكەی هەوڵی دا مارەی بكات لە ( ڕۆستەم پاشا ) كە كابرایەكی ( بیێ باوك و دایك = لقیط ) ی (كورواتی) بوو ، جا بۆ ئەوەش ناپاكی یەكەی تەواو خەست بكاتەوە ئەم ئافرەتە هات ابراهیم پاشای كوشت كە (صەدری ئەعظە م) بوو ، لە جیاتی ئەو ئەم زاوا ( بیێ باوك و دایكەی خستە جێگەی ) ، پاشان پلانێكی تریشی دانا و توانی لە مستەفا(كە ( وەلی عهد ) و كوڕی سوڵتان سەلیم بوولە ژنە گەورەكەی ( یەكەمەكەی )) خۆی ڕزگاربكات و سەلیمی دووەم كە كوڕی خۆیەتی بكاتە ( وەلی عهد ) .

لەو كاتانەدا جولەكە لە هەموو لایەكەوە ئەچەوسێنرانەوە: لە ئەندەلوسدا، لە ڕوسیادا،و زۆرێكیان لە دەست دادگاكانی پشكنین هەڵهاتن و ڕایان كرد ، ئەم ژنە یەهودیە هاتە لای سوڵتان و تكای ئەوەی ئەكرد كە سوڵتان ڕێگە بدات جولەكە كۆچ بكەن بۆ ئەم وولاتە ، ئەوە بوو وا دەرچوو هەندێكیان كۆچیان كرد ولە( ئەزمیر) [1] و ناوچەی (ئەدەرنە) و شاری( بورصە) و ناوچەكانی باكوری ڕۆژئاوای(ئەناچۆڵ) دا گیرسانەوە ، پاش ئەوە دامەزران لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا ، بە پیێ ی یاساكانی شەریعەت هەڵسوكەوتیان لەگەڵ دا ئەكرا و لەسایەی ئەو شەریعەتەدا هەستیان بە جۆرێك لە( ئۆتۆنۆمی) ئەكرد ، لە ڕاستیدا جولەكەكانی ئیسپانیا لە ناو توركیای عوسمانیدا هەر ئەوەندەنەبوو كە شوێنی ژیانیان دەست كەوت بەڵكوو ئازادی تەواو و خۆشگوزەرانیشیان دەست كەوت و ، وای لیێهات ڕیزبەندیشیان لەناودەوڵەتدا بۆ دروست بوو ،كەمە كەمە چوونە ناو شوێنە هەستیارەكانی دەوڵەتەوە وەك :( دون جوزیف ناسی) و جگە لەوانیش جولەكەكانی ئیسپانیا بڕێكی زۆر سەربەخۆیان پیێ درا و وای لیێهات سەرۆكی حاخامەكانیان دەسەلاتی ئەوەی پیێ درا كە كاروبارە ئایینی و مافە مەدەنی یەكانیان ڕاپەڕێنێت بە شێوەیەك وای لیێهات بڕیارو

---

[2] ) بڕوانە : تأريخ الدولة العثمانية ، دز علي حسوم ، ص٢٤١ .

ڕاسپاردەکانی ئەم حاخامە لەلایەن حکومەتەوە ( تصدیق ) ئەکرا و گەیشتە ئەوەش ئەو بڕیارو ڕاسپاردانە ئە بوونە یاسای تایبەت بەجولەکە ( لە دەوڵەتدا ) [١] .

جێگەی ئاماژە بۆکردنە لەم بوارەدا ، ( علی پاشا ) کە وەزیری دەرەوە بوو بوو، بە( صەدری ئەعظە م) و لە ساڵی ١٨٩٥زدا بە خۆی و شاندێکەوە نێردرا بۆ وولآتە ئەوروپی یە مەسیحی یەکان ، هەندێ لە ئەندامانی شاندەکەی جولەکە بوون [٢] .

جولەکە لەژێر سایەی یاساکانی ( هاوولآتیانی دەوڵەت ) دا گشت ( امتیاز ) و ( حەصانە ) یەکیان ئەپارێزرا [٣] و ئاشتی و بێ ترسیان دەست کەوت و بوونە خاوەنی تەواوی شتەکانی خۆیان لە ناو دەوڵەتی عوسمانیدا [٤]

**یەکەم / جولەکەکانی دۆنمە :**

ووشەی دۆنمە چەمکێکە مانای جیاوازی زۆری هەیە ، چونکە ئەم ووشەیە لە ڕووی زمانەوانی یەوە لە ووشەی (دۆنمك ) ی تورکی یەوە وەرگیراوە کە واتای گەڕانەوە یان هاتنەوە یان پاشگەز بوونەوە ئەگەیەنێت ، بەلآم چەمکی کۆمەلایەتی ئەو ووشەیە واتە _ هەڵگەڕانەوە یان حول حولی ( متذبذب ) ، بەلآم لە ڕووی مانای ئایینی یەوە ئەم ووشەیە یانی : مەزهەب و ئایینێکی تازە، کە( حاخام ساباتای زیفی) بانگەشەی بۆ ئەمە ئەکرد ، بەلآم چەمکە سیاسی یەکەی ئەم ووشەیە واتە : ئەو جولەکە موسڵمانانەی کە قەوارەیەکی تایبەت بە خۆیان هەیە [٥] بەلآم ئەم ووشەیە پێناسێکی تایبەتی وەرگرت لە سەدەی حەڤدەهەمدا و بەو جولەکانە ئەوترا کە لە شارە ئیسلامی یەکاندا ئەژیان بەتایبەتی هەرێمی " سلانیك " ، عوسمانی یەکان بەو مەبەستانە ناوی دۆنمەیان نا لە و جولەکانە تا خەڵکی بزانێ ئەمانە لە یەهودیەتەوە گەڕاونەتەوە بۆ ئیسلام ، پاشان ئەمە بوو بە زاراوەیك مەبەست

---

[1] ) بڕوانە : اليهود والدولة العثمانية ، د. احمد النعيمي ، ص٣٧ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٣٧ .

[3] ) هەمان سەر چاوەی پێشوو ، ص٣٨ .

[4] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٣٩ .

[5] ) بڕوانە : يهود الدونمه ، د . احمد النعيمي ، ص٨ .

پیّ ی ئەو جولەکانە بوو کە لە ئەندەلوسەوە پەنایان بۆ دەوڵەتی عوسمانی هینا بوو ، بە ڕووکەش بیروباوەڕی ئیسلامیان قبولّ کرد بوو [1] .

دامەزرێنەری تاقمی دۆنمە بریتی بوو لە ( شبتای زەیفی ) کە لافی ئەوەی لیّ ئەدا کە ئەو حەزرەتی مەسیحی چاوەڕوانکراوە لەم چەرخی هەڤدەمەدا ، چونکە لەو ڕۆژانەدا پڕوپاگەندەیەك هە بوو گوایە : حەزرەتی مەسیح لە ساڵی ١٦٤٨ زدا دەردەکەوێت بۆ ئەوەی ڕێبەرایەتی (( یهود )) بکات لە وێنەی مەسیحدا و دێت و فەرمانڕەوایی دونیا ئەکات لە فەلەستینەوە و (( قودس )) ئەکاتە پایتەختی یەهودی _بەخەیاڵی خۆیان_ [2] .

ئەم بیرۆکەیەی( مەسیحی چاوەڕوانکرا و) لەناو جامیعەی جولەکەکانی ئەو کاتەدا بڵاو بوو ، ناوەندە یەهودیە کۆنەکان بڕوایان بە نزیکبوونەوەی دەرکەوتنی مەسیح هە بوو ، بۆیە ئەم بانگەشەی ( شبتای ) پشتیوانی یەکی زۆری لە ناو جولەکەکانی فەلەستین و میصر و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپادا بۆ دروست بوو ، نەك هەر ئەوە بەڵکوو زۆربەی جولەکەکان و خاوەن پارەکان پشتی ئەم بیرۆکەیان گرت لەبەر چەند مەبەستێکی سیاسی و ئابوری [3]، دەنگ و باسی ئەم ( شبتای ) ە گەیشتە ئەوروپا و پۆڵەندا و ئەڵمانیا و هۆڵەندا و ئینگلتەرا و ئیتاڵیا و باکوری ئەفریقا و شوێنی تریش و لە ئەزمیردا پێشوازی لەو شاندە یەهودیانە ئەکرد کە لە ئەدرنە و صوفیا و یۆنان و ئەڵمانیاوە ئەهاتن بۆ لای، ئەم شاندانە ناوی ( پاشای پاشاکان ) یان لێنا ، ئەم ( شبتای ) یە هەستا هەموو جیهانی کردەسی و هەشت(٣٨) پارچەوە ، و بۆ هەرپارچەیەکی پاشایەکی دانا ، بڕوای وا بوو کە لە فەلەستینەوە فەرمانڕەوایی هەموو دونیا ئەکات ، ئەوە بوو لەم بوارەدا ئەیوت : من نەوەی سولەیمانی کوڕی داودم ، فەرمانڕەوایی هەموو خەڵکی ، قودسیش وا دا ئەنێم کە کۆشی منە [4] .

---

[1] ) بڕوانە : صحوة الرجل المريض ، ص٢٤٢ .

[2] ) بڕوانە : يهود الدونمة، ص١٦ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢١ .

[4] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ٢٧ .

ئەم ( شبتای ) ە هەستا ناوی سوڵتان محمدی چوارەمی لە ووتارەکانی ناو کەنیسەی یەهوددا ، سڕیەوە و لە جیاتیدا ناوی خۆی دانا و خۆی ناو نا ( سوڵتانی سوڵتانەکان ) و ( سولەیمانی کوڕی داود ) ئەمە سەرنجی حکومەتی عوسمانی بۆ کارەکە ڕاکێشا [1] .

( شبتای ) بوو بە سەرچاوەی دڵە ڕاوکێ ی حاخامەکانی جولەکە و ، لای سوڵتان شکاتیان لێ کرد ، و سوڵتانیان دڵنیا کرد کە شبتای بە نیازە بزوتنەوە یەکی یاخی دروست بکات لە پێناو دروست کردنی دەوڵەتێکدا بۆ یەهود لە فەلەستیندا [2] .

لە ئەنجامی قایمبونی فتنەی (شبتای زەیفی ) دا " احمد کوبرولو " کە وەزیرێکی ئازاو بەجەرگ بوو ، بڕیاری گرتنی بۆ دەرکردو خستیە زیندانەوە ، و ماوەی دوومانگ لە زیندانندا مایەوە ، و پاشان گوازرایەوە بۆ قەڵای دوورگەی ( غالیبولی ) لەسەر ( دردنیل ) و ڕێگەی دا کە ژنەکەی و نوسەرە تایبەتی یەکەی خۆی لە خانوویەکی نزیك خۆیدا بن ، و ئەنجومەنێکی وەك( ئەنجومەنی میران)ی بۆ خۆی دروست کرد ، کەس بۆی نە بوو بچێتە لای بە بێ مۆڵەتی پێش وەخت ، وای لێهات هی وا هەبووچەند ڕۆژ چاوەڕوانی ئەکرد تا بۆ ساتێك چاوی پێ ی بکەوێت ، ژنەکەی ڕێوڕەسمی شاژنەکانی پیادە ئەکرد لەگەڵ ئەوانەدا کەئەهاتن بۆ سەردانی چ پیاو و چ ژن ، چونکە لە هەموو دونیاوە شاندەکانی یەهود ئەهاتن بۆ سەردانی کردنی [3] .

(شبتای) درایە دادگا لە ( سەرای ئەدرنە ) و سوڵتان دەستەیەکی زانستی بەڕێوە بەری بە سەرۆکایەتی (صەردی ئەعظە م ) و ئەندامێتی هەریەك لە ( شێخ الاسلام یحیی ئەفەندی منقری زادە ) و یەکێك لە زانا گەورەکان بەناوی ( محمد ئەفەندی واتلی ) کە پێش نوێژی کۆشك بوو ، ( د. مستەفا حەیاتی ) یش کاری وەرگێڕانی ئیسپانی بوو بۆ زمانی تورکی لە دادگاکەدا [4] .

قازی دادگا ئەوەی دوپات کردەوە کە ئەم کارەی " شبتای " سنور شکاندنە سەبارەت بە دەوڵەتی عوسمانی ، سوڵتان کە خۆی لە ژوورێکی ترەوە گوێی بۆ دادگاکە ئەگرت ، لە

---

1 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٧ .

2 ) هەمان سەرچاوەیپێشوو ، ص٣٤ .

3 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٣٦ .

4 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٣٦ .

ڕێگەی وەرگێڕەکەوە ووترا بە "شبتای " : تۆ لافی ئەوە لێ ئەدەی کە حەزرەتی مەسیحی ، دەی فەرموو بزانین ( معجزة ) ت چی یە ، ئێمە جلەکانی بەرت لائەبەین و بە نیشانە ئەتنێینەوە و چەند پیاوێکی تیر هاوێژی دەست ڕاستی خۆمان دێنین و ئەگەر ئەو تیرانە لەشی تۆیان نەبڕی ئەوە سوڵتان بانگەشەکەت لێ وەرئەگرێت و ( بڕوات پێ ئەکات ) ،" شبتای" لە شتەکە حاڵی بوو بۆیە نکۆڵی لە هەموو ئەو شتانە کرد کە دراونەتە پاڵی و ووتی : ( ئەوانە درۆیان بە دەمەوە کردووە [1] ، قازی باسی ئیسلام ( موسڵمان بوونی ) بۆ کرد ، ( شبتای ) موسڵمانێتی خۆی ڕاگەیاندو ناوی خۆی نا ( محمد عزیزی ئەفەندی ) [2] و داوای لە دەسەڵاتی عوسمانی کرد کە ڕێگەی بدەن با جولەکەکان بانگ بکات بۆ ئیسلام ، ڕێگەی پێ دراو ئەمەی کردە هەلێك و دەستی کردە گەڕان بەناو جولەکەکاندا و بەردەوام بانگی ئەکردن بۆ باوەڕهێنان و هانی ئەدان پێویستە هەموو کۆببنەوە و لە ڕووکەشدا ئیسلام دەربڕن و لەناخدا دینی لادەری یەهودییەت هەڵبگرن ) [3] .

" شبتای " و پشتویانەکانی هەر خەریکی ئەوە بوون بە پەنهانی بە شوێن دینی موسایی یەکەی خۆیاندا بڕۆن و کار بۆ ( زایۆنیزم ) بکەن بە دزی یەوە ، و لە ڕووکەشیشدا دڵسۆزی بۆ ئیسلام و پیاو چاکی و لە خواترسان دەربڕن لەبەردەم تورکەکاندا ، بەردەوام بە شوێنکەوتەکانی ئەووت : ئەو وەك موسا پێغەمبەر وایە کە ناچار بوو بۆ ماوەیەك لە کۆشکی فیرعەوندا بمێنێتەوە [4] .

لەم هەل و مەرجەو لە کاتیکدا کە " شبتای " لەگەڵ کۆمەڵێك لە هەوادارانی کە لە کەنیسەی ( قوری چشمە ) کە لە ناو پەرستگاکەدا بوو خەریکی ئاهەنگێڕان بوون و سروودە یەهودی یەکانیان ئەخوێندەوە و مەشروباتیان ئەخواردەوە و خۆشی جلێکی جولەکانەی لەبەرکردبوو ، ژنانیش چواردەوریان دابوو ، هەروەها (مەزامیرەکانی داود ) یان ئەخوێندەوە ، ئالەو کاتەدا دەستگیر کرا ، و تۆمەتی ئەوەشی لەسەر بوو کە داوا لە موسڵمانان ئەکات کە

---

[1] ) یهود الدونمة ( مصطفی طوران ، وەرگێرانی : کمال خوجه ، د علی حسون لەمەوە گواستوویەتی یەوە ، ص٢٤٣ .

[2] ) بڕوانە : تأريخ الدولة العثمانية ، د. علی حسن ، ص٢٤٣ .

[3] ) یهود الدونمة : ص٣٥ .

[4] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٤١ .

واز لە ئایینەکەیان بێنن و بڕوا بەو بهێنن ، جا ئەگەر شێخولسلام دەخالەتی نەکردایە ئەوە ئەدرا لە ملی، شێخولسلام بۆ لەناو بردنەکەی ڕەخنەی ئەوە بوو ئەیووت : ئەم کابرا فێڵبازە لە سێدارە بدرێت لە ناو خەڵکدا ئەفسانەیەك دروست ئەبێت و هەوادارەکانی ئەوە لەناو خەڵکدا بڵاوئەکەنەوە گوایە وەك حەزرەتی عیسی (علیه السلام ) چووە بۆ ئاسمان ) [1] ، ئەوە بوو دوورخرایەوە بۆ شاری ( دولسجنو ) لە ئەلبانیا ، ئەمەش لە هاوینی ساڵی ١٦٧٣زاینیدا بوو ، دوای پێنج ساڵ دوورخستنەوە مرد ، بیروباوەڕی (شاباتائی) لەناوکۆمەڵانی ( سالونیك ) دا هەرمایەوە و شوێنکەوتەکانی کەوتنە داهێنانی چەندان فرت و فێڵ ودەمارگیری و خۆ داڕنین لە پرنسیپەکان و لە ڕەوشتە بەرزەکان ) ) [2] .

( شباتی زیفی) بیروباوەڕی دۆنمە ی لە( هەژدە) ماددەدا داڕێژاوە ، و لە ڕاستیدا مادەی ( شازدە و حەڤدە ) بە گرنگترین سەروسیمای دۆنمەکان دا ئەنرێ ، ماددەی ( ١٦ ) ئاماژە بەوە ئەدات : (( پێویستە نەریتەکانی تورك زۆر بەووردی جێ بەجێ بکرێ تا چاویان بەسەرتانەوە نەمێنێ ، وە پێویستە هیچ هەوادارێکمان بێزاری لە ڕۆژووی ڕەمەزان و قوربانی کردن دەر نەبڕێت و ئەوانەش ئەم کارانە ئەکەن ئەبێت بە دیار چاوی خەڵکەوە بیکەن و لە قەڕەباڵەغیدا بێت ) [3] وە مادەی ( ١٧ ) ش ئاماژە بەوە ئەدات کە : ( ژن و ژنخوازی لەگەڵیاندا ( واتە لەگەڵ موسڵماناندا ) بە هەمووشێوەیەك قەدەغەیە ) [4] .

(شبتای) بەیەکەمین کەسێکی جولەکە دائەنرێت کە مژدەی ئەوەی دابێ کە (بنی ئیسرائیل ) ئەگەڕێنەوە بۆ فەلەستین ، لە ڕاستیشدا بزوتنەوەی ( زیفی ) بزوتنەوەیەکی سیاسی بوو دژ بە دەوڵەتی عوسمانی زیاد لەوەی بزوتنەوەیەکی ئایینی بێت ) [5] .

ئەم تاقمە ڕۆڵی زۆریان بینی بۆ ڕووخاندنی بەها ئیسلامی یەکان لەناو جامیعەی عوسمانیدا ، کاریان بۆ ئەوە ئەکرد کە بیروڕای ڕۆژهەڵات و بێدینی ( ئیلحاد ) و ماسۆنیەت بڵاوببێتەوە و بانگەشەی دڕاندنی حیجابی ئافرەتانی موسڵمانانی ئەدا بەگوێ ی خەڵکدا و

---

[1] ) یهود الدونمة ، ص٤٢ .

[2] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٤٣ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٤٥ .

[4] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٤٥ .

[5] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٤٦ .

داوای تێکەڵاوی پیاو ژنیان ئەکرد بەتایبەتی لە قوتابخانەکاندا ، زۆرێك لە پیاوانی کۆمەڵەی ( ئیتحاد و تەرەقی) بەشداری بۆ نەوئاهەنگەکانیان ئەکردن .

جولەکەکانی دۆنمە ڕۆڵێکی کاریگەریان هە بوو لەسەرخستنی ئەو هێزانەدا کە دژایەتی (سوڵتان عبدالحمید) یان ئەکرد ، ئەو هێزانەی کە لە ( سلانیك ) ەوە دەستیان دایە جوڵە و بزاوت بۆ ئەوەی لەسەر کارلای بەرن ، هەر ئەوانە بوون پاشان بیروڕای ئەفسەرەگەنجەکانیان ژەهراوی کردو تا کاتی ئەمڕۆشمان هەر خەریکن ، و ڕۆژنامەو خانەی بلاْوکردنەوەیان هەیە و چوونەتە ناو ڕەگ و ڕیشەی ئابوری عوسمانی و هەموو بوارەکانی ژیان لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا ) [1] .

ئەمانە توانیان کاریگەری خۆیان لەسەر کۆمەڵەی ((ئیتحاد و تەرەقی)) دابنێن و (سوڵتان عبدالحمیدی دووەهەم)یش باش ئاگاداری ڕاستی دۆنمە بوو ، ( جەنڕاڵ جواد رفعت اتلخان ) ئەم ڕاستی یە دوپات ئەکاتەوە و لەم بارەیەوە ئەڵێ : (( ئەو تاکە کەسەی کە لە هەموو مێژووی تورکیدا ، ڕاستی زایۆنیزم و شەبەتائیە و زیانەکانی لەسەر تورك و ئیسلام زانیبێ و ترسناکی یەکانیانی دەرك پێ کردبێ و خەباتی دژیان بووبێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بە جدی تا سنوور بۆ خراپە کاری یەکانیان دابنێ ، تەنیا سوڵتانە گەورەکەی تورك بوو ، ( واتە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم ) ، خەباتی تەواوی ئەم ڕێکخراوە ترسناکانەی وەك پاڵەوان کرد بۆ ماوەی ( سی و سێ ساڵ ) زۆر زیرەکانە و ورەبەرزانە بە شێوەیەك خەڵك سەرسام ئەبێت لێ ی [2] .

لە ڕاستیدا ، (سوڵتان عبدالحمید) گرنگی بە ئەوە ئەدا کە ئەم" دۆنمە " یانە هەر لە هەرێمی "سالونێك " دا بمێننەوە نەیەڵێت بێنە " آستانە " ، بۆ ئەوەی هەر لەژێر کۆنتڕۆڵدا بن و دوور نەبێت لە چالاکی یەکانیان ، ئەنجامی ئەم هەڵوێستە توندەی (عبدالحمید) لە تاقمی دۆنمە وای کرد کە ستراتیژێکی دژ بە سوڵتان بگرنەبەر ، ئەوە بوو دەستیان دایە دژایەتی کردنی سوڵتان لەسەر ئاستی ڕای گشتی عوسمانی و ( هێزەکانی ) سوپا [3] .

---

[1] ) بروانە : تأريخ الدولة العثمانية ، د. علی حسون ، ص٤٦ .

[2] ) بروانە : السلطان عبدالحميد والخلافة الاسلامية " ی ( الجندي )، ص١٠٧ .

[3] ) بڕوانە : يهود الدونمة ، ص٨١ .

دەرەنجامی ئەم هەڵوێستانەی (عبدالحمید) لە دۆنمە ، ئەوە بوو جولەکەکانی دۆنمە بە هاوکاری لەگەڵ (کۆڕەکانی ماسۆنەت) دا کەوتنەئیش کردن بۆ لابردنی ، ئەمانە هەندێ دروشمی دیاری کراویان بەرزکردەوە وەك ئازادی و دیموکراسیەت و لابردنی تاکڕەوی (عبدالحمید) ، لەسەر ئەم بناغەیە هەستان بە دروست کردنی یاخی بوون و دووبەرەکی لەناو هێزەکانی سوپادا ، وە مەبەستیش بەمە هێنانەدی پرۆژەی نیشتە جێ کردنی زایۆنیزمەکان بوو لە فەلەستیندا ، جولەکەکانی دۆنمە بەردی یەکەمیان پێك دەهێنا بۆ جێ بەجێ بوونی نەخشەکانی جولەکەی جیهانی ) [1] .

**دووەم / ( سوڵتان عبدالحمید ) و ( ( هرتزل ) ) ی گەورەی جولەکەکانی دونیا .**

( تیوردر (هرتزل) ) کە ڕێبەری بزوتنەوەی جیهانی جولەکە و زایۆنیزمەکان بوو توانی پشتیوانی ئەوروپا بۆ پرسی جولەکە بەدەست بهێنێت لە هەریەك لە ( ئەڵمانیا ) و ( بەریتانیا ) و ( فەرەنسا ) دا ، توانی ئەم دەوڵەتانە بکاتە کارتی فشار بەسەر دەوڵەتی عوسمانیەوە و سەرەتایەك هەڵبچنێ بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنێك بکات لەگەڵ (سوڵتان عبدالحمید) دا و داوای فەلەستینی لێ بکات ، ئەو کاتەش دەوڵەتی عوسمانی بەدەست جۆرەها گرفتی دارایی یەوە ئەینالاند ، هەل و مەرجی ئابوری لە وڵاتدا گەیشتبووە پلەیەك لە خراپیدا ، ئەو دەوڵەتە ئەوروپانەی کە قەرزیان دابوویە دەوڵەتی عوسمانی ناچار بوون تیمێکی دارایان ناردە تورکیای عوسمانی بۆ ئەوەی سەرپەرشتی بارودۆخە ئابوری یەکان بکات تا قەرزەکانی خۆیان دەستە بەربکاتەوە ، ئەم حاڵەتە وای لە (سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) کرد هەرچی کردووە چارەسەرێك بۆ ئەم گرفتە گەورەیە بدۆزێتەوە .

ئەم کەلێنە تاکەڕێگەیەك بووکە(( (هرتزل) )) لێوەی بچێتە ژوورەوە ، وکار لەسیاسەتی (عبدالحمیدی دووەم) بکات بەرامبەر بەجوولەکە ، لەم ڕووەوە (( (هرتزل) )) لە (( یاداشتەکانیدا )) ئەڵێت : ((ئێمە هەڵدەستین بیست ملیۆن لیرەی تورکی ئەدەین بۆ چاککردنی بارودۆخی دارایی لە تورکیا ، دوو ملیۆنی لەجیاتی نرخی فەلەستین و ئەوی تری بۆئەوەی تورکیا ڕزگاری ببێت لەقەرزو قەرزەکانی بداتەوە و سەرەتایەك بێت بۆ ئەوەش

---

[1] ) بڕوانە (( الحركة الاسلامية الحديثة في تركيا )) ی محمد مصطفى ، ص٦٨_٦٩ .

تیمە ئەورووپی یەکە بڕۆنەوەو تورکیا بەجێ بهێڵن و پاش ئەمانەش سوڵتان داوای هەر قەرزێکی تازەمان لێ بکات پێ ی هەڵدەستین [1] .

(هرتزل) پەیوەندی یەکی زۆری کرد بە بەرپرسەکانی ناو(ئەڵمانیا) و (نەمسا)و (ڕوسیا)و (ئیتالیا)و (ئینگلتەرا)و مەبەستی سەرەکیشی لەم هەمووە پەیوەندیکردنە هەر ئەوە بوو کە دانیشتنێکی لەگەڵ (عبدالحمیدی دووەم)دا بۆ دروست بکەن ، لەم ڕووەوە ( لاندوٚ )کە هاوڕێیەکی یەهوودی (هرتزل) خۆی بوو لە ٢١/شباط /١٨٩٦ز ئامۆژگاری کرد کە بەبۆنەی (نیو لنسکی ) هاوڕێیەوە کە سەرۆکی ڕاپەڕاندنی ڕۆژنامەی (برید الشرق) بوو ،ئەم کارە بکات.

،لەم بوارەدایە (هرتزل) ئەڵێ:(ئەگەر ئێمە فەلەستینمان دەست بکەوێت ، ئامادەین زۆر شت بدەین بە تورکیا ، یان هەرکەسێك بکەوێتە نێوانمان ئامادەین خەڵاتێکی زۆری بدەینێ ، و بە بەرامبەر ئەم کارەشەوە ، ئێمە ئامادەین هەموو کاروبارە دارایی یەکانی تورکیا ڕێك بکەینەوە ، ئێمە دێین هەموو ئەو زەوی یانەی کە هی سوڵتان خۆیەتی لە ڕووی یاسامەدەنیەکانەوە لێ ی وەردەگرین ، لەگەڵ ئەوەدا هەڵئەگرێ کەهیچ جیاوازی یەك نەبێت لە نێوان دەسەڵاتی موڵکایەتی و موڵکە تایبەتی یەکاندا ) [2] .

(هرتزل) سەردانێکی ( قسطنطینیة ) ی کرد لە حوزەیرانی ساڵی ١٨٩٦ ە زانینیدا و لەم سەردانەیدا ( نیولنسکی ) هاوڕێ ی بوو ، کە پەیوەندی یەکی خۆشەویستی لەگەڵ (سوڵتان عبدالحمید)دا هەبوو ، لە ئەنجامی ئەمەدا ئەم ( نیولنسکی ) یە توانی( بیروڕای (هرتزل) ) بگەیەنێتە کۆشکی ( یلدز ) و حیوارێك کەوتە نێوان ( نیولنسکی ) و (سوڵتان عبدالحمید)ەوە ، سوڵتان پێ ی ووت : جولەکە ئەتوانن لە پارچە زەوی یەکی تردا نیشتە جێ بن جگە لە فەلەستین ؟ نیولنسکی وەڵامی دایەوە و ووتی : ( فەلەستین بە لانکەی یەکەمی جولەکە دائەنرێ ، بۆیە جولەکەکان حەزیان لەوەیە کە بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ ) سوڵتان وەڵامی دایەوە و ووتی : (( فەلەستین لانکەی جولەکە نی یە بە تەنها بەڵکوو بە لانکەی

---

١)بڕوانە: اليهود والدولة العثمانية ، ص١١٦.

2) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١١٧ .

هەموو ئایینەکانی تریش دائەنرێ )) نیولنسکی ووتی : ئەگەر جولەکە فەلەستینیان دەست نەکەوێتەوە ئەوە ئەوان هەوڵ ئەدەن زۆر بە ئاسانی خۆیان بگەیەننە (( ئەرجەنتین ) [1] .

(سوڵتان عبدالحمید) نامەیەکی بە ڕێگەی ( نیولنسکی ) هاوڕێیدا نارد بۆ ( (هرتزل) ) ، لەو نامەیەدا هاتووە :

(( ئامۆژگاری " (هرتزل) " ی هاوڕێت بکە ، با هەنگاوی تازەی تر نەنێت دەربارەی ئەو بابەتە ، چونکە من ناتوانم دەست هەڵبگرم تەنانەت لە یەك بست خاکی ئەو زەوی یە پیرۆزانە ، چونکە ئەوە موڵکی من نین ، بەڵکوو موڵکی گەلەکەمە ، باوباپیرانی من لە پێناو ئەم زەوی یانەدا تێکۆشاون و بە خوێنی خۆیان تێر ئاویان کردووە ، با جولەکە (مەلایینەکان)ی خۆیان بپارێزن .. ئەگەر ( کار گەییە ئەوەی دەوڵەتەکەی من لەت و پەت کرا ، ئەوکاتە لەوانەیە بەبێ هیچ بەرامبەرێك ئەوان فەلەستینیان دەست بکەوێت ، ئەوەش وا ئەخوازێ کەسەرەتا دەست بە دڕاندنیجەنازەکەمان بکات بەڵام ئەو بیەوێ هەر بەزینوووی لەشم هەڵدڕێ و پارچە پارچەی بکات ئەوە بێ گومان ڕێگەی نادەم [2] !! .

(سوڵتان عبدالحمید) لە (( یاداشتەکانیدا )) لەم بارەیەوە ئەڵێت :

( جێگەی خۆیەتی ئێمە هەستین بە بەپرکردنەوەو بەرکارهێنانی زەوی یە چۆڵەکانی دەوڵەت ، ئەمەش یانی لە ڕووی یەکی ترەوە ئەرکی ئەوەمان ئەکەوێتەسەر سیاسەتی کۆچپێکردنی تایبەت بگرینە بەر ، بەڵام کۆچکردن بە جولەکە بە هیچ شێوەیەك جێگەی خۆی نی یە ، چونکە مەبەستی ئێمە نیشتە جێکردنی کەسانێکە کە هەمان ئایین و نەریتی باوباپیرانی ئێمەیان هەبێت ، بۆ ئەوەی نەوەك دەسەڵات پەیدا بکەن و ڕەشمەی کاروبارەکانی دەوڵەتیان بکەوێتە دەست ) [3] . دوای ئەوەی هەوڵەکانی (هرتزل) شکستیان هێنا لە ڕێگەی ( نیولنسکی ) یەوە ، ڕووی کردە کۆشکی ( ولیمی دووەم ) کە ئیمپراتۆری ئەڵمانیا بوو ، چونکە ئەمیش هاوڕێ ی (عبدالحمید) بوو ، زیاد لەمەش ئەم " ولیمی دووهەمە " تا کە

---

1 ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٢٠ .

2 ) بڕوانە : اليهود والدولة العثمانية ، ص١٢٠ .

3 ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٢٠ .

هاوپەیمانی عوسمانیەکان بوو لە ئەوروپادا [1] ، بەلاّم هەولّەکانیشی لەم قۆلّەوە دیسان سەرکەوتنی بەدەست نە هێنا .

( نظام الدين نظيف ) کە مێژوو نوسێکی تورکی یە لە کتێبی ( اعلان الحريه والسلطان عبدالحميد الثاني) دا ئەلّیّ : (( ... کاتێك کە ڕەدی شانەدەکەی جولەکەی دایەوە کە بە پالّشتی (ئیمپراتۆر ولیم)هاتبوونە لای ، بۆ ئەوەی نیشتمانێکیان دەست بکەویّ ، واتە کە (هرتزل) لەم هەولّە چنراوەشیدا بیّ ئومێد بوو ، ڕقی داگیرسا لە دژی ( یلدز ) ، (سولّتان عبدالحميد) چاوەڕوانی ئەمەی ئەکرد ، چونکە جوولەکە لە چنینی کاردا شارەزایی باشیان هەیە ، هێزی زۆر شك ئەبەن بۆ ئەوەی هەر هەولێکیان دا تێیدا سەرکەوتوو بن ، دارایی بیّ شوماریان هەیە و دەستیان گرتوە بەسەر پەیوەندی یە بازرگانی یە نێودەولّەتی یەکاندا ، ڕۆژنامەکانی ئەوروپا لەژێر چنگیاندا بوو ، ئەیانتوانی کەی بیانەویّ گەردەلولی ڕای گشتی هەلّبکەن ... ) [2] .

ئەم مێژوو نوسە ئەلّێت :

(( سەرەتا دەستیان کردە جولاّندنی ڕۆژنامە گەری جیهانی ، پاشان دەستیان دایە کۆکردنەوەی دوژمنەکانی (عبدالحميد) ، ئەوانەی لەو کۆمەلّگە عوسمانیە هەمە چەشنەدا پیّ گەیيبوون ، ئەمان بینی کە شوێن کەوتەکانی ( مەرجداریّتی = المشروطية ) [3] شێوەیەکی ڕێخراوی و پەلاماردەریان گرتەخۆیان لەگەلّ ئەوەدا کەلەوەوپێش پەرش بلاّوو بەبیّ ڕێکخستن و هەماهەنگی کاریان ئەکرد ، ( لەڕاستیدا ) یەك خستن و کۆکردنەوەی دوژمنانی (عبدالحميد) کارێکی گران نە بوو ، نەخوازەلاّ لە کۆمەلّگەیەکی تێکەلّ و پێکەلّی عوسمانی ئەوڕۆژەدا ، (المشرق الاعظم ) کە دامەزراوەیەکی ماسۆنی یەکی ئیتالّی بوو ئەرکی ئەوەی خستە سەرشانی کەرێکخستن و هەماهەنگی دروستکردنی کاری ئەو بێت ،

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٢١ .

[2] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني حياته واحداث عصره ، محمد اورخان ، ص٢٨١، ٢٨٢ .

[3] ) ( مشروطية ) واتە ئەوانەی داوای دیموکراتیەتیان ئەکرد لەناو دەولّەتی عوسمانیدا و بانگەشەی دەستورو دەسەلاّتی ئازادی تەواویان ئەکرد و گوێیان بە ئاین و نەریتەکان نەئەدا ( وەرگێڕ .ن. ) .

چونکەئەم نزیکترین مەڵبەندی ماسۆنیەتە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی یەوە ، کۆڕە ئیتاڵی یەکان و بەتایبەتی کۆڕی ( ریزوتا ) لە سلانیك دا ڕۆڵێکی بەرچاوی بینی لەم بوارەدا ... ) [1].

( کە لە هەوڵەکانیدا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا ) (هرتزل) بڕیاری دا چەند ڕێگەیەکی تر بگرێتە بەر بۆ ڕاکێشانی (سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) بەلای خۆیدا ، ئەوە بوو جارێکی تر لە ڕێگەی ( نیولنسکی ) یەوە ئامادەیی دەربڕی ئەو کێشەی ئەرمەنی یەکان چارەسەر بکات و لە خزمەت سوڵتاندایە ) [2] .

(هرتزل) لەم بارەیەوە ئەڵێ : (( سوڵتان داوای ئەوەی کرد خزمەتێك هەیە بیکەم بەرامبەری ، ئەویش ئەوەیە کار بکەمە سەر ڕۆژنامە ئەوروپایی یەکان و وایان لێ بکەم کە بەزمانێکی دوژمندارانەی کەمتر بەرامبەر تورکیا لەسەر کێشەی ئەرمەنی یەکان بنووسن ، منیش بە ( نیولنسکی ) م ڕاگەیاند کە هەرئێستا بەو ئەرکە هەڵدەستم ، بەلام ئەوەم دوپات کردەوە با بیرۆکەیەکی تەواوم لەسەر ئەرمەنی یەکان پێ بدەن : کێن ئەو کەسانەی لە ( لندەن ) دا دائەنیشن و پێویستە من بچم ئەم بیروڕایان بۆ دروست بکەم وە ئەو ڕۆژنامانە کامانەن کە پێویستە بەلای خۆماندا ڕایان بکێشین و جگە لە مانەش هەندێ زانیاری تریش)[3].

لەسەر ئەم بناغەیە دیبلۆماسیەتی زایۆنیزم کەوتنە چالاکی کردن بۆ ئەوەی ئەرمەنەکان بێنە سەرئەو بڕوایەی واز لە شۆڕش کردن بهێنن لە ئەنجامی ئەمەشدا " (هرتزل) " پەیوەندی کرد بە ( سالزبوری ) و بەرپرسەکانی تری ئینگلیزەوە بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر ئەرمەنی یەکان ، هەروەها جوولەکە لە شارەکانی تری ئەورووپاشدا وەك " فەرەنسا " بۆ هەمان مەبەست دەستیان دایە چالاکی ، بەلام ئەم دیبلۆماسی یەتەی " (هرتزل) " شکستی هێنا و هۆکەشی ئەوە بوو کە بەریتانیا دڵ گەرم نە بوو بۆ مەسەلەکە ، چونکە ئەوەیانی

---

[1] ) السلطان عبدالحميد الثاني ، حياته واحداث عصره ، محمد اورخان ، ص٢٨٢ .

[2] ) بڕوانە : اليهود والدولة العثمانية ،ص١٣٢ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٣٧ .

ئەوەی پشتیوانی لە سیاسەتی (عبدالحمید) بکرێ ، وئەوەش کارێك بوو سەری بۆ ئەوە ئەکێشا کە ڕای گشتی بەریتانی دژ بە حکومەتی بەریتانیا بوروژێنێ [1] .

" (هرتزل) " هەوڵیدا جارێکی تر (عبدالحمیدی دووەم) ببینێ ، بەتایبەت لە کاتی سەردانی دووهەم جاری ( ئیمپراتۆروایمی دووەم ) بۆ ( قسطنطینیة ) بەڵام فەرمانبەرەکانی کۆشکی "یلدز " ڕێگەی ئەمەیان لێگرت و نەیان هێڵا ، (هرتزل) بەردەوام لە هەوڵدا بوو بۆ ئەم مەبەستە تا ئەوە بوو دوای دووساڵ ( ١٨٩٩ -١٩٠١ ز ) هەوڵەکانی سەرکەوتن و بە بۆنەی ئەو هەمووە تێکەڵیەی لەگەڵ فەرمانبەرەگەورەکانی( یلدز ) دا توانی چاوی بە (سوڵتان عبدالحمید) بکەوێ و بۆ ماوەی دووسەعات لەگەڵیدا دابنیشێ ، (هرتزل) پێشنیازی ئەوەی کرد بۆ (سوڵتان عبدالحمید) کە بانکە یەهوودی یە دەوڵەمەندەکانی ئەورووپا هاوکاری دەوڵەتی عوسمانی بکەن لە بەرامبەر ئەوەدا کە ڕێگە بدات لە فەلەستیندا نیشتە جێ بن ، زیاد لەمەش پەیمانی بە (عبدالحمید) دا کە قەرزە گشتی یەکانی دەوڵەتی عوسمانی سوك بکەن ئەمەش لە ساڵی ( ١٨٨١ ز ) ی یەوە ئەبێت و (هرتزل) پەیمانی ئەوەشی دا بە (عبدالحمید) کە پارێزگاری لەم گتفوگۆیەی نێوانیان بکات [2] .

(سوڵتان عبدالحمید) لەم دانیشتنەدا زۆرتر گوێ ی ئەگرت نەك قسە بکات ،پەتی شلکردبوو بۆ (هرتزل) تا چی لەناخ و خەیاڵیدا هەیە لە بیروڕا و پرۆسە و داواکاری هەمووی هەڵبڕژێت ، ئەم گوێگرتنەی (عبدالحمید) بڕوایەکی بۆ(هرتزل) دروست کرد گوایە لە کارەکانیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە ، بەڵام لە کۆتایی کارەکەدا بۆی دەرکەوت کە دۆڕاندویەتی و کەم کەم لەگەڵ (عبدالحمید) دا بەرەو ڕێگەیەکی بنبەست ئەڕوات [3] .

دوای ئەوەی هەوڵەکانی(هرتزل) لەگەڵ (عبدالحمید) دا سەرکەوتوو نە بوو ، (هرتزل) ئەڵێت : (( لەو حاڵەتەدا کە سوڵتان فەلەستینمان بداتێ ، ئەرکی سەرشانمان ئەوە ئەبێت کە کاروبارە دارایی یەکان ڕێك و پێك بکەین ، بەڵام لە کیشوەری ئەورووپادا قەڵایەکی قایم دروست ئەکەین دژ بە ئاسیا ، ئەو کاتە دەست بە دامەزراندنی شارستانیەتێك ئەکەین دژ بە

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٣٧ .

[2] ) بڕوانە : اليهود والدولة العثمانية ، ص١٤١ .

[3] ) بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو ،ص١٤٣ .

دوا کەوتن و لە هەمان کاتدا بەردەوام لەناو ئەوروپادا ئەمێنینەوە بۆ ئەوەی بوونمان دەستەبەرکەین .

لەڕاستیدا (عبدالجمید) ڕای وابوو زۆر پێویستە ڕێگە لە جوولەکە بگرێت بێنە فەلەستین و نیشتەجێ بىن تێیدا و بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ڕەگەزی عەرەبی بکرێ و بەو زۆرینە سروشتی یەی خۆیان بمێننەوە .. لەم بارەیەوە ئەڵێت : (( ... بەڵام ئێمە ژمارەیەکی تەواوی جوولەکەمان هەیە ، جا ئەگەر بمانەوێ کە ڕەگەزی عەرەبی بە زۆرینە بمێنێتەوە ئەوە ئەبێ واز لەو بیرۆکەیە بهێنن کەکۆچەری تر لە فەلەستیندا نیشتە جێ بکەین ، ئەگەر نا ئەوە گەر جوولەکە نیشتە جێ ی هەر خاکێك بىن زۆرنابا دەست ئەگرن بەسەر هەرچی ووزە و توانای ئەو شوێنەدا هەیە ، جا ئەگەر ئێمە وا بکەین ئەوە بڕیاری مردنێکی بێ گومانمان داوە بەسەر ئەو برایانەماندا کە هاو دینن لەگەڵماندا ))[1] .

دەوڵەتی عوسمانی زۆر جار هەوڵی ئەوەی ئەدا کە یەهودیە عوسمانیەکانیش لە بیروڕاکانی (هرتزل) و بزوتنەوەی زایۆنیزم دووربخاتەوە ، هەندێ جاریش زمانی هەڕەشەی بەکار دەهێنا لەگەڵیاندا ، لەم بارەیەوە ( علی فروخ بگ ) لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنە بیانی یەکاندا ئەمە ڕوون ئەکاتەوە و بەبێ پەردە ئەڵێت : ( ئەوە زۆر ناڕاستە کە زایۆنیزم هەستن بە دروستکردنی گیروگرفت بۆ دەوڵەتی عوسمانی ، تا ملی پێ کەچ بکەن بۆ بەدەست خستنی بەرژەوەندی یەکانیان ، چونکە ئەم گیروگرفت دروست کردنانە لە کۆتایی دا سەر بۆ ئەوە ئەکێشێ کەخۆیان تووشی سەر ئێشە بکەن و ئاشتی و کامەرانی خۆیان لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا لە دەست بدەن ... ئەم خاڵە زۆر ڕوونە سەبارەت بە پەیوەندی عوسمانی یەکان لەگەڵ هاولاتی یە ئەرمەنی یەکاندا ، چونکە ژمارەیەکی کەم یاخی بوونێکیان بەرپا کردو دەستیان دایە کاری بێ عەقلانە و نادروست پشت ئەستور بەڕێنمای یەکانی ( میکا ڤیلی ) ، ئەوە بوو لە کۆتایی دا هەموو پەشیمانیش بوونەوە لەو کارانەی کردبوویان ، بەبێ ئەوەی بگەنە هیچ ئەنجامێك .

لەگەڵ ئەو شکستەی[2] بەسەر هەوڵەکانی هرتزلدا هات لەگەڵ (عبدالحمید) دا کە چی ئەنوسێ : (( پێویستە ببینە خاوەنی زەوی و لە ڕێگەی خەڵکی جوولەکەشەوە بە شێوەیەکی

---

[1] ) بڕوانە : هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٤٦ .

[2] ) بڕوانە : الیهود والدولة العثمانية ، ص١٤٦ .

پله پله بێ ئەوەی پەنا بۆ بەکارهێنانی توند و تیژی بەرین ، هەوڵ ئەدەین هانی دانیشتوانە ڕەسەنە هەژارەکان بدەین باربکەن بۆ وولاتەکانی دەوروبەرو لە وێدا کاریان بۆ مسۆگەر بکەین و ( ئەوەش ئەبێت بزانین ) کە ئیش کردن پێیان لە وولاتی خۆماندا کارێکی ترسناکە ، دەست گرتن بەسەر زەویدا لە ڕێگەی بەکرێ گیراوە نهێنی یەکانی خۆمانەوە ئەبێت کە کۆمپانیا یەهودی یەکان دوای ئەوە کاری زەویفرۆشتنیان بەجوولەکە ئەکەوێتە دەست ، لەسەروو ئەمەشەوە کۆمپانیا یەهودی یەکان سەرپەرشتی بازرگانی کردن بە کڕین و فرۆشتنی زەوی یەوە ئەکەن ، بەو مەرجەی کەتەنها بە خەڵکی جوولەکەی بفرۆشێت [1] .

(هرتزل) هەروەها ئەنوسێت : (( دان بەوەدا ئەنێم لەژێر ڕۆشنایی ئەو قسانەمدا لەگەڵ(سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) دا کرد من کە ئێمە ناتوانین سوود لە تورکیا وەربگرین کاتێك نەبێت کە بارودۆخی سیاسی گۆڕانی بەسەردا دێت یان لەو ڕێگەیەوە کە تورکیا بخرێتە ناو شەڕێکەوە و لەو شەڕەدا بشکێت ، یان لەو ڕێگەیەوە بیخەینە ناو کۆمەڵێ گیروگرفتی نێودەوڵەتی یەوە یان لە هەر دوو ڕێگەکەوە لە یەك کاتدا [2] .

( سوڵتان عبدالحمید) ئامانجەکانی جوولەکەی ئەزانی ، ئەوەتا لە یاداشتە سیاسی یەکانیدا ئەڵێت : (( هرتزلی سەرۆکی زایۆنیزم ناتوانێ قەناعەتم پێ بهێنێ بە بیروڕاکانی خۆی ، لەوانەیە ئەو قسەیەی ڕاست بێت لای خۆی کە ئەڵێ : گیروگرفتی جوولەکە کاتێك چارەسەر ئەبێت کە تواانای ئەوەی هەبێت خۆی گاسنەکەی خۆی بگرێتە دەست ، بۆیە هەوڵ ئەدات زەوی بۆ برا یەهودی یەکانی دەستەبەر بکات ، بەڵام ئەوەی لەبیر نی یە کە زیرەکی بەس نی یە بۆ چارەسەرکردنی هەموو گیروگرفتەکان .. جوولەکە بەوەوە ناوەستن خەریکی کاری کشتوکاڵ بن لە فەلەستیندا ، بەڵکوو ئیشی تریان هەیە وەك دروست کردنی حکومەت و هەڵبژاردنی نوێنەران ، من باش لەوە گەیشتووم جوولەکە چەند چاو چنۆکن ، بەڵام جوولەکە ڕووکەش ئەبینن ، وا گومان ئەبەن من مل بۆهەوڵەکانیان ئەدەم . من چۆن ئەو خزمەتانەی هاووڵاتی یە جوولەکەکانی خۆمان ئەنرخێنم کە بەرامبەر ( باب العالی ) کردوویانە" ئاواش

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٤٨ .

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٤٧.

دژ بەو ئاوات و چاوبڕینانەیان ئەوەستم کە بڕیویانەتە فەلەستین [1] (عبدالحمیدی دووەم) دەربارەی ( قودس ) یش ئەڵێ :

(( بۆچی واز لە قودس بهێنین ... " قدس " خاکی ئێمەیە لە هەموو کاتێکدا و لە هەموو سەردەمێکدا و تا دونیاش دونیایە هەر ئاوا ئەمێنێتەوە .. ((قدس)) یەکێکە لەشارە پیرۆزەکانی ئێمە ، و ئەکەوێتە خاکێکی ئیسلامی یەوە و ئەبێت هەرواش بمێنێتەوە )) [2] .

(سوڵتان عبدالحمید) ( ئەو ماوە زۆرە ) گویٚ ی بۆ ( تیودۆرهرتزل) ) گرت مەبەستیشی ئەوە بوو ئەم شتانە بزانیٚ :

١- ڕاستی نەخشەکانی جوولەکە .

٢- زانینی هێزە جیهانی یەکانی جوولەکە و ڕادەی بەهێزیان .

٣- ڕزگارکردنی دەوڵەتی عوسمانی لە ترسناکی یەکانی جوولەکە [3] .

(سوڵتان عبدالحمید) هەموو دەزگاکانی هەواڵگری دەرەوە و ناوەوەی ئاگادار کرد کە وورد چاودێری جوولەکە بکەن و ڕاپۆرتی ( وورد ) بنوسن بۆی دەربارەیان ، و دوو فەرمانی دەرکرد : یەکەمیان لە ٢٨ی یوبیو / ١٨٩٠ زدا و دووەمیان لە ٧ی یولیوی / ١٨٩٠ زدا ، لەیەکەمیاندا بڕیاری ئەوە دراوە کە ( هیچ جوولەکەیەك وەرناگیرێت لە میرنشینەە شاهستانی یەکاندا ) و لە دووهەمیاندا هاتووە ( ئەرکی ئەنجومەنی وەزیران ئەوەیە لێکۆڵینەوەیەك بکات لەسەر لق و پۆپەکانی ئەم پرسە و بڕیاری جدی و کۆتایی تێدا بدات [4] .

(سوڵتان عبدالحمید) هەموو ڕێگەیەکی گرتە بەر بۆ ئەوەی زەوی نەفرۆشرێت بە جوولەکە لە فەلەستیندا ، لە پێناو ئەمەشدا کاری زۆری بۆ ئەوە ئەکرد کە هیچ جۆرە ( امتیاز ) یٚك نەدرێتە جوولەکە و بیکەنە بیانوو بۆ دەسەلاٌت پەیدا کردن لەسەر خاکی فەلەستیندا ، کە کار گەیشتە ئەمە پێویست بوو چی ڕێکخراوی زایۆنیزمی هەیە سەر بکەن بەیەکدا بۆ ئەوەی (سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) لە دەسەلاٌت دوور بخەنەوە ، ئەوی پشتی ئەم قسەیە ڕاست ئەکاتەوە ئەو قسەی"(هرتزل) " ە کە ئەڵێت (( من هیچ ئومێدێکم نەماوە بەوەی ئاواتەکانی

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص١٤٨ .

[2] ) بڕوانە : العثمانييون في التأريخ والحضارة ، ص٥٧ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ٥٦ .

[4] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص٨٨ .

جوولەکە لە فەلەستیندا بێنە دی ، و جوولەکە ناتوانن بچنە ئەو خاکەی ( خوا وادەی پێ داون ) [1] تا (سوڵتان عبدالحمید) لەسەر کورسی دەسەلاَت بێت ، و بەردەوام بێت تێیدا [2] .

زایۆنیزمی جیهانی کەوتنە جووڵە ، بۆ پشتیوانی کردنی لە دوژمنانی (سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) ، کە ئەوانەش ، یاخی بووە ئەرمەنی یەکان و ناسیۆنالسیتەکانی ناو بەلقان و بزوتنەوەی کۆمەڵەی (( ئیتحاد وتەرەقی )) بوون ، ( بڕیاریاندا ) کەلە پشت هەموو بزوتنەوەیەکی جوداخوازی یەوە بوەستن کە ئەیانەوێت لە دەوڵەتی عوسمانی جیاببنەوە [3] .

## باسی چوارەم

### ( سوڵتان عبدالحمید ) و کۆمەڵەی ئیتیحادوتەرەقی

ئەکرێ بێ دوودڵی بڕیاری ئەوە بدەی کە کەسێك هەیە لە توانایدا هەیە کارێك بکات یان لە توانایدا نی یە ، بەلاَم ناتوانی بڕیاری ئەوە بدەی کە بە فلاَن شێوە کارەکە ئەکات ، ئەگەر " کمال بگ " بێنیتە بەرچاوی خۆت ، چونکە ئەو خۆشی خۆی ناناسێت ، ئەتوانی بڵێ ی ئەو یەکێکە لە کەسایەتی یە دەگمەنەکان ، ئەوانەی کە بە دوو شێوەی جیاواز ئەژین،ئەم ژیانەیان بە پێ ی حەزەکانی زۆر جیاوازە لە ژیانەکەی تری ، ئەوانەی لە نزیکەوە ئەیناسن ، ئەزانن .. کاتێك کە لەگەڵ ( سرای ) دا ڕێك وبێ کێشە بوو کتێبی ( التاریخ العثمانی )) دانا ، و کەئەم پەیوەندی یەشی خراپ بوو ، ئەزانن هات سەری ئەژدیهاکەی قرتاند بەوەی ووتی : (( سەگە ئەو کەسەی بێ ترس لە خزمەت ڕاوکەرێکی بێویژداندا بێت )) ، ئەوکابرایە پیاوێکی حول حولیە ، لەوانیە پیاوێکی زۆر دڵسۆز بێت ، ئەتوانی لەماوەی چەند کاتژمێرێکدا وای لێ بکەیت وەك تۆ بیر بکاتەوە ، بەلاَم ناتوانی ئەوە بزانی چەند کاتژمێری تر یان چەند ڕۆژی تر لەسەر ئەو بیروڕایە ئەمینێتەوە [4] .

پاش ئەوەی (سوڵتان عبدالحمید) بۆی دەرکەوت کە (کۆمەڵەی عوسمانی یە تازەکان) و بەسەرکردایەتی ( مدحت پاشا ) بەردەوام کارتی فشار بەکاردێنن بۆ ئەوەی بیروڕاکانی

---

[1] ) ئەوی ناو کەوانەکەمان بۆ (( الارض الموعودة )) بەکارهێناوە ( وەرگێڕ. ن.).

[2] ) بڕوانە : الیهود والدولة العثمانیة ، ص١٥٨ .

[3] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ، ی محمد حرب ، ص٢٣٤ .

[4] ) مذکرات السلطان عبدالحمید ، ص٤٧ .

ئەوان وەربگرێت ، و ناچاریشیان کرد شەڕی عوسمانی ڕوسی بکات ، سوڵتان کەوتە کار کردن بۆ ئەوەی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە بلاّوە پیٚ بکات ، سەرتا گەورەکەیان کە (صەدری ئەعظە م)یش بوو ( واتە مدحت پاشا)ی دوورخستەوە ، دوای ئەم ڕاستەو خۆ دووپیلان دژی سوڵتان ڕاست بوویەوە بۆلابردنی لەسەرکار ، یەکێکیان : بەسەرکردایەتی ( علی سعاوی ) بوو کە ئەندامی کۆمەڵەکە بوو ، ئەوی تریان :پیلانێکی ماسۆنی بوو کۆمەڵەی (( کلانتی سکالییری عزیر )) پیٚ ی هەستا .

هەردوو پلانەکە ئینگلتەرا پشتیوانی لێکرد ، بەلاّم هەردووکیان نشوستیان هێنا ، و سوڵتانیشی وا لێکرد کە چاودێری توند بخاتە سەر ئەو بیروڕا هاوردانە و هەموو ئەوانەش کە کەوتوونەتە ژێرکاریگەری یانەوە ، لەم سەرو بەندەدا بوو خانەیەکی نهێنی لە قوتابییانی قوتابخانەی جەنگی لە ئەستنبولٚ کە هەواداری ئەو بیروڕا تازەیە بوون ، قوت بوونەوە و ئامانجیان ئەوە بوو کە دژایەتی (سوڵتان عبدالحمید) بکەن ، ئەوە بوو یەکێك لە ئەندامانی کۆمەڵەی ( کلانی _ عزیزبگ ) ی ماسۆنی کە ( علی شفقطی بگ ) بوو توانی هەڵبێت و بچێتە ( نابولی ) و لەوێوە بۆ جنێف ، و لەوێدا لە نێوان سالاّنی ( ١٨٧٩ _ ١٨٨١ ) ڕۆژنامەیەکی دژ بە دەسەلاّتی عوسمانی دەر بکات بە ناونیشانی ( استقبال ) واتە: داهاتوو.

لە سالّی ١٨٨٩ زدا لە قوتابخانەی سەربازی تەندروستی دا لەئەستەنبولٚ ، ڕێکخراوێکی قوتابیان دامەزرا ، چونکە هەندیٚ مامۆستا لەوێدا بە شێوەیك زیاتر قوتابیانیان هان ئەدا نەیاری دەسەلاّت بکەن ، و بیرو ڕای عوسمانی یە تازەکان بلاّو بکەونەوە ، دامەزرێنەری ئەم ڕێکخراوە (( ابراهیم تیمور ڕۆمانی )) بوو کە لەژێر کاریگەری کوڕە ئیتالّی یەکانی ماسۆنیەتدا بوو ، ئەم ڕێکخراوەی ناو نا (( یەکێتی عوسمانی )) و یادی سەد ساڵەی شۆڕشی فەڕنسی یان کردە ڕۆژی ئاهەنگێران و مێژوو بۆ ڕێکخراوەکەیان و لە ناو ئەنجامەکانیدا : (دژایەتی کردنی فەرمانڕەوایی (سوڵتان عبدالحمید) ، دامەزراندنی دەوڵەتێك کە گونجاو بێت لەگەڵ بیرو ڕا سیاسی یەکانی سەردەمدا ، کە ئەزمونی دەوڵەتە ڕۆژئاوای یەکان بکاتە نمونە بۆ خۆی ، وەك _ ئینگلتەرا و فەڕنسا و ئەڵمانیا و بانگەشە کردن بۆ دەستوور و ئازادی و دیموکراتی) هە بوون .. ) [1] .

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحميد الثاني ، ص٢٧٩ .

لەم قوتابخانەی سەربازی تەندروستی یەوە ، بیروڕاکانی کۆمەڵەی ( یەکێتی عوسمانی ) تەشەنەی کرد بۆ هەمووقوتابخانە باڵاکانی تر ، گشت خانەکانی ئەم کۆمەڵەی یەکێتی یە خانەی نهێنی بوون لەسەر سیستمی کۆمەڵەی ( کاربۆناری ) ئیتاڵی کاریان دەکرد .

ئەم کۆمەڵەیە پەلەپەلی نەئەکرد ، نە لە بانگەشە بۆ بیروڕاکانی ، نە لە چالاکی و جووڵاندا دژ بە سوڵتان ، تەنانەت ( احمد رضابگ ) تا پلەی بەڕێوبەری بەڕێوەبەرایەتی مەعاریف لەناوچەی(بۆصه) ش چوو ، پاشان لە ساڵی ١٨٨٩ زدا سەردانێکی پاریسی کرد بە بیانوی ئەوەی کە بۆ پێشەنگایەکی نێو دەوڵەتی ئەچێت لە پاریس ، کە گەیشتە ئەویٚ ڕای گەیاندئیتر ناگەڕێتەوە بۆ وولاتەکەی ، و لە فەڕەنسادا نزیکەی شەش ساڵ مایەوە ، جوڵەیەکی نەیاری وای لیٚ دەرنەکەوت شایەن بە تۆمارکردن بێت ، تا ساڵی ١٨٩٨ ز کە ڕۆژنامەی ( مشورات ) ی دەرکرد .

دامەزرێنەری کۆمەڵەی یەکێتی _ ابراهیم تیمور _ باسی ئەوە ئەکات کە زۆربەی کاتەکانی لە دەرەوە بەسەرئەبرد تا ساڵی ١٨٩٤ ز _ و هەر لەهەوڵی ئەوەدا بوو ئەندامی تازەپەیدا بکات بۆ ڕێکخراوەکەیان و پەروەردەیەکی شۆڕشگێڕانەیان بکات و کۆبونەوەی نهێنی بکات و چالاکی یە ڕۆشنبیری و ئەدەبیەکان بخوێنێتەوە کە لە لایەن ئەندامانی کۆمەڵەی عوسمانی یە تازەکانەوە ئەنووسران ، وەك _ نامق کمال و ضیاء پاشا ، هەروەها بڵاوکراوەکانی ( علی شفقطی بگ ) کەڕای کرد بوو بۆ ئەوروپا و ئەندامی (کلانتی ماسۆنی) بوو( ٢)[1] . لە ئەنجامی نامە گۆڕینەوەی نهێنی نێوان ئەندامانی کۆمەڵەی یەکێتی عوسمانی لە دەرەوە و لە ناوەوە ، لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە کاری سەربازی و مەدەنییان دژ بە سوڵتان یەك بخەن ، ناوی ( کۆمەڵەی ئیتیحادو تەرەقی ) بنێن لە خۆیان وەك ( ڕێکخراوێك ) بۆ یەکگرتنی هەردوو باڵی ( سەربازی و مەدەنی ) کە لە بازنەی یەکێتی یەکدا کاریان ئەکرد .

ناوی کۆمەڵەکە لە ناوەندە سەربازی یەکاندا بریتی بوو لە ( یەکێتی عوسمانی ) ،( احمد رضا بگ) نوێنەری باڵای مەدەنی بوو ، لەژێر کاریگەری بیروڕاکانی ( اوغست کانت ) ی فەیلەسوفدا بوو، دەستوری ئەم فەیلەسوفە ئەوە بوو : (( ڕێکخستن و گەشەکردن )) ، (احمد رضا) ووشەی (( گەشەکردن ))ی لە دەستوری ( کانت ) ەوە وەرگرت ، باڵە سەربازیەکەش

---

[1] ) بڕوانە : مذكرات ابراهيم تيمو ، ص٩ .

دەستیان گرت بەناوی (( یەکێتی )) یەکەوە ، هەموو لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کە ناوی کۆمەڵەکەیان (( یەکێتی و گەشەکردن )) بێت [1] .

خانەکانی ( یەکێتی و گەشەکردن )(*) بەناو یەکەکانی سوپا و فەرمانبەرەکانی دەوڵەت لەدەزگا مەدەنیەکاندا بلاْوبوویەوە و ، ئەم دوو باڵە لە ( پارسیدا ) یەکیان گرت لە یەك کاردا بە هەر دوو باڵە مەدەنی و سەربازی یەکەیەوە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی پراکتیك دژ بە (سوڵتان عبدالحمید) بکەونەکار ، ئەم کۆمەڵە توانی سوڵتان لە ٢٤/ یولیو / ١٩٠٨ زدا ناچار بکات دەستور ڕابگەیەنێت کە لەوە و پێش و لە ساڵی ١٨٧٧ زدا بڕیاری ئیش ڕاگرتن بەدەستور دا بوو [2] .

بیری سیاسی کۆمەڵەی ((ئیتیحادو تەرەقی )) پێ ی لەسەر چەمەکەکانی طورانی دائەگرت لەسەر هەردوو ئاستی ناوەوە و دەرەوە ، " طورانیەت " ناوێکە ئاماژە بۆ نیشتمانی ڕەسەنی تورك ئەکات ، و ئەم ناوە ئەدرێتە پاڵ کێوی " گوران " کە ئەکەوێتە ناوچەی باکوری ڕۆژهەلاْت لە ئێراندا [3] .

لەناو بزوتنەوەی ((ئیتیحادو تەرەقی )) دا ڕەوتێکی بەهێز هە بوو پێ ی لەسەر ئەوە دا ئەگرت کە تورك کۆنترین میللەتانی سەرزەوی یە و لە هەموو میللەتانی دنیا ڕەسەنترە و پێش هەمووان شارستانێتی ناسیوە ، ئەمان و ڕەگەزی ( مەغولی ) لە بنەڕەتدا یەکن و ئەبێت بینەوە بەیەك ، و ئەمە ناو ئەنێن (( کۆمەڵەی طورانی )) و ئەمەیان تەنیا قۆرغ نەئەکردەوە لەو تورکانەدا کە لە (سیبریا ) و تورکستان و صین و فارس و قەوقاز و ئەناضۆلَ و ڕوسیادا هە بوون ، دروشمیان گوێ نەدان بوو بە ئایین و پشتگوێ خستنی جامیعەی ئیسلامی بوو، کاتێك نەبێت کە خزمەت بە ناسیونالیزمی طورانی بکات ، ئەوکاتە ئەبێتە (( کەرەسە )) نەك (( مەبەست )) ! ئەمەش واتای ئەوە ئەگەیەنیْ کە ئەم ئاڕاستەیە بانگەشە بۆ زیندوکردنەوەی بیروباوەڕە بتپەرستیەکانی کۆنی تورك ئەکات وەك( بتی کۆنی تورك  بوز قورت ) یان گورکی

---

[1] ) بڕوانە : السلطان عبدالحمید الثاني ، ص٢٨١،٢٨٠ .

(*)ئێمە لەم نوسینە دازیاتر(ئیتیحادوتەرەقی)مان بەکارهێناوەتە((یەکیەتی وگەشەکردن)) (وەرگێڕ:ن.)

٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص٢٨١ .

[3] ) بڕوانە : الیهود والدولة العثمانیة ، ص١٨٣ .

سپی _ ڕەش کە وێنەکانیان خستنە سەر( پولی پۆستە )و سروودیان پێدا هەڵئەدان و سوپایان بەو ئەرکە بارکرد کە ئە بوو هەموو پێش خۆر ئاوا بوونێك ڕیز ببەستن و ئەو سرووده بڵێن ، وەك ئەوەی سلاو کردن لە (گورگ) لە بری نوێژ دانرابێت ، ئەمەش وەك زیادەڕەوی یەك بۆ ئەوەی هەستە ناسیۆنالیزمەکە بچێتە جێگەی هەستە ئایینی یەکە ، ئەم کەسانە ( ئەتلاو طغرك ، جەنگیزخان و تیموری لەنگ ) بە پاڵەوان و قارەمانی خۆیان ئەزانن و نمونەیان پی'دێننەوە .

ئەم ئاڕاستەیە لەناو ( طورانیە ت )دا ئەوەندە توند ڕەوی کرد گەیشتە ئەوە بڵێن : (( ئێمە تورکین و کەعبەی ئێمە طورانە ) ، ئەمانە بەردەوام گۆرانی بە بالای (جەنگین)دا ئەڵێن و زۆر بەسەرسامیەوە باس لە فتوحاتەکانی مەغۆل ئەکەن و نکۆلی لە هیچ کارێکیان ناکەن و سروودیان بۆ هەموو ڕووداوەکانی جەنگیزخان داناوە بۆ ئەوەی هەموو کەس سەرسام بێت پێیان و دەرونیان بچێتە ئەو ئاستەی ڕێبەرەکەی ئەمانی پیٚ گەیی ، هەموو ئەمانە نوێنەرایەتی ئەو ئاڕاستەیان ئەکرد : ( فیاکوك الب )[1] و یوسف اقثور و جلال ساهر و یحیی کمال و حمداللە صبحی و محمد امین بەگی شاعیر و زۆرێك لە ئەدیبان و زۆربەی تری قوتابیان و نەوەی نویٚ .

کاریگەری جوولەکە لەسەر ( طورانیە ت ) شتێکی ئاشکرایە ، لەم ڕووەوە (نیازی برکس) لە کتێبی " هاوچەرخی لە تورکیا " دا ئەڵیٚ : (( جوولەکەکانی ئەورووپا و جولەکە خۆ جێی یەکانیش لەهەردووسەدەی نۆزدەهەم و بیستەم دا ڕۆڵی گەورەیان بینی لە دامەزراندنی ناسۆنالیزمی گورانیەتدا لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا لە هەردوو سەدەی نۆزدەهەم و بیستەمدا ، زانا جولەکەکان لە ڕۆژئاوادا وەك ( لومالی داڤید و لیون کاهون و ئەرمینیوس نامیری ) دەستیان دایە نوسین لەسەر بنچینەکانی بیری ناسۆنالیزمی طورانی ، هەر وەك جولەکە خۆجیٚ یەکانی دەوڵەتی عوسمانی وەك کراسوا ( قەرەصوٚ ) و موئیز کوهین و ئابراهام غالانتی ، پشکی گەورەیان هەبوولە کۆمەڵەی ( یەکێتی و پێگەیشتن ) دا ، هەرئەوەندەی ئەم کۆمەڵە سەرکەوتنیان بەدەست هێنا و حوکمی (عبدالحمید)یان لابرد و دەستیان بەسەر

---

[1] ) بڕوانە : الیهودو الدولة العثمانیة ، ص١٦٥ .

دەسەڵاتدا گرت خێرا زایۆنیزم داوای لە یەکێتی یەکان کرد کە کۆمەڵە دان بەوەدا بنێت کە فەلەستین نیشتمانێکی نەتەوەیی جوولەکەیە .. ) [1] .

(نیازی برکس) لەو کتێبەی ڕابورد" ناوی " موئیزکوهین " ی جوولەکە دێنێ ، کە (( رینیه بیلو )) بەم شێوەیە باسی ئەو کابرایە دەکات و دەڵێت :

١- بە دڵنیاییەوە (( کوهین )) یەکێکە لەدامەزرێنەرانی بیری ناسۆنالیزمی طورانی لەناو دەوڵەتی عوسمانیدا .

٢- کتێبەکەی (( موئیزکوهین)) بریتی بوو لە ( کتێبی پیرۆز ) بۆ سیاسەتەکانی طورانیە ت) [2].

ئەم موئیز کوهینی جولەکە ( مەزهەبە ) زۆر چالاکانە پێناسەی ((بزوتنەوەی یەکێتی وگەشەکردن )) ی لە ڕۆژنامەکانی ئەوروپادا ئەکرد ، چونکە لەگەڵ زانینی زمانی عیبرانی و تورکیشدا چەند زمانی ئەورووپیشی ئەزانی بە وتارێك دەستی پێ کرد کە بە زمانی فەڕەنسی نوسیبووی بە ناوی ( تورکەکان بە دوای گیانێکی ناسیۆنالیزمی دا ئەگەڕێن ) [3] .

موئیز کوهین پشکی گەورەی هە بوو لە داڕشتنی سیاسەتە ڕەگەزپەرستی یەکەی طورانیەت دا ،ئەو سیاسەتەی کە کۆمەڵی ( ئیتیحادو تەرەقی ) لەسەری ئەڕۆیشتن و ئەو سیاسەتەش بوویە هۆی لێکترازاندنی گەلەکانی ناو دەوڵەتی عوسمانی و کردنی بە ڕەقیبی یەکتری .

ئەم کابرا جوولەکەیە نەماندوبون و نە بێ تاقەتی نەئەزانی لەکارکردندا بۆ بلاْوکردنەوەی بیری ناسیۆنالیزمی (تورکی) بۆ ئەوەی دەوڵەتی عوسمانی لەت و پەت بکات ، سێ کتێبی نوسی کە دوایی بوویە میتۆد بۆ یەکێتی یەکان کە ئەمانەن : ( ماذا یمکن ان یکسب الاتراك من هذه الحرب ) و ( الطوران ) و ( سیاسه التتریك ) .. ئەم نوسەرە یەهودیە نوسینی لەسەر بیری کەمالیەتیش هەیە وەك ( الکمالیه ) و کتێبی تریشی بەناوی ( الروح الترکیه )هەیە کە تێیدا مێژووی گەشەسەندنی " ڕەگەزی تورکی " ی باس کردووە [4] .

---

[1] ) بڕوانە : العثمانیون في التأریخ والحضارة ، ص١١٩ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١١٩ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ، ص١٢٠ .

[4] ) بڕوانە: العثمانیون في التاریخ والحضارة ، ص١٢٢ .

کۆمەڵـەی (یـەکێتی و گەشەسـەندن) کـاری بـۆ ئـەوە ئـەکرد هەسـتی ناسـیۆنالیزمی لای تورکـەکان بورژوژێـت لەژێرخـەونی طـورانیەتـدا ، چـەند چـەمکێکی تـازەی خـستە نـاو وەك (نیشتمان) و (دەستور)و (ئازادی) کە ئەم چەمکانە شتی نامۆ بوون لە ناوعوسمانی یەکانـدا و کۆمەڵێك لاوی ڕۆشنبیری تورك لە ڕیزەکانیاندا هە بـوون جگـە لـە جوولەکـەکانی دۆنمـە ، و مەبەستی سەرەکیشیان ئەوە بوو کە حوکمی (سوڵتان عبدالحمیدی دووەم) نەهێڵن [1] .

## ( باس پێنجەم )

### ( دەست گرتن بەسەر فەرمانڕەوایی سوڵتانی عبد الحمیدی دووەمدا )

سـوڵتان عبدالحمـدی دووەم زۆر بـەئاگاو بەحـەزەر بـوو لـە کۆمەڵـەی ( ئیتیحـادو تـەرەققی ) پاڵپـشت کـراو بـە جولەکـەو دەسـتەو تاقمـە ماسـۆنی و دەوڵەتـە ڕۆژئـاوایی یـەکان . دەزگـای زانیـاری سـوڵتان عبدالحمیـدی دووەم تـوانی کـە شـارەزایی لەسـەر ئـەو بزوتنـەوەیە بەدەسـت بخـات و زانیـاری یـەکانی لـەبارەوە کۆبکاتـەوە ، بـەلاّم بزوتنـەوەکـە بـەهێز بـوو ، چـاودێری عبدالحمیدیش لەسەر ئەندامانی ئەو بزوتنەوەیە لە کـاتێکی دواتـر و درەنـگ دا بـوو ، بـەوەی خەڵکیان پاڵ پێوە نا بۆ چەندخۆپیشاندانێکی پڕ هەراو هوریا لە ( سلانك ) و ( مناسـتە ) و (ئـسکوب ) و( سوسـن ) و داوای پێداچـونەوەی دەسـتوریان دەکـرد . زیـاد لـەوەیش خۆپیشاندەران هەڕەشەی کشان بەسەر قوستەنتینیەیان دەکرد . ئەو کارەی وایکرد سوڵتان ملبـدات بـۆ داواکـاری خۆپیـشاندەران و هەسـتا بەڕاگەیانـدنی دەسـتورو زیندووکردنـەوەی پەرلـەمان ، ئـەوەیش لـە ٢٤ی تـەمووزی ١٩٠٨ دا بـوو . لێـرەدا چـەند هۆکارێـك وای لـە( ئیتیحـاد و تـەڕەقی ) کـرد کـە لـەو ماوەیـەدا سـوڵتان عبدالحمیـدی دووەم لەسـەر کورسـی دەسەڵاّت بمێنێتەوە ، لەوانە :

١-( ئیتیحاد و تەڕەققی ) هێزی تەواو پێویستی نەبوو بۆ لابردنی سوڵتان لە ساڵی ١٩٠٨ ز دا .

٢- سوڵتان عبدالحمیـدی دووەم سیاسـەتی نـەرمی لەگەڵـدا نوانـدن ، بەڵێنی جێبەجێکردنی خواستەکانیان کە هێنانەوەی دەستور بوو .

٣- هـۆگری عوسمـانی یـەکان بـۆ خـودی سـوڵتان عبدالحمید . ئـەم خاڵـەیش ڕوون و دیـارە ، چـونکە لیژنـەی ئیتیحـاد و تـەڕەققی زاتـی تـەواو و پێویـستی نـەبوو لەسـەر بلاّوکردنـەوەی

---

[1] ) بڕوانە : اليهود والدولة العثمانية ، ص١٦٨ .

بانگەشەکانی دژ بە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم لە نێو سەربازەکانیدا چونکە ئەو خەڵکە ڕێزی سوڵتانیان دەگرت و بە گەورەیان دادەنا [1].

بەڕاستی زایۆنیزمی جیهانی بەوەوە نەوەستاکە کودەتای دەستوری لەساڵی ١٩٠٨ز دا بکات . بەڵکوو لەگەڵ کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەڕەقیدا هاوکاری کرد لە پێناو بەدەستهێنانی دەستکەوت گەلێکی زیاتر لە نێو فەلەستیندا .بۆ ئەمەش وا پێویست بوو بە یەکجاری ڕزگاری بێت لە سوڵتان عبد الخمیدی دووەم . بۆیە نەخشەی ڕووداوەکانی ٣١ی ئەبرێلی ١٩٠٩ ی نێو ئەستەنبوولی سازدا . کە لە ئەنجامەکەیدا پێکدادانێکی گەورە ڕویدا و تیادا هەندێ سەربازی کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەڕەققی کوژران کە لە مێژوودا بەناوی ( ڕوداوی ٣١ی مارت ) ناسراوە .

ئەو پێکدادانە گەورەیە بە پلانێکی ئەوروپی جولەکانە لەگەڵ پیاوانی ئیتیحاد و تەڕەققی لە پایتەختدا ڕویدا . لە ئەنجامدا سەربازانی( ئیتیحاد و تەڕەقی ) لە سلانیکەوە کەوتنە ڕێ و چوونە ئەستانبوول ، بەمە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم لە هەموو دەسەڵاتی شارستانی و ئایینی یەکان داڕنرا ، پاشان کۆمەڵەی ( ئیتیحاد و تەڕەقی ) ئەم تۆمەتانەیان دایە پاڵ :

١- ئەنجامدانی ڕوداوی ٣١ی مارت .

٢- سوتاندنی قورئانەکان .

٣- زیادەڕۆیی کردن .

٤- ستەمکاری و خوێن ڕشتن [2].

لەگەڵ ئەوەی کۆمەڵەی ( ئتیحاد و تەڕەققی ) کاری بە بیرۆکە ڕۆژئاوایی یەکانی دژ بە ئیسلام و بیری ئیسلامی ئەکرد ، بەڵام لەکاتی قسەکردن لەگەڵ خەڵکدا ئایینیان بەکارئەهێنا بۆ کاریگەری کردنە سەر خەڵکەکەو بەدەستاهێنانی پشتیوانان بۆ خۆیان دژ بە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم . لە و کارەشیاندا سەرکەوتوو بوون . کۆمەڵەکە لە بەیانەکەیاندا بۆ عوسمانی یەکان دەیانوت : ( ئەی عوسمانی یەکان : مەبەستی ئێمە سەلامەتی دەوڵەت و خەلافەتە و هیچ کەسیش نی یە لەوە بێ ئاگا بێت ) . ( پشت بەخواو هیممەتی برایان ) و (

---

[1] ) اليهود و الدولة العثمانية ص١٦٨

[2] ) العثمانيون في التأريخ والحضارة ص٥٠

ئـەی موسـڵمانان : بەسـە ئـیتر هـەروەك تەماشـاكەرێك سـەیری سـوڵتانێكی خـۆ سـەپێن و بێباوەڕبكەین كە قورئان لە ژێرپێكانیدا دەشێلێت ، هەروەها ویژدان و ئیمانیش ئەخاتە ژێر پـێ ) و ( ڕاچـڵەكێن ئـەی ئوممـەتی محمـد ) و ( دلێـری دلێـری ئـەی موسـڵمانان ! دلێـری لـە ئێمەوەو یارمەتی لە خواوە ، نـصر مـن الله وفتح قريـب ) و ( ئـەی موسـڵمانی یەكتاپەرست ! بـەناوی پەروەردگارتـەوە بخوێنـە ) و ( ئـەی موسـڵمانی یەكتاپەرسـت ڕاپـەڕەو ئـایین و ئیمانەكـەت لـە دەسـت ستەمكاران ڕزگار بكـە و بـەوەیش خـۆت ڕزگار بكـە ! چـونكە لێـرەدا شەیتانێكی خۆسەپێن و زۆردار هەیە كە تاجێكی لەسەرسەری داناوە و ئایین و ئیمانەكـەت لە دەستی ئەو دایە . جا ئەی یەكتاپەرست ئایین و ئیمانەكەت لە دەستی ئەو ڕزگار بكـە ) و ( ئەیموسـڵمانان : سـوڵتان عبدالحميـد – بـە پێـی شـەرع – سـوڵتان و خـەلیفـە نـی یـە ! هەركەسیش بـاوەڕ بـەو قـسەیەمان ناكـات : بـا بڕوانێتـە قورئـان و فـەرموودەكانی پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم ) . بەڕاسـتی كۆمەڵەكـەمان بـە ئایەتـە قورئـانی و فـەرمودەكانی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم ) و فرمانەكانی خواو فرمانـەكانی پێغەمبـەر ( صـلی الله علیـە وسـلم ) سـەری هەڵـداوە كـە ئاڕاسـتەی حكومـەت و خـەڵك كـراون . بـەلام سـوڵتان عبدالحميـد خـۆی دوور گرتـووە لـە فەرمانـەكانی خـواو پێغەمبـەر (صـلی الله علیـە وسـلم ) لەمـەوە : ستەمكاری یەكەی چەسپاو و سەلمێنراوەو شەرمی ڕەخنـەگرتن لە خـوا تێدا نـی یـە ، بۆیـە پێویستە لەسـەر گەلەكـەمان پـەنا بـەرن بۆ چـەك لـە دژی . ئەگـەر گـەل ئـەوە نـەكات ، ئـەوكات دەبێت تاوانەكانی سوڵتان عبدالحميد وەك ستەمكارێك لە ئەستۆ بگرێت ) [1].

بەڕاستی بیری جوڵێنەری نێو ئاڕاسـتەكانی كۆمەڵـەی ئیتیحـاد و تـەڕەقی بریتـی بـوو لـە بیروڕای :

( ماسۆنیەت ) كە دان نانێت بە هیچ ئاینێكدا وكاربە فەلسەفە دانراوەكان ( عەقلانیـەت ، كـە ئـایین ڕەت ئەكاتـەوە ) و عەلمانیـەت ( كـە ئـایین لـە ژیـان دوور دەخاتـەوە ) دەكـات . لەگـەڵ ئەمەیشدا شۆڕشگێرە ئیتیحـادی یـەكان ئایینیـان بـەكار دەهێنا بۆ دژایـەتی كردنـی سـوڵتان عبدالحمیدی دووەم و بەناوی ئایینەوە قسەیان بۆ هەڵدەبەسـت [2] ئـەو تۆمەتانـەی ئاڕاسـتەی سـوڵتان عبدالحمیـدی دووەم كرانـەوە ، لـە بـەردەم لێكۆڵینـەوەی زانـستی دا دەركـەوت كـە

---

١) السلطان عبدالحميد الثاني ص٢٨٢ ، ٢٨٣ .

[2]) هەمان سەرچاوەی پێشوو ص ٢٨٣ .

خۆیان ناگرن هەروەك لەبەردەم ئەو بەڵگانەدا خۆیان ناگرن کە شایەتن لەسەر دوورە پەرێزی تەواوی سوڵتان لەوانەی دراونەتە پاڵی ، بە بەڵگەکان بێ ئاگای سوڵتان هەر ئاگاداری ڕوداوی ۳۱ی مارت نەبووە ، هەروەك ( شتێکی مەحاڵە کە سوڵتان عبدالحمید قورئان بسوتێنێن ، چونکە ئەو سوڵتانێکی ناسراو بووە بە لە خوا ترسی ، و نوێژنەکردن و تەمبەڵی کردن لە پەرستشی لێنە بینراوە ، هەروەك ئەو بە زێدەڕۆیی نەکردن ناسراوە ، چونکە ئەو زێدەڕۆیی نەزانیوە بەوەی هەمیشە ماڵ و سامانی لەلا کۆبووەتەوە . ئەو لە ماڵی تایبەتی خۆی چەندین باری گرانی لە سەرشانی دەوڵەت لابردووە ) . لەمەڕ ستەم و خوێن ڕێژیشەوە ، سوڵتان عبدالحمید شتی وای لێ نەبینراوە ، خوێن ڕشتنیش هیچکات لەنێو سیاسەتی ئەودا نەبووە [1] .

ئەوە لە بیروخولیای کودەتاکەران وون نەدەبوو کە فشاربەرن بۆ موفتی ئیسلام محمد ضیاءالدین تا فەتوای لابردن لەسەر کاری خەلیفە دەربکات ، جا لەڕۆژی سێ شەممە ۲۷ی مانگی نیسانی ساڵی ۱۹۰۹ ز دا ۲٤۰ ئەندامی ئەنجومەنی ناوداران لە کۆبوونەوەیەکی هاوبەشدا کۆبونەوەو بەیەك دەنگ بڕیاری لابردنی سوڵتان عبدالحمیدیان دا نوێنەر ( حەمدی ئەفەندی مالی ) ڕەشنوسی فەتواکەی شێخی نوسی ، بەڵام ئەمینی فەتوا ( نوری ئەفەندی ) کە بانگ کرابوو بۆ کۆبونەوەکە ، ئەو ڕەشنوسەی ڕەت کردەوە و هەڕەشەی دەست لە کارکێشانەوەی لە پۆستەکەی خۆی کرد ئەگەر گۆڕانکاری بەسەردا نەهێنرێت ، ژمارەیەك لە پشتوانەکانی لە نوێنەران لەو گۆڕانکاری یە دا پشتگیریان کرد . بۆیە بەشی کۆتایی گۆڕدرا بەوەی ئەنجومەنی ( مبعوثان ) بڕیاری ئەوەی دا سوڵتان خۆی وازبێنێ یان لەکورسی دەسەڵاتلا بدرێت .

ئەمەیش دەقی فەتواکەیە : ( ئیمزا کراو لەسەری لەلایەن شەیخو ئیسلام محمد فیساءالدین ئەفەندی یەوە و ئەنجومەنی ( مبعوثان ) بەکۆی دەنگ لەسەری ڕێکەوتوون کە : ( ئەگەر پێشەوای موسڵمانان ( زەیدناوێك ) خوو بگرێت بەوەوە کەباس و خواسە گرنگە شەرعی یەکانی نێو کتێبە شەرعی یەکان پشتگوێ بخات و کتێبە باسکراو خراپەکان کۆبکاتەوەو زێدەڕۆیی لە بەیتوڵمانی موسوڵمانان‌دا بکات و ڕێککەوتنی پێچەوانەی بەڵگە شەرعی یەکان ئیمزا بکات و کوشتن و گرتن و ئاوارەکردنی تاکی کۆمەڵگە بەبێ هۆکاریی

---

[1] ) العثمانيون في التأريخ والحضارة ص٥٠ .

شەرعی دەست بداتیٚ و هەموو ستەمکاری یەکانی تربکات ، پاشان سویٚند بخوات کە وازبهیٚنیٚ و کەچی سویٚندەکەی بشکیٚنیٚ و بگەڕیٚتەوە سەرڕەوشتەکانی جارانی و ، و سوربیٚت لەسەر ڕوودانی فتنە و ئاژاوە تاکوو بەتەواوی باری موسڵمان تووشی بشیٚوی بکات و . لەلایەن موسڵمانانەوە لە هەمو بەشە ئیسلامی یەکانەوە بە دووبارەو یەکڕایی نارازی بەرزبیٚتەوە و وا هەست بکریٚ کە ( ئەم زەید ) ە لەسەر کار لابراوە و لە مانەوەیدا تیٚبینی زیانیٚکی دیاربکریٚت و لە لابردنیشیدا خیٚر ببینریٚت . ئایا لەسەر ئەهلی( حەل و عەقد ) و کاربەدەستان پیٚویست ئەبیٚت کەدابەزین لە خیلافەت و دەسەلاٚتبخەنە بەردەستی زەیدی ناوبراودا یان لەلایەن خۆیانەوە لایبەن ؟ وەلاٚمەکەی ئەوەیە : بەڵیٚ پیٚویستە ) .[1]

ئەو فەتوایە لە کۆبونەوەی هاوبەشی ئەنجومەنەی نەتەوایەتیدا خویٚندرایەوە و نویٚنەرە ئیتیحادی یەکان هاواریان کرد : دەمانەویٚت لایبەرین ، پاش قسەگۆڕینەوەیەك یەکدەنگ بوو لەسەرلابردنی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم .[٢]

بە داخوازی یەکی کۆمەڵەی ( ئیتیحاد و تەڕەققی ) لیژنەیەکی ڕاگەیاندنی خەلیفەی موسڵمانان و سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانی عبدالحمیدی دووەم پیٚکهیٚنرا بۆ بڕیاری لابردنی . ئەو لیژنەیە پیٚکهاتووە لە :

١- ئیمانویل قراصو : کە جولەکەیەکی ئیسپانی بوو ، لە کەسە یەکەمەکانەن کە بەشداربووە لە ( بزوتنەوەی تورکیای گەنجان ) دا و لەبەرامبەر کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەڕەققیدا بەرپرسی نانەوەی ئاژاوەگیٚڕی و هاندان بوو دژ بە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم ونهیٚنی پاریٚزی زانیاری وەرگرتنی نیٚوان سلانیك و ئەستانبوول بوو لەو بوارانەی پەیوەند بوون بە پەیوەندی یەکانی بزوتنەوەکە وە ، ئەم قراصوەیە پاریٚزەر بوو کۆمەڵەی( ئیتیحاد و تەڕەققی ) بەسەرکەوتوویی نیشانیان کرد بۆ دامەزراندنی لە ئەنجومەنی نویٚنەرانی عوسمانیدا ، جاریٚك نویٚنەری سلانیك و دووجارنویٚنەری ئەستانبول بوو . سەرچاوە ئینگلیزی یەکان وا باس و وەسفی دەکەن کەیەکیٚك بووە لەسەر کردەکانی ئیتیحاد و تەڕەققی بوو . لەکاتی جەنگ دا وەك موفەتیشی بوژاندنەوە( ئیعاشە)کاری کردووە ، لە کاتی ئەو پایەیەدا توانی

[1] ) صحوة الرجل المريض ص٤١٠ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پیٚشوو ص٤١٠ .

ماڵ و دارایی یەکی زۆر کۆبکاتەوە بۆ حسابی تایبەتی خۆی ، لە داگیرکاری ئیتاڵیا بۆ لیبیا ڕۆڵێکی گرنگی بینی کە ئیتاڵیبا ماڵ و دەستکەوتێکی بێوێنەی پێدا .
لە ئەنجامی ناپاکی لە دەوڵەتدا ناچار بوو ڕابکات بۆ ئیتاڵیا ومافی هاووڵاتی بوونی ئیتاڵی بەدەست بهێنێت و لە ( تریسنا) نیشتە جێ بوو و لەساڵی ١٩٣٤ز دا مرد . لەکاتی بوونی لە نێو دەوڵەتی عوسمانیدا ، گەورە مامۆستای کۆڕی مقدونیا یزولتای ماسۆنی بوو .
٢- ئارام : ئەرمەنی بوو ئەندامی نێو ئەنجومەنی ناودارانی عوسمانی بوو .
٣- ئەسعەد طوبطانی : ئەلبانی بوو ، لە ئەنجومەنی نوێنەراندا جێگری ناوچەی دراج بوو .
٤- عارف حیکمەت : کە فەریقی دەریایی و ئەندامی ئەنجومەنی ناوداران بوو ، کە خەڵکی کەرەجی عێراق بوو [1]
سوڵتان عبدالحمید لە یادەوەری یەکانیدا درێژەی ئەو ڕوداوە دەگێڕێتەوەو دەڵێت : ( ئەوەی دڵگرانم دەکات دوورکەوتنەوە لە دەسەلاَت نی یە ، بەڵکوو ئەو هەڵسوکەوتە بێڕێزانە بوو کە ئەسعەد پاشا دوای چەند قسەیەك ئەنجامیدا ، کە لە هەموو سنورێکی ڕەوشت چووبوە دەرەوە ، کاتێك پێم وتن : من سەرم بۆ شەریعەت و بڕیاری ئەنجومەنی مەبعوثان دادەنەوێنم ، ئەوەیش بڕیاری خوایە ، بەلاَم ئەوەندەیە من دوپاتی دەکەمەوە نە لە دوورو نە لە نزیکەوە بچوکترین پەیوەندیم نی یە بەو ڕووداوانەی لە ٣١ی مارت دا تەقینەوە ، پاشان بە دوایدا ووتی : ئەو بەرپرسیاریەتەی لە ئەستۆتان گرتووە زۆر قورسە ) . پاشان عبدالحمید ئاماژەی کرد بۆ قراصو و ووتی : ئەم جولەکەیە لە پێگەی خەلافەتدا چی دەکات و بەچ مەبەستێك ئەم کەسەتان هێناوە بۆ بەردەمم ؟ ) [2] .
بەڕاستی جولەکە و ماسۆنی یەکان ئەو ڕۆژەیان بە جەژنی خۆیان دەربڕی و پێی دڵخۆش بوون و هەستان بە ڕێپێوانێکی گەورە لە شاری سلانیکدا ، ماسۆنی یەکان بەمەوە نەوەستان بەڵکوو وێنەی ئەو ڕێپێوانەیان لە چەند کارتێکی نامەیدا چاپ کرد تا بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لە بازاڕەکانی تورکیای عوسمانیدا بفرۆشرێت . بەڕاستی ئیتیحادی یەکان هەمیشە شانازی یان بەوەوە دەکرد کە ماسۆنین . ڕەفیق مانیاسی زادە چەند

---

[1] ) العثمانيون في التأريخ والحضاة ص٥١ .
[2] ) اليهود الدولة العثمانية ص٢١٩ .
[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ص ٢٢٠ .

پەیامێکی بۆ ڕۆژنامەی ( تمیس ) ی فەرەنسی خستە ڕوو لە دوای سەرکەوتنی کودەتاکەی بزوتنەوەی ( ئیتیحاد و تەڕقی ) کە تیایدا هاتبوو ( لە ڕاستی دا لە یارمەتی یە ماددی و مەعنەوی یانەدا کە لە کۆمەڵەی ماسۆنی یە تی ئیتاڵی یەوە وەرمان ئەگرت کە یارمەتی و پاڵپشتی یەکی گەورەیان ئەکردین ، لەبەرئەوەی پەیوەندی بەهێزو پتەومان لەگەڵیاندا )[1] .

سوڵتان عبدالحمید لە نامەیەکیدا کە ئاڕاستەی شێخ محمود ئەبو الشاماتی کردبوو( کە مامۆستای بوو لە ڕێبازی لە شاذەلیدا لە دوای لابردنی، ئەو پەیوەندیە نێوان صەهیۆنیەت و ماسۆنی یەتی ڕوون کردبوویەوە ، ئەمەیش لە ساڵی ١٣٢٩ ك دا بوو[2] کە تیایدا هاتبوو : ( ئەو ئیتیحادی یانە سوربوون لەسەر کە من دان بنێم بە دامەزراندنی نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە لە خاکی پیرۆزی فەڵەستیندا ، لەگەڵ ئەو زۆر کردنەیاندا بە هیچ جۆرێك ئەو داخوازی یەم قبوڵ نەکرد ، لە کۆتاییدا بەڵێنی پێشکەش کردنی ١٥٠ ملیۆن لیرەی ئاڵتونی ئینگلیزی یان دا ، دووبارە بە هەمو شێوەیەك ئەو داخوازی یەم بەرپەرچ دایەوە و بەم وەڵامی یەکلایی یەوە وەڵامم دانەوە ( ئێوە ئەگەر پڕ بە هەموو دنیا ئاڵتونم بدەنێ ، بە هیچ جۆرێك ئەو داخوازی یە تان قبوڵ ناکەم ، بەڕاستی زیاتر لە ٣٠ ساڵە خزمەتیمیللەتی ئیسلامی و ئوممەتی موحەممەد دەکەم ، ئێستا ئەو لاپەڕانەی موسڵمانان ناشۆرمەوە ) .

پاش ئەو وەڵامەم یەکدەنگ بوون لەسەر لابردنم ، و وایان پێڕاگەیاندم : کە ئەوان بە زوویی دوورم دەخەنەوە بۆ سلانیك ، جا ئەو کۆتا داخوازی یە یانم قبوڵ کرد ، ئەمەو سوپاسی خوام کرد و ئەیکەم کە قبوڵی ئەوەم نەکرد، ئەو شەرمەزاری یە هەمیشەیی یەم نەهێنا بەسەر جیهانی ئیسلامیدا کە دامەزراندنی دەوڵەتێکی جولەکە بوو لە خاکە پیرۆزەکانی فەلەستنیدا )[3] .

لە نوسراوێکدا کە لە ڕۆژنامەی ( بویرك ضوغو ) ی تورکیدا لە ٢ی مایۆی ساڵی ١٩٤٧ ز ژمارە ٦١ دا محرم فوزی طوغای لە ژێر ناونیشانی ( فەلەستین وکێشەی جولەکە ) دا دەڵێت :

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢١ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٢٣ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوول ٢٢٣ .

( سوڵتان عبد الحمید ڕێگری کرد لە بە دیهێنانی ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی جولەکەیی لە فەلەستیندا ، ئەو ڕێگری یەی سوڵتان عبدالحمیدی زۆر لەسەری کەوت و بویە هۆی ئەوەی کورسی دەسەڵاتەکەی لەدەست بدات وئەوەش بوە هۆی داڕمانی هەموو دەوڵەتی عوسمانی لەپاشاندا ) . لەگەڵ ئەوەیدا کە ئەو( وەك نیزامەددین لبەدتخلیی ئوغلو لە لێکۆڵینەوەکەی لەسەر ڕۆڵی جولەکە لە داڕمانی دەوڵەتی عوسمانی دا دەڵێت ، ئەیزانی کە ( جولەکە خاوەن هێزێکی زۆرن کە دەتوانن لە کاری ڕێخراوەیدا سەرکەوتوو بێن ، چونکە ئەوان ماڵ و سامانیان لە لایە ، پەیوەندی یە بازرگانی و نێو دەوڵەتی یەکانیش لە نێو دەستیاندایە ، هەروەك ئەیزانی خاوەنی ڕۆژنامەگەری ئەورووپی وکۆڕ ماسۆنی یەکانن ) [1] .

هەندێ لەسەرانی بزوتنەوەی ( ئیتیحاد و تەڕەققی ) دواتر بۆیان دەرکەوت چۆن کەوتنە ژێر کاریگەری ماسۆنی و زایۆنیزمەوە ، ئەوە تا ( ئەنوەر پاشا) کە ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە کودەتاکەی ساڵی ١٩٠٨ ز دا ، لە قسەیەکدا لەگەڵ( جەمال پاشای ) دا یەکێکە لەکۆڵەکەکانی کۆمەڵەی ( ئیتیحاد و تەڕەققی) دەڵێت ( ئەی جەمال ئەزانی تاوانی ئێمە چی یە ؟ پاش ئاه هەڵکێشانێکی قوڵ ئەڵێ ( ئێمە سوڵتان عبدالحمیدمان نەدەناسی ، بەمە بووینە ئامێرێکی دەستی زایۆنیزمە کان و ماسۆنی یەتی جیهانی چاك بەکاری هێنایین . ئێمە هەرچی بوو لە خزمەت زایۆنیزمدا بوو ئائەوە تاوانە ڕاستەقینەکەی ئێمەیە ) [2] .

هەر لە مانایەدا ئەیوب صەبری سەرکردەی سەربازی ئیتیحادی یەکان دەڵێت : ( بەڕاستی کەوتینە نێو داوی جولەکەوە کاتێك لە ڕێگەی ماسۆنی یەکانەوە ولە پێناو دوو پارچەی ئاڵتونی دا ، خواستەکانی جولەکەمان جێبەجێ کرد ، لە کاتێکدا جولەکە ٣٠ ملیۆن لیرەی ئاڵتونی بەردەم سوڵتان عبدالحمید بۆ جێبە جێکردنی داواکاری یەکانیان ، کەچی ئەو قبوڵی نەکرد ) [3] .

هەرلەوبارەیەوە ( برنارد لویس ) دەڵیت ( بەڕاستی برایانی ماسۆنی و جولەکەبەشێوەیەکی نهێنیدەستیان کرد بەیەکدا بۆ لابردنی سوڵتان عبدالحمید ، چونکە ئەو نەیارێکی بەهێزی

---

[1] ) السلطان عبدالحميد الثاني ص ٨٨ .

[2] ) اليهود والدولة العثمانية ص٢٢٨ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ص٢٢٩ .

جولەکە بوو، زۆر بەتوندی بەپەرچی ئەوەی دایەوە کە ئامادەنی یە بستێك لە خاکی فەلەستین بدات بە جولەکە ) [1] .

نەجمەددین ئەربەکانی موجاهیدی گەورە سەرکردەی حیزبی رەفای لە تورکیا لەسەر ئەو بابەتە لێدوانێکی دا و ووتی : ( بزوتنەوەی ماسۆنی هەوڵێکی زۆری دا بۆ لابردنی سوڵتان عبدالحمید ، لە هەوڵەکەیشیدا سەرکەوتوو بوو ، یەکەم کۆڕێکی ماسۆنی کەلە تورکیای عوسمانیدا کرایەوە لە سەردەستی( ئەمیل قرەصوە ) دا بوو کە کابرایەکی زایۆنی بوو ئەوەبوو کە سەرلەشکرەکانی ناوچەی سالونیکاش دایانە پاڵی .... ) [2].

پاش دوورخستنەوەی عبدالحمید لە دەسەڵات ، ڕۆژنامە جولەکەیی یەکانی نێو سلانیك دڵخۆشی خۆیان دەردەبڕی لە ڕزگاربوون لە ( چەوسێنەری ئیسرائیل ) بەو جۆرەی کە ئەو ڕۆژنامانە وەسفیان دەکرد ، لەو بارەیەوە ( لۆثە ر) دەڵێت : ( پاش دوورخستنەوەی عبدالحمید لە دەسەڵات ، ڕۆژنامە جولەکەیی یەکان لە سلانیکدا دڵخۆشی خۆیان دەردەبڕی و موژدەکانیان بڵاو دەکردەوە بە ڕزگاربوون لە ( چەوسێنەری ئیسرائیل ) ئەو کەسەی کە دوو جار بەرپەرچی داواکاریەکانی ( هرتزل ) دایەوە . ئەو کەسەی کە پاسپۆرتی سووری دانا کە وەك یاسای بێگانەکان ) ە لای ئێمە ) [3] .

هێرشە ڕێکخراوە ڕاگەیاندنی یەکان بەردەوام بانگەشە یەکی بڵاوی لەمەڕ سوڵتان عبدالحمیدی دووەم بڵاو دەکردەوە ، دوژمنانی ئیسلام لەم هێرشانەیاندا ئامانجیان بریتی بوو لە :

١- بەرگری کردنی لە ئەندامانی ( ئیتیحاد و تەڕەققی ) ، پاساو هێنانەوە بۆهەڵسوکەوتیان لە کۆتایی پێکهێنانی دەسەڵاتی سوڵتان عبدالحمید دا گوایە بۆ ئەوە بووە تا دەوڵەت پێگەی خۆی بگێڕێتەوە .

٢- سڕینەوەی شکستی ( ئیتیحاد و تەرەققی ) لە حوکمی دەوڵەتدا ، چونکە پیاوانی ئیتیحاد و تەڕەققی پەنایان برد بۆ هێزو چەوساندنەوە و ناکۆکی یان لە نێو دانیشتوانی وولاتەکەدا نایەوە .

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوول٢٢٩ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٢٢٩ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٣٠ .

٣- نیشاندانی وێنەیەکی پڕشنگدار بۆ سەردەمی سەرکەشی و مولحید ( مصطفى کمال اتاتورك ) و هاوکارەکانی وپاساو هێنانەوە بۆ هەڵسوکەوتی بەکرێ گیراوەکانی جولەکەو ئینگلیز و دەوڵەتە ڕۆژئاوایی یەکان لە هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت و دەسەڵات و ڕاگەیاندنی کۆماری تورکیادا .

٤- خواستی زایۆنیزمە کان لەشێواندنی ژیانی سوڵتان عبدالحمید دا وەك تۆڵە لێکردنەوەی لەمەڕ سیاسەتە دژایەتی یەکەی ئامانجەکانیان لە فەلەستین دا [1] .

ڕاستی باسەکە ئەوەیە کە ئەگەر ڕەسەنایەتی و ریشەداری و بڵندی دەوڵەتی عوسمانی نەبوایە ، ئەوە هەر لەسەدەی ١٨ یان ١٩ ئە بونە تۆزی بەر بادووە لاپەڕەکانی دەپێچرایەوە ، بەلاّم زیاتر لە دوو سەدە بەرگری سەختیەکانی ڕۆژگاری گرت و لە ئەنجامی هێرشی داگیرکاری و فرت و فێڵی جولەکەو خۆرەکانی لە ئەنجامی ئەمانەدا ماسۆنی و ئەو لاوازی و یە توندەی کە دەوڵەت بەسەریدا هاتبوو لاوازی یەکە کە سوڵتان عبدالحمید لێی بەرپرس نە بوو ، شمەکەکانی دەوڵەت بوویە تالاّنی بەدەست دەوڵەتە داگیرکەری یە ئەوروپی یەکانەوە کە لە دێر زەمانەوە پیلانی دادەنا بۆ لە ناوبردنی ئەم دەوڵەتە [2] .

## ( باسی شەشەم )

### ( فەرمانڕەوایی ئیتیحادی یەکان و کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی )

لەدوای سوڵتان عبدالحمیدی دووەم ، محمد ڕەشادی برای دەسەلاّت و خەلافەتی گرتە دەست بەلاّم لە ڕاستیدا هیچ دەسەلاّتێکی کرداری لە دەستدا نەبوو ، بەڵکوو دەسەلاّت کەوتبووە دەست کۆمەڵەی ( ئیتیحاد و تەڕەققی ) کە حوکمەتی عوسمانی لە نێوەڕۆکەکەیدا تورکی و لە دەرمارگیریدا نەتەوەیی بوو ، لەکاتێکدا پێشتر لە نێوەڕۆکەکەیدا عوسمانی و لە پەیوەندیدا ئیسلامی بوو . جا ئەو کۆمەڵەیە کاریگەری هێزی ئەو بیرۆکە نەتەوەیی یە تورانی یانە بوو بوو کە بانگەوازیان دەکرد بۆ ڕزگاری هەموو تورك لاف ئەوەیان لێ ئەدا کە گەلانی ئیسلامی لە ئەنادۆڵ و ئاسیای ناوەڕاستدا هەموویەك گەل پێکدەهێنن ، ئەمە ئەو

---

[1] ) الدولة العثمانية – د. الشناوى ( ٢/ ١٠١٨ – ١٠٢٣ ) .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ( ٢/ ١٠٦١ ) . ص٥١٤

بیرۆکەیە بوو کە لە پاشاندا بە هەوڵە دراوەکانی هەندێ لە نوسەرەکانی کۆمەڵەکە و لەسەروو هەموویانەوە ( موئیز کوهین )ی جولەکە و نوسەری ناوداری تورکی ( ضیاکوك ئالب ) گەشەی زیاتری پێ درا ، ئەوە بوو حوکمەت دەستی دایە سیاسەتی بە تورك کردن ( تەتریك ) . ئەوەیش بە کردنی زمانی تورکی بە تاکە زمانی ڕەسمی ،کە پێشتر زمانی عەرەبیش لە پاڵیدا ڕاوەستیابوو . بۆیە بزوتنەوەی بانگەشە بۆ نەتەوایەتی عەرەبی لە بەرامبەر بزوتنەوەی بە تورك کردندا کڵپەی سەند .

عەرەب ( حیزبی لامەرکەزی ) پێکهێنا ، بەو واتایەی ویلایەتە ناتورکی یەکان سەربەخۆی یەکی خۆیی وەربگرێت و دەرەوەش هەر بە ملکەچی ئیستانبول بمێنێتەوە . هەروەك چەند کۆمەڵەیەکی نهێنی یان دامەزراند وەك ( کۆمەڵەی قەحتانی ) بەسەرکردایەتی ( عبدالکریم خەلیل ) و (عەزیزی عەلی میسری ) ئەفسەرو ( کۆمەڵەی عەرەبی گەنجان ) کە لە پاریس و لە ساڵی ١٣٢٩ ك دا لەسەر بەرنامەی کۆمەڵەی تورکیای گەنجان دەمەزرا ، لە لایەن چەند خوێندکارێکەوە کە لەوێ وانەیان دەخوێند و بە بیرۆکە ڕۆژئاوایی یەکان تێر بووبوون بەتایبەت بنەماکانی دەمارگیری نەتەوەیی ، هەندێکیان زاراوە ماسۆنی یەکانیان بەکارهێنا ، کە ئامانجیان : سەربەخۆیی تەواوی عەرەب بوو ، پێگەیشیان لە پاریسەوە گواستەوە بۆ بەیروت و پاشان بۆ دیمەشق کەژمارەی ئەندامەکانیان بە تایبەت لەمەسیحی یە عەرەبەکان زیادی کرد .

کۆمەڵەی چاکسازی لە بەیروت لە ساڵی ١٣٣١ ك پێکهات و لەگەڵ کۆمەڵەی ڕاپەڕینی لوبناندا لە تاراوگە هەوێیان کرد بەیەکداو دا و لە ساڵی ١٣٣١ك دا نامەیەکی هاوبەشیان پێشکەش کرد بە حوکمەتی فەڕەنساو تیایدا داوای داگیرکردنی سوریاو لوبنانیان کرد ، لە کاتێکدا هەندێ لە ڕۆشنبیرانی عێراق بەرەو ڕووی ئینگلیز چوون ، کە پشتیوانیان لە وە ئەکرد کە بەریتانیا سەرپەرشتی بەرنامەی چاکسازی بکات ، بەڵکوو تەنانەت پشتیوانیشیان لەوە ئەکرد کە بەریتانیا دەست بگرێ بەسەر وولآتەکەیاندا !![1].

کاتێك ئیتیحادی یەکان بەرەو ڕووی ئەندامانی کۆمەڵەی عەرەبی بوونەوە ، گەنجانی عەرەبی هەستان بە بەستنی کۆنگرەیەکی عەرەبی لە پاریس لە ساڵی ١٣٣٢ ك / ١٩١٣ ز دا .

---

[1] ) تأريخ الدولة العثمانية – د . علي حسون ص ٢٤٩ .

فەرەنسی یەکان شوێنی لەباریان ئامادەکرد بۆ بەستنی کۆبونەوەکە و ئەندامانی کۆنگرە بڕیاری ئەمانەیان دا :

١- پێویستی جێبەجێکردنی چاکسازی بەپەلە .

٢- بەشداری عەرەب لە کارگێڕی مەرکەزیدا .

٣- کردنی زمانی عەرەبی بە زمانی ڕەسمی لە هەموو ویلایەتە عەرەبی یەکاندا .

٤- خزمەتی سەربازی لەمەڕ عەرەبەوە ناوچەیی بێت تەنها لە کاتی پێویستدا نەبێت .

٥- سۆزداری و نەرمونیانی نواندن لەگەڵ داخوازی یەکانی ئەرمەندا .

ئەندامان ئەوەیان دوپاتکردەوە کە بزوتنەوەکە یان ( نائایینی یە ) و ژمارەی مە سیحی یەکان لەگەڵ ژمارەی موسڵمانەکانا هاوسەنگ بووە وبەسەرکردایەتی عبدالحمیدی زەهراویکۆنگرەکە بەستراوە [1] .

فەرەنسا چەندین هیوای گەورەی بەست بەم کۆنگرەوە کە ژمارە یەکی زۆر پیشتوانی خۆیی لە ناوکۆنگرەکەدا هەبوو ، پاشان هەستا بە بلاْوکردنەوەی بڕیارەکانی کۆنگرە .

کاتێك جەنگی جیهانی یەکەم ( ١٣٣٣ - ١٣٣٧ ك / ١٩١٤- ١٩١٨ ز ) بەرپابوو ، تورکیا لە پاڵ دەوڵەتە نێوەندەکاندا ( ئەڵمانیا و نەمسا ) چووە نێو جەنگەوە لە کاتێکدا ئینگلیز لە ڕێگەی نامەکانی(حسین مکماهۆن ) ەوە عەرەبی ڕاکێشا بۆ لای هاوپەیمانی ( بەریتانیا ، فەرەنسا ، ڕوسیا ) بەمە بیرۆکەی نەتەوەگەری عەرەبی قەڵەمڕەوی گرتە دەست و پێکدادان لە نێوان عەرەب و تورك دا دەستی پیّ کرد [2] .

تورکیا پاش شکستهێنانی لە جەنگەکەدا کەوت و هاوپەیمانان و یۆنان بە شێکیان داگیر کرد و ( ئاستانە ) کەوتنە ژێر قەڵەمڕەوی ئینگلیزو خەلیفە تیایدا وەك دیلی لێهات .

لابردنی سوڵتان عبدالحمید و بەرپابونی کۆمەڵەی ( ئیتیحاد و تەرەقی ) لە فەرمانڕەواییدا ، پیلانێکی بنەڕەتی بوو بۆ بە دیهێنانی ئەو نەخشەیەی کە لە کاتی جەنگ و دوای جەنگدا لە چەند قۆناغێکدا تەواو بوو کە لە مانە دا پوختی دەکەینەوە :

١-ڕێکەوتنی هاوپەیمانان لەسەر دابەشکردنی جیهانی ئیسلامی ژێردەستی دەوڵەتی عوسمانی لە نێوان هاوپەیماناندا ، کە ئەوەیش لە پەیمانامەی نهێنی سایکس بیکۆدا لە

---

[1] ) حاضر العالم الآسلامي ( ١/ ١٠٩ ) .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل ( ١/ ١١٠ ) .

ساڵی ١٣٣٤ك / ١٩١٦ ز دا بە ڕوونی دەرکەوت لەو کاتەدا کە پەیمانی سەربەخۆیی درابوو بە عەرەب ، گرنگترینی ئەو بڕگانەی ئەو پەیماننامەیە لە خۆی گرتبوو بریتی بوون لە :

* باشوری عێراق بۆ بەریتانیا و کەناری باکوری سوریا ( لوبنان و کەناری باکوری سوریا ) بۆ فەڕەنسا بێت .

*-دوو دەوڵەتی عەرەبی لە باکوری عێراق و نێوەندی باشوری شامدا دابمەزرێنن کە لە یەکەمدا کە باکوری سوریا و ڕۆژهەڵاتی ئوردونە باڵادەستی بۆ بەریتانیا و لە دووەمدا کە ناوەڕاستی سوریا ودوورگەی فوراتی یە باڵادەستی بۆ فەڕەنسا بێت .

*- فەڵەستین وولاتێکی نێو دەوڵەتی بێت .

*- ئاستانە و تەنگاوەکان ( گەروەکانی ) ( بسفۆر و دەردەنێل ) بۆ ڕوسیا بن [1].

٢- پەیمانی بلفۆر کە بەریتانیا لە ٢/ ١١/ ١٩١٧ ز ( موحەڕەمی ١٣٢٦ك ) دا دەری کرد بۆ زایۆنیزم بەوەی فەڵەستین ببێتە نیشتمانێکی نەتەوەیی بۆ جولەکە .

٣- بەدەستەوەدانی تورکیا بە دڕەندەترین بزوتنەوەی ( بەڕۆژئاوایی کردن ) و کاولکردنی ئاکارە ئیسلامی یەکان بە گواستنەوەی لە دەوڵەتێکی خاوەن مۆرکی ئیسلامی یەوە بۆ دەوڵەتێکی مۆرکی ڕۆژئاوایی ، بۆیە دەکرێت بوترێت کە ئەو ماوەیەی کە لە تورکیادا سوڵتان عبدالحمید لابراو ئیتیحادی یەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست ، ئەو ماوەیە خواستی فەرمانڕەوا و داگیرکەران یەکی گرت لەسەر پاکتاوکردنی دەوڵەتی عوسمانی و نیشاندانی مۆرکی کۆمەڵگەی تۆرانی و گەیشتنی پەیوەندی تورك و عەرەب بە تونترین و ڕەقترین ئەو قۆناغانەی کە ئاسانکاری کرد بۆ ئاوابوونی دەوڵەت و پەلاماری ڕۆژئاوا بۆ بەشە عەرەبی یەکان و پێدانی ئەو پەیمانەی بلفۆر بە جولەکە کە مافی بەرپاکردنی دەوڵەتی فەلەستینی پێدەدان . [2]

ئیتیحادی یەکان هەستان بە ئاراستەکردن دەوڵەت بۆ ئاراستە یەکی نەتەوەیی نا ئایینی ، کاتێکیش ئینگلیز ئەستانبول یان گرت ( استانە ) و خەلیفە بوو بە نیمچە دیلێك

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ١/ ١١٠ ) .

لەبەردەستیاندا و مەندوبی سامی بەریتانی و جەنڕاڵ هازنجوت ( سەرکردەی گشتی هێزە هاوپەیمانەکان لە ئەستانبوڵدا ) بوونە خاوەندەسەڵاتی کرداری [1] .

فێڵی جیهانی بۆ لەناوبردنی یەکجارەکی خیلافەتی عوسمانی وای ئەخواست کە بانگەشە بۆ دروست کردنی پاڵەوانێك بکەن کە لە بەردەمیدا سوپا بێشومارەکەی هاوپەیمانان ببەزێنێت میللەتی بێ هیوای ئیسلامی ، هیوای گەورە و خەونی چەند ساڵەی بەو پاڵەوانە بهێنێتەدی و جا لەو لوتکەی گەورەیی و لێهاتووەیدا کۆتا هەناسەکانی ژیانی نێو جەستەی ئومەت ببڕێت و قەپی پیا بکات و گیانی بکێشێ ، ئەوەیش باشترین شتێکە بەبێ دوو دڵی لەو: ( سەد پرۆژەیە بۆ دابەشکردنی تورکیا ) و داڕومانی ئیسلام کە هەبوو [2] .

بە هۆی هەواڵگری ئینگلیزی یەوە بەسەرکەوتوویەکی نایاب دروست کردنی پاڵەوانەکە تەواو بوو ، (مصطفی کمال ) لە پڕدا دەرکەوت بە ناوی ڕزگارکەری شەرەفی دەوڵەت لە هاوپەیمانان و یۆنان پاککردنەوەی لە ئەوانەی بە پشتیوانی بەریتانیا لە ساڵی ۱۳۳۸ ز دا ئەزمیریان داگیرکرد و لە ڕق و کینەی داپۆشراوی خاچپەرستی لە ئەنادۆڵ دا ڕۆچوون ، مصطفی کمال هەستا بە هاندان و وورووژاندنی ڕۆحی جیهاد لە نێو تورکەکاندا و قورئانی یۆنانی یەکانی پاشە کشەپێ کردو هێزەکانی هاوپەیمانانیش بەبێ ئەوەی چەکی خۆیان بە کاربهێنن . کشانەوەو شوێنەکانیان لە بەردەم دا چۆڵ کردو ( مصطفی کمال ) یش پلە بەپلە ئەکەوتە بەرچاو جیهانی ئیسلامی دڵخۆش بوون و نازناوی غەزاکەریان لێنا و شاعیران شعریان بە سەردا ئەوت و وتار بێژان پیایاندا هەڵدەدا ، ئەحمەد شەوقی لە یەکەم دێڕی قەسیدە بەناوبانگەکە یدا دەیخاتە پاڵ خالیدی کوڕی وەلید [3] .

الله أكبر كم في الفتح من عجب ............ يا خالد الترك جدد خالد العرب

پاشان دەیخاتە ریزی صەلاحەددینی ئەیوبی کە دەڵێت :

حذوت حرب الصلاحيين في زهن .............. فيه القتال بلا شرع ولا أدب

سەرکەوتنە کەیشی بە سەرکەوتنی بەدر چواند و دەڵێت :

يوم كبدر فخيل الحق راقصة ...............على الصعيد وخيل الله في السحب

---

[1] ) حاضر العالم الآسلامي (١/ ١١١) .

[2] ) العلمانية ، د. سفر الحوالي ص٥٦٩ .

[3] حاضر العالم اللآسلامي ( ١/ ١١١ ) .

تهيئة ايها الغازي وتهنئة ..................بآية الفتــح تبقــى آية الـــحقب

جا كه خه‌ڵكی خه‌بات و تێكۆشانی ( مصطفی كمال ) ی زاڵ و سه‌ركه‌وتویان به‌راورد ئه‌كرد به بوده‌ڵه‌ی ( خه‌لیفه‌و صید الدین محمدی شه‌شه‌م ) كه له ئاستانه‌دا خۆی مت كردبوو ، به‌و هه‌موو زه‌لیلی یه ڕازی بوو كه به‌سه‌ریدا هاتبوو ، تا ئه‌هات لای خه‌ڵك مصگفی كمال گه‌وره تر ئه‌بوو خه‌لیفه‌ش سوكتر ئه‌بوو ، ئه‌وه‌ی زیاتر خه‌ڵكی پڕكرد له خه‌لیفه ئه‌وه بوو كه ڕۆژنامه‌كان هه‌واڵی ئه‌وه‌یان بلاْوكرده‌وه كه خه‌لیفه بڕیاری كوشتنی "مصگفی كمال" ی ده‌ركردووه و ناوی ناوه ( بێگوێی یاخی ) ! له به‌رچاویشیاندا مصطفی كمال پاڵه‌وانێكی خۆ به‌ختكه‌رو ره‌نجده‌ره بوو ، كه له پێناو گه‌ڕاندنه‌وه‌ی شكۆداری خه‌یلافه‌تدا گیانی خۆی به‌خت ده‌كات ، وا خرابووه خه‌یاڵیان كه خه‌لیفه له ژێر پێی سوپا داگیركه‌ره‌كاندا له نێو خۆڵدا گه‌وزاوه . به‌لاْم زۆری نه‌خایاند كه ڕاستی ( مصطفی كمال )ده‌ركه‌وت كه دروست كراوی دوژمنانی ئیسلامه له جوله‌كه‌و مه‌سیحی یه‌كان به‌تایبه‌ت ئینگلته‌را كه بینی له كارخستنی خیلافه‌ت كارێكی ئاسان نی یه ، ئه‌وه‌یش ناكرێت مه‌گه‌ر به دروست كردنی پاڵه‌وانێك نه‌بێت كه وێنه یه‌كی گه‌وره پێی بدرێت و ده‌وری بدرێت به خه‌رمانه‌یه‌ك و خه‌ڵك وای و نیشان بدرێت بناسێت كه ، كه‌رامه‌ته‌كان له‌سه‌ر ده‌ستی ئه‌ودا ڕووئه‌ده‌ن ، ئه‌و كاته ئه‌كرێ به ئه‌و خه‌نجه‌رێك بدرێت له موسڵمانان بێ ئه‌وه‌ی هه‌ست به ئێشه‌كه‌ی بكه‌ن چونكه سه‌ركه‌وتنه درۆینه‌كان ، كه هه‌سته‌كانی سڕكردووه ! هاوپه‌یمانان خۆیان ئه‌هاتن بشێویان دروست ده‌ركردو داوای دامركاندنه‌وه‌یانیان له سوڵتان ده‌كرد . ناوی مصطفی كمالیشیان پێشنیار ئه‌كرد بۆ ئه‌و كاره گرنگه ببێته جێگه‌ی هیواكانی خه‌ڵك و جێگه‌ی ڕێزگرتنی سه‌رله‌شكره‌كان ، ئیدی پێگه‌و سام و شكۆی ئه‌و سه‌رده‌كه‌وت و ڕێزو شكۆی خه‌لیفه‌ش ئه‌هاته خواره‌وه له چاوی خه‌ڵكدا سه‌نته‌ری خیلافه‌ت كزده‌بوو، فرت و فێڵه‌كانی ئینگلیزیش به ئاسانی هه‌ستی پێ ناكرێ [1] .

به‌ڕاستی ده‌زگای هه‌واڵگری ئینگلیز توانی ئه‌وه‌ی به شوێنیدا ئه‌گه‌ڕا له كه‌سێتی ( مصطفی كمال ) دا بیدۆزێته‌وه ، ئه‌و په‌یوه‌ندی نێوان هه‌واڵگری یه‌كانی ئینگلیز و مصطفی كمال له ڕێگه‌ی ( ارمسترونج )ی پیاوی هه‌واڵگری ئینگلیزه‌وه بوو كه له فه‌له‌ستین و سوریا

---

[1] ) تأريخ الدولة العثمانية ص٢٧٧ .

دا پەیوەندی لەگەڵ دا بەهێز کرد لەو کاتەدا کە مصطفی کمال لەوێ سەرکردەیەکی نێو سوپای عوسمانی بوو .

دەبینین( ارمسترنج ) لەو کتێبەیدا لەسەر ( مصطفی کمال ) نووسیویەتی بەڕاشکاوانە پەنجەی دادەنێت لەسەر سەرتای گرێی دەرونی یەکانی( مصطفی کمال ) و ئاماژە دەکات بۆ شووکردنی دووەمی دایکی لەگەڵ یەکێك لە رۆدیسی یە دەوڵەمەندەکاندا و پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ دایکی دا و پەنا بردن بۆ ئەو هاوەڵە ڕوهبانە مەکدۆنیانەی کە بە هەلیان گرت و بنەماکانی زمانی فەڕەنسیان فێرکرد لەگەڵ هاوڕێیەکی مەکدۆنیدا کە ناوی ( فتحی ) بوو. ئیدی هەردوکیان کتێبەکانی( فۆلتێر) و( ڕۆسۆ) و دانراوەکانی ( هۆبر) و (جون ستیورات میل ) و چەندین کتێبی تری قەدەغەیان کرد بە قوڕگیاندا ، لە کاتی تەواو خوێندنەوەکەیدا لە کۆلیژی سەربازیدا وتاری دەدا و باسی گەندەڵی سوڵتانی بۆ دەکردن پێش ئەوەی تەمەنی لە ٢٠ ساڵ تێپەڕ بێت . پاشان گواستیەوە بۆ ئەستانبول و لە نێو شوێنە ناڕەواکانیدا ڕۆچوو و دەیخواردەوەو قوماری دەکرد و خەریکی دڵداری کردن بوو . لە پێش ئەوەی بە هۆی پەیوەندی کردنی بە ( کۆمەڵەی نیشتمانی یەوە ) بگیرێت [1] .

( ارمسترونج ) لە پێشەکی مێژووەکەیدا بۆ ژیانی( مصطفی کمال )شایەتی پەیوەندی ( ئیتیحاد و تەرەقی) دەدات بە (دۆنمە )وجولەکەوە . جا باس دەکات چۆن ( بانگکراوە بۆ یەکێك لە کۆبونەوەکانی لە ماڵەکانی هەندێ لە جولەکە خاوەن ڕەگەز نامە ئیتاڵیی یەکان وسەربە کۆمەڵە ماسۆنی یە ئیتاڵیی یە کان . ئەو ڕەگەزنامەیەیان بە هۆی گرێبەست و پەیماننامە و مافە بیانی یەکانەوە دەیپاراستن ، بەڕاستی ئیتیحادی یەکان تێکۆشان و هەوڵیان دا بۆ پارێزگاری کردن لە قەڵای جولەکە و ئەوان لە ماڵی جولەکەکاندا بە دڵنیایی و بەبێ مەترسی کۆدەبونەوە و هەندێکیان وەك ( فەتحی مەکدۆنی) هاوڕێی کۆنی( کمال ) دایانە پاڵ کۆمەڵەی ماسۆن ( بنیاد سازە ئازادەکان ) ئەوەیش دەگێڕێتەوە کە چۆن بۆ پێکهێنان و ڕێکخستنی کۆمەڵە شۆڕشگێڕی یەکەیانا پشتیان بەستوە بە ئەوڕێساو شێوازی ڕێخراوە ماسۆنی یەکان لەسەری دەڕۆیشتن ، و وایان لێهات لە چەند لای جیاوازەوە پاڵپشتی و هاوکاری ماددی یان بوون پێدەگەیشت و پەیوەندی یان دەکرد بەو پەنابەرە سیاسی یانەوە کە سوڵتان دووری خستبوونەوە ( نەفی کردبوون ) بۆ دەرەوەی وڵات .

---

[1] ) صحوة الرجل المريض ص٢٦٥-٢٦٦ .

(ارمسترونج ) ئەوە بە دەر دەخات کە چۆن بۆ جێبەجێکردنی کۆتا هەنگاوی نەخشەی بەریتانیا خواست کەوتۆتە سەر خودی مصطفی کمال و نەکەوتە سەر کەس لە هاوڕێکانی ، ئەوەتا دەڵێت : سروشتی وابوو کە حەزی دەکرد ببێتە فەرمانکەر و نەهی کەر و هیچ ڕێزێکی بۆ سەرکردە ئیتیحادی یەکان نیشان نەدەدا و لە دواییدا کێشەی بۆ دروست بوو لەگەڵ هەریەك لە ( انور ) و ( جمال ) و ( جاویدی بەرەچەڵەك جولەکە ) و ( نیازی بەرەچەڵەك ئەڵمانی ) کەپیاوێکی دڕندە و ( گلعت ) کە ورچە گەورەی پێ ئەوترا و کارمەندێکی بچوکی پۆستە بوو .

پاش ئەوەی مصطفی کمال لە تەنها ئەفسەرێکی یاخی بچوکەوە گۆڕا بۆ سەرکردەیەکی سەربازی و بۆیە حاوەنی چەندین سەروەری و سەرکەوتن ، نازناوی ( الغازی =غەزاکەر ) ی لێنرا بە هۆی دەستڕۆیی و قەڵەمڕەوی دەزگای هەواڵگری یەکانی بەریتانیاوە . ( ارمسترونج ) باسی لاپەڕەیەکی نوێی ژیانی تایبەتی دەکات لە پاش بە دیار خستنی و ئەهلیەتی بۆ رووخاندنی خیلافەتی ئیسلامی ، بەرەڵایی و حەرامکاری یەکانی جا باسی ئەو ژن هێنانە ئەفسانەیی یەی ( کمال اتاتورك ) ئەکات کە ( لطفیە) ئەهێنێت _ئەو کچەمیرە دەوڵەمەندەی کە زۆر نەبوو لە پاریسەوە گەڕابوویەوە تا ئەزموونە ئیداری و ڕۆشنبیری یە هاوچەرخەکانی و زمانزانینەکەی کە هەشت زمانی ئەزانی بخاتە خزمەت غازی مصطفی کمال ئەمە جگە لەوەی ژنێتی و جوانی و کۆشکە گەورەکەی باوکی لە ئەزمیردا بە دیاری پێ بەخشی !بەو شێوەیە ( غازی مصطفی ی )خستە دوای خۆیەوە و ( فکریە ) ی پێ لە ناوبرد کە بۆ چارەسەری نەخۆشی ناردبووی بۆ ( میونخ ) ئەو نەخۆشیەی کە لە ئەوەوە بوی گوازرابوویەوەە ، پاشان ئەوە بوو نەخشەی خۆکوشتنی "فکریە " شی دانا . هەروەها وازی لە " صالحە " ی ژنیشی هێنا و لە پرێکدا و پاش ئەوەی ژیانی ( سعادت ) و دەیان کچ و ژن ومێرد منداڵی تری شێواند هات و ( لطفیە ) ی مارەکرد .. ئەو دیکۆمێنتانەش کە لە یەکێك لە ئەفسەرەکانی هاوڕێیەوە بە جێماوە هەموو ئەمانە دووپات ئەکەنەوە [1].

خودی " لگفیە " ش لە پاشاندا بوویە قوربانیەکی تر لە قوربانیەکانی ئەم ( غازی ) یە ، ئەوە بوو بە بڕیارێکی وەزاری تەڵاقی دا و بوویە نێچیری دەستی نەخۆشی و ئازار و هەڕەشەی ئەوەشی لێ کرد کە ئەبێت بێدەنگ بێت و لە هیچ شوێنێك باسی ( شذوذی

---

[1] ) صحوة الرجل المریض ص٢٦٧.

جنسی ) ئەم نەکات ، کەس لەگەڵیدا نەمایەوە (( عفت )) خانم نەبێت کە ئەو هونەرمەندەی کە مامۆستا و مێژوو نووسیشی بوو ، ئەم ( عفت ) ە توانی جڵەوی ئەم دڕندەیە بە پێ ی دەربڕینی خۆی _ بگرێت و ملی پێ کەچ بکات و بیکاتە کۆیلەی خۆی .

بەڵام ( لەتیفە ) هانم ئەشاکی . پێوەرێك بووو کە یاسای پارێزگاری مصطفی کمال ڕێگری هیچ هێرش یان ڕەخنەیەکی لێنە دەگرت لە ماستاو چێتی نێو دێڕە یادەوەری یەکانی کە ڕۆژنامەی ( الحرية ) ئازادی تورکی لە حوزەیران ( یونیو ) ی ساڵی ١٩٧٣ زدا بلاوی کردۆتەوە کە چەند تیشکێکی خستۆتە سەر ژیانی تایبەتی ئەتاتورك و زیادەڕۆیی لە خواردنەوەو هەوڵی بەرپرسی خستنەسەر هاوریێ و وەك ( قلج عەلی ) و( نوری جنکس)و( ڕەجەب مدی )کە بەدەست ئەنقەست کاتی ئەتاتورکیان بە فیرۆدەدا ، ئەوانە کۆمەڵێکی بکوژو سەرکەشی ناوداربوون کە ئەتاتورك لە چواردەورو بۆ پاسەوانی خۆی دابوینە پاڵ خۆی ، هەندێکیان تێچوون و خەرجیان تا دوورترین سنور بەرزدەکردەوە پاشئەوەی چەندین کارو تاوانی گەورەیان ئەنجامدا بۆ کەمال ئەتاتورك کە بەهۆی ئەمانەوە لە چەندان نەیاری خۆی ڕزگاری بوو[1] .

بەڕاستی ئەو ئاکارە گەنیوانەی کە مصطفی کمال ناوی پێدەرکردبوو ، سەیر نی یەبۆ کەسێکی وەکو ئەو کە لە بنەرەتداله جولەکەکانی دەونەمەیە .

لە ( دائیرەتولمەعاریف )ی جولەکە دا هاتووە کە : ( بەڕاستی زۆرێك لە جولەکەکانی سلانیك دووپاتیان کردەوەکە کەمال ئەتاتورك بەڕەچەڵەك لە جولوکەکانیدۆنمەیە ، ئەوەیش ڕای ئیسلامی یە نەیارەکانی کەمال ئەتاتورکە . بەڵام حکومەت بەرپرچی ئەوە دەداتەوە )[2] .

( توینبی ) قسە دەکات لەسەر بنەچەی مصطفی کمال و دەڵێت : ( خوێنێکی جولەکە بەنێو دەمارەکانی بنەماڵەی کەمالیدا هاتوچۆدەکات . چونکە بەڕاستی سلانیك پێگەی جولەکە بووە کاتی لێقەومانەکەیان ، بیروباوەڕەکانی خۆیشیان ئەپاراست بەبۆنەی ئەوەوە

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پیشوو .

[2] ) يهود الدونمة – د. النعيمي ص٨٧-٨٩ .

بەدەم ئیسلامیان ڕاگەیاند بوو، بەلاّم سروشتی کەمال ئەتاتورك ورەنگی چاوی و پێکهاتەی جەستەیی لەوە دووری دەخاتەوە کە بە خوێنێکی جولەکە کاریگەر بوو بێت )[1] .

( ئوسامە عەینای) دەڵێت : ( دۆنمەکان زۆر شانازی دەکەن بە ئەتاتورکەوە و بیروباوەڕێکی چەسپاویان هەیە کە : ئەو لەوانە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە کە کمال ئەتاتورك کاتێ فەرمانڕەوایی گرتە دەست پەردە لەسەر نیاز خراپەکانی دژ بە ئیسلام لادا )[2] .

بەڕاستی کردارەکانی مصطفی کمال لە دواتردا بەڵگە بوون لەسەر ڕق و کینەی لە ئیسلام ، جا لەساڵی ١٣٣٧ ك دا کاتێك لە ئەنقەرە دا زاڵبوو بەسەر یۆناندا ، لەبەردەم گەلدا ڕایگەیاند ( هەموو ئەو دابیناکاری یانەی دەخرێتە کار جگەلە پارێزگاری کردنلە دەسەلاّت و خیلافەت ورزگارکردنی سوڵتان و وولاّت لە کۆیلایەتی بیانی هیچ ئامانجێکی تریلە پشتەوە نی یە )[3] . دەبینین پاش ئەوەی لە ساڵی ١٣٤١ك / ١٩٢٣ ز دا دەستی گرت بەسەر خەڵك و وولاّت دا ( کۆمەڵەی نیشتمانی تورکی ) بەسەرکردایەتی ئەو بەرپابوونی کۆماری تورکیای ڕاگەیاند و مصطفی کەمالی بە یەکەم سەرۆکی هەڵبژارد و بۆماوەیەکی کاتی پارێزگاری کردن لە خیلافەتی داوا ئەکرد و عبدالمجیدی کوڕی سوڵتان عبدالعزیزی لە جیاتی محمدی شەشەم هەڵبژارد کە بەسەر کەشتی یەکی جەنگی بەریتانی یەوە بەرەو ماڵتە وولاّتی بەجێهێشت و سوڵتان عبدالمجیدش هیچ دەسەلاّتێکی فەرمانڕەوایی لەدەستدا نە بوو [4].

خەلیفە عبدالمجید پیاوێکی بەرەوشت و ڕۆشنبیر بوو کەشایەنی بنەماڵە و نەوەی عوسمان بوو ، لە ڕوانگەی تورکەکانەوە عبدالمجید هەڵقەی پەیوەندی زیندووی بوو بە کەلتورو مێژووی عوسمانی ئیسلامی یەوە ، جەماوەری ئەستانبول هەموو هەینی یەك بەعەرزەتی بینین وسلاّو لێکردن و ڕێزلێگرتنێکی بوون . کاتێك ئەڕۆیشت بۆ نوێژی فەرزی جومعە . خەلیفە بەتەواوی هەستی بەگەورەی پایەخیلافەت ورەسەنی ئەو بنەماڵەی ئەکردکە

---

1 ) هەمان سەرچاوەی پیشوو ل٩٠ .

2 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٩٤ .

3 ) حاضر العالم الاسلامي ( ١/ ١١٢ ) .

4 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

کە دەچێتەوەسەری ، بۆیە جارێك مێزەرەکەی محمدی فاتیحی ئەکردە سەر و جارێکیش شمشێرەکەی سولەیمانی قانونی ئەبەست لە هاتنە دەرەوەدا .

مصطفی کەمال لە تووڕەیدا ئاگری تێبەر بوو ، توانای ئەوەی نەبوو کە خۆشەویستی خەڵك و وابەستەیی یان بە ئالی عوسمان و خیلافەت و دەسەلأتەوە ببینێت یان ببیسێت . بۆیە ڕێگری کرد لە خەلیفە کە بچێت بۆ نوێژ ، پاشان دەرماڵەی تایبەتمەندی و مافەکانی دابەزاند بۆ نیوە ، مصطفی کەمال بەئاگرو ئاسن فەرمانڕەوایی وولأتی ئەکرد و پاڵپشتی دەوڵەتەگەورەکانی بۆ سیاسەتە توندڕەوی یەکە ی خۆی دابین کردبوو. مصطفی کمال کۆمەڵەی دامەزرێنەری لە ٣ی ئازار / مارسی ١٩٢٤ز دا بانگکرد بۆ کۆبوونەوە یەك متمانەی یەکی تەواوی هەبوو کە هیچ یەکێك لە نێو کۆمەڵەی دامەزرێنەردا – کە جگەلە ناوەکەی خۆی هیچی تری تێدا نەمابوو و نی یە کە نەیاری بکات . بڕیاری لە کارخستنی خیلافەتەی خستە بەردەم کۆمەڵەکە کە ئەو ناوی نابوو ( دوومەڵی سەدەکانی ناوەڕاست ) [1]. ئەو بڕیارەی کەدوورخستنەوەی خەلیفەی لە وولأت لە خۆگرتبوو لە ڕۆژی داهاتوودا بەبێ قسەو لێدوان هەموارکراو لەسەردەستی ( مصطفی کمال ) ئەومەشخەڵی خیلافەتە کوژایەوە کە موسڵمانان بە درێژایی ئەو هەمووە هێمای یەکڕیزی و بەردەوامی قەوارەی خۆیانیان لێ وەردەگرت .

بەڕاستی( مصطفی کمال ) نەخشەیەکی بۆ کێشراوی نێو ئەو پەیماننامانەی جێبەجێ دەکرد کە لەگەڵ دەوڵەتە ڕۆژئاوایی یەکاندا بەسترا ، جا پەیماننامەی لۆزان لە ساڵی ١٣٤٠ ك / ١٩٢٣ ز بەسەر تورکیادا سەپێنراو ئەویش مەرجەکانی ڕێککەوتنی قبووڵ کردکە بە چوارمەرجەکەی کروزن ناسراو ( کە سەرکردەی وەفدەکەی ئینگلیز بوو لە کۆنگرەی لۆزاندا ) ی قبوڵ کرد کە بریتین لە :

١- بڕینی هەموو پەیوەندی یەکی تورکیا بە ئیسلامەوە .

٢- لە کارخستنی تەواوی خەلافەتی ئیسلامی .

٣- دەرکردنی خەلیفەو پشتیوانانی خەلافەت و ئیسلام لە وولأتدا و دەستگرتن بەسەر ماڵ و سامانی خەلیفەدا.

---

[1] ) التأريخ العثماني في شعر أحمد شوقي – محمد أبو غدة ص١١٠ .

٤- دانانی دەستورێکی شارستانی لە جیاتی دەستوری کۆنی تورکیا [1] .

بێ ئومێدی یەکی زۆر جیهانی ئیسلامی داپۆشی ، ئەو ( ئەحمەد شەوقی ) یەی پێشتر وەسفی (کمالئەتاتورك ) کردبوو ، گریا بۆ خیلافەت و ووتی :

پاشان شەوقی سەرزەنشت و ڕەخنەی توند ئاڕاستەی ئەو ئەتاتورکە کرد کە دەیویست بە نوکە پێنوس یان بە ئاگرو ئاسن تورکەکان خۆشیان بێت و ترشیان بێت لە ئاسیاوە بگوێزێتەوە بۆ ئەوروپا لە ڕیشەداریەیانەوە لە ئاسیادا هەیانە بیانبات بۆ چاوەڕوانی لە بەردەرگای ڕۆژئاوادا [2] .

شەوقی وازی لەوە نەهێنا کەهۆی دەرکەوتنی ئەو خۆ سەپێنانە بۆ نەزانی گەلان وخۆدانیان بەدەستی سەرکەشە چەوسێنەرەکان ڕوونبکاتەوە و دەڵێت : [3]

بەڕاستی مصطفی کمال بەتەواوەتی نەخشەکەی جێبەجێ کردو دوورکەوتەوە لە هێڵە ئیسلامی یەکان و تورکیا چووە نێو چەند چالاکی یەکی ترسناکی بەڕۆژئاوایی کردن ، جا لەساڵی ١٣٤٣ك / ١٩٢٤زدا وەزارەتی ئەوقاف لەکارخرا و وەزارەتی مەعاریف کاروبارەکانی گرتە ئەستۆ ، و لە ساڵی ١٣٤٤ك / ١٩٢٥ز دا مزگەوتەکان داخران و حوکمەت زۆر بێ بەزەییانە هەموورەوتێکی ئایینی لەناو بردو هەموو ڕەخنەیەکیئایینی بەتوندی سەرکوت ئەکرد ، و لەساڵی ( ١٣٥٠-١٣٥١ ك / ١٩٣١-١٩٣٢ ز ) دا ژمارەی مزگەوتەکان دیاری کراو ڕێگە تەنیا بە مزگەوتێك ئەدرا لە هەریەکەیەکی بەڕێوەبردندا کە ڕووبەری زەوی یەکەی بگاتە ٥٠٠ مەتر ، ڕایشی گەیاند کە ڕۆحی ئیسلامی ڕێگە لە پێشکەوتن دەگرێت .

( مصطفی کمال ) لە هێرشکردنی دا بۆ سەر مزگەوتەکان بەردەوام بوو ، ژمارەی ئەو ئامۆژگاری کەرانە( واعیزەکان ) کەم کردەوە ( ئەوانەی کە دەوڵەت موچەی بۆ دابین دەکردن ) بۆ ٣٠٠ سێ سەد ئامۆژگاری کەر ، فرمانیشی پێکردن کە لە وتاری هەینیدا بواری فراوان بکەنەوە بۆ قسە کردن لە سەر کاروباری کشتوکاڵی و پیشەسازی و سیاسەتی دەوڵەت و وەسف کردنی زۆری ئەو . هەروەها ناودارترین دوو مزگەوتی گەورەی ئەستانبوڵ داخستن

---

[1] ) تأريخ الدولة العثمانية د . علي حسون ص٢٨٧ .

[2] ) تأريخ العثماني في شعر احمد شوقي ص١١٢ .

[3] ) الشوقيات ، ديوان احمد شوقي ( ١/ ١١٢ ) .

و یەکەمیان کە مزگەوتی ( ئایاصوفیا) بوو گۆڕی بۆ مۆزەخانە ، دووەمیش کە مزگەوتی ( ئەلفاتیح ) بوو گۆڕی بۆئەمباروگەنجینەیەك .

شەریعەتی ئیسلامیش گۆڕِرا و یاسایەکی مەدەنی شوێنی گرتەوە کە حکومەتی تورکیا لە یاسای سویسری لە سالّی ١٣٤٥ك / ١٩٢٦ ز دا وەری گرت ، ڕۆژ ژمێری کۆچیشی گۆڕی و ڕۆژ ژمێری ( گریگۆری) ڕۆژئاوایی دانا چا سالّی ١٣٤٢ کۆچی لە هەموو بەشەکانی تورکیا دا لەکارخرا و سالّی ١٩٢٦ زایینی شوێنی گرتەوە .

* لەدەستوری سالّی ١٣٤٧ ك / ١٩٢٨ زدا لە دەستوردا باس لەوە نەکرا کە تورکیا( دەولّەتێکی ئیسلامی ) یە دەقی سوێندی یاسایی کە پیاوانی دەولّەت لە کاتی گرتنە دەستی کارەکانیدا سوێندیان پیێ دەخوارد گۆڕاو سوێندیان بەشەرەفی خۆیان دەخوارد لە جیاتی ئەوەی سوێند بە خوا بخۆن کە وەك چۆن پێشتر وابوو .

* لە سالّی ١٩٣٥ زدا حکومەت پشووی ڕەسمی گۆڕی و هەینی تێدا نەما ، بەلّکوو ڕۆژی یەکشەممە بوو بە پشوی ڕەسمی و پشووی کۆتایی هەفتە لە دوای نیوەڕۆی ڕۆژی شەممەوە دەستی پێدەکرد و تاکوو بەیانی ڕۆژی دووشەممە بەردەوام بوو .

* حکومەت بە تەواوەتی فێرکردنی ئایینی لە خوێندنگە تایبەتی یەکاندا پشتگویێ خست ، پاشان هەلّی وەشاندەوە ، نەك هەر ئەمە بەلّکوو کۆلیژی شەریعەت لە زانکۆی ئیستانبول تا ئەهات ژمارەیەکی کەمتر خوێنکاری وەرئەگرت تا لە ١٣٥٢ك / ١٩٣٣زدا بەتەواوی داخرا .

* حکومەتەکەی مصطفی کمال لە بزوتنەوەی بە ڕۆژئاوایی کردندا بەتەواوەتی ڕۆچوو ، ئەوەبوو ، بڕیارێکی دەرکرد بۆ یاساغ کردنی ( طربوش ) کردنە سەر و فرمانی کرد دا شەبقە بکرێتە سەر وەك دەولّەتە ئەوروپی یەکان [1]. و لەسالّی ١٣٤٨ك / ١٩٢٩ زدا حکومەت دەستی کرد سەپاندنی بەکارهێنانی پیتە لاتینی یەکان لە نوسینی زمانی تورکی دا لە بری پیتە عەرەبی یەکان . ئیدی ڕۆژنامەو کتێبە کان بە پیتە لاتینی یەکان دەردەچون و لە کۆلیژەکاندا فێربوونی زمانی عەرەبی و فارسی لابرا . هەروەها بەکارهێنانی پیتە عەرەبی یەکان بۆ چاپکردنی نوسینە تورکی یەکان قەدەغەکرا . ئەو کتێبانەیش کە پێشتر لە چاپخانە کانی ئەستانبول لە سەردەمەکانی پێشوودا چاپیان کردبوون ، نێردران بۆ میسرو

---

[1] ) حاضر العالم الاسلامي ( ١/ ١١٥ ) .

فارس و هیند ، بەم جۆرە حکومەتی تورکیا پەیوەندی لە نێوان تورکیا و ڕابردووی ئیسلامیدا لە لایەك ولە نێوان خۆی و موسڵمانانی هەموو وولاتە عەرەبی و ئیسلامیەکاندا لە لایەکی ترەوە دابڕا .[1]

*( ئەتاتورك ) ڕۆحی نەتەوەپەرستی دەکرد بە گەلی تورکیادا ، ئەوەیشی بەهەل قۆستەوە کە هەندێ لە مێژوونوسەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد کە زمانی سۆمەری یەکان خاوەن شارستانیەتی کۆن لە وولاتی نێوان دوو ڕووبار دا پەیوەندی هەیە لەگەڵ زمانی تورکیدا ، بۆیە ئەیوت : تورکەکان خاوەنی کۆنترین شارستانی یەتن لە جیهاندا ئەمەش بۆ ئەوە ئەیوت تاقە ڕەبووی ئەو هەمووە بەها بالأنەی لەدەستیدااوا بکاتەوە بۆیان ، پاش ئەوەی دژایەتی هەموو چالاکی یەکی ئیسلامی دەست دایە . جا ( مصطفی کمال ) ناوی ( ئەتاتورك ) ی دابڕی بەسەر خۆیدا کە بە واتای ( باوکی تورکەکان ) دێت[2].

* حکومەتەکەی ( ئەتاتورك ) ئیشی ئەوە بوو کە گرنگی بە هەموو ئەوشتانە بدات کە ئەوروپی بێت ، ئیدی بوارەکانی هونەر گەشەیان سەند و لە هەموو مەیدانەکانی شارەگەورەکاندا پەیکەری ئەتاتورك ڕاست ئەکرایەوە ، و گرنگی دان بە وێنە و مۆسیقا زیادی کرد و ژمارە یەکی گەورەی هونەرمەندان وەك وەفد هاتن بۆ تورکیا کە زۆرینەیان لە فەڕنساو نەمساوە هات بوون[3] .

* حکومەتەکەی( ئەتاتورك ) ئیشی ئەکرد لە سەر ئەوەی کە بالأپۆشی ئافرەت (حیجاب ) نەهێڵێت و فرمانی کرد بە سفوری (قوامة )و بەرپرسیارێتی پیاو بەسەر ئافرەتدا نەهێشت و بەناوی ئازادی و یەکسانی یەوەجڵەوی بۆ ئافرەت بەرداو دەستی کردە پشتیوانی کردن لە ئاهەنگەکانی سەماکردن شانۆ تێکەڵەکان .

* لە هاوسەرگیریشدا لەگەڵ( لەتیفە هانی) دا کە کچی یەکێك لە دەوڵەمەندەکانی ئەزمیربوو پەیوەندی یەکی پتەویان هەبوو بە جولەکەکانی دانیشتووی ئەزمیر ، ئاهەنگی ژنگواستنەوەکەی لەسەر شێوازی ڕۆژئاوایی بەڕێوە برد هانی دەستهەڵگرتن لە خوونەریتە ئیسلامی یەکان بدات و بەکەناری شاردا گەڕاندی کە هەمووگیانی بەدەرەوە بوو ، لەگەڵ

---

1 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

2 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

3 ) المسألة الشرقية – الاسوقي ص٤٢٨-٤٣٢.

پیاوانـدا تێکـەڵ دەبـوو و پێـشکەوتووترین جلوبـەرگی لەبـەر ئـەکرد کـە یارمـەتی بـدات بـۆ پیشاندانی جوانیەکانی [1].

* فرمانی کرد بە وەرگێڕانی قورئان بۆ زمـانی تـورکی . بەمـە هـەموو واتـاو نێوەڕۆکـەکانی لـە دەستدا ، فرمانیشی کرد کە بانگ بە زمانی تورکی بێت [2].

* ئیشی کـرد لەسـەر گۆڕینی بەرنامـەکانی خوێنـدن و لـە پێنـاو بـە دیـار خـستنی ڕابـردووی نەتـەوەیی تورکیـدا نوسـینەوەی مێـژووی دووبـارەکردەوە و کەوتـە پاکتـاو کردنـی زمـانی تورکی لە ووشەی عەرەبی و فارسی و گۆڕی بۆ ووشە گەلێکی ئەورووپی یان کۆنە لاتینی.

* ئەوروپا سوربوونی لە سەرچوون بە ئاڕاستەی ئەورووپا ڕاگەیانـد و لـە جیهـانی ئیسلامی و عـەرەبی دابـڕاو حکومەتەکەی بەپەلـە پـشتی کـردە ئیسلام تەنانـەت بـە تونـدی دژایـەتی هـەر هەوڵێکی کرد کە هاویشتەی بەرەو زیندووکردنەوەی ڕێبازە ئیسلامی یەکان بوایە [3].

ئەو هەنگاوانەی مصطفی کمال کاریگەری دووریان هەبوو لەسەر میسر و ئەفغانـستان و ئێران و هیندی ئیسلامی و تورکستان و لە هەموو شـوێنێکی جیهـانی ئیـسلامی، ئەگـەر هـەل بڕە خسایە بۆ بانگخوازە بە ڕۆژئاوایی کـەرەکان و خزمـەتگوزارانی ڕۆشـنبیری ئیمپریـالیزمی کە تا ئەو پەڕی توانست جێبەجێی بکەن و لە بواری پێشکەوتن و ڕاپەڕینی بانگەشـە کـراودا تورکیـا بـە نمونـە بهێننـەوە . جـا ڕۆژنامـە میـسری یـەکانی وەك (– الأهـرام ) ، ( الـساسة ) ( المقطم ) کە ئاڕاستەیەکی ئیسلامیان هەبوو و لەلایەن دەسـەڵاتی ڕۆژئـاوایی و سـەنتەرەکانی جولەکە و ماسۆنی یەوە پاڵپشتی ئەکران کەوتنە بە پیا هەڵدانی کەمال ئەتاتورك.

ئـەو ڕۆژنامانـە هەڵـسوکەوتەکانی کمـال ئـەتاتورکیان بـە بیـانوو دەهێنایـەوە و لەگـەڵ ئەوەدابوون کە ئەو دایهێنـاو چـەندین قسەیان لـەبارەوە بڵاودەکـردەوە بـۆ نمونـە ( تورکیـای نـوێ هـیچ پەیوەنـدی یـەکی بـە ئایینـەوە نـی یـە ) و مـصطفی کمـال ( ڕۆژێـك قورئـانێکی بەدەستەوە و ووتی : بەڕاستی پێشکەوتنی گەلـەکان ناگونجێت بە کۆمەڵـە یاسـاو بنەمایـەك جێبەجێ بکرێت کە لەسەر دەمە کۆنەکاندا دانراوە ) .

---

[1] ) حاضر العالم الآسلامي ( ١/ ١١٦ ) .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

[3] ) الإتجاهات الوطنية ( ٢/ ١٠٠ ) .

بەڕاستی حکومەتی عەلمانی کەمالی تورکیا – وەك ئەمیر شکیب ئەرسەلان وەسفی کردووە حکومەتێکی ئایینی نەبووە لە شێوەی فەڕەنسا و ئینگلتەرادا ، بەڵکوو دەوڵەتێکی( نائایینی ) بوو ، وەك شۆڕشی بەسشەفی بوو لە ڕوسیادا_ چونکە ئەو هەمووە حکومەتە لە ڕۆژئاوادا بە شۆڕشە ناودارەکانیەوە دەستی نەخستە نێو پیتەکانی ئینجیل و جۆری بەرگی پیاوانی ئایینی و ڕێوڕەسمە تایبەتی یەکانیان و کەنیسەکانی لە کار نەخستن [1] .

ڕاگەیاندنی جولەکەیش ڕۆڵێکی گەورەی هەبوو لە نرخ پێدانی ئەو هەڵگەڕانەوەیە دا . هەروەك ڕۆڵی دیاریشی هەبوو لە هاندانی ئەتاتورك لەسەر دژایەتی کردنی هەر ئۆپۆزسیۆنێکی ئیسلامی ، هەروەها ئەو کارانەی بۆ جوان و ڕازاوە دەکرد کە لەسەر بڕینی دڕندانەی دژ بە مرۆڤ پێی هەڵدەسا وای ئەناساند جگەلە چەند جەنگێکی پاڵەوانێتی هیچی تر نی یە ، هەروەك مینبەرێك بوو بۆ هەموو بانگە خۆ چوێنەرەکان بە ڕۆژئاوای خاچپەرستی و بانگەواز بۆ ئازادی لە سنور دەرچوو بۆ ئافرەتی تورکی و نرخدان بە هونەرەکانی ڕووخاندنی ڕەوشت وای دەرئەبڕی کە خواردنەوەی مەی و قومارو زینا جگەلە دیاردەی شارستانێتی و ژیاری بوون هیچی تر نی یە [2] .

ڕاستی تاڵ ئەوەیە : مصطفی کمال بوو بە نمونەیەکی زەق بۆ فەرمانڕەواکانی جیهانی ئیسلامی و شێواز چەوسێنەری یە بێوێنەکەی کاریگەری هەبوو لە سیاسەتی ئەوانەی دواتردا . هەروەها بیانوی پێویستی دا بە دەستئیمپریالیزمی ڕۆژئاواوە تا ئیسلام لەناو بەرێت ، بۆ نمونە فەڕەنسا ئەوەی ئەکرد بە بیانوو کاتێك خەریکی بە نەصارنی کردنی کیشوەری ئەفریقا بوو ، بە هەموو شێوەیەك ئەیویست لە ئایین و عەقیدە و ئیسلامەکەیان دووریان بخاتەوە ، ئەیوت ، خۆ ئێمە لە تورکە موسڵمانەکان سوور ترنین بۆ پاراستنی ئیسلام [3] .

بەڕاستی مصطفی کمال بوو بوو بەسەرکردەیەکی دیار بۆ زۆرێك لەو فەرمانڕەوایانەی کە دوا ڕۆژی خۆیان فرۆشت بۆ دنیایەکی بەسەر چوو .

---

1) العلمانية – د . سفر الحوالي ص٥٧٣ .

2) حاضر العالم الآسلامي ( ١/ ١١٧ ) .

3) العلمانية – د. سفر الحوالي ص٥٧٣ .

موسڵمانان چەندین شۆڕشی چەکداری یان دژ بە حوکمی عەلمانی تورکی (کە دوژمن بوو بە ئیسلام ) بەرپا کرد . گرنگترین شۆڕشەکانیش لە ناوچەی باشوری ڕۆژهەڵاتەوە بوو لە ساڵی ١٣٤٤ ك دا . پاشان لە ساڵی ١٣٤٩ ك دا لە منیمین . کە کەمالی یەکان بەتوندو تیژی یەکی بێوێنە سەرکوتیان کرد و ژمارەیەکی زۆری زانایان بوونە قوربانی و ناوچەکە لە ڕووی ئابووری و زانستی یەوە پشتگوێ خرا .

بزوتنەوەی نور بەسەر کردایەتی ( شێخی بەدیعوز زەمان سەعیدی نورسی ) و خوێندکارەکانی دوای خۆی بەرپا بوو، و ژمارەی یەکی زۆری پەیامی ئیسلامی بڵاوکردەوە لە ژێر ناونیشانی ( پەیامەکانی نوور ) دا لە پێناودروست کردنی هۆشیاری ئیسلامی وبەرەنگاری کردنی ئیسلامی و بیروڕاکانی کەمالی و عەلمانی یەکان . بزوتنەوەکەی ئەو پشتی بە هەڵگرتنی چەك نەبەست و بەڵکو بە جیهادکردنی زمانەوە وەستا . ئەتاتورك هەوڵیدا بۆ لای خۆیی ڕاکێشێت و موناقەشەی زۆری لەگەڵدا کرد گوایە ئەو خەڵکی بۆ نوێژ بانگ دەکات و ئەو بانگەشە یەی ئەویش دوبەرەکی و ناکۆکی دەنێتەوە لەنێو ئەندامانی ئەنجومەنەکەدا ، ئەویش وەلامی دایەوە و فەرموی ( گەورەترین ڕاستی یەك کە لە دوای ئیسلام ئە درەوشێتەوە لە نوێژدایە ،هەرکەسیش کە نوێژ ناکات ناپاکە . فەرمانڕەوایی ناپاکیش ڕەت ئەکرێتەوە )[1].

کەمال ئەتاتورکیش گرتی و پاشان پاش ئەوەی بە پیلانی هەڵگەڕاندنەوەی نیزامی حوکم تۆمەت باری کرد دووری خستەوە ( نەفی کرد ) بەڵام بانگەوازەکەی بە نهێنی لە نێو ڕیزی لاوانی زانکۆ و سەربازەکانی سوپا و دامودەزگاکانی دەوڵەتدا بەردەوام لە بڵاوبوونەوە دابوو ، جارێکی تر بە تۆ مەتبارکردنی ئەتاتورك بە دەجال ڕووبە دادگایی کردن بوویەوە. ئەویش لەبەردەم دادگا ڕاوەستا و ووتی : ( من سەرم زۆر سوڕ دەمێنێت کە چۆن خەڵکانێك کە لە نێو خۆیاندا قورئان و واتا و موعجیزەکانی ئاڵوگۆڕ پێدەکەن تۆمەتباردەکرێن بەوەی خەریکی سیاسەت ودروستکردنی کۆمەڵە نهێنی یەکانن ، لە کاتێکدا هەق ئەدرێ بە خەڵکانی یاخی زۆربێشەرمانە و بەردەوام درۆ بەدەم قورئان و ڕاستی یەکانەوە بکەن !پاشان ئەوەدەکرێتە کارێکی پیرۆز ! چونکە ئەوە ئازادی یە ، بەڵام ئەو ڕۆشنایی قورئانەی کە لە نێو دڵی ملیۆنەها موسڵمانی وابە ستە بە دەستورەکەیدایە جێگەی مەترسی یەوئەبێت

---

[1] ) حاضر العالم الآسلامي ( ١/ ١١٧ ) .

هەموو زاراوە خراپو پیسی یەکانی ناو و سیاسەت هەیە برژێنرێت بەسەریدا . گوێ بگرن ئەی ئەوانەی ئایینەکەتان فرۆشتووە بە دنیا و ئاوەژووی نێو( بێ باوەڕی تەواو) بوون من بەوپەڕی ئەو هێزەی کە خوا پێی داوم دەڵێم : چی لە تواناتاندا هەیە بیکەن ، ئەوپەڕی ئامانجی ئێمە کە دەیخوازین ئەوەیە سەرمان بکەینە قوربانی بچوکترین ڕاستی لە ڕاستی یەکانی ئیسلام ..... ) [1].

ئینجا گەڕێنرایەوە بۆ دەست بەسەریەکەی و تا ساڵی ١٣٦٧ ك مایەوە ئەو کاتەی حکومەت ناچار بوو دەستبکات بە وەڵامدانەوەی داواکاری یەکسانی گەلی موسڵمان تایبەت بە چالاکی ئایینی [2] .

بەڕاستی سیاسەتە علمانی یەکەی ئەتاتورك بەڕوونی لە ناو بەرنامەی حیزبەکەیدا ( حیزبی کۆماری گەل ) دەرکەوت لە ساڵی ١٣٤٩ : دا جارێك و ساڵی ١٣٥٥ ك یش بۆ جاری دووەم . کە دەستوری تورکی نوسیەوە . ئەویش ئەو شەش بنەمایە بوون کە بەشێوەی شەش تیر لەسەر ئاڵای حیزبەکەی کێشرابوون کە هێما بوون بۆ : نەتەوایەتی ، کۆماری گەلێتی ، عەلمانی یەت ، شۆڕش ، دەسەلاتی دەوڵەت [3] . ئەتاتورك لەگەڵ ناڕازیبوونی موسڵماناندا عەلمانی یەتی تورکیای هەرسەرخست و لە ساڵی ١٣٥٦ ك دا مردو دونیای بەجێ هێشت !! بە دیهێنا . بە ڕاستی مصطفى کمال بەدوو ساڵ پیش مردنی تووشی نە خۆشی یەکی سەخت بوو لە گورچیلەکانیدا کە کەس لێی تێنە دەگەیشت ، توشی چەند نەخۆشی یەکی درێژ خایەن بوو بوو کە بەرگەی نەدەگرت ، هۆکەیشی سەرکردنە خواردنەوەی مەی بوو، کە بووە هۆی پەککەوتنی جگەر و هەڵئاوسانی دەمارەکانی دەست و قاچی و پاشان تووشی حالەتی خەمۆکی و دڵتەنگی وگۆشەگیری بوو ، لە بەشە سەرەکی یەکانی مێشکیشیدا تووشی داوەرین و داڕمان بوو . بۆیە ئەم دیکتاتۆرە نمونەیەکی ناوازە بوو لە دڵرەقی و زۆرداری و خۆویستی کاولکەریدا [4] .

---

[1] ) حاضر العالم الآسلامي ( ١٢٢/١ ) .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ١٢٢/١ ) .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ١/ ١١٦ ) .

[4] ) المسألة الشرقية – محمد ثابت الشاذلي ص٢٤٢ .

## ( باسی حەوتەم )

### ( چەند موژدەیەکی ئیسلامی لە تورکیای عەلمانیدا )

پاش مردنی ئەتاتورك لە ساڵی ١٣٥٦ ك دا (عیسمەت ئینونو) ی هاوڕێی لەسەر هەمان ڕێڕەوی عەلمانی سەرۆکایەتی گرتە دەست و لەسەرهەمان سیاسەتی ئەتاتورك دەچوو ، لە کاتی هەڵگرسانی جەنگی دووەمی جیهانی دا تورکیا پابەندی بێلایەنی بوو کەچی شەڕەکە دەستی پێکرد دایە پاڵ هاوپەیمانان و چوویە نێو جەنگەکەوە ، پاش کۆتای پێهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی ، تورکیا لە ولایەتە یەکگرتووەکان نزیك بوویەوە و لەگەڵیدا چووە نێو چەند پەیماننامەیەکەوە ، ئەمریکا لەسەر خاکە تورکی یەکان چەن بنکەیەکی سەربازی دانا و چەندین قەیرانی توندی ئابووری سەری هەڵدا کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ مەترسی یەکەی زیادی دەکرد و هەڵئاوساوی ماددی زیادی کرد .

دەوڵەت ڕێخۆشکەری کرد بۆ دامەزراندنی چەند حیزبێکی نوێی عەلمانی ، جا حیزبی دیموکراتی لە ساڵی ١٣٦٦ ك دا لە دوو بەرەکی نێو خودی ڕیزەکانی حیزبی کۆماری گەلدا گەشەی سەند . لە بە ختوکەدانی هەستی خەڵکی لە هەڵبژاردنەکانیشدا سەرکەوتنی بەدەست هێناو دەستیان دایە پێڕەوی کردنی سیاسەتەکانی ئەمریکا و ( جلال بایار ) کە سەرۆکی حیزبەکە بوو ، بوویە سەرۆك کۆمار لە ساڵی ( ١٣٧٤ك ) دا و پایەی سەرۆك وەزیران ئەوکاتە لە گرنگی دا دەیدا بەسەر پایەی سەرۆك کۆماردا .

قەیران و کارەساتە ئابوورییەکان درێژەیان کێشا و ڕەخنەیەکی زۆریش ڕووی کردە حیزبی فەرمانڕەوا، حیزبی ناسیونالیزمی کە لە ساڵی ( ١٣٦٨ك ) دا دروست بوو بوو ، فەرمانی هەڵوەشاندنەوەی بۆ دەرکرا بە بیانووی ئەوەی کە دژایەتی پرنسبە کەمالیەکان ئەکات ، بەڵام ئەم حیزبە بەناوێکی ترەوە دامەزرایەوە و ناوی خۆی نا ( حیزبی نەتەوایەتی کۆماری ) و باجێکی زۆرو سەختی خستە سەر ئەو ڕۆژنامە نوسانەی کە لە ڕیزی حکومەتیان دادەبەزاند ، هەروەها بە شێوەیەکی گشتی فشاری خستە سەر مامۆستایانی زانکۆکان و دادوەران و کارمەندە مەدەنی یەکان ، لە ساڵی ١٣٧٦ ك یشدا چەند مەرجێکی سەپاند بەسەر کۆبونەوەکاندا . حیزبی دیموکراتی تۆمەتی ئاڕاستەی زۆرێك لە بێتاوانەکان کرد بە بەشداری کردن لەوەدا کە بە ( پیلانی ئەفسەرەکە ناسرا بوو کە تۆمەتیاری کردبوون بە هەڵگەڕانەوە لە ڕێبازەکانی عەلمانی یەت ولادانەوە بەرەو ڕێکخراوەکانی ئایینی ئیسلامی

، له ڕاستیدا هەندێ چاو پێدا خشاندنەوە کرا دەربارەی هەندێ هەڵوێستی دژ بەرامبەر بە ئیسلامبەهۆی ئەوفشارە ئیسلامی یەی کە دروست بوو بوو [1].

تەنانەت حیزبی گەلی کۆماری دەستی کرد بە گۆڕان لە ئاڕاستە عەلمانی یەکەیەوەلەو کاتەوە کە بڕیاری گواستنەوە بۆ فرە حیزبی لە وولاتدا دا ، ئەوە بوو حیزبەکە کۆك بوو لەسەر کردنەوەی ئیلاهیات و پەیمانگەی زانستە ئیسلامی یەکان لە ئەنقەرە .

حیزبی دیموکراتی لە هەڵبژاردنەکانی ١٤ی ئایاری ١٩٥٠ ز دا پشتی بە کۆمەڵە ئیسلامی یەکان ئەبەست کە هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ بردنەوەی لە حیزبی گەلی کۆماری. بە هۆی ئەمەوە حیزبەکانی تریش پشتیان بەست بەو کۆمەڵانەی باسکران . وەك حیزبی عەدالەت لە ماوەی نێوان ١٩٦١-١٩٨٠ز دا . حیزبی ڕێگەی ڕاستیش لە هەشتاکاندا هێزی خۆی لە ڕای گشتی ئیسلامی یەوە وەردەگرت . حیزبی کاری نەتەوایەتی بەسەرکردایەتی ( ئەلب ئەرسەلان تورکش ) لەگەڵ ڕەوتە ئیسلامیەکەدا کەوتە ڕێ و گۆڕانی لە چەمکی عەلمانیەتدا دروست کردوو دەستی کرد بە نزیك بوونەوە لە ڕای گشتی ئسلامی و لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٧ز دا دروشمی ئەم حیزبە بریتی بوو لە ( ڕێ نیشاندەرمان قورئانە و ئامانجمان طورانە ) [2].

بەلأم کاری ئیسلامیبە شێوەیەکی ڕێکخراوەی ولە نێو ئەو شەپۆلە عەلمانی یە یەك لە دوای یەکدا بە ڕوونی دوای دەرکەوت و ڕێگەی دەرکەوتنی ( حیزبی ئاشتی نیشتمانی ) ( حزب السلامة الوطني ) دەرکەوت و کەوتە ڕێگەبڕین .

- **بزوتنەوەی ئیسلامی لە تورکیا دا پێش دەرکەوتنی حیزبی ئاشتی نیشتمانی پێکهاتبوو لە :**

* نرامەکانی سۆفیزم کە دژایەتی بزوتنەوەی "کەمالیەت " یان ئەکرد : ئەمانە بەپێی چەمکی تایبەتی خۆیان پارێگاری یان دەکرد لە کەلتوری ئیسلامی و بە نهێنی قورئانیان لە بەردەکرد ، ئامانجی ئەم بزوتنەوە یە بریتی بوو لە پارێزگاری کردن لە پەرستشە ئیسلامی یەکان لە دەروونی ڕای گشتی تورکیدا ، لەو بوارەشدا هەستان بە پێکهێنانی چەند کۆمەڵەیەك بۆ هاوکاریکردنی ماددی خوێندکارانی خوێندنگەکان تایبەت بە ئیمام وتار بێژان تابەردەوام ڕوو لەزیاد بوون بکەن ، و قەرەبووی ئەو کەم بوونەوەیە بکەن لە کاردیری

---

[1] ) حاضر العالم الأسلامي ( ١/ ١٢٠ ) .

[2] ) الحركة الأسلامية الحديثة في تركيا _ د .أحمد النعيمي ص١٨٤- ١٨٧ .

ئیسلامیدا كه له ئه‌نجامی خۆشاردنه‌وه‌ی بانگخوازه ئیسلامی یه‌كانه‌دا دروست بوو بوو كاتێك حیزبی كه‌مالی ڕووبه‌ڕووبوویه‌وه له‌گه‌ڵیاندا .

* بزوتنه‌وه‌ی پێشه‌وای گه‌وره چاكساز ( سه‌عیدی‌نورسی) كه به ( بزوتنه‌وه‌ی نور) ده‌ناسرێ و هه‌وڵه‌كانی‌ئه‌م بزوتنه‌وه‌یه‌چڕ ئه‌بێته‌وه له‌سه‌ر بانگه‌وازكردن بۆ ئیمان به خواو ڕۆژی دوایی و به‌ره‌نگاریكردنی ماتریالیزمی وبێباوه‌ڕی ( ئیلحاد) و گرنگیدان به په‌روه‌رده‌ی نه‌وه‌كانی داهاتوو . زۆرێك له شوێن كه‌وتوانی‌ئه‌م بزوتنه‌وه‌یه له سیاسه‌ت دووركه‌وتنه‌وه [1] .

كه توركیا جۆرێك له ئازادی به‌ده‌ست هێنا ، ئه‌و ئیسلامیانه‌ی باوه‌یان به گرنگی ململانێ ی سیاسی هه‌بوو پێشڕه‌وی یان كرد بۆ دامه‌زراندنی ( پارتی ڕژێمی نیشتمانی ) له كانونی دووه‌می ساڵی ١٩٧٠ ز دا كه ( یونس عارف ) هه‌ستا به دامه‌زراندنی .هاوكاری و پاڵپشتی ئه‌م حیزبه به‌شێوه‌یه‌كی سه‌ره‌كی له‌لایه‌ن بازرگانه بچوكه‌كان و پیشه گه‌رو پیاوانی ئاین ویستی نێو ئه‌نادۆڵه‌وه بوو . حیزبه‌كه له ماوه‌یه‌كی ته‌واو كه‌مدا فراوان بوو . ئیدی هه‌ڕه‌شه یه‌كی ترسناكی پێك ده‌هێنا له‌سه‌ر حیزبه عه‌لمانی یه‌كان . له ده‌قی به‌یانی دامه‌زرانه‌كه‌یدا ئه‌مه هاتووه : (( ئه‌مڕۆ : ئومه‌ته گه‌وره‌كه ئێمه كه درێژه پێده‌ری ئه‌و پاڵه‌وانه ئازاد خوازانه‌یه كه پێش هه‌زار ساڵ سوپا خاچپه‌رسته‌كانیان تێكشكاند و پێش ٥٠٠ ساڵ فه‌تحی ئه‌ستانبولیان كرد ، ئه‌وانه‌ی پێش ٤٠٠ ساڵ له ده‌رگاكانی( ڤیێننا) یان داو پێش ٥٠ ساڵ جه‌نگی سه‌ر به‌خۆیی یان به‌رپا كرد .ئه‌و ئومه‌ت ڕه‌سه‌نه ئه‌مڕۆ هه‌وڵ ده‌دات كه له گه‌لان ڕاست ببێته‌وه و هێزو په‌یمانه‌كانی له‌گه‌ڵ پارته ڕه‌سه‌نه‌كه‌ی ( پارتی ڕژێمی نیشتمانی ) نوێ بكاته‌وه . پارتی ڕژێمی نیشتمانی په‌یمان ئه‌دات كه پله‌و پایه‌داری‌به‌رز ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ ئومه‌ته‌كه‌مان ، ئه‌و ئومه‌ته‌ی پشكێكی گه‌وره‌ی له ڕه‌وشت و فه‌زڵی هه‌یه زیاد له پشكه مێژووی یه‌كه‌ی و ئه‌و پشكه‌ی ئێستاشی كه بریتی یه له ئه‌و هه‌مووه گه‌نجه تێكه‌یشتووه‌ی كه باوه‌ڕی به باس و خواستی خۆی و نیشتمانه‌كه‌ی هه‌یه ) [2]

.

---

[1] ) المعالم الرئسية التأريخية والفكرية لحزب السلامة ص ٤٣٥ .

[2] ) الحركة الآسلامية الحديثة في تركيا ص١٢٦ .

* پارتی ڕژێم بەرنامەی ئیشکرندنی لە دووتوێ ی چەندین بیروڕا ( ی گشتیدا ) ئەخاتە ڕووکە دەکرێت لەم خالانەدا پوختی بکەینەوە :

١- هەموو دامەزراوزە گرنگەکانی نێو تورکیا لە دەسێکی ڕۆژئاوایی نانیشتمانی دایە ، باری سروشتی و پێویستی نەتەوەیش داوای ئەوە دەکەن کە ئەو دامەزراوانە بگەڕێنەوە بۆ خاوەنەکانیان .

٢- خەڵك (٤٠ ) ساڵ ژیاو هێزە دەرەکی یە کاریگەرکانیش هەوڵی دوورخستنەوەیان دەدەن لە تەوەری ڕاست و دروستی خۆیانەوە بۆ تەوەرێکی نامۆ ، بۆیە خەڵك کەوتوونەتە نێو تەنگەبەری و چەرمەسەری توندەوە ، پێویستە خەڵك بگەڕێتەوە بۆ باری سروشتی و تەوەرەی ڕەسەنی یان ( سروشتە خوا دابێ بەکری ) تا کاروو باریان ڕاست ببێتەوە و لە بیرو باوەڕەنامۆکانیان ڕزگاریان بێت .

٣- ئەم ناوە تازانەی سەردەم وەك ڕاست و چەپ و ناوەڕاست . ئەمانە لە داهێنانی ماسۆنی وزایونزمن کە هەموویان چەند دامەزراوە یەکی شوێنکەوتەی یەك ئامانجن . ئەویش ئەوەیە کە تورکیا لەو هێڵە شارستانی یەی لابدات کە تەمەنی هەزار ساڵە . جا ڕزگار بوون لەو ناوانەو گەڕانەوە بۆ ئەو هێڵە ڕەسەنە کە ڕابردووی پرسەروەری سبەینێی پرشنگدار دەگەیەنێت .

٤- پارتی ڕژێمی نیشتمانی وەك هیچ حیزبێکی تر نابێت . هەموو حیزبەکان لەسەر بنەمای دەسەلآت گرتنە دەست و ئارەزووی فەرمانڕەوایی بەرپا دەبن ، بەلآم ئێمە لەسەر بنەمایەکی نوێ هەڵدەستین کەڕازی یکردنی خواو کارکردنە لە پێناو نیشتماندا .

٥- سیسم فێرکردن لە تورکیا گەندەڵە و کەمینەیەکی کینە لە دڵە خاچپەرست و جوولەکە بە شێوەیەك دایاننناوە کە لەگەڵ ئەم ئوممەتەدا شیاو وگونجاو نی یە ، ئەو سیستمە هەموو نرخێکی ئایینی یان ڕەوشتی لە ڕیشەوە دەرهێناوەو ئامانجی جیاکردنەوەی تورکیا یە لە ڕابردووی ئیسلامی و سڕینەوەی لە ئایین و ) بەهابالآکانی وتەنیا بەم ڕێگە یە دەتوانن نەوەکان لە ناوبەرن و وولآت کاول بکەن ، بەڕاستی وا ٥٠ ساڵ تێپەڕی و ئێمە هەر دەبیستین تورکیا بەشێکە لە ئەورووپا و پێویستە ڕاپەڕین لە سەر کەلاکی ئایین دەستپێ بکات چۆن لە ڕۆژئاوادا ڕوویدا ، کەچیئەوەیان بیر چووەتەوە کە : ئیسلام جیاوازە لە کەنیسەو دەوڵەتیقەشەو پیاوانی ئاینی .

٦- لەو کاتەدا کە تیایدا دەوڵەت ڕێگری دابەشکردنی کتێب دەکات بەسەر پەیمانگە باڵا ئیسلامی یەکاندا و هەوڵی داخستنی پەیمانگەکانی پێشنوێژو وتابێژان و خوێندگەکانی فێرکردنی قورئان دەدات ، پارمەتی ماددی ملیۆنەها شانۆ و هونەر مەند دەدات . لەگەڵ پارە بۆ ئەو خواردنەوانەی لە نێو باڵوێزخانەکاندا دابەش دەکرێت . لەو کاتەدا کە دەوڵەت ڕێگری دەکات لەو کچە خوێندکارە کەمدەسانەی کە لەچك دەدەن بەسەریاندا ، لە هەموو شوێنێك بەبێ چاودێری یان فشارێك کتێبەکانی لاهوت دەوترێتەوە . ئەمەیش واتای ئەوەیە کە پارتی ڕژێمی نیشتمانی هەقیەتی دووپاتی گەڕانەوە دەکات بۆ ئیسلامی ڕاست و دروست [1] .

جولەکە و عەلمانی یەکان لە تورکیادا لە ڕووی ئەو دەنگە گەنجانەدا خۆیان نەدەگرت کە بەزینوویی و چالاکی یەوە دەردەپەڕی و سەری هەڵدەداو ئیمانێکی قوڵی بە ئیسلام و گرنگی گەڕانەوەی گەلی تورکی بۆ ئیسلام لە باس و خواسەکانیدا دەیجولاند . بۆیە سوپای تورکی لە ئازاری ١٩٧١ زدا بە هۆی چالاکیپارتی کرێکارانەوە کەوتە ڕێو جوڵاو باس و خواسی پارتی رژێمی نیشتمانی گەیاندە دادگای دەستوری کە لە ٢١ی مارسی ١٩٧١ زدا بڕیارێکی زۆردارانەی دەرکرد بە هەڵوەشاندنەوەی پارتەکە [2] .

* لە بڕیاری دادگای باڵای ئاسایشی دەوڵەتدا ئەمە هاتبوو :

١- ئەوبنەمایەی کە پارتەکەی لەسەر بەرپا بووە لەگەڵ هەڵسوکەتەکانیشیدا پێچەوانەی دەستوری تورکین .

٢- ئیش کردن بۆ لە کارخستنی عەلمانی یەت لە وڵات دا و بەرپا کردنی حوکمەتێکی ئیسلامی .

٣- هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو دامەزراوە ئابووری و کۆمەڵایەتی و یاسایی یانەی کە وولاتی لەسەر ڕاوەستا وە .

٤- ئیش کردن دژ بە بنەماکانی ئەتاتورك .

٥- هەستان بەهەندێخۆپیشاندانی ئایینی .

---

[1] ) الحركة الأسلامية الحديثة في تركيا ص١٢٧ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٢٨ .

هەروەها لە بڕیاری دادگاکەدا هاتبوو : هیچ کەسێك لە کەسایەتی یەکانی پارتەکە بۆی نی یە لە چوارچێوەی هیچ پارتێکی تری سیاسیدا ئیش بکات و بۆیشیان نی یە حیزبێکی نوێ دامەزرێنن وڕێگەش نادرێ خۆیان بۆ هیچ هەڵبژاردنێکی تر بپاڵێون ئەگەر بۆ ماوەی پێنج ساڵ بابەناوی سەربەخۆشەوە بێت . ئەمەیش واتای ئەوەیە کە نێوانی سەرهەڵدان و داخستنی حیزبەکە تەنها دەمانگ بووە [1] .

لە نێو ئەم ڕووداوە گەرمو گوڕو تەواو توندو تیژەی یەی نێوان ئیسلام و عەلمانی یەت لە تورکیادا، موجاهیدی گەورە ( نەجمەددین ئەربەکان ) دەرکەوت و جەنگێکی فیکری لەگەڵ عەلمانی یەکاندا بەرپاکرد ، جا لە ٢ی ئابی ١٩٧٢ ز و پێش دامەزراندانی حیزبی ئاشتی نیشتمانیدا ( ئەربەکان ) لە ئەنجومەنی نیشتمانیدا قسەی کردوو ووتی : ( ڕامان وایە کە ڕونکردنەوەی گرنگی زیاترو لەبار بدەین بۆ کردنی دەستور بەدەستورێکی دیموکراتی ، پێویستە لێرەدا چەند مادەیەکی لەباری دەستور هەبن بۆ ناساندنی بزوتنەوەکان و مافەکانی فیکرو بیرو باوەڕ . هەروەها دەکرێت کەشێك بڕەخسێنرێت بۆ جێبەجێکردنەکانی ئێستا کە لەگەڵ بنەما بنەڕەتی یەکانی دەستوردا نەیارن ، خەڵك پێویستە سەرەتا قسە لە بناغەکانی ( بیری ئازاد) و( ئازادی بیرو باوەڕ) بکات . دەوڵەتەکەیشمان بەردەوام لەو کارەدایە و گەشە دەسێنێت ولە داهاتوودا شوێنی خۆی وەردەگرێت لە نێو جومسەرە شارستانی یەکانی جیهاندا ) [2].

( ئەربەکان ) وای دەبینی کە سیستەمی دیموکراتی بە دیموکراتی ناژمێرێت بەبێ دیاری کردنی مافەکان و ئازادی بیروباوەڕ ، لە پشت ئەمەیشەوە ئامانجی ئەوە بوو ئازادی تەواودەستەبەر بکاتبۆ بلاْوکردنەوەی بیروڕا ئیسلامی یەکان ، هەر دوو ڕۆژنامەی ( جمهوریەت ) و( مللیەت ) ی عەلمانی لێدوان و قسەکانی ئەربەکانیان بەوە لێکدایەوە کە ڕێگەبۆ ئەوە خۆش دەکات کە ئایین بەکار بهێنێ بۆ ئامانجگە لێکی سیاسی [3] .

بەڕاستی ( نەجمەددین ئەربەکان ) هێرشی زۆری کردە سەر عەلمانی یەت و سودی لە کونوکەلە بەرەکانی نێو دەستوری تورکی بینی ، وەلاْمی هێرشەکانی ڕاگەیاندنی عەلمانی یە

---

[1] ) الحركة الآسلامية الحديثة في تركيا ل١٢٨ .

[2] الحركة الاسلامية في تريا – د. النعيمي ل١٢٨ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو: ل٢٨ .

ناحەزەکانی کە دژ بە پڕۆژەکانی ئەو بوون بەوە دایەوە ، ووتی : ( بەڕاستی چەمکەکانی نەتەوایەتی و دیموکراتی و عەلمانی یەت و کۆمەڵایەتی کە کەسێتی دەوڵەتی لەسەر بەندە بە پێی ماددەی دووەمی دەستور ، ئەمە دەکرێت بەوە ڕوون بکەینەوە کە ئەو ماددەیە ڕێگەی ئەوە نادات ،هێزی ئۆپۆزیسیۆن تەفسیرو بەکارهێنانی خۆی پەیڕەوبکات ، لەم بوارەیشدا بەشێوەیەکی تایبەت چەمکی نەتەوایەتی پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە ، ئەمەیش واتە پێویستە وا دەستنیشان بکرێت ڕێزگرتنی هەموو ئاکارە ڕۆحی یەکانی نەتەوایەتیمان بگرێتە خۆی چ وەك سەروەریە مێژووی یەکانمان وچ وەك نەریتەکانمان )[1].( نەجمەددین ) ئەوەیشی زیاد کردوو ووتی : ( ئایین بیرۆباوەڕێکی بنەڕەتی و سیستەمێکە بۆ بیرکردنەوەی هەمووتاکێك ، ئەوەیش واتە دانانان بە مافی ئازادی و بوون و مافە بیروباوەڕی یەکانی تاکدا ، بەڕاستی بێبەش کردنی تاك لە بنەمایانە دژ بەڕۆح پرنسیبە بنەڕەتی یەکانی دەستورە بە تایبەت بڕگەی یەکی ماددەی نۆزدە و بیستی ( ١٩، ٢٠ ) دەستور )[2].

پاش هێور بوونەوەی کەشی توندو تیژی و ڕاڕایی سیاسی لە نێو سیاسەتی ناوخۆیی تورکیدا بە پێی یاسا ( عورفی ) یەکان ، ئەربەکان هەستا بە کۆکردنەوەی کادیری ئەندامانی پارتی ڕژێمی نیشتمانی و حیزبێکی نوێی لێ دامەزراندن و ناوی نا( حیزبی ئاشتی نیشتمانی ) .

( حیزبی ئاشتی نیشتمانی ) لە ماوەیەکی کەمدا کە لە ( ٨ی ) مانگ تێنەپەڕی توانی لە ١٧ پارێزگادا بنکەکانی ڕێکبخات و نەجمەددین ئەربەکان ڕایگەیاند کە سەرکەوتنی حیزبەکەی لەو ماوەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سۆزە گشتی یەی لەگەڵ ئەو حیزبەدا هەیە کە بانگەواز بۆ گرنگیدان بە ڕەوشتە ئایینی و هەڵوێستە مەعنەوی یەکان دەکات ، لەسەر ئەو بنەمایەیش حیزبی ئاشتی نیشتمانی لەبەر نامەکانیدا ئەمەی دووپات دەکردەوە :
( بەرقەرارکردنی ڕێکخراوێك کە لەسەر ڕەوشت و کاری چاك دائەمەزرێت و بەهای مەعنەوی بە مرۆڤ دەبەخشێت هەروەك ماددەی دەو چواردەی دەستور نوسیویەتی و دوپاتی دەکاتەوە کە بەهای مەعنەوی مرۆڤ لەسەر بناغەی ڕەوشت و کاری چاك ڕائەوەستێت )[3] .

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٢٨ .
[2] )المعالم الرئيسية للآسس التأريخية لحزب السلامة الوطني ص٤٣٥ .
[3] ) الحركة الآسلامية الحديثة ص١٣٠ .

* گرنگترین کارەکانی حیزبی ئاشتی :

کاتێك حیزبی ئاشتی ( سەلامەت ) هەستی بە بەهێزی خۆی کرد و بوو بە بە شێك لە ژیانی سیاسی نێو تورکیا ، ناودارانی حیزبەکە هەستان بە بەرپاکردنی هێرشێکی ڕاگەیاندنی ڕێکخراو بۆ سەر بنەما عەلمانی یەکان نێو تورکیا و بۆ خەڵکیان ڕوونکردەوە کە چوارچێوەی سیاسی بۆ تورکیای نوێ دژ بەبنەما سیاسیەکانی ئیسلامە و ئیسلام بڕیاری یەکخستنی دەسەڵاتە سیاسی و ئایینی یەکان لە ژێر دەسەڵات ئاییندا دەدات ، . بەم واتایەیش عەلمانی یەت و ڕژێمی عەلمانی دژی ئیسلام و شەریعەت و ئایینە بەتایبەت جێبەجێکردنی لە تورکیادا چونکە ئەو بۆ دابیناکردنی زەندەقە نەخشەی بۆ کێشراوە [1] .

بەدوای ئەم قسانەدا ئەڵێن: ( تەنیا ناپاك و درۆزنەکان دەڵێن ئایین و سیاسەت دووشتی لەیەك جیان . چونکە موسڵمانان کاروباری دنیا لە کاروباری ئاسمان جیا ناکەنەوە . بە ڕوونیئەوە دیارە کە مافی مرۆڤ نی یە (( شەرع )) دابنێت ، بەڵام ئەگەر دەستی کردە یاسادانان یان لافی ئەوەی لێ ئەدا کە ئەتوانێ یاسا دابنێ . ئەوا ئەو زاستەی بە هەڵەو تاوان دادەنرێت . دروستکەری یاسا ئیسلامی یەکان خودی دروستکەری مرۆڤە ، بەڕاستی خوا مرۆڤیگونجاو بە ئەو یاسایانە دروست کردووە ، بەڕاستی یاسا مرۆڤکردەکان لەگەڵ سروشتی مرۆڤدا ناگونجێن ، ئیسلام ڕژێمێکە بۆ هەموو سەردەمێك دەگونجێت ، ئەو هەم ئایین و هەم دەوڵەتیش لە خۆ دەگرێت . قورئان بۆ ئەوە دانەبەزیوە تا لە گۆڕەکاندا بخوێنرێت یان لە شوێنەکانی پەرستشدا کلیل بدرێت . بەڕاستی خوا قورئانی دابەزاندوە حوکم بکات ) [2] .

موجاهیدی گەورە ( نەجمەددین ئەربەکان ) لە ڕێگەی دژایەتی کردنی عەلمانی یەتدا زەحمەتی زۆری بوو کە ململانێ ی بە بەڵگە و پڕۆژە لەگەڵدا ئەکردن ڕێگە ی خۆی بڕی ، لە کاتی لێدوانەکانیشی لەگەڵ ( ضیائولحەققی ) فەرمانڕەوای پێشووی پاکستاندا – خوا ڕەحمی پێبکات – بەڕاشکاوانە ڕاکانی خۆی دەردەبڕی بە جەخت کردنە وە لەسەر ئەوەی : بەشداری ئیسلام لە هەموو بوارەکانی ژیاندا تاکە مەرجی بەرپابوونی دەوڵەتی ئیسلامی یە

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٣١ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

، لەم بوارەیشدا ( نەجمەددین ئەربەکان ) دەڵێت ( پێش هەموو شتێك پێویستە دەوڵەت ئیسلامی بێت ، ئەگەر وانەبێت ، ئەوا ئایینی ئیسلام لە مەترسیدا یە )[١] .

حیزبی ئاشتی نیشتمانی لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٧٣زدا هەوڵی نەدەدا کە راستەوخۆ هەڵوێستی هێرش بردن بگێرێتەبەر بەرامبەر دیموکراتی یەت ، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٠ زدا هەستیڕاستەقینەی خۆیان دەربڕی کاتێك دەستیان کرد بە رەخنە گرتن لە دیموکراتی یەت بە دوپات کردنەوەی ئەوەی دیموکراتی یەت لەگەڵ بنەماکانی ئیسلامدا ناگونجێت[٢] . لەم بوارەیشدا حیزبی ئاشتی دووپاتی کردەوە کە : ( دیموکراتی یەت پیلانێکی رۆژئاوایی یە بۆ سەرکردایەتی کردنی نەزانانەکان بە پێی شێوازی ئاکارە رۆژئاوایی و مەسیحی یەکان ، بەڕاستی ئەوە سەرکەوتنی مەسیحیەتە دژ بە ئیسلام ، بۆیە پێویستە یاسا خوایی یەکان جێبەجێ بکرێن ، چونکە مرۆڤـ ناتوانێت یاسا گەلێك دابنێت کە بتوانرێت جێبەجێ بکرێن )[٣]

دەکرێت دیدی ڕوانینی حیزبی ئاشتی نیشتمانی لەمەڕ سەرمایەداری و هاوبەشەکی لە نوسراوێکی( نەجیب ( فازل ) دا پوخت بکەینەوە کە تیایدا هاتووە : ( ئێمە ڕێگەی ڕزگار بوون دابەش دەکەین بۆ دوو کۆمەڵە :

یەکەمیان ڕێگەی ئیسلامە لە ڕزگاربووندا . دووەمیش دەکرێت وەك ڕێکخستنێکی بۆماوەیی ڕیزبەندی بکەین کە ناتگەیەنێتە ڕزگار بوون ، کۆمەڵەی دووەم پشت بە ڕێنمایی یە خودایی یەکان نا بەستێت و دژایەتی خودی خۆی ئەکات بە پشت بەستنی بەیاسا گەلێکی کە دروست کراوی مرۆڤە ، وەك : کۆمۆنیستی ، سەرمایەداری ، سۆسیالیزمی ، دیموکراتی ، بەڕاستی ئەوە دووپات کراوەتەوە کە خوا فەرمانمان پێ دەکات بەوەی بەپێی ڕێنمای یەکانی قورئانی پیرۆزحوکمڕانی بکەین نەوەك بەپێی ڕا تایبەتی یەکانی خۆمان . ئەگەر بەپێی نیزامی دەنگدان فەرمانڕەوایی یان کرد ، ئەوا پێویستی یان بە قسەی خوانی

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٣٢ .

[2] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٣٥ .

[3] ) الحركة الآسلامية الحديثة ص١٣٥ .

یە . لە کۆمەڵگەیەکیشدا کە هەموو باس و خواسەکان بەپێی دەنگدان چارەسەر بکرێن ، ئیسلام بلاو نابێتەوە ) [1].

سەبارەت بە پەیوەندی حیزب بە ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە ، حیزبی ئاشتی نەیاری بوونی ئەمریکی بوو لە خاکە تورکی یەکاندا ، هەروەها نەیاری بەکارهێنانی زەوی یە تورکی یەکان بوو لە لایەن ئەمریکاوە دژ بە دەوڵەتەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست . لە ئەنجامی ئەمەیشدا حیزب لە کۆتایی یەکانی ساڵی ١٩٧٩ زدا بە هۆی زیادە چالاکی سەربازی ئەمریکی لە تورکیا ڕەخنەی ( توندی ) گرت لە حوکمەتەکەی ( دیمریل ) ، بەوەی داوا یەکی پێشکەش کرد بە ئەنجومەنی نوێنەرانی تورکی کە تیایدا داوای لێپرسینەوەی لە حکومەتەکەی دیمریلی دەکرد بەهۆی ئەو چالاکی یە ئەمریکی یانەوە . بەڵگەی لەمەشدا ئەوە بوو دوو فرۆکە لە فرۆکەخانەی مالقا کە ١٨٠ سەربازیان تێدا بووە نیشتبوونەوە لەگەڵ نوێترین ئامادەسازی جەنگیدا ، حیزب ئەوەی دووپاتکردەوە کە ئەوە هەڕەشە لە ئاسایشی ناوچەکە دەکات .

لەڕاستیشدا حیزبی ئاشتی توانی ڕایەکی گشتی دژ بە ڕۆژئاوا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پێك بهێنێت لە ڕێگەی کێشەی قوبرصی یەوە . ئەربەکان هەستا بە ڕۆڵێکی سەرەکی لە ڕازی کردنی سەرکردە سەربازی یەکان بۆ ئەوەی سوپاکانیان ببەنە دوورگەکە . جا لە کاتی ئامادە نەبوونی ئەجوید کە لەسەردانی هەندێ ووڵاتی ئەورووپای باکوردا بووئەربەکان سەرکردایەتی گرتە دەست .

حیزبی ئاشتی بەسەرکردایەتی ئەربەکان ئیشی ئەکرد بۆ لە کارخستنی هەموو نەخشەو پڕۆژە یۆنانی یەکان لە دەریای ئیجەدا . لە و بوارەدا ئەربەکان دەڵێت ( بەپێی بنەماکانی دادپەروەری و ماف و ڕاستی دەجوڵێنەوە نەوەك بەپێی ئەو بنەمایانەی کە جەمسەرە گەورە ئەورووپی یەکان دەسنیشانی دەکەن ) [2].

لە و بارەشەوە کە پەیوەندی بە بازاڕی هاوبەشی ئەورووپاوە هەیە ئەربەکان دەڵێت : ( پێویستە تورکیا لە نێو بازاڕی هاوبەشی ئەورووپای دەوڵەتە ڕۆژئاوایی یەکاندا نەبێت ، بەڵکوو ئەبێت لە بازاڕی هاوبەشی دەوڵەتە ڕۆژ هەلاتیەکاندابێت ، چونکە تورکیا لە ناووڵاتێ

---

[1] ) هەمان سەرچاوەیپێشوو .

[2] ) الآحزاب السیاسیة في ترکیا ص١٩٢ .

ڕۆژئاوایی یەکاندا دواکەوتووە ، بەڵام لەلای وڵات ڕۆژهەڵاتی یەکان پێشکەوتووە ، ئەگەر تورکیا چووە نێو بازاڕی هاوبەشی بارودۆخە قەڵەمڕەو بە دەستەکانی ئەمڕۆوە ئەوا دەبێتە جێگە ی تەماحی وڵاتی ئیمپریالیزمەکان ) [1].

بەڕاستی حیزبی ئاشتی کاریگەری گەورەی هەبوو لە سەر شەقامی تورکیدا و کاری کرد لە سەر گەڕاندنەوەی پێناسی ئیسلامی و بە بورهان و بەڵگەکانی ئیسلام ململانێ ی ئەکرد لەگەڵ ڕژێمە سوسیالیزمی و سەرمایەداری یەکان دا . نەجمەددینی سەرکردەی حیزبەکەش هاوڕێ لەگەڵ عیززەتی ئیسلامی دا قسەی دەکرد و مەترسی لادان لە مەنهەجی خوای بۆ گەلی تورکی ڕوون ئەکردەوە و موشەکەکانی ئاڕاستەی دوژمنانی ئیسلام دەکرد . لەم بوارەیشدا ( نەجمەددین ئەربەکان ) هەر دوو ڕژێمی سوسیالیزمی و سەرمایەداری مان بۆ هەڵدەسەنگێنێت و لەبارەی ئەوەی پەیوەندی بەیەکەمەوە هەیە دەڵێت (سوسیالیزمی بیرۆکەیە کە هەڕەشەیە بۆ سەر ئازادی یەکان و زیان لەقەوارەی نەتەوەیی دەدات و جەخت لەسەر سەرچاوە بیانی یەکان دەکاتەوە ) [2] لەمەڕ ئەوەیش پەیوەندی بە دوەمەوە هەیە دەڵێت ( بیری سەرمایەداری بیرێکە لەسەر( سووخواردن ) وەستاوە و سەرچاوەکەشی سەرچاوەیەکی بیانی یە ، حیزبی ئاشتیش بە بەرزکردنەوەی ئالای ڕەوشت ورەسەنایەتی ڕێگەی خۆی ئەبڕێت و ڕژێمی سەرمایەداری و ڕژێمی سوسیالیزمیش تەنیا پەیوەند نین بە مەیدانی ئابوریەوە ، بەڵکو کاریگەری یانئەگاتە هەردوو مەیدانەکەی کۆمەڵایەتی و مەعنەویش . هەرچەند هەردوو ڕژێمەکە لە ڕووکەشدا لەیەك جیان ، بەڵام هەردووکیان ماددین و هەردووکیان کار لەسەر ڕاپەڕینی ماددی ئەکەن لە بەرامبەر ڕماندنی ڕەوشت و مەعنەوی یباتدا ، هەردووکیشیان لەگەڵ داڕومانی ڕۆشنبیری و ڕەوشتدا بەرزبوونەوەی ماددی یان زیاددەکات ) [3].

بەڕاستی ئامانجی حیزبی ئاشتی گەیشتن بوو بە تێگەیشتنی ( تورکیای گەورە ) و سووربوون لەسەر ئەوەی دەست بگرن بە ڕابردووی شکۆداری عوسمانی یەوە ، گرنگی پابەندبوون بە ئیسلامیشی بۆ خەڵك ڕوون کردەوە و سیاسەتێکی گرتە بەر کە لە مەودایەکی

---

[1] ) الحركة الآسلامية الحديثة في تركيا ص١٣٧ .

[2] يقظة الآسلام في تركيا ص٢٩-٣٠ .

[3] ) هەمان سەرچاوە ل٣٠ .

دووردا دەبێتە هۆی لەناو بردنی بنەما عەلمانی یەکانی ئەتاتورك ، لە هەمان کاتیشدا بانگەوازی دەکرد بۆهەماهەنگی نەکردن لەگەڵ ڕەگەزە نائیسلامی یەکانی نێو تورکیا . لە هەمان کاتیشدا بەتوندی بەرەنگاری شیوعیەت بوویەوە و دووپاتی ئەوەی دەکردەوە کە چاکترین ڕێگەی بڵاوبوونەوەی ڕێبازە ئیسلامی یەکان بریتی یە لە دابین کردنی ژیانی ئازاد بۆ هەموو هاوولاتی یەکی تورکی . ئەربەکان بانگەوازی ئەکرد بۆ پێویستی گەشە و برەو دان بە پەیوەندی یەکانی تورکیا لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا لە هەموو بوارەکاندا ، بۆ نمونە دەڵێت : ( با ئەو پەیوەندی یانە بە وێنەیی نەمێنێتەوە ، بەڵکوو پێویستە ببنە پەیوەندی کرداری گەشەسەندوو ، بەوەی لە جیهاندا نزیکەی ٥٠ دەوڵەتی ئیسلامی هەن کە ژمارەی دانیشتوانی دەگاتە یەك ملیار کەس ، ئەو دەوڵەتە ئیسلامی یانەیش بازاڕێکی سروشتی بەهێزن بۆ بەرهەمەکانمان )[1] لەسەر ئەو بنەمایە ، ( ئەربەکان ) بە توندی ڕەخنەی لە زایۆنیزمی و ماسۆنی یەت ئەگرت و[2] بەوەی لە و بوارەدا دەڵێت ( بەڕاستی زایۆنیزمی و ماسۆنی یەت کاتی خۆی هەوڵیعەزلکردنی تورکیایان لە جیهانی ئیسلامی داوە و پیلانەکانیشیان بەردەوامە ، جا جەنگی نێوان ئیسلام و زایۆنیزم لە تورکیا دا چەندین شێوەی وەرگرتووە و جەنگی درێژخایەنە و ماوەی پێنج سەدەیە بەردەوامە ، هەر لە کاتی فەتحکردنی قوستەنتیەوە لەسەردەستی سوڵتان محمدی فاتیحدا وکارکردنی بۆ فەتح کردنی (روما ) ش . بەلاَم ئەو ململانێیە لەسەد ساڵی کۆتاییدا شێوە یەکی نەخشە بۆ کێشراوی پێشوەختی لە خۆ گرت ، بۆیە لە ساڵی ١٨٣٩ زدا هەندێ لە هێزەکان توانی یان کاربکەنە سەر فیکری دەوڵەت و بە هۆی ڕێکخراوە ماسۆنی یە جولەکەکانەوە چەندین یاسای دانراوی دوور لە ئیسلام بخەنە ناوی یەوە .

کاری جولەکەیی لە تورکیا دابەش کرا بۆ سێ قۆناغ کە ماوەی ٣٠ ساڵ بخایەنێت کە ئامارەیە بۆ جێبەجێکردنی بیرۆکەکەی ( لیتویود و هرتزل ) بۆ ڕووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامی لە تورکیادا ، قۆناغی دووەمیش ٢٠ ساڵ بەردەوام بوو کە بۆ دوورخستنەوەی تورکیا بوو لە ئیسلام . پاشان حیزبی ( ئیتیحاد و تەڕەقی ) گەشەی سەند کە پەیوەندی بە جولەکە و ماسۆنی یەتەوە هەبوو ، پاشان توانی ( سوڵتان عبدالحمید ) بخات و دەستی کرد

---

[1] ) هەمان سەرچاوە .

[2] ) الحركة الأسلامية الحديثة في تركيا ص١٤١ .

به دوورخستنەوەی تورکیا لە ڕێڕەوی ئیسلامی وهەوڵدان بە چەندین ڕێگە بۆ بە ڕۆژئاوای کردنی ئەو وولاتە ، گرنگترینیان ئەو عەلمانی یەتەیە کە بە شێوەیەکی دەست نیشان کراو لە تورکیادا مەبەست پێ ی چەوساندنەوەی موسڵمانان بوو[1] .

حیزبی ئاشتی نیشتمانی بەشداری هەڵبژاردنە گشتی یەکانی ساڵی ۱۹۷۳ ز کردو تیایدا ۱۱/۹٪ ی دەنگەکانی بە دەست هێنا ، واتە ۲٤ / ۱ ملیۆنی دەنگی دەنگدەران ، لە ئەنجامی ئەمەیشدا لە ئەنجومەنی نیشتمانی تورکی دا بە ٤٥ کورسی خۆی نواند[2].

ئەربەکان لە ئێوارەی هەڵبژاردنەکانی ۱۹۷۳ زدا ڕایگەیاند : ( ئێمەبەم زووانە سەردەمی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) دەگێڕینەوە ) . هەروەك پاش هەڵبژاردنەکان ڕایگەیاند کە دروشمی حیزبەکەی ئەو _ کلیلە _ ئەویش کردنەوەی ڕێگەی داخراوی بەردەم حیزبەکەی دابین دەکات و دەبێتە کلیلی هەموو حکومەتێکی ( ئیئتلافی ) تر لەمەو دوا .[3]

لە ئەنجامی ئەمەدا یەکەم حکومەتی ئیئتلافی پێکهات کە حیزبی کۆماری گەل و حیزبی ئاشتی نیشتمانی لە خۆگرت ، ئەوەیش لە ۲٥ ی کانونی دووەمی ۱۹۷٤ زدا بوو کاتێك وەزارەت ۱۸ وەزیری ئەندامانی حیزبی کۆماری گەل و حەوت ئەندامی حیزبی ئاشتی لە خۆگرت .

بە فەزڵی خواو دواتر بە هەوڵەکانی حیزبی ئاشتی نیشتمانی بەسەر کردایەتی ئەربەکان ، بۆ یەکەم جار لە ئازاری ۱۹۷٤ ز دا تورکیا لە کۆنگرەی باڵای ئیسلامیدا بەشداری کرد و وەزیری ناوخۆی تورکی ( کە لە حیزبی ئاشتی نیشتمانی بوو ) لە و کۆنگرەیە دا هەڵبژێردرا .

بەڕاستی چالاکی حیزبی ئاشتی نیشتمانی لە ماوەی حەفتاکاندا بووە هۆی شڕو شێواو بوونی دیاردە عەلمانی یەکانی نێو تورکیا بەوەی کە چەند دیاردەیەکی ئیسلامی بڵاوبوویەوە کە ڕێگەی درا بە پێگەیاندن و ڕاهێنانی پێشنوێژ و ئامۆژگاری کەرەکان ، ئەو خوێندنگانە نزیکەی ۱۰٪ ی زانست خوازانی نێو خوێندنگە ناوەندی یەکانی دەوتەوە کە ٥٠٠٠٠ ڕەگەزی ئافرەتی نێو تورکیای تێدا بوو ، لە ڕاستی دا دەنگدانی ئیسلامی گەیشتە

---

[1] ) الصحوة الأسلامية منطلق الأصالة وإعادة بناء الأمة ص١١٧ .

[2] ) الحركات الأسلامية الحديثة في تركيا ص١٤٢ .

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٤٣ .

نێوان ١٠ ٪ بۆ ١٥ ٪ ، عەلمانی یەکانیش ئەو ڕێژەیەیان بە مەترسی زانی بۆ سەر شارستانی تورکی [1].

بەکاریگەری حیزبی ئاشتی نیشتمانی و خوێندکارەکانی نور لە تورکیا دا زنجیرەی ( هەزار کتێب ) هاتە بوون کە وەزارەتی پەروەردە هاوکاری دەکرد ، ئەم زنجیرەیە ڕۆشنبیری تورکی بە پێوەرێکی ئیسلامی ئەخوێندەوە هات ، حیزبی ئاشتیش لە کۆنگرەی گەورەی نیشتمانی تورکی دا چەمکە ئیسلامی یەکانی قوڵ دەکردەوە ن ڕۆژنامە ئیسلامی یەکانی نێو تورکیا هێرشیان ئەکردە سەر کمال ئەتاتورك و ناوی ( دەجال ) یان بەسەردا بڕی ، حیزبی ئاشتی نیشتمانی فشاری خستەسەر سەرۆکایەتی کاروباری ئایینی ئەوە بوو لە حوزەیرانی ١٩٧٣ دا بەیانێکی دەرکرد کە تێیایدا جەختی کردەوە لەسەر ئەوەی کە ئافرەتی تورکی هانبدات بۆ باڵا پۆشی ( حیجاب کردن ) .

کاتێ ئەربەکان لە ساڵی ١٩٧٤ ز دا گەشتێکی کرد بۆ سعود یە – لە کاتێکدا جێگری سەرۆك وەزیران بوو – سەردانەکەی بە زیارەتی کەعبە دەست پێکرد ، لە و نامەیەدا کە بۆ مەلیك فەیصەڵی – ی نوسی ( بەڕەحمەت بێت ) تیایدا ئەمەی باس کرد بوو ( ئاگاداری گەل و حاجی یەکان لەو پرۆژانەی لە ناوچەکانی ڕۆژهەلات و باشوری ڕۆژئاوایی تورکیادا ڕوو دەدات بەهۆی ئەو قەرزانەی دەیدەن بە تورکیا ئەوە یەکێکن لە کارە گرنگەکان ، بەڕاستی پاڵپشتی و هاوکاری ئێوە بۆ هەڵوێستی من لە تورکیا دا قۆناغێکی نوێ دەکاتەوە بۆ تورکیا لە جیهانی ئیسلامی دا ، یارمەتی ئێوەیش بۆ ئێمە لەو بوارەدا دواتر پاڵپشتی و دەستگرۆیی ئەو قۆناغەیە ) [2].

( ئەربەکان ) توانی لە پەرلەماندا یاسایەك پەیڕەو بکات کە بەهۆیەوە ماوە بە تورکەکان بدات بۆ گەشتی و شکانی بۆ حەج کە ئەوە پێشتر قەدەغە بوو [3] .

بە ڕاستی هەنگاوەکانی حیزبی ئاشتی نیشتمانی لە کۆمەڵگەی تورکیدا دلێرانە بوو ، بۆیە سوپای تورکی خزمەتگوزاری عەلمانیەت لە تورکیادا بەرگەی ئەو کردارە سوپاسگوزاری یانەی نەگرت ، ئەوە بوو سوپا کودەتای کردو فرە لایەنیو ئازادی سیاسی

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٤٥ .

[2] ) الحركات الآسلامية الحديثة في تركيا ز دز محمد مصطفى ص٢٠٧ .

[3] ) الحركة الاسلامية الحديثة في تركيا – د . النعيمي ص ١٤٧ .

لەناو برد لە ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ ز دا ، لە پێش ئەو كودەتایە لە ڕۆژی ٦ی ئەیلولدا لە شاری قونیا چەند ڕێپێوانێكی گەورە كراو ڕێپێوان كەران هاواری دامەزراندنی دەوڵە تێكی ئیسلامی یان دەكرد . پشتیوانانی حیزبی ئاشتی دەستیان كرد بە گاڵتە كردن بە دامو دەزگا سەربازی یەكان و هەموو ئەو شتانەی كە ئەتاتورك بڕوای پێیان هەبوو ، ئەوانەی كە لە هەموو بەشەكانی وولاتەوە هاتبوون بە دروشمە ئایینی یەكان هوتافیان دەداو داوای بە كارخستنی شەریعەتی ئیسلامیان دەكرد لە هەڵسوكەوتی سیاسی ناوخۆییدا و ڕێگەیان نەدا سرودی نیشتمانی بووترێت [1] .

خۆپیشاندەران ناڕەزایی خۆیانیان بۆ داگیر كردنی ( قدس ) دەربڕی و بانگەوازیان دەكرد بۆ بڕینی پەیوەندی یەكان لەگەڵ ئیسرائیل دا و بانگكردنی ئیسرائیل بۆ ئەوەی كە قودس ئازاد بێت ، هەروەك ئەربەكان لە ڕێپێواندا بانگەوازی دەكرد بۆ دەست كردن بە ململانێ بۆ كۆتایی هێنان بە عەقڵیەتی درۆینەی ڕۆژئاوایی كە فەرمانڕەوایی توركیا دەكات . خۆپیشاندەران دروشمەكانیان بە زمانی عەرەبی نوسی بوو ، هەروەها هەستان بە سووتاندنی ئالآی قەوارەی زایۆنی و ئەمریكا و سۆڤیەت ، خۆپیشاندەران بە دروشمی ( مردن بۆ جولەكە ) هاواریان دەركر بە تایبەت كە شاری قونیا ژمارەیەك لە تایەفەی جولەكەی لە خۆ دەگرت كە ژمارەیان دەگەیشتە ٢٠٠٠٠ هەزار جولەكە ، هەروەها خۆپیشاندەران بانگیان دەكرد ( ڕۆڵی یاسای ئایینی هات و جەنگەڵی بوون تەواو بوو ، شەریعەت یان مردن ... دەوڵەتی بێباوەڕی پێویستە لە ناو بچێت ... قورئان دەستورمانە ... دەوڵەتێكی ئیسلامیمان دەوێت بە بێ سنور و چینایەتی ) [2] .

جەماوەری حیزبی ئاشتی نیشتمانی بەردەوام زیادی ئەكرد چونكە ئەو بەڕاشكاوانە پابەندی باس و خواستە ئیسلامی یەكان بوو ، بە تایبەت لە دوو ساڵی ١٩٧٩ز– ١٩٨٠ ز . حیزبی كۆماری و حیزبی عەدلەتیش ناچار بوون حیزبی ئاشتی نیشتمانی ڕازی بكەن و چەند سازشكاریان كرد بۆ ڕەوتی ئیسلامی ، بەهێوای یارمەتی یە ماددی یەكانی ولآتە ئیسلامی یەكان و پێویستی زۆر بە پەترۆڵەكەیان .

---

1 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٥١ .

2 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو .

سەرکردایەتی سوپای تورکی پاش کودەتا سەربازی یەکان شەرمیان لەوە نەکرد بڵێن : هۆی دەستێوەردانیان لە پێنا ڕاگرتنی هەڵکشانی ئیسلامی دایە .

کودەتایی یەکان بڕیارێکیان دا کە هەموو حیزبێکی سیاسی یاساغە و پێویستە سەرکردەکانیان دەستبەسەربکرێن و بدرێنە دادگا ، ئاسایی و سروشتی بوو کە حیزبی ئاشتی نیشتمانیش دادگایی بکرێت و تۆمەت ئاڕاستەی ئەربەکان و هاوڕێ موجاهیدەکانی بکرێت . تۆمەتەکان هەموو بە دەوری مکوڕی حیزبی ئاشتی لە سەر گێڕانەوەی دەوڵەتی ئیسلام لە تورکیا و ڕزگار بوون لە بیرۆکە عەلمانی یەکان و ڕێبازە کەمالی یەکاندا دەسوڕایەوە . عەلمانی یە تورکە لوتبەرزەکان بە هەموو بێشەرمی یەکەوە و لە سەرزمانی ( جەنڕاڵ ئیفرنی ) سەرۆك ئەرکانی سوپای تورکی ڕایگەیاند کە ئەو ئەوەندە سوپای هەیە دەتوانێت زمانی هەموو کەسانە ببڕێت کە هێرش دەکەنە سەر ئەتا تورك [1] .

بەڕاستی حیزبی ئاشتی نیشتمانی توانی هەندێ گۆڕانکاری بکات لە ئاکاری سیاسی ناو خۆیی تورکیادا ، لەوانە : بە دیهێنانی بانگ لە مزگەوتەکاندا و بە زمانی عەرەبی و سەپاندنی خوێندنی قورئان لە وێستگەکانی ڕادیۆو تەلەفزیۆندا . کە ئەمانە لەو ڕۆژەوەی گەندەڵ و خراپە کاری گەورە ( مصطفی کمال ) هاتە سەر کورسی فەرمانڕەوایی هەمووی قەدەغە کرد .

بەڕاستی ئەربەکان لەگەڵ حیزبە موجاهیدەکەیدا بوو بە مەشخەڵێك لە مەشخەڵەکانی بزوتنەوەی هاوچەرخی ئیسلامی لە تورکیا دا و حیزبی ئیسلامی کاری کردە سەر نێوەندە ئیسلامی و ڕێبازەکانی سۆفیزم و تەکیە و خانەقاکان و لە نێو ڕەوتە ئیسلامی یە گشتی یەکەدا کەسانێکی دیتەوە کەسەری بخەن و لە پاڵیدا بوەستن و پاڵپشتی بکەن . لە ساڵی ١٩٨٣ زدا دادگای ستەمکاری سەربازی بڕیاری بەندینخانەی بۆ ماوەی ٤ ساڵ دەرکرد بۆ ئەربەکانی موجاهید و ٢٢ کەس لە ئەندامانی حیزبی ئاشتی نیشتمانیش بۆ ماوەی سێ ساڵ و نیو کرانە بەندینخانە [2] .

سوپای تورکی هەستا بە دەرکردنی هەموو ئەو کەسانەی کە بۆنێکی ئیسلامی لێوە بێت ، ( ئیفرن ) لەو هێرشەیدا کە ئامانجی لێدانی ئیسلامی یەکانی نێو هێزی چەکدار بوو ووتی

---

[1] ) الحركة الآسلامية الحديثة في تركيا ص١٥٠ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پیشوو ل١٥٦ .

ئەو موسڵمانانە ( ئامانجیان گەیشتنە بە پلە بەرزەکانی نێو هێزە چەکدارەکان ، چی ڕوودەدات ئەگەر ئەوان جڵەوی سوپا بگرنە دەست ؟ )[1] .
ئینجا دەڵێت ( پێدەچێ وولات بگۆڕن بۆ هەر جۆرە ڕژێمێك كە دەیانەوێت ، ئایا ئەمە چالاكی ئایینی یە یان ناپاكی یە ؟ )[2].
سەركردایەتی سەربازی لە توركیادا دەستی كردبە گەڕان بەدوای چارەسەری گرفتە سیاسی یەكانی و ڕازی
كردنی فشارە ئەوروپی یەكان كە توركیای بە پێشێلكاری مافە كانی مرۆڤ تۆمەتباركردو لەسەری پێویست كرد سەرلەنوێ دیموكراتی یەت بگێڕێتەوە بۆ وولات ، بۆ ئەمەش چەند لیژنەیەكی نوێی پێكهێنابۆ دروستكردنی دەستورێك بۆ وولات بەجۆرێك مافی سەپاندنی باری نا سروشتی و هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و بانگەواز بۆ هەڵبژاردنێكی نوێی بدات بەسەرۆكی توركی ، بەمە توانی مافی ئەوە بدات بە عەلمانی یەكان كە ڕێگە بگرن لە هەوڵە بەردەوامە كانی ئیسلامی یەكان بۆ لەناوبردنی‌دەستوری عەلمانی . یاساكان گۆڕانیان تێدا كرا بە جۆرێك كە سەركردایەتی سەربازی مافی ئەوەی هەبێت كە هەندێدەسەلاتی بە سەر ژیانی سیاسی نێو توركیا ببێت .
پاش ڕاگەیاندنی دەستوری نوێ لە ساڵە ١٩٨٢ زدا چەندین حیزبی سیاسی پێكهات و (حیزبی ڕەفاە ) یش دەركەوت كە ئەویش درێژە پێدەری حیزبی ئاشتی نیشتمانی بوو ، خەڵكە ئیسلامی یەكان بە كۆمەڵ دەچوون بۆ لای ئەو حیزبە نوێ یە ، ئەو حیزبەی دووچاری بەرەنگاری سوپا و فشار خستنە سەر بووتا ڕێگەی چوونی بۆ نێو هەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٨٣ ز لێ بگرن . بەلاّم ئەو چووە نێو هەڵبژاردنەكان و ڕیژەی ٥٪ ی دەنگەكانی بە دەست هێنا[3].
زیاد لەوەیش ، حیزبی ڕەفاە لە هەڵبژاردنەكانی تشرینی یەكەمی ساڵی ١٩٨٧ زدا بەشداری كرد و بە ٧/.٦ ٪ ی دەنگەكانی بەدەست هێنا [4] .

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٦٥ .
[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٦٥ .
[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٧٩ .
[4] هەمان سەرچاوەی پێشوو .

کۆمەڵە ئیسلامی یەکان بە دەوری ( حیزبی ڕەفاە ) دا کۆدەبوونەوە و ( حیزبی ڕەفاە ) دەستی کرد بەسەرکردایەتی کردنی بزوتنەوە ئیسلامی یەکان لە هەموو شارە تورکی یەکاندا ، تەنانەت لە پارێزگا گەورەو گوندە دوورەکانیشدا . بزوتنەوەی ئیسلامی لەگەڵ گرتنە دەستی دەسەلاتی ( ئەوزال ) بوژایەوە ، ئەو لەگەڵ ئیسلام لە تورکیادا بە سۆز بوو بەتایبەت کە ژمارەیەکی گەورەی سەرکردایەتی حیزبەکەی _ حیزبی نیشتمانی دایك _ لە بەرە ناوداری ئیسلامی یەکانی نێو تورکیا دا بوون ، چەندین کادریی گرنگی سەرکردایەتی لە حیزبی هەڵوەشاوەی ئاشتی چوونە نێو حیزبی نشیتمانی دایکەوە کە لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٨٣ زدا بە زۆرینە یەکی گەورە سەرکەوت ، حکومەتەکەی ( ئەوزال ) هانی چالاکی مزگەوت و خوێندنگە ئایینی یەکانی دا و( کاظم اکصوی ) کە وەزیری دەوڵەت و سەرپەرشتیاری کاروباری ئایینی بوو گرنگی دا بە کردنەوەی چەند خولێکی فێرکردنی قورئانی پیرۆز کە لە سەرەتای هەشتاکاندا ٢٠٠ خولی ڕەسمی بوو و لە ساڵی ١٩٨٧ ز دا گەیشتە ٣٠٠٠خول ، ڕێبازە ئاینی یەکان چالاك بوون و( کاظم اکصوی ) هەستا بە دامەزراندنی چەند دامەزراوە و بانکی ئایینی وەك ( بانکی ئەوقاف ) کە لە گرنگترین ئەو مەڵبەندانە بوو کە لە تورکیادا پشتیوانی لە بزوتنەوەی ئیسلامی دەکرد [1].

( حیزبی ڕەفاە ) لەجیهادی ئاشتیانە و ڕۆچوونی تەواو بە قولایی یەکانی گەلی موسڵمانی تورکیدا بەردەوام بووئەو گەلەی کە بەردەوام کارەکانی حیزبی ئاشتی لە بیرەوەری و ویژدانیدا حزوریان هە بوو ، توانی ئامادەیی ئیسلامی بگێرێتەوە بۆ کۆمەڵگەی تورکی . ( حیزبی ڕەفا ) کە درێژە پێدەری حیزبی ئاشتی بوو . توانی لە مارسی ساڵی ١٩٩٤ زدا گرنگترین و گەورەترین شارەوانی یەکانی نێو تورکیا بە دەست بهێنێت و لە هەڵبژاردنەکانی دیسەمبەری ساڵی ١٩٩٥ زدا وەك گەورەترین حیزبی نێو وولات سەرکەوتن بە دەست بهێنێت و لە ئەنجامیدا لە ساڵی ١٩٩٦ ز دەسەلاتی لە ئیئتلافێکی حکومیدا لەگەڵ حیزبی ڕێگەی ڕاست دا گرتە دەست [2].

موجاهیدی گەورە ( نەجمەددین ئەربەکان ) بوو بە سەرۆك وەزیران و هەستا بە چەند چاکسازی یەکی زۆر چاکی ئابوری و لە ماوە یەکی کورتدا موچەی بەرزکردەوە و وەك تیر

---

[1] )هەمان سەرچاوەی پێشوول١٨٣ .

[2] ) تحديات السياسية تواجه الحركات الآسلامية ص١١٨ .

بەرەو بانگەشە کردن بۆ بنیاد نانی بازارێکی هاوبەشی ئیسلامی بەرەو پێشەوە دەڕۆشت و ڕەفزی چونە ناوەوەی تورکیا بۆ بازاڕی هاوبەشی ئەوروپی دەکرد ، جا ئەوە بانگەواز بوو بۆ بەرپابوونی میللەتانی یەکگرتووی ئیسلامی و کۆنگرەی هاوبەشی ئیسلامی و نوێنەرانی حیزبی ڕەفاە لە شارەوانی یەکان و لەسەر ئاستی دەوڵەت بە جوانترین نمونەی پاکێتی و دەستپاکی و توانی نەخشەکێشان بوون بە پێشەنگ ، دامەزراوەکانی حیزب گرنگیان بە پێش خستن و چاککردنی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری یەکان ئەدا بە هاوولاّتیان . گەلی تورکیش سۆزیان هەبوو لەگەڵ ( حیزبی ڕەفاه ) دا تەنانەت زۆرێك لە دامەزراوەکان دەنگەکانی خۆیان دا بە حیزبی ڕەفاه کە کاری دەکردبۆ بە دیهێنانی هەلی کارکردنی شەرەف مەندانە بۆیان و لابردنی خانەکانی لەشفرۆشی گەندەڵی و کارکردن بۆ گەڕانەوەبۆلای خوا تا لێیان خۆش ببێت .

بەڕاستی نوێنەری ڕەفاه کە شارەوانی ئەستانبولی گرتە دەست بە هەموو دلێری یەکەوە کێشەکانی پایتەختی چارەسەر کرد و بودجەی دووقات کردەوە دوای ئەوەی بودجەی شارەوانی هەمیشە کەمی ئەهێنا بە هۆی ئەو دزی یەوە .

جولەکە و عەلمانی یەکان بە و دەستکەوتە گەورانە ڕازی نەبوو کە بزوتنەوەی ئیسلامی لە تورکیادا بە دی هێنا ، بۆیە سەرکردەی سوپایان پاڵ پێوەنا تا فشاربخات بۆ سەر حیزبەکان ئەوە بوو نوشوستیان هێنا بەسەر هاوپەیمانی نێوان ( حیزبی ڕێگەی ڕاست ) و( حیزبی ڕەفادا ) . حیزبێکی توندڕەوی پاڵپشت کراو بە هێزی سەربازی و پیاوە عەلمانی یە دەوڵەمەندەکان پێشڕەوی کردو ( حیزبی ڕەفاه ) ی دایە دادگای دەستوری و دادگاش لە ساڵی ١٩٩٧ ز دا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی ( حیزبی ڕەفاه ) ی دا و دەستی گرت بەسەر ماڵو سامانەکانیدا .

هێشتا ئیسلامی یەکان لە تورکیادا بە هەموو دلێری و نەترسی و ژیری یەکەوە ململانێی خۆیان لەگەڵ جولەکە و عەلمانی یەکان و دوژمنانی ئیسلام بەڕێوە دەبەن ، منیش بە و پەڕی دڵنیایی و بێ دوودڵی ئەڵێم بزوتنەوەی ئیسلامی لە تورکیا بەزوویی دەگات بە فەرمانڕەوایی و بە ویستی خوا شەریعی خوا جێبەجێ دەکات ، چونکە هەموو ئاماژەو سونەتەکان وا دەڵێن .

بەم گفتوگۆیەی مامۆستا و موجاهیدی گەورە ( پرۆفیسۆر نجمە الدین ئەربەکان ) کۆتایی بە ئەزموونی ئیسلامی نێو تورکیا دێنم کە پایەکانی عەلمانی یەتی لە تورکیادا

توشی کرمۆلی کرد ( *) ڕۆژنامەوانێکی موسڵمانی ناودار بەم شێوەیە پرسیاری لێکرد :( هەندێ موسڵمان ڕای وایە ) بەشداریکردن لە چالاکی هەڵبژاردندا لە ئیسلامدا کارێکە لەلایەنی شەرعییەوە دروست نی یە ، چونکە ئەو بەشداری یە ڕێژمە نەزانەکان بەهێز ئەکات چونکە ئەوان پشت بەو ڕیو شوێنانە دەبەستن ..... ئەربەکان وەڵامی دایەوە : ئەی چی بکەین ؟ ئایا دەتوانین ئەو هەمووە دەستکەوتە گەورانە لە سەر ئاستی ئازادی یە شەخصی و گشتی یەکان بەدی بهێنین ... و ئەو سەدان خوێندنگە ئیسلامی یانە دابمەزرێنین ... و لە پەرلەماندا دەنگمان بەرزبکەینەوە بۆ گۆڕینی ئەو ماددە دەستوری یانەی کە سنوور بۆ ئازادی یە ئایینی یەکان دەست نیشان دەکات و ئەتوانین بۆ خەڵکی بڕوابوون بە خۆ و ئایینیان بگێڕینەوە و هەموو جۆرە خراپەیەك گەمارۆ بدەین کە خەریکە لەوڵاتدا قێزەون ئەبێت بەبێ ئەو هۆکارانەی کە ئاستی خزمەتی هەموو تاك و کۆمەڵەیەك بەرزدەکاتەوە و پاڵ بە هەموانەوە ئەنێت تا بچنە ژێر باری بەرپسیار یەتی لە دووبارە بنیادنانەوەی ( کۆمەڵگەکانیاندا ) [1].

ڕەوتی ئیسلامی لە تورکیادا بەردەوام لە گەشە سەندنێکی بەرز دایە لەگەڵ گەورە و قەبەیی نەخشە گەمارۆدەرەکانی دوژمندا و لەگەڵ ترسناکی ئەو پیلانانەدا کە بەشێوەیەکی یەکسان لە ڕاست و چەپەوە دا ئەڕێژرێت ، بەڵام ئێمە هەر چاوەڕێی بە دیهاتنی بەڵێنی خواین کە ئەفەرموێت : ﴿فأما الزبد فيذهب جفاء وأما ما ينفع الناس فيمكث في الأرض﴾ ( الرعد : ١٧ ) و ﴿ إن الله لايصلح عمل المفسدين﴾ ( يونس : (٨ ) و ﴿ و يأبى الله إلا أن يتم نوره واو كره الكافرون﴾ ( التوبة : ٣٢ ) . ( مانای ئایەتەکان یەك لە دوای یەك : (( بەڵام ئەوەی کەفی سەردەریایە ئەڕوات و ئەوەشی کەڵکی ئەگرێت لە زەویدا ئەمێنێتەوە )) ، (( خوای گەورە بە دڵنیایی یەوە کاری خراپەکاران ڕێکوپێك ناکات )) !! (( خوای گەورە هیچ قەبوڵ ناکات ئەوە نەبێت کە نووری خۆی تێرو تەواوبکات با کافرانیش پێیان ناخۆش بێت )).

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٨٧ .

## ( باسی هەشتەم )

## ( هۆکارەکانی نشوستی هێنانی دەوڵەتی عوسمانی )

ڕێخۆشکەری : هۆکارەکانی نشوستی هێنانی دەوڵەتی عوسمانی زۆرن ، کۆی هەموویان دوورکەوتنەوەیان بوو لە حوکمکردن بە شەریعی خوا کە هەرچی سەختی و چەرمەسەری و دڵتەنگی دونیاهەیە هێنای بەسەر تاك و ئوممەت دا ، شوێنەوارەکانی دوورکەوتنەوە لە شەریعەتی خوایش لە ژیاندا لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئابووری دا دەردەکەوێت .

فیتنەکان بەردەوام دێن بەسەر خەڵکدا و هەموو کاروبارەکانی ژیانیان دەگرێتەوە ، خوا دەفەرموێت ﴿ فليحذر الذين يخالفون عن أمره أن تصيبهم فتنة أو يصبهم عذاب اليم ﴾ ( النور : ٦٣ ) .

بەڕاستی دوورکەوتنەوەی سوڵتانە دواییینەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە شەرعی خوا کاریگەری ( خراپی زۆری ) هەبوو لە سەر ئوممەتی ئیسلامی ، تۆ دەبینیت مرۆڤی ڕۆچوو لە نێو ژیانی ماددە و نەزانی دا توشی ڕاڕایی و واق و ڕومان ترس و سام دەبێت و هەموو شتێك بە مەترسی دەزانێت بۆ سەر خۆی . لە مەسیحی یەکان دەترسێت ناتوانێت بە عیززەت و شکۆداری و سەربڵندی یەوە لە بەردەمی یاندا بوەستێت ، ئەگەر لە جەنگێك لە جەنگەکانیشدا وورە بداتە بەر خۆی ، کەچی لە ئەنجامی تاوانەکانی نێو دڵیدا لە بەرامبەر دوژمندا لاواز دەبێت و لە ژیانێکی دڵتەنگی و ناخۆشی دا دەبێت ﴿ ومن اعرض عن ذكري فأن له معيشة ضنكا ﴾ .

لە ڕاستیشدا گەلە ئیسلامی یەکان لە کۆتا قۆناغەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا توشی گەوجی ولە دەستدانی هەست کردن بە خۆ و لاواز بوونی ویژدان بوون ، ئیدی فرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە بە هیچ جۆرێك نەما ، ئەوەی توشی ( بەنی ئیسرائیل ) بوو کاتێك کە فرمان بە چاکە ونەهی لە خراپە یان وازهێنا توشی ئەوانیش هات ، خوا دەفەرموێت ﴿ لعن الذين كفروا من بنى إسرائيل على لِسانِ داود وعيسى بن مريم ذلك بما عصوا وكانوا يعتدون ، كانوا لايتناهون عن منكر فعلوه لبئس ماكانوا يفعلون ﴾ ( المائدة ٧٨، ٧٩ ) .

جا هەر ئوممەتێك شەرعی خوا چ فرمانەکان وچ نەهی یەکان بەرز ڕانەگرێت هەروەك ( بەنی ئیسرائیل ) چۆن لە ناو چوون و کەوتن ئەوانیش دەکەون و نامێنن . پێغەمبەر ( ص ) دەفەرموێت ( نەبەخوا ، یان فرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکەن و دەدەن بە دەستی

زۆرداردا و ملی پێ نەوی ئەکەن بۆ ڕاستی و بە زۆرملکەچی ئەکەن بۆ ڕاستی یەکان یاخود خوای گەورە دڵی هەندێکتان ئەماڵێ بە دڵی هەندێکی ترتاندا و پاشان نەفرینتان لێدەکات وەك نەفرینی لەوان کرد ) . ( واتە لە بەنی ئیسرائیل ) .

بەڕاستی لە دەوڵەتی عوسمانی دا سوننەتی خوا لە گۆڕینی دەرونەکان لە گوێڕایەڵی و ملکەچی یەوە بۆ سەرچێچی و هەڵگەڕانەوە بەسەر حوکمەکانی خوادا هاتەدی ﴿ ذلك بأن الله لم يك مغيرا نعمة انعمها على قوم حتى يغيروا ما بأنفسهم ﴾ ( الآنفال ٥٣ ) .

هەروەك ئەو گەلانەی سەر دادەنەوێنن بۆ ئەو فەرمانڕەوای یانەی کە لە شەرعی خوا دوور کەوتوونەوە سەر شۆڕو ڕسوا دەبن تاکوو لەبەردەم ئەوەدا ڕادەوەستێت کە سەرپێچی فرمانی خوا دەکات و داوای یارمەتی لە برا هاوبیروباوەڕەکانی دەکات . لادانی سوڵتانە دوایینەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە شەرعی خواو کەمڕەوی گەلە ئیسلامی یەکانی ژێردەستیان لە فرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە کاریگەری کردە سەر ئەو گەلانە و دوژمنکاری یە نێو خۆیی یەکان نێوان خەڵك زیاد بوون و دەروونەکان تووشی قوڕ بەسەری و ماڵەکان تووشی تالآنکاری و ناموسڵمانەکان تووشی دەستدرێژی بوون بە هۆی لە کارخستنی حوکمەکانی خوا لە نێو خۆیاندا ، چەندین جەنگ و بەلآ و ئاژاوە لە ئەنجامی دوژمنایەتی و ڕق و کینە دا لە دایك بوون و هەڵگیرسان کە تەنانەت لە دوای ئاوابوونیشیاندا تیایاندا ماون . سام وشکۆی دوژمن : ڕوس و ئینگلیز و بولغارو صربەکان و ئەوانی تریش بە هێز دەبوو و چەندین دەستکەوتی گەورەیان بە دەست خست و سەرکەوتنی خوایی بە دوور نەبوو لە ئوممەت و سوڵتانە عوسمانی یەکان و بێبەش بوون لە دەسەلآتداری و لە ترس و بیمی دوژمناندا بوون و چەرمەسەری یەکان یەك لە دوای یەکدا هاتن و ماڵەکان بەفیڕۆ چوون و بێباوەڕان زاڵ بوون .

لەو سوننەتە خودایانەی کە لە ڕاستی یە ئایینی و مێژوویی یەکان وەرگیراوە ئەوەیە کە : ئەگەر کەسانێك کە خوا دەناسن لە خوا یاخی بوون ، خوا کەسانێك کە نەیناسن زاڵ دەکات بەسەریاندا ، بۆیە خوا مەسیحی یەکانی زاڵ کرد بەسەر موسڵمانەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ، ئەو تاوانانەی خوا دەوڵەتی پێ لە ناو دەبات و ئوممەتەکانی پێ سزا دەدات دووبە شن :

١- ملە جیڕەیی کردنی پێغەمبەران و بێباوەڕ بوون بەوانەی پێی هاتوون .

٢- ناشوكرى كردنى نعمەتەكان سوك سەيركردنيان و خراپە و داپۆشينى ڕاستى و خەڵك خەڵەتاندن و ستەمكردن لە هەژاران و خۆشەوەيستى بە هێزان و زيادە ڕۆيى لە دەرچوون و لادان و سەركەشى بوون بە دەوڵەمەندى و سامان . ئەمانە هەموويان ناشوكرى نيعمەتەكانى خوايە و بەكارهێنانيەتى لە ڕێيەكدا كە خوا پێى ڕازى نى يە وەك ڕێگەى دوور لە سودى خەڵك و دادپەروەرى گشتى .

جۆرى دووەمى تاوانەكان ئەوە بوو كە كۆتا سوڵتان و كار بەدەستەكانى دەوڵەتى عوسمانى پەيڕەوى يان كرد [1] .

دەوڵەتى عوسمانى لە سەرتايدا لە هەموو بچوك و گەورە يەكدا لەسەر شەرعى خوا دەچوو و پابەندى مەنهەجى ئەهلى سوننە بوو لە ڕێكردەى بانگەوازى و جيهادى خۆيدا و مەرج و هۆكارەكانى دەسەلاتدارى كە لە قورئانى پيرۆز و سوننەتى شەرەفمەندانەى پێغەمبەردا هاتووە بەجێدە گەياند ، بەلام لە كۆتا سەردەمەكەيدا لايدا لە مەرجەكانى دەسەلاتدارى و دووركەوتەوە لە هۆكارە ماددى و مەعنەوى يەكان ، خواى گەورە دەفەرموێت ﴿ وعَدَ الله الَّذينَ ءامَنواْ منكم و عَمِلواْ الصلِحتِ لَيَستَخْلِفَنَّهُم فِي الأَرضِ كَمَا استَخْلَفَ الَذينَ من قَبلِهِم وَ لَيُمَكِنَنَّ لَهُم دِينَهُم الَذِى ارتَضى لَهُم وَلَيُبَدِلَنَهُم مِن بَعدِ خَوفِهِم امنا يَعبُدونَني لاَ يُشرِكونَ بِى شيئا وَمَن كَفَرَ بَعدَ ذلكَ فأُولئكَ هُمُ الفسِقون ، وَ اقيمُو الصَلوةَ وَ ءَاتُو الزَّكَوةَ وَاطِيعوُ الرَسولَ لَعَلَكُم تُرحَمُونَ ﴾ ( النور ٥٥ و٥٦ ) .

جا دەوڵەتى ئيسلامى عوسمانى لەسەرتايدا لەو مەرجانە تێگەشتبوو ، بەلام لە كۆتايى يەكانى سەردەمەكەيدا ئەو مەرجانە تووشى لارێبونى چەمكە بنەڕەتى يەكانى بوون ، بۆنمونە :

يەكەم : لە پێويستى يەكانى ئيمانى ڕاست و دروست هۆگرى و دوورەپەرێزى يە واتە ( ولاء ) و ( براء ) ە :

دەوڵەتەكە لە سەردەمە سەرەتاكانيدا بەم فەرمايشتانەى خوا ئيشى دەكرد ﴿ لايتخذ المؤمنون الكفرين أولياء من دون المؤمنين ومن يفعل ذلك فليس من الله في شيئ الا أن تتقوا منهم تقة ويحذركم الله نفسه ،وإلى الله المصير﴾ ( آل عمران ٢٨ ) و﴿ يأيها الذين ءامنوا

---

[1] ) دولة الموحدين _ د. على محمد الصلابي ص١٧٠ .

لاتتخذوا اليهود والنصرى أولياء بعضهم أولياء بعض ومن يتولهم منكم فأنه منهم إن الله لايهدى القوم الظلمين ﴾ ( مائدة ٥١ ) .

پێغەمبەریش (ﷺ) دەفەرموێت ( اوثق عرى الآيمان الموالاة في الله و المعاداة في الله والحب في الله و البغض في الله ) [1] واتە : بە هێزترین هەڵقەی ئیمان هاودەمی و هۆگری یە لەپێناو خوادا و دوژمنایەتی کردنە لە پێناو خوادا و خۆشەویستی لە پێناو خوادا و ڕق و کینە بوون لە پێناو خوادا ) .

بەڵام لە کۆتا سەردەمەکانیدا و بەتایبەت لە دووسەدەی ١٣ و ١٤ ی کۆچیدا ، چەمکی ( ولاء) و( براء ) تووشی لادان بوو بەهۆی ئەو نەزانی یە چڕوپڕەی کە باڵی کێشا بوو بەسەر زۆرینەی هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی و وولاتە ئیسلامی یەکاندا لە ئەنجامی نەبوونی ئەو زانا خواویستانەی کە ڕێگەی ئوممەت ڕۆشن ئەکەنەوە و جڵەوی ڕۆیشتن بەرو ڕێگەی ڕاست و دەگرنە دەست ، فەرمانڕەواو سوڵتانەکانیش موجامەلەی دوژمنیانی لە بێباوەڕیان دەکرد لە جیاتی موسڵمانان دەیانکردنە هاودەمی خۆیان ، لەکاتێکدا ئەو بێباوەڕانە لە لایەنێکی گەورەی هێزی ماددی دا بوون و تەواو بە پێچەوانەوە موسڵمانەکان لە بەرامبەردا لە لاوازیدابوون جا ئەو بارو دۆخە ناخۆش و سەختەی کە موسڵمانانی تێدا دەژیا یارمەتی ئەوەی دا ئەو بیروباوەڕە ئیسلامی لەرزەی تێ بکەوێت [2] .

بۆ نمونە ئەو بارودۆخەی کە پڕبوو لە هەموو شێوەکانی تیاچوون وەك هەژاری و لاوازی و نەزانی و نەخۆشی و ئەفسانە لە بەرامبەر بارودۆخی ( واقیعی ) ئەورووپیدا ، هۆیەك بوو لە لاوازبوونی بیروباوەڕی ( ولاء) و( براء ) ، لەگەڵ ئەوەیشدا هەرگیز دروست نی یە بۆمان کە بە واقیعی بێباوەڕان بیانوو بدەینە دەست ئەوانەی پێیان سەرسام بوون . چونکە ئەگەر ئیمانەکە یان ڕاست و بیروباوەڕیان چەسپاو بوایە ، ئەوا ئارەزووی دەروونیی بێباوەڕان ڕاینەدەماڵین و شەپۆلەکانی ماددی و هێز فریێی نەدەدان ، وەك چۆن باری سەرەی یەکەم _ ڕەزای خوایان لێبێ _ بە ئایین و بیروباوەڕەکەیان زاڵ بوون بەسەر بێباوەڕان و لووتبەرزیاندا ، تەنانەت لە کاتی شکست و ساتی سەرنەکەوتنیشدا ، وەك خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ ولاتهنوا ولاتحزنوا وانتم الآعلون إن كنتم مؤمنين ﴾ ( آل عمران ١٣٩ ) .

---

[1] ) صحيح الجامع الصغير ( ٣٤٣/٢ / ج ٢٥٣٦ ) .

[2] ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ١/ ١٤٢ ) .

لەگەڵ ئەوەیشدا ئەو بیروباوەڕە لەسەر ئاستی گەلانی ئوممەتی ئیسلامی لە نێو دەرونەکاندا کڵپەی سەندوو و لە نێو عەقڵەکاندا سەقامگیر بوو . جا موسڵمان لە باکوری ئەفریقی یەوە برایەکی موسڵمانی خۆی لە شامدا خۆش دەویست و دراوسێ مەسیحی یە ( داگیرکەرە ) کەی ڕق لێبوو ، بە مجۆرەیش لە هەموو کونج و لاو هەرێمەکاندا وابوو . موسڵمان لە هەموو شوێنێکەوە هەستی بە براکانی ئەکرد و هەستی بەو دوژمنایەتی و لێقەومانانەش ئەکرد کە تووشی ئایینەکەی بوو بوو، هەندێکیان لە جیهادی دەستدرێژکەران و دەرچوون لە ڕێی خوادا لەگەڵ براکانیدا بەشدار یان دەکرد ، تاڕادەیەکی زۆر بەو شێوەیە بوون کە پێغەمبەر ( ﷺ ) وەسفیان دەکات ( کالجسد الواحد إذا اشتکی منه عضو ، تداعی لە سائرا الجسد بالسهر والحمی ) رواه البخاري . سەرخستنی موسڵمانانی حیجازو لیبیامان بۆ براکانیان ڕۆشن کردەوە لە کاتێکدا لە ساڵی ١٢١٣ك / ١٧٩٨ ز دا فەرنسی یەکان داگیریان کرد . وەچۆن موسڵمانان لەگەڵ بانگەوازەکەی ( سوڵتان عبدالحمیدی دووەم ) دا جوڵانەوە بۆبیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی و بانگەوازی بۆ یەکێتی موسڵمانان لە بەرامبەر دەسەڵاتگیری و خۆسەپاندنی ئەوروپیی و ڕوسی و لایەنانی تردا . ئەو بانگەوازەیش تا ئاستێکی گەورە بەرهەمی هەبوو و موسڵمانان لە هەموو لایەکەوە بە جیاوازی زمان و ڕەنگ و وولاتیانەوە لەگەڵیدا بوون ، بەڵگەی لەوە گەورە تر نی یە کە چۆن موسڵمانان لە هەموو لاکانی جیهانەوە دەستیان دایە ماڵ بەخشین بۆ داڕشتنی هێڵی ئاسنینی نێوان بەغداد و حیجاز کە سێ یەکی تێچوونی هێڵەکەیان خستە ئەستۆی خۆیان . لەگەڵ ئەو لاڕێبونانەی کە بەشبەشەکی و دابەشبونی موسڵمانانی لێکەوتەوە وەك مەزهەبە کەلامی و فیقهی و ڕیبازە سۆفیزمەکان . هەستکردن بە پەیوەندی ئایینی نێوان موسڵمانان بە هێزتر بوو ، ( ولاء ) و ( براء ) یش تا ئاستێکی گەورە لە نێو دەرونی هەمواندا ساغ و سەلامەت بوو ، بۆیە لەسەر دوژمنانی ئیسلام وەك جولەکە و مەسیحی یەکان سەخت بوو کە لەو بیروباوەڕەدا دیوارێکی پتەو و بەربەستێکی بە هێز ببینن لە بەرامبەر پیلان و هەوڵەکانی بۆ لەناوبردنی موسڵمانان و ئایینەکەیاندا ڕاوەستێت ، بۆیە کەوتنە کارکردن لەسەر ڕوخاندنی ئەو دیوارە و تواندنەوەی ئەو بەربەستەی لە ڕێگەی هەڵقە لەگوێ و بەکرێ گیراوەکانی خۆیانەوە لە جیهانی ئیسلامی و نێو دەوڵەتی عوسمانیش بەتایبەت ئەوانەیان کە کاروباریان لە دەستدایە وەك سوڵتان و پاشاکان . وەك لەگەڵ سوڵتانی عوسمانی محمودی دووەمی کۆچکردووی ساڵی ١٨٣٩ زدا ڕویدا کە سەرکردایەتی بزوتنەوەی چاکسازی خۆ چوێنەر

بەمەنهەجی ئەورووپی دەکرد . ئەوە بوو هەستا بە کارکردن بۆ داماڵینی بیروباوەڕی ( ولاء ) و( براء ) و هەوڵی سڕینەوەی دا لە دەرونەکاندا ، ئەو ئاڕاستە مەترسی دارەیش لە خودی قسەی سوڵتاندا دەردەکەوێت : ( من ئەمەوێت _ لە ئێستاوە بەدوا _ موسڵمانان تەنها لە مزگەوت و مەسیحی یەکان تەنها لە کەنیسە و جولەکەکان تەنها لە پەرستگاکاندا جیابکرێنەوە ، من دەمەوێت هەموان یەکشێوە بەرێزەوە ئاڕستە بگرن و هەموان بەیەکسانی ماف و پارێزگاری باوکایەتی یەوە بە خۆشی بیگوزەرێنن ، ئەوە بوو مەسیحی یەکان و جگە لەوانیش لەو سەردەمەدا ئازادیەکی بەرفراوانیان دەست کەوت [١] .

لەو سەردەمەیشدا خوێندگە یۆنانی و ئەرمەنی و کاسۆلیکی یەکان بە فراوانی بڵاوبوونەوە بە هۆی سەرپەرشتی و هاندانی سوڵتانەوە [٢] .

پیاوانی یەکێك لە سەربازگەکانی عوسمانی شۆڕشێکیان بەرپاکرد لەبەر ئەو گریمانەی کە گزایە زۆریان لێ ئەکرێت ئەبێ دووپشتوێنی یەکتربڕ _کە شێوەی ( خاچ ) بدات وەك ( نەمساوی یەکان ) _ بەسەر سنگیانەوە دابنێن ، شۆڕشگێڕەکان هەستان و ئەو ( پاشا ) ش کە سوڵتان ڕەوانەی ئەویێ ی کرد بوو ، دەریان کرد و ناردیانەوە [٣] .

هەروەها سوڵتان ڕێگەی دا بە هاولاتی یە مەسیحی یەکانی ژێر چنگی خۆی تا تێربوش بکەنە سەر لە جیاتی ( کلاوە کۆنەکانیان ) ، بەمەیش لە هێمای تایبەت بەوان ڕزگاری کردن ، ئەمەیش خۆشی یەکی زۆری لای ئەوان دروست کرد ، هەوڵی فەرزکردنی تەڕ بوشی سوریشی دا بەسەر زانایاندا لە جیاتی مێزەر ، جا کاتێك لە دژی ڕاوەستان لەسەر ئەوکارەی پاشگەز بوویەوە و ئەو هەڵوێستەی بە ڕاگەیاندنی جیهاد دژ بە ڕوسیا داپۆشی [٤] . لە ویش خراپتر ئەوەیە کە دەوڵەتی عوسمانی داوای هاوکاری لە سەرلەشکرەکانی( داتوا ) کرد پێشتر ( ولاء ) یان بۆ ڕوسیا . دەوڵەت لەو ڕاستی یە بێئاگا

---

[1] ) حركة الأصلاح في عصر السلطان محمود الثاني ص٢١٤ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢١٤ .

[3] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٥٨ .

[4] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٦١ .

بوو ، دواتریش ڕوسیا چەندین هەواڵگری لە سوپای نوێی سوڵتاندا هەبوو ، کە لە وردترین زانیاری و نەخشە ڕوسیایان ئاگادار ئەکرد )[1].

دەوڵەتی عوسمانی تووشی چەند شکستی پشتشکێن بوو لەلایەن ڕوسیاوە ، هۆکارەکانیشی دزەکردنی زانیارە گرنگەکان بوون لە ڕێگەی ئەو هەواڵگرانەوە .

ئەمە نمونە یەکی دیارە لەسەر لاوازی بیروباوەڕی ( ولاء ) و ( براء ) لەلای هەندێ لە سوڵتان عوسمانی یەکان و گرنگی نەدانیان پێی .

( پاشا محمد علی ) والی میسریش بەڕۆژئاوا هەڵخەڵەتاو شوێن سیاسەتی ئەوان کەوت و بە ڕێڕەوی ئەواندا ئەڕۆیشت ، لە ماوەی دوورو درێژی فەرمانڕەوایی یەکەیدا کە گەیشتە نزیکەی ٤٥ ساڵ ، دەیدایە پاڵ بێباوەڕان و موجامەلەی ئەکردن و پلە وپایەی یانی بەرزدەکردەوە و دەکەوتە شوێنیان و وەرگرتنی ڕێکخستن و یاساکانیان و ڕۆشتن لەگەڵ کاروانی ئەواندا ، لە کاتێکدا زۆر خراپ و دڵڕەقانە مامەڵەی لەگەڵ موسڵماناندا ئەکرد و گاڵتەی پێ ئەکردن . بیروباوەڕی ( ولاء ) و( براء ) ی لابرد و لەڕیشەوە لێیدا تا سەرکردە خاچپەرستەکانی ڕازی بکات و ئوممەت و گەلە موسڵنانەکەی ملکەچی نەخشەکانی جولەکە بکات ، جا بەڕاستی ( محمد پاشا )خووی بەوەوە گرتبوو کە زۆربەی کەسانی چواردەوری لەو مەسیحی و جولەکانە بن کە خۆیان خزاند بووە نێو حکومەت و کۆشکەکەیەوە ، بەتایبەت مەسیحی یە ئەرمەنی یەکانی دوژمنی میللەت کە کەسانی تایبەت و ئەندامانی کۆڕو جێگەی ڕاوێژی بوون و بەشدارانی بوون لە بەفیڕۆدانی ماڵ و سامانی وبە تالآن بردنی خێروبەری دەوڵەتدا[2].

دەرگاشی خستە سەر پشت بۆ دەستە و تاقمە مەسیحی یە خاچپەرستەکان بۆ گەڕان و پشکنین و دۆزینەوەی شوێنەوار و لێکۆڵینەوە و بە دوادا چوونی مەڵبەندەکانی سامان و لێکۆڵینەوەی پێگەکان بە لێکۆڵینەوەیەکی نەخشەیی کە بوویە بەڵگەی بۆ داگیرکردنی میسر لە دواتردا لە ساڵی ١٨٨٢ ز . بە تایبەت کە زانیمان زۆربەی ئەو پشکێنەرانە لە ئینگلیزەکان بوون . چەندین ئامانجی تر هەبوون کە زۆرێك لە لێکۆڵەران هەستیان پێنەکرد بوو. باسەکە بەجێدەهێڵین بۆ یەکێك لە ڕۆژهەلآت ناسەکان لە کتێبەکەیدا ( الشرق الآدنی ، مجتمعە

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٤٧ .

[2] ) الآنحرافات العقدية والعصبية ( ١/ ١٦٥ ) .

وثقافته ) ، ( ئێمه كه چووبینه هەر وولأتێكی ئیسلامی یەوه . زەوی یەكه مان هەڵدەكەندەوه تا شارستانیەتی پێش ئیسلام بدۆزینەوه ، ئێمه به سروشتی حاڵ تەماعی ئەوەمان نەبوو كه هیچ موسڵمانێك هەڵگەڕێتەوه بۆ بیروباوەڕی پێش ئیسلام . بەڵكوئەوەمان بەس بوو كه دڵە ڕاوكێ و ڕاڕایی بۆ دروست ببێت لە پشتیوانی كردنی نێوان ئیسلام و ئەو شارستانیەتانه .... ) [١] .

لەژێرڕۆشنایی ئەو ئامانجانەی پێشوودا دەتوانین گرنی دانی ئەو مەسیحی یانه واژه بكەین به لەت و پەرتەوازەكردنی وولأت به درێژی و پانی یەوه و پێدانی دارایی یەكی زۆر و زەبەندە لە دۆزینەوەی شوێنەوارەكان و داماڵینی وولأتەكە بە دەست پێشخەری فەڕنسی یەكان و دواتر ئەو ئینگلیزانەی كه لەجێبەجێكردنی ئەو ئامانجه پیسانەیاندا لەسەر یەك هێڵ دەچوون [٢] .

مامۆستا ( محمد قطب ) دەڵێت ( بەلأم ئەو پلان و نەخشه پیسەی كه خاچپەرستەكان لەگەڵ خۆیاندا هەڵیان گرتبوو و بە ئەمسەرو ئەوسەری وولأتدا دەگەڕان و بریتی بوو لە هەڵدانەوەی خاكی ئیسلامی بۆ دەرهێنانی شارستانیەتەكان تا بیكەنه سەرەتایەك بۆ بەیەكجاری دابڕین له پشتیوانی كردنی ئیسلام ) [٣] .

( محمد عەلی ) بە لێدانی ئاڕاستەی ئیسلامی سەلەفی لە دوورگەی عەرەبیدا خزمەتێكی پێشكەش بە پلان و نەخشەكانی دوژمن كرد بە ڕووكەش گوێڕایەڵی كردنی بوو بۆ سوڵتانی عوسمانی كه دەسەلأتی و قەڵەمڕەیی بەسەر دوو حەرەمی پیرۆزدا له دەستدا بوو ، لەمەیش پەردەیەكی پێكهێنا بۆ داپۆشینی پیلانەكانی بەریتانیا و فەڕنسا كه هەردووكیان وایان دەبینی بوونی سعودی مەترسی پێكدەهێنێن بۆ سەر بەرژەوەندی یەكانیان به تایبەت لە كەنداوی عەرەبی و دەریای سوردا [٤] . ئەو سوپایانەش كە( محمد عەلی ) ئاڕاستەی كرد بوون زۆرێك له سەركردەكانیان ئەفسەری فەڕەنسی و هەندێ مەسیحی بوون [٥] .

---

[1] ) واقعنا المعاصر ص٢٠٢ .

[2] ) الأنحرافات العقدية و العلمية ( ١/ ١٧١ ) .

[3] ) واقعنا المعاصر ص٢٠٢ .

[4] ) قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين ص١٨٩ .

[5] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل١٨٧ .

فەڕەنسا و هەروەها بەریتانیایش بەو کارە جەنگی یە کاولکەرە دڵخۆش بوون و فەڕنسا لە ڕێگەی کونسوڵی خۆیەوە لە قاهیرە بە محمد عەلی ڕاگەیاند کە ئەو زۆر سوپاسی ( محمدعەلی ) ئەکات بەهۆی ئەو بەهێزی یەی لە بلاوکردنەوەی ڕوخساری شارستانێتی لە وولاتە ڕۆژهەلاتی یەکاندا دەری بڕی [١].

( محمد عەلی پاشا ) فشاری خستە سەر زانا و فیقهناس و پیاوە ئەزهەری یەکان لە تیکەی ژیاندا ، و دەستی گرت بەسەر هەموو ئەوقافەکانی سەر بەئەزهەردا و دایە پاڵ دەوڵەت و دواتر خۆی زاڵکرد بەسەر زانا کاربەدەستەکانی فێرکردن لە پیاوانی ئەزهەر [٢]. تەنانەت ئەو دەستەو کۆمەلانەی نەوە تازە پێشکەوتووەکانی موسڵمانان کە قورئان زانستە سەرەتایی یەکانیان فێر دەبوون ، لەو سەرکەشی یەی محمد عەلی ڕزگاریان نەبوو ، جا ( جەبرەتی ) _ ڕەحمەتی خوای لێبێت _ باس لەوە دەکات کە زۆربەی خوێندنگاکان بەهۆی لەکار کەوتنی وەقفەکان و دەستگرتنی( محمد عەلی ) بەسەریاندا داخران [٣].

( شێخ محمد عەبدە ) باس دەکات کە ئەوەی ( محمد عەلی ) لە وەقفەکانی ئەزهەرو وەقفەکانی تری هێشتبوویە وە ، هێندەی یەك لە هەزاری داهاتەکانی نەدەبوو ، ئەو لە وەقفەکانی مزگەوتی ئەزهەر تا ئەمڕۆ ( لەسەر دەمی شێخ محمد عبدەدا ) ئەو تالانی یەی لە نیو ملیۆن جونیە لە ساڵێکدا کەمتر نی یە ، دەیبرد ، بۆ ئەزهەریش لە ساڵێکدا ڕێژەی ٤ هەزار جونیەی بڕیار دابوو ، لە کاتێکدا دەبینین بەرەو ڕۆژئاوایی بوون و ناردنی دەستەکان چوو وەك لە لێکۆڵینەوەکەدا باسمان کرد . ئەو سیاسەتە کاولکەرەی کە ( محمد عەلی ) گرتیە بەر و کردنی بەمەنهەج و بەناچاری بەسەر موسڵماناندا سەپێنرا ، جێبەجێکردنی پلانی خاچپەرستی بوو کە هێرشی فەڕەنسی بەهۆی ناچاربوونی بە کۆچ کردن و بەجێهێشتن نەیتوانی جێبەجێی بکات . ئەوەیش شتێکە کە( ئەرنۆڵد توینبی) مێژونوسی ئینگلیزی لە قسەکەیدا دووپاتی دەکاتەوە "محمد عەلی " دیکتاتۆرێك بوو کە توانی( بیرو ڕاکانی ناپلیۆن ) بگۆڕێت بۆ چەند ڕاستی یەکی کارا لە میسردا ) [٤].

---

[1] ) الأنحرافات العقدية والعلمية ( ١/١٧٤ ) .

[2] ) قراءة جديدة في تأريخ العثمانيين ص١٧٩ .

[3] ) عجائب الآثار ( ٣/ ٤٧٨ ) .

[4] ) قراءة جديدة في تأريخ العثمانين ص١٨٢ .

بەبێ بێگومان ( محمد عەلی پاشا ) دروستکراوێك لە دروستکراوەکانی ڕۆژئاواو بەکرێ گیراوێك بوو لە بەکرێگیراوەکان ، ئیدی ئەوە یەکسانە کە گەیشتنی بەپایەی دەسەلات لەئەنجامی نەخشەیەکی خاچپەرستی دابێت بەتایبەت نەخشەیەکی فەرەنسی ، یان لە ئەنجامی لێهاتوویی و فێڵ و ڕۆشنبیری ( محمد عەلی ) خۆیەوە بوو بێت . یان هەردوو هۆکارەکە پێکەوە بووبێت ، چونکە هەموو ئەمە هیچ لەبارەکە ناگۆڕێت و ئەوە بەرپەرچ ناداتەوە کە ( محمدعەلی ) دەوڵەتە ڕۆژئاواییە یەکان چواردەوریان دابوو لەگەڵ کاروانەکەی خۆیاندا ئەیانبرد بە تایبەت کە چەند ڕەوشت و سیفەتێکی تێدا بوو کە هەمیشە هێزە ئیمپریالیزمەکان بە دوایدا ئەگەڕان ، وەك شێتی گەورەیی ( جنون العظمة ) و دڵڕەقی و تورەیی ودین ناسکی  یان بیٚ دینی .

( محمد عەلی ) بە درێژایی ساڵەکانی فەرمانڕەوای ئیشی کرد بۆ لەوناوبردنی بیروباوەڕی ( ولاء ) و( بـراء ) و سیاسـەتی تونـدو تیـژی و تۆقانـدن و چەوسـاندنەوە لەبەشـەکانی دەسەلاتەکەیدا ، تا ئەو بیروباوەڕە لە دڵی موسڵماناندا دارمێنێت و بەیەکجاری نەهێڵێت [1].

لە گەڵ ئەو خەرمانە زۆرەی کە( محمد عەلی ) پیٚ گەمارۆ درابوو لەلایەن ڕۆژهەلاتناسان و ئەو مێژو نوسە نەتەوەیی و عەلمانی یانە شەوەکە بەشوێن ئەواندا ئەڕۆیشتن وبە بالآی ئەو چاکسازی یانە دا هەڵیان ئەدا کە لە زۆرێك لە بوارە زانستی و ئابوری و سەربازی یەکاندا پێی هەستا . بەلآم ئەوە لە مێژووی ژیانی( محمد عەلی ) دا چەسپاوە کە ئەوزۆر ڕقی لە موسڵمانانی میسر بووە وئەوپەڕی پیٚ کردوون سوکایەتی وناڕاستی تەواوی لەڕوودا کردون ، بەڵگەترین شتیش لەسەر ئەوە قسەکەی خۆیەتی ( متمانەتان هەبێت کە بڕیاری من لە سۆزێکی ئایینی یەوە سەرچاوە ناگرێت ، جا ئێوە دەمناسن و دەزانن کە من ڕزگار بووم لەو ئامـاژەو دەربڕینانـە کـە گەلەکەم پێوەی کۆت و بەنـدە _ لەوانەیـە بڵێن کـە هاونیشتمانی یەکانی من ( کەر ) و ( گان ) ! دەی ئەوەیش ڕاستی یەکە کە خۆم دەیزانم ) [2].

( محمد عەلی پاشا ) لەگەڵ فەرەنسی یەکاندا لە کاتی داگیرکردنی جەزائیردا ڕێکەوت ، تەنانەت پاش ئەوەی لە ئاغاکانیەوە فەرمانی بۆ هات_ خەریك بوو خۆی هەستێت بە داگیرکردنی جەزائیر وەك خزمەتێك بۆ فەرەنسی یەکان و کارێك بۆ حسابی تایبەتی یان .

---

[1] ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ١٨١/١ ) .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ١٨٨/١ ) .

بەلاّم ئاغاکانی ئەو بیرۆکەیان ڕەفزکردەوە چونکە موسڵمانەکانی دەوروژاند و کرێگرتەیی بەکرێ گیراوەکەیان بە دیار دەرکەوت. بۆیە کەوتنە لە کارخستنی ئەو بڕیارە و ( محمد عەلی ) کاری تێ‌نیا ئەوە بوو کە دانەوێڵە بنێرێ بۆ فەڕەنسی یەکان لە جەزائیردا !! [1].

دکتۆر( سولەیمان غەننام ) بۆ ئەو رایە دەچێت کە بەریتانیا کاتێك بە بڕیارو نیازی محمد عەلی زانی لە دژی ڕاپەڕی و هەڕەشەی ژێر ئاوخستنی کەشتی گەلەکەی لێکرد ئەگەر بیر لەوە بکاتەوە .

ئەوە هەڵوێستەیەکە لەگەڵ پاشایەك لە پاشاکانی دەوڵەتی عوسمانیدا کە کاری دەکرد لەسەر لاواز کردنی بیروباوەڕی( ولاء ) و ( براء )لەلای ئوممەتی ئیسلامی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ ، کە لەسیاسەتی توندو تیژی و تۆقاندن دا خۆی دەنواند . بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆیش ڕۆژئاوایی کرد بە ڕێباز بۆ خۆی . بەڕاستی ( محمد عەلی ) شیاوی ئەوە بوو کە ببێتە ڕابەری( ڕۆژئاوایی کردن ) لە جیهانی ئیسلامی عەرەبی دا کە سەر بە دەوڵەتی عوسمانی بوو . کوڕو نەوەکانیشی لەدوای خۆی لەسەر هەمان سیاسەتی ئەو چوون ، ئەوانیش بەردەوام پەیمانی چاندنی ڕۆژئاوایی کردن و عەلمانی یەتیان دەدا وبە هەمان ڕێگەدا دەڕوشتن و بۆ دەست خستنی هۆگری ڕۆژئاوا و خوازیاری خۆشەویستی ئەو پێشبرکێ یان دەکرد [2]. دەستەیەك لە سوڵتان و پاشاکانی دەوڵەتی عوسمانی ڕۆچوون لە دۆستایەتیکردنی بێباوەڕاندا و خۆشەویستی یان پێبەخشین و دایانە پاڵیان و لە جێی موسڵمانان بە دۆستیان گرتن وکاریان کرد لە سەر لاواز کردنی بیروباوەڕی ( ولاء ) و ( براء ) لە ئوممەتی ئیسلامیدا و لە ڕیشە وە کاریان تێ کرد ، بەمەیش کەسێتی و پێناسی دەوڵەتی عوسمانی توایەوە و دیارترین پێکهاتە و پایەکانی لە دەستدا و دوای ئەوە لەسەر دوژمنەکانی ئاسان بوو کە چواردەوری بدەن و دواتر بە خراپترین شێوە لەت و پەتیان کرد .

دووەم : قۆرخبوونەوەی چەمکی پەرستش :

ئەو مەرجانەی کە دەسەلاّتداری عوسمانی یەکان پێی هەڵدەستان بریتی بوو لە بەدیهێنانی چەمکی گشتگیری پەرستش بەو جۆرەی کە لە قورئانی پیرۆزو سوننەتی

---

[1] ) الشرق الأسلامي ، حسين مؤنس ص٣١١ .

[2] ) الأنحرافات العقدية والعلمية ( ١/ ١٨٩ ) .

پێغەمبەرەوە ( ﷺ) لێی تێگەیشتبوون و لەسەلەفی صاڵحەوە ( ڕەزای خوای لێبێت ) وەریان گرتبوو .

جا تێگەشیت بوون کە ئایین هەمووی پەرستشە ، بۆیە پەرستش بە چەمکە فراوانەکەی ئەو مەبەستە ڕاستی یەیە کە خوای گەورە دروستکراوی لە پێناودا دروست کردوە . وەك خوا دەفەرموێت ﴿ وما خلقت الجن والأنس الا ليعبدون ﴾ ( الذاريات : ٥٦ ) . ئەوەش بانگەوازی هەموو پێغەمبەران بووە هەر لە نوح ( عليه السلام ) ەوە تاکوو پێغەمبەرمان محمد ( ﷺ) بۆ گەلەکانیان ﴿ ياقوم أعبدوا الله مالكم من الله غيره ﴾ ( الأنحراف : ٥٩،٦٥، ٧٣،٨٥ ) . هەروەها دەفەرموێت ﴿ ولقد بعثنا في كل أمة رسولا أن أعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت ﴾ ( النحل : ٣٦ ) و ﴿ ما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحي اليه انه لا إله إلا انا فأعبدون ﴾ ( الأنياء : ٢٥ ) .

بەڕاستی عوسمانی یە پیشینەکان بەو جۆرەی خوا دەیویست لە چەمکی گشتگیری پەرستش گەیشتبون ئەویش ئەوەیە کە هەموو چالاکی یەکی نێو ژیانی مرۆڤ بگرێتەوە ﴿ قُل إنَّ صَلاَتِي وَ نُسُكِي وَ مَحيَايَ وَمَمَاتِي لِلهِ رَبِّ العلَمِين ، لاَ شَرِيكَ لَهُ وَ بِذَلِكَ أُمِرتُ وَ أنا أَوَّلُ المُسلِمِين ﴾ ( الانعام ١٦٢ و ١٦٣ ) .

بۆیە ژیانیان پڕبوولەکاری گەورە ، وەك بەهێزکردنی دەوڵەتی عوسمانی و پەروەردەکردنی بەردەوامی ژێردەستەکانی و فێرکردنی قورئان و زانست و جیهادکردنی بێباوەڕ ودوو ڕوەکان و هەستان بەکاراوباری موسڵمانان و جێبەجێکردنی ئامانجەکانی دەسەڵاتداری ، بۆیە دەبینین ( شێخ ئاق شەمسەددین ) ڕۆڵی لە ئاڕاستە کردن و فێرکردنی ئوممەت وبەکارهێنانی زانستی دارودرەخت و پزیشکی و صەیدەلی پێکەوە کۆدەکاتەوە بۆ بەرژەوەندی موسڵمانان . بەڕاستی ئەو شێخە بە زانستی ئاینی و دنیایی خوای گەورەی دەپەرست ، چەند لێکۆڵینەوەیە کیشی لە زانستی دارو درەخت ( ڕووەك ) و چارەسەری ( نەخۆشی ساریەکان ) دا هەبوو ، لەم بارەیشەوە کتێبێکی دانا ، هەروەها گرنگی زۆری دا بە چارەسەری نەخۆشی شێرپەنجە، لە ڕیزەکانی سوپای ( محمدی فاتیح )یشدا موجاهیدێك بوو ، پەروەرشیارێك بوو بۆ هەموو عوسمانی یەکان لەسەر گوێڕایەڵی خواو گرنگی دەدا بە ( تەزکیە ) پاك کردنەوەیان لە تاوان و هەڵە ، فرمانی ئەکرد بە چاکە و نەهی ئەکرد لە خراپە ، بەڕاستی پەروەرشیارێکو دڵسۆزێکی چاك بوو بۆ ( محمدی فاتیح ) ، جا دوای ئەوەی ( قوستەنتینە ) فەتح کرا ، ( محمدی فاتح ) هاتە لای شێخ کە لەخەوەتدابوو ، ( شێخ

شەمسەددین ) ڕێگری ئەوەی لێکرد و بە محمدی فاتحی ووت : ( تۆ ئەگەر بچیتە خەڵوەتەوە ، چێژێکی وای لێوەر دەگریت حوکمەو دەسەلأتت لەبەر چاو ئەکەوێت و ئەوکات کاروباری دەوڵەت تێکدە چێت و خوایش لێمان عادز ئەبێت و ، مەبەستیش لە خەڵوەتکردن بە دەستهێنانی دادپەروەری یە ، جا بۆیە ئەرکی سەرشانتە ئەمەو ئەوەبکەی و، چەند ئامۆژگاری یەکی بۆ باس کرد) .

ئەم تێگەیشتنەجون بۆ ( عیبادەت ) ئەوڕێبازە بووکە دەوڵتی عوسمانی لەسەری دەڕۆیشتن ، ئەوکاتەکە زانایانی خواناس حڵەوی ئاڕاستە کردن وئامۆژگاری و فێکردنیان لەدەست دابوو ، بۆیە ئەوهەموپێشکەوتنە هەمەلایەنە لەسەردەمی محمد فاتح دا ڕوویداو هەموو بوارەکانی ژیانی ( پەروەردەیی و سیاسی و ئابووری و سەربازی و کۆمەلأیتی و زانستی ) یشی گرتەوە ، هەمووئەوپێشکەوتنانە لەو تێگەیشتنەوە هاتبووکە هەیانبوبۆ "پەرستش" کەلە شەرعیەتی پاکی ئیسلامەوە وەریان گرتبوو ، هەرلەبەرئەوەبووکە دەوڵتی عوسمانی لەسەردەمی سەروەری و هێزیدا پێشڕەوتی یەکی لەبواری زانستیەکاندا بەخۆیەوەبینی ، بۆ نمونە : لەجوگرافیادا ناوی ( ریس بیری ) لەهەردو سەردەمی ( سەلیمی یەکەم ) و ( سولەیمانی قانۆنی ) دا زۆرئەبرێت ، ( ریس بیری ) سەرکردەی هێزی دەریای عوسمانی بوو ، زانایەکی جوگرافیاناسی گەورەش بوو ، لە سالّی ( ١٤٦٥ ز) دا لە دایك بوە و لە سالّی ( ١٥٥٤ ز ) کۆچی دوایی کردووە ،

ئەو زانا جوگرافی یە پێشەنگێك بوولەوپێشەنگەکانی نەخشەسازی لە ئەدەبی جوگرافی عوسمانیدا . لە و بوارەشدا دوو نەخشەی گرنگی هەیە ، یەکەمیان بۆ ئیسپانیا و ڕۆژئاوای ئەفریقا و زەریای ئەتڵەسی و کەنارە ڕۆژهەلأتی یەکانی هەردوو ئەمریکا _ ئەمەیشی لە سالّی ١٥١٧ ز لە میسردا پێشکەشی سوڵتان سەلیمی یەکەم کرد ، ئێستایش لە مۆزەخانەی ( توبقبو ) لە ( ئەستان بولّ ) دا هەیە ( ٦٠ × ٨٥ سم ) ئیمزایی ڕیس ) یشی لەسەرە ، ئەوی تریان بۆ کەنارە زەریایی یەکان لە گرینلاندەوە تا فلۆریدا ( ٦٨ × ٦٩سم ) کە ئەمەیش ئێستا لە مۆزەخانەی ( توبقبو ) لە ( ئەستانبولّ ) دا هەیە . ئەوەی شیاوی باسە ئەوەیە کە ئەو نەخشەیەی ( ڕیس بیری ) بۆ ئەمریکای کێشاوە کۆنترین نەخشەیە بۆ ئەمریکا کێشرابێت !!

لە ٢٦ی ئوغسطسی سالّی ١٩٥٦ زدا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە زانکۆی جۆرج تاون دا کۆبونەوەیەکی ڕادیۆیی کیرا بۆ نەخشەکانی ( ڕیس بیری ) ، تیایدا هەموو

جوگرافیناسه بەشداربووەکان یەکدەنگ بوون لەسەر ئەوەی نەخشەکانی ( ڕیس بیری ) بۆ ئەمریکا ( دۆزینەوەیەکی نائاسایی یە ) لە توانیستی ئاسایی مرۆڤدا نی یە ( خارق للعادة).

( ڕیس بیری ) پێش دۆزینەوەی ئەمریکا شارەزای بوونی ئەمریکا بوو و لە کتێبی (البحرية ) دا دەریایی دا دەڵێت ( دەریای ڕۆژئاوا _ مەبەستی زەریای ئەتڵەسی یە _ دەریایەکی گەورەیە ، بە پانی ۲۰۰۰ میل لە بوغاز سەبتە وە بەرەو ڕۆژئاوا درێژ دەبێتەوە و لە کەنارەکانی ئەو دەریا گەورەیەدا کیشوەرێك هەیە کە کیشوەری ( ئەنتیلیا ) یە . دەستەواژەی کیشوەری( ئەنتیلیا ) دنیا یان ئەمریکا ئەگەیەنێت .( ڕیس ) ئەوەشی نوسیوە کە ئەو کیشوەرە لە ساڵی ۸۷۰ك / ١٤٦٥ز دا دۆزراوەتەوە واتە نزیکەی ۲۷ ساڵ پێش دۆزینەوەکەی ( کۆڵۆمبس ) بۆ ئەمریکا [1].

بەڕاستی ( ڕیس بیری ) لە هێزی دەریایی دا کتێبێکی بەجێ هێشتووە ئەو زانیاری و نەخشە و ردانەی کە تیایدایە ، زانا جوگرافی یە هاوچەرخەکانی ئەورووپا و ئەمریکای توشی ڕامان کرد ، زانیاری و نەخشە گەلێك کە جیهانی سەردەم ڕاستی ئەوانەی سەلماندووە .

ڕاهیبی جزویتی( لاین هام ) ی بەڕێوەبەری مەڵبەندی ( ارصاد ) لە ( ویستن ) باس لەوە دەکات کە بەڵگەیە لەسەر لێهاتویی ( ڕیس بیری ) سەرکردەی عوسمانی لە زانستی جوگرافیدا ئەوەتا دەڵێت : ( نەخشەکانی ( ڕەیس بیری ) ڕاستیان لە پلەیەکدایە کە عەقڵ سەرسام دەکات ، بە تایبەت کە ئەو بەڕوونی چەند شوێنێك لەسەر نەخشەکە دیاری دەکات کە تا سەردەمی خۆیشی لەسەدەی ١٦ی زاینیدا نەدۆزرابونەوە ، لایەنی هەژێنەری پێگەی ( ڕەیس بیری ) ئەو وێنە کێشانەیەتی بۆ شاخەکانی ئەنتارکتیکا بە دووروودرێژی کە لە چەند نەخشەیەکدا کێشاویەتی ، لەگەڵ ئەوەی ئەو شاخانە کەس نەیتوانیوە بیاندۆزێتەوە تا ساڵی ١٩٥٢ ز واتە لە نیوەی دووەمی سەدەی ۲۰ زاینیدا . چۆن ؟ پاش بەکارهێنانی دەزگای پێشکەوتووی دەنگدەرەوە ، بەڵام پیش سەرکردەی عوسمانی ڕەیس بیری واتە تا سەدەی ١٦ ی زایینی _ هیچ کەس نەیدەزانی کە ( ئەنتارکتیکا ) هەیە کە بەدرێژایی چاخەکانی مێژوو بە بەفر داپۆشرا بوو ) [2].

---

[1] ) العثمانيون في التأريخ والحضارة ص٣٨٢ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٣٨٣ .

دیاره كه ئەنتارکتیکا کیشوەری شەشەمە و دەکەوێتە نیوەی باکوری زەوی یەوە ، تەنها ڕاهیب لاین هام سەرسام نەبووە ، بەڵکوو ئەوە زۆربەی زانا و نوسەرەکانی دەستەو سان کردووە ، بەڕاستی هەندێ لە زانایان وێنەی زەوی کەوێنەی گرتنی لە کەشتی هەواوە گیراوە لە سەدەی ( ۲ دا ) لەگەڵ ئەو نەخشانەدا بەراورد کرد کە سەرکردەی دەریایی عوسمانی ڕەیس بیری لە سەرتاکانی سەدەی ١٦ دا کێشا بوونی ، لێکچوونێکی سەرسوڕهێنەرانەی نێوان وێنە گیراوە ئاسمانی یەکان و نێوان نەخشەکانی ڕەیس بیری دا هەبوو [1] .

ڕاپەڕین لە دەوڵەتی عوسمانی لەسەردەمە دیارو ڕووناکەکانیدا لە هەموو ئاستە زانستی وجەماوەری و حکومی و سەربازی یەکاندا بوو ، بزوتنەوەی دەوڵەت و گەلیش دەربڕینێکی ڕاست بوو بۆ چەمکی گشتگیری پەرستش . بەڵام لە کۆتا سەردەمەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا ، چەمکی پەرستش لە چەند وێنەیەکی پەرستشی عەشایەریدا قۆرخبوویەوە و وای لێهات بووە نەریتێکی جێماوەیی کە هیچ کاریگەری یەکی لە ژیانی پەیڕەوکەرانیدا نە بوو . مەگەر لە سەردەمێکدا ڕۆچوو بن لە جێبەجێکردنیدا ( لابردنی پەرستش لە بەشەکانی تری ئیسلامدا کرا تا وای لێکرا وەك بڵێ ی ئیسلام تەنیا بریتی یە لەوانە و شتی تر لە ئیسلامدا نی یە ، بۆ نمونە ( جیهاد ) و حوکمەکانی کڕین و فرۆشتن و پەیوەندی یە دارایی یەکان . لەگەڵ ئەوەدا کە زۆربەی خەڵك ئەگەر نەڵێین هەموویان ، دەیانزانی کە ئیسلام تەنها پەرستشە فەرزەکان نی یە و بەس ، چونکە ئەوان لایەنەکانی تریان واز لێهێنا بوو، و چاویان لێدا خستبوو، پایەیان دابەزاند بوو ، دەستەیەك لە وەعز خوێن و مورشیدەکان داوای ئەوەیان ئەکردکەخەڵکی واز بهێنێ لە جگە لەو پەرستشانە . جا جیهاد و نکوڵی کردن لە خراپە و بەرپەرچدانەوەی سەرکەشی و ئیمپریالیزم و بەرەنگاری ستەم و کارکردن لە هەموو ئەو بوارەکانە دا کە لە کاروبارە گشتی یەکان و سود بە موسڵمانان بگەیەنێت ، هەموو ئەوانە لە بەرچاوی ئەو دەستەیەی خەڵکدا _ کە لە سەردەمەکانی دواکەوتوییدا زۆر زۆرن _ چەند شتێکی زیادە کە لە خواو عیبادەت دووریان دەخاتەوە لە کاتێکدا کە پێوەر لە ئیسلام دا لە بۆ ( چاکە ) و ( خواناسی ) گشتگیرە هەموو ئەو واجیباتانە ئەگرێتەوە کە ئیسلام بڕیاری داون وەك جیهاد و زانست و دادپەروەری و ئیشی بەسود بۆ خەڵك وتەپسان لە هەڵسوکەوت و چاکەدا هەموو ئەو کارانە هاوڕێن لەگەڵ (

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٣٨٤ .

یەکتاپەرستی ) و ( دڵسۆزی نواندن بۆ یەکتا پەرستی ) ، کەچی پێوەر وای لێهات .جا پێوانەکانی لە خوا ترسان لە نێو قۆرخ بوویەوە لەو عیبادەتانەدا )[1] .

بەم شێوەیە ئەو بیرۆکەیەی کە پەرستشی لە بەشەکانی تری ڕژێمی گشتگیری ئیسلام لابرد بویە هۆی لاوازی لە هۆشیاری سیاسی و کۆمەلاّتی و ڕەوشتیدا .

ئەم قۆرخکردنەی چەمکی پەرستشی بووبە هۆی چەند خراپەیەك ( سلبیات ) کە لە گرنگترینیان ئەمانەن :

* دروشمە کانی عیبادەت بە شێوەیەکی تەقلیدی بێ سود وبێ کاریگەری ئەنجام ئەدران کاتێك واز لە بەشە کانی تری ئیسلام هێنرا . جا ئەو دروشمانە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا ڕۆڵی خۆی نەدەبینی ، هەروەها لە بوارەکانی تری پەرستش دابڕا . جا نوێژێك خوا لە بارەیەوە دەفەرموێت ﴿ إن الصلوة تنهى عن الفحشاء والمنكر ﴾ ( العنكبوت : ٤٥ )وای لێهات هیچ کاریگەری یەکی دیاری لە نێو ژیانی جێبەجێکەرانی لە خەڵکدا نەبوو، بە جۆرێك کە لە خراپە و داوێن پیسی دووری نەدەخستنەوە . نەیشدە بوو کە ئەو کاریگەری یە ی هەبێت کە پەرستش لە تەنها بەجێکەیاندنی دروشمە تەقلیدی یەکاندا قۆرخ بکرێتەوە .

_ خەڵکی تەمەڵ بوون لە لایەنەکانی تری عیبادەتدا . چونکە لە دیدی خەڵکدا ئەو شتانەی تر " عیبادەت " نین

کاتێك دەبینین لە نێو موسڵماناندا هەیە کە نوێژە فەرزەکانی بەکۆمەڵ لە مزگەوتدا دەکات . پاشان دەچێتە دەرێ و بە درۆ لەسەر حسابی مزگەوت سوێند دەخوات و لە کڕین و فرۆشتندا فرت و فێڵ ( ڕیبا ) دەخوات بە چەند قات ! و دەم ئەخاتە ناموسی خەڵکەوە و مێشێکیش میوانی نی یە و ویژدانی ئاسودەیە وخەیاڵی ڕاحەتە و ئازارەکانی ویژدانی و سەرزەنشتی دەرونی بەهۆی ئەو چەند ڕکاتە نوێژانەوە بێدەنگ کردووە .

* پشت بەستن بە لایەنی تاکی شەخسی و پشتگوێ خستنی لایەنە کۆمەلاّیەتی یەکان ، دەبینین کە موسڵمانان ( گرنگی یان زیاتر داوە بە ئاکارە تاکی و وابەستە بەخودی مرۆڤەکان تا ئاکارە کۆمەلاّتی یە وابەستەکان بە خەڵکانی تر ، هەندێ جار موسڵمان لە خودی خۆیدا پاکە ، بەلاّم گوێی لێ نی یە شەخەڵێك لە ڕێگەی موسڵماناندا لاببات ، ئەوەی لەبیرچووە کە ( اماطة الاذى عن الطريق من شعب الايمان )) واتە : ( لابردنی نارەحەتی و

---

[1] ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ١/ ١٠٠ ) .

ئازار دەریك لەسەر ڕێگا لە لقەکانی ئیمانە ) وەك لە فەرمودەی ( صحیح ) دا هاتووە [1] هەندێ جار موسڵمان دەکرێت چاودێری یاساکانی پاکی و مەرجەکانی پاکیزەیی نێو خۆی بێت ، بەلام گوێی لێ نی یە ڕێگەی خەڵك و شوێنی دانیشتنیان پیس بکات و ئەو ئاکار و ڕەوشتە کۆمەلایەتی یانە نەکات کە ئیسلام فرمانی پێکردووە ) [2].

لە ئەنجامی ئەوەی چەمکی پەرستش تەنها لە دروشمەکاندا مایەوە و هەموو کارەکانی تری لێ دابرا خەڵکی هاتن کەوتنە گرنگی یان بە کاروباری تایبەتی خۆیان و کاروباری گشتی یان پشتگوێ خست و ڕۆحی تاکەگەرایی لەسەر حسابی ڕۆحی کۆمەلایەتی گەشەی سەند .

* پەرستش کردن لە جیاتی کارکردن دانرا و دەست گرتن بە ڕیوڕەسم و دروشمەکانیەوە کە چەندان بیدعەشی تێکەڵکرا بوو بە بەکارهێنانی هۆکارەکانەوە تێدا ڕوودا . کرایە هەموو شت و دەستبەردرا لە هۆکارە ماددیەکان .

( خوێندن و خوێندنوەی قورئان بەزارچوویە جێگەی کارکردن کە چەندین لە ئایەتی جیهاد وڕوانین بۆ بونەوەر و بیرکردنەوە لە خولقاوەکانی خوا و بەرپاکردنی دادپەروەری و تەرازوو بە یەکسانی و حوکم کردن بەوەی خوا دایبەزاندووە و بەرهەمهێنانی ئەو بەخششانەی خوا کە لە بونەوەردا هەن لەگەڵ ئەوەدا کە ئەمانە هەمووی پەرستشن .

هەروا پێغەمبەر ( ﷺ ) بەو جۆرەی خوا فەرمانی کرد بوو بەتەواەتی خۆی بۆ کوشتاری بێباوەڕان ئامادە دەکردو لە خوا دەپاڕایەوە و پەرستشی دەکرد تاکوو سەری بخات . کەچی لەم سەردەمە کۆتاییانەدا موسڵمانان نوێژو نزای لێوە بە جێماو و داهێنەرو بیدعەیان لە جێی هۆکارەکان داناوداوای . ڕۆزی و شیفا و سەرکەوتنیان لە و نەوە ئەکرد نەکلەو ڕێگە شەرعی یەکانە وەکە خوا کردونی بە هۆکار و بۆ دەستخستنی ئەو ئامانجانەو دەستخستنی ئەوشتانەدا ئەهێنا ، چەند نزایەکی تایبەت کە تەنها ئەوانەیان دەخوێند . بجاری واهەبوو دوعا و نوشتە و زیارەتگەلێکیان بۆ دەستخستنی ئەوشتانەدا ئەهێنا و چەندین ویردیان تایبەت ئەکرد بۆی.... ) [3].

---

[1] ) بڕوانە : ( صحيح مسلم ) ، باب بيان عدد شعب الايمان ، (٦٣/١ ) .

[2] ) المجتمع الأسلامى المعاصر ص٦٦ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٩ .

له ئه‌نجامی ئه‌م تۆرخکردنه مه‌ترسیداره‌ی چه‌مکی په‌رستنه‌دا هه‌موو کاره‌کانی تر له بازنه‌ی په‌رستش چوونه ده‌رێ . جا کاری سیاسی که چاودێری ئوممه‌ت له‌سه‌ر کاره‌کانی فه‌رمانڕه‌وا و پێشکه‌ش کردنی ئامۆژگاری بۆی و شه‌ونخونی کێشان بۆ جێبه‌جێکردنی شه‌ریعه‌ت و به‌جێگه‌یاندنی دادپه‌روه‌ری له نێو ژیانی خه‌ڵکی له‌بازنه‌ی عیباده‌ت چووه ده‌ره‌وه ، ئه‌و قسه چه‌ند جوانه که ( سید قطب ) له ڕوون کردنه‌وه‌ی بۆ ڕاستی په‌رستش و سه‌رزه‌نشتی ئه‌وه‌ی که له دروشمه په‌رستشی یه‌کاندا کورتی ده‌کاته‌وه و ده‌ڵێت : ( ڕاستی ئه‌وه‌یه که ئه‌گه‌رعیباده‌تی ڕاسته‌قینه ته‌نها دروشمه په‌رستشی یه‌کان بوونایه ئه‌وا ئه‌و کاروانه پیرۆزه‌ی په‌یامبه‌ر و ئه‌وهه‌مووه په‌یامانه‌ی ، ئه‌و هه‌موو هه‌وڵه ماندوکه‌رانه‌یشی شیاو نه بوو که پێغه‌مبه‌ران ( علیه السلام ) به خه‌رجیان ده‌دا ، ئه‌و هه‌موو سزا و ئازارانه‌یشی شیاو نه بوو که بانگخوازان و موسڵمانان به درێژایی کات به‌ره‌و ڕووی بوونه‌وته‌وه ! به‌ڕاستی ئه‌و به‌ها قورس و گرانه ته‌نها شیاوی ئه‌وه‌یه که مرۆڤایه‌تی به‌یه‌کجار له ئاینداری به‌نده‌وه ده‌ربهێنێت و بیانگێڕێته‌وه بۆ ئایینداری به ته‌نها بۆ خوا له هه‌موو کاروباری ژیانداو بۆ مه‌نهه‌جی ژیانی دنیا و دوا ڕۆژیاندا به‌یه‌کسانی ) [1] .

ئه‌وه‌یش واتای ئه‌و په‌رستشه گشتگیره‌یه که عوسمانی یه پێشینه‌کان هۆشیان لای بوو له ژیانیاندا جێبه‌جێیان ده‌کرد و له واقیعی سه‌ر زه‌ویدا کاریان پێکرد ، بۆیه میرنشینه‌کان گشتیان سه‌ریان بۆ دانه‌واندن و سه‌رکه‌شه‌کان له‌به‌رده‌میاندا ملیان که‌چ کرد و خوای گه‌وره له زه‌ویدا ده‌سه‌ڵاتی پێدان و جێگری کردن و به به‌سه‌ر هه‌رێمه فراوانه‌کانی دونیاوه ئاڵای ئیسلامیان به‌رزکرده‌وه ، ئه‌و ڕۆژیش که ئه‌و چه‌مکه گۆڕا و له بازنه‌ی دروشمه‌کاندا قۆرخ کرایه‌وه ، هیممه‌ته‌کان کول بوون و بڕیارو نیازه‌کان لاواز بوون بۆ ئه‌نجامدانی ته‌واوی کاروباری ئیسلام پاشان بێهێزی و پاشان نشوستی ڕوویدا .

ئه‌وشکسته سه‌ربازی وقه‌یرانه ئابوری و لادانه ڕه‌وشتی و لێقه‌ومانه کۆمه‌ڵایه‌تی و گه‌نده‌ڵبوونی بیر و وشکی له ڕۆحدا و دواکه‌وتن له قه‌یرانه شارستانی یه‌تدا یه‌که‌ی که تووشی ده‌وڵه‌تی عوسمانی بوو ،هه‌موو هۆکانی بریتی بوون له به‌تاڵ کردنی ئیسلام له پێکهاته بنه‌ڕه‌تی یه‌که‌ی و له‌ده‌ستدانی چه‌مکی گشتگیری په‌رستش .

---

[1] ) في ظلال القرآن ( ٤/ ١٩٣٨ ) .

(( ئەو ڕۆژەی کە ﴿ واعدوا لهم ما استطعتم من قوة ﴾ ( أنفال : ٦٠ ) پەرستش بوو . هیچ کەس سامی داگیرکردنی خاکەکانی موسڵمانان و بردنی خێرو بێری نە بوو . ڕۆژێکیش کە ( طلب العلم فريضة ) بوو . لەوێدا لادانێکی زانستی نە بوو ، بەڵکوو ئوممەتی موسڵمان ئوممەتی زانستێك بوو کە ئەورووپا لە خوێندنگە و زانکۆکانی ئەمدا فێری بوون !

ڕۆژێك کە ﴿ فأمشوا في مناكبها وكلوا من رزقه ﴾ ( الملك : ١٥ ) پەرستش بوو .کۆمەڵگە ئیسلامی یەکان دەوڵەمەندترین کۆمەڵگەکانی زەوی بوون . ڕۆژێك کە ( كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته ) پەرستش بوو ، کاربەدەست و بەرپرسیار هەستی بەوە دەکرد کە ئەو بەرپرسە لە ژێردەستەکەی و لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا کێشەیەك بەناوی کێشەی هەژارانەوە نەبوو ، چونکە چارەسەری خوایی بۆ کێشەی هەژاری لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا وەك پەرستش بۆ خوا جێبەجێ دەکرا .

ڕۆژێك ﴿ عاشروهن بالمعروف ﴾ پەرستش بوو ، ئافرەت کێشەیەکی نە بوو ، چونکە هەموو ئەو ماف و دابینکاری یانەی کە خوا فەرمانی پێکردبوون وەك گوێڕایەڵی و پەرستش بۆ خوا جێبەجێ دەکران )[1] .

بەڕاستی لادان لە چەمکی گشتگیری پەرستش لە سەردەمە کۆتایی یەکانی دەوڵەتی عوسمانی دا هۆکارێك بوو بۆ بڵاوبوونەوەی مەزهەبی عەلمانی و زاڵبوونی دروشمە عەلمانی یەکانلە زۆرێك لە هەرێمەکانی سەر بەدەوڵەتی عوسمانی دا .

**سێ یەم : بڵاوبوونەوەی دیاردەکانی (( شیرك )) و بیدعە و ئەفسانە :**

دەوڵەتی عوسمانی لە دووسەدەی کۆتایدا ڕۆچوو بوو نێو زۆرێك لە دیاردەکانی ( شیرك )و بیدعە و ئەفسانە ولاڕێبونێکی ترسناك لە یەکتاپەرستی پەروەردگاریدا ڕویدا و شەپۆلێکی گومڕایی و تاریکی لە ڕاستی ئاینیدا لە لایان ڕۆیدا و ڕۆشنایی یەکتاپەرستی سەرکوت کرا و لە ڕێگە ڕاستەکەیان لایاندا[2] .

ڕۆژێك کەدەوڵەتی عوسمانی بە دیهێنەری یەکتاپەرستی بوو و چەمکی پەرستشی گشتگیری پەیڕەو دەکرد ودژایەتی ( شیرك ) ی دەکرد لە و پەڕی دەسەڵاتداری و عیززەت و سەرکەوتندا بوو کە خوا بۆی ئەناردن ، ئەوەتا ( سوڵتان مورادی یەکەم ) پاش ئەوەی

---

[1] ) مفاهيم يجب ان تصحيح ص٢٤٩ .

[2] ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ١/ ٢٧١ ) .

سەربازێکی صربی خەنجەرێکی لێدا ، لەسەرە مەرگیدا بە چەند واتایەکی قوڵی یەکتاپەرستی وچەند وشەیەکی پڕ لە یەکتاپەرستی و دژ بە (( شیرك )) ماڵئاوایی لە دنیا دەکات و دەڵێت ( لە کاتی ماڵئاواییدا جگە لە سوپاسی خوا هیچی ترم پێناکرێت ، ئەو ئاگاداری تەواوی نەزانراوەکانە و گیراکەری نزای هەژارانە ، ( اشهد أن لا إله إلا الله ) ، جگە لەوەیش کەس شیاوی سوپاس و سوپاس گوزاری نی یە ، بەڕاستی
ژیانم لە کۆتایی نزیك بوەتەوە و سەرکەوتنی سەربازی ئیسلامم بینی ، گوێڕایەڵی یەزیدی کوڕم بن و دیلەکان سزا و ئازار و ئەشکەنجە مەدەن ، لەم کاتەوە ماڵئاوایی لەئێوە و سوپاسەرکەوتوەکەشمان دەدەمە دەست ڕەحمەتی خوا ، چونکە هەر خوا دەوڵەتەکەمان لە هەموو خراپەیەك دەپارێزێت ) [1].

سوڵتان مورادی دووەمیش وەسیەتەکەی خۆی وا بەجێهێشت ( ڕۆژێك دێت خەڵك تیایدا خۆڵەکەم دەبینن ) [2]. ئەو لەوە ڕاڕا بوو کە دەترسا لە گۆڕێکی گەورەدا بنێژرێت و دەیویست هیچ لەسەر گۆڕەکەی بنیاد نەنرێت . بەڕاستی سوڵتانەپێشوەکان واتاکانی یەکتاپەرستی لە قسەکانیاندا هەڵدەقولا ولە کارەکانیاندا ڕەنگی دابوویەوە . ئەو چەمکانەیش لە هەموو گەلی عوسمانیدا بلاوبووبوونەوە . بەلام لە کۆتا سەردەمەکاندا بارەکە گۆڕا و لەگەڵ کە لەکەبوون و یەك بەدوای یەك بەڵگەکان و ڕوونی نەهی کردن لەو ڕێگە یانەی کە سەر بۆ (( شیرك )) ئەکێشن و وریایی دانی پێغەمبەر ( ﷺ ) و سوربوونی لەوەدا لە پێش مردنی وەك لە هەر دوو صەحیحەکەدا هاتووە ( لعن الله اليهود و النصارى اتخذوا قبور انبيائهم مساجد ) مسلم واتە ( نەفرینی خوا لە جولەکە و مەسیحی یەکان کە گۆڕی پێغەمبەرەکانیان کردە مزگەوت ) لەوە وریایی دەدا کە وەك ئەوان بکەن .
دایکمان ( عائیشە ) "ڕەزای خوای لێبێت " دەفەرموێت ( ئەگەر وا نەبوایە ئەوا بە دڵنیایی یەوە گۆڕەکەی ( پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ) بەرزئەکرایەوە بەلام ، پێناخۆشی دەربڕیوە لەوەی کە بکرێت بە مزگەوت . وتەی پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم ) ( لعن الله زائرت القبور والمتخذين عليها المساجد والسرج ) الترمذي .

---
[1] ) الفتوح الآسلامية ص٣٩١ .

[2] ) العثمانيون في التأريخ والحضارة ص٣٤٦ .

پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) پێنج ڕۆژ بەرلەوەی بمرێت فەرمووی ( لە پێش ئێوە میللەتانێك هەبوون كە گۆڕەكانیان دەكردە مزگەوت وریابن ئێوە گۆڕەكان نەكەن بە مزگەوت بە دڵنیایی یەوە من بەرگری ئەوتان لێدەكەم ) رواه مسلم .

هەروەها دەفەرموێت ( خوایە گۆڕەكەم نەكەیتە بت و بپەرستێت ، توڕەیی خوا لەسەر گەلێك توند بووە كە گۆڕی پێغەمبەرەكانیان دەكەنە مزگەوت ) رواه مالك . و ( لەسەر گۆڕەكان دامەنیشن و نوێژیان بۆ مەكەن ) رواه مسلم .

كاتێك هەندێ لە ئافرەتەكانی باسی ئەو كەنیسەیان بۆ كرد كە لە خاكی حەبەشە دیتبویان و وێنەی تێدا دانرا بوو ، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی ( ئەوانە ئەگەر پیاوی چاك تیایاندا بمردایە لەسەر گۆڕەكەی مزگەوتێكیان بنیاد دەنا و پاشان ئەو وێنەو پەیكەرانە یان بۆ دەكێشا . ئەوانە لە لای خوا خراپترینی دروستكراوەكانن ) رواه البخاري .

پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) نەهی كردووە لەوەی كە گۆڕگە چكاری بكرێت و لەسەری دابنیشت و لەسەری ( بینا) بكرێت ، لە گێڕانەوەیەكی تردا دووره پەرێزی لە نوسین لەسەر گۆڕەكان كراوە . الترمذي . لە كۆتایی یەكانی دەوڵەتی عوسمانیشدا بە شێوەیەكی نایاسایی دانانی گومەز و بنیادنانی گڵكۆ و دانانی دیمەن و نوێ كردنەوەی مەزارگەكان زیادی كرد تا ئەوەی وەك ئەو دەقانە هاتبن و فرمانی بكەن بە بنیادنان لەسەر گۆڕەكان و باسی فەزڵیان بكەن و هانی ئەوە بدەن .

بارەكە زیاتر ڕووی لە خراپە كرد :كە هەندێ لە فیقهناسەكان فەتوای دروستی گومەزی دانان لەسەر گۆڕەكانیان دا ئەگەر مردووەكە پیاو باش بووبێت ، بەڵگەیشیان بۆ ئەوە بریتی بوو لەوەی كە هەندێ لە پێشینان ( سلف ) ئەوەیان بەباش زانیوە ، قورەكە بەوە زیاتر خەست بوویەوە كە ئەوان ئەوڕاو بۆچونە گەندەڵانەیان لە ( كتێب و) دانراوەكانیاندا بە جێهێشت كە خوێندكارەكان لە خوێندنیدا پێوەی وابەستە ئە بوون [1] .

ئەو دەردە گەورەیە گوازرایە وە و كەوتە بنەبڕكردنیدەوڵەتی عوسمانی و خراپەكەی زیادی كرد و ئەوشیركە گەورەیەی كە پێغەمبەر (ﷺ) وریایی لێدەدا ڕویدا .

---

[1] ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ١/ ٢٧٢و ٢٧٣ ) .

**دیاردەو هۆکارەکانی (( شیرك )) لەو ماوەیەدا لەم شێوانەدا زاڵ بوو :**

_ بنیادنانی مزگەوت و گومەزی و دیمەنە کان لەسەر گڵکۆو گۆڕەکان لە هەرێمەکانی دەوڵەتدا ، بەڵکوو ئەوە لە هەمو جیهانی ئیسلامیدا بڵاوبوویەوە ، بەداخێکی زۆرەوە لە کۆتا سەدەکاندا دەوڵەتی عوسمانی دا دەبینین کە هانی ئەو دیمەن و گڵکۆبڵاوانەی نێو جیهانی ئیسلامی دەدرا ، بۆ نمونە دەوڵەت لە خەڵکی بەسرە بوورا ڕێوڕەسم و ئەرکەکانی ، لەسەر هەڵگرتن وەك ڕێزێك بۆ( زوبەیری کوڕی عەووام) (( ڕەزای خوای لێبێت )) . عوسمانی یەکان لەسەر گڵکۆکەیشی مزگەوتێکیان بنیاد نا و دایکی ( سوڵتان عبدالعزیز ) هەستا بە چاکسازی گومەزی و گەورەکردنی مزگەوتەکە ، لەساڵی ١٢٩٣ : یشدا بڕیارێك لە ( سوڵتان عبدالحمیدی دووەم ) ەوە دەرچوو بە بنیادنانەوەی ئەو مەزارگە پیرۆزانە بە چاودێری والی بەسرە ( ناسر پاشای سەعدون ) .

پاشان لە ساڵی ١٥٠٣ ز دا دووبارە ( سوڵتان عبدالحمید ) بڕیاری سپی کردنەوەی گومەزی یەکەو بنیادنانەوەی مزگەوتەکەی داو دووبارە بڕیاری دا بە دووبەرگ بۆ گۆڕی ( زوبەیر و عوتبەی کوڕی غەزوان ) بە ئاورشمی سوری جوان نەخشێنراو بە زیو ، هەروەها فەرمانی کرد بە دانانی چەند بوخردان و گولاودانێکی زیوی لە لای هەردوو گۆڕی پیرۆزیاندا [1].

هەموو هەرێمە ئیسلامی یەکان و لە حیجاز و یەمەن و ئەفریقیا و میسر و ڕۆژئاوای عەرەبی و عێراق و شام و تورکیا و ئێران و ئەودیو ڕوبار و هیند و شوێنەکانی تردا پێشبڕکێیان لە بنیادنانی گڵکۆو گومەزیدا دەکرد و کێبەرکێیان دەکرد لە گەورە کردن و ڕازاندنەوەیدا ، چونکە بنیاد نان لەسەر گۆڕەکان بەزمێك بوو کە خەڵکی ئەو سەرەدەمە لەسەری بوون و ئەوە پایەبەرزی یەك بوو کە زۆرینە بەدەوریدا دەسوڕانەوە . بەڕاستی عوسمانی یەکان لە کۆتایی سەردەمەکانیاندا ڕاهاتبوون لە هەموو شتێکدا کە خەڵکی ئەو سەردەمە بە گەورەیان دەزانی ئیدی ئەوشتە یان شوێنەواری پێغەمبەران یان هەرشتێکی تربوویێت و بەگەورە دابنرایە . ئەو دیاردەو گڵکۆیانە بوون بە شوێنی پاڕانەوە و پشت بەستن بەمردووەکان و چەند بیروباوەڕێکی ( شیرك ) ی بڵاوبوونەوە وەك سەربڕین بۆ جگە لە خوا و نەزر بۆ گۆڕەکان و داوای شیفا کردن و داوای چاکە لە گۆڕەکان و پشت بەستن پێیان . ئیدی گۆڕو گڵکۆکان دەستیان گرت بەسەر ژیانی خەڵکییدا ، ئەو گڵکۆیانە ڕژانە ناو ژیانی

---

[1] ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ١/ ٢٤٩ ) .

خەڵکیودەستیان کێشا بەسەر کاروباری خەڵکدا و سەرقاڵ کردبوون و لە دڵیاندا بەرزترین پێگەی گرتبوو ، دەستهاڕی ئەم دەسەڵاتی گۆڕو گۆڕستانانە بەدەوری شیرك و زیادەڕەویدا ئەسوڕایەوە ، و خەڵکیان وابەستە ئەکردپێیانەوە جگە لە خوا ، ئیدی هیچ کارێکی بچوك و گەورەی ژیانیان نەما پرس بە مردووەکان نەکەن تێیدا و ڕاوێژیان پێ نەکەن و لێیان نەپاڕێنەوە کە ئەوانە هیچ سود و زیانێکیان بۆ خۆیشیان نە بوو ، ئیدی چۆن بۆ جگە لە خۆیان ئەیانبێت ، زاناکانیش ( بەداخێکی زۆرەوە ) پێش جەماوەر دەکەوتن و سوننەتی خراپی بەگەورەکردنی گلکۆ و پایەکان و خوو پێوە گرتنیان فێری خەڵك دەکرد و پێی هەڵدەستان سامێکی گەورەیان لە دەرونیاندا دەچاند . خەڵك لە ( شیرك ) و( گومڕایی) ڕۆچوون وچوونە ناو ژیانی بتپەرستی و دژایەتی کردنی یەکتاپەرستی خەڵکەکە بەوەشەوە نەوەستان پەنا بۆ مردووی قەبرسان و زیندووەکان بەرن ، بەڵکو دەستیان دایە " شیرك " بەهۆی دار بەردەوە و کار گەیشتە ئەوەی کە بیروباوەڕی جەماوەری نێو بەغداد لە تۆبخانەیەکی کۆنی نێو مەیدانی پاشماوەی چەکی سوڵتان مورادی عوسمانی کە لە جەنگی دژ بە فارسەکاندا بەکاری هێنا بوو بۆ دەرکردنیان لە بەغداد . نەزریان بۆ دەکردن و خوازیاری کردنەوەی زمانی منداڵەکانیان لێدەکردو لای ئەوان ناسرا بوو بە ( طوب ئەبی خوزاعە ) کەوای لە زانا محمد شوکری ئالوسی کرد بە ڕیگرتن لەو خەیاڵاتە شەرمەزاری یە بە نوسینی نامەیەك کە سەرزەنشتی ئەو زانانەی پێدەکرد کە ناوی نا ( القول الأنفع في الردع عن زيادة المدفع ) [1] .

لەکۆتایی یەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا خەڵك خوویان بەوەوە گرت کە سوێند بە جگە لە خوا بخۆن لە دروستکراوەکان ، سوێندی بەدرۆی دەست ئەنقەستی بەناوی خوایان لائاسان بوو ، بەڵام هەرگیز زاتیان نە بوو سوێند بەو دروستکراوانە بخۆن کە بەگەورەیان دادەنان مەگەر بەڕاستی نەبێت ) .

_ بڵاوبوونەوەی بیدعە و خەیاڵات :

سوڵتانە یەکەمەکانی نێو دەوڵەتی عوسمانی لە بیدعە و خاوەن بیدعەکان ڕایاندە کردو دژایەتی یان دەکرد ، جا ئەو سوڵتان محمدی فاتیحە کە لە وەسەتەکەیدا بۆ ئەوانەی دوای خۆی دەڵێت ( دووربکەوە لە بیدعە و خەڵکی بیبدعە و لە وانە دووربکەرەوە کە هانت دەدەن

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ١/ ٣٧٦ ) .

لەسەری ) . بەلأم لەکۆتا چاغەکانی دەولەتی عوسمانیدا زۆر بەریشەیی بیدعەکان بلأوبوونەوە و تێکەڵ بوو بە ژیانی ژێردەستەکانی دەولەتی عوسمانی . ئەوان کەم پەرستش یان کاریان بوارێك لە بوارەکانی ژیانی لێبە دەربوو ئیدی لە مردوو ناشتن و ماتەمینی و ئاهەنگی هاوسەری و میوانداری و وەلیمە و بیدعەکانی لە دایك بوون بێت لە لای سۆفی یە لارێبوەکان . بەو جۆرە بیدعەکان لە هەموو شوێنێکدا دەبینران و خەریك بوو ژیانی خەلکی دادەگرت و نەزانەکان کاریان پێدەکرد و زاناکان پشتگیری یان دەکردن سوننەت بوو بەبیدعە و بیدعە بوو بە سوننەت [1]. و چەمکی ئایین و زانست لە مەنهەجێکی تەواو و گشتگیری هەموو بوارەکانی ژیانەوە گۆرا بۆ چەند رێورەسمێکی نامۆ و تەسکاو کە خۆیان پێوە هەلدەواسی و وایان دەزانی رێنمونی کراون . صەحیحی بوخاریش کە مەنهەجی پێغەمبەری ( ﷺ ) ی لە خۆگرتبوو گۆرا بۆ چەواشەکاری یەکی نەسکاوی نەگۆر کە لە ئەزمەکاندا دەوتراو لە جەنگەکانیشدا دەخوێندرا بۆ داوای سەرکەوتن و تێکشکاندنی دوژمن [2].

لەومومەیەدا سوننەت تەواو نامۆ بووبوو پاش ئەوەی لافاوی گەورەی بیدعەکان رایمالی و خەلك دایان خۆ هەلواسین بەو بیدعانەی لە رۆخی ئاییندان و بەراشکاوانە کەمتەرخەمی یان تێدا نەدەکرد ، لە کاتێکدا لە زۆرێك لە یاساکانی ئیسلام دا کەمتەرخەمی یان دەکرد و لە پێناویدا قوربانی یان دەدا و لەسەری رێکەوتن و وایان دەزانی خزمەتیان بە ئایین کردوە و سودیان بە موسلمانان گەیاندووە [3].

_ بلأوبوونەوەی خەیالأت : لە کۆتایی یەکانی دەولەتی عوسمانیدا خەیالأت و ئەفسانەکان بە شێوەیەکی بێوێنە لە نێو کۆمەلی موسلماناندا بلأوبوونەوە و وەك چەند راستی یەکی بە دیهێنراوی لێهات کە بەهیچ جۆرێ گفتوگۆی نەوێت . تەنها ئەوەیش نا ، بەلکوو لای زۆرێك لەوانە چەند کارێکیان لاپیرۆز بوو رەوا نەبوو سوکایەتی یان پێبکرێت نەوەك گومان بکەوێتە نێو راستی یەکەیەوە . لەو خەیالأتانەی لەئاستانە داباو بوو ئەوەبوو مزگەوتی خواجە مستەفا پاشا بەزنجیرێکی بەستراو بەدرەختێکی کۆنی چنارەوە چواردەور درا بوو ، ئەو زنجیرە خەیالأتێکی هەبوو کە نەزانەکان دەیانگواستەوە بەو شێوەی کە هەر کەس شتێکی

---

1 ) مشكلات الجيل في ضوء الآسلام ص٣٧٣ .

2 ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ٣٨٠/١ ) .

3 ) هەمان سەرچاوەی پێشوو (٤٢٨/١ ) .

ڕاستی ئینکاربکات و له ژێر ئەو درەختە دا دابنیشێت ئەوا زنجیرەکە دەکەوێت بەسەریدا ، ئەگەر لە و ئینکاری یەیشیدا ڕاستگۆ بوو ئەوا زنجیرەکە ناجولێت [1]. بەڕاستی ئوممەت لە وماوەیەدا بەتەواوەتی کەوتبوونە پەرستشی گۆڕەکان و پشت بەستن بەجگەلە خواچەندین دیاردەی هاوەڵ دانان و زیادە ڕۆیی و بیدعە و خەیالآت ڕویدا کە ژیانی ئوممەتی پڕکردبووە وە و کاتەکانی سەرقاڵ کردبوو و وزەکانی کوشتبوو و هەوڵەکانی لە ڕێگە ڕاستەکەی خۆیەوە گۆڕی بوو ، ئیدی ئوممەت نەیەتوانی لەو هەڵخلیسکانەی ڕاپەڕێتەوە و چارەسەری هۆکارەکانی کەوتنی بکات و لە بەردەم سوپاکانی دوژمندا شکستی خوارد و لە بەرگری پیلان و نەخشەکانیاندا دەستەوسان وەستا کە ئەنجامەکەی لەدەستدانی دەوڵەتی عوسمانی بوو .

**چوارەم : سۆفیەتی لادەر :**

گەورەترین لادانێك کە لە مێژووی ئوممەتی ئیسلامیدا ڕویدا بێت دەرکەوتنی سۆفیەتی دەرەوەك هێزێکی ڕێکخراوی نێو کۆمەڵگەی ئیسلامی کە چەند بیروباوەڕ و بیرۆکە و پەرستشێکی دوورر لە قورئان و سوننەتی هەڵگرتبووە ، سۆفیەتی لادەر بە هێز بوو و لە کۆتایی یەکانی سەردەمی عوسمانیدا بە هۆی چەند هۆکارێکی جۆراوجۆرە وە سام و شکۆی زیادی کرد . لەوهۆکارانە :

١- ئەو بارودۆخە خراپەی کە ئوممەتی ئیسلامی تێدا دەژیا و ئەو بارە ناخۆشەی کە موسڵمانان لە و ماوەیەدا تێیدا دەژیان لە بلآوبوونەوەی لادان و ستەم و سەرکەشی و هەژاری و نەخۆشی و نەزانی و هەموهۆکارێك وای کرد خەڵك خۆیان بدەن بە لای سۆفیەتی لادەردا کە زیاتر هەڵنەدەسابە دوورەپەرێزی لێ کردن و وریایی یان بداتێ و وایان لێبکات لە بارێك ببالەوبارەدادا بژین کە ڕایان کردووە لەدەستی .

٢- پێکدادان و نەهێشتنی ئارامی مۆرکێك بوو لە مورکەکانی کۆتا سەردەمەکان بەوەی ڕۆحەکان بە هۆکارگەلێکی بێ بایەخەوە لە ناو دەچوون . بەڵکوو هەندێ جار بە بێ هۆکار و لە و کەش و هەوا تاریك و بارو دۆخە ئاڵۆزەدا سەرۆك تەسەوفەکان ژیانێکی هێدی یان زیندو دەکردەوە کە دوور بوو لە و چەرمەسەری و ئاژاوانەی خەڵکیان لە ناو دەبرد . خەڵکی

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو (١/ ٤٣٢ ) .

هەژار زیاتر دڵخۆش و دڵئارام بوون لە لەجوتیارەکانی نێو کێڵگەکانیان و بارزرگانەکان لە شوێنی بازرگانی یەکانیان و پیشە گەران لە کارەکانیاندا بوون ، ئەوانە بەهۆی جێبەجێکردنی یاساکانە وە لە ئارامشدا بوون دووربوون لە دیاترین ماوەکانی ستەمی کاولکەران لە هەموو ئەو خراپانەدا . چونکە سەربازان دەترسان لەخراپە زیان و دەسەلاتی ڕۆحی یان و باوەڕیان هە بوو بە پەیوەندی یان بە خواوە ، بۆیە ملکە چیان دەبوون و داوای ڕەزامەندی یان لێدەکردن ، هەندێ کەیش ڕازی بوون بچنە سەر ڕێگەکە ئەمەیش پاڵنەری کەدواتر لە سایەی تایبەتمەندی یەکانیدا دڵنیایی و سەقامگیری بارو دۆخ دەیگرێتەوە ) [1].

٣- زیادەڕۆیی لە ژیانی سەرۆك دەستەکاندا ( هەژاران لەسەرو فشاری ژیانی ئەو ڕۆژەوە ، هەوڵی خۆیان دەدا بۆ کارێك کە بەهۆیەوە ژیانیان دابین بکەن ، بەڵکوو لە کونجەکاندا دەژیان و نان و پۆشاکیان لەسەر بەخششی ئەوچاکە کارو ساماندارانە بوو کە بانگەشەی یەکلای بونەوە بۆ زیکر و خۆ دابڕان بۆ شەونخونی و یەکلا بونەوە بۆ خوا یان دەکرد . لە خەندانترین دیمەنەکانی ئەو سەردەمە ئەوەیە کە ئەو دنیا نەویستانەی بانگەشەیان دەکرد بۆ دەست کورتی و ڕازی بوون بە کەمێك لە کاروباری ژیاندا زیاتر لە جوتیارو بازرگان و خاوەن پیشەکان بەرزترین و دەوڵەمەندترین ژیانیان لە جوتیارو بازرگان و خاوەن پیشەکان هە بوو [2].

٤- خۆشەویستی عوسمانی یە تورکەکان بۆ دەروێش و تەسەوف ( تورکەکان تەسەوفیان خۆش دەویست و خوازیاری پیرۆزکردنی داروەستەی ئیمان بوون بە بوونی دۆستایەتی ڕاست و دروستیان ) [3].

( سۆفیەت لە کۆمەڵگەی عەبباسیدا بلاْودەبوویەوە ، بەلاْم پایەیەکی کەنار گیر لە کۆمەڵگە بوو ، بەلاْم لەژێر سێبەری دەوڵەتی عوسمانی و لە خودی تورکیادا ، گۆڕا بۆ ئەو کۆمەڵگە و ئایینە و بە شێوەیەکی تایبەت لە دوو سەدەی کۆتاییدا ئەو قسەلۆکە سەرسورهێنەرە بلاْو

---

[1] ) التصوف في مصر ابان العصر العثماني ص ١٥٣، ١٥٤ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوول١٥٤ .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوول١٥٤ .

بویەوە کە ( هەرکەس شێخی نەبێت ، ئەوا شەیتان شێخ یەتی ! بە شێوەیەکی گشتیش لە ئاست هەمووواندا خەڵکی بەوجۆرە چوونە ناو ئایین و بواری پەیڕەوکردنی ئایینیان گۆڕا ) [1] .

زۆرێك لە سوڵتانە عوسمانی یەکان هەڵدەستان بە چاودێری سۆفیەتی و سۆز و مهریی خۆیان بەسەردا دەڕشتن . تا ئەوەی سوڵتان عبدالحمید لە بارودۆخێکی تەنگەژەدا هاتە سەر دەسەلأت کاتیّ پیلانەکان ئوممەتیان داگیرکرد بوو و کارەسات و چەرمەسەری یەکان لە هەموو لاوە گەمارۆیان دابوو . بانگەوازە نەتەوەیی یەکانیش لە هەموو ولأتەکانەوە بانگەوازی خۆیان بلأودەکردەوە ، ئەویش بانگەوازی کرد بۆ جامیعەی ئیسلامی و پەیوەندی ئایینی ، سۆفیە تیش بە هەموو دەستە وڕێگەکانی یەوە قورسایی یەکی پێکدەهێنا لە بانگەواز کردن بۆجامیعەی اسلامی .

ئەو سەردەمە ، سەردەمی سۆفی یەتێك بوو کە بەسەر جیهانی ئیسلامیدا چەسپا هەر لەخوارەوە تا سەرەوەی ، هیچ شارو گوندێك نەمابوو سۆفیەتیﻨەچووبێتە ناوەوە ، مەگەر ئەوەی بە فریا خوازی و هاوشێوەیەکیﻨەوی هەبوایە [2] .

لە و ماوەیەدا سۆفیەتی لادەر زاڵ بوو بەسەر جیهانی ئیسلامیدا و جەماوەرێکی موسڵمان کەوتنە دیلی یەوە و لە و دووسەدەیەدا دەسەلأتی سۆفی گەران زیاد بوو و گەیشتە پلەیەکی بەرز ، ئەگەر لە هێزو دەسڕەویدا نەبوایە ئەوا لە هەموو پانی و درێژی ولأتدا زاڵ بووونی خۆی بەسەر جەماوەردا بسە پاندایە بەس بوو . جا ئیدی چۆن بێت ئەگەر دەوڵەت دەستی پێوە بگرێت و فەرمانڕەواکان سەری بخەن [3] .

دیدی تەسەوفگەری لادەر ڕێزی بێکاری دەگرت و سواڵکردنی ڕەوا دەکرد و تەنگەبەری دەسازاند و هەوڵی لایەنی زەلیلی دەدا ، پێیان وابوو دەبیّ هۆکارە تەواو لادەرەکان بگیرێتەبەر ( جا ئەو بازرگانەی کاتی خۆی لە بازرگانی دا بەخەرج دەدا و جوتیاران کە هەوڵی خۆیان لە کوشتوکاڵەکانیاندا بەخەرج دەدا و پیشە گەران کە چالاکی یان لە پیشەگەری یەکاندا بە خەرج دەدا ، بێهیوا دەبوون هەر کەسیشیان بۆ ڕۆزی بەدەسخستن یان خواستێکی ماڵ سەرف یان بکردایە ئەوا شکستی دەهێنا ، چونکە ڕۆزی لەداخوازی

---

[1] ) واقعنا المعاصر ص١٥٥ .

[2] ) الآنحرافات العقدية والعلمية (١/ ٤٤٧ ) .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ( ١/ ٤٤٨ ) .

خاوەنەکەیدا بازنەیی یە کەسی ڕۆزی دراویش لە خواستی ڕۆزی یەکەیدا بە جۆشە ، بەوەستانی یەکێکیان ئەوی تریان دەجولێت .... ) .

لای زۆرێك لە سۆفی یەکان بیروباوەڕی قەزا وقەدەر تێکچووبوو و بووبووبە بیروباوەڕیکی لە خشتە بەری سیلبی ، یەك لە ڕۆژهەلأتناسە ئەلمانی یەکان کە باری موسلمانان لە کۆتا سەردەمەکاندا دەگێڕێتەوە دەلێت ( سروشتی موسلمان خۆ بەدەستەوەدانە بۆ خواستی خواو ڕازی بوون بە قەزاو قەدەری و بە هەرچی شتێکی کە هەیەتی ملی بۆ خوای تاکی بەدەسەلأت کەچ بکات . لە و گوێڕایەلی یەدا دوو شوێنەواری جیاواز هە بوو : لەسەردەمی یەکەمی ئیسلامیدا لە جەنگەکاندا ڕۆلێکی گەورەی بینی بەوەی سەرکەوتنێکی بەردەوامی بە دیدە هێنا . چونکە پالی دەنا ڕۆحی فیداکاری لە سەربازدا ، لە کۆتا سەردەمەکانیشدا هۆکارێك بوو بۆ ئەو بەستویی و ناکارایی یەی کە خۆی دا بەسەر جیهانی ئیسلامیدا و بەرەو کەوتن و نەمانی بردو دووری خستەوە لە تەیارەکانی ڕووداوە جیهانی یەکان ) [1].

ئەو پیاوە کە بێباوەڕیشە هەستی بەو ڕاستی یە کردووە : ڕاستی جیاوازی نێوان باوەڕ بەقەزا و قەدەر بە و شێوەی کە پێشینە لێی تێگەیشتوون و نێوان باوەڕێك کە دوایی یەکان بەکاریگەری یان بە سۆفی گەران دایان هێنا بوو . جا تاوان تاوانی بیروباوەڕە کە نە بوو ، بەلکوو تاوانی باوەڕدارانی بوو . شاعیری ئیسلامیش محمد اقبال بە شعرێك ئەوەی دارشتووە :

| | |
|---|---|
| من القرآن قد تركوا المساعي | و بالقرآن قد ملكوا الثريا |
| إلى التقدير ردوا كل سعي | وكان زماعهم قدرا خفيا |
| تبدلت الضمائر في إسـار | فما كرهوه صارلهم رضيا [2] |

ناپلیۆن پۆناپەرتیش ئەو بیرۆکە لادەرەی قەزاو قەدەری قۆستەوە کاتێك سوپا خاچپەرستی یەکان خاکی میسریان داگیرکرد ، ئەو بلأکراوەی بلأودەکردەوە و بیری موسلمانانی خستەوە کە کە ئەو داگیرکاری و دیلی یەی ڕویداوە بۆیان بە قەدەری خوا بووە

---

[1] ) الاسلام قوة الغد العلمية ص٧٨ .

[2] ) العلمانية _ د. سفر الحوالي ص٥١٩ .

، بۆیە ئەوەی هەوڵ بدات لە ڕووی ئەوەدا ڕابوەستێت کە ڕوویداوە وەك ئەوە وایە ڕەخنە لە قەزا و قەدەر بگرێت و لە ڕوویدا ڕابوەستێت [1] .

لە ڕاستی دا چەمکەکانی سۆفیگەری لادەر لە نیوەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا جێپێی دادەکوتا و جیهانی خاچپەرستیش لە بوارەکانی زانست و مەیدانەکانی مەعریفی دا بەرەو گرتنە بەری هۆکارەکانی هێزو پێشکەوتن و چارەسەر دەڕۆیشت و پیلان و دەسکیسە دادەنا بۆ لە ناوبردنی دەوڵەتی عوسمانی و دواتر زاڵ بوون و خۆسەپاندن بەسەر جیهانی ئیسلامیدا .

سۆفیگەرە لاڕێبووەکان کەوتنە گوێگرتن لە گاڵتەجاری مۆسیقا و فێری مۆسیقا دەبون و کۆڕەکانیان پڕبوو لە تەپڵ و نەی و دروشم و فێرکاران . زۆربەی ڕێگە لادەربوەکانیشیان بازنەکانی زیکریان خاڵی نە بوون لە دەف . تا ئەوەی ئەبو لهودای صەییادی کە لە کەسانی تایبەتی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم و لە پشتیوانانی جامیعەی ئیسلامی یە دەڵێت :

لای زۆرینەی سۆفی گەرەکان ( سەماع ) پێگەیەکی گەورەی هەبوو ، ئەبولهودای صەییادی دەڵێت ( هەرکەسێك ( سەماع ) نەیجوڵێنێت ئەوا کەموکورتەو لایداوە لەسۆزی نێوەندبوون ، دوورە لە ڕۆشنایی ڕۆحانی یەت و ڕۆچووەنە لێو مۆرکی توند تیژ وتوڕەیی ، بەڵکوو لە بێ گیان و باڵندە گیانداران زیاتر دڵڕەقترو بێ هەست ، چونکە هەموویان بە ئاوازە کێشی یەکان کاریگەر دەبن ، .... بەگشتی سەماع لە دڵدا بارێك بەرهەم دەهێنێت کە بە ( وەجد ) ناودەبرێت ، وەجدیش بزوانی لایەکان بەرهەم دێنێت ، یان بە جوڵەیەکی بێ کێش کە بە پێکدادان ناو دەبرێت یان بە جوڵەیەکی کێشدار کە بە چەپڵە و سەما ناودەبرێت .

خۆزگە ئەو سۆفی گەرانە تەنها خوویان بە ئامێری ژەندن و گۆرانی یەوە بگرتایە ، بەڵام ئەوان ئەوەیان کردە هۆی نزیکربوونەوەی خوا و بە گوێڕایەڵی یەکی خوایان دادەنا کە دڵەکان پێی نەرم و ڕۆحەکان پێی پاراو دەبن . چەند ئەوە جوانە کە زانای ( حافظ ) ئیبن قەییمی جەوزی لە بارەی ئەو سۆفیگەرانەوە دەڵێت ( ئەگەر لە کاتی مۆسیقا ژەنین دا دەنگیان بێدەنگ دەبێت و جوڵەیان هێور دەبێتەوە و دڵیان بە تەواوی حووی پێوەگردەیْ و بەیەکجاری دەدن بە لایدا و وەك شەیدایی سەرخۆشان لێ دێ لە جوڵە و سەمادەبڕێن ، ئایا دیوتە ژنانی و نامەردان و سەرخۆشان بشکێن ؟ ئەوەیشیان شیاوە . شەرابی دەروونەکان

---

[1] ) الآنحرافات العقدية والعلمية (٤٦٧/١ ) .

تێکەڵ بوون و گەورەترین شت تیایدا ڕووی دەدا کە دەیکات بۆ کەسیٚ جگەلە خوا ، بەڵکوو بۆ شەیتان ، دڵانێك کە لێرەدا تێکدەشڵەژێن و جلانێك لە جگە لە گوێڕایەڵی خوادا دەبەخشن تا ئەوەی سەرخۆشیی کاری خۆی دەکات و شەیتان ئارامیش و هیوای خۆی تێدا دەدۆزێتەوە و بە دەنگ و فێڵی خۆی هەڵیان دەخەڵەتێنیٚ و بەپیٚ و سواری خۆی ڕای کێشان و لە دڵیاندا پێی داکوتا وبەتوندی دەیاندات بەزەویدا ، هەمان کات بەدەوری بازنەیەکدا دەیانکاتە وەك وشتر و جارانێکیش وەك مێش لە نێوەندی ماڵدا سەما دەکەن . دەی ڕەحمەت لە سەقف و زەوی کە پێیان بشکێنن . شەرمەزاریش بۆ هاوشێوەکانی وشتر و ئاژەڵ . جنێویش شیاوی دوژمنانی ئیسلامە ، ئەوانەی بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەوان تایبەتمەندانی ئیسلامن و ژیانیان لە چێژو ڕابواردندا بەسەر دەبەن و ئایینە کەیان کردوەتە ئارەزوبازی و گاڵتەجاری ، دەنگی دەهۆڵی شەیتان لە لایەن خۆشترە لە گوێگرتن لە سورەتەکانی قورئان ، ئەگەر یەکێکیان لەسەرەتای قورئانەوە تاکۆتایی یەکەی ببیستێت هیچ ناجوڵێت و بێزاری دانیشتن نی یە و هیچ کارێکی تێناکات و هەستی شەیدابوونی خوای بۆ پەیدا نابیٚ ، تاکوو ئەگەر قورئانی شەیتانی بەسەردا بخوێنرێت و گوێی لە خورپەی دەنگەکەی بێت . پلمەکانی شەیدایی نێو دڵی لەسەر هەردوو چاوی دەتەقنەوە و لەسەر پێکانی سەما دەکات و لەسەر دەستەکانی چەپڵە دەکوتێت و لەسەر هەموو بەشەکانی لەشی دەلەرێتەوە و دەبزوێت و لەسەر هەناسەکانی هەناسە تەنگ دەبێت و ئاگری شەیدایی لیٚ دادەگرسێت شاعیریش جوان دەڵێت [1] .

بەمجۆرە ژیانی سۆفیگەرە لارێبووەکان بووە گاڵتەو گەپ و ڕیسوایی وکات و تەمەنیان لە کۆڕەکانی زیکر و بیستن و گاڵتەجاریدا بە فیڕۆ دەداو ژیانیان وای لێهات لەسەرەتایەوە تاکوو کۆتایی یەکەیدەسوڕایەوە بە دەوری زیکردا ئەویش لە شێوە لاربووەکەیدا و پەرستشی نێو هەوڵی سەختی یەکانی دنیا و داوای ڕۆزی و جیهاد و زانست و بڵاوکردنەوەی زانست و فرمانی بە چاکە و نەهی لە خراپە نەمان ، ئەوانە هەموویان کارگەلێك بوون کە لە زیکر سەرقاڵیان دەکردیت و ڕیٚی لێدەگرتی . پاشان لەسەر موسڵمانان پێویست بوو سەرقاڵ نەبن بەوانەوە و ژیانیان بە زیکر بەرنە سەر کە گوێگرتن لە گۆرانی و سەما کردنە .

---

[1] ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ٥٠٦/١ ) .

پیرۆزکردنی کەسە مردوو و زیندووەکانی سۆفیگەرەکان چووە نێو جیهانی سۆفیگەری لارێبووە وە و نازناوی سەرو توانست و کەرامەتیان دایە پاڵیان و لە ئەفسانەو ژیانی خەڵکدا دەژیان و خەڵکی توشی وەهن و بێتوانای و داکەوتن بوون و پێناسی لاساری و کەوتن بڵاوبویەوە ، ئەوروپای خاچپەرستیش بەردەوام لە بەرزبونەوەی باشترین شارستانی یەتی ماددی دا بوو و سوپاکانی ئامادەبوون تا بکێشن بەرەو جیهانی ئیسلامی کە ئەوکات رۆچووبوویە نێو دنیای خەیاڵ و ئەفسانەکانی پشت بەستوو بەسەروتوانست و کەرامەتەوە.

لەو کاتەدا کە ئوممەت بەتوندی بەدەست لاوازی و کەوتنەوە دەیناڵاند و پیلانەکانی دوژمنان گەمارۆی دابوون و دەسکیسەکان چاویان تێبڕیبوو ، زۆرێك لە زاناکان بە خواستی شێخەکانی نێو سۆفیگەری لادەر ڕازی بوون ، ئەوانەی گیانی زەلیلی و سەرشۆڕی نێو ئوممەت و خۆبەدەستەوە دانیان بڵاوکردەوە لەگەڵ چەندین نەخۆشی تری لادەردا . زۆرێك لە ڕیگە لادەربووە سۆفی یەکان جیهادی بەگژدا چوونی دوژمنانیان واز لێهێنابوو و لە نەریتی خەڵکدا ئەولیاکان بوون بە ڕاکێشەرو سەرپەرشت کەرو شێتوکە کەر . گومانیش نی یە لە نێوانیاندا چەندین دەجال و فێڵباز هەبوون کە ئەو ڕاکێشەری یە دەرونی یەی خەڵکیان لە پایەیەکی پیرۆزەوە بەهەند وەرگرت و دەستیان خستە ڕیزەکانیانەوە تاکوو دەست بخەنە پەیوەندی ئەولیاکانەوە ئەوانەی کە لۆمەو سەرزەنشتیان لەسەر نی یە ، هەرچەندە توشی گوناهە گەورەکانیش بووبن و داوێن پیسی و خراپەیان بە ئاشکرا کردبێت . زۆرێك لەوانەیش لەگەڵ جنۆکەدا هەڵسوکەوتیان هە بوو . ئیدی ئاسایی بوو تیرەکانی دوژمن کاری خۆیان بکەن و نەخشەکانیان سەربگرێت و سوپاکانیان خاکمان داگیر بکەن و نیشتمانمان بکەوێتە بەردەستیان . سۆفی یەکان دەریایەکی پڕلە بیروباوەڕە لادەربوو و گومڕایی یانەکانیان گرتە بەر ، پێدەچێ کۆتا بیروباوەڕێك کە زۆرێك لە سۆفیگەرە لارێبووەکان باوەڕیان پێهێنابێ . بیروباوەڕی یەکبونی بوون و حلول بووبێ ، سۆفیگەرە لادەرەبووەکان ئەو بیروباوەڕانەیان گرتە خۆ و کەوتنە بڵاکردنەوەی و لە پێناویدا چەندین نوسراویان نوسی و بەڕاستی یەکیان دادەنا کە نهێنی یەکەیان بۆدەرکەوتووە و لە خەڵکی تر شاراوەتەوە .

خوێندنی دوو کتێبی ( فصوص الحکم ) و ( الفتوحات المکیة ) ی ئیبن عەرەبی و ئەو کتێبانەی تری سۆفیگەرەکان کە بیروباوەڕی ( وحدة الوجود والحلول ) ی دەگرتەوە ، دروشمی گەورەی زاناکانی نێو سۆفیگەرایی و ئەوانی تر بوو ، ئەوەیش ئەو پێگە زانستی

یەیەکە کەس پێی ناگات جگە لە تایبەتمەندانی خۆیان ئەو ئاستە زانستی یەیشە کە جگە لە زاناکان کەس پێی ناگات [1].

ئەو بیروباوەڕە لادەربوانە هەرمێنێکی ( رواج ) فراوانی نێو سۆفیگەرە لادەربووەکانی گرتەوە لەو ماوە ناکاوەدا کە ئوممەتی ئیسلامی پێیدا تێدەپەڕی . زۆرێکیان بڕوایان بە بیروباوەڕی یەکبونی بوون هەبوو کە لە سایەیدا ژیان خراپ و گەندەڵ نەدەبوو و هەموو جیهانی دەگرتەوە و هەموو ئایینەکانی تری پووچەڵ دەرکردەوە ، ئیدی هیچ ئایین و جیهاد و دژایەتی یەکی نێوان موسڵمان و بێباوەڕی جودا نەدەکردەوە و ، هەموان یەك بوون و بوونیش یەکە ، ئەگەر چی دیاردەکانیش فرە جۆرن . داوای سەلامەتی نێو ئایین لە خوا دەکەین . ئەوان کەوتبوونە شاردنەوەیەکی زۆری دروشمەکان ئەرکەکانیان لادەبردن یان نەیان دەهێشت سوکایەتی یان دەرکرد بە فرمان و نەهی یەکانی ئایین لە ژێرناونیشانی ویلایەت و حیزب و ڕاکێشان و. بەڕاستیش واقیعی سۆفیگەری بەڵگەیەکی بەهێز بوو کە بزوتنەوەکانی بە ڕۆژئاوایی کردن کردیانە بەڵگەی دەستیان . ئەوانەی دەوڵەتی عوسمانی یان دارماند .

پێنجەم : چالاکی دەستە لادەربووەکان :

وەك قادیانی و بە هائی و دەستە و تاقمەکانی ترکە لەسەر ئیسلام حسابدەکران . بەڕاستی ئەو دەسەڵات و تاقمانە کاروباریان گرنگ بوو بەتایبەت لەگەڵ هاتنی ئەو ئیستعمارە خاچپەرستی یەی کە ئوممەتی ئیسلامی گەمارۆ دا بوو ، ئەوان هەمیشە لەسەر نەریتی خۆیان بوو بوونە یارمەتی دەری دوژمنانی ئیسلام و سەربازێکی دڵسۆزی ژێر سەرکردایەتی یان .

لەڕابوردودا گەورەترین یاریدەدەری تەتار و خاچپەرستەکان بوون دژ بە موسڵمانان . ئەوەتا هەمووی لەسەر هەمان مەنهەجی ناپاکی و پیلان گێڕانی خۆیانن لەسەر حیسابی دوژمنانی ئوممەت . لەم کتێبەیشدا ڕۆڵی سەفەوی یەتی( اثنا عشري ) دەبینین لە دژایەتی کردنی دەوڵەتی عوسمانی دا بە تێپەڕبوونی سەردەمەکان ، کاتێکیش فەرەنسی یەکان سوریایان داگیرکرد و بزوتنەوە جیهادی یەکان لە دژی هەستان ، ئەندامانی هەندێ لە

---

[1] ) الآنحرافات العقدية والعلمية ( ٥٥٦/١ ) .

دەستەو تاقمە گومڕاکان دەست بە دەست لەگەڵ فەڕەنسی یەکاندا دەجەنگان وەك ئەوەی لەگەڵ موجاهید ( ابراهیم هنانو ) و موجاهیدە هاودەمەکانیدا کردیان [1].

ئەمیر بەشیری شەهابی کۆچکردووی ساڵی ١٢٦٦ ك لە کاتی داگیرکردنی شام دا بەسەربازەکانی یەوە لەپاڵ سوپای محمد عەلیدا وەستا کە بوویە هۆی ئاسانکردنی شکستپێهێنانی سوپای عوسمانی بۆ محمد عەلی لە حمیص دا بە درێژایی شاخەکانی تۆرۆس و سوپاکانی لە نێوەندی وولاتی تورکدا داکەوتن . لەکاتی داگیرکاری فەڕەنسی یەکان بۆ عەککا چەند هاتوچۆیەکی پەیوەندی هەبوون لە نێوان ناپلیۆن و دەستەی شەهابیدا [2].

بە هائی یەکان لە ساڵی ١٢٦٠ ك / ١٨٤٤ز لە ژێرچاودێری ئیستعماری ڕوسی و جولەکەی جیهانی و ئیستعماری ئینگلیزیدا بە ئامانجی گەندەڵ کردنی بیروباوەڕی ئیسلامی و تێکدانی یەکڕیزی موسڵمانان و گێڕانەوە یان لە باس و خواسە سەرەکی یەکان گەشەیان سەند ، بەهاء بانگەشەی مەهدی بوون و دواتر پێغەمبەرایەتی و دواتر خوایەتی و پەروەردگاریەتی دەکرد [3].

لە ڕاستی دا ئەوەی جێی داخە بریتی یە لە گوێ نەدانی دەوڵەتی عوسمانی بە لەناو بردنی ئەو ڕەگەزە پیسەداو جێبەجێکردنی حوکم و شەرعی خوا بەسەر هاوشێوەی ئەوانەدا . قاد یانی ڕەگەزێکن کە دەدرێنەوە پاڵ ( غولام ئەحمەدی قادیانی ) دەدرێتەوە پاڵ گوندی قادیان لە هەرێمی بنجاب لە هیند ( کۆچکردووی ساڵی ١٣٢٦ك ) کە بریتی یە لە ( بزوتنەوەیەك کە بە پلانێکی ئیستعماری ئینگایزی لە کیشوەری هیندیدا گەشەی سەند بەمەبەستی دوور خستنەوەی موسڵمانان لە ئایینەکەیان و لە جیهاد بە شێوەیەکی تایبەتی گەشەی سەند تاکوو بەناوی ئیسلامەوە بەرەو ڕووی ئیستعمار گەر نەبنەوە ) [4].

قادیانی بانگەوازی پێغەمبەرایەتی و دواتر خوایەتی دەکرد ، لە دیارترین ڕوانگەکانی ( غولام ئەحمەدی قادیانی ) ( ئارەزوومەندی بووە بۆ ئینگایز و خزمەتکردنی ئامانجەکانیان

---

[1] ) الأعلام ( ٤٢/١ ) .

[2] ) الأنحرافات العقدية والعلمية (٥٧٧/١) .

[3] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو (٥٨٩/١ ) .

[4] ) الموسوعة الميسرة للأديان ص٣٨٩ .

لـه وولاتـی هینـد و پوچـەڵ کردنـەوەی بیروبـاوەڕی جیهـادی بۆیـان و سـوپاس کردنیـان و سوربونی شوێنکەوتوانی لەسەر خستنی ئینگلیز لە هەموو شوێنێکدا ....) [1].

قادیـانی دەڵێـت ( لای مـن دروسـت نـی یـە ژێـر دەسـتەکانی هینـد ڕێـی موسـڵمانە سەرکەشەکان بگرن و شمشێرەکانیان لە ڕووی ئەو دەوڵەتە چاکەدا هەڵگرن ، یان لەم کارەدا کەسێك دەست نیشان بکەن . و لەسەر شتێك بەقسە یان کردار یان ئامـاژە یـان مـاڵ وسـامان یان بیرکردنەوە گەندەڵی یـەکان یـەکێك لـە لادەران دەسـت نیشـان بکرێـت ، بەڵکوو ئەوانـە بە یەکجارەکی حەرامن . هەرکەسیش ئەوەی بوێت ئەوا لـە خـوا و پێغەمبەرەکـەی یـاخی بـووە و بە ڕوونی گومڕا بووە ) [2].

بەڕاسـتی ئـەو دەسـتە و تاقمانـە سەرچـاوەیەکی شـێواندن و نانـەوەی ڕاڕایـی و ئـاژاوە و ڕوودانـی گیرەشـێوێنی بـوون لـەنێو خـۆی دەوڵـەتی عوسمـانی وتەنانـەت لـە کۆبونـەوەکانی موسڵمانان لـە هینـد و شـوێنەکانی تریشدا . ئـەو دەسـتە و تاقمانـەیش بێزارنـە دەبوون لـە پـیلان گێـڕی بـەردەوامیان لەگـەڵ دوژمنـانی ئیـسلام و ناپـاکی کـردن لـە موسـڵمانان لـە ناکـاوترین کاتـەکان و ناسـکترین بارودۆخەکانـدا ، ئوممـەت دوچاری خراپـە و زیـانی ئـەو دەسـتەو تاقمانـە بووبـوو کاتێـك بیروبـاوەڕی ئـەهلی سـوننە لـە کیـانی دەوڵـەتی سـوفنە و دەروونی ژێردەستەکانی ئەهلی سوننەدا لاواز بوو بوو .

**شەشەم : ئامادە نەبوونی سەرکردایەتی لە خواترس :**

سـەرکردایەتی لـە خـواترس هۆکارێکـە بـۆ ڕاپـەڕین و دەسـتەڵاتداری ئوممەتـە ، چونکە سەرکردەکانی ئوممـەت کرۆکـی ژیـان و وەك سـەری جەسـتی ئوممەتن ، جا ئەگـەر سـەرکردە چاك بـوو ئوممـەتیش چاکە ئەگـەریش سـەرکردە خـراپ بوو ، ئـەو خراپەیـە لـە ئوممەتیشدا ڕوودەدات ، بەڕاسـتی دوژمنـانی ئیـسلام هەسـتیان بـە گرنگـی سـەرکردایەتی لـە خـواترس دەکرد لـە نێـو ئوممەتـدا ، بۆیـە بەتـەواوەتی سور بوون لەسـەر ئـەوەی سـەرکردایەتی یـە لـە خواترسەکان کاروبارە گرنگەکان و حوکمە دیارەکانی نێو ئوممەتی ئیسلامی نەگرنـە دەست . وەك لە پلانەکەی لویسی نۆیەمدا وەسیەتی بەوە کردووە کە ( دەستەڵاتدار نەبوونی وولاتـە

---

[1] ) عقيدة ختم النبوة ص٢٠٩ .

[2] ) عقيدة ختم النبوة بالنبوة المحدية ص٢٥٥ .

ئیسلامی و عەرەبی یەکان تا فەرمانڕەوایەکی باش حوکمیان نەکات ) . هەروەك وەسیەتی کردووە بە ( کارکردن بۆ گەندەڵ کردنی ڕێکخستنەکانی فەرمانڕەوایی لە وڵاتە ئیسلامی یەکاندا لە ڕێگەی ڕەشوە و گەندەڵی و ئافرەتەوە تاکوو جەماوەر دابڕێت لەسەرەوە )[١] . سەرکردەی ڕۆژهەڵاتناسی بەریتانی ( مونتجومری وات ) لە ( ڕۆژنامەی تایمزی لەندەنی دا ) بە ئاشکرا دەڵێت : ( ئەگەر سەرکردەیەکی لەبار هەبێت کە بەقسەی لەبار لە مەڕ ئیسلامەوە قسە بکات ، ئەوا پێدەچوو ئەو ئایینە جارێکی تر وەك یەکێك لە هێزە گەورە سیاسی یەکانی نێو جیهان دەردەکەوێتەوە )[٢] .

ڕۆژهەڵاتناسی صەهیۆنی ( برنات لویس ) لە ژێر ناونیشانی ( گەڕانەوەی ئیسلام ) لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لە ساڵی ١٩٧٦ زدا بڵاوی کردەوە ، دەڵێت : ( ئامادەنەبوونی سەرکردایەتی ڕۆشتنبیریسەرکردایەتی یەك کە بکەوێتە خزمەتکردنی ئیسلام بەو جۆرەی کە زانستی ئەمڕۆ داوای دەکات ، ئامادە نەبوونی ئەو سەرکردایەتی یەی بزوتنەوەی ئیسلامی هێزێکی سەرکەوتوو کۆت دەکات و ڕێگری نە بوونی ئەو سەرکردایەتی یانەی بزوتنەوە ئیسلامی یەکان دەکات تا نەبێتە ڕکەبەرێکی مەترسیداری سەر دەسەڵاتی جیهانی ئیسلامی ، بەڵام ئەو بزوتنەوانە دەکرێت بگۆڕدرێن بۆ هێزی لەباری سیاسی ئەگەر بێت و ئەو جۆری سەرکردایەتی یەیان بۆ ئامادە بکرێت )[٣] .

لێکۆڵەری مێژووی دەوڵەتی عوسمانی دەبینێت کە لەسەردەمە یەکەمەکانیدا و بەتایبەت لە کاتی فەتحی قوستەتینیەدا سەرکردایەتی لە خوا ترس هەبوون . جا لە بواری جیهادی و شارستانی دا سەرکردە لە خواترسەکان دەبینین و ڕەچاوی سیفەتە هاوبەشەکانی نێوانیان دەکەین ، وەك سەلامەتی بیروباوەڕ و زانستی شەرعی و متمانە بوون بە خوا و پێشەنگی و ڕاسیت گۆیی و لێهاتوویی و دلێری و پیاوەتی و دونیا نەپەرستی و خۆشەویستی بۆ قوربانی دان و چاك هەڵبژاردنی یاریدەدەرەکان و نەوازش و قوربانی دان قبوڵ کردن و لەسەرخۆیی و خۆڕاگری و ورەبەرزی و تایبەتمەندی ڕۆح سوکی و ڕوخۆشی و دلێری و

[1] ) قادة الغرب يقولون ص٦٣ .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٥ .

[3] ) التمكين للآمة الآسلامية ص١٨٥ .

خواستی بەهێزو دادپەروەری و ڕێزی هاوبەرانبەرو توانای چارەسەری کێشەکان و وانە ووتنەوە و ئامادە سازی سەرکردایەتی و سیفەتی تریش .

بەڕاستی محمدی فاتیح لەسەردەمی خۆیدا وەك سەرکردەیەکی یەکی لە خواترس سەرکردایەتی ئوممەتی دەکردو ئیمان لە دڵ و دەماریداهاتوو چۆی دەکرد و بەرهەمەکانی لە جەستەیدا ڕەنگیان دابوویەوە و لە هەستان و دانیشتنیدا سیفەتەکانی لە خواترسان هەڵدەقوڵان و گەل و دەوڵەتەکەیشی بەرەو چەند ئامانجێکی دیاری کراوی پلان بۆ دانراوی نە گۆڕ دەبرد ، سەرکردە لە خواترسەکان خودی دڵی سەرکردایەتی و عەقڵی بیریاری دەوڵەتن ، بۆیە ئوممەت و دەوڵەتی عوسمانیش لەسەرچاوڕوونی و ڕێنمونی و زانست دەڕۆیشتن [1].

بەڵام لە کۆتا سەردەمەکاندا لێکۆڵەر لادانێکی پڕ مەترسی نێو سەرکردایەتی عوسمانی دەبینێت لە ئاستی سەربازی و زانستی دا . بۆ نمونە مەدحەت پاشای ماسۆنی گەیشتە پایەی صەدری گەورە و زانا و فیقە ناسەکان محمد عەلی پاشایان کردەوالی میسر پیاو سەری سوڕ دەمێنێت زانایان چۆن پیاوێکی وەك ( محمد عەلی پاشا ) یان هەڵبژارد تاکوو کاروباریان بگرێتە دەست ئەو زانایانە چۆن سوربون لەسەر ئەوەی ئەو کەسە فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست ،هەرکامیان لەوان زۆر باشتر بوو لە کەسێکی سەربازی نەزانی سەرکەش کە ببێتە والی ، وا دەردەکەوێت زانایان متمانەی نێو زانستەکەیان لە دەست دابێت و سامی دابەزینە نێو مەیدان و گرتنە ئەستۆی بەرپرسیارێتی یە گەورەکانیان نەمابێت ، چونکە ئەوانە پایەیان بۆ بازنە زانستی یەکان دادەڕشت و کتێبیان دادەنا و نەیان دەتوانی جگە لەوکارە هەستن بە ئەرك و بەرپسیارێتی یەکانی تر .

لەو بارو دۆخە دڵتەزێنەی کە لە نێوان زاناکاندا ڕووی دەدا ، ڕوودانی کێبەرکێ و کینەی نێوانیان و پشت بەستنی هەندێکیانبوو بە فەرمانڕەواکان و داوای دژایەتی دەسەڵات بوو بۆ سەر ئەوانی تر ، هەرکات ئەوە ڕویدا ئەوا هەل بۆ سەرکەشەکان هەڵدەکەوێت تاگورزە پڕ ئازارەکانیان بوەشێنن بۆ تێکشکاندنی ڕیزی زانایان . وەك ئەو ناکۆکی یەی لە نێوان ( شێخ عبداللە شەڕقاوی ) شێخی ئەزهەرو هەندێ لە شێخەکانی تردا ڕوویدا کە بەدوای ئەو ناکۆکی یەدا دەرچوونی فەرمانەکەی محمد عەلی پاشای لێکەوتەوە لەڕووی شێخی شەڕقاوی دا کە فەرمانی پێکرد بچێتەوە ماڵی خۆی تەنانەت بۆ نوێژی هەینیش نەچێتە دەر . هۆکاری

---

[1] ) فقة النصرو والتمكين في القرآن الكريم ص٣٢٨ .

ئەمەیش وەك جبرتی دەڵێت : ( چەند بوارو کینەو کێبەرکێ یەکی نێوان ئەو و براکانی بوو ، بۆیە پاشا لێیان هەڵتۆقی و ئەوەی پێکرد کە باس کرا . کارەکە وای لێهات و ئەویش هیچ سەرخەرێکی بەدی نەدەکرد بۆیە و بوارەکەی پشت گوێ خست ) [1].

شێخ مستەفا سەبری باری ئەو زانایانەمان بۆ وەسف دەکات کە لە کاروباری فەرمانڕەوایی و ئامۆژگاری کردنی فەرمانڕەواکان دوورکەوتبونەوە وهاوکات ڕوانین عەلمانی یەکان بۆ زانایان چی یە کە دەڵێن : ( ئەوانەی لە وڵاتەکانماندا ئایینیان لەسیاسەت ڕاماڵی ئەوانە خۆیان و براکانیان سەرقاڵبونی زانایانی ئایین یان بە سیاسەتەوە بەڕەوا نەدەبینی بەو بەڵگەیەی ئەوە شیاوی ئەوان نی یە ڕێزیان کەم دەکاتەوە . ( ئامنجیشیان سنورداركردن و گەمارۆدانی سیاسەت بوو بۆ خۆیان و فێڵ کردن لە زانایان بە دابەزاندنیان بۆ پلەی بێ دەسەڵاتی . ئەوان دەستی زانایانیان ماچ دەکرد و وایان بۆ نیشان دەدان کە ئەوانە زانایان لە لایان ڕێزدارن پاشان چی یان بویستایە بۆ ئایین و دونیای خەڵك ، دەیانرکردو لە و ئیحتماله ڕزگاریان دەبوو کە فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە لە کوێوە لە لای زانایانەوە دێت مەگەر لەسەرزمان و لە دوورە وە یان لەدڵدا خۆی مەلاس بدایە ئەوەیش لاوازترینی ئیمانە .

زانا دوورە پەرێزەکان لە سیاسەت ، وەك ئەوەی لەگەڵ هەموو سیاسەتمەدارە چاك و ستەمکارەکاندا یەکڕا بووبن کە کاروبار بەدەستی ئەوانەوە بێت و موچەی بەخشش و ڕێزگرتنیان لە لایەن ئەوانەوە هەبێت هەروەك خەلیفەیەکی لە دەسەڵات و هەموو دەسترەوێکی سیاسی لابرد ..... ) [2].

بەڕاستی زانایان لە کۆتایی یەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا بوونە دنیا ویستی یەکجاری و شوێن ئارەزوەکانیان کەوتن و کەوتنەلاوازی لە هەستان یان بە کارەکانیان . بەمە بوونە پیشەنگێکی خراپ بۆ ئەو جەماوەرەی کە لە نزیکەوە چاودێریان دەکردن و چاویان لێ زیت دەکردنەوە ، زۆرێکیشیان لەخۆشگوزەرانی دونیادا خنکان و تێیدا ڕۆچوون و زمانیان بەبێ شمشێر یان قامچی یەك داخرا . بەڵکوو بە دیاری پێبەخشینیان لەلایەن پاشا و

---

[1] ) عجائب الآثار ص ( ٣/ ١٣٤ ) .

[2] ) الاتجاهات الوطنية في الأدب المعاصر (٨٤/٢ ) .

فەرمانڕەواکانەوە و دانانیان لە پایە بەرزە خاوەن پلە نایابەکان و تایبە تمەندی یە گەورەکان کە ئەمانەزامنی بێدەنگ کردنیان و کپ کردنەوەی شۆڕش و ڕەخنەکانیان بوو [1].

( بەڕاستی زانایانی ئایین هەمیشە لە مێژووی ئەم ئوممەتەدا سەرکردەو ئاڕاستە کەری ئوممەت بون، هەروەها ئەگەر بارێك لە کاتی ترس و سامدا گرتبنی یەوە ئەوان پەناگەو جێ پەنای ئوممەت بون خەڵکی چوونەتەلای ئەوا تاکوو زانستی ئایینی یان لێوەر بگرێن و لەکارە گرنگەکاندا ڕاوێژیان پێبکەن و ئەگەر ستەمێکی فەرمانڕەوا و والی یەکان ڕوویدابێت لە ڕویاندا ئەوا دەچونە لای زانایان تاکوو هەوڵی لابردنی ستەم بدەن لەسەریان بە بیرخستنەوەی ئەوفەرمانڕەوا و والی یانە بە خوای خۆیان و فەرمان پێکردنیان بە چاکە و نەهی کردنیان لە خراپە . هەندێ جار زانایان لەلایەن سوڵتانەکانەوە ئازار دەدران و دەخرانە بەندیخانە وبە جەستەو ماڵ ئازار دەدران ، بەلأم ئەوان خۆڕاگرن بوون وەك ڕێزگرتنی بەرپرسیارێتی یان لەبەردەم خوادا .

هەروەك زانایان لە کاروبارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕۆحی یەکاندا سەرکردەو ڕێبەری ئوممەتن ، هەروەها ئەوان هەرکات دژایەتی یەك ڕوبدات بۆ ئوممەت ، دەبنە بانگخوازی ئوممەت بۆ جیهادو بیری خواو ڕۆژی دوایی و ئەو بەهەشتەیان دەخەنەوە کە موجاهیدە ڕاستگۆکان چاوەڕێی دەکەن و خۆیان لە جیهاددا بەشداری دەکەن ، بەڵکوو لە هەندێ کاتدا خۆیان سەرکردایەتی سوپا دەکەن .

ئەمە گرنگی و ئەرکی زانایانی ئایین بوو ، ئایینیش لە دەروونیاندا زیندووە ... لە مێژوویشدا چەندین نمونە هەیە کە خوای خۆیان ڕازی کردووە و ئەرکی خۆیان جێبەجێ کردووە و بەوپەڕی ڕاستی یەوە جیهادی ڕێی خوایان کردووە هەرچی یەکیش لە ڕێی خوادا توشیان بووبێت ، خۆیان ڕاگرتووە . بۆیە لاواز و بێدەسەلأت نەبوون ، ئەی لەو ماوەیەدا کە ئێمە لە مێژوودا بەدوایدا دەگەڕێێن کوان ؟

ئایا لە شوێن ئەو سەرکردایەتی یەدان کە ئوممەت بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ پەیوەندی پێوە کردوون ، ئایا ئەوانە پارێزەری ئوممەت بوون ، لە دوژمن و لەو ستەمەی کە لەلایەن سوڵتانەوە لێیان دەکرا !

---

[1] ) الآنحرافات العقدية والعلمية (١/٦٠٥ ) .

ئایا ئەوانە بوون کەداوای مافەسیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری یەکانی ئوممەتیان دەکرد ؟ ئایا ئەوانەن کە فەرمان بە چاکە و نەهی لە خراپە دەکەن و لەبەردەم پێشەوای ستەمکاردا ڕادەوەستن و فەرمانی پێدەکەن و نەهی لێدەکەن ، ئیدی بیان کوژێت یان نەیان کوژێت ؟ یا خود زۆرێکیان خۆیان کردبووە بەندەی سوڵتان و بەڕێڕەوی ئەودا دەچوون و ماستاو چێتی یان بۆ دەکردن و ستەمەکانیان بە پیرۆز دادەنا و لەسەرکەشی و لادەریدا بەردەوام بوون ، لە کاتێکدا زانا چاکەکانی تریان لەماڵەکانیاندا کەناریان گرت یان لە وانەو کتێبدا ڕۆچوون وایان دەزانی ئەگەر زانست بەخەڵکدا بڵێنەوە ئەوا ئەرك و گرنگی یەکەی تەواو بووە . نامانەوێت ستەمیان لێبەکەین ، بێگومان تیایاندا هە بووە وشەی ڕاستی دەربڕێ ، یان کاتێك هەستی بکردایە دەکرێتە کۆیلەی سوڵتان یان لە وشەی حەق ڕێگری لیْ دەکات ، پلەو پایەی دەخستە ژێر پێکانی ، بەڵام ئەوانە کەمینە یەکی کەم بوون لە نێو زۆرینەیەکی زاڵدا کە لەپشت خۆشی یەکی دنیایی دا دەمیان داچەقاند بوو . یان لە نێو وانە و کتێبدا خۆیان کەنار دا بوو بەو کەمتەرخەمیەوە کە تیایاندا بوو ... ) [1] .

ئاساییش بوو کە لەو ماوەیەدا زانستە ئایینی یەکان توشی بەستوی وناکارایی بن ، لە ئەنجامی چەند هۆکارێك کە بە پێی سەدە یەك بەدوای یەك هاتوەکاندا کاریگەری خۆیان نواند ، لە و هۆکارانەیش بریتین لە :

١- گرنگی دان بە کورتکردنەوەکان :

هەندێ لە زاناکان هەستان بە کورتکردنەوەی دانراوە دووروودرێژەکان لە پێنا و ئاسانکردنی لەبەرکردنی بۆ زانست خوازان کاتێك کە لەبەرکردن بوو بە ئامانج لەلای زانست خوازو زانایان کاتێك توانستی تێگەشتن و لێدەرهێنان ( ئیستنباط ) لەلایان لاواز بوو ( ئیدی فیقەناسان قسەکانی پێش خۆیان نەقڵ دەکرت و دانراوەکانیان لە چەند دەقێکی کورت و پوختدا کورت دەکردەوە و ئەو قسانەیان بە تەنها و بە بیْ بەڵگەکانی قورئان و سوننەت وەردەگرت و بەو هێندە بۆ هاوەڵانیان دەوەستان [2] و وازیان دەهێنا ) .

شێخ عبدالحمیدی کوڕی بادیس بەڕەخنەگرتن لەڕێگەی وانە ووتنەوەی فیقە دەڵێت : ( بەبیْ ڕوانین خوێندنی لقە فیقهی یەکانمان بە موجەڕەدی کورت دەکردەوە و وشك و بیْ حیکمەت

---

[1] ) واقعنا المعاصر ص٣٢٧ .

[2] ) المحتمع الآسلامی المعاصر ص٥٦ .

دەبوون و لەودیو شورای نێو دەربڕینە کورتەکانەوە پێش گەیشتن بە بیناکان لەناو دەچوون)[1].

پێشەوا شەوکانی باسی گرنگی دانی خەڵکی ئەو سەردەمە دەکات بەو کورتکراوانە و ئەو مەترسی یانەی کە لێی دەکەوتنەوە و دەڵێت ( بەڕاستی ئامانجی مەبەستی زانستیان کردبووە کورتەیەکی ئەو کورتکردنەوە فیقهی یانەی کە زانستی ڕاو گێڕانەوە و ڕای زاڵ تریان پێکهێنابوو ، جگە لەوەیش هیچ گرنگی یەکیان نەدەدا بە هیچ جۆرە زانستێکی تر ، بۆیە بوونە بێئاگا ونەشارەزای قورئان وسوننەت و فێری نەزانی یەکی تەواوبوون ، چونکە ئەوە لای ئەوان چەسپاو بوو کە حوکمی شەریعەت لەو کورتکراوەیەدا تەسکاو وگەمارۆ( منحصر ) دراوە وجگە لەویش پاتاڵ و نەویستراوە ، بۆیە تەواو کەوتنە پێوە شلۆقبوون و پەلاماردانی تەواو لە زانستەکانی تر دوور دەکەوتنەوە )[2].

٢- شەرح و پەراوێزو بەیاننامەکان : شەوکانی – ڕەحمەتی خوای لێبێت- کە زۆرێکی ئەو شەرح و پەراوێزانەی لە هەمە جۆرەی زانستە ئایینی وزمانی یەکاندا خوێندووە و وتۆەتەوە بەرەخنە گرتن لێی دەڵێت : ( لەگەڵ ئەوەی کەزۆر شتی تێدایە کە پێویست نی یە بەڵکوو زۆرینەی وایە ، بەتایبەت ئەو لێوردبونانەوەی کە لە شەرح و پەراوێزەکانیدا هەیە ، چونکە ئەوە دوورە لە زانستی قورئان و سوننەت )[3].

بەڕاستی دانراوەکان بەزۆری شەرح و پەراوێزەکانی وچەندین زیادەڕۆیی تر کە عەقڵی کە لەپچە دەکردو دەبووە هۆی بەستوویی و ناکارایی زانستەکان بە درێژایی چەندین سەدە بەردەوام بوون . چەند پەراوێزو شەرحێکی بەسودی هەبوون ، بەڵام هێندە نەبوو کە باس بکرێت . مەنهەجی فێرکردنیش لەو ماوەیەدا بەتەواوەتی دوور لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بوو هەموو پەیمانگا ئیسلامی یەکانیش بە هێندێك دوور بوون لە مەنهەجی بنەڕەتی ئیسلامی .

بۆ نمونە ئەزهەر کە پەیمانگەیەکی گەورەی ئیسلامی و زانکۆیەکی کۆن بوو . مەڵبەندێك بوو بۆ ئەو زانستانەی کە دوور لە ڕۆح و ڕێبازی ئیسلام قسەیان دەکرد ، یەکێك لە وانە

---

1) ابن باديس _ حياته والآثاره (١/ ١٠٨ ) .

2) أدب الطلب ص٥٩ .

3) البدر الطالع بمحاسن ما بعد القرن السابع (١/ ٨٦ ) .

بێژانی نێو ئەزهەر لە بارەی زانستی کەلامەوە دەڵێت : ( بە ڕەهایی لەو زانستانەی کە لە زانکۆی ئەزهەردا سودم لە خوێندنی نەبینیوە زانستی کەلامە ، بەڕاستی چەند ساڵ لە ئەزهەردا وتومەتەوە ، بەڵام هیچی لەبارەی خواوە لێوە فێرنە بووم ، بەڵکوو تەنها لە چەند زاراوەیەکدا ڕۆچووم کە شلۆقی و پێکدادانی بیرمی زیاد کرد تا ئەوەی خوازیاری ئیمانی نەخوێندەواریٚ بووم ) [1].

بەڕاستی مەنهەجە ئیسلامی یەکان لەو ماوەیەدا بە زیاد لە ناکارایی و بەستوویی یان توشی شەپۆلێکی ووشکی بون کاتێك ( سەردەمە دواینەکان تەواو دوور کەوتنەوە لە ڕۆحی و ئیسلام و گرنگیان دا بەجەستەو مادده تا ئەوەی خوێندنە ئیسلامی یەکان بووە خوێندنێك کە ژیان و ڕۆحیان تێدا نەبێت دەردی ئەو خوێندنانەیش چوو بووە هەموو بەشەکانی فیقه تاکوو ئەو بەشانەیش کە پێویست بوو خوێندنی ڕۆح گرنگترین ڕەگەز بێت تیایاندا وا نەمابوون ) [2].

٣- مۆڵەتەکان : یەکیٚ لە هۆکارەکانی داڕمانی ژیانی زانستی لەو ماوەیەدا ئاسانکاری بوو لە پێدانی مۆڵەتەکاندا ، جا لەماوەی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانیدا چاوپۆشی یەك دەکرا کە هێندە بەس بوو زانستخواز سەرەتاکانی کتێبێك یان دوو کتێب بخوێنێت کە مامۆستاکەی دەیوتەوە تاکوو مۆڵەتی هەموو گێڕانەوەکانی بەدەست بخات ، زۆرێك لەو مۆڵەتانەیش لەڕێگەی ( موراسەلە ) وە دەبەخشرایە ئەوانەی کە لە وولاتە دوورەکانەوە خوازیاری بوون . جا زانایەك لە قاهیرەوە مۆڵەتی دەنارد بۆ خوێندکارێکی نێو مەککە بە بیٚ ئەوەی بینیبێتی یان تاقی کردبێتەوە [3]. جا ئەو ئاسانکاری یەی کاروبارانە موسڵمانانی بێئاگا کرد لە بەدەست خستنی زانست بەو جۆرەی کە پێویستە ، هەروەها ئاسانکاری لە بەخشینی مۆڵەتەکاندا هۆکارێکی گرنگ بوو لە هۆکارەکانی داڕمانی ئاستی زانستی و لاوازی زانستە شەرعی یەکان بەوەی ئامانجی زۆرێك لە وانەی خۆیان دابووە پاڵ زانست بەڕاشکاوانە بڵێن

---

[1] ) الأنحرافات العقدية والعلمية (٢/ ٤٢و٤٣ ) .

[2] ) المجتمع الأسلامي المعاصر ص٢١٠ .

[3] ) الأنحرافات العقدية والعلمية (٢/٥٩ ) .

بەدەست خستنی زیاترین ئەو مۆڵەتە وێنەیی یانەی بوون کە لە ڕاستیدا زۆرجار هیچ نرخێکیان نەبوو [1].

٤- میراتگری پایەی زانستی : لەکۆتایی یەکانی دەوڵەتی عوسمانیدا پایە زانستی یەکان لە کاروبارە زانستی یە گرنگەکانی وەك وانە ووتنەوە و فەتوا و ئیمامەت و تەنانەت دادوەریشدا بوو بە میراتگری ، بەڕاستی ئەو پایانە وایان لێهات بە مردنی کاربەدەستەکەی بە تەواوی دەبوو بە میراتگری وەك ڕۆڵ لەدەستدان و ماڵ و سامانیش بەمیرات دەگیرا ، جا زۆر جار وا ڕوویداوە مامۆستایەك کە وانەی دەوتەوە دەمرد ، پێش ئەوەی بخرێتە گۆڕەوە پایە و کورسی یەکەی دەگوازرایەوە بۆ کوڕ یان برا یان یەك لە نزیکەکانی ، هەندێ جاریش میراتگرەکە کەم تێگەیشتوو بێئاگا بوو لە زانست ، بەڵام بۆ سەرکردایەتی و وانەووتنەوە کورسی چۆڵ نە دەکرد کە هەندێ جار کەسێکی بێگانەی کەسوکاری مردووەکە لە شوێنیدا دادەنیشت ئەگەر شیاوی جێگرایەتی ئەو پایە بوایە کە کۆچ کردووەکە بەجێی هێشتبوو [2].

مێژوونوسی توركی ئەحمەد جەودەت کە لە ساڵی ١٣١٢ك دا مردووە [3] لەباسی ئەو دیاردە خراپەی نێو دەوڵەتی عوسمانی دا دەڵێت : ( ئەوەی دەسەلأت دارو دادوەران کە هێشتا تازە پێگەیشتوو منداڵ بوون ، ئەرکەکانیان دەگرتە دەست و بۆ ئەمەیش لە ئەرکەکاندا سەردەکەوتن تا ئەوەی دەچوون بۆ پلەی ( مەولەوی ) لە دادگای عوسمانیدا دوای پلەی دادوەرو سەربازی دووەم پلە بووە ) سەرەی دەهات کەچی هێشتا سمێڵی نەهاتبوو و زوڵفی زەرد نەبوو بوو ، هەروەها هەموو خاوەن ڕوو و ناودارێك پایەی وانە وتنەوەی دەگرتە دەست . تا ئەوەی پلەو پایە زانستی یەکان بە میرات وەردەگیران ، ئیدی وەزیرەکان و پیاوانی دەوڵەت ڕێیان بۆ ئاسان بوو کە ئەو پایانە بدەن بە نەوەکانیان و کەسانی تریش . ئیدی ژاوەژاو دەوڵەتی گرتەوە و نەزانەکان دەیاندا بەسەر یەکدا و کاروبار تەواو تێکچوو و تەواو خراپ بوو ) [4].

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو (٢/٦٤ ) .

[2] ) الآنحرافات العقدية والعلمية (٢/٦٤ ) .

[3] ) وەزیرێکی نێو کۆشکی عوسمانی بوو و لە ١٢ی بەرگدا مێژووی نوسیوەتەوە.

[4] ) الآنحرافات العقدية والعلمية (٢/٦٨ ) .

( محمد كرد عەلی ) لەبارەی بارودۆخی زانستی نێو شام و دواكەوتنی لەسەردەمی عوسمانیدا دەڵێت : ( لەو سەردەمەدا بنكەی چاكەی باوك بۆ كوڕ بەهێز بوو و ( ئەبوسعود ) ی موفتی كە یەكێ بوو لە شێخەكانی ئیسلام بوو لە ئاستانە ، یەكەم كەس بوو كە ئەوەی داهێنا و بۆ خەڵكی هێنایە مەیدان ، ئیدی وانە وتنەوە و بوون بە والی و وتار بێژی و پێشنوێژی و پێگە ئایینی یەكانی تریش دەدرایە دەست نەزانانەوە بەو بانگەشەیەی كە باوباپیرانیان زانا بوون و پێویستە ئەوان ئەرك و پایەكانیان بە میرات بگرن هەرچەندە نەزانیش بن ، هەروەك چۆن فرۆشگە و بینا و فەرش و كتێبەكانیشیان بە میرات دەگرتن ، بەڵكوو باری دەوڵەت گەیشتە ئەوەی نەخوێندەوارەكان دادوەری یان دەگرتە دەست ،جا چەند نەخوێندەوار لە دیمەشق و حەلەب و قودس و بەیروتدا پایەی دادوەری دادوەرەكانیان گرتە دەست جا لە هەرێمەكاندا پێدەچێت نەخوێندەواران زیاتر جگە لە خۆیان بووبن ... )[1].

بەڕاستی ئەو نەریتە خراپە چەندین شوێنەواری تەواو خراپی بەجێ هێشت وەك دابەزینی ئاستی فێركردن و لاواز بوونی ژیانی زانستی لای موسڵمانان ، ئەویش بە بەمیراتگری ئەو پایە ئایینی یانەوە و قۆرخ كردنی لە نێو بنەماڵە یەكی دەست نیشان كراودا ، دواتریش ئەو نەریتە كاری كردە سەر هێنانە دی چەندین زانای لە خوا ترسی خۆ یەك لاكەرەوە بۆ ئایینی خوا كە مون بریتی بوو لە هێنانە دی دادپەروەری و سەرخستنی ستەم لێكرا و سەربڵندكردنی ئایین .

حەوتەم : ڕەفزكردنی دەرگای ئیجتهاد : لە كۆتایی یەكانی دەوڵەتی عوسمانیدا بانگەشە بۆ كردنەوەی دەرگای ئیجتهاد بوو بە تۆمەتێكی گەورە كە دەگەیشتە تۆمەتباربوون بە گوناهە گەورەكان . لای هەندێ لە لاسایی كەرەوە و ناكارا و كەسە چەق بەستوەكانیش دەگەیشتە ئایستی بێباوەڕی ، لە و تۆمەتانەی كە نەیارانی بانگەوازی سەلەفیەت بۆ زاناكانیان دەكرد بانگەشەی ئیجتهاد بوو كە لەو كاتەدا تۆمەتێكی توند و گەورە بوو ، لەگەڵ ئەوەیشدا كە هیچ كامیان ئەوەی نەوتبوو ، بانگەواز بۆ قوفڵكردنی دەرگای ئیجتهادیش بە درێژایی سەردەمەكان میراتی دەمارگیرەكان بووە ، لە كۆتایی یەكانی دەوڵەتی عوسمانیشدا سووربونیان بە ئاشكرا دەركەوت و لە پێناو نەكرانەوەی ئەو دەرگایە و بەرنگاری هەموو كەسێكدا كە بچێت بە پاڵیدا تەشەنەیان سەندو بڵاوبونەوە كە بە ڕۆژئاوایی كەرەكانی

---

[1] ) خطط الشام (٣/٧٠) .

هاندان بۆ هەوڵدانی بێوچان بۆ گێڕانەوەی ڕێبازو ڕێکخستنەکانی ئەوروپا . دوابەدوای ئەم داخستنەی دەرگای ئیجتهادەیشدا چەند شوێنەوارێکی تەواو مەترسی دار هاتنە ئارا کە هێشتا زیانەکانی لە ژیانی موسڵماناندا تا ئەمڕۆی ئێمەیش کون و کەلەبەر دروست دەکات . جا کاتێك ئیجتهاد لەگەڵ بوونی بانگەواز کەرو خوازیارەکانیدابوەستێت .... ئیدی چی ڕوودەدات ؟

یەکێ لەم دوو بوارە ڕوودەدات : یان ژیان دەیبەستێت و لەگەشەسەندن دەوەستێت ، چونکە ئەو بەچەند قاڵبێك بەستراوەتەوە کە فراوان و لەباری ناکات . یان لەو قاڵبە حەبس کراوەدا دەردەچێت . لە هەمان کاتیشدا لەسێبەری شەرعەتدا دەچێتە دەرێ ، چونکە ئەو سێبەرە درێژەی ئیجتهادی نە بووە تاکوو بیبەخشێت . هەردوو بوارەکە پێکەوە ڕوویاندا و یەك لە دوای یەك هاتن ، یەکە مجار بەستوویی و پاشان پاش ئەوە دەرچوون لە بازنەی شەریعەت [1].

بەراستی ئوممەت بە دەست قوفڵکردنی دەرگای ئیجتهادەوە دەیاناڵاند و دەوڵەتی عوسمانیش لە کۆتایی یەکانی سەردەمی خۆیدا مافی ئەو دەرگایەی نەدا . ڕێڕەی ژیانیش بە پەلە ترو بەهێز تر بوو لەو بەست و کۆتکراوانەی کە بەرپەرچی هەموو شتێکی نوێ یان دایەوەو کارەکە لە دەستیان دەرچوو ( بەو جۆرەیش بزوتنەوەی عەقلی لای موسڵمانان وەستا کە لە بەردەم هەموو نوێ گەری یەکدا وەستا کە ژیان دەیهێنایە دونیاوە ، ژیانیش داهێنەرە و هەرگیز لە لەدایك بوون و داهێنانی خۆی ناوەستێت ، ئەو ڕۆژانە شتی نوێ دەبێت کە مرۆڤایەتی پێشتر نەیناسیوە . بۆ ئەمەیش خەڵکی _ جگە لە موسڵمانان _ لەگەڵ هەموو نوێگەری یەك دا دەچوون و هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەرکردو نوێ گەری یەکیان لێ بەرهەم دەهێنا ، بەو حۆرەیش خەڵکی _ جگەلە موسڵمانان _ لە ژیاندا هەنگاوێکیان دەنا و موسڵمانان ڕاوەستا بوون بەوەی ئەو شوێنەی خۆیان بەجێنە دەهێشت کە باوباپیرانیان لە چەند سەدەیەکدا لەسەری بوون ) [2].

دەمارگیری مەزهەبی بەردەوام بوو لە لاوازکردنی ئاستی زانیاری و دواخستنی زانستەکان و بەستوویی و کەلەپچەکردنی عەقڵ و تێگەیشتنەکان و ناکارا کردنیدا زیاد

---

[1] ) واقعنا المعصر _ محمد قطب ص١٥٩ .

[2] ) سدباب الآجتهاد وما ترتب عليه ص١٤٤ .

لەوەی کە بووە هۆی دووبەرەکی قسەی موسڵمانان و خراپ کردنی نێوانیان و چاندنی دژایەتی و دووبەرەکی نێوان تاك و کۆمەڵی موسڵمانان . پاش ئەوەی بوونە چەند دەستەو کۆمەڵێك ، هەموو دەستەیەك مەزهەبی خۆی سەردەخست و لە پێناویدا دژایەتی مەزهەبەکانی تری دەکرد، لەو کاتەدا ئەو دەمارگیریە خراپ تر بوو و بەشە ئیسلامی یەکانی گرتەوە و هیچ بەش و ولاتێکی لێ دەرنەچوو جا زانکۆی ئەزهەر مەیدانێکی پێشوازی کەری ئەو ململانێ مەزهەبیانە بوو بەتایبەت لە نێوان شافعی و حەنەفی یەکاندا ئەمەیش لە پێناو کێبەرکێ ی توند لەسەر بوون بەشێخی ئەزهەر [1] .

دەمارگیری مەزهەبی لە کۆتا سەدەکاندا چەندین بەربەستی چڕو پڕی لە نێوان موسڵماناندا هێنایە دی ، کە تەواو هەستی لاواز کردن بەرامبەر بە یەکبوونی ئیسلامی یان لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسیدا ، لە نێوانیشیاندا چەندین دژایەتی بەجێهێشت کە بێئاگای کردن لە هەموو جۆرە دوژمنانێکی ئیسلام و مەترسی یە کینە لە دڵانەیان بۆ ئیسلام و موسڵمانان [2] . بەڕاستی دەمارگیری مەزهەبی لە مەنهەجی خوادا کارێکی لادەرە ، ئەو لادانەیش قوڵی لەکارخستنی عەقڵ و بەستووی زانستەکان و تێك و پێکشکاندنی ڕێزی ئیسلامی زیاد دەکات کە گەورەترین کاریگەری هەبوو لە لاوازی و کۆت بوونی دەوڵەتی عوسمانی و سەرقاڵ بوونیدا بەکێشە ناوخۆیی یەکانی یەوە ، لە کاتێکدا پیلانەکان گەمارۆیان دا بوو و خاچپەرستان دەستیان کرد بوو بە خۆ ئامادەسازی بۆ سەرپیاوە نەخۆشەکە .

**هەشتەم : بلاوبونەوەی ستەم لە دەوڵەتدا :**

ستەم لەدەوڵەتدا وەك نەخۆشی وایە لە مرۆڤدا ، پاش ئەوەی ماوەی دیاری کراوی تەواو بوو وهەر نەخۆش بوو ئەوا مەرگ پێش دەخات و بە کۆتایی هاتنی ئەو ماوەیە کاتی مەرگی دێت ، بەهەمان شێوە ستەمیش لە دەوڵەتدا لەناو چوونی پێش دەخات بەوەی چەندین کاریگەری کاولکەری تێدا ڕودەدات کە دەبێتە هۆی لە ناوچوون و شڕۆڵ بوونی لە ماوەیەکی دیاری کراودا کە خوا دەیزانێت ئەوەیش ئەجەلی دەستنیشانکراویەتی ، واتە ئەوەی خوا

---

[1] ) عجائب الاثار (٢٤٢/٢ ) .

[2] ) الآنحرافات العقدية والعلمية (٨٦/٢ ) .

بۆی داناوە بە پێی ئەو سوننەتە گشتی یەی کە بۆمەرگی ئوممەتەکانی داناوە بەپێی هۆکارەکانی مانەوە کە تیایدایە وەك دادپەروەری یان هۆکارەکانی لەناوچوون وەك ستەمکاری کە کاریگەری یەکەی بەدەر دەکەوێت ، ئەویش لە ناوچونیەتی پاش تێپەڕبوونی ماوەیەکی دەستنیشان کراو کە خوا دەیزانێت [1]. خوا دەفەرموێت

﴿ ولكل امة اجل فأذا جاء أجلهم لا يستأخرون ساعة ولا يستقدمون ﴾ ( اعراف ٣٤ ) .

ئالوسی لە تەفسیریدا

بۆ ئەم ئایەتە دەڵێت ﴿ ولكل أمة أجل ﴾ واتە بۆ هەموو ئوممەتێك لە ئوممەتە لە ناوچووەکان ئەجەلێك هەیە . واتە کاتێکی دیاری کراو دەستنیشانکراوی پیشە کێش کردنیان [2]. لە ناوچونی ئوممەتەکان هەرچەندە شتێکی دووپاتکراوەیە بەڵام کاتی هاتنی نادیارە لای ئێمە واتە ئێمە بە دڵنیای یەوە دەزانین کە ئوممەتی ستەمکار بە بە هۆی ستەمەکەیەوە لە ناودەچێت بە پێی سوننەتی خوا بۆ ستەم و ستەمکاران ، بەڵام ئێمە بە تەواوەتی کاتی لە ناوچوونی نازانین ، جا کەس ناتوانێت ڕۆژان یان ساڵانێك دەستنیشان بکات ، ئەوەیش لە لای خوا دەستنیشان کراوە [3].

سوننەتی خوا لە لەناوچونی ئوممەتە ستە مکارەکاندا بەدوای یەکدادێت ، خوا دەفەرموێت

﴿ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾ ﴾ . ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕوونی دەکاتەوە : سزای خوا تەنها بۆ گەلە ستەمکارەکانی پێشوو نی یە ، بەڵکوو سوننەتی خوا لە گرتنی هەموو ستەمکاراندا یەك سوننەتە . جا ناکرێت کەسێك وا بزانێت ئەو لە ناوچوونە تەنها بۆ ئەو ستەمکارە پێشوانە یە ، بەڵکوو خوای گەورە کاتێك

[1] ) السنن الآلهية ص١٢١ .

[2] ) تفسير الآلوسی (١١٢/٨ ) .

[3] ) السنن الآلهية ص١٢١ .

باریان دەگێڕێتەوە دەفەرموێت ﴿ وكذلك أخذ ربك اذا أخذ القرى و هي ظالمة ﴾ . جا خوای گەورە ئەوە بەدیار دەخات کە هەرکەس لەکاری ئەوانەی پێشودا بەشداری بکات کە بوو بەهۆی لەناوچونیان ، ئەوا دەبێت لەو گرتنە سەختە توندەیشدا بەشداریان بێت ، ئایەتەکە ئاگاداری ناسازی و زیان بەخشی ستەممان دەکاتەوە . هەندێ جار دەوڵەتی بێباوەڕ دادپەروەر دەبێت بەو واتایایەی کە فەرمانڕەواکانی ستەم لە خەڵکی نەکەن و خەڵکیش لە نێو خۆیاندا ستەم نەکەن ، جا ئەودەوڵەتە لەگەڵ بێباوەڕیشدا دەمێنێتەوە ، چونکە سوننەتی خوا تەنها بە بێباوەڕبوونیان نابێتە هۆی لە ناوبردنی دەوڵەت ، بەڵکوو ئەگەر ستەمی فەرمانڕەواکان بۆ ژێردەستە ( رەعیەت ) دایە پاڵ بێباوەڕی یەکەی و خەڵك لە نێو خۆیاندا ستەمیان کرد [1] . خوای گەورە دەفەرموێت ﴿ وما كان ربك ليهلك القرى بظلم وأهلها مصلحون ﴾ ( هود ١١٧ ) .

ئیمامی ڕازی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت : ( مەبەست لە ستەم لەم ئایەتەدا هاوەڵ دانانە. واتە: خوای گەورە تەنها بە بێباوەڕبوونی خەڵکێك لەناو یان نابات ، ئەگەر هەڵسوکەوتی نێوان خۆیان چاك بێت و ، لەگەڵ یەکتردا بە چاکی و خراپە نەکردن هەڵسوکەوت بکەن ) [2] .

لە تەفسیری قورتوبییشدا ﴿ بظلم ﴾ واتە بە هاوەڵ دانان و بێباوەڕی ﴿ واهلها مصلحون ﴾ واتە لە نێوان خۆیاندا لە بەخشینی مافەکاندا . واتای ئایەتەکەیش ئەوەیە کە : خوای گەورە تەنها بەبێ باوەڕبوونیان لە ناویان نایات تاکوو خراپەی بۆ زیاد نەبێت ، وەك گەلی شوعەیبی بەهۆی سوکی کێش و تەرازوو و گولی لوتی بەهۆی نێربازی یەوە لەناو بردن [3] . ئیبن تەیمییە لە لەناوچوونی دەوڵەتی ستەمکاردا ئەگەریش موسڵمان بێت دەڵێت ( کاروباری خەڵك لەگەڵ دادپەروەریدا سەقامگیردەبێت با هەندێ جۆری خراپەیشی تێدابێت زیاتر لەوەی لەگەڵ ستەم لەمافەکاندا سەقامگیر دەبێت ئەگەر لە خراپەیەکیشدا بەشدار بێت . بۆ ئەمەیش وتراە : خوای گەورە دەوڵەتی دادپەروەر سەقامگیر دەکات ئەگەر بێباوەڕیش بێت ، دەوڵەتی ستەمکاریش سەقامگیر ناکات گەرچی موسڵمانیش بێت . دەیشوترێت ( دنیا لەگەڵ دادپەروەری و بێباوەڕیدا بەردەوام دەبێت ولەگەڵ ستەم و ئیسلامدا بەردەوام

---

[1] ) هەمان سەرچاوە ص١٢٢ .

[2] ) تفسير الرازي ( ١٦/١٨ ) .

[3] ) تفسير القرطبي (١١٤/٩ ) .

نابێت . ئەوەیش ئەوەیە کە دادپەروەری نیزامی هەموو شتێکە ، جا ئەگەر کاروباری دنیا بە دادپەروەری بەرپا بوو ، ئەوا بەرپا بووە ، ئەگەریش بە دادپەروەریش بەرپا نەبوو ، ئەوا ئەویش بەرپا نابێت ، ئەگەرچی خاوەنەکەیشی ئیمانی هەبێت کە لە ڕۆژی دوایی دا پاداشتی پێوەردەگرێت )[1] .

هەندێ پاشا هەستان بەچەند کارێکی ناشیرین و کەوتنە خوێن ڕشتن و دەستیان دەگرت بە سەرماڵ و ساماندا ، جا ئەوە ابراهیم پاشای ناسراو بە ( بدلی ) یەکی وەزیری سوڵتان موورادی سێ یەمەو ئەمیری ئەمیرەکانی دیار بەکربوو ، کەوتە کاولکاری لە شارەکەدا و ستەمی لە خەڵکەکەی کرد و چەندین تالآن کردنی ماڵ و سامان و کاری لاساری زۆری ئەنجادان ، کاتێ هەواڵ گەیشتە سوڵتان: ئەنجومەنی دادوەری بەست ئەویش خەڵکی ترسان کە شایەتی لەسەر بدەن ، دادوەر نەیتوانی لە سکالآکەیدا وردبونەوە بکات ، چونکە خوشکەکەی جێی ڕەزامەندی سوڵتان بوو ، نەیارەکانیشی پاشگەز بوو نەوە و سوڵتان لە دیاربەکردا داینایەوە ، ئەویش چوو بۆ ئەوێ بۆ لە ناوبردنی ئەوانەی سکالآیان لەسەرنوسیبوو و لەژێر سزادا زۆرێکی لێ لەناوبردن . ئینجا لەقەلآدا خۆی توند و تۆڵ کردو بە تۆپەکان تۆپارانی خەڵکی شارەکەی دەکرد تاکوو زۆرێکی لێکوشتن[2] .

ئەوستەمەیش کە پاشا محمد عەلی پێی هەستا لە ڕووی خەڵکی میسر و شام و حیجازدا شتێکی ڕوون و ئاشکرایە ، لەم کتێبەیشدا باسمان کردووە ، ستەمی تورکەکانیش بۆ عەرەب و کورد و ئەلبەکان لەگەڵ هاتنی ئیتیحاد تەرەققی بۆ سەر حوکم توندبوویەوە ، بەڵکو ئەو جەنکەرانە کەوتە ستەم کردن لە خەڵك لەنێو تورکیاودەرەوەیشدا ئەو ستەم و توندو تیژی و خراپەیانەیشیانمان باسکرد کە سوڵتان عبدالحمیدی دووەم بەرەو ڕووی بویەوە ، جا ئەو سوننەتەی خوا کە ناگۆڕێت تیایاندا ڕویدا و تۆڵەی لە ستەمکاران سەندەوەو خراپەی خۆیانی خستە نێو خۆیانەوەو دەوڵەتی عوسمانی لە بوونەوە ئاوابوو .

---

[1] ) رسالة الآمر بالمعروف والنهى عن المنكر _ ابن تيمية ص٤٠ .

[2] ) المختار المصون من اعلام القرون ( ٢/ ٩١٦، ٩١٧ ) .

**نۆیەم : زێدەڕۆیی دنیایی و ڕۆچوون لە نێو ئارەزووەکاندا:**

خوا دەفەرموێت ﴿ فلولا كان من القرون من قبلكم اولوا بقية ينهون عن الفساد في الارض إلا قليلا ممن انجينا منهم واتبع الذين ظلموا ما اترفوا فيه وكانوا مجرمين ﴾ . ( سورەتی هود ئایەتی ١١٦ ) . کاتێ دەفەرموێت ﴿ واتبع الذين ظلموا ما اترفوا فيه ﴾ مەبەستی لە ( ظلموا ) بریتی یە لە : وازهێنەرانی لە نەهی کردن لە خراپەکان واتە گرنگیبەو کارە نادەن کە پایەیەکی گەورەیە لە پایەکانی ئایین کە فەرمان بەچاکە ونەهی لە خراپە یە . بەڵکوو گرنگی یان داوە بە خۆشگوزەرانی و زێدەڕۆیی دنیایی و ڕۆچوون لە ئارەزووەکان و هەوڵی بە دەستخستنی سەرکردایەتی و پاراستنی دا و هەوڵدان بۆ ئەو مەبەستە و خواستی هۆکارەکانی ژیانی خۆش و کامەران [1] .

سوننەتی خوا بۆ سزا دان و هیلاکی ئەو دنیاپەرستانەی کە بەخششی دنیایی سەرکەشی کردبوون و لە شەرعی خوا دوورکەوتبوونەوە هاتە دی . خوا دەفەرموێت ﴿ وكم قصمنا من قرية كانت ظالمة و انشأنا بعدها قوما ءاخرين ، فلما احسوا بأسنا إذا هم منها يركضون ، لاتركضوا وارجعوا إلى ما اترفتم فيه ومسكنكم لعلكم تسئلون ﴾ ( انبياء ١١ و ١٢ و١٣) .یەکێ لە سوننەتەکانی خوا بەهیلاکدا بردنی ئوممەتە بەهۆی ( فسق ) ی دنیا پەرستەکانیەوە . خوا دەفەرموێت ﴿ و إذا اردنا أن نهلك قرية امرنا مترفيها ففسقوا فيها فحق عليها القول فدمرنها تدميرا ﴾ (اسرا ١٦ ) . لە تەفسیرەکەیدا هاتووە کە ( کاتێك کاتی لە ناوچونیان هات ، فرمانی گوێڕایەڵیماندا بە سەر دنیاپەرستەکانی دا واتە خۆشگوزەران و خۆسەپێن و پاشاکانی دا . ئەوانیش لێی دەرچوون ، بۆیە چی یان پێ وتاربوو هاتە دی لە ناومان بردن . خوای گەورە تەنها باسی دنیاپەرستەکانی کردووە لەگەڵ فرمان کردن بە گوێڕایەڵیش بۆ هەموان ، چونکە ئەوان پێشەواکانی دەرچوون و سەرکردەکانی گومڕایین . هەر خراپەیەکیشیان توش بێت ، ئەوا توشی شوێنکەوتە و فریودراوەکانیشیان دەبێت ، بۆیە ئاراستەکردنی فرمانەکە بە ڕووی ئەواندا دوپات دەکرێتەوە ) [2]

لەسەردەمی سوڵتان محمدی کوڕی ابراهیم دا ڕوویدا کە ( کۆشکی خیلافەت سێ ڕۆژ ڕازێنرایەوە و سوڵتان محمد کە لە شاری سلسترە بوو لە روم ئیلی ، نامەیەکی نوسی بۆ (

---

[1] ) السنن الآلهية ص١٨٦ .

[2] ) تفسير الالوسي (١٥/٤٢ ) .

عبدی پاشای نەیشانی ) قائیمقامی وەزیر لە قوستەنینە کە دەیوت : ئەو دەیەوێت بێت بۆ دارو لمەملەکە . ئەو لەماوەی تەمەنیدا دیمەنێکی جوانی پێوە نەدیوە و فرمانی کرد بانگەوازبکرێت بۆ ئامادەسازی جوانکاری یەکی تر ئەگە رهات بۆیە پێش ٤٠ ڕۆژ لە هاتنی سوڵتان بانگەواز کرا و خەڵکی کەوتنە جوانکاریان ، پاشان سوڵتان هات و دەستیان کرد بە ڕازاندنەوە وهەوڵەکانیان لەو ڕۆچوون و جوانکاری یەدا خستەگەڕ ، خەڵکی ئەو سەردەمە لەسەر ئەوە کۆك بوون کە لە هیچ سەردەمێکدا جوانکاری لە و شێوە ڕوونەداوە ، منی هەژار کە لە قوستەنینە بووم و بینیم . هیچ جۆرە هۆکارێکی خۆشحاڵی و شادمانی نەما بوو کە هەوڵ و تەقەلای تێدا بە خەرج نەدرابی نێردراوەکان بەرەو لای چوون خەڵکیش لە چێژوکامەرانیدا ڕۆچووبوون و هەموو جۆرە ئامێرەکانی چالاکی و خۆشگوزەرانی یان گرتبووە بەرو ناڕەوایی یەکان بلاوبوونەوە . ژیرەکان زانی یان کە ئەو کارە هەڵە بووە و توشبونی تاوانێکی گەورە یە ، ئەمەیشیان بە تاکۆتایی دەسەلات و دەرگای بەختەوەری و بە خشداری و دانا ، پاشان هەڵوەشاندنەوەی کتوپڕ ڕوویدا و کەموکورتی خۆی نواند و دوای ئەوە بردنەوە وخۆشی یە دوڕاندن و چەرمەسەری شوێنی گرتەوە ...) [1].

لە ساڵی ٩٩٠ ك دا سوڵتان موڕادی دووەم بە بۆنەی خەتەنە کردنی سوڵتان محمدی کوڕیەوە ئاهەنگی گێراو بۆئەمە خۆشی یەکی گێرا کە لە سەردەمی هیچکام لە خەلیفە و پاشاکاندا ڕوونەداوە .هەروەها وەلیمە و خۆشی وڕابواردن و خۆشحاڵی ماوەی ٤٥ ڕۆژ بەردەوام بوو ، سوڵتان لە ماڵی ابراهیم پاشادا لە ناوچەی ئات مەیدان دانیشت بۆ سەیرکردن و کەوتە بەخشی گەورە و دابەشی دەکردن لە مێژووی ( کبری ) دا بینیومە کە چەند بەردە ئەستێ یەکی بچوکی لە زیوو و زێر دروست کردووە و زێری بەزیوو زیوی بە زێڕ پڕکردووە ، و داویەتی بە خاوەن ( ڕابواردنگە ) کان [2]. ئەوە لادانێکی ترسناك بوو لەو مەنهەجەی کە دەوڵەت لەسەردەمی بەهێزی و چەسپاوی و دەسەلاتداریدا لەسەری دەڕۆیشت . لە وەسیەتەکانی محمدی فاتیح بۆ جێگرەکەی بریتی بوو لەوەی ( پاسەوانی ماڵ و سامانی بەیتوماڵ بکە لەوەی کە بەفیرۆبچێت ) ( ماڵ و سامانی دەوڵەت لە ڕابواردن و گاڵتەجاڕیدا بە خەرج مەدەو زۆر بە هێندەوە پابەند بە ، چونکە ئەو لەگەورەترین هۆکاری لە

---

[1] ) المختار المصون (٢/١١٦٣ ، ١١٦٤ ) .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو (٢/١١٥٥،١١٥٤ ) .

ناوچـوونه ) . بۆیـه ئاسـایی یـه دوای ئـەو لادانـه گـەوره و ڕۆچـوونەی نێـو گاڵتـەجاڕی و ڕابواردن و ئارەزوانه دەوڵەت پاش نەمانی جێپێ وەستاوەکانی مانەوەی ( مقومات البقاء ) ی بڕوخێت و نەمێنێت .

**دەیەم : ناکۆکی و دووبەرەکی :**

سوننەتی بەردەوامی خـوا لـه نێوگـەل و ئوممەتەکانـدا ناگۆڕێت و لـه خۆوه چاك نابێت . خوای گەورەیش ناکۆکی کردۆته یەك لە هۆکارێکی لە ناوچوونی ئوممەتان ، پێغەمبـەریش ( ﷺ ) دەفەرموێت ( فأن من كان قبلكم اختلفوا ، فهلكوا ) یـان ( فأهلكوا ) [1]. واتـه : ئەوانـەی پێش ئێوه ناکۆکی یان تێکەوت و لەناوچوون یان لـەناوبران ) . ئیبن حبـان و حـاکم لـه ئیبن مەسعودەوه دەگێڕنەوه بە ( فأنما اهلك من كـان قبلكم الاختـلاف ) واتـه : بەڕاسـتی نـاکۆکی ئەوانەی پێش ئێوەی لەناو برد .

ئیبن حەجـەری عەسـقەلانی دەڵێـت : لـەو فەرمودەیـه و ئـەوەی پـێش ئەویـشدا سـوربوون لەسەر کۆمەڵبون و یەکانگیری و ئاگادار بوون له دووبەرەکی و ناکۆکی هەیه [2] .

ئیبن تەیمیه (ڕەحمـەتی خـوای لێبیـت ) دەڵێـت ( خـوای گـەوره فـەرمانی پێکـردوین بـه کۆمەڵبوون و هاو بەرەیی و نەهی لێکردووین له دووبەرەکی و ناکۆکی ) [3] .

ناکۆکی لە نـاو بەرەی ئوممـەتیش دا هـەمان نـاکۆکی زەم کـراوه ( ناپەسـەند ) کـه دەبێتـه هـۆی دوو بـەرەکی بـوون و بـەش بـەش بـوونی ئوممـەت و ڕێگـری سـەرکەوتن بـەوەی لـەنێو ناکۆکی کەراندا هەر لایەنێك باوەڕی بە پوچەڵی ئەوەیه کە لـەلای لایـەنی دووەمـه تـا ئـەوەی بارەکه دەگاته ڕەواکردنی کوشتنی یەکتری [4] .

بەڕاستی نـاکۆکی هۆکـارێکی لـه ناوچونی ئوممەتانـه وەك لـه فەرمودەکـەی پێغەمبـەردا ( صلى الله عليه وسلم ) هات . چونکه ئەو ناکۆکی یانه به ناپەسەندی ( زەم کراوه ) ی هەندێ له وەسفەکانیان باس کرد ، ئوممەت دەبێته چەند دەستەیەکی جیا کە ئوممـەت لاواز دەکات

---

[1] ) صحيح البخاري بشرح العسقلاني (٩/١٠٢،١٠١ ) .

[2] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو (٩/١٠٢ ) .

[3] ) مجموعة الفتاوى

[4] ) السنن الالهية ص١٣٩ .

، چونکە هێزی ئوممەت لەو کاتەدا کە یەکن گەورەترە لەو هێزەی کە دووبەرەکن ، ئەو لاوازی یە گشتی یەیش کە بە گشتی توشی ئوممەت دەبێت ، دوژمن زاڵ دەکات بەسەریدا و تەماعی هەمووی دەیگرێت و خاکەکانی داگیر دەکات و خۆی دەسەپێنێت بەسەریدا و دەیکات بە کۆیلە و کەسایەتی یەکەی دەسڕێتەوە ، ئیدی هەڵوەشاندنەوە و لێکترازان و لە ناوچوونی لە مەدایە[1] .

وانە گرنگەکانی نێو ئەم لێکۆڵینەوە مێژوویی یە ئەوەیە کە : ڕێگری و خۆپارستن لە لەناوچوون بە ڕێگری و خۆپاراستنە لە ناکۆکی ناپەسەند ، چونکە ناکۆکی هۆکارێك بوو لە هۆکارەکانی ئاوا بوون و لەناوچوون و پوکانەوەی دەوڵەتی عوسمانی ، مەترسیدارترین ئەو شتەیش کە ئێستا پێوەی دەناڵێنین ، ناکۆکی نێو ڕیزەکانی ئەو ئیسلامی یانەیە کە هەستاون بە ئەرکی بانگەواز بۆ خوای گەورە ، ئەو ناکۆکی یە دەبێتە هۆی لاوازی ئوممەت ئەگەر بێت و ڕێگەی خۆپاراستن لێی نەگیرێتە بەر . شێخ عبدالکریم زەیدان دەڵێت (ناکۆکی وەك چۆن ئوممەت لاوازدەکات ولەناوی دەبات . ئەو موسڵمانەیش لاواز دەکات کە هەڵدەستێ بە ئەرکی بانگەواز بۆ خودا و دواتر لە ناویان دەبات . بۆیە خراپترین شتێك کە کۆمەڵی موسڵمانی پێوە توش دەبێت ، ڕودانی ناکۆکی ناپەسەند و زەم کراوە لە نێوانیاندا ، بە جۆرێك دەیانکات بە چەند دەستەیەکەوە تا ئەوەی هەموو دەستەیەك وادەزانێت ئەو ڕاستەو کارەکەی پێکاوە و ئەوانی تر لەسەر وجگە لەو هەڵە و گومراین . هەموو دەستەیەکیش باوەڕیان وا دەبێت کە ئەو ئەوەیە کە لە بەرژەوەدی بانگەوازدا کار دەکات . هاوار ئەگەر دووبەرەکی و دەستەگەرایی و ناکۆکی ناپەسەند لە بەرژەوەندی بانگەوازدا بێت ، یان بەرژەوەندی بانگەواز لە ڕێگەی دوو بەرەکی یەوە بێت . بەڵام شەیتانەکە دەستگەرایی و دووبەرەکی لە چاوی دووبەرەکی کەرو ناکۆکی کەرەکاندا جوان دەکات و وایان لێدەکات باوەڕیان وابێت کە ناکۆکی و دووبەرەکی یان لە بەرژەوەندی بانگەوازدا یە ناکۆکی نێو کۆمەڵ کاریگەری یەکەی لە سنوری لاوازکردنی کۆمەڵدا ناوەستێت ، بەڵکوو کاریگەری یەکەی خەڵك لاواز دەکات و دەستبەرداران والێدەکات ڕای پوچەڵی خۆیان لە نێو خەڵکدا دابڕژێنن و بڵێن : کۆمەڵێکی خراپ فرمان بە خەڵك بکەن بە یاساکانی ئیسلام و ئیسلامیش بانگەواز بۆ یەکانگیری و کۆبونەوە دەکات و نەهی دەکات لەناکۆکی ، کەچی ئەو کۆمەڵە

---

[1] ) هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ١٣٩ .

ناکۆکی دەبێت چونکە ئەو لە نێو خۆیدا دوو بەرەکی و ناکۆکەو هەر دەستەیەك ئەوی تر لەکە داردەکات و بانگەشە دەکات کە تەنها ئەو لەسەر ڕاستی یە ، پاشان بارەکە دەگاتە تەنگەبەری ( انحسار ) کاریگەری کۆمەڵەکە لە نێو کۆمەڵگادا و پاشان لاواز و شڕۆڵ و لە ناوچونی و بەرپا بوونی چەند کۆمەڵێکی نویٚ لە شوێنی دا کە دەستەی جیابووەوەی ئەون . ڕووداوە دوور و نزیکەکانی مێژوویش پیشتگیری ئەوە دەکەن و وا دەڵێین ) [1].

بەڕاستی دەوڵەتی عوسمانی بەتایبەت لە کۆتایی یەکانی سەردەمەکەیدا توشی ناکۆکی و دووبەرەکی نێوان سەرکردەو سوڵتانەکانی بوویەوە ، جا هەندێ لە فەرمانڕەوا ناوچەیی یەکان هەوڵی سەربەخۆبوونیان دەدا لە حکومەتی مەرکەزی بۆ درێژە پێدانی ماوەی فەرمانڕەوایی یان و هەوڵی دەمەزراندنی بنەماڵە گەلێکی ناوچەیی ( مەمالیك لە عێراق ، ئالی گەورە لە سوریا ، موعەننی و شیهابی یەکان لە لبنان ، محمد عەلی لە میسر ، ظاهر و لعەمر لە فەڵەستین ، ئەحمەدی جەززار لە عەککا ، عەلی بەگی گەورە لە میسر قراملی یەکان لە لیبیا ) [2]. ئەو ململانێیەی نێوان فەرمانڕەوا ناوچەیی یەکان و دەوڵەتی عوسمانی هۆکارێکی لاوازکردنی دەوڵەت و دواتر ئاوابوون و کەوتنی بوو . هەندێ لە مێژوو نوسانیش چەند هۆکارێکی کەوتنە کە باس دەکەن و دوچاری تێکەڵکردنێکی نێوان هۆکارەکانی کەوتن و نێوان شوێنەوارە بەجێماوەکانی دوورکەوتنە وە لە شەرعی خوا بوون) . قسەکردن لەسەر لاوازی سیاسی و جەنگی و ئابوری و زانستی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و چۆنێتی نەهێشتنی ئەو لاوازی یەدا و قسەکردن لەمەڕ ئیستعمار و شالاوی فکری و سەرخستن و چۆنێتی بەرنگاربوونەوەی هیچ هەوڵێکی لەناو بردنی ئەو دیاردە بێزراوانە زیاد ناکات ، بەلاٚم هەرگیز ناتوانرێت ئوممەتێك ڕاپەڕین بکات کە توشی برسێتی بیروباوەڕی بوون ، تاکوو جەنگان دژ بە هۆکارە ڕاستی یەکان و زاڵبوون بەسەریدا ڕوونەدات ، ئەوا بە جۆرێك لە جۆرەکان ناتوانرێت بەسەر ئەو شوێنەوارە مەترسیدارانەدا زاڵ بێت . شوێنەوارەکان پێکدادراوو نێوخۆیی بوون و هەریەك لەوانە کاریگەری یەکی وێنە دانەوەی هەبوو بۆ ئەوی تر ، جا بۆ نمونە لاوازی سیاسی کاری دەکردە لاوازی ئابوری و پێی کاریگەر دەبوو و بەو جۆرە .... زۆرێك لەو هەولاٚنەی لە جیهانی ئیسلامیدا لە پێناوی دوبارە گێڕانەوەی دەوڵەتی

---

[1] ) السنن الالهية ص١٤١،١٤٠ .

[2] ) العلم العربي في التأريخ الحديث ص ٩٤ .

ئیسلام و عیززەت و هێزەکەیدا بەگەر خران . جەختی لەسەر شوێنەوارەکان دەکردەوە و هۆکارە ڕاستی یەکانی چارەسەر نەدەکرد کە لە پشت لەناوچوونی دەوڵەتی عوسمانی و لاوازی و گەمارۆدرانی ئوممەتدا بوون .

هەوڵەکانی مەسیحی و جولەکە و عەلمانی یەکان کاریگەری یان لە دەوڵەتی عوسمانیدا نە بوو تا دوای ئەوەی دەوڵەت لە شەرعی خوا لایدا و مەرجەکانی دەسەڵاتداری لە دەستدا و هۆکاری ماددی و مەعنەوی یەکانی پشت گوێ خست ﴿ لقد كان في قصصهم عبرة لاولى الالباب ما كان حديثا يفترى ولكن تصديق الذي بين يديه و تفصيل كل شيء وهدى و رحمة لقوم يؤمنون ﴾ ( سوره يوسف ١١١ ) .

ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە :

١- مێژووی عوسمانی بەرەو ڕووی هێرشەکانی شێواندن و تەزویرکردن و گومان دروست کردن بۆتەوە لە لایەن جولەکە و مەسیحی و عەلمانی یەکانەوە .

٢- مێژوونووسە عەرب و تورکەکان لەسەر ئاڕاستەی دژایەتی کردنی سەردەمی خیلافەتی عوسمانی چون .

٣- هێزە ئەوروپی یەکان دایەنی ئاڕاستە ڕاپەڕینەکانی دژ بە خەلافەتیان کردووە و هەستان بە دەسگرۆیی مێژوونوسەکانی نێو میسر و شام لە پێناو چەسپاندن و قوڵکردنەوەی چوارچێوەی نەتەوەیی وەك بوستانی و یازەجی و جورجی زەیدان و ئەدیب ئیسحاق و سەلیم نەققاش و شبلی شەمیل و سەلامە موسا و کەسانی تر .

٤- تاقمە ماسۆنی یەکان توانی یان زاڵ بـبن بەسەر عەقڵی سەرکردەکانی ئاڕاستەی نەتەوەیی نێو گەلە ئیسلامی یەکان ، ئەو سەرکردانەیش زیاتر لە نەوازش و سەردانەواندنیان بۆ داواکاری یەکانی گەلەکانیان بەتایبەت لە هەڵوێستیان لەمەڕ ئایینی ئیسلام ، زیاتر سەریان بۆ ئاڕاستە و ئاماژەی تاقمە ماسۆنی یەکان دانەواند .

٥- ئەو مێژوو نوسانەی کاریان کردبۆ شێواندنی دەوڵەتی عوسمانی ، پشتیان بەست بە تەزویرکردنی ڕاستی یەکان و درۆ و قسە هەڵواسین و گومان خستنە دڵەوە و دوو دڵی . بەڕاستیش مۆرکی ڕق و کینەی کوێرانە و هاندەری لاڕێبوو ( منحرف ) ی بە دوور لە هەموو مەوزوعیەتێك زاڵبوو بەسەر ئەو کتێب و لێکۆڵینەوانەدا .

٦- كۆمەڵێك لە زانایانی مێژووی عوسمانی لە نەوكانی ئوممەتی ئیسلامی هەستان بە بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتانە و بەرگری كردن لەدەوڵەتی عوسمانی . لە گرنگترین و دیارترینیان ئەو نوسینەیە كە دكتۆر عبدالعزیزی شینناوی لە سێ بەرگی گەورەدا لە ژێر ناونیشانی ( الدولة العثمانية دولة مفترى عليها ) پێی هەستا . هەروەها ئەو كتێبە گرنگانەی كە د. محمد حرب پێشكەشی كرد وەك ( العثمانيون في التأريخ والحضارة ) و ( السلطان محمد الفاتح فاتح القسطنطينيه وقاهر الروم ) هەروەها لەگەڵ ئەو كتێبەی كە دكتۆر موفق بەنی لمورجه نوسی ( صحوة الرجل المريض ) .

٧- ڕەچەڵەكی توركەكان دەگەڕێتەوە بۆ ناوچەی ئەو دیو ڕوبار كە ئەمڕۆ بە توركستان ناو دەبرێت و لە بانی مەنغۆلیا و باكوری چینەوە لە ڕۆژهەلاتەوە درێژدەبێتەوە بۆ دەریای قەزوین لە ڕۆژئاواوە . وە لە بیابانەكاكنی سیبریا لە باكورەوە بۆ نیمچە دوورگەی هیندی و فارس لە بارشورەوە _ درێژدەبێتەوە_ ، كە هۆز و تیرە گەورەكانی غەز لەو ناوچانەدا نیشتە جێ بوون كە بەتورك یان توركەكان ناسران .

٨- توركەكان لەسەردەمی عوسمانی كوڕی عفان ( رضي الله عنه ) لەساڵ ٢٢ك دا هاتنە نێو ئیسلامەوە .

٩- هۆزە توركەكان پاش چونیان بۆ نێو ئیسلام بوونە بەشێك لە ژێردەستەو ئەندامانی ( رعیه ) دەوڵەتی عوسمانی ، ژمارەیان لە كۆشكی خەلیفە و سەركردە عەبباسی یەكاندا زیادی كردو دەستیان كرد بە گرتنە دەستی پایە سەركردایەتی و كارگێڕی یەكانی نێو دەوڵەت ، و سەربازو سەركردەو نوسەریان تێدا بوو .

١٠- سەلجوقی یەكان كە توركن توانی یان هەستن بە دامەزراندنی دەوڵەتێكی گەورەی توركی كە خوراسان و ئەودیو ڕووبارو ئێران و عێراق و ولاتی شلم و ئاسیای بچوكی لە خۆدەگرت .

١١- سەلجوقی یەكان پاڵپشتی خیلافەتی عەبباسی یان كرد لە بەغداد و مەزهەبی سوننی ( كە مەزهەبی دەوڵەتی عەبباسی بوو ) یان سەرخست پاش ئەوەی خەریكبوو لە نێوان دەستڕەوی بوەیهی شیعی نێو ئێران و عێراق و دەستڕەوی عەبیدی فاتیمی نێو میسرو شامدا داڕوخێت . جا سەلجوقی یەكان بە تەواوی زاڵبون بەسەر دەستڕەو ( قەڵەمڕەو) ی بوەیهیدا و ڕێگەیان لە خیلافەتی عەبیدی فاتیمی گرت .

١٢- توغرولْ بەگی سەرکردەی سەلجوقی توانی لە ساڵی ٤٤٧زدا لە بەغداد دەوڵەتی بوەیهی یەکان بخات و زاڵبێت بەسەر ئاژاوەکاندا و هەرچی قسەوتن بوو بە هاوەڵان لەسەر دەرگای مزگەوتەکاندا لایبەرێت و ئەبو عبدالله الجلالی پێشەوای ڕافیزەکان بەهۆی ڕۆچوونی لە رەفزدا بکوژێت .

١٣- ئەلب ئەرسەلان پاش مردنی توغرولْ بەگی مامی سەرکردایەتی گرتە دەست . ئەو سەرکردەیەکی لێهاتوو لەسەر پێ بوو ، ئەوبوو کە لە جەنگی ملازگردی ساڵ ٤٦٣ ك دا سەرکەوت بەسەر سوپاکانی ئیمپڕاتۆری ڕۆمدا . ئەو سەرکەوتنە خاڵی گۆڕانی مێژووی ئیسلامی بوو ، چونکە قەڵەمڕەوی ڕۆمی لە زۆربەی بەشەکانی ئاسیای بچوکدا لاواز کرد ، ئەوێیش ئەو ناوچە گرنگانە بوون کەئیمپڕاتۆریەتی بیزەنتی جەختی لەسەر دەکردەوە .

١٤- پاش مردنی ئەلب ئەرسەلان مەلیك شای کوڕی سەرکردایەتی سەلجوقی یەکانی گرتە دەست ، لەسەردەمی ئەودا دەوڵەتی سەلجوقی فراوانبوو تاکوو گەیشتە ئەوپەڕی درێژبونەوەی لە ئەفغانستان لە ڕۆژئاواوە بۆ ئاسیای بچوك لە ڕۆژهەڵاتەوە و وولاتی شام لە باشورەوە .

١٥- نیزامولمولك بە گەورەترین وەزیرە سەلجوقی یەکان دادەنرێت ، و ناودارە بە ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەت و خۆشویستنی زانست و زانایان و زۆربەخشین و کارەکانی لە چاکە و خێروبنیادنانی خوێندنگەکاندا بۆ فێرکردنی موسڵمانان .

١٦- چەند هۆکارێکی زۆر هەبوون بۆ کەوتنی دەسەلاتی سەلجوقی کە بە و هۆیەوە کەوتنی خیلافەتی عەبباسی ئاسان کرد . لەوانە ململانێی نێو بنەماڵەی سەلجوقی و دەستێوەردانی ئافرەتان لە کاروباری فەرمانڕەوایی دا و لاوازی خەلیفە عەبباسی یەکان و ئەو فێڵەی باتینی یەکان کە لە تیرۆکردنی سوڵتان و پێشەواو سەرکردە سەلجوقی یەکاندا خۆی دەنواند .

١٧- دەوڵەتی سەلجوقی چەند کارێکی بەرزو شکۆداری پێشکەش کرد بە ئیسلام ، لەوانە : ڕۆڵیان هە بوو لە دواخستنی ئاوابوونی دەوڵەتی عەبباسی دا بۆ ماوەی دوو سەدە . ڕێگری دەوڵەتی عەبیدی نێو میسری کرد لە بەدیهێنانی ئامانجە فراوانخوازی یەکانیدا . هەوڵەکانی سەلجوقی یەکان ڕێخۆشکەر بوون بۆ یەکخستنی ڕۆژهەلاتی ئیسلامی . کەلە سەردەستی صەلاحەددینی ئەیوبیدا لە ژێر ئالای خەلافەتی عەبباسی سوننی دا هاتە دی . هەستان بە بلاوکردنەوەی زانست و ئارامی و سەقامگیری لە و هەرێمانەدا کەلە ژێر قەڵەمڕەویاندا بوون . لە ڕووی جوڵە و بزاوتنە خاچپەرستی یەکانی ئیمپڕاتۆری بیزەنتی دا وەستان تا

ئاستێکی دیار و هەوڵی ڕێگری مەترسی مەغۆلیان دا و لە پلەو پایەی مەزهەبی سوننی و زاناکانی ( ئەو مەزهەبەیان ) بەرزکردەوە .

١٨- عوسمانی یەکان دەدرێنەوە پاڵ تیرەیەکی تورکمانی کەلە کوردستاندا دەژیان و پیشەی شوانێتی یان دەکرد .

١٩- سولەیمانی باپیری عوسمان لەساڵی ٦١٧ك دا لەگەڵ تیرەکەیدا لە کوردستانەوە چوون بەرەو وولاّتی ئەنادۆڵو لە شاری ئەخلاتی ڕۆژهەلاّتی تورکیای ئەمڕۆدا سەقامگیر بوون .

٢٠- لە دوای مردنی سولەیمان ئورتوغرڵ کوڕی سەرکردایەتی تیرەی سولەیمانی گرتە دەست و جولەو بزاوتی بەرەو باکوری ڕۆژئاوایی ئەنادۆڵ درێژە پێدا . لە ڕێگەکەیدا ململانێ یەکی چەکداری لە نێوان سەلجوقی یە موسڵمانەکان و ڕۆمە مەسیحی یەکاندا ڕوویدا . ئینجا دایانە پاڵ موسڵمانەکان . هاتنە نێو ئیسلامیان لەکاتی پێویست و لەباردا هۆکارێك بوو لەبەدیهێنانی سەرکەوتنی سەلجوقی یەکاندا .

٢١- سەرکردەی ئیسلامی سەلجوقی پارچە زەوی یەکی سەر سنوری ڕۆژئاوایی ئەنادۆڵی لەپاڵ سنوری ڕۆمدا بڕی یەوە بۆ ئورتوغروڵ و کۆمەڵەکەی و هەلی فراوان خوازی پێدان لەسەر حیسابی ڕۆم .

٢٢- عوسمانی یەکەم سەرکردایەتی گەلەکەی لەدوای مردنی باوکی گرتە دەست و لە فراوانخوازی خاکەکانی ڕۆمدا لەسەر بەرنامەی سیاسەتی پێشووی باوکی دەچوو .

٢٣- عوسمانی یەکەم خاوەنی چەند سیفەتێکی بەرزو بڵند بوو ، لەوانە : دلێری و دانایی و نیازپاکی وخۆڕاگری و وابەستەیی ئیمانی و دادپەروەری و وەفاداری و خۆ یەك لاکردنەوە بۆ خوا لە فتوحاتەکانی دا و خۆشەویستی بۆ زانست و زانایان .

٢٤- ژیانی عوسمانی یەکەمی دامەزرێنەری دەوڵەتی عوسمانی بریتی بوو لە جیهادکردن و بانگەواز لە ڕێی خوادا . زانایانی ئایینیش چواردەوریان دا بوو و سەرپەرشتی پلان و نەخشەی کارگێڕی و جێبەجێکاری شەرعی یان دەکرد لە پێشەوایەتی یەکەیدا . مێژوویش وەسێتەکەی عوسمان بۆ ئورخانی کوڕی بۆ پاراستوین لە وکاتەدا کە لەسەرجێگەی مەرگدایە . لەو وەسیەتەدا بەڵگەی شارستانی و مەنهەجی بوونی شەرعی تێدایە کە دواتر دەوڵەتی عوسمانی لەسەری دەڕۆیشت .

٢٥- سوڵتان ئورخان لە ساڵی ٧٢٦ك دا پاش مردنی باوکی فەرمانڕەوایی گردە دەست و لە فەرمانڕەوایی و فتوحاتەکاندا لەسەر هەمان سیاسەتی باوکی دەچوو سوریش بوو لەسەر

بەدیهێنانی موژدەی پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم) لە فەتحکردنی قوستەنتینی یەدا .
پلانێکی ستراتیژی دانا کە ئامانجی گەمارۆدانی پایتەختی بیزنتی بوو لەڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتەوە لە یەك کاتدا .

٢٦- گرنگترین ئەو کارانەی پەیوەندیان هەیە بە ژیانی سوڵتان ئورخانەوە ، دامەزراندنی سوپای ئیسلامی و سووربوونی یەتی لەسەر هێنانی نیزامێکی تایبەت بە سوپا . بۆیە هەستا بە دابەشکردنی سوپا بۆ چەند یەکەیەك کە هەریەکەیەك لە ١٠ یان ١٠٠ یان ١٠٠٠ کەس پێکهاتبوو ، یەك پێنجی دەستکەوتەکانیشی دانا بۆ دابەشکردن لەوەیش بڕێکی بەسەر سوپادا . لەپاش ئەوەیش کە پێشتر سوپا تەنها لە کاتی جەنگدا کۆدەبوویەوە .کردی بە سوپایەکی هەمیشەیی و چەند مەڵبەندێکی تایبەتی بۆ کردنەوە کە تیایدا مەشقیان دەکرد .

٢٧- ئورخان گرنگی دا بە پتەوکردنی پایەکانی دەوڵەتەکەی ، جا چەند کارێکی چاکسازی و بینا سازی گرتە خۆو کاروباری کارگێڕی ڕێکخست و سوپای بەهێز کردو مزگەوتەکانی بنیاد نان و پەیمانگا زانستی یەکانی دامەزراندو چاکترین زانا و مامۆستاکانی کردە سەرپەرشتیاری ، کە لە دەوڵەتدا بە ڕێژەیەکی زۆر بەرچاو ڕێزیان لێدەگیرا .

٢٨- دوای ئورخان ، لەساڵی ٧٦١ك دا سوڵتان موڕادی یەکەم فەرمانڕەوایی گرتە دەست ، موڕادی یەکەم دلێرو موجاهیدو بەڕێز و دیندار بوو ، نیزامی خۆش دەویست و پێوەی پابەند بوو ، لەگەڵ ژێردەستەو سەربازەکانیدا دادپەروەر بوو ، سەرقاڵی غەزاو مزگەوتو خوێندنگەو پەناگەکان بوو . لە پاڵیدا کۆمەڵێك لە چاکترین سەرکردەی بە ئەزمون و سەربازی هەبوون کە ئەنجومەنێکی لێپێکهێنان بۆ ڕاوێژ پێکردنیان . لە یەك کاتیشدا لە ئاسیای بچوك و لە ئەوروپایشدا فراوانخوازی دەکرد .

٢٩- موڕادی یەکەم توانی لەساڵی ٧٦٢ك دا ئەدرنە فەتح بکات و ئەو شارە لەساڵی ٧٦٢ك دا بکاتە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی ، بەمە پایتەخت لە ئوربەوە گوازرایەوە و ئەدرنە بوو بە پایتەختێکی ئیسلامی .

٣٠- سوڵتان موڕادی یەکەم دەیزانی لە ڕێگەی خواداجەنگ دەکات و سەرکەوتنیش لای خوایە ، بۆیە زۆر نزای دەکردو لای خوا سکاڵای دەکردو خۆی لە ڕوودا کەم دەنواند و پشتی پێ دەبەست ، لە نزاکەیشیدا بەڵگەی ناسینی خوا لەلایەن سوڵتان موڕادەوە و بەدیهێنانی واتاکانی پەرستش بەدەستدەخەین . لە جەنگی قوصوە دا کە دژ بە صرب بوو شەهید بوو .

٣١- سولتان موراد ماوەی ٣٠ سالْ بە هەموو دانایی و لێهاتویی یەکەوە کە هیچ کام لە سیاسەتمەدارانی سەردەمەکەی پێی نەگەیشتبوون ، سەرکردایەتی گەلی عوسمانی دەکرد .

٣٢- بایەزید لە سالّی ٧٩١ کۆچی پاش مردنی باوکی فەرمانڕەوایی گرتە دەست ، ئەو دلێرو نەبەردو بەڕێز و گەرم و گوڕ بوو بۆ فتوحاتە ئیسلامی یەکان ، بۆیە گرنگی یەکی زۆری دا بە کاروبارە سەربازی یەکان و هەرێمە مەسیحی یەکانی نێو ئەنادۆلّی کردە جێ ئامانج و لە ماوەی سالێکدا ئەو ناوچانە بووە بە پاشکۆی دەولەتی عوسمانی . بایەزید لە بزاوتنەکەیدا لە نێوان دوو بەرەی بەلقانی و ئەنادۆلّی دا وەك بروسکە وابوو ، بۆیە نازناوی ( هەورە بروسکە ) یان لێنا .

٣٣- بایەزید بەهۆی ڕاکەڕاك و پەلەکردن و چاك هەڵنەبژاردنی ئەو شوێنەدا کە سوپای تێدا دادەبەزاند لەبەرامبەر سوپاکانی تەیموری لەنگدا شکستی خوارد .

٣٤- دەولەتی عوسمانی بەرەو ڕووی مەترسی یە ناوخۆیی یەکانی بوویەوە و جەنگی ئەهلی لە نێو دەولّەتەدا لە نێوان کوڕەکانی بایەزیددا هەڵگرسا لەسەر کورسی دەسەلات ، ئەو جەنگە دەسالْ بەردەوام بوو ، ئەو قۆناغە لە مێژووی دەولەتی عوسمانیدا بە قۆناغی تاقی کردنەوە و توشبون دادەنرێت کە پێش دەسەلاتداری کارای وەك فەتحی قوستەنتینیە کەوت .

٣٥- سولّتان محمد چەلەبی توانی بەهۆی ئەو ژیری و ووردی و دووربینی یەی کە هەیەتی زالْ بێت بەسەر جەنگی ئەهلیردا و یەك لە دوای یەك بەسەر براکانیدا زالْ بێت تا ئەوەی هەموو کارەکەی کەوتە دەست و بە سولتانی بە تەنها مایەوە ، ماوەی فەرمانڕەوایی عوسمانی بردە سەر بە بنیادنانەوەی دەولەت و پتەوکردنی پایەکانی . هەندێ لە مێژوو نوسان بە دامەزرێنەری دووەمی دەولەتی عوسمالنی دادەنێن .

٣٦- سولّتان محمد چەلەبی توانی زالْ بێت بەسەر ئەو بزوتنەوەیەی شێخ بدرالددین دا کە بانگەشەی یەکسانی مالْ و سامان و شمەك و ئایینەکانی دەکرد و جیاوازی نەدەکرد لە نێوان موسلمانان و ناموسلمان ، لە بواری بیروباوەڕەدا .

٣٧- سولّتان محمد چەلەبی شعرو ئەدەب و هونەرەکانی خۆش دەویست . دەوترێت ئەو یەکەم سولتانی عوسمانی بووە دیاری سالانەی ناردووە بۆ ئەمیری مەککە .

٣٨- له سالی ٨٢٤ك دا مورادی دووهم کاروباری دهسهلاتی له دوای مردنی محمد چهلهبی باوکی گرته دهست ، ئهوهیش جیهاد و بانگهوازی ڕێی خوای خۆشدهویست و شاعیر بوو و زانا و شاعیرهکانی خۆش دهویستن .

٣٩- محمدی فاتیح له دوای مردنی باوکی له سالی ٨٥٥ك دا فهرمانڕهوایی دهولهتی عوسمانی گرته دهست و که لهو کاتهدا تهمهنی ٢٢سال بوو . ئهو خاوهن کهسایهتی یهکی کهم وێنه بوو ، که هێزو دادپهروهری پێکهوه کۆ کردبویهوه . ههروهك ههر لهسهرتای پێگهیشتنهوه زۆرێك لهو زاننستانهی خسته هۆشی خۆیهوه که لهخوێندنگهی ئهمیرهکاندا وهری گرتبوو بهتایبهت شارهزایی له زۆرێك له زمانهکانی سهردهمی خۆی و خواستی زۆری بۆ لێکۆلینهوهی کتێبه مێژوویی یهکان .

٤٠- له گرنگترین کارهکانی سولتان محمدی دووهم فهتحکردنی قوستهنتینیه بوو ، ئهو فهتحکردنه کاریگهری یهکی گهورهی هه بوو لهسهر جیهانی ئیسلامی و ئهورووپی ، فهتحکردنی قوستهنتینیه چهند هۆکارێکی ماددی و مهعنهوی و چهند مهرجێکی ههبوون که به جێگهیهنران .

٤١- عوسمانی یهکان سوربون لهسهر فهرمانڕهوایی پێکردنی شهرعی خوا ، کاریگهری دنیایی و دوا ڕۆژی یهکانیشی بهسهر کۆمهلگهی عوسمانیدا دهرکهوتن ، لهوانه : خیلافهت کردن و دهسهلاتداری و ئاسایش و سهقامگیری و سهرکهوتن و فهتح و عیززهت و شهرهف و بلاوبوونهوهی فهزل و بلندی یهکان و لابردنی سوکی و نزمی یهکان و چهندین کاریگهری تر.

٤٢- له گرنگترین سیفهته سهرکردایهتی یهکانی نێو کهسایهتی محمدی فاتیح : نهبهردی و دلێری و ژیری و سوربوون و جهخت کردنهوه و دادپهروهری و سهرکهش نه بوون بههێزی خۆی و زۆری سهربازو فراوانی سولتانی و نیاز پاکی و زانست بوو .

٤٣- له کاره شارستانی یهکانی محمدی فاتیح :کردنهوهی خوێندنگه و پهیمانگهو گرنگی دانی بوو به زانا و شاعیر و ئهدیبهکان و وهرگێران و بیناسازی و بنیادنان و نهخۆشخانه و گرنگی دانی به بازرگانی و پیشهسازی و ڕێکخستنه کارگێری و سوپایی و دهریایی یهکان و دادپهروهری .

٤٤- محمدی فاتیح وهسیهتێکی بهجێهێشت که ڕاسترین ئاماژهیه بهمهنههج و ئاکارو ئامانجهکانی له ژیاندا که بڕوای پێهێنا بوو .

٤٥- هەردووماموٚستا محمدی کوڕی حەمزەی ناسراو بە ( ئاق شەمسەددین ) و احمدی گۆرانی لەو زانایانە دادەنرێن کە کاریگەری یان هەبووە لەسەر محمدی فاتیح .
٤٦- دوای مردنی سوڵتان محمدی فاتیح لە ساڵی ٨٨٦ ك دا بایەزیدی کوڕی حوکمی گرتە دەست . ئەو سوڵتانێکی ڕووخۆش و نەرمونیان بوو . بە خۆشەویستی ئەدەب پێگەیشت و شارەزای زانستەکانی شەریعەتی ئیسلامی بوو و سەرقاڵ و شەیدای زانستی گەردووناسی بوو .
٤٧- سوڵتان بایەزید چووە نێو ململانێ یەك لەگەڵ جەمی برایدا ، لەسەر سنوری شامیش لەگەڵ مەمالیك لە چەند شەڕێکدا پێکیاندادا . هەوڵیشی دا یارمەتی موسڵمانانەکانی ئەندەلوس بدات لەو چەرمەسەری یە سەختەدا کە دوچاریان بوو بوو .
٤٨- لە دوای بایەزیدی دووەم ، سوڵتان سەلیمی یەکەم فەرمانڕەوایی گرتە دەست ، ئەو ئەدەب و شعری فارسی و مێژووی خۆش دەویست . لەگەڵ دڵڕەقیدا ئەو حەزی بە هاودەمی کەسانی خاوەن زانست دەکرد و هاودەمی مێژوونوس و شاعیرەکانی دەکرد لە مەیدانی جەنگدا تاکوو گەشەسەندنی جەنگەکان تۆماربکەن و ئەو قەسیدانە بهۆننەوە کە سەربڵندی ڕابردوو دەگێڕنەوە .
٤٩- لە لاوازکردنی قەڵەمڕەوی شیعە لە عێراق و وولاتی فارسدا دوای خوا فەزڵەکە دەگەڕێتەوە بۆ سوڵتان سەلیمی یەکەم . کە سەرکەوتنێکی گەورەی لە جەنگی چاڵدێراندا بەدەست هێنا بەسەر سەفەوی یە شیعە ڕافیزەکاندا .
٥٠- ئەنجامی ململانێی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی سەفەوی ، دانە پاڵی باکوری عێراق و دیاربەکر بوو بۆلای دەوڵەتی عوسمانی . کە عوسمانی یەکان سنوری ڕۆژهەلاتی دەوڵەتەکەیان و زاڵبوونی مەزهەبی سوننی یان لە ئاسیای بچوك هێنایە دی و مە ترسی یان نەما پاش ئەوەی زاڵ بوون بەسەر شوێنەکەوتە و پاڵپشتانی ئیسماعیلی صەفەویدا .
٥١- پورتوگالی یەکان سودیان وەرگرت لە ململانێی عوسمانی یەکان ، لەگەڵ سەفەوی یەکاندا و هەوڵیاندا گەمارۆیەکی گشتی بسەپێنن بەسەر هەموو ڕێگە کۆنەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا لە دەریا ڕۆژهەلاتی یەکاندا.
٥٢- بەهۆی ململانێی نێوان عوسمانی و ئەوروپایی یەکانەوە ، خۆشی و کامەرانی چووە نێو ئەورووپی یەکانەوە . و ئەورووپی یەکان هەولیاندا لەگەڵ شیعەی صەفەویدا دژ بە

دەوڵەتی عوسمانی ڕاوەستن بەڵکوو شڕوشێواوی بکەن هەتا نەتوانێت لە ئەوروپادا درێژە بەکشانەکەی بدات .

٥٣- عوسمانی یەکان توانی یان سەرکەوتنێکی یەکلاکەرەوە بەسەر مەمالیکەکاندا بهێنن لە جەنگی غەززە و پاشان جەنگی ریدانیە دا و پاش ئەوە دەوڵەتی مەمالیکیان سڕی یەوە و نەیانهێشت .

٥٤- پاش کوژرانی سوڵتانی غوری و طومان بای جێگری ، شەریفی مەککە ( بەرەکاتی کوڕی محمد ) بەپەلە گوێڕایەڵی خۆی پێشکەش بەسوڵتان کرد و کلیلەکانی کەعبەی پێدا . بەمە سوڵتان سەلیم بوو بە خزمەتگوزاری دوو حەرەمە پیرۆزەکە .

٥٥- دوای کەوتنی دەوڵەتی مەمالیك ، یەمەن چووە ژێر قەڵەمڕەوی عوسمانی یەوە . کەخاوەن کیانێکی ستراتیژی بوو ، و بەکلیلی دەریای سور دادەنرا ، لەسەلامەتیشدا جێی سەلامەتی پێگەو شوێنە پیرۆزەکانی نێو حیجاز بوو ، عوسمانی یەکان سودیان بینی لە بونیان لە یەمەندا ، وەك هەستان بەچەند هێرشێکی دەریایی بۆ کەندا وبەمەبەستی ڕزگاربوونیان لە فشاری ئیسپانی .

٥٦- پاش ئەوەی عوسمانی یەکان وولاتی مسیرو شامیان گرتە خۆو ولاتە عەرەبی یەکان چوونە ژێر چوارچێوەی حوکمی عوسمانی یەوە ، دەوڵەتی عوسمانی بە دایێری یەکی کەم وێنەوە بەرنگاری پورتوگالی یەکان بوویەوە و توانی هەندێ پێگەی ئیسلامی کەنار دەریای سور بگێرێتەوە وەك مصوع ، زەیاع ، هەورەك توانی هێزێکی دەرایایی بەسەرکردایەتی میر عەلی بەگ بنێرێت بۆ کەناری ئەفریقی و مەقدیشۆ و ممبسە ڕزگار بکەن و سوپا پورتوگالی یەکانیش توشی چەندین زیانی گەورە بوون .

٥٧- لەسەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانونیدا ( ٩٢٧_٩٧٤ك ) دەوڵەتی عوسمانی توانی پورتوگالی یەکان لە دەریایی سور دوور بخاتەوە و لەو مەڵبەندانە دا هێرشیان بکاتە سەر کەلە کەنداوی عەرەبیدا تیایدا سەقامگیر بوون .

٥٨- عوسمانی یەکان توانی یان ڕێگری پورتوگالی یەکان بکەن بە دوور لە مەملەکەتە ئیسلامی یەکان ڕایان وەستێنن و سنور بۆ چالاکی یان دابنێن . دەوڵەتی عوسمانی توانی مەترسی سەر دەریای سور نەهێڵێت و پارێزگاری شوێنە پیرۆزەکان بکات لە فراوانخوازی پورتوگالی کە بنیاد نرا بوو لەسەر ئامانجە داگیرکاری و ئامانجی سوك و هەوڵەکانیان بۆ کارکردنە سەر ئیسلام و موسڵمانان بە هەموو جۆرە ڕێگەیەك .

٥٩- ئەنجامی ململانێی عوسمانی پورتوگالی ئەوە بوو کە عوسمانی یەکان پارێزگاری شوێنە پیرۆزەکان و ڕێگەی حەجیان کرد لەگەڵ پاراستنی سنوری وشکانی لە هێرشە پورتوگالی یەکان بە درێژایی سەدەی ١٦ و بەردەوامی ئەو ڕێگە بازرگانی یانەی بەسترابوونەوە بە هیند و ئەندۆنیسیا لەڕۆژهەلاتی دوورەوە بە هۆی کەنداوی عەرەب و دەریای سورەوە .

٦٠- لەسەردەمی سوڵتان سولەیمانی قانونیدا ڕۆدس فەتح کرا و سولەیمان توانی ڤیەننا ئابلۆقە بدات و لەگەڵ فەرەنسادا چووە نێو سیاسەتی لێکنزیکبوونەوە وە .

٦١- دەوڵەتی عوسمانی گرنگی دا بەباکوری ئەفریقی و لەگەڵ بوزتنەوەی جیهادی دەرياييدا ڕاوەستا و هەموو خزمەتگوزاری یە ماددی و مەعنەوی یەکانی پێشکەش کردن .

٦٢- لەسەردەمی سوڵتان سەلیمی یەکەمدا جەزائیر چووە ژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی یەوە و دوو سەرکردەی گەورەی مەیدانی جیهادی باکوری ئەفریقیی دەرکەوتن کە هەردوو برا : عروج و خەیرەددین بربروس بوون .

٦٣- خەیرەددین سەرکەوتوانە چەندین پاڵپشتی پێشکەش کرد بە دەوڵەتێکی گەنجی نێو جەزائیر ، یارمەتی یە عوسمانی یەکانیش بە بەردەوام له لایەن سوڵتان سولەیمانی قانونی یەوە پێی دەگەیشتن ، خەیرەددین توانی گورزەکانی ئاڕاستەی کەنارەکانی ئیسپانیا بکات . هەوڵەکانیشی بۆ ڕزگارکردنی هەزاران موسڵمان لە دەست ئیسپانیا بەرهەمدار بوون .

٦٤- بوونی عوسمانی لە جەزائیردا کاریگەری هە بوو لەسەر هەڵوێستی پاشای پورتوگالی لە مەغریبدا ، کە وازی هێنا لە هەستان بە چەند چالاکی یەکی سەربازی لە مەغریبدا .

٦٥- پاش ئەوەی خەیرەددین بربروسە بوو بە سەرکردەی کەشتی گەلی عوسمانی ، گرنگی دا بە حەوزی ڕۆژهەلاتی دەریای ناوەڕاست و سەرکردە ئاغا طوشی فەرمانڕەوایی جەزائیری گرتە دەست کە تەواو کەوتبووەزیاد کردنی ئارامش و دانانی چەند بنەمایەك بۆ کارگێری سەقامگیر ، هەروەها هەوڵی کۆکردنەوەی چواردەوری وولاتەکەی دا بە دەوری دەسەلاتی مەرکەزی جەزائیریدا .

٦٦- حەسەن ئاغای طوشی توانی سوپا خاچپەرستەکان بە سەرکردایەتی شارلی پێنجەم لە خاکەکانی جەزائیردا شکست پێبهێنێت . ئەم شکستە کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ئیمپڕاتۆری یەتی ئیسپانی و شارلەگانی پاشای و ئاستی ڕوو داوە جیهانی یەکان .

٦٧- هەوڵەکانی شکستی شارلەگان وەك هەورەبرەسکە دابەزینە سەر ئەورووپا و ڕووداوەکان لەسەر ئاستی ئەورووپی بەپەلە گەشەیان سەند .

٦٨- شارلی پێنجەم توانای بیرکردنەوەی هێرشێکی تری نە بوو دژ بە جەزائیر ، هەروەها سێبەری خەیرەددین و حەسەن ئاغایش زاڵ بوو بەسەر هەمواندا .

٦٩- لە باکوری ئەفریقیدا چەند سەرکردەیەکی گەورە دەرکەوتن کە بەشداری جیهادی دژ بە ئیسپانیا و مەسیحی یان دەکرد لە دەریای ناوەڕاستدا ، لە بەناو بانگترینیان : حەسەن خەیرەددین بربروسە ، و صالح رایین ، و قلج عەلی .

٧٠- دەولەتی عوسمانی هەوڵی دا پەیوەندی یەکی ستراتیژی لەگەڵ دەوڵەتی سەعدیدا پێکبهێنێت ، بەڵام لە هەندێ جاردا سەری نە دەگرت بەتایبەت لەسەردەمی سوڵتان محمدی شێخی سعدی و محمد المتوكلدا .

٧١- لەو کارە گەورانەی کە دەوڵەتی سەعدی لەسەردەمی سوڵتان عبدالملك دا پێی هەستا ، سەرکەوتنە هەڵکەوتە و گەورەکەیان بوو لە جەنگی سێ یەمی پاشاکاندا کەبەسەر مەسیحی یە پورتوگالی یەکان داسەرکەوتن . لە کتێبەکانی مێژودا بە جەنگی ( القصر الكبير ) ( کۆشکی گەورە ) یان جەنگی ( وادى المخازن ) ناسراوە .

٧٢- سەرکەوتنی مەغریبی یەکان لە جەنگی وادى المخازن دا بە هۆی چەند شتێکەوە بوو لەوانە : ئەو سەرکردایەتی یە دانایی یەی کە لەسەرکردایەتی سوڵتان عبدالملك و ئەبولعە باسی برایدا خۆی دەنواند ، وکۆبونەوە و گردبونەوەی خەڵك بەدەوری سەرکردایەتی یەکەیدا . خواستی موسڵمانەکانیش بۆ پارێزگاری ئایین و بیروباوەڕو ئابڕویان ، و کارکردن بۆ برینپێچکردنی برینەکان بە هۆی کەوتنی غرناطە و لەدەستدانی ئەندەلوسەوە . هەروەها بەشداری چەند خاوەن ئەزمونێکی عوسمانی یەکان ، کە بە لێهاتوویی وەشاندنی تۆپ تایبەتمەند بوون ئەمە وایکرد تۆپە مەغریبی یەکان زاڵ بن بەسەر تۆپە ڕۆژئاوایی یە مەسیحی یەکاندا .

٧٣- سوڵتان ئەحمەدی مەنسور لە دوای شەهید بوونی عبدالملكی برای لە جەنگی وادی المخازندا فەرمانڕەوایی دەوڵەتی سەعدی گرتە دەست .

٧٤- بە مردنی قلج عەلی لە جەزائیر ، نیزامی بەیلەر بەگی کۆتایی پێهات کە چەندین پاشای دەسەڵات و قەڵەمڕە و فراوانی نێو فەرمانڕەواکانی جەزائیری پەیدا کرد . بە نیزامی پاشایەتیش شوێنی گیرایەوە کە لە تونس و تەرابلوس دا جێبەجێدەکرا .

٧٥- دەوڵەتی عوسمانی بەهۆی دەرکەوتنی جەزائیر لە هەوڵەکانیدا بۆ گرتنە خۆی ڕۆژئاوا ی دوورنەیتوانی ڕۆژئاوای دوور لە خۆبگرێت .

٧٦- عوسمانی یەکان خواستێکی سگەورەیان هە بوو لە گەڕاندنەوەی ئەندەلوسدا ، بەلاّم نەیانتوانی ئامانجە خوازراوەکە یان بەدی بهێنن بە هۆی هوڵێستی دەوڵەتی سەعدی لە لایەك و هەڵسوکەوتی هەندێ ئینکشاری لە لایەکی ترەوە و بەرەکانی ڕۆژئاوا لە لای سێ یەمەوە .

٧٧- مێژوونوسان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی گەورەیی دەوڵەتی عوسمانی بەمردنی سوڵتان سلێمانی قانونی عوسمانی لە ساڵی ٩٧٤کردا کۆتایی هات ، پێشەکی یەکانی لاوازی دەوڵەت لەسەردەمی  سوڵتان سولەیماندا بەدیارکەوتن .

٧٨- سەلیمی دووەم پاش سولەیمانی قانونی فەرمانڕەوایی گرتە دەست کە ئامادەی پاراستنی فتوحاتەکانی سوڵتان سولەیمانی باوکی نە بوو . ئەگەر بوونی وەزیری نایاب و موجاهیدی گەورە و سیاسی لێهاتوو محمد پاشا ی صوقلی نەبوایە ئەوا دەوڵەت دا دەڕوخا ، ئەمەیش فەزڵی خوایە بەسەر ئوممەتەوە .

٧٩- لەجەنگی لیبانۆ لەساڵی ٩٧٩ك/ ١٥٧١زدا عوسمانی یەکان شکستیان هێنا . ئەنجامی ئەو جەنگە لەناوبردنی هیواکانی عوسمانی یەکان بوو. بەمەترسی سەرکردایەتی عوسمانی لەدەریای ناوەڕاستدا نەما ، ئەو شکستە خاڵی گۆڕان بوو بەرەو وەستانی ماوەی سەردەمی گەشەسەندنی هێزی دەریایی دەوڵەت .

٨٠- جەنگی لبانتو هەلێکی لەبارو پێویست بوو بۆ دەرکەوتنی چاوچنۆکی فەڕەنسا بەرەو ڕۆژئاوای ئیسلامی ، کەتەنها بە بلاّوبونەوەی هەواڵی دارمانی کەشتیگەلی عوسمانی لەو جەنگەدا . پاشای فەڕەنسا شارلی نۆیەم پرۆژەیەکی پێشکەش کرد بە سوڵتانی عوسمانی ، ئەمەیش لە ڕێگەی باڵوێزەکەیەوە لە ئەستانبول ، کە خواستی پێدانی هەلی لە خۆ دەگرت بۆ حکومەتەکەی بۆ فراوانکردنی قەڵەمڕەوەکەی بەسەر جەزائیر دا بەبانگەشەی پارێزگارکردن لە کیانی ئیسلام و موسڵمانان بەو هۆیەوە .

٨١- سوڵتان سەلیمی دوووەم کەوتە هەوڵی ڕزگارکردنی تونس لە دەستڕۆیی و زاڵبوونی ئیسپانیا . عوسمانی یەکان بەسەرکردایەتی  قلج عەلی و سنان پاشا توانی یان لە ساڵی ٩٨٢کدا فەتحی تونس بکەن .

٨٢- ئیسپانیا کە تونسی لە دەستدا هیواکانی لە ئەفریقیادا لەناو چوون . پلە بە پلەیشدەسەلاتی لاواز بوو تائەوەی تەنها چەند پێگەیەکی لە دەستدا ما وەك : ملیلە ، وەهران ، مرسی گەورە ، خەیالی ئیسپانیش بەرەو بنیادنانی دەولەتێکی ئیسپانی لە باکوری ئەفریقیدا تێکشکاو چووە ژێر لمەوە .

٨٣- سولتان سەلیمی یەکەم هێرشێکی گەورەی نارد بۆ یەمەن و توانی عەدەن و سە نعاء لە دەست بەسەرا گرتن و دەستڕۆیی موزایەدە کەران ڕزگار بکات .

٨٤- پاش جەنگی لیبانتو لە ٩٧٩ك دا سیاسەتی دەولەتی عوسمانی وای لێ هات مافی یەکەمێتی هەبێت لە پاراستنی شوێنە پیرۆزە ئیسلامی یەکان دا یەکەمجارو دواتر دەریای سور و کەنداوی عەرەبی وەك پشتوێنێکی پارێزگاری بەدەوری ئەو شوێنانەدا . ئەوەیش داوای کەشتی گەلێکی بەهێزی دەکرد بۆ بەرەنگار بوونەوەی پورتوگالی یەکان .

٨٥- دەولەتی عوسمانی توانی قەلغانێکی بەهێز بنیاد بنێت کە پارێزگاری شوێنە پیرۆزە ئیسلامی یەکان بکات لە هێرشە مەسیحی یەکان ، تەنها لەگەل ئەم قەلغانەدا . سولتان بەپاسەوانێکی تایبەت پارێزگاری لە مەککەی پیرۆزو مەدینەی پرشنگدارو یەنبەع دەکرد .

٨٦- پاش مردنی سەلیمی دووەم ، مورادی سێ یەمی کوڕی فەرمانڕەوایی گرتە دەست کە گرنگی دەدا بە هونەرەکانی زانست و ئەدەب و شعر ، بە سێ زمانی تورکی و عەرەبی و فارسی قسەی دەکرد ، هەولی قەدەغەکردنی مەی دا بەلام ئینکشاری یەکان ناچاریان کرد بە لابردنی فەرمانەکەی ، ئەوەیش بەلگەیە لەسەر دەرکەوتنی لاوازی دەولەت .

٨٧- لە دوای مورادی سێ یەم ، محمدی سێ یەم فەرمانڕەوایی گرتە دەست ، لەگەل ئەو بارە لاوازی و داخورانەی کە دەستی کرد بوو بەلەکەدارکردنی دەولەت ، بەلام ئالای جیهاد هەر بەرزو بلند بوو ، سولتان خۆی چووە نێو مەیدانەکانی جەنگەوە . شێخ سەعدەددین ئەفەندی لەوانە بوو کە هانیان دا خۆی بچێت بۆ سەرکردایەتی سوپاکان و بە سولتانی وت : ( من لەگەلتدا دێم و هەنگاو دەنێم تاکوو دەروونم لە تاوان پاك بکەمەوە ، چونکە من بەوەوە هەنگاو دەنێم .

٨٨- لەدوای محمدی سێ یەم ئەحمەدی یەکەمی‌کوڕی فەرمانڕەوایی گرتە دەست کە تەمەنی ١٤سال بوو ، هیچ کام لە سولتانە عوسمانی یەکانی پێش ئەو لەو تەمەنەدا لەسەر کورسی دەسەلات دانەنیشتبوون ، بارودۆخی دەولەت بەتەواوی شەق و شۆڕبوو بەهۆی سەرقال بوونی بە جەنگەکانی نەمسا لە ئەوروپا و جەنگی ئێران وشۆڕشە نێو خۆیی

یەکانی نێو ئاسیاوە . احمود کەوتە ئەو ئامادەسازی یەی کە باوکی دەستی پێکردبوو ، کە ئامانجی لە خواترسان بوو ، ئەو کەسێکی کوڵ نەدەر بوو لەسەر گوێڕایەڵی یەکان و خۆی بەشداری ڕاستەو خۆی کاروباری دەوڵەتی دەکرد ، لە جل و بەرگیشدا نەوازشی هەبوو ، زۆر ڕاوێژی بە ئەهلی زانست و دانا و سەرکردایەتی دەکردو زۆر پێغەمبەری (ﷺ) خۆش دەویست .

٨٩- پاش مردنی سوڵتان ئەحمەدی یەکەم ، چەند سوڵتانێکی لاواز فەرمانڕەوای یان گرتە دەست ، لەوانە : مستەفای یەکەم ، عوسمانی یەکەم ، موڕادی چوارەم ، ابراهیمی کوڕی ئەحمەد ، محمدی چوارەم ، سولەیمانی دووەم ، ئەحمەدی دووەم ، مستەفای دووەم ، ئەحمەدی سێ یەم ، محمودی یەکەم ، عوسمانی سێ یەم ، مستەفای سێ یەم ، عبدالحمیدی یەکەم .

٩٠- سوڵتان سەلیمی سێ یەم پاش مردنی عبدالحمیدی یەکەمی مامی لە ساڵی ١٢٠٣ زدا فەرمانڕەوایی گرتەدەست کە قۆناغێکی نوێ لە قۆناغەکانی جەنگی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دوژمنەکانی دەستی پێکرد ، سوڵتان سەلیم دەستی کرد بە زیندووکردنەوەی ڕۆحی مەعنەوی لەدەروونی سەربازەکانیدا .

٩١- سوپا ڕوسی و نەمساوی یەکان توانی یان سوپای عوسمان شکست پێبهێنن ، ئەو جەنگە چەند شوێنەوارێکی هە بوو لەسەر دەوڵەتی عوسمانی . ئیدی شکستەکان یەك بەدوای یەك دەهاتن بەسەر عوسمانی یەکاندا و هێزی عوسمانی یەکان بەرەو دواوە بە ئاڕاستە ڕۆژهەلاتی دانوب پاشەکشێیان کردکە ئەمە هەلی دا بە نەمساوی یەکان بۆ هەڵوەشاندنەوەی گەمارۆیی بەلگراد و کردنەوەی ڕێگا بۆ هێزە هاوپەیمانی یەکان و دەرکردنی عوسمانی یەکان لە ئەورووپادا .

٩٢- پاش هێوربوونەوەی جەنگەکە ، سەلیمی سێ یەم پاشەکشێی کرد بۆ چاکسازی یە نێو خۆیی یەکان ، ئیدی دەستی کرد بە ڕێکخستنەوەی سوپا بۆ ڕزگا بوون لەو ئینکشاری یانەی کە بوو بوونە هۆی هەموو ئاژاوەیەك ، ئینجا کەوتەخۆچواندن بە ئەورپا ، بەلاّم لەدەسەلاّت دەرکراو لابرا .

٩٣- فەڕەنسی یەکان و ئەمان لاوازی دەوڵەتی عوسمانی یان ڕاشڵەژاند ، و بەسەرکردایەتی سەرکردەی ناودار ناپلیۆن پۆناپەرت هێرشە ناودارەکەیان نارد ، ئەو هێرشە دەنگدانەوەیەکی شۆڕشی فەڕەنسی بوو و کاریگەر بوو بە بیرۆکە شۆڕشگێڕی یەکانی .

٩٤- پیاوانی هێرشی فەڕنسی هەوڵی شڵەژاندنی ئایینیان دا لە دەروونی مامۆستا و زانا و نەخوێندەوارانی موسڵمانان‌دا بە خستنە ڕووی چەند نمونەیەکی شارستانێتی ڕۆژئاوایی بەڕوویاندا .
٩٥- فەڕەنسی یەکان سەرکەوتوانە توانی یان ڕەگەزە قیبتی یە مەسیحی یەکان بجوولێنن بۆ پاڵپشتی هێرشەکە بە هەموو جۆرە هۆکارێك .
٩٦- هێرشی فەڕەنسی بۆ سەر میسر بەیەکەم هێرشی خاچپەرستی دادەنرێت لە مێژووی نوێدا بۆ سەر هەرێمێکی عەرەبی لە هەرێمەکانی دەوڵەتی عوسمانی ، یەکسەر سوڵتان سەلیمی سێ یەم جیهادی دژ بە فەڕەنسی یە خاچپەرستەکان ڕاگەیاند ، موسڵمانانیش لە حیجازو شام و باکوری ئەفریقاوە چوون بەدەم بانەگەوازەکەیەوە
٩٧- بەریتانیا زۆر بە وردی شوێن پێی چاوچنۆکی یە فەڕەنسی یەکانی لەمسیرو شوێنانی تردا بسرێتەوە ، کاتێك هێرشە فەڕەنسی یەکە جوڵاو گەیشتە میسر ، بەریتانیا کەشتی گەلێکی بەسەرکردایەتی ئەمیرال نیاسون نارد بۆ بە دواداچوونی هێرشە فەڕەنسی یەکە . کەشتی گەلی ئینگلیزی توانی لە جەنگی ئە بی قیری دەریایی دا کەشتی گەلی فەڕەنسی تێك بشکێنێت .
٩٨- شکستی کەشتی گەلی فەڕەنسی لە ناوچەی ئەبی قیری دەریایی دا دەوڵەتی عوسمانی هاندا بۆ هێرش کردنە سەر هێرشە فەڕەنسی یەکە لە میسردا . جا سوڵتان سەلیمی سێ یەم جەنگی ڕاگەیاند دژ بە فەڕەنسا و فەرمانی دەرکرد بە گرتنی هەڵسوڕێنەری کاروباری باڵوێزی فەڕەنسی و هەموو ژێر دەستەکانی فەڕەنسا لە ئەستانبوڵدا و خستیانە نێو بەندینخانەوە .
٩٩- هێرشی فەڕەنسی ناچار بوو بەهۆی ئەو هێرشە هاوبەشەی کە ئینگلیزو عوسمانی یەکان پێی هەستان بۆ سەر فەڕەنسا ، میسر بەجێ بهێڵن ، چەند هۆکارێك سەریان هەڵدا کە لە کۆتایی دا داگیرکەرە فەڕەنسی یەکانی ناچار کردبچنە دەرێ لە میسر . لەوانە : تێکشکاندن و کاولکردنی کەشتی گەلەکەیان لەجەنگی دەریایی ئەبی قیردا ، زاڵبوونی دەریایی ئینگلیز لە دەریایی ناوەڕاستدا و توندکردنەوەی گەمارۆیان بۆ سەر کەنارە مسیری یەکان کەحکومەتی فەڕەنسی بێ دەسەلات کرد لە ناردنی فریاکەوتن و فریادڕەسی یەکانی بۆ فەڕەنسا لەمیسردا .

١٠٠ – هێرشەکەی فەڕەنسا کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر میسر بەتایبەتی و ڕۆژهەلأت بەگشتی کە تاقمە ماسۆنی یە جولەکە فەڕەنسی یەکان توانی یان هەنگاو بنێن بۆ تانەو تەشەر دان لە ئیسلام بە خەنجەرە ژەهراوی یەکەیان . فەڕەنسی یەکانیش توانی یان بیرۆکەکانیان بچێنن و لەناوچەکەدا چەندین بەکرێ گیراویان بۆ پەیدا ببێت ، کە پاش چوونە دەرەوەی سەربازی یان سودیان لەو ڕۆڵە مەترسیدارە وەرگرت کە دواتر محمد عەلی پاشای فەرمانڕەوایی میسر پێی هەستا .

١٠١– سوڵتان محمودی دووەم لە ساڵی ١٢٢٣ك دا فەرمانڕەوایی گرتە دەست و توانی ڕزگاری ببێت لە ئینکشاری یەو لایبردن ، لە دوای ئەوە لەگەشەپێدانی سوپاکەیدا سەربەست بوو و نەخشەی شارستانی ڕۆژئاوای کێشاو تەربووشی ڕۆمی گۆڕی بە مێزەرو تزیای گۆڕی بە زیی ئەورووپی ، و فرمانی کرد کە ئەو زیی یە ڕەسمی یە بۆ هەموو کارمەندانی دەوڵەت بێت .

١٠٢ – لەم بارە تەنگاوەی مێژووی عوسمانیدا ، تاقمە ماسۆنی یەکان لە میسر و شام و تورکیادا بلأوبوونەوە و بە شەو و ڕۆژ لە پێناو لە ناوبردن و لاوازکردنی دەوڵەتی عوسمانیدا پشت ئەستور بە کارە خراپ و گەنیوەکانیان کە کۆڵنەدان و ماندوو نەبون و بێ هیوا نەدەبوون و کاریان دەکرد .

١٠٣– تاقمە ماسۆنی یەکان پالپشت کردنی محمد عەلیان بەباش دەزانی تاکوو چاوچنۆکی یە داهاتووی یەکانیان بەدیبهێنێت کە پارستن و بەهێزکردن و وزە پێدانی تاقمە ماسۆنی یەکان و لاواز کردنی دەوڵەتی شکۆرداری عوسمانی وچاندنی خەنجەر ژەهراوی یەکەیەتی لە دڵی دەوڵەتی عوسمانیدا ، بۆیە کەشتی گەلێکی پێشکەوتووی گەشە سەندووی دەریایی و پێگەیەکی دەریایی یان لە دمیاط بۆ دامەزراند .

١٠٤– محمد عەلی هەستا بە ڕۆڵێکی گوماناوی کە گواستنەوەی ئاڕاستەی ئیسلامی بوو بۆ شتێکی تر کەلە کۆتایی دا دەگەیشتە دەرچوون لە شەریعەتی خوا ، ئەوئەزمونەی محمد عەلی پێشەنگێك بوو بۆ ئەوانەی دوای ئەو وەك مستەفا کەمال ئەتاتورك .

١٠٥– محمد عەلی لە جیاتی فەڕەنسا و بەریتانیا و ڕۆسیا و نەمسا و دەوڵەتەکانی ترهەستا بە وەشاندنی چەند گورزێکی توند بەڕووی ئاڕاستەی ئیسلامی لە هەموو میسر و دوورگەی عەرەبی و شام و خیلافەتی عوسمانی دا کە کاریگەری هەبوو لە ئامادە سازی جیهانی ئیسلامی بۆ چاوچنۆکی یەکانی ڕۆژئاوا .

١٠٦- محمد عەلی چنگولْ وەشێن و خەنجەرێکی ژەهراوی بوو کە دوژمنان لە جێبەجێکردنی پلانە کانیاندا بەکاریان دەهێنا ، بۆیە لە ڕاپەڕینە زانستی و ئابوری و سەربازی یەکەیدا لەگەڵیدا ڕاوەستان لەپاش ئەوەی دڵنیا بوون لە لاوازی لایەنی بیروباوەڕیی شارستانیە کەی خۆیی و پاڵپشت و سەربازەکانی .
١٠٧- دوای ڕۆڵی محمد عەلی لە ناوچەکەدا ، واڕویدا کە دەوڵەتە ئەوروپی یەکان خۆیان لەو باسە بەدوور گرت لەگەڵ ئەو لاوازی یەی کەدەوڵەتی عوسمانی توشی بووبوو . پاشان ئامادە سازی یان کرد بۆ دابەشکردنی خاکەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەهەر کاتێکدا بارودۆخی سیاسی گونجاو لەبار بێت .
١٠٨- لەدوای مردنی سوڵتان محمودی دووەم ، عبدالمجیدی یەکەمی کوڕی فەرمانڕەوایی دەوڵەتی گرتە دەست کە لەشێکی لاوازی هەبوو ، بیرتیژو واقیع بین و میهرەبان بوو لە بەهێزترین سوڵتانەکاتنی بنەماڵەی عوسمانی بوو .
١٠٩- سوڵتان عبدالمجید ملکەچی کاریگەری ڕەشید پاشای وەزیری بوو کە لە ڕۆژئاوادا و فەلسەفەی لە ماسۆنی یەت دا کەم وێنە بوو . ڕەشید پاشا ئەو کەسە بوو کە چینی داهاتووی وەزیرو پیاوانی دەوڵەتی ئامادە کرد و بەیارمەتی ئەو ئەو دەستانە بەشداریان کرد لە پالْ پێوەنانی عەرەبانەی ئەوبە ڕۆژئاوایی کردنەی کە دەستی پێکرد بوو .
١١٠- بزوتنەوەی چاکسازی و نوێگەرایی بەدەوری سێ خاڵی گرنگدا دەسوڕایەوە : خۆچواندن بە ڕۆژئاوا لەو بوارەدا کە پەیوەندی بە ڕێکخستنی سوپاوە هەیە ، خۆپڕ چەك کردن لەڕێکخستنی حوکم و کارگێڕیدا . ئاڕاستەکردنی کۆمەڵگەی عوسمانی بەرەو پێکهاتەیەکی عەلمانی و ئاڕاستەکردن بەرەو مەرکەزی بوونی دەسەلأت لە ئەستانبولْ و هەرێمەکاندا .
١١١- بە فرمانی مەدحەت پاشا لە ساڵی ١٨٧٦ زدا و دووهێڵی گوڵەخانەو هومایون کێشران و بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیسلام و دەوڵەتەکانیدا بەپێی دەستورێکی وەرگیراو لە دەستوری فەرەنسی و بەلجیکی سویسری کاروبار دەچوو بەڕێوە دەبرا کە ئەوانە چەند دەستورێکی دانراوی عەلمانی بوون .
١١٢- بزوتنەوەی ڕێکخستنەکانی دەوڵەتی عوسمانی بەڕەسمی لە کۆتایی ڕێگەی دا وەك دەوڵەتێکی ئیسلامی گۆڕدرا و یاساکان بوون بە عەلمانی و چەند دامەزراوەیەك دانران کە بەیاساگەلێکی دانراو ئیشیان دەکردو لە بوارەکانی بازرگانی و سیاسەت و ئابوریدا لە

تەشریعی ئیسلامی دوور کەوتبونەوە . بەڕاستی ڕەوا بوونی دەوڵەتی عوسمانی لەبەر چاوی موسڵمانان داوە .

١١٣- بەڕاستی ئەو ڕوانینە پشکنینەی نێو مێژووی ئوممەتەکان و خوێندنەوەی بارودۆخیان بۆ مان ڕوون دەکاتەوە کە : بە لێکچواندنی نێوان ئوممەت و ئوممەتێکی ترو نێوان گەلێك و گەلێکی تر . هاوشێوەیی و کارلێك و لێکتوانەوەیەك ڕوودەدات کە تایبەتمەندی و سەربەخۆیی لە نێو گەلە لێکچوێنەرەکاندا لاواز دەکات و دەیکاتە کەسێتی یەکی شلۆق و داشڵەژاو .

١١٤- سوننەتی خوا لە دروست کراوەکانیدا بەڕێوە دەچوو : کە گەلی لاواز ژێرکەوتوو سەرسامی گەلی بەهێزی خاوەن سام و شکۆ سەرکەوتوو دەبێت و پاشان خۆی پێوەی دەچوێنێت و ڕەوشت و ئاکارو شێوەی ژیانی بەدەست دەخات تاکوو دەگاتە خۆ پێوە چواندنی لە بیروباوەڕو بیرۆکەو ڕۆشنبیری و ئەدەب و هونەریشدا بەمە گەلی خۆ چوێنەر ( مقومات ) پاڵپشتی یە تایبەتی یەکانی خۆی و شارستانێتی یەکەی _ ئەگەر خاوەن شارستانێتی بێت _ لەدەست دەدات و لەسەر باری خەڵکی تر دەژێت .

١١٥- لە دەوڵەتی عوسمانیدا سوڵتان عبدالعزیزی کوڕی محمودی دووەم لە ساڵی ١٢٧٧زدا فەرمانڕەوایی گرتە دەست . دەوڵەتە ئەوروپایی یەکانیش سور بوون لەسەر فشارخستنە سەرحکومەتی عوسمانی بۆ بەردەوامبوونی لە نەخشەکانی چاکسازی و ڕاپەڕینی بانگەشە بۆ کراوی بەرنامە بیرۆکە ئەوروپی و ڕێبازە عەلمانی یەکان . سوڵتان عبدالعزیزیش بەرپەرچی ئەو دەستورە ڕۆژئاوایی و خوونەریتانەی دایەوە کە دوورن لە ڕەوشتی ئیسلامی . هاوکات هەوڵی ڕاپەڕینی دا بە کۆمەڵگەی ئیسلامی عوسمانی . جا لە ڕێگەی کونسوڵ و نوێنەرانی دەوڵەتە ئەورووپی یەکان لە پایتەختدا پیلانێك دانرا بۆ کوشتنی عبدالعزیز و هەستان بە جێبەجێکردنی لە ڕێگەی ئەو بەکرێ گیراوانیانەوە کە لە پیاوانی دەوڵەت بوون و بیرۆکەکانیان نۆش کرد بوو . لەسەروو هەمووویشیانەوە دروست کەری مسۆنی یەتی تۆمەتبار مەدحەت پاشا .

١١٦- لە دوای سوڵتان عبدالعزیز ، مورادی پێنجەمی برازای فەرمانڕەوایی گرتە دەست کە لە ئاکارە ماسۆنی یەکاندا ڕۆچوو بوو . و تامەزرۆیی دەستور و لیبڕالیەت و عەلمانی یەت بوو ، بزوتنەوەی ماسۆنی یەت بوو کە پاڵی بە مورادی پێنجەمەوە نا بۆ دەستەڵات ، بەڵام پاش ئەوەی توشی گەشکە و ترس بوو بەهۆی کوژرانی مامی یەوە توشی پێکدادانێکی

عەقڵی بوو . چەند پێکدادانێکی عەقڵی لێوە دەرکەوت کە کاری کردە سەر دەزگای هەست کردنی و تەندروستی لە داڕومانێکی بەردەوامدا بوو ، جا هەر دەبوو لابرایە . ئەوەیش لە لایەن شەیخول ئیسلامەوە ڕاگەیەندرا .

١١٧- لە دوای موورادی پێنجەم ، سوڵتان عبدالحمیدی دووەم لە ساڵی ١٢٩٣ ك دا فەرمانڕەوایی دەوڵەتی گرتە دەست و لەلایەن مەدحەت پاشاوە فشاری خرایە سەر . ئینجا دەستوری ڕاگەیاند ، وەزیرەکان زۆرداری خۆیان پەیڕەو دەکردو سیاسەتە بە ڕۆژئاوای کەرەکەیان بە سەرکردایەتی کۆمەڵی نوێگەرە عوسمانی یەکان توند بوویەوە کەچینی هەڵبژاردەی ڕۆشنبیرانی لە خۆ دەگرت کە بەڕۆژئاوا کاریگەر بوو بوون . کاتێك هەل ڕەخسا بۆ سوڵتان عبدالحمید دەستوری هەڵوەشاندەوە و سەرکردەکانی بە ڕۆژئاوایی کردنی ڕاوە دونا و کەوتە کارکردن لەسەر لاوازکردنی دەسەڵاتیان ، و دەستی کرد بە چاکسازی دەوڵەت بەپێی ڕێنمای یە ئیسلامی یەکان و سور بوو لەسەر جێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلامی .

١١٨- سوڵتان عبدالحمید کەوتە هەوڵی پێکهێنانی دەزگایەکی بەهێزی هەواڵگری بۆ پارێزگاری کردنی دەوڵەت لە ناوخۆدا ، و زانیاری کۆکردەوە لەسەر دوژمنەکانی لە دەرەوە دا و شۆڕشەکانی لە بەلقان و هەڵگەڕانەوە ناوخۆیی یەکانی دامرکاندەوە . دەزگای زانیاری لە و هۆکارە گرنگانەیە کەلای سوڵتان بۆ زاڵبوون بەسەر هەڵگەڕانەوە ناو خۆیی یەکانی ئەو کاتەی خۆی دا بەکاری دەبرد .

١١٩- دەوڵەتی عوسمانی چووە نێو جەنگێکی وێران کەرەوە لەگەڵ ڕوسیادا و لە بەرامبەری دا شکستی خوار دو ناچاری بەستنی پەیماننامەی سان ستفانو بوو لەگەڵیدا . پاشان لەدوای ئەوە چووە کۆنگرەی بەرلین لە ئەڵمانیادا .

١٢٠- بیرۆکەی جامیعەی ئیسلامی لە نێوەندی سیاسەتدا لە سەردەمی سوڵتان عبدالحمیدا بەدیار کەوت کە لە پێناو پاڵپشتی برایەتی نێوان موسڵمانان دا کاری دەکرد و لە هەموو شوێنێکدا گرنگی بەو بیرۆکەیە درا . تاکوو ئوممەت بتوانێت دژ بە چاوچنۆکی یە خاچپەرستی یەکان ڕابوەستێت .

١٢١- سوڵتان عبدالحمید دەستی کرد بە جێبەجێکردنی نەخشەکەی بۆ گەشتن بە جامیعەی ئیسلامی بەهۆی چەند هۆکارێکی جیاوازەوە لەوانە : پەیوەندی کردن بە بانگخوازانەوە و ڕێکخستنی ڕێگە سۆفی یەکان و کارکردن لەسەر بە عەرەب کردنی دەوڵەت و بەرپاکردنی

خوێندنگەی عەشیرەتەکان و بەرپاکردنی هێڵی سکەی ئاسنینی حیجازو پوچەڵکردنەوەی پلانەکانی دوژمن .

١٢٢- سوڵتان عبدالحمید هەوڵی تەنگەتاوکردنی جولەکەی دەونمەی دا کاتێك هێزو پیلانەکانیانی بۆ دەرکەوتن دژ بە ئیسلام . بۆیە جولەکەی دەونەمە هەستان بە دانانی پیلانێکی ستراتیژی دژ بە ئەو ، بەوەی لەسەر ئاستی ڕای گشتی عوسمانی و سوپادا لەدژی جولانەوە و هەستان بە پاڵپشتی و دەستگیرۆیی تاقمە ماسۆنی یەکان بۆ دەستبەسەردا گرتنی ، و دروشمەکانی ئازادی و دیموکراتی و قسە سەپاندنیان بە کارهێنا . لەسەر ئەو بنەمایە هەستان بە بلاوکردنەوەی دووبەرەکی و هەڵگەڕانەوە لە نێودەوڵەت و نێو ریزەکانی سوپادا ، جولەکەی دەونەمە دەستەی یەکەمیان پێکدەهێنا بۆ جێبەجێکردنی پلان و نەخشە جیهانی یە جولەکانەکان ، دەکەوتە هەوڵی بەدیهێنانی پرۆژەی بە نیشتمان کردنی صەهیۆنی لە فەڵەستیندا .

١٢٣- سوڵتان عبدالحمید کۆسپی بەهێزی بەردەم پیلانەکانی فەرمانڕەواکانی صەهیۆن بو ، بۆیە ئەوانیش کەوتنە هەوڵی هە ڵخەڵەتاندنی و دڵخۆش کردنی بەسامان ، بەلام نەیانتوانی ، سوڵتان دابینکاری یە پێویستی یەکانی دادەنا لە پێناو نەفرۆشتنی خاکەکانی نێو فەڵەستین بە جولەکە ، و لە شانو شکۆی خۆی هیچ پایەو پلەیەکی نەدەدا بە جولەکە تا نەبێتە هۆی زاڵبونی جولەکە بەسەر زەوی یەکانی فەڵەستیندا .

١٢٤- صەهیۆنی جیهانی کەوتە جولان بۆ پاڵپشتی کردنی دوژمنانی سوڵتان عبدالحمید کە ئەوانیش هەڵگەڕاوەکانی ئەرمەن و نەتەوەیی یەکانی بەلقان و بزوتنەوەی ئیتیحاد و تەرەققی بوون ، هەروەها ئەوان و لەگەڵ هەموو بزوتنەوەیەکی جیاخوازی لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەوەستان و پاڵپشتی یان دەکرد .

١٢٥- کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەققی توانی سوڵتان عبدالحمیدی دووەم لەسەر حوکم لابەرێت کە بەڕاستی ئەو کۆمەڵەیە لە پاڵپشتی چەند دەوڵەتێکی ئەوروپی و جولەکە و تاقمە ماسۆنی یەکانەوە بەرهەم هات بۆ گەیشتن بەو ئامانجە ( ئامانجی دژایەتی سوڵتان و سەرخستنی جوولەکە ) . بۆ ئەو ئامانجە بەدەست کەوت .

١٢٦- کۆمەڵی ئیتیتحاد و تەرەققی پاش شکست هێنانی لە جەنگی جیهانی دووەمدا نەیتوانی بەرنگاری هاوپەیمانان ببێتەوە و سەرکردەکانیان ناچار بوون ڕابکەن بۆ ئەڵمانیا و ڕۆسیا .

١٢٧- ئینگلیزو جولەکە توانی یان پاڵ بنێن بە مستەفا کەمالەوە تا سەرکردایەتی دەوڵەتی عوسمانی بگرێتە دەست ، ئەویش هەستا بەجێبەجێکردنی نەخشەیەکی کێشرا و کە بەوە مەرجەکانی کرزونی چوارەم هاتنە دی کە بریتی یە لە بڕینی هەموو پەیوەندی یەکی تورکیا بە ئیسلامەوە ، لەکارخستنی خیلافەتی ئیسلام بەتەواوەتی ، دەرکردنی خەلیفە و پشتیوانانی خیلافەت و ئیسلام لە وڵات و دەست بەسەراگرتنی ماڵ و سامانی خەلیفە و دانانی دەستورێکی شارستانی لەجێی دەستوری کۆنی تورکیا .

١٢٨- مستەفا کمال کەوتە هەوڵی شۆردنەوە و سڕینەوەی تورکیا لە بیروباوەڕ و ئیسلامەکەی و جەنگ و دژایەتی ئایین داری و تەنگەبەری خستنە بەر بانگخوازانی و بانگەشەی دەکرد بۆ سفوری و تێکەڵی ، بەڵام لە تورکیادا دەنگی ڕاستی بەتوندی بەرنگاری عەلمانی یەت بوویەوە و بزوتنەوەی سەعیدی نەورەسی و حیزبی سەلامەت بەدیارکەوتن کە دواتر ئەو حیزبە بوو بە حیزبی ڕەفاە . هێشتاململانێی نێوان ڕاستی و پوچەڵی و ڕێنمونی و گومڕایی و سەربەرزی و ڕسوایی بەتوندترین شێوە لە تورکیادا هەیە .

١٢٩- هۆکارەکانی کەوتنی دەوڵەتی عوسمانی زۆرن ، کەکۆی هەموویان دوورکەوتنەوە بوو لە فەرمانڕەوایی پێکردنی شەریعەتی خوا کە سەختی و دڵگرانی و ناخۆشی ژیانی ڕاکێشکرد بۆ تاکەکان و ئوممەتیش ، کاریگەری دوورکەوتنەوە لە شەرعی خوایش لەلایەنە ئایینی و کۆمەڵاتی و سیاسی و ئابوری یەکانیدا دەرکەوتن .

١٣٠- لادانی کۆتا سوڵتانەکانی دەوڵەتی عوسمانی لە شەرعی خوا و شلکردنەوەی گەلە ئیسلامی یەکانی ژێردەستیان لەفەرمان کردن بە چاکە و بەرپەرچی خراپەدا کاریگەری لە نێو ئەو گەلانەدا هەبوو و دوژمنکاری یە نێو خۆی یەکانی نێوان خەڵك زیاد بوون و دەروونەکان ڕووبەڕوی بە هیلاکدا چوون و ماڵەکان ڕوبەڕوی تالانکردن و زەوی یەکان ڕوبەڕوی دەستبە سەرداگرتن بوونەوە بەهۆی لە کارخستنی حوکموکانی خوا لە نێوانیاندا . ئیدی جەنگ و ئاژاوە و بەڵاکان هەڵگیرسان کە لەو ئەنجامەیدا دوژمنایەتی و ڕق و کینەیەك هاتە بوون کە تا دوای ئاوابونیشیان هەر تیایاندا مایەوە .

١٣١ – لەو سوننەتە خوایی یانەی لە مێژوودارپوو دەدەن ئەوەیە : ئەگەر خەڵك سەرکەش بن لەوکەسانەی کە خوا دەناسن ، ئەوا خوا کەسانێك زاڵ دەکات بەسەریاندا کە نایناسن ، بۆیە مەسیحی یەکانی زاڵ کرد بەسەر موسڵمانەکاندا و سەرکەوتنی ئوممەت دیار نەما و بێبەش

بوون لە دەستەڵاتدرای و کەوتنە نێو ترس و بیمەوە و بە دوایدا چەرمەسەری یەکان بەسەریاندا هاتن و شارەکان فەوتان و بێباوەڕان زاڵ بوون .

١٣٢- بەڕاستی ئوممەت توشی لادانێکی توند بوو بوو لەچەمکەکانی ئایینەکەیدا ، وەك بیروباوەڕی هۆگری و نەویستن ( الولاء والبراء ) و چەمکی پەرستش . هەروەها دیاردەکانی هاوەڵ دانان و بیدعە و ئەفسانەکان بڵاوبووبوونەوە .

١٣٣- لە گەورترین ئە لادانانەی لە مێژووی ئوممەتی ئیسلامیدا ڕوویاندا ، دەرکەوتنی سۆفیەتی لادەر بوو وەك هێزێکی ڕێکخراوی نێو کۆمەڵگەی ئیسلامی کە چەندین بیروباوەڕو بیرۆکە و پەرستشی دوور لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەر ( ﷺ ) ی هەڵگرت بوو ، جا سۆفیەتی لادەر بەهێزبوو و لە کۆتایی یەکانی سەردەمی عوسمانیدا سام و شکۆی زۆر زیادی کرد بوو .

١٣٤- زۆرێك لەزانایان بوون بە یاری دەستی فەرمانڕەوا زۆردارەکان و لەسەر بەدەستخستنی پیشە و پلان پێشبڕکێیان دەکردو ئەو ڕۆڵەی لێیان داواکرا بوو نەیانما ، ئیدی شتێکی ئاسایی بوو کە لە کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی دا زانستە ئایینی یەکان توشی چەق بەستویی و بە بەرد بوون بن . هەروەها زانایان گرنگی یاندا بە کورت کردنەوەی شەرح و پەراوێز و تەقریرەکان و دوورکەوتنەوە لە ڕۆحی ڕاستی ئیسلام کە لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەرەوە ( ﷺ ) درێژبوەتەوە . زۆرێك لە زانایانیش کردنەوەی دەرگای ئیجتیهادیان داخست ، و بانگەوازکردن بۆ کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد بوو بە تۆمەتێکی گەورە کە دەگەیشتە دانانی لە تاوانە گەورەکان و لای هەندێ لە خۆچوێنەرو کەسە بەستوەکاندا دەگەیشتە ئاستی کوفر .

١٣٥- ستەمکاریی لەدەوڵەتی عوسمانی دا بڵاوبوویەوە ، ستەمیش وەك نەخۆشی وایە لە نێو مرۆڤدا کەپاش ئەوەی ماوەی توانستی تێپەڕاند و هەر نەخۆش بوو . ئەوا مەرگی پێش دەخات . دە ئاوایش ستەم لە ئوممەتدا هیلاکی و لەناو بردنی پێش دەخات کە تیایدا چەند کاریگەری یەکی کاولکەر ڕوودەدات کە دەبێتە هۆی بە چەرمەسەردا بردنی و شلۆق بوونیدا لە ماوەیەکی دیاری کراودا کە خوای باڵادەستی تواناادار دەیزانێت ، بۆیە دەوڵەتی عوسمانی لە بوونیدا ئاوا بوو و هەروایش ئەوەی ئاوا بوونی دەوڵەتەکان پێش دەخات ، ڕۆچونیەتی لە نێو ئارەزوەکان و دنیاپەرستی و زۆر ناکۆکی و دووبەرەکیدا .

١٣٦- به دواى دەركەوتنەوەى ئوممەتيش له بەرنامەكەى پەروەردگارى چەند شوێنەوارێكى مەترسيدار هاتن وەك لاوازى سياسى و جەنگى و ئابورى و ڕەوشتى و كۆمەلأتى ، ئوممەتيش تواناكانى بەرنگارى و زاڵبوون بەسەر دوژمنانى لەدەست داو تووشى ئيستعمار بوو و شالأوى فيكرى له ڕوودا بەرپا كرا له ئەنجامى له دەستدانى مەرجەكانى دەسەلأتدارى و دووركەوتنەوەى له هۆكارە ماددى و مەعنەوى يەكان و نەزانى و بێئاگايى له سوننەتەكانى خوا لەمەڕ ڕاپەڕين وكەوتنى ئوممەتەكاندا . خوا دەفەرموێت ﴿ ولو أن أهل القرى ءامنوا و اتقوا لفتحنا عليهم بركت من السماء والأرض ولكن كذبوا فأخذنهم بما كانوا يكسبون ﴾ ( اعراف /٩٦) .

١٣٧- ئەو هەوڵەى كە دراوە نەوازشى يەو شياوى ڕەخنە و ئاڕاستەو ڕينمايى يە . ئەمە تەنها هەوڵێكى نەوازشى يە كە ئامانجى نيشاندانى هۆكارەكانى ڕاپەڕين و كەوتنى ئوممەتە ، نێوانى من و ڕەخنەگريش قسەى شاعيرە :

إن تجد عيبا فسد الخللا        جل من لاعيب فيه وعلا

له خوا دەپاڕێمەوە كە ئەو هەوڵە بە چاكترين شێوە قبووڵ بكات و بەرەكەتى تێ بخات و بيخاتە سەر ئەو كارە چاكانەم كە پێى نزيكم دەخاتەوە لە خۆى . ئەو برايانەيشم لە پاداشت بێبەش نەكات كە لە تەواو كردنيدا يارمەتيان دام ، ئەم كتێبەيش بە فەرمايشتى خوا كۆتايى پێ دێنم ﴿ ربنا اغفر لنا و لأخواننا الذين سبقونا بالأيمان ولاتجعل في قلوبنا غلا للذين امنوا ربنا إنك رءوف رحيم ﴾ ( الحشر : ١٠ ) .

شاعيريش دەڵێت :

انا الفقير إلى رب البريان ________ انا المسكين في مجموع حالاتي

انا الظلوم لنفسي وهي ظالمتي ____ والخير إن يأتنا من عنده يأتي

لا استطيع لنفسي جلب منفعة ______ولا عن النفس لي دفع المفسرات

والفقير لي وصف ذات لازم ابدا ________ كما الغني أبدا وصف له ذاتي

وهذة الحال حال الخلق اجمعهم __________ وكلهم عنده عبد له آتي

( سبحانك اللهم وبحمدك ، اشهد ان لاإله إلا انت ، استغفرك و اتوب إليك ) .

جەنگاوەرە فەتحکەرەکان لێکرا لە کاتێکدا کە سوڵتان جەنگی لەگەڵ سەفەوی شیعەی ڕافیزی دا دەکرد لە وولاتی فارس [1].

دەیەم : گەڕانەوەی خەیرەدین بۆ جەزائیر : خەیرەدین لە دوای شکانی لە تونسدا گەڕایەوە بۆ جەزائیر و یەکەم جار لە قوستەنتینیەدا جێگیر بوو ، لێرەوە خۆی ئامادە کرد بۆ بەرپاکردنی جیهاد دژ بە ئیسپانیا لەو برانەوەکە دەست نیشانی دەکردن و بە خەیرەدینەوە پەیوەست بوون ، بەکاتی لە شاری جەزائیردا جێگیر بوو لەبەر ئەو پابەند بوونانەی کە نەخشە نوێیەکە بەسەریدا دەچەسپاند ، وەك قبودان پاشا بۆکەشتیگەلی ئیسلامی عوسمانی کە شالی پێنجەم هەستی بە بوونی دەکرد تا بەرپەرچی ئەو لێدانەی تونس بداتەوە بە لێدانێکی هاوشێوە . بۆیە هەستا بە هێرش کردن بۆ سەر دورگەی ئیسپانیەکانی بلبار و کەنارەکانی باشوری تاگەیشتە گەروی جبل تاریق ، عەننان خۆی هەستا بە هێرش بردنە سەر کەشتیە ئیسپانی و پورتوگالیەگەڕاوەکان لە زەویەکانی ئەمریکاوە کە هەڵگری زێڕو زیو بوون ، ئەم ڕووداوانە هەموو نێوەندەکانی مەسیحیەتی هەژاند و شارل دودڵی و ڕاڕایی تێکەوت لە کاتێکدا کە وای دەزانی کە خەیرەدین هەرگیز خۆی بەهێز ناکاتەوە پاش ڕووداوی پێشووی تونس لە ٩٤٢ك ، ١٥٣٥ز دا [2].

لەلایەکی ترەوە دەوڵەتی عومسانی چووە نێو هاوپەیمانێتیەکی ڕەسمی لەگەڵ فەرەنسادا لەساڵی ٩٤٣ك ، ١٥٣٦ز کە ئەمەیش بە دژە هەڵوێستێك دادەنرێت بەسەر ئەو هێرشە دژایەتیەی کە ئیسپانیان پێی هەستا بۆسەر تونس [3].

---

[1] فتح العثمانيين عدن / ١٣٠ .

[2] حرب الثلاثمائة عام / ٢٢٧، ٢٣٦، ٢٤١، ٢٤٢ .

[3] جهود العثمانيين / ٣٢٣ .

بۆیـه واهاتـه پـێش و دەركـەوت كـه ئیمبراتۆیـەتی پـیرۆزی ڕۆمـانی لەلایـەن نـەیار فەرەنـساو عوسمانیەكانـەوه گـەمارۆ دراوه ، كـه بوویـه هـۆی سـەرلەنوێ سـەرهەڵدانەوەی جەنگـەكانی نێوانیـان ، هـەروەك ئامانجـەكانی ئیـسپانیا و پورتوغـال بووبەیـەك ، ئەمـەیش لـه داگیر كردنـی مەڵبەنـدەكانی ڕۆژئاوادا لەگـەڵ بوونی ترسیان له پێشڕەوی عوسمانیەكان بو نیمچه دورگەی ئیبیری .

دیبلۆماسیەتی پورتوگالی و هەڵوەشاندنەوەی یەكڕیزی له باكوری ئەفریقیادا :

ئەحمەد وەطاس توشی شكست بوو له ٩٤٣ك ، ١٥٣٦ز له ڕووی سەعدیەكاندا له ناوچـەی ( بیرعقبـه) لـەنزیك ( وادی العبیـد ) . پـشێوی لـه هـەموو سـوپادا بـڵاو بوویەوه ، بەهۆی ئەو شكستەوه ئەحمەدی وەطاسي له پورتوگـال نزیـك بوویـەوه ، ئەمــەیش لـه ئـەنجامی هەسـتكردنی بـه سـەرقاڵ بـوونی عوسمانیـەكان لـه جەنگەكانیاندا دژ به ئیسپانیا ، بۆیه له گەڵیاندا گرێبەستێكی بەست بۆ ماوەی ١١ساڵ كه بارودۆخی ڕۆژئاواییه نیشتەجێكانی ناوچەكانی ئەهیلا و طنجة و ( القصر الصغیر) ی دەخستە ژێر دەسەڵاتی قەڵەمڕەوی پاشای فاس ، هەروەك بۆ ژێردەستە بازرگانه دەریاییەكانی پاشای وەطاسي هەبوو كه بچنه ئەو ناوچانەوه به مەرجی نەبونی بازرگانی چەك و شمەكه مەترسیدارەكان .

ئەگەر پاپۆڕە عوسمانی یان فەرەنسی یان شوێنكەوتوەكانی مەسیحیەكانی جگه له ئیسپانیا و پورتوگالیەكان هاتن بۆ خاكی پورتوگالیەكان به شمەكەوه ، ئەوا ڕۆژئاواییەكان هیچیان لێناكرێن ، هەروەها لەمەڕ ڕۆژئاواییەكانیش دەبێت شمەك له عوسمانیەكان نەكرن تادەست بەسەر دەستكەوتەكاندا بگیرێت و ئەملاو لایان پێ بكرێ تا هێزەكانی دوژمن هەلی هێرش كردنه سەریان بۆ نەڕەخسێت [1] .

هــەروەها پورتوگالیــەكان هــەوڵی بەســتنی گرێبەســتی كاتیــان دا لەگــەڵ سـەعدیەكاندا ، بۆیـه وەفـدێكیان نـارد بـۆ مـەراكیش بـۆ دانوسـتان لەگـەڵ مـەولا

---

[1] جهود العثمانيين / ٣٢٣ .

ئەحمەدی ئەعرەجدا کە ئامادەبوو ، چونکە ئەو پێویستی بە ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەتە تازە پێگەیشتەوەکەی هەبوو بەتایبەت پاش ئەو سەرکەوتنانەی کە نەیارە وەطاسیەکانی بەدەستیان هێنا لە ناوچەی بیر لەدوای ٩٤٣ك ، ١٥٣٦ز . پورتوگالیەکان لەگەڵ سەعدیەکاندا ڕێککەوتن بۆ بەستنی گرێبەستی کاتی لە نێوانیاندا لە ٢٥ی ذي القعدة ی ٩٤٤ك ، ٢٥ی ئەپریلی ١٥٣٧ز بۆ ماوەی سێ ساڵ لەگەڵ ئاڵوگۆڕپێکردنی بازرگانی نێوان ژێردەستەکانی هەردولا دا گرێبەستەکە بەسترا [١] .

ئامانجی پورتوگالیەکان لە نزیکبونەوە لە وەطاسیەکان و سەعدیەکان حەسانەوەیەکی کاتی بوو بەبێ بونی یارمەتیەکی دروستی نێوان عوسمانیەکان لە لایەك و وەطاسی و سەعدیەکان لە لایەکی ترەوە ، چونکە هەرهاوکاریەك لە لایەن ئەوانەوە واتای هەڕەشەیە بۆ سەر بەرژەوەندیەکانی نیمچە دورگەی ئیبریە لە ڕۆژئاوادا . گرنگتر لەوە ترسی ئیسپانیاو پورتوگال بوو لە پێشڕەوی کردنیدەوڵەتی عوسمانی بۆ نێو نیمچە دورگەی ئیبریەو هێنانەدی ئامانجەکانی لە گەڕاندنەوەی ئەندەلوس دا [٢] .

## باسی پێنجەم

## موجاهیدی گەورە حەسەن ئاغای طوشی

خەیرەدین بربروسە سەرقاڵ بوو بە حوکمکردنی پایەکەی قبودان پاشا وەکە کارکردن بوون لە کەشتیگەلی عوسمانیدا ، چالاکی لە حەوزی ڕۆژهەلاتی دەریای ناوەڕاستەوە دەستی پێکرد . لە کاتێکدا حەسەن ئاغای طوشی بەردەوام بوو لەو پایە دەسەلاتەیدا کە بە جێگری بیلریك دانرابوو ئیشی دەکرد بۆڕا وەدوونانی جەردە ئەوروپیەکان . لەم پێناوەشدا هەر ڕێگەیەکی چاکی گرتەبەر ،

---

[1] جهود العثمانيين / ٣٢٤ .

[2] جهود العثمانيين / ٣٢٤ .

کەسێتی ئەو لە جەزائیردا نمونەیەکی دیاریپاڵەوانێتی و قوربانیدانی ئیسلامی بوولە پێناو بەرگری کردن لە ولاتانی ئیسلام لە باکوری ئەفریقیادا . بەمە جەزائیر شکۆداری وبڵندیەکی بەدەست هێناو وای کرد گەلانی مەسیحی ڕاکەڕاکەیان بێت ( پەلە بکەن لە ڕۆشتن ) بۆ لای شاهەنشاهی گەوەر یان ئیمبراتۆر شارلی پێنجەم تاداوای ڕزگاری و فریاکەوتنی لێبکەن ،بەهۆی دەسەلاتەکەیەوەو و بچنە ژێر ئالای ئەوەوە لە نێو ئەوانەشدا پاپا پۆلی سێیەم بوو .

شارلی پێنجەم لە ٩٤٦ك ، ١٥٣٩زدا هەوڵیدا ڕێککەوتنێکی کاتی ببەستێت لەگەڵ خەیرەدین بروسە ، بەلام هیواکەی سەری نەگرت [1] .

هەروەك چۆن لە هەوڵی یەکەمیدا سەرنەکەوت کاتێك بە نهێنی دانی نابە خەیرەدیندا وەك فەرمانڕەوای باکوری ئەفریقیا لە بەرامبەر سەرانەیەکی کەمدا .

شارلی پێنجەم کە هەستا بە هاوپەیمانیەتی ئیسپانی جەزائیری، هیوای وابوو سەنگەرگیری هاوپەیمانێتی فەرەنسی عوسمانی پێبکات و ئیش بکات لە سەر جیاکردنەوەی باکوری ئەفریقیا لە ئەستانبوڵ بەو هیوایەی ئەگەر ئەوەی هێنایەدی ئیدی باکوری ئەفریقی هەرگیز ناتوانێت دەست بکات بە بەرگریەکی بەهێز ، بەوەش کەوتنی ئاسان دەبێت [2].

حەسەن ئاغا طوشی تەواو کەوتە پتەوکردنی ئاسایش و دانانی بنەڕەتەکانی بەڕێوە بردنێکی جێگیرو هەوڵی کۆکردنەوەی لایەنەکانی ولاتی دا بەدەوری دەسەلاتی مەرکەزی جەزائیریدا [3] .

---

[1] تأريخ الجزائر العام : ٣/٦٣،٦٢ .

[2] تأريخ الجزائر الحديث /٣٥ .

[3] حرب الثلاثمائة سنة / ٢٧٩ .

جا شاری موستەغانمی ملکەچی دەوڵەتەکەی کرد ، پاشان بەرەو باشوری ڕۆژهەلات پێشڕەوی کردو دەستی گرت بەسەر پایتەختی ( زاب بەکرە ) و دەوربەریدا ، لەوێدا قەلایەکی پتەوی دروست کرد و پارێزەری بۆ دانا .

لە مانگی جەمادی یەکەمی ٩٤٩ك ، سێبتەمبەری ١٥٣٩ز دا سوپای عوسمانی چووەوە نێو دەریا کە نزیکەی ١٣٠٠ پیاو بوون لە نێو ١٣کەشتیدا و بەهۆیەوە بەرەو ئیسپانیا بەڕێکەوتن . حەسەن ئاغاو سوپاکەی لە وشکانیدا دابەزین و شارەکەیان داگیرکردو تیایدا سەقامگیر بوون و هەرچی خێرو داهات و ڕۆزی و دەستکەوتی بوو دەستی گرت بەسەریدا بۆ موسڵمانان، هەروەها چووە نێو بەرەکانی کەناری باشوری ئیسپانی و ئەو ماڵ و سامان و شمەکەی ئیسپانیا کردە دەسکەوت کەکەوتە ژێردەستی یەوە. لە نێوانیاندا دەستەیەك لە دیل و ( سەبایا) کانی هەڵبژارد تا لە شارە ڕۆژئاواییەکانی باکوردا بەتایبەت لە تەطواندا بیانفرۆشێت و دواتر بگەڕێتەوە بۆ مەیدان ، کاتێك ویستی بگەڕێتەوە بۆ جەزائیر ڕێگەیەکی بنیادی ئیسپانی بە ژمارەیەکی زۆرەوە بەرەنگاری بوونەوە و جەنگ لە نێوان هەردوو هێزدا ڕوویدا کە زۆر پشێوو توندو سەخت بوو بویە هۆی چونە ژێرئاوی ژمارەیەك لە کەشتیەکانی هەردولا ، لەگەڵ ئەوەدا زیانەکانی ئیسپانی لەوجەنگەدا زۆر گەورەتربووە [1] .

شارلی پێنجەم سوربوو لەسەر ئەوەی هەستێ بە هێرشێکی سەربازی کە ئامانجی زاڵبوون بوو بەسەر بزوتنەوەی جیهادی ئیسلامیدا لە حەوزی ڕۆژهەلاتی دەریای ناوەڕاست . پێش ئەوەی دەست بکات بە جێبەجێکردنی هێوریەکی نیمچەیی کیشوەری ئەورووپی گرتبوویەوە بەهۆی بەستنی ڕێککەوتنی کاتی ( نیس ) لە موحەڕەمی ٩٤٨ك هاوکاتی ١٥ی مانگی ئۆکتۆبەری ١٥٤١ ز ەوە کاتێك حەسەن ئاغای طوشی بینی شارل نیازی چیە ، لە دیوانەکەیدا لەگەڵ

---

[1] حرب الثلاثمائة سنة / ٢٨٠ .

ناوداران و گەورەپیاوانی دەوڵەتدا کۆبوویەوە و هانی دەدان لەسەر جیهاد و بەرگری کردە لە ئیسلام و نیشتمان بەو وتەیەی : ( ... بەڕاستی دوژمن گەیشتوە پێتان تا کوڕو کچەکانتان بفڕێنێت . جا لە پێناو ئەم ئایینە پاکەدا خۆتان شەهید بکەن ... ئەو زەویانە بەهێزی شمشێر فەتح کراون و پێویستە بپارێزرێن ، پشت بەخوا سەرکەوتن هاودەممانە ، ئێمە ئەهلی ڕاستی و حەقین ...) موسوڵمانانیش دۆعایان بۆکرد و پشتگیریان کرد بۆ جیهاد کردن دژی دوژمن ، پاشان حەسەن ئاغای طوشی دەستی کرد بە ئامادەسازی سوپاکانی و سازدانیان بۆ جەنگ [1] .

لە لایەکی ترەوە ئیسپانیا دەستی کرد بە ئامادەکردنی ڕیزەکانیان ، شارلی پێنجەم سەری سوڕما لە ئامادەسازیەکانی حەسەن ئاغاو دەیویست گاڵتەی پێبکات ، بۆیە فەرمانی کرد بە نوسەرەکەی تا دەقێك ئامادە بکات بۆ حەسەن ئاغا کەتیایدا هاتبوو : ( ... تۆ دەمناسیت کە من سوڵتانم ، هەموو میللەتی مەسیحیەکان لە ژێر دەستمدایە ، ئەگەر دەتەوێت بەرەوڕووم بیتەوە ، ئەوا ڕاستەوخۆ قەڵاکەم بۆ بدە بەدەستەوە ، خۆت لە دەستم ڕزگار بکە ،گەرنا فەرمان دەکەم بەردەکانی قەڵاکە بخەمە نێو دەریاکان و نەگەورەیی و نە قەڵاکەو نەتورکەکانت بۆ نەمێننەوە ، هەموو شارەکانیش کاول دەکەم ...) . ئەو دەقە گەیشتە حەسەن ئاغا ، ئەویش وەڵامی دایەوە : ( .... من خزمەتگوزاری سوڵتان سولەیمانم ... وەرە قەڵاکە وەربگرە ، بەڵام ئەم وڵاتە خوو و نەریتێکیان هەیە کە ئەگەر دوژمن هات بۆیان جگە لەمردن هیچی تر نابەخشن ) [2] .

لە گێڕانەوەیەکی تردا : ( ئیسپانیا جارێك لەسەردەمی عوروجدا جەنگی کرد لەگەڵ جەزائیر ، لەسەردەمی خیرەدینیشدا جارێك بەڵام ، هیچی بەدەست

---

[1] جهود العثمانيين / ٣٢٦ .

[2] جهود العثمانيين / ٣٢٦ .

نەکـەوت ، بـەڵکو مـاڵ و سـامانی لەدەسـت چـوو و سـەربازەکانی لەناوچـوون ، بەویستی خوا جاری سێیەمیش تۆیش هەرئەوە بەدەست دەهێنیت )[1] .

لەوشەوەدا نوێنەرێکی والی جەزائیر گەیشتە سەربازگەی شارلەگان و داوای لـێ کرد ڕێگە بدات بە ئازادی چوونی هەرکەسی لـە خـەڵکی دورگەکـە کـە دەیانـەوێت بڕۆن ، بەتایبـەت ئافرەتـان و منداڵـەکانی بـە چوونەدەرێ لەشارەکە لـە ڕێگـەی ( بـاب الـوادي ) یـەوە . شارلەگان زانـی پـارێزەری جـەزائیر سـوورە لەسـەر بـەرگری کردنی بەردەوام ، و مەحاڵە جەزائیر داگیر بکات مەگەر بە تەواوی وێرانی بکـات ، ئیمبراتـۆریش تائـەو کاتـە تـۆپی گـەمارۆدانی بـەکار نـەهێنابوو ، بەمـەیش نەیدەتوانی بە تۆپ جەزائیر تۆپ باران بکـات ، لـە هـەمان کاتـدا موجاهیـدەکان لـە هەموو شوێنێکەوە گورزە کوشندەکانیان ئاراستەی هێزە ئیسپانیەکان دەکرد. تا یەك لەسوارەکانی مـالطـة لـە قسەکانیدا لـە بـارەی جەنگەکـەوەوتـی : ( بەڕاسـتی ئەو ڕێگەیەی جەنگ دای هەژاندین ، چونکە ئێمە پێشتر نەماندەزانی و شـارەزای نەبووین )[2] .

ژمارەی موجاهیدەکان بـەردەوام زیـادی دەکـرد بـەو هۆیـەی کـە تـەنها بـە بیـستنی دابـەزینی هێـزە ئیـسپانیەکان جـەنگاوەرەکانیان لـە هـەموو لاوە دەردەپـەڕین ، موجاهیـدەکان سـودیان دەبـینی لـە وەشـاندنی گورزەکانیانـدا بـەهۆی شـارەزایی وردو تەواویان بەخاکەکە و بەکارهێنانیان بە هۆی تایبەتمەندییان بە شێوەیەکی باش . خـوای گـەورە بـاران و ڕەشـەباو شەپۆلەکانی بۆ سـەربازانی ئیسلام دابین دەکـرد (لەبەرژەوەنـدیان ) ڕەشـەبای گـەردەلولێك چـەند ڕۆژێـك بـەردەوام بـوو و چـادرەکانی سـەربازانی هێرشـبەری پێچانەوەو کەشـتیەکان هەنـدێکیان دەیانـدا بەهەنـدێکی تریانـدا کـە بـووە هـۆی چـوونەژێرئاوی زۆرێکیـان . شـەپۆلە دەنـگ

---

[1] خيرالدين بربروسة / ١٠٨ .

[2] خيرالدين بربروسة / ١٠٨ .

ترسێنەکانیش هەندێ لە کەشتیەکانیان بەرەو کەناری دەریاکە فڕێ دەداو بەرگریکەرە موسوڵمانەکانیش هێرشیان دەرکردنەسەر و دەستیان دەگرت بەسەر ئامێرو خەزێنەکانیدا . بارانیش باروتەکەیانی لەکار دەخست ، لە نێوەندی ئەو کارەساتانەدا ، ئیمبراتۆر هەوڵی هێرش کردنەسەر شاری جەزائیری دا ، بەڵام هەموو هەوڵەکانی شکستیان خوارد )[1] .

پاڵەوانیەتیەکی بێوێنە لە سەرکردە ( الحاج الکبیر) ەوە دەرکەوت کە توانی بەسەربازەکانیەوە مەسیحیەکان بەدلێریەکی سەرکەوتوانەو نەبەردیەکی کەموێنەو پاڵەوانێتیەکی بێوێنەوە پاکتاو بکات . بەڕاستی سەرکردایەتی سەربازی جەزائیری توانی سود لەو بارە گەمارۆدراوەی مەسیحیەکان وەربگرێت و سەربازەکانی بەڕێگەیەکی تایبەتی ( کرّ و فرّ ) ئاراستەبکات کە بەشێکی گەورەی دوژمنەکانی لەناو برد و ئیمبراتۆری ناچار کرد بە پاشەکشەکردن لەگەڵ ئەو سەربازانەی تری دا بەو بڕە کەشتیانەی کە بۆیان مابوونەوە و بە کەشتیگەلەکەیەوە لە جیاتی ئیسپانیا بڕۆن بەرەو ئیتالیا .

ئەو هۆکارانەی بوونە یارمەتی دەری شکست هێنانی ئیمبراتۆر ، سەرکردایەتی پێگەیشتوانەو کۆبوونەوەی گەلی جەزائیری بوو بەدەوریدا لەگەڵ دەرپەڕینی پیاوانی هۆزەکان بەرەو مەیدانی جەنگ بە داخوازی شەهید بوون لە ڕێگەی خواو پارێزگاری کردن لە ئیسلام و موسوڵمانان . خەڵکی دورگەکە ئەو شکانەیان بەوێنەی شکانی یارانی فیل چواند کە لە قورئاند هاتووە ، جا لە نامەیەکدا کە ئاراستەی سوڵتان سولەیمانیان کردووە دەڵێن : ( خوای گەورە شارلی پێنجەم و سەربازەکانی بە تۆڵەی یارانی فیل تۆڵە لێکردەوە و فڕوفێڵیانی کردە گومڕایی و ڕەشەبایەکی گەردەلولی و شەپۆلێکی تێکشکێنەری بۆ ناردن کە خستنیە

---

[1] الدولة العثمانیة ، دولة إسلامیة : ٢/ ٩١٩ .

کەنارەکانی دەریا بە شێوەی دیلی یان کوژراوی ، جگە لە کەمێکیان نەبێت هەموو خنکان )[1] .

دانیشتوانی جەزائیر –ئایا خەڵکانی سەرەکی و ڕەچەڵەکی هەرێمەکەبن یان ئەو موسوڵمانە ئەندەلوسیابن کە بە ئایینەکەیانەوە بەرەو جەزائیر ڕایان کردبوو – هەستان بە ناردنی نامەیەك لە مانگی داهاتوودا بۆ سوڵتان سولەیمان لە مەڕ شکانی شارلی پێنجەم . ئەو نامەیە ئەو بارودۆخە نالەبارو لەناکاوەی ڕوون دەکردەوە کە گەمارۆی ئەو موسوڵمانانەی دابو کە پارێزگاریان لە ئایینەکەیان دەکرد لە ئیسپانیادا پاش ئەوەی لاپەڕەی حوکمی ئیسلامی لە ئەندەلوس پێچرایەوە ، لەگەڵ ڕووبەڕوو بوونەوەی ستەمی دەسەڵاتە مەسیحیەکان و دادگاکانی دیوانی بەدواداچوون –دادگاکانی پشکنین – و سوتاندنیان ، نامەکە باس لەو خزمەتگوزاریە بەرزو بەنرخانە دەکات کە خەیرەدین پاشای موجاهیدی ڕێی خوا و سەرخەری ئایین و شمشێری خوایی دژ بە بێباوەڕان بەجێی گەیاندوون لەپێناو ئیسلام دا ) .

هەروەها نامەکە دەیوت : خەڵکی ئەندەلوس پێشتر داوای فریاکەوتنیان لێکردووە ، ئەویش چوو بەدەمیانەوە ( کە بوویە هۆکارێك بۆ ڕزگاربوونی زۆرێك لە موسوڵمانان لەدەست بێباوەڕە هەڵگەڕاوەکان و گواستنەوەیان بۆ خاکی ئیسلام ) بەمە بوونە ژێردەستەی دڵسۆزی دەوڵەتی عوسمانی . نامەکە دوو داواکاری سەرەکی دەستنیشان کردبوو :

١. ناردنی فریاگوزاری یە سەربازەیی یەکان ( بۆ سەرخستنی جەزائیر ، چونکە دیواری ئەهلی ئیسلام بوو ، سزاو سەرقاڵی ئەهلی بێباوەڕی و سەرکەشیش بوو ، کە بەناوی پیرۆزتانەوە لەژێر قەڵەمڕەوی پایەی بڵندی

---

[1] الدولة العثمانية ، دولة إسلامية : ٢/٩٢٠ .

ئێوەدا مۆر کرا کە دڵە شکاوەکان پێی عیززەتمەند دەبن و ژێر دەستە هەمەجۆرەکانیش تەواو هۆگری دەبن )[1] .

٢. گەڕاندنــەوەی خــەیرەدین پاشــا بــۆ پایەکــەی پێــشووی –بەگلەربــەگی جەزائیر– ( چونکە جێبە جێکاری فەرمانەکانی گەورەمانە چونکە ئەو ئەم وولآتـەی زینـدوو کـردەوە و دڵـی بێبـاوەڕانی تۆقاند و مـاڵی هەڵگـەڕاوەو هەڵهاتوانی کاول کرد ، ئەو سەرخەرێکی چاك بوو بۆ ئەم ولآتە و هەموو هاوەڵدانەران لێی دەترسان و دەتۆقان )[2] .

خەیرەدین بربروسە گەیشتە شاری جەزائیر بۆ بەشداریکردن لە بەرگری لێکردنی ئەو ناوچەیە تا بەتەوفیقی خوا بۆ موسوڵمانان و پەیمان پێدانی موسڵمانان سەرکەوێت کە بەسەرکەشتیگەلی ئیسپانیا دا . بەو لەدەست دانی کاروباری بەگلەربەگیەوە وەستاو ئاگاداری بەڕێوەچوونی کارەکانی بوو ، پاشان بە کەشتیگەلەکەیەوە بەرەو وولآتی ئیسپانیا چوو تا سزایەکی سەخت و دەردناکی توش بکات . سوڵتان سولەیمان پلەی پاشایەتی بەخشی بە حەسەن ئاغای طوشی بە هۆی ڕۆڵی کاریگەری لە سەرکەوتن و چۆڵکردنی دەریای ناوەڕاست لە کەشتیگەلی ئیسپانی کە برینەکەی دەپێچایەوەو هەوڵی گێڕانەوەی هێزەکەی دەدا ، جا کەشتیە عوسمانیەکان بەرەو کەنارە ئیسپانی و ئیتالیەکان دەرچوون و لەوێ چەند جەنگێك بە دوای یەکدا ڕوویاندا . ترس و بیم ئەو ناوچانەی گرتەوە کە بەڕوی عوسمانیەکاندا بەکراوەیی مابوونەوەو لەوێ شەپۆلیان دەهاویشتە ناوی و ئەوەی تیایدا بوو بە دەستکەوتیان دەگرت[3] .

---

[1] الدولة العثمانية ، دولة إسلامية : ٩٢١/٢ .

[2] الدولة العثمانية ، دولة إسلامية : ٩٢١/٢ .

[3] حرب الثلاثمائة سنة / ٢١٣ .

هـەروەك دەوڵەتـە ئەوروپيـەكان حيـسابێكيان بـۆ عوسمانيـەكان دەكـرد ، بەمـە مەڵبەنـدی ئيـسپانيا لـە وەهـران و ناوچـەكانی تـری ژێـر قەڵـەمڕەويان لـە باكوری ئەفريقيدا هەژاند و كەوتە لەرزين [1] .

لـە لايـەكی تـرەوە سـەعديەكان سـەركەوتنێكی گـەورەيان بـە ديهێنـا بەسـەر پورتوگاليەكانـداو قـەڵای سـانتاكروزيان فـەتح كـرد ، كـە جـانی سـێيەم پاشـای پورتوگـالی ئـەم هەواڵـەی بيـست يەكـسەر فـەرمانی بـە پـارێزەرانی ئاسـفی و ئەزموركرد كە بەجێی بهێڵن . لەم بارەدا پاشا جانی سێيەم باڵوێزی خۆی نارد بۆ مەدريد بە نامەيەكی تۆماری مێژوويی لە ٢٢ی ڕەمەزانی ٩٤٨ك ، ديسەمبەری ١٥٤١زدا كـە تيايـدا شارلی پێنجـەمی ئيمبراتـۆری ئيـسپانی ئاگـادار دەكرێتـەوە بـەوەی باسـی ئـو هۆكارانـە دەكـات كـە پورتوگـالی ناچـار كـرد بـە بڕيـاری بەجێهێـشتنی دوو بنكـەی ئاسفی و ئـەزمور . بە زيـاد لـە باری نالـەباری ئـەوێ، هێزەكـانی سـەعديەكان بـەهۆی يارمەتيـە عوسمانيەكانـەوە زيادبـان كـرد و فـەرمانڕەوای سـەعدی بويـە خـاوەنی تـۆپی عوسمـانی و ئامێرە جەمگيـەكان كـە چـەندين سـەربازی مەشـق پێكـراوی لەگەڵـدا بـوون ، ئـەم يارمەتيانـە لـەكاتی ئابڵۆقـەدانی سانتاكروز دا دەركـەوتن كـە پارێزگـاری كـردبن ئـەودوو مەڵبەنـدەی كردە كارێكی سەخت و گران ، پاشان بەجێهێشتنی ئاسفی و ئـەزموور بـە واتـای بەجێهێشتنی ڕۆژئـاوا نـەبوو ، چـونكە فـەرمان بۆلـە دەرچـوو بتـەوكردنی مازكـان ئەويش بە هۆی ئاسانی بەكارهێنانی بەندەرەكەی بە درێژايی ڕۆژانی ساڵ [2] .

لەمـەوە مـاوەی گرنگيـدانی دەوڵـەتی عوسمـانی دەردەكـەوێت بـە پێشكەشكردنی يارمەتی هێزە ئيسلاميەكان لـە ڕۆژئـاوا دادژ بـە مەسـيحيەكانی ئـەوێ ، ئـەوەيش چونكە دەوڵەت دەيويست پشتەوەی بێ خـەم و دڵنيا بكـات تـا هـەڵی هێرشـی بـۆ

---

[1] المغرب العربي الكبير / ٩ .

[2] جهود العثمانيين / ٣٢٨ .

هەڵکەوێ ، لێرەدا دەوڵەت خوازیاری یارمەتی سەعدیەکان بوو تا کۆتایی بەبوونی پورتوگالی بهێنن لە مەڵبەندە باشوریەکانی ڕۆژئاوادا و دواتر تێپەڕبن بۆ ئەندەلوس ، چونکە ڕۆژئاوا نزیکترین خاڵی تێپەڕبوونی دەنواند [1] .

سەرەنجامی شارلەگان : شکستی شارلەگان ( شارلی پێنجەم ) لە هێرشەکەیدا بۆ سەر جەزائیر ، کاریگەریەکی قووڵی هەبوو نەوەك تەنها بۆ سەر ئیمبراتۆریەتی ئیسپانی و پاشایی شارلەگان ، بەڵکو لەسەر ئاستی ڕووداوە جیهانیەکاندا . شیعری عەرەبی ئەو ڕووداوە تۆمار دەکات کە لە بارەیەوە ووتراوە :سلوا شارلكان

کم رأى من جنودنا فليس له الا هم من زواجر

فجهز أسطو لاوجيشا عرمرما ولكنه قد اب اوبة خاسر

هەواڵەکانی شکست وەك هەورە بروسکە دابەزینە نێو ئەوروپا ، لەوێدا ڕوداوەکان بەپەلە گەشەیان سەند ، هیچ هاوپەیمانێك نەمایەوە بۆ ئیمبراتۆر جگە لە هنری سێیەم پاشای ئینگلتەرا کە دایە پاڵ پاشای فەرەنسا دۆق دی کلیف و پاشای دانیمارك و پاشای ئیسکەندنافیا ، فەرەنسیەکان زۆر دڵخۆش بوون، چونکە شکست و کەوتنی جەزائیر دەبویە هۆی بێ هیوایی ڕوخان و کەوتنی فەرنسا ، فرانسوای یەکەم کە پاشای بوو ، کەوتە بەستنی چەند گرێبەستێك لەگەڵ سوڵتانی عوسمانیدا ، هەروەها ئەم کارەیش چەند ئەنجامێکی مەعنەوی ( دەرونی) هەبوو لە نێوخۆی باکوری ئەفریقیادا ، لەئەوروپایش ( ترسی موسوڵمانەکان لە دڵی خەڵکی ئەوروپادا بۆ ماوەیەکی درێژ مایەوە ) .

شارلی پێنجەم نەیتوانی بیر بکاتەوە لە هێرشێکی تر دژ بە جەزائیر ، سامی خەیرەدین و حەسەن ئاغا زاڵبوو بەسەر هەموو گشتی و تاکی خەڵکدا تائەوەی خەڵك ئەگەر لە دوورەوە کالانێکیان بدیبایە دەیاندایە پاڵ خەیرەدین و هاوار

[1] جهود العثمانيين / ٣٢٨ .

بەرز دەبوویەوەو قیژەو گریانیان زیادی دەکرد و دانیشتوان لە ماڵ و کێڵگەو پێگە بازرگانیەکانیاندا ڕایان دەکرد ، ئەگەر ڕەشەبا کەشتیەکی لەناوبردایە ، خەڵکی دەترسان و وایان دەزانی خەیرەدین بربروسە بووە کە دەریای هەژاندووە وروژاندویەتی و بەرەو ژێر ئاوخستنی کەشتیەکانی بردووە . ترس لەسەرکردەکانی جەزائیر گەیشتە ئەوپەڕ تا خەڵکی ئیسپانیا و ئیتالیا ئەگەر تاوان یان دزی یان ناپاکی و خراپە یان کاولکاری یان نەخۆشی یان دەرد یان نەهاتی ڕووی بدایە دەیانووت : خەیرەدین و هاوەڵەکانی هۆکاری ئەوەن [1] .لە پرمەی گریانیاندا دەیانووت :

| | |
|---|---|
| بربروسة | بربروسة |
| انت صاحب | كل شرّ |
| ما كان من | الم ،او عمل |
| مؤذن وجهنمي | مدمر |
| الا والسبب | فيه |

*مردنی حەسەن ئاغای طوشی : حەسەن ئاغای طوشی بەردەوام بوو لە هەستان بە ئەرکی پیرۆزی تاکاتی مردنی لە ٩٥١ك ، ١٥٤٤زدا ، خەڵکی دیوانیش لە جەزائیردا کۆبوونەوە بۆ دانانی حاجی بکیر لە شوێنیدا ، هەروەها بابی عالی لە ئەستانبول فەرمانڕەوایی نوێی دەستنیشان کرد کە حەسەنی کوڕی خەیرەدینی دەستنیشان کرد و لەهەمان ساڵدا چوویە شوێنەکەی [2] .

باسی شەشەم

*موجاهید حەسەنی کوڕی خەیرەدین بربروسە

حەسەنی کوڕی خەیرەدین لە گەڵ گەیشتنیدا دەستی کرد بە خۆئامادەکردن بۆ جیهاد و بەرەنگار بوونەوەی مەسیحیەکان ، بۆیە کەوتە پتەوکردن و بەهێزکردنی

---

[1] خيرالدين بربروسة / ٢٠٠ .

[2] تأريخ عام الجزائر : ٣/ ٨٤ .

شاری جەزائیر ، ئەوەیش لەو ناوچانەدا کە هێرشی شارلی یەکەم لاوازی نواند بوو ، هەروەك کەوتە پتەوکردن وچەسپاندنی نیزام لە جەزائیر و نێو ڕیزەکانی سوپادا .

پاشان کشایەوە بۆ چارەسەری کێشەی تلمسان کە بۆی دەرکەوت مانەوەی بنەماڵەی زیانی و بونی ئیسپانیا لە وەهران چارەسەری کێشەکە پەك دەخەن [1] .

فەرمانڕەوای تلمسان ( أبو زيان ) ئەحمەدی دووەم فەرمانڕەوایی گرتەدەست بە پاڵپشتی عوسمانیەکان ، بەڵام ئەوەبوو ملی کەچ کرد بۆ پلانە دەرەکیەکان و کەوتنەشوێن دەستەکەیان و لە ئیسپانیا نزیك دەبوویەوە کە بوویە هۆی ناڕەزایی خەڵکەکە لێی ،و بڕیاریاندا لەسەر کورسی دەسەڵاتەکەی لایبەرن و بەیعەت بدەن یەك لە براکانی حەسەن . بۆیە {ئەبووزییان} بەرەو وەهران چوو بۆ داوای پاڵپشتی لە ئیسپانیا و پەیمان پێدانیان بەوەی وابەستەی هۆگربوونیان بێت ، بۆیە فەرمانڕەوای وەهران بڕیاری قۆستنەوەی ئەو هەلەی داو سوپایەکی ئامادەکردو هەموو ملکەچانی ئیسپانیایش لە بەنوعامر و فلیتە و بەنو ڕاشید و لەسەرو هەموویانەوە سەرکردە مەنصوری کوڕی بوغنام دایانە پاڵی و بەرەو تلمسان پێشڕەویان کرد بۆ دوورخستنەوەی حەسەن و دووبارە دانانەوەی ئەبو زیان لەسەر کورسی دەسەڵاتی شارەکە . کەحەسەنی کوڕی خەیرەدین بە بزاوتنی هێزی ئیسپانی زانی ، سەرکردایەتی سوپای ئیسلامی کرد لە تلمسان تاکوو ڕێگری ئیسپانیا بکات بۆ گەیشتن بەئامانجیان . حەسەن لەمەدا سەرکەوت ،بەڵێ ئەو کەسەی کە بە دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی دەناسرا پاڵپشتی پاشا حەسەنی هاوپەیمانی کرد لە تلمسان دا [2] .

---

[1] تأريخ الجزائر الحديث / ٣٨، ٣٩ .

[2] الجزائر والحملات الصليبية / ٢١، ٢٢ .

هـــەروەها پاشـــا حەســـەنی کـــوڕی خـــەیرەدین پـــارێزەرێکی عوسمـــانی دانابەســەرکردایەتی ســەرکردە محمـد لـە قـەڵای میـشواردا لـە تلمـسان ، لەگـەڵ ئەوەدا قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانی لەدەرەوەی تلمساندا دەلەری یـەوە بەهۆی تەنگەبەریەکانی هەندێ لەو هۆزە هاوسنورانەی بە سـەرکردایەتی مـزواری کـوڕی بوغنام کە بەچاکی دەزانی بکەوێتـە یارمەتیـدان و دانـەپاڵی زاوای ئـەمیر مـەولای ئەحمەدی هاوپەیمانی ئیسپانیا[1] .

دەوڵـەتی عوسمـانی هەسـتا بـە پاڵپـشتی سـوڵتان شـەریفی سـەعدی بـە بـڕی ٢٠ هەزار سەرباز کە بەدەوریدا کۆبوونەوەو پاڵیان پێوەنا بۆ دروسـتکردنی کەشـتی جـەنگی بـۆ زاڵبـوون بەسـەر ئیـسپانیادا ، شـەریف سـەعدیش بـەوەژازی بـوو و موچەی دەستگرۆیی بۆ بەخەرج دەدات [2] .

شـەریف سـەعدی تـوانی کۆتـایی بـە فـەرمانڕەوایی وەطـاسـی بهێنێـت ، بەمـە ئیسپانیەکان دەترسان لە هێرشـی هاوبەشـی عوسمـانی سـەعدی ، بۆیـە هەسـتان بە کۆتـایی هێنـان بـە فـەرمانرەوا خوازیـە پیشاوەکان و چـەند لێپرسینەوەیەکی ئاسایـشیان ســەپاند بـــە ســـەر جەبـــەل تـــاریق و قـــادش دا لەگـــەڵ چـــەند لەبەرچـاوگرتنێکی تـردا ، یەکـەمجار سـەعدیەکان وەك ڕزگارکـەری ڕۆژئـاوا لـە بوونی مەسیحیەکان دەرکـەوتن ، ئەمـەیش پـشتگیری موسوڵمانانی بۆ بەدەسـت خـستن بـەوەی ئـەوەیان بـە جـۆرێ لـە جیهـاد دادەنـا ، دەوڵـەتی عوسمـانی یارمەتیگـەلێکی زۆری پێـشکەش کـرد بۆ هێنانـەدی ئـەو کـارە ، پاشـان پـرۆژەی گەڕاندنـەوەی ئەندەلوسـی خـستەڕوو بـۆ سـەعدیەکان . پـاش ئـەوەی وڵاتـانی ڕۆژئاوا کەوتنە ژێردەستی شەریف سەعدی و فەرمانڕەوایی وەطاسی کۆتایی هات ، شـەریف بەرەو تلمسان چوو چەند سوپایەکی گەورەی نارد بۆ کۆتایی

---

[1] جهود العثمانيين / ٣٢٩ .

[2] جهود العثمانيين / ٣٣٠ .

هێنـان بـه حـوكمی عوسمـانی تیایـدا ، كاتێـك عوسمانیـەكان هەسـتیان بـەو چاوچـنۆكیانه و لادانـی شـەریف سـەعدی كـرد لـه ئامـانجی ئیـسلامی ، چـەند هێرشێكیان ناردەسەر تاكوو بگەڕێتەوه بۆ وڵاتی خۆی [1].

موجاهیـدەكان لـه باشـوری ئـەفریقیادا هەڕەشـەی ئاسایـشی ڕۆژئـاوای دەریـای ناوەڕاسـتیان دەكـرد ، هەسـتان بـه چــەند هێرشـێكی بازرگـانی و كەشـتیه بارهەڵگرەكانی نێوان ئیسپانیاو ئیتالیایـان بێزاركـرد ، موجاهیـدەكانی خەڵكی باكوری ئەفریقی بەشێك لـه دەریای ناوەڕاستیان داپۆشـی لـه نێوان سـەردینیاو كەناری ئەفریقیدا ، بەمه كەشتیه مەسیحیەكان ناچار بوون ڕێگەیەكی زیاتر له بارو ئارام بگرنەبەر لـەنزیك دووسـەری كورسیكاوه ، بـەڵام داگیركـەری فەرەنسی ئەویش بەیارمەتی عوسمانیەكان لەوێیش كەوتنه خەژەشه كردن لەپەیوەندیەكانی نێوان ئیسپانیاو ، لێرەدا هەلێك بۆ شارلی پێنجەم نەمایەوه بۆ بـەرگری كـردن لـه ڕێگه دەریایەكان دژی قوستەنتینیه كه هەر لەساڵانی منداڵیەوه خەون و خـەیاڵی بوو ، هەروەك نەیتوانی بەرژەوەندیه ڕاستەوخۆكانی ئیسپانیا سەربخات [2].

یەكـەم : كۆتـا ڕۆژەكـانی خـەیرەدین بربروسـه : خـەیرەدین بـەردەوام بـوو لەسەركردایەتی كەشتیگەلی عوسمانیـدا و چەند سـەركەوتنێكی گـرنگ و دیـاری بەدیهێنا كه هەموو ئەوروپای داهەژاند . پاش ئـەوەی دەوڵـەتی عوسمـانی لەگـەڵ فەرەنـسادا هاوپـەیمانی بەسـت ، خـەیرەدین لەشـاری ( مارسـیلیا) دا بنكەیـەكی دانا بۆ سەركردایەتی خۆی و پێگەیه كێشی دانا بۆ كەشتیگەلەكەی ، لێـرەدا – لەمەرسیلیا– خەیرەدین و پیاوانی كەشتیگەلەكەی ئەو دەستكەوتانەیان فرۆشت كه لـه كاتی جەنگ كـردن لەگـەڵ ئیسپانیایاند هـەڵیان گرتبـوو ، هـەورەك تیایـدا پیـاوان و ئافرەتـانی ئیـسپانیایان فرۆشـت . بەمـه لەدەسـتی خەڵكـدا دەسـت

---

[1] جهود العثمانيين / ٣٣٠ .

[2] جهود العثمانيين / ٣٥٦ .

بەدەستیان پێدەکرا ، فەرەنسیەکان بە داهاتێکی بێوێنە کڕینیان . پاشان بە پشکی درێژخایەن دەیانفرۆشتن بە جولەکەی ئیتالی ( لیفورنو ) . ئەمان بە ڕۆڵی خۆیان بە نرخێکی خەیاڵی فرۆشتنی دیلە هەڵکەوتەکانیان بە ئیمبراتۆر شارلەگان دەفرۆشتەوە .

کەشتیگەلی فەرەنسی بە فەرمانی پاشای فەرەنسا دایە پاڵ کەشتیگەلی عوسمانی ، سەرکردەی کەشتیگەلی فەرەنسی ( ئەمیر فرانسوا دبوبوربون ) هێزەکانی خستە ژێر دەستی سەرکردایەتی خەیرەدینەوە ، بەوەی ئەو کاتە سەرکردەی گشتی هێزە هاوپەیمانەکان ( عوسمانی –فەرەنسی ) بوو ، یەکەم کار خەیرەدین پێی هەستا ، سەرکردایەتی کردنی هێزەکان بوو بۆ هێرشکردنە سەر (نیس) و دەرکردنی فەرمانڕەواکەی ( دوق سافوا) و دارماندنی لە فەرمانڕەوایی ئیسپانی و گەڕاندنەوەی بۆ پاشای فەرەنسا .

پاشان خەیرەدین بە کەشتیگەلەکەیەوە لە شاری (طولون ) جێگیربوو و کردیە بنکەیەك بۆ سوپاو کەشتیگەلی ئیسلامی پاش ئەوەی زۆربەی دانیشتوانەکانی بەفەرمانی پاشای فەرەنسا چۆڵیان کرد و لە نێو دەستی موسوڵماناندا بە جێیان هێشت . هەڵچوونی هەموو مەسیحیەکان دژ بەو هەڵسوکەوتە فەرەنسیە راپەڕی و بانگەشەی دژ بە موسوڵمانان بە هەموو بەشەکانی ئەوروپادا بڵاو بوویەوە کە ئیسپانیاو خاچ لەملەکان هەڵیاندەگرت و ئەیانگەیاندە ئەوپەڕی سنور . لەوانە دەیانوت : ( خەیرەدین زەنگی کەنیسەکانی لەبن هەڵکێشاوە و لە طولوندا جگە لە بانگی بانگبێژان هیچی تر نابیسترێت ) خەیرەدین و سەربازانی ئیسلامی لە شاری طولوندا مانەوە تاساڵی ١٥٤٤ز لەوکاتەدا شارلەگان هێرشی کردە سەر باکوری ڕۆژهەڵاتی فەرەنساو لەژێر دیواری ( شاتوتییری) دا شکستی خوارد [١] .

---

[1] خیرالدین بربروسة / ١٦٦ .

پاشان ناچاربوو بچێت بەرەو ئەڵمانیا لە کاتێکدا بزوتنەوەی هەڵگەڕانەوەی پرۆتستانتی بە شێوەیەکی گشتی دژ بە کاسۆلیکیەکان و بەشێوەیەکی تایبەتی دژ بەئەو –چەند بوارێکی مەترسیداری گرتەوە ، ئەوەیش دوای ئەوەی ئەستێرەکەی کەوتە خوارو دەستکەوتەکەی پوکایەوە –لە ئەنجامی نەگبەتیەکەی لە بەرامبەر جەزائیردا – ئەمە ناچاری کرد هەستێت بە بەستنی گرێبەستێك لەگەڵ پاشای فەرەنسا لە ڕۆژی ١٨ی ئەیلولی ١٥٤٤ز لە شاری ( کریسبی دی ڤالوا)دا ئەنجامی ئەم گرێبەستە لابردنی خەیرەدین و سوپاکەی لە شاری طولون و گەڕانەوە بۆ ئەستانبوڵی پایتەختی لێکەوتەوە . جەنگی نێوان ئیسپانیا و موسوڵمانەکان نەوەستاو خەیرەدین بەردەوام بوو لە بەجێهێنانی کارە جەنگیەکان لە کاتی ڕێگەی گەڕانەوەیدا ، لەلای شاری جەنوەدا وەستا و ئەنجومەنی پیرانەی ئەو شارە پێیان خۆشبوو کۆمەڵێك دیاری گرانبەهایان بۆ نارد لە بەرامبەر توشنەبوونی شارەکە بەناخۆشی و زیان . خەیرەدین ڕێگەکەی خۆی گرتەبەر تاکوو گەیشتە دورگەی ( البا) کە لەژێر فەرمانڕەوایی ئیسپانیادا بوو –ئەوەی لە دواتردا بوە مەنفای ناپلیۆن پۆناپارت – چی تێدا بوو بەدەستکەوتی گرت ، هەروەك هەندێ لە شارە کەناریەکانی داگیرکرد لەوانە شاری ( لبیاری)خەیرەددین، بەکەشتیە قورسە دەستکەوتیەکانیەوە گەڕایەوە بۆ پایتەخت و بە چاکترین شێوە کە دایك پێشوازی لە منداڵە چاکەکانی دەکات پێشوازی لێکرا .

خەیرەدین دوای ئەوە زۆر تەمەنی نەکرد و گەڕایەوە بۆ لای پەروەردگاری ، کە هاوەڵە جیهادی یەکەی حەسەن ئاغای طوشی لەساڵی ١٥٤٤ز دا پێشی کەوتبوو ( پێش ئەو مرد ).

بە مردنی خەیرەدین ئەستێرەیەك دیار نەما کە بەردەوام ئاسمانی موسوڵمانان لە وشکانی ودەریادا پێی دەدرەوشایەوە ،بەئامادەنەبوونی خەیرەددین لاپەڕەیەکی

دیار له لاپەڕەکانی جیهادی ڕێگای خوا پێچرایەوە تا لاپەڕەیەکی نوێ دەست پێبکات .

بەڕاستی خەیرەدین جەنگەکانی باوەڕی سەرکردایەتی دەکرد و سەرکەوتنێکی گەورەی بەدیهێنا و خاوەن وەفاو پاکی و خۆشەویستی و ئامادەیی بەردەوام بوو بۆ قوربانیدان و ڕاستی و دلێری بەهەموو شێوەکانیەوە ، مێژوو وەڵامی ئەومان بۆ دەپارێزێت بەرامبەر شارلەگان کاتێك پێی وت : ( پێویستە لەبیرت نەچێت ئیسپانیا له جەنگێکدا شکستیان نەخواردووە و دوبراکەی ئیلیاس و عوروجیان کوشتووە و ئەوەیش لەسەریەتی درێژە دەکێشێت و سەری دووبراکەی خۆی هەڵدەگرێت ، چونکە سەرەنجامی ئەویش وەك سەرەنجامی دووبراکەیەتی ) خەیرەدینیش وەڵامی دایەوە ( بەیانی دەبینین ، بەیانیش دوورنیە ، کە سەربازەکانت پارچەکانیان ( أشلاء) دەچن بە ئاسماندا و کەشتیەکانت دەچنە ژێر ئاو و سەرکردەکانت بە داماوی و شەرمەزاری شکستخواردنەوە دەگەڕێنەوە بۆ لات ) کاتێك شارلەگان له دوای مردنی عوروج بربروسە ئابلۆقەی جەزائیری دا خەیرەدین هات و سووربونی خۆی نواند و ئەم ئایەتەی بەسەر هەموو سەرکردەو سەربازەکانیدا خوێندەوە ﴿ إن تنصروا الله ينصركم ويثبت أقدامكم ﴾ محمد : ٧ ،دواتر لەگەڵ پیاوەکانیدا بەرەو مەیدان پێشڕەوی کرد ، پێی ووتن : ( موسوڵمانان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە دۆعا و نزای تەوفیق دەکەن بۆ ئێوە ، چونکە سەرکەوتنی ئێوە سەرکەوتنی ئەوانە ، تێکشکاندنی ئەو سەربازە خاچپەرستانە له شکۆی موسوڵمانان و ئیسلام بەرزدەکاتەوە ) [١].

( بۆیە هاواریان کرد : الله أکبر ، و هێرشیان کردەسەر ئیسپانیاو هەموویان لەناو بردن ) [٢].

---

[1] خير الدين بربروسة / ١٧٠، ١٧١ .

[2] خير الدين بربروسة / ١٧١ .

ئەم وێنەیە هەرگیز نە لە شێوەو نەلە واتایدا جیاوازی لە وێنەی ئەو سەرکردە موجاهیدانەی ڕێگەی خواو ئەوانەدا نیە کە لە دورگەکەیاندا دەرچوون و پەیامی ئیسلامیان بۆ جیهان هەڵگرت .

جگەلەوەی هەڵوێستی گشتی لەسەردەمی خەیرەدیندا هاوشێوەی ڕۆژانی فەتح نەبوو ، چونکە لاوازی بەرودڵی موسوڵمانانی گرتبوو ، ئەوان پێشتر لە ژێر سەرکردایەتیەکدابوون کە ڕێگەی بە ئاشکرا هاتنەناوی دوژمنیان نەدەدا یان بە پەیرەوکردنی ڕۆڵیان لە کاریگەری خستنە سەر تەیاری گشتی ، لە کاتێکدا ئەوان ڕۆڵیان هەبوو لە ئاراستەکردنی ڕووداوەکاندا ، مەترسیدارترین کار ئەوەبوو ئەوان مەڵبەندەسەرکردەییەکانیان داگیرکرد کە بۆیان دەلوا پەیڕەوی ڕۆڵێکی ترسناک بکەن دژ بە هاوڵاتیان و برا هاوئایینەکانیان .

شتێکی مەحاڵ بوو سەرکەوتن لەوجۆرە چالاکیانەدا بەدی بهێنیت ئەگەر لێهاتوویەکی سەرکردایەتی بەرز نەیەتەدی ، تا بەڕێوەبردنی جەنگ لە هەموو قۆناغێك لە قۆناغەسەختەکانیدا بگرێتە ئەستۆ .

سیٚ هۆکارەکەی سەرکەوتن هاتنەدی ، گەلێکی موجاهیدی ڕێگای خوا ، جێبەجێکاریەکی بەرزی بیروباوەڕی ئیسلامی جەنگی ، سەرکردەیەك لە پلەیەکی بەرزی لێهاتوویدا .

بەمە گەلی جەزائیر و خەیرەدین سەرکەوتن و گەلی جەزائیر و خەیرەدین لەژێر قەڵەمڕەوی دەوڵەتی عوسمانیدا چیرۆکی شکۆداری جیهاد و موجاهیدەکانیان نوسیەوە .

خەیرەدین نەیدەتوانی ئەوە بەدی بهێنێت کە دەیویست ئەگەر گەلی موجاهیدی جەزائیر پێی هەڵنەسایە ، گەلی جەزائیریش بە ئامانجەکەی نەدەگەیشت ئەگەر سەرکردەیەکی لە بار نەبوایە ، خەیرەدین ڕۆڵی خۆی لە بەدیهێنانیدا جێبەجیٚ کردو لە ئاستی ڕووداوەکاندا داینا .

خەیرەدین گەڕایەوە بۆ لای خوای خۆی بەڕەزامەندی خۆی و لێڕازی بوونی ئوممەتی ئیسلامی .بە درێژایی سالان .ئەو هەلوێستە پالەوانێتیانە دەگێڕنەوە کە بیرو باوەڕو ڕێبازەکانی جیهاد و ئاکارەکانی ڕێگای خوا دروستی کرد .

*دووەم : لابردنی حەسەنی کوڕی خەیرەدین لەسەر جەزائیر : حەسەنی کوڕی خەیرەدین بربروسە پاش ئەوەی شکستی یەسەعدیەکان هێنا لە تلمسان و پالپشتیەکانی حوکمی عوسمانی تیادا بەهێز کرد لە ٩٥٩ك ، ١١٥١ز بەرەو ڕێبازی سیاسەتێکی دژ بە هەموو دەولەتە بیانیەکان چوو بەوەی فەرەنسای تێدا بوو کە بە پەیوەندیگەلێکی ڕەسمی تەواو توندو باشی هەبوو ، کە یارمەتی فەرەنسیەکانی دا سودمەند بن لە ئیمتیازاتی ئابوری کە لەگەل ئەستانبولدا بۆلوا ، کە هەموو هەرێمەکانی دەولەتی عوسمانی گرتەوە ، بەلام حەسەنی کوڕی خەیرەدین بەوەوە پابەند نەبوو و دوژمنایەتی خۆی لە چەند بۆنەیەکدا بۆ فەرەنسا ڕاگەیاند ، فەرەنسایش بالوێزی باوەڕپێکراوی خۆی لە ئیستانبولەوە نارد بۆ جەزائیر ، بە ئامانجی زانینی ئەو ماوەیەی کە حەسەنی کوڕی خەیرەدین پێی کەوتۆتە دژایەتی فەرەنسا ، ئایا ئەو دوژمنایەتیەیش کاریگەری هەیە لەسەر پەیوەندیە ئابوریەکانی نێوان فەرەنساو بەگلەربەگی جەزائیر؟

بالوێزی فەرەنسا لەگەل بەگلەربەگ حەسەنی کوڕی خەیرەدیندا کۆبوویەوە و پێشکەشکردنی یارمەتیە سەربازیەکانی بۆ خستە ڕوو لە مەڕجێبەجێکردنی پرۆژەی دەولەتی عوسمانی لە هێرش کردنە سەر ئیسپانیا و ڕزگارکردنی موسولمانانی ئەندەلوس ، بەلام حەسەن بەرپەرچی دایەوە بەهۆی شارەزایی لە هەلوێستە پێشیەکانی فەرەنسا لە خودی دەولەتی عوسمانیدا ، بەڕاشکاوی ڕایگەیاند : باس و خواسی جیهاد باس و خواسێکی تایبەت بە موسولمانانە و ڕوونیکردەوە کە بە دوژمن بەسەر دوژمندا سەرناکەوێت ، بالوێزی فەرەنسی گەڕایەوە بۆ ئەستانبول صەدری بابی عالی تووڕەبوو ووتی: ( بەڕاستی ئەو دەسەلاتە فراوانە ڕاشکاوانەی حەسەنی کوڕی خەیرەدین بربروسە پیادەی

دەکات ، هەوڵی فراوانخوازی مەملەکەتەکی یەکپریزی دەوڵەتی عوسمانی تێك دەشکێنێت و هەڕەشەی دابەشبوونی کیانی دەکات )[1]. بە تایبەت کە دایکی لە گیراوە جەزائیریە ناسراوەکان بوو .

دەوڵەتی عوسمانی بینی پێویستە سیاسەتی خۆی لە ناوچەکەدا بگۆڕێت بە تایبەت دوای ئەوەی ڕۆژئاوا بوویە هاوپەیمانێکی بەهێزی ئیسپانیا کە بوویە هۆی ڕاستەوخۆ هەڵگەڕانەوەی پێوانە ستراتیژیەکان بەرەو پشتەوە . سوڵتان چەند بیرکردنەوەیەکی کرد بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی باری نوێی ، لەوە سوڵتان سولەیمان قانونی بەگلەربەگی جەزائیر حەسەنی کوڕی خەیرەدینی لەکار خست بە بانگەشەی خراپەکاری لە چاك سنوری لەگەڵ ڕۆژئاوادا ، هەروەك بانگەشەی بۆ یەکبونی ئیسلامی وچاك سنوری و دراوسێیەتی کرد[2] .

دەوڵەتی عوسمانی بەگلەربەگی جەزائیری دایە پاڵ صالح ڕایس لە سەفەری ٩٦٠ك ، ینایر ١٥٥٢ز لە جیاتی حەسەنی کوڕی خەیرەدین[3] .

*<u>سێیەم : نامەی سوڵتان سەلیمی قانونی بۆ فەرمانڕەوای فاس محمدی سەعدی:</u>

( ... ئەمە ئاماژەی پیرۆزی بەرزی سوڵتانی و دەقی بەرزو بڵندی سامی خاقانیە ، بەردەوام جێبەجێکەر و گوێڕایەڵە پشت بەخوا ، پارێزگاری هەمیشەیی کە لە جەنابی باڵای ئەمیری گەورەی بەڕێزی شکۆداری تەواو دادپەروەری خەمخۆری بڵندی سەرخەری خەزێنەداری بەشی ڕێژەیی ڕەچەڵەکی بنەماڵەی هاشمیە ، لقی درەختی پاکی پێغەمبەرایەتی ، ڕێبازی مێزەری پێچراوەی عەلەوی بەلایەنە تۆزاویەکان بە هەستەکانی پاشای خۆڕاگر ، فەرمانڕەوای ویلایەتی فاسی ئەمڕۆژە پایەداری بەڕێز محمد هەمیشە سەربڵند بێت و شکۆی زیاد بکات ، ئەم

---

1 الجزائر والحملات الصليبية / ٣٠-٣٢ .

2 بداية الحكم المغربي للسودان الغربي / ٩٠، ٩١ .

3 المغرب العربي في عهد السعديين / ٧٩ .

وێنه بەرزو بڵندو بەڕێزەمان دەکرد بۆ جەنابی باڵا کە بەسەلامی پڕ خۆشەویستی بەڕێزی پاك ڕادەگرین ، وە بەبۆنی خۆشی خۆیەوە دوپاتی پەیوەندیە هۆگری و سۆزاویەکان دەکەین لەگەڵ سەلامی پاك و زوڵاڵ دا ، پاشان خوای گەورە توانای بەرز و بڵند و خواستی بەرزەلەو کاتەوەی لە دەوڵەتێکی گەروەو دیاردا جێگیری کردین تا سواری ئەسپەکانی بووین و بەخششێکی درێژخایەنی پێدایین کە بەردەوام دەکشێت ، وە قەڵەمڕەویەکی پایەداری وەك خۆر و بەرەبەیانی بەختەوەریەکی هەوڵ بۆدراوی وەك مانگی بەدوادا هات ، هەروەها خەلافەتێکی شکۆداری پێ تایبەتمەند کردین کە کەسی سەرخراو ئیمانی پێ بەهێز دەبێت ، دەسەلاتێکی پێبەخشین کە ئیسلامی پێ سەربڵند دەکات ، جا بێگومان پێویستە و لە گەردنمانە سوپاسی ئەو میهرە گەورەو چاکە گشتیە بکەین ﴿ ذلك فضل الله یؤتیه من یشاء والله ذو الفضل العظیم ﴾ الجمعه : ٤ ، هەمیشە سروشتمان گرنگیدانە بە بەجێگەیاندنی شەرعی ڕوون و دیارو جێبەجێکردنی سوننەتی پێشوان ( پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" ) و هەستان بە کوژاندنەوەی ئاگری بێباوەڕی و سەرکەشی و پێچانەوەی ستەم و دژایەتی و بڵاو کردنەوەی دادپەروەری و چاکە ، کاتێك بیستمان ئەمیری پێشووی ئەمیرەکان لە ویلایەتی جەزائیر حەسەن پاشا چاك هاوسنوری لەگەڵ دراوسێکەیدا نەکرد و دایە پاڵ لایەنی توندو تیژی و لەپشت ئەوەوە دەستبەرداری ڕێگەکانی ڕێککەوتن و یەکگرتن بوو ، دەرگای یەکبونی نێوان موجاهیدانی پارێزەری ئایینی داخست بۆیە گۆڕیمان بۆ کەسێکی تر ، جا ویلایەتی جەزائیرمان بەخشیە پاشای ژێردەستی پاشای بەڕێزمان . ڕەمزی خزمەت گوزاری.

# المصادر والمراجع

## (حرف الالف)


١- اخبار الامراء والملوك السلجوقية ، د. محمد نورالدين

٢- ايعيد التاريخ نفسه،محمد عبده، المنتدى الاسلامي ،طبعة ١٤١١هـ .

٣- اعلام الموقعين عن رب العالمين، الامام ابن قيم ،مراجعة وتعليق طه عبد الرؤوف سعد ،دار الجيل، بيروت – لبنان .

٤- اوروبا في العصور الوسطى، سعيد عاشور، الطبعة السادسة ، الانجلو المصرية ١٩٧٥م .

٥- اقتصاديات الحرب في الاسلام ،د.غازي التمام، مكتبة الرشد الرياض، الطبعة الاولى ١٤١١ هـ – ١٩٩١م.

٦- اطوار العلاقات المغربية العثمانية،ابراهيم شحاتة، منشاة المعارف، الاسكندرية، الطبعة الاولى ١٩٨٠م.

٧- امام التوحيد محمد بن عبد الوهاب ، احمد القطان، مكتبة السندس الكويت، الطبعة الثانية ١٤٠٩هـ،١٩٨٨م.

٨- استمرارية الدعوة، محمد السيد الوكيل، دار المجتمع المدينة، السعودية، الطبعة الاولى ١٤١٤ هـ ،١٩٩٤م.

٩- اضواء البيان في ايضا ح القران بالقران، لمحمد الامين الشنقيطي، مطبعة المدني ، الطبعة الاولى عام ١٣٨٤ هـ.

١٠- اقتضاء الصراط المستقيم مخالفة اصحاب الجحيم لابن تيمية، تحقيق محمد حامد الفقي، الطبعة الثانية عام ١٣٦٩هـ، مطبعة السنة المحمدية.

١١- ابن باديس حياته وآثاره ، د . عمار الطالبي ، دار الغرب الاسلامي،بيروت الطبعة الثانية ١٤٠٣هـ – ١٩٨٣م.


## (حرف الباء )

١٢- البداية والنهاية ، ابو الفداءالحافظ ابن كثير الدمشقي، دار الريان ، الطبعة الاولى ، ١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م.
١٣- البطولة والفداء عند الصوفية ، اسعد الخطيب، دار الفكر ، سورية - دمشق .
١٤- البدر الطالع بمحاسن من بعد القرن السابع، لمحمد بن علي الشوكاني ، دار المعرفة، بيروت.
١٥- بدر التمام في اختصار الاعتصام، اختصره ابو عبد الفتاح محمد السعيد الجزائري ، دار الحنان الاسلامية، الطبعة الاولى ١٤١١هـ ، ١٩٩١م ،الامارات العربية المتحدة .
١٦- بدائع الزهور في وقائع الدهور ، محمد بن احمد بن اياس، القاهرة، مطابع الشعب ١٩٦٠م.
١٧- بداية الحكم المغربي من السودان الغربي، محمد الغربي ، الدار الوطنية للتوزيع والنشر، طبعة عام ١٩٨٢م.
١٨- البرق اليماني في الفتح العثماني، دار اليمامة، الرياض، قطب الدين محمد بن احمد المكي، الطبعة الاولى ١٣٨٧هـ - ١٩٦٧م.
١٩- البلاد العربية والدولة العثمانية ، ساطع الحصري، بيروت ١٩٦٠م.

(حرف التاء)

٢٠- تاريخ الترك في آسيا الوسطى، بارتولد ترجمة احمد السعيد القاهرة، مطبعة الانجلو المصرية ١٣٧٨هـ - ١٩٥٨م.
٢١- تاريخ الامم والملوك ، محمد بن جرير الطبري، دمشق، دار الفكر ١٣٩٩هـ -١٩٧٩م.
٢٢- تاريخ الدولة العلية العثمانية ، محمد فريد بك، تحقيق الدكتور احسان حقي ، دار النفائس ، الطبعة السادسة، ١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م.

٢٣- تـاريخ الاسـلام ، شمـس الـدين محمـد بـن احمـد الـذهبي ، دار الكتـاب العربي، الطبعة الثانية ، ١٤١١هـ - ١٩٩١م.
٢٤- تـاريخ دولـة آل سـلجوق ، لمحمـد الاصـبهاني، القـاهرة ، دار الآفـاق الجديدة، بيروت الطبعة الثانية ١٩٧٨م.
٢٥- تاريخ سلاطين آل عثمان ،تحقيق باسم الجابي، تاليف يوسف آصاف ، دار البصائر ، الطبعة الثالثة ١٤٩٥هـ - ١٩٨٥م.
٢٦- تاريخ العرب الحديث ، رافت الشيخ ، عين للدراسات والبحوث الانسانية والاجتماعية .
٢٧- تـاريخ العـرب الحـديث ،تـاليف د .جميـل بيفـون، د. شـحادة النـاظور، الاستاذ عكاشة، الطبعة الاولى ١٤١٢هـ -١٩٩٢م، دار الامل للنشر والتوزيع.
٢٨- التقليـد والتبعيـة واثرهـا في كيـان الامـة الاسـلامية ، ناصـر العقـل، دار المسلم، الطبعة الثانية ١٤١٤هـ.
٢٩- تـاريخ الدولـة العثمانبـة ، د. علـي حـسون ، المكتـب الاسـلامي ، الطبعـة الثالثة ١٤١٥هـ - ١٩٩٤م.
٣٠- التاريخ العثماني في شعر احمد شـوقي بقلـم محمـد زاهدعبـد الفتـاح ابـو غدة، دار رائد كندا ، الطبعة الاولى ١٤١٧هـ - ١٩٩٦م.
٣١- تاريخ سـلاطين آل عثمـان ، للقرمـاني، الطبعـة الاولى ١٤٠٥هـ -١٩٨٥م، دار البصائر ، دمشق - سوريا.
٣٢- تـاريخ المـشرق العربـي ، عمـر عبـد العزيـز عمـر، دار المعرفـة الجامعيـة، الاسكندرية.
٣٣- تجربـة محمـد علـي الكـبير، دروس في تغـيير والنهـوض، مـنير شـفيق، دار الفلاح للنشر ، الطبعة الاولى، ١٩٩٧م- ١٤١٨هـ ، بيروت - لبنان.
٣٤- التراجـع الحـضاري في العـالم الاسـلامي، د. علـي عبـد الحلـيم، دار الوفـاء، ١٤١٤هـ - ١٩٩٤م.

